# ئینسكلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆكێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ
**موسەدەق تۆڤێ**

هاریكارێ سەرنڤیسەرێ
خالد سالح

## بەرگێ پێنجێ
## زمان و ئەدەبیات- فولكلۆر و كولتۆر

٢٠١٧ ز ٢٧١٧ ك ١٤٣٩ مش

# ناڤەرۆك


**زمان و ئەدەبیات** ........................................................ ٩

بەهدینی ........................................................ د.فازل عومەر ١١

ئەتلەسا فۆنولۆجییا زمانێ كوردی پارێزگەها دهۆكێ .............. د.سەلوا فەریق سالح ١٩

هۆزانا كوردی ل چاخێن ناڤەراست ٥٠٠-١٥٠٠ز ........................ د.عەبدولرەحمان مزوری ٦٢

شعرا كوردی یا كلاسیكی ل دەڤەرا بادینان........................................ تەحسین دۆسكی ٧٩

بزاڤا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٠٠-٢٠٠٠ ........................ ئیسماعیل ئیبراهیم بادی ٨٦

كورتە چیرۆك ل دەڤەرا بەهدینان ................................................ خالد سالح حەسەن ١٠٦

رەوشا رۆمانێ ل دەڤەرا بەهدینان ................................................ د.نەوزەت زێباری ١٢١

ژانرێن (جۆرێن) ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ............................................ كۆڤان رێسان حەسەن ١٢٥

رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان ................................................ د.نعمەت الله حامد نهێلی ١٤٠

بزاڤ و قۆناغێن وەرگێرانێ ل دەڤەرا بەهدینان ........................... هێرش كەمال رێكانی ١٥٦

**فولكلۆر و كولتۆر** ........................................................ ١٩٣

فولكلۆر. پاسا نەتەوەییا كوردی ................................................ د.عیماد وەیسی خالد ١٩٥

پەندا كوردی ل دەڤەرا بەهدینان ................................................ خالد سالح ١٩٩

گۆتنێن مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان ................................................ د.عیماد وەیسی خالد ٢٢٢

مامك یان تشتیك ........................................ ئیسماعیل تاها شاهین ٢٤٥

ئەدەبێ زارۆکان د فولکلۆرێ کوردی دا بەهدینان وەك نموونە ........ حەجی جەعفەر ٢٥١

نفرین ژ دەڤەرا بەهدینان ........................................ ئەحمەد عەبدوللا زەرو ٢٦٣

هندەك داب و نەریتێن کوردان ل دەڤەرا بەهدینان ........ محەمەد حەسەن بناڤی ٢٧٢

رێز و سەروبەرێن ژنئینانێ ل دەڤەرا بەهدینان ........ جەمیل شێلازی ٢٨٧

یارییێن دڤەرا دهۆك ........................................ پەیبەرێ ئەرتیسی ٣١١

ئیدیوم ل دەڤەرا بەهدینان ........................................ خالد سالح ٣٤٧

فولکلۆرێ کلدانیان ل دهۆکێ ........................................ خالد سالح ٣٦٩

چەند پیشەسازییێن دەڤەرا بەهدینان ........ محەدمەد حەسەن بناڤی ٣٧٨

راڤ و نێچیر ل پارێزگەها دهۆکێ ........................................ خالد سالح ٣٨٧

دەهوات ل پارێزگەها دهۆکێ ........................................ کامیران درباس هرۆری ٤٠١

خان ل پارێزگەها دهۆکێ ........................................ خالد سالح ٤٢٠

خوارنێن کوردی ........................................ محەمەد حەسەن بناڤی ٤٣٧

کار و پیشەیێن کوردەواری ل پارێزگەها دهۆکێ ........ کامیران درباس ئیسماعیل ٤٥٣

کەڤنە باوەری ل بەهدینان ........................................ جەمیل شێلازی ٤٨٠

ئامویرێن هێرانا دەخل و دانی ل دەڤەرێ ........................................ جەمیل شێلازی ٥٠٣

سترانا فولکلۆری ل دەڤەرا بەهدینان ........................................ جەمیل شێلازی ٥٢٢

بازێرێن بەهدینان دناڤ فولکلۆرێ دەڤەرێ دا ........................................ خالد سالح ٥٣٧

# بەهدینی

د.فازل عومەر

## پێشگۆتن:

نـــەدووره ب ســانەهـی نەبت، ئەم دەڤۆكـەكا هەڤـكرتی و جودا و سینۆردای ناڤێ بەهدینی ببینین، بەهدینی پتر رەنگڤەدانا مێژوویێ و جیۆگرافیا سیاسیە ژ راستییەكا زمانەڤانی، چاوا بت، بەهدینی بۆ ئەوێ كوردیا ل دەڤەرا بەهدینان پێ دئاخڤن، دهێتە گۆتن. ب گۆتنەكا دی، بەهدینی ئەو ئاخفتنا كوردیە یان ئەو دەڤۆكا كرمانجییە، ئەوا ل دەڤەرا بەهدینان دهێتە بهیستن و نڤیسین.

ئەڤ راستییە مە تووشی راستییەكا دی دكەت كو زارەكێ كوردی نینە ناڤێ وی بەهدینی بت، هەلبەت ئەڤە دێ دلگرانیێ بۆ گەلەك كەسان چێ كەت، لێ راستییەكە پێدڤیە ئەم ببینین. ل هەمان وەخت، ژبیر نەكەین كو نەدووره، ل پاشەرۆژەكا نێزیك ئەو دەڤۆكە یان ئەو زارە پەیدا ببت، نەخاسمە هەكەر پەروەردەیا دهۆكێ و دەزگەهێن رەوشەنبیری (مەدیا، زانكۆ، نڤیسەران، هۆنەرمەندان)شیان، رەنگە رێزمانەكا هەڤپشك پەسەند بكەن و هەمی بكاربینن.

دگەل ئەڤێ راستیێ، ئەم دشێین خەریتەیەكێ بەهدینیێ دگەل زارێـن دی دارێژین و جیۆگرافیا هندەك جوداهیێن ناڤخوە ژی پەرچاڤ بكەین، ئەڤ هەردو كارە، وەكو پارچەیەك ژ زارناسییا كوردی، مەكەنزی، ب تەرزەكێ مەیدانكی ل نیڤا سەدسالیا بیست كریە، لێ نەگەهشتیە هوورهووركێن جوداهیێن ناڤخوەیی، بەری هینگێ ل سەدسالیا نۆزدێ، گاررۆنی رێزمانەكا زارێ دەڤەرێ دانایە، و پاشی مەتی فلیپێ بازی پرتووكەك ل سەر ئەڤێ دەڤۆكێ نڤیسیە و هندەك تایبەتمەندی بەرچاڤكرینە، رۆلێ سادق بەهاددین ئامێدی ل ئەڤی واری دیارە دگەل هندەك بزاڤێن كەسی ل ڤر و ور.

## بەهدینان:

بەهدینان، وەكو ناڤكرن، دەڤەرەكا سیاسی بوویە، بەری ببتە دەڤەرەكا جودایا رەوشەنبیری و مێژوویی و ئابۆری.. ب گۆتنەكا دی، بەهدینان ناسنامەیەكا سیاسی بوویە، نە ژ مێژە بوویە ناڤ بۆ كۆمەلەكێ خوەسەر و جودایێ رەوشەنبیری یان ئابووری. لێ ئەڤە هندەك راستیان ناڤەشێرت، كو بەهدینان جهەكێ زیندی بوویە د مێژوویێ دا و گەلەك جاران پشكداریەكا كارا د بویەران دا كریە تا كو وەكو دەڤەرەكا خوەسەر و جودا خوە دایە ناسین.

بەری مووسل بهێتە ئالێ چەپێ ژ دیجلەی، دەڤەرا بەهدینان دكەفتە ناڤبەرا هیزلی و دیجلەی و زێی و دەڤەرا بارزان دگەلدا. دەشتا مووسلێ و خوارتر،

د گومانێ دایە، چەند گرنداپی بەهدینان بوویە یان چەند ژێ دوورە. ل وەختێ چیایێ مەقلووبێ شێخان پارچەك ژ هەكاری، هینگێ ئەو دەڤەرە دگەلدا بوویە، لێ بزاڤێن لەشكەری و سیاسییێن بەردەوام، نەهێلاینە دەڤەر ئارام ببت و رەنگە هەڤگرتنەكا جهگیر بپاریزت.
ل بەهدینان ب سەدان جهێن شوینواری هەنە، مێژوویا دەڤەرێ ڤەدگەرِیننە دەستپێكێن شەهرستانیێ، لێ مخابن پتریا ئەوێ مێژوویێ ب تەرزەكێ بێدەنگ و بێرەنگ د پارچە شوینوارەكیدا یان د نەخشەكی یان د كەڤرەكی یان د رێزەكا پرتووكەكێدا .. مایە، و ئەڤە تێرا بەرهەڤكرنا زنجیرەكا پێكڤە گرێدایی ناكەت.
لەو، ئەم دێ باسێ ئەو كوردییا ئەڤرۆ ل بەهدینان پێ دئاخڤن، كەین و ئەتیمۆلۆجیا ئەڤێ دەڤۆكێ بۆ پاشەرۆژێ هێلین.

## جیۆگرافیا ژێر دەڤۆكێن بەهدینی

ئەم دشێین د ناڤ دەڤۆكا بەهدینان دا، كۆمەكا ژێر دەڤۆكان ببینین، كو ژ رەنگە جوداهییێن فۆنەتیكی، ئاواز و سترێسێ دەستپێدكەن ئو ب هندەك جوداهییێن رێزمانكی و سیمانتیكی ب دوماهی دهێن.

### ١-١بەهدینیا رەخێن زێی:

چونكی دكەفتە سینۆرێ زارێ سۆرانی، هندەك جوداهییێن ئەوێ جیۆگرافیایێ ستاندینە. بۆ نموونە: ب بەرفرەهی پیِرِست (ژ) تێدا نەمایە و (ل) ل شوونێ بكار دهێت.

**※ ژ مال دەركەڤت.**
**※ ل مال دەركەڤت.**

ل شوونا مۆرفێمێ دیاركرنا تەكێ نفشێ نێر (ی) ل هندەك رەوشان دبتە (ەی) و نەدووره ئەڤە بۆ جوداكرنێ بت ژ مۆرفێمێ سۆرانی (ی) ل رەوشا جیناڤێ لكاوێ كەسێ سێیەم.

**※ ئەوی كوری چ گۆت؟**
**※ ئەوی كورەی چ گۆت؟**

ل ئەڤێ دەڤەرێ گەلەك جاران (-ەكە)یا ناسیارێ دهێتە دیتن كو د كرمانجیدا یان نینە یان ب تەرزێن دی دهێتە گۆتن.

**※ تە رۆژ دیت؟**
**※ تە رۆژەكە دیت؟**

### ١-٢ ژێردەڤۆكا ئامێدیێ

دهێتە پێشبینیكرن كو ئامێدیێ وەكو كەڤنە پایتەختێ بەهدینان، سەنتەرێ دەڤۆكا بەهدینی ژێ بت. لێ راستی وەسا نینە یان نەمایە، هەكەر زەمانەكی هەبت ژێ.
ل وارێ دەنگسازیێ، دەردۆرێن ئامێدیێ، دەنگێ /ا/ وەكو دیفتۆنگەكێ (ئو)یێ دبێژن. ئەو دەنگە د فارسی ژێ دا دهێتە بهیستن.

**※ ئاڤ، داڤ، چاڤ.**
**※ئوٚڤ، دوٚڤ، چوٚڤ.**

هەلبەت دەنگێ /ۆ/ هەمان دەنگێ /ۆ/ یا بەربەلاڤ نینە- وەكو /ۆ/ە، لێ ژ نەچاری من پێ نڤیسی، چونكی نێزیكترینە.
هەر وەسا ئامێدیێ، دەنگێ /ر/ نابێژن. ئەڤ دیاردەیە ل گەلەك كەڤنە گوندێن بەهدینان تاكو درەنگ مابوو، لێ بەرەڤ نەمانێیە ژبلی ناڤا ئامێدیێ.

**※ بارەكێ گران ل كەری نەكە.**
**※ بائەكی گئان ل كەئی نەكە.**

ئەو دەنگێ/ نەهێتە گۆتن/ من ب دەنگێ /ئ/ نڤیسی داكو ژ سفرێ جودا بكەم، چونكی نەگۆتنا دەنگێ /ر/ێ وێ ناگەهینت كو (هیچ) جهێ وێ دگرت. ئەو ڤالاهی ب گۆرەی دەنگێن دۆرماندۆر، ب گەلەك

جۆران دهێتە پرکرن. دبت ئەڤ بابەتە هەوجەی پتر لێکۆلینێ بت، نەخاسمە هندەك كەڤنە گوندێن بەهدینان (باڤیا سلێڤانەیان) تاكو سالێن هەفتیان، هەمان دیاردە لێ دهاتە بهیستن. هەر وەسا، پێدڤیە ئەم ئەڤێ ژ زارێ مووسلیان و وەرگوهاستنا /ر/ بۆ /غ/ دوور نەبینین، چونكی شەنگستەیێ هەردووان؛ نەشێیانا گۆتنێیە.

## ٣-١ ژێردەڤۆكا زاخۆ

چونكی زاخۆ دكەڤتە سینۆرێ دەڤۆكا بۆتان، چەندین جوداهی دگەل دەڤەرێن دی و د ناڤ دا، دهێنە دیتن. نەدوورە ئێك ژ ئەوان جوداهیێن ناڤخوە یێن گەلەك بالكێش، ب كارئینانا ئووشیێ دەنگان /خۆ/ ل شوونا /خوە/ بت، ل ناڤ زاخۆ ب تەنێ.

* **خوە، خوەش، خوەزی.**
* **خۆ، خۆش، خۆزی.**

ل ئەڤێ دەڤەرێ فۆرمێ كەڤنێ ئووشیێ دەنگان (خوەو خوا- و كوا-) گەلەك باش هاتییە پاراستن، بەرەڤاژی پتریا دەڤەرێن بەهدینان كو (خوە) بوویە (خۆ) و (خوا- و كوا-) بووینە (خا- و كا-).

* **خواست، كوار، خواندن.**
* **خاست، كار، خاندن.**

هەروەسا ل ئەڤێ دەڤەرێ فۆرمێ كەڤنێ (-ە ە-) ب بەرفرەهی دهێتە بهیستن، هەكەرچی ل سەلال و خوارتر، بوویە دەنگێ /ا/.

* **كەهر، بەهر، مەهركرن، خوەهر.**
* **كار، بار، ماركرن، خوار/خار.**

ل ئەڤێ دەڤەرێ ل شوونا كارێ بوونێ (بوو) ب هەردو رۆلێن وێڤە، (بی) بكاردهێت:
چێبوو/ چێبی، ئەز بووم/ ئەز بیم، بوو هرچ و رەڤی/ بی هرچ و رەڤی و ...هتد.
ل دەڤەرا زاخۆ، رەنگە سڤككرنەكا فۆرمێن رێزمانی ژی دهێتەدیتن، هەر بۆ نموونە، ل پتریا دەڤەرێن بەهدینان، نفشێ ناڤێ دوۆڤی ژی دیاردكەن و دبێژن:

١-**سینەم یا جوانە.**
٢- **شینۆ یێ زیرەكە.**
٣- **سینەم و شینۆ درەنگزن!**

ل دەڤەرا زاخۆ ئەڤە بێ نیشانێن نفشی و هەژمارێ دهێنە گۆتن:

١-**سینەم جوانە.**
٢- **شینۆ زیرەكە.**
٣- **سینەم و شینۆ رەنگزن!**

هەر وەسا ڤەرێژێن دەمكی یێن كارێن كرنێ و برنێ، ب (ا) دهێنە گۆتن، هەكەرچی ل پتریا بەهدینان ب /ە/ دهێنە گۆتن، وەكو:

* **دكەت، دبەت، دێ كەت، دێ بەت. ب ئەڤی رەنگی دهێنە گۆتن؛**
* **دكت، دبت، دێ كت، دێ بت.**

پاشبەندێ كەسێ دووەمێ تەك، ل پتریا زار و دەڤۆكێن كوردی، مۆرفیمێ (ی) یە: تو چۆی، تو هاتی. لێ ل پتریا دەڤەرێن ژێردەڤۆكا زاخۆ، ب دەنگێ /ێ/ دهێتە گۆتن: تو چۆیێ، تو هاتێ. ئەڤ دەرازی پاشبەندێ نفشێ نێر ژی دبت و دبێژن:
زەلامەكێ گۆت. ئەڤێ ژی رەوشەكا دی ئینایە پێش ئەو ژی (ژنەكی جوانە) ل شوونا ژنەكا جوانە دهێتە بهیستن، هەر وەسا زەلامەكی باشە ل شوونا (زەلامەكێ باشە).
ل كێرەیێ سندیان، هندەك تایبەتمەندیێن دی هەنە، وەكو؛ ل شوونا (یا كری یان كریە)، دبێژن؛ كرە. هەر وەسا هندەك پەیڤێن دەگمەن وەكو (ژۆ: بۆ) دهێنەدیتن.

ئەڤێ هەڤبەری؛ ژەو- لەو، بۆ- لۆ،... بکە.
چاوا بت، پتریبا هەردو رەخێن چیایێ بێخێری و بانا تلاکرۆ و رەخێن خابۆری، رەنگە ژێردەڤۆکەکی دیار دکەن.

## ١- ٤ ژێردەڤۆکا کۆچەران

هەکەرچی پشتی بۆرینا ٨٠ سالان ل سەر ئاکنجیبوونا وان و تێکەلبوونا وان دگەل بەهدینیێن ئاکنج و خوەجە، هەم خوەسەری ژ دەستداینە هەم زمانەکێ ئێککرتی و جودا، ل جهێن ڤەدەر و گوندێن خوەروو کۆچەر و تێکەلی خەلکێ دی نەبووین، هێشتا هندەك نیشانێن تایبەت پاراستینە، وەکو پاراستنا دەنگێ /وو/ کو ل بەهدینان یان بوویە دودەنگی /وی/ui/ و هندەك جاران /ۆ/ یان هەر بوویە /ی/.

* **دویر، سویر، کویر، شیر، بویرا.**
* **دوور، شۆر، کوور، شوور، بوورا.**

هەر وەسا هێشتا کوو و کوسا ل شوونا چی و چاوا بکاردئینن.
وەکو ژێردەڤۆکا زاخۆ، ڤەرێژێن دەمکی یێن کرن و برنێ ب دەنگێ /ا/ دبێژن، کو ل بەهدینان، پتر ب /ە/ دبێژن.

* **دکت، دبت، دێ کت، دێ بت.**
* **دکەت، دبەت، دێ کەت، دێ بەت.**

## ١-٥ ژێر دەڤۆکا دەڤەرا شێخان و دەشتا مووسلێ:

دبت ژێردەڤۆکەکا تایبەت ل ئەڤێ دەڤەرێ نەهێتە دیتن، هەکەر چی هندەك شێوازێن دەراندنا دەنگان هەنە و هندەك باندۆرا دەڤۆکا بۆتانی ژی ل سەر دهێتە دیتن، ئەو ژی نەدووره گرێدایی ئێزدیاتیێ بت، ئانکو نەدووره کەڤتبنە بەر باندۆرا کوردێن شنگارێ و بۆتانێ.
ل ئەڤێ دەڤەرێ، ب بەرفرەهی هێشتا دەنگێ /وو/ مایە. ل شوونا بۆ، بۆرا دبێژن.
ل هەمی ئەڤان ژێردەڤۆکان، جوداهیێن سترێسی و تۆنی هەنە و کەسێ شەهرەزا دشێت ب شێوازێ گۆتنا پەیڤان دەڤەرا وی بزانت.

## دەنگناسی

نەدووره، ل بەهدینان، پتریبا دەنگێن زمانێ کوردی و دۆرماندۆری بهێنە بهیستن. ئانکو، ب دەنگان زەنگینترە ژ پتریبا زار و دەڤۆکێن کوردی، دگەلدا هندەك تایبەتمەندی ژی هەنە.
ل بەهدینان ئەڤ دەنگە ب گوهی دهێنە بهیستن، هەلبەت ئۆسیلێتەر دێ پتر ئاشکرا کەت:
ئ، ا، /اۆ/، ب، پ، پ١، پ٢، ت٠، ت١، ت٢ (گ)، ج، چ٠، چ١، ح، خ، د، ر، ڕ، ز٠، ز١، ژ، س، ص، ش، ع، غ، ف، ق، ك٠، ك١، ل، ڵ، م٠، م١، ن٠، ن١، ە، و٠، و١، وو، ۆ٠، ۆ١، وی، ی٠، ی١، ێ.
ئەڤانە دەنگێن فۆنێمن ل بەهدینان، هەلبەت دەنگێن دی هەنە لێ رۆلێ فۆنێمیێ ناگێڕت لەو نیشان بۆ نەهاتینە دانان، هەر وەسا هندەك ژ ئەڤان دەنگان گەلەك خوەجهن، بۆ نموونە؛ دەنگێ (اۆ) ل ئامێدیێ و دۆرا وێ هەیە. دەنگێ /وو/ ل ناڤ هندەك هۆزێن کۆچەران مایە و هندەك ئێزدییان. دەنگێ/ڵ/ جیۆگرافیەکا پرت و بەلاڤ هەیە، لێ دەگمەن مانایێ دگوهێرت.
دەڤۆکا بەهدینان ب گوهەڕینا دەنگێ/وو/ بۆ /وی/ و پاشی بەرەڤ /ی/ و پاراستنا ئەرگەتیڤیتیێ و هندەك فۆرمێن دێرین، رەنگە تایبەتمەندی و خوە جوداکرنەکا مەزن ژ دەڤۆکا بۆتانی و زارێ سۆرانی پەیداکریە. چونکی ئەڤ گوهەڕینە ل ئەڤی دەنگی تەنێ نەراوەستایە، بەلکە دەربازی گوهەڕینا فۆرمێ پەیڤان ژی بوویە، نەخاسمە وەختێ دەنگێ/وو/ سێیەم دەنگێ پەیڤێ بت. بۆ نموونە ئەڤان پەیڤان: چلوو، هنوو، جهوو، حلو، کلوور، بروو، کلوو، بلوور، زروو، ..هتد. ل ڤۆناغا ئێکێ بووینە؛ چلوی، هنوی، جهوی، حلوی، گلویر، بروی، کلوی، بلویر، زروی...هتد.
وا دیارە ئەڤ ڤۆناغە گەلەك نەساز و گرانە ل سەر ئەزمانی، لەو باشترین چارەسەری بۆ رەهوان گۆتنێ و تەمامکرنا وەرگەڕانا دەنگێ /وو/ بۆ /وی/ خەلکی ب ئەڤی رەنگی ئەڤ پەیڤە گۆتینە: چولی، هونی، جوهی، حولی، گولیر، بوری، کولی، بولیر، یان بولیل، زوری، ...هتد.

هەلبەت ئەڤێ گوهەڕینێ و یێن دی، ڤارێبوونەکا مەزن بۆ دەڤۆکا بەهدینان ژ دەڤۆك و زارێن دی چێکریە و بوویە دەرگەهەك یان دەستپێکەك بۆ پەیدابوونا زارەکێ دیێ کوردی ب ناڤێ بەهدینی یان بەهدینانی. راستە ئیرۆ ئەڤە گەلەك دیار نینە، لێ هەکەر ل وارێ نڤیسینێ و پەروەردەیێ هندەك بزاڤێن لێك- نێزیککرنێ نەهێنەکرن، ئەڤ پرۆسێسە نێزیك نەدوور دێ گەهتە ئەنجامەکێ، نەخاسمە دەڤۆکا بۆتان و نێزیکی وێ، یێن کۆمەکا گوهەڕینێن مەزن ب خوەڤە دبینن و یێن دهێنە پەسەندکرن. ئانکو کرمانجییا بەهدینان و یا بۆتان، هەرێك یا بۆ رەخەکێ وەرارێ دکەت و هێشتا نەچو هێزێن بەرگر هەنە، نە ژێ یێن هەڤگر.

ل وارێ ئەتیمۆلۆجیا دەنگان، ژبلی باندۆرا زمانێن سامی، رەنگە تەڤلهەڤیەکا هەردو گرۆپێن ئیرانی ل ئەڤی واری دهێتە دیتن. ئانکو، دەنگێ /ز/ بەرانبەر /ژ/ ئو دەنگێ /گ/ وەکو ورگوهاستنا دەنگێ /ڤ/ بەرانبەر /ب/ پتر فارسینە و یێن پاشی کوردینە، لێ فارس دبێژن زوبان و کورد دبێژن زمان و ئەزمان. کورد زیرەك ژ ژیر پتر بکاردئینن، ئو گۆتن و گازی ژ بێژە پتر بەربەلاڤن.

ل وارێ دەنگوهەڕینێ، ژبلی گوهەڕینێن گشتی کو گرێدایی هەمی زمانێ کوردیە یان گرێدایی بنەمالا زمانیە، کوردیا بەهدینان رەنگە پاشڤەبرنا گۆتنێ هەیە. ئانکو گۆتنا دەنگان پاشڤەچوویە .. دەنگێن لێڤێ بۆ پدوو و ددانان چۆینە و یێن وان بۆ زمانی و یێن زمانی پاشڤەتر.

ئەڤ پرۆسێسە، ب کێماتی بۆ ئەتیمۆلۆجیایێ و جودابوونا بەهدینیێ ژ زارێن دی، گەلەك گرنگە. هەر بۆ نموونە:

/ێ/ بوویە /ە/ یان /ع/.

/ە/ بوویە /ح/.

/ك/ بوویە /ق/.

/ژ/ بوویە /د/.

/پ/ بوویە /ت/ پاشی دبتە /س/.

/ت/ بوویە /گ/.

/ز/ بوویە /ڤ/ یان /ز/

/س/ بوویە /ص/...هتد.

/ڤ/ بوویە/ب یان و/.

## مۆرفۆلۆجی

کوردی ئێکە ژ زمانێن هەری زەنگین ل وارێ مۆرفۆلۆجی، لێ مخابنی، تاکو نهو خزمەتا هەژی بۆ نەهاتیە کرن و زمانێ نڤیسینێ نەهاتیە زەنگینکرن ب دارێشتنێن نوو و هەڤچاخ. هەر بۆ نموونە، ل کنار دەهـ رێکێن دارێشتنا ناڤێ بکەری هەنە، لێ هێشتا کوردی ب گشتی گەلەك هەژارە ب ناڤێ بکەری یان دروڤێ بکەریێ (الصفه الفاعله) و ئەڤێ دەرگەهـ لبەر بەلاڤبوونا هندەك فۆرمێن خەلەت و تێکدەر ڤەکریە و یێن جهگیر دبن. وەکو کرپار (ناڤێ کاریە وەکو پرسیار) ل شوونا بکر دگەل خوازیار و فرۆشیار کو هەمی ناڤێن کارینە و بەری هینگێ کۆری زانیاری کورد ب زانیاری ئەڤ دەرگەهە ڤەکربوو.

چونکی ئەڤە یا دەستوورەکا زمانی تێك ددەت، دێ پتر رۆهن کەم:

د کوردیدا پاشگر (-یار) دچتە سەر رەگێن پەیڤان و ناڤێ کاری (ژێدەر) ئاڤا دکەت وەکو؛ پرس- پرسیار، پر- پریار، کر- کریار، نژن- نژیار، drwo-dirwar/doryar، کر- کریار، دی- دیار (مرئی)، ...هتد. ئەڤە ناڤن بەرانبەر پرۆسێسا کاری ژ هەمان رەگان؛ پرسین، کرین، نژنین، droon یان drooten، کرن، دیتن.

بەرانبەر ئەڤێ و ئەوا سەر ل زماننەزانان گێژکری پەیڤا لێکدایە دگەل پەیڤا یار ب واتەیا (دۆست، هەڤال، هۆگر). وەکو ئاشکرا، پەیڤا یار دگەل پەیڤێن دی یان ناڤان پەیڤێن لێکدای ئاڤا دکەت و فۆرمێ دەرکار، وەکو ناڤێ کاری دیار دکەت.

د کرمانجییا بەهدینان دا، ئەم دشێین سێ نموونەیێن خوەمال ببینین:

بەخت- یار، هش (هۆش)- یار، جۆت- یار.

بنێرە؛ بەخت و هش و جۆت ناڤن، نە رەگن و یار وەکو دروڤ یان سیفەت چۆیە دگەل و دروڤێ بکەری

ئاڤاکریە، هەچوەکو بێژی بەخترەش، هۆشپاك و جۆتكار.
ل دەڤۆكا بەهدینان، بەرمایكێن وەختێ دروڤ یان سیفەت ل پێش ناڤان دهات مایتە، لێ بەرەڤ نەمانێیە، وەكو: پیرەمێر بۆ مێرێ پیر، پیرەژن بۆ ژنا پیر، سۆرگول بۆ گولا سۆر، زەرگول بۆ گەنمێ گولی زەر، ...هتد. لێ هندەك پەیڤێن كەڤن هەنە بەرەڤاژن، ئانكو دروڤ ل پاشە وەكو دۆتمام، پسمام، پسئاغا، ژنمەلا، ...هتد. ئەڤێ رەنگە ئالۆزی و شەپرزەییەك پەیداكریە چونكی وەكو دەستوور، هەكەر سیفەت ل پەی ناڤی هات، دگەل ناڤی دبتە سیفەتێ خودان یان جهێ ناڤی. بۆ نموونە، وەختێ بێژین: سۆرگول و گولسۆر. سۆرگول گولا سۆرە، لێ گولسۆر ئەو جهە یێ گولێن سۆر لێ هەبن یان ئەو كەسە یێ گولا سۆر هەیە. ئانكو كەچەل حەسەن و حەسەن كەچەل هەردو ئێك نینن. كەچەل حەسەن حەسەنێ كەچەلێ و حەسن كەچەل ئەو مالە یان گەلە یێ حەسەنێ وی ئان وان كەچەل بت.
ئارێشە ئەوە ئەڤ ئارێشەیە ب تیۆریێ و رۆهنكرنێ چارەنابت، ل ئەڤی واری ئالۆزیەكا قۆناغا وەرگوهاستنێ دهێتەدیتن و نەدوورە ئێك ژ گرفتاریێن زمانی بت.
ل بەهدینان پاشگرێ /-ك/ گەلەك دهێتەدیتن و هندەك جاران رۆلێن ئەنتیكە دگێرت، بۆ نموونە:
ژن و مێر (الزوجە والزوج) ب زێدەكرنا ئەڤێ كێێ دبنە: ژنك و مێرك (المرأە والرجل). هەر وەسا رۆلێ لێكدانێ یان پێكڤە بەستنێ ژی دگێرت؛ سەرۆپێك، نێرامێك، بەرپێك، بەردەستك، ...هتد.
ل بەهدینان رەنگە وەرگوهاستنا دەنگێ /ە/ ل هندەك جهان دهێتە دیتن، وەكە: هەژێر، هەڤیر و هێڤێن دبنە هێژێر، هێڤیر و هێڤێن. هەروەسا وەج و كەچ دبنە وج و كچ.
تشتەكێ ئەنتیكە و جهێ پرسیارێ، ل بەهدینان دبێژن ئێك ئو ل دۆرماندۆری وێ یەك دهێتە گۆتن و ئەڤە بەس ل هندستانێ دهێتە بهیستن! چاوا چێبوویە؟ ب دیتنا من، ئەڤە بەرماییكەكا میتانیانە كو بەری ۳۳۰۰ سالان، ل ئەڤێ دەڤەرێ دەستهەلاتداربوون.

## رێزمان

ژ هەمی زار و ژێرزار و دەڤۆكێن كوردی، ل وارێ سینتاكسێ، بەهدینی ژ هەمیان زەنگینترە. هەم فۆرمێن كەڤن پاراستینە، هەم ژێكجوداكرن بۆ باشتر تێكگەهشتنێ پاراستینە. بۆ نموونە سادەترین رستەیەكا وەكی (ئەز دچم) نفشێ ئەز دیار دكەن و دبێژن: ئەز یێ/ یا دچم). ئەڤ دیاركرنا نفشی ل دەڤەرا زاخۆ بەرەڤ نەمانێیە لێ ساخلەتەكا دەڤۆكا بەهدینانە.

* **ئەز یێ گەنجم.**
* **تو یا گەنجی.**
* **ئەز و تو د گەنجین.**

ئەز /د/ بەرماییكا (یێد)ە كو نهو وەكو (یێت) ل كارە. هەروەسا نیشانا نفشی و هەژمارێ ل پاش ناڤان ژی دهێتەدیتن كو د كرمانجیدا بەرەڤ نەمانێیە. بۆ نموونە:

**بابێ زیرەكی/ێ، یان دایكا جوانی/ێ.**

ل جهێن دی دبنە بابێ زیرەك و دایكا جوان. و ئەڤە رەنگە تێكنەگەهشتنەكا ل ناڤبەرا دو رەوشان پەیدا دكەت، كانێ زیرەك و جوان زاڕۆكن یان دروڤێن باب و دایكێنە. ل بەهدینان ئەو ئارێشە نینە.
ل بەهدینان نیشانا پاشبەند بۆ كەسێ سێیەم دگەل كاران ب سێ ئەلۆمۆفان هەیە: -ت، -یت، -یتن. وەكو: ئەو دچت، ئەو دچیت، ئەو دچیتن. ئەڤە بەهدینیێ پتر نێزیكی سۆرانی دكەت ژ بۆتانی كو هەمان پاشبەندێ ناڤان و دروڤان بكاردهێت:

**- ئەز گەنجم. - تو گەنجی. - ئەو گەنجە.**
**- ئەز دگەڕم. - تو دگەڕی. - ئەو دگەڕت/ دگەڕیت/ دگەڕیتن.**
**(دگەڕە- بۆتانی).**

بەهدینیێ دۆخەكێ دەمێ زێدەتر ژ هەمی زار و

دەڤۆكێن دی هەیە ئەو ژی دەمێ نهۆیێ ئێكسەر:
ئەز یێ دنڤیسم، تو یا دفڕی، ئەو یێ دنڤن. ئەڤە جودایە ژ:
ئەز دنڤیسم، تو دفڕی، ئەو دنڤن. كو رەنگە نهۆیەكێ بەردەوامە و جودایە ژ:
من دنڤیسی، تو دفڕیی، ئەو دنڤستن. كو بەردەوامێ دەمێ بۆرینە.
بنێرە ئەڤان رستەیان:

**١-ئەز كەڤتم**
**٢- ئەز داكەڤتم**
**٣- ئەز دكەڤتم**
**٤- ئەز كەڤتبووم**
**٥- ئەز كەڤتبامە**
**٦- ئەز كەڤتیمە**
**٧- ئەز یێ/ یا دكەڤم**
**٨- بكەڤە**
**٩- ئەز دێ كەڤم**
**١٠- ئەز بكەڤم**
**١١- ئەز دكەڤم**

نومرە هەفت ل ئەڤان رستەیان، تایبەتمەندییەكا دەڤۆكا بەهدینانە و دەگمەن ل جهەكێ دی بهێتەبهیستن.
شوونك و دەپ و ئێك ل بەهدینان، تنێ دەڤۆكەكا هەڤچاخ و نوویا كوردی ناهێتە بهیستن، بەهدینیێ ب دەهان پەیڤێن مێژووهەلگر و مێژووپارێز هەنە، هەم دەڤەرێ ب دیرۆكێڤە گرێ ددەن، هەم هندەك، هەم هندەك دەستپێكێن زمانی دیاردكەن .. من شوونك (بەرێ دانی پێ دقوتن- كو گرێدایی خوارنێیە) و دەپ (تەپك- كو ئێكەمین پەڕێ نڤیسی بوو) و ئێك (دەستپێكا هەژمارتنێ و فەهمكرنا كۆمكرنێ) كرنە سەرناڤێن دوماهییا ئەڤێ گۆتارێ، دا كو ژ ئیرۆ ڤەگەڕینە بەرپەرێن دەستپێكا شەهرنشینیێ و وەرارا مرۆڤی و سیستەمێن ژیارێ، و دیاربكەین كو بەهدینان ئەو دەستپێك پاراستینە.

پەیڤا شوونك، بۆ ئەوێ نەزانت، پەیڤەكا خوەڕوو سۆمەری- كوردیە. شوونك ژ شوو (دەست) و نە (بەر، كەڤر) و — ەك (-ك) پێكهاتییە، هەچوەكو بێژین دەسبەرك و ئەڤە دستاڕی دئینتە بیرا مرۆڤی كو ژ دەست و هار (هێر- هێران) پێكهاتییە و پەیڤا هار ژی د زمانێ سۆمەری دا ب هەمان مانایێە.
پەیڤا دەپ، كو نهۆ بۆ دارێ تراشی و پانكری بكاردهێت، هەڤبەندی تەپك و تەپ و تیپە، و هەمی پێكڤە دگەهنە پەیڤا سۆمەری دوب/ دەپ/ توپو.. كو دگۆتنە تەپكێن ئاخێ ئەوێن بۆ نڤیسینێ بكاردهاتن. پاشی دبستان و ئەدەب و دەبیر ژێ هاتینە دارێشتن. گرنكییا ئەڤێ پەیڤێ د ئەوێدایە، زمانێ كوردی ب دەستپێكێن شەهرستانی و شەهرەواریڤە گرێ ددەت.. كوردی رەگێ ئێكەمین ئالاڤێ نڤیسینێ پاراستییە.
بۆ پتر رۆهنكرنێ، ئەرەبان (كتب، طبع) ژهەمان ڕەگی هەنە. (طبع) هندەك مانا دەستپێكی پاراستییە، وەختێ بۆ لێدانێ بكاردهێت (طبع قبلة على خدها- ماچەك ل روویێ وێ دا)، لێ (كتب) گرێدایی قۆناغا دییە، قۆناغا وەرگوهاستنا مانا تەپێ و تەپكێ ژ جهێ خوەیێ سرۆشتی بۆ نڤیسینێ. ئانكو پەیڤا (كتب) و ڤەڕێژێن وێ وەرگرتینە.
ل بەهدینان، پەیڤا ئێك ل شوونا یەك دهێتە گۆتن، ئەڤە ژی تێكرەسانەكێ دگەل زارێ سۆرانیێ چێ دكەت كو یەك دبێژن، و بۆ دیاركرنا كەسێ نەنیاس، دبێژن؛ پیاوێك هات، ئافرەتێك دەربازبوو. بەهدینان بەرەڤاژ بكاردئینت؛ دبێژن ئێك و بۆ تەكێ نەنیاس دبێژن زەلامەك هات، ژنەك دەربازبوو.
هەلبەت مەرەما من ئەڤەنینە .. من ب بەرچاڤكرنا پەیڤا ئێك مەرەمەكا دوورتر ل جهی و ل زەمانی هەیە. بەری ٣٥٠٠ سالان، گەلەكێ ناڤدار ل ئەڤێ دەڤەرێ دژییا، دگۆتنێ میتانی. ئەڤان ئیمپراتۆریەكا هندی كوردستانا ئیرۆ و پتر دامەزراندبوو. ئەوان ژی وەكو هندستانی و بەهدینیان دگۆت؛ ئێك.
ژ ئەڤان پەیڤان و یێن دی، ئەم دشێین باسێ مێژووا بەهدینیێ بكەین. لێ مخابنی، ژ بەلا نڤیسینێ یان

نەمانا دۆکیۆمەنتان، ئەم نەشێین زنجیرەکا مێژوویی بۆ ئەڤێ دەڤۆکێ داریژین، نەخاسمە زمان پتر ب ریزمانێ نە ب پەیڤان دهێنە جوداکرن و ناسین. لەو، تاکو زنجیرەکا دۆکیۆمەنتێن نڤیسای نەهێنەدیتن، ئەم نەشێین مێژوویەکا جودا ژ زار و زمانێ کوردی بۆ بەهدینیێ بنڤیسین.

## ژێدر و پەراوێز

- بەهدینی و بەهدینانی و بادینی و بادینانی، هەمی بۆ ئەو کوردیا ل ئەڤێ دەڤەرێ دهێتە بهیستن، دهێتە گۆتن. کانێ کیشک کەڤنترە و دروستترە بتە ستاندەرد، پتر بابەتێ پێکهاتییە ژ راستێن زمانکی و مێژوویی. وەکە ئاشکرا، فۆرمێ (-ە ە-) ل گەلەك زار و دەڤۆکێن کوردی بوویە دەنگێ /أ/ و هندەك جاران، بەرەڤاژ ژی روودایە، نەخاسمە ل باکوورێ کوردستانێ. بۆ نموونە:

بەهر- بار. کەهر- کار. مەهر- مار. خوەهر- خوار.

لێ بەلگەیێن فۆرمێ (-ە ە-) دێرینتر دکەن، هندەك پەیڤێن هەڤپشکن د زمانێن ئاریدا. کورد ب گشتی دبێژن: چاڤ، چاو، لێ فارسی دبێژن: چەشم. بەرانبەرێ کوردی، پێدڤی یە چەشڤ بت و ئەڤە بوویە چەهڤ و پاشی چاڤ ژێ مایە. بەلگە ئەوە هێشتا چەهڤ و چەعڤ ل باکوور مایە و وەرگەرانا دەنگێ /ژ/ بۆ /ش/ و پاشی بۆ /ە/ و پاشی بۆ /٠/ درێژتن و رێتن دا دهێنە دیتن: رێشتن- رێشتن، رێهتن، رێتن.

ئەڤجا، فۆرمێ بەهدینان و بەهدینی دێرینترە، لێ خەلك چاوا باخڤن، ئەو زمانە نە چی دئاخفتن.

# ئەتلەسا فۆنۆلۆجیا زمانێ كوردی پارێزگەها دهۆكێ

د. سەلوا فەریق سالح

د خشتەیێن ژێریدا هێما و ڕێنڤێسا (IPA) یا كو د ڤێ ڤەكۆلینێدا مفا ژێ هاتییە وەرگرتن، هاتینە نیشاندان:

١. كونسۆنانت:

| | ليڤى | | ليڤ ددانى | | ددانى | | پدووى | | پدوو - پەحناك | | پەحنكا نەرم | | ئەزمانك | | گەورى | | ژێری | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | | | | | | | | | | | | | | |
| پەقى | b | p | | | d | t | | | | | g | k | q | | | | | ʔ |
| خشووك | | | v | f | | | z | s | ʒ | ʃ | | | ɣ | x | ʕ | ħ | | h |
| پەقى-خشووك | | | | | | | dʒ | tʃ | | | | | | | | | | |
| دفنى | m | | | | | n | | | | | | | | | | | | |
| لازمانى | | | | | | | l | | | | ɫ | | | | | | | |
| لێدان | | | | | | | r | | | | | | | | | | | |
| هەژۆك | | | | | | | R | | | | | | | | | | | |
| شێوە بزوين | w | | | | | | | | j | | | | | | | | | |

**٢. ڤاول:**

| ڕێز | | | ə ɑ ʉ u | |
|---|---|---|---|---|
| پاشی | ناڤەراست | پێشی | o ɨ e i | |
| وو u | ɨ ʉ و | i یـ | گرتی | ڕادێ بەرزی و نزمیێ |
| ۆ o | | e یـ | نیڤگرتی | |
| | ə ــە | | نیڤڤەکری | |
| ا ɑ | | | ڤەکری | |

**٣. نیشانە:**

| هەناسەداری | ʰ |
|---|---|
| توندبوون | . |
| درێژبوون | : |

## دەرازینك:

نیشاندانا چەوانیا دابەشبوونا فۆرمێن زمانیێن دیارکری ل دەڤەرەکا جوگرافییا دیارکری ب زارناسییا جوگرافی دهێتە نیاسین. د زارناسییا جوگرافیدا جهێ جوگرافی و دووراتییا د ناڤبەرا دەڤەراندا ب فاکتەرێن گرنگ دهێنە هژمارتن. هەمەجۆرییا زمانی ل دەڤەرێن جیران کێمتر و ب دوور بوونا دەڤەرا جوگرافی ئەڤ هەمەجۆرییە پتر دبیت. زارناس هندەك فۆرمێن زمانی هەلدبژێرن و لدووڤ ئارمانجا دیارکری، جیاوازیێن فۆنیمی، سینتاکسی و لیکسیکیێن وان نیشاندەن. ئەڤ جیاوازییە لدووڤ دەڤەرا جوگرافی دهێنە دەستنیشانکرن و ل سەر هندەك نەخشان دهێنە نیشاندان. زارناس هەولددەن لدووڤ شیانێ و بەلگێن زمانی دەڤەرێن پەیدا بوونا دیاردەیەکا زمانی و چەوانیا بەلاڤبوونا وێ و سنوورێن وەکهەڤی و جیاوازیێ نیشانبدەن. کۆما ڤان نەخشێن کو باسی فۆرمێن زمانیێن دەڤەرەکا دیارکری دکەن، ب ئەتلەسا زمانی (ئەتلەسا دیالێکتی) دهێنە نیاسین.

ئەڤ ڤەکۆلینە لژێر ناڤونیشانێ (ئەتلەسا فۆنۆلۆجییا پارێزگەها دهۆکێ)، هەولددەت ئەتلەسا فۆنۆلۆجییا(٢٥) فۆرمێن زمانی بکێشیت و شرۆڤەبکەت. ڤەکۆلین لدووڤ ڕێبازا دیالێکتۆلۆجییا کلاسیك و ب ڕێکا نەخشەیێن نیشاندانی (پێنگاڤا ئێکێ ژ شێوێ دەستنیشانکرنا سنووریا وەکهەڤییێ - isogloss) هاتییە ئەنجامدان. بگۆڕێن زمانیێن ڤێ ڤەکۆلینێ بتنێ بگۆڕێن فۆنیمینە.

د ناڤبەرا زمان و دیالێکتێن دەڤەرێن جیاوازێن کوردستانێدا هندەك جیاوازی هەنە. ئەم دشێین ڤان جیاوازییان ژ دوو ئالییێن جوگرافی و جڤاکیڤە نیشانبدەین. ئاخڤتنا خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ چ ژ لایێ فۆنیمیڤە و چ ژ لایێ لیکسیکیڤە هندەك جیاوازی د ناڤبەرا واندا هەنە. ئەگەر ب هووری گوهێ خۆ بدەینە ئاخڤتنا خەلکی ل دەڤەرێن جیاوازێن ڤێ پارێزگەهێ، دێ هەست ب ڤێ هەمەجۆری و ڕەفتارا جیاوازا زمانی کەین، کو گرێدای دابەشبوونا جوگرافییە. ب دەربڕینەکا دی هندی ئەم ژ ناڤەندا بـاژارێ دهۆکێ بـەرەڤ ئالییێ (باکوور، باشوورێ ڕۆژهـەلات و بـاشـوورێ ڕۆژئـاڤـاڤـە) بچین، ئەڤ هەمەجۆرییا زمانی پتر دیاردبیت. لەوا ئەم دشێین جیاوازی و هەمەجۆرییا ڕەفتارا زمانییا ڤێ پارێزگەهێ ب ڕێکا هۆکارێ دابەشبوونا جوگرافی نیشانبدەین.

ب پێشکەڤتنا هۆیێن پەیوەندیکرنێ و ژ ئەنجامێ تێکەلبوون و ب هەڤڕا ژیانا ڤی سەردەمی، چینێن جیاوازێن جڤاکی و ب تایبەتی تەخا گەنج ل پارێزگەها دهۆکێ هێدی هێدی مفا ژ فۆرمێن ستاندارد وەردگرن، ئەڤە ژی مەترسییە ل سەر ژبیرکرن و نەمانا شێوەزارێن ڤێ پارێزگەهێ پەیدادکەت. توومارکرن و پارازتنا فۆرمێن زمانیێن پارێزگەها دهۆکێ و نیشاندانا وان ل سەر نەخشەی دبیتە پێنگاڤەك بۆ پارازتنا ڤان شێوەزاران و هەبوونا کەرەستەیەکێ خاڤ بۆ ڤەکۆلینێن پاشەڕۆژێ. ئەم دشێین گرنگی و پێدڤیاتییا ڤەکۆلینێ د ڤان خالاندا دەستنیشانبکەین:

١. بۆ کێشانا ئەتلەسا زمانییا کوردستانێ، پێدڤییە هەمـوو دیالێکتێن کوردی بهێنە کۆمکرن.

٢. چ ڤەکۆلینەك ل سەر دەستنیشانکرنا سنوورێن

وەکهەڤییێ ل ڤێ پاریزگەهێ نەهاتینە ئەنجامدان، ب ڤەکۆلین ل دیالێکتێن کوردی دشێین سنوورێن وەکهەڤییێ و نەوەکهەڤییێ د ناڤبەرا دیالێکتێن کوردیدا نیشانبدەین.

٣. کەرەستێن خاڤێن دیالێکتێن زمانێ کوردی دبنە ژێدەرەکێ گرنگ بۆ ڤەکۆلینێن زمانی، جڤاکناسی، گەلناسی و دیرۆکی و ...هتد.

٤. بۆ ئەنجامدانا ڤەکۆلینێن هوور و زانستی ل سەر زمانێ کوردی پێدڤییە هەمی دیالێکتێن زمانێ کوردی بهێنە توومارکرن.

٥. دابەشبوونا جوگرافییا فۆرمێن زمانی ل پاریزگەها دهۆکێ، دێ زانیاریێن تەواو ل سەر جیاوازییا زمانی ل ڤێ دەڤەرێ دەت.

٦. بگۆڕێن زمانی ژ ئالییێ دەنگیڤە ل پاریزگەها دهۆکێ دهێنە نیشاندان.

## پێنگاڤێن ئەنجامدانا ڤێ ڤەکۆلینێ:

أ. **ڤۆناغا بەرهەڤکرنا پرسیارنامێ**، پشتی دەستنیشانکرنا بگۆڕێن زمانی، پرسیارنامەك هاتە بەرهەڤکرن، کو هەموو بگۆڕێن فۆنیمی بوون. پاشی پرسیارنامە پێشکێشی لیژنا زانستییا پشکا زمانێ کوردی هاتەکرن، داکو هەلسەنگاندن بۆ پرسیارنامێ بهێتەکرن، لیژنا زانستی ژی پرسیارنامە بۆ چەند بسپۆران هنارت. ڤەکۆلەری سەرجەم تێبینی و ڕێنماییێن هەلسەنگێنەران بجهـهینان. پاشی ئەو پرسیارنامە ب شێوەیەکێ بالکێش هاتییە دیزاینکرن و ب چاپەکا ڕەنگی هاتییە بەرهەڤکرن، داکو بشێت پتر خزمەتا ئارمانجا ڤەکۆلینێ بکەت و سەرنجا ئاخڤتنکەران ڕابکێشیت.

ب. **بەرسڤدانا پرسیارنامێ**، ل دەستپێکێ پرۆسا کاری و ئارمانجا کاری ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە بۆ ئاخڤتنکەران و ئامادەبوویان دهاتە شرۆڤەکرن. ڤەکۆلەرێ بۆ هەر دەڤەرەکێ ڕێنیشاندەرەکێ خۆجهێ وێ دەڤەرێ لگەل خۆ دبر، داکو بشێت ب دەڤوك و شێوە گوڤەرا وان بخۆ پرسیاران ژ وان بکەت و نەکەڤنە ژێر کاریگەرییا دەڤۆکا ڤەکۆلەری. داخواز ژ ئاخڤتنکەران دهاتەکرن ب هەمان شێوێ کو لگەل ئەندامێن خێزانا خۆ دئاخڤن باخڤن. بەرسڤێن ئاخڤتنکەران دهاتنە توومارکرن، و پاشی ل سەر پرسیارنامێ ژی ب ڕێنڤێسا (IPA) دهاتنە نڤێسین. پرسیار ژ لایێ ڤەکۆلەریڤە بۆ ئاخڤتنکەران دهاتنە خواندن و وێنە دهاتنە نیشاندان، لێ دەمێ چاڤێ ئاخڤتنکەری باش نەددیت، ڤەکۆلەر نەچار دبوو وێ فۆرمێ زمانی سالۆخ بدەت، داکو ئاخڤتنکەر وێ فۆرمێ زمانی بلێڤبکەت.

## دەستنیشانکرنا ئاخڤتنکەر و دەڤەرێن توومارکرنێ:

### •ژی، ڕەگەز و هژمارا ئاخڤتنکەران

بۆ هەر دەڤەرەکا دەستنیشانکری زانیاری و دەنگێ (٤) هەتا (٦) کەسان هاتییە توومارکرن، دوو ژن و دوو زەلام. ژییێ ئاخڤتنکەرانژی (٤٥) وسەرووی (٤٥) سالێ و ژ کەسێن نەخویندەوار بوون. هەلبژارتنا ئاخڤتنکەران ل هەر دەڤەرەکێ ژی لدووڤ عەشیرەتا زاڵ ل وێ دەڤەرێ بوویە. ئەو ژن و زەلامێن دهاتنە هەلبژارتن پێدڤی بوو خەلکێ ڕەسەنێ وێ دەڤەرێ بان و بەری هینگێ بۆ چ دەڤەرێن دی مشەخت نەببن. زێدەباری ڤێ پێدڤی بوو هەڤژینێ ئاخڤتنکەرا ژن ژی سەر ب هەمان شێوە گوڤەرا ژنێ بیت و پێچەوانە.

ئاخڤتنکەر ب شێوەیەکێ هەڕەمەکی هاتینە هەلبژارتن و پشتی ڕەزامەندییا وان دەنگێ وان هاتییە توومارکرن. هندەك جارن پشتی ب دوماهیك هاتنا توومارکرنێ بۆ ڤەکۆلەری دیار بوویە، کو مەرجێن دیارکری لدەڤ ئاخڤتنکەری نەبووینە، لەورا پرسیارنامە و توومارا دەنگییا وی/وێ هاتییە لادان.

### •دەڤەرێن توومارکرنێ

بۆ مەبەستا هەلبژارتنا دەڤەرێن توومارکرنێ، ب پشت بەستن ب توومارکرنا دەنگی، ب باشی هاتە

زانین مفا ژ دابەشبوونا ئیداریا پارێزگەها دهۆکێ بهێتە وەرگرتن. پارێزگەها دهۆکێ ژ (٧) قەزایێن (دهۆك، سێمێل، زاخۆ، ئامێدی، ئاكرێ، بەردەرەش و شێخان)ێ پێكدهێت، هەروەسان ژ (٢٩) ناحیان پێكدهێت، نموونە ژ ڤان (٢٩) ناحیان هاتنە وەرگرتن.

## •دەمێ توومارکرنێ

توومارکرن و گوهداریکرنا ئاخفتنا ئازاد ل دەڤەر و خێزانێن جیاواز، بۆ بهار و دەستپێکا هاڤینا سالا (٢٠١٣)ێ دزڤریت. بەرهەڤکرن، دیزاینکرن و چاپکرنا پرسیارنامێ ل دوماهیا هاڤینێ و چاڤپێکەڤتن و توومارکرنا دەنگێن ئاخفتنکەرێن هەر دەڤەرەکێ ل پاییز و دەستپێکا زڤستانا (٢٠١٣)ێ هاتییە ئەنجامدان. قۆناغا گوهداریکرن و نڤێسین ب رێنڤیسا (IPA) ل بهارا (٢٠١٤)ێ بوویە.

## هەرێما کوردستانێ - ئێراق

هەرێما کوردستانێ ژ پارێزگەها دهۆکێ، سنوورێ ئەوێ یێ کارگێڕییا نها و سنوورێ کارگێڕییا بەرێ سالا (١٩٦٨)ێ، و پارێزگەهێن (کەرکوك، سلێمانی، هەولێر، هەڵەبجە) و دەڤەردارێن ئاکرێ، شێخان، شەنگار، تەلەعفەر، تلکێف، قەرەقوش و ناوچەیێن

نەخشێ ژمارە (١) هەرێما کوردستانێ



زۆمــار، باشیكێ، ئاسكی كەلەك ل پارێزگەها نەینەوا و هەر دوو دەڤەردارێن خانەقین و مەندەلی ل پارێزگەها دیالە و دەڤەردارییا بەدرە و ناوچەیا جەسسان ل پارێزگەها واست، ب سنوورێ كارگێرییا سالا (١٩٦٨)ێ، پێكدهێت. (پـرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان - عێراق: ٢٠٠٦/٨/٢٢)

## نێرینەكا گشتی بۆ پارێزگەها دهۆكێ:

پارێزگەها دهۆكێ ب ئێك ژ پارێزگەهێن هەرێما كوردستانێ (باشوورێ كوردستانێ) دهێتە هژمارتن، ئەڤ پارێزگەهە خودان دیرۆك، شوینوار و كەلێن دیرۆكییە. لـدووڤ بەلگە و شوینوارێن كەتینە دەست شارەزایان، دیار دبیت كو ب درێژاهییا چەرخێن دیرۆكی، ئەڤ دەڤەرە یا ئاڤەدان بوویە و جهێ ژیان و شارستانیەتێ بوویە.

هەبوونا شوینواران ل هەر دەڤەرەكێ بەلگەیە ل سەر هەبوونا شارستانی و كەڤناریا وێ، ل دهۆكێ ژی هژمارەكا زۆرا شوینواران هەنە. گرنگترین شوینوارێن دهۆكێ بریتینە ژ (شكەفتا چارستین) ل ئالییێ راستێ یێ گەلییێ دهۆكێ، (گری مالتایێ) ل گوندێ مالتایێ و (شكەفتا هەلامەتا) ل باشوورێ شندۆخا و...هتد. دیرۆكا شوینوارێن دەڤەرا دهۆكێ بۆ سەردەمێن دیرۆكییێن جودا جودا دزڤرن، بتایبەتی بۆ سەردەمێ ئەكەدی، بابلی، ئاشوری، میدی، ئەخمینی، ئەغریقی، ساسانی و ڤەكرنێن ئیسلامی ل چەرخێ ئێكێ كوچی دزڤرن. (موسی مستەفا هسنیانی: ٢٠٠٦: ٩٠)

سەبارەت ب ناڤێ دهۆكێ نڤێسەر و دیرۆكنڤێسان بۆچوونێن جیاواز هەنە، دەمەلوجی دبێژیت دهۆك ب رێنڤێسا كوردی دهێتە نڤێسین لێ ئەڤ پەیڤە نەیا كوردیە، بەلكو ئاشورییە. (كاوە فریق احمد: ٢٠٠٠: ٢٧) دشێین بێژین( بۆ ئێكەمین جار د ژێدەرێن دیرۆكیدا ناڤێ (دهـۆك)ێ د پەرتووكا (دیاربكریە) یا (ابوبكر الطهرانی) هاتییە ئەوا ل سالا (١٤٧٠-١٤٧١ز) ب زمانێ فارسی هاتییەدانان. دەمێ لدور رویدانێن (١٤٤٦-١٤٤٧ز) دئاخڤیت، ئاماژەی ب ناڤێ دهۆكێ دكەت.) (زرار صدیق توفیق :٢٠٠٠: ٧١)

پشتی هەرڤتنا میرگەها بادینان، دهۆك ژی وەك پشكەك ژ میرگەهێ كەتە ژێر دەستەهەلاتداریا ئوسمانییان و سەردەمەكێ نوو ژ دیرۆكا وێ دەستپێكر، و بڤی شێوەی دیرۆكا زیندییا باژێرێ دهۆكێ ژ چەرخێ نوزدێ دەستپێكرییە و ئەڤ دەڤەرە ب سنجەقا مووسل یان ویلایەتا ئوسمانیڤە هاتییە گرێدان و گشت دەڤـەرا بادینان ب رەنگێ چەند دەڤەرداریان كەتییە ژێر كاریگەرییا راستەوخۆیا پارێزگەها مووسلێ. (موسی مستەفا هسنیانی: ٢٠٠٦: ٩٢)

هەر ژ دامەزراندنا دەولەتا ئێراقێ ل سالا (١٩٢١ز)، هزرا پارێزگەهكرنا دهۆكێ هەبوویە، ژ ئەنجامێ بزاڤ و خەباتا بەردەوام و بتایبەتی وەك داخوازەكا شۆرشێ ل سەردەمێ شۆرشا ئەیلونێ (١٩٦١)ێ پارێزگەها دهۆكێ هاتە دامەزراندن. (كۆڤارا دهۆك: ٢٠٠٥: ٢٢) ل رێكەڤتی (٢٧ێ گولانا ١٩٦٩ز)ێ بریارا ژمارە (٢١١) دەركەڤت و ل گۆرەی ڤێ بریارێ دهۆك بوو پارێزگەهـ و مەلبەندێ وێ باژێرێ (دهـۆك)ێ بوو و هەر چار دەڤەردارێن (دهۆك، زاخۆ، ئامێدی و سێمێل) سەر ب پارێزگەها دهۆكێڤە بوون. (هاشم خضیر الجنابی: ١٩٨٥: ٧)

پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ تەڤایا دەڤەرداریا (ئاكرێ) و پشكەكا مەزن ژ دەڤەرداریا (شێخان) كەڤتنە ژێر دەستهەلاتداریا حكومەتا هەرێما كوردستانێ، و وەك دوو دەڤەردارێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێڤە سەرەدەری لگەل هاتنەكرن. ل رۆژا (١٢-١٠-٢٠٠٦)ێ ب بریارەكا پەرلەمانێ كوردستانێ دەڤەردارییا بەردەرەش ژی هاتەدامەزراندن. بڤی رەنگی پارێزگەها دهۆكێ نهو ژ حەفت دەڤەردارێن (دهۆك، ئامێدی، زاخۆ، سێمێل، ئاكرێ، شێخان و بەردەرەش) پێكدهێت.

## جوگرافییا پارێزگەها دهۆكێ :

پارێزگەها دهۆكێ دكەڤیتە باكوورێ ئێراقێ و رۆژئاڤایا هەرێما كوردستانێ. پارێزگەها دهۆكێ دهێتە هژمارتن ئێك ژ پارێزگەهێن سنووری و ستراتیژی، كو دكەڤیتە د ناڤبەرا سێ پارچێن كوردستانێدا ل ناڤ وەلاتێن (عێراق، سوریا و تركیا). پارێزگەها دهۆكێ (ژ لایێ باكوورێڤە لگەل تركیا ب درێژاهییا (٢٢٩,١كم)،

و ژ لایێ باكوورێ رۆژئاڤاڤە لگەل سووریایێ ب درێژاهیا (٥,٥كم)، و ژ لایێ باشوورێ رۆژهەلاتڤە لگەل پارێزگەها هەولێرێ ب درێژاهیا(٢٣٩,٧كم)، ژ لایێ باشوور و باشوورێ رۆژئاڤاڤە لگەل پارێزگەها مووسل ب درێژاهییا (٢٣٣,٨٨كم) هەڤسنوورە.( هاشم خضیر الجنابي: ١٩٨٥: ٨)

شێوێ گشتیێ پارێزگەها دهۆكێ وەك لاكێشەیەكا نەرێكخستییە، هێلا درێژیێ(٤٣-) پلەیا رۆژهەلات، دهۆكێ ب نیڤی بكەت و ئەڤ هێلە د ناڤەندا باژێرێ دهۆكێرا دبووریت، هەروەسا دكەڤیتە د ناڤبەرا بازنەیێ درێژ یێ هێلا (٣٦,٤٠) و (٣٧,٢٠) پلەیان ژ باكووریڤە، ئانكو دكەڤیتە باكوورێ هێلا راست. (لجنە التالیف: ١٩٨٦: ١١)

دهۆك وەكو باژێر دكەڤیتە د ناڤبەرا دوو چیایێن بلند و نهالەكا كووردا، ژ ئالیێ باكووریڤە چیایێ سپی (كێلیا شەدایێ و كێلیا فرعینی)نە، ژ ئالیێ باشووریڤە چیایێ رەش (چیایێ زاوا) - هندەك دبێژن چیایێ شندوخا و دەهكان - و ژ لایێ رۆژئاڤایڤە دەشتا دووبانێ - دەشتا سلێڤانە- هەتا دگەهیتە رووبارێ دجلە. رووبەرێ گشتی یێ پارێزگەهێ (٣,٩٠٢,٢١٨) دونەمە و هژمارا ئاكنجیێن وێ لدووڤ رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ ل سالا (٢٠١٣)ێ، (١٤١٨٩٣٣) كەسن. (موسەدەق توڤی :٢٠١٠: ٦٨ و ١٦٢ )

## دیالێكتولۆجی (زارناسی)

دیالێكتولۆجی لقەكە ژ زمانڤانییێ كو د دیرۆكا خۆدا توشی گەلەك گوهۆڕین و وەرچەرخانان بوویە. ئارمانجا دیالێكتولوجیێ كۆمكرن و وەسفكرنەكا زانستییانەیە بۆ دیالێكتان، دا كو بشێن ب شێوەیەكێ زانستی ئەوان تووماربكەین و نەهێلین ژناڤبچن (دیالێكتولۆجی: لقەكە ژ لقێن زمانڤانیێ، كو ڤەكۆلینێ ل زمانەكێ دیاركری دكەت ژ لایێ شرۆڤەكرن و وەسفكرنا هەمەجوریا ناوچەیی یان جڤاكی یان رۆژگاریڤە، دیاردكەت كا چەوا ئەڤ هەمەجۆرییە د دركاندن یان رێزمان (پەیڤسازی یان سینتاكس)دا یان د فەرهەنگێدا پەیدادبن، هەروەسا دیار دكەت كا چەوا ئەڤ هەمەجۆریا جوگرافی پەیدادبیت.) (عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدولا و شێرزاد سەبری : ٢٠١١ : ١٠٤)

ئەڤرۆكە كۆمكرن و توومارکرنا دیالێكتان گرنگییەكا تایبەت پەیداكریە، (چونكی لگەل هاتنا تەكنۆلۆژییێ و پەیدابوونا تەلەڤزیون، رادیۆ و ئەنترنێت و...هتد و د ئەنجامدا خویندەواری و هشیاربوونا خەلكێ ناوچە و گوندان و زێدەبوونا پەیوەندیان، هێدی هێدی زمانێ فەرمی جهێ گەلەك ژ دیالێكت و ئەكسێنتێن ناوچەیی دگریت، ئەڤ بارۆدوخە بۆ ئەگەر كو زمانڤان پتر ژ هەرجار خوازیارێ دیالێكتولۆژی و كۆمكرنا دیالێكتێن ناوچەیی د زویترین دەمدا بن.) (زینت مرتضوي : ١٣٨٧ :١٨) ب ئەڤی شێوەی دشێین بێژین دیالێكت گەنجینەیێن پڕ بهانە بۆ ئەنجامدانا ڤەكۆلینان ل سەر زمان و كەلتوور و پیشینەیا دیرۆكا گەل و نەتەوەیان. زێدەباری هندێ ژ بەركو زمان و كەلتوور دوو رەگەزێن سەرەكی و گرنگن بۆ نیشادانا ناسنامەیا هەر جڤاكەكی د درێژاهییا دیرۆكێدا. دیسا ڤەكۆلینێن دیالێكتولوژی ژبلی زمانڤانیێ دشێن د بیاڤێن جڤاكناسی، شینوارناسی ژێدا بكاربهێن. (حامد مولایی : ١٣٩٠ :٤٢)

زمان و دیالێكت، ژ رەگەزێن سەركیێن هەر كەلتوورەكی دهێنە هژمارتن و پێدڤییە ب هەر شێوەیەكی بیت بهێنەپارازتن، چونكی سەروەت و سامانێن مرۆڤایەتیێنە. دیالێكتولۆجی وەكی زانستەك دشێت دیالێكتان ب شێوەیەكێ زانستی كۆمبكەت و پشتی وەسفكرن و توومارکرنا دیالێكتان، وان ژناڤچوونێ بپارێزیت. ب ڤی شێوەی دیالێكت ب شێوەیەكێ زانستی دهێنە توومارکرن و ژناڤچوونێ دهێنە پارازتن. (د ڤان سالێن داوییدا بابەتێ پارازتنا زمان و دیالێكتان، بوویە پشكەك ژ پارازتنا كەلتوورێ بۆماوەییا مرۆڤی، و ژ لایێ زمانڤان و رێكخراوا یونسكۆڤە ب بابەتەكێ زۆر گرنگ دهێتە هژمارتن. دەرئەنجامێ گرنگێ ڤی بابەتی، بجهینانا پرۆژەیا بەرفرەهـ یا نیڤدەولەتییە،

ب ناڤێ (پەرتووکا سوور)، د ڤی پرۆژەیدا پێدڤییە ناڤەند و بەنکێن زانیاریێن پەیوەندیدار، وان زمانێن کو نها بەرەڤ ژناڤچوونێ دچن بنیاسن و داتایێن ئەنترۆپۆلۆجییێن-Anthropology ئاخفتنکەرێن وان زمانان و تێبینییێن ڕامیاری، ئاکنجیبوون، جڤاکناسی و زمانییێن وان وەربگرن و زانیاریێن پێدڤی و تەنانەت سالوخدانەکا ڕێکوپێك بۆ زمان و دیالێکتێن کو ل سەرانسەری دونیایێ هەنە کۆمبکەن و بپارێزن.) (علی اکبر شیری : ١٣٨٦ :٤٠)

## دیالێکتولۆجییا جوگرافی:

کەڤنترین تایێ دیالێکتولۆجییێ، ئەو ڤەکۆلینن، کو ئەڤرۆکە ب دیالێکتولۆجییا جوگرافی دهێنە نیاسین، واتە ئەو ڤەکۆلینن یێن ل سەر بەلاڤبوونا فۆرمێن زمانی ل دەڤەرەکا جۆگرافییا دیارکری، هاتینە ئەنجامدان. بارودۆخێ جوگرافی و مەودا جهی ژ سەرەکیترین هۆکارێن نەزمانینە، کو دبنە ئەگەرێ دروستبوونا دیالێکتێن جیاواز. ئەگەر ئەم ژ دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دیا جوگرافی بچین، بێ گومان دێ هندەك جیاوازێن دەربڕینێ، لێکسیکی یان ڕێزمانی د ئاخڤتنا خەلکێ وان دەڤەراندا بینین. ب دەربڕینەکا دی، ئاخڤتنکەرێن ڕەسەنێن زمانەکێ دیارکری، لدووڤ وێ دەڤەرا جۆگرافییا، تێدا پەیدا بووینە و دژین، تایبەتمەندیێن زمانیێن جیاواز هەنە. چونکی (هۆکارێن جوگرافی د گوهۆڕینێن زمانیدا ڕۆل هەیە، ب ڤی ڕەنگی خالەکا هەڤپشك د ناڤبەرا زمانڤانی و جۆگرافیاییێدا پەیدا دبیت، کو ب دیالێکتولۆجییا جوگرافی دهێتە نیاسین.) (اسماعیل عباسی:١٣٨٦: ٢٤)

هەر زمانەکی شێوە و فۆرمێن جۆراوجۆر هەنە و جۆگرافییا ب ئێك ژ هۆکارێن ڤێ جۆراجۆریێ دهێتە هژمارتن. بکارهینانا زمانەکێ دیارکری ل دەڤەرێن جیاواز، دبیتە ئەگەرێ پەیدا بوونا فۆرمێن جۆراوجۆر، هەروەسا گوهۆڕینیێن بەردەوامێن زمانی ژی ب درێژاهییا دەمی فۆرمێن جۆراوجۆر پەیدا دکەن. ب ڤی ڕەنگی دیالێکتێن جیاوازێن زمانەکی دابەشی دیالێکتێن جوگرافی، دیالێکتێن ناوچەیی، دیالێکتێن دیرۆکی، دیالێکتێن جڤاکی، دیالێکتا پیڤەر (دیالێکتا ئستاندارد) دبیت. (علی اکبر شیری: ١٣٨٦: ١٠٣)

جۆراوجۆرییێن زمانییێن جوگرافی ژ بەر هۆکارێن جیاواز ڕوی ددەن. دەمێ زمانەك ل دەڤەرەکا گەلەك بەرفرەه بهێتەبکارهینان، ب بوورینا دەمی دێ توشی گوهۆڕینان بیت، لێ ئەو گوهوڕینێن زمانی کو ل دەڤەرەکا جوگرافی ڕوی ددەن دێ ژ گوهۆڕینێن زمانییێن دەڤەرەکا دی جیاواز بن. بۆ نموونە، ئەگەر ئاخڤتنکەرێن زمانەکی ژ بەر بارودۆخێن ڕامیاری و ئاستەنگێن سرۆشتی ژ ئێك دویر بمینین، پشتی ماوەیەکی دێ تووشی گوهۆڕینێن زمانییێن تایبەت ب خۆ بن و پشتی چەندین سالان هەر ئێك ژ وان دەڤەران دێ ب زمانەکێ جیاواز ئاخڤیت. (انتونی ارلاتو: ١٣٨٤: ٧)

گەلەك هۆکار بۆ پەیدا بوونا جۆراوجۆرییێن زمانییێن جوگرافی هاتینە دەستنیشانکرن، (نربن و هرینگا Nerbonne & Heeringa) کوچیبەریێ ب ئێك ژ هۆکارێن جۆراجۆرییا جۆگرافیایی دزانن، ب باوەرا وان کوچبەرییا ب کۆمەل ژ جهەکێ وەلاتەکی بۆ جهەکێ دی، دبیتە ئەگەرێ ڤەگوهازتنا تایبەتمەندییێن ئەکسێنتی. (نربن و هرینگا) بۆ کاریگەرییا کوچبەریێ، ئیالەتا میشیگان دکەنە نموونە، چونکی ل ئیالەتا میشیگان هژمارەکا تایبەتمەندییێن ئەکسێنتی هەنە کو پتر ل دەڤەرێن باکوورێ ڕۆژهەلاتێ وی وەلاتی هەنە و هۆکارێ وێ ژی ئەوە کو زۆربەیا خۆجهێن دەستپێکی یێن میشیگان ژ باکوورێ ڕۆژهەلات هاتینە و ل دەمێ هاتنێ ئەکسێنتا خۆمالییا خۆ ژی هینانە میشیگانێ. ئەڤ هۆکارە زۆربەیا جاران بۆ وان جیاوازیێن ئەکسێنتی کو گرێدای چینێن جڤاکییە کاریگەرییا خۆ هەیە. (حامد مولایی: ١٣٩٠: ٧٢) ب ڤی ڕەنگی دەمێ کۆمەلەکا خەلکی ژ جهەکی بەرەڤ جهەکێ دی دچن دیالێکتا خۆ ژی لگەل خۆ دبەن، و ژ بەر تێکەلبوون لگەل ئەکسێنت یان دیالێکت یان زمانەکێ دی، دێ هندەك تایبەتمەندییان ژ دەستدەن و هندەکا ژی دێ ڤەگوهێزن و ب ڤی ڕەنگی ئەڤ کوچبەرییە دبیتە

ئەگەرێ جۆراوجۆریا زمانییا جوگرافی.

پێدڤییە ئاماژێ ب وێ چەندێ بدەین، كو ئەڤرۆكە بەروڤاژی بەرێ، ژ بەر بەلاڤبوون و پەیدابوونا رێكێن پەیوەندیكرنێ و سیستەمێن خواندنێ و پەیدابوونا ئەنتەرنێت و هەبوونا میدیایێ، كاریگەریا هۆكارێن جوگرافیێن مە بەحسكرین هەتا رادەیەكێ زێدە كێم بوویە. (پیتر ترادگیل) د وێ باوەرێدایە دەمێ ل جهەكێ دەستنیشانكری تشتەكێ نوو د زمانیدا - مینا پەیڤەكا نوو، زاركرنەكا نوو بۆ بكارهینانەكا نوو - پەیدا دبیت، رەنگە هەتا وی دەمی كو چ ئاستەنگ نەكەڤنە د رێكا پەیوەندیكرنێدا بۆ هەمی دەڤەران ب تایبەتی بۆ دەڤەرێن نوو بچیت و بەلاڤ ببیت. (پیتر ترادگیل: ١٣٧٦: ٢٢٠) د بەردەوامیا بابەتیدا دبێژیت: (داهێنانێن زمانی زۆربەیا جاران ژ سەنتەرێ باژێرەكی بۆ سەنتەرەكێ دی بەلاڤ دبن و پاشی بتنێ دگەهنە گوندێن دەوروبەر. ئەڤە ژی ژ بەر دەستەلاتداریا ئابووری، جەماوەری، كەلتووریا باژێران ل سەر گوندان و ژ بەر پێكهاتا سیستەمێ پەیوەندیكرنێیە. كەواتە بەلاڤبوونا تایبەتمەندیێن زمانی ژ دەڤەرەكێ بۆ دەڤەرەكا دی بتنێ گرێدای نێزیكی و جیرانیێ نینە.) (پیتر ترادگیل: ١٣٧٦: ٢٢٢)

## شێوازێن دیالێكتولۆجییا جوگرافی

د دیالێكتولۆجییا جوگرافیدا هەول دهێتەدان بنەمایێن پراكتیكی و ئەزموونیا وان ئەنجامێن، كو پەیوەندی ب جۆراوجۆریا زمانێ دەڤەرەكا دیاركریڤە هەیە بهێنەدانان. (ئەڤ تایە ژ زمانڤانیێ ئارمانجێن هەڤپشك لگەل تایێن دیێن وێ، مینا فونۆلۆجی، سینتاكس و سیمانتیكێ هەنە، هەرچەندە دیالێكتولۆجییا جوگرافی هندەك ئالیێن دی ژی هەنە، كو گرێدای وێ بخۆنە. (J.K.chambers & PeterTrudgill:٢٤:١٩٨٠)

دیالێكتولۆجییا جوگرافی بریتییە ژ كۆمەكا فۆرمێن ناوچەییێن ئاشكەرا، كو ل ناوچەیێن جوداجودایێن دەڤەرەكا بەرفرەهـ دهێنەبكارهینان. هەروەكی هاتییە گوتن، چونكی دیالێكتولۆجییا جوگرافی، د هندەك ئالیاندا، ئارمانجەكا هەڤپشك لگەل تایێن دیێن زمانڤانیێ هەیە، هەروەسا رەنگە د هەر دەڤەرەكا جوگرافیدا گەلەك جۆراوجۆریا زمانی هەبیت، لەورا پێدڤییە ڤەكۆلەرێن دیالێكتولۆجییا جوگرافی بریارێ بدەن، كا دێ ڤەكۆلینێ ل سەر كیژ كەرەستێ زمانی كەن، پاشی داتایان كۆم بكەن. ب ڤی رەنگی ڤەكۆلەر دشێت كەرەستەیەكێ باش كۆمبكەت و باشتر كارێ خۆ ئەنجام بدەت. رەنگە ڤەكۆلەر گرنگییێ بدەتە پەیڤێن جیاواز، یان هندەك دەنگان د پەیڤێن دیاركریدا، یان فۆرمێن رێزمانی، وەكی: كار و ناڤان. پێدڤیە ئەڤ داتایە ژ گفتگۆ یان چاڤپێكەڤتن لگەل خەلكێ دەڤەرێ بهێنە وەرگرتن، ئەڤێ ژی پێدڤی ب بكارهینانا هندەك شێوەیێن هوور و تایبەتن. (Robert L. Trask: ١٧٠:١٩٩٦)

ڤەكۆلەرێن دیالێكتولۆجییا جوگرافی، لدووڤ ئارمانجا ڤەكۆلینا خۆ، دێ ب كۆمكرنا داتایان رابن، ژبەركو ڤەكۆلینێن دیالێكتولۆجییا جوگرافی ب دوو شێوەیێن وەسفی و بەراوردكرن دهێنە ئەنجامدان، لەورا پێدڤییە ئێك ژ ڤان شێوازان بهێتە هەلبژارتن. شێوێ وەسفی بەربەلاڤترین جۆرە د ڤەكۆلینێن دیالێكتولۆجییا جوگرافیدا و بۆ پێناسەكرنا دیالێكتێن وەلاتەكی یان دەڤەرەكێ دهێتە بكارهینان. د شێوێ بەراوردكرنێدا، زۆربەیا جاران دیالێكتا دەڤەرەكا تایبەت لگەل دیالێكتا پیڤەرا وی وەلاتی دهێتە بەراوردكرن و وەكهەڤی و جیاوازیێن وان دهێنە بەحسكرن. هەلبەت شێوەیەكێ دی ژی هەیە، كو پتر بۆ ڤەكۆلینێن دیالێكتولۆجییا جڤاكی دهێتە بكارهینان، ئەو ژی شێوێ ئامارییە. (علی اكبر شیری: ١٣٨٦: ١٠٩)

### ١- شێوێ وەسفی

بەربەلاڤترین شێوێ كۆمكرن و وەسفكرنا دیالێكتان، شێوێ وەسفییە. ڤەكۆلەر زانیاریێن فۆنۆلوجی، رێزمانی و واتایی لدور دیالێكتەكێ كۆمدكەت و پشتی شرۆڤەكرنێ، دێ وان زانیاریان پێناسە و وەسف كەت. بێ گومان پێناسەكرن و وەسفا هەمی ئالیێن دیالێكتەكێ، كارەكێ بەرفرەهـ

و بزەحمەتە، زۆربەیا جاران ڤەکۆلەر بۆ هندێ، داکو ڤەکۆلینەکا زانستی و باش ئەنجام بدەت، بتنێ ئێك ژ ڤان ئالیان - فۆنۆلۆجی، رێزمانی یان واتایی- وەردگریت. د ڤی جۆرێ ڤەکۆلینان‌دا، ڤەکۆلەر ئێك یان چەند کەس ژ خەلکێ خۆمالیێ دەڤەرێ، لدووڤ هندەك پیڤەران، وەکی: ب تەمەن بیت، زەلام بیت، خەلکێ رەسەنێ دەڤەرێ بیت و گوندی بیت، هەلدبژێریت، مفای ژ هندەك تەکنیکێن تایبەت وەردگریت و ب هاریکاریا ئاخڤتنکەران، تایبەتمەندیێن وێ دیالێکتێ پەیدا و وەسف دکەت. (علی اکبر شیری :١٣٨٦: ١٠٩- ١١٠) بۆ لێکۆلین و وەسفا دیالێکت و ئەکسێنتان، ژبلی هەبوونا ڤەکۆلەرەکێ زمانڤان و شارەزا، پێدڤی ب ئاخڤتنکەرەکێ خۆمالی و خەلکێ رەسەنێ وێ دەڤەرا دەستنیشانکری ژی هەیە. ڤەکۆلەر ب مفا وەرگرتن ژ رێکێن تایبەت و پشتی چاڤپێکەڤتن و دیداران، داتایان کۆمدکەت، (ب ڤێ رێکێ ڤەکۆلەر دێ (کەلواشێ زمانی کۆمکەت و پاشی دێ وەسفا وێ دیالێکتێ کەت.)(رضا زمردیان: ١٣٧٩: ١٠٩)

د شێوێ وەسفیدا سێ فاکتەرێن سەرەکی بۆ وەسفا دیالێکتان پێدڤیە، واتە: ڤەکۆلەر، بکارهێنەرێ زمانی و کەلواشێ زمانی .

## ٢- شێوێ بەراوردکاری

شێوەیەکی دی د دیالێکتولۆجیا جوگرافیدا، شێوێ بەراوردکاریە. د ڤی شێوەیدا بۆ دانەنیاسین و وەسفا دیالێکتەکێ، لگەل دیالێکتەکا دی یان لگەل دیالێکتا ستاندەرا وێ وەلاتی بەراورد دکەن و بەحسێ وەکهەڤی و جیاوازیێن د ناڤبەرا واندا دهێتەکرن،




بگۆڕێ ژمارە (٣٦)

[ʔav]

ب ڤێ رێکێ تایبەتمەندیێن دیالێکتا مەبەست پێ هەی، دهێنە دەستنیشانکرن. (پرانبیا جاران د ڤی شێوەیدا، دیالێکتەک لگەل دیالێکتا ستاندەر دهێتە بەراوردکرن و لدووڤ ئارمانجا ڤەکۆلەری ئێک ژ تایبەتمەندیێن فۆنۆلۆجی، رێزمانی و واتایی یان ژی ژ هەمی ئالییانڤە دهێتە وەسفکرن، لێ پتر ڤەکۆلین ل ئالییێ فۆنۆلۆجی دهێتەکرن و د بەراوردکرنا ئالییێ فونولۆجییا دیالێکتەکێ دا لگەل دیالێکتا ستاندەر، تایبەتمەندیێن دەنگی و فونۆلۆجییێن دیالێکتا مەبەست دهێنە دەستنیشانکرن. ژبۆ ئەنجامدانا ڤەکۆلینەکا ب ڤی شێوەی پێدڤییە ڤەکۆلەر ژ چەند قۆناغان دەرباز ببیت، ئەو قۆناغ بریتینە ژ: هەلبژارتنا بگۆڕێن زمانی، دەستنیشانکرنا لەرەیا (فریکۆنسی) تایبەتێن زمانی، نەخشەیێن دیالێکتا زمانی (ئەتلەسێن زمانی.) (علی اکبر شیری: ١٣٨٦: ١١٤)

### أ.هەلبژارتنا بگۆڕێن زمانی

ئێکەم قۆناغ د ڤەکۆلینێن بەراوردکاریدا، هەلبژارتنا بگۆڕێن زمانییە. مەبەست ژ بگۆڕێ زمانی، کەرەستەیەکە کو ب دوو یان چەند شێوەیان دەردکەڤیت.(د ڤێ قۆناغێدا ئێک یان چەند بگۆڕ دهێنە هەلبژارتن و پاشی ئەو بگۆڕ ل دەڤەرێن دیارکری دهێنە بەراوردکرن، ب ڤی شێوەی سنوورێ د ناڤبەرا دیالێکتاندا دێ هێتە دەستنیشانکرن.)(علی اکبر شیری: ١٣٨٦: ١١٥-١١٤)

د دیالێکتولۆجییا پێشکەڤتیدا، ل شوونا وەسفکرنا هەمی ئالییێن دیالێکتەکێ، ئێک یان چەند بگۆڕێن زمانی دهێنە هەلبژارتن و ب شێوێ ئامارێ، پەیوەندییا فۆرمێن جیاوازێن وێ بگۆڕێ لگەل هۆکارێن جڤاکی دهێنە باسکرن. ( علی اکبر شیری: ١٣٨٦: ٤٤)

بگۆڕێ ژمارە (٨٦)

[xu]



### ب. دەستنیشانکرنا لەرەیا تایبەتمەندییەکێ

قوناغەکا دی ژ ڤەکولینێن بەراودکاری، دەستنیشانکرنا لەرەیا تایبەتمەندییەکا زمانییە. بۆ ڤێ مەبەستێ تایبەتمەندییەکا دیارا وێ دیالێکتێ- بۆ نموونە شێوێ بلێڤکرنا دەنگەکی یان پەیڤەکا دیارکری و رادەیا بکارهینانا وێ دهێتەبەرچاڤکرن - ل وێ دەڤەرا، کو ئەو دیالێکت تێدا بکاردهێت، دهێتە هەلبژارتن. پشتی هژمارتن و بەراوردکرنا رێژە و چەوانییا بکارهینانا وێ تایبەتمەندیێ، سنوورێ د ناڤبەرا دیالێکتاندا دهێتە دەستنیشانکرن. (علی اکبر شیری، ١٣٨٦: ١١٥)

### ت. نەخشەیێن دیالێکتێن زمانی (ئەتلەسێن زمانی)

ڤەکولەر پشتی توومارکرنا ئاخفتنا خەلکێ دەڤەرا مەبەست پێ هەی، وان زانیارییان دێ پۆلینکەت. (پاشی وان داتایان ب ئەلفابێیا جیهانی (IPA) نڤیسیت، داکو بشێت جیاوازیێن دەنگی، لیکسیکی، رێزمانی و واتاییێن وان پەیڤێن کو بەروەخت ئامادە کریوون، دەستنیشانبکەت. پشتی توومارکرنا داتایان، نها ئەنجامێن ب دەستڤەهاتی بۆ بەلاڤکرنێ ئامادەنە. شێوازێن جیاواز بۆ بەلاڤکرنا ئەنجامان هەنە، بۆ نموونە ئەنجامێن داتایان ب شێوێ لیستە دهێنە بەلاڤکرن، لێ دیالێکتناس جۆرەکێ دی ب باشتر دزانن، کو ب زەحمەت و گرانترە، لێ ئەنجامان ب شێوەیەکێ ئاشکراتر بەرچاڤدکەت، ئەو ژی نیشاندانا وان ئەنجامانە ل سەر نەخشەیێن دیالێکتان.) (Robert L.Trask، ١٩٩٦:١٧١)

هەر ئەتلەسەکا زمانی، ژ چەندین نەخشەیێن جوداجودا پێکدهێت و جۆراوجۆرییا خۆمالیا زمانەکی نیشاندەدەت، (ئەتلەسا زمانی کو ب ئەتلەسا دیالێکتی ژی دهێتە بناڤکرن، کۆمەکا نەخشەیێن زمانییە، کو بەلاڤبوونا دیاردەکا زمانی ل دەڤەرەکا دیارکری نیشاددەت، ئەڤ نیشاندانە دێ ل سەر نەخشەیان و ب هاریکارییا هندەک هێمایان، وەکی: سێگوشە، ستێر، بازنە، خالّ و ...هتد بیت. ب ڤی رەنگی هەر نەخشەیەک جهێ بکارهینانا تایبەتمەندییەکا دەنگی، لیکسیکی، رێزمانی یان واتاییا بگۆرەکی- ژ لایێ بکارهێنەرێن خۆمالیڤە - نیشاددەت.) (حسنعلی کدخدا، ١٣٨٨:٦٢) ب ڤی شێوەی ئەنجامێن بەردەست ل سەر نەخشێن جوگرافی دهێنەدارژتن و دبنە نەخشەیێن دیالێکتان. (نەخشێن زمانی کو ب رێکا ڤەکولینێن دیالێکتولۆجی بدەستڤە دهێن، بتنێ بۆ نیشاندانا زانیاریان نینن، بەلکو دەربرینێ ژ وان گوهۆرینان دکەن یێن د زمانەکی یان دیالێکتەکێدا روویداینە.) (اسماعیل عباسی، ١٣٨٦: ٣٠)

## ٣- شێوێ ئاماری

د ڤی جۆرێ ڤەکولینێدا، ڤەکولەر ئێك یان چەند بگۆرێن زمانی هەلدبژێریت و رێژە و فریکۆنسیا بکارهینانا وی بگۆری یان بگۆران لژێر فاکتەرێن جیاواز، مینا چینا جڤاکی، تەمەن، رەگەز، خویندەواری و ... هتد دەستنیشان دکەت؛ و هەول ددەت کو وان زانیاریان ب رێکا خشتە و سەهمان نیشان بدەت. (علی اکبر شیری : ١٣٨٦: ١٢٠

بۆ شرۆڤەکرنا دیاردێن دەنگیێن بگۆران، ناڤەندا پارێزگەها دهۆکێ وەك پیڤەر هاتییە وەرگرتن، چونکی ئەگەر لدووڤ بناغێ رەسەنێ پەیڤێ بگەرهین ڤەکولین بەرەڤ ئێتیمۆلۆجی دچیت و گەلەك جاران ڤەدیتنا فۆرمێ رەسەن، کارەکێ ب ساناهی نینە و ئەڤە ژی دا ڤەکولینێ توشی نارێکیێ کەت، لەورا بۆ خو دەربازکرن ژ ڤێ ئاریشێ بگۆر لدووڤ چەوانییا بلێڤکرنێ ل بازێرێ دهۆکێ هاتنە شرۆڤەکرن.

# دیاردێن دەنگی (یاساییێن فۆنۆلۆجی)

زنجیرا دەنگی د هەر زمانەکیدا دکەڤیتە ژێر کاریگەرییا دەنگێن دەوروبەرێ خوە، دبنە ئەگەرێ رووداناا کۆمەکا گوهۆرین و کاریگەریان، ئەڤ گوهۆرینە ب گەلەك شێوان، وەکی (دیاردێن دەنگی، یاسایێن فۆنۆلۆجی، یاسایێن فۆنیمی و...هتد) هاتینە بناڤکرن. (یەکێن دەنگی گەلەك جاران پشتی کو ب

شێوێ برگە دەردکەڤن و ژ ئەنجامێ هاتنا وان لگەل برگەیێن دی توشی هندەك گوهۆڕینان دبن و ئەڤ گوهۆڕینە ب شێوێن جۆراوجۆر دیار دبن، دبێژنە ڤان گوهۆڕینان دیاردێن دەنگی. ) (علی محمد حق شناس: ١٣٨٣: ١٣٦) یان ژی هەر گوهۆڕینەك، كارتێكرنێ ل جۆر، جهـ و ژمارا فۆنیمێن پێكهێنەرێن برگێ بكەت، دبێژنێ یاسایێن فۆنیمی. (مهری باقری: ١٣٨٠: ١١٤)

ب شێوەیەکێ گشتی ئەگەرێ ڕوودانا ڤان دیاردان، بۆ هەبوونا یاسایێن دەنگێ بهێز و یاسایێن دووبارەکرنێ، هەروەسا بۆ هۆكارێن دەرەكی و هۆكارێ لەزاتییا ئاخڤتنێ، دزڤریتەڤە. (طالب حسین علی: ١٩٨٩: ٤٤)

## شڕۆڤەکرنا دیاردێن دەنگیێن بگۆڕان

- **بگۆڕێ ژمارە (١) [xin]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل بیست و ئێك دەڤەران نیمچە کۆنسۆنانتا [w] هاتییە زێدەکرن. ← [xwin]

٢. ل دەڤەرەکێ ڤاولا [i] بوویە [u]، پاشڤەچوونا ڤاولی ڕوودایە. ← [xun]

٣. ل حەفت دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [xin]



• **بگۆڕێ ژمارە (٢) [ranɨk̚]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل نەهـ دەڤەران ڤاول و کۆنسۆنانتا [ɨk̚] ژناڤچوویە. ← [ran]

٢. ل سێ دەڤەران زێدەکرنا کۆنسۆنانتی و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [rəhnɨk̚]

أ. کۆنسۆنانتا [h] هاتییە زێدەکرن.

ب. ڤاولا [ɑ] بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

٣. ل پێنج دەڤەران زێدەکرن و ژناڤچوونا کۆنسۆنانتی و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [rəhn]

أ. کۆنسۆنانتا [h] هاتییە زێدەکرن.

ب. ڤاولا [ɑ] بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ت. ڤاول و کۆنسۆنانتا [ɨk̚] ژناڤچوویە.

٤. ل دوو دەڤەران ژی گوهۆڕینا لیکسیکییا [het̚] هەیە.

٥. ل دەهـ دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [ranɨk̚]



• **بگۆڕێ ژمارە (٣) [ƫehni]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل هەژدە دەڤەران ژناڤچوونا کۆنسۆنانتی ڕوودایە. ← [ƫeni]

٢. ل دەڤەرەکێ ژناڤچوونا کۆنسۆنانتی و ڤاولی ڕوودایە: ← [ƫen]

أ. کۆنسۆنانتا [h] ژناڤچوویە.

ب. ڤاولا [i] ژناڤچوویە.

٣. ل دەڤەرەکێ چەندین گوهۆڕینێن ڕوودایـنە:← [ƫɨʃnə]

أ. ڤاولا [e] بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاستبوون گرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [h] بوویە [ʃ]، تووشی نەرمبوونێ بوویە.

ت. ڤاولا [i] بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

٤. ل نەه دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [ƫehni]



- **بگۆڕێ ژمارە (٤)** [hɨrmiR̊]، **د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل سێ دەڤەران ژناڤچوونا کۆنسۆنانتی و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [hərmi]

أ. ڤاولا [ɨ] بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [R̊] ژناڤچوویە.

٢. ل دەڤەرەکێ ژناڤچوونا کۆنسۆنانتی و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: [hərmo]

أ. ڤاولا [ɨ] بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. ڤاولا [i] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

ت. کۆنسۆنانتا [R̊] ژناڤچوویە.

٣. ل پێنج دەڤەران کۆنسۆنانتا [R̊] ژناڤچوویە. ← [hɨrmi]

٤. ل دەڤەرەکێ ژی گوهۆڕینا لیکسیکیا [R̊artʃɨR̊] هەیە.

٥. ل نوزدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [hɨrmiR̊]



- **بگۆڕێ ژمارە (٥) [ǩʉlɨnd]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل دەڤەرەکێ ژناڤچوون ڤاول و کۆنسۆنانتی، زێدەکرنا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ǩʉndɨǩ]

أ. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ɨ]، [l] ژناڤچوویە.

ب. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ǩ]، [ɨ] هاتینە زێدەکرن.

٢. ل پێنج دەڤەران ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی، زێدەکرنا ڤاول و کۆنسۆنانتی و پێکگوهۆڕینا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [qʉndɨǩ]

أ. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ɨ]، [l] ژناڤچوویە.

ب. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ǩ]، [ɨ] هاتینە زێدەکرن.

ت. کۆنسۆنانتا [ǩ] بوویە [q]، ب ئەزمانکیبوون ڕوودایە.

٣. ل دەڤەرەکێ ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی، زێدەکرنا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ǩʉndɨr]

أ. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ɨ]، [l] ژناڤچوویە.

ب. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [r]، [ɨ] هاتینە زێدەکرن.

٤. ل پێنج دەڤەران ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی، زێدەکرنا ڤاولی ڕوودایە: ← [ǩʉdɨ]

ا. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ɨ]، [l] ژناڤچووینە.

ب. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [i] هاتینە زێدەکرن.

٥. ل دەڤەرەکێ ژی گوهۆڕینا لیکسیکیا [badʒan] هەیە.

٦. ل شازدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [ǩʉlɨnd].



• **بگۆڕێ ژمارە (٦) [sih]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل دەهـ دەڤەران ڤاولا [i] بوویە [ɨ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە. ← [sɨh]
٢. ل پێنج دەڤەران کۆنسۆنانتا [h] ژناڤچوویە. ← [si]
٣. ل چاردە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [sih]



- **بگۆڕێ ژمارە (٧) [ƙani]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل چار دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاولی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ƙəhni]

أ. ڤاولا [a]بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [h] هاتییە زێدەکرن.

٢. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاولی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ƙəhniƙ]

أ. ڤاولا [a]بوویە [ə]، ب ناڤەڕاستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [h] و [ƙ]هاتینە زێدەکرن.

٣. ل دوو دەڤەران زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ƙaniƙ]

٤. ل پێنج دەڤەران درێژبوونا ڤاولی ڕوودایە. ← [ƙa:ni]

٥. ل هەڤدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [ƙani]

بگۆڕێ ژمارە (٧)

[ƙani]



- **بگۆڕێ ژمارە (٨) [k̥ʰʉɫav]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل یازدە دەڤەران کۆنسۆنانتا [ɫ] بوویە [l]، تووشی پدوویبوونێ بوویە. ← [k̥ʰʉlav]

٢. ل چار دەڤەران ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی و زێدەکرنا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [k̥ʰʉmɨk]

أ. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [a]، [ɫ] و [v] ژناڤچوویە.

ب. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [ɨ]، [m] و [kʰ] هاتینە زێدەکرن.

٣. ل دەڤەرەکێ ژێبرنا ڤاول و کۆنسۆنانتی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [k̥ʰʉm]

أ. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [a]، [ɫ] و [v] ژناڤچوویە.

ب. کۆنسۆنانتا [m] هاتییە زێدەکرن.

٤. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاول و کۆنسۆنانتی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [k̥ʰɨlavk]

أ. ڤاولا [ʉ] بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاست بوونا ڤاولی ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [ɫ] بوویە [l]، تووشی پدوویبوونێ بوویە.

ت. کۆنسۆنانتا [k] هاتییە زێدەکرن.

٥. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [k̥ʰɨlav]

أ. ڤاولا [ʉ] بوویە [ɨ] ب ناڤەڕاستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [ɫ] بوویە [l]، تووشی پدوویبوونێ بوویە.

٦. ل چار دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاول ڕوودایە، ڤاولا [ʉ] بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاست بوونا ڤاولی ڕوودایە: ← [k̥ʰɨɫav]

٧. ل شەش دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [kʰɨlaw]

أ. ڤاولا [ʉ] بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [ɫ] بوویە [l]، تووشی پدوویبوونێ بوویە.

ت. کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، تووشی حلیسینا دەنگی بوویە.

پ. کۆنسۆنانتا پفدار و گرانا [k̥ʰ] بوویە کۆنسۆنانتا پفدارا[kʰ]، سڤکبوون ڕوودایە.

٨. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [kʰɨɫaw]

أ. ڤاولا [ʉ] بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، تووشی حلیسینا دەنگی بوویە.

ت. کۆنسۆنانتا پفدار و گرانا [k̥ʰ] بوویە کۆنسۆنانتا پفدارا[kʰ]، سڤکبوون ڕوودایە.

٩. ل دەڤەرەکێ ژی وەکی خۆ مایە. ← [k̥ʰʉɫav]

- **بگۆڕێ ژمارە (٩) [xal]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆنانتا [l] بوویە کۆنسۆنانتا [ɫ]، ب پەحنکانەرمبوون ڕوودایە. ← [xaɫ]

٢. ل دوو دەڤەران درێژبوونا ڤاولی ڕوودایە. ← [xa:l]

٣. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆنانتا [l] بوویە کۆنسۆنانتا [r]، ب ڕێبوون (لێدان) ڕوودایە. ← [xar]

٤. ل دەڤەرەکێ زێدەبوون، پێکگوهۆڕین و درێژببوونا ڤاولی ڕوودایە: ← [xa:ɫo]

أ. ڤاولا [a]درێژ بوویە [a:].

ب. کۆنسۆنانتا [l] بوویە کۆنسۆنانتا [ɫ]، ب پەحنکانەرمبوون ڕوودایە.

ت. ڤاولا [o] زێدەبوویە.

٥. ل دوو دەڤەران زێدەبوون و درێژبوونا ڤاولی ڕوودایە. ← [xa:lo]

أ. ڤاولا [a]درێژ بوویە [a:].

ب. ڤاولا [o] زێدەبوویە.

٦. ل بیست و دوو دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [xal]



- **بگۆڕێ ژماره (١٠)** [sibər]**، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل چار دەڤەران ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی، زێدەکرنا کۆنسۆنانتی و پێککوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [sɨh]

أ. ڤاولا [i]بوویە [ɨ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [r]، [ə]، [b] ژناڤچوویە.

ت. کۆنسۆنانتا [h] هاتییە زێدەکرن.

٢. ل دەڤەرەکێ ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [si]

- ڤاول و کۆنسۆنانتێن [r]، [ə]، [b] ژناڤچووینە.

٣. ل دەڤەرەکێ ژناڤچوونا ڤاول و کۆنسۆنانتی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [sih]

أ. ڤاول و کۆنسۆنانتێن [r]، [ə]، [b] ژناڤچوویە.

ب. کۆنسۆنانتا [h] هاتییە زێدەکرن.

٤. ل نەهـ دەڤەران ڤاولا [i]بوویە [e]، پێشڤەهاتن و نیڤگرتیبوون ڕوودایە. ← [sebər]

٥. ل دەڤەرەکێ نیمچە کۆنسۆنانتا [w]هاتییە زێدەکرن. ← [swibər]

٦. ل سێزدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [sibər]

بگۆڕێ ژماره (١٠)

[sibər]



• **بگۆڕێ ژمارە (١١) [ʔav]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. كۆنسۆنانتا [v]ل پێنج دەڤەران تووشی حلیسینا دەنگی بوویە [ʔaw] ← [w].

٢.ل دەڤەرەكێ گرانبوون و پێككوهۆڕینا كۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ʕaɣ]

أ. كۆنسۆنانتا [v]ل دەڤەرەكێ بوویە [ɣ]، واتە گرانتر دهێتە بلێڤكرن.

ب. كۆنسۆنانتا [ʔ]ل دەڤەرەكێ بوویە [ʕ]، واتە ب حەفكیبوون ڕوودایە.

٣.ل بیست و سێ دەڤەران ژی وەكی خۆ مایە. ← [ʔav]



- **بگۆڕێ ژمارە (١٢) [sir]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل سێزدە دەڤەران نیمچە کۆنسۆنانتا[w] هاتییە زێدەکرن. ← [swir]

٢. ل دەڤەرەکێ ڤاولا ڤاولا [i]بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە. ← [sor]

٣. ل چار دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ʃor]

أ. ڤاولا [i]بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا[ʃ] بوویە [s]، ب پدوویبوون ڕوودایە.

٤. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [ʃoR]

أ. ڤاولا [i]بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا[ʃ] بوویە [s]، ب پدوویبوون ڕوودایە..

ت. کۆنسۆنانتا[R] بوویە [r]، تووشی ب ڕیبوون (لێدانێ) بوویە.

٥. ل دەهـ دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [sir]



- **بگۆڕێ ژمارە (١٣) [hɨrtʃ]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل چار دەڤەران ڤاولا [ɨ]بوویە [ʉ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون. ← [hʉrtʃ]
٢. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆنانتا [h] بوویە [w]، تووشی حلیسینا دەنگی بوویە. ← [wɨrtʃ]
٣. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆنانتا [tʃ] بوویە [s]، ب خشووکبوون ڕوودایە. ← [hɨrs]
٤. ل بیست و سێ دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [hɨrtʃ]



- **بگۆڕێ ژمارە (١٤) [nəvruz]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل شەش دەڤەران کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، تووشی حلیسینا دەنگی بوویە. ← [nəwruz]

٢. ل چار دەڤەران ڤاولا [u] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون. ← [nəvroz]

٣. ل دوو دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاولی و کۆنسۆناتی ڕوودایە: ← [nəwroz]

أ. کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، تووشی حلیسینا دەنگی بوویە.

ب. ڤاولا [u] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

٤. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاولی و کۆنسۆناتی ڕوودایە: ← [nəwrɨs]

أ. کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، تووشی حلیسینا دەنگی بوویە.

ب. ڤاولا [u] بوویە [ɨ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

٥. ل دوو دەڤەران پێکگوهۆڕین و زێدەکرنا ڤاولی ڕوودایە: ← [nəvəroz]

أ. ڤاولا [ə]هاتییە زێدەکرن.

ب. ڤاولا [u] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە. ← [nəvroz]

٦. ل چاردە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [nəvruz]



- **بگۆڕی ژمارە (١٥) [bəlg]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل چار دەڤەران كۆنسۆنانتا [g] بوویە [k̊]، تووشی گرچوونێ بوویە. ← [bəlk̊]

٢. ل دەڤەرەكێ پێككوهۆڕین و گرانبوونا كۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [b̥əɫk̊]

أ. كۆنسۆنانتا [l] بوویە [ɫ]، ب پەحنكانەرمبوون ڕوودایە.

ب. كۆنسۆنانتا [g] بوویە [k̊]، تووشی گرچوونێ بوویە.

ت. كۆنسۆنانتا [b] گران بوویە [b̥]

٣. ل پێنج دەڤەران پێككوهۆڕینا كۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [p̊əlk̊]

أ. كۆنسۆنانتا [b] بوویە [p̊]، تووشی گرچوونێ بوویە.

ب. كۆنسۆنانتا [g] بوویە [k̊]، تووشی گرچوونێ بوویە.

٤. ل دوو دەڤەران زێدەبوونا ڤاولی ڕوودایە: ← [bəlɨg]

٥. ل چار دەڤەران پێككوهۆڕینا كۆنسۆنانتی و زێدەبوونا ڤاولی ڕوودایە: ← [p̊əlɨk̊]

أ. كۆنسۆنانتا [b] بوویە [p̊]، تووشی گرچوونێ بوویە.

ب. كۆنسۆنانتا [g] بوویە [k̊]، تووشی گرچوونێ بوویە.

ت. ڤاولا [ɨ] زێدەبوویە.

٦. ل سێزدە دەڤەران ژی وەكی خۆ مایە. ← [bəlg]



- **بگۆڕێ ژمارە (١٦) [həvir]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١.ڤاولا [ə]ل دەڤەرەکێ بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاستبوون و گرتیبوون ڕوودایە. ← [hɨvir]

٢.ڤاولا [ə]ل یازدە دەڤەران بوویە [e]، پێشڤەهاتن و نیڤگرتیبوون ڕوودایە. ← [hevir]

٣.ل دەڤەرەکێ پێککوهۆڕینا کۆنسۆنانتی ڕوودایە و کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، توشی حلیسینا دەنگی بوویە. ← [həwir]

٤.ل چار دەڤەران پێککوهۆڕینا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [hewir]

أ. کۆنسۆنانتا [v] بوویە [w]، توشی حلیسینا دەنگی بوویە.

ب.ڤاولا [ə] بوویە [e]، پێشڤەهاتن و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

٥.ل دەڤەرەکێ پێککوهۆڕینا کۆنسۆنانتی ڕوودایە. ← [xəmir]

أ.کۆنسۆنانتا [h] بوویە [x]، تووشی نەرمبوونێ بوویە.

ب. کۆنسۆنانتا [v] بوویە [m]، تووشی نەرمبوونێ بوویە.

٦. ل یازدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [həvir]



- **بگۆڕێ ژمارە (١٧) [xiʃk̂]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل نەهـ دەڤەران ڤاولا [i] بوویە [ʉ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە. ← [xʉʃk̂]

٢. ل پێنج دەڤەران نیمچە کۆنسۆنانتا [w] هاتییە زێدەکرن. ← [xwiʃk̂]

٣. ل دەڤەرەکێ ژێبرن و پێکگوهۆڕین و زێدەکرنا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [xʉh]

أ. ڤاولا [i] بوویە [ʉ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆناتێن [ʃ] و[k̂] ژناڤچووینە.

ت. کۆنسۆناتا [h] هاتییە زێدەکرن.

٤. ل سێ دەڤەران پێکگوهۆڕین و زێدەکرنا ڤاولی ڕوودایە: ← [xʉʃɨk̂]

أ. ڤاولا [i] بوویە [ʉ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. ڤاولا [ɨ] هاتییە زێدەکرن.

٥. ل دەڤەرەکێ زێدەکرنا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [xwiʃɨk̂]

أ. ڤاولا [ɨ] هاتییە زێدەکرن.

ب. نیمچە کۆنسۆنانتا [w] هاتییە زێدەکرن.

٦. ل دەڤەرەکێ چەندین گوهۆڕین ب سەر دا هاتینە: ← [xʉwalə]

أ. ڤاولا [i] بوویە [ʉ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. ڤاول و کۆنسۆناتێن [l]، [a]، [w] و [ə] ژناڤچووینە.

٧. ل نەهـ دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [xiʃk̂]



• **بگۆڕێ ژمارە (١٨) [ninuk̂]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل پێنج دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاولی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [nəjnuk̂]

أ. ڤاولا [i] بوویە [ə]، ب ناڤەراستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [j] هاتییە زێدەکرن.

٢. ل دەڤەرەکێ جهێ ڤاولا [i] بوویە [u]، پاشڤەچوون و گرتیبوون ڕوودایە. ← [nunik̂]

٣. ل پێنج دەڤەران ڤاولا [u] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە. ← [ninok̂]

٤. ل دەڤەرەکێ ڤاولا [u] بوویە [i]، پێشڤەهاتن و گرتیبوون ڕوودایە. ← [ninik̂]

٥. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا ڤاولی و زێدەکرنا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [nenik̂]

أ. ڤاولا [i] بوویە [e]، پێشڤەهاتن و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

ب. ڤاولا [u] بوویە [i]، پێشڤەهاتنا گرتیبوون ڕوودایە.

٦. ل دەڤەرەکێ گوهۆڕینا لیکسیکی هەیە: ← [naxen]

٧. ل پازدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [ninuk̂]



- **بگۆڕێ ژمارە (١٩) [ʔəz]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل سێ دەڤەران گوهۆڕینا لیکسیکیا [mɨn] ڕوودایە.
٢. ل دوو دەڤەران گوهۆڕینا لیکسیکیا [ʔəmɨn] ڕوودایە.
٣. ل بیست و چار دەڤەران چ گوهۆڕینێن دەنگی ڕوونەداینە و وەکی خۆ مایە. ← [ʔəz]



- **بگۆڕیێ ژمارە (٢٠) [dəjk̂]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل سێ دەڤەران ژناڤچوونا ڤاولی ڕوودایە: ← [daj]

٢. ل یازدە دەڤەران ڤاولا [ə] بوویە [ɑ]، پاشڤەچوون و ڤەکریبوون ڕوودایە. ← [dajk̂]

٣. ل دەڤەرەکێ پێکگوهۆڕینا و زندەکرنا ڤاولی ڕوودایە: ← [dajik̂]

أ. ڤاولا [ə] بوویە [ɑ]، پاشڤەچوون و ڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. ڤاولا [i] هاتییە زندەکرن.

٤. ل چاردە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [dəjk̂]

بگۆڕیێ ژمارە (٢٠)

[dəjk̂]



**• بگۆڕی ژماره (٢١) [z̦ɨvɨșṱan]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل حەفت دەڤەران کۆنسۆناتێن گرانێن [ș]، [z̦] و [ț] سڤکبووینە← [zɨvɨsṱan]

٢. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆناتێن گرانێن [ș] و [ṱ̦] سڤکبووینە← [z̦ɨvɨsṱan]

٣. ل دوازدە دەڤەران ژناڤچوونا ڤاولی و کۆنسۆنانتی و سڤکبوونا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [zɨsṱan]

أ. کۆنسۆنانت و ڤاولا [vi] ژناڤچووینە.

ب. کۆنسۆناتێن گرانێن [ș]، [z̦] و [ṱ̦] سڤکبووینە.

٤. ل دوو دەڤەران ژناڤچوونا ڤاولی و کۆنسۆنانتی و سڤکبوونا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [z̦ɨsṱan]

ا. کۆنسۆنانت و ڤاولا [vi] ژناڤچووینە.

ب. کۆنسۆناتێن گرانێن [ș] و [ṱ̦] سڤکبوونە.

٥. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆنانت و ڤاولا [vi] ژناڤچووینە. ← [z̦ɨșṱ̦an]

٦. ل شەش دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [z̦ɨvɨșṱ̦an]



- **بگۆڕێ ژمارە (٢٢) [senikʰ]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل هەشت دەڤەران کۆنسۆنانتا [k] ژناڤچوویە. ← [seni]
٢. ل دەڤەرەکێ کۆنسۆنانتا [h] هاتییە زێدەکرن. ← [sehnikʰ]
٣. ل بیست دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [senikʰ]



• **بگۆڕێ ژمارە (٢٣) [xu]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل نەهـ دەڤەران پێککگوهۆڕینا ڤاولی و زێدەکرن کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [xwə]

أ. نیمچە کۆنسۆنانتا [w] هاتییە زێدەکرن.

ب. ڤاولا [u] بوویە [ə]، ب ناڤەراستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

٢. ل حەفت دەڤەران ڤاولا [u] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە. ← [xo]

٣. ل سێزدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [xu]



- **بگۆڕێ ژمارە (٢٤) [k̥əngɨr]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل سێ دەڤەران جهگوهۆڕین ڕوودایە. ← [k̥ərɨng]

٢. ل دەڤەرەکێ جهگوهۆڕین و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [k̥ɨrəng]

أ. ڤاولا [ə]بوویە [ɨ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. ڤاولا [ɨ]بوویە [ə]، ب ناڤەراستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ت. جهێ ڤاول و کۆنسۆنانتا [rə] هاتیە گوهۆڕین.

٣. ل دەڤەرەکێ جهگوهۆڕین و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [k̥ərəng]

أ. ڤاولا [ɨ]بوویە [ə]، ب ناڤەراستبوون و نیڤڤەکریبوون ڕوودایە.

ب. جهێ ڤاول و کۆنسۆنانتا [rə] هاتیە گوهۆڕین.

٤. ل دەڤەرەکێ جهگوهۆڕین و پێکگوهۆڕینا ڤاولی ڕوودایە: ← [ƙɨrɨng]

أ. ڤاولا [ə]بوویە [ɨ]، ب ناڤەراستبوون و گرتیبوون ڕوودایە.

ب. جهێ ڤاول و کۆنسۆنانتا [rɨ] هاتیە گوهۆڕین.

٥. ل پێنج دەڤەران کۆنسۆنانتا پفدار و گرانا [k̥] بوویە کۆنسۆنانتا پفدار و سڤکا[ƙəngɨr] ←[ƙ].

٦. ل دەڤەرەکێ زێدەبوونا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە. ← [ƙəngɨruƙ]

٧. ل دەڤەرەکێ زێدەبوونا ڤاولی و کۆنسۆنانتی ڕوودایە. ← [ƙəngɨroƙ]

٨. ل شازدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [ƙəngɨr]



**• بگۆڕێ ژمارە (٢٥) [dʒəh]، د ڤێ پەیڤێدا:**

١. ل یازدە دەڤەران ڤاولا [ə] بوویە [ɨ]، ب ناڤەڕاستبوون و گرتیبوون ڕوودایە. ← [dʒɨh]

٢. ل شەش دەڤەران پێکگوهۆڕینا ڤاولی و ژناڤچوونا کۆنسۆنانتی ڕوودایە: ← [dʒo]

أ. ڤاولا [ə] بوویە [o]، پاشڤەچوون و نیڤگرتیبوون ڕوودایە.

ب. کۆنسۆنانتا [h] ژناڤچوویە.

٣. ل دەڤەرەکێ زێدەکرنا ڤاولی ڕوودایە. ← [dʒəhi]

٤. ل یازدە دەڤەران ژی وەکی خۆ مایە. ← [dʒəh]



## ئەنجام:

• شرۆڤەكرنا بگۆڕێن زمانی نیشانددەن، كو ل پارێزگەها دهۆكێ گوڤەرەكا دیاركری زاڵە و پتر دهێتە بكارهینان و هەتا ڕادەیەكی یەكەیێن زمانیێن هەڤبەش دهێنە بكارهینان. لێ چونكی هندەك جیاوازیێن بكارهینانا یەكەیان ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەهێ دهێنە دیتن، لەوڕا دشێین بێژین ژبلی گوڤەرا زاڵ، دیالێكتەكا دی ژی ل هندەك دەڤەرێن ڤێ پارێزگەهێ دهێتە بكارهینان. هۆكارێ ڤێ ژی بۆ هەڤسنوور بوونا ڤان دەڤەران بۆ پارێزگەها هەولیرێ و دیالێكتا كرمانجیا ناڤەراست بزڤریتەڤە. هەروەسا ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ جۆرەكێ زمانیێ وەكهەڤ ناهێتە بكارهینان، ل دووڤ هەلكەڤتا و مەودایێ جۆگرافی جۆرێن زمانیێن جیاواز دهێنە بكارهینان، هەر چەندە ئەڤ جیاوازیە د هندەك بگۆڕاندا یا كێم ژی بیت. ب ڤی ڕەنگی گریمانا ئێكێ و دوویێ هەر دوو دهێنە سەلماندن. سەرەڕای ڤێ چەندێ ئاخڤتنكەرێن ڤێ پارێزگەهێ ب ساناهی دشێین جیاوازیێن دیالێكتی دەستنیشانبكەن.

• لدور نیشاندانا سنوورێن وەكهەڤیێ ل پارێزگەها دهۆكێ، دشێین بێژین بۆ هندەك بگۆڕان دشێین وی سنووری دەستنیشان بكەین وەكێ بگۆڕێ [xwə]، [ʔav] ، لێ بۆ هندەك بگۆڕان ئەڤ كارە ب زەحمەتە و ئەم نەشێین چ سنووران بۆ دەستنیشان بكەین. بۆ نموونە بگۆڕێ [p̊əlat̊ink̊] و [dut̊mam] زورترین جۆر هەنە و ئەم نەشێین سنوورێ وەكهەڤیێ بۆ وان دەستنیشان بكەین.

پێشنیار

• بۆ مەبەستا تەواو بوونا ئەتلەسا زمانیا پارێزگەها دهۆكێ و ل دووڤ بەرفرەهیا ڤێ پارێزگەهێ، پێدڤییە دەڤەرێن جوگرافیێن پتر بهێنە وەرگرتن. بۆ ڤێ یەكێ ژی پارێزگەهـ بۆ سەر چەند دەڤەران بهێتە دابەشكرن (باشترە ل دووڤ عەشیرەتا زاڵ ل هەر دەڤەرەكێ بیت)، پاشی ئەو دەڤەر ژی بۆ دەڤەرێن بچووكتر بهێتە دابەشكرن (گوندێن سەر ب هەر دەڤەرەكێ یان عەشیرەتەكێڤە) و سیمایێن زمانیێن وان بهێنە توومارکرن.

• ڤەكولەرێن ئەنتریۆلۆجی دشێین مفای ژ بگۆڕ و ئەتلەسێن زمانیێن ڤێ ڤەكولینێ وەربگرن و هندەك ڤەكولینان ل سەر كەلتوور و پەیوەندییا ڤان دەڤەران لگەل هەڤدوو ئەنجام بدەن.

| ڕێز | پرسیار | بەرسڤ | بلێڤكرن |
|---|---|---|---|
| ١ | دەمێ لەشێ مرۆڤی بریندار دبیت ... ژێ دهێت | خوین (خین) خوون | |
| ٢ | ئەڤە كیژ پارچا مریشكێیە؟  | ڕانك ڕەهنك | |
| ٣ | دەمێ مرۆڤ.... دبیت ئاڤێ ڤەدخووت | تێهنی تێنی تینی | |

| ژ | پسیار | بەرسڤ | |
|---|---|---|---|
| ٤ | ئەڤە چییە؟  | هەرمێ<br>هەرمیك | |
| ٥ | ئەڤە چییە؟  | كولند<br>كولندك | |
| ٦ | هەر هەیڤەك ژ چەند رۆژان پێكدهێت ؟ | سیهـ<br>سهـ | |
| ٧ | ل بەرێ د چوونە سەر .... یا گۆندی و ئاڤ بۆ خو دهینان | كەهنی<br>كانی<br>كانیك | |
| ٨ | ئەو چییە ل سەرێ ڤی كوری؟  | كولاڤ<br>كلاڤك<br>كلاڤ<br>كوم | |
| ٩ | برایێ دەیكا تە دبیتە چییێ تە؟ | خال | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٠ | ئەم ل هاڤینێ دێ چینە بن ... دارێ دا هەتاڤ ل مەنەدەت<br> | سیبەر | |
| ١١ | دەمێ ئەم تێهنی دبین، ئەم ... ێ ڤەدخووین ؟ | ئاڤ | |
| ١٢ | فلفل تا ماوێ یا نبژە و خوێ تاما وێ یا .... ـــە | سویرە<br>سوورە<br>سیرە | |
| ١٣ | ئەڤە وێنێ چییە ؟<br> | هرچ<br>هورچ | |
| ١٤ | گەلێ کورد جەژنا .... ێ ئاگری هەلدکەت و دچیتە سەیرانێ | نەڤرۆزە<br>نەورۆزە | |
| ١٥ | ل زڤستانێ .... یێ داران دوەریت<br> | بەلگ | |

| ١٦ | ئەڤ مرۆڤە یێ..... ی دکەت داکو نانی بپێژیت  | هەڤیر<br>هیڤیر | |
|---|---|---|---|
| ١٧ | کچا دەیکا من دبیتە ... ا من | خووشك<br>خویشك | |
| ١٨ | ئەڤە وێنێ چییە؟  | نینوك | |
| ١٩ | ئەز – ئەس | | |
| | دەیك - دایك | | |
| ٢٠ | ل کیژ وەرزی بەفر دباریت و دنیا گەلەك سارە؟ | زڤستان، زستان | |
| ٢١ | ئەڤ خارنە دناڤ چدایە ؟  | سینیك<br>سێهنیك<br>سنیك | |
| ٢٢ | خۆ –خوە | | |

| ٢٣ | ئەڤە چییە ؟  | کەنگر<br>کەرنگ | |
|---|---|---|---|
| ٢٤ | ئەم کا و ... د دەینە تەرش و کەوالی | حەهـ<br>جهـ | |

## ژێدەر و پەراوێز


١. ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان - عێراق، پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان - عێراق، ئامادەکردن و وەرگێرانی: لیژنەی پێداچوونەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان - عێراق، ٢٠٠٦/٨/٢٢ زایینی، ٣١ خەرمانان ٢٧٠٦ کوردی.

٢. اسماعیل عباسی، بررسی توزیع متغیرهای تاریخی زبان فارسی در بستر جغرافیایی و تعیین مرزهای همگونی و تهیه اطلس زبانی، پایان نامه دانشگاه سیستان و بلوچستان، دانشکده تحصیلات تکمیلی، زاهدان: ١٣٨٦.

٣. انتونی ارلاتو، درامدی بر زبان شناسی تاریخی، ترجمەی یحیی مدرسی، پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی، چاپ دوم، تهران، : ١٣٨٤ .

٤. بەرهەڤکرنا: موسەدەق توڤی و ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، چاپخانا هاوار دهۆک، ٢٠١٠.

٥. پیتر ترادگیل، زبانشناسی اجتماعی (درامدی بر زبان و جامعە)، ترجمەی محمد طباطبایی، چاپ اول، نشر اگە، ١٣٧٦.

٦. حامد مولایی، بررسی توزیع ١١٤ متغیر زبان فارسی و رسم اگلس زبانی بخش های کوهبنان و خرمدشت در استان کرمان، پایان نامە دانشگاه سیستان و بلوچستان، دانشکده تحصیلات تکمیلی، زاهدان، ١٣٩٠.

٧. رضا زمردیان، راهنمای گرداوری و توصیف گویشها، انتشارات دانشگاه فردوسی مشهد، مشهد، ١٣٧٩.

٨. زرار صدیق توفیق، المؤرخ (ابوبکر الطهراني) و اول ذکر لاسم دهوك ،مجلة دهوك ، عدد (١٠)، ایلول ٢٠٠٠.

٩. طالب حسین علی، فۆنولۆجی کوردی و دیاردەی ئاسان بوونی فۆنیمەکانی لە زاری سلێمانیدا، نامەی ماستەر، زانکوی سەلاحەدین، کولیژی ئاداب،١٩٨٩.

١٠. عەبدولسەلام نەجمەدین عەبدوللا و شێرزاد سەبری، زمانڤانییا تیۆری، چاپا ئێکێ، سپیریز، دهۆک، ٢٠١١.

١١. علی اکبر شیری، درامدی بر گویش شناسی، انتشارات مازیار، تهران، ١٣٨٦.

١٢. علی محمد حق شناس، اواشناسی ( فونتیك)، چاپ نهم، موسسەی نشر اگە، تهران،١٣٨٣.

١٣. لجنة التالیف، محافظة دهۆك، شرکە مطبعة الادیب، ١٩٨٦.

١٤. مهری باقری، مقدمات زبانشناسی، چاپ چهارم، نشره قطره، تهران، ١٣٨٠.

١٥. موسا مستەفا هەسنیانی، دهۆکا باژێر و پارێزگەهـ دناڤبەرا دوهی و ئەڤرۆدا، ترجمە،سعید عبدالرحمن دوسکی،کۆڤارا مەتین، ژمارە (١٤٥)خزیرانا ٢٠٠٦.

١٦. هاشم خضیر الجنابي، مدینە دهۆك (دراسة في جغرافیة المدن)، مطبعة الموصل ، الموصل،١٩٨٥.

١٧. Robert Lawrence Trask, Dictionary of Phonetics and Phonology,London: Routledge,1996.

١٨. J.K.Chambers & Peter Trudgill, Dialectology, second edition, Cambridge university press , London. 1980.

# هۆزانا كوردی ل چاخێن ناڤەراست
# ٥٠٠ - ١٥٠٠ز

د.عەبدولرەحمان مزوری

چاخێن ناڤەراستMiddle ages دبێژنە وێ قۆناغا مێژوویا هزار ساڵیا، دكەڤیتە نێڤبەرا كەتنا ئیمبیراتوریەتا رومانی وسەردەمێ هشیاربونێRenaissance ٥٠٠ - ١٥٠٠ز، ئانكو قۆناغا ژ دەسپێكا سەدساڵیا شەشێ تا دەسپێكا سەدساڵیا شازدێ زاینی ڤەكێشای[١].

ئاشكارە ژێدەرێن مێژویی و ئەدەبی باسی چ نڤێسینان ب گوڤەرێ كرمانجییا ژووری بەری سەدساڵیا چاردێ زاینی، ناكەن. بۆ جارا ئێكێ رۆژهەلاتڤانێ روس ڤلادیمیر مینورسكی V. Minorsky باسی دەسنڤێسەكا ئەرمەنی دكە، نڤێسەرێ وێ هنەك نڤێسینێن دنیێن[٢] ل سەر دیوارێ دێرەكا ئەرمەنی، هلگرتینە و دنێڤ بەریەرێن دەسنڤێسا خودا بەلاڤكرینە. دەسنڤێس دبێژێ: ئەڤ رێزكە وەكو دەسپێكا نڤێژەكێنە ب زمانێ مار[٣](ماد/كوردی) هاتینە. ئەڤە ئورگینالا وان رێزكایە: (**پاكژ خودێ، پاكژ زەخم، پاڤژێ ڤێ (بێ) مەرگ، كو هاتی خاچێ ئەشكەرە مە، رەحمەتێ مە**)[٤].

ل جەم كوردێن ئێزدی ئەدەبەكێ دینی هەیە: ژ قەولان، بەیتان، دوعان، دەروزان، شیرەتان وهۆزانان ... پێكهاتیە، زانایێن دینی وقەولڤانان ئەڤ ئەدەبە رستیە وڤەهاندیە. ژترسێن قوتبرینێن جیرانان وژترسا نەمانێ و ژناڤچونێ، قەولڤانان وهۆزانڤانان ئەڤ ئەدەبە ل چ جهان نەنڤێسییە، بەلكو دسنگێن خودا ژبەركریە وپاراستییە، نفشەكی تەسلیمی نفشێ دووڤدا كریە، حەتا ئیرو.

دڤان چەرخێن داویدا و ب پێشكەتنا رەوشەنبیری وچاندا كوردی وكوردێن ئێزدی ب تایبەتی، هنەك ژ ڤی ئەدەبی هاتە كوومكرن وبەلاڤكرن. ساڵا ١٩٢٠ هنەك ژێ لازو كازاریانLazo Kazaryan ل سوڤیێتا جاران بەلاڤكر. ساڵا ١٩٣٣ جەلادەت بەدرخان هنەك بەلاڤكر. دساڵێن حەفتێیاندا برایان جەلیلێ جەلیل وئوردیخانێ جەلیل، خدرێ سلێمان وخەلیلێ جوندی هنەكێ دن بەلاڤكر. ئەڤرۆ بەلاڤكرنا وی ئەدەبی بەردەوامە، هیڤیدارین ددەمەكێ نێزدا هەمو ژسنگێن پیروزێن پیرەمیران، پیرەژنان، قەولڤانان، كالان و زانایێن دینی دەركەڤیت و بكەڤیتە سەر كاغزێ.

هزر بو هندێ دچیت ئەدەبێ دینیێ ئێزدییان ل سەردەمێ شیخادیێ كورێ موسافرێ هەكاری وهێرڤە هاتبیتەڤەهاندن. ب گروڤێ مشەبونا پەیڤ وزاراڤێن ئیسلامی دنێڤ شوڤادا (تێكستادا) وەك: أمین، تبارك الله والدین، الله احسن الخالقین، پرا سەلەواتێ، نورا رەحمانی، كانیا زەمزەم، سونەتخان

(اهل السنە)، ئیمام، خەلیفە، هاشمی، قورەیشی، ئاتقات (اعتقاد)، حەج، زەكات، فتر، تەرقین (تەلقین)، مورید، فەقیر، شێخ، قەوال، موسحەف، قورئان، یاسین، ئەلحەمد، تەحیات، عیبادەت، سجود، عیرفان، حەقیقەت، شەفاعەت، مەلەك (ملائكە) ... كو ب رێیا عەدەوی یا سۆفیاتیێ هاتینەنێڤ زمانێ هۆزانان، بەیتان وقەولاندا. لەوان لێكولەرێ ل سەر مێژوا كەڤنا ئێزدیاتیێ ڤەكۆلیت و پشتا خۆ تنێ ب ڤان بەیتان، قەولان و دەروزان ... قاهیمكەت، ئاشكارە دێ كەڤیتە شاشییان، چمكی ئێزدیاتی ژ رێیا عەدەوی یا سۆفی گەلەك كەڤنترە.

دەمێ ڤەهاندنا وان هۆزانان، بەیتان وقەولان ژسەردەمێ شیخادیێ كورێ موسافر (٤٦٧-٥٥٧/١٠٧٤-١١٦١ز) سەدساڵیا دوازدێ زاینی تا سەدساڵیا هەڤدێ وهەژدێ زاینی ڤەكێشایە. چمكی دنێڤ وان هۆزانان، بەیتان وقەولاندا گەلەك جاران هۆزانێن فەقیێ تەیران (١٥٦٣ - ١٦٤٢ز) ومەلایێ باتەیی (١٦٨٨-١٧٥٦ز) هاتینە[5].

## ئەڤ قەول وڤەهینوكە هۆزانن یان نە؟

دبەرسڤێدا دبێژین، ڤان قەول و ڤەهینوكان كێشێن خوییێن خومالی هەنە.

**ژ لایێ كێشێڤە**، كێشێن هۆزانێن سەربەستن، مینا كێشێن پرانییا ستران، لاوك وحەیرانێن كوردینە. ل سەر بنگەهێ: سێ لڤی، چار لڤی، پێنج لڤی، حەفت لڤی، یازدە لڤی... هاتینە ڤەهاندن، وەك متەوالیەكا ئەندازەیی مامەلە دگەل بنگەهێ هەر كێشەكێ هاتییەكرن.

**ژ لایێ سەروایێڤە (قافیێڤە)**، هەر سێ مالكان ژ هۆزانێ (قەصیدێ)، كێم جاران ژی چار مالكان ئێك قافیە هەیە، قافیە سێ مالك سێ مالك تێتەگوهورین. ب كورتی ئەڤ قەول و ڤەهینوكە، هۆزانن دكێش وقافیەكرینە.

گەلەك ژ هۆزانڤان و قەولڤانان ناڤێن خو ل داویا بەیتان یان دنێڤ بەیتاندا ئانینە و راچاندینە وەك: **شێخ فەخرێ ئادیا، پیر رەشێ حەیران، دەروێشێ قاتانی، پیر خدر، كوچەك جەم، گاڤانێ زەرزا، داودێ بن دەرمان، ئەبو بەكرێ ئومەرێ زەرزایی، پسێ جەم، پیر هەڤند، دەروێش تاجدین، شێخ مەند، هەسەدێ ئال تەوری**[1]... وگەلەكێن دن. ئەڤ هۆزانڤان وقەولڤانە ل سەر دەمەكێ/چاخەكێ درێژ دبەلاڤن، درێژیا وی مینا دسەرمەرا بوری ژسەدساڵیا دوازدێ تا سەدساڵیا هەژدێ زاینی ڤەدكێشە. ئەگەر لێكولەر ونڤێسەرێن كورد ب كارن سەردەمێن ژیانا ڤان هۆزانڤانان هەمیان، هنەكان، حەتا ئێك ژوان دەسنیشانكەن، بێ گومان دێ خزمەتەكا بێ هەڤتا گەهیننە ئەدەبێ كوردی. من دڤێ گوتارێدا هندی بەرومنێن خو ئەڤ پێكولە كرییە.

## ئێك: پیر رەشێ حەیران:

مە بەری نهو گوتی وان هۆزانڤان وقەولڤانان كارەكێ باش كرییە، ئەوژی راچاندنا ناڤێن خویە دنێڤ راچاندن وڤەهاندنا هۆزانان، بەیتان وقەولاندا. دڤێ گوتارێدا هەر بەرهەمەكێ هۆزانڤانەكی یان قەولڤانەكی، ناڤێ وی یان ناسناڤێ وی د نێڤ بەیت و قەولێن ویدا نەهاتبیت، دێ ب پشتگوهڤە هێتەهاڤێتن، تا دپێشەرۆژێدا بەلگە وگروڤێن پشتەڤانێن مكومتر دەست مە دكەڤن.

دبێژن ناڤێ وی رەشویە یان رەشە[7]، باڤێ محەمد رەشانە هەڤچاخ وخوندكارێ شێخادیێ كورێ مسافر[8]. ب مگرتیەكا مكوم پیر رەش دسەدساڵیا دوازدێ زاینیدا ژیایە، نەمازە شێخێ وی شێخادی نێڤبەرا ١٠٧٤-١١٦١ز ژیایە. وەسا دیارە پیر رەشێ حەیران ل گورستانا پیر رەش، سێ كیلومتران نێزی باژێركێ ئەتروش، ل سەر رێیا شێخان - ئەتروش هاتیەڤەشارتن.

#### هۆزانڤانیا وی:

ژبەر درێژیا بابەتی دێ پێكولێكەین بۆ هەر هۆزانڤانەكی، سێ سەبەقان (موڤكان) ژ سێ هۆزانان (قەصیدان) ل بەرچاڤ دانین، تنێ وەك نمونە بۆ هۆزانڤانیا وی.

١. قەولێ شێخو بەکر. ل سەر بنگەهێ (سێ دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتینە:

- ژ قەولێ (پیر رەشێ حەیرانە) (٩ دەنگ)

هنجیێ ب راست دەست دهاڤێتە دامانا یار و برانە (١٨ دەنگ)

دائیم مەرکەبا وی ل بەحرێن گران مەلەڤانە (١٥ دەنگ)

- ژ قەولێ (پیر رەشێ) ب جیدە (٩ دەنگ)

دبێژمە وە گەلی موریدە (٩ دەنگ)

مە دین شەرفەدینە وئاتقاتا (مە) سۆلتان ئێزیدە[٩] (١٥ دەنگ)

٢. قەولێ ستیا ئێس[١٠]. ل سەر بنگەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- ئەڤ کەسەرا (رەشێ پیرە) (٨ دەنگ)

خوزی رونشتبامە ل جەلسا میرە (١٢ دەنگ)

جهێ سەما لێ دکێشن فەقیرە[١١] (١٠ دەنگ)

٣. قەولێ شەرفەدین. ل سەر بنگەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- ئەڤ زەمان دێ ب ئیمان بی (٨ دەنگ)

حەججا مە سۆلتان بی (٦ دەنگ)

(پیر رەشێ حەیران) زەبونێ چار بران بی[١٢] (١٢ دەنگ)

## دو: داودێ بن دەرمان:

ناڤێ وی دقەولاندا پیر داود، داودێ خەربەندە[١٣]، داودێ فەقیر... ژی هاتییە. مە (دو) بەلگە هەنە کو هۆزانڤانێ مە، دسەدسالییا دوازدێ زاینیدا ژیایە:

أ. دقەولەکیدا شێخادیێ کورێ موسافر ئەو خەلاتکرییە:

شێخادی خودانێ قەرارێ (٩ دەنگ)

مێر جەماکرن ل موغارێ (٩ دەنگ)

پیر داود خەلاتکر[١٤] وێ جارێ[١٥] (٩ دەنگ)

خویایە شێخادی دسالێن ١٠٧٤-١١٦١ز ژیایە.

ب. دهەمان قەولیدا سۆلتان زەنگی، داودێ بن دەرمان بو جەم شێخادی، وەك قاسد هنارتییە:

سۆلتان زەنگی مێرەك ب کارە (٩ دەنگ)

بەرێ دچن دهۆل ونقارە (٩ دەنگ)

داود کرە قاسد، باشێخادی ڤە دهنارە[١٦] (١٥ دەنگ)

ئاشکارە دەولەتا ئەتابەگی ل موصل پتر ژسەد سالان ڤەکێشایە (١١٢٧-١٢٣٣ز)، تێدا نەهـ سۆلتانان فەرمانڕەوایی گێڕایە. دپرانییا ژێدەراندا، تنێ عمادالدینێ کورێ ئاق سینگەرێ زەنگی، ئەوێ دنێڤبەرا ١١٢٧- ١١٤٦ز فەروەری گێڕای، ناسناڤێ (زەنگی) هلگرتییە[١٧]. لەوان ب مکرتییەکا مەزن داودێ بن دەرمان دسەدسالییا دوازدێ زاینیدا ژیایە.

هۆزانڤانیا وی:

١. قەولێ سبەکێ ژێن عەدەویا، ل سەر بنگەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- فەخرێ منێ ژێرێ زانە (٨ دەنگ)

تە ئیمامیکر ل بەر خەلکێ عێرفێ دانە[١٨] (١٤ دەنگ)

تەمامیا ڤی قەولی ل ملك الموت وداودێ بن دەرمانە[١٩] (٢٠ دەنگ)

٢. قەولێ داودێ خەربەندە، ل سەر بنگەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- داود دبێژت،

هەی پەدشێ منو پیری (٨ دەنگ)

هەگەر تو کەرامەتەکێ ژ زمانی مەزنتر ناهنێری (٢٠ دەنگ)

سۆلتانێ (زەنگ) ل سەر دەستێ خو[٢٠] ناسپێری[٢١]

(١٢ دەنگ)

٣. بەیتا سپی، ل سەر بنگەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- داود وە (هە) دبێژی یە (٨ دەنگ)

هەی شێشەمسوی ئەولی یە (٨ دەنگ)

دابچینە سلاڤی شێخادی یە[٢٢] (١٠ دەنگ)

## سێ: شێخ فەخرێ ئادیا:

دژێدەرێن مێژوییدا ودبەیت و قەولاندا ناڤێ شێخ فەخرێ ئادیا ب گەلەك رەنگان و تەخلیتان هاتییە وەك: شێخ فەخرێ ئادیا، شێخ فەخر، شێخ فەخرەدین، مەلك فەخرەدین، فەخرێ زەرگوون، فەخرێ زەرباب/بابزەر، فەخرێ رەش... كو دجهێن خۆدا دێ ئاماژە پێهێتەدان.

هێژا صدیق الدملوجی نڤێسییە، ابن العبری دپەرتووکا خۆیا مێژوییدا ناڤێ وی (ئانکو ناڤێ شێخ فەخرەدین) ئینایە[٢٣]. لێ مخابن نەگوتی یە دکیش چاپێ و کیش بەرپەریدا!

دیسان سامی سعید الاحمد نڤێسیە، ابن العبری دپەرتووکا خو (تاریخ مختصر الدول)دا ناڤێ شێخ فەخرەدین کورێ ئەبولمەفاخر عودەی (یێ دوێ) بربیە[٢٤]. لێ دیسان نە نڤێسیە دکیش چاپێ وکیش بەرپەریدا! وەسا دیارە ژ الدملوجی بێ ئاماژە پێدان ڤەگوهاستییە.

مێژوڤان ابن العبری، کریکوریوس بن اهرون/هارون الملطی خودانێ پەرتووکا عەرەبیا بناڤێ: تاریخ مختصر الدول نێڤبەرا ١٢٢٦-١٢٨٦ز ژیایە. مخابن من نەکاری ناڤێ شێخ فەخرەدین کورێ ئادیێ دوێ، دپەرتووکا ناڤبریدا دلبێن عەرەبیێن ل بەردستێ خۆدا ب بینم[٢٥]. ئەگەر بۆچوونا الدملوجی والاحمد یاراست بیت، ئانکویا وێ ئەوە شێخ فەخرێ ئادیا هەڤچاخێ ابن العبری بویە، دسەدسالیا سێزدێ زاینیدا ژیایە.

ل گوور ژێدەرێن عەرەبی شێخ فەخر کورێ شیخادیێ دوێیە (٦١٤ه/١٢١٧ز مری یە)[٢٦]، برایێ شێخ حەسەنێ داسنی یە (٥٩١-٦٤٤ه/١١٩٤-١٢٤٦ز)[٢٧]. ل گوور ژێدەرێن ئێزدییان شێخ فەخر کورێ ئێزدینێ میرە/میر ئێزدینێ شەمسانی یە[٢٨]، خارزێ شێخ حەسەنێ داسنیێ کورێ شیخادیێ دوێیە[٢٩].

ژێدەرێن ئێزدییان سەبارا شێخ فەخرێ ئادیا ژ ژێدەرێن عەرەبی رەسەنتر وراسترن. چمکی ئەو ژێدەر دێ، باڤ، خوشك و برایێن شێخ فەخر هەمویان دیاردکەن، ئاماژێ هۆزانڤانی وقەولڤانیا وی دکەن، حەتا رۆژا مرنا وی ژی ژمەرا روندکەن. ژێدەرێن عەرەبی سەبارا ڤێ چەندێ دمت و شتن، هنەك چریسکێن کێمێن روناهیێ نەبن.

دسەبەقەکێدا هوسا دێ وباڤێن شێخ فەخرێ ئادیا دەردکەڤن:

**شەمسەدین و فەخرەدینە**
**هەردو پسێن ستیا زینە**
**هەردو خەلەفێن میرئێزدینە[٣٠]**
**هەردو نەڤیێن شەرفەدینە[٣١]**

ل گوور رێزمانا کوردی راستره مالکێن بوری هوسا بێنەنڤیسین:

**شەمسەدین و فەخرەدینن**
**هەردو پسێن ستیا زینن**
**هەردو خەلەفێن میرئێزدینن**
**هەردو نەڤیێن شەرفەدینن**

چمکی مالك ب رەنگێ (کۆمێ/هەردو) هاتینە، دڤێ ب کۆمێ ب هێنەنڤیسین، بۆی کێش وقافیە وئانکویا وان بێتەگوهورین.

لێکولەرێ ئەلمان رودولف فرانك R. Frank پەرتووکەك سالا ١٩١١ چاپکری یە تێدا نڤیسیە، وی زانیاریێن خو سەبارا کورێن شیخادی (یێ دوێ ع.م) ژ مێژوا Chronik یا Barhebraeus (ابن العبری) وەرگێرا فەرەنسیا برونس Bruns وکیرش Kirsh ب ٥٣٢، ٥٥٢ وەرگرتینە. پاشی دەڤێ سریانی دگەل وەرگێرا خویا ئەلمانی ئینایەخارێ[٣٢]. ئەڤا ژێری

وەرگێرا كوردیا وەرگێرا ئەلمانیا دەقێ سریانیێ فرانكە:

وی سەردەمی (١٢٧٥ز) دوبەرەكی نێڤبەرا دو كوڕێن شیخادی (ێ دوێدا .ع.م) پەیداببو، شیخادیێ كوردێن دەردورێن مۆسل مینا پێغەمبەرەكی هێڤدكەنێ. یەك ژوان ژنەكا مەغولی ئانی بو، یێ دوێ ژ ترسادا دگەل نێزی ٤٠٠ كەسان ژ ئالیگرێن خۆ، ب گاران و پەزێ خۆڤە، مشەختی سوریێ بون. دوێ سالێدا[٣٣] ودسەردەمێ مەسعود دا[٣٤](١٢٧٦ز) كوڕێ دیێ شیخادی ژ دەردورێن مۆسل، دگەل ژنا خۆیا مەغولی مشەختی مسرێ بون. كوڕێ مەزنێ شیخادی ئەوێ مشەختی سوریێ بوی، پشتی دەمەكی زڤری میرگەهێ وژ مشەختبونا خو پوشمان بوو، لێ بریارا سێدارەدانا وی (ژ لایێ مەغولان ڤە) هاتەدان[٣٥].

روجیە لیسكو R. lescot دپەرتووكا خودا سالا ١٩٣٨ هەرئەو زانیاریێن فرانك ڤەگوهاستینە. دیسان زانیاریێن خو ژ پەرتووكا خۆیا بناڤێLes Yezidis de Syrie وژ پەرتووكاBarhebraeas وەرگێرا فەرەنسیا پروكوك Procock ب٥٠٩ وەرگرتینە[٣٦]. لیسكو خالەكا بالكێش ئازراندیە و نڤێسیە، شێخ فەخر پشتی دەمەكێ كورت ژ مسرێ زڤری وەلاتی وب كوشتنێ هاتەحوكمكرن[٣٧]*. ب هزرا من ئەڤە بوچوونەكا شاشە ود موفكێن داهاتیدا دێ راستیا وێ بو خاندەڤانان بەلیكەین.

جون گیستJ. Guest سالا ١٩٨٧ هەرئەو زانیاری دوبارەكرینە. ل گوور ژێدەرێن نڤێسین ئەوی زانیاریێن خو ژBarhebraeus توژاندنا: بیجان، وەرگێرا ئنگلیزیا: بودج، چاپا: ئكسفورد، ١٩٣٢، جـ١ ب٤٥٣ ــ ٤٥٦ وەرگرتینە[٣٨]. من ژ جون گیست زانی وەرگێرا ئنگلیزیا پەرتووكاBarhebraeus هەیە. ژ بەختێ منێ سپی لبەكا وەرگێرا: بودج چاپا: ئكسفورد یاناڤبری، ل پەرتووكخاناStaatsbibliothek ل بەرلین هەیە.

Barhebraeus (ابن العبری) خالەكا گرنگ نڤێسیە ئەوژی ئەوە، سالا ١٢٨١ز برایێ مەزنێ چویە سوریێ (شەمسەدین .ع.م) زڤری جهێ خو، چو لەشكەرگەهێ (مەغولان) ولێبورین خاست، لێ مەغولان ئەو ب مرنێ مەحكومكر وكوشت[٣٩].

ئەڤ سالە (١٢٨١ز) نە فرانك بو پەرتووكا خۆ ڤەگوهاستیە، نەژی لیسكوی، تنێ جون گیست ڤەگوهاستیە ونڤێسیە، وی (برایێ چویە سوریێ) دەمەكێ خراب بو زڤرینا خو هەلبژارتبوو (١٢٨١ز)، مەغولی دژی مەمالیكان دشەڕیدابوون، لەوان بریارا كوشتنا وی دا[٤٠].

فیلیب كراینبروك Ph.Kreyenbrock سالا ١٩٩٥ هەرئەو زانیاریێن فرانك ب٥٤، لیسكو ب١٠٤ ڤەگوهاستینە[٤١].

سەبارا بۆچوونا لیسكو كو فەخرەدین دەمێ ژ مسرێ زڤری یە وەلاتی، مەغولان حوكمێ كوشتنێ ل سەردانێ[٤٢]. مە بەری نهو گو ئەڤە شاشی یە ب گروڤێن:

أ. فرانك بەری لیسكوی نڤێسی یە، كوڕێ مەزنێ شیخادی ئەوێ مشەختی سوریێ بوی، دەمێ پوشمان بووی و زڤری ل سێدارێ هاتەدان[٤٣]. ئاشكارە شەمسەدین بۆ مشەختی سوریێ بووی و فەخرەدین چوبو مسرێ!

ب. Barhebraeus (ابن العبری) سەرەكانیا ڤان نوچانە نڤێسی یە، كوڕێ مەزنێ شیخادی (ێ دوێ .ع.م) ئەوێ چویە سوریێ پشتی زڤری وەلاتی.. مەغولان كوشت[٤٤]. ئاشكارە شەمسەدین بو چویە سوریێ!

دەمێ ئەم بۆچوونێن نڤێسەرێن بوری بێژنگ دكەین ئەڤ نیڤشكە سەردكەڤە:

١. هەمیان هزرێن خو ژ مێژوا سریانیا ابن العبری، ژ وەرگێرێن فەرەنسی وئنگلیزیێن وێ، ڤەگوهاستینە.
٢. ابن العبری هەڤچاخێ بۆیەرێن رۆژهەلاتا ناڤینە دسەدسالیا سێزدێدا، نێڤبەرا ١٢٢٦-١٢٨٦ز ژیایە. خەلكێ باكوورێ كوردستانێیە ل مەلاتیا ژ دیبویە ول ئەزەربێجان مری یە. ئانكو ب گشتی دێ نوچەیێن وی دراستبن و نێزی راستیێ بن.
٣. مێژوڤان ابن العبری مینا پرانیا مێژوڤانێن

عەرەب شێخ حەسەنێ داسنی، شەمسەدین وفەخرەدین ب كورێن شێخادیێ دوێ زانینە. ل گوور ژێدەرێن ئێزدییان شەمسەدین وفەخرەدین كورێن میر ئێزدینن، خارزیێن شێخ حەسەنێ داسنی نە، شێخ حەسەن ژی كورێ شێخادیێ دوێیە. ژێدەرێن ئێزدییان راسترن چمكی ئێزدی دنێڤ بویەراندا ژیاینە وپاراستینە.

٤. فەخرەدین/شێخ فەخرێ ئادیا سالا ١٢٧٦ز مشەختی مسرێ بوویە، ئاشكارە بەری سالا ١٢٨١ز، هێ نێڤبەرا مەغولان ومەمالیكان شێلونەبووی، زڤڕی یە وەلاتی.

پێدڤی یە نهو هزر و بۆچوونێن هنەك نڤێسەرێن كورد سەبارا سەردەمێ ژیانا شێخ فەخرێ ئادیا دانینە بەرچاڤ:

أ. توسنێ رەشید، شێخ فەخر دسەدسالیا سێزدێدا بەرهەمێن خو سێوراندینە[٤٥].

ب. خێری بوزانی، شێخ فەخر نێڤبەرا ١١٩٤- ١٢٤٦ز یان ١٢١٢ - ١٢٩٠ز ژیایە[٤٦].

جـ. باڤێ ئازاد، شێخ فەخر نێڤبەرا ١١٦٩ - ١٢٥٤ز ژیایە[٤٧].

د. عەسكەرێ بوییك، شێخ فەخر نێڤبەرا ١١٩٠ - ١٢٦٠ز ژیایە[٤٨].

بژلی هێژا خێری بوزانی هێژایێن دنێن ناڤبری نەنڤێسی یە، ئەو چەوان گەهشتینە دەسنیشانكرنا وان سالان!

مە بەری نهو گو شێخ فەخر كورێ میر ئێزدینە، خارزیێ شێخ حەسەنێ داسنی یە. ب گشتی دڤێ بیست سالەكێن ژی/تەمەنی نێڤبەرا خالی وخارزیدا هەبن. شێخ حەسەن سالا ٦٤٤ه/١٢٤٦ز ب دەستێن والیێ مۆسل بدرالدین لؤلؤ هاتییەكوشتن[٤٩]. وێگا ژیێ وی ٥٣ سالبوون، ئانكو شێخ حەسەن نێڤبەرا ١١٩٤-١٢٤٦ز ژیایە[٥٠]. شێخ فەخر كو بیست سالەكا ژ خالێ خو بجوكترە، ژێدەرەكی نڤێسی یە حەفتێ سالان ژیایە[٥١] بێ بێژینە مە ئەڤ حەفتێ سالە ژكوڤە ئانینە. لێ حەفتێ سال وەك ناڤنجی (معدل) بو ژیانا خورستیا مروڤی هژمارەكا بەرئەقلە. لەوان ل گوور ڤان پێزانینان شێخ فەخر ب راسترین بۆچوون دڤێ نێڤبەرا ١٢١٢ - ١٢٨٢ ز ژیابیت[٥٢]، گومانبرە دسەدسالیا سێزدێدا ژیایە.

بەلگەیەكێ دنێ مكومێ پشتەڤانیا ژینا شێخ فەخرێ ئادیا دسەدسالیا سێزدێدا دكەت مشورا پیر خەتیب پسێ كورێ پیر بوتارە[٥٣]، كو شێخ حەسەنێ داسنی یان ب فەرمانا وی، ب حازربونا شێخ فەخرێ ئادیا وگەلەكێن دن ل گەلیێ لالش، دنیڤا ئێكێیا سەدسالیا سێزدێدا هاتییەنڤێسین. چمكی شێخ حەسەن مینا دسەرمەڕا بوری تا سالا ١٢٤٦ز ل ژیانێ بوو. ژبیرا مە نەچیت ب حازربوونا شێخ فەخرێ ئادیا هاتییەنڤێسین كو وێگا ئەوژی ل ژیانێ بو. ئاشكارە گش نڤێسەرێن مە بەری نهو ناڤێن وان ئانین وەك توسنێ رەشید، عەسكەرێ بوییك، خێری بوزانی وباڤێ ئازاد ... ل وێ هزرێنە شێخ فەخر دسەدسالیا سێزدێدا ژیایە.

## هۆزانڤانیا شێخ فەخرێ ئادیا:

مەگو شێخ فەخرێ ئادیا خارزایێ شێخ حەسەنێ داسنی یە. شێخ حەسەن دژێدەرێن مێژوییێدا بیرتیژ، زیرەك، شەرەزا وفلیڤان/بلیمەت بو، بژلی كو هۆزانڤان و نڤێسەر ژی بو[٥٤]. كورد دبێژن پشتی سەدسالا خارزا ددەنە دو خالا. ل گوور ژێدەرێن ئێزدییان شێخ فەخر ژی بیرتیژ، شەرەزا، زانا، دوربین، هۆزانڤان وقەولڤان بو[٥٥].

ژهنەك ژێدەرێن عەرەبی تێ زانین شێخ فەخر بەیت، چامە وقەولێن دینی بو ئێزدییان درستن و ڤەدهونان. الدملوجي نڤێسی یە، دقەفتەكا دەسنڤێسێن داود الچلبي دا فەتوایەكا شێخ حەسەنێ شێڤكی هەیە، تێدا هاتی یە: ئێزدی ل دو (هذیانات الشیخ فخر/ ژبەرئاخفتنێن شێخ فەخر) دچن وپشتا خو پێ قاهیمدكەن[٥٦]. پاشی موڤكەك ژ فەتوا شێڤكیێ ناڤبری بو نێڤ پەرتووكا خو ڤەگەهاستی یە[٥٧]، ئەو موڤك دفەتوا رەبەتكی دا تونە. ئەڤەژی بەلگەیە شێڤكی فەتوایەكا جودا

دژی ئێزدییان دایە. جهێ داخێیە سالا نڤێسینا فەتوایێ و سەردەمێ ژیانا شیڤكی بۆمە نە درونن. دوور نیە فەتوا دسەدسالییا پازدێدا هاتبیتەدان، ب گروڤێ زانایەكێ دینێ كوردێ بناڤێ محمد كورێ یوسڤێ حەلوانی[٥٨] بانگێ شەرێ ئێزدییان سالا ١٤١٤ز هەلدێرایە، دوڤدا هێزێن میرێ جزیرێ عزالدینێ بۆتانی، هێزێن میرێ شەرانش تەوەكولێ كورد وهێزێن سەرداریێ هەسكیڤێ ... هێرش برینەسەر لالش[٥٩]. لەوان دور نیە فەتوا شیڤكی بو پشتەڤانیا گازیێن حەلوانی بە.

بەرئەقل ئەڤ فەتوایە بەری فەتوا شێخ عەبدولایێ رەبەتكی یە ئەوا سالا ١٧١٥ز هاتییەدان. ب گروڤێ شێخێ رەبەتكی هنەك هەڤوكێن وێ بو نێڤ فەتوا خو ڤەگوهاستینە، ژوان هەڤوكا (ژبەرئاخفتنێن شێخ فەخر)[٦٠]. یانژی هەردو فەتوا ئێكن، بو دو كەسان هاتییەدانان.

پەیڤا هذیانات/ژبەرئاخفتن ئەوا دژمنان دایەپال شێخ فەخر، بەلگەیە كو هنەك خەلكێ بادینان دزانی قەول، بەیت، هۆزان ودەروزێن هەین ژ گوتنێن شێخ فەخرن. ئەڤە ژی خالەكە پشتەڤانیا راستیا هۆزانڤانیا وی دكە.

مەگو بەیت، هۆزان، دەروز وقەولێن هۆزانڤان وقەولڤانێن ئێزدییان دسنگادا هاتینەپاراستن و نفش بو نفشی ڤەگوهاستینە. لەوان گەلەك جاران پەیڤ و جهێن وان هاتینەگوهارتن، قافیە وكێش هاتینەشكاندن، مالك (رێزك) هاتینەزێدەكرن یان قوساندن، لێ كاكل و نیڤشكێ وان هاتییەپاراستن. بۆ نموونە دقەولێ (مەلك شێخ سن) دا سەبەقا ئێكێ هوسا هاتییەنڤێسین:

**سلاڤ وسەد سلاڤ**
**هەی مەلكو شرین كەلاڤ**
**یامەلك شێخ سن كو باخو شێفەخرێ ئادیا ئەزیم خولام[٦١]**

ئاشكارە درێژكا سێدا (كو باخو) شاشیا چاپێ یە، چمكی دسەبەقێن دوڤدا (تو باخو) هاتی یە. قافیا پەیڤێن (سلاڤ، كەلاڤ، خولام) شكەستی یە، ب هزرا من سلاڤ و كەلاڤ هەردو دئەسلدا (سەلام وكەلام) بوینە، دا دگەل قافیا (خولام) ب گونجن! ئانكو ئەڤ سەبەقە ل سەر بنگەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهاندن وهوسابویە:

| | |
|---|---|
| سەلام و سەد سەلام | (٦ دەنگ) |
| هەی مەلك وشرین كەلام | (٨ دەنگ) |
| یامەلك شێخ سن تو باخوی، شێفەخرێ ئادیا ئەزم خولام° | (١٨ دەنگ) |

ئاشكارە ئەم نكارین هەمو بەرهەمێ شێخ فەخرێ ئادیا دڤێ گوتارێدا توومارکەین چمکی گەلەكە. تنێ دێ هنەك بەیت وقەولێن وپێن ناڤێ وی تیدا هاتی، وەك بەلگە بو هۆزانڤانیا وی، دانینە بەرچاڤ.

١. قەولێ شێخ فەخرێ زەرگوون. سەرینگەهێ (سێدەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتینە:

| | |
|---|---|
| - ژ قولێ شێخ فەخرێ زەرگوونە[٦٢] | (٩ دەنگ) |
| هنجیێ نەفەسا یار وبرایێت ئاخرەتێ ب كشینە | (١٨ دەنگ) |
| رۆژا ئاخرەتێ وێ دەردەكێ بێ دەرمان ب بینە | (١٥ دەنگ) |
| - ژ قەولێ شێخ فەخرێ ئادیا | (٩ دەنگ) |
| ئەزێ ئەسلیمە ژ ناڤ، و (ئەز) دكارێ ئەسلیا(٦٣) | (١٥ دەنگ) |
| ئەزێ مسری بوم ژ مسری[٦٤] | (٩ دەنگ) |

٢. قەولێ قەندیلا. سەرینگەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتینە:

| | |
|---|---|
| - ئەڤ قەولە قەولێ مەلك فەخرەدینێ زەرگوونە[٦٥] | (١٤ دەنگ) |
| پرسكەن مەلەكێ بەیرونە | (٨ دەنگ) |
| گەلو عەزمان چاوا راوەستابو بێ ستونە؟ | (١٤ دەنگ) |
| - وە دبێژە فەخرەدینێ ئادیایی[٦٦] | (١٠ دەنگ) |

هەرچار برا ب تەڤایی (٨ دەنگ)
رادانە وان ب هەڤرایی (٨ دەنگ)
دبێ ستونا عەزمان راوەسرابو ب دوعایی[٦٧]
(١٤ دەنگ)

٣. قەولێ تەختا. ل سەر بنگەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- پادیشایێ من ل ناڤ تەختێ خوێ ئامنە
(١٤ دەنگ)
مەلك فەخرەدین خادمە (٨ دەنگ)
حەجا مە کاف و مغار و قوبلەت ب دور وزمزمە[٦٨]
(١٦ دەنگ)

- ژ قەولێ شێخ فەخرێ ئادیا (٨ دەنگ)
پادشاهێ من یێ بێریا (٨ دەنگ)
یێ داهرە (زاهرە) لهەمو جیا[٦٩] (٨ دەنگ)

ب هزرا من ئەڤ هەرسێ نمونە بو هۆزانڤانی وقەولڤانیا شێخ فەخرێ ئادیا بەسن، بەرهەمێن وی پێدڤی پەرتووکەکا خوسەرن، گوتارا مە هەرهندە دکاریت دنێڤ چارچوڤێ خودا همبێزکەت.

## چار. ئەبو بەکرێ کوڕێ ئومەرێ زەرزایی:

ئەوی ناڤێ خۆ دبەیت وقەولێن خۆدا هوسا نڤێسی یە: ژ قەولێ ئەبا بەکرێ ئومەرە، ژ قەولێ ئەبا بەکرێ زەرزایی، ژ قەولێ ئەبا بەکرێ ئومەرا یێ زەرزایی[٧٠]. ژ ڤان قەولان مە ناڤێ وی زانی یە.

پەیڤا زەرزایی سیناهیەکێ سەبارا سەردەمێ ژیانا ڤی هەلبەستڤانی و قەولڤانی ددەتە مە. زەرزایی کەڤنتر زەرزاری ناڤێ عەشیرەتەکا کوردی یە، ناڤێ وێ دژێدەرێن مێژوییدا دچاخێن ناڤەراستدا پڕ هاتی یە[٧١]. هنەك بابکێن وێ بەری ئەیوبییان ل شامێ دژیان. بو نموونە زانایێ دینی محمد کوڕێ رەمەزانێ زەرزاری ل باژێرێ دیمەشق سالا ٥٤٧مش/١١٥٢ز ژ دیبویە[٧٢]. دگەل پەیدابوونا دەولەتا ئەیوبی عەشیرەتێن کوردان وەك: هەکاریان، مهرانیان/میرانیان، حەمیدیان، بەشنەویان، هەزبانیان وزەرزاریان ب گەرمی تێدا بشکداربوون[٧٣]. گەلەك زەرزاریان تێدا جهێن بلند گرتن وەك شێرکویێ کوڕێ باخلێ زەرزاری، نوشیروانێ زەرزاری[٧٤]، نورالدینێ زەرزاری[٧٥]، جمال الدین خوشترینێ زەرزاری وشیروین (شیروە) کوڕێ حەسەنێ مهرانیێ/میرانیێ زەرزاری[٧٦] ... هتد.

زەرزاری دکەڤندا ل دەڤەرا شنگارێ هەبوون. ابن الاثیر نڤێسی یە، سالا ٥٧٨هـ/١١٨٢ز سۆلتان صلاح الدینێ ئەیوبی دڤیا شنگار بێختەبن دەستێ خو، برایێ سەرداری مۆسل عزالدین ئەتابەگی خو تێدا ئاسێکر، میرێن کوردێن زەرزاری ژ بنڤە خۆ گەهاندە صلاح الدین، رێیا کەلێ نیشادا وهاریکاریا وی کر، سۆلتان شیا شنگارێ ب هاریکاریا وان بگریت[٧٧].

ل گوور ژێدەرێن ئێزدیان زەرزاری/زەرزایی دسەدسالییا دوازدێ زایینیدا ل دەڤەرا مەقلوبێ شێخان ودەردورێن روبارێ گومل (تایەکێ زێی بادینان) هەبون. گوندێ زیوە ل بن چیایێ مەقلوب ئالێ ژووری ڤە، گوندێ شێخ جەعفەرێ زەرزایی بو. محمد رەشانێ دومبەلی/دوملی خوندکار، مورید وهەڤچاخێ شیخادیێ کوڕێ موسافر، پشتی شەڕەکێ گران دژی شێخێ زەرزایی و ئالیگرێن وی کری، ئەو ژ گوندێ ناڤبری گرنەدەر[٧٨].

پشتی نەمانا دەولەتا ئەیوبی ل مصرێ، گەلەك ژخێل وعەشیرێن کوردان کەتنەنێڤ لەشکەرێ مەملوکی. مێژوڤان ابن فضل الله العمری شیرەتا سەرکێشێ کوردان (وصیة مقدم الاکراد) بو هێزێن کوردیێن دنێڤ لەشکەرێ ناڤبریدا، هوسا بومە ڤەدگێرێ: ((ان رعایتنا الشریفة ستعمم وتوقد نار کل قبیلة، واننا لاینقص عندنا بختبختي، ولاننسی طرف دیسني، ولا نحل ازرار زرزاري الا لنلبسه الملبس السني، ولانسهر طرف سهري الا لینام قریر العین ... الخ[٧٩].

دڤێ شوڤا بوریدا بختی بۆتانی نە، سهری ژی سۆرانی نە. مەرەما مە دیسنی/دیسنایە کو

داسنی نە! نە بەلی یە ئەڤ داسنی یە، مینا ئێزدی دنێڤ لەشکەرێ ئەیوبیا ومەملوکییادا بوون، یانژی بوسلمان ببوون ونفشێ خو ژیرنەکربون. ڤێ دبێژم چمکی دگوتنە زانایێ ناڤدێر حسین بن باخل الزرزاری، ئەوێ دسەدساليیا دوازدێ زاینیدا ژیای، دگوتنێ پیر حوسێن![٨٠].

یاقوت الحموی (١٢٢٨ز مری یە) نڤێسی یە، کەلا خوفتیان[٨١] دکەڤیتە هەرێما هەولێر، سەر رێیا هەولێر - مەراغە ودبێژنێ کەلا خوفتیانا زەرزاری[٨٢]. ئانکو زەرزاری دسەدساليیا سێزدێدا ل دەردورێن هەولێر ژی دبەلاڤبوون.

بەدلیسی فەسلەکێ پەرتووکا خۆ (شەرەفنامێ) بو میرێن میرگەها زەرزا تەرخان کربوو، لێ مخابن یان ژیرکر بنڤێسیت، یانژی نڤێسی بو ونەما. بەدلیسی دبێژێ میرێ بابان پیر بوداق (ل داوویا سەدساليیا پازدێ زاینیدا) ویلایەتا لارجان/لاهیجان ژ عەشیرەتا زەرزا ستاند[٨٣]. ب هزرا عباس العزاوی عەشیرەتا زەرزا دئەسلدا ژ عەشیرەتێن بادینان بوو، ژ وێرێ بەلاڤبوون چونە گەڤەرێ ومەلازگردێ ل ویلایەتا هەکاری، شنویێ (أشنویە) وناڤ شکاکان ل رۆژهەلاتی کوردستانێ و چونە دەڤەرا ئالتون کوپری[٨٤].

وەسا دیارە زەرزاری، زەراری وزەرزا یەکن. جهێن ئاکنجیبونا وان نێزی هەڤن، تیپێن پەیڤا زەرزاری لێك هاتینەگوهارتن وسڤککرن. مینا پرانیا خێل وعەشیرەتێن کوردان بەری ئیسلامێ، پرانیا عەشیرەتا زەرزاری/زەرزایی ژی دکەڤندا ئێزدی، جو وفەلەبون. کەسێن وانێن وەك گاڤانێ زەرزایی وئەبابەکرێ عومەرێ زەرزایی بەیت وقەول بو دینێ ئێزدیاتیێ ڤەهاندینە، پاشی هێدی هێدی عەشیرەت بەرف موسلمانەتیێڤە چویە. ژ بەلگەیێن دنێن ئێزدیبونا هنەك بابکێن عەشیرەتا زەرزاری/زەرزایی سەمایا پیروزا زەرزایە کو تا ئیرو ل لالش تێتەکرن. ئاشکارە حەفت رەنگێن سەمایا پیروز ل لالش تێنەکرن، سەمایا زەرزا یەك ژ وانە[٨٥]. دور نیە بو رێزگرتنا ڤێ عەشیرەتێ ئەڤ سەمایە هاتبیتە پیروزکرن.

نهو ل گوور ژێدەرێن ل سەر عەشیرەتێن ئێزدییان ئاخفتین[٨٦]، هیچ عەشیرەتەکا ئێزدی بناڤێ زەرزاری/زەرزا نەمایە، حەتا ل دەڤەرێن مێژوییێن وان وەك بادینان، شنگار، هەکاری وشام... عەشیرەتا زەرزایی یادەشتا لاهیجانێ ئەوا بەدلیسی باسکری، نە گوتی یە ئێزدیبون. چمکی بەدلیسی عەشیرەتێن ئێزدیێن سەردەمێ خو هژمارتینە وەك: مەحمودی، سلێمانی/سلیڤانی، خالدی/خالتی، نیویدکان، دونبەلی، شورش، هیودل، بسیانی وبۆتانی[٨٧].

پشتی نەمانا دەولەتا ئەیوبی دسەدساليیا سێزدێدا (١٢٨٤ز)، بژلی ناڤێ زەرزایێن دەشتا لاهیجانێ، ناڤێ عەشیرەتا زەرزاری/زەرزا دژێدەرێن مێژوییدا کێم تێتەدیتن یان ناهێتەدیتن. ناڤێ وێ نهو بویە زراری وزازا. وەسا دیارە بابکێن ئێزدیێن کەڤنارێن عەشیرەتێ، ناڤێ وان سڤکبویە وبوینە زازا. بابکێن ژێ موسلمانبوین ناڤێ زازا هلگرتی یە، بابکێن ماین ئێزدی ب ناڤێ دومبەلی/دوملی تێنەناسکرن، هەرچەند زازا ودوملی ئێکن.

ل گوور زانیارێن بوری هۆزانڤان وقەولڤانێن مەیێن ناسناڤێ زەرزایی دهەلگرن، بەیت وقەول ب دینێ ئێزدییان ڤەهاندبن وەك: ئەبو بەکرێ کورێ ئومەرێ زەرزایی وگاڤانێ زەرزایی ... دڤێ دسەدساليیا سێزدێ زاینیدا، وب مگرتیەکا لەغەرا سست دسەدساليیا دوازدێدا، ژیابن.

## هۆزانڤانیيا ئەبو بەکرێ کورێ ئومەرێ زەرزایی:

١. قەولێ پیر شەرەفێ مێراڤی. سەرینکەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتینە:

ژ قەولێ(ئەبابەکرێ ئومەرە)          (١٠ دەنگ)

هنجیێ مێرێ ل رێیا مەسەبێ خو، یێ نەکەر ویێ مەکەرە          (٢٠ دەنگ)

ل دیوانا شیخادی ومەلك شێخ سن نەشەفاعەت

لێ هەیە، نە مەهدەرە[88] (٢٢ دەنگ)

- ژ قەولێ (ئەبابەکرێ ئومەرا یێ زەرزایی)

(١٤ دەنگ)

هەکە دو برا کرەتەبایی (١٠ دەنگ)

ب فەروارا سۆلتان شیخادی، دێ چیایی دانێنە سەرچ یایی[89] (٢٠ دەنگ)

٢. دوعا تفاقێ. سەرینکەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- ژ قەولێ (ئەبابەکرێ زەرزایی)

(١٠ دەنگ)

هەکە دو برا ب هەڤرا کر تەبایی

(١٢ دەنگ)

ب فەروارا شیخادی ومەلك شێخ سن، دێ چیا دەینن سەر چیایی[90] (٢٠ دەنگ)

٣.قەولێ قەندیلا. سەرینکەهێ (یازدە دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتینە:

- (ئەبابەکرێ ئومەرا) مە لومینن (١١ دەنگ)

شەمس وفەخرێن میرا مەزهەب ودینن (١١ دەنگ)

برانو ژغافلان ب گەرێن، بلا دئاگرێ غەزەبێدا ب مینن (٢٢ دەنگ)

- (ئەبابەکرێ ئومەرا) مە ڤەهۆژن (١١ دەنگ)

شەمس وفەخرێن میرا هەیڤن ورۆژن (١١ دەنگ)

برانو ژغافلان ب گەرێن، بلا دئاگرێ غەزەبێدا ب سۆژن[91] (٢٢ دەنگ)

## پێنج. گاڤانێ زەرزا:

سەبارا هۆزانڤان وقەولڤان گاڤانێ زەرزا کو مە بەری نهو ناڤێ وی ئانی بوو، تشتێ زێدە ل سەر ژیانا وی ل جەم مە تونە. ئەوژی ب مکرتیبەکا مەزن دسەدسالییا سێزدێ زاینیدا ژیایە، مینا ئەم درێژکێن بوریدا ل سەر سەردەمێ عەشیرەتا زەرزا ب گشتی ئاخفتین وئاماژە دایێ.

**هۆزانڤانیا گاڤانێ زەرزا:**

١. قەولێ سبەکێ ژ بیت عەدەوی یا. سەرینکەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

-فەخرێ منێ ژیرێ زانە (٨ دەنگ)

تە ئیمامی کر لبەرخەلکێ عێرفێ زانە (١٤ دەنگ)

تەمامیا ڤی قەولی ل ملك الموت و(گاڤانێ زەرزانە)[92] (١٨ دەنگ)

٢. قەولێ ئەرد وعەزمان. سەرینکەهێ (حەفت دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- ب قودرەتا رەحمانە (٧ دەنگ)

ئەرد وعەزمان پێکهاتن وەکە خوشك وبرانە

(١٤ دەنگ)

تەمامیا ڤی قەولی خودانە وملك الموت و(گاڤانێ زەرزانە)[93] (٢١ دەنگ)

٣. قەولێ قەرە فرقان. سەر بنکەهێ (چار دەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ مالکە تێدا هاتینە:

- هنجیێ ل ڤی قەولی یێ ب شکە یێ ب گومانە

(١٦ دەنگ)

ئەڤ قەولە قەولێ قەرە فرقانە (١٠ دەنگ)

تەمامەتیا ڤی قەولی لخودێ و(گاڤانێ زەرزانە[94]

(١٦ دەنگ)

## شەش. شێخ مەند کورێ فەخرێ ئادیا:

شێخ فەخرێ ئادیا دو کوڕ هەبون مەند و بەدر[95]، هنەك دبێژن سێ هەبون وئاقوب زێدەدکەن[96]. دگەل کچەکێ بناڤێ خەزال ناڤدێرە ب خاتونا فەخرا[97].

ئاشکارە شێخ مەند دسەدسالییا سێزدێدا ژیایە، دەمێ باڤێ وی چویەبەر دلوڤانییا خودێ، شێخ مەند قەول پێ ڤەهاندینە. ئانکو یێ مەزنبویە وشەرەزایی درستن و ڤەهاندنا قەولاندا پەیداکری یە.

هۆزانڤانیا شێخ مەند:

١. قەولێ فەروارێ. ل سەر بنکەهێ (سێ دەنگی) هاتییەڤەهونان. ئەڤ سەبەقە تێدا هاتینە:

-شێخ مەند وێ دگوهینە (دگەهینە)
بێ مینا عەزیز مەلك فەخرەدینە
ژ ناڤ مە دچنە، گەلو ئەم کی وکینە؟[98]
-رابە بابو تو رابە
چارشەمبو رۆژا ب حسابە
شێخ مەند مایە بێ بابە[99]

هنەك ل وێ هزرێنە (قەولێ فەرواریّ) ژ ڤەهاندنا شێخ فەخرێ ئادیایە. لێ ئەڤە بۆچوونەکا سستە چمکی شێخ فەخر دقەولیدا یێ نەساخ وبەدحالە (حالێ وی حالەکێ نەخوەشە، ل سەر قوبێ یێ بەدحالە)[100]، پاشی دچیتەبەر دلوڤانیا خودێ و وەسفێن سندروکا وی تێنەدان (ئەڤە سندروکا سپی یە، دناڤدا فەخرێ بکولی یە، مەلەکان برە جەم مەلەکێ عەرشێ عێلی یە)[101]. دیسان رۆژا چارشەمبو وەك رۆژا ژ دیبون وکراسکوهورینا وی تێتە دەسنیشانکرن (دلێ منێ ب خەمە، ئەزێ ل عالمان پسیار دکەمە، عەزیز مەلك فەخرەدین ل چارشەمبوێ بوویە و ل چار شەمبوێ گوهەست قەدەمە)[102]. نە بەر ئەڤقلە شێخ فەخر باسی سندروکا خو ورۆژا کراسکوهورینا خو بکەت! ئەڤە شێخ مەندە هوسا نازك وخەمگین وەسفێن مرنا باڤێ خو ددە.

٢. قەولێ بەدرومەند[103]. سەرینگەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- مەند دبێژتێ بەدرو بەس بکە قال وقیلە
(١٢ دەنگ)
ئەز چی بکەم تو رونشتی یە ل سەر چی دەلیلە
(١٤ دەنگ)
پشتی شێخ فەخرێ ئادیا، ئەز وتو نائینین دەرزیەکە ب دو پیلە[104] (٢٢ دەنگ)

٣. قەولێ بۆرێت فەقیرا. سەرینگەهێ (چاردەنگی) هاتییەڤەهونان، ئەڤ سەبەقە تێدا هاتییە:

- ژ قەولێ شێخ مەندێ فەخرانە (٨ دەنگ)
راستمالێ مێرا ئیمانە (٨ دەنگ)
ئەم دکێمن خودێی تەمانە[105] (٨ دەنگ)

ئەڤ نموونە بۆ هۆزانڤانی وقەولڤانییا شێخ مەندێ فەخرا بەسن.

## سەربێژنگ:

هۆزانڤان و قەولڤانێن ڤێ لێکولینێ همبێزکرین شەشن: پیر رەشێ حەیران، داودێ بن دەرمان، شێخ فەخرێ ئادیا، ئەبو بەکرێ کورێ ئومەرێ زەرزایی، گاڤانێ زەرزا وشێخ مەندێ فەخرا. پیر رەشێ حەیران و داودێ بن دەرمان ل گوور بەلگە و ژێدەرێن مێژوویی دسەدسالییا دوازدێ زاینیدا ژیاینە، هەر چارێن دن دسەد سالیا سێزدێدا.

پڕانییا هۆزان و قەولێن وان سەرینگەهێ (سێمالکی) هاتینەڤەهونان، ئانکو هەر سەبەقەك ژ سێمالکان پێکهاتی یە. سەبەقێن ناڤێن قەولڤانان تێدا هاتین و مە دڤێ گوتارێدا دەسنیشانکرین، دکێش و قافیە کرینە، کێشێن وان وەك دسەرمەرا بوری، کێشێن سەربەستن مینا کێشێن لاوك وحەیرانێن کوردینە.

تا نهو مێژوا دەسپێکا هۆزان ڤەهاندنا کوردی ب کرمانجییا ژووری دزڤڕی یە سەدسالییا شازدێ زاینی، سەردەمێ فەقیێ تەیران (١٥٦٣-١٦٤٢ز)، مەلایێ جزیری (١٥٦٧-١٦٤٠ز) وشەمسەدینێ ئەخلاتی (١٥٨٨-١٦٧٤ز). ئەڤرۆ ل بن سها هۆزان و بەیتێن پیر رەشێ حەیران، داودێ بن دەرمان، شێخ فەخرێ ئادیا، ئەبو بەکرێ زەرزایی ... مێژووا دەسپێکا هۆزان ڤەهاندنا کوردی زڤڕی سەدسالییا دوازدێ زاینی، ئانکو چار سەدسالان بۆ پاشڤە زڤڕی.

# ژێدەر و پەراوێز


١. Das Neue Duden Lexikon, Dudenverlag, Mannheim, 1989, Vol: 6, p. 2548.

دیسان:هل أخرون، دائره معارف الناشئین، ترجمة: فاطمه محجوب، دار الهلال، سلسلة الالف کتاب، د.ت، ص٢٣٤.

٢. دین: پەیڤەکا ئاڤێستایی ویەهلەوی یە، ژ دائینا/دەئینا daena ب ئانکویا دین religion یان قانونا دینی هاتییە. ب هزرا نیبێرگ Nyberg ژ زمانێ پەهلەوی کەتیە نێڤ زمانێ ئارامی و پاشی عەرەبی (احسان بهرامی، فرهنگ واژەهای اوستائی، نشر بنیاد نیشاپور، تهران، ٢٠٠٠، جـ٢ ب٦٧٧، ب فارسی. دیسان: بهرام فرەوشی، فرهنگ زبان پهلوی، انتشارات دانشگاه تهران، تهران، ١٣٥٨ش، ب١٤٥، ب فارسی).

٣. مار: ناڤێ مللەتێ (ماد، مەد) گەلەك گوهورین ب سەردا هاتینە، ئەرمەنان دگوتێ: مار، ساسانیان دگوتێ: مای، بوسلمانان دگوتێ: ماە ... هتد (حسن پیرنیا، ایران باستان، انتشارات دنیای کتاب، تهران، ١٣٦٦ش، جـ١ ب٢٠٧، ب فارسی). مێژوڤانێن ئەرمەن پەیڤا مار بۆ نفشێ کوردا ب کارئانیە، ئانکو کورد ژنفشێ مارانە/مادانە، مەدانە.

٤. مینورسکی، ڤلادیمیر، بنچینەکانی کورد وچەند وتاریکی کوردناسی، وەرگێرانی: د. نەجاتی عبداللە، مەکتەبی بیر وهوشیاری (ی. ن. ك)، سلێمانی، ٢٠٠٧، ب٢١٧. دیسان: د.جمال رشید احمد، ظهور الکورد في التاریخ، منشورات دار أراس، اربیل، ٢٠٠٣، جـ٢ ص٣١٣، ب عەرەبی.

٥. سەبارا هۆزانێن فەقێن تەیران و باتەیی هێڤکە: د.خەلیل جوندی رەشو، پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، دەزگەها سپیرێز یاچاپ ووەشانێ، دهۆك، ٢٠٠٤، جـ٢ ب٦٠٩، ٧٣٦، ٧٤٦.

٦. دبە هەسەدێ تۆری بە، خەلکێ تۆرعابدین بە. ئێزدی تا نهو ژی ل دەڤەرا تۆرێ ل دەوروپشتێن مێردینێ، میدیاتێ وقەرەجەوسێ دژین. نێزی ٢٨ گوندێن وان ل ڤێ دەڤەرێ هەنە، عەشیرەتێن وانێن ڤێ دەڤەرێ مینا، بوتوکا، حەلوکا، سموکا، شەروکا، مسورکا، ناسرکی، دەقشوری، باهجولی، زەینکی، هەویری وبۆتی ... هتد (کەمال تولان، هەبون وتونەبونا ئێزدییان، وەشانێن هان، بەرلین، ٢٠١٠، ب٨٨).

٧. کوردان ناڤێ (رەش) وەك رەنگ ب کارئانیە، پێوەندیا وی ب ناڤێ رەشیدێ عەرەبی ڤە تونە. وەك ناڤێن هێژایان: مەلا عبداللە یێ رەش نڤێسەرێ دسالا ١٢٧٧مش ل سلێمانیێ ژیای، عبداللە رەشکێ بەدلیسی دسەدسالیا هەڤدێ زاینیدا ل بەدلیس، سەیدایێ فێرگەها مەولانا ئیدریسێ بەدلیسی بوو (بابا مەردوخ روحانی، تاریخ مشاهیر کرد، انتشارات سروش، تهران، ١٣٦٤ش، جـ١ ب٣٣٠، ٤٥٦، ب فارسی).

٨. کوڤان رێسان حەسەن، هزر و فەلسەفە دڤەولێن ئێزدییاندا، ناما ماستەرێیە سالا ٢٠١٣ پێشکێشی ڤاکولتیا زانستێن مروڤایەتی ل زانکۆیا زاخۆ کریە، نەهاتییە وەشاندن، ب١٢٣.

٩. د.خەلیل جوندی رەشو، پەرن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب١٩٥ ــ ١٩٦. دیسان:

بەدەل فەقیر حەجی، باوەری ومیتولوجیا ئێزدییان، چاپخانا هاوار، دهۆك، ٢٠٠٢، ب٣٣١.

ئانقات: سڤککرنا ئیعتیقادە ب ئانکویا: باوری وهزر.

١٠. دبێژن ستیا ئێس دیا شێخادی بوو.

١١. د.خەلیل جوندی رەشو، پەرن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٥٤٩.

١٢. هەرئەو ژێدەر ، جـ١ ب٤٧٨.

١٣. خەربەندە: کەسێ دەواران ب کرێ دەە (تبریزی، محمد حسین بن خلف، برهان قاطع، مؤسسة و انتشارات امیر کبیر، تهران، ١٣٦٢ش، جـ٢ ب٧٢٧، ب فارسی).

١٤. دئەسلدا (خەلاتکریو)، ب هزرا من ژبەر راستیا سەنگێ (بو) زندەیە. ع.م

١٥. خدرێ سلێمان وخەلیلێ جوندی، ئێزدیاتی ل بەر روشنایا تێکستێن ئاینێ ئێزدییان، چاپخانا کوڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ب١١٥.

١٦. هەرئەو ژێدەر، ب١١٢.

١٧. بو نمونە بنێرە: القس سلیمان الصائغ، تاریخ الموصل، تحقیق: عبدالخالق بن حسن الموصلي، دار الکتب العلمیة،

بیروت، ۲۰۱۳، جـ۱ ب۲٤٦، ب عەرەبی. دیسان: د.محمـد سهیل طقوش، تاریخ الزنكيين في الموصل و بلاد الشام، دار النفائس، بیروت، ۱۹۹۹، ب٤۳۹، ب عەرەبی. ئەم دکارین سەبارا رامان ژ( سۆلتان زەنگی) عمادالدینێ زەنگی بە، هنەك بەلگەیێن دن ژی زێدەكەین وەك: دسەردەمێ عمادالدین دا پرانییا دەڤەرێن كوردستانێ وەك، موصل، هەبلیر، شەهرەزور، ئاكرێ، ئامێدی، حەران، حەلەب، بۆتـان، سنجار، كوردێن حەمیدی، بەشنەوی، هەكـاری، مێهرانی/میرانی ... كەتنە بندەستێ دەولەتا زەنگی. دیسان ڤەكۆلەر (الصلابي) ناڤێن كورێن عمادالدینی هوسا نڤیسینە: نورالدین محمـود بن زنكـی، قطب الدین مودود بن زنكی ... ئانكو زەنكی هەر ناسناڤێ عمادالدینی بویە (د.علی محمـد الصلابي، السلطان الشهيد عمـادالدين زنكـي، منشورات المكتبة العصرية، بیروت، ۲۰۱۰، ب۹٥ - ۹۷، ب عەرەبی. دیسان: ئەو نڤیسەر، عصر الدولة الزنكية، مؤسسه اقرأ للنشر والتوزيع، القاهـره، ۲۰۰٦، ب۱٦۹، ب عەرەبی).

۱۸. دهنەك شوڤاندا (زانە)، هەر چەند ئانكویا زانا ودانا ئێكە. دیسان ئەڤ مالكە ل بن ناڤێ گاڤـانێ زەرزا ژی هاتینەگوتن.

۱۹. د.خەلیل جوندی رەشو، پەرن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ۲ ب٥۷۹. ئەڤـ سەبەقە ل سەر ناڤێ گاڤانێ زەرزا ژی هاتییە (هەرئەو ژێدەر).

۲۰. دهنەك شوڤاندا دەستێ تە.

۲۱. د.خەلیل جوندی رەشو، پەرن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ۲ ب۸٦۰.

۲۲. هەرئەو ژێدەر، ب٦٥۷. ئەز نەگەلەكێ پشتراستم ئەڤـ هەردو قەولە (۱، ۳) ژڤەهاندنا داودێ بن دەرمان بن، چمكی گوتییە: داود دبێژت یان داود وە دبێژییە! دڤیا بو نمونە گوتبا: ژقەولێ داودێ خەربەندە، یان ژقەولێ داودێ بن دەرمان .... دارشتنا راستا مە تا نهو دقەولاندا دیتی.

۲۳. صديق الدملوجي، اليزيديه، مطبعة الاتحاد، الموصل، ۱۹٤۹، ب۱۰۰، ب عەرەبی.

۲٤. د.سامي سعيد الاحمد، اليزيديه احوالهم ومعتقداتهم، مطبعه الجامعة، بغداد، ۱۹۷۱، جـ۱ ب۱٥۸، ب عەرەبی.

۲٥. سێ لبێن پەرتووكا: تاريخ مختصر الدول یامێژوڤان ابن العبری ب زمانێ عەرەبی ل بەردەستێ منن. جهێ داخێیە هەرسێ لب ژ توژاندنا ئەنتون صالحانی اليسوعی نە. دو چاپێن چاپخانا كاسولیكی نە، بەیروت، ۱۸۹۰، ۱۹٥۸. چاپەكا دار الرائد اللبنانی یە، بەیروت، ۱۹۸۳. هندی ئەز ئاگەهدارم تاریخا ناڤبری سالا ۱٦٦۳ ل چاپخانا ئێكسفورد ل بەریتانیا ژی هاتییەچاپكرن، نزانم ل مسرێ هاتییەچاپكرن یان نە.؟ لێكولەر

۲٦. ب بۆچوونا عباس العزاوی شێخادیێ دوێ تا سالا ٦۱۸ه یێ ساخبو (عباس العزاوي، تاريخ اليزيدية واصل عقيدتهم، مطبعة بغداد، بغداد، ۱۹۳٥، ب٤٦).

۲۷. الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، ب۸۳، ۹۹ - ۱۰۰. سامی سعيد الاحمد، ژێدەرێ بەرێ، جـ۱ ب۱٥۸. سعيد الديوەجي، اليزيديه، مؤسسه دار الكتب، الموصل، ۱۹۷۳، ب۹۲، ب عەرەبی. زهير كاظم عبود، لمحات عن اليزيديه، مطبعة النهضه، بغداد، ب٥۲، ب عەرەبی. محمـود الجندي، ماهي اليزيديه ومن هم اليزيديـون؟ مطبعة النضامن، بغداد، ۱۹۷٦، ب٤۹، ب عەرەبی.

۲۸. بەدەل فەقیر حەجی، گوتارا: چەواتیا ناسكرنا تێكستێن راست و درستێن دیانەتا ئێزدییان، ژ پەرتووكا: شێخ فەخرێ ئادیان، ژێدەرێ بەرێ، ب۱٤٤.

۲۹. خێری بوزانی، گوتارا: شێخ فەخرێ ئادیان ـــ ژیان وبەرهەم، ژ پەرتووكا: شێخ فەخرێ ئادیان، ژێدەرێ بەرێ، ب۱۸٥.

۳۰. هێژا خێری بوزانی نڤێسیە، هنەك قەولزان ڤێ مالكێ مینا مە نڤێسی دخونن، ودبێژێ هوسا راسترە چمكی ئێزدین میر بوو، هێ چینا شێخان نەهاتبو دانان (خێری بوزانی، گوتارا: شێخ فەخرێ ئادیا قەولڤان و ئختیار، كوڤارا: لالش، هژمارا: ۱۰، سالا: ۱۹۹۹، ب۱۳۱، فەروزێ: ٤).

۳۱. د.خەلیل جندی رەشو، پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ۲ ب٦۷۰. هێژا رێسان حەسەن جوندی ئەڤـ مالكە ب (یا و نونێ) كوومكرینە. من ئەڤە بو ئێكگرتنا رێنڤێسا كوردی راستر زانی (رێسان حەسەن جوندی، گوتارا: بەرهەمێن شێخ فەخر وشروڤەكرنەك، ژ پەرتووكا: شێخ فەخرێ ئادیا، ژێدەرێ بەرێ، ب۲۳۰).

۳۲. Frank, Rudolf, Scheick Adi-der grosse Heilige der Jezidis, Mayer u. Müller, Berlin, 1911, p.53.

۳۳. دشوڤا ئەسلیدا (دوێ سالێدا) هاتییە، لێ دیارە دسالا پاشتردا بویە ۱۲۷٦ز.

٣٤. مەسعود: رامان ژێ مەسعود کورێ ئەعلەموددین یەعقوبێ بەرقوتی یە، دسالێن ١٢٧٦ - ١٢٨٩ز والیێ مۆسل بوو ژ لایێ مەغولییان ڤە (سلیمان الصائغ، تاریخ الموصل، المطبعة السلفیه، مصر، ١٩٢٣، جـ١ ب٢٤٠ - ٢٤١، ب عەرەبی. دیسان: عباس العزاوي، تاریخ العراق بین احتلالین، مطبعة بغداد، بغداد، ١٩٣٥، جـ١ ب٢٦٦، ٢٨١، ٣٣٥، ب عەرەبی).

٣٥. Frank, Rudolf, op. cit., p. 53-54.

٣٦. Lescot, Roger, Enquete sur les Yezidis de Syrie et du Djebel Sindjar, Beyrouth, 1938, p. 104.

٣٧. Ibid.

* هێژا سیروان بەرکو فەرمانبەرێ ئینستیتوتا کوردولوگی ل بەرلین، بو من جهێن پێدڤی ژ پەرتووکا لیسکو ژ زمانێ فەرەنسی وەرگێرانە کوردی جهێ سوپاسیێ یە. لێکولەر

٣٨. Guest, John S., The Yezidis, KPI Limited, London and New York, 1987, p. 24, 217.

٣٩. Bar Hebraeus, Gregory Abul Faraj, The Chronography, translated by: Ernest A. Budge, Oxford University Press, London, 1932, Vol. 1, p.464.

٤٠. Guest, John S., The Yezidis, KPI Limited, London and New York, 1987, p. 24. دیسان: وەرگێرا وێ یا عەرەبی: الحیاة بین الکورد .. تاریخ الایزدیین، ترجمة: عماد جمیل مزوري، دار سبیریز للطباعة والنشر، دهۆك، ٢٠٠٥، ب٦٧- ٦٨.

٤١. Kreyenbrock, Philip G., Yezidisim-Its backround, observances and textual tradition, Edwin Mellen Press, Lewiston and New york, 1995, p. 33-34, 42 footnote N. 61.

٤٢. Lescot, Roger, op. cit., p. 104.

٤٣. Frank, Rudolf, op. cit., p. 54.

٤٤. Bar Hebraeus, op. cit., p. 464.

٤٥. توسنێ رەشید، گوتارا: زمانێ قەول وبەیتێن ئێزدییان، ژ پەرتووکا: شێخ فەخرێ ئادیان، ژێدەرێ بەرێ، ب١٧٦.

٤٦. خێری بوزانی، گوتارا: شێخ فەخرێ ئادیا قەولڤان و ئختیار، ژێدەرێ بەرێ، ب١٢٠.

٤٧. باڤێ ئازاد، گوتارا: شێخ فەخرێ ئادیان، ژ پەرتووکا: شێخ فەخرێ ئادیان، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٨٨.

٤٨. د.عەسکەرێ بوییك، ژێدەرێ بەرێ، ب١٠.

٤٩. ابن شاکر الکتبي، محمد بن شاکر بن احمد، فوات الوفیات، تحقیق: محمد محی الدین عبدالحمید، مطبعة السعادة، مصر، ١٩٥١، جـ١ ب١٢١، ب عەرەبی. دیسان: الذهبي، محمد بن احمد، العبر في خبر من غبر، تحقیق: صلاح الدین المنجد، مطبعة حکومة الکویت، الکویت، ١٩٦٦، جـ٥ ب٨٣، ب عەرەبی.

٥٠. Frank, Rudolf, op. cit., p.54.
دیسان: صدیق الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، ب٨٤ - ٨٦.

٥١. حاجی عەلو، گوتارا: مەلك فەخرەدینێ شەمسانی، ژ پەرتووکا: شێخ فەخرێ ئادیا، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٥٠.

٥٢. بەری من هێژا خێری بوزانی ب رێیا خویا تایبەتی گەهشتی یە هندێ شێخ فەخرێ ئادیا نێڤبەرا ١٢١٢ - ١٢٩٠ز ژیایە، ب هزرا من بۆچوونەکا بەرئەقلە (خێری بوزانی، گوتارا: شێخ فەخرێ ئادیا قەولڤان وئختیار، ژێدەرێ بەرێ، ب١٢٠).

٥٣. مشورا پیر خەتیب پسێ دەسنڤێسە، هێژا خدرێ پیر سلێمان ل گوندێ کەلەبەدرێ دیتی یە، لبەکا میناککری ژ منرا شاندی یە، جهێ سوپاسیێ یە. لێکولەر

٥٤. ابن شاکر الکتبي، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ص٢٤٢. دیسان: السخاوي، محمد بن عبدالرحمن، تحفه الاحباب وبغیة الطلاب في الخطط والمزارات، تحقیق: محمود ربیع وحسن قاسم، مکتبة العلوم والاداب للطباعة والنشر، القاهره، ١٩٣٧، ص١٩١، ب عەرەبی.

٥٥. د. عەسکەرێ بوییك، ژێدەرێ بەرێ، ب١٤٥، ٢٤٩.

٥٦. صدیق الدملوجي، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٣٤.

٥٧. ژێدەرێ بەرێ، ب٤٣٩.

٥٨. ل گوور ئاگەهداریا من (دو) بازێرێن بناڤێ حەلوان/حلوان ل کوردستانێ هەنە. حەلوان ل رۆژهەلاتێ کوردستانێ. بازێرەکێ کەڤنێ کوردایە، شونوارێن وی دکەڤنە ژێریا سەرپول زەهاب رۆژهەلاتێ قەسر شرین. ناڤێ وی ددەسپێکا هاتنا موسلماناندا بو هەرێما کوردستانێ پڕ هەیە. حلوان ل باکوورێ کوردستانێ. دکەڤیتە ژێرێ رۆژئاڤایێ بازێرێ سوێرەك، باکوورێ ئورفایێ، رۆژهەلاتێ ئاڤا سکرێ ئەتاتورك.

٥٩. المقريزي، احمد بن علي، السلوك لمعرفة دول الملوك، مطبعة دار الكتب المصرية، القاهرة، ١٩٧٢، جـ٤ ق١ ب٢٩٤، ب عەرەبی. دیسان: عباس العزاوي، ژێدەرێ بەرێ، ب١١٣.

٦٠. عباس العزاوي، ژێدەرێ بەرێ، ب٨٤.

٦١. خدرێ سلێمان وخەلیلێ جوندی، ئێزدیاتی ل بەر رۆشنایا هندەك تێکستێن ئاینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، ب ١٢٣.

* ب هزرا من دڤێ شوڤ (تێکست) چەوا تێنەگوتن وەسا بێ گوهارتن بێنەنڤێسین. هێژایان پیر خدر وخەلیل جوندی راست وب ئەمانەت سەبەق نڤێسی یە. دیێنگاڤا دویدا پێدڤی یە نڤێسەر ولێکولەر ب تەرازیا ئەقلی وزانستی شوڤان ب کێشن وهەلسەنگینن، حەتا دگەهنە راسترین شێوە. لێکولەر

٦٢. زەرگوون: زەرباڤ رەنگ زەر. قەولڤانێ دبێژێ: ژ دەرێ ئەڤینا خودێ ئەزێ نەساخ و رەنگ زەرم.

٦٣. پەیڤا (ئەسلیا) دچاپێدا بویە (ئەسلیمە). ئاشکارە شاشیا چاپێیە چمکی قافیە پێ دشکێ.

٦٤. د.خەلیل جوندی رەشو، پەڕن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٥٠٩ ــ ٥١٠.

٦٥. ب هزرا من (ئەڤـ قەولە) دڤێ رێزێدا زێدەیە، دڤیا (ژ قەولێ ...) ل شونێ با. ب گروڤێ پرانیا قەولان دبێژن (ژ قەولێ...) وەك: ژ قەولێ پیر رەشێ حەیرانە، ژ قەولێ پسێ جەمێ، ژ قەولێ ئەبا بەکرێ ئومەرە ... هتد (د.خەلیل جوندی رەشو، هەرئەو ژێدەر، جـ١ ب١٩٠، ٣٩٥، جـ٢ ب٨٦٩).

٦٦. دئەسلدا (ئادی). هوسا دگەل قافیا: تەڤایی، هەڤرایی، دوعایی ... ناگونجیت، لەوان دور نیە شاشیا چاپێ بە.

٦٧. د. خەلیل جوندی رەشو، پەڕن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب٤٢٠.

٦٨. بەدەل فەقیر حەجی، باوەری ومیتولوجیا ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٣٧ ــ ٣٣٨.

ب دور، رۆژە (د.محمد، ئە، عەلی، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٣). ل گوور داخازا من هێژا بەدەل فەقیر حەجی رۆژا ٢٠١١/٦/١١ ب تلەفونێ پسیارا ئانکویا پەیڤا (ب دور) ژ باڤێ خوکر، ئەوی ژی دبەرسڤێدا گو (رۆژە) تێ گوهارتن وب دورە، جار قوبلەت ل رۆژهەلاتی یە جارژی ل رۆژئاڤا. ددینێ زەردەشتیدا رۆژێ جهەکێ پیروز وپایەبلند هەیە، روناهیا وێ ژ ئەڤینا خودێیە (هورمزدی یە). روناهیا وێ دێوان، دزان وگورگان دبەزینە (د.جهانگیر أوشیدری، دانشنامه مزدیسنا ــ واژەنامه توچیحی ئێین زرتشت، نشر مرکز، تهران، ١٣٧١ش، ب٢٦٥، ب فارسی). قەشە جان دومنیکی نڤێسی یە، قیبلەتێن کەنیسان وجهێن نڤێژان ل کەنیسێن کەڤنێن رۆژهەلاتی ورۆژئاڤا، بەردەوام دکەفتنە رۆژهەلاتی (بەرف هەلاتنا رۆژێ)، پاشی ل کەنیسێن نو ب زۆری ئەو جهـ هاتنەگوهورین (الدومنيكي، جان موريس فييه، الاثار المسيحيه في الموصل، ترجمة: نجيب قاقو، مطبعة الطيف، بغداد، ٢٠٠٠، ب٨٩، ب عەرەبی).

٦٩. بەدەل فەقیر حەجی، ژێدەرێ بەرێ، ب ٣٤١.

٧٠. د. خەلیل جوندی رەشو، پەڕن ژئەدەبێ دینێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٨٦٩، ٨٧٠، ١٠٢٦.

٧١. بو پتر زانینان بنێرە، بەهار عەباس جبرائیل، کوردە زەرزاریەکان ــ رۆلی رامیاری وشارستانیان لە هەردو سەدەی دوازدەهەم وسێزدەهەمی زاینیدا، نامەیا ماستەرێیە سالا ٢٠١٠ پێشکێشی زانکۆیا کۆیە کریە، نەهاتیە وەشاندن.

٧٢. الذهبي، محمـد بن احمـد، تاريخ الاسـلام ووفيـات المشاهير والاعـلام، دار الكتـاب العربـي، بيروت، ١٩٩٨، ص٣٧٥، ب عەرەبی.

٧٣. ابن الفـرات، محمـد بن عبدالرحيـم، تاريـخ ابن الفـرات، تحقيق: د.حسن الشماع، مطبعة حداد، البصره، ١٩٦٧، مجلد:٤، جـ١ ب٢٤٠، ب عەرەبی. دیسان: العمـاد الكاتـب الاصفهـاني، محمـد بن محمـد، الفتـح القسـي في الفتـح القدسـي، مطابـع بريـل، ليـدن، ١٨٨٨، ص٣٠٢، ب عەرەبی.

٧٤. ابن شداد، يوسف بن رافع، النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، تحقيق: احمد ايبش، دار الاوائل للنشر والتوزيع،

دمشق، ٢٠٠٣، ب ٣٣٥، ٤١٩، ب عەرەبی.

٧٥. ابن العميد، المكين جرجس، اخبار الايوبيين، مكتبه الثقافة الدينية، بورسعيد، د.ت، ب٤٠، ب عەرەبی.

٧٦. ابن شداد، محمد بن علی، الاعلاق الخطيره في ذكر امراء الشام والجزيرة، تحقيق: سامي الدهان، منشورات المعهد الفرنسی للدراسات العربية بدمشق، دمشق، ١٩٥٦، جـ٢ ب١٩٥، ٢٥٠، ب عەرەبی. دیسان:
د.زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبلية الكوردية في العصر الوسيط، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، اربيل، ٢٠٠٧، ب١٠٢، ب عەرەبی.

٧٧. ابن الاثير، علی بن محمد الجزری، الكامل فی التاريخ، دار صادر للطباعة و النشر، بيروت، ١٩٦٦، جـ١١ ب٤٨٧، ب عەرەبی.

٧٨. خدر پير سليمان، گوتارا: قەولێ حەمەدێ بابێ، كوڤارا: لالش، هژمارا: ٦، سالا: ١٩٩٦، ب٥، ٩.

٧٩. ابن فضل الله العمري، احمد بن يحيي، التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلميه، بيروت، د. ت، ب١٤٩، ب عەرەبی.

٨٠. ابن المستوفی، المبارك بن احمد، تاريخ اربل، تحقيق: سامی خماس الصقار، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٠، جـ١ ب٥٣، ب عەرەبی.

٨١. هێژا محمد عەلی عەونی دبێژێ نهو ناڤێ (خوفتيان) سڤكبويه بويه: هاويان (شرفنامه، وەرگێرا: محمد علی عونی، جـ١ ب٢٦٨).

٨٢. الحموی، ياقوت بن عبدالله، معجم البلدان، دار احياو التراث العربی، بيروت، ١٩٩٧، جـ٣ ب٢٤٠، ب عەرەبی.

٨٣. شرف خان البدليسی، شرفنامة، ترجمة: محمد علی عونی، دار احياء الكتب العربية، القاهرة، ١٩٦٢، جـ١ ب٢٧٧، ٣١٢، ب عەرەبی. دەشتا لاهيجانێ دكەڤيته ژێربا رۆژئاڤایێ باژێرێ مەهاباد (هێڤكه: ميرزا شكرالله سنندجی، تحفه ناصری در تاريخ وجغرافيای كوردستان، موسسة انتشارات امير كبير، تهران، ١٣٦٦ش، ب٣٦٢، ب فارسی).

٨٤. عباس العزاوی، عشائر العراق، مطبعة المعارف، بغداد، ١٩٤٧، جـ٢ ب١٣٥، ٢١٧، ب عەرەبی.

٨٥. بەدەل فەقير حەجی، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٨.

٨٦. وەك: الدملوجی، ژێدەرێ بەرێ، ب٢٤٢ - ٢٦٠. عباس العزاوی، ژێدەرێ بەرێ، ب٩٠ - ١١٠. د.محمد التونجی، اليزيديون — واقعهم، تاريخهم ومعتقداتهم، الدار السلفية، الكويت، ١٩٨٨، ب٥٣ - ٥٩، ب عەرەبی. د.خليل جندی، نحو معرفه حقيقه الديانه الايزدية، منشورات رابون، أبسالا، ١٩٩٨، ب٢٠٥ - ٢٤٧، ب عەرەبی. كەمال تولان، هەبون وتونەبونا ئێزدییان، وەشانێن هان، بەرلين، ٢٠١٠، پەرتووك هەمو ل سەر عەشیرەتێن كوردستانا باكووره.

٨٧. شرف خان البدليسی، ژێدەرێ بەرێ، جـ١ ب١٣، ١١٢، ٢٥٩، ٣٠١، ٣٠٥.

٨٨. د.خەليل جوندی رەشو، پەڕن ژئەدەبێ دينێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٨٦٩ - ٨٧٠. دیسان: بەدەل فەقير حەجی، باوەری وميتولوجيا ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٠٠.

٨٩. ژێدەرێ بەرێ.

٩٠. د.خەليل جوندی رەشو، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب١٠٢٦. ئەڤە دوجاریكرنا سەبەقا بەرێیە، لێ هنەك جودايی دڤەگێرانێدا هەیە.

٩١. بەدەل فەقير حەجی، باوەری وميتولوجيا ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، ب٤٠٠. دیسان:
د.خەليل جوندی رەشو،پەڕن ژئەدەبێ دينێ ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٨٦٩.

٩٢. ژێدەرێ بەرێ، جـ٢ ب٥٧٩، درێژكا سیێدا ژڤێ سەبەقێ ناڤێ (داودێ بن دەرمانه) بەری گاڤانێ زەرزانه هاتی یە. ب هزرا من (داودێ بن دەرمانه) ل داویا رێزكێ قافیێ بێ هێزدكە. قافیا پەیڤێن (زانه، زانه، زەرزانه) گەلەكا رەهوان وموسيقی یە. ب دوور نابينم گاڤانێ زەرزا ناسناڤێ داودێ كورێ دەرمان بيت!

٩٣. بەدەل فەقير حەجی، باوەری و ميتولوجيا ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٠٠. دڤێ سەبەقێدا مالكا چارێ هەیە دبێژه (ئو ل هەرچار برانه). چمكی قەول هەمو سەرێنكەهێ (سێ مالكان) هاتيبەڤەهاندن، لەورا مە مالكا چارێ ل ڤر نەنڤێسی. لێكولەر

٩٤. عزالدین سەلیم باقەسری، مەرگەهێ ژوەشانێن بنگەهێ لالش یێ رەوشەنبیری، دهۆك، ٢٠٠٣، ب٢٨٧ - ٢٨٨.
٩٥. بەدەل فەقیر حەجی، باوەری و میتولوجیا ئێزدییان. ژێدەرێ بەرێ، ب٣٤٤. پەیڤا (مەند) ب كوردی ئاڤا هێدیبا جهێن راست وكووریێن روبارایە، بەروڤاژیا ئاڤا رژد و لەزە ل جهێن ژووردایی. (مەند) ب ئارامی دبێژنە كەسێ دوربین و زانا(هێڤكە: غضبان رومی الناشئ ، الصابئە، مطبعة الامة، بغداد، ١٩٨٣، ب٦٢، ب عەرەبی).
٩٦. د. محمد. ئە. عەلی، چیایێ كورمێنج عەفرین - ئێزدی وئێزدیاتی، عەفرین، ٢٠٠٨، ب٦٧.
٩٧. خێری بوزانی، گوتارا: شێخ فەخرێ ئادیا - ژیان وبەرهەم، ژ پەرتووكا: شێخ فەخرێ ئادیا، ژێدەرێ بەرێ، ب١٨٦.
٩٨. عیدو بابە شێخ، گوتارا: شێخ فەخر و بەردەوامیا رولا وی دناڤ ئێزدیاتیێدا، ژ پەرتووكا: شێخ فەخرێ ئادیا، ژێدەرێ بەرێ، ب١٦٩. دیسان: بەدەل فەقیر حەجی، باوەری و میتولوجیا ئێزدییان، ژێدەرێ بەرێ، ب٣٤٧. مخابن دژێدەرێ داویێدا ناڤێ شێخ مەند كەتی یە.
٩٩. ژێدەرێ بەرێ، ب١٦٩، ١٤٨.
١٠٠. بەدەل فەقیر حەجی، باوەری ومیتولوجیا ئێزدییان. ژێدەرێ بەرێ، ب٣٤٤.
١٠١. ژێدەرێ بەرێ، ب٣٤٥.
١٠٢. ژێدەرێ بەرێ، ب٣٤٨.
١٠٣. دڤی قەولیدا هەردو كورێن شێخ فەخرێ ئادیا مەند و بەدر سەبەقان دهاڤێنەبەرك، لێ سەبەق هەمو ژ ڤەهاندنا شێخ مەندن.
١٠٤. داسن شێخ عەلو، قەولێ بەدر و مەند، كوڤارا: رۆژ، هژمارا: ٤ ــ ٥، سالا: ١٩٩٨، ب١٠. درێژكا سێدا (پولا) هاتییەنڤیسین، شاشیا چاپێیە، دگەل قافیێ ناگونجیت، باراست پولە یا پیلە یە.
١٠٥. میرزا سلێمان هەكاری، قەولێ بۆرێت فەقیرا، كوڤارا: لالش، هژمارا: ٢٢، سالا: ٢٠٠٥، ب٥٩. دشوڤا ئەسلیدا پەیڤا (تەمامە) ژبەر پێدڤیا قافیێ بویە (تەمانە) وهەر وێ ئانكویێ دگەهینە.

# شعرا کوردی یا کلاسیکی ل دەڤەرا بادینان

تەحسین دۆسکی

## شعرا کلاسیکی:

هەر کەسێ ب رێبازێن ئەدەبی یێن جیهانی ئاگەهەدار بت، دزانت کو (کلاسیك) رێبازەکا ئەدەبی یا خودان سالۆخت و سەر و سیمایێن تایبەتە، ل سەدسالا شازدێ زایینی ل ئەوروپا پەیدا بوویە، و ناڤێ خۆ ژ پەیڤا لاتینی (کلاسیك) وەرگرتییە کو رامانا (تەخەیا بلندتر) د جڤاکێ دا ددەت[1]، ئەو تەخەیا خەلك ب چاڤەکێ بلند بەرێ خۆ ددەتێ، و لێ دگەرێت کو چاڤ لێ بکەت.

و ژ بەر کو ب دیتنا ئەوروپییان ئەدەبێ یۆنانی و رۆمانییان ب هێزترین و بلندترین ئەدەب بوو، وان ناڤێ وی کرە ئەدەبێ کلاسیکی، پاشی هەر ئێکێ د نڤیسینا خۆ دا چاڤ ل وی ئەدەبی کربا گۆتنە ئەدەبێ وی ژی: ئەدەبێ کلاسیکی.. و پشتی بۆرینا دەمی (ئەدەبێ کلاسیکی) وەك رێبازەکا ئەدەبی یا خودان هندەك بناخە و سالۆخەت هاتە ناسین، و ل ڤێ سەدسالا دووماهییێ و ب رێکا وەرگێرانێ ئەڤ ناڤە د ئەبییاتێن رۆژهەلاتێ ژی دا بەلاڤبوو، و ئێدی مە گوهـ لێ بوو: ئەدەبێ کلاسیکی یێ کوردی، یێ تورکی، یێ فارسی، و یێ عەرەبی ژی، هاتە گۆتن، هەر چەندە بەری هنگی ئەڤ پەیڤە ل نك مە نەبوو، و دەمێ ئەڤ پەیڤە بۆ ئەدبییاتێن مە هاتییە ب کارئینان، ل دەستپێکێ ئارمانج ژێ ئەدەبێ کەڤن بوو، ئەوێ ل سەر هندەك بناخەیێن دەسنیشانکری هاتییە ئاڤاکرن، و د هندەك قالبێن سنووردای دا هاتییە دارێتن. و ب راستی دەمێ ئەم ل ڤێرێ دبێژین: ئەدەبێ کوردی یێ کلاسیکی، مەخسەدا مە ژێ پێ هەر ئەڤ مەعنایەیە، یەعنی: ئەدەبێ کوردی یێ کەڤن و (تەقلیدی)، ئەوێ د چارچووڤەیەکێ دەستنیشانکری دا دئێتە دانان، و پێگیرییێ ب وان سەر و سیمایان دکەت یێن ئەدیبێن مە یێن پێشییێ ئەدەبێ خۆ پێ ئافراندی.. و مەبەستا مە پێ ئەو ناڤەرۆکا مەنهەجی نینە یا رێبازا کلاسیکییا ئەوروپی پێ هاتییە ناسین.

## تایبەتمەندییێن کلاسیکێن بادینان:

ئەدەبێ کلاسیکی یێ کوردی، ل دەڤەرا بادینان بت یان ل هەر دەڤەرکا دی یا کوردستانێ بت، هندەك سالۆخەت و تایبەتمەندییێن خۆ هەنە پێ دئێتە ناسین، مە دڤێت ل دووماهییا بابەتێ خۆ ب کورتی و د چەند خالەکان دا ئیشارەتێ بدەینێ:

١- کلاسیکێن مە یێن بادینی هەر ژ شێخ شەمسەددینێ ئەخلاتی بگرە و حەتا شێخ مەمدووحێ بریفکی، خودان شعرەکا (مەنهەجینە)، و مەخسەدا مە ب پەیڤا

مەنهەجی ل ڤێرێ ئەوە ئێك ژ وان دەمێ دڤێت شعرەكێ ڤەهینت بەری ئەو دەست بدەتە قەلەمی نەخشەیەكێ پێش وەخت دانایی ل بەر سنگێ وی هەیە، ئەو دئێت دا ل سەر برێڤە بچت و چاڤ لێ بكەت، ئەو نەخشە یێ خودان هندەك سالۆخەتێن دەستنیشانكریبە، شاعر نەشێت پێ لێ بدانت یان د سەر را بازدەت، و سالۆخەتێ ژ هەمییان بەرچاڤتر سالۆخەتێ (شەكلی)یە، ئەوێ ب ناڤێ (وەزن و قافیبە) دئێتە ناسین، لەو هندەك جاران بۆ شعرا كلاسیكی دئێتە گۆتن: شعرا تەقلیدی (یا چاڤلێكرنێ).

٢- و نە ب تنێ روخسار (شەكل) بەری هنگی یێ دانایە، بەلكی (پەیڤ) ب خۆ ژی ژ لایێ مەعنایێ ڤە یا توخووبدایە، و شاعر نەشێت چو گوهۆرینێ یان نویاتییێ د وێ مەعنایێ دا بكەت یا ژ شاعرێن بەرێ هاتییە ڤەگوهاستن، لەو هەر (ئستعارە) و (مەجازەكا) شاعرێ كلاسیك ب كار بینت، بەری هنگی ژ لایێ شاعرێن كەڤن ڤە یا بۆ وی هاتییە چێكرن، و یا ل سەر وی ئەوە ئەو وێ ب كار بینت بێی گوهۆرینەكێ ب سەر حالەتێ وێ یێ حسسی و عەقلی و مەنتقی دا بینت، بۆ نموونە: حەرفا نوونێ برویبە، ئەلیف بەژنە، صاد چاڤە.. خۆ ل نك ئێكێ وەكی جەگەرخوینی ژی ئەوێ ب حەرفێن لاتینی دنڤیسی!

مەعنا: مەجاز و ئستعارە هەمی ددورستن، و هەوجە ناكەت شاعر ژ نوی سەرێ خۆ ب دورستكرنا هندەكێن دی ڤە گێژ بكەت.

٣- خۆ وەصف ژی ژ لایێ ب كارئینانا تەشبیە و كنایەت و دیمەنێن حسسی ڤە بەری هنگی یا قالبدایە، و یا بۆ شاعری دمینت ئەوە ئەو زیرەكییا خۆ د رەنگێ وێنەكرن و ئسلووب و شێوەیێ گەهاندنێ دا ئاشكەرا بكەت، یەعنی: مەتەلا شاعری د ڤێ چەندێ دا وەكی مەتەلا (موجتەهدێ د مەزهەبی) دایە وەكی زانایێن ئوصوولی و فقهی دبێژن، چونكی د هزرا وان دا زەمانێ (موجتەهدێ موتلەق) یێ چووی و نەمایە!

٤- د شعرا مە یا كلاسیكی دا بابەت (مەوضووع) ددوبارە كرینە، یەعنی: دەمێ دیوانا شاعرەكێ كلاسیك دكەفتە دەستێ تە، و بەری تو ڤەكەی و بخوینی، تو دشێی وان بابەتان بهژمێری یێن شاعری شعرێن خۆ ل سەر ڤەهاندین.. نە ب تنێ هندە، بەلكی هندەك جاران شعرەك بۆ پتر ژ شاعرەكی دئێتە پالدان، و ئەم گەلەك زەحمەتێ دبینین حەتا بشێین بزانین كانێ ئەو شعر یا كێیە، هەر چەندە دبت پتر ژ سێسەد سالان د ناڤبەرا وان هەردو شاعران دا هەبت ژی، و یا ژ ڤێ ژی غەریبتر وەك نموونە ل سەر ڤێ گۆتنا مە گۆتی (و دا هوین ژێ عەجێبگرتی ببن) بسپۆرەكێ شارەزا د شعرا مە یا كلاسیكی دا جارەكێ شعرەكا سەیدایێ مە مەلا مەحموودێ بووسفی د دەستنڤیسەكێ دا دیت، و ژ بەر كو ناڤێ شاعری ل سەر نەبوو، گۆت: ئەم نزانین ئەڤ شعرە یا كێیە، بەلێ ب نیشانان ئەو یا شاعرەكییە بەری نوكە ب دوسەد سالان یان پتر ژیابە.. و ئەو ب خۆ سەیدا پشتی گۆتنا وی ئەڤە بیست و تشتەك سالە هێشتا یێ زێندیبە!

مەعنا: پتریا شاعرێن مە یێن كلاسیك (ژ بەر تەقلیدێ) نەشیاینە شێوە و مەنهەجەكێ تایبەت بۆ خۆ بدانن شعرێن وان پێ بێنە ناسین.

٥- د ناڤ بەرهەمێ شاعرێن مە یێن كلاسیك دا هندەك مێرگێن رۆمانسی هەنە، وەكی هندەك شعرێن صووفیاتی و غەزەل و مەدح و پێگۆتنێ، یێن كو خۆیاتییا (ذاتییەتا) شاعری تێدا بەرچاڤ دبت (و ئەڤە ژ سالۆخەتێن شعرا رۆمانسییە)، بەلێ ئەڤ شعرە ژ بەر قالبێن خۆ یێن حازر و مەعنایێن دوبارەكری هەر زوی دزڤرنە كلاسیكیيا خۆ.

٦- شعرا مە یا كلاسیكی د هزر و بیرێن خۆ دا شعرەكا نموونەیی و (مثالییە) و د مەعنایێن خۆ دا بەر ب گشتییێ ڤە دچت، بۆ نموونە: دلبەرا شاعری د جوانییا خۆ دا هەردەم یا بێ وێنەیە، و ئەو سالۆخەتێن شاعر بۆ وێ دەستنیشان دكەت دگشتینە و نە تشتەكە تایبەت ب وێ ڤە، و

ئەو کەسێ شاعر مەدحێن وی دکەت هەمی گاڤان چێترین مرۆڤە، و ئەو سالۆخەتێن ل وی وی هەین ل نك گەلەك کەسان ژ بلی وی ژی دئێنە دیتن. مەعنا شاعرێ مە یێ کلاسیك مرۆڤی بێ توخووب، و ب ڕامانێن وی یێن گشتی ڤە بۆ مە وێنە دکەت، هەر وەکی ئەو کەسەکێ ژ دەرڤەیی دەمی و جهییە.

## قۆناغا ئێکێ
## (یان: ئێکەمین شاعر):

ئێك ژ شاعرێن کرمانج یێن ل دەستپێکێ شعر ب زمانێ کوردی نڤیسین عەلییێ حەریرییە، و مخابن عەلییێ حەریری ژ وان شاعرانە یێن حەتا ئەڤرۆ ئەم چو ژ ژین و سەرهاتیێا وی نزانین، کەنگی ژیایە؟ خەلکێ کیژ دەڤەرێیە؟ ئەڤێ ئەم نزانین، و هزر بۆ هندێ دچت کو ئەو بەری مەلایێ جزیری بت، یان هەڤچاخێ وی بت، و ئەگەر ئەڤ هزرە یا دورست بت، حەریری دێ ژ کورێن سەدسالا شازدێ زایینی بت.

دیوانا عەلییێ حەریری حەتا نوکە ب تمامی نەهاتییە دیتن و چاپکرن، هندەك شعرێن وی کو نێزیکی دەهانە، یێن هاتینە دیتن، و ژ لەهجا وی یا هەکاری دئێتە زانین کو دبت ئەو خەلکێ دەڤەرا بادینان یان هەکاری بت، و ئەگەر لەقەبێ وی (حەریری) ژ باژێرێ (حەریرێ) هاتبتە وەرگرتن، ئەوێ نوکە دکەڤتە نێزیکی چیایێ قەندیلی د ناڤبەرا دەڤەرا بادینان و سۆران دا، ئەم دێ شێین ب پشتڕاستی ڤە بێژین: ئەو ئێکەمین شاعرێ دەڤەرا بادینانە.. بەلێ ڤێ چەندا هە -وەکی مە گۆتی- دەلیل پێ دڤێت، و چو دەلیل نوکە د دەست مە دا نینن.

ئەگەر ئەم عەلییێ حەریری بدانینە لایەکی، ئێکەمین شاعرێ ل دەڤەرا بادینان بەرهەمێ خۆ ب کوردی نڤیسی، و بەرهەمێ وی گەهشتییە مە شێخ شەمسەددینێ قوتبێ ئەخلاتییە..

و بەلکی ئێك بێژت: خەلاتێ ل کیڤە و بادینان ل کیڤە؟

و د بەرسڤێ دا دێ بێژین: شێخ شەمسەددینێ کوڕێ شێخ عەبدلکەریمێ خەلاتی، ئەوێ ل سالا ٩٩٧ مشەختی (١٥٨٨ زایینی) ل باژێرێ خەلاتێ هاتییە سەر دنیایێ، ژ بەر هێرشێن صەفەوییان یێن بەردەوام بۆ سەر دەڤەرا سەرحەدێ، و دەمێ هێشتا ئەو یێ گەنج نەچاربوو د گەل بابێ خۆ و برایێ خۆ شێخ محەمەد ئەمینی ژ خەلاتێ مشەخت ببت، و بێتە دەڤەرا هەکاری ل سەر زەمانێ میر عمادەددینێ هەکاری.

ل دەستپێکێ ئەو د ناڤ ئویخاجا دۆسکییان دا ل دەردۆرێن گەڤەرێ ئاکنجی بوون، بەلێ وەکی عادەتێ عەشیرێن کوردان ل وی دەمی شێخ شەمسەددین د گەل ئویجاخێن ئەرتووشییان ل زڤستانێ ب کۆچەری دهاتە دەشتێن دەڤەرا بادینان و هاڤینێ ڤەدگەڕیا زۆزانان.. و جارەکێ ژ ڤان جاران دەمێ ژیێ شێخی ل دۆرێن سیهـ سالییێ ئەو هاتە ئامێدییێ و چاڤ ب میرێ بادینان سەیدی خانێ کوڕێ قوباد بەگی کەفت، و هندی کەیفا میری پێ هات داخواز ژێ کر ئەو بمینتە ل دەڤەرا بادینان، و حەفت گوند ل دەڤەرا مزووریان دانێ، و ئێك ژ وان گوندێ بریفکان بوو.. و ب ڤی ڕەنگی شێخ شەمسەددین ل بادینان ئاکنجی بوو، حەتا ل هەشتێ و هەشت سالییێ (ل سالا ١٠٨٥ مشەختی ١٦٧٤ زایینی) وەغەرا دووماهییێ کری و ل گوندێ بریفکان هاتییە ڤەشارتن.

شێخی -وەکی نەڤیێ وی شێخ نوورەددین دبێژت- دیوانەکا مەزن هەبوو، بەلێ مخابن ژ وێ دیوانێ ب تنێ (١٦) شعرێن وی گەهشتینە، و ژ وان شعران دئێتە زانین کو ئەو شێخ و زانا و ئەدیبەکێ مەزن بوو، و ئەگەر دیوانا وی هەمی بێتە دیتن و بەلاڤکرن ئەز باوەر دکەم ژ لایێ ناڤەرۆکێ ڤە ئەو گەلەك ژ دیوانا مەلایێ جزیری کێمتر نەدبوو، و تشتێ بەرچاڤ د تەصەووفا وی دا ئەوە ئەو ل سەر ڕێبازا نەقشییان نەبوو، بەلکی ڕێبازا وی خەلەوتی بوو، و ئەڤە تایبەتمەندییەکێ ددەتە وی[٢].

و ب ڤێ چەندێ شێخ شەمسەددین ل دووڤ ئاگەهدارییێن حەتا نوکە مە هەین ئێکەمین شاعرە ل دەڤەرا بەهدینان دیوانەکا شعری ب کوردی دانابت،

و هەژیه بێژین: میرێن بادینان سەیدی خان و یێن پشتی وی، زێده رێز ل شێخ شەمسەددینی دگرت، و میر سەیدی خان بوو مەدرەسه و تەكیایەك بۆ وی ل بریفكان ئاڤاكری، و پشتی شێخی ژی بنەمالا وی ئەو ب ناڤێ شێخێن بریفكان هاتینه ناسین جهەكێ بلند ل نك میرێن ئامێدییێ و خەلكێ دەڤەرێ ژی هەبوو.

## قۆناغا دویێ:

مەخسەدا من ب ڤێ قۆناغێ ئەو دەمە یێ دكەفته ناڤبەرا قۆناغا شێخ شەمسەددینێ قوتب و قۆناغا زێرین دا یا كو كۆمەكا شاعرێن مەزن تێدا پەیدا بووین، و بەلكی ئەم بشێین بێژینه ڤێ قۆناغێ قۆناغا مەلا مەنصوورێ گرگاشی.

ئەڤ قۆناغه نیڤا دووێ ژ سەدسالا هەڤدێ و نیڤا ئێكێ ژ سەدسالا هەژدێ ڤەدگرت، و ناڤدارترین شاعر ل ڤی دەمی ژیای مەلا مەنصوورێ گرگاشییه، ئەوێ موساجلەیەكا شعری د گەل مەلا حوسێنێ باتەیی كری، و ژ وێ موساجلێ ئاشكرا دبت كو ئەو شاعرەكێ دەستهەل و زیرەك بوویه، و مخابن مەلا مەنصوور ژی ژ وان شاعرانه یێن ئەم چویێ ژ ژین و سەرهاتییا وی نزانین، و دەستنڤیسەكا كەشكۆل د دەست مە دا هەیه ل سالا ١١٨١ مشەختی (١٧٦٧ زایینی) ب دەستێ (موحەمەدێ كورێ مەسیحایی) هاتییه نڤیسین، شعرەكا مەلا مەنصووری د مەدحا بهارێ دا تێدا هەیه، و ئەڤە هندێ دگەهینت كو كو مەلا مەنصوور ژ كورین سەدسالا هەژدێ (وبەلكی هندەكێ ژ هەڤدێ ژی) بوویه.

و ل ڤی دەمی شاعرەكێ مللی (شەعبی) یێ مەزن ژی ل دەڤەرا بادینان هەبوو هندەك سالۆخەتێن شعرا فلكلۆری و هندەكێن شعرا كلاسیكی د بەرهەمێ وی دا ب بەرچاڤ دكەڤن، ئەو ژی (حەمكێ تۆڤی)یه، ئەوێ شعرێن وی یێن سڤك وەك ستران ل سەر دەڤێ خەلكی بەلاڤبووین.

و هەر ل ڤی دەمی شاعرەكێ دی ژی یێ كلاسیكی ل ئامێدییێ هەبوو ناسناڤێ خۆ یێ شعری كربوو (صادق)، شعرەكا وی هەر د كەشكۆلا ناڤبۆری دا ئەوا ل سالا ١٧٦٧ز هاتییه نڤیسین هەیه، و د هندەك دەستنڤیسان دا لەڤەبا (العمادی) بۆ ڤی شاعری دئێته دانان، تشتێ هندێ دگەهینت كو ئەو خەلكێ ئامێدییێ بوو.

و دو شاعرێن دی ژی د ڤێ قۆناغێ دا هەنە، ناسناڤێ ئێكی (مینا)یه، و یێ دی (ماجن)ە، هندەك شعرێن وان ژی د ڤێ دەستنڤیسێ دا هەنە، بەلێ ئەم ب دورستی نزانین كانێ ئەو بادینینه یان هەكارینه، ژ بەر كو لەهجه ئێكه.

و شاعرەكێ دی ب ناڤێ مەلا عەبدللاهێ بازەلی هەبوو شعرێن خۆ ب كوردی دنڤیسین و هندەك جاران عەرەبی و توركی و فارسی ژی دكره د ناڤ دا، ئەڤ شاعره ژی یێ بادینییه، و ئەز دویر نابینم (بازەلی) ئەو گوند بت یێ نوكه دبێژنێ: (بێزەلی) كو ئێك ژ گوندێن عەشیرەتا رێكانییانه، ئەڤ شاعره بەری سالا ١٧٦٦ز مربوو.

## قۆناغا سێیێ (قۆناغا زێرین):

و من گۆت: قۆناغا زێرین، ژ بەر كو د ڤێ قۆناغێ دا (ئەوا سەدسالا نوزدێ دوماهییێ ژ ژیێ میرنشینا بادینان ڤەدگرت) رەوشەنبیری و ئەدەبییاتا كوردی ل دەڤەرێ پێشكەفت و بیاڤێ وێ بەرفرهە بوو، و هژمارەكا شاعرێن مەزن پەیدا بوون، و ل ڤێرێ بۆ نموونه ئەز دێ ناڤێن هندەك ژ وان ئینم، دا بزانین چاوا شعرا كلاسیكی بیاڤەكێ (مەساحەیەكا) بەرفرەهـ ڤەگرتبوو:

- مەلا خالدێ زێباری، خودانێ بەیتا سیسەبانێ، هەر چەنده ب دورستی دەمێ ئەو لێ ژیای و سەرهاتییا ژینا وی ب درستی بۆ مە ئاشكەرا نەبوویه ژی، و ئەم نزانین كانێ ئەڤ خالدێ زێباری ئێك ژ وان شێخ خالدانه یێن ناڤێن وان د ناڤ شێخێن مالباتا شێخێن باصرەتێ دا دئێن یان نه.. بەلێ ژ دەسنڤیسێن بەیتا سیسەبانێ دئێته زانین كو ئەو بەری سالا ١٨١٨ زایینی ژیابوو، و هەر چاوا بت مەلا خالدێ زێباری ئێك ژ شاعرێن دەڤەرا بادینان دئێته هژمارتن[٣].

- شێخ عەبدلەتیفێ کوڕێ شێخ یوونسێ کوڕێ شێخ عەبدلەتیفێ شۆشی، ئەوێ ناسناڤێ خۆ بۆ شعری کرییە (سەیفی) ل سەدسالا هەژدێ و نۆزدێ ژیابوو، و دەستنڤیسەکا وی هەیە د ناڤبەرا سالێن ١١٩٥-١٢٠١ مشەختی (١٧٨٠-١٧٨٦ زایینی) هاتبوو نڤیسین، و گەلەك شعرێن وی تێدا هەنە[٤].
- دەردی، و ئەڤە ناسناڤێ شاعرەکییە ئەم چو ژێ نزانین، بەلێ ژ شعرەکا وی دئێتە زانین کو ئەو هەڤچاخێ عادل پاشایێ میرێ ئامێدییێ بوو ئەوێ ل سالێن (١٨٠٤-١٨٠٨ز) حوکم کری، ژ بەر کو ئەو مەدحێن ڤی میری دکەت و بەحسێ شەڕەکێ وی دکەت[٥].
- میر محەمەد تەیار پاشا کوڕێ ئیسماعیل پاشایێ میرێ ئامێدییێ، دەمەکی حاکمێ ئاکرێ بوو، و سالەکێ میراتییا بادینان ژێ کربوو، پاشی برایێ وی زوبەیر پاشا بوو میر و ئەو گرت و هاڤێتە د زیندانێ دا.. ل سالا ١٨١٧ زایینی مربوو، شعر ب کوردی ڤەدهاندن، و ناسناڤێ وی یێ شعری (غەریب) بوو، و بەری مرنا خۆ ب دو سالان وی نوسخەیەك ژ دیوانا مەلایێ جزیری نڤیسی بوو.
- بەکر بەگێ ئەرزی، دبێژن: ژییێ وی ژ سەد سالان دەرباس بووبوو، و حەتا سالا ١٨٣٤ز ئەو یێ زێندی بوو، خەلکێ گوندێ ئەرزێ بوو، ئەوێ دکەڤتە دەڤەرا دۆسکییان، و ئەو ب خۆ ژ بنەمالا میرێن ئامێدییێ بوو، کۆمەکا شعرێن وی هەنە، کو هندەك جاران بەر ب سالۆخەتێن شعرا مللی ڤە دچن، و ئەو د ڤەهاندنێ دا گەلەك چاڤ ل فەقییێ تەیران دکەت[٦].
- شێخ نورەددینێ بریفکانی، ئەوێ شێخ شەمسەددینێ خەلاتی دبتە باپیرێ وی یێ پێنجێ، ل دۆرێن سالا ١٧٩٠ز هاتبوو سەر دنیایێ و ل سالا ١٨٥١ ز مربوو، و ئێك ژ ناڤدارترین شێخێن تەریقەتا قادری بوو ل بادینان، پتر ژ سیهـ کتێبێن وی هەنە، و شعر ب کوردی و عەرەبی و فارسی ڤەدهاندن، و ناسناڤێ وی یێ شعری (نووری) بوو[٧].
- شێخ عەبدسەلامێ کوڕێ مەلا عەبدللایێ کوڕێ مەلا محەمەدێ بارزانی، ئەوێ ل سالا ١٨٧٤ز مری، شێخێ تەکیا بارزان یا نەقشبەندی، زانا و شاعرەکێ ناڤدار بوو، و کۆمەکا شعران ب کوردی هەنە[٨].

و وەکی ئەم دبینین ئەڤ شاعرە ژ دەڤەرێن جودا جودا یێن بادینانە، تشتێ هندێ دگەهینت کو زانین و ئەدەبییات، ب تایبەتی شعر، ل ڤێ قۆناغێ نە ب تنێ ل ئامێدییێ و باژێرێن مەزن هەبوو، بەلکی ئەو ل گەلەك گوند و دەڤەرێن دویر ژێ یا بەلاڤبوو، و بەلکی ئەڤە بۆ وێ ئەگەرێ بزڤرت چونکی ل ڤی دەمی مەدرەسە ل گەلەك گوند و باژێرێن دەڤەرا بادینان بەلاڤبووبوون.

## قۆناغا چارێ (قۆناغا نوی):

و ئەڤە وی دەمی ڤەدگرت یێ گوهۆڕینێن مەزن تێدا ب سەر نەخشەیێ ڕەوشەنبیری و سیاسی و جڤاکی یێ دەڤەرێ دا هاتینن پشتی دەولەتا ئۆسمانی بڕیارا نەهێلانا میرنشینێن کوردان دای، پاشی دەڤەر تێکدا تووشی هژیانەکا سیاسی بووی، دەولەتا ئۆسمانی ب خۆ ژێ هلوەشیای، و دڤەر ب ڕەنگەکێ دی و ل سەر هندەك دەولەتێن نوی هاتییە لێکڤەکرن، و ئەو دڤەرا دگۆتنێ: بادینان، بۆ حوکمەتا عیراقێ یا نوی هاتییەدان، ئەڤە ژ لایێ سیاسی ڤە، و ژ لایێ ڕەوشەنبیری ڤە چاپخانە پەیدابوون، و ڕۆژنامەگەرییا کوردی دەرکەفت، و خواندنگەهێن نوی ل شوینا مەدرەسێن دینی یێن کەڤن هاتنە پێش، و دەستەکەکا نوی یا زانا و ئەدیبان پەیدابوو کو تێکەلی ڕەوشەنبیرییا جیهانی و بیانی بووبوون، و جڤاکا کوردان ب خۆ ژێ هاتە گوهاڕتن، تەخەیا میر و حاکمان نەما، و شێخ و ئاغا هاتنە پێش، و ل شوینا (ولاء) بۆ میری بێتەدان ئەو بۆ شێخی و ئاغای (پاشی بۆ پارت و کۆمەلێن سیاسی) هاتەدان، و هژمارەکا سەرهلدان و شۆڕشێن چەکدار ل بن ناڤ و نیشانێن جودا جودا هاتنە ب ڕێڤەبرن، و ئەڤێ هەمییێ دەنگڤەدان و ڕەنگڤەدانا خۆ د ئەدبییاتا کوردی دا

هەبوو، تشتێ بوویە ئەگەرا پەیدابوونا گوهۆڕینێن بەرچاڤ د ناڤەرۆك و روخسارێ ئەدەبێ کوردی دا.. و هندەك ژ ڤان گوهۆڕینان ژ ئەدەبێ کوردی یێ کلاسیکی ژێ گرت، و ئەدەبێ کلاسیکی یێ کوردی ل دەڤەرا بادینان یێ دویر نەبوو ژ وان گوهۆڕینان.

د ڤێ قۆناغێ دا هژمارەکا شاعرێن کلاسیکی یێن مەزن ل دەڤەرێ پەیدا بوون، و ئەم ل ڤێرێ دێ ئیشارەتێ دەینە هندەك ژ وان:

- محەمەد سەعید میهری یێ مزوری، کوڕێ مەلا عبدررەحمانێ کوڕێ ملا یەحیایێ مزووری، ل سالا ١٧٩٥ ز هاتبوو سەر دنیایێ، و ل نك بابیرێ خۆ خواندبوو، بووبوو مەلا و مفتی ل ئاکرێ، ل سالا ١٨٨٤ ز مربوو، شعر ب کوردی و عەرەبی و فارسی ڤەدهاندن، و لەقەبێ وی یێ شعری (میهری) بوو.
- مەلا تاها کوڕێ مەلا عەبدررەحمانێ مایی، ل سالا ١٨٤٣ ز هاتبوو سەر دنیایێ، فەقیاتی ل نك گەلەك زانایان کربوو وەکی مەلا قاسمێ مایی و مەلا عەبدلهادی یێ ئەترووشی، و ئیجازا تەریقەتا نەقشبەندی ل بامەرنێ ژ شێخ محەممەدی وەرگرتبوو، ل سالا ١٩١٩ز مربوو، چەند کتێبەك ب عەرەبی هەبوون، و شعر ب کوردی و عەرەبی و فارسی ڤەدهاندن، و لەقەبێ وی (بەهائی) بوو[٩].
- حوسنی بامەرنی کوڕێ مەلا ئەحمەدێ بابکی، ل سالا ١٨٦٨ ل بامەرنێ هاتییە سەر دنیایێ، و ل سالا ١٩٣٦ مرییە، کۆمەکا شعران ب کرمانجی هەنە[١٠].
- غیاسەددین کوڕێ شێخ بەهائەددینێ نەقشبەندی، ل سالا ١٨٩٠ز ل بامەرنێ هاتبوو سەر دنیایێ، و ئیجازا مەلاتییێ ژ مفتییێ ئامێدییێ مەلا شوکری ئەفەندی وەرگرتبوو، و تەریقەتا نەقشبەندی ژ بابێ خۆ وەرگرتبوو، و ئەندامێ جڤاتا نوینەرێن عیراقێ بوو، ل سالا ١٩٤٤ز مربوو، و شعرێن وی ب کوردی بوون.
- شێخ تاهرێ شۆشی، ل سالا ١٩١٨ز هاتبوو سەر دنیایێ، و فەقیاتی ل گەلەك جهان کربوو، و ل ئەربیلێ ئیجازە ژ مەلا عەبدللایێ بێتواتەیی وەرگرتبوو، و پشتی هنگی مەلاتی ل گەلەك گوندێن دەڤەرا بادینان کربوو، و خۆ دهژمارت ئێك ژ تەلەبێن مەلا سەعیدێ کوردی یێ نوورسی، ل سالا ١٩٦٢ز مربوو، و گەلەك نڤیسینێن وی هەنە، ئێك ژ وان ڤەهەینۆکا (گولزار)ە کو ژ نێزیکی (١٣) هزار مالکان پێك دئێت.
- مەلا ئەحمەدێ کوڕێ ئەمینێ نالبەند، ل سالا ١٨٩٠ز ل بامەرنێ هاتبوو سەر دنیایێ، و بۆ وەرگرتنا علمێ مەلاتییێ فەقیاتی ل گەلەك دەڤەران کربوو، وەکی: بامەرنێ، ئامێدی، زاخۆ، دهۆك، وگوندێ بێدوهێ ل دەڤەرا بەرواریان، و ل ڤی گوندی ئیجازە ژ شێخ محەممەد پارسا کوڕێ مەلا تاهایێ مایی وەرگرتبوو، پاشی مەلاتی ل هندەك دەڤەرێن گولی و بەرواریان کر.. و ل سالا ١٩٦٣ ل گوندێ خشخاشا ل دەڤەرا بەرواریان خۆ کوشت، پشتی کو عەقل د سەری دا نەمای! بەرهەمەکێ زێدە هەبوو، و دیوانا وی (باغێ کوردان) نێزیکی پێنجی هزار بەیتان تێدا هەنە[١١].
- مەلا ئەنوەرێ مایی، ل سالا ١٩١٣ز ل گوندێ مایێ ل دەڤەرا بەرواری بالا هاتبوو سەر دنیایێ، و د ناڤ مالەکا دینی دا هاتە پەروەردەکرن، و زانینا خۆ ل مزگەفت و مەدرەسان وەرگرتبوو، حەتا ل سالا ١٩٣٦ ئیجازا مەلاتییێ ژ مفتییێ ئامێدییێ مەلا شوکری ئەفەندی وەرگرت، دەمەکی مەلاتییا گوندان کر، پاشی بوو (مەعەلم) و پشتی هنگی بوو فەرمانبەر.. پشتی دەستپێکرنا شۆڕشا ئەیلوولێ بوو ئێك ژ پێشمەرگێن شۆڕشێ، و ل سالا ١٩٦٣ ب دەستێ لەشکەرێ سووری ئەوێ هاتییە هاریکاریا لەشکەرێ عیراقێ هاتە کوشتن. چەند کتێبەکێن وی ب عەرەبی هەنە، و شعرێن وی ب کوردی ژی هەنە، بەلێ حەتا نوکە د ئێك کتێب دا نەهاتینە بەلاڤکرن.
- شێخ مەمدووحێ بریفکانی، ژ بنەمالا شێخ شەمسەددینێ ئەخلاتییە، ل سالا ١٩١١ز هاتبوو سەر دنیایێ، و ئیجازا خۆ ژ مەلا ئەحمەدێ

ئاكرەیی ل زاخۆ وەرگرتبوو، ئێك ژ شێخێن تەریقەتا قادری بوو، ل سالا ١٩٧٦ز ل بەغدا مربوو، و شعر ب كوردی ڤەدهاندن و لەقەبێ وی یێ شعری (خەلاتی) بوو. دیوانەكا وی یا شعران هەیە[١٢].

و ئاشكەرایە كو ئەڤە ب تنێ هندەك نموونەیێن بەرچاڤێن كلاسیكێن مەنە.. و ژ بلی وان هێشتا هەنە..

## ژێدەر و پەراوێز


١. أحمد أمين: النقد الادبي، دار الكتاب العربي، بيروت، ط ٤، ١٩٦٧، ص ٣١٩-٣٢٠.

٢. ئەو پارچەیا مایی ژ دیوانا شێخی پتر ژ جارەكێ هاتییە چاپكرن، و سەیدا محەمەد ئەمین دۆسكی شەرحەكا عەرەبی ژی ل سەر دانایە.

٣. بەیتا سیسەبانێ یا مەلا خالدێ زێباری چەند جارەكان هاتییە بەلاڤكرن، و ئەو د كتێبەكا تایبەت دا ژ لایێ كاك (هزرڤان)ی ڤە ل سالا ٢٠٠٧ ل دهۆكێ هاتییە وەشاندن.

٤. ئەڤ شعرێن وی د كتێبكا تایبەت دا ل سالا ١٩٩٩ ز مە بەلاڤكرینە.

٥. سەیدا عبدالرقيب يوسف گۆتارەك ل دۆر ڤی شاعری د كوڤارا (رۆشنبیری نوێ) دا بەلاڤكرییە.

٦. سەیدا محەمەد ئەمین دۆسكی كتێبەك ل دۆر ڤی شاعری و شعرێن وی ل سالا ٢٠٠٢ بەلاڤكرییە، و بەری وی سەیدا عبدالكريم فندی ژی هندەك شعرێن وی د نامیلكەیەكا تایبەت دا بەلاڤ كربوون

٧. دیوانا وی پتر ژ جارەكێ هاتییە چاپكرن، ژ لایێ شێخ وەحیددەین بریفكانی و زاهد بریفكانی ڤە.

٨. هندەك شعرێن وی د چەند ژێدەرەكان دا هاتینە بەلاڤكرن، وەكی كتێبا (بارزان ومسألة الوعي القومي الكردي) یا پێرەشی.

٩. سەیدا عبدالرحمن مزووری كتێبەك ل دۆر بەهائی و ژیان و بەرهەمێ وی، نڤیسییە، و ل سالا ٢٠١٢ ل دهۆكێ چاپكرییە.

١٠. ژ لایێ كاك عبدالرحمن بامەرنی ڤە هاتینە بەلاڤكرن د كتێبەكا تایبەت دا ل سالا ٢٠٠٢ ل دهۆكێ.

١١. دیوانا وی ل سالا ١٩٩٧ ل دهۆكێ ژ لایێ هەڤالێ وی مەلا تاهایێ مایی ڤە د پێنج بەرگان دا هاتە چاپكرن.

١٢. دیوانا وی ل سالا ٢٠٠١ ژ لایێ زاهد بریفكانی ڤە هاتییە چاپكرن.

# بزاڤا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان[1]

# ١٩٠٠ - ٢٠٠٠

ئیسماعیل ئیبراهیم بادی

## بەراهییەك:

كەلتورێ پاشمایێ وان مللەتێن ل سەر ئاخا كوردستانێ ژیاین، دەست بۆ دەستی هاتییە ڤەگوهاستن و گەلەك ژێ بەرزە بوویە ژ ئەگەرێ وان كاودان و كریارێن ب سەرێ وان هاتین ژ كوشتن و رەڤین و دویرئێخستنێ، یان ژی گەلەك جاران ب زۆری رح و جانێ خۆ رزگار كرینە. دیسا ئەم بێژین پتریا وی كەلتوری ب زمانێن بیانی هاتییە نڤیسین و نوكە بۆ وان مللەتان دهێتە هژمارتن، چنكو ناڤەرۆكا وان نڤیسینان بابەتێن ئایینی و تەسەووف بووینە، یان ژی بابەتێن زانستی (عیلمی) بووینە، زێدەباری ئەدەبیاتان، هەروەسا پتریا وان نڤیسەران كورد بووینە.

ب سەدان ناڤێن گەش و مەزن د ئەدەبیاتێن زمانێ عەرەبی و توركی و فارسی دا هەنە كو بەرهەم و ئەدگارێن وان یێن مەزن هەنە و بۆ وان مللەتان دهێتە هژمارتن، بۆ نموونە شاعرەكێ ناڤدارێ كورد خەلكێ ئۆرفایێ ب ناڤێ (نابی یوسف أفندی/١١٢٤هـ - ١٧١٢م وەغەر كرییە) پەرتووكەك ب ناڤێ (خیریە) نڤیساندییە و بۆ ترك دهێتە هژمارتن[2]. ژبلی (نەفعی) كو ئەو ژی شاعرەك ناڤدارە و پەرتووكێن وی هەنە و (نەفعی) یەك دیتر خۆ ب ناڤێ وی ناڤكرییە و دیوانا وی ژی هاتییە چاپكرن[3].

د زمانێ عەرەبی دا ژی گەلەك ناڤێن مەزن هەنە وەكو (احمد شوقی) و (محمود عباس العقاد) و (جمیل صدقی الزهاوی) و بنەمالا تەیموریان ( احمد و محمود و عائشە) و گەلەكێن دیتر، هەمی ئەڤرۆ ب عەرەب دهێنە ل قەلەمدان، ژبلی زمانێ فارسی كو مەزنترین شاعرێ كورد (بابا تاهرێ هەمەدانی) ل ئیرانێ ب شاعرەكێ فارس دهێتە نیاسین.

## زمانێ كوردی:

زمانێ كوردی و دیالێكتێن وێ، گەلەك بەربەلاڤبووینە ل هەرێمەكا بەربەلاڤ ل ژێرێ كیشوەرێ ئاسیا، كو دەڤەرێن باكوور و رۆژهەلاتێ باكوورێ عیراقێ، رۆژئاڤایێ ئیرانێ - ژبلی دەڤەرا عەرەبستانێ - ڤەدگریت. زێدەباری ژ لایێ باكووری ڤە دووماهیا وێ دگەهتە ئەرمینیا.

د ڤێ بەلاڤكرنا جوگرافی دا، زمانێ كوردی نەیێ بێبارە ژ كارتێكرنێن زمانڤانی یێن زمانێن دەوروبەر، وەك: توركی، عەرەبی، فارسی، ئەرمەنی و توركمانی، بەلێ دەڤەرێن ناڤەندی زمانێ وان یێ كوردی و دیالێكتێن وێ ب پاقژی ماینە و كارتێكرنەكا مەزن لێ نەهاتییە كرن، ئەو ژی ژ ئەگەرێ دووریا زمانێ كوردی ژ زمانێن دەردور یێن بیانی. پرۆفیسۆر (فوئاد

حەمە خورشید) ئاشکرا دکەت کو مەبەستا وی ژ کارتێکرنێن زمانێن بیانی ل سەر زمانێ کوردی، ژ ئەگەرێن نەبوونا سنوورەکێ جوگرافی یێ قەبرە، ژ هەر پارچەیەکێ ل هەر وەلاتەکی، چ سنوور د ناڤبەرا وان زمان و زمانێ کوردی دا نینن کو کارتێکرنێ لێ نەکەن[٤].

## دیالێکتا کرمانجیا ژۆری:

ئەڤ دیالێکتە ژ دیالێکتێن دیتر، پتر بەلاڤبوویە و دەڤەرەکا بەرفرەهـ بخۆڤە گرتییە، کوردێن ترکیا ل پارێزگەهێن (بایەزید، وان، جۆلەمێرگ، سعرد، موش، مێردین، ئامەد، خەربۆت، ئیدیابان، غازیان تەپە) و پشکێن رۆژهەلاتێ بازێرێن (مەرعەش و سیواس) و ژێریێ پارێزگەهێن (ئەرزەرۆم و قارس). هەروەسا کوردێن ل رۆسیا ل ژێریێ رۆژئاڤا یا (ئەرمینیا) و ل کوردستانا عیراقێ پارێزگەها دهۆك و قەزایێن وێ و دەڤەرا شنگالێ پێ دئاخڤن.

جهێ ڤێ دیالێکتێ و دیالێکتا کرمانجیا ناڤەراست ژێکجودا دکەت، ئەو خێچا وەهمی یە ئەوا ژ کنارێن رۆژئاڤایێ ناڤەراست یا دەریا ئۆرمیێ، بەر ب ژێریا رۆژئاڤایی، هەتا دگەهتە باکوورێ بازێرێ (شنۆ) دەرباز دبیتە (کێلەشین)ێ ل سەر سنوورێ عیراق و ئیرانێ. چیایێ هەلگورد، پاشی ئەو خێچ بەردەوام دبیت هەتا دگەهتە باکوورێ رویبارێ رەواندوزێ و پاشی بەر ب زێی مەزن دچیت هەتا رویبارێ دیجلە.

ژبەر کو ئەڤ دیالێکتە گەلەك بەربەلاڤ بوو، گەلەك شێوەزارێن دیتر یێن ناڤخویی ژێ دەرکەفتینە، چەندەکێ ژێ د جودانە ب ڤی شێوەیی:

١- بایەزیدی (بازیدی): ل باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ دەریا وانێ.

٢- هەکاری: ل باشوور و باشوورێ رۆژئاڤایێ دەریا وانێ.

٣- بۆتانی: ل رەخ و روبێن دۆلا بۆتان، سعرت، ئەرتوش، جزیرێ و ئامەدێ.

٤- شەمدینان: ل کوژیێ باشوورێ رۆژهەلاتێ ترکیا، رۆژهەلاتێ زێی مەزن و دەڤەرێن نێزیك ل ئالیێ ئیرانێ.

٥- بەهدینان: ل پارێزگەها دهۆکێ و هەمی قەزایێن سەر ب وێ ڤە*.

٦- دیالێکتا رۆژئاڤایی: ل خەربۆت و ئورفە و عەفرین و مەرعەش[٥].

دیالێکتا کرمانجیا ژووری ژ ئەنجامێ کاودانێن سیاسی و پویتەپێنەدانا حکومەتێن دەستەلاتدار ل دەڤەرێ، ئەڤ دیالێکتە ما وەکو زارەکێ ئاخفتنێ و نڤیسین هەکە پێ هاتبا کرن ژی تنێ د ناڤ دەستخەتاندا بوویە ئەوژی پتر ب شێوازێ رێنڤیسەکا عەرەبی کو نە کوردییەکا دروست بوویە. ئانکو کرمانجیا ژووری ژ ئەنجامێ چەندین کاودانادا وەك زارەکێ پاشڤەمایی و دویر ژ دەزگەهێن رۆژنامەڤانیێ و ناڤەندێن خواندنێ و رەوشەنبیریێ سەرەدەری ل گەلدا دهاتە کرن. دەڤەرا بەهدینان کو زارێ وێ یێ پەیڤینێ کرمانجیا ژووری یە و سەر ب لیوا مووسلێ ڤە بوو هەتا سالا ١٩٥٨ێ، زمانێ کوردی ب هەر زار و زارۆچکەیەکێ بیت نە لێ دهاتە خواندن و نڤیسین و چ دەزگەهێن رەوشەنبیری و رۆژنامەڤانیێن کوردی ژی لێ نەبوون[٦].

## تورێ زارگوتنێ:

تورێ زارگوتنێ، یانژی تورێ زاردەڤ یێ نەنڤیسی، دهێتە هژمارتن بەربەلاڤترین و زەنگینترین تورێ ئەدەبیێ کوردی ب گشتی و یێ کرمانجی ب تایبەتی، چونکو گەلەك تا و چڤێن ڤی توری د زارێ کرمانجیێ دا هەنە و دبیت د هندەك زارێن دیتردا نەبن، ژبلی دەولەمەندیا وی.

ل دور ڤی تورێ ناڤبری، (پیر خدرێ سلێمان) دبێژیت: (تشتێ نوو بهیستنا ناڤێ چەند شاعرێن کرمانجا کو د ناڤ بەینا چەرخێ شەشێ و هەفتێ کۆچی دا ل لالشێ ل میرگەها شێخا ژیاین و شعرێ دەروێشیێ و خودێناسیێ ب شێوەیا کرمانجیا ژووری نڤیسین و ئەو شیعرنە هەتا نۆکە ژی د سینگێ

هندەك پیرەمێر و ریهسپی و مجێورێد ئێزدییا دا مابن، لێ چاوا بت ب کوردی یەکە رەوانن و بێد وان شاعرانن کو بەری هەشت سەد سالەکی ل میرگەها شێخا ژیاین)[٧].

هزرەك دیتر هەیە دبێژیت: (ل سەدێ (١٢- ١٣ز) و ڤرده زانا و قەولبێژ و چاکێن ئێزدییان یێن وەکو (شێخ فەخرێ ئادیا، پیر رەشێ حەیران، پسێ جەم و ... هتد) بیر و باوەر ب ئاوایێ (قەول، بەیت و قەسیدە) دارشتنە، ئەڤە ژی زێدەتر ل سەر زاری بووینە هەتا کو بهێنە پاراستن و ژبەرکرن ب ئاوایەکی سڤك...)[٨].

ل پەی هزر و بیرێن هندەك نڤیسەران مێژوویا دەستپێکا تورێ کوردی بۆ ڤی ئەدەبی دزڤریت، ئەو ژی ب هەبوونا هندەك قەول و بەیتێن ئایینێ ئێزدییان کو ناڤێ وان کەسان تێدا هاتییە ئەوێن ئەو قەول و بەیت ڤەهاندین، ژ وان ژی (پیر رەشێ حەیران) و (شێخ فەخرێ ئادیا کورێ ئێزدینە میر) کو هەڤچەرخێ شێخ حەسەنێ شێخادیێ دووێ* بوو[٩].

هەکە ئەم قەول و سەبەقێن ئایینێ ئێزدییان ب هۆزان بهژمێرین، دڤێت ئاڤریەکێ ل وان سترانبێژان ژی بدەین ئەوێن پەیڤێن سترانێن خۆ ب هەر رویدان و کریارەکا بیت، وان ڤەهاندین و کرینە ستران و گۆتین، هەر بۆ نموونە ل دەڤەرا زاخۆ دەما شەرێ (تەنکا بانکێ) رویدایی، ب ناڤ و دەنگترین ستران ژ لایێ سترانبێژ (تاهرێ سەعیدێ عەبۆی)یڤە پێ هاتە گۆتن، ل دور ڤێ سترانێ هۆزانڤان و نڤیسکار (خالد حسێن) دبێژیت: (بۆ یەکەم جار کو هۆزانا مللی هاتییە نڤیسین ل دەڤەرێ، ئەوژی ل سالا ١٩١٧- ١٩١٨ێ سترانا تەنکا بانکێ ژ لایێ (تاهرێ سەعیدێ عەبۆ)یڤە هاتییە ڤەهاندن و هەر ژ لایێ ویڤە بوویە ستران). دیرۆکا هۆزانێ ل دەڤەرا زاخۆ ژ ئەڤی مرۆڤی دەست پێ دکەت و دبیت ژی بەری وی ژی هەبن[١٠].

## تورێ نڤیسی:

تورێ نڤیسی لگەل خواندن و نڤیسینێ پەیدا بوویە، هۆزانڤانێن ڤێ رێبازێ بەرهەمێ خۆ ب هندەك بیر و باوەر و هزران ڤە گرێدابوو، هەر ئێکێ شێوازێ خۆ یێ نڤیسینێ هەبوویە و بەرهەمێ خۆ بۆ وێ چینا د ناڤدا دژیا بۆ دنڤیسی و پێڤە دگرێدا.

ب دیالێکتا کرمانجییا ژووری، مێژوونڤیس (ئەنوەرێ مایی) هۆزانڤانەك ب ناڤێ (بابە راخێ هەمزانی) دەستنیشانکرییە کو ئەوژی هەڤچاخێ (بابا تاهرێ هەمەدانی ٩٣٧ - ١٠١٠) یە و هۆزان ب کرمانجی نڤیسینە[١١] ، بەلێ ل دووڤ ڤەکۆلینێن نوی هەبوونا ڤی هۆزانڤانی کەفتییە د گومانێ دا کو وی ل وی سەردەمی هۆزان ڤەهاند بن، هەروەسا هۆزانڤان (پۆرا پۆزا) ئەوێ چ ژ ژیان و بەرهەمێ وی نەدیار تنێ ل دووڤ گۆتنا رۆژهەلاتناسێ رۆسی (ن. فلیا مینوف) ل دورێن ٣٣٠ بەری زایینێ ژیایە[١٢]، بەلێ دووماهی ڤەکۆلین ل دور مێژوویا ئەدەبی ب زارێ کرمانجی ددەتە ئاشکرا کرن کو هۆزانڤان (حەمیدی) ئێکەمین هۆزانڤانە هۆزان ب کرمانجی نڤیسین[١٣].

مخابن چو نیشانێن مانا نڤیسینەکا کوردی ل ڤێ دەڤەرێ پێش هەزارا مشەختی نینن و ئەڤە ڤەدگەرتە گەلەك ئەگەران، وەکی:

- نە ژ مێژە ناڤێ بەهدینان بۆ پارچەیەکێ ژ دەڤەرا هەکاری دهێتە بکارئینان.
- گەلەك زانایێن دەڤەرێ بەرهەمێ خۆ ب زمانێ عەرەبی نڤیسیە و هندەکان ب فارسی.
- میترایەرتسی و پاشی ئێزدیاتی کو گەلەك ژ مێژووا دەڤەرێ ڤەگرتینە، هن رێ نەداینە نڤیسینێ بۆ پاراستنا دەقێن دینی، لەو نڤیسین ب گشتی پاشدا مایە.
- پەیدانەبوونا کیانەکێ ئابووری- سیاسی- رەوشەنبیری ل ئەڤێ دەڤەرێ ... و هتد[١٤].

## ئەدەبێ کلاسیکیێ کورمانجی:

ل دۆر ئەدەبێ کورمانجی ل دەڤەرا بەهدینان، ناڤێ گەلەك شاعرێن ناڤدار و خودان بەرهەم هەنە، کو شعر و هەلبەستێن خۆ ب زمانێ کوردی نڤیسینە، هژمارەکا دیوانێن وان هاتینە چاپکرن و هندەکان ژی تنێ چەند هەلبەستەك ژێ بەلاڤبووینە.

گەلەك جاران ل جەم كوردێن باشوور (مەبەست پێ ئەوێن ب دیالێكتا ناڤەراست دپەیڤن) هەر كەسێ ب كرمانجی نڤیسی، ئەو دهژمێرن بەهدینی، ئانكو وەك ئەدەبێ كورمانجی سەرەدەری ل گەلدا دهێتەكرن، بێی هزرێ ل سنوورێن جوگرافی یێن دەڤەرێ بكەن و بزانن هەر چەند هۆزانڤان یێن پارچەیەكێ نە و هەر هندەك یێن دەڤەرەكێ نە.

## ئەگەرێن سەرهلدانا ئەدەبیاتا كرمانجی:

ئەدەبیاتا كرمانجی ژ كارتێكرنێن ئەدەبیاتێن دەوروبەر سەرهلدا، چونكی خواندن و نڤیسین ل مزگەفت و مەدرەسەیێن ئایینی هەمی ل دەستپێكێ ب زمانێ فارسی بوو، پشتی هاتنا ئایینێ ئیسلامێ ئەدەبیاتا عەرەبی ژی جهێ خو گرت و خواندن ب زمانێ عەرەبی پتر بوو، نەخاسمە ل دەڤەرا بەهدینان كو پتریا خەلكێ وێ زمانێ عەرەبی دزانن بۆ وان ب ساناهیتر بوو، هەروەسا تێكەلی و هاتن و چوون پتر ل گەل عەرەبان بوویە و ئایینێ وان ژی یێ ئیسلامێ كوردان زوی وەرگرت و لدووڤچوون.

ئەدەبێ كرمانجی ژ بەر چەندین ئەگەران پەیدابوو، ئانكو رێك بوو هاتە خۆشكرن و هەستا كەسێن نیشتمان پەروەر و خواندەڤان هاتە لڤاندن و بۆ ئاشكرا بوو كو خودان مافن و پێدڤییە ل مافێن خۆ بپرسن. ژ وان ئەگەرێن كارتێكرنەكا باش پەیدا كری، وەك:

- رویدانا سەرهلدانێن كوردی یێن ئێك ل دووڤ ئێكێ كو داخـوازا سەرخۆبوونا كوردستانێ دكرن یان ژی مافێن رەوایێن مللەتێ كورد، وەكو سەرهلدانا شێخ عوبەیدوڵلاهێ نەهری ل سالا ١٨٨٠ێ، سەرهلدانا بدلیسێ ل سالا ١٩١٤ێ، سەرهلدانا شێخ سەعیدێ پیران ل سالا ١٩٢٥ێ و سەرهلدانێن دیتر.
- دەركەفتنا رۆژنامەیا (كوردستان) وەكو دەستپێك ل قاهیرە ل سالا ١٨٩٨ێ، كو دگەهشتە كوردستانێ و شیا ببیتە زمانحالێ خەلكی و كار د پێشكەفتنا ئەدەب و رەوشەنبیریا كوردی دا كر.
- پەیدابوونا كۆمەڵە و یانێن سیاسی و رەوشەنبیری ل (ستەنبۆلێ) و باژێرێن دی یێن كوردان، كو ڤان كۆمەڵەیان بەلاڤكرنا رەوشەنبیری و دەرئێخستنا رۆژنامە و كۆڤاران و ڤەكرنا قوتابخانەیێن كوردی ب ستویێ خۆڤە گرتبوو.
- مشەختبوونا تەخەیەكا مەزن یا رەوشەنبیر و كەسایەتییان پتر ژی ژبەر ئەگەرێن سیاسی بۆ دەرڤەی كوردستانێ و بەلاڤبوونا وان ل هندەك وەلاتان وەكو تركیا و وەلاتێن عەرەبی و یێن رۆژئاڤا و ل وێرێ ب سەر هندەك رەوشەنبیریا نوی هەلبوون و پێ داخبار بوون.
- دانانا چاپخانەیێن كوردی ل دەرڤەی كوردستانێ و كوردستانێ بخو ژی، یەكەمین چاپخانەیا كوردی، (چاپخانەیا كوردستان) ئەوا (شێخ فەرەجوڵلا زەكی كوردی) ل سالا ١٩٠٠ - ١٩٠٩ ێ زایینی ل قاهیرە دانای، پاشی چاپخانەیا (حسێن حوزنی موكریانی) ل سالا ١٩١٥ێ زایینی ل (حەلەبێ) دانای، پاشی ل سالا ١٩٢٥ێ هاتییە ڤەگوهاستن بۆ بەغدا و چاپخانەیێن دیتر كو پشكداری د چاپكرن و بەلاڤكرنا پەرتووكێن كوردی دا دكر[١٥].

# قۆناغا ئێكێ ١٩٠٠ - ١٩٧٠

## دەستپێكا بزاڤا رەوشەنبیریا كوردی ل دەڤەرا بەهدینان:

د ڤێ قۆناغێدا چەندین هۆزانڤانێن كورد ل دەڤەرێ هەبوون، بەلێ دەلیڤە ل بەر نەهاتبوو ڤەكرن كو بشێن بەرهەمێن خۆ بەلاڤ بكەن و ببیتە بنیاتەك بۆ بزاڤا ئەدەبێ كوردی یێ كرمانجی ل دەڤەرا بەهدینان، كەڤنترین دەقێن ب كرمانجی هاتینە چاپكرن چەند هۆزانەكێن (پەرتۆ بەگێ هەكاری) بوون كو ژ لایێ (حسێن حوزنی موكریانی) ڤە ژ دەستنڤیسەكێ وەرگرت بوون و د كۆڤارا (زار كرمانجی) دا ئەوا ل سالێن ١٩٢٦ - ١٩٣٢ێ ل رەواندزێ دەردكەفت

بەلاڤکربوون[16].

ل دەڤەرا زاخۆ ناڤێ (عەبدوللا خەیات) دهێت ئەو بخۆ خەلکێ دەڤەرا جزیرا بۆتانە و ل سالا 1942ێ، د ئەڤێ قۆناغێ دا ل باژێرێ زاخۆ ژیایە و و دەست ب نڤیسینا هۆزانێ کربیە، هۆزانەك بۆ (چەرچلی) سەرۆکێ ئەنجومەنێ ئینگلیزی فرێکر بوو ب رێیا پۆستەی پشتی عیراق ژ بریارێن (عصبة الامم) لێڤەبووی[17].

(رێزمانا کوردی) ئەوا (مەلا محەمەد سەعیدێ بریفکانی/ 1897- 1976) دانای کو ل خواندنگەهان بهێتە خواندن پشتی بریار هاتییە دان کو خواندن ل دەڤەرێن کوردان ب زمانێ کوردی بیت[18]. بزاڤ بۆ هاتینە کرن کو ئەڤ رێزمانە ل دەڤەرا بەهدینان بهێتە خواندن و وەکو دبێژن بۆ دەمەکی هاتییە خواندن[19]. بەلێ مخابن خواندن ب زمانێ کوردی گەلەك پاشڤە ما و نەهاتە خواندن، ڤێ چەندێ ژی کارتێکرنەکا مەزن ل سەر بزاڤا رەوشەنبیری و ئەدەبی کر کو ئەوژی گەلەك پاشڤە ما هەتا کو دەست ب نڤیسین و وەشانێ کری.

رۆژنامەڤانیا کوردی ل دەڤەرێن دیتر کارتێکرنا خۆ ل سەر دەڤەرا بەهدینان هەبوو، نەخاسمە دەرکەفتنا کۆڤارا (گەلاوێژ) ل بەغدا و کۆڤارا (هاوار) ل شامێ، ل دووڤدا ژی کۆڤارا (رۆناهی) هەر یا شامێ، ئەو کەسێن حەزا خواندن و نڤیسینێ هەی شیان ب شیانێن خۆ پشکداریێ د وان کۆڤاران دا بکەن و ببنە خواندەڤانێن بەردەوامێن وان و بابەتان ژی تێدا بەلاڤ بکەن.

ژ ئەوان نڤیسەرێن بەراهیێ دەست ب نڤیسینێ کری د ئەوان کۆڤاران دا، ل بەراهییا هەمیان ناڤێ (سەیدا صالح یووسفی) دهێت ب هۆزانەکێ ب ناڤێ (هیڤیا مە) دکۆڤارا (هاوار)ێدا بەلاڤکری[20]. هەروەسا چەند نڤیسەرێن دیتر ژی پشکداری د نڤیسین و بەلاڤکرنێدا کر وەکو: (شێخ مەمدووحێ بریفکانی) ب هۆزانا (پیرۆزیا جەژنێ) ل هژمارا (50) چریا پێشین 1942، (مەلا ئەنوەرێ مایی) ب هۆزانا (بەیتا کەوی) ل هژمارا (52) ل رۆژا 20 کانوونا پاشین 1943، (صالح بامرنی) ب هۆزانا (هۆزانا هاوارێ) ل هژمارا (55) ل رۆژا 15 خزیرانا 1943[21].

هەروەسا د کۆڤارا (رۆناهی) یا شامێ دا، ل ناڤبەرا سالێن 1943 - 1944ێدا ژی چەند نڤیسەران پشکداری د بەلاڤکرنێدا کریە وەکو: (ئەنوەر مایی، دلکولێ دۆسکی، ئەرمەغانی، ئەلهۆیێ بێدوهی، صالح روشدی، ژاندار میرزەنگ و خ. بامەرنی)[22].

دیسان کۆڤارا (گەلاوێژ) ئەوا ل باژێرێ بەغدا ل ناڤبەرا سالێن 1939 - 1949ێدا دەرکەفتی، هژمارەکا نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان تێدا پشکدار بوون ب چەند بابەت و هۆزانێن نوی، ژ ئەوان نڤیسەران (صالح یووسفی، ئەنوەر تاهر بەرواری (مایی)، تاهر روشدی و لاوێ بەهدینی)[23]. بەلێ بۆ دەمەکی ئەڤ بزاڤە هاتە راوەستاندن ژ ئەگەرێ نەگەهشتنا وان رۆژنامە و کۆڤاران کو یێن شامێ هاتنە راوەستاندن و یا گەلاوێژ ژی ژبەر کاودانێ سیاسیێ عیراقێ نەدگەهشت.

(حەیدەر مەتینی) ژ ئەوان هۆزانڤانا بوو، یێن د سالێن چلاندا دەست ب نڤیسینا هۆزانێ کری و ل دور بیرهاتنێن وان سالان و تێکەلیا نڤیسەر و هۆزانڤانان دگەل ئێکدا دبێژیت: ( ئەم چەند هەڤال و هەڤگور ڤێك دکەتین و پێکڤە ئەم دچوینە سەیرانا ل دەڤەرا بەغدا، بەعقوبە، کەمالیێ، سلمان پاك، سدە الهندیە و مە گوتار و هۆزانێن کوردینیێ و نیشتمان پەروەریێ دخواندن و ل سەر ئێش و نەخۆشی وگرفتاریا کورد و کوردستانێ دیاردکرن، و هەر رۆژێن ئەینی ئەم گەلەك د چوینە یانەی سەرکەوتن (نادی الارتقاء الکردی) ل نێزیك (باب المعظم) بوو، ژ وان برادەران ئەوێن ئەم ل وێرێ ڤێك دکەتین ئەڤە بوون: صدیق ئەتروشی، صادق بهاءالدین، محمد سعید دوسکی، ابراهیم دوسکی، محمد أمین ئوسمان،..... و گەلەکێن دی)[24].

ل سالێن پێنجییان دا هۆزانڤانێ ناڤدار (ئەحمەدێ موخلص/ نالبەند) ل سەر نڤیسینا هۆزانێ د کاروانەکێ بێ راوەستیان دابوو، گەلەك جاران کاغەز ب دەست نەکەفتینە هۆزانان ل سەر بنڤیسیت، وی دەمی ئەو ل گوندێن دەڤەرا زاخۆ دژیا، ل زاخۆ بۆ

جارا ئێکێ د چارچووڤەکێ ئەدەبی دا هۆزان هاتییە خواندن ژ لایێ ویڤە بوویە، (ل پەی گۆتنا (خالد حسێن) دەربارەی بزاڤا ئەدەبی ل دەڤەرا زاخۆ دبێژیت: (بۆ یەکەم جار هۆزان د چارچووڤەکێ ئەدەبی دا ل زاخۆ دیار بوویە، ل سالا ١٩٥٣ێ هەلبەستەك ژ لایێ هۆزانڤانێ مەزن (ئەحمەدێ نالبەند/ موخلص) ڤە ل فیستەڤالا وەرزشی هاتە خواندن)[٢٥]، هەروەسا ل سالا ١٩٥٧ێ ل پەی گۆتنا (د. مەسعود کتانی)، ئەوی و ئەحمەدێ نالبەند د ئاهەنگا جەژنا رۆژا داران (عید یوم الشجره) دا کو هینگێ وە دگوتە جەژنا نەورۆزێ ل بەرامبەر جەماوەرەکێ زۆر ل ئامێدیێ هۆزان خواندینە[٢٦]. ئانکو چالاکیێن ئەدەبی ب وی شێوەی دهاتنە گێران و کۆڕێن تایبەت بۆ خواندنا هۆزانێ هینگێ نەبووینە.

د ڤێ قۆناغێ دا گەلەك هۆزانڤان هەبوون و بەرهەمەکێ جوان و باش ل بەردەست بوو، بەلێ ژبەرکو ل دەڤەرا بەهدینان چ بیاڤێن بەلاڤکرنێ دخوش نەبوون، لەورا ئەو بەرهەمێ تنێ ما دناڤ دەفتەرکێن وان دا و ل دەمێ پێدڤی نەهاتە بەلاڤکرن.ژ وان هۆزانڤانان وەکو سەیدا صالح یووسفی کو ئێك بوویە ژ مەزنترین هۆزانڤانێن وی دەمی، هەروەسا محمد عەلی یونس تۆڤی و حافز مایی و مەسعوود کتانی و ئەحمەدێ نالبەند و رێبەر و شێخ غیاسەددین نەقشبەندی و تاها مایی و تاها سەلیم و صدیق ئەتروشی و تاهرێ روشدی و گەلەکێن دیتر، هەر چەندە هندەك ژ وان کتەکا کێم ژ هۆزانێن خۆ بەلاڤکرن، بەلێ وەکو پێدڤی ل ناڤ مللەتی نەهاتنە نیاسین و ئەو جهێن لێ بەلاڤدکرن، هەمی ژ دویری باژێرێ دهۆکێ بوون.

دیسان کۆمەکا دی یا هۆزانڤانان هەبوون، پتر د گرێدایی خواندنا ئایینی و مزگەفت و مەدرەسەیێن دینی بووینە و زێدەتر د ناڤ جڤاکا مەیلاندا هاتبوونە نیاسین، وەکو (مەلا خەلیل مشەختی، شیخ بەشیر شێخ محمد تاهر، عبدالرحمن شەوقی، حوسنی بامەرنی، مەلا نورەدینێ سندی، محمد خالد قازی ئاکرەیی، سەلمان شووشی)، ژلی هندەك وەك شاعرێن مللی هاتبوونە نیاسین کو هۆزان و ڤەهاندنێن وان وەکو بەیت دهاتنە ڤەگێران و ژبەرکرن و گۆتن وەکو: (نادرێ کانیسارکی، حەمید سلێڤانەی، مەلا سالح ئێتویتی) و گەلەکێن دیتر.

## شۆرشا ١٤ی تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ:

پشتی رویدانا شۆرشا ١٤ی تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ، گەلەك گوهۆرینێن مەزن و دەستکەفتیێن گرنگ بۆ تەڤایا خەلکێ عیراقێ بجهـ هاتن، گەلێ کورد ژی پشکەك ژ ئەڤان گوهۆرین و دەستکەفتان ڤ بەر کەفت. گومان ژی تێدا نینە کو پشکەك ژ ئەڤێ پشکێ ڤ بەر خەلکێ دەڤەرا بەهدینان کەفت، ژ ئالیێ رەوشەنبیری و خواندنێ ڤە بۆ ئێکەمین جار ئێزگێ کوردی یێ بەغدا پویتەکێ باش دا کرمانجییا ژووری و پشکەك ژ دەمێ خۆ بۆ تەرخانکر، هەروەسان بۆ یەکەمین جار ژی خواندنا کوردی ب زارێ کرمانجییا ژێرێ ل دەڤەرێ هاتە خواندن، ڤەکرنا بارەگایێن حزبی و گەهشتنا هەموو جورێن کۆڤار و رۆژنامێن کوردی و عەرەبی بۆ دەڤەرێ، ڤێ هەمییێ دەلیڤە ل بەر نڤیسکارێن دەڤەرا بەهدینان ژ دەستەکا سالێن چلان و یێن پشتی وان ژی پێکەهشتین ڤەکر کو ب خورتی بهێنە مەیدانا نڤیسینێ و ب بەلاڤکرنا بەرهەمێن خۆ د کۆڤار و رۆژنامێن کوردیدا تێهنا وان نە شکەست، بەلکی بزاڤکرن ئەو ب خۆ ببنە خودان کۆڤار و رۆژنامە و د ڤێ قۆناغێدا ژ ئەنجامێ رەنجا (جەرجیس فەتحوڵلا و ئەنوەرێ مایی)، رۆژناما (الحقیقە / راستی)[٢٧] ب کوردی و عەرەبی وەك یەکەمین رۆژناما کوردی - عەرەبی یا باژێرێ (مووسل) بەلاڤکر[٢٨].

بەلێ ئەڤێ رۆژنامێ (راستی) کو هەر هژمارەکێ پشکەك بۆ نڤیسین و بەلاڤکرنا ئەدەب و مێژوویا کوردی تەرخانکربوو ژ نڤیسین و بەرهەڤکرنا (ئەنوەرێ مایی) بوو، یان ژی دا ب ناسناڤێ (رێبەر) بەلاڤکەت کو دەستپێکەکا باش بوو بۆ رۆژنامەڤانیا کوردی ب زارێ کرمانجییا ژووری. بەلێ مخابن تێهنا نڤیسکار و رەوشەنبیرێن دەڤەرا بەهدینان نەشکاند،

ب دیتنا مە ژبەر هندێ رەحمەتی (حافز قازی) هزر ل دەرئێخستنا کۆڤارا (روناهی) کر و ل مەها چریا ئێکێ یا سالا ۱۹٦۰ێ ل بەغدا کۆڤارێ رۆناهی دیت پشتی ماندیبوونەکا مەزن پێڤەبری هەتا بریارا دەرکەفتنا وێ هاتییە دان کو ب ئێکەمین کۆڤارا کرمانجییا ژووری ل عیراقێ و باشوورێ کوردستانێ دهێتە هژمارتن[٢٩] .

(مەلا ئەنوەرێ مایی) ژ هاریکار و پشتەڤانێن بیر و باوەرێن شۆرشا تیرمەهێ بوویە، هێز و ڤەژەنا خۆ ژبۆ بیر و باوەرێن وێ و بەرەڤانی و پشتەڤانییا وان د رۆژناما (راستی) یێدا یاکو تێدا کار دکر تەرخان کریبوو[٣٠]. هەروەسا پەرتووکا خۆ (محاضرە عن الاكراد في الصين) ل سالا ۱۹٥۹ێ ل بەغدا بەلاڤکر کو وەکو سمینار ل (چین)ێ بەری هینگێ ژ لایێ ویڤە هاتبوو خواندن[٣١].

دامەزراندنا ئێزگێ کوردی ل بەغدا، ئەوێ ژی گرنگییەکا خۆ هەبوویە د بیاڤێ ئەدەبیاتا کرمانجی دانەخاسمە پشتی شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ، ب تایبەت ژی دەما هێژا (حافز قازی) هاتییە راسپاردن بۆ ب رێڤەبرنا پشکا کرمانجی یا ئێزگەی، ئەوی هەر زوی کۆمەکا ئەدیب و نڤیسەرێن کرمانج ئەوێن ل بەغدا ل خۆ کۆمکرن، ل دور ڤی بابەتی کو بوویە دەستپێکەك بۆ بزاڤا ئەدەبیاتا کرمانجی، د (بیرەوەری) یێن خۆ دا ئاشکرا دکەت کو ل سپێدەیا رۆژا ١٦ی تیرمەها ۱۹٥۸ێ هاتییە ئاگەهدارکرن بۆ وەرگرتنا بەرپرسیارییا پشکا کرمانجی و هەر وێ ئێڤارێ ل گەل رێڤەبەرێ رادیۆیا کوردی ل بەغدا (کامل أمین) پێکڤە روونشتینە و چەند ناڤەك دەست نیشانکرینە بۆ کارکرنێ وەکو (سەیدا صادق بەهائەددین/ مامۆستایێ ناڤنجیا (غەربیە)، و تەحسین ئەحمەد بەگێ بەرواری ڤوتابیێ کولیژا حقوقێ)، سەیدا ددەتە ئاشکراکرن کو هەر وێ ئێڤارێ (۱۹٥۸/۷/١٦ێ) ل پشت میکرۆفۆنا ئێزگەی روینشت و بۆ ئێکەمین جار د مێژوویا رادیۆیا کوردیدا ل بەغدا، پەخشا دەنگوباسێن جیهان و لێکولینا سیاسی ب زارێ کرمانجی گەهشتنە گوهداران، پشتی هەفتیەکێ، دیسان ب دەنگێ (ئەنوەر مایی) بابەتەك ل دور مێژوویا ئەدەبێ کوردی پێشکێشی گوهداران کر، ئەڤ چەندە بۆ هاندانەك کو ئەڤ بزاڤە بەرفرەهتر لێبهێن و پتر پەیوەندی هاتنە خورتکرن و بیاڤێ زارێ کرمانجی د ناڤ رادیۆیێ دا مەودایەکێ مەزنتر وەرگرت[٣٢].

ژ نڤیسەرێن د سالێن پێنجیاندا پێگەهشتین و پشتی شۆرشا تیرمەها ۱۹٥۸ێ هاتینە مەیدانا نڤیسینێ وەکو: (صادق بەهائەددین، د.صدیق ئەترووشی، حافز مایی، محەمەد ئەمین ئۆسمان، محەمەد عەلی یونس، مەلا خەلیل سلێمان (مشەختی)، حەسەن جندی و تاهر روشدی) و هندەکێن دیتر، هەروەسا پشتی شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ سەرکەفتن ب دەستڤە ئینای، یاسا و دەستورێن نوی هاتنە دانان، رەوشەنبیری و ئەدەبێ کوردی پتر بەلاڤ بوو. هندەك رۆژنامە و کۆڤار ب کوردی و عەرەبی دەرکەفتن، ناڤێن چەند نڤیسەران هۆزانڤانان بەری ڤێ شۆرەشێ هەبوون وەکو (ئەحمەدێ موخلص/ نالبەند، ئەنوەر مایی و شێخ مەمدووحێ بریفکانی و رێبەر و ... هتد). بەلێ ب هەبوونا ڤێ شۆرەشێ، هۆزانێن هۆزانڤانەکێ وەکو (نالبەندی) ئاشکەراتر و دژوارتر لێهاتن و پتر بەرەڤانی ژ مافێن رەوا و دروست یێن مللەتێ خۆ دکر، نیشانا راست بۆ مللەتی دیارکر و رێکا مللەتێ خۆ بەرنەدا، هەتا سەرێ خۆ ژی ل گەلدا بن ئاخ کری،[٣٣].

ئەڤان نڤیسەران د سالێن شێستان دا ژی بەردەوامی دا کاروانێ بزاڤا نڤیسینێ و بەلاڤکرنێ، هەروەسا هندەك نڤیسەر و زانایێن دیتر ستێرا وان گەش بوو و خۆ هاڤێتنە ڤادا خزمەتێ و کارێ نڤیسینێ گرت، وەك: (صادق بەهائەددین ئامێدی، محەمەد ئەمین ئۆسمان) دیار بوون و خۆ دا نیاسین و ناڤێن وان کەتنە سەر بەرپەران[٣٤] و هاتنە مەیدانێ و هەر ئێکی ژ لایێ خۆڤە بزاڤەك دکر.

هۆزانڤان (حافز مایی) پشتی سالا ۱۹٦٥ێ کولیژا ئادابێ پشکا زمانێ کوردی ب دووماهی ئینای، کو ب تنێ ئەڤ نڤیسەرە یێ تایبەتمەند بوو ب زمان و

ئەدەبیاتا کوردی، وی د کۆڤارا (رۆژی نوێ) هژمارا (٤) یا سالا ١٩٦١ێ دا، ئێکەمین بەرهەمێ خۆ هۆزانەك بەلاڤکر، پاشی بەردەوامی دا نڤیسین و بەلاڤکرنێ د رۆژنامە و کۆڤارێن (رۆناهی، پێشکەوتن، دەنگی کورد، هاوکاری و دەنگی مامۆستا) دا[٣٥] و هەتا نوکە ژی یێ بەردەوامە.

ل دور بەلاڤکرنا هۆزانێن (حافز مایی) د کۆڤارا (رۆناهی) دا، خودانێ وێ (حافز قازی) دبێژیت: (حافز انور مایی ل بەغدا قوتابی بوو، هندی من بابێ وی دڤیا ئەو ژی ل بەر دلێ من شرین بوو، ئێڤارەکێ هاتە جەم من، یێ دو دل بوو هەکو پارچە شعرەکا خۆ ل بن ناڤێ (ئەرێ کوردین هەتا کەنگی) نیشا من دای. پشتی من شعر خاندی من دیت خورتێ مە بەهرەدارە و پێویستی ب هاندانێ یە، وان رۆژا کوتایی ب چاپکرنا کۆڤارا (رۆناهی) دا هێت، من ژی گوتێ، دێ هەولێ دەم ڤێ پارچە شعرێ د ڤێ هژمارێ دا بەلاڤکەم، ژ کەیفادا ئەو چەند باوەر نەکر. رۆژا دووێ من شعر دا دەستێ سەیدایێ (هەژار)، دەمێ خاندی گۆت:

- ئەڤە چیە؟

- ئەڤە شعرا گەنجەکێ خودان بەهرەیە، تکایە ل ڤێ ژمارێ بەلاڤکە[٣٦].

سەیدا (حافز قازی) د بیرهاتنێن خۆ دا ب درێژی ل دور چەوانیا بەلاڤکرنێ ئاخفتییە و چەوا هەژار رازی کرییە بدانیتە جهێ شعرەکا (سەیدا سالح یووسڤی).

تشتێ بالکێش د ژیانا ڤان نڤیسەراندا، پتریا وان ئەو ب خۆ فێر بوونە خواندن و نڤیسینا کوردی بێی کو دەرچوویێن چ خواندنگەهـ و کۆلیژێن زمانی و ئەدەبێ کوردی بن. ئانکو نڤیسەر و هۆزانڤانێن وەکو (ئەحمەدێ موخلص و ئەنوەرێ مایی و شێخ مەمدووحێ بریفکانی) مرۆڤێن ئایینی بوون، بەلێ (صادق بەهائەددین و محەمەد ئەمین ئۆسمان و حافز قازی و صالح یووسڤی و حافز مایی) دەرچوویێن کولیژێن جودا جودا بووینە و فەرمانبەر بووینە، بەلێ عەشق و ڤیانا وەلاتی و مللەتی چریسکا رۆناهیێ د دلێ وان دا گەش کر و بێی هەبوونا پاشەزینکەکا باش کو وەکو سەرۆکانی بۆ هزر و بیرێن خۆ مفای ژێ وەربگرن لبەر دەست نەبوویە ژێلی کەلتوورێ کلاسیکان و تورێ زاردەڤ و زارگۆتنا کوردان (فولکلۆر) ێ زەنگینێ د سینگێ کالەمێراندا ڤەشارتی و پاراستی.

ئەڤ نڤیسەرە هەمی ب دەستەکا سالێن پێنجیان و شێستان دهێنە نیاسین و پتریا وان چووینە بەردلۆڤانیا خودێ. هەروەسا تشتێ رەوشەنبیرێن ئەڤێ قۆناغێ ژ هەمی قۆناغێن دی جودا دکەت، دووریا نڤیسەرانە ژ دەڤەرێ، ئانکو پرانیا رەوشەنبیر و هۆزانڤانێن دەڤەرێ بزاڤا خۆ ل دەرڤە (بەغدا و مووسل) کرینە[٣٧].

ل مەها شوباتا سالا ١٩٦٠ێ (پارتی دیموکراتی کوردستان) هاتە دەستویردان کو ب شێوەیەکی فەرمی بارەگای ل بەغدا و باژێرێن کوردستانێ دانان، رۆژناما (خەبات) زمانحالێ پارتی رۆژانە هەتا (١٥) هزار دانە ل بازارا هاتنە فرۆتن[٣٨]. ب دەرکەفتنا ئەڤێ رۆژنامەیێ، گەلەك نڤیسەر پەیدا بوون، هەر چەندە ب زمانێ عەرەبی بوو، بەلێ ئەڤە بۆ ئەگەرێ هندێ کو ل دووڤدا رۆژناما (برایی) و کۆڤارا (برایەتی) دەرکەڤن و بابەت ب هەر دوو شێوە زاران تێدا بهێنە بەلاڤکرن.

ژ نڤیسەرێن پشکداری د بەرێەرێن رۆژناما (برایی) دا کرین، هەر بۆ نموونە سەیدا (صادق بەهائەدین ئامێدی) دگوتارەکا خۆ دا ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو د هژمارا (٣٠٠) رۆژا ١٩٦٨/٦/٢٩ێ گوتارەك ل دور (هۆزانڤانێ کلاسیکی یێ ب ناڤودەنگ عەلی حەریری) دا بەلاڤکر بوو[٣٩].

دیسان ل دووماهییا سالا ١٩٦٩ێ و ل ناڤ سەروبەرێ ئامادەکرنێ بۆ رێککەفتنا (١١)ی ئادارێ، نڤیسەرێن کورد خۆ گەهاندە ئێك و داخواز ژ حکومەتا عیراقێ کر کو ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد بهێتە دامەزراندن، دا دەربرینێ ژ هزر و بیرێن وان بکەت و ببیتە دەلیڤەیەك بۆ دیارکرنا بەهرەمەندی و ئافراندنا نڤیسەرێ کورد ل کوردستانا عیراقێ[٤٠].

ئەڤ پێنگاڤا دامەزراندنا ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد، ببوو رێخوشکرنەك کو ب رێیا وێ، ل سالا

١٩٧٠ لقەك ل پارێزگەها دهۆكێ ژی بهێتە ڤەكرن.

ل دەستپێكا سالا ١٩٧٠ێ، هۆزانڤان (صالح عەلی گولی) شیا ئێكەمین دیوانا خۆ ب ناڤێ (زێرگول) بگەهینتە چاپێ ل بەغدا ل چاپخانا (إرشاد)، تێدا (٣٦) هۆزان بەلاڤكربوون، كو هەمی ل سەر شێوا كلاسیكی هاتبوونە ڤەهاندن. دیوان ب قەبارێ مەزنە و ژ (٩٢) لاپەران پێك دهێت.

ل دووماهیا سالا ١٩٧٠ێ د كەشەكێ ئازاد دا یێ پشتی بەیاننامە ١١ی ئاداری، كوڤارا (چیا) ژ لایێ سەیدا (بەدرخان سندی) ڤە هاتە وەشاندن و ژمارە (١) ل مەها چریا دووێ ل كەركوكێ دەركەفت، ژبەر كو ئەو مامۆستا بوو ل هەولێرێ، پاشی هژمارا دووێ ڤەگوهاستە دهۆكێ پشتی چاپخانە ل دهۆكێ هاتیە ڤەكرن ل مەها شواتێ هاتە چاپكرن.

## قۆناغا دووێ:
## دەستەكا سالێن ١٩٧١ - ١٩٨٠

رەوشا ئەدەبی، ب تایبەتی د بوارێ هۆزانێ دا ل كرمانجیا ژووری (دەڤەرا بەهدینان) هەتا سالێن حەفتێیان ب شێوەیەكێ گشتی ژ بزاڤا هۆزانا نوی یا كوردی یا دویر بوو، چونكی ژ لایێ شێواز و رۆخساری ڤە، كێشا عەرووزی و هۆنەرێن رەوانبێژیا عەرەبی - ئیسلامی ب سەردا دزاڵ بوون، هەروەسا ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە ژی، بابەتێن كەڤن وەكی ئەڤینداری، ستایش و ئایینی.. هتد پتر دهاتنە بەحسكرن، لێ (ل سالێن حەفتێیاندا، بزاڤا هۆزانا نوی دەست پێكر، كو ئەوژی نویكرن د هۆزانێ دا، ژ لایێ رۆخسار و ناڤەرۆكێ ڤە بوو)، واتە قالبێ هۆزانێ ژ لایێ كێشا عەرووزی و سەروا و قافیێ ڤە، هاتە شكاندن و بابەتێن وان پتر گرێدای كێشا نەتەوەیی و خەباتا چەكداری و ئاریشێن بەروەختێن (جڤاكی، رامیاری، ... هتد) بوون[41].

ل دور دەستەیا نڤیسەرێن دەستپێكا سالێن حەفتێیان، سەیدا (رەشید فندی) دبێژیت: (جیلێ سالێت حەفتێ یا، جیلەكێ بەختەوەرتر بوو ژ یێ بەری وان، پشتی بەلاڤكرنا بەیاننامە یازدەی ئاداری ل سالا ١٩٧٠ێ... بزاڤەكا ئەدەبی و رەوشەنبیریا مەزن ل دەڤەرێ پەیدابوو، كو هەر ژ بەری بەیانێ بریارا دامەزراندنا هژمارەكا رۆژنامە و كوڤارێت كوردی هاتبوو دان، و گەلەك دەزگەهێت كوردی بنواشێ بەلاڤكرنا پەیڤا جوانا كوردی دانا، مینا دەزگەها رەوشەنبیری و بەلاڤكرنا كوردی، یا رۆژناما حەفتەیی (هاوكاری) بەلاڤ دكر، دگەل كوڤارا (بەیان) یا هەیڤانە و كوڤارا (روشنبیری نوێ) یا وەرزی...). چەند گوڤارێن دیتر دەركەفتن وەكو و (برایی) و (برایەتی) و پاشی رۆژناما (برایەتی)، (رۆژی كوردستان)، دیسان پشتی رێڤەبەریا خواندنا كوردی ڤەبووی، گوڤارەك ب ناڤێ (پەروەردە و زانست) بەلاڤكر[42]، سەیدا (جەمال خەزنەدار)ی كوڤارا (دەفتەری كوردەواری) بەلاڤكر و گەلەكێن دیتر كو هندەك ژ وان نڤیسەرێن سالێن پێنجییان و شێستان بەردەوامی دا نڤیسینێ پشكداری تێدا دكر.

نڤیسەرێن سالێن حەفتێیان ژی وەكو یێن بەری خۆ، چوو سەرو كانی یێن بەرفرەە ل بەر دەستێن وان نەبوون، پەرتووكخانا وان یا ئەدەبێ كوردی یا ژار و لاواز بوو، ژنوی وان دندك دندك بخۆ كوم دكر، و هێلینێن خۆ زلك زلك ئاڤاكرن، سوود و بهایەكێ باش ژ یێن بەری خۆ وەرنەگرت، جەماوەرێ ئەدەبی، نەمازە ل دەڤەرا بەهدینان یێ لاواز و كێم بوو، هەر چەندە ب دل گەرمی دهاتە قادا ئەدەبی، بۆ نموونە رۆژناما (هاوكاری) كو ل وی دەمی ل دەست پێكرنا سالا ١٩٧٠ێ، چەند هژمارەك ب تنێ ل دهۆكێ دهاتنە فرۆتن... هەروەسا كوڤارا (بەیان) و یێن دی ژی، هەر چەندە شەیدا و سەرگەرمێن ئەدەبی دكێم نەبوون، بەلێ ژبەر بەلاڤ نەبوونا خواندنا كوردی ل دەڤەرێ بكرێت چاپكرییێن كوردی دكت كتە بوون[43].

ژ وان ناڤێن گەش یێن دەستپێكرنا سالا ١٩٧٠ێ هەتا سالا ١٩٨٠ێ و هەتا نوكە ژی ئەوێن ساخ ل سەر نڤیسین و بەلاڤكرنێ دبەردەوامن، ژ وان ناڤان: (كەریم فندی، عبدالرحمن مزووری، رشید فندی، فیصل مصطفی، خالد حسێن، انور محمد طاهر، حجی جعفر، محسن قۆچان، صدیق حامد، مصطفی نوری بامەرنی، خدرێ پیر سلێمان، صدیق شەرۆ،

نزار محمد سعید)[٤٤]، هەروەسا د بیبلیۆگرافیایێن رۆژنامەیا (هاوکاری) و کۆڤارا (بەیان) و (رۆشنبیری نوێ) دا، ناڤێ هندەك نڤیسەرێن دیتر ژی بەرچاڤ دبن، دبیت کو ژێدەرێ چوویی ئاماژەپێ نەمریە، وەکو ( مەلا خەلیل مشەختی، مەلا عبدالکریم کروری (رێبەر)، محمد امین ئاغۆك ئاکرەیی، خەلیل محمد دهۆکی، رویبار عبدالرحمن، سەگڤان عبدالحکیم، خلیل جندی، احمد قەرەنی، ڤەهیل ئامێدی، تاها مایی، صالح علی گولی، صدیق حامد، عمر علی بادی، علی نەقشەبەندی، فارس عبدالله حەمو، مصدق تۆڤی، معصوم مایی، موئەیەد تەیب)[٤٥].

ل رۆژا ١٩٧١/٨/١٢ێ ئەندامێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد ل هۆلا ئامادەیا کاوە بەرهەڤبوون دا کو لقێ دهۆکێ بهێتە ڤەکرن، دەستەکا ئێکێ ژ ئەڤان نڤیسەران پێك دهات:

- شێخ مەمدووح بریفکانی سەرۆکێ لقی
- محەمەد حەویز جێگرێ سەرۆکی
- خەلیل دۆسکی سکرتێر
- علاءالدین سەعید ژمێریار
- مەلا عبدالکریم کروری ئەندام
- رەشید فندی ئەندام
- محەمەد تاهر گوهەرزی ئەندام

پشتی ئەڤ لقە هاتییە ڤەکرن، چەندین چالاکی و بزاڤ هاتنە کرن و هەتا بهارا سالا ١٩٧٣ێ بەردەوام بوو، پاشی هندەك گوهۆرین هاتن کرن و ئەحمەد عەبدوللا زەرۆ بوو جێگر و رەشید فندی بوو سکرتێر.

ب رێیا ڤێ ئێکەتیێ گەلەك چالاکی هاتنە ئەنجامدان وەکو:

- فیستەڤالا هۆزان خواندنێ ل دهۆکێ ل هاڤینا سالا ١٩٧٣ێ.

- فیستەڤالا هۆزان خواندنێ ل زاخۆ ل هاڤینا سالا ١٩٧٣ێ[٤٦].

زێدەباری چەند بزاڤێن دی یێن پشکداریکرنێ ل بازێرێن دی، هەروەسا بەردەوامی دا کارێن خۆ و هەتا نوکە ژی یا بەردەوامە.

## چاپخانا دهۆکێ:

ئێکەمین بەرهەم ل ڤێ چاپخانێ هاتییە چاپکرن، هەژمارا (٢)ێ بوو ژ کۆڤارا (چیا) کو سەرنڤیسکارێ وێ (دکتۆر بەدرخان سندی) بوو. هەروەسا تاکە هژمارا کۆڤارا (رەوشەن) ئەوا ژ لایێ پەروەردەیا پارێزگەهێ ڤە هاتییە وەشاندن لێ هاتبوو چاپکرن و پرتا ئێکێ و دووێ (بەرگ) ژ (دیوانا ئەحمەدێ مخلص / نالبەند) کو (خالد حسێن)ی بەرهەڤکر بوو.

ل سالا ١٩٧٤ێ پشتی رەوشا دەڤەرێ تێك چوویی و شۆرشا ئیلونێ دەست پێکریەڤە، ئەڤ چاپخانە یە هەتا سالا ١٩٧٦ێ ل جهێ خۆ ما بوو، پاشی جارەکا دی بۆ مووسل هاتە ڤەگوهاستن، ب ڤە ئاوایی دەرگەهێ چاپخانەیان ل پارێزگەها دهۆکێ هاتە گرتن دهۆك ما بێ چاپخانە هەتا سالا ١٩٩٥ێ.

سالا ١٩٧٢ێ کۆڤارا (رەوشەن) ژ لایێ رێڤەبەریا پەروەردەیا دهۆکێ ڤە هاتە چاپکرن و هژمارەکا ئێکانە بوو و چ هژمارێن دیتر چاپ نەبوون.

هەر ل چاپخانا دهۆکێ، دیوانا ئێکێ یا هۆزانڤان محمد أمین ئاغۆك ئاکرەیی ب ناڤێ (بشکوژەك ژ باخچێت کوردستانێ) هاتە چاپکرن، دیوان ژ قەبارێ ناڤنجی یە و ژ (٤٠) لاپەران پێك دهێت، تێدا نێزیکی (٣٩) پارچە هۆزانان تێدا هەنە و پێشەکیا وێ ل دور ژیانا هۆزانڤانی و هۆزانان سەیدا (صادق بەهائەدین) ی نڤیسی یە. ل دووڤ دا پەرتووکا (چیرۆکێت کرمانجی) ژ لایێ سەیبدا (عەلی نەقشەبەندی) ڤە هاتە چاپکرن کو (١٩) چیرۆکێن کوردی نە ب شێوازەکێ نوی نڤیسینە و چاپکرینە، ژ (١٠٢) لاپەران پێکهاتییە ب قەبارێ ناڤنجی.

بەلاڤۆکا (هیڤی) یا ئێکەتیا مامۆستایێن کوردستانێ لقێ دهۆکێ، ژبەرهەڤکرنا مامۆستا(ئەحمەد عەبدوڵڵا زەرۆ)ی و چەند مامۆستایێن دی، ل سالا ١٩٧٣ێ (٧) حەفت هژمار ژێ دەرکەفتن، لێ ژبەر نەبوونا چابخانە و دراڤەکێ پێدڤی، تنێ ب دەستی دهاتە نڤیسین و ب رۆنیۆ یێ دهاتە کێشان.

هەروەسا چەند پەرتووکێن دیتر ژی هاتنە چاپکرن

وەكو بزاڤەكا دەستپێكی بۆ بزاڤا رەوشەنبیری و ئەدەبی ل دەڤـەرا بەهدینان، ژ وان پەرتووكان: (بەیتا نەصیحەتا) یا (مەلا عەبدولكەریم كروری)، چیرۆكەك ل دور دوو ئەڤینداران ب زمانێ عەرەبی ژ نڤیسینا (عەزیز مالتایی) و وەرگێران بۆ زمانێ عەرەبی (عەبدولرەحیم عەبدولكریم بادی) ڤە. هـەروەسـا سەیدا (عەبدولرەقیب یووسف) ل باژێرێ (نەجەف) ئێكەمین پەرتووك ل دور ئەدەبێ كلاسیكیێ كرمانجی ب ناڤێ (دیوانا كرمانجی) دا چاپكرن، سەیدا (معصوم مایی) سەرهاتیێن (عیسێ دەلا) ل سالا ١٩٧٢ێ ل باژێرێ (النجف) دانە چاپكرن، سەیدا (ئەمینێ ئۆسمان) ژی (نان و ژیان) وەكو چیرۆك و سەرهاتیێن زارڤەكرنێ چاپكر.

بەلێ ڤێ بزاڤێ گەلەك ڤەنەكێشا، چونكی سەروبەر تێكچوو و شەری دەست پێكر و پێشمەرگە چوونە چیا و هندەك نڤیسەر ژی دگەلدا چوون، ئانكو هەتا پشتی رێككەفتنا جەزائیر سالا ١٩٧٥ێ كاودان ب وی شێوەی مان و چ چالاكی ل ناڤ باژێرێ دهۆك و دەوروبـەران نەهاتنە كرن، تنێ پشكداریا وان نڤیسەرێن گەهشتینە ناڤ رێزێن شۆرەشێ ل راگەهاندنێ كار دكر. پشتی سالا ١٩٧٨ێ جارەكادی نڤیسەرێن دهۆكێ دەلیڤە بو پەیدا بوو كو چالاكییا ئەنجام بدەن و چەند سمینارەك هاتنە پێشكێشكرن و كۆرێن هۆزان خواندنێ چێكرن.

بەری ئێكەتیا نڤیسەران بهێتە دامەزراندن، دەستەكەكا ئامادەكار هاتە پێكئینان و هندەك چالاكی كرن وەكو:

- سمینارەك بۆ (تێلی ئەمین) ب ناڤێ (دۆزا شۆرەشڤانیێ د هۆزانا كوردییا هەڤچەرخ دا)
- سمینارەك بۆ (عەبدولرەحمان مزووری) ب ناڤێ (هۆزانڤانێ كلاسیكی مەمدووح بریفكی).
- سمینارەك بۆ (ئەنوەر محەمەد تاهر) ل دور هندەك مەسەلێت ئەستاتیكا د هۆزانێت خانی دا).

هەروەسا كۆرێن هۆزان خواندنێ هاتنە رێكخستن و ڤان هۆزانڤانا پشكداری تێدا كر: (عەبدولرەحمان مزووری، موئەیەد تەیب، خالد حسێن، عەبدولكەریم فندی، خەلیل محەمەد دهۆكی، محسن قۆچان، رەمەزان عیسا و صدیق حامد). ل دووڤدا كۆرەك بۆ سێ هۆزانڤانێن گەنج ل وی دەمی ئەو ژی: (ڤەهێل ئامێدی، مەحفوز مایی، ئەحمەد قەرەنی) و هۆزانێن وان ژ لایێ (جەعفەر مایی) ڤە هاتنە هەلسەنگاندن.

هەروەسا ل هاڤینا ١٩٧٨ێ ئاڤاهییێ قوتابخانا (صلاح الدین) فیستەڤالەكا هۆزان خواندنێ بۆ هۆزانڤانێن كورد ل دهۆك و هەولێر و سلێمانی و كەركوكێ هاتە رێكخستن[٤٧].

هندەك بزاڤێن دیتر ژی هەبوون ب زمانێ عەرەبی وەكو هژمارا (١) یا كۆڤارا (الشموع) ل سالا ١٩٧٦ێ ژ لایێ (دار المعلمین الابتدائیه) ل دهۆكێ هاتە وەشاندن ب قەبارێ مەزن و ژ (٩٨) بەریەران پێك دهات و تنێ هژمارەك ژێ دەركەفت كو ل باژێرێ مووسل هاتبوو چاپكرن ب سەرپەرشتیا مامۆستایێ زمانێ عەرەبییێ (عامر باهر الكیالی) ڤە، بەرگ و كارێن هۆنەری مامۆستا (حسێن حاجی عمر) ب پشكداریا قوتابی (محمد سلیم شكری)، د ڤێ كۆڤارێ دا كۆمەكا گوتارێن رەوشەنبیری و زانستی و ئەدەبی و چەند پێزانین تێدا بەلاڤبووینە[٤٨].

د درێژیا سالێن حەفتییاندا، چەند پەرتووكێن دیتر ژی هاتبوونە چاپكرن وەكو: دیوانا (بویكا بەهدینا) یا هۆزانڤان (صالح علی گولی)، دیوانا (شین و شادی) یا هۆزانڤان (صبری بۆتانی)، (دیوانا (گوڤەند و بەهی) یا هۆزانڤان (صدیق حامد)، نەخریبا هەمیان كو ب دەستپێكا هۆزانا سەربەست دهێتە هژمارتن دیوانا (ئەڤین) یا هۆزانڤانێ نویكەر (فیصل مصطفی) و گەلەكێن دیتر.

## قۆناغا سێیێ:
## دەستەكا سالێن ١٩٨٠- ١٩٩٠:

دەستەكا سالێن حەفتێیان، هەر چەندە دكێم بوون، بەلێ شیان ژ وان بزاڤ و چالاكیێن دهاتنە ئەنجامدان، كارتێكرنا خۆ ل جەماوەر و گوهدار و خواندەڤانێ دەڤـەرێ بكەن كو ل دووڤ وان دا دەستەكەكا گەنجتر پەیدا ببیت و كاریگەرییا خۆ د

هەمی شیوازێن ئەدەبی یێن هەڤچەرخێن وی دەمی دا بگێرن، هەر وەك سەیدا (رەشید فندی) بۆ چوویی، هەردو دەستەك یێن سالێن حەفتێیا و سالێن هەشتێیان هەر دو ژ ئێك خواندنگەها ئەدەبی نە، رەوش و تیتالێن هەردووان وەکی هەڤن، ل سەر ئێك ئاوا و دەستور دچنە د نڤیسینێ دا، هەتا ب تەمەنی ژی جوداییەکا مەزن د ناڤبەرا وان دا نینە، تنێ هندە گوهۆرینێن بچووك دناڤ نڤیسارێن وان دا، ئانکو رەوش و سیفاتێن تەبایی ل ئەدەبێ ڤێ دەستەکێ دیار دبن، کو بەختەوەرتر بوون ژ هەمی دەستەکێن بەری خۆ، ژبەرکو هژمارەکا کۆڤار و رۆژنامە و دەزگەهان دەرگەهێن خۆ بۆ ڤەکربوون وەکی (هاوکاری، بەیان، رۆشنبیری نوێ، عیراق ب کوردی و عەرەبی، رۆژی کوردستان و نووسەری کورد)، دیسان ژبۆ چاپکرنا پەرتووکان هاریکاری دبەردەوام بوون چ دەزگەهان چاپ دکرن یان ژی پشتەڤانیا چاپێ دکر وەکو هاریکاری پشکەك ددایێ(٤٩).

د ناڤ ڤێ دەستەکێ دا، گەلەك ناڤ پەیدا بوون، هندەکان بەردەوامی دا نڤیسین و بەلاڤکرنێ، هندەك ژی ناڤێن وان زوی ل سەر بەرپەرێن رۆژنامە و کۆڤاران نەمان، دیارترین ناڤ ژ وێ دەستەکێ کو بووینە نڤیسەر و خودان بەرهەم خزمەتا ئەدەب و رەوشەنبیریا کوردی کرین وەکو: (فازل عومەر، محەمەد سەلیم سواری، کەریم بیانی، شەعبان مزیری، عەگید شەفیق، رێکێش ئامیدی، نەجیب بالایی، سەلمان کۆڤلی، سەگڤان یووسڤی، مستەفا حسێن، بەدەل رەفۆ، صەبریا هەکاری، هیڤی بەرواری، ئەحمەد شوشی، هزرڤان عەبدوللا، کامیران بەرواری، نورەدین سەعید، محسن ئۆسمان، وەصفی حەسەن، عەبدوللا جندی، سەعید دێرەشی، ئیسماعیل تاها شاهین، ئیسماعیل بادی(٥٠)، هەروەسا هندەك ناڤێن دیتر ژی شیان جهێ خۆ د ناڤ بەرپەرێن رۆژنامە و کۆڤاران دا بکەن وەکو (ئەدیب چەلکی، نزار محەمەد سەعید، جەمال بەرواری، مستەفا نوری بامەرنی، د.نافع ئاکرەیی، نزار بەزاز، سالم سلێمان حاجی، پێزانێ ئالیخان، سالم جاسم، بەهجەت هرۆری، صەدیق خالد هرۆری، ئیسماعیل مستەفا، ئەدهەم بارزانی، بائیزێ عەمەری، تەحسین ناڤشکی، حەسەن سلیڤانی، محەمەد عەبوللا، کرمانج هەکاری، کامیران هرۆری، تێلی صالح موسا، حەسەن کوخی، زیاد نەقیب بەرواری، حەمزە شوشی، خالد سالح حەسەن، زکی سلێمان، ژارۆ دهۆکی، سالم مستەفا عەبدولعەزیز، سەرفەراز عەلی نەقشەبەندی، سەعدوللا بامەرنی، سەگڤان یووسڤی، شەوکەت تاهر سندی، عەبدولعەزیز هاجانی، عەبدولرەحمان نەقشەبەندی، عەبدولسەلام عەلی میرزا، عزت فندی، عصمەت محەمەد بەدەل، محەمەد ئۆسمانا، قەسیم حەسەن باوانی، سەعدوللا ئاڤدەل، عەبدولعەزیز خەیات، کەمال رەمەزان، مەسعوود حسێن بۆتانی، تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، ئیسماعیل سگێری، محسن ئیبراهیم دۆسکی، ناجی تاها بەرواری، ئیبراهیم رەشکۆ سورچی، جەلال مستەفا، مستەفا ئاکرەیی، بێریڤان رەشید، کامیران رەشید بەرواری، صەبیح محەمەد حەسەن و حەکیم عەبدوللا) و گەلەکێن دیتر.

هندەك ژ ئەڤان نڤیسەران ژبلی بەلاڤکرنێ د رۆژنامە و کۆڤاران دا، شیان بەرهەمێ خۆ وەکو پەرتووك بدەنە چاپکرن و هندەکان ژی وەکو دەستەك پێکڤە کارکرن و بەلاڤۆك و کۆڤار دەرئێخستن. ئانکو دەلیڤەیا بەلاڤکرنێ ژ قۆناغێن دیتر گەلەك بەرفرەهتر بوویە، نەخاسمە ژ نیڤا سالێن هەشتێیان پێدا و دەرکەفتنا رۆژنامەیا (بزاڤ) ب زارێ کرمانجی ل بەغدا، گەلەك دەلیڤەیا بەلاڤکرنێ هاتە خوشکرن(٥١).

دیسان دەرکەفتنا هژمارا ئێکێ ژ کۆڤارا (کاروان) ل سالا ١٩٨٢ێ ل هەولێرێ ژ لایێ ئەمینداریا گشتی یا رەوشەنبیری و لاوان کو پتر ژ (٨٠) حەشتێ هژماران ژێ دەرکەفتن، دەرگەهەکێ مەزن ل بەر نڤیسەر و چیرۆکنڤیس و هۆزاڤانێن دەڤەرێ ڤەکر رەوشا بزاڤا ئەدەبی خورتتر لێکر و چەندین نڤیسەرێن نوی هاتنە مەیدانێ و بوونە ناڤێن گەش

ل ئەسمانێ رەوشەنبیریا كوردی دا. هندەك ژ وان ناڤێن نوی: (ئاشتی عەبدولحەكیم بەرواری، محەمەد حەسەن بناڤی، نەبیل عەبدولرەحمان عەلی، هاشم ئەترووشی، عەبدولفەتاح عەلی بوتانی، بەیار باڤی و جەمیل شێلازی)[٥٢].

## یانەیا هۆزانێ:

ل ناڤەراستا سالێن هەشتێیان و سەر ب ئێكەتیا نڤیسەرێن كورد/ تایێ دهۆكێ ڤە، (یانا هۆزانێ) هاتە دامەزرندن و ئەڤ یانە شیا كۆمەكا هۆزانڤانێن گەنج ل دورێن خۆ كۆم بكەت و چەندین چالاكییان ئەنجام بدەت.

## گرۆپا تورەڤانێن گەنج و بەلاڤكرنا بەلاڤۆكا (دەنگێ مە):

ئێكەمین پاڵدەر بۆ لێك نێزیكرنا هۆزانڤانێن دەڤەرا بەهدینان ئەوبوو كو ل سالێن هەشتێیان دا هۆزانڤانێن دەڤەرێ ل گەل هندەك ژ رەوشەنبیر و ئەدەب دۆستێن دەڤەرا بەهدینان كۆڤارەك ل ژێر ناڤێ (دەنگێ مە) دەرئێخستن و چەندین هۆزانێن وان تێدا ئەوا دهێت ب واتایا (مودێرنیزم) یانژی (الحداثة)، بەلكو تەنها واتایەكا سەرڤەیە و هەلس و كوتكرن ل گەل تشتێن نوی یە)، واتە ئەڤ كۆڤارە تەنها یا گرێدای و تایبەت ب بابەتێن نویخازی ڤە نینە، بەلكو (ناڤێ ڤێ كۆڤارێ پتر هیڤییەك بوویە و پتر رەنگڤەدانەكا رامیاری بوویە ژ یا ئەدەبی، چونكی بەرهەمەكێ نوخازتر ژ سالێن بەری هنگی نەبوویە[٥٣].

(دەنگێ مە) ژ لایێ (دەستەكا تورەڤانێن گەنج) ڤە ل وی دەمی دهاتە بەرهەڤكرن و دەرێخستن، بێی هاریكاریا جهەكێ فەرمی یێ میری یان دەزگەهەكێ رەوشەنبیری، ژبلی هژمارا (٤) چوارێ (ئەمینداریا گشتی یا رەوشەنبیری و لاوان) یا وی سەردەمی هندەك هاریكاری ل گەلدا كربوو. كۆڤارا (دەنگێ مە) د ژینێ خۆ یێ كورت دا، تنێ (٤) چوار هژمار ژێ دەركەفتی نە و ب قەبارێ ناڤنجی بوینە و سەرجەمێ بەرپەرێن هەر چوار هژماران دبنە (٥٧١) بەرپەر و ل سالا ١٩٨٥ێ ئێكەمین هژمار ژێ دەركەفت و سالا ١٩٨٩ێ هژمارا دووماهیێ ژێ چاپبوویە و هەر چوار هژمار ل چاپخانا (الحوادث) ل بەغدا هاتینە چاپكرن[٥٤].

## رۆژناما بزاڤ:

رۆژناما (بزاڤ) ئێكە ژ ئەوان دەرگەهێن بیاڤەكێ مەزن و بەرفرەهـ بۆ نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان ڤەكری و شیا د ماوەیەكێ كێم دا چەندین نڤیسەران ل خۆ كۆم بكەت و گەلەك نڤیسەرێن نوی ژی بینتە مەیدانا نڤیسینێ. هەروەسا نڤیسەرێن خودان تایبەتمەندیێن هەمەجۆر د نڤیسینێ دا ئافراندن و نە تنێ ئەدیب و هۆزانڤان، بەلكو د وارێن زانستی و فولكلۆری و كەلتوری دا ژی پەیدابوون.

رۆژناما (بـزاڤ) ل باژێرێ بەغدا دەردكەفت، سەرنڤیسەرێ وێ (د. نافع ئاكرەیی) بوو، ئەندامێن دەستەكا نڤیسینێ هەمی نڤیسەرێن كرمانج بوون وەكی (محەمەد سەلیم سـواری، خالد حسێن، ئەحمەد عەبدوللا زەرۆ و... هتد) هندەك ل دهۆكێ بوون و یێن دی ژی ل بەغدا دژیان.

## ئەدەبیاتا پێشمەرگایەتیێ:

هەروەسا قووناغا ئەدەبێ چیا (پێشمەرگایەتیێ) د سالێن هەشتیان دا بزاڤەكا خورت بخۆڤە دیت و ب وان ئامیرێن بێ سەروبەر و كێم، شیان چەندین بەلاڤۆك و پەرتووكان بدەنە چاپكرن ل چاپخانا (خەبات) یا شۆرشێ یان ژی ب ئامیرێ رۆنیۆیێ كو وی دەمی هەتا ل ناڤ باژێران ژی كار ب وی ئامیری دهاتەكرن، د ڤێ بزاڤێ دا ناڤێ كۆمەكا هۆزانڤان و رەوشەنبیران پێشچاڤ دبیت كو وان لڤینەك ئێخست بوو كاروانێ رەوشەنبیریێ، وەكو: (ئەحمەد قەرەنی، سەعدوللا ئاڤدەل، ئەدیب چەلكی، قەچاخ، ژارۆ دهۆكی، لەزگین كۆچەر، عەلی شرتی، محمد صالح بەندی، سمكۆ ئامێدی) و گەلەكێن دیتر. هەروەسا نەتنێ پەرتووكێن خۆ چاپ دكرن، بەلكو

دیوانێن هۆزانڤانێن ب ناڤو دەنگ ژی چاپ دکرن وەکو دیوانا (رۆناك) یا هۆزانڤانێ ناڤدار (جەگەرخوین)ێ و کۆمەکا پەرتووکێن دیتر یێن وەرگێرایی ژ زمانێن بیانی بۆ زمانی کوردی و عەرەبی.

## قۆناغا چوارێ ۱۹۹۱ - ۲۰۰۰:

دەمێ سەرهلدانێ دەستپێکری و پشتی کۆچا ملیۆنی، چەندین گوهۆرین ل کوردستانێ پەیدابوون، نەخاسمە ل سەر دەمێ (بەرەی کوردستانی) و ل دووڤدا پشتی هەلبژارتنێن پەرلەمانێ کوردستانێ و دانانا حکومەتا هەرێمێ و دەست ب کارکرنا وێ د کابینەیێن حکومەتێ دا. ژ ڤێ بزاڤا سیاسی، ئازادیا رادەربرینێ هەتا رادەکێ باش جهێ خۆ گرت ب تایبەت ل سەردەمێ بەرەی کوردستانی ژ زۆری یا پارتێن سیاسی یێن کوردی، هەر ئێکێ چەندین بەلاڤۆك و رۆژنامە و کۆڤار دەرئێخستن و هژمارەکا کەنالێن راگەهاندنێ ژ رادیۆ و تێلەفزیونان ڤەکرن، لەورا هژمارەکا زۆر ژ نڤیسەر و رۆژنامەنڤیسان ل دور خۆ کۆمکرن و دەرگەهێن بەلاڤکرنێ و نڤیسینێ ژێرا ڤەدکرن و پشتەڤانیا وان ژبۆ چاپکرنێ دهاتەکرن و هەر پارتەکێ ژی ژبۆ بەرژەوەندیا خۆ یا تایبەت بوویە.

ژڤێ چەندێ نڤیسەرێن دەڤەرێ ئەڤ دەلیڤەیە ژ دەست نەدان و چ د ئێك بەرە دا و چ سەربەخۆ د هەمی بەلاڤۆکان دا نڤیسی و هزر و بیرێن خۆ دەردبرین و ئازادانە بەرەڤانی ژ هزر و بۆچوونێن خۆ دکرن، بەلێ د گەلەك بیاڤاندا ڤان بەلاڤۆکێن مشە بەربەلاڤ ژ چالاکی و بزاڤێن رەوشەنبیری و هۆنەری و بەلاڤکرنا بابەتێن ئەدەبی رەنگە کێماسییەك تێدا هەبوویە و ئەو تشتێ دکر و بەلاڤ دکر پتر دبەرژەوەندا وی لایی دا بوویە، ژڤێ چەندێ ل گەلەك جهان و ژ بازێرێن کوردستانێ چەند نڤیسەران خۆ ددا ئێك و کۆڤارەك بەلاڤ دکر.

ل دەڤەرا بەهدینان ژی، چەند کۆڤار دەرکەفتن وەك: (نوخازی)، (مەتین) و (سەرهلدان) ل دهۆکێ، (تیرۆژ) ل سێمێلێ، (خابوور) ل زاخۆ، (پیرس) ل ئاکرێ، ل دووڤدا (چەپەر) و (ئادار) و (مهاباد) و (پێلا سەربەست) و (راستەرێ) و چەندێن دیتر و هندەك ژ وان د تایبەتمەند بوون د وارێن ژێکجودا دا، هەروەسا هندەك رۆژنامە ژی دەرکەفتن وەکو (بۆتان) کو ئێکەمین رۆژنامە بوو ل دهۆکێ دەربکەڤیت، پاشی (سەرهلدان) و (نەورۆز) و هندەکێن دیتر ل قەزا و ناحیان ژی هەبوون[٥٥].

## کۆڤارا (نوخازی):

دەمێ کۆڤارا (نوخازی) دەردکەفت، چ کۆڤار و رۆنامەیێن رەوشەنبیری و هۆنەری و ئەدەبی نەبوون کو سەداسەد یا تایبەت بیت ب وی بیاڤی ڤە، چونکی ئەوێن دەرکەفتن ل وی دەمی نوینەراتیا لایەنەکێ سیاسی دکرن، ئەڤ کۆڤارە دەرکەفت، چونکی نڤیسینا وێ ژیانەك و هزر و بیرێن نوی دخواستن، د سەرگوتارا هژمارا (۱)ێدا دەستەکا نڤیسینا وێ دبێژن: (ئەم ژیانەك نوی دخازین، لەو ئەم پێدڤی هزر و بیرێن نوی نە، پێدڤی ئەدەبەکێ نوی نە و چونکی تورەڤان وژدانا جڤاکی یە و هەستیارترین کەسە و هەردەم خەیالا خۆ تێر دکەت ب وێنێن نوی د ژیانێ دا)[٥٦].

دەستەکا نڤیسەرێن کۆڤارا (نوخازی) شیان تەنها سێ هژماران ژ ڤێ کۆڤارێ دەربێخن کو هژمارا (۱) ئێك ل سالا ۱۹۹۱ێ و دووماهیك هژمار ژی یا (۳) سیێ ل سالا ۱۹۹۲ێ دەرکەفت. پاشی هاتە راگرتن ژ بەر کو د وی سەردەمی دا سەروبەرێ ئابووری یێ کوردستانێ یێ ئالۆز بوو و خەرجیا کۆڤارێ ژی ل سەر ملێن دەستەکا نڤیسەرێن کۆڤارێ ڤەبوو[٥٧]. ب رێیا ڤێ کۆڤارێ، هژمارەکا زۆر یا بابەتان هاتنە بەلاڤکرن وەکو (۱۳) سێزدە ڤەکۆلینان و (۱۱) هۆزان و (۱۲) چیرۆك و گەلەك بابەتێن دی یێن گرێدای ب هۆنەری ڤە.

## گرۆپێن نویخواز:

کۆڤارا (نوخازی) ئێکەمین هەول و بزاڤێن هزرمەند و رەوشەنبیرێن نویخازێن دەڤەرا بەهدینانە کو ب شێوەیەکێ کۆمی، بێی کو گرۆپەکێ پێك بینن بەشداری د ڤێ کۆڤارێ دا کری یە و بابەتێن هزری و هۆزانێن نویخاز یێن خۆ تێدا بەلاڤکرینە[٥٨].

پشتی راوەستیانا کۆڤارا (نوخازی) ل دەڤەرا

بەهدینان هەتا سالا ١٩٩٤ێ، هەولێن نڤیسین و گەهاندنا هزرێن نوخازی دبەردەوام بوون — ب تایبەتی د بوارێ نڤیسینا هۆزانێ دا -، لێ هیچ گرۆپ و بەلاڤۆكەكا تایبەت ب ڤی بواری ڤە نەهاتە د ناڤ مەیدانا رەوشەنبیری دا، هەتا كو پشتی سالا ١٩٩٤ێ ل ڤێ دەڤەرێ دوو گرۆپێن جودا یێن نویخازی سەرهلدان و پێنگاڤێن مەزن د بوارێ گەهاندن و بجە ئینانا هزر و ئەدەبیات و هۆزانا نویخازی دا هاڤێتن، ئەو ژی:

## گرۆپا نویكرن هەروهەر:

ل دووماهیكا سالا ١٩٩٤ێ ل دهۆكێ پرانییا وان هەولدانێن (٨٥-٨٨) ژ لایێ هندەك هۆزانڤانڤە هاتینكرن ژبۆ نۆژەنكرنا هۆزانێ ژ لایێ رۆخسار و ناڤەرۆكێ ڤە، هاتنە گۆگراندن و رێكخستن و گرۆپەك ب ناڤێ (نویكرن هەروهەر) ل دەڤەرا بەهدینان ئالایێ ڤێ گوهۆرینێ هەلگرت.. ئەڤ گرۆپە پێك هاتبوو ژ هۆزانڤان و رەوشەنبیران (محسن قوچان، فازل عومەر، شوكری شەهباز، عارف حیتۆ، سەلمان كۆڤلی، هزرڤان عەبدوڵلا)[٥٩].

گرۆپا نویكرن هەروهەر پاڵدەرەكێ سەرەكی بوو، د بەرفرەهكرنا بوارێ رەخنێ دا ب تایبەت رەخنا ئەدەبی هەر ژ سالا دامەزراندنا وێ هەتا سالێن (١٩٩٨ - ١٩٩٩) ێ كو ب سالێن لاوازی یا وێ دهێتە هژمارتن، چونكی ب دانانا ڤێ گرۆپێ و بەلاڤكرنا بەرهەمێن وان ژ چەندین لایانڤە هێرشێن نڤیسینێ و رەخنەگرتنەكا نیگەتیڤی ل سەر وان هاتنە كرن[٦٠].

ژ وان لایەن و كەسایەتیێن رەخنە لێگرتین، وەكو مەلایێن مزگەفتان كو ب پێنگاڤەك دەركەفتن ژ ئایینێ ل قەلەم ددا، و دگوتن ئەڤە بانگەوازا هزرێن ئەوروپی د ناڤ جڤاكێ مە دا دكەن، هەروەسا مامۆستا و رەوشەنبیران هێرشێن توند كرنە سەر چ ب رێیا دان و ستاندنێ دگەل ئەندامێن گرۆپی، یانژی لایێن رەوشەنبیری ب بەلاڤكرنا گوتاران ل حەفتینامە (پەیمان) و كوڤارێن (مەتین) و (ڤەژین) و (گازی)، زێدەباری لایەنێن سیاسی و خواندەڤانێن هۆزانا كلاسیكی هزر و بیرێن ڤی گرۆپی قەبویل نەكرن[٦١].

## گرۆپا نویخازا ئاكرێ:

ل سالا ١٩٩٥ێ ل ئاكرێ ل ناڤ چارچۆڤێ (بزاڤا رەوشەنبیری یا ئاكرێ)، سێ ئەندامێن بەشدار د ڤێ بزاڤێ دا (ئازاد دارتاش، ئەمیر فندی، شەمال ئیسماعیل) هزر ل دانان و پێكئینانا گرۆپەكا نویخازی كرن د ناڤ بزاڤا رەوشەنبیریا ئاكرێ دا ل ژێر ناڤێ (گرۆپا نویخازا ئاكرێ)[٦٢].

ب دامەزراندنا ئەڤێ گرۆپێ ل ئاكرێ، گۆما ئەدەبی د ناڤ رەوشەنبیرێن ئاكرێ دا هاتە شلقاندن و گوهۆرین، چونكی ئەندامێن بەشدارێن ڤێ گرۆپێ كەفتنە ململانا گەنگەشە و دانوستاندنێ دگەل هۆزانڤانێن كلاسیكی و هۆزانڤانێن هۆزانا سەربەست، هەروەسا زۆربەی هۆزانڤانێن نوی یێن گەنج ژی كو دەست ب هۆزانێ كری، پتر زارڤەكرنا ڤێ گرۆپێ كر و ل سەر شێوێ هۆزانێن نویخاز هۆزانا خۆ ڤەهاندن[٦٣].

ل پەی گۆتنا ئەندامەكێ ڤێ گرۆپێ، شیان لڤینەكێ د بوارێ رەخنا ئەدەبی و تێكستا هزری دا رۆلەكێ بەرچاڤ و دیار هەبوون، كو شیان د نڤیسینێن خۆ دا بەرەڤ خواندنا بونیاتێ ڤەشارتیێ تێكستی بچن... كو هەتا بەری سەر هلدانا ڤێ گرۆپێ و نۆكە ژی رەخنەیا ئایدیۆلۆژی یا زاڵە، لێ ئەو شیان د نڤیسینێن خۆ دا تا رادەكی ڤەقەتیانەكا ئەپستمۆلۆژی دگەل یێن بەرێ دروست بكەن و دیاردا زاڵبوونا ئێك شێوازێ هزركرنێ رەت بكەن و نڤیسكار و هەلبەستڤان ئازادانەتر هزر بكەن و ل ژێر فشارا تێكستا دا نەژین[٦٤].

## ئێكەتیا نڤیسەرێن كورد/ تایێ دهۆكێ:

تورەڤانێن دهۆكێ پشتی دیتی كو مەیدانا بزاڤا رەوشەنبیری یا ڤالایە ژ بزاڤ و چالاكیێن ئەدەبی، ل رێكەفتی ١٩٩١/٦/٢٨ێ رابوون ب دامەزراندنا لیژنەیەكا بەرەوەخت ب ناڤێ (لیژنا بەرەوەختا رەوشەنبیری یا تورەڤانێن دهۆكێ)، پێكهاتبوو ژ ئەڤان ئەندامان: (عەبدولرەحمان مزووری، سەلمان كۆڤلی، سەعید دێرەشی، فازل عومەر، شوكری

شەهباز، هزرڤان عەبدوڵلا، هیڤی بەرواری). پشتی دەمەکێ کورت، ل رۆژا ٤/٧/١٩٩١ێ لیژنا بەرەوخت، ل بیرەوەریا شەهیدبوونا (سەیدا صالح یووسفی) فیستەڤالەك هاتە سازکرن و تێدا چەند پەیڤ هاتنە خواندن و ژیاننامێ هۆزانڤانی ژلایی (عەبدولسەلام عەلی میرزا) ڤە هاتە خواندن، پاشی رەحمەتی (محەمەد ئەمینێ ئۆسمان) چەند بیرهاتنێن خۆ ل گەل هۆزانڤانی گۆتن، ل دووماهیێ ژی کۆمەکا هۆزانڤانان چەند هۆزانێن خۆ خواندن.

ل رۆژا ١٠/٧/١٩٩١ێ کۆنفرانسەکێ بەرفرەهـ ژ ئەدیب و نڤیسەرێن کورد ل دهۆکێ هاتە پێکئینان، پشتی رێ و رەسمێن کونفرانسی، دەرگەهێ هەلبژارتنان هاتە ڤەکرن و چەند نڤیسەران خۆ هەلبژارت، د ئەنجامدا ئەڤ نڤیسەرە بوونە دەستەکا رێڤەبەر:

- عەبدولرەحمان مزووری
- عەبدولکەریم فندی
- ئەنوەر محەمەد تاهر
- رەمەزان عیسا
- محەمەد ئەمین محەمەدصالح[٦٥].

ل دووڤ دا ل باژێرێن سێمێل و زاخۆ، کۆمیتەیێن رەوشەنبیری هاتنە دامەزراندن و هەر ئێکێ ژ لایێ خۆ ڤە چەند بزاڤ و چاکی ئەنجامدان و ڤالاتی نەهێلا د پاناڤێ رەوشەنبیریێ دا ل دەڤەرێ.

ئەڤ کۆر و سمینارێن رەوشەنبیری و ئەدەبی هەتا نوکە ژی د بەردەوامن و ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد/ تایێ دهۆکێ د باشترین قۆناغێن ژیێ خۆ دا دەرباز بوویە و ئەو بزاڤێن د وان سالاندا هاتینە کرن نەخاسمە سالێن نۆتان دا، چ جاران ب وێ گەرم و گۆڕێ نەبوویە، دیسان چاپکرنا کۆڤارا (پەیڤ) کو - هەتا دەمێ نڤیسینا ڤی بابەتی - شیاینە (٧٥) حەفتێ دوو هژماران ژێ دەربێخن و ب سەدان پەرتووکان بدەنە چاپکرن و بەلاڤکرن.

هەروەسا د درێژیا ڤان سالاندا ژ باشترین بزاڤێن ئەدەبی، گێرانا چەند فیستەڤالان بوویە، گرنگیترین فیستەڤال ل رۆژێن ٢٠ - ٢٢/٦/١٩٩٥ێ گێرانا (فیستەڤالا خانی) بوویە، کو ب پشداریا پتر ژ (٤٠٠) رەوشەنبیر و نڤیسەر و رۆژنامەڤانان ل دهۆکێ هاتە گێران.

گرنگترین بزاڤ د وارێ ئەدەبی دا، ل سالا ١٩٩٨ێ، ب پشتەڤانیا سەرۆك (مەسعوود بارزانی) دیوانا هۆزانڤانێ کورد پەروەر و ب ناڤودەنگ (ئەحمەدێ نالبەند/ موخلص) ب (٥) پێنج بەرگان ب ناڤێ (باغێ کوردان) هاتە بەرهەڤکرن و چاپکرن ژ لایێ ڤان نڤیسەران ڤە: (تاها مایی، رەشید فندی، ئیسماعیل بادی، محەمەد عەبدوڵلا) ل چاپخانا (خەبات) ل دهۆکێ هاتە چاپکرن. لەورا (فیستەڤالا ناڵبەندی) ل رۆژا ٦/١٢/١٩٩٨ێ ب هەلکەفتا چاپکرنا دیوانا وی هاتە گێران، ئەڤ فیستەڤالە دوو رۆژان ڤەکێشا و چەندین سمینار هاتنە پێشکێشکرن.

هەروەسا ل رۆژێن ١٨-٢٠/٩/٢٠٠٠ێ، (فیستەڤالا جزیری) بەرفرەهترین فیستەڤال بوو هاتییە گێران و تێدا کۆمەکا کۆر و سمیناران هاتنە پێشکێشکرن ژ چەندین پارچێن کوردستانێ، هەروەسا (سەرۆك بارزانی) ل رۆژا دووێ یا فیستەڤالێ پشکدار بوو و سمینارەکا ژ هەژی بەژن و بالا (مەلایێ جزیری) پێشکێشکر[٦٦].

رێڤەبەریا گشتیا رەوشەنبیری و هونەری یەك ژ رێڤەبەریێن چالاك و پڕ بزاڤە ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ و سەر ب وەزارەتا رەوشەنبیری یا هەرێما کوردستانێ یە، چالاکیێن ڤێ رێڤەبەریێ دهۆك کریە مەلبەندەکێ رەوشەنبیری و هونەری ل سەرانسەری کوردستانێ و شوون تبلێن چالاکیێن ڤێ رێڤەبەریێ ژ سالا ٢٠٠٤ێڤە ل هەموو باژێر و باژێرکێن پارێزگەها دهۆکێ د دیارن.

## چالاکیێن رێڤەبەریێ ل سەر ئاستێ دەڤەرێ:

ب رێکا ڤان چالاکیان رەوشەنبیر و نڤیسکار و هونەرمەندێن کورد و گەلەك جاران یێن بیانێ ژی ل دهۆکێ ل هەڤدو جڤاندینە و ب جڤاندنا وان هەموویان دهۆك بوویە شانەکا رەوشەنبیری هونەری.

هندەك ژ وان چالاکیێن ڤێ رێڤەبەریێ ئەنجامداین وەکو:

- ڤیستەڤالا ئەحمەدێ خانی ١٩٩٥
- ڤیستەڤالا مەلایێ جزیری ٢٠٠٠
- ڤیستەڤالا ساخكرنا بیرەوەریا سەلمان كوڤلی دهۆك-٢٠٠٥/١/٥
- ڤیستەڤالا رێزگرتنێ بۆ شەهید ئەنوەر مایی دهۆك ١٣-٢٠٠٥/١/١٤
- ڤیستەڤالا رێزگرتنێ بۆ نڤیسەر سادق بەهائەدین دهۆك ٣-٢٠٠٥/٣/٤
- ڤیستەڤالا رێزگرتنێ بۆ نڤیسەرێ شەهید سالح یوسفی زاخۆ ٤-٢٠٠٥/٨/٥
- ڤیستەڤالا زانا و هۆزانڤان شێخ مەمدوحێ بریفكانی دهۆك ٧-٢٠٠٦/٩/٨
- ڤیستەڤالا هەلبەستڤانێ ناڤدار سەبری بۆتانی دهۆك ٤-٢٠٠٧/٧/٥
- ڤیستەڤالا هۆزان خواندنێ بۆ ئافرەتێن خودان شیان دهۆك ٢٠٠٧/١١/٢٣
- ڤیستەڤالا نڤیسەر مەلا خەلیل مشەختی شێخان ١٢-٢٠٠٧/١٢/١٣
- ڤیستەڤالا هۆزانڤانێ خابیری خالص خەلیل زاخۆ ٢٠٠٨/٦/٢٦
- ڤیستەڤالا هەلبەستڤانێ ناڤدار خالد ئاغایێ زێباری دینارتێ ٢٠٠٨/١١/١٣

ب رێیا ڤان فیستەڤالان، بازارێ هۆزانێ گەرم كرییە و هۆزانڤان هزرێ ل پاشەرۆژا خو دكەن كو بەرهەم و كەدا وان ب هەروە ناچیت و دەزگەهەك هەیە خۆ لێ بكەتە خودان. لەورا دێ بینین سال بۆ سالێ چاپكرنا بەرهەمان ژ لایێ هۆزانڤانان ڤە خورتتر بوویە و هۆزانڤان مشەتر بووینە.

## ئاڤاهیێ پەرتووكخانا بەدرخانیان:

ئێك ژ بەرچاڤترین ئاڤاهیێن ل سالا ١٩٩٩ ل پارێزگەها دهۆكێ هاتییە ئاڤاكرن، ئاڤاهیێ (پەرتووكخانا بەدرخانیان) بوو ل باژێرێ دهۆكێ. ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە و ب هەڤكاری لگەل ئێكەتیا نڤیسەرێن كورد/ تایێ دهۆكێ ل رۆژا ١٩٩٩/١١/٩ێ پەرتووكخانا بەدرخانیا هاتە ڤەكرن كو پەرتووكخانا گشتی یا ئێكا نەیە ل بازێرێ دهۆكێ، ژبلی پەرتووكخانێن سەر ب زانكۆیا دهۆكێ و زانكۆیێن دیتر ڤە[١٧].

ڤەكرنا ڤێ بەرتوكخانێ گرنگیا خۆ هەبوو كو لڤینەك ئێخستە بازارێ پەرتووكێ ل دەڤەرێ، ئەو ژی ب دانا هژمارا سپاردنێ ب پەرتووكخانێ ل شوینا نڤیسەر بچنە هەولێرا پایتەخت وەربگرن، دیسان هەبوونا هژمارەكا زۆر یا پەرتووكان و رۆژنامە و كۆڤاران، نڤیسەر و رەوشەنبیر نەچار دبن رێیا وێ بگرن كو دبیت هندەك ژێدەر تێ ل وێرێ ب دەست بكەڤن. ئانكو دشێین بێژین بزاڤەك پەیداكر و پێشڤەچوونەك رەوشا ئەدەبی بخۆڤە دیت.

## دەزگەهێن چاپ و وەشانێ:

د سالێن نۆتان و دوو هزارێ و ل دووڤ دا، ئەڤ بزاڤە خورتتر لێهاتن چ ب وەشاندنا رۆژنامە و كۆڤاران یان ژی ڤەكرنا دەزگەهێن چاپێ و وەشانێ، وەكو (دەزگەها سپیرێز) یا چاپ و وەشانێ ل سالا ٢٠٠٢ێ ل دهۆكێ هاتە دامەزراندن، ژ ئەنجامێن وێ ئەوە هاریكاریا نڤیسەران دكەت ژ بۆ چاپكرنا بەرهەمێن وان. ئەڤ دەزگەهەشیایە كۆمەكا مەزن یا دیوانێن هۆزانان چاپ بكەت چ یێن ئەدەبێ كلاسیكی یان ژی یێن هەڤچەرخ و هەتا نوكە یا دخزمتكرنێ دا بەردەوامە.

هەروەسا (رێڤەبەریا چاپ و وەشانێ) و پرۆژەیێ ئێكەتیا نڤیسەرێن كورد/ تایێ دهۆكێ یێ چاپكرنا پەرتووكان و گەلەك دەزگەهێن دی ژ لایێ خۆ ڤە پەرتووك چاپ دكرن.

ڤێ دووماهیێ ژی (دەزگەهێ نالبەند یێ چاپ و وەشانێ) هاتییە دامەزراندن و ل نێزیك دێ كەفتە كاری. هەروەسا هژمارەكا گەلەك مەزن ژ پەرتووكان هاتنە چاپكرن د وارێن ژێكجودا دا و لڤینەك كەفتە وارێ وەرگێران و خواندنێ ژی.

(سەنتەرێ ڤەكۆلینێن كوردی و پاراستنا بەلگەنامەیان)،كو نها ب سەنتەرێ بێشكچی

هاتییە ناڤکرن، ئەڤ سەنتەرە، سەنتەرەکێ زانستی یە، د چوارچوڤێ زانکۆیا دهۆکێ دا کاردکەت. پاراستنا بەلگەنامان، پویتە پێدان ب کەلتوورێ نەتەوەییێ کوردی و رەوشەنبیری و شارستانیا کوردان، هاندان و هاریکاریا دانان و چاپکرنێ و وەرگێرانی ژ زمانێ کوردی بۆ یێن بیانێ و ژ یێن بیانی بۆ کوردی. هەر وەکی د پەیرەوێ سەنتەریدا هاتی یەك ژ ئارمانجێن سەنتەری ناڤتێدانا نڤیسین و وەرگێران و چاپ و بەلاڤکرنێ یە د چوارچوڤێ تایبەتمەندیا سەنتەریدا، د ڤی واریدا سەنتەری چەند پەرتووکەك ب زمانێن کوردی و عەرەبی چاپکرینە. هندەك ژ وان پەرتووکان دیوانێن هۆزانانە و چەند پەرتووك ژی گرێدای ئەدەبێ کلاسیکی نە[٦٨].

ئێك ژ بزاڤێن دیتر کو رۆلێ خۆ دیتی د پێشڤەبرنا هۆزانێ دا و ئاڤاکرنا کەسایەتییەکا جوان بۆ گەنجێن ڤی سەردەمی و پالدانا وان بۆ خزمەتکرنا بزاڤا ئەدەبیاتا کوردی ب تایبەتی هۆزانێ، ئەو ژی دانانا گرۆپێ (کۆمەلا هەلبەستڤانێن گەنج) بوو کو ل رۆژا ٢٠٠٧/٧/٧ێ هاتییە دامەزراندن رۆژا ٢٠٠٩/٣/٢٥ێ مولەتا فەرمی وەرگرت، ئەڤ کۆمەلە شیان کۆڤارەکێ یا تایبەتمەند ب هۆزانێ ڤە دەربێخن و تێدا چەندین هۆزان و رەخنە و ڤەکۆلین دهاتنە بەلاڤکرن[٦٩].

ژلی دەرکەفتنا هژمارەکا زۆر یا رۆژنامە و کۆڤاران کو هەمیان بەرپەرین خۆ بۆ هۆزانان ڤەکرینە، گەلەك دیوانێن هۆزانان هاتینە چاپکرن چ ل سەنتەرێن باژێران، یان ژی ل قەزایێن سەر ب پاریزگەهێ ڤە، ڤان دیوان و کۆمەلەیێن هۆزانان لڤینەکا بەرچاڤ ئێخستییە بازار و خواندنا هۆزانێ ب دیالێکتا کرمانجی و بزاڤەکا مەزن دهێتە کرن پتر بۆ پێشڤەبرنا ڤێ وەرارا هۆزانێ ل دەڤەرێ.

ئەڤە تنێ کورتییەك بوو هەر وەك ل بەراهیێ ژی مە دایە ئاشکراکرن کو ئەڤ بابەتە پتر پێدڤی ل دووڤچوون و شرۆڤەکرنێ یە دا کو ب دروستی بشێین بزاڤا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان بنەجهـ بکەین.

# ژێدەر و پەراوێز


١. ئەڤ بابەتە پێدڤی پترڤەکۆلینێ یە، بەری نوکە هندەك بزاڤ هاتینەکرن، بەلێ هێشتا مێژوویەکا دروست بۆ دەستپێکرنا ئەدەبیاتا کوردی ل دەڤەرێ نەهاتییە دانان و گەلەك بۆچوون هەنە.

٢. مجلة (الجسر)، العدد (٥) شتاء (٢٠١٢)، اسماعيل بادي، نابي يوسف أفندي الشاعر العثماني الكوردي الشهير ومخطوطتة (خيرية) في الشعائر الاسلامية (دراسة)، ص ٣٣ - ٤٤.

٣. تحسین ابراهیم دۆسکی، مسعوود خالد گولی: دیوانا نەفعی (ساخکرن و بەرهەڤکرن)، هەولێر - ٢٠١٠.

٤. د. فؤاد حمه خورشید: اللغه الكردية والتوزيع الجغرافي للهجاتها، بغداد - ١٩٨٥، ص ٣١.

*. ڤەزا بەردەرەش کو پتریا وان گورانن و دیالێکتا وان ژ دیالێکتا کرمانجییێ یا جودایە.

٥. د. فوئاد حەمە خورشید: زمانێ کوردی و دابەشبوونێ جوگرافیی دیالێکتەکانی، وەرگێرانی: حەمە کەریم هەورامی، بەغدا- ١٩٨٥، ل ٣٠ - ٤٥.

٦. موسەددەق تۆڤی: کۆڤارا رۆناهی - ڤەکۆلینەك دیرۆکی، رەوشەنبیری، دهۆك - ٢٠٠٥، ل ١٣.

* (سالا ٦٤٤ مش ب دەستێ پاشایێ مووسل بەدرەددین لوئلوئی هاتبوو کوشتن).

٧. خدرێ سلێمان، گوندیاتی ئالیەکێ ئەنترپۆلۆجی (کۆمکرن و بەرهەڤکرن)، بەغدا - ١٩٨٥، ل ١٠٣.

٨. رێزان شڤان، قەولڤان پیر رەشێ حەیران (گوتار)، کۆڤارا (مەحفەل، هژمار (١) هاڤینا ٢٠١٠، ل ٣٠.

٩. خدرێ سلێمان، دەنگێ ئەدەبێ کوردی ل میرگەها شێخان (گوتار)، کۆڤارا (دەنگێ مە)، هژمار (٤) سالا ١٩٨٧، ل ٤٤.

١٠. ئومێد سەگڤان ئەحمەد، خەلات عەلی سلۆ، هەڤال عبدالکریم خالد، هژمارکاریەك ل دور هۆزانڤانێن دەڤەرا زاخۆ ژ سالا (١٩٠٠- ٢٠١٠) (ڤەکۆلینا دەرچوونێ / زانکۆیا دهۆکێ، فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی- پشکا زمانێ کوردی، ئێڤاران)، ٢٠١٤، ل ٢.

١١. کوڤارا (رۆناهی) هژمار (٣) سال (١)، کانوونا ئێکێ ١٩٦٠، أ. بابەراخێ هەمزانی (گوتار)، ل ٥- ١٢.
١٢. أنور المایي، الاکراد في بهدینان، ط ٢، دهوك - ١٩٩٩، ص ١٦٩ .
١٣. کوڤارا (دیرۆك)، هژمار (١) هاڤینا ٢٠١٣، سەعید دێرەشی، حەمیدی شاعرێ ئێکێ یێ کوردە د دیرۆکا تۆرەڤانیا کوردی دا (ڤەکولین)، ل ٧٣- ٨٥.
١٤. فازل عمر، ئەدەبێ کوردی ل دەڤەرا بەهدینان ١ (گوتار)، کوڤارا (پەیف)، هژمار (٣٥) سالا ٢٠٠٥، ل ٢٤.
١٥. تەحسین دۆسکی ، تێکستێت ئەدەبێ کوردی یێت بەرزە و دەستپێکێت نڤیسینێ (گوتار)، کوڤارا (پرێز)، دهوك، هژمار (١) پاییزا ٢٠٠٨، ل ١١٩-١٢٠.
١٦. د. کوردستان موکریانی، زارکرمانجی یەکەمین کوڤاری کوردی شاری رەواندز، (ئامادەکردن و پێشەکی)، چاپی یەکەم، هەولێر - ٢٠٠٢، ل ٤١. بەرێخو بدە زمارێن (٢، ٣، ٤، ٥، ٧، ٩، ١٠، ١٧) ل (١٦، ١٣، ١٨، ١٠، ٢١، ١٥، ١٧، ١٢).
١٧. ئومێد سەگڤان ئەحمەد، خەلات عەلی سلۆ، هەڤال عبدالکریم خالد، هژمارکاریەك ل دور هۆزانڤانێن دەڤەرا زاخۆ ژ سالا (١٩٠٠- ٢٠١٠) (ڤەکولینا دەرچوونێ / زانکۆیا دهوکێ، فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی- پشکا زمانێ کوردی، ئێڤاران)، ٢٠١٤، ل ٣.
١٨. کوڤارا (مەتین)، هژمار (٧٧)، خزیرانا ١٩٩٨، ل ٥٠ -٦٥.
١٩. موسەددق توڤی، کوڤارا رۆناهی، ژێدەرێ بەری، ل ١٦.
٢٠. کوڤارا (هاوار)، هژمار (٣٩) رۆژا ١٥ شوباتا ١٩٤٢.
٢١. موسەددق توڤی، ژێدەرێ بەرێ، ل ١٨.
٢٢. هەر ئەو ژێدەر، ل ١٩.
٢٣. هەر ئەو ژێدەر، ل١٩.
٢٤. رەشید فندی، کەسك و سوور و هندەك هزرێت ئەدەبی، دهوك - ٢٠٠٨، ل ٤٥.
٢٥. ئومێد سەگڤان ئەحمەد، خەلات عەلی سلۆ، هەڤال عبدالکریم خالد، هژمارکاریەك ل دور هۆزانڤانێن دەڤەرا زاخۆ ژ سالا (١٩٠٠- ٢٠١٠) (ڤەکولینا دەرچوونێ / زانکۆیا دهوکێ، فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی- پشکا زمانێ کوردی، ئێڤاران)، ٢٠١٤، ل ٤.
٢٦. الدکتور مسعود مصطفى الکتاني، المساجد والمدارس والعلماء والمخطوطات في إماره بادینان - العمادیة، الطبعة الأولى، دهوك - ٢٠١٠، ص ١٩٤.
٢٧. ژ ٧ی گولانا ١٩٥٩ێ هەتا ٣٠ نیسانا ١٩٦٠ێ، (٢٤) هژمار ژ ڤێ رۆژنامێ دەرکەفتن.
٢٨. موسەددەق توڤی، کوڤارا رۆناهی، ل ٢٠.
٢٩. صادق بەهائەددین ئامێدی، هۆزانڤانێت کورد، بەغدا - ١٩٨٠، کۆری زانیاری عیراق- دەستەی کورد، ل ٤٩٨.
٣٠. وصفی حسن ردێنی، فەرهەنگا نڤیسکارێت دەڤەرا بەهدینان ١٩٣٥ - ٢٠٠٠، دهوك - ٢٠٠٦، ل ١٤.
٣١. حافڤ قاچی، بیرەوەری، دهوك - ٢٠٠٣، ل ٦١و ٦٢ و ٦٤.
٣٢. موسەددق توڤی، کوڤارا رۆناهی، ژێدەرێ بەری، ل ٢١.
٣٣. رەشید فندی، کەسك و سوور و هندەك هزرێت ئەدەبی، دهوك – ٢٠٠٨، ل ٦٨.
٣٤. رەشید فندی، کەسك و سوور و هندەك هزرێت ئەدەبی، دهوك – ٢٠٠٨، ل ٦٩.
٣٥. أحمد محمد صالح و شیراز عبدالقهار محسن، هژمارکاریەك بۆ هۆزانڤانێت دەڤەرا ئامێدیێ (١٩٠٠- ٢٠١٠) (ڤەکولینا دەرچوونێ / زانکۆیا دهوکێ، فاکولتیا زانستێن مرۆڤایەتی- پشکا زمانێ کوردی، ئێڤاران)، ٢٠١٤، ل ٢٠.
٣٦. حافظ قاضی، بیرەوەری، دهوك - ٢٠٠٣، ل ١٣٤.
٣٧. فازل عومەر، ئەدەبێ کوردی ل دەڤەرا بەهدینان (گووتار)، کوڤارا (پەیڤ)، هژمار (٣٥) سالا ٢٠٠٥ ێ، ل ٣٢.
٣٨. حافظ قاضی، بیرەوەری، دهوك - ٢٠٠٣، ل ١٢٤.
٣٩. کوڤارا (دەفتەری کوردەواری) بەرگێ (٣)، مایس ١٩٧٠، ل ٦١- ٧٧.
٤٠. عصمت محمد بدل، محسن عبدالرحمن، أرشد حیتو، کاروانێ رەوشەنبیری یێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد/ لقێ دهوك ١٩٩١ - ٢٠٠٣، دهوك - ٢٠٠٣، گوتارێ سەیدا رەشید فندی، ل ٥.

٤١. ئەبو عوبەید عەبدوللا زیاب، هۆزانا نویخازی ل دەڤەرا بەهدینان، هەولیر -٢٠٠٥، ل ٧٦.

٤٢. رەشید فندی، کەسك و سوور و هندەك هزرێت ئەدەبی، دهۆك - ٢٠٠٨، ل ٧٠.

٤٣. ژێدەرێ بەرێ، ل ٧١.

٤٤. هەر ئەو ژێدەر، ، ل ٧٣.

٤٥. أ: کۆڤارا (بەیان) ژمارە (٩٢) تشرینی دووەم ١٩٨٣، ژمارەیەکی تایبەت بە ببلیۆگرافیای (بەیان) لە ساڵی ١٩٦٩ - ١٩٨٢، ئامادەکردنی : مصطفی نەریمان.

ب: وصفی حسن، فەرهەنگا ئەدیب و نڤیسکارێت دەڤەرا بەهدینان ١٩٣٥ - ٢٠٠٠، دهۆك - ٢٠٠٦.

٤٦. عصمت محمد بدل، محسن عبدالرحمن، أرشد حیتو، کاروانێ رەوشەنبیری یێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد/ لقێ دهۆك ١٩٩١ - ٢٠٠٣، دهۆك - ٢٠٠٣، گوتارێ سەیدا رەشید فندی، ل ٧..

٤٧. د. رەشید فندی، مێژوویا ئێکەتیا نڤیسەرێت کورد لقێ دهۆك ١٩٧١ - ١٩٩١، دهۆك - ٢٠١٥، ل ٤٤ و ٨٧.

٤٨. مجله (الشموع)، العدد الاول ١٩٧٦، مجلة سنوية اصدرها دار المعلمين الابتدائية في دهۆك.

٤٩. رەشید فندی، کەسك و سوور و هندەك هزرێت ئەدەبی، دهۆك - ٢٠٠٨، ل ٧٦.

٥٠. رەشید فندی، کەسك و سوور و هندەك هزرێت ئەدەبی، دهۆك - ٢٠٠٨، ل ٧٨.

٥١. ژبۆ دیتنات ناڤێن نوی د ئەدەبیاتا زارێ کرمانجی دا، ل هژمارێن رۆژنامەیا (بزاف) بنێرن کو نێزیکی (٥٧) هژمارا نە.

٥٢. بۆ پتر پێزانینان، ل ببیلۆگرافیایێن کۆڤارێ بنێرن کو ل هژمارا (٣٧) دەستپێکریە و پاشی هەر سال هاتییە بەرهەڤکرن د ناڤ بەریەرێن کۆڤارێ دا دهاتە بەلاڤکرن..

٥٣. ئەبو عوبەید عەبدوللا زیاب، هۆزانا نویخازی ل دەڤەرا بەهدینان، هەولیر- ٢٠٠٥، ل ٨٠.

٥٤. ئیسماعیل بادی: کاروانێ رۆژنامەڤانیێ ل دەڤەرا بەهدینان، دهۆك - ٢٠٠٦، ل ١٠ - ٢٧.

٥٥. اسماعیل بادی، رۆژنامەڤانیا کوردی د ناڤبەرا بزاڤا سیاسی و رەوشەنبیری دا، سلێمانی - ٢٠٠٤، ١٣١ - ١٣٢.

٥٦. کۆڤارا (نوخازی)، هژمار (١) دهۆك، سالا ١٩٩١ێ، ل ٤٥.

٥٧. ئەبو عوبەید عەبدوللا زیاب، هۆزانا نویخازی ل دەڤەرا بەهدینان، هەولیر- ٢٠٠٥، ل ٨٠.

٥٨. هەر ئەو ژێدەر، ل ٧٩.

٥٩. د. عارف حیتۆ، خواندنەك (زمانێ سێیەم کانی یا هەروهەر نویکرنێ) دا (گوتار)، کۆڤارا (بیاڤ)، هژمار (٧) پاییزا ٢٠٠١ێ، ل ١٥٣.

٦٠. ئەبو عوبەید عەبدوللا، هۆزانا نویخازی .... ژێدەرێ بەرێ، ل ٩٠.

٦١. هەر ئەو ژێدەر، ل ٩٠ - ٩١.

٦٢. هەر ئەو ژێدەر، ل ٩٣ -٩٤.

٦٣. هەر ئەو ژێدەر، ل ١٠٠.

٦٤. هەر ئەو ژێدەر، ل ١٠٠.

٦٥. عصمت محمد بدل و هندەکێن دی، کاروانێ رەوشەنبیریێ ئێکەتین نڤیسەرێن کورد، دهۆك- ٢٠٠٣، ل ١٦٦.

٦٦. هەر ئەو ژێدەر، ل ٧٧.

٦٧. عصمت محمد بدل و یێن دی، کاروانێ رەوشەنبیری یێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد.... ژێدەرێ بەرێ، ل ٧٨.

٦٨. موسەدەق توفی، ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، ژێدەرێ بەرێ ل ٢١٦.

٦٩. نەمان جەرجیس أمین، رۆژان عبدالعزیز محمد، هژمارکاریەك بۆ هۆزانڤانێن دەڤەرا دهۆك و دەوروبەر- سالا ١٩٠٠ - ٢٠١٠ز، ڤەکۆلینا دەرچوونێ سالا ٢٠١٤، ل ٧.

# کورتە چیرۆك
# ل دەڤەرا بەهدینان

**خالد سالح**

## دەستپێك:

هۆنەرێ کورتە چیرۆکێ هۆنەرەکێ نوی یە، بزاڤەکا مرۆڤایەتی یە و تا نهو مینا هەر هۆنەرەکێ دی چ پێناسێن تایبەت نینن، بەلکی هەر کەسەکی پێناسەکا تایبەت یا هەی، لێ ب گشتی چیرۆك هەلویستەکە ژ ژیانێ وەکی دیاردە، و دگەل بوونا مرۆڤی یا هەی و یا دگەلدا مەزن بووی و چەند سالۆخەتێن تایبەت پێن هەین، وەکی رویدان و کەسایەتی و دەم ئابووری دیەیڤان دا و... هتد[1].

تا نهو چ جهـ ب دروستی نەهاتینە دەستنیشانکرن کا یەکەمین چیرۆکێ ل کیش وەلاتی سەرێ خۆ هلدایە، چونکی ب کورتی ئەڤ چەندە هەر دگەل مرۆڤاندا هەبوویە، وەکی ڤەگێران و دەمێن خۆ دگەل دبۆراندن، ب تایبەت چیرۆکێن رۆمانسی و ئەفسانەیی و یێن ترسێ و... بەری خۆ ب چەسپینت وەکی هۆنەرەکێ سەربخۆ کو نهو ئەم دخوینین، ژبۆ ڤێ چەندێ ئەڤ ملەتێن خودان شارستانی هەڤرکمانی ل سەر ڤێ چەندێ دکرن، کا کیشکە یەکەم وەلات چیرۆکێ سەرێ خۆ لێ هەلدای و هەر ئێکی بۆ خۆ ڤەدکێشا و خۆ ب خودانێ وێ چەندێ دزانین، لەوما گەلەك ئەفسانەیێن کەڤن و چیرۆکێن ل سەر زارێ گیانداران دهاتنە گۆتن، وەکی (کلیلە و دمنە) یا هندی و پەندو چیرۆکێن یونانی و گریکی ب بنواشێ چیرۆکێ دزانین.

هەروەسان گەلەك ڤەکۆلەر هەبوون، وەسان بۆ دچوون کو چیرۆکێن ئەدەبی ددەمێ ڤەژینێ دا، کەتنە ژێر کارتێکرنا ئەدەبێ فارسی، کو ئێك ژ وان رەنگێن ئەدەبی دگۆتنێ (فابولا)، کو ئەو ژی د جهێ خۆدا رەنگەکێ دەستپێکیێ چیرۆکێ بوویە، ئەڤ چەندە ل (فەرەنسا) ل ناڤەراستا سەدالیا دووازدێ، تا دەستپێکا سەدالیا چواردێ هەبوویە، ئەو ژی چیرۆکێن هۆزانی بووینە[2].

هەر چەوان بیت، یەکەم رەنگێ چیرۆکێ ل چەرخێن ناڤین ل (ئەوروپا) هاتیە زانین، ئەو ژی پەرتووکا (پەروەردا ئایینی) بوو، یا جویەکێ (ئەندەلوسی) ب ناڤێ (موسا سفردی)، کو ل سالا (١١٠٦)ێ بوویە فەللێ کاتۆلیك، چیرۆك ژی یا تێکەلە دناڤبەرا (کلیلە و دمنە) و (سیندەبادێ دەریایێ) دا و هندەك وەسان بۆ دچن، کو ئەڤە ئەو پرا دەرباس بوونێ یە، دناڤبەرا چیرۆکا رۆژهەلاتی و رۆئاڤایی دا.

پشتی ڤێ چەندێ و ل سەدالیا چواردێ چیرۆکا (ئیتالی) وەرار کر، نەمازە د ژوورەکا بەرفرەهـ دا ل (فاتیکان) دهاتنە گۆتن، دگۆتنێ (کارخانا درەوا) و ب خۆشی خەلکی گوهێ خۆ ددانێ و دەمێن خۆش دگەل دبووراندن[3].

هەر دیسان (بۆکاچیو) (١٣١٣- ١٣٧٣ز)، یێ ناڤدار ب میرێ کورتە چیرۆکێ، یان یێ ناسیار ب بابێ چیرۆکێ، خودانێ (ئەلدیکامیرون) کو یا پێك هاتییە ژ (١٠٠) سەرهاتییان، ئێك بوو ژ وان کەسان کو ل (ئیتالیا) دەرکەتی و (ئیتالیا) ئێك بوویە ژ بنگەهێن گرنگ بۆ دەستپێکا کورتە چیرۆکێ[٤]. ل سەدالییا شازدێ چیرۆکێن (شڤان و گاڤان)ان ل (ئەسپانیا و ئیتالیا و فەرەنسا) بەلاڤ بوون، ئەڤ رەنگە چیرۆکە ژ وان چیرۆکێن دگۆتنێ (کارخانا درەوا) درێژتر بوون و تێدا سنج و رەوشت و فێرسی و پەهلەوانی و ژیانا کۆچەراتیێ ب باشی ل قەلەم ددان[٥].

ل سەدسالییا هەژدێ لاوازییەك کەتە دناڤ ڤان چیرۆکان دا. ژبەر پتر پویتە پێدانا خەلکی ب دەراڤی و (مادیاتا) و سەرەدەری دگەل ژیانێ.

دگەل سەدالییا نۆزدێ و دەستپێکا بەلاڤبوونا رۆژنامەگەریێ، چیرۆك ژی ب تێکەهەکێ نوی یێ هونەری ل ئەوروپا هاتە مەیدانێ و پتر بەلاڤ بوو، وەکی رەنگڤەدانەك بۆ پێشڤە چوونا مرۆڤا، کو بخۆڤە دیتی[٦].

ژلایێ کۆمەلایەتی ژی ڤە و ژ ئەنجامێ شۆرشا پیشەسازی و پشتی چیرۆکێ جهێ خۆ دناڤ سیاسەتێ ژی دا گرتی، پتر بزاڤ و لڤین و رۆناهی ئێخستنێ و بۆ هەڤرکمانی دبوارێن کۆمەلایەتی و ئایینی دا، بۆ خەباتکەر و یاخی، مل ب ملێن کەسێن سادەو بێ شیان دا، شەر دگەل ژیانا قورس و گران دکر و پیچ پیچ چیرۆکێ وەرارو پێشکەتن بخۆڤە ددیت، ل ژێر کارتێکرنا خواندنگەهێن هزری و کۆمەلایەتی و سیاسی یێن جودا جودا و چەندین خواندنگەهـ ژێ دەرکەتن، وەکی رۆمانسی و ریالیستی و ریالیستا سوشیالیستی و... تا خواندنگەهێن نوی تر.

ناڤ هینانا هندەك ناڤداران دڤی بواری دا، دیار دبیت کو سەدالییا نۆزدێ سەدالییا چیرۆکا کورت بوویە، ژوان ناڤان ژی: (موباسان ١٨٥٠- ١٨٩٣) (ئەدگار ئالان پو) ، کو ڤی کەسی چەند بنەما و دستور بۆ ڤی هونەری دانایینە، هەر دیسان (دودێ، هوفمان، تورگینیف، ئوسکار وایلد، گوگول، چیخوف و...)[٧].

## چیرۆکا کوردی:

وەکی یا دیار هونەرێ کورتە چیرۆکا کوردی، مینا یا هەمی دەڤەرێ نە گەلەك کەڤنە و بۆ ڤێ چەندێ بۆچوونێن جودا یێن هەین کا کیشکە یەکەم چیرۆکا کوردی و جهـ و مێژوویا دەرکەتنا وێ و وهەر نڤیسەرەکی و ژ هەست بوون ب بەرپرسیارەتییا نەتەوەیی، یێ ڤیای دەمەکێ کەڤنتر بۆ پەیدا بکەت، دا کو دیار کەت کو کورد نەکێمترن ژ نەتەوەیێن ل رەخ و رویێن خۆ.

تا دەمەکێ درەنگ بۆچوون دوەسا بوون، کو چیرۆکا (لە خەوما) یا (جەمیل سائیب)ی یەکەم چیرۆکا کوردی یە، لێ پشتی (د. کەمال مەزهەر) ی گۆتارەك ب زمانێ عەرەبی، ل گۆڤارا (المثقف الجدید)، ژمارە (٧١) ل سالا (١٩٧٥) ێ بەلاڤ کری، تێدا دیار کر کو چیرۆکا (فوئادێ تەمو) یەکەم چیرۆکا کوردی یە و پشتی (د. جەمال خەزنەدار) هەرسێ ژمارێن گۆڤارا (رۆژی کورد) ل سالا (١٩٨١)ێ بەلاڤ کرین، ئەو چیرۆك د دو ژمارێن وێ یێن سەری دا بەلاڤ بیوون و ب وێ چەندێ ئەو ب یەکەم چیرۆکا کوردی دهاتە ل قەلەم دان، لێ وەکی ئەو دبێژیت چیرۆك مابوو ل نیڤا رێ و تمام نە ببوو، لێ ل دووڤ بۆچوونا چەندین نڤیسەرێن دی چیرۆك یا تمامە و وەکی ئەو دبێژن، ئەگەر یا تمام نەبا بۆچی ل ژمارە (٣)ێ ژ گۆڤارێ، کو ناڤێ وێ بوویە (هەتاوی کورد) نەدهاتە خوار و هەر وی نڤیسەری هۆزانەك ل بن ناڤێ (گازندەیێن کوردان) ل (بپ ٢٥-٢٦) تێدا یا بەلاڤ کری یە؟!.

ل دووڤ ڤێ چەندێ دا چەندین بابەتێن دی ژ لایێ چەندین نڤیسەرێن دی ب زمانێن کوردی و عەرەبی ل سەر هاتنە نڤیسین، ب ڤێ چەندێ (لە خەوما) پاشڤە دهێتە رێزا چواری، پشتی چەندین نڤیسەرێن دی چەند چیرۆکێن دی بەلاڤ کرین، وەکی چیرۆکا (کندو) ی، کو ل بن ناڤێ (چیرۆکا کرمانجان) ب شێوەی فۆلکلۆر، مینا هەمی چیرۆکێن وی سەردەمی نڤیسی و ل گۆڤارا (رۆژی کورد) ژمارە (٣) ێ ل (بپ ٣١) بەلاڤ کری و چیرۆکا (کەریم زانستی) ب سێیەمین چیرۆك دهێت، کو ل رۆژناما (ژین) ل

(بپ٩) ل سالا (١٩٢٤)ێ بەلاڤ کری[٨]..

ل دووڤ دا پروفیسور (عزەددین مستەفا رەسول) (مەولودناما شێخ حسێن قازی) (١٧٩٠- ١٨٧٠)ێ ب دەستپێکەکا ساکارا چیرۆکا کوردی دزانیت.

(یاسین قادر بەرزنجی) ژی دبێژیت:

(بۆچی جلخوارم) یەکەم چیرۆکا کوردی یە، کو چەند هەیڤا بەری (لە خەوما ) یا بەلاڤ بووی.

ژبلی ڤان بیرو رایان، هندەك فۆلکلۆری ب بناغێ یەکەم چیرۆکا کوردی دزانن و هندەکێن دی وەسان بۆ دچن کو (نڤیسینەکا)کو ل رۆژناما (کوردستان) یا بەلاڤ بووی ب یەکەم چیرۆك دزانن[٩].

(د.فەرهاد پیربال) ژی چیرۆکا (مەم و زین) یا (مەلا مەحمودێ بایەزیدی) کو ل بن ناڤێ (حیکایەت) بەلاڤ کری، ب یەکەم چیرۆکا کوردی دزانیت و دبێژیت: چیرۆکێن وی سەردەمی هەمی ب شێوێ فۆلکلۆری هاتینە نڤیسین و دبیت ب بوورینا دەمی هندەك نڤیسینێن دی جهێ وێ چەندێ بگرن[١٠].

سەبارەت دەڤەرا بەهدینان ژی، دبیت تا دەمەکێ نێزیك پەیڤا چیرۆك ب واتایا خۆ یا هونەری دناڤبەرا هەبوون و نەبوونێ دا بوویە، راستە چەند کورتە چیرۆکێن کێم  و ل ئاستێن جودا جودا یێن بەلاڤ بووین، لێ ب دروستی چ وەرارو پێشکەتن بخۆڤە نەدیت بوو، بەلکی هەر پتریا وان هەر ب تنێ ڤەگێران و سەرهاتی بووینە و ئەگەرێ وێ ژی چەندێ ڤەدگەرێتەڤە چەند خالەکان:

- هونەرێ کورتە چیرۆکێ بخۆ هونەرەکێ نویترە ژ هۆزانێ، نە ل سەر ئاستێ کوردستانێ ب تنێ، بەلکی ل سەر ئاستێ دەڤەرێ و جیهانێ ب رەنگەکێ گشتی.
- چیرۆك هونەرەکە پتر ب بازێران ڤە یێ گرێدایە و وەکی دیار کۆمەلگەهێ کوردی پتر کۆمەلگەهەکێ جۆتیاری و شڤانداری بوویە و ڤێ چەندێ کارتێکرنێن ئابۆریێن نەرێنی یێن ل سەر ژیانا کەسێ کورد کری و پیشەسازی پێش نەکەتییە و مللەت ب رەنگەکێ گشتی یێ پاشڤە مای.
- نەبوونا چ کیانێن سیاسی یێن ئازاد، کو ڤێ چەندێ ژی کارتێکرنێن نەرێنی، نە هەر ب تنێ ل سەر کورتە چیرۆکێ یا کری، بەلکی یا ل هەمی لایەنێن ژیانا کەسێ کورد کری.
- بەلاڤ بوونا نەخویندەواریێ ب رەنگەکێ بەرفرەه، ئەگەر رەنگە خواندنەك ب کوردی هەبیت ژی هەر ئەو بوویە یا دناڤ  زوورێن مزگەفتان دا و وێ ژی پتر پویتە دایە هۆزانێ.
- هەمی ئەو خالێن ل سەری دیار کری، هۆکار بووینە کو چ رۆژنامەگەری ژی پەیدا نەبن و نەبوونا رۆژنامەگەریێ بخۆ ژی هۆکارەکە کو چیرۆك ژی پەیدا نەبت، لێ دەمێ ئەو خالێن ل سەری دیار کری هاتینە بەروڤاژی کرن، کورتە چیرۆکا کوردی ب رەنگەکێ گشتی و یا دەڤەرێ ب تایبەتی پەیدا بوو[١١].

## قۆناغا سالێن شێستان:

ئەڤ قۆناغا دەستپێکی، دبیت ناڤەکێ نە بەرهۆش بیت، بۆ تشتەکێ هەیی و بەرزە، لێ هەر چەوان بیت تشتەکێ هاتییە نڤیسین و تشتەکێ هەی ب ناڤێ چیرۆك، راستە سادەیێ بخۆڤە دگریت، چ ژ لایێ دارشتنێ ڤە و چ ژ لایێ ناڤەرۆکێ ڤە، لێ ئەم نەشێین بێژین تشتەك نینە ب ڤی ناڤی و ژوان چیرۆکێن دڤی سەردەمی دا هاتینە نڤیسین:

- سەرهاتییەك: نڤیسەر سالح روشدی. گۆڤارا رۆناهی ژمارە (٣) سالا (١٩٦٠)ێ، کو ئەڤە دهێتە هژمارتن یەکەم چیرۆك ل دەڤەرا بەهدینان.
- کۆمەلا (نان و ژیان): نڤیسەر محەمەد ئەمین ئوسمان، ل سالا (١٩٦٩)ێ ل (بەغدا). ئەڤە ژی پێك دهێت ژ پێنج چیرۆکێن زارڤەکرنێ.
- چەند چیرۆکەك ژ کۆمەلا (خان و مان): نڤیسەر سادق بەهائەددین ئامێدی، ئەڤ کۆمەلە ل سالا (١٩٨١)ێ یا چاپ بووی، لێ مێژوویا چەند چیرۆکێن وێ ڤەدگەرێنەڤە سالێن شێستان.

هەلبەت ژبلی (کەو و قدك)، کو نڤیسەرێ وێ ب

ناڤێ (نێچیرڤان) هاتییە نیاسین و ل رۆژناما (برایی) ژمارە (٢٢٦) ل شواتا سالا (١٩٦٨)ێ یا بەلاڤ کری.

هەروەسان چیرۆکا (تۆلە سەندن) یا نڤیسەر (عەزیز ئاکرەیی)، کو ب رەنگێ نامیلکەیە و وی هەردو دیالێکتێن ب کرمانجییا ژووری و ژێری نڤیسییە. ئەڤ چیرۆکە ژ (١٩ بپ) پێك دهێت[١٢].

ل ڤێرە پرسیارەك خۆ ئاراستە دکەت:

ئایا دەمێ ڤان نڤیسەران ئەو چیرۆك نڤیسین ئارمانجا وان یا سەرەکی نڤیسینا چیرۆکێ و پەیدا بوونا چیرۆکا دەڤەرێ بوویە، یان مەرەمەکا دی پێ هەبووینە؟

ئەگەر مرۆڤ ل دووڤ بابەتی بچیت و ب تایبەت هەرسێ ناڤ و نیشانێن دەستپێکی، دێ بینت هەر ئێکی ئارمانجەکا تایبەت هەبوویە، لێ ئەوێ ئارمانجێ ئارمانجەکا دی ژی یا هنگافتی، ئەو ژی پەیدا بوونا چیرۆکا دەڤەرێ وەکی دەستپێك:

وەکی سالح روشدی بخۆ دبێژیت:

ل دووڤ داخوازییا گۆڤارێ ئەڤ چیرۆکە یا نڤیسی و وەکی ئەو بخۆ دبێژیتەڤە:

ئەڤ چەندە یا ب گرنگی زانی و (لایەنەکێ مەزنە ژ ئەدەبێ کوردی) و هەلبەت وەکی دیار، یا وی ژێ پێ مەبەست فۆلکلۆرە، واتە ل ڤێرە ئەگەر گۆڤارێ ئەڤ چەندە ژێ داخواز نەکربا، دبیت نە نڤیسیبا[١٣].

محەمەد ئەمین ئوسمان دبێژیت:

کارکرنا وی درادیوێ دا و پێدڤییا رابوینێ بۆ چیرۆکێن زارڤەکرنێ، ئەو یێ پالدای وان رەنگە چیرۆکان بنڤیسیت و وەکی وی بخۆ دپێشەکییا کۆمەلێ دا دیار کری: چەندەك ژ وان یێن هاتینە زارڤەکرن. واتە ئەگەر وی ل رادیوێ کار نەکربا و رادیو یا پێدڤی ب زارڤەکرنێ و چیرۆکێن وان نەبایە، دبیت نە نڤیسیبان[١٤].

سادق بەهائەددین ئامێدی ژی دپێشەکییا (خان و مان) دا پرسیار دکەت و دبێژیت: کەنگی من دەست ب چیرۆکنڤیسینێ کرییە و ژبەر چی؟

د بەرسڤێ دا دبێژیت:

(ل سالا (١٩٦٣) ێ من دەرس دگۆتنە شاگردێت پشکا کوردی- کولیژا لیتراتورایێ - ل زانینگەها بەغدا، ئەز پێدڤی پرۆسا (نەثرا) بووم کو بدەمە شاگردێت خۆ دگەل هۆزانا، کو بخوینن، هوی (فێری) زارێ کرمانجی ببن، نەمازە ئەو شاگردێت ب زارێ سۆرانی دخویند و تاخڤتن)[١٥].

کەواتە دیسان ئەگەر ئەو مامۆستا نەبا، وی خۆ ب ڤان نڤیسینان ڤە نە دکر، هەر چەندە وی پشتی هینگێ ئەڤ رەنگە چیرۆکە یێن نڤیسین، لێ چ وەرار و پێشکەتن بخۆڤە نەدیتینە، هەر مینا سەرهاتییان یێن نڤیسین.

ئەڤ نڤیسەرێن ل سەری دیار کری، پشتی هینگێ هەر بەردەوامی یا دایە نڤیسینێ، لێ دوور ژ چیرۆکێ و کەسێ ژ وان خۆ ل وی بابەتی نەدایەڤە.

ب کورتی: مرۆڤ دشێت بێژیت کو سالێن شێستان، قۆناغا دەستپێکییا پەیدا بوونا ناڤێ چیرۆکا دەڤەرێ بوویە، چونکی ئەگەر ب رەنگەکێ گشتی ئەو چیرۆك بێنە خواندن، دێ بینین تێکدا ڤەگێرانێن سڤك و سادەنە و دداگرتینە ژ پەیڤێن کو چیرۆکێ نە لڤینن، بەلکی ل دووڤ هۆنەرێ چیرۆکێ، پرێژی مشە یا دناڤ دا هەی.

وەکی دیار چیرۆك پتر دناڤ کۆمەلگەهێن پێشکەتی دا سەرێ خۆ هلددەت و پتر وەرار و پێشکەتنێ بخۆڤە دبینن، نە مینا کۆمەلگەهێ کوردی یێ وی سەردەمی، کو پتریا وان کۆمەلگەهەکێ کشتوکالی بوویە و مژویلی ب خودان کرنا تەرش و کەوالی بوویە.

وان چیرۆکان ب رەنگەکێ گشتی، ژاری و ژیارا خەلکێ سادە، دناڤ کۆمەلگەهەکێ سادە دا یێن خۆیا و بەرچاڤ کرین و رویدانێن وان چیرۆکان پتر کۆمەلایەتی بووینە، ژبلی (سەرهاتییەك) کوچیرۆکەکا تام سیاسی بوویە.

## قۆناغا سالێن حەفتییان:

ئەگەر مرۆڤ بنێریتە چیرۆکا کوردی ل ڤێ قۆناغێ و هەمی قۆناغێن ل دووڤ دا ژێ هاتین، دێ

بینت کورتە چیرۆکا دەڤەرێ (یا کوردی ب گشتی) ب تمامی یا گرێدای کاودانێ سیاسیێ کوردستانێ ڤە بوویە، هەر دەمێ کاودانێ سیاسی ل بار بوویە، چیرۆکێ ژی لڤینەك و پێشکەتن بخۆڤە دیتییە و بەروڤاژی، ئەگەر کاودان یێ ل بار نەبایە، مرۆڤ دشێت ڤێ قۆناغێ ژی بکەتە دوو بشك:

## قۆناغا ئێکێ/ (١٩٧٠- ١٩٧٤):

دڤێ قۆناغێ دا، پێکهاتنا (١١)ی ئاداری ل سالا (١٩٧٠)ێ هاتە راگەهاندن، ئاشتی پشتی نەهـ سالێن شەری هاتە راگەهاندن و کاودان ب رەنگەکێ گشتی کەتە د قۆناغەکا گرنگ و مێژوویی دا، کوردستانێ پیشکەتنەکا باش و د هەمی بواران دا بخۆڤە دیت، کو ئێك ژوان لایەنان، لایەنێ رەوشەنبیری بوو، و ئەدەب پارچەك ژ وێ رەوشێ و کورتە چیرۆك پارچەك ژ وی ئەدەبی. ل ڤێرە یا مەبەست ژێ ب تایبەتی (کرمانجی) یە. ئێدی دەلیڤە دناڤ کاودانێ ئازادیێ دا هەلکەت، هەر چەند نە ل دووڤ خواست و پێدڤیابوو، لێ رۆژنامە و گۆڤار دەرکەتن، کۆمەلە و رێکخراوێن تایبەت د ڤی بواری دا هاتنە دامەزراندن، زمانێ کوردی بۆ زمانێ فەرمی ل خواندنگەهان، ئەڤە و چەندین خالێن دی بوونە فاکتەر، کو پتر پویتە ب زمانێ کوردی بهێتە دا و پتر بهێتە مەیدانێ و رۆژ بۆ رۆژێ وەرار و پێشکەتنێ بخۆڤە ببینت و خورتر لێ دهات، لێ چونکی کورتە چیرۆکا کوردی ب گشتی و یا دەڤەرێ ب تایبەتی چ ئەزمۆن ل بەری هینگێ بخۆڤە نەگرتبوون مینا شعرێ، دێ بینین رەنگە تێکەلییەك یا هەی، د ناڤبەرا چیرۆکا مللی و چیرۆکا هۆنەری و گەلەك ژێك نە دهاتنە ڤاڤارتن، دبیت هندەك نڤیسەر وەسان بۆ چووبن کو هەر ئەوە چیرۆك، لێ ئەو بخۆ ئەو چیرۆکە ئەوا ل سەر زارێ پیرو کالان د کۆچك و دیوانان ڤەدهاتنە گۆتن، نموونە ژی ئەو چیرۆکێن د هەردو ژمارێن گۆڤارا (چیا) ل سالا (١٩٧١)ێ دا هاتینە بەلاڤکرن، کو ئەگەر خۆ چیرۆك ژ هزرا نڤیسەری بخۆ ژی بت، دێ بینین یێ کەتییە ژێر کارتێکرنا فۆلکلۆری و گەلەك ب سادەیی یا نڤیسی، دبیت ئەڤە تشتەکێ سرۆشتی بت بۆ هۆنەرەکێ دێ ژنوی پێن خۆ ل مەیدانا ڤی هۆنەری رکێبنت، یان ل هندە جاران دارشتنا هزرا خۆ، یا دگەل چیرۆکێن فۆلکلۆری تێکەل کرین، مینا چیرۆکێن (عەلی نەقشەبەندی)، کو ل ژێر ناڤێ (چیرۆکێت کرمانجی) ل سالا (١٩٧٢)ێ بەلاڤ کرین، هەر چەوا بیت مرۆڤ دشێت بێژیت ئەڤ قۆناغە، قۆناغا ڤاڤارتنا چیرۆکا مللی یە ژ چیرۆکا هۆنەری، چونکی سەرەرای ڤێ تێکەلیێ، هندە بزاڤێن سادە یێن هەین، ب راست یێن ڤیاین چیرۆکا هۆنەری بنڤیسن، نموونە ئەو چیرۆکێن دناڤ رۆژنامەگەریا وی سەردەمی دا بەلاڤ بووین، وەکی بەلاڤۆکا (هیڤی) و رۆژناما (هاوکاری) و گۆڤارێن (رۆژی کوردستان و بەیان) دا.

## قۆناغا دووێ/ (١٩٧٥- ١٩٧٩):

قۆناغەکا گەلەك گرنگە ژمێژوویا سیاسیا گەلێ کوردستانێ، ئەو قۆناغە کو شۆرشا ئەیلولێ ژ ئەگەرێ رێکەفتنا (جەزائیر) سالا (١٩٧٥)ێ ژناڤچووی و چەك هاتییە بێدەنگ کرن، کەسێ کورد د رەنگە بێ ئومێدییەکێ وەربیوو، چونکی هەمی تشت دوێ شۆرشێ دا ددیت، نەمازە تاما سەرکەتنێ و ئارامیێ ل چوار سالێن پشتی رێککەفتنا (١١) ئاداری دیت بوون. وەکی رەنگڤەدانەك بۆ وێ کارەساتێ و وەکی دیتنا چریسکەکا رۆناهیێ و ژبۆ دەربرینا وی تشتێ دناخێ خۆدا، تەخا رەوشەنبیر دەست دانە قەلەمی و یا دلێ خۆ دادرێشتنە سەر کاغەزێ، ئەگەر چ ئەڤ رەنگە بزاڤە پتر دناڤ شعرێ دا یا دیاربوو و پەیڤ مینا شۆرشەکێ لێ هاتبوو، لێ ئەو چیرۆکا هەی ژی یا ڤالا نەبوو ژ ڤی هەلویستی، د ڤێ قۆناغێ دا چیرۆکێ ژی پێچ پێچ جهێ خۆ یێ سرۆشتی دناڤ ئەدەبی دا دگرت و تا رادەکی کراسێ فۆلکلۆری ژبەر خۆ کر، پتر بەرەڤ هۆنەریێ ڤە چوو، کو مرۆڤ دشێت ڤێ قۆناغێ، ب قۆناغا دەستپێکییا دروستا چیرۆکا دەڤەرێ ل قەلەم بدەت و ژ گرنگترین هۆکارێن پەیدا بوونا وێ ڤەدگەرێتەڤە دو خالان:

ئێك: رەنگڤەدانا رویدانا سالا (١٩٧٥)ێ، کو

گەلەك كارتێكرن ل دەروونێ كەسێ كورد و نەمازە ل رەوشەنبیران كربوو، ئەڤ چەندە بۆ پالدەر كو بەرێ خۆ ب دەتە خواندن و نڤێسینێ ب زمانێ كوردی و پتر بەرێ خۆ ب دەتە رەوشەنبیریێ، ب پەیڤێ دەربرینێ ژ مەینەتێن خۆ بكەت و تا رادەیەكی شیا وێ دەربرینێ ب هێمایێن سڤك، د رێكا كێشێن كۆمەلایەتی دا ژێ بكەت و پتر بەرێ گەنجێ كورد ب دەتە خواندن و نڤیسینێ ب زمانێ كوردی، نەمازە دەستپێكەكا خواندن و نڤیسینێ ل پشتی بەیاننامــا (١١) ی ئادارێ هاتبوو مەیدانێ.

دوو: پتر پویتەدانا وان رۆژنامە و گۆڤاران كو ل (بەغدا) دەردكەتن ب زارێ كرمانجی (بەهدینانی)، مینا رۆژنامەیا (هاوكاری) وگۆڤارا (بەیان)، ب تایبەت ل دوماهییا سالێن حەفتیان و ئەڤە ژی بوونە هاندەر كو چەندین نڤیسەرێن گەنج پشكداریێ تێدا بكەن و پشتی هینگێ رۆلێ خۆ ببینن وەكی چیرۆكنڤیس.

ژ گرنگترین دیاردێن ل سەر كورتە چیرۆكا دەڤەرێ دڤێ قۆناغێدا پەیدا بووین ئەڤ خالێن دیار كرینە:

١ - بوونا یەكەم كۆمەلە كورتە چیرۆكا كوردی ب واتایا خۆ یا هونەری ب زاراڤێ بەهدینانی، ئەو ژی كۆمەلا (كــومــڕ)ە، یا چیرۆكنڤیس (ئیبراهیم سەلمان)، كو ل سالا (١٩٧٩)ێ ل بەغدا دەركەتی، د ڤێ كۆمەلێ دا چیرۆكنڤیس مرۆڤی دبەتە ژیانا سادە یا گوندان و سەڤا و سەرو بەرێ وان و ئەڤینی و كێشێن جڤاكی و ژاری و پێشمەرگایەتی، كو ب هێما ناڤان دەربرین ژێ كری. دیسان مفا یێ ژ ژیانا گوندان و كەڤنە باوەریان كری بۆ ئاڤاكرنا چیرۆكێن خۆ. چیرۆكنڤیس چەند د هندە چیرۆكان دا یێ گەشبینە، ل بەرامبەر د هندە چیرۆكاندا یێ رەشبینە.

٢ - پەیدابوونا چەندین نڤیسەران، كو دڤێ قۆناغێ دا یەكەم چیرۆكا خۆ بەلاڤ كرین و پشتی هینگێ كۆمەلە چیرۆك بەلاڤ كرین، مینا (شەعبان مزیری، سدقی هرۆری، جەعفەر ئیبراهیم حاجی، نزار محەمەد سەعید).

٣ - بەردەوامبوونا چەند نڤیسەران ل سەر نڤیسینا چیرۆكێ، وەكی بەردەوامبوونا قۆناغا پێشتر ل نیڤا ئێكێ ژ سالێن حەفتیان، مینا (فاروق ئامێدی، فارس عەبدولا حەمو، رەشید فندی، ئەنوەر محەمەد تاهر).

٤ - بۆ جارا ئێكێ ل دەڤــەرێ، كورتیلە چیرۆك (پۆستەرە چیرۆك) ژ لایێ (ئیبراهیم سەلمان و فەیسەل مستەفا) ڤە هاتە نڤیسین.

٥ - ئامارا چیرۆكێن بەلاڤ كری هەر بەرەڤ زێدەبوونێ ڤە دچوون. بۆ نموونە ئەو چیرۆكێن ل رۆژناما (هاوكاری)، وەكی ژێدەرێ سەرەكی بەلاڤ بووین دێ بینین ل سالێن (١٩٧٥ و ١٩٧٦)ێ، چ چیرۆك بەلاڤ نەبووینە. لێ ل سالا (١٩٧٧)ێ یێن بووینە دو چیرۆك و ل سالا (١٩٧٨)ێ بووینە (پێنج) چیرۆك و ڤێ ژمارێ ل سالا (١٩٧٩)ێ خۆ ل (٢١) چیرۆكان و ئێك كۆمەلە چیرۆك دا. زێدەباری گۆڤارا (بەیان)، كو ل سالا (١٩٧٨)ێ چیرۆكەك تێدا بەلاڤ بووی و ل سالا (١٩٧٩)ێ سێ چیرۆك تێدا بەلاڤ بووین. هەروەسان چیرۆكەك ل سالا (١٩٧٩)ێ ل گۆڤارا (ئاسووی زانكو)، كو ل (سلێمانیێ) دەردكەت یا بەلاڤ بووی.

## قۆناغا سالێن هەشتیان:

سالێن هەشتییان، واتە ژ سالا (١٩٨٠ تا ١٩٨٩)ێ یە، لێ چونكی ئەڤ دو سالێن ل دووڤ دا هاتین، چ بزاڤەكا خورتا چیرۆكێ دناڤ دا نەبوو، دیسان دەڤەر ب گشتی چوو دناڤ قۆناغەكا دی یا مێژوویی دا، د ڤان دو سالان دا لەشكەرێ عیراقێ چوو دناڤ ئاخا (كوێت) ێ دا و هاتە داگیر كرن، ل دووڤ دا سەرهلدانا خەلكێ عیراقێ چێ بوو، كاودان بەرەڤ سەمتەكا دی ڤە چوون، ژبەر ڤێ چەندێ ئەڤ دو سالێن ل دووڤ دا هاتین، واتە سالێن (١٩٩٠، ١٩٩١)ێ هاتنە دگەل سالێن هەشتییان، هەر چەند یا كێم بەرهەم و كێم ڤەرێژ بوو، لێ چونكی كوردستان كەتە د قۆناغەكا دی یا مێژوویی دا، لەوما ب فەر هاتە دیتن ئەو دو سال وەكی بەردەوامی دانا قۆناغا سالێن هەشتیان بهێنە

هەژمارتن، هەر چەند جیاوازییەك یا دگەل هەی، ب تایبەت ژ لایێ چەندیێ ڤە.

قۆناغا سالێن هەشتییان یا پڕی رویدانێن سیاسییە، چ ل سەر ئاستێ (عیراق) ێ و چ ل سەر ئاستێ كوردستانێ و رویدان گەلەك ب لەز دچوون.

ل نیڤا ئێكێ چەندین رویدان تێدا بوون: شەرێ عیراق- ئیران، پێشڤە چوونا لەشكەرێ ئیرانێ بۆ ناڤ ئاخا عیراقێ ڤە، پێشڤە چوونا خەباتا چەكداری ل كوردستانێ و... هتد.

ل نیڤا دووێ ژی ئاراستە بەرەڤ سەمتەكا دی ڤە چوون: راوەستاندنا پێشڤەچوونا لەشكەرێ ئیرانێ بۆ ناڤ ئاخا عیراقێ و راوەستاندنا شەری ب ئێكجاری، بەردەوامیدانا كاڤل و وێران كرنا كوردستانێ ب رەنگەكێ دژوارتر، تا گەهشتییە بكارهینانا چەكێ كیمیاوی، و ئەنجامدانا هەوێن ئەنفالان، واتە ب كورتی ئەم دشێین بێژین قۆناغەكا نوی بوو ژ جینوسایدكرنا گەلێ كورد.

ڤان رویدانان و چەندین رویدانێن دی، كارتێكرن ل نڤیسەران كرینە، ب ئەدەبی دەربڕین ژوان رویدانان كرینە و بووینە گرنگترین بابەتێن چیرۆكنڤیسان، ئەڤ قۆناغە دهێتە هژمارتن قۆناغەكا مێژوویی بۆ چیرۆكا دەڤەرێ و مرۆڤ دشێت بێژیت دەستپێكا دروستا چیرۆكا دەڤەرێ یە، چ ژ لایێ چەندیێ و چ ژ لایێ چەوانیێ ڤە، ئەگەر رەنگە سادەیەك د گەلەك ژوان چیرۆكان ، یان د هندە كۆمەلە چیرۆكان دا هەبیت ژی و ئەڤە تشتەكێ رەوایە بۆ هەر رەنگەكێ ئەدەبی و ل هەر جهەكی. لێ گەلەك ژوان نڤیسەران شیان جهێ خۆ بێن سرۆشتی دناڤ چیرۆكێ دا موكم بكرن ب ركیبینن و شیان تەكنیكێن نوی بكار بینن و چیرۆكا دەڤەرێ ب دروستی بیننە مەیدانێ و بێخنە سەر رێكا وێ یا دروست.

ژ لایێ چەندیێ ژی ڤە دێ بینین هەر ژسالا (١٩٨٠- ١٩٩٠)ێ، واتە دڤان (١١) سالان دا پتر ژ (٢٠٠) كورتە چیرۆكان ب ڤە رەنگی ل دووڤ ئێك بۆ هەر سالەكێ یێن بەلاڤ بووین:

(١٥ - ١٥ - ٤ - ٧ - ٣٤ - ٢٣ - ١٧ - ٢٥ - ١٥ - ٢٢ - ٢٥)[١٦].

ژگرنگترین فاكتەرێن دڤێ قۆناغێ دا بووینە پالدەر بۆ پێشڤە چوونا كورتە چیرۆكا دەڤەرێ:

ئێك: پەیدابوونا ژمارەكا باش ژ گەنجان كو هەست ب بەرپرسیارەتییا خۆ یا نەتەوەیی و نیشتیمانی و مێژوویی و رەوشەنبیری و مرۆڤایەتی دكرن.

دو: كارتێكرنا كاودانێن نالەبارێن سیاسی و جڤاكی و ئابووری ل سەر كۆمەلێ ب گشتی و ل سەر كەسایەتییا وان ب تایبەتی.

سێ: كارتێكرنا رەوشەنبیریا بیانی ل سەر رەوشەنبیركرنا وان و نەمازە یا عەرەبی.

چوار: رۆلێ رۆژنامەگەریێ كو د وی سەردەمی دا هەر بەرە بەرە بەرفرەهتر لێ دهات، ئەو ژی بوونە پالدەر كو دەلیڤە بۆ گەنجان پتر هەلكەڤیت بەرهەمێن خۆ ب ساناهیتر بەلاڤ بكەن و دیسان بۆ دەلیڤە كو پتر خواندەڤان ژی ل دۆر خرڤە ببن، مینا (رۆژنامەیێن هاوكاری و بزاڤ و عیراق و پاشكوی عیراق و گۆڤارا بەیان) كو ل (بەغدا) دەردكەتن و (گۆڤارێن كاروان و حوكمێ ئوتونومی) كو ل (هەولێر) ێ دەردكەتن، ئەڤە زێدەباری (گۆڤارا دەنگێ مە) و تاكە ژمارا گۆڤارا (پەیڤ) كو ل (دهۆكێ) دەردكەتن.

ئەگەر ئەم ل ژمارێن وان چاپەمەنییان بگەرێین، دێ بینین ژمارەكا باشا ناڤ و نیشانان بۆ كورتە چیرۆكان، یان كورتیلە چیرۆكان یا دناڤ بەرپەرێن خۆدا هەمبێز كرین و ب ڤی رەنگێ ل خوارێ دیار كری، هەلبەت ژ بلی چەند گۆڤارێن دی كو ب رەنگەكێ كێمتر رۆلی خۆ د بوارێ چیرۆكا دەڤەرێ دا دیتی، مینا رۆژی كوردستان و نووسەری كورد و... یێن مایی:

- گۆڤارا كاروان: (٦٢) كورتە چیرۆك.
- رۆژناما هاوكاری: (٥٦) كورتە چیرۆك.
- گۆڤارا بەیان: (٣٧) كورتە چیرۆك.
- رۆژناما بزاڤ: (٢٩) كورتە چیرۆك.
- گۆڤارا پەیڤ: (٤) كورتە چیرۆك.
- گۆڤارا دەنگێ مە: (١١) كورتە چیرۆك.

- گۆڤارا رۆژی كوردستان: (۱) كورتە چیرۆك.
- گۆڤارا حوكمێ زاتی : (۱) كورتە چیرۆك
- گۆڤارا نووسەری كورد: (۱) كورتە چیرۆك[١٧].

هەلبەت ژبلی رۆژنامێن (العراق) و (پاشكویا رۆژناما عیراق) و چەند بەلاڤۆكێن دی.

ژگرنگترین ناڤێن دڤێ قۆناغێ دا دیار بووین، كو یەكەم چیرۆك بەلاڤكرین و پشتی هینگێ كۆمەلە چیرۆك بەلاڤكرین و ناڤێ وان چوویە دناڤ لیستا چیرۆكنڤیسێن دەڤەرێ دا كو مرۆڤ دشێت وان ب (چیرۆكنڤیسێن سالێن هەشتیان) ب ناڤ بكەت ئەڤ ناڤەنە: (محەمەد سەلیم سواری، نافع ئاكرەیی، بایزێ عەمەر، جەلال مستەفا، كەریم جەمیل بیانی، فازل عومەر، حەسەن سلێڤانەیی، عەگید شەفیق، عەبدولا جوندی، حەكیم عەبدولا، خالد سالح، سەبیح محەمەد حەسەن، ئیسماعیل مستەفا، حەسەن ئیبراهیم، تێلی سالح، جەمیل محەمەد شێلازی، زەكی سلیڤان، قەیران فەرەج، عسمەت محەمەد بەدەل)[١٨].

هەر دیسان دڤێ قۆناغێ دا (١٠) دەهـ نڤیسەران یەكەم كۆمەلە چیرۆكێن خۆ چاپكرن، كو ئەڤ ناڤێن ل خوارێ دیار كرینە: (نافع ئاكرەیی، شەعبان مزیری، ئەنوەر محەمەد تاهر، محەمەد سەلیم سواری، راستی هرۆری، نزار محەمەد سەعید، كەریم جەمیل بیانی، عەبدولا جوندی، جەلال مستەفا، زەكی سلیڤان) و هندەكان پتر ژ كۆمەلەكێ چاپكرن، وەكی (راستی هروری، محەمەد سەلیم سواری، شەعبان مزیری نافع ئاكرەیی)، هەلبەت ژبلی (جەعفەر ئیبراهیم)[١٩] و سەرفەراز نەقشەبەندی[٢٠] واتە دڤێ قۆناغێ دا (١٧) كۆمەلە چیرۆك ب قەبارەیێن جودا جودا چاپ بووینە.

ئەگەر چ پتریا ڤان نڤیسەران ژنوی ل ڤێ قۆناغێ هاتنە مەیدانێ، لێ هندەكان بەردەوامی دا قۆناغا پێشتر و مرۆڤ دشێت وان- ژ بلی ئەنوەر محەمەد تاهری[٢١]كو تاكە نڤیسەرێ قۆناغا سالێن حەفتییان و تا نهو سەركەتییانە یێ بەردەوامە ل سەر رۆلێ خۆ وەكی چیرۆكنڤیس، ڤان چیرۆكنڤیسێن دی ب (چیرۆكنڤیسێن دوماهییا سالێن حەفتیان) ب هەژمێریت مینا (ئیبراهیم سەلمان، سدقی هروری، سالمێ جاسم، نزار محەمەد سەعید و... یێن مایی).

ئەڤ نڤیسەرێن ناڤبری، كو ل ڤێ قۆناغێ و ل قۆناغا پێشتر ژی دەركەتین، پتریا وان رێبازا ریالیستی و هندەك ژ وان ریالیستا سوشیالیزمی هەلبژارتینە، نامەیێن جودا جودا هەبووینە، كو هندەك ژ وان وەكی دەستە بژێر نامەیا خۆ ئاراستە كرینە، خەم هەلگر و بار هەلگر بووینە، لەوما گۆتارێن وان د پری رەخنە و گلی و گازندەنە و داخوازا جڤاكەكێ یوتوبیایی كرینە، كو وان د هزر و د ئاشۆپا خۆ دا وێنە دكرن و دەما نەشیاین وێ نامێ ئاراستەی جهێ وێ یێ دروست بكەن، چ یێ نەمایە ڤێجار پەنا یا بۆ بەر ل خۆ گەریانێ وەكی كەس، وەكی چەوان ل بەری وێ چەندێ ل مللەتێ ژی گەریانە وەكی گەل. دڤێن بزانن جهێ وان ل ناڤ كۆمەلێ دا ل كویرێ یە؟ دەما جهێ خۆ دناڤ جڤاكەكێ پاشكەتی دا نە دیتین چ یێ نەمایە ژ هاڤی و ڤەدەربوونێ پێڤەتر و خۆ یاخی دناڤ كۆمەلێ دا دیتینە و دگەهنە وێ چەندێ ئێدی خۆ بەرزە دبینن و دبیت ل هندە جاران ئەڤ بەرزەبوونە یا ب فەلسەفەكا تایبەتا وان یا كەسایەتی ڤە ژی یا گرێدای بیت، یان كاودانەكێ نوی كو ئەو تێ ئالیاین، وەكی خەونەك و هیڤییەك هەبوون و ب جە نەهاتن، یان كاردانەڤا حالەتەكێ وی یێ دەروونی، یان كاودانەكێ تایبەت، نەمازە چوونا ژ دەرڤەی وەلاتی و خۆ د بۆشاییەكا بێ دوماهیك دا دبینن و ژیانێ بێ واتا دبینن.

ل بەرامبەر ڤان چیرۆكنڤیسان، هندەك چیرۆكنڤیسێن دی هەنە گۆتارەكا سڤك و سادە هەنە، ب تنێ یێن ڤیاین پەیامەكێ، یان دیمەنەكی، یان رویدانەكێ بەرچاڤ بكەن، نەمازە ئەو رویدانێن سیاسی كو كوردستان تێرا دەرباس بووی و كێشێن جڤاكی دناڤ كۆمەلگەهێ دا.

ئەگەر ئەم ل وان رویدانێن سیاسی بنێرن، دێ بینین كو چیرۆكنڤیسان فەرهەنگەكا سیاسی، چ راستەو خۆ یان نەراستەو خۆ یا دناڤ دەقێن خۆ دا

هەمبێز کرین: کوردینی، نەتەوە، شۆرش، پێشمەرگە، هەلویست، بەرەڤانی، ئالا، گرێدان ب ئاخێ ڤە، وەلات، بەرگری کرن، ناسنامە، سەرهلدان، خەبات و تێکوشان، خەباتا سیاسی و لەشکەری، قوربانیدان و... هتد و ل بەرامبەر ڤان پەیڤان ب دەهان پەیڤێن تەراژیدیا کوردان: جینوساید، قرکرن، خوین، زولم، ئاگر و ئاسن، کاڤل و وێران کرن، زولم و زۆرداری، سڤکاتی ب کوردان کرن، بەرزەبوون، تەعریب، زیندان، کوشتارگەهـ، ل سێدارەدان، ئەشکەنجە و لێدان، زالگەهـ، مشەخت کرن، مشەخت بوون، ئوردیگا، دەستەلاتا رژێمێ و درندایەتی، دەربەدەری، کۆچا مەلیونی، هەمی ئەو کاودانێن نالەبارێن ئابووری و رەوشەنبیری و جڤاکی ژ ئەنجامێ وان سیاسەتێن هۆڤانە، تا دگەهیتە کەلا نزارکێ و کیمیاوی و هەلەبچە و هەوێن ئەنفالان، کو ب هزاران کەس ژ ناڤبرین. هەر دیسان چەندین پەیڤێن دی کو پەیوەندی ب بابەتی ڤە هەی: دەستکاتی کرن بۆ دوژمنی و خۆ فرۆشتن و سیخوری و... هتد.

هەر دیسان کێشێن جڤاکی ژی جهێ خۆ دگەلەک چیرۆکان دا بێن کرین، ب تایبەت کێشا ژنێ و رەوشت و تیتالێن کەڤن: ئەڤینی، ب خورتی دان شوی، (فرۆتنا وان)، کوشتن، قەیرەبوون، گوهنێلی، خرشاتی، دۆتمام و پسمام و... و چەندین کێشێن دی یێن کۆمەلایەتی، ب تایبەت ژاری و ئێتیم و سێوی بوون و دەردێ ژنبابێ و ماف خوارن و پێشێلکرنا مافان و مافێ جیرانی و زبارە و ئاغا و نەخۆشی و زارۆك بوون و کێشێن ساخلەمیێ و بێ کاری و مێهڤانداری و... هتد.

هەلبەت ناڤەرۆکا چیرۆکان گەلەك بابەتێن دی ب خۆڤە دگرن، مینا شەرەنیخا ژیانێ و شەرەنیخا دو بەرەبابان و بابەتێ هەبوون و نەبوون و کەنی و گری و مرن وەکی فەلسەفە و وەکی گرێدان ب حالەتێ مرۆڤی ڤە، ب تایبەت یێ سیاسی، کو سەرکەتن و رزگاری، واتە ژیان و بەروڤاژی، شکەستن و بندەستی، واتە مرن.

دیسان بابەتێن ئاشتی و مرۆڤایەتی و تا دگەهیتە (عەبەسیەت)، ژ بابەتێن هندە دەقێن دی نە.

نڤیسەرێن چیرۆکێ، گەلەك جاران ژ بەر کاودانێن سیاسی پەنا برینە بەر جەڤەنگان و ئەڤ چەندە گەلەك جاران ب ناڤێن مرۆڤان، مینا (ئازاد، کیڤی، ئۆمێد، بێکەس، کوردو و سەربەست و خەبات و هتد) دەربرین ژێ کرینە. یان هندە جاران ئەو دەربرین ب هندە تشتێن دی کرینە، مینا (چیا و ئاش و کاروان و کەڤال و کەو و دار بەروی و بارانا رەش و بیڤەلەرز و هتد).

هندە چیرۆکنڤیسین دەڤەرێ، وەکی کەسێن زیندی و وەکی هەست ب بەرپرسیاریەتیێ کرن نە د ڤالانە ژ رەخنەگرتنێ، ب تایبەت ئەو دەردێن دناڤ مللەتی دا دبەربەلاڤ: براکوژی، گەندەلی، نەدادی، نەیەکسانی، پاشڤەمان، پارەپەرێسی، خۆفرۆتن، دکتاتوریەت، بێ بهایا قەلەمی و رەوشەنبیران و پویتە نەدان ب وان، بەدرەوشتی، پرێژی، بەرزەبوون ل دەرڤەی وەلاتی و هتد.

قەهرەمانێن چیرۆکێن دەڤەرێ هند ژێ د رەشبینن و هند بەروڤاژی د گەشبینن، دبیت ئەو ژی پتر یێ ب بارێ دەروونییێ نڤیسەری بخۆڤە یێ گرێدای بت، ئەگەر چ پتریا دەقان گەشبینیێ بخۆڤە دگرن، لێ ل گەلەك جهان بێزاری و بێ هیڤی بوون و رەشبینی ژی دناڤ گەلەك دەقان دا ل بەرچاڤە، لێ ل هندە دەقێن دی رەشبینییە، تا دوماهییا چیرۆکێ ئەو دەرگەهـ ب کلیلیا گەشبینیێ ڤەدبن، درێکا خەون و ئاشۆپ و پەنابرن بۆ ئەفسانە و چیڤانۆك و تەیرکێ دەولەتێ کەڤنە باوەریان و... هتد و جارەکادی رۆناهیێ دبیننەڤە.

ل سەر شێوازێ چیرۆکان ژی هندەك نڤیسەران پتر پویتە داینە رۆخساری، لێ هندەکان پویتە داینە ناڤەرۆکێ، کو د سڤك و سادەنە، دا نامەیا وان ب ساناهی ب گەهیت، یان دبیت هەر ئاستێ وان بخۆ دوی ئاستی دایە و نەشێت ژ وێ چەندێ باشتر بنڤیسیت.

وەکی ئاماژە پێ هاتییە دان کو چیرۆکێن دەڤەرێ پتریا وان د ریالیستی نە، لەوما دێ بینین دەم ژی هەر

بێ گرێدای وی ریالیستییە، واتە دەم ئەو دەمە یێ چیرۆك لێ هاتییە نڤیسین و ئەگەر وەكی فلاش باك ڤەگەڕیابیتەڤە دەمەكێ كەڤن ژی، باراپتر هەر ئەو دەمە یێ وی دیتی و ل ڤێرە دەم باراپتر یێ چارچۆڤە كرییە دناڤبەرا سالێن حەفتیان و هەشتییان و هندەك ژێ بێن ڤەگەڕیاینەڤە سالێن شێستان و ئەو ژی پتر ئەو چیرۆكنڤیسن كو ئەو دەم دیتین و قەهرەمانێن چیرۆكان ژی پتر ژ دۆرهێلی یێن وەرگرتین، كێم جاران كەسێن ئاشۆپی نە، هەمی ئەو كەسن یێ ژناڤ سرۆشت و سەقایێ ئەو تێدا دژیت هەلبژارتین، ب تایبەت گوند و باژێرێن وەلاتی، ئەگەر چ پتریا وان دەستنیشان نەكرینە چ جهن، لێ ژ سالۆخەتان دیارە هەر كوردستانە... گوند و فۆلكلۆر و رەوشت و تیتال و ژینگەهـ و سەقا و یاری و... دیسان باژێر ب كەسایەتیێن خۆ یێن جودا جوداڤە، هەروەسان چیرۆكنڤیسان هندەكان جهـ ڤەگوهاستینە بۆ چۆل و چیایێن وەلاتی، ب تایبەت ل رۆژێن خەباتێ، یان ل هندە جاران مەیدانا رویدانان برینە ژ دەرڤەی وەلاتی ژی.

## قۆناغا پشتی سەرهلدانێ:

دهێتە هژمارتن گرنگترین قۆناغ د مێژوویا چیرۆكا كوردی ل باشووری كوردستانێ، كو دەڤەرا بەهدینان ژی پارچەك ژ وێ رەوشێ، تێدا كورتە چیرۆك كەتە سەر رێكا خۆ یا راست و دروست و سێ دەستەكان پشكداری تێدا كرن (چیرۆكنڤیسێن سالێن حەفتیان و چیرۆكنڤیسێن سالێن هەشتیان و چیرۆكنڤیسێن پشتی سەرهلدانێ)، كو مرۆڤ دشێت قۆناغا پشتی سەرهلدانێ ژی بكەتە دوبشك: قۆناغا سالێن (١٩٩٢-٢٠٠٣)ێ، كو رژێما عیراقێ لێ شكەستی و قۆناغا پشتی سالا (٢٠٠٤تا نهو)، كو ب دەهان نڤیسەران سەرێن خۆ د ڤی بواری دا هلدان و بزاڤا چیرۆكنڤیسیێ خورتر لێ هات، دبیت ئەگەرێ وێ ژی ڤەدگەڕیتەڤە چەندین خالان:

- هەبوونا كیانەكێ نیڤ سەربخوو، كو ئەڤە بوویە پالدەرو پشتەڤان بۆ پێشڤە چوونا خواندن و نڤیسینێ ب زمانێ كوردی و ڤێ چەندێ كارتێكرنێن ئەرێنی ل سەر پتر بەلاڤ بوونا بەرهەمێن ئەدەبی هەبوون.

- بەلاڤبوونا رۆژنامەگەریێ ب رەنگەكێ گەلەك بەرفرەهـ، كو چ باژێر و باژێرك نەماین ئەگەر چ چاپەمەنی لێ نەدەركەتین، ب دەهان رۆژنامەو گۆڤار دەركەتن، ب ڤێ چەندێ گەنج پتر شیان بێنە دناڤ مەیدانێ دا و رۆلێ خۆ دناڤدا ببینن و ب دەهان چیرۆكان تێدا بەلاڤ بكەن، ب تایبەت گۆڤارا (پەیڤ)، كو وێ ب تنێ تا دوماهیا سالا (٢٠٠٥)ێ، پتر ژ (٢٥٠)ێ چیرۆكان دناڤ بەرپەرێن خۆدا هەمبێز كربوون، دیسان هەردو حەفتینامەیێن (پەیمان و ئەڤرو) و دگەل هەڤبەندێن وان یێن (ئەدەب و هۆنەر)، كو وان ژی هەر د ڤی دەمی دا شیان پتر ژ (٢٠٠) چیرۆكان بەلاڤ بكەن، وەسان ئەڤ رۆژنامە و گۆڤارێن ل خوارێ دیار كری ژی، كو هەر ئێكێ ب رەنگەكێ بەهرا خۆ یا تێدا كری:

رۆژناما رەسەن: پتر ژ (٦٠) كورتە چیرۆكان بەلاڤكرینە.

گۆڤارێن (مەتین، دیجلە، ماف، نۆبۆن): هەر ئێكێ ل جهێ خۆ پتر ژ (٣٠) كورتە چیرۆكان بەلاڤكرینە.

گۆڤارێن (تیرۆژ، سەرهلدان، خازر): هەر ئێك ژ وان نێزیكی (٢٠) كورتە چیرۆكان تێدا بەلاڤبووینە.

رۆژنامەیێن (چاڤدێر، سەرهلدان): هەر ئێكێ پتر ژ (٥) كورتە چیرۆكان بەلاڤكرینە.

رۆژنامەیێن (چەپەر، بۆتان): هەر ئێكێ دناڤبەرا (٣، ٤) كورتە چیرۆكان بەلاڤكرینە.

هەلبەت ژبلی چەندین رۆژنامەو گۆڤارێن چیرۆكەك یان دوو چیرۆك تێدا بەلاڤبووین، مینا گۆڤارێن (بشێش، زاخو، بەیان، پێلا سەربەست، پێشمەرگە، خابۆر، نۆژین) و رۆژنامەیێن (بەهدینان و دەنگێ لالش)، ئەڤ هەمی چاپەمەنییە ژبلی (تیرۆژ) كو ل (سێمێل) ێ و (زاخۆ و خابۆر) ل (زاخۆ) دەردكەتن و یێن دی هەمی ل ناڤەندا باژێرێ دهۆكێ دەردكەتن.

ب كورتی: دڤان (١٥) سالان دا، واتە دناڤبەرا

سالێن (١٩٩١- ٢٠٠٥) دا، پتر ژ (٨٠٠) ناڤ و نیشانان، بۆ کورتە چیرۆکێ و کورتیلە چیرۆکێ دناڤ رۆژنامەگەریا دەڤەرێ دا، یێن پتر ژ (٢٥٠) ی نڤیسەران، کو نێزیکی (٢٠٠) نڤیسەر یێن دەڤەرێ بخۆنە یێن بەلاڤ بووین، کو بۆ هەر سالەکێ، وەکی ئامارەکا نێزیکی دروستیێ، ل دووڤ خشتەیێ خوارێ بەلاڤبووینە و ل دووڤ ئێك:

(١٨، ٣٧، ٣٦، ٢٧، ١٦، ٣١، ٣٧، ٥٩، ٧٨، ٧٩، ٨٧، ٨٦، ٤٩، ٩٨، ١٠٩) [٢٢].

پشتی ڤێ قۆناغێ ژی (واتە پشتی سالا ٢٠٠٥)ێ ژی ئەڤ کاروانە هەر یێ بەردەوام بوو و رۆژنامەڤانیێ رۆلێ خۆ دوەرار و پێشکەتنا چیرۆکێ دا ددیت، نەمازە گۆڤارا (پەیڤ) کو وێ ب تنێ پتر ژ (٣٢٠) ناڤ و نیشان بەلاڤ کرین، زێدەباری رۆژناما وار کو وێ ژی پتر ژ (١٠٠) ناڤ و نیشان بەلاڤ کرین، ئەڤە زێدەباری چەندین رۆژنامە و گۆڤارێن دی ب رێژەیەکا کێمتر، مینا (ئەڤرو، چاڤدێر، بەهدینان، نۆژین، سیپە و... یێن مایی).

گەلەك ژ وان نڤیسەران ب تنێ ئێك کورتە چیرۆك بەلاڤکرینە، لێ هندەکێن دی ل بەرامبەر گەلەك چیرۆك بەلاڤکرینە، لێ وەکی کۆمەلە چیرۆك چاپ نەکرینە، مینا (سەگڤان خەلیل هیدایەت، تەحسین ناڤشکی، خالد حسێن، ئەدیب عەبدولا، کەمال سلێڤانەیی، دەیکا دالیایێ، عیسا تاهر، خەلیل دهۆکی، سەلمان کۆڤلی، ئەحمەد شۆشی، جاهیدا بیری و... هەلبەت ژ بلی یێن کۆمەلە چیرۆك چاپ کرین.

- مشە بوونا دەزگەهێن چاپ و بەلاڤکرنێ و هاریکاریکرنا نڤیسەران و ئەڤە ژی رێ خۆشکەر بوو کو نڤیسەر ب ساناهیتر بەرهەمێ خۆ ب گەهینتە چاپێ و وەکی هاندەر بۆ هاڤێتنا پێنگاڤەکادی.
- ئەگەر ل سالێن پێشیێ ژ ڤێ قۆناغێ بارێ ئابووری یێ خراب بیت، لێ ل سالێن دووماهیێ بەرەڤ باشبوون و پێشکەتن ڤە چوون، ب تایبەت پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ.
- هەبوونا ڤەرێژەکا باش ژ نڤیسینان کو ژ پاشڤەمایێن سالێن هەشتییانە و نەشیاینە ژ بەر هەر ئەگەرەکێ هەی بەلاڤبکەن و نهو دەمەکێ گونجای هاتە مەیدانێ کو بەلاڤبکەن، یان ل هندە جاران دبیت وەکی یادداشت د سەرێ خۆ دا توومارکرین و نهو دەلیڤە هەلکەفت دارێژنە سەر کاغەزێ و نەمازە تراژیدیا و رویدانێن سیاسییێن نالەبار.

## ژ گرنگترین دیاردەیێن ڤێ قۆناغێ:

- گەلەك نڤیسەرێن نوی دبوارێ چیرۆکنڤیسیێ دا پەیدابوون، کو یەکەم چیرۆکا خۆ بەلاڤ کرین و پشتی هینگێ کۆمەلە چیرۆك بەلاڤ کرن مینا:

(سەدیق حامد، مسلم باتێلی، کیڤی عارف، ژارو دهۆکی، محسن عەبدەلرەحمان، نەوزاد عەبدولا، سالح غازی، عەجیب عەبدولا، محەمەد سەلیم (بابێ قەیدوی)، یونس ئەحمەد، عەبدولخالق سولتان، ئیسماعیل سلێمان هاجانی، عارف حیتو، نەفیسە ئیسماعیل، سیپان عەبدوللا، نەوزاد مزوری، عەلی خەلیل، ئەمجەد عوبەید).

ئەگەر ئەم بنێرینە پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ، واتە ب دروستی ل پشتی ژناڤچوونا رژێما بەغدا دێ بینین ئەڤ کاروانە یێ بەرەڤ ئاراستەکێ دی ڤە چووی، ئەڤ نڤیسەرێن ل بەری هینگی خورتر، رەنگە خاڤی و سستییەك یا کەتییە دناڤ دا، هندەکان هەر چ بەرهەم نە نڤیسینە و پتریا ئەڤێن نڤیسین ژی، هەر ب تنێ ئێك بەرهەم یێ نڤیسی و کێمان ژێ پتر ژ بەرهەمەکی یێن نڤیسین، دبیت ئەگەر ژی ڤەدگەرێتەڤە وێ چەندێ کو ئەڤ ئاریشەیە بوویە دیاردە، نە ل کوردستانێ ب تنێ بەلکی ل دەڤەرێ هەمیێ، ئەڤرۆ پێشکەتنا تەکنولوجی پتر جهێ وێ چەندێ دگریت، یان دبیت هندە جاران دەبارا ژیانێ پتر وان مژویلی هندە کارەکێن دی دکەت دویری ئەو وارێ ئەو تێدا دنڤیسیت، وەکی رۆژنامەگەری، یان هەر کارەکێ دی تر بیت و ئەز پتر وەسان دبینم ئەگەر هندە چیرۆکنڤیسێن نوی خۆ نە هاڤێژنە ڤێ مەیدانێ،

ئەڤ کاروانە دێ پتر بەرەڤ ژووردانی ڤە چیت.

ژ گرنگترین ناڤێن دڤی قۆناغێ دا و ل پشتی سالا (٢٠٠٥)ێ کۆمەلە چیرۆك بەلاڤ کرین ئەڤ ناڤەنە:

- ئەمجەد عوبەید کو ل پشتی سالا (٢٠٠٥) ێ چیرۆك بەلاڤ کرینە.

- ئیسماعیل سلێمان هاجانی کو هۆزان دنڤیسی و یەکەم چیرۆکا خۆ – وەکی ل بەر دەست - ل سالا (٢٠٠٥) ێ بەلاڤ کری ل ژێر ناڤێ (ئەز ژ کێ ؟)، ل گۆڤارا نۆبۆن ژمارە (٦٨) ب تیپێن لاتینی و شیا سێ کۆمەلە چیرۆکان بەلاڤ بکەت.

- عارف حیتو (هۆزانڤان)، یەکەم چیرۆکا خۆ (وی دگۆت) - وەکی ل بەر دەست - ل رۆژناما برایەتی (ئەدەب و هونەر) ل ژمارە (٥٣) ێ سالا (١٩٩٧) ێ بەلاڤ کرییە.

- عەلی خەلیل ل پشتی سالا (٢٠٠٥) ێ چیرۆك بەلاڤکرینە.

- سیپان عەبدولا ل پشتی سالا (٢٠٠٥) ێ چیرۆك بەلاڤکرینە.

- نەڤیسا ئیسماعیل کو دهێتە هەژمارتن یەکەمین ژن ل دەڤەرێ کۆمەلە چیرۆك بەلاڤکری، یەکەمین چیرۆك - وەکی ل بەر دەست – دوو کورتە چیرۆکن ل ژێر ناڤێن (خوەزی یا دایکینیێ و بەرسینگ گرتنەك) ل گۆڤارا پەیڤ ژمارە (١٦) ل سالا ٢٠٠ ب تیپێن لاتینی بەلاڤکرییە

- نەوزاد مزوری کو وەکی ل بەر دەست یەکەمین کورتە چیرۆکا خۆ ل ژێر ناڤێ چیرۆکێن گەلەك کورت (خەمگین، دەهوات، سەهم) ل رۆژنامەیا رەسەن ژمارە (٧٢) رێکەفتی ١٩٩٨/١٠/٥ بەلاڤ کرییە.

- گەلەك کۆمەلە چیرۆك هاتنە چاپ کرن، چ ل سەر ئاستێ نڤیسەرێن نوی پەیدا بووین، و چ ل سەر ئاستێ چیرۆکنڤیسێن سالێن هەشتییان و بێن پێشتر، بۆ نموونە:

(ئەنوەر محەمەد تاهر) دوو کۆمەلە چیرۆکێن دی ژی چاپ کرن (ژ نڤیسەرێن سالێن حەفتیانە).

(نزار محەمەد سەعید) ئێك کۆمەلە چیرۆکا دی بەلاڤ کر (ژنڤیسەرێن دوماهیا سالێن حەفتیانە).

(کەریم جەمیل بیانی )؛ ئێك کۆمەلە چیرۆك.

(جەلال مستەفا)؛ دو کۆمەلە چیرۆك.

(محەمەد سەلیم سواری)؛ سێ کۆمەلە چیرۆك.

- ژ نڤیسەرێن سالێن هەشتییان، کو ژنوی کۆمەلە چیرۆك بەلاڤ کرین ب ڤی رەنگینە:

ئێك کۆمەلە چیرۆك: (وەکی بەرهەمێ نەخری) و تا دوماهیا سالا (٢٠١٢) چ کۆمەلە چیرۆکێن دی چاپ نەکرین: (بابیزێ عەمەر، جەمیل محەمەد شێلازی، حەسەن سلێڤانەیی، عەگید شەفیق، قەیران فەرەج).

دو کۆمەلە چیرۆك: تێلی سالح موسا، حەکیم عەبدولا.

سێ کۆمەلە چیرۆك: عسمەت محەمەد بەدەل، سەبیح محەمەد حەسەن، فازل عومەر.

چوار کۆمەلە چیرۆك: خالد سالح.

پێنج کۆمەلە چیرۆك: ئیسماعیل مستەفا، حەسەن ئیبراهیم.

- نڤیسەرێن سالێن نۆتان ژی ب ڤی رەنگی بەلاڤ کرینە:

ئێك کۆمەلە چیرۆك: (عەبدولخالق سولتان، عەجیب عەبدولا، کیڤی عارف، محەمەد سەلیم - بابێ قەیدوی، مسلم باتێلی، یونس ئەحمەد).

دو کۆمەلە چیرۆك: (سەدیق حامد).

چوار کۆمەلە چیرۆك: محسن عەبدولرەحمان، زارو دهۆکی.

هەلبەت ژ بلی چەند کۆمەلە چیرۆکێن دی کو ب رەنگێ ناملکە ل بەغدا دەرکەتین و ب دەست من نەکەتین.

ب کورتی: د ڤێ قۆناغێ دا پتر (٦٥) کۆمەلە چیرۆك یێن هاتینە چاپ کرن. واتە ب رێژەیا سێ کۆمەلە چیرۆك بۆ هەر سالەکێ و ئەڤە رێژەیەکا نزمە، لێ د سەر هندێ را دهێتە هژمارتن گرنگترین قۆناغ د مێژوویا چیرۆکا دەڤەرێ دا.

## کورتە چیرۆك و چەند ئامار:

هەر ژسالا (١٩٧٩)ێ، کو یەکەمین کۆمەلا چیرۆکان (کومر)، ب واتایا خۆ یا هونەری دەرکەتی و

تا دوماهیا سالا (٢٠١٢)ێ، واتە دڤان (٣٤) سالان دا پتر ژ (٨٥) کۆمەلە چیرۆك ییێن پتر ژ (٤٠) نڤیسەران، ب هەرسێ قەبارانڤە ییێن بەلاڤ بووین.

ئەگەر ئەم ل ڤان سالێن ناڤبری بنێرین، دێ بینین د هندە سالان دا هەر ئێکجار چ کۆمەلە چیرۆك بەلاڤ نەبووینە، لێ بەرامبەر د هندە سالێن دی دا ژ (١) کۆمەلە تا (١٠) کۆمەلا ییێن بەلاڤ بووین و ب ڤی رەنگی:

- ئەو سالێن چ کۆمەلە چیرۆك نە دەرکەتین، سالێن (١٩٨٢، ١٩٨٩، ١٩٩٠، ١٩٩١، ١٩٩٧، ١٩٩٨، ٢٠١٢) بووینە.

ئەگەر ئەم ل ڤان سالان بنێرین، دێ بینین د پری رویدانێن سیاسی و لەشکەری بووینە (ژبلی سالا ٢٠١٢)ێ و دبیت ڤان رویدانان پتر کارتێکرنێن خۆ ل سەر کێم دەرکەتنا کۆمەلە چیرۆکان کرین، نەمازە هەمی دزانن کو شەر، واتە خوین و رۆندك و گرانییا بارێ ئابووری و کارتێکرنێن دەروونی و... راستە وان رویدانان رەنگڤەدانا خۆ هەبوو، لێ دەربرین ژوان مەینەتان ل پشتی هینگێ دناڤ دەقێن وان دا دخۆیا و بەرچاڤ بوون، ب تایبەت ل پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ کو وان دەقان ژ نوی رۆناهی دیتین، ئەو رویدان ژی:

- سالا (١٩٨٢) ێ گەرمە گەرما شەرێ عیراق - ئیران بوو و عیراق تووشی شکەستنێن گران دبوو.

- سالا (١٩٨٩) ێ، ئەو دەمە یێ پشتی ئەنفالان و کارتێکرنێن وێ ییێن دژوار ل سەر دەروونێ کەسێ کورد.

- سالا (١٩٩٠) ێ لەشکەرێ عیراقێ چوو دناڤ ئاخا (کوێت)ێ دا و داگیرکر.

- سالا (١٩٩١) ێ، شەرێ کەنداڤێ ئێکێ و رویدانێن سەرهلدانێ و کۆچا مەلیونی.

- سالێن (١٩٩٧، ١٩٩٨) ێ شەرێ دژوارێ ناڤخۆ.

دیارترین سال کو پترین کۆمەلە چیرۆك تێدا بەلاڤ بووین، هەرسێ سالێن (٢٠٠٤) و (٢٠١٠) و (٢٠٠٥)ێ بوون، کو د سالا ئێکێ دا (١٠) دەهـ کۆمەلە چیرۆك بەلاڤ بووین و د سالا دووێ دا (٩) نەهـ کۆمەلە چیرۆك بەلاڤ بووین و ل یا سیێ (٨) کۆمەلە چیرۆك لێ بەلاڤ بووین، هۆیێ وێ ژی ڤەدگەرینتەڤە:

- پەیدابوونا ژمارەکا باشا چیرۆکنڤیسان.

- پشتەڤانییەکا باش ژ لایێ چەندین رێکخراو دەزگایێن چاپ و بەلاڤکرنێ.

- ئارامی و تەناهیا کوردستانێ.

- باشتر بوونا بارێ ئابووری ب رەنگەکێ گشتی، ب تایبەت ل پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ.

دڤان سالێن ل خوارێ دیار کری ژی دا، هەر ب تنێ ئێك کۆمەلە چیرۆك ب ڤی رەنگی یا بەلاڤ بووی:

(١٩٧٩، ١٩٨٠، ١٩٨١، ١٩٨٤، ١٩٨٧، ١٩٩٢، ١٩٩٣، ١٩٩٥، ٢٠٠١، ٢٠٠٣، ٢٠٠٩)، (واتە ١١ کۆمەلە چیرۆك).

دبیت ژ گرنگترین هۆیێن کارتێکرن ل ڤێ چەندێ کرین، کو کێم کۆمەلە چیرۆك ل بەری سالا (٢٠٠٠)ێ دەرکەتین ئەڤ خالە بووینە:

- هەبوونا کێم چیرۆکنڤیسان و ئەگەر هەبن ژی، هێش ل دەستپێکا ئەزموونا خۆ بووینە.

- پویتە نەدانا رژێمێ ب هەر تشتەکێ کوردی، کو ئەدەب ژی پارچەك بوویە ژ وێ رەوشێ و ئەگەر چەند پێنگاڤ دڤی بواری دا هاڤێتبن و چەند رۆژنامە و گۆڤار و پەرتووك بەلاڤ ژی کرین، هەر ژبوو راگەهاندنێ بوویە و نە پتر و ئەو ژی هەمی ل بن سانسۆرەکا دژوارڤە بوون، کو ب سەدان هێلێن سوور دانانە سەر.

- لاوازیا حوکمەتا هەرێمێ ژ لایێ دارایی ڤە، نەمازە د سالێن نۆتان دا و تا سالا (٢٠٠٣)ێ ژی، ئێدی ژ نوی عیراق ب گشتی و کوردستان ب تایبەتی کەتە دناڤ کاودانەکێ دی دا.

- کارتێکرنێن سیاسی و لەشکەری.

ل سالێن (١٩٨٣، ١٩٩٤، ٢٠٠٢)، دو کۆمەلە چیرۆك بۆ هەر سالەکێ ییێن بەلاڤ بووین، (واتە ٦ کۆمەلە چیرۆك).

ل سالێن (١٩٨٥، ١٩٨٨، ٢٠١١)، سێ کۆمەلە چیرۆك بۆ هەر سالەکێ، (واتە ٩ کۆمەلە چیرۆك).

ل سالێن (١٩٩٩، ٢٠٠٠، ٢٠٠٦، ٢٠٠٧)، چوار کۆمەلە چیرۆك بۆ هەر سالەکێ، (واتە ١٦ کۆمەلە

چیرۆك).

ل سالا (١٩٨٦) ێ، پێنج کۆمەلە چیرۆك یێن بەلاڤ بووین.

ل سالێن (١٩٩٦، ٢٠٠٨) ێ، شەش کۆمەل چیرۆك یێن بەلاڤ بووین، (واتە ١٢ کۆمەلە چیرۆك) و پتریا ئەو کۆمەلێن ل سالا (١٩٩٦)ێ چاپ بووین، ژ لایێ پرۆژێ چاپکرنا پەرتووکان یێ هەلکەفتنا یۆبیلا زێرینا دامەزراندنا (پ. د. ك) بەلاڤبووینە.

سەبارەت کۆمەلە چیرۆکان ژێ، سەرجەمێ بەرهەمێن هەر نڤیسەرەکی تا دوماهیا سالا (٢٠١٢) ب ڤی رەنگێ ل خوارێ دیار کری یە:

ئەڤ چیرۆکنڤیسێن ئێك کۆمەلە چیرۆك هەیین: (ئەمجەد عوبەید، ئیبراهیم سەلمان، بایزێ عەمەری، حەسەن سلێڤانەیی، جەمیل محەمەد شێلازی، زەکی سلیڤان، سیپان عەبدولا، عارف حیتو، عەبدولخالق سولتان، عەبدولا جوندی، عەجیب عەبدولا، عەگید شەفیق، عەلی خەلیل، قەیران فەرەج، کیڤی عارف، محەمەد سەلیم (بابێ قەیدوی)، مسلم باتێلی، نەفیسە ئیسماعیل، نەوزاد عەبدولا، یونس ئەحمەد).

ئەڤ نڤیسەرێن ناڤێن وان ل خوارێ دیار کری ژی هەر ئێکی دو کۆمەل چیرۆك ب ڤی شێوەی هەنە: (تێلی سالح موسا ١٤٢بپ، حەکیم عەبدولا ٢٠٠بپ، راستی هرۆری، سالح غازی ١٨٤بپ، سەدیق حامد ٢٣٨، کەریم بیانی ١٢٨، نافع ئاکرەیی ١٣٣ بپ، نزار محەمەد سەعید ٢٤٤ بپ).

ڤان نڤیسەران ژی هەر ئێکی سێ کۆمەلە چیرۆك ب ڤی رەنگی یێن هەین:

(ئەنوەر محەمەد تاهر ٣٢١ بپ، ئیسماعیل سلێمان هاجانی ٣٢٨بپ، جەلال مستەفا محەمەد ٢٣٤ بپ، سەبیح محەمەد حەسەن ٣٤١ بپ، عسمەت محەمەد بەدەل ٢٣٦ بپ، فازل عومەر ١٩٠ بپ).

ئەڤ نڤیسەرێن ل خوارێ ژی دیار کری هەر ئێکی چوار کۆمەلە چیرۆك هەنە:

(خالد سالح (٣٦٧بپ)، ژارو دهۆکی ٢٦٠بپ، محسن عەبدولرەحمان ٣٧٣ بپ، محەمەد سەلیم سواری (٣٧٦بپ).

ڤان نڤیسەران ژی پێنج کۆمەلە چیرۆك هەنە :

(ئیسماعیل مستەفا (٣٧٧بپ)، حەسەن ئیبراهیم ٤١٨ بپ).

ئەڤە زێدەباری (شەعبان مزیری)، کو پێنج کۆمەلە چیرۆك مینا نامیلکان د (١٧٠ بپ) دا. پشتی هینگێ ژی بەرهەمێن چاپکری هەنە و ل بەغدا چاپ بووینە، مینا (چیرۆکا ژیانێ، گوندێ من... دیرۆکا من)، کو ئەڤا دووێ ل سالا (٢٠٠٥) ێ یا چاپ بووی، (واتە زنجیرا پترین ژمارا بەرپەرێن نڤیسەران ب ڤی رەنگی نە:

(حەسەن ئیبراهیم، ئیسماعیل مستەفا، محەمەد سەلیم سواری، محسن عەبدولرەحمان، خالد سالح، سەبیح محەمەد حەسەن، ئیسماعیل هاجانی، ئەنوەر محەمەد تاهر).

سەرجەمێ ژمارا پەرپەرێن هەمی کۆمەلە چیرۆکێن دەڤەرێ پترن ژ (٧٠٠٠ ) بەرپەران، واتە ب رێژەیا (٨٠بپ) بۆ هەر کۆمەلە چیرۆکەکێ.

مەزنترین کۆمەلە چیرۆك ئەڤێن ل خوارێ نە:

شەهینا چیایێ سپی (١٨٠بپ).

بەرپەرەکێ وندا ژ ژیاننامێ سەلیمێ ئەسمەرێ (١٧٨بپ).

مەیدانا کووچکان (١٤٥بپ).

خواندنگەها برسیکرنێ (١٤٤بپ).

گوندێ من... دیرۆکا من (١٤٤ بپ).

ئەوێ دژی هەمیا (١٤٠بپ).

جەستەیێن فرۆك (١٣٦بپ).

رێکا بەرانی (١٢٨بپ).

بچویکترین پێنج کۆمەل ژی یێن ئێك نڤیسەرن (شەعبان مزیری) ، ب ڤی رەنگی:

بەرپەرەك ژ دیرۆکا گوندێ من (٢٤بپ).

تە نە گۆت (٣٢بپ).

شەهیدێ خەم و کولێت بێ دەنگیا خۆ (٣٦بپ).

جۆتیار (٣٨بپ).

ئەو چیرۆکا دوماهیکا وێ نەدیار (٤٠بپ).

**تێبینی:**
نیڤشکێ بابەتێ کورتییەکە ژ پەرتووکا (کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان) هاتییە وەرگرتن و ژ بلی کو بابەتی مفا ژ وان ژێدەران وەرگرتییە کو د ناڤ بابەتی دا هاتین، ژ ڤان ژێدەران ژی وەکی پتریا کۆمەلە چیرۆکێن دەڤەرێ وەرگرتییە، کو ژ سالێن هەشتییان بەرەف ژوور هاتینەچاپکرن.

# ژێدەر و پەراوێز


١. خالد صالح، کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، (دهۆك: ٢٠١٠)، بپ٩.
٢. هەمان ژێدەر، بپ١٥.
٣. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، بپ١٦.
٤. هەمان ژێدەر.
٥. هەمان ژێدەر، بپ١٧.
٦. هەمان ژێدەر.
٧. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، بپ١٧.
٨. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، بپ٤٤.
٩. هەمان ژێدەر، بپ ٤٤- ٤٥.
١٠. هەمان ژێدەر، بپ٤٥.
١١. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، بپ ٥- ٦.
١٢. وەسفی حەسەن، فەرهەنگا ئەدیب و نڤیسکارێت دەڤەرا بەهدینان، (دهۆك: ٢٠٠٦)، بپ٧٤.
١٣. حافظ قاضی، سەرهاتییەك یا سالح روشدی، گۆڤارا رۆناهی، ژمارە ٣، چ ٢، سالا ٢٠٠٥، بپ٦١.
١٤. محەمەد ئەمین ئوسمان، نان و ژیان (پێشەکییا وێ)، (بەغدا: ١٩٦٩).
١٥. سادق بەهائەددین ئامێدی، خان و مان، (بەغدا: ١٩٨١)، بپ٣.
١٦. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، بپ٨٠.
١٧. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان، بپ٨١.
١٨. هەمان ژێدەر، بپ ٨٢- ٨٣.
١٩. فەرهەنگا ئەدیب و نڤیسکارێت کورد، بنێرە بپ ٢٦ کو ناڤێ کۆمەلە چیرۆکا مرۆڤ و دۆزەخ تێدا هاتییە و ل سالا (١٩٨٦) ێ ل سوید چاپ بوویە لێ ل بەر دەست نینە.
٢٠. ناڤێ کۆمەلا (ئەز هەبووم و تۆ نە) دناڤ ژیاننامـا وێ دا ل بەرگێ دوماهییا ژ پەرتووکا وێ (سمات المرأة الكردية فی التراث الادبي الكردي) کو ل بەرلین چاپ بووی دا یا هاتی. تێدا نڤیسییە یا ل سالا ١٩٨٩ێ ل هەولێرێ چاپ بووی. گەلەك ل دووڤ چووم و من پرسیارا وێ بخۆ ژی کر گۆت راستە، لێ چ دانە ل بەر دەستێ من نینن و من ل بەرە چاپ بکەمەڤە، لێ هەر چەوان بیت من نەدیتییە.
٢١. هەمان ژێدەر، بپ٨٤.
٢٢. کورتە چیرۆکا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان ، بپ ١٣٢.

# رەوشا رۆمانێ ل دەڤەرا بەهدینان

**پ.هـ.د. نەوزەت زێباری**
**زانکۆیا زاخۆ- کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

رۆمـان مینا گەلەك ژانرێن نوی یێن ئەدەبی دەرئەنجامێ هاتنا چاپخانە، بزاڤا رۆژنامەگەری، وەرگێران، شـارەزا بوون د زمانێن بیانی دەسپێکا سەدسالیا بیستێ د ئەدەبێ کوردیدا پەیدا بوو.

چەند دیالێکتی، پارچە پارچە بوونا نەخشەیا جوگرافیا سیاسی یا کوردستانێ، چەند رێنڤیسی ژ وان هۆکارانە کو د هەر پارچەکا کوردستانێ رۆماننڤیس ل گۆر رەوش و دەستەلاتێ رۆمانێ نڤیسینە. بۆ نموونە (شڤانێ کورد) کو ئێکەم رۆمانا کوردییە دەرئەنجامێ رەوشا سیاسی و ئایدیۆلۆژیا سەپاندی یا ئێکەتیا سوفیەت بەرهەمەکێ ریالیزما سۆشیالیزمیە - ئەوا گرنگی ب کار و درستکرنا پالەوانێ ئەرینی دەت - و ب هەمان شێواز پرانیا رۆمانێن کوردی ل ئێکەتیا سوفیەتێ سەر ب هەمان رێبازن. د باشوورێ کوردستانێ ب هەمان شێواز رۆمانێن کوردی پێگیری ب ریالیزم و ریالیزما سۆشیالیزم کرینە.

رۆمان ژانرێ باژێرایە، د سیستمەکێ بورژوازی ژ دایك دبیت، پێدڤی ب چاپخانە، تەخەکا خویندەوار و رەخنەگر، پشتەڤانییەکا دارایی، سەقامگیرییەکا رامیاری، جڤاکی و رەوشەنبیری یە، لێ هەتا چارێکا دووماهیێ ژ سەدسالیا بیستێ ئەڤ چەندە ل دەڤەرا بەهدینان ناهێتە دیتن. دەڤەرا بەهدینان تێکەلی شۆرشان دبیت، لەورا هەر شیعر بابەتەکێ سادە و ئامرازەك بوو بۆ گەهاندنا پەیاما شۆرشێ. ئەڤە هەمی دبنە هۆکار بۆ درەنگ سەرهلدانا رۆمانێ ل دەڤـەرا بەهدینان. سـەرەرای ڤان هەمی هۆکار و ئاستەنگان ئەڤ ژانرە شیا ب لەز جهێ خوە بگریت و ببتە خودیکا ژیان و سەردەمێ خوە. ب گشتی دشێین رۆمان ل دەڤەرا بەهدینان ب سەر سێ قۆناغان دابەش بکەین:

- قۆناغا ئێکێ: دامەزراندن ۱۹۸۸ - ۱۹۹۱
- قۆناغا دووێ:گەشە کرن ۱۹۹۱-۲۰۰۳
- قۆناغا سێێ: پێشکەفتن و نوی بوون ۲۰۰۳ هەتا نهو

## قۆناغا ئێکێ: دامەزراندن ۱۹۸۸- ۱۹۹۱

رۆمانا ڤێ قۆناغێ، فۆتۆکۆپی یا واقیعێ کوردە و دەربرینێ ژ ئێش و ئازار، بەرگریا ژیان، ئێشێن جڤاکی، هەژاری، پاشکەفتن، نەخویندەواری و شەرییە. هەر چەندە ئەڤە قۆناغەکا گەلەك کورتە ، لێ یا گرنگە ب گوهرینێن سیاسی. د ڤێ قۆناغێدا ب تنێ دو بەرهەم هاتینە چاپکرن (رەنگە هێشتا بەرهەم و دەست نڤیس هەبن لێ نەهاتینە چاپکرن).

رۆمان ل دەڤەرا بەهدینان ل گەل رۆمانا (دەراڤێ تەنگ) یا (کەریم بیانی) ل سالا ۱۹۸۸ێ دەست

پێدكەت. ئەڤ رۆمانە دكەڤیتە د تۆرێ شەری دا ل سالا ١٩٨٥ێ ل سەر جەنگا عیراق - ئیران هاتییە نڤیسین و ل سالا ١٩٨٨ێ ل (دار الحرية) ل بەغدا هاتییە چاپكرن.. رویدانێن ڤێ رۆمانێ ل دۆر شەرێ ئێراق و ئیرانێ دزڤرن.(دەراڤێ تەنگ) سەر هاتیيا گەنجەكێ سەربازە ب ناڤێ (رویگەش) ئەو ژ بەروكێن شەری دەڤیت و دگەهیتە دناڤ رێزێن پێشمەرگەی، لێ ئەو یێ دو دلە دناڤبەرا باوەرئینان ب شەرێ سەپاندی و باوەری ئینان ب بزاڤا رزگاریخوازی. ل دووماهیێ ئەو دناڤبەرا ڤان هزرێن هەڤدژ بەرزە دبیت لەوما دزڤریتە دهۆكێ.

ل دووڤ دا لسالا ١٩٨٩ێ رومانا دووێ بناڤێ (بوهژین) ژ لایێ (د. نافع ئاكرەیی) هاتییە نڤیسین و ل رێڤەبەریا رەوشەنبیری و لاوان ل هەولێرێ هاتییە چاپ و بەلاڤكرن[1]. (بوهژین) رۆمانەكا ریالیزمی یە، دەربرینێ ژ كەتوار و ژیانا جڤاكێ كوردی د سەردەمێ هەڤچەرخ دكەت. گرنگی ب هەژاری و ئەنجامێن هەژاریێ دایە. (سەعید) قارەمانێ سەرەكیێ رۆمانێ كورەكێ هەژارە؛ لێ هەژاری نابیتە ئاستەنگ د رێیا زانستی دا و ل داویێ باوەرناما نۆشداریێ ب دەستڤە دئینیت.

## قۆناغا دووێ: گەشە كرن ١٩٩١- ٢٠٠٣

پشتی سەرهلدانێ دەرفەت بۆ نڤیسینا رۆمانێ خوەشتر لێ هات، لێ دەر ئەنجامێ رەوشا ناڤخۆیی ئانكو شەرێ براكوژی دناڤبەرا پارتێن سیاسی، نەبوونا دەزگەهێن چاپكرنێ، كەسادی یا بازارێ پەرتووكان، بوونە ئاستەنگ د بەر نڤیسین و بەلاڤكرنا رۆمانێ، هەر د ڤێ قۆناغێ هژمارەكا رۆماننڤیس ل دەرڤەی كوردستانێ دژیان لێ هەر ل سەر بزاڤا ئەدەبی بەردەوام بوون. د ڤێ قۆناغا نە ئاساییدا هژمارەكا كێم رۆمان هاتینە نڤیسین. هەر چەندە ئەڤ رۆمانە بەرهەمێن رۆماننڤیسین دەڤەرا بەهدینانن لێ د چەندین جهێن جیاواز مینا (سوید، هەولێر، ئەلمانیا...) هاتینە چاپكرن هەر ژ بەر ڤێ ئەگەرێ ب هەر دو تیپێن عەرەبی و لاتینی هاتینە چاپ و بەلاڤ كرن.

-(گولستان و شەڤ)نۆڤلێت/ حەسەن سلێڤانەی / ١٩٩٦/ تیپێن لاتینی

- (كورێ زنارێ سەربلند) سدقی هروری / ١٩٩٦ سوید / تیپێن لاتینی[2]

- (ئەڤین و شوات ) سدقی هروری /١٩٩٨ / سوید / تیپێن لاتینی[3]

- (پێلەك ژ بایێ رەڤا رەش) ئەحمەد بالایی/ ١٩٩٩ ل ئەلمانیا [4]

- (گەریان ل بابێ بەرزە) ئەنوەر محەمەد تاهر/ هەولێر/ ٢٠٠١

- (پالێ پیشی) ژارو دهۆكی/ ٢٠٠١

- (ئەو ئاشێ دەراڤ لێ وەرگێرای) ناجی تاها بەرواری / ٢٠٠٢

د ڤێ قۆناغێدا ژن ژی دبیتە قارەمانا رۆمانێ مینا (گولستان) د رۆمانا (گولستان و شەڤ) د ڤێ كورتە رۆمانێدا گولستان هەتا سپێدێ نانڤیت و ب رێیا فلاش باك و مۆنۆلۆگێ هزر د پێنج سالێن بووری ل گەل دلشادی دكەت. دلشاد سەربازە و بەشداری شەرییە. ئەڤ بەرهەمە ژی دچیتە د تۆرێ شەریدا چنكو دەرئەنجامێ شەری دیار دكەت.

## قۆناغا سیێ: پێشكەفتن و نوی بوون ٢٠٠٣ حەتا نهو.

پشتی ژ ناڤچوونا رژێما دیكتاتوری ل بەغدا، باشتربوونا رەوشا دەڤەرێ، هاتنا هێزێن هەڤپەیمان، پەیدا بوونا ئارامی و دل رەحەتیێ، رێژەكا باش ژ هۆزانڤان و چیروكنڤیسێن دەڤەرێ مینا (ناجی تاها بەرواری، بلند محەمەد، هزرڤان، سەبری سلێڤانەی...)دەست ب نڤیسینا رۆمانێ كرینە. رۆمانا دەڤەرێ بەرەڤ سەمتەكا دیتر ڤە چوو. رێژا رۆماننڤیس، چاپبوونا رۆمانێ بەرەڤ زێدەتر ڤە چوو، ناڤەروكێن جوراوجور، هەڤچەرخ و نوی، تەكنیكێن نوی ل دەڤ رۆماننڤیسان پەیدا بوو. پرانییا رۆمانێن دەڤەرا بەهدینان د چارچوڤێ ریالیزمی یا جڤاكی، ب مەبەستا هوشیاری یا جڤاكی هاتینە نڤیسین. بابەتێن هەژاری و گونداتی وەكو كلتور و ئایدیۆلۆژی یا سنجی یان جڤاكی جهەكێ گرنگ د

رۆمانا دەڤەرێدا گرتیە. ژ لایێ زمانیڤە هەول هاتیە دان زمانەکێ رەسەن بهێتە بکارئینان. لێ چنکو رێژەکا باش ژ رۆماننڤیسان هۆزانڤانن د هندەك بەرهەماندا زمانێ هۆزانێ ب سەر بەرهەمی زالە و رۆماننڤیس زمانێ هۆزانێ ل گەل زمانێ هزری و فەلسەفی تێکەل دکەت.

پەیدا بوونا وەشانخانەیان مینا سپیرێز، ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد - دهۆك ، رێڤەبەریا چاپ و بەلاڤکرنێ ل دهۆکێ، دهاریکارن بوون بۆ پەیدا بوون وبەرزبوونا رێژا رۆمانێ ل دەڤەرا دهۆکێ. هەر د ڤێ قوناغێ دا ژ بلی رۆمان ب زمانێ کوردی ،

هندەك ژ بەرهەمێن ڤێ قوناغێ دا بەلاڤ بووی:

- (ئاڤا مەزن - دەما ماسیێن خوە تێهنی دهێلیت) سەبری سلێڤانەی، ٢٠٠٤، تیپێن لاتینی، سلێمانی
- (هێلێن سور) هزرڤان، ٢٠٠٤
- (دۆزەخا سپی ) حەسەن ئیبراهیم، ٢٠٠٤
- (گوند) محەمەد سەلیم سواری / ٢٠٠٥
- (بیست سال و ئێڤارەك) سەبری سلێڤانەی/ ٢٠٠٥
- (سوتنگەهـ ) بلند محەمەد / ٢٠٠٥
- (ژانێن سیناهی) تحسین ناڤشکی / ٢٠٠٥
- (داویا شەرڤانەکی) عسمەت محەمەد بەدەل/٢٠٠٥
- (ڤیان د دەمەکێ ژاندارا) محسن عەبدولرەحمان/٢٠٠٥
- (سپێدەیەکا دی) یونس ئەحمەد/ ٢٠٠٥
- (دەردێ ئەڤینێ) یونس ئەحمەد/ ٢٠٠٦
- (شەڤێن سار ) حەسەن ئیبراهیم/ ٢٠٠٦
- (رۆژێن ئێتوون) کوڤان سندی/ ٢٠٠٧
- (مریەما - کچە ژنەك ژ زەمانەك دی) سەبری سلێڤانەی / ٢٠٠٧
- (سیلاڤ و مێرێت وێ - تە ئەز فێری ئەڤینێ کرم) حەسەن ئیبراهیم /٢٠٠٧
- (ئەز و دەلال) سدقی هروری/ ٢٠٠٧ ب تیپێن لاتینی[٥]
- (چاڤێ سیتاڤکێ) تەحسین ناڤشکی/ ٢٠٠٧
- (شەڤێن پراگ) حەسەن ئیبراهیم/ ٢٠٠٨
- (مەمو کەو بەردا ) حەسەن ئیبراهیم/ ٢٠٠٨
- (خەجا بەرلینی) حەسەن ئیبراهیم/ ٢٠٠٨
- باخورە(بالۆرەیێن سرۆدەك زەرەدەشتی) محسن عەبدولرەحمان / ٢٠٠٩
- (پەل و خولی ) تەحسین ناڤشکی/ ٢٠٠٩
- (پەری خان) سەعید ئەلحاج سەدیق زاخویی/ ٢٠٠٩
- (خێفزانك) سەعید ئەلحاج سەدیق زاخویی/ ٢٠٠٩
- (کورێ چیا) محەمەد تاهر شورو بێبویی/ ٢٠٠٩
- (کمێدێ گەور) سەدیق حامد/ ٢٠٠٩
- (ئالێ دی یێ پرێ) تەحسین ناڤشکی/ ٢٠١٠
- (سیفرا سلیڤی- لێگەریانەك ل قەتێ دی) سەبری سلێڤانەی / ٢٠١٠
- (وارێ روندکان ) محەمەد سەلیم سواری /٢٠١٠
- (ئەڤین و ئەنفال) حەسەن ئیبراهیم / ٢٠١٠
- (سڤێتلانا) حەسەن ئیبراهیم / ٢٠١١
- (نەبیا بەندەمانێ) کەمال سلێڤانەیی / ٢٠١١
- (شوپێن روندکان) هزرڤان / ٢٠١١
- (تاڤگە) تەحسین ناڤشکی / ٢٠١١
- (بەهەشتا ئاگری) تەحسین ناڤشکی/ ٢٠١١[٦]
- (نالینێن پەراڤان) کوڤان سندی/ ٢٠١١[٧]
- (کورێ ساڤا رەعنایێ ) ئەنوەر محەمەد تاهر/ ٢٠١٢

سەرەرای ڤان رۆمانان چەند رۆمانێن دی ژی دناڤبەرا سالێن ٢٠١٣- ٢٠١٤ دا یێن محەمەد سەلیم سواری و حەسەن ئیبراهیم و ژارو دهۆکی بەلاڤبووینە.

رۆماننڤیسێن دەڤەرێ، رۆمان ب زمانێن ئینگلیزی و هولەندی و عەرەبی ژی چاپ و بەلاڤ کرینە مینا ئیبراهیم سەلمان و قەشەم عەلی و عەبدولکەریم یونس گەیلانی و حەلیما شنگاری و قاسم بەرواری. ژ بلی(دەولەتا دارستانێ) کو نۆڤلێتەکە بۆ زارۆکان / تەحسین ناڤشکی ل سالا ٢٠٠٨ .

## ژێدەر و پەراوێز

١. پشکا دووێ ژ ڤێ رۆمانێ ژ لایێ محەمەد سەلیم سواری ڤە هاتییە بەرهەڤکرن و ل سالا ٢٠٠٠ێ چاپبوویە .

٢، ٣. چاپا دووێ ل سالا ٢٠٠٨ ێ ل هەولێرێ و ب تیپێن عەرەبی .

٤. چاپا دووێ ل سالا ٢٠١٢ ێ ل دهۆکێ .

٥. چاپا دووێ ل سالا ٢٠٠٨ ێ ل هەولێرێ ب تیپێن عەرەبی .

٦. ئەڤ رۆمانە دو بەرگە و د هێتە هەژمارتن مەزنترین رۆمانا دەڤەرێ کو لاپەرێن وێ پترن ژ (١٢٠٠بپ) .

٧. ئەڤ رۆمانە دو بەرگە ل ئەلمانیا ب تیپێن لاتینی چاپ بوویە .

# ژانرێن (جۆرێن) ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ

كۆڤان رێسان حەسەن

## پێشەكی:

ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ ئەدەبیاتەك گەلەك دەولەمەندە، سەرەڕایی ڤێ دەولەمەندیێ ئەو هەتا نها ژی زۆر ل سەر زاری مایە، رەهـ و ریشالێن پر دیرۆكی هەنە و ژ ناڤەرۆكا وان دیارە، نەخاسمە ژی ئەدەبیاتا فولكلۆری (یا تایبەت ب ئێزدییان ڤە)، لێ ئەدەبیاتا ئۆلی ڤەدگەرتەڤە سەدەیێ ١١ز و هەتا داوی یا سەدێ ١٣ز، ئانكو د ماوەیێ ٣ سەدەیان دا هاتییە لێكدان و د چارچۆڤەیەكی هۆنراوەیی و رێكخستی دا هاتی دارێتن، چونكی ئەدەبیاتا دینی یا ئێزدییان ل سەر بنگەها وێ ئەدەبیاتا فولكلۆری و داب و نەریت و باوەریا میسۆپۆتامیا هاتییە ئاڤاكرن، ئانكو دیرۆكا ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ یا دینی نا ڤەگەرتەڤە سەدەیێ ١١ - ١٣ز، بەلكو ب دارێتنا وێ د چارچۆڤەیەكێ هۆنراوەیی و رێكخستی دا ژ بۆ هنكی دزڤریتەڤە، ئەڤ پێنگاڤە ژی ژ بزاڤێن شێخادی یێ كورێ موسافرێ هەكاری (١٠٧٢ - ١١٦٢)ز، هات و ب هاریكاری یا پتر ژ پێنجی قەولڤانان، مینا: شێخ فەخرێ ئادیان، پیر رەشێ حەیران، پسێ جەم، داودی بن دەرمان، دەروێش قاتانی، بابەكرێ ئۆمەرا یێ زەرزایی، شێخ مەند، پیر داود و ...هتد. ژ پێخەمەت هندێ پتر بهێتە پاراستن و ئەكتیڤكرن، چونكی ئێزدییان هەر ژ كەڤن دا ئەدەبیاتا دینیێ خوە ل سەرزاری پاراستی یە، دیارە ژی دەڤێن هۆنراوەیی پتر دهێنە ژبەر كرن و زوو دهێنە ڤەگوهاستن ژی، لەورا قەولبێژێن ئێزدییان ژی ل سەدەیێ ١١ و هەتا ١٣ ئەڤ یەك ئەنجام دان.

سەبارەت پارڤەكرنا ئەدەبێ ئۆلا ئێزدییان ل سەر جۆر و ژانران، هەتا نها دو دابەشكرن هەنە، ئەو ژی دابەشكرنا: د. خەلیل جندی و خدرێ سلێمان.

١. د. خەلیل جندی ب ڤی رەنگی دابەش دكەت: ئەفسانە و چیرۆكێت دینی، دوعا و درۆزە، قەول و بەیت، مسحابەت، مۆزیكا دینی، خزێمۆك و رۆبارین و پاییزۆك، قەسیدە، لاڤژ و غەریبی.

وەكە دیار دو و سێیان ب هەڤرا دئینیت، ئەو بخوە د ناڤ ئێزدییان دا هەر ئێك جۆرەكە و ژ هەڤ د جودانە، لێ ئەڤ ب هەڤرا ئینانا (د. خەلیل جندی) ژ بۆ هندێ یە كو ئەوی نكاری یە سنوورەكی جودابونێ دناڤبەرا وان دا بكەت[1]. هەروەسا (د. خلیل جندی) مۆزیكا دینی ژی مینا ئەدەب د هەژمێریت، ئەڤە ژی زێدەتر لایەنێ هۆنەری یە، هەروەسا ئەدەبیاتا فولكلۆری و ئۆلی ژی تێكەل كرینە.

٢. خدرێ سلێمان، سەبارەت دابەشكرنا ئەدەبێ ئۆلی یێ ئێزدییان، دبێژیت: (بریتییە ژ قەول و دوعا و بەیت و قەسیدا)[2].

ئەڤان هەردو نڤیسكاران د دابەشكرنێن خوە دا، جۆرەكی وەكو (سرود) ژ بیر كریە، ژ بەر كو سرودێ جوداهی یا خوە ژ ڤان دەقێن دی هەیە، هەتا نها ب رەنگەكی كێم د ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ دا دكەڤیتە بەرچاڤ. ئەگەر ئەم دابەشكرنەكا نوو بدەینە ئەدەبیاتا ئێزدیان؛ ب ڤی رەنگی دابەش دكەین:

١. ئەدەبیاتا فولكلۆری: راستە پتری یا ژانرێن ئەدەبیاتا فولكلۆری یا ئێزدیاتیێ هەر ئەو ژانرن یێن د ئەدەبیاتا فولكلۆری یا كوردی و جیهانی دا هەین، ژ بلی خزێمۆك، پاییزۆك و رۆبارینان كو تایبەتن ب ئێزدییان ڤە، لێ ئەو ژانرێن ئێزدییان یێن هەڤپشك دگەل ئەدەبیاتا كوردی ژی چونكی ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە د جودانە و سیمایەكێ ئێزدیاتیێ پێڤە یێ دیارە و تایبەتن ب ئێزدییان ڤە لەورا مە باس كرینە، ب ڤێ چەندێ ئەو ژانرە ژی ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە تایبەتمەندییەكێ بۆ خوە دورست دكەن.

١ - ١. ئەفسانە

١ - ٢. داستان

١ - ٣. سەرهاتی

١ - ٤. چیرۆك

١ - ٥. گۆتنێن مەزنان

١ - ٦. نفرین

١ - ٧. پێكەنین

١ - ٨. مەتەلۆگ

١ - ٩. ستران:

١ - ٩ - ١. خزێمۆك

١ - ٩ - ٢. پاییزۆك

١ - ٩ - ٣. رۆبارین

٢. ئەدەبیاتا ئۆلی:

٢ - ١. قەول

٢ - ٢. بەیت

٢ - ٣. قەسیدە

٢ - ٤. دوعا

٢ - ٥. درۆزە

٢ - ٦. سرود

٢ - ٧. سەرهاتی و چیرۆكێن ئۆلی

٢ - ٨. مسحابەت.

سەبارەت ڤێ دابەشكرنێ، رەنگە ژ لایێ روخسار ڤە هندەك جۆر نێزیكی ئێك بن، لێ ئێزدی و ب تایبەتی ژی قەولبێژ هەر جۆرەكی جودا دبینن، ئەگەر ئەڤ نە بەلگەیەكا زانستی ژی بیت؛ خالەكا دی هەتا كو هەر جۆرەك تایبەتمەندی یا خوە درست بكەت ئەوە؛ هەر جۆرەكی ڤی ئەدەبی، دەم و رێ و رەسما خوە یا تایبەت هەیە، ئانكو هەر جۆرەكی ئەدەبی ل هەر دەمەكی ناهێتە گۆتن. بۆ نموونە؛ ئەگەر ئەم جۆرێ دوعا وەرگرن، ئێزدییان سێ جۆرێن دوعایان هەنە (شەبەقێ، سبێ و هێڤاری)، دوعایا شەبەقێ دڤێت شەبەقێ بهێتە گۆتن، سبێ د ڤێت سبێ بهێتە گۆتن و یا دی ژی وەسا. شەهدا دینی چونكی یا تایبەتە ب شەڤ و دەمێ نڤستنێ ڤە، نابت ب رۆژ بهێتە گۆتن، هەمو دوعایێن دی یێن نەخوەشیان ژی وەسا، هەردیسان جۆرێ قەسیدەیان ژی ب هەمان ئاوا ئەو پتر گرێدای رێ و رەسم و جۆرێن سەمایانە و هەر قەسیدەك دگەل سەمایەكێ دهێتە گۆتن و پەیوەندییەكا بابەتیانە دناڤبەرا وان دا هەیە.

١. **ئەدەبیاتا فولكلۆری:** ئەدەبیاتا فولكلۆری یا ئێزدییان ب جۆرێن خوەڤە، مینا ئەدەبیاتا فولكلۆری یا كوردێن دی یە، لێ ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە ئەو یا جودایە و دەربرینێ ژ ئێزدییان و ئێزدیاتیێ دكەت، هەروەسا ژی وان هندەك جۆرێن ئەدەبیاتا فولكلۆری یا تایبەت بخوە ڤە ژی هەنە كو ژ ئەدەبیاتا فولكلۆری یا كوردێن موسلمان د جودانە، مینا: خزێمۆك و رۆبارینان. ئەڤێن لخوارێ ب كورتی ژانرێن ئەدەبیاتا فولكلۆری یا ئێزدییانە:

**١ - ١. ئەفسانە،** وەكە دیار زۆربەیا ئۆلان ل سەر بابەتێن ئەفسانەیی هاتینە ئاڤاكرن، یان ژی هەر ئۆلەكێ ل دنیایێ هەبیت ژ بابەتێن ئەفسانەیی یێ ڤالا نینە، چونكی ئەڤە ئێك ژ سیمایێن ئۆلانە كو ژ ئەفسانەیێ ژی پێك دهێت. هەروەسا د ئۆلێ ئێزدییان دا ژی ئەم هژمارەیەكا زۆر یا ئەفسانەیان دبینین.

ئەڤ ئەفسانەیە ژ ئەفسانەیێن كوردێن موسلمان د جودانە، بەلكو سیمایەكێ ئێزدیاتیێ پێڤە یێ دیارە، یان ژی بینینا ئێزدییانە ل بەرامبەری هەر دیارۆك و بویەرەكێ.

ئەفسانەیێن ئێزدییان بەحسێ بابەتێن: خوەدا، فریشتەیان، ئافراندنا دنیایێ، بەهشت و دۆژەهێ، مرۆڤی، تۆفانێ، مرنێ، دونیایا ژێر و ژۆر و... هتد، دكەن ب ئاوایێ چیرۆكی ل سەر زاری دهێنە گۆتن. بۆ نموونە: د ئەفسانەیا نەبی نوح دا هاتییە: دەمێ پاپۆرا نوحی ل سەرێ چیایێ شنگالێ كەڤتی و كون بوی ئاڤا رەش د هاتە د پاپۆرا وی دا، ماری خوە كرە د ڤێ كونێ دا و نەهێلا ئێدی ئاڤ بهێتە دناڤ پاپۆرێ دا، ب ڤێ چەندێ نەبی نوح و ئەو گیانەوەرێن دگەل وی ژ مرنێ قورتال بون. ژ بەر ڤێ چەندێ دبینین ئێزدییان گرنگی ب ماری دایە نەخاسمە ژی مارێ رەش و تێكەلی ئۆلی و داب و نەریتان كریە[٣]. ل ڤێرێ ئەگەر ئەڤ چیرۆكا نەبی نوح و ماری ئەفسانە ژی بیت؛ د هەمان دەم دا مار د ڤێ ئەفسانەیێ دا هێمایێ رزگاركرنا مرۆڤی یە.

هەروەسا گەلەك ژ ڤان ئەفسانەیان بوینە بنیاتێ ژانرێن دی یێن ئەدەبیاتا ئێزدییان، ئانكو هندەك لا یێن ژانرێن دی یێن ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ مینا: قەول، بەیت و ... هتد، ل سەر بنیاتێ ئەفسانەیێن ئێزدیاتیێ هاتینە ئاڤاكرن، یان ژی مفا ژێ هاتییە وەرگرتن. بۆ نموونە: ئەو تێكستێن ل سەر بنیاتەكی ئەفسانەیی هاتینە ئاڤاكرن، یان مفا ژ ئەفسانەیێ وەرگرتین: ق. زەبونی مەكسور، ئافراندنا دنیایێ، سەرەمەرگێ، ئیسماعیل پێغەمبەر و ...هتد[٤].

**١ - ٢. داستان:** جۆرەكێ ئەدەبی یێ بەرفرەهـ و كەڤنە، ژ بەر هندێ گەلەك بۆیەر، كەسایەتی، دەم، جهـ، دیالۆگ و بابەت و ...هتد، تێدا هەنە، ڤێجا چ ب راستی ژی هەبوبن یان ژی د ئاشۆپی و ئەفسانەی بن. د ئەدەبیاتا فولكلۆری یا ئێزدییان دا داستان هەنە، ئەڤ داستان ژی چەند جۆرن: جۆرەك تایبەتە ب ئێزدییان ڤە و ب سامانێ خوە دزانن، مینا: داستانا (ئاشق غەریب و شاهـ سەنەم)، (میر مح)، (گێلا میر ئەتلەس) و دەروێشێ عەڤدی و ... هتد.

جۆرەكێ دی یێ داستانێ دناڤ ئێزدییان دا هەیە كو هەمان داستان د ناڤ تەڤ كوردان دا هەیە، لێ ئێزدییان ڤەگێرانێن خوە یێن تایبەت پێ هەنە و سیمایەكێ ئێزدیاتیێ پێڤە یێ دیارە، وەك: مەم و زین[٥]. هەروەسا جۆرەكێ دی هەیە ب سامانێ رۆژهەلاتا ناڤەراست دهێتە هژمارتن، لێ دیسان ئێزدییان ڤەگێرانێن خوە یێن تایبەت پێ هەبوینە. وەك: داستانا لەیلا و مەجنون[٦].

**١ - ٣. سەرهاتی:** ژبەر كو هەر ژ كەڤن دا بویەرێن جڤاكی، لەشكەری و بەرخوەدانی یێن ئێزدییان نەهاتینە توومارکرن، یان ژی ژ بەر وان بارودۆخێن نەخوەش یێن ئێزدی تێرا دەرباز بوین زانینە نڤێسینێن وان نامینن، لەورا گەلەك بویەر و دیرۆك ب چیرۆكی (پەخشانكی)[٧] و سترانكی ل سەر زاری ژ بەرەباب بۆ بەرەبابی هاتینە ڤەگێران و پارازتن. بۆ نموونە: سەرهاتی یا بەرخوەدانا ئێزدی میرزا، شێخ میرزایێ ئاقۆنسی و میرزكێ زازا، هەروەسا سەرهاتی و غەریبی یا خەنسێ و رەشۆ و ...هتد[٨].

ئێزدییان جۆرەكێ دی یێ سەرهاتی یان تایبەت ب خوەڤە هەیە، ئەو ژی سەرهاتی یێن گیان دوبارەبوونێ (تناسخ الارواح)ن، كەسێن كو مرنە و جارەكا دی رەوانێن وان ل سەردەمەكی دی و ل جهەكی دی دەركەفتینە، ئەوان كەسان باسێ ژیانا خوە و سەردەمێ كەڤن و یێ بەری هینگێ تێدا ژیاین كرینە، ئەڤ باسكرنێن وان بوینە سەرهاتی و د ناڤ ئێزدییان دا ب ئاوایێ چیرۆكان دهێنە ڤەگوهازتن.

هەروەسا چونكی ئەڤ سەرهاتی ب ئاوایێ چیرۆك دهێنە گۆتن و گەلەك دەم د سەررا دەرباز بوویە هندەك تشتێن ئەفسانەی ژی تێكەلی هندەك ژ وان سەرهاتییان بوونە، لەورا ژی ئەو مینا جۆرەكێ ئەدەبێ فولكلۆری و سامانێ مللەتی دهێنە هژمارتن[٩].

**١ - ٤. چیرۆك:** ژ جۆرێن ئەدەبی یێن پەخشانی یە، خودان دیرۆكەك دور و درێژە، ڤەگێرانا وێ ل سەر بنیاتەكێ ئەندێشەی بویە، خوە ئەگەر كەسایەتی و جهـ و ...هتد، د دیرۆكی بن و د راستی یێ دا هەبوبن

ژی؛ ل سەر بنیاتەکێ ئەندێشەی و ئەفسانەی هاتینە ئاڤاکرن، لەورا ژی ئەڤ جۆرە چیرۆکە ب توخمەکێ فولکلۆری دهێتە هژمارتن. ئێزدییان هژمارەکا زۆر یا ڤان چیرۆکان هەنە ژ لایێ بابەتی ڤە د ئەفسانەی نە، لێ سیمایەکێ ئێزدیاتیێ پێڤە یێ دیارە و هەروەسا ژی خودان تەکنیکێن سەرنجراکێشن، خودان چێژن و بابەتێن وان ژی وانە و شیرەتن و د مفادارن[10].

**١ - ٥. گۆتنێن مەزنان،** جۆرەکێ فۆلکلۆری یێ کەڤنە، رستەیەك یان گۆتارەکا کورتە، لێ واتایا وێ یا کورە و گەلەك رامان ژێ دچن، ژ ئەنجامێ بویەر، سەرهاتی و سەربۆرێن ژیانێ سەرهلداینە. ب رەنگەکێ دی بێژین؛ کورت بری یا چیرۆکەکێ یان بویەرەکێ یە و مەبەستا پتری یا وان شیرەت و رەخنەنە[11].

ئەڤ جۆرێ فۆلکلۆری ب رێژەیەکا باش د ناڤ جڤاکێ ئێزدییان دا هەنە، لێ پتری یا وان هەر ئەو گۆتنن یێن د ناڤ جڤاکێ کوردی دا ب گشتی هەین، دگەل هندێ ژی ئێزدییان هندەك گۆتنێن تایبەت بخوە ڤە هەبوینە.

بۆ نموونە:

١. مالا خوە تێر کە، گەلی یێ لالشێ تژی خێر کە.

٢. هەگەر تە خێرەك ب بەلەنگازەکی ئانی؛ تە کەڤرەك ل سەر سورا شیخادی دانی.

٣. بێ شێخ و پیرەکی، نەچە دیوانا میرەکی.

٤. شێخ ل رێ، مرید ل پێ.

٥. شێخ و پیر گولی یێ دارەکێ نە.

٦. خێر و شەر ژ دەرگەهێ خوەدێ دهێن.

٧. هەگەر مالا ئادی یا بو ئاڤ؛ تو نە دە ناڤ.

**١ - ٦. نفرین،** ئاخفتنەکا کورتە، مینا گۆتنا مەزنایە، هەر نفرینەکێ بویەرەك یان چیرۆکەك ل پشتە و ژ ئەنجامێ وێ بویەرێ نفرین پەیدا دبیت. چونکی خودانێ نفرینێ یێ دیار نینە ب ئێك ژ جۆرێن ئەدەبیاتا فولکلۆری دهێتە هژمارتن، ئەو کەسێ نفرینێ دکەت زولم لێ هاتیە کرن یان مافێ وی هاتیە خوارن. نفرینکەر پەنایێ نابەتە بەر یاسایێ مافێ خوە وەرگریت، بەلکو پەنایێ دبەتە بەر بابەتێن رۆحانی و داخوازێ ژ خوەدا، فریشتەیان یان خاس و بابچاکان دکەت مافێ وی بستینیت یان بەلایەکێ ژ بۆ وی کەسی بینیت یێ مافێ وی خواری.

بۆ نموونە:

١. تاوسی مەلەك روحا وی حوکوم بکەت.

٢. ئەو تاوسی مەلەکە بکەم وەکی وی حەولی مەحکەما ئاخرەتێ دکەن مەلك شێخ سن ل سەر بنڤیسە، شێشمس مۆر بکە و شێخادی دەستورێ بدە.

٣. تۆیا (شێشمس)(*) ل کۆك و ئاساسێن وی بکەڤە.

٤. شێشمسۆ تو هەقێ من ژێ بستینی.

٥. شێخادی دوعایێ لێ نەکە.

٦. بەر تۆیا چلمێران بکەڤە و ... هتد.

مرۆڤێ نفرینێ دکەت (یێ بەلەنگاز و بێ دەستەلاتە و ئەو کەسێ زۆرداری لێکری کەسەکی خودان دەستەلاتە و یی بهێز و توانایە. ڤێجا ئەو مرۆڤێ بەلەنگاز نکارت بدەستێن خوە تۆلا خوە ڤەکەت، لەوما رادبت پەنایێ دبەتە بەر هێزەکا سروشتی، هێزەکە نەپەنی کو وی باوەری پێ هەیە دا کو تۆلا وی ڤەکەت)[12]. سەرەرای ئەڤێ چەندێ، هندەك کەسێن دەستەلاتدار ژی هەنە نفرینان دکەن، ئەو ژی کەسێن ئۆلدارن، ئۆلدار ژ بۆ بابەتێن خوە پەنایێ دبەنە بەر خوەدا و ئەوان هێزێن باوەری پێ هەی، هەر ژ بەر هندێ ژی نفرینان سیمایەکێ ئۆلی پێڤە یێ دیارە.

ژانرێ نفرینێ ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ د ناڤ ئێزدییان دا هاتیە بکارئینان، لەورا ژی ئێزدی خودان گەنجینەیەکا نفرینانە، لێ هەتا نها ب سەرزاری دهێنە گۆتن و ڤەگوهازتن نەخاسمە ژی ژ بال ژنان ڤە، ئەڤە ژی وێ چەندێ دیار دکەت ژن د جڤاکێ ئێزدییان وەکو جڤاکێن رۆژهەلاتی کەفتیە دبن فشارێن دەروونی دا و مافێ وێ هاتیە خوارن، یان ژی ژ بۆ ئەنجامدانا هندەك کاران رێ لێ هاتیە گرتن، د ڤی سەردەمی دا ئەڤ جۆرە نفرینە بەر ب کێمی یێ

چۆینە، بێ گومان ئەڤە ژی نیشانێ جڤاکێ ئێزدییان دگەل سەردەمی پێشڤە دچیت.

**١ - ٧. پێکەنین:** چیرۆکەکا گەلەك کورتە، ئەڤ چیرۆك ب درستی رودایە یان ژی تشتەکی ئاشۆپی و درست کریە. دەربرینێ ژ جڤاکی و شێوەیێ ژیانێ و ئاستێ تێگەهشتنا جڤاکی دکەتن. یان ژی رەخنەکرن و هێرش برن و شکاندنا لایەکی یە.

پێکەنین جۆرەکێ ئەدەبێ (سخری) یە. ئارمانجا وێ ئەوە وەرگری بکەنینیت و د هەمان دەم دا رەخنەیا لایەکێ بکەت. هەروەسا د ناڤ هەمو جڤاکان دا هەنە و ب پاشماوەیێ ملی یێ ملەتی دهێنە هژمارتن، چونکی یێ دادهێنیت یێ دیار نینە، هەروەسا ژی پێکەنین (ب دەقەکێ ئەدەبی یێ داهێنەرانە یێ ڤەگێرانکی دهێتە هژمارتن)[١٣].

ئەڤ جۆرێ ئەدەبی دناڤ جڤاکێ کوردی دا یێ زۆرە، ئێزدی ژی وەك بنیاتێ ملەتێ کورد خودان پاشخانەیەکا مەزن یا پێکەنینانە، کا چەوا پێکەنینێن هەر ملەت و جڤاکی دەربرینێ ژ وان دکەن، یێن ئێزدییان ژی سیمایەکێ دەڤەرکی و ئێلایەتی یێ ئێزدییان پێڤە یێ دیارە. ژ بەر کو جڤاکێ کوردی جڤاکەکێ ئێلایەتی یە، لەورا ژی هەر کەسانێن ئێلەکێ پێکەنینان ب ئێلەکا دی دبێژن، یان ژی یێ گوند و دەڤەرەکێ ب گوند و دەڤەرەکا دی دبێژن.

ژ لایێ ناڤەرۆکێ ڤە، پێکەنین هەمو بابەتان بخوەڤە دگرن، لێ یێن پتر کارتێکرنێ دکەن ئەو بابەتن یێن د ناڤ جڤاکی دا د قەدەغە و ل سەرئێککۆمبوون (کبت) ل سەر تاکی پەیداکرین، مینا بابەتێن: سێکسی، سیاسی، ئۆلی و ...هتد. ئانکو پێکەنین ب جۆرەکێ ئەدەبی یێ ڤالاکرنا بابەتێ د ناخێ مرۆڤی دا ژی دهێتە هژمارتن. بۆ نموونە: پێکەنینەك لدۆر شنگالی یان دبێژیت: (ئێکی گۆتە ئێکێ شنگالی: تو ب الله کی ناڤێ الله چی یە؟، گۆت: جە ب الله نزانم!).

**١ - ٨. مەتەلۆک:** مەتەلۆک دناڤ ئەدەبیاتا فولکلۆری یا ئێزدییان دا هەنە، لێ هەر هەمان ئەو مەتەلۆکن یێن د ئەدەبیاتا فولکلۆری یا کوردی دا هەین، لێ جوداهی یا مەتەلۆکێن کو مۆرکەکێ ئۆلی پێڤە هەبت؛ ئەو زێدەتر د ناڤ دەقێن قەولان دا بکارهاتینە، ب تایبەتی ژی قەولێ (بەحرا)، رێژەیەکا زۆر ژ ڤی قەولی ب ئاوایێ مەتەلۆکان هاتییە ئافراندن، لێ وەکە دیار مەتەلۆکان بەرسڤێن خوە ژی هەنە، لێ د قەول دا بەرسڤان نادە، بەلکو ل خەما وەرگری دهێلت، ئەڤە ژی ئێك ژ سیمایێن ئەدەبیاتا نوو یە کو ناخوازت ب ئاسانی مانایا دەقی بدەستڤەبەردەت، بەلکو د خوازت وەرگر هزر بکت، ئانکو هاریکارە ژ بۆ دانەکارا هزرێ، ئەڤە ژی کارەکی زۆر باشە، بکارهاتنا مەتەلۆکێ د قەولێ بەحرا دا ب دوو ئاوایان بوویە: ئێك: جارنان ب رێزکەکێ مەتەلۆکێ تینت. دوو: جار ژی ب سەبەقەیەکێ (ئانکو سێ رێزکان).

بۆ:

**هەر چار چرا و فتیلەك**
**دوو مەنبەر و قەندیلەك**
**هەشت دەرگەهـ و کلیلەك**

یەك دن:

**من ل وێ دیتبوو بازارەك**
**د ناڤدا هەبوو دیارەك**
**ل سەر سەکنی بوو سوارەك**

وەکە دیارە ئەڤە سەبەقەیێن قەولێ بەحرانە کو ب ئاوایێ مەتەلۆکێ هاتنە ئافراندن، لێ بەرسڤا وان نادەت، بەلکو ل خەما وەرگری دهێلت.

**١ - ٩. ستران:** ئێزدییان گەنجینەیەکا مەزن یا سترانا فولکلۆری هەیە. نەخاسمە ژی سترانا دەڤەرا شنگالێ، ئەڤ ستران ژ لایێ ناڤەرۆکێ ڤە هەمو بابەتان بخوەڤە دگریت. لێ خالا گرنگ ئەوە ناڤەرۆکا گەلەك ژ ڤان سترانان مێژوویە، گەلەك بویەرێن خۆش و نەخۆش ژ دیرۆکا ئێزدییان، ب سترانێ هاتینە پارازتن. نەخاسمە ئەو هەوێن لەشکەری یێن ب سەر شنگال و دەڤەرێن ئێزدییان دا هاتین ژ پێخەمەت نەهێلانا بیر و باوەرێن ئێزدیاتیێ، دیسان ئەڤ ستران گەلەك باسێ قەهرەمانێن چیایێ شنگالێ دکەن و

بیر و باوەرێن ئێزدیاتیێ ژی تێرا دەرباز دبن.

هەروەسا ب پتری یا بابەتێن خوەڤە سیمایەكێ ئێزدیاتیێ پێڤە یێ دیارە، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو ستران ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە تایبەتمەندییەكێ ژ خوە را درست دكەن كو ژ سترانا دەڤەرێن دی یێن كوردستانێ یا جودا بیت. بۆ نموونە: سترانا شێخ میرزایێ ئاڤۆنسی، ئێزدی میرزا، حەسەن و غەزالێ، خەنسێ و رەشۆ، فەرمانا فریق پاشا، مەمۆیێ عەلیكێ، لاوكێ سمۆقی، كاروانۆ، شەرێ بەدەلێ عەسۆ و ... هتد[*].

دیسان ژبلی سترانا فولكلۆری یا ئێزدییان ب تەڤ جۆرێن خوەڤە، ئێزدییان سێ جۆرێن دی ژی هەنە ب رێ و رەسمێن پەرستگەها لالش ڤە د تایبەتن و جۆرەكی پیرۆزی و گرنگیێ ژی هەنە، ئانكو ئەم دكارین بێژین جهێ وان دكەڤتە دناڤبەرا ستران و قەولان دا، هەر جۆرەكی ژی دەقەك ب تنێ هەیە، لێ گەلەك شاخ ژێ پەیدابوینە، ئەو ژی: خزێمۆك، پاییزۆك و رۆبارینن.

**١ - ٩ - ١. خزێمۆك،** ب جۆرەكێ سترانا فولكلۆری دهێتە هژمارتن ژبەر كو ب ساخلەتێن خوەڤە دچیتە سەر سترانا فولكلۆری، خالا هەرە دیار خودانێ وێ یێ دیار نینە.

وەكە ژ ناڤێ وێ دیار ئەو ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە بەحسا خزێمان دكەت، ژبلی بابەتێ خزێمێ ئەو زێدەتر بەحسا دەرویش و بابچاكێن ئێزدییان و ئاماژەیێن پیرۆز یێن ئێزدیاتیێ دكەت، هەروەسا ژی عشقەكا قەلەندەران (عەشقەكا سۆفیانە) یا راستەقینە تێدا دیار دبیت. یان ژی سالۆخدانێن قەلەندەرانە ل هەمبەر بابەتێن دلداری، یان عەشق و پێگۆتنەكە بەرامبەری خاس و بابچاكەكی ئێزدییان، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژی ئەڤی جۆرێ سترانێ تایبەتمەندی یا خوە ل جەم ئێزدییان هەیە و ئێزدی وەكە ئەدەبەكی گرانبها دبینن و جۆرە پیرۆزیەكێ د دەنێ.

هەروەسا ژ لایێ روخساری ڤە، سەبەقەیێن خزێمۆكێ نە وەكی یێن قەولان سێ رێزی و د جێگرن، بەلكو سەبەقەیێن جۆرا و جۆر ژ لایێ هژمارەیا رێزان ڤە هەنە، بۆ نموونە: سەبەقە ٤ رێز، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩، ١٠ رێز ژی هەنە[١٤].

هەروەسا ژی چونكی ئەڤ جۆرێ سترانێ ژ بال خلمەتكارێن پەرستگەها لالش ڤە ب بابەتێن دلداری هاتیە گۆتن؛ ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە بابەتێن ئۆل و ئەڤینداری تێكەلی هەڤ دبن.

**هەیی باكەنە هۆستا عەلی بلا بێتە دەرێ دكانێ،**
**بلا خزێمەكێ چێ بكێ نە ڤوتایی چاكوچی، نە كێشایی خەرگەمانێ،**
**ب خێر و خۆشی جەمایێت مالا شیخادی هاتن،**
**دا بكەهتە خەملەكە ژ خەملێت خودان ئیمانێ**[١٥].

**١ - ٩ - ٢. پاییزۆك،** ئێك ژ ستران یان ژی بەیتێن گرنگە ژ ئەدەبیاتا فولكلۆری یا ئێزدییان، هەر وەكی ژ ناڤێ وێ ژی دیار ئەو ژ ئالێ ناڤەرۆكێ ڤە دەربرینێ ژ ناڤ و نیشانی دكەت و ئەو ب هاتن و نێزیكبوونا وەرزێ پاییزێ دهێتە گۆتن، لێ دیسان ژی د ناڤ ڤی بابەتێ سروشتی و وەرزی را كۆمەكا بابەتێن دن ژی دهێن باسكرن. مینا: هێمایێن پیرۆز یێن ئێزدیاتیێ، سالۆخدان، عەشقەكا قەلەندەرانە و هندەك جاران ئاماژەیێن سێكسی (وەك حەز و رەمەكەك نەگۆر ژ سروشتێ مرۆڤی)[١٦] تێدا دیار دبن، هەروەسا (ئەڤ جۆرە سترانە بەهرا پتر گل و گازندەنە)[١٧].

ژ ئالێ كوبرێ (ئاوازێ) ڤە، ئەو ب ئاوایەك نەرم و رەحەت و تایبەت و خەمگین و بلند و نزم دهێت گۆتن (دەقەكا ئەدەبی یە ب دارشتنەكا پر سۆز ژ چەند وێنێن جوان و سیفەتێن د جهێ خوە دا و بكارئینانا پەیڤێن رەسەنێن كوردی پێكهاتی یە)[١٨].

ژ لایێ روخساری ڤە و ب تایبەت ژ لایێ ئاوایێ هژمارا رێزان ڤە، سەبەقەیا پاییزۆكێ هەتا ١٢ رێزكی ژی هەیە[١٩]. ئانكو ئەو ژی وەكی خزێمۆكێ ئازادی د سەبەقەیێ دا ژ لایێ هژمارا رێزان ڤە هەبویە، لێ ئەگەر خزێمۆك هەتا ١٠ رێزان چۆبیت؛ پاییزۆك هەتا ١٢ چۆیە.

پاییزۆك سەرەرای هندێ ب وەرزێ پاییزێ هاتینە گۆتن و پاییز دەمێ وانە، لێ دیسان ژی ژ بال خلمەتكارێن پەرستگەها لالش ڤە د دەمەك تایبەت

دا ژ وەرزێ پاییزێ هاتینە گۆتن، ئەو ژی (چەند رۆژەکان بەری جەژنا جەمایێ، ژ بەر کو بەرێ خلمەتکار د چۆنە کەندێ دۆغاتا - قەزا تلکێفێ و ب مەرێر و قاسمان گێچ د کۆلان و سەراد دکرن و ب دەواران د ئانینە پەرستگەها لالش دا قوبێن پەرستگەهێ ب وێ گێچێ جوان و سپی بکەن. ئەڤ رێ و رەسم ژ بال خلمەتکار و شکەستی و کۆچەك و ...هتد، یێن ئێزدییان ڤە دهاتە کرن کو سالەکێ قوبێن گەلی یێ لالشێ سپی دکرن و سالەکێ قوبێن دەڤەرێن ئێزدی نشین)[20]. ئانکو هەر دو سالان جارەکێ قوبەك سپی و جوان دکر، ڤێجا ئەڤ کار ژی چەند رۆژان دۆم دکر و ئەڤان کەسان دبەر کارێ خوە را ئەڤ پاییزۆك د گۆتن.

**پاییزە ل من دەست دا، من نەکر کار و بارێ زڤستانێ.**

**چیایێ بلند دخوازن مژ و مۆرانێ.**

**بەرێ یا خەلەف ئاغا دخوازێ رەشیشەکە هوورەبارانێ.**

...

**دەنگەك هاتە ژ ئەزمانا،**

**هنا دگۆت، (ملیاکەتن، کەتنە پشتی ئەورانا)،**

**هنا دگۆت، (ڤیرێنا مەمێ شڤانا).**

...

**ڤیرێن دکەتی تۆق و بێنی و کەهرەبانا،**

**ل سەر سینگ و بەرێ منێ گەور و بۆز د دانا..**[21].

پاییزۆك نە ب تەنێ د ناڤ ئێزدییان دا هەنە، بەلکو ل دەڤەرا بەهدینان و د ناڤ کوردێن موسلمان دا ژی هاتنە پارازتن. لێ دیسان پاییزۆکێن وان ژی سەمبول و هێمایێن ئێزدیاتیێ و ئێزدییان د ناڤ دا دکەڤنە بەرچاڤ، وەك ئاماژەیێن: لالش، شێخادی، باشیکێ، کچێن شێخان و دنا، جەمەدانی و ...هتد[22]، ژ بەر ڤێ چەندێ رەنگە هەر ئێزدییان بخوە ڤەهاندبن و ژناڤ وان چۆبنە د ناڤ کوردێن موسلمان دا.

(**ئەرێ دایکێ، ئەز دێ مرم، رۆژکا چارێ،**

**کێلیکا بۆ من بینن، ژ گەلیکێ لالەشێ ...**)[23].

١ - ٩ - ٣. **رۆبارین**، جۆرەکێ سترانێ یە و ئێك دەق ب تنێ یە، لێ گەلەك شاخ ژێ پەیدابووینە (توخمەکی تایبەتە ژ ئەدەبێ ئۆلی یێ ئێزدییان، وەکی لاڤژ، پاییزۆك، خەریبی و ...هتد)[24]، ناڤێ ڤی جۆری رۆبارینە و د ناڤەرۆکێ ژی دا بەحسێ رۆباران دکەت. لێ (شێخ میرزایێ خەتاری) دبێژیت: ئەڤ جۆرە بەیتە (رۆبارین) ب مانایا (رۆبار) ناهێت، بەلکو (رێبوارین) ە، ئانکو (چۆنە/ دەربازبونە)، یان ژی (چۆن و هاتنە)، ئانکو (رێڤنگی) یە.

یەك ژ تایبەتمەندی یێن رۆبارینێ ئەوە دەقەکێ پرسیار و بەرسڤی[25] یێ سەرواداره، هەروەسا ژ لایێ ناڤەرۆکێ ڤە ژی نێزیکی هەردو جۆرێن پاییزۆك و خزێمۆکانە، چونکی ئەو ژی بەحسا پیرۆزی و خاس و بابچاکێن ئێزدیاتیێ دکەت. هەروەسا سالۆخدانێن کەچکان تێدا دکەڤنە بەرچاڤ، ئانکو ئەو ژی ژ بال خلمەتکار و کۆچەك و شکەستی یێن پەرستگەها لالش ڤە هاتینە گۆتن و پەسن و سالۆخێن وان ژی عەشقەکا خودای و سۆفیگەری و هندەك جاران ژی عەشقەکا دنیەوی بوویە.

**خەملێت رۆبارا چینە؟، خەملێت رۆبارا دار و بینە.**

**خەملێت فراتا چینە؟، خەملێت فراتا کەلەك و مەرکەب و زۆر گەمینە.**

**خەملێت لاوکا چینە؟، خەملێت لاوکا سمبێلێن رەشێ د قەترانینە.**

**خەملێت زەرییا چینە؟، خەملێت زەرییا حن و مۆریك و بەنك و بزینە.**

**خەملێت بووکا چینە؟، خەملێت بووکا خێلی و سپیچار و خێلینە.**

**هەیی عەسل دین، دینێ شەرفەدینە...**[26]

٢. **ئەدەبیاتا ئۆلی**: ئەدەبیاتا ئۆلی یا ئێزدیاتیێ ژ چەند ژانرێن جودا جودا یا پێکهاتی یە، ئەوان ژانران ژ لایێ روخسار و ناڤەرۆکێ ڤە تایبەتمەندی یا خوە هەبویە، ئەڤێن لخوارێ ئەو ژانرن.

**٢ - ١. قەول:** تێکستەکا رێکخستی یە، پشکا گرنگ یا ئەدەبیاتا ئۆلێ ئێزدییانە[٢٧]، وەکو ژانر یێ تایبەتە ب ئێزدییان ڤە (قەول وەك ناڤ بۆ تێکستێت دینی سەدا سەد تایبەتن ب ئێزدیاڤە)[٢٨].

وەکو پەیڤ، ژ تەڤ قەولان ڕا (قەول) دهێتە گۆتن، لێ ئەو قەولێن فەلسەفی و خودان ڕامانێن کور، ئێزدی دبێژنێ: (قەولێن بەرانی)[*].

ژ لایێ زمانی ڤە؛ زمانێ ئێزدییان یێ ئاخفتنێ زمانێ کوردی یە. پتری یا وان ب دیالێکتا کورمانجی د ئاخڤن، پتری یا ئەدەبیاتا ئێزدییان یا ئۆلی ژی و نەخاسمە قەول ب زمانێ کوردی و دیالێکتا کورمانجی یا سەری ب تایبەت شێوەزارێ دەڤەرا مەرگەهێ (قەزا شێخان یا نها)یە، هەروەسا (کتێبێن پیرۆز) ژی ب زمانێ کوردی و ئەلفابایا ئێزدیاتیێ یا تایبەت کو ئەلفابایا کوردی یا ڕەسەنە هاتینە نڤێسین(پشتی ئەلیف بێیا خەتێ ئێزدییان هاتییە دیتن و جودا ژ ئەلیف بێیا هەر زمانەکێ دیتر ئەم دشێین بێژین ئەلیف بێیا زمانێ کوردی یا ڕەسەنە)[٢٩].

ئەڤ ئەدەبیات ژ لایێ زمانی و فەرهەنگی ڤە گەنجینەیەکا مەزنە، ژ لایێ ناڤەرۆکێ ڤە ژی ژ بۆ ئەدەبیاتا کوردی ب گشتی دەولەمەندییەکە کو (خزمەتیان بە زمان و ویژەی کوردی کـردووە)[٣٠]، لێ ژ بەر کو د سەردەمێ ئەڤ ئەدەبیاتە تێدا هاتییە ئافراندن (ل وی دەمی کارتێکرنا وەلاتێن دەردۆر ل سەر دەڤەرێن ئێزدییان هەبوو، لەورا دبینن هندەك پەیڤێن بیانی عەرەبی، ترکی و فارسی ژی دکەڤنە بەرچاڤ گەلی ووشەی ئایینی عەرەبی یان لەم شیعرە ئایینی یانەدا بەکارهیناوە)[٣١].

خالەکا دی سەبارەت زمانێ ڤێ ئەدەبیاتێ، هندەك تێکستێن ئێزدییان ب تەمامی ب زمانێن بیانی هاتینە نڤێسین، لێ ئەو تێکست د کێمن، هژمارەکا کێم ب عەرەبی، دەقەك ب فارسی و دەقەك ب تورکی هەنە، تایبەتمەندییەکا دی یا دەقێن ئێزدییان یێن ب زمانێن بیانی هاتینە نڤێسین هەیە، ئەو ژی زمانێ کوردی دایە پال ڤان زمانان، ئانکو هندەك دەقێن ب زمانێ عەرەبی (ب کوردی و عەرەبی)، یێ فارسی (ب کوردی و فارسی) و یێ تورکی ژی (ب کوردی و تورکی) هاتینە نڤێسین:

**دیللەرم .. دیللەرم**
**دیللەر .. بیللەرم**
**یوخ حەرام باش قولخەرم**[٣٢]
**ئەزم و هەر ئەزم**
**دەنونێ مسری ئەزم**
**بازیدێ بەستامی ئەزم**
...
**دنیا یۆخ،**
**ئاخرەت چۆخ**
**ئەو جۆر و جەڤا دنیا هیچ یۆخ**[٣٣]

ئەم ڤێ دیاردەیێ د ئەدەبیاتا کلاسیکی یا کوردی دا ژی دبینین، لێ ڤایە بەری وێ د ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ دا هەبویە، ئەڤ دیاردەیە شـارەزای و شیانێن وان قەولبێژان د بوارێ زمان و کەلتورێ مللەتێن دی دا دیار دکەت.

ژ کنارێ سەروایێ ڤە، پتری یا وان سەبەقەیان د ئێك سـەروا (ئێك دەنـگ) بوینە. ئانکو هەر سەبەقەیەك ب ئاوایێ (B, B, B)، (A, A, A.) وەسا هاتینە درستکرن.

ژ کنارێ کێشێ ڤە، پتر ل سەر کێشا فولکلۆری یا کوردی هاتینە ئافراندن، (مارف خەزنەدار) دبێژیت: (لە پاش لیکولینەوە و خویندنەوەی بەشی زوری ئایینی یەزیدی یەکان، بوم دەرکەوت ئەم شیعرە ئایینی یانەیان لە چوار چیوەی کیش و قافیەی گورانی و بەیت و حەیران و لاوك نەچوونەتەوە دەرەوە)[٣٤]. ب دیتنا مە ئەگەر ڤەکۆلینێن ئەکادیمی دڤی بواری دا بهێنە کرن؛ دبت کێشێن دی ژی بهێنە دیتن. ئانکو ئەڤا (مارف خەزنەدار) دبێژیت ژ بۆ ئەدەبیاتەکا دەولەمەند و تێر ژانر بریارەکا ڤەبر نینە.

ژ لایێ تۆبۆگرافی ڤە، مینا دەقەکا هۆزانی یە و ژ چەند سەبەقەیان (پارچەیان) پێکهاتی یە، هەر سەبەقەیەك ژی ژ چەند ڕێزان پێکهاتی یە، پتری یا سەبەقەیێن قەولێن ئێزدییان د سێ ڕێزینە، کێم

ژی دو رێز یان چار و پێنج رێزن، ئەڤ گهۆرینە ژی ژ کارتێکرنا ڤەگوهازتنا ل سەر زاری ب سەردا هاتینە، ئانکو سەبەقەیا درست یا قەولی سێ رێزی یە.

قەول ژ سەبەقەیان پێکهاتی یە، سەبەقە ژی مینا زنجیرێ پێکڤە دگرێداینە، ئەڤ سیستەم ب ڤی رەنگی دهێتە درستکرن (رێزکا داویێ ژ سەبەقا ئێکێ و رێزکا ئێکێ ژ سەبەقا دوێ ب هەڤڤە د گرێداینە)[٣٥]. ئەو رێزێن هەڤگرێدانێ درست دکەن د هەڤتەریبن، یان ژی(ب تنێ پەیڤەك هاتیە گهۆرین، یان ژی پاش و پێشئێخستن هاتیە کرن)[٣٦]، بۆ نموونە:

س. (١)

١. چی بەحرەکە عەمیقە

٢. پەدشا ل مە دکەت شەفیقە

٣. ئەم ژ دوور ئانینە نێزیکە

س. (٢)

٤. ئەم ژ دوور ئانینە کنارە

٥. پێل دئینە مە ب دژوارە

٦. مە ب خودێ خۆ هەوارە

س. (٣)

٧. هاواری خودێ خۆمە

٨. چەندی مەدەها ژێ د دەمە

٩. پەدشێ من ئەوە یێ ل عەرشا ل سەما[٣٧]

وەکە دیار، رێزا (٣) ژ س. (١)، و رێزا (١) ژ س. (٢) ب هەڤرا دگرێداینە، هەروەسا ژی رێزا (٣) ژ س. (٢) و رێزا (١) ژ س. (٣) ب هەڤرا دگرێداینە، ئەڤ سیستەم د گەلەك قەولان دا بەرچاڤ دکەڤیت، د هندەك قەولان دا ئەڤ سیستەم ناهێتە دیتن، بێ گومان ئەڤ نە دیتنە ژی ژ ئەگەرێن ل سەرزار ڤەگوهازتنێ ب درێژی یا چەندین سەدەیان، تێکچۆیە، یان ژی (هندەك جاران ل گۆرەیی بارودۆخان هندەك گهۆرین و سەرزێدەکرن ب سەردا کرینە ژ بۆ بەرژەوەندی یا وی سەردەمی)[٣٨]، ئانکو ئێزدییان هندەك گهۆرین د قەولان دا کرینە ژ پێخەمەت خوە پارازتن و خوەگونجاندنێ دا ئەو ملەت و باوەرێن دەردۆرێن وان فەرمان و ڤرکرنان ب سەر وان دا نەئینن. ئەڤ چەندە ژی بویە ئەگەرا

هندێ سیستەمێ قەولی تێك بچیت.

هەروەسا کا چەوا سەبەقەیێن هەر قەولەکی ب ئاوایێ زنجیرە ب هەڤرا دگرێداینە، وەسا قەول ژی ب قەولی ڤە یێ گرێدای بویە، ئانکو قەول ب سیستەمەکی رێك و پێك هاتنە ئافراندن، بۆ نموونە د قەولێ تەختان دا دهێتە گۆتن:

**ئەڤ قەول قەولەکی ب قریارە**
**مفتا هەفتی قەولی ب هژمارە**[٣٩]

قەولێ تەختا[*] قەولەکی فەلسەفی یە و یێ تایبەتە ب خوەدا ڤە، مینا کلیلا(مفتەیا) هەفتی قەولی دهێتە زانین، ئانکو کەسێ ئەڤی قەولی باش نەخوینیت و نزانیت و شارەزایی فەلسەفە و بابەتێن خوەدای نەبیت؛ نکاریت (٧٠) قەولێن دی تێبگەهیت. ئەڤە دیار دکەتن قەول ژ ئالیێ بابەتی ڤە ب هەڤرا د گرێداینە، یان ژی بابەت د ناڤا قەولان دا د پۆلین کرینە، ئەڤ ژی راستە، ژ بەر کو هەر قەولەك تایبەتە ب هەلکەفتەکێ یان رێ و رەسم و دەمەکی ڤە، ئانکو هەر قەولەك ل هەر دەم و هەر هەلکەفتەکێ ناهێتە گۆتن، هەروەسا ژ ئالێ شێوەیێ گۆتنێ ڤە ژی ژ بۆ هەر وەختی قەول و بەیت ب رەنگەکی و کوبریەکێ (ئاوازەکێ) تێنە گۆتن»، ئانکو قەول ژ قەولی جودایە و ل گۆرەی هەلکەفت و ناڤەرۆکا قەولی ئاواز ژی دهێت گهۆرین، بۆ نموونە: قەولێ سەرەمەرگێ ب تنێ ل سەر مری یان دهێتە گۆتن.

ژ لایێ واتایێ ڤە، قەول زێدەتر بوارێن ئۆلی، هزر و فەلسەفی یێن تایبەت ب ئێزدییان ڤە بخوەڤە دگرن.

**٢-٢. بەیت،** مینا تێکستەکا هۆزانی یا رێکخستی یە (وەك هەلبەست و سروودێن دینی نە)[٤٠]. ب رەنگەکی دی بێژین(بەیت و گۆرانی لە بنەرەتدا لە خانەی شیعری کێشراودان)[٤١]. ژ لایێ سەروایێ ڤە د هندەك سەبەقەیان دا جۆت سەروا (مینوی) تێدا دهێتە دیتن ئەڤ چەندە د قەولان دا بەرچاڤ نابیت. ژ بەر کو سەبەقەیا قەولی یا درست سێ رێزی یە. ژ لایێ بابەتی ڤە ژی بابەتێ وان تەڤ نە بابەتێن

ئۆلی یێن گرنگن. بەلکو بابەتێن ئۆلی و گشتینە. دیسان وەکو تێگەهـ(بۆ تێکستا لناڤ کوردێت نە ئێزدی ژی، ب تایبەت هۆزانێت کلاسیك ژی هاتییە بکارئانینە)[42]. بەیتێن هەتا نها هاتینە بەلاڤ کرن: بەیتا سوبێ (بەیتا شێشمس)، هێڤاری[43]، بلبلا[44]، نسرا[45]، میر مح، نەسیحەتا، سەرافێ هندی یا، بەهارێ، دنێ و ...هتد.

هەروەسا هەمو بەیت ب روخسار و ناڤەرۆك نە مینا ئێکن، بەلکو هەر بەیتەك ژ بەیتەکا دی یا جودایە، بۆ نموونە: ژ لایێ روخساری ڤە، نەخاسمە هژمارەیا رێـزان و سەروایێ ڤە، هندەك بەر ب سیستەمێ قەولان دچن: وەك: بەیتا سوبێ، هێڤاری، بەیتا نسرا، ئانکو سێ رێزکینە و کێمەك ژی چار رێزی و پێنج رێزینە، هەروەسا ژی بەیتا نەسیحەتا، سەرافێ هندی یا، بەیتا بەهارێ، ژ لایێ رێزان ڤە پتر ئەو د شەش رێزیکە، ژ لایێ سەروایێ ڤە ژی تایبەتی یا خوە هەبوینە و زۆربەیا سەبەقەیێن وان لدووڤ ڤی سیستەمێ لخوارێ چۆینە:

١. .......... B .............. A
٢. .......... B .............. A
٣. .......... B............... A

هندەك ژی ب ڤی سیستەمی:

١. .......... B .............. A
٢. .......... B .............. C
٣. .......... B .............. D

هندەك سەبەقە ژی لدووڤ چ سیستەمان نەچووینە و د ئازادبووینە، ئانکو هەر رێزەك دەنگەك بوویە.

**٢ - ٣. قەسیدە**، تێکستەکا رێکخستی یە، ب کێش و سەلیقەیەکا سڤك هاتییە ڤەهاندن. پتری یا وان بەحسێ پەسنا خودێ و خاس و بابچاکان دکەن. هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژی (فەقیر حەجی فەقیر شمو) وان ژ قەولان ژی گرنگتر دبینیت[46]. دیسان تایبەتییەکا قەسیدەیان ئەوە (دگەل سەمایێ دهێنە گـۆتـن)[47]. گەلەك ب زمانێ عەرەبینە، هندەك ژی عەرەبی و کـوردی تێکەل هاتینە گۆتن. ئەڤێ ژی مەبەستێن خوە هەبوینە، ژبلی بابەتێن تەکنیکی، هەروەسا (ژ بۆ کو گەلێن هاویردۆر ئێزدییان و دینێ وان فێم بکەن و بزانن ئەڤە ملەتەکێ خودان فیلۆسۆفییەك تایبەتە، هەروەسا ژی ژ بۆ پێناسەکرنا خاس و بابچاکێن خوە ب وان خەلکان وەسا ئافراندنە)[48]. ژ وان تەکستێن ب زمانێ عەربی هاتینە گۆتن: انا وحدی، اسمعوا، الکریم الله، غایب کونی (ئەو ب قەسیدا تاوسی مەلەك) ژی یا ناڤدارە، جوبان[49]، خالی راحووم، زمزم بلادی، شربت بالزناره، شربت بکأس الحب، صفا وقتی، کلمة الطلوع، نادیمي (لاتمیل)، ودونی لبحر البحور[50] و ... هتد. گەلەك ژ وان هەتا نها نەهاتنە بەلاڤەکرن.

ژ بەر ڤێ چەندێ (خدرێ سلێمان و خەلیلێ جندی) دبێژن: (هەر تێکستەکی ئایینی ب زمانێ کوردی هاتبتە گۆتن، ئێزدی دبێژنێ: قەول گۆتن، یان بەیت، و هەکە ب زمانەکی بیانی هاتبنە گۆتن دبێژنێ: قەسیدە). یا ژ مە ڤە، ئەڤە نە پیڤەرە، ژ بەر کو تەکستەك ب زمانێ تورکی هەیە و کەس نابێژتێ: قەسیدە، دیسان پتر ژ (٣٠) تێکسان ب زمانێ کوردی هەنە[51] و هەر دبێژنێ: قەسیدە.

ل گۆرەی دیتنا مە، قەسیدە ب کەسایەتی (خاس و بابچاکێن) هەردو چینێن شێخ و پیران (نەخاسمە ژی شێخان) هاتینە ڤەهاندن، ستایش، کەرامات و کاروبارێن وان تێدا دیار دبن. ئەڤە ژی وێ دیتنا مە تەکەز دکەت دەمێ بەری نها مە دیار کری ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ ب سیستەمەکی رێکخستی هاتییە نڤێسین. لەورا ژی زۆربەیا کەسایەتی یێن شێخ و پیران قەسیدە و بەیت پێ هەبووینە، ب دیتنا مە کەسایەتی یا بەیت یان قەسیدە پێ نەی ژی، ئەو نەمایە و هندابویە.

ژ لایێ هژمارێ ڤە (سەبەقێن قەسیدان، مینا یێن بەیت و قەولان نە گەلەکن)[52]. بەلکو کێمترن. ژ لایێ سەروایێ ڤە ژی هندەك قەسیدە ب (جۆت سەروا) هاتینە ڤەهاندن، ئانکو د ڤێ خالێ دا نێزیکی هندەك سەبەقەیێن بەیتان دبیت، وەك قەسیدا

(شێشمسێ تەوریزی):

| | |
|---|---|
| نە یار ددەر | A |
| نە گویل ددەر | A |
| مەولدی جان | B |
| خالقی عەرد و عەزمان[٥٣] | B |

**٢ - ٤. دوعا:** دوعا وەكو زاراڤ ب واتایا (داخوازی، هیڤی، پاراندن ژ نالینێ مروڤەكی بێ هێز و بێ چارە، بۆ هێزەكە پیروزە نە دیار تێت، هەتا ئەو هێز د هانا وی بێت، ئەوی ژ بەلایێت دنیایێ بپارێزیت، ل حالێ وی بپرست و هیڤیێن دلێ وی بجی بینت)[٥٤]. ژ خوە دوعا (ب ئێك ژ شێوەیێن دەستپێكی یێن دیاربونا هزرا ئیمانی - ئۆلی دهێتە هژمارتن)[٥٥].

دوعا د ئەدەبێ ئێزدییان دا ب ڤی شێوەی دهێتە دیاركرن:(تێكەستەكی ڤەهوونایە، ناڤەرۆكێن وان هیڤی و داخوازن ژ خودێ و خاس و بابچاكان، هندەكێن دن بۆ چارەسەریێ و خوە پاراستنێ نە)[٥٦].

سەبارەت ژانرێ دوعایێ، (د. محەمەد بەكر) ژ ئەنجامێ ڤەكۆلینا خوە گەهشتی یە وی ئەنجامی ئەو دەق (دوعایا رۆژهەلاتێ) پەخشانەكا ریتمی یە، ئانكو (Prose Rhythm/ النثر الایقاعی)[٥٧]، لێ ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت تەڤ دەقێن دوعایێن ئێزدیاتیێ پەخشانێن ریتمی بن، چونكی هەر دەقەك نە وەكی دەقا دی یە و ژ لایێ روخسار ڤە ژ هەڤ د جودانە.

د ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ دا دوعایێن فەرز[*] و نە فەرز هەنە، یێن فەرز سێنە و دڤێت رۆژانە ژ بال مروڤێ ئێزدی ڤە د دەمێ وان دا و سەرەڕای شەهدا دینی ب شەڤێ بهێنە گۆتن. لێ ئێزدییان هژمارەكا زۆر یا دوعایان هەنە نە د فەرزن، بەلكو هەر ئێك ب بابەتەكی ڤە گرێدایە و ل گۆرەی پێدڤی یێنە، بۆ نموونە: دوعایێن چارەسەركرنا نەخوەشیان: دوعایا كێما هەیڤێ، نەزەرێ، زەركێ، ئێشا مەمكێ ژنێ و ...هتد، دوعایێن تایبەت ب هندەك گیانەوەران ڤە، مینا: دوعایا دوپشكی، گێرگراتكێ (مێری یێ)، گوركی و ...هتد[٥٨].

ژ لایێ هژمارێ ڤە، ئێزدییان هژمارەكا زۆر یا دوعایان هەبوینە، هەر دوعایەك ژی تێكستەكی جودایە، بۆ نموونە؛ كەسەكێ ئێزدی ب تنێ (٢٤٣)[٥٩] تێكستێن دوعایان زانینە و ژ بەر بوینە، لێ هەتا نها ئەڤ هژمار ب گشتی نەهاتییە بەلاڤەكرن.

ژ لایێ كێشێ ڤە، ل گۆرەی ڤەكۆلینەكا (د. محەمەد بەكر) یا ل سەر (دوعایا رۆژهەلاتێ) كری دیار دبیت كێشا خۆمالی یا كوردی (٨) برگەی ل سەر دەقی زالە و تەنانەت كێشا عەروزی ژی دیار دبیت[٦٠]. دڤێ دەربارەیێ دا (مارف خەزنەدار) دبێژیت: (لە حەیران و لاوك و هەندی لە بەیتەكان و دوعا ئاینیی یەكانی یەزیدی یەكان بومان دەرئەكەوێ كە رەنگا و رەنگی كێش لە پارچە هەلبەستیكدا یەكیكە لە خەصائسی روخساری شیعری كوردی نەتەوەیی)[٦١].

**٢ - ٥. درۆزە:** هندەك دبێژنێ (دروزگا شەمس)[٦٢] ئێك دەق ب تنێ یە، دەقەكی ئۆلی یێ درێژە، ژ لایێ ناڤەرۆكێ ڤە یێ تایبەتە، ژ بەر كو ناڤێ زۆربەیا خاس و بابچاكێن ئێزدییان تێدا دهێت. ژ بەر ڤێ چەندێ مروڤ دكاریت بێژیت: ئەو مینا دەقەكێ رێبەری یان ئەندێكسی یێ خاس و بابچاكێن ئێزدییانە.

**٢ - ٦. سرود:** تێكستەكا ب كێش و سەروایە، نە گەلەك درێژە، لێ دەربرینێ ژ گەلەك تشتان دكەت مللەت پێ دهێتە ناسكرن، كۆمەكا پەیڤێن سادەنە و ب پارچەكا مۆزیكێ دهێتە گۆتن (سرود پارچەكە مۆزیكی یە و ستایشا دیرۆكا وەلات، داب و نەریت و بەرخودانێن مللەتی دكەت و د هەلكەفت و جهێن تایبەت دا دهێتە گۆتن كو پتریا وان د گەرم و گورن، ئەڤە ژی ژ پێخەمەت هندێ ڤیانا وەلاتی پتر ل جەم تاكی پەیدا بكەت)[٦٣].

د ناڤا ئەدەبیاتا ئێزدییان دا سرود ژی دكەڤنە بەرچاڤ، لێ گەلەك دكێمن، یێن هەتا نها هاتنە بەلاڤەكرن: (سرودا شەرفەدین)[٦٤] و سرودا(هەیی رابە سولتان رابە)نە، ئەڤ سرود ژی پتر لایێ شەری، بەرگریێ و نەتەوایەتیێ پێڤە یێ دیارە، دیسان ژی د چارچوڤەیەكێ ئۆلی دا هاتینە گۆتن و جۆرەكێ پیرۆزی و تایبەتی یێ ژی بخوە ڤە درستكرینە، ئانكو

ئۆل و نەتەوایەتی تێكەل كرینە، بۆ نموونە د سرودا (هەی رابە سولتان رابە) دا هاتی یە:

**بەسما دبێژتە بەسامە**
**دا ئەم هەرن ئەیرانە**
**ل وان بكن فەرمانە**
**هەی رابە، هەی رابە، هەی رابە،**
**هەی رابە سولتان رابە**
**دا خەلكێ ئێزدی تەنا بە**(٦٥)

**٢ - ٧. سەرهاتی یێن خاس و بابچاكان،** ب ئاوایەكی پەخشانكی هاتینە گۆتن، بوبەرێن وان ب راستی قەومینە، قەهرەمانێن وان ژی بابچاك و دەروێشێن ئێزدیاتیێ بوینە، ئانكو بابەتێن وان د ئایینی بوینە. لێ هندەك تشتێن ئەفسانەیی كەتینە د ناڤ دا و مینا ئەدەب دهێنە ناسكرن، د هندەك كناران دا بابەتێن كەرامات و تشتێن سەرنجراكێش ژی تێدا دیاردبن، ئێزدییان هژمارەكا زۆر ژ ئەڤان سەرهاتی یان هەنە(٦٦).

**٢ - ٨. مسحابەت،** ژ لایێ تێگەهی ڤە ب واتایا شیرەتكرن دهێت؛ ئاخفتنەكا سەرزاری یا پەخشانكی یە، مینا سمینارەكێ یە، ژ شیرەت، دیرۆك، سەرهاتی، چیرۆك، ئەفسانە، قەول و بەیت، و ...هتد، ب هەڤرا، یا پێكهاتی یە. ژ بال زەلامێن ئۆلی یێن ئێزدییان ڤە ل جەژن، هەلكەفت و تازی یان دهێتە گۆتن. ئەڤ مسحابەتە چونكی گەلەك ژانرێن ئەدەبی بخوەڤە دگریت، لەورا ژی ژ لایێ بابەتی و ناڤەرۆكێ ڤە ژی ژ كۆمەكا بابەتان پێكدهێت، مینا بابەتێن: ئۆلی (ئێزدیاتی)، بیر و باوەر، رێ و رەسم، جڤاكی، ئەفسانەیی، بابەتێن رۆژانە و ... هتد.

ژ لایێ دیرۆكا پەیدابونێ ڤە و كا ئایا بەرهەمێن كیژان نڤیسەری بووینە؟، تشتەكی دیار نینە، هەر ژ بەر هندێ ژی سەرەرای ئەو ژانرەكا ئەدەبێ ئۆلی یە، هەروەسا مینا دەقەكا فولكلۆری ژی دهێتە ناسكرن. ژ بەر كو د سەرزاری بووینە و پتری یا وان خودانێ وان یێ دیار نەبویە. دیسان ژی قەول و بەیت و قەسیدە د ناڤ دا نە و خودانێ هندەكان ژ وان د دیارن، ئەڤە ژی ژ تایبەتمەندی یێن ژانرێ مسحابەتێنە و ب ڤان تایبەتمەندی یان خوە ژ ژانرێن دی جودا دكەت.

ئارمانجا مسحابەتێ پەروەردە و فێركرنە، بەرێ تاكێ ئێزدی د دەتە ئێزدیاتیێ، رێ و رەسمێن ئێزدیاتیێ، باشی یێ، دوركرن ژ بابەتێن جڤاكی یێن خراب، ئانكو وان ل گۆرەی ئێزدیاتیێ پەروەردە و فێر بكەت. زانیاری یان سەبارەت ئێزدیاتیێ، دیرۆك، خاس و بابچاكێن ئێزدیاتیێ بدەتە وان(٦٧).

# ژێدەر و پەراوێز


١. بنێرە: د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ ئێكێ، چاپا ئێكێ، دەزگەهێ سپیرێز - دهۆك، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٨٢.

٢. خدرێ سلێمان و خەلیلێ جندی، ئێزدیاتی لبەر رۆشنایا هندەك تێكستێد ئاینێ ئێزدی یان، چاپخانەی كۆری زانیاری كورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل٨٣.

٣. خەلات باعەدری، میتۆلۆجیا د تێكستێن ئۆلا ئێزدییان دا (قەولێ سەر مەرگێ وەك نموونە)، چاپا ئێكێ، دەزگەهێ سپیرێز، چاپخانا خانی، دهۆك، ٢٠٠٨، ل٥٥ - ٥٦.

٤. ب درێژی، بنێرە، د. خەلیل جندی رەشۆ، پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ ئێكێ، ل٧٦.

٥. بنێرە: داود مراد خەتاری، مەم و زین - سێ ڤەرسیونێن وێ ژ دەڤەرێن ئێزدییان، ژ وەشانێن ئەنستیتویا كەلەپوورێ كوردی، چاپا ئێكێ، چاپخانا مارۆ، سلێمانی، ٢٠١١.

٦. Binêre، ]Qadir H. Ido: Leyl û Mecrum, govara Laliş, jimare 16, Dihok, Tebaxa 2001, I. 226 - 216.

٧. گەلەك ژ سەرهاتی، چیرۆك و ئەفسانەیێن ئێزدییان سەرەرای هندێ ب پەخشانكی دهێنە گۆتن، لێ د ناڤا وان بخوە دا هۆزان

ژی هەنە و ب سترانکی ژی دهینە گوتن. ئانکو ژانرێ (هۆزان و پەخشان) تێکەلی ئێك دبن.

٨. ب درێژی سەبارەت ڤان سەرهاتی یان، بنێرە: رێسان حەسەن: لالش د سترانا دیرۆکی یا کوردی دا، چاپا ئێکێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٠، رێسان حەسەن بەستامی: سەرهاتی و غەریبیا خەنسێ و رەشۆ، چاپخانا هاوار، دهۆك، ١٩٩٩.

٩. ژ بۆ دیتنا هندەك ژ ڤان سەرهاتیێن گیان دوبارەبونێ، بنێرە: تارق شوکری خەمۆ: خۆناسین و کۆچەك زان (سەرهاتیێن دێرین)، چاپا ئێکێ، دەزگەهێ سپیریز، دهۆك، ٢٠٠٨ و کۆڤان خانکی، سێدەرا شێشمس، سەرهاتی و ئەفسانە ژ فۆلکلۆرێ ئێزدییان، چاپا ئێکێ، ژ وەشانێن ئەنستیتویا کەلەپوورێ کوردی، چاپخانا کەمال، سلێمانی، ٢٠١١.

١٠. سەبارەت ڤان چیرۆکان ب درێژی، بنێرە: تارق شوکری خەمۆ: خەون (سەرهاتیێن کەڤن)، چاپا ئێکێ، دەزگەهێ سپیریز - دهۆك، چاپخانا حەجی هاشم - هەولێر، ٢٠٠٦، کۆڤان خانکی: سێدەرا شێشمس. و ئدریس فارقینی: میسکێ زازا - چیرۆك و سەرهاتی ژ دەڤەرێن ئێزدییان، پرۆژەیا ئەنستیتویا کەلەپوورێ کوردی، چاپا یەکەم، چاپخانا کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢.

١١. ب درێژی سەبارەت گۆتنێن مەزنان، بنێرە: وەهبیا محەمەد سەعید یاسین: گۆتنێت پێشینان ل دەڤەرا بادینان، چاپا ئێکێ، چاپخانا هاوار، دهۆك، ٢٠٠٦ و کۆڤان خانکی: گۆتنێن مەزنان د هۆزانا جەگەرخوین دا - خواندنەکە ژ بۆ تەڤ دیوانێن وی، چاپا ئێکێ، چاپخانا ئازادی، دهۆك، ٢٠٠٨ .

* خەلك ل جهێ ناڤێ ڤی خوداوەندی ناڤێ خوداوەندێن جۆراوجۆر بکاردئینن و نفرینێن دی ژی وەسا. ئانکو نفرینێ هندەك بنیات هەنە لێ هەر کەسەك وەکی خوە بکاردئینیت.

١٢. یوسف بەری: نفرین، گۆڤارا لالش، ژمارە ٢١، حزەیران، دهۆك، ٢٠٠٤، ل١٧٨ - ١٧٩.

١٣. وارد بدر سالم: فلسفه النکته فی ثقافات الشعوب، http://magazine.imn.iq/articles/view.13965

* زۆربەیا ڤان سترانان ب تنێ ستران نینن، بەلکو د هەمان دەم دا داستان، سەرهاتی و چیرۆکن ژی، ب درێژی سەبارەت دەقێن ڤان سترانان، بنێرە: [رێسان حەسەن: لالش د سترانا دیرۆکی یا کوردی دا]، [رێسان حەسەن، شنگال وەك قوتابخانا سترانا فلکلۆری یا کوردی، چاپا ئێکێ، ژ وەشانێن رێڤەبەریا گشتی یا کاروبارێن ئێزیدیان، چاپخانا رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١١، خێری شنگالی: ل چیایێ شنگالێ قەبقەبا کەوێ نێرە (کۆمەکا تێکستێت فۆلکلۆرێ ئێزدییان)، بەرگێ ئێکێ، چاپا ئێکێ، ژ وەشانێن ئەنستیتۆیا کەلەپوورێ کوردی، چاپخانا سەردەم، سلێمانی، ٢٠١١، ل١١١ - ٣٧٣، خێری شنگالی: ل چیایێ شنگالێ قەبقەبا کەوێ نێرە، بەرگێ دووێ، چاپا ئێکێ، ژ وەشانێن ئەنستیتۆیا کەلەپوورێ کوردی، چاپخانا تەوار، سلێمانی، ٢٠١١، داود مراد خەتاری، هەر سترانەکێ چیرۆکەك ژ دەڤەرێن شنگال و شێخان، ژ وەشانێن ئەنستیتویا کەلەپوورێ کوردی، چاپخانا شڤان، سلێمانی، ٢٠١٠ و Christine Allison: Yezidi Sozlu Kulturu, ingilizce ve Kurtçeden Çeviren: Fahriye Adsay, Avesta Yayinlari, Bariş Matbaacilik, Istanbul, 2007.

١٤. بنێرە: د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، ل١٠٥٠ - ١٠٥٩.

١٥. چاڤپێکەفتنەك دگەل شێخ میرزایێ خەتاری (سترانبێژە و شارەزایێ ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ یە، ل سالا ١٩٣٠ ل گوندێ خەتارێ - ناحیا ئەلقوش ژ دایکبوویە)، ل پەرستگەها لالش - شێخان، ل رۆژا ٢٠١٢/٨/٣١.

١٦. ئەریك فرۆم: چەمکی مرۆڤ لای مارکس، و. بۆ عەرەبی: محەمەد سەید رەساس، و. بۆ کوردی: ئارام جەمال سابیر، چاپخانەی چوار چرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٦٥.

١٧. عەبدلعەزیز خەیات: سترانا فولکلۆری یا کوردی، گوڤارا لالش، ژمارە ١٢، دهۆك، کانونا دووێ ٢٠٠٠، ل٢٣٢.

١٨. Xêrî Bozanî: Payîzok, govara Laliş, jimare 9, Dihok, Şûbata 1998, l. 192.

١٩. بنێرە: د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، ل١٠٦٠ - ١٠٦٣.

٢٠. چاڤپێکەفتنەك دگەل شێخ میرزایێ خەتاری ل پەرستگەها لالش، ل رۆژا ٢٠١٢/٨/٣١.

٢١. Stranvan: chant d›atomne, govara Hawar (govareke rewşenbîrî bû, ji bal binemala Bedirxaniyan ve li 1932-1943 li derdikeft), jimare 31, Şam, tebaxa 1941, l. 15.

٢٢. حجی جعفر: قەفتەکا سترانێن فۆلکلۆری ل دەڤەرا بادینان، چاپا ئێکێ، وەشانێن ئەنستیتویا کەلەپورێ کوردی، چاپخانا ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٠ - ٣٣

٢٣. حجی جعفر: قەفتەکا سترانێن فۆلکلۆری ....، هەمان لاپەر.
٢٤. م. س. هەکاری: سەبەقە و زنجیرا رۆبارینا، گۆڤارا لالش، ژمارە ١٠، دهۆک، کانونا دووێ ١٩٩٩، ل١٤٦.
٢٥. د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، ل١٠٤٥.
٢٦. چاڤپێکەفتنەک دگەل شێخ میرزایێ خەتاری ل پەرستگەها لالش، ل رۆژا ٢٠١٢/٨/٣١.
٢٧. سەبارەت گرنگی یا ڤان قەولان د ئێزدیاتیێ دا، بنێرە: ریسان حسن: گرنگییا قەولان د ئێزدیاتیێدا، گۆڤارا لالش، ژمارە ٢٤، دهۆک، خزیرانا ٢٠٠٦، ل٨٣ - ٨٩.
٢٨. د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ ئێکێ، ل٨٣.
*. مینا قەولێ: تەختا، قەرەفرقان، ئافراندنا دنیایێ، زەبونێ مەکسور، شێخوبەکر و ...هتد.
٢٩. اسماعیل بادی: ئەلیف بێ یا ئێزدی یان، گۆڤارا لالش، ژمارە ١٠، دهۆک، کانونا دووێ ١٩٩٩، ل١٨٦.
٣٠. سدیق بۆرەکەیی: مێژووی ویژەی کوردی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٣٦.
٣١. معروف خزنەدار: کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا، چاپخانەی (الوفاء)، بەغدا، ١٩٦٢، ل٤٢.
٣٢. خێری بۆزانی و م. س. هەکاری: ڤەرستەک ژ تێکستێن دینێ ئێزدییانرا، پشکا دووێ، گۆڤارا لالش، ژمارە ١٧، دهۆک، کانونا دووێ ٢٠٠٢، ل١٣٩.
٣٣. چاڤپێکەفتنەک دگەل دەشتی شێخ زەیدین شەمسانی (قەولبێژە، ژ دایکبوینێ سالا ١٩٦٤ ل گوندێ خانکا کەڤن - دهۆک)، ل کۆمەلگەها خانکێ، ل رۆژا ٢٠١٣/٤/٢٠.
٣٤. معروف خزنەدار: کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا، ل٤٢.
٣٥. کۆڤان خانکی: کاغەزێن رەخنەیی - خواندنێن پێکهاتەیی - سیمانتیکینە ژ بۆ چەند تەکستەکێن ئەدەبی، چاپا ئێکێ، چاپخانا زانکۆیا دهۆک، دهۆک - ٢٠١٠، ل٢٦.
٣٦. هەمان ژێدەر، ل٢٦ و ٢٧.
٣٧. عزالدین سلیم باقسری: مەرگەهێ الایزدیة الاصل، التسمیة، المفاهیم، الطقوس، المراسیم و النصوص الدینیة، الطبعة الاولى، مطبعة (خەبات)، دهۆک، ٢٠٠٣، ل٢٩٠ - ٢٩١.
٣٨. خیری شنگالی: الایزدیە و مصحف (رۆژ) المقدس، الطبعة الاولى، مطبعة اسا، السلیمانیە، ٢٠٠٢، ص٣.
٣٩. رێسان حەسەن جندی و پیێن دی: ئێزدیاتی - وانە بۆ قوتابیێن ئێزدییان - رێزا دووێ ناڤنجی، ل٤٤.
*. سەبارەت دەقێ ڤی قەولی ب درێژی، بنێرە: [هەمان ژێدەر، ل٣٧ - ٤٤].
٤٠. Mîrza H. Dinnanyî، pirojek ji bo danana Êzidiyology, xeleka 2, govara Roj, jimare 4 - 5,Nîsana 1998, l. 17.
٤١. محمد بکر محمد: کێش و ریتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی، نامەی ماستەر، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٠، ل١٥٠.
٤٢. د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ ئێکێ، ل٨٣.
٤٣. ب درێژی سەبارەت ڤان بەیتان، بنێرە: بەدەلێ فەقیر حەجی: بەیتا سوبێ و هێڤاری، گۆڤارا بەیان (گۆڤارێکی ویژەیی و هونەری گشتی بوو، وەزارەتی راگەیاندن، دەزگای هاوکاری چاپ و بلاوکردنەوەی کوردی مانگی جارێك دەریدەخست)، ژمارە ١٥٤، نیسانی ١٩٨٩، ل٨٣ - ٨٨.
٤٤. ب درێژی سەبارەت ڤان بەیتان، بنێرە: بەدەلێ فەقیر حەجی: بەیتا بلبلا، رۆژناما بزاڤ (رۆژنامەکا هەفتیانە، سیاسی، گشتی بو ل بەغدا دەردکەفت)، ژمارە ٢١، یا رێکەفتی ١٩٨٩/١٢/١٩، ل٥.
٤٥. Bi dirêjî binêre: ]Bedel Feqî Hecî, Beyta Nisra, govara Laliş, jimare 26,Dihok, Nîsana 2007, l.71 - 78.
٤٦. چاڤپێکەفتنەک دگەل فەقیر حەجی فەقیر شەمۆ (ل سالا ١٩٢٣ ل گوندێ گابارا - قەزا شێخان ژ دایك بویە، پشکەکا مەزن ژ ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ ل سەر دەستێن وی هاتییە پارازتن، ئەو د ئەدەبیاتا ئێزدیاتیێ دا ژ کەسێن شارەزا یێن ئێکێ یە و نێزیکی ٨٠ سالان خزمەتا پەرستگەها لالش کریە)، ل مالا وی ل باعەدرێ، ل رۆژا ٢٠١٢/١٢/٢٧.
٤٧. چاڤپێکەفتنەک دگەل پیر شەرۆ پیر فەرحان (بابێ چاویشە - پلەیەکا جڤاتا رۆحانی یا ئێزدییانە، پیر شەرۆ ژ دایکبوینێ سالا ١٩٧٥ ل کۆمەلگەها مەهەتێ - شێخان)، ل پەرستگەها لالش، ل رۆژا ٢٠١٢/١٢/٢٨.

٤٨. Mîrza H. Dinnanyî: pirojek ji bo danana Êzidiyology, xeleka ٢, l. ١٧.
٤٩. ئەڤ تێکستە (چۆپان)ب شێوەیێ ئاخفتنا خەلکێ باشیك و بەحزانێ یە، ژ بۆ درێژی یا ڤی تێکستی، بنێرە: د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، ل٧٥٨ - ٧٥٩.
٥٠. خێری بۆزانی و م. س. هەکاری: ڤەرستەك ژ تێکستێن دینێ ئێزدییانرا، پشکا دووێ، ل١٣٨ - ١٤٩.
٥١. بنێرە: د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، ل٦٦٨ - ٧١٦، ل٧٥٤ - ٧٦١ .
٥٢. خێری بۆزانی و م. س. هەکاری: ڤەرستەك ژ تێکستێن دینێ ئێزدییانرا، پشکا دووێ، ل١٣٢.
٥٣. ب درێژی، بنێرە: خدرێ سلێمان و خەلیلێ جندی: ئێزدیاتی لبەر رۆشنایا...، ل١٣٢.
٥٤. د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ ئێکێ، ل٧٩.
٥٥. د. خليل جندی: ادعیه الایزیدیه، القسم الاول، مجله لالش، العدد ١، دهوك، خریف ١٩٩٣، ص٦٤.
٥٦. شەمۆ قاسم کەلۆ و بێن دی: ئێزدیاتی، وانە بۆ قوتابیێن ئێزدی یان، رێزا شەشێ ئامادەیی، چاپا سێیێ، چاپخانا (العداله)، بەغدا، ٢٠٠٤، ل٨٠.
٥٧. د. محەمەد بەکر: ئەدەبێ کوردێن ئیزدی پۆلکرن و هۆنەرسازی، پشکا ئێکێ، گۆڤارا لالش، ژمارە ١٢، دهۆك، کانونا دووێ ٢٠٠٠، ل١٩٦.
*. دوعایێن فەرز ئەڤن: دوعایا فەجرێ (بەری رۆژ دەرکەڤیت)، دوعایا سبێ (دگەل دەرکەفتنا رۆژێ)، دوعایا هێڤاری (دگەل رۆژئاڤا)، دەمێ ئێزدی پەروەستەی خوەدێ دبن و دوعایێن خوە دکەن؛ دەستێ راستێ د دانن سەر دەستێ چەپێ و ل همبەری کنارێ رۆژێ رادوەستن، چونکی رۆژ قوبلەتا ئێزدییانە و سەرێ خوە د چەمینن و دوعایا خوە دکەن، ئێزدی (دوعایێن خوە ب شێوەیەکی نهێنی دکەن) رەشید بەندەر: بەزدیاتی دینەك کەڤنە چ تێکەلی نە لگەل یەزید و نە لگەل شەیتان هەیە، دورماندوری کارتێکریە و ناسناما خوە پاراستییە، و: گازی، خەلەکا سێ، گۆڤارا گازی، ژمارە ٢٠، دهۆك، ١٩٩٦، ل١٠.، دەنگێ خوە ژی بلند ناکەن، ب وێ باوەرێ دەمێ ئەو دوعایێ دکەن ل کیدەرێ بن خوەدا ئاگەهـ ژێ هەیە. درویش حسو: الازداهیون الیزیدیون، الطبعة الاولى، اوست برویسن، ١٩٩٢، ص٨٦..
٥٨. ژ بۆ پتر پێزانینان سەبارەت جۆرێن دوعایان د گەل دەقێن وان، بنێرە: د. خليل جندي: ادعية الايزيدية، القسم الاول، ص٦٤ - ٨٠، د. خليل جندي: ادعية الايزيدية، القسم الثاني، مجلة لالش، العدد ٢ - ٣، دهوك، ١٩٩٤، ص١٣٨ - ١٥٤ و سەعید خەلیل عەسکەر: دوعایێن ئێزدییان، چاپخانا هاوار، دهۆك، ٢٠١١.
٥٩. د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ ئێکێ، ل٧٧.
٦٠. ب درێژی بنێرە: د. محەمەد بەکر: ئەدەبێ کوردێن ئیزدی پۆلکرن و هۆنەرسازی، پشکا ئێکێ، ل١٩٣ - ١٩٦.
٦١. معروف خزنەدار: کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا، ل٤٣.
٦٢. Tosinê Reşîd: Êzdiyatî, olek hê jî nenaskirî, çapa yekemîn, weşana Lîs, Istanbul, 2010, l. 233.
٦٣. (د. م): نشید وطني، http://ar.wikipedia.org
٦٤. سرودا شەرفەدین مینا سرودەکا ملی یە، هەر دەمێ تەمبورڤانێ ئێزدی تەمبورێ لێ دخت ل پێشی یێ دەست ب گۆتنا وێ سرودێ دکەت. رێسان حەسەن: شنگال وەك قوتابخانا سترانا فلکلۆری یا کوردی، ٢٠١١، ل١٦]، و سەبارەت دەقێ ڤێ سرودێ ژی، بنێرە: Îvan Derwêş Casim: Sirûda Şerfedîn bi zimanê Mûzîkî, govara Laliş, jimare 13, Dihok, Tebaxa 2000, l. 222 - 223.
٦٥. بنێرە: کۆڤان خانکی: سرودا هەیی رابە سولتان رابە، گۆڤارا مەحفەل، ژمارە ٩، دهۆك، ٢٠١٣، ل٣١ - ٣٢.
٦٦. ژ بۆ دیتنا هندەك ژ ڤان سەرهاتی یان، بنێرە: تارق شوکری خەمۆ: خەون، تارق شوکری خەمۆ: خۆناسین و کۆچەك زان، خێری شنگالی: ل چیایێ شنگالێ قەبقەبا کەوێ نێرە، بەرگێ ١، ل١٥ - ١٠٨ و کۆڤان خانکی: سێدەرا شێشمس، ٢٠١١.
٦٧. بنێرە مسحابەتان، د. خەلیل جندی رەشۆ: پەرن ژ ئەدەبێ دینێ ئێزدییان، بەرگێ دووێ، ل٧٦٥ - ٨٤١.

# رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان (دەسپێك، وەرار و ئاستەنگ)

**د. نعمت الله حامد نهێلی**
**زانكۆیا دهۆك- كۆلێژا زانستێن مرۆڤایەتی**

رەخنا ئەدەبی دناڤ ئەدەبیاتا جیهانی دا زۆرا كەڤنارە. وەكو زۆربەی زانستێن دیتر، رەخنا ئەدەبی ژی ل یونانێ دەسپێكریە. (ل دەسپێكێ رەخنە ل یونانێ ب شێوەكێ سادە دیاربوویە. پاشی هێدی هێدی پێشكەفتن و گهورین بسەردا هاتینە تاكو ل سەردەستێ ئەرستۆی شێوەیێ تیورەكا دیار بەرچاڤ بووی. دوی دەمیدا هندەكا رەخنە وەكو راڤەكرنەك(تفسیر) بۆ تێكستان بكارئینایە و هندەكان ژی وەكو هەلسەنگاندنەك ل دووڤ هندەك پیڤەرێن جڤاكی ورەوشتی بۆ تێكستان تەماشەی رەخنێ كریە)[1]. ئانكو رەخنا ئەدەبی ژ رامان و دیتنەكا سادە دەسپێكرییە و پاشی رامانێن بەرفرەهتر و بیاڤێن جوداتر بخۆڤەگرتینە.

## * تێگەه و پێناسێن رەخنا ئەدەبی:

بێگومان دديرۆكێ دا گهورینێن زۆر بسەر تێگەهێ رەخنا ئەدەبی دا هاتینە و ب گەلەك شێوەیان و دكوژێن جودا جودا را رامان بۆ هاتینە دەسنیشانكرن. بۆ نموونە دژێدەرەكی دا هاتییە كو:(رەخنە(Criticism) هۆنەرێ راستڤەكرنا بەرهەمێن ئەدەبی و هۆنەری یە و شروڤەكرنا وایە ل دووڤ بنیاتەكێ زانستی. و ئەگەر ئەم بێژین (litearary criticism) رامانا وێ دبیتە ئەو رێك و شێوازێن بكارهاتی ژبۆ شروڤەكرنا بەرهەمێن ئەدەبی و پولینكرنا وان و جوداكرنا بەرهەمێن باش ژ یێن خراب، داكو لایەنێن باش و خرابێن بەرهەمان بهێنە دەسنیشانكرن ل دووڤ هندەك تێبینی و داتایێن هویر كو هەلسەنگاندنا بەرهەمان ل دووڤ وان دهێتە كرن و بریار ل سەر دهێتە دان)[2]. ئەڤجا ل دووڤ ئاستێ روشنبیریێ رەخنەگری و شێوازێ هۆنەریێ بەرهەمی ئەو هەلسەنگاندنە دهێتە ژێك جوداكرن. هەروەسا سەردەم و قۆناغ ژی كاریگەریێ ل سەر شێوازێ خواندنا بەرهەمان دكەت و جۆرێ خواندنا وان دەسنیشان دكەت. لەورا دشێین بێژین پێناسەیێن هەمەجۆر بۆ رەخنا ئەدەبی هەنە و ئەڤەژی دەولەمەندیا رەخنا ئەدەبی دیاردكەت ژلایەكیڤە و ژ لایێ دیتر ژی مەودا و بیاڤێ بەرفرەهێ وێ ژی بەرچاڤ دكەت. بۆ نموونە (رینیە ویلك) دبێژیت:(رەخنە یا پێكهاتییە ژ وەسفكرن و شروڤەكرن و پێداچوون و هەلسەنگاندن و بریاردانێ ل سەر بەرهەمەكێ ئەدەبی ل گەل دیاركرنا بنەمایێن ئیستاتیكی و گەنگەشەكرن ل سەر تێگەهان)[3]. دڤێ پێناسێ دا چەند كریارەك بۆ رەخنا ئەدەبی هاتینە دەسنیشانكرن ئەوژی:(وەسفكرن، شروڤەكرن، هەلسەنگاندن، بریاردان، گەنگەشەكرن). و ب دیتنا رینیە ویلك

پێدڤیە ئەڤ هەمی کریارە ژ لایێ رەخنەگریڤە ل سەر تێکستی بهێنە ئەنجامدان تاکو بشێین کارێ وی ب رەخنا ئەدەبی بناڤ بکەین. دیسا (ئوسکار وایلد) دبێژیت: رەخنە داهێنانەکە ل سەر بەرهەمێ ئەدەبی دهێتە کرن و وی بەرهەمی دکەتە دەسپێك و ژێ دەربازدبیت داکو بەرهەمەکێ دیترێ نوی ژێ بئافرینیت)[٤]. ئەڤ نڤیسەرە رەخنا ئەدەبی وەکو داهێنان دهەژمێریت و ب وی مەرجی کو دڤێت ل سەر بەرهەمەکێ ئەدەبی بهێتە ئەنجامدان و تشتەکێ نووتر ژوی بەرهەمی بئافرینیت. ژلایەکێ دیتر هاتییە گۆتن کو:(رەخنە ورەخنەگری بریتییە لە ناساندنی چاك و خراپ و جیاکردنەوەی سەر و ناسەرە لە هەموو هونەرەکاندا...لە رەخنەی ئەدەبی دا جێگەی بیروبوچوونی ناتەباو جیاوازی تێدا دەبێتەوە)[٥]. ئەڤەژی وێ چەندێ دگەهینیت کو کریارا بریاردانێ درەخنێ دا بهێتە ئەنجامدان. لێ ل دووڤ تیۆرێن نوو یێن رەخنەیی ئەڤ یەکە نەمایە و بریاردان نەهێلایە وەکو مەرجەك بۆ رەخنا ئەدەبی. و دپێناسەکا دیتر دا هاتییە کو:(رەخنەی ئەدەبی لەسەر زەمینەی دەقی ئەدەبی کاردەکات و لە سیما و پێکهاتەی رەگەزە هونەرییەکان دەکولێتەوە)[٦]. ئەڤەژی دسەلمینیت کو فەرە کارێ رەخنەگرتنێ ژبۆ دیارکرنا لایەنێن هونەریێن بەرهەمی بهێتە تەرخانکرن. و دژێدەرەکێ دیتردا بڤی رەنگی سنوور و ئەرکێ رەخنا ئەدەبی هاتییە دەسنیشانکرن ئەوژی:(رەخنەی ئەدەبی کارێکی خاوەن بەرنامەیە کە هەولی ئەوە دەدا بەرهەمێکی ئەدەبی بخوێنێتەوە و لێکبداتەوە و راڤەی بکا و هەلیسەنگێنێ)[٧] دڤێ پێناسێ دا بەرنامە دارێژی وەکو مەرج درەخنەگرتنێ دا هاتییە دیارکرن و ل سەر رەخنەگری مەرجە ل دووڤ پلانەکا دەسنیشانکری بەرهەمێ ئەدەبی راڤە بکەت. ئانکو فەرە رەخنا ئەدەبی یا دویر بیت ژ بەرەللایێ.

ژبەر بەرفرەهییا ئەوان مەودایێن رەخنا ئەدبی گرنگییێ پێ ددەت، پێناسەیێن وێژی دبەرفرەهـ و هەمەرەنگن. بۆ نموونە هاتییە گوتن کو(رەخنە کریارەکا پەیوەندیکرنێ یە و ئامرازێ وێ یێ سەرەکی زمانە.)[٨] هەلبەت ئەو زمانێ رەخنەژی پێ دهێتە نڤیسین یێ جودایە ژ زمانێ ئافراندنا تێکستێن ئەدەبی یان زمانێ رۆژانە، لەورا هاتییە گوتن کو:(زمانێ رەخنەیی زمانێ شروڤەکرنێ یە[٩].(ئانکو پێدڤییە رەخنەگری شیانێن شروڤەکاری هەبن و ژ لایێ دارێتنا گوتارا رەخنەیی ژیڤە یێ شەهرەزا بیت دزمانی دا. و هەر ژبەر ئەوێ پەیوەندییا دناڤبەرا رەخنێ و تێکستێ ئەدەبی دا هەی هاتییە گوتن کو:(پەیوەندییا دەقێ رەخنەیی ب یێ ئافراندیڤە پەیوەندییا دووڤەلانك و دووڤچووییە، چونکی دەقێ ئەدەبی پێدڤیە ئارمانج و گەوهەرێ رەخنەیێ بیت.)[١٠] ب ڤی رەنگی بۆ مە دیاربوو کو رەخنا ئەدەبی ب گەلەك شێوەییان هاتییە دیتن و ب تێگەه و پێناسێن جودا هاتییە پەیرەوکرن. ئەڤەژی گروڤێ وەرار و پێشڤەچوونا رەخنا ئەدەبی یە د مێژوویا ئەدەبیاتناسییا جیهانی دا.

## ※ رەخنا ئەدەبی و ئەدەبیاتا کوردی:

رەخنا ئەدەبی وەکو لقەکێ گرنگێ ئەدەبیاتناسیێ گرنگیدایی فاکتەرێن دەرەکی و ناڤخۆیی یە. ئانکو هوکارێن بابەتی و خۆدی کاریگەرێ ل سەر شێوە و سەمتا رەخنەیی دکەن ل هەموو سەردەم و دناڤ هەموو مللەتان دا. رەخنا ئەدەبی گرێدایی دەقێ ئەدەبییە و ل سەر رووبەرێ وی کاردکەت، دەرئەنجامێ پێشکەفتن و وەرارا وی یە. د ئەدەبێ کوردی دا وەکو ئەدەبێ مللەتێن دی شعرێ بەری ژانرێن دیتر جهێ خوە گرتییە، لەورا سەرهلدان و پەیدابوونا رەخنێ ژی دڤی بواری دا زووتر بوویە ژبوارێن دی. (رەخنەییا کوردی مێژوویەکا دوور و درێژ نینە، لەورا ژی هێشتا ئەم نەبووینە خودان کەلتوورەك و میراتەکێ رەخنەییێ باش.)[١١] ژبەرهندێ ئەگەر تەماشەی ڤەکۆلینێن رەخنەیێن کوردی ژێ بکەین دێ ئەوێ بێ سەربوری و کێم شارەزاهییا دناڤدا بینین و هەستپێبکەین. ل (کوردستانا ئیراقێ) (رەخنەی ئەدەبی وەکو زۆر هونەری ئەدەبی تر لە باوەشی رۆژنامەو و کۆڤار و لەگەل بلاوبوونەوەی چاپ و چاپەمەنی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا گەشەی کرد و جەگەری کرد[١٢]

ئانكو بنەمایێن تیووری یێن رەخنا ئەدەبی درەنگ گەهشتینە مە و ئەدیبێن كوردێن دەڤەرا بادینان ژی هەتا سالێن هەفتییان ژی رەخنا ئەدەبی ل دووڤ میتۆد و بنەمایێن وردبین ناس نەكرییە و دنڤیسینێن خوەدا بكارنەئینایە. هەلبەت ئەگەر ئەم تەماشەی دیرۆكا رەخنا ئەدەبی بكەین دێ بینین كو وێ پەیوەندی یا ب سێ رەهەندێن سەرەكیڤە هەی. ئانكو(رەخنا ئەدەبی مفای ژ سێ سەروكانییان وەردگریت ئەوژی: كەساتیێن بەهرەدار، دیرۆكا پرشەنگدار، ئازادییەكا بێ سنوور)[13]. و ل دووڤ ئەڤێ گوتنێ، ل دەڤەرا بەهدینان هەتا چەرخێ نوزدێ ژی ئەگەر مە كەساتیێن بەهرەدار ژی هەبن ، لێ مە دیرۆكەكا پرشەنگدارا ئەدەبی نەبوویە(ب تنێ دبیاڤێ شعرێ دا مە هندەك بەرهەم هەبووینە)، هەروەسا ئازادی ژی ل ئەڤێ دەڤەرێ هەردەم ل ژێر گەفێ بوویە و ئەدیبێن مە نەشیایینە ئازادانە هزربكەن و ئازادانە رەخنێ ژی پەیرەوبكەن. لەورا رەخنا ئەدەبی ژی ل دەڤەرێ درەنگ سەرهلدایە. دئەنجام دا و ل دووڤ هندەك بۆچوونان دبیاڤێ رەخنەیی دا ئەم دشێین سێ جورێن مللەتان دەسنیشان بكەین ئەوژی: (جورێ ئێكێ ئەو جڤاك و مللەتن یێن كو دیرۆكا خۆیا هزری دا چ جۆرە رەخنەیەك بكارنەئینای و ناس نەكری، چونكی وان چ شیانێن میتودگەریێ ل دەف نینن. جورێ دوێ، ئەو جڤاك ومللەتن یێن كو د قۆناغەكێ ژ قۆناغان یان سەردەمەك ژ سەردەمان هندەك سەرقەلەمكێن رەخنەیی یان هندەك ئامازێن رەخنەیی بكارئینایین. لێ ئەو نەگەهشتینە وی رادەی تاكو ژ جورێ دی یێ جڤاكان جودا ببن و بەرەف دانانا میتودان ڤە چووبن. جورێ سیێ ژ جڤاك ومللەتان ئەون یێن كو ل دووڤ سستەم و میتودان كاردكەن و هزردكەن، و ئەو میتودگەرییە دبیتە نیڤشكێ راماندن و ئاراستەكرنێن وان یێن هزری و گەرەنتیا پێشڤەچوونا وان دكەن، هەر ئەڤ جڤاكەنە یێن كو نوكە سەركێشیا جیهانێ دكەن ژ لایێ داهێنان و زانیارییانڤە)[14]. لەورا ئەگەر ل دووڤ پیڤەرێن بۆری و ل دیڤ ئەڤێ بوچوونا بەری نوكە ئەم جڤاكێ دەڤەرا بەهدینان ب پیڤین یان پولینبكەین، دێ بینین كو ئەم ژ جورێ دوێ یێ جڤاكاینە ئەو جڤاكێ كو دهندەك قۆناغ یان سەردەمێن جودا جودا دا هندەك سەرقەلەمكێن رەخنەیی هەین. و ئەم نەشیایینە ل دووڤ میتۆدێن دیاركری رەخنا ئەدەبی پەیرەوبكەین. ئانكو جڤاكێ مە نە ژوان جڤاكایە یێن كو سستەماتیك و ل دووڤ پلانا كاردكەن و دارێتنا میتۆدان ب هزرێن خوە یێن خومالی بكەت.

هەرچەندە د بەرهەمێ بەهرا پتریا شاعرێن كلاسیك دا ئامازێن رەخنەیی هەنە. زۆریەی وان ژی تێكەهێ رەخنێ ب نەقس و كێماسیێ ڤە گرێدایە. جارجار ژی هندەك تێبینیێن رەخنەیی دبەرهەمێن خۆدا ئاراستەكرینە كو گرێدایی ئاڤاكرنا بەرهەمان بوون. لێ رەخنا كوردی دبیاڤێ پەخشانێ دا دیارنەبوویە، هەتا كو پەیدابوونا چاپەمەنیێ و بەلاڤبوونا رۆژنامە و گوڤاران. ئانكو ل دەسپێكا چەرخێ بیستێ و ب تایبەت پشتی شۆرەشا (١٤)ێ تەمووزێ یا سالا (١٩٥٨)ێ دەلیڤە خۆش بوو كو ئەدیب و نڤیسەرێن كورد پەرتووكێن رەخنەیی بنڤیسن. دكرمانجییا خوارێ دا چەندین بەرهەمێن رەخنەیی پەیدابوون. ئەڤەژی هاندەرەكێ رێخۆشكەر بوو كو رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان ژی سەرهەلبدەت لێ ئەو دەسپێكە یا سادە بوو.

## رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان:

دەڤەرا بەهدینان وەكو پارچەك ژ باشووری كوردستانێ ب ئەوان پێشهاتێن دەردووری خۆ كاریگەر بوویە. ئەدەبیاتا ئەڤێ دەڤەرێ ژی ب ئەدەبیاتا كوردی ب گشتی و یا جیهانی كاریگەر بوویە. و سەرهلدانا رەخنا ئەدەبی دناڤ هەر ئەدەبیاتەكێ دا یا گرێدای بە ب سەرهلدانا ئەدەبیاتا وی مللەتی ڤە، ئانكو پێدڤییە ل دەستپێكێ بەرهەمێ ئەدەبی پەیدا ببیت و پاشی رەخنا ئەدەبی ل سەر وی بەرهەمی دێ پەیدا بیت. دناڤ مە كوردان دا، حوجرە و مزگەفتان رۆلەكێ ئێكجار مەزن هەبوویە بۆ پەیداكرنا هەستەكا رەخنەیی ل دەف ئەوان كەسێن ل وان مزگەفتان دخواند و ژێ دەردچوون. لەورا ئەو هەستا رەخنەیی یا ل دەف وان

هەی ب هاریكاریا زانستێن وان خواندین بووینە هۆزان و هۆزانێن رەخنەیی ژێ دروستبووینە. ئانكو ئاماژەیێن دەسپێكێ یێن رەخنەیی ب شعر هاتینە دەربرین، ئەوژی ل ژێر كارتێكرنا ووتارێن رەخنەیێن حوجرە و مزگەفتان بوویە، دیسان ژ ئەگەرێ هەبوونا كۆچك و دیوان و دیوەخانا ژی بوویە، كو بەهرا پتریا جاران سوحبەت و دانوستاندنێن ل وان جها رەخنە و رەخنەگرتن بوون ژدیاردێن هەمە جۆرێن گرنگیدایی ژیانا رۆژانەیا وی سەردەمی ڤە. ئەڤ هەردو هۆكارە بیوونە ئەگەر كو جۆرەكێ رەخنێ پەیدا ببیت و دشێین بێژین رەخنە بوو ل دیاردێن جڤاكی، ئایدۆلۆژی و كێم جاران هندەك شاعران دوان دیوانان دا رەخنە ب شعر ل هندەكێن دیتر دگرت.

ئەگەر ئەم بەرهەمێن بابا تاهرێ هەمەدانی دانین ئێكەم دەقێ نڤیسی یێ ئەدەبێ كوردی، دێ دیرۆكا ئەدەبیاتا كوردی ڤەگەریتە بەری پتر ژ (١٠٠٠) سالان. نەخاسمە دڤێت بزانین كو ئەو شێوازێ هۆنەریێ بەرهەمێ بابا تاهرێ هەمەدانی پێ هاتییە نڤیسین، شێوازەكێ هۆنەریێ بەرز بوو، ئەڤە ژی بەلگەیە كو رەخنە ل وی سەردەمی هەبوویە، چونكی بهێزیا بەرهەمی نیشانە بۆ هەبوونا رەخنا ئەدەبی. لێ چ بەلگە مەنینن بۆ رەخنا ئەدبی یا كوردی كو ل وی سەردەمی ب پەخشان هاتبیتە نڤیسین. د ئەدەبیاتا كرمانجی ژی دا بەرهەمێن زۆر دەولەمەند هاتینە نڤیسین هەر ژ جزیری بگرە تاكو دگەهییە خانی و فەقیێ تەیران و ...هتد. لێ پشتی هنگی وەكو ڤەقەتیانەكێ چێبوویە یانژی بێژین بەرهەم بەرەف زمانەكێ جوداتر هاتینە نڤیسین. و بەرهەمێ (مەلا مەنسورێ گێرگاشی، كو دسەدێ شازدێ زایینی دا ژیایە) باشترین نموونە یە بۆڤێ گۆتنا مە.

(ل سەدسالا نوزدێ زایینی گوهورینەكا بەرچاڤ بسەر ئەدەبێ كرمانجی دا هاتییە. ئەڤ گهورینە دەرئەنجامەكێ سروشتی بوو بۆ وان گهورینێن سیاسی و جڤاكی یێن كو بسەر مللەتێ كورد دا هاتین...شعرا كرمانجی ل دەسپێكا سەدسالا نوزدێ ژ لایێ ناڤەروك و روخسارێ ژی ڤە چاڤلێكرنەكا روی ب روی بوو بۆ شعرا شاعرێن قویناغا داهێنانێ(ئانكو قویناغا شاعرێن مەزن وەكی جزیری، خانی و...هتد). ئەڤ كارتێكرنە ب روهنی دبەرهەمێن شاعرێن بەهدینان دا دیاربوویە. بۆ نموونە كارتێكرنا جزیری ل سەر بەرهەمێ محەمەد تەیار پاشایێ ئامێدی و شێخ نوورەدینێ بریفكی و... هتد یا دیارە. پشتی ئەو گهورینێن مەزن ئەوێن بسەر نەخشەیێ سیاسی یێ كوردستانێ دا هاتی و هەڤركییا میرێن بۆتان ل گەل دەولەتا ئوسمانی، هەستا نەتەوەیی ب شێوەكێ بەرچاڤ دناڤ كوردان دا بەلاڤبوو و ب تایبەت دناڤ شاعر و روشەنبیران دا. هژمارەكا مەزنا رەوشەنبیر و زانایێن كورد دەست دا نڤیسینێ ب زمانێ خۆ یێ دایكێ. ئانكو زمانێ شعری بەرەف زمانێ خومالی و بژین ژ پەیڤێن بیانی و بەرەف سڤككرنێ ڤە چوو. دیسا ناڤەروكا شعری ژی بەرەف روهنی یێ ڤەچوو و دەست ژ وێ ئالوزیا بەری هینگێ بەردا...دیسان بەلاڤبوونا زانستێن نوی دناڤ تەخا رەوشەنبیردا و پەیدابوونا چاپخانەیان و تێكەلییا ئەدیب و رەوشەنبیرێن كورد ل گەل یێن بیانی و پەیدابوونا دەستەیەكا نوی یا شاعرێن كرمانج...بوونە ئەگەر كو فورمێ شعری ژ فورمێ كەڤن دوور بكەڤیت و داهێنا شعری بەرەف سەمتەكا نووتر ڤە بچیت...دویر ژ شعرێ و شاعران، ژنیڤا سەد سالا نوزدێ هێرڤە پەخشانا كوردی ژی زێدە وەراركر... ئێدی ئەدیب و زانایێن كورد زمانێ خۆ بۆ بابەتێن ئەدەبی و سیاسی و جڤاكی و دیرۆكی ژی بكارئینا. مەلا مەحموودێ بایەزیدی باشترین نموونا وەرارا پەخشانا كوردیە. و پشتی رۆژنامە و كۆڤار ب زمانێ كوردی دەركەفتین، بزاڤا پێشخستنا پەخشانا كوردی ئێكجار خورت بوو[15]. لێ دڤێت ئەم ب وێ راستیێ قایل بین كو تا سالێن هەفتییان ژی مە رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان نەبوویە(ب وی تێگەهێ جیهانی و ل دووڤ میتۆدێن بەرنیاس). هەلبەت دوێ قۆناغا دیڤرا ژی دا ئانكو هەر ژ سالێن هەفتییان و هەتا سەرهلدانێ ژی ئەو بزاڤێن شەرمینوك و ئەو بابەتێن دهاتنە نڤیسین ژی زۆر جار دچوونە دخانا مێژوویا ئەدەبی و تیورا ئەدەبیدا. ئانكو تارادەیەكێ

ئەدیبێن کوردێن دەڤەرا بەهدینان هەتا سەرهلدانێ ژی نەشیابوون ئەوان سنووران ژێکجودا بکەن ئەوێن دکەفتنە دناڤبەرا ئەوان هەرسێ لایەنان دا. لەورا دبەرهەم و نڤیسینێن وان ژی دا ئەو تێکەلییە دهێتە دیتن. لێ گومان تێدا نینە کو رەخنا ئەدەبی ل دەف ئەدیب و رەخنەگرێن کرمانجا خوارێ(ئانکو ل باژێرێن دی یێن هەرێما کوردستانێ) بەری رەخنا دەڤەرا بەهدینان سەرهلدایە. و هەر ل ژێر کاریگەریا بەرهەمێن وان و یێن وەلاتێن دیتر، ئەدیب و نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان ژی بەرەف نڤیسینا گوتارێن رەخنەیی چوون. ل دەڤەرا بەهدینان سالێن بەری هەفتییان ژچەرخێ بوری وەکو قۆناغەك ژبۆ بەرهەمئینانا تێکستێن ئەدەبی دهێنە دەسنیشانکرن. ئانکو دوان سالان دا بەهرا پتر نڤیسەرێن دەڤەرێ بزاڤ دکر بەرهەمان بنڤیسن و فلکلورێ کوردی ل دەڤەرێ خرڤەکەن.

پشتی ئەڤێ قۆناغێ و ل سالێن هەفتییان و هێرڤە چەند رۆژنامە و کۆڤار ل دەڤەرا بەهدینان دەرکەتن و بوونە رێخۆشکەرەك کو ئەدیب و نڤیسەرێن دەڤەرێ بەرهەمێن خوە تێدا بەلاڤ بکەن. ئانکو هەبوونا ئەوان رۆژنامە و کۆڤاران وەکو پرەکێ بوون ژبۆ دروستکرنا پەیوەندیێ دناڤبەرا نڤیسەر و خواندەڤانان دا. و ژ لایێ دیتر هاندەرەك بوون ژبۆ پێکگهورینا راو بۆچوونێن رەخنەیی دناڤبەرا نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان دا. هەرچەندە ئەدیبێن دەڤەرا بەهدینان نەبەس مفا ژوان رۆژنامە و کۆڤارێن ب گرمانجی ل دەڤەرێ دەردکەڤن وەردگرت، بەلکو ئەوێن ب دیالیکتا کرمانجیا خوارێ ژی دەردکەفتن دیسان دەلیڤەکا دیترا بەلاڤکرنێ بوون بۆ ئەدیبێن ئەڤێ دەڤەرێ. دشێین ب ڤی رەنگی ئاماژێ بدەینە ئەوان رۆژنامە و کۆڤارێن دوێ قۆناغێ دا دەرکەفتین. ئەوژی:(هاوکاری، بەیان، رۆشنبیری نوێ، رۆژی کوردستان، رامان، چیا، هیڤی، پەیڤ خولا ئێکێ، مەتین خولا ئێکێ، رێیا سەرکەفتنێ، گازیا خویندکار ولاوان، دەنگێ مە...هتد)[16]. هەبوونا رۆژنامەگەریا کوردی هاندەرەکێ سەرەکی بوو ژبۆ پەیدابوونا رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان. دبیاڤێ رەخنەیی دا دسالێن دناڤبەرا (١٩٧٠ و تا ١٩٨٠) ێ دا چەند بزاڤەکێن شەرمینۆك هاتنە کرن نەخاسمە کو دوان سالان دا بەرهەمێن ئەدیبێن مە ل دەڤەرێ ب رێکا چاپەمەنیێ و بزاڤا رۆژنامەگەریێ کەتبوونە بەر دەستێ خویندەڤانان. بۆ نموونە ئەم دشێین هندەك ژ ئەوان نڤیسینێن رەخنەیی دەسنیشان بکەین ئەوێن دوان سالان دا هاتینە بەلاڤکرن وەکو:(فەیسەل موستەفا) بابەتەکێ رەخنەی ل سەر دیوانا(بویکا بەهدینان) یا هۆزانڤان (سالح گولی) نڤیسی. و ژ لایێ روخسار و ناڤەروکێن بەرهەمی تێبینیێن خوە دیارکربوون. و هۆزانڤان (سالح گولی) دبابەتەکێ دا ل ژێر ناڤێ(بویکا بەهدینان و بەرسڤەکا پێدڤی) بەرسڤدانەکا رەخنەیی ئاراستەی گوتارا (فەیسەل موستەفای) کربوو. دیسا (ریبار عەبدورەحمان) بابەتەکێ رەخنەیی ل سەر هۆزانێن(فەیسەل موستەفا) نڤیسیە و تێبینیێن خوە یێن رەخنەیی ئاراستەی دیوانا وی کرینە. نڤیسەرەکێ دیتر ژی ب ناڤێ(ئەمین) بابەتەك ل سەر ناڤەروکا دیوانا (بویکا بەهدینان)نڤیسیە. هەروەسا هۆزانڤان (عبدالرحمن مزویری) بابەتەك ل سەر هۆزانێن(ئەنوەر مایی) بەلاڤکریە و هۆزانێن وی ژ لایێ ناڤەروکێ و کێش وسەروایێڤە ئێخستینە بن تیروژکێن رەخنەیی[17]. دئەڤان نموونان دا دیارە کو بەهرا پتر ئەو نڤیسینە رەخنەیەکا سەرپێ بوون و ڤەکۆلینێن وردبین و بسپوریانە نەبوون . بەلکو تێبینی و دیتنێن تایبەتێن وان کەسان بوون ل سەر ئەوان بەرهەمان کو پەیرەویا چ میتودەکا رەخنەییا بەرنیاس تێدا نەهاتییە کرن. ئانکو بەهرا پتر دانەنیاسینا بەرهەمان بوون و هندەك بۆچوون بوون ل سەر ناڤەروکا وان بەرهەمان. لەورا دشێین وان بەرهەمان وەکو دەسپێکەك بهەژمێرین بۆ پەیدابوونا هەستا رەخنەیی ل دەف نڤیسەران. لێ ژبەر نەبسپووریا وان نڤیسەران، ئەو هەستا رەخنەیی یا هەیی ژی کەتبوو ل ژێر کونترولا هەست و سوزان و نڤیسینێن وان ژ بابەتیبوونا رەخنەیی دووردکەفتن.

پشتی سالێن هەفتیان هێدێ هێدی هندەك خواندنێن رەخنەیی بۆ هندەك هۆزانان یان هندەك دیوانێن شعری یانژی هندەك چیرۆك و بابەتێن

فلكلۆری هاتنە نڤیسین. دناڤبەرا سالێن (١٩٨٠-١٩٩١)ێ دا بابەتێن رەخنەیی ژ لایێ رێژێ ڤە زوورتر لێهاتن و تێبینیێن رەخنەگران ژی بهێزتر لێهاتن. ئەم دشێین هندەك نموونان ژ ئەوان گوتارێن رەخنەیێن دوان دەهـ سالان دا بەرچاڤ بكەین داكو ب رێكا وان سروشتێ ئەوان بابەتێن رەخنەیی دەسنیشان بكەین بۆ نموونە:

(ئدریس محەمەد عەلی) بابەتەك ل ژێر ناڤێ (زڤرینەك) ل سەر هۆزانەكا دیوانا (فەیسەل موستەفا) ب ناڤێ(پەزكو بنف) نڤیسیە و ژ لایێ ناڤەروكێڤە ل سەر راوەستیایە و هندەك ئاماژە داینە سەر كێشا وێ هۆزانێ ژی. دیسا هەمان نڤیسەر بابەتەكێ دیتر ل ژێر ناڤێ(یامن گوتی وتە نەگوتی دترازیا رەخنێ دا) ل سەر دیوانا هۆزانڤان(تێلی ئەمین) نڤیسیە و ژ لایێ ناڤەروكێ و زمانی ڤە تێبینیێن خوە دیاركرینە. (محەمەد ئەمین دوسكی) بابەتەك ل ژێر ناڤێ(پشتەڤانیا چینا رێنجبەر و ژار دشعرا كوردی دا) ل سەر هۆزانێن هندەك هۆزانڤانان نڤیسیە. (د.نافع ئاكرەیی) بابەتەك ل ژێر ناڤێ(ئەدەبی كوردی چون بووە و چون دەروا؟)نڤیسیە. وی دئەڤی بابەتی دا ئەدەبیاتا دەڤەرێ سەر چوار قۆناغان دابەشكریە ئەوژی:(قۆناغا كلاسیك - سەدێ ١٣ تا دوماهیا سەدێ ١٧ و١٨، قۆناغا وەستان و بێ ڤین- سەدێ١٨ تا دوماهیا سەدێ نوزدێ، قۆناغا چاڤلێكرن و نیشتیمانپەروەری- ژ سالا ١٨٩٨ تا ١٩٥٨، قۆناغا نوی و نهۆ یا ئەدەبێ كوردی- ژ ١٩٥٨-١٩٨٢). و هندەك كێماسی و تێبینیێن خوە ژی ل سەر قۆناغا دووماهیێ دیاركرینە. (سەكڤان عەبدولحەكیم) بابەتەكێ رەخنەیی ل سەر دیوانا(تە چ ڤیا و من نەئانی) یا هۆزانڤان(خلیل دهۆكی) نڤیسیە و ژ لایێ ناڤەروكێ و دارێتنێ و زمانی ڤە ل سەر راوەستیایە. هەمان نڤیسەر بابەتەكێ دیتر ب ناڤێ (ل خەلكی تەحلێ ل من شرینێ) ل سەر دیوانا هۆزانڤان(عەبدورەحمان مزویری) نڤیسیە.دیسا بابەتەكێ دیتر ل سەر هۆزانەكا هۆزانڤانا كچ(هیڤی بەرواری) ل ژێر ناڤێ (سەیرانەك دناڤ هۆزانەكا هیڤی بـەرواری دا) نڤیسیە. (وەسفی حەسەن ردێنی) بابەتەك ل سەر دیوانا هۆزانڤان (خەلیل دهۆكی) نڤیسیە ب ناڤێ(پشتی من ..تە چ ڤیا و من نەئانی.. خواندی). ئەڤ دیوانە ژ لایێ ناڤەروك و مەبەست و بابەتێن تێدا شروڤەكریە. هەر هەمان نڤیسەری بابەتەكێ دیتر ل ژێر ناڤێ(بكارئینانا فولكلوری دناڤ هۆزانێت مزویری دا) نڤیسیە. هەروەسا بابەتەكێ دیتر ب ناڤێ(خەمێت هۆزانڤانەكێ هەڤچەرخ، عەبدورەحمان مزویری) بەلاڤكریە. و دبابەتەكێ دیتر دا هەمان نڤیسەر ل سەر دیوانا(دەمە بهارا تە هلدا) یا هۆزانڤان (سالم مستەفا عەبدولعەزیز) چەند تێبینیێن رەخنەیی بەرچاڤكرینە. (صادق بەهائەددین ئامێدی) بابەتەك ل ژێر ناڤێ (تە چ ڤیا و من نە ئانی- ئینا) نڤیسیە و تێدا چەند تێبینیەك ل سەر زمانێ ئەوێ دیوانێ دیاركرینە. (ئیسماعیل ئیبراهیم ئەحمەد) بابەتەك ل ژێر ناڤێ(خواندنا سلاڤەك بۆ دەلالێ و چریسكێت رەخنەیی)نڤیسیە و چەند تێبینیەك ل سەر دیوانا هۆزانڤان(خالد حسین) دیاركرینە. (حجی جعفر) بابەتەكێ رەخنەیی ل سەر دیوانا (عەبدورەحمان مزووری) نڤیسیە ل ژێر ناڤێ (چەند تێبینییەك ل سەر دیوانا ژ ئەڤینا چرایێن كەڤن). دیسان بابەتەكێ دیتر ژی ل ژێر ناڤێ (كەلەپوور ددیوانا ل خەلكی تەحلێ ل من شرینێ دا) نڤیسیە. هەرهەمان نڤیسەری بابەتەكێ دی ل ژێر ناڤێ(وێنێ دووجاركی ل نك مزووری) نڤیسیە. دڤان هەرسێ بابەتان دا چەند تێبینیەك ل سەر بەرهەمێن هۆزانڤان (عەبدورەحمان مزووری) دیاركرینە. دووبابەتێن دیتر ژی دروژناما هاوكاری دا هاتینە بەلاڤكرن، یێ ئێكێ ل ژێر ناڤێ(دگەل محفوز مایی و پەیڤا راستیێ). و یێ دیتر ل ژێر ناڤێ (هیڤی و هیڤی یا هۆزانێ) بوو. دڤان هەردو بابەتان دا چەند دیتنەكێن تایبەتێن نڤیسەری ل سەر وان بەرهەمان هاتینە ئاراستەكرن. چەندین بابەتێن دیتر ژی هەر سەر ب شێوەیێن بابەتێن بەری نوكە هاتینە نڤیسین و تێبینیێن رەخنەیی ل سەر هندەك هۆزانا یان دیوانێن هۆزانڤانان هاتینە دیاركرن كو دشێین ب ڤی رەنگی ئاماژێ پێ بكەین:(رێدیر عەبدالحمید تەها) بابەتەك ل سەر هۆزانا (هشیار

رێکانی) نڤیسیە ل ژێر ناڤێ(ستێرەکا گەش و چەند تێبینی). (پێزانێ ئالیخان) بابەتەك ل سەر دیوانا (دلستان) یا (سەبری بوتانی) ل ژێر ناڤێ (دلستانا دل حەبین) نڤیسیە. دیسان (رەمەزان عیسا) گوتارەك ل سەر هۆزانڤانێن گەنجێن وێ قوناغێ نڤیسیە ل ژێر ناڤێ(لەزێ نەکەن). هەروەسا (ئیسماعیل رەڤەندی) گوتارەك ل ژێر ناڤێ (گوڤەند و بەهی دیوانەکا کلاسیکیە) نڤیسیە. دیسا (محسن قوچان) بابەتەك ب ناڤێ (مزوبری، حەیرانوك و مەلەڤانی ب پەیڤان) نڤیسیە. هەروەسا بابەتەکێ دیتر ژی ل ژێر ناڤێ(خالد حسێن و نهێنی یا لێڤێد گرتی- ئالوزی دهۆزانا خالد حسێن دا)نڤیسیە. ژلایەکێ دیتر(ئەنوەر محەمەد تاهر) ڤەکولینەك ب ناڤێ (مرن و ڤەژین دناڤبەینا سێ هۆزانڤانا، عەبدولوەهاب بەیاتی، بەدرخان سندی و عەبدورەحمان مزوبری) نڤیسیە. دیسان هندەك چاڤپێکەفتن ژی ل گەل هۆزانڤانان هاتینە کرن و تێدا هندەك تێبینی و بۆچوونێن خۆ یێن رەخنەیی ل سەر رەوشا ئەدەبیاتێ بگشتی و یا هۆزانێ ب تایبەتی دیارکرینە. بۆ نموونە دروژناما هاوکاری دا دیدارەك ل گەل هۆزانڤان (هزرڤان عەبدوللا) هاتیە کرن ب ناڤێ(هۆزانڤانێ گەنج هزرڤان و هیڤیەکا مەزن)، هەروەسا دیدارەك ل گەل (سەبری بوتانی) ژی هاتیە کرن. هەروەسا (عەبدورەحمان مزووری) گوتارەك ل ژێر ناڤێ (ڤەفتەکا نێرگزێن بێندار ل سەر گۆرێ هۆزانڤان ساریا دوسکی) بەلاڤکریە. دیسا (شەعبان مزوبری) ڤەکولینەك ب ناڤێ (ئەڤینا دلی کول و گرنژینا هۆزانا کوردی) نڤیسیە و ب چاڤەکێ رەخنەیی هەلسەنگاندن بۆ هۆزانێن( مەلا محەمەد مستەفا یوسفی) کریە. هەروەسا (سەلمان کوڤلی) بابەتەك ل ژێر ناڤێ (ئەز وئاگر و چەند تێبینی) نڤیسیە و دیوانا(هزرڤانی) رەخنەکریە)[18]. و گەلەك بابەت و چاڤپێکەفتنێن دیترێن ئەدەبی ژی د رۆژنامە و کوڤارێن وی سەردەمی بەلاڤبووینە.

ژلایەکێ دیترڤە هندەك پەرتووك ژی دوی سەردەمی دا هاتینە بەلاڤکرن و بابەتێن رەخنەیی و ڤەکولینێن تایبەت ل سەر بەرهەمێ ئەدەبیێ دەڤەرێ تێدا هاتبوونە نڤیسین، دشێین وەکو نموونە بۆ پەرتووکێن رەخنەیی ئاماژێ ب ڤان پەرتووکان بدەین: (ئەنوەر محەمەد تاهر) پەرتووکەك ل ژێر ناڤێ(چەند گوتارەکێن رەخنەیی) ل سالا ١٩٨٨ بەلاڤکریە. دیسا (رەشید فندی) دوو بەر هەم بەلاڤکرن ل ژێر ناڤێ(عەلی تەرەماخی ئێکەمین رومانڤیسێ کوردە) ل سالا ١٩٨٥، و پەرتووکا(مناقشات حول خانی) ل سالا ١٩٨٦ب زمانێ عەرەبی نڤیسیە. هەروەسا نڤیسەر(صادق بەهائەددین ئامێدی) بەرهەمێ خوە ب ناڤێ (هۆزانڤانێن کورد) ل سال ١٩٨٠ نڤیسی. نڤیسەر (عبدالرقیب یوسف) دوو بەرهەم نڤیسینە ب ناڤێ(دیوانا کرمانجی-١٩٧١)،(شاعرێن کلاسیکێن کورد-١٩٨٨). هەروەسا (د. نافع ئاکرەیی) بەرهەمەك ل ژێر ناڤێ(چەند شاعیرەك دهەرێما بەهدینان دا) ل سالا ١٩٧٨ نڤیسیە)[19]. زێدەباری چەند بەرهەمێن دیتر کو هندەك جاران ژیان و بەرهەمێن نڤیسەران دوان پەرتووکان دا دهاتنە دیتن، و جار ژی هندەك دووڤچوون ل سەر بەرهەمێن وان دکر و ژ لایێ ناڤەروکێ ڤە دهاتنە شروڤەکرن.

دئەوان گۆتار و بابەتێن رەخنەیی دا چەند تێبینیەك دهێنە دیتن مروڤ دشێت سەروسیمایێ رەخنەگرتنا ئەوێ قوناغێ تێدا دەسنیشان بکەت ئەوژی دئەڤان خالان دا:

١- زۆربەی ئەو بابەتێن هاتینە نڤیسین ژ لایێ رەخنەگران ڤە نەهاتینە نڤیسین بەلکو ژ لایێ هۆزانڤان و ئەدیبان ڤە هاتینە نڤیسین، لەورا چ بسپۆریەکا رەخنەیی تێدا ناهێتە دیتن. ئانکو ئەو کەسێن ئەڤ کارێن رەخنەیی ئەنجام داین رەخنەگر نەبووینە و بتنێ هندەك دیتن و بۆچوونێن تایبەتێن خۆ ل سەر دیوان و هۆزانێن هەڤدوو نڤیسینە وبەلاڤکرینە.

٢- ئەگەر پێداچوونەکێ دوان بابەتان دا بکەین دێ بینین کو زۆربەی وان ل دۆر ناڤەروکا بەرهەمان بووینە و هندەك جاران ل ڤێرێ و ل وێراهە تێبینی ل سەر زمان و دارێتنا وان بەرهەمان دیارکرینە. دیسان هندەك تێبینی ل سەر کێش و سەروایێن

بەرهەمان ژی گوتینە، لێ نەب وی رەنگی بووینە کو بێژین دەسنیشانا دروستا پێکهاتا هۆنەری یا بەرهەمان کربیت. لەورا وەکو رەخنەیێن خۆدی و سەرقەلەمکێن رەخنەیی دهێنە دەسنیشانکرن.

٣- دوان هەمموو بابەتان دا چ ڤەکۆلینەك یان بابەتەکێ رەخنەیی ناهێتە دیتن کو ل دووڤ بنەمایێن میتۆدێن رەخنەیێن بەرنیاس بەرهەم شروڤەکرین یان رەخنەکرن ل سەر هاتبیتە کرن. ئەڤەژی ژبەر وێ ئەگەرێ بوویە کو ئەو کەسێن ئەو بابەتە نڤیسین رەخنەگر نەبووینە و زانیاری و شارەزایی ل سەر میتۆدێن رەخنەیی نەبوویە تاکو ل سەر تێکستێن کوردی پراکتیزە بکەن.

٤- گەلەك جاران دوان بابەتێن هاتینە نڤیسین دا ئەو تێبینیە دهێتە کرن کو نڤیسەران وەکو هێرش و هێرشبرن یان رەد و بەدەلانێ خواندن بۆ تێکستێن هەڤدوو نڤیسینە. و زۆر جار شکاندن و ئێشاندن تێدا هاتییە پەیرەوکرن. ئانکو مەوزوعییەتا رەخنەگری هاتییە ژدەست دان، لەورا وان نڤیسەران بەلانسا خوە ژ دەست دایە و لایەنێ سۆزێ ل سەر بریار و هەلسەنگاند و ئەحکامێن وانێن رەخنەیی زالبوویە.

٥- گەلەك ب روهنی چاڤلێکرن دوان بابەتێن رەخنەیی دا دهێتە دیتن ئەوێن ژ لایێ نڤیسەرێن دەڤەرێ ڤە دهاتنە نڤیسین، ئەڤجا چ چاڤلێکرنا وانبیت بۆ ئێکدوو یانژی چاڤلێکرنا ئەدیب و نڤیسەر و رەخنەگرێن کوردێن کرمانجییا خوارێ بیت. و هندەك ژ وان نڤیسەران چاڤلێکرنا هندەك نڤیسەرێن عەرەب ژی ب روهنی ل سەر دیارە. ئەڤەژی وێ راستیێ دگەهینیت کو ئەوان نڤیسەران ژ ئەنجامێ پێکەهشتنا ئەزموونا خوە یا کەسی ئەو بابەتە نەنڤیسینە. لەورا زۆر جار بریارێن رەخنەیێن شاش دوان بابەتان دا دهاتنە دیتن و زێدەروویی ژی پێڤە دیاربوو.

پشتی سەرهلدانێ و ژبەر کۆمەکا هوکارێن دیارکری، رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان خورتتر لێهاتییە و بەرهەمێن رەخنەیی وەکۆ رێژە ژی زوورتر لێهاتینە. ئەم دشێین گرنگترین هۆکارێن رێخوشکەر ژبۆ بەرەڤ پێشچوونا رەخنا دەڤەرا بەهدینان دئەڤان خالان دا کورت بکەین:

١- ژ لایێ سیاسیڤە دەڤەرا بەهدینان هاتە ئازادکرن ل بن رژێما بەعس ڤە، دیسا خواندنا ب زمانێ کوردی ل دەڤەرێ بەرفرەهتر لێهات. ئەڤەژی ئەگەر بوون کو نڤیسەرێن دەڤەرێ ئازاد ببن و بەرهەمێن خوە دویر ژ ترسێ و ب زمانێ کوردی و ب زارێ بادینان بئافرینن. ئانکو پەیدابوونا ئازادیێ رێخوشکەر بوو ژبوی کو ئازاد هزربکەن و ئازاد بنڤیسن.

٢- خورتبوونا بزاڤا رۆژنامەگەریێ و چاپەمەنیێ ل دەڤەرێ و پەیدابوونا ژمارەکا زۆر ژ چاپخانە و رۆژنامە و کۆڤاران هاندەرەك بوو ژبۆ بەلاڤکرنا بەرهەمێن رەخنەیێن رەخنەگرێن دەڤەرێ. دیسا ئاڤاکرنا پرەکێ بوو دناڤبەرا نڤیسەری و رەخنەگری دا. لەورا ب رێکا ئەوان بەرهەمێن رەخنەیی بزاڤا ئەدەبی ژی بەرەڤ پێشچوو. و گرنگترین کۆڤار و رۆژنامێن پشتی سەرهلدانێ دەرکەتین و رولەکێ باش دخورتکرنا رەخنا دەڤەرێ دا دیتی ئەڤەبوون: کۆڤارا خابوور ١٩٩١ چوار هژمار ژێ دەرچوون، رۆژناما بوتان ١٩٩١ سێزدە هژمار ژێ دەرچون، تیرۆژ ١٩٩١ دوازدە هژمار ژێ دەرچوون، سەرهلدان١٩٩١ هەشت هژمار ژێ دەرچوون، مەتین خولا دوێ ١٩٩١ (١٣٢) هژمار ژێ دەرچوون، نووخوازی ١٩٩١ سێ هژمار ژێ دەرچوون، کۆڤارا سەرهلدان ١٩٩٣ شازدە هژمار ژێ دەرچوون، کۆڤارا پەیڤ خولا دوێ ١٩٩٣ و تا نهۆ بەردەوامە، کۆڤارا لالش ١٩٩٣ و هەتا نهۆ بەردەوامە، هەفتیناما پەیمان ١٩٩٤ و(٤١٣)هژمار ژێ دەرچوون و هەتا سالا ٢٠٠٣ بەردەوامبوو، کۆڤارا گازی ١٩٩٤ تا سالا ٢٠٠٠ بەردەوامبوو و (٦٥) هژمار ژێ دەرچوون، رۆژناما رەسەن١٩٩٥ و پاشی بوو کۆڤار، کۆڤارا ڤەژین ١٩٩٥ تا سالا ٢٠٠٢ و (٢٩)هژمار ژێ دەرچوون، کۆڤارا سڤورە یا زاروکان ١٩٩٨ و تا نوکە بەردەوامە، کۆڤارا دیجلە ب پیتێن لاتینی ١٩٩٨

هەتا ٢٠٠١ و (٤٢)هژمار ژێ دەرچوون، کوڤارا هۆنەر ١٩٩٨، کوڤارا زانکۆیا دهوك- پشکا مروڤایەتی ئەکادیمی ١٩٩٨ دەرچوویە، کوڤارا بیاڤ ١٩٩٩، کوڤارا نوبوون، کوڤارا کەپر یا زاروکان، کوڤارا مەتین خولا سێ، رۆژنامە و پاشی کوڤارا چاڤدێر، روژناما بەهدینان، روژناما ئەڤرو، روژناما وار، کوڤارا هیزل[٢٠]. ئەڤە و گەلەك ژ رۆژنامە وکوڤارێن دیتر ببوونە رێخۆشکەرەك کو دناڤ لاپەرێن واندا بابەت و ڤەکۆلینێن رەخنەیی بهێنە بەلاڤکرن و دانوستاندنێن رەخنەیی خورت ببن.

٣- پەیدابوونا سازیێن ئەدەبی وروشنبیری: پشتی سەرهلدانێ چەندین سازیێن ئەدەبی وروشنبیری ل دەڤەرێ هاتنە مەیدانێ و یێن بەری هینگێ هەبی ژی خورتتر لێهاتن و چالاکیێن ئەدەبی و کور وسمینارێن رەخنەیی ئەنجام ددان. بۆ نموونە: ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد لقێ دهوك ب رێکا گێرانا کور و سمینار و ڤیستەڤالێن ئەدەبی و چاپکرنا پرتووکان هێزەکا دی دایە رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان. هەروەسا هەبوونا رێڤەبەریا گشتی یا روشنبیری ولاوان تایێ دهۆکێ و دامەزراندنا سەنتەرێن ئەدەبی و گێرانا چالاکیێن ئەدەبی و دامەزراندنا سازیێن ئەدەبی ل دەڤەرێ هاندەرەکێ دیترێ بهێزبوو ژبۆ خورتبوونا رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرێ. زێدەباری هەبوونا سازیێن ئەدەبی و یانەیێن رەوشەنبیری یێن ئەحزاب و لایەنێن جودا جودا و ئایینێن جودا، رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا مە ب وەرار ئێخستیە.

٤- دامەزراندنا زانکویان وەکو زانکویا دهۆکێ، زاخۆ ، نەوروز و پولیتەکنیك. و هەبوونا پەیمانگەهێن جودا جودا وەکو پەیمانگەها بەرهەڤکرنا ماموستایان و پەیمانگەها هۆنەرێن جوان و پەیمانگەها تەکنیکی و...هتد، هوکار و هاندەرێن ئێکجار بهێزبوون ژبۆ بەرەڤ پێشچوونا رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان. ئەڤ سازیێن ئەکادیمی شیان ب چەندین رێکان خزمەتا بەرەڤ پێشچوونا رەخنا دەڤەرا بەهدینان بکەن، وەکو: هەبوونا وانا رەخنا ئەدەبی دپروگرامێ خواندنا زانکویێ دا و ل پەیمانگەهان ژی رێخوشکەر بوو ژبۆ بەربەلاڤکرن و دانەنیاسینا میتۆد و ئاراستەیێن رەخنەیێن جیهانی ل دەڤ قوتابییان وپاشی بەرهەڤکرن ودروستبووکرنا رەخنەگرێن گەنج و بسپور دبیاڤێ رەخنا ئەدەبی دا. هەروەسا ڤەکرنا خواندنا بلند ل زانکوییێن دەڤەرێ هاندەرەك بوو کو ڤەکۆلینێن رەخنەیی وەکو پێدڤییێن وەرگرتنا باوەرنامێن بلند (ماستەر و دکتورایێ) بهێنە نڤیسین. ئەڤەژی ئەگەرەك بوو کو رەخنەگرێن پروفشنال ل زانکویێ دەربکەڤن و بەردەوام ڤەکۆلینێن رەخنەیی ئەنجام بدەن و پەرتووکخانا کوردی ب پرتووك و ڤەکۆلینێن خۆ دەولەمەند بکەن و ژێدەرێن ب زمانێ کوردی ل دور رەخنا ئەدەبی ب زارێ دەڤەرێ زێدەببن. هەروەسا هەبوونا کوڤارێن تایبەت ب ڤەکۆلینێن ئەکادیمی یێن زانکویێ دەرگەهەکێ دیترێ بەرەڤ پێشبرنا رەخنا ئەدەبی بوو ل دەڤەرا بەهدینان.

٥- تەکنەلۆژیا سەردەمی وەکو ئنترنێتێ رێخوشکەرەك بوو ژبۆ پێکگەهاندنا رەخنەگران و ڤێرا گەهاندنا ژێدەر و ڤەکۆلینێن رەخنەیی یێن پێدڤی بۆ بەردەستێ رەخنەگرێن دەڤەرێ پێخەمەت ئەنجامدانا ڤەکۆلینێن رەخنەیی. هەروەسا هوکارەك بوو ژبۆ ئاشنابوونا رەخنەگرێن دەڤەرێ ب میتۆدێن رەخنەیێن نوی و کەڤن و ئەو گهورینێن بسەر بیاڤێ رخنا ئەدەبی دا هاتین ل جیهانێ.

لەورا پشتی سەرهلدانێ وەرارەکا بەرچاڤ کەتییە دبیاڤێ رەخنا ئەدەبی یا دەڤەرا بەهدینان دا. ئەم دشێین گرنگترین سیمایێن رەخنا ئەدەبی یا پشتی سەرهلدانێ و تا نوکە ل دەڤەرا بەهدینان دئەڤان خالان دا دەسنیشان بکەین:

١- پەیدابوونا نەوەیەکێ نوی یێ رەخنەگران کو هەلگرێن باوەرنامێن بلندن و بسپورن دبیاڤێ رەخنا ئەدەبی دا. ئەڤ بسپووریا وان بوویە

ئەگەر كو سەمتا ڤەكۆلینێن رەخنەیی بەرەف میتودێن رەخنەیێن نووتر ڤە بچیت و ڤەكۆلینێن ئەكادیمی بهێنە نڤیسین. ئانكو تا رادەیەكێ ئەو شیاینە هندەك ڤەكۆلینێن رەخنەیی ل سەر تێكستێن ئەدەبی یێن دەڤەرێ بنڤیسن و هاندەرەك بن ژبۆ پەیدابوونا ژێدەرێن رەخنا ئەدەبی ب دیالیكتا بەهدینان.

٢- جار جار گەنگەشە و دانوستاندنێن رەخنەیی دناڤبەرا رەخنەگرێن دەڤەرێ ل سەر لاپەرێن رۆژنامە و كوڤارێن دەڤەرێ دهێنە ئەنجامدان ، ئەڤەژی دبیتە ئەگەر كو هەستەكا رەخنەیی ل جەم خویندەڤانان پەیدابیبت بۆ خواندنا بەرهەمان و دانوستاندنێن هزری ژێ بهێنە بەرهەم. و هندەك جار ململانێ و هەڤركی دناڤبەرا نەوەیێن نوی و كەڤن یێن رەخنەگرێن دەڤەرێ دا دهێتە دیتن. ئەوژی ب رێكا سەرنڤیسین و خواندنێن رەخنەیی ل سەر بەرهەمێن هەڤدوو. ئانكو دشێین بێژین ئەڤ هەردوو دەستەكە ب رێكا نڤیسینان شیاینە ململانە و بابەتێن رەخنەیی وبەرهەمێن نوو بئافرینن. لێ ئەو دیاردا بەری سەرهلدانێ بەربەلاڤ(ئانكو نڤیسینا ڤەكۆلین و بابەتێن رەخنەیی ژ لایێ ئەدیبان ڤە) هێدی هێدی یا ژناڤ دچیت و مەیدان یا بۆ رەخنەگرێن نوی دهێتە چولكرن.

٣- تا رادەیەكێ سەمتا ڤەكۆلینێن رەخنەیی ژ ناڤەروكێ بەرەف فورم و روخسارێ بەرهەماڤە چوویە. ئانكو لایەنێن هۆنەرێن بەرهەمی دهێنە دەستنیشانكرن ل دووڤ پەیرەوكرنا میتۆدێن رەخنەیێن نوی. هەلبەت ناڤەروكا بەرهەمان ژی ناهێتە فەراموشكرن دوان شروڤەكرنان دا. ئەڤەژی هاندەرەك بوویە بۆ بەرف پێشچوونا ئەدەبیاتا دەڤەرێ ب گشتی. دیسان گهورینەك بوویە ژبۆ ئەوان تێگەهێن كەڤن ئەوێن د رەخنا ئەدەبی یا دەڤەرێ دا ل بەری سەرهلدانێ دهاتنە پەیرەوكرن.

٤- دنڤیسینێن رەخنەیێن بەری سەرهلدانێ دا بەهرا پتر دووڤچوون ل سەر بەرهەمێن شعری دهاتە كرن. لێ پشتی سەرهلدانێ ڤەكۆلینێن رەخنەیی بەرەف ژانرێن دیترێن ئەدەبی ژی چووینە وەكو(رومان، چیروك...هتد). ئانكو رەخنا ئەدەبی نەبتنێ ل سەر تێكستێن شعری دهێتە كرن بەلكو ڤەكۆلین ل سەر رومان و چیرۆك و فلكلور و بیاڤێن دیتر ژی دهێنە دیتن.

## * جوداهی دناڤبەرا رەخنەگرێن كەڤن و نوی ل دەڤەرا بەهدینان:

پێدڤیە وێ راستیێ بزانین كو رەخنەگرێن كوردێن كەڤن دبسپۆرنەبوون دبیاڤێ رەخنا ئەدەبی دا، لەورا كارێ وان یێ رەخنەیی ژی ب كارەكێ دروست ورێكوپێك دەرنەدچوو. وان پتر گرنگی ددا نڤیسەری و ژینگەهـ و دەوروبەرێن وی. وان ئەڤە دكرنە كلیل بۆ شرۆڤەكرن و خواندنێن خۆ یێن رەخنەیی، گەلەك جاران وان ژیەرهەمی دەسپێدكر (ئانكو ل سەر لایەنەكێ ناڤەرۆكێ یێ بەرهەمی رادوەستیان)، لێ ژبەرهەمی بدوماهیك نەدهاتن (ئانكو بەرەڤ لایەنێن دەرڤەی بەرهەمی ڤە دچوون و بتنێ بەرهەم دكرنە خالا دەسپێكێ، لێ خالا ناڤەراست و دووماهیا كارێ وان، یان ل دۆر نڤیسەرێ بەرهەمی بوو یانژی ل دۆر ژینگەهـ و سەروبەرێ دەوروبەرێن وی نڤیسەری بوو). هەلبەت ئەڤێ چەندێ ژی دوو ئەگەر هەبوون. یا ئێكێ ئەوە كو وان بخۆ هند زانیارییێن رەخنەیێن دروست نەبوون و دمەلەڤان نەبوون دپێكهات و ئاڤاهیێ بەرهەمی دا، لەورا خۆ ب بابەت و ناڤەرۆكێ و ژیان و ژینگەها نڤیسەری ڤەگرێددا بۆ پركرنا وێ لاوازیا ل دەف وان هەی. یا دووێ ئەوبوو كو تێگەهـ و رامانا وان بۆ رەخنا ئەدەبی ژ تێگەهـ و رامانا نوكە یا جودا بوو. ئەوان رەخنا ئەدەبی دهندەك قالبێن دیتردا ددیت. بۆ نموونە (بەرسڤ و بەرسڤ دانێ، شكاندن و دیاركرنا شاشیان ...هتد). لەورا ئەو ب دروستاهی درەخنا ئەدەبی نەدگەهشتن. دیتنا وان بۆ تێكستێ ئەوبوو كو بەرهەم دەربرینێ ژ ئێش و ئازارێن جڤاكی دكەت، ئانكو بەرهەم دڤێت ژ جڤاكی پەیدابیبت ودەربرینێ ژ ئێش و ئازارێن

وی بکەت و پەیامەکا چارەسەرێ ژێ بگەهینیت. ئانکو ژ جڤاکی پەیدابببیت و بۆ جڤاکی بیت. لەورا رەخنەگرێن کەڤن پتر بەرەڤ رەخنا ئایدۆلۆژی، جڤاکی، مێژوویی، دەروونی ڤەدچوون. چونکی ئەڤ رێبازە هەمیە دگرێدایی نڤیسەری و دەوروبەرێن وی نە. (ئانکو ئەو ژینگەها ئەو نڤیسەر تێدا دژیت و تێدا پەروەردە بووی کارتێکرنێ ل وی نڤیسەری دکەت و ژبۆ دیارکرنا وێ کارتێکرنێ. وان ددیت کو فەرە ڤەگەرنە سەر وان ئەگەرێن دەرەکی بۆ ڤەکرن و شرۆڤەکرنا کونجێن تارێن بەرهەمی (ئەگەر هەبان، چونکی بەهرا پتریا بەرهەمێن کەڤن ئێك رامان ددا، ئانکو دگرتی بوون).

لێ رەخنەگرێن نوی دبینن کو فەرە تێکست وەکو جیهانەکا سەربخۆ بهێتە دیتن. دڤێت هەمی پەیوەندیێن تێکستی لگەل نڤیسەری وێ بهێنە ڤەتاندن. ئانکو مرنا نڤیسەری رادگەهینن، چونکی ب دیتنا وان بەرهەم بخۆ تێرا هندێ هەیە تو هەمی تشتەکێ تێدا ببینی. ئانکو بەرهەم بخۆ خۆ ئاڤادکەت و رامانێن نوی بۆ خۆ دروست دکەت (هەلبەت ئەڤە پتر بۆ بەرهەمێن ڤەکری و پری خواندن یا دروستە). ئانکو رەخنەگرێن نوی ژبەرهەمی دەستپێدکەن و ژبەرهەمی ژی ب دوماهیك دهێن. چونکی بەرهەم بخۆ دشێت نوینەراتیا خۆ بکەت و خۆ ب دەست خواندنێن هەمەرەنگ و جودا جودا ڤە بەردەت دویر ژ نڤیسەری و ئەو کاودانێ بەرهەم ژێ پەیدابووی یان ئەو ژینگەها نڤیسەر تێدا ژیای.

رەخنەگرێن کەڤن ل دووڤ هندەك بنەمایێن تایبەت و هندەك پیڤەرێن حازر و ئامادە کارێ رەخنەیی دکر، بۆ نموونە: (هۆنەرێن رەوانبێژیێ، سێ یەکەیان (دەم، جھ، بابەت...هتد)، لەورا رەخنا وان ب رەخنا پیڤەری (قیاسی) دهێتە بناڤ کرن. رەخنەگرێن کەڤن ل بەرسڤا ڤان پرسیاران دگەریان: بەرهەم چ دبێژیت؟ کێ بەرهەم نڤیسیە؟ کەنگی و دچ سەروبەردا بەرهەم ژدایکبوویە؟ هەلبەت بەرسڤا ڤان پرسیاران یا تایبەتە ب ناڤەرۆکا بەرهەمی و ژیان و سەروبەر و ژینگەها بەرهەم ژێ پەیدابووی. لێ رەخنەگرێن نوی ل بەرسڤا گەلەك پرسیاران دگەرن وەکو: بەرهەمی چ گۆتیە؟ بۆچی ئەو گۆت و نە چ تشتەك دی؟ ئەو تشت چاوا گۆتیە؟ بۆچی ب وی رەنگی ئەو تشت گۆتیە؟ ئەگەر ب وی رەنگی نەگۆتبا دا چاوا بێژیت؟ باشتر بوو ئەو تشت چاوا گۆتبا؟ و ب دەهان پرسێن دی. ئەگەر ل بەرسڤا ڤان پرسان بگەرین، دێ بینین پرانییا وان ل دۆر بەرهەمی بخۆنە، ئانکو گرێدایی بەرهەمی بخۆنە.

ئەها لڤێرە جوداهی دناڤبەرا رەخنەگرێ کەڤن و نوی دا دیاردبیت. لەورا ئەرکێ رەخنەگرێن نوی ژ ئەرکێ رەخنەگرێن کەڤن بزحمەترە، چونکی رەخنەگرێ نوی خوە گەلەك ب گرێ و ئاستەنگێن بەرهەمی ڤە ماندی دکەت، هەتا بشێت رامان و خواندنەکێ بۆ پەیداکەت. دیسان گەلەك گرنگیێ ددەتە ئاڤاهی و پێکهاتا هۆنەریا بەرهەمی ژی. ئانکو شێوازێ بەرهەمی ژ لایێ رۆخسار و ناڤەرۆکانڤە شرۆڤەدکەت و ل سەر رادوەستیت. رەخنەگرێ کەڤن پتر گرنگی ددا لایەنێ بەرفرەهبوونێ، ئانکو دا خواندنا پەرتووکەکێ یان دیوانەکێ ب دوو سێ بەریەران ئەنجام دەن، لێ رەخنەگرێن نوی دشێن پەرتووکەکێ ل سەر دوو مالکێن شعرێ یان کورتە چیرۆکەکێ ئاڤاکەن، لەورا دیاردبیت کو رەخنەگرێن نوی گرنگیێ ددەنە کویری و شرۆڤەکرنێن سەرانسەری، لێ رەخنەگرێن کەڤن گرنگی ددا پەحنی و سەرڤەسەرڤەیێ. یێن نوی بەرهەمی ژ هەمی لایەکیڤە شرۆڤەدکەن و خۆ دادهێلنە دناڤ هەمی کونجێن بەرهەمی دا. لێ یێن کەڤن بتنێ لایەکێ بەرهەمی دگرت. لێ ل سەر ڤێ چەندێ را ژی هێشتا رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا مە ب وێ هێزێ دیارنەبوویە و گەلەك ئاستەنك و ئاریشە دکەڤنە هەمبەر ڤەکۆلینێن رەخنەیی و رەخنەگرێن دەڤەرێ.

## ئاریشە وئەگەرێن لاوازییا رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بەهدینان

ئەو ئاریشە و ئاستەنگێن درەخنا دەڤەرا بەهدینان دا هەین دهەمەجورن و د گەلەك بیاڤان دا نە. ئانکو گەلەك هوکارێن هەین ژبۆ پاشڤەمانا رەخنا دەڤەرا بەهدینان. ئەم دێ ئەوان هوکار و ئەگەرێن لاوازیێ ب ڤی رەنگی دیارکەین:

١- ژ لایێ تیوریزەکرنا بنەما و پرنسیپێن رەخنەیی

ڤە، چەند ئاستەنگ و گرفتەك دیاردبن وەكو:

A - تا نوكەژی گەلەك ژئەوان كەسێن ب ڤی كاری رادبن نە دبسپۆرن دبیاڤێ رەخنەیی دا. ئانكو ئەڤ كارە نەبتنێ ژ لایێ رەخنەگرێن ئەكادیمیك ڤە دهێتە ئەنجامدان، بەلكو ژ لایێ هندەك ژ كەسانێن دیتر ژی دهێتە ئەنجامدان كو خوە وەكو رەخنەگر دبینن. لێ ئەو بخوە نڤیسەرێن بیاڤێن دیترن. یان شاعرن یان چیرۆك نڤیسن یانژی زمانڤانن...هتد. ئەڤێ چەندێ ژی وەكریە كو ئەو تێگەهـ و پرنسیپێن ئەو دادرێژن یان بەحس ژێدكەن دراست نەبن یانژی كێماسی تێدا هەبن. ئانكو رەخنەگرێن ئەكادیمیك و بسپور نەشیاینە هەبوونا خۆ ب شێوەكێ كاریگەر بسەلمینن و تیوریزەكرنا بنەما و رێبازێن رەخنەیی ژ لایێ وانڤە ب شێوەكێ ئەكتیڤ بهێتە كرن.

B - هەڤركیەك هەیە دناڤبەرا رەخنەگرێن گەنج و ئەكادیمیك و رەخنەگرێن نەبسپور و جیلێ كەڤن ژ نڤیسەران. ئەڤێ چەندێ ژی وەكریە كو ڤالاهیەك پەیدابیت دناڤبەرا واندا و هەر دەستەكەك ژوان خوە زاناتر ژ دەستەكا دیتر دبینیت. جیلێ نوی دبێژیت ئەم دبسپورین و ئەكادیمیكین لەورا ئەڤە كارێ مەیە و جیلێ كەڤن چ نوزانیت و راڤەكرن و كارێ وان نەجهێ پشت بەستنێ (ئعتیمادێ) یە. جیلێ كەڤن ژی دبێژیت مە سەربۆر و دیرۆكەكا درێژا هەی دڤی بواری دا و جیلێ نوی یێ بێ ئەزموونە و نڤیسینێن وان دباش نینن.

C - ئەو زانیاری و بوچوونێن دبیاڤێ تیوریزەكرنا رەخنەیی دا دهێنە كرن، زۆریەی وان ب رێكا وەرگرتن و چاڤلێكرنێ دهێنە ئەنجامدان. ئانكو وەرگرتنا زانیاری و رێبازێن رەخنەیی ژ لایێ رەخنەگرانڤە ب رێكا وەرگێرانێ دهێنە كرن. رەخنەگرێن دەڤەرێ وان زانیاریان ژ ئەدبێ عەرەبی و بیانی وەردگرن. عەرەبان ژی یا ژ ئەوروپا یان زمانەكێ دیتر وەرگرتی. ئەڤجا زۆر جار عەرەبا بخۆ هندەك تێگەه و چەمكێن رەخنەیی شاش ژ ئەوروپا یان ژ زمانێن دیتر وەرگرتینە. رەخنەگرێن دەڤەرا مەژی ئەو زانیاریە ژوان وەرگرتینە. ئانكو دبیتە چاڤلێكرنا چاڤلێكرنێ و هەر وەكو ئەرستۆ دبێژیت دوو جارا ژ راستیێ دوور دكەڤن. لەورا گەلەك جاران ئەو زانیاریێن بۆ خویندەڤانی یان وەرگری دهێنە پێشكێشكرن دشاشن یان دكێم و ڤەقەتیایی نە.

D- نەبوونا ژێدەران یان ڤەتلازیا وان ب زمانێ كوردی و ب تایبەت ب زارێ كرمانجی(دەڤەرا بادینان)، بوویە ئاریشەكا مەزن كو ڤەكۆلەر پشت بەستنێ بكەنە سەر ژێدەرێن زمانێن بیانی. هەرچەندە نەوەیەكێ نوو یێ دەرچوویێن زانكۆیێ (نەوەیێ پشتی سەرهلدانێ)پەیدابووینە كو ژبلی زمانێ كوردی هیچ زمانەكێ دیتر نزانن. ئەڤەژی بوویە ئەگەرەك كو رەخنا ئەدەبی و نڤیسینێن رەخنەیی ژ لایێ وان ڤەكۆلەرێن ب كوردی خواندی ژ لایێ رێژێ ڤە دكێم و دلاواز بن.

٢- ژ لایێ پراكتیكرنا بنەمایێن رەخنەیی ل سەر تێكستان، چەند ئاریشەك دیاردبن وەكو:

A - پرانیا ڤەكۆلینێن دهێنە ئەنجامدان وبەلاڤكرن درۆژنامە وكۆڤارێن دەڤەرێ دا، دبیاڤێ پراكتیكێ دا د تایبەتن ب رێبازێن سیاقیڤە. ئانكو رەخنەیێن مێژوویی، جڤاكی، رەوشتی، دەروونی نە. دیسان گەلەك ژوان رەخنەیا ئنتیباعینە و رەخنەگر هندەك دیتن وئنتیباعاتێن خۆ یێن تایبەت ل سەر تێكستان دیاردكەت. ئانكو خواندنێن تایبەتن. گەلەك كێم شروڤەكرنێن رەخنەیی ل دووڤ بنەمایێن رێبازێن نوی یێن رەخنەیی وەكو: فورمالستی، شیوازگەری، بونیادگەری، هەلوەشینگەری، هەلویستی خوێنەر (تیورا وەرگرتنێ)، رەخنا نوی یا ئەنگلو ئەمریكی... دهێنە ئەنجامدان. ئەگەر ڤەكۆلینەكا ب ڤی رەنگی ژی هاتبیتە ئەنجامدان ئەوژی هەر ژ لایێ رەخنەگرێن ئەكادیمیكێن جیلێ نویڤە بوویە. لێ ئەوژی نە ب وێ رێژێ نە كو وێ ڤالاهی و پێدڤیبوونا هەی پر بكەن.

B - ئەو شروڤەکرنێن دهێنە ئەنجامدان، گەلەك ژوان ب دروستی بنەما و پرنسیپێن ڕێبازێن رەخنەیی پەیرەوناکەن. ئەڤجا چ ژبەر وێ چەندێ بیت کو ئەو رەخنەگرە بخۆ ب دروستی دوان بنەمایان نەگەهشتیە. یانژی دبیت ئەوی بخۆ ئەو زانیاریە ب شاشیڤە وەرگرتبن ژوی ژێدەرێ وی زانیاری ژێ وەرگرتین و پشتا خوە پێ گەرمکری. هەلبەت ئەڤە بەهرا پتر ل دەف وان رەخنەگران دهێتە کرن ئەوێن جیلێ کەڤن و ئەوێن نەبسپور.

C- زۆربەی شروڤەکرنێن رەخنەیێن دهێنە ئەنجامدان دبیاڤێ شعرێ دانە. ئانکو رێژا شروڤەکرن و ڤەکۆلینێن رەخنەیی دبیاڤێ ژانرێن دیترێن ئەدەبی دا وەکو( چیروك، رۆمان، شانۆ، ژیاننامە، ...هتد) یا کێمە.

D- زۆر ژئــەوان شروڤەکرنێن رەخنەیێن دهێنە ئەنجامدان ل سەر تێکستێن دەڤەرێ، هیشتا ب تێگەه و چەمکێن کەڤنێن رەخنەیی نە. ئانکو گەلەك ژوان رەخنا ئەدەبی وەکو کریارەکا هەلسەنگاندنێ یان تەقیمێ بۆ تێکستێ ئەدەبی پەیرەودکەن. ئانکو پیڤەرێن کەڤن(هەلسەنگاندن و دیارکرنا لایەنێن باش و خرابێن بەرهەمێ ئەدەبی یانژی راستڤەکرنا تێکستان و ڕێنمایکرنا نڤیسەران دتێکستێن واندا) دهێنە پەیرەوکرن. کێم ژ رەخنەگران پیڤەر یان پرنسیپێن نوو یێن شروڤەکرن و خواندنێن رەخنەیی پەیرەودکەن. ئەڤەژی یان ژبەر کێم زانیاریایە ل دەف وان رەخنەگران. یانژی ژبەر باوەری نەئینانە ب وان ڕێبازان. هەلبەت دهەردوو رەنگاندا خوێندەڤان و وەرگر زیانێ دبینیت و ئەڤەژی وەکو ئاریشەیەك دبیاڤێ رەخنا ئەدەبیدا دهێتە دەستنیشانکرن.

٣- دبیاڤێ گەهاندنێ دا ئاریشە دناڤبەرا رەخنەگری و وەرگری دا دروست دبن و دبیتە ئەگەرێ پەیداکرنا ڤەقەتیانێ دناڤبەرا واندا یانژی دروستکرنا ڤالاهیەکێ دبیاڤێ فێربوون و تێگەهشتن و وەرگرتنا گوتارێن رەخنەیی دا. ئانکو ئەو ئاریشا گەهاندنێ یا هاریکار نینە داکو دانوستاندنێن رەخنەیی پەیدابن. ئەڤەژی ژبەر چەند هۆکارەکان رویددەت ئەوژی:

A - ئەو زمانێ گوتارێن رەخنەیی پێ دهێنە نڤیسین زۆر جاران زمانەکێ هشکە و پێ بزحمەتە بۆ تێگەهشتنێ یان وەرگرتنێ، چونکی زۆربەی جاران ڤەکۆلەر زانیاریێن تیوری ب ڕێکا وەرگێرانێ ژ زمانێن بیانی دادرێژیتە سەر زمانێ کوردی، لەورا ئاریشا وەرگێرانێ بخۆژی ئاستەنگەکا زۆرا مەزنە دگەهاندن و وەرگرتنا ئەوان گوتاراندا. دئەنجامدا خواندەڤان ژ وان گوتاران بێزاردبیت و ژێ ڤەدرەڤیت.

B - رێژەکا زۆر ژ رەخنەگرێن دەڤەرا بادینان ڤەکۆلینێن رەخنەیی ب زارێ کرمانجیا خــوارێ دخوینن و ئاگەهداری نڤیسین و ئەوێ بزاڤا رەخنەینە ئــەوا ب زارێ کرمانجیا خــوارێ (سورانی) دهێتە نڤیسن. لێ زۆربەی رەخنەگرێن ب زارێ کرمانجیا خوارێ (سورانی) دنڤیسن، ڤەکۆلین و پەرتووك وبەرهەمێن رەخنەگرێن دەڤەرا بادینان ناخوینن. ئەڤەژی دبیتە ئەگەر کو ئەو تشتێ ل بادینان دهێتە نڤیسین ل دەڤەرێن دیتر ئاگەه ژێ نەبیت یان ب شێوەکێ دیتر بێژم ، ئەو دو یان سێ رەخنەگرێن بادینان نەنیاسن. ئەڤەبخۆژی ئێك ژ ئاریشێن مەزنن دگەهاندنا گوتارێن رەخنەیێن دەڤەرا بادینان دا. دیسان ڕێنڤیسا عەرەبی بخۆژی ئاریشەکا دیترە کو ئەو کوردێن ب ڕێنڤیسا لاتینی دخوینن ودنڤیسن نڤیسینێن رەخنەگرێن بادینان نەبینن ونەخوینن. ئانکو زمان و زار و ڕێنڤیس ئاریشەکا دیترە هەمبەر رەخنە ورەخنەگرێن دەڤەرا بادینان بۆ گەهاندنا بابەت و نڤیسین و بەرهەمێن رەخنەیی.

C- نەبوونا رۆژنامە یان کوڤارێن تایبەت بۆ نڤیسین و بیاڤێ رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا بادینان ئاستەنگەکە کو بەرهەمێن رەخنەیێن نڤیسەرێن بادینان نەهێنە بەلاڤکرن و زۆر ژ ڤەکۆلین و بەرهەمێن نڤیسەران د رۆژنامە و کوڤارێن نە بسپورێن

دیتر دا دهێنە بەلاڤکرن. ئەڤەژی هۆکارەکە کو خویندەڤان و وەرگرێن گوتارێن رەخنەیی وان بەرهەمان زوی ب زوی نەبینن یان بدەست وان نەکەڤن. ئانکو ڤەقەتیانا خواندنێ بۆ نڤیسینێن رەخنا ئەدەبی پەیدادبیت.

D - نەبوونا دەزگەهێن چاپکرن وبەلاڤکرنێ ل دەڤەرا بادینان بوویە ئەگەر کو زۆر ژ بەرهەم و پەرتووکێن رەخنەگرێن مە روناهیا چاپێ نەبینن و نەگەهنە خویندەڤانی. ل دەڤەرا مە بتنێ ئێك دەزگایێ چاپکرن وبەلاڤکرنێ هەبوو ب ناڤێ (سپیرێز) ئەوژی نوکە وەك بەرێ نەمایە و بەرهەمێن نڤیسەرێن مە دمینن دەسخەت و ناهێنە چاپکرن.

٤- بوارێ ئابووریێ رەخنەگری و نەبوونا پشتەڤانیا دارایی بۆ پەرتووك و نڤیسین وبەرهەمێن وی، ئەو دلسارکریە و نەبوویە پشتەڤان و هاریکارەك کو رەخنەگر پتر خۆ ب وەستینیت و بەرهەمێن هەژی و زۆر بگەهینتە چاپێ، بەلکو بەروڤاژی. ئەڤ هۆکارە بوویە ئەگەر کو گەلەك ژ رەخنەگرێن ئەدەبی یێن دەڤەرێ ب کارێن ئیداری و رۆژانەڤە مژویل ببن یان پتر ژ کارەکی بکەن تاکو ژ لایێ ئابووریڤە بڤەتینن. ئەڤەژی گرفتەکا دیترە هەمبەر رەخنەگر و رەخنا ئەدەبیا دەڤەرا مە.

٥- نەبوونا بەریکانەیێن رەخنەیی یان ئەو سازیێن گرنگیێ ب خەلاتکرنا بەرهەمێن باش و گوتارێن باش ددەن. بوویە ئەگەرەك کو ململانا رەخنەیی و هەڤرکیا نڤیسنێ نەبیت. ئانکو پالدەرێ نڤیسینا بەرهەمێن رەخنا ئەدەبی، نڤیسەر بخۆیە. چ سازی یان لایەنەکێ دیتر نینە وی هانبدەت یان پالدەرێ (دافعێ) نڤیسینێ ل دەف وی زێدەبکەت.

٦- زۆر جاران دڤەکۆلین یان نڤیسینا بەرهەمێن رەخنەیی دا موجامەلەکرن و بەرژەوندی رۆلێ خۆ دبینن. ئانکو ئەو رەخنا ل سەر ڤی بنیاتی دهێتە نڤیسین خزمەتا بیاڤێ رەخنەیی ناکەت بەلکو بەروڤاژی بۆ بەرژەوەندیێن تایبەت و تاکەکەسی دهێتە نڤیسین.

٧- مە تا نوکە ل دەڤەرێ ئەو رەخنەگرە نینە یێ کو بشێت تیورێن رەخنەیی بئافرینیت. هەلبەت رەخنەگرێن مە نەشیاینە مژارێن رژدێن رەخنەیی ژێ پەیدابکەن. ئەڤەژی دبیتە ئەگەر کو رەخنەگرێ مە هەر چاڤ ل تێگەهـ و میتودێن رەخنەگرێن بیانی بکەت. وژ لایێ دیتر مە چ دەزگایەکێ تایبەتێ وەرگێرانێ ژی نینە کو دوماهی زانیاریێن نوی بۆ زمانێ کوردی بهێنە وەرگێران و ڤەگوهاستن، ئانکو دیسان ڤەقەتیانا زانیاریان یا هەی و ئەڤەژی دبیتە ئەگەر کو رەخنەگرێ مە یێ ڤەمایی بیت و یێ پێگەهشتی نەبیت.

ب ڤی رەنگی ئەم دشێین بێژین کو رەخنا ئەدەبی ل دەڤەرا مە بەری سەرهلدانێ دڤۆناغا دەسپێکێ و ل خوە گەریانێ دا دابوو، لێ پشتی سەرهلدانێ رەخنا ئەدەبی یا دەڤەرێ شیایە هندەك وەرار و پێشکەفتنێ ب خوەڤە ببینیت و رەخنەگرێن نوی و بسپور ل دەڤەرێ پەیدابووینە. لێ ل سەر ئەڤێ هەمیێ را، هێشتا رەخنا ئەدەبیا دەڤەرا مە هەمبەری کومەکا ئاریشەیانە و ئەگەر ئەو ئاریشە و ئاستەنگە نەهێنە چارەکرن و ستزیێن تایبەتمەند دووڤچوونێ بۆ چارەکرنا ئەوان ئاریشان نەکەت، دێ رەخنا دەڤەرا مە هەر ڤەمایی و لاواز مینیت. ئەو کارێ نوکە دهێتە کرن ژی دبیاڤێ رەخنا ئەدەبی دا وەکو کارێن تایبەت و ئەزموونێن تاکە کەسینە. ئانکو هێشتا بەرنامە داریژی بۆ پشڤەبرنا رەخنا ئەدەبی نەهاتییە کرن. ب کورتی دشێم بێژم دەڤەرا مە پێدڤی ب دەستەك و گروپێن رەخنەیی یە. دیسان پێدڤی ب پلان و کارەکێ رێکوپێکە ژ لایێ سازیێن تایبەتمەندڤە تاکو رەخنا دەڤەرێ بەرەڤ ئاسۆیێن گەشتر و وەرارەکا دیترا بەرهەمهێنەرڤە بهێتە ئاراستەکرن.

## پەراویز:


١. د. شوقی ضیف، في النقد الادبي، الطبعة العاشرة، دار المعارف، القاهرة،٢٠٠٤،ص ٤٦.
٢. د. ابراهیم محمود خلیل، النقد الادبي الحدیث من المحاکات الی التفکیك، دار المسیرة للنشر،عمان، ٢٠٠٣، ص ١١.
٣. قاسم عبدالامیر عجمان، الشعر والمناهج النقدیة الحدیثة، صدیق القاری و دلیله الی الابداع، بغداد، ١٩٩٨،ص ١٧٧.
٤. رینیة ویلك، مفاهیم نقدیة، ت،د.محمد عصفور، عالم المعرفة، المجلس الوطنی للثقافة والفنون والادب-الکویت،١٩٩٠، ص٤١٠.
٥. د.هیمدادی حوسێن، دەروازەیەك بۆ رەخنەی ئەدەبیی کوردی،دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠٠٧،ل ٩.
٦. فوئاد رەشید، رەخنەی رەخنەی رومانی کوردی-١٩٧٣-١٩٩٩،بلاوکراوەکانی کتێبفروشی سوران-هەولێر، چاپخانەی روون-سلێمانی،٢٠٠٥، ل ١٥.
٧. چارلس برێسلێر، رەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکانی- پێشەکییەك بۆ تیوری، و: عەبدولخالق یەعقوب، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر-٢٠٠٢،ل ٢١.
٨. نەفیسا ئیسماعیل حاجی، زمانێ رەخنەیا چیروکا هۆنەریا کوردی(کتێبێن رەخنەیی وەك نموونە)-١٩٧٣-٢٠٠٦، چاپخانا خانی/دهۆك،وەشانێن دەزگایێ سپیریز،٢٠٠٨، ل٢٦.
٩. د.صلاح فضل،نظریة البنائیة في النقد الادبي، مطابع الهیئة المصریة العامة للکتاب، ٢٠٠٣،ص ٢١٩.
١٠. نەفیسا ئیسماعیل حاجی، زمانێ رەخنەیا چیروکا هۆنەریا کوردی(کتێبێن رەخنەیی وەك نموونە)-١٩٧٣-٢٠٠٦، چاپخانا خانی/دهۆك،وەشانێن دەزگایێ سپیریز،٢٠٠٨، ل٣٢.
١١. نەفیسا ئیسماعیل حاجی، زمانێ رەخنەیا چیروکا هۆنەریا کوردی(کتێبێن رەخنەیی وەك نموونە)-١٩٧٣-٢٠٠٦، چاپخانا خانی/دهۆك،وەشانێن دەزگایێ سپیریز،٢٠٠٨، ل٨٩.
١٢. د.هیمدادی حوسێن، دەروازەیەك بۆ رەخنەی ئەدەبیی کوردی،دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم،هەولێر،٢٠٠٧،ل ٣٥٨.
١٣. البرت تیبودیة، النقد الکلاسیکی اعلامه واصوله، ت: د.ابراهیم الکیلانی، دار طلاس للداراسات والترجمة والنشر، دمشق،١٩٨٩،ص ٢٢.
١٤. د.حسن مسکین، مناهج الدراسات الادبیة الحدیثة من التاریخ الی الحجاج، مؤسسة الرحاب الحدیثة للطباعة والنشر،بیروت لبنان،٢٠١٠،ص ٨.
١٥. تەحسین ئیبراهیم دوسکی، ل دور ئەدەبێ کرمانجی ل سەد سالا نوزدێ و بیستێ زایینی، ژ وەشانێن کوری زانیاری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤، ص٧-١٤.
١٦. بۆ پتر زانیاریان بنێرە:وصفی حسن، روژنامەگەری ل دەڤەرا بەهدینان(١٩٥٠-٢٠٠٥)، وەزارەتا روشنبیری ولاوان-رێڤەبەریا راگەهاندنێ، چاپخانا خانی دهۆك، چاپا دوێ وزێدەکری،٢٠١٢.
١٧. عیماد وەیسی خالد، جەڤەنگ دهۆزانا ریالستیکا کوردی دا دەڤەرا بەهدینان ١٩٧٠-١٩٩١، دەزگایێ سپیریز یێ چاپ و وەشانێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، ٢٠٠٤، ل ١٥-٢٢.
١٨. بۆ پتر زانیاریان ل سەر ئەوان بەرهەمان بنێرە: عیماد وەیسی خالد، جەڤەنگ دهۆزانا ریالستیکا کوردی دا دەڤەرا بەهدینان ١٩٧٠-١٩٩١، دەزگایێ سپیریز یێ چاپ و وەشانێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، ٢٠٠٤، ل ١٥-٢٢.
١٩. بۆ پتر زانیاریان ل سەر بەرهەم و نڤیسینێن ئەدیبێن کورد بنێرە: وصفي حسن ردێنی، فەرهەنگا ئەدیب و نڤیسکارێت دەڤەرا بەهدینان(١٩٣٥-٢٠٠٠)، وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد-لقێ دهۆك،چاپخانا هاوار/دهۆك،٢٠٠٦.
٢٠. بۆ پتر زانیاریان بنێرە: وصفی حسن، روژنامەگەری ل دەڤەرا بەهدینان(١٩٥٠-٢٠٠٥)، وەزارەتا روشنبیری و لاوان-رێڤەبەریا راگەهاندنێ، چاپخانا خانی دهۆك، چاپا دوێ وزێدەکری،٢٠١٢.

## ژێدەر:


١. د. ابراهيم محمود خليل، النقد الادبى الحديث من المحاكات الى التفكيك، دار المسيرة للنشر،عمان، ٢٠٠٣.

٣. البرت تيبوديه، النقد الكلاسيكى اعلامه واصوله، ت: د. ابراهيم الكيلاني، دار گلاس للدراسات والترجمة والنشر، دمشق،١٩٨٩.

٣. تەحسين ئيبراهيم دوسكى، ل دور ئەدەبێ كرمانجى ل سەد سالا نوزدێ و بيستێ زايينى، ژوەشانێن كورى زانيارى كوردستان، هەولێر، ٢٠٠٤.

٤. چارلس برێسلێر، رەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەكانی- پێشەكییەك بۆ تیوری، و: عەبدولخالق یەعقوب، چاپی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر-٢٠٠٢.

٥. د.حسن مسكين، مناهج الدراسات الادبيه الحديپه من التاريخ الى الحجاج، مؤسسه الرحاب الحديپه للگباعه والنشر،بيروت لبنان،٢٠١٠.

٦. رينيه ويلك، مفاهيم نقديه، ت:د.محمد عصفور، عالم المعرفة، المجلس الوطنى للثقافة والفنون والادب-الكويت،١٩٩٠.

٧. د. شوقى ضيف، في النقد الادبي، الطبعة العاشرة، دار المعارف، القاهرة،٢٠٠٤.

٨. د.صلاح فضل،نظرية البنائية في النقد الادبي، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب، ٢٠٠٣

٩. عيماد وەيسى خالد، جەڤەنگ دهۆزانا ريالستيكا كوردى دا دەڤەرا بەهدينان ١٩٧٠-١٩٩١، دەزگايێ سپيريز بێ چاپ و وەشانێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، ٢٠٠٤.

١٠. فوئاد رەشيد، رەخنەی رەخنەی رۆمانی كوردی-١٩٧٣-١٩٩٩،بلاوكراوەكانی كتێبفرۆشی سوران-هەولێر، چاپخانەی روون-سلێمانی،٢٠٠٥.

١١. قاسم عبدالامير عجمان، الشعر والمناهج النقديه الحديثة، صديق القارى ودليله الى الابداع، بغداد، ١٩٩٨.

١٢. نەفيسا ئيسماعيل حاجى، زمانێ رەخنەيا چيروكا هۆنەريا كوردى(كتێبێن رەخنەيى وەك نموونە)-١٩٧٣-٢٠٠٦، چاپخانا خانى/دهۆك،وەشانێن دەزگايێ سپيريز،٢٠٠٨.

١٣. د.هيمدادى حوسێن، دەروازەيەك بۆ رەخنەی ئەدەبیی كوردی،دەزگای توێژینەوە و بلاوكردنەوەی موكریانی، چاپی یەكەم،هەولێر،٢٠٠٧.

١٤. وصفى حسن، رۆژنامەگەرى ل دەڤەرا بەهدينان(١٩٥٠-٢٠٠٥)، وەزارەتا روشنبيرى ولاوان-رێڤەبەريا راگەهاندنێ، چاپخانا خانى دهۆك، چاپا دوێ وزيدەكرى،٢٠١٢.

١٥. وصفى حسن ردينى، فەرهەنگا ئەديب و نڤيسكارێت دەڤەرا بەهدينان(١٩٣٥-٢٠٠٠)، وەشانێن ئێكەتييا نڤيسەرێن كورد-لقێ دهۆك،چاپخانا هاوار/دهۆك،٢٠٠٦.

# بـزاف و قۆناغێن وەرگێڕانێ ل دەڤەرا بەهدینان

هێرش کەمال ڕێکانی

## بەراهیك

زمان وەك ئالاڤەکێ ل ئێك دو تێگەهشتن و هەڤنیاسینێ دناڤبەرا جڤاك و کەسێن ئێك زمان دا،دگەل ڤێ چەندێ ژی ئێك ژ پێنگاڤێن گرنگ و فەر بۆ ل هەڤدو تێگەهشتنا خودانێن زمانێن جودا جودا و جیاواز و بیانی و ب ساناهی ئێخستنا وەرگرتن و زانینا ڕامان و تێگەهێن وان زمانان ژی پێدڤی وەرگێرانێ یە، کو وەرگێران ژی هۆنەر و چقەکە ژ چقێن زانستێ زمانی، ژ بۆ ڤێ چەندێ ژی گەل و مللەتان بزاڤ کرینە بۆ زانینا زمانێن دیترێن جیهانێ و مفاوەرگرتن ژ ڕەوشەنبیری و شارستانیەت و کەلتور و تیتالێن مللەتێن دەوروبەر و جودا جودا یێن جیهانێ، مە کوردان ژی دڤێ مەیدانێ دا پێنگاڤێن کاروانێ وەرگێرانێ هاڤێژتینە و خو دایە دگەل پێشڤەچونێن مرۆڤایەتیێ دا، و هژمارەکا سوارچاکێن کورد ل دووڤ پێچێبوون و بەروملێن خو ڤەرێژێن گرنگ و بەرکارێن هەژی پێشکێشی بەرەبابێن دووڤ خو دا کرینە، دڤێ مژارێ دا دێ چەند تیرۆژکا ئێخینە ل سەر وان پێنگاڤێن هاتینە هاڤێژتن دبوارێ وەرگێرانێ دا ژ زمانێن بیانی بۆ زمانێ کوردی و نەخاسمە بەهدینی(کرمانجی یا ژووری) و ڕێزبەندکرنا هژمارەکا وەرگێرانێن چاپکری ل دەڤەرا بەهدینان د مەیدانا بابەتێن جودا جودا دا، ب وێ ئومێدێ نڤیسەڤان و ڤەکۆلەر و زمانڤان پتر دڤێ خەبتێن و بەر رووی کرنا ڤی بابەتێ گرنگ دا ڕژدیێ بکەن.

دڤێ ڤەکۆلینێ دا بزاف هاتییەکرن کو زانیاری و بەرچاڤکرنا هژمارەکا نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان (وەك نموونە و دیارکرن)بخۆڤە بگریت، ئەڤ چەندە ژی ل دووڤ قۆناغ و دەستپێکێن بزاڤا وەرگێرانێ ب کرمانجییا ژووری(بەهدینی) ب گشتی و ل دەڤەرا بەهدینان (سنووری پارێزگەها دهۆك)ێ ب تایبەتی، ئەڤجا چ ئەو بزاڤ و پێنگاڤێن وان نڤیسەران ل دەڤەرێ بخو بن یان ژی ل وەلاتەکێ دیتر ئەو خزمەت پێشکێشکربن.

هەژی یە بێژین ئەڤ ڤەرێژە ژی ل سەر دو لایەن و جوران هاتییە دابەشکرن:

١- نڤیسین و گۆتارێن (وەرگێران) یێن رۆژنامەگەری:

ژ بەر کو بەهرا پتریا نڤیسەرێن دەڤەرێ یێن کو خو دایە مەیدانا وەرگێرانێ ژ رۆژنامەگەریێ (رۆژنامە، کۆڤار) دەستپێکریە وەرگێرانێن خۆ تێدا بەلاڤکرینە، ئەڤجا چ وەك گوتار یان هەر جورەکێ دیتر یێ ئەدەبی ( هۆزان، چیرۆك، پەخشان....)بیت، ئەڤە ژی بۆ هەر قۆناغەکێ (هەگەر قۆناغەکا نڤیسەرێن دەڤەرا

بەهدینان هەبن) مە هندەك نموونە ژێ داینە دیارکرن.

٢- بەرهەم و چاپکریێن (وەرگێران) بێن پەرتووك:

وان بەرهەم و چاپکریێن وەرگێرانێ بێن وەك (پەرتووك)هاتینەچاپکرن و بەلاڤکرن بخو ڤە دگریت، و ل ڤێرێ هەژی گوتنێ یە کو (ل دووڤ ئەو بەرهەمێن گەهشتینەمە و مە ئاگەهی ل سەر هەین و پێحەسیاین هاتینە دیارکرن، ئانكۆ هەگەر بەرهەمەك نەهاتبیتە دیارکرن، ئەو ب مەرەم نەهاتیبەکرن) ب وێ ئومێدێ دپاشەرۆژێ دا هەمی بهێنە کومکرن و وەك بیبلۆگرافییەك بۆ بهێتە بەرهەڤکرن، ئەڤ جورە ژێ چاپکریێن دناڤبەرا سالێن (١٩٨٤-٢٠١٦) بخوڤە دگریت.

## وەرگێران ل دەڤ کوردان:

کورد ئەو گەلێ خودان زمانەکێ کو رەهـ و ریشالێن کەڤنار هەین دیرۆکێ دا و بزاڤ و خەبتینێن وەرگێرانێ دناڤ دا هاتینە کرن، کو کەڤنترین ژێدەرێ دیرۆکی کو ئاماژە دایە پرۆسا وەرگێرانێ کو ل دەڤ کوردان هاتبیتەکرن ئانكۆ دناڤبەرا زمانێ کوردی و زمانەکێ بیانی دا دزڤریتەڤە بۆ پەرتووکا(ئاناباسیس) یا سەرکردە و مێژوونڤیسێ یونانی (کزەینەفون) ئەوێ ل سالا(٤٠١ بەری زایینی)دەمێ بەحسێ گەهشتنا بۆ دەڤـەرا کاردوخیا(و نەخاسمە ئەو پێکدادانا دناڤبەرا لەشکەرێ وی و کوردێن کاردوخی دا ل گەلیێ زاخو) دکەتن و ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو چەکدارێن یونانی ب رێکا وەرگێرانێ ئاخڤتن دگەل کاردوخیان کریە[1]، دگەل ڤێ چەندێ ژی دقۆناغێن جودا جودا دا بوویە جهێ گرنگی پێدانا گەلەك کەسێن بیانی ژی ژ گەرۆگڤان و رۆژهەلاتناسان ، و ڤەکۆلین و فەرهەنگ ژی هاتینە دانان، و نەخاسمە بێن گرێدای ئاخڤتنڤانیا ب بەهدینی(کرمانجی یا ژووری) بۆ نموونە: ماوریتزیو گارزونی کو رۆژهەلاتناس و گەرۆکڤان و قەشەیەکێ ئیتالی بوو،بۆ ماوەیەکێ درێژ ل ئامێدیێ ژیابوو، ژ مزگینەدەرێن (موبەشر) دومنیکان بوو ل مووسل کو ل سالا ١٧٦٢ز قەشەیێ دومنیکانی بوو ل مووسل،ل دووڤ گوتنێن وی بۆ ماوێ ٢٨ سالان ل ئامێدیێ ژیابوو، پشتی ل مووسل






GRAMMATICA
E VOCABOLARIO
DELLA
LINGUA KURDA
COMPOSTI
DAL P. MAURIZIO GARZONI
De' Predicatori Ex-Missionario Apostolico

ROMA MDCCLXXXVII.

Nella Stamperia della Sacra Congregazione di Propaganda Fide
CON LICENZA DE' SUPERIORI.

(ROMA 1787)


شرح روزنامه جدید (دەستنڤیسێ مەلا عەبدوڵلاهێ ڕێکانی/ مامیسی)(٨)




هاتیبە ئامێدیێ و نەخاسمە ل گوندێ (بێبادێ)کو دکەڤیتە ل رۆژئاڤا ئامێدیێ، بۆ ماوێ (١٨)سالان ل ڤی گوندی ژیابوو، یێ شەهرەزا بوو دزانینا گیایێن نۆشداری دا، و پشتی ل دەڤەرێ ژیای و فێری زمانێ کوردی (بەهدینی)بووی،پەرتووکەکا فەرهەنگی یا ئیتالی-کوردی ل سەر ڕێزمانا زمانێ کوردی بەرهەڤکر و ل سالا(١٧٨٧ز)ل رۆما چاپکر، کو ژ(٤٦٠٠)پەیڤان پێك دهێت، کو ل دەستپێکێ ل دور کوردستانێ چەند پێزانین ژلایەنێ جوگرافی و ئابوری و سیاسی ڤە بەحسکرینە، گارزونی ل باژێرێ خو(فلورنسا)ل سالا(١٧٩٠ز) وەغەرکریە[٢].

بێگومان وەرگێڕان بۆ زمانێ کوردی ل دەستپێکێن ڤێ بزاڤێ بەهرا پتر ژ زمانێن نەتەوە و وەلاتێن نێزیك و دەوروبەر بوویە وەك (فارسی، عەرەبی، تورکی) و دگەل قۆناغ و سەردەمان بەرفرەهی کەڤتیە ڤێ مەیدانێ و سنوور دەربازکرینە کو هژمارەکا ژ زمانێن

وەلاتێن جیهانێ جهێ خو دناڤ وەرگێڕانا بۆ کوردی دا بکرن، وەرگێڕانێن (خانای قوبادی١٦٦٨-١٧٣٢ز) کو هەر سێ بەرهەمێن هۆزانڤانێ فارس (نیزانی گەنجەوی ١١٤١-١٢٠٤ز) ( لەیلا و مەجنون، خوسرەو شرین ، ئەسکەندەرنامە) ژ فارسی وەرگێڕابوونە زمانێ کوردی (کرمانجیا ژێری / سورانی) ب ئێکەم وەرگێڕێ کورد دهێتە هژمارتن[٣].

## دەستپێکێن بزاڤێن وەرگێرانێ ل بەهدینان :

دەڤەرا بەهدینان و نەخاسمە ئامێدیێ کو ب درێژاهیا دیرۆکا دەستەلاتداریا میرگەها بەهدینان پایتەختا وێ بوویە، و بنگەهەکێ گرنگ و مەزنێ ڕەوشەنبیری و زانین و زانستا بوویە، ئەو ژی ژبەر هەبوونا هژمارەکا مەدرەسێن ئایینی و گرنگی پێدانا هندەك میرێن میرگەهێ ب زانین و زانایان وەك:(سولتان حەسەن بەگ، سولتان حسێن(حسێن وەلی)کوڕێ حەسەن بەگ ، زێبر پاشایێ دووێ...)کو




ل سەردەمێ وان مەزنترین و ناڤدارترین مەدرەسە یا کو ب زانینگەهەکا گرنگ دهاتە هژمارتن ئەو ژی (قوبەهان) بوویە کو هژمارەکا مەزن ژ زانایان ژێ دەرچووینە و دەرس لێ گوتینە وەك: (مەلا ڕەسولێ سورچی، مەلا مەحمودێ بهوسی(مرن ١١٠٠مش/ ١٦٨٩ز)، مەلا عەبدوللاهێ ڕێکانی، مەلا یەحیایێ مزووری(مرن ١٢٥٤مش /١٨٣٩ز....)، ل ڤێ مەدرەسێ گرنگی ب گەلەك زانست و زانینان دهاتە دان کو بەهرا پتر ب زمانێ عەرەبی و فارسی بووینە، دگەل ڤێ چەندێ ژی پشتی هندەك دەستنڤیس ب دەست مە کەفتین و دناڤ دا بۆ مە دیار بوویە کو گرنگی ب بزاڤا وەرگێرانێ ژی هاتییەدان کو هندەك ژ دەرسدەر و سەیدا و شاگردێن وێ زمانێن (عەرەبی، فارسی، تورکی) ب باشی و شەهرەزایی دزانین و ئەڤ چەندە ژی بوویە دەلیڤە بۆ وەرگێرانێ، نموونە و بەلگە ژی بۆ ئاخڤتنا مە زانایێ مەزنێ دەڤەرا بەهدینان (مەلا عەبدوڵلاهێ ڕێکانی یێ مامیسی)[٤] ( روزنامە جدید) ئەوا ب زمانێ فارسی کو ژ(٢٣) لاپەران پێك دهێتن،ل سالا (١١٩٢مـــش-١٧٧٨ز)ل مەدرەسا(قوبەهان-ئامێدیێ) نڤیسی بوو ئانکۆ نەسخ کر بوو[٥]

ئەڤ بەرهەمە ژ لایێ زانایێ بەهدینان(عەڵلامە کوڕێ مەلا مەحمودێ بهوسی)[٦] ب زمانێ تورکی هاتبوو دانان، و کربوو فارسی و ناڤێ وێ کربوو(روزنامە جدید/ڕۆژناما نوی)، و مەلا عەبدوڵلاهی هەر یا ب زمانێ فارسی نەسخ کربوو[٧]، ئەڤە ژی نیشانە ل سەر وێ چەندێ کو دەڤەرا بەهدینان ژ مێژە و دکەڤن دا گرنگی یا ب وەرگێرانێ دای بەلێ هەر ژ زمانێن بیانی بۆ زمانەکێ دیترێن بیانی، ئانکۆ ل دووڤ پێدڤی یا زمانێن وی سەردەمی ل دەڤەرێ دهاتنە خواندن.



دەستنڤیسێ مەلا مەحمودێ بازیدی

پێنگاڤێن دەستپێکێ بۆ هەبوون و پەیدابوونا جور و رێکێن وەرگێرانێ ل دەڤەرا بەهدینان وەکی قوناغێن ژیێ مرۆڤی بووینە کا چەوا زارۆکینی قوناغا مرۆڤی یا ئێکێ یە، وەسا دانان و هزر کرن دهێکرنا(فێرکرن) زارۆکان دا ژی پەنابریە رێکێن دەستپێکێ و سڤك و ب ساناهی ئەو ژی ب رێکا دانانا فەرهەنگ و فەرهەنگوکا ب تەرزێ (هۆزانکی یا فێرکرنێ) ئانکۆ ب رەنگێ ڤەهاندنا هۆزانکی ژ بەرکو دا بۆ ژبەرکرن و فێربوونێ ب ساناهی و خوش بیت، کو ئەڤە ژی جورەکێ وەرگێرانێ یە و بۆ ڤێ چەندێ ژی هۆزانڤانێ مەزنێ کورد ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٦ز) پیشەنگێ ڤێ مەیدانێ بوویە کو ئێکەمین کەس بیت هزر ددانانا فەرهەنگوکەکا هۆزانکی دا بکەت بۆ زارۆکان کو هژمارەکا پەیڤێن (عەرەبی-کوردی)بخو ڤە بگریت، کو «خانی» بەرهەمێ خو یێ فەرهەنگی «نووبار/ نووبهار» دژیێ ٣٣ سالیێ دا ل رۆژا ١٣ هەیڤا ٣ یا سالا ١٠٩٤مش/١٣-٣-١٦٨٣ نڤیسی بوو[٩] هەژی یە بێژین ئەڤ بەرهەمێ وی ل قوناغێن دەستپێکێ یێن خواندنا فەقەیان ل مەدرەسێن ئایینی دهاتە خواندن.

پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقی ل سالا ١٩٢١ێ کو یا سیستەم شاهاتی بوو، هزرەك ل وەرگێرانێ ل دەڤەرێ هاتیە کرن، هەروەکی دنامەیەکا (کاتب تحریر)ێ ئامێدیێ(رەسول ناجی)داهاتی ئەوا بۆ رۆژناما (پێشکەفتن) یا سلێمانیێ هاتیە هنارتن و د هژمارە (١٠٣) یا رۆژا ١٣ نیسان (٤) ١٩٢٢ێ هاتیە بەلاڤکرن تێدا هاتبوو دیارکرن و گوتبوو: کو نها پێنج خواندنگەهـ ل قەزا ئامێدیێ یێن هەین و دڤان رۆژان دا جێگرێ شیرەتکارێ لیوا مووسل (کابتن جاردین) و دگەل شیرەتکارێ پەروەردێ سەرەدانا ئامێدیێ و ڤان خواندنگەهان کریە و پێدڤیێن وان بجهـ ئینانە و فەرمان دایە مامۆستایان کو پەرتووکێن عەرەبی وەرگێرن بۆ زمانێ کوردی و ب زارۆکان بدەنە خواندن و ل دووماهییا نامێ داخوازکریە کو بەرهەمێن ئەدەبی یێن کوردی ل سلێمانیێ ب رێکا رۆژناما (پێشکەفتن) بۆ قەزایێن بەهدینان ژی بهێنە فرێکرن چونکی گەلەك کارەکێ فەر و پێدڤی یە[١٠].






## وەرگێرانا پەرتووکان بۆ زمانێ کوردی یا کرمانجی یا ژووری(بەهدینی):

وەکی ل بەری نوکە مە دیارکری ل دەستپێکێ وەرگێرانێ ب پێنگاڤێن سادە و سڤك دەستپێکربوو ئەو ژی چ ب وەرگێرانا ئێکسەر یا زاردەڤی یان یا نڤیسینێ ب رێکا فەرهەنگوکان نەخاسمە ب شێوەیێ هۆزانکی وەکی یا (نووبار) ا ئەحمەدێ خانی، پشتی ڤێ چەندێ هزر دپێنگاڤێن مەزنتر و بەرفرەهتر دا هاتیبەکرن ئەو ژی یا وەرگێرانا پەرتووکان، ژ بۆ ڤێ چەندێ ژی دیرۆکا رەوشەنبیریا کوردی دا هەتا نوکە(کو مە ئاگەهی و زانیاری ل سەر هەین) ئێکەم کەس کو وەرگێرانا پەرتووکێ کریت بۆ دەڤوکا (زاراڤێ) کرمانجیا ژوور ئەو ژی زانا و دیرۆکنڤیسێ مەزنێ کورد( مەلا مەحمودێ بازیدی/بایەزیدی) [11] بوویە ئەوێ کو ل سالا(١٢٧٥مش/ ١٨٥٨ز)[12] پەرتووکا دیرۆکی(شەرەفناما)شەرەفخانێ بدلسی (١٥٤٣-١٦٠٤ز) ژ زمانێ فارسی وەرگێرایە زمانێ کوردی (کرمانجیا ژووری) ئانکۆ ب ئێکەم وەرگێرێ کورد دهێتە هژمارتن کو هەتا نوکە دیرۆکێ دا هاتییە نیاسین، کو وەرگێرانا بەرگێ ئێکێ یە ژ شەرەفنامەیێ.

د دیرۆکا وەرگێرانا پەرتووکێن ئایینی دا ژی و نەخاسمە یێن گرێدای پەرتووکێن ئایینێن ئەسمانی، کو ژوان ژی ئینجیل بۆ ئێکەمین جار هاتبیتە وەرگێران بۆ زمانێ کوردی ئەو ژی ل سالا ١٨٥٧ێ بوو[13]، ژ زمانێ یۆنانی بۆ زارێ کرمانجی و ب ئەلفبێیا ئەرمەنی هاتبوو چاپکرن کو ناڤ و نیشانێ وێ (ئنجیل خودیێ مە ئیسایێ مەسیح)بوو ژ (٣٩٨)رووپەران پێك دهات و ژ لایێ مزگینەدەرێن (موبەشر)مەسیحیێن ئەرمەنی ل ئستەنبۆلێ هاتبوو بەلاڤکرن[14].

هەژی یە بێژین کو ژ گەلەك زمانێن جیهانی و بیانی بەرهەم و نڤێسین بۆ کرمانجیا ژووری هاتینە وەرگێران ئەڤجا چ وەك گوتار یان هەر جور و چقەکێ ئەدەبی یان پەرتووك وەك زمانێن:(عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی، ئەلمانی، تورکی، رۆسی، هۆلەندی....) و دەستپێك و بەهرا پتر وەرگێرانێن بەلاڤبوویێن دناڤ رۆژنامە و کۆڤاران دانە، کو دڤێ ڤەکۆلینێ دا دگەل






هەر قۆناغەكا بزاڤا وەرگێرانێ دێ هژمارەكا نموونەیان وەك میناك ئینین ( ئانكۆ مە هندەك دیاركرینە بتنێ وەك نموونە، نەكو هەمی بەلكو چەند ژێگرتنەكن بۆ ئاماژەدانێن وان قۆناغان).

## نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان و وەرگێران د رۆژنامەگەری یا كوردی دا (١٨٩٨-٢٠١٦)

ژ بەر كو رۆژناما كوردستان (١٨٩٨-١٩٠٢ز) ب پێشەنگ و دایكا رۆژنامەگەری یا كوردی دهێتە هژمارتن و ب كرمانجی یا ژووری بوویە، لەوما مە هەر ژ وێ دەستپێكریە كو قۆناغێن بزاڤ و پێنگاڤێن خودان نڤیسین و گوتار و بەرهەمێن دەڤەرا بەهدینان ژی هەر ژ وێ ژێهەل بهێین هەتا كو دگەهینە سالا ٢٠١٦ێ.



د.صەدیق ئەتروشی

## قۆناغا دناڤبەرا (١٨٩٨-١٩٢٠):

ئەڤ قۆناغە ب دایكا كاروانێ رۆژنامەگەری یا كوردی دهێتە هژمارتن ئەو ژی ب دەركەفتنا ئێكەم رۆژناما كوردی بناڤێ (كوردستان) ل قاهیرە ل ١٨٩٨/٤/٢٢ ژ لایێ هەر دوو برایان (میقداد مەدحەت بەدرخان) و (عەبدوررەحمان بەدرخان) هاتبوو دەرێخست و بەلاڤكرن و هەتا ١٩٠٢/٤/١٤ێ (٣١) هژمارە ژێ دەركەفتبوون، ئەڤە ژی جهێ شانازیێ یە كو پێشەنگا رۆژنامەگەری یا كوردی ب كرمانجی یا ژووی بیت، د كۆڤارا (كورد تعاون و تەرەقی غزتسی) ئەوا ل سالا(١٩٠٨-١٩٠٩) ل ئستەنبۆلێ دەردكەفت د هژمارە (٩) یا (١٩٠٩/١/٣٠) بابەتەك ب زمانێ توركی بەلاڤكربوو ناڤێ وی( ركانی زادە: سید محمد عصمت بوو كو كەسەكێ دەڤەرا بەهدینان بوویە پشكداری دڤێ كۆڤارێ دا كربوو، و دكۆڤارا (ژین)دا یا كو ل ئیستەنبولێ دناڤبەرا سالا(١٩١٨-١٩١٩)دەردكەفت كەسەكێ دەڤەرا بەهدینان بناڤێ (زاخویی) پشكداری كر دهژمارا وێ یا (١٩: ١٩١٩/٦/٤) دا [(١٥)].

## قۆناغا دناڤبەرا (١٩٣٢-١٩٤٥):

ئەڤ قۆناغە ژی ژ قۆناغێن گەلەك گرنگ بوویە بۆ رۆژنامەگەری یا كوردی، ئەو ژی كو ئێكەم كۆڤارا كوردی ب كرمانجییا ژووری بناڤێ(هاوار) (١٩٣٢-١٩٤٣)ل شامێ ژ لایێ نڤیسەرێ پێشەنگ میر (جەلادەت بەدرخان١٨٩٣-١٩٥١)، و هەر ژ لایێ وی ڤە كۆڤارا رۆناهی (١٩٤٣-١٩٤٥)، و كۆڤارێن (رۆژا نوو) (١٩٤٣) و (ستێر) (١٩٤٣) ل بەیرۆتێ ژ لایێ برایێ وی میر (د.كامیران بەدرخان١٨٩٥-١٩٧٨)، دڤێ قۆناغێ دا هندەك نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان ژی پشكدار بووینە كو گوتار و هۆزانێن خو د كۆڤارا (هاوار) و هندەك ژ وان د كۆڤارا (رۆناهی) دا بەلاڤكرینە وەك: صالح بامەرنی (سەیدا صالح یوسفی)، مەلا ئەنوەر (مەلا ئەنوەر مایی)، ئەلهۆیێ بێدوهی (مەلا تەها مایی)، دلكۆلێ دۆسكی (محەممەدسەعید

دۆسکی)........) بۆ نموونە:

- هێڤیا مە (هۆزان)، سالح بامەرنی (سەیدا سالح یوسفی)، کۆڤارا هاوار،(ژ٣٩، ١٩٤٢)[١٦].

- بەیتا کەوێ (هۆزان)، مەلا ئەنوەر (مایی)، کۆڤارا هاوار ، (ژ ٥٢ ، ١٩٤٣)[١٧].

- سەربەستی (هۆزان)، مەلا ئەنوەر (مایی)، کۆڤارا رۆناهی ، (ژ ١٢، ١٩٤٣)[١٨].

## قۆناغا دناڤبەرا (١٩٥٠-١٩٩٠):

ئەڤ قۆناغە کو دبیتە دایکا رۆژنامەگەری یا دەڤەرا بەهدینان ئەو ژی ب دەرکەفتنا ئێکەم رۆژنامەیا کوردی (کرمانجی یا ژووری/ بەهدینی) ل سالا ١٩٥٩ێ بناڤێ (الحقیقە- راستی)[١٩]

و ئێکەم کۆڤارا بەهدینی بناڤێ (رۆناهی) ل سالا



سەلاح سەعدوللا

١٩٦٠ێ ژ لایێ نڤیسەر (حافز مستەفا قازی/ حافز قازی) ڤە ل بەغدا.

ل سالێن دەستپێکێ ژ ڤێ قۆناغی رەوشەنبیر و نڤیسەرەکێ دەڤەرا بەهدینان بناڤێ (د.صەدیق ئەتریشی)کارێ وەرگێرانێ کریوو بەلێ ژزمانەکێ بیانی بۆ زمانەکێ دیتر یێ بیانی ئەو ژی پەرتووکا(مسألە توحید اللغة الکردیة) کو ئەڤ بەرهەمە ژ نڤیسینا (عصمەت شەریف وانلی) بوویە کو وی سەردەمی سەرۆکێ کۆمەلا خویندکارێن کورد بوو ل ئەورۆپا ، ب زمانێ ئینگلیزی د کۆڤارا کومەلێ دا هاتبوو بەلاڤکرن، و ل دووڤ داخازا نڤیسەر حافز قازی ئەڤ بەرهەمە ژ لایێ (د.صەدیق ئەتریشی)[٢١]ڤە هاتبوو وەرگێران بۆ زمانێ عەرەبی کو (٣٠٠٠) دانە ل سالا ١٩٥٩ێ ژێ هاتبوونە چاپکرن و دکونگرێ دووێ یێ مامۆستایێن کورد دا ل سالا ١٩٦٠ێ ل شەقلاوە هاتبوو بەلاڤکرن[٢٢].

هەر ژ نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان کو ل سالێن شێستان دا ناڤێ وی درۆژنامەگەریا کوردی دا هاتی و ئەو ژی (عبداللە گەرمامی) بوویە کو بابەتەکێ وەرگێرانێ بناڤێ ( جوتیاری سوڤیاتی لگەل زانیاریی یێ دچیت) پشکدار دکۆڤارا رۆناهی دا کریوو (کۆڤارا رۆناهی، ژمارە ٥-٦، شوات و ئادار ١٩٦١، ل ٢٣).

ل سالێن دەستپێکا حەفتیان نڤیسەرێن بەهدینان پشکدارێن وەرگێرانێ د رۆژنامە و گۆڤارێن وی سەردەمی هەبوون بۆ نموونە ل رۆژناما هاوکاری (ئێکەم ژمارە ١٩٧٠/١/٩ ل بەغدا دەرکەفتبوو) وەك:

- خانێ کەسێ نە(ئەدەبێ گەلان)، ئەلفرد مالکیلاند، وەرگێران: ئەحمەد عەلی دۆسکی، رۆژناما هاوکاری( ژ ١٣١ ، ١٩٧٢، ل ٥ )[٢٣].

- چیرۆکا (هۆزان)،وەرگێران:ئەحمەد عەلی دۆسکی،رۆژناما هاوکاری(ژ ١٦٨، ١٩٧٣،ل ٥ )[٢٤].

- خەونا کەڤن جارەکا دی (هۆزان)، وەرگێران: ئەنوەر محمد تاهر ، رۆژناما هاوکاری ( ژ ١٩٥، ١٩٧٣، ل ٥ )[٢٥].

- باوەری(هۆزان)،وەرگێران: سەربەست بامەرنی، رۆژناما هاوکاری( ژ ١٩٨، ١٩٧٣،ل ٥ )[٢٦].

- بیرئانینا توما بوا (گوتار)، جویس بلو، وەرگێران: عەبدولکەریم فندی، کۆڤارا دەنگێ مە ( ژ ٤، ١٩٨٩،ل ٢٣ )[٢٧].
- مال، سومرست موم، وەرگێران ژ ئینگلیزی: دەولەت عەلی، کۆڤارا دەنگێ مە ( ژ ٤ ، ١٩٨٩،ل ٩١ )[٢٨].

و د کۆڤارا (کاروان)[٢٩] ژی پشکداریێن نڤیسەرێن بەهدینان هەبوون وەك:

- رۆخسار و ناڤەرۆك دشانوویا جادوی دا ، وەرگێران: عبدالله جندی، ( ژ ١٣، ١٩٨٣).
- گرۆپێت خوینێ، وەرگێران: ئاشتی عەبدولحەکیم، ( ژ ٢٧، ١٩٨٤).
- چیرۆکا بویکا مارا ، وەرگێران: نزار محەممەد سەعید، ( ژ ٣٨، ١٩٨٥).
- چەند هۆزانێن توشنۆڤا ، وەرگێران: بەدەل رەڤو مزوری، ( ژ ٧٥، ١٩٨٩).

هەر وەسا ل کۆڤارا (رۆژی کوردستان) ل هژمارە (٦٥ شواتا : ١٩٨٤)(نەجیب بالایی) چیرۆکەکا وەرگێرای بەلاڤکربوو، و ل کۆڤارا (بەیان) ئیسماعیل بادی ل هژمارە (١٠٦: ١٩٨٥) بابەتەك وەرگێرابوو، و د رۆژناما (برزاڤ: ئێکەم ژمارە ل ١٩٨٩/٨/١ ل بەغدا دەرکەفتبوو)دا ژ نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان کو وەرگێران دناڤ دا بەلاڤکرین وەك:

- چیرۆکا کچەکا دناڤ خیزێ رەش دا، وەرگێران:عەبدولمەجید محەممەد سندی، ( ژ ٢١، ١٩/ ١٢/ ١٩٨٩).
- چەند هۆزانەك بۆ زارۆکان، وەرگێران:بابێ جوتیاری، ( ژ ٣٣، ١٣/ ٣/ ١٩٩٠).
- چەند تیۆرێن ئەدەبی ، وەرگێران:صالح سەعید، (ژ ٣٤، ٢٠/ ٣/ ١٩٩٠).

لێ وەرگێران وەك (پەرتووك) بۆ زمانێ کوردی یا کرمانجی ژووری (بەهدینی) ل دەڤەرا بەهدینان گەلەك درەنگ پێنگاڤ هاتینە هاڤێژتن و کاروانەکێ گیرۆبوویی بوویە، بەلێ دگەل ڤێ چەندێ ژی هەر گرنگییا خو هەبوویە و بنیاتەك هاتیيە دانان کو ڤەرێژێن باشتر و خورتتر هەبن، کو پەرتووکا (ئەوێ دبلوماسی) یا نڤیسەر جیمس ئولدرج ئەوا ل سالا ١٩٨٤ێ[٣٠] ژ ئینگلیزی هاتیيە وەرگێران بۆ سەر زمانێ کوردی ژ لایێ نڤیسەرێ بەرنیاس (صەلاح سەعدوللا١٩٣٠-٢٠٠٧)[٣١] ب ئێکەم پەرتووکا وەرگێرایا دەڤەرا بەهدینان دهێتە هژمارتن[٣٢].

هەژی یە بێژین کو ل سالێن هەشتێیان دا وەك پەرتووك ژی وەرگێران هاتینە کرن (بەلێ ژ بەر کاودان و رەوشا ئابووری یان هەر ئەگەرەکا دیتریت نەهاتبوونە چاپکرن) ژوان پەرتووکان ژی پەرتووکا (پێشەکیا ئیبن خەلدون)[٣٣]ی ژ لایێ نڤیسەر و وەرگێرێ دەستهەل (عەلی نەقشەبەندی ١٩٢٤-٢٠٠٠) کو ل سالا (١٩٨٦) وەرگێرابوو، هەروەسا رۆمانا ڤەگەریان بۆ حەیفا یا غەسان کەنەفانی - وەرگێران/ شەعبان مزیری.

**پەرتووکێن وەرگێرایی یێن چاپکری دناڤبەرا سالێن(١٩٨٤-١٩٩٠)**

| ژ | ناڤێ پەرتووکێ | ناڤێ نڤیسەری | ناڤێ وەرگێری/ ی | جور و زمانێ ژێ هاتیيە وەرگێران | سالا چاپکرنێ |
|---|---|---|---|---|---|
| | ئەوێ دبلۆماسی | جیمس ئولدرج | سەلاح سەعدوللاه | رۆمان/ ئینگلیزی | ١٩٨٤ |

# قۆناغا دناڤبەرا (١٩٩١-٢٠٠٠)

## قۆناغا پشتی سەرهەلدانێ:

د ڤێ قۆناغێ دا ئانکۆ پشتی سەرهەلدانا بهارا ١٩٩١ێ نڤیسەرێن دەڤەرا بەهدینان د چەندین رۆژنامە و کۆڤارێن کوردی دا وەرگێرانێن خو یێن هەمەرەنگ بەلاڤ دکرن کو د وی سەردەمی دا ئەو رۆژنامە و کۆڤارێن ب کوردی دەردکەفتن لاپەرێن خو ب بابەتێن وەرگێرای ژی خەملاندبوون وەك : رۆژناما

بوتان ١٩٩١، کۆڤارا خابور، تیرۆژ ١٩٩١، کۆڤارا سەرهەلدان ١٩٩١، مەتین خولا سێیێ ١٩٩١، کۆڤارا پیرس ١٩٩١، کۆڤارا ڕاستەرێ ١٩٩٢[٣٤]، کۆڤارا سەرهەلدان ١٩٩٣، ژین ١٩٩٣، لالش ١٩٩٣، پەیڤ (خولا دووێ) ١٩٩٣، گازی ١٩٩٤، حەفتیناما پەیمان ١٩٩٤، ڤەژین ١٩٩٥، ماف ١٩٩٥، کۆڤارا دهۆك ١٩٩٧،حەفتیناما ڕەسەن ١٩٩٥،کۆڤارا ڤەژین ١٩٩٥،کۆڤارا ماف ١٩٩٦،کۆڤارا دهۆك ١٩٩٧، کۆڤارا بیاڤ ١٩٩٩ ل ئاکرێ، کۆڤارا خازر ٢٠٠٢، کۆڤارا بشێش ٢٠٠٢، زاخو ٢٠٠٤، هێلین ٢٠٠٤،نوژین ٢٠٠٥ ل ئامێدیێ، سیلاڤ ٢٠٠٦ ل ئامێدیێ، کۆڤارا دیرۆك ٢٠١٣، کۆڤارا نیژەن ٢٠١٤ل شێلادزێ....و هەژی یە بێژین دبوارێ زارۆکان دا ژی ئەو کۆڤارێن ل دەڤەرێ بێن گرێدای و تایبەت بۆ زارۆکان لاپەرێن وان ژی ب بابەتێن وەرگێرای بخوڤە گرتینە وەك کۆڤارێن (سڤورە ١٩٩٨، زەنگ و بەنگ ٢٠٠١، کەپر ٢٠٠٣....) ، سەرەرای هژمارەکا پەرتووکێن گرێدای بوارێ زارۆکان هاتینە چاپکرن.

**چەند نموونەیەك ژ ڤێ قۆناغێ(گوتار) (١٩٩١-٢٠٠٠)**

| ناڤێ بابەتی | ناڤێ نڤیسەرا/ وەرگێرا | رۆژنامە/ کۆڤار و زمانێ ژێ هاتییە وەرگێران | ژمارە و سال و لاپەر |
|---|---|---|---|
| مزگەفتێت چینێ ژ کەڤنترین دەم هەتا نها | و: ناجی تاها بەرواری | کۆڤارا: ڕاستەرێ | ژ٧، ربیع الاول ١٤١٣-ئیلون ١٩٩٢، ل ٨. |
| چیرۆکێت زور کورت | ن: شکری تەیار ، و: عیدو بابە شێخ | کۆڤارا: پەیڤ/ عەرەبی. | ژ ١، ١٩٩٣، ل ٤٧ |
| شعر بوتە | ن: سیسیل دی لویس و: عصمت محمد بەدەل | کۆڤارا : پەیڤ/ عەرەبی. | ژ ٤، ١٩٩٧، ل ٣٢. |
| دایك | ن: سەمرێست مەیهام و: دەولەت عەلی | کۆڤارا : پەیڤ/ ئینگلیزی. | ژ ٤، ١٩٩٧، ل ٨٣. |
| پرسیار | ن: هند ابو الشعر و: حەسەن سلێڤانی | کۆڤارا : پەیڤ/ عەرەبی. | ژ ٨، ١٩٩٨، ل ٨٥. |
| ددل دایە صلاح الدین | ن: سمیح القاسم و: موئەیەد تەیب | کۆڤارا : پەیڤ/ عەرەبی. | ژ ١٢، ١٩٩٩، ل ١٣٨. |

ژ پەرتووكێن وەرگێرایی یێن چاپكری دناڤبەرا سالێن(١٩٩١- ٢٠٠٠)

| ژ | ناڤێ پەرتووكێ | ناڤێ نڤیسەری | ناڤێ وەرگێری/ ێ | جور و زمانێ ژێ هاتییە وەرگێران | سالا چاپكرنێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ئینجیلا لۆقا | --- | --- | --- | ١٩٩٢ |
| ٢ | رێزمانا كوردی -ئەلمانی | --- | جوتیار | | ١٩٩٤ |
| ٣ | كورد دناڤ تەوراتێ و ئنجیلێ دا | --- | بێدەل | ئینگلیزی | ١٩٩٤ |
| ٤ | چوار بەندێن خەیامی | --- | مەلا خەلیلێ مشەختی | هۆزان/ فارسی | ١٩٩٦ |
| ٥ | هۆزێن كوردی ل باكوورێ ویلایەتا مویسل و رۆژئاڤا فوراتی | | عەبدولكەریم فندی | ئینگلیزی | ١٩٩٦ |
| ٦ | ئاوازێن دلی | --- | مەسعود خالد گولی | فارسی | ١٩٩٦ |
| ٧ | داستانا مۆسیقێ | --- | عادل دهۆكی | فارسی | ١٩٩٦ |
| ٨ | بوچی شێرڤین یێ خەمگینە؟ | نۆڤلێت | د.عارف حیتو | ئینگلیزی | ١٩٩٧ |
| ٩ | قورتالبوویێن ژ ئەشكەنجەدانێ، جۆرەكێ نوو یێ نەساخانە | --- | د.عارف حیتو | ئینگلیزی | ١٩٩٧ |
| ١٠ | مێرگا قەنجان | ئیمامێ نەوەوی | ئەنوەر تەوفیق شیلانی/ گولی | ئایینی / عەرەبی | ١٩٩٧ |
| ١١ | قورتال بوویێن ژ ئەشكەنجەدانێ | --- | د.عارف حیتو | ئینگلیزی | ١٩٩٧ |
| ١٢ | شیزوفرینیا | --- | د.عارف حیتو | ئینگلیزی | ١٩٩٩ |
| ١٣ | فەرماندەیی | --- | حەسەن نوری | عەرەبی | ١٩٩٩ |
| ١٤ | هەمە رەنگیا كوردا | --- | د.رزگار | عەرەبی | ٢٠٠٠ |
| ١٥ | پەندێن ئەلمانی | --- | حەجی جەعفەر | ئەلمانی | ٢٠٠٠ |

## قۆناغا دناڤبەرا (٢٠٠٠- ٢٠١٦):

ل سەردەمێ ڤێ قۆناغێ دا بزاڤا وەرگێرانێ بەرەف خورتبوون و پێنگاڤێن هەژی چوویە، كو كاروانێ وەرگێرانێ گوهرینێن بەرفرەهتر ژ قۆناغێن بوری هاڤێژتینە، بۆ نموونە: دەزگەها سپیرێز[٣٥] یا چاپ و وەشانێ چەندین پەرتووكێن وەرگێرایی چاپكرینە، هەروەسا ڕێڤەبەری یا چاپ و بەلاڤكرنێ ل دهۆكێ ژی هژمارەكا پەرتووكێن وەرگێرای چاپكرینە، و ل كۆڤارا (مەتین)ژی ل سالا ٢٠٠٦ ێ زنجیرا وەرگێران هاتبوو دەستپێكرن و هژمارەكا پەرتووكێن وەرگێرایی هاتنە چاپكرن، و دیسا هندەك پەرتووكخانێن دهۆكێ ژی دگەل چاپكری و وەشانێن خو دا پەرتووكێن وەرگێرایی

**چەند نموونەیەك ژ ڤێ قۆناغێ(گوتار)(٢٠٠٠ - ٢٠١٦)**

| ناڤێ بابەتی | ناڤێ نڤیسەرا/ وەرگێرا | ڕۆژنامە/ كۆڤار و زمانێ ژێ هاتییە وەرگێران | ژمارە و سال و لاپەرە |
|---|---|---|---|
| بەرەف كوردستانێ سنوورێن ئاگرین. | ن: شێری لایزەر، و:حكیم عبدالله | كۆڤارا : پەیڤ/ ئینگلیزی. | ژ ٢٩، بهارا ٢٠٠٤، ل ١٠٩. |
| كارتێكرنا جڤاكی دپێكهاتا بهایێت جوانكاریێ دا ل سومەر و ئەكەد. | ن: د.فەوزی ڕەشید، و: ستار عەلی | كۆڤارا : پەیڤ/ عەرەبی. | ژ ٢٩، بهارا ٢٠٠٤، ل ٩٣. |
| قارەمان دناڤبەرا باشیێ و خرابیێدا. | ن: شكری محمد عیاد و: سەلمان كوڤلی | كۆڤارا : پەیڤ/ عەرەبی. | ژ ٢٩، بهارا ٢٠٠٤، ل ١٠٢. |

**ژ پەرتووكێن وەرگێرایی یێن چاپكری دناڤبەرا سالێن(٢٠٠٠-٢٠١٦)[٣٦]**

| ژ | ناڤێ پەرتووكێ | ناڤێ نڤێسەری | ناڤێ وەرگێری/ ێ | جور و زمانێ ژێ هاتییە وەرگێران | سالا چاپكرنێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ژ پەندێن ئەلمانی | --- | حەجی جەعفەر | ئەلمانی | ٢٠٠٠ |
| ٢ | چەندی عەرد بزڤریت | ڕەسول حەمزە توف | بەدەل ڕەڤو مزووری-خەیری هەژار مزووری | هۆزان/ عەرەبی | ٢٠٠١ |
| ٣ | سەرهلدانا سانونێ | كونێ ڕەش | موسەدەق تۆڤی | مێژوو/ عەرەبی | ٢٠٠١ |

| ٤ | چارەسەریا مەلاریایێ | --- | د.عارف حیتو | ئینگلیزی | ٢٠٠٢ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥ | زارۆك دژیێ ئێك سالیێدا | --- | د.عارف حیتو | عەرەبی | ٢٠٠٢ |
| ٦ | زارۆك دژیێ ٢-٣ سالیێدا | --- | د.عارف حیتو | عەرەبی | ٢٠٠٢ |
| ٧ | دەروونناسیا زارۆکان | حسێن نەجاتی | محەممەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز) | فارسی | ٢٠٠٣ |
| ٨ | رێنومایا کونترۆلکرنا کولێرایێ | --- | د.عارف حیتو | نۆشداری/ ئینگلیزی | ٢٠٠٣ |
| ٩ | بۆچی هوین ژ مرنێ دترسن؟ | --- | مەسعود خالد گولی | فارسی | ٢٠٠٤ |
| ١٠ | بارکرن بەرەف دەریایێ | زەکەریا تامر | د.عارف حیتو | چیرۆك/ عەرەبی | ٢٠٠٤ |
| ١١ | کەلیلە و دمنە | عبدالله بن المقفع | محەممەدئەمین دۆسکی | عەرەبی | ٢٠٠٤ |
| ١٢ | چیڤانوکێن ئیسوبی | --- | د.فازل عومەر | ئینگلیزی | ٢٠٠٤ |
| ١٣ | سەردەمێ دینەسوران | جوناتان راتسلاند- دیڤید ناش، وەرگێران بۆ فارسی: حەمید رچا اصلانی | جاهیدا بیری | فارسی | ٢٠٠٤ |
| ١٤ | کێتك و بنەمالا وێ | شەفیق مەهدی | موئەیەد تەیب | عەرەبی | ٢٠٠٤ |
| ١٥ | سەگ و بنەمالا وی | شەفیق مەهدی | موئەیەد تەیب | عەرەبی | ٢٠٠٤ |
| ١٦ | مرۆڤێ بەری دیرۆکێ | سام و ئیپریل ئیشتاین | تەحسین دۆسکی | عەرەبی | ٢٠٠٤ |
| ١٧ | ناما ئاشتیێ | خاڤێر ڤیڤانی | موئەیەد تەیب | سویدی | ٢٠٠٤ |

| ١٨ | كەچا ژ هەیڤێ هاتی | شاگاهیراتا | مەسعود خالد گولی | فارسی | ٢٠٠٤ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩ | خزینە | --- | د.عارف حیتو | چیرۆك/ عەرەبی | ٢٠٠٥ |
| ٢٠ | دەما هێشتا گیانەوەر دئاخڤتن | --- | حەجی جەعفەر | ئەلمانی | ٢٠٠٥ |
| ٢١ | داستانا گلگامێش | --- | دەحام عەبدولفەتاح | عەرەبی | ٢٠٠٥ |
| ٢٢ | هۆنەرێ پەیڤینێ (چاوا جوان باخڤین؟) | --- | جگەرسۆز پێندرویی | فارسی و عەرەبی | ٢٠٠٥ |
| ٢٣ | دارا هنارێ | یەشار كەمال | فورات جەوهەری | ڕۆمان/ توركی | ٢٠٠٥ |
| ٢٤ | ئامیرێن موزیكی یێن كوردی | عەلی ئەصغەر نەسرۆللاە پور | مەسعود خالد گولی | فارسی | ٢٠٠٥ |
| ٢٥ | كولیلك چەوا شین دبن؟ | سۆزان مایز | محەممەدئەمین دۆسكی | عەرەبی | ٢٠٠٥ |
| ٢٦ | هنگڤین چەوا چێدبیت؟ | ئەننا كلیبۆرن | ئیسماعیل تاها شاهین | عەرەبی | ٢٠٠٥ |
| ٢٧ | هێزا ئاڤێ | مەحمود سالەك | جاهیدا بیری | فارسی | ٢٠٠٥ |
| ٢٨ | سەدەمێن زارۆك | م.دانش زادە | حسێن سەنعان | فارسی | ٢٠٠٥ |
| ٢٩ | كەڤوكا ئاشتیێ | فرندریك رێكناگل | موئەیەد تەییب | سویدی | ٢٠٠٥ |
| ٣٠ | نێچیرڤانێن درندە | دیڤید نیكوك- جێین دانلی | جاهیدا بیری | فارسی | ٢٠٠٥ |
| ٣١ | ئەردێ زێرین | --- | لوقمان ئاسهی | ئینگلیزی | ٢٠٠٥ |
| ٣٢ | كەچا میرێ مشكان | حوسێن ئەرسی | مەسعود خالد گولی | فارسی | ٢٠٠٥ |
| ٣٣ | مێشا شڕ | ڤ.ب- بیانكی | باڤێ نازێ | ڕوسی | ٢٠٠٥ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٤ | هەر تشتەك دەربارەى بارانێ | سۆزان مایز | محەممەدئەمین دۆسكی | عەرەبی | ٢٠٠٥ |
| ٣٥ | چەوا كەمان چێبوو؟ | --- | محەممەد سەعید ژۆری | ئەلمانی | ٢٠٠٥ |
| ٣٦ | سەربازێ خوراگر | هانس گریستیان ئەندرسن | موئەیەد تەییب | سویدی | ٢٠٠٥ |
| ٣٧ | هانسل و گرتل | براین گریم | رێكار مزویری | فارسی | ٢٠٠٥ |
| ٣٨ | بەفرێن كلیمەنجارۆ و هندەك چیرۆكێن دی | ئێررنست هەمینگوەى | صەلاح سەعدوللا | چیرۆك/ ئینگلیزی | ٢٠٠٦ |
| ٣٩ | گەریان ل دووڤ بەختەوەریێ | لورد ئاوویبوری | محەممەدسالح پیندرۆیی (جگەرسۆز) | فارسی | ٢٠٠٦ |
| ٤٠ | پێنج چیرۆكێن بەری سەد سالان ل كوردستانێ | كارل مای | حەجی جەعفەر | ئەلمانی | ٢٠٠٦ |
| ٤١ | چیرۆك و چیڤانوكێن سولاڤی | --- | حەجی جەعفەر | ئەلمانی | ٢٠٠٦ |
| ٤٢ | هەڤدەرێ مە | --- | د.عارف حیتو | چیرۆك/ عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٤٣ | ئافرەت و زارۆك بوون | د.لویس كارو - د.چاچان خالدی | عصمەت خابوور | عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٤٤ | هنگاڤتنا پاشەرۆژێ | ئەلڤین توفلەر وەرگێران بۆ عەرەبی : عەبدوللەتیف خەیات | محسن قوچان | عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٤٥ | دیموكراسیەتا راگەهاندن و پەیوەندیكرنێ | د.محمد عەبدولقادر حاتم | نزار ئورمانی | عەرەبی | ٢٠٠٦ |

| ٤٦ | هیڤی و عەور | سوفیا بروکوفیفا وەرگێران بۆ عەرەبی: عززە حسێن کبە | فەهیما ئیبراهیم عەبدوللا | چیرۆك/ عەرەبی | ٢٠٠٦ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٤٧ | رۆلێ رۆژنامەگەریا کوردی دپێشڤەبرنا هزرا نەتەوەیی یا کوردی دا | هۆگر تاهر تەوفیق | محسن عەبدورەحمان | عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٤٨ | تێشکە رویڤینێ بەرزە | ئێرینا کورشۆنێڤ | نیدا بیری | فارسی | ٢٠٠٦ |
| ٤٩ | هرچ ، مێشا هنگڤینی | بن زلس، وەرگێران بۆ فارسی: سەبا بابایی | مەسعود خالد گولی | فارسی | ٢٠٠٦ |
| ٥٠ | گیڤرێ ئاشڤانی | بڕایین گریم | جوتیار بامەرنی | ئەلمانی | ٢٠٠٦ |
| ٥١ | کچکا شخارتە فرۆش | کریستیان ئەندرسن | مەسعود خالد گولی | فارسی | ٢٠٠٦ |
| ٥٢ | دارو بار | ئەکادیمیا ئاڤنەتەوەی | ئیسماعیل تاها شاهین | عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٥٣ | ئەختوباری | --- | د.عارف حیتو | چیرۆك/ عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٥٤ | مغامەراتێن کابتن رنجل | ئەندریە نکراسوف ، وەرگێران بۆ عەرەبی: ئەنغام عەبدولکەریم | سەلام بالایی | عەرەبی | ٢٠٠٦ |
| ٥٥ | پینۆکیوو | کارلو کولودی | هزرڤان | --- | ٢٠٠٦ |
| ٥٦ | چیایێن سپی | جان کریستوفر | لەزگینێ ئاڤدەرهمانی | ئینگلیزی | ٢٠٠٦ |
| ٥٧ | ئەو هاتن بەغدا | ئاگاتا کریستی | سەلاح سەعدوللا | چیرۆك/ ئینگلیزی | ٢٠٠٧ |

| ٥٨ | چاڤلێكرن و نویكرن دئەزموونگەریا ژاپونی دا | د.عەبدولغەفار رەشاد | مەسعود حسێن بوتانی | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥٩ | مێشەمور | --- | ئیسماعیل تاها شاهین | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
| ٦٠ | ژ دیرۆكا ئەشكەنجەدانێ دئیسلامێ دا | هادی ئەلعەلەوی | جەلال مستەفا | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
| ٦١ | رۆژانێن هیڤیێ | --- | نازدار | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
| ٦٢ | سنۆرێن ئاگرین | شێری لایزەر | حەكیم عەبدوللا | ئینگلیزی | ٢٠٠٧ |
| ٦٣ | چیڤانۆك ژ هەمی دنیایێ | هانس یورگك ئوتەر | حەجی جەعفەر | ئەلمانی | ٢٠٠٧ |
| ٦٤ | قەرەچ : سێ شانوگەریێن پوشكینی | --- | ئەنوەر محەممەد تاهر | --- | ٢٠٠٧ |
| ٦٥ | ژن دناڤبەرا میتولوژیا و نویخوازیێ دا | خەدیجا صەببار | سەعید عوسمان عەبدوللا | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
| ٦٦ | چیرۆكێن رۆیڤیا | --- | محەممەد مەلا حەمدی | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
| ٦٧ | ئاڤ | پامیلا گرانت- تارنەر هاسویل | محەممەدئەمین دۆسكی | عەرەبی | ٢٠٠٧ |
| ٦٨ | شاە ئیسماعیل صەفەوی و دامەزراندنا دەولەتا صەفەوی | د.ئەمیر حوسێن خونجی | نزار ئەیوب گوللی | دیرۆكی/ فارسی | ٢٠٠٨ |
| ٦٩ | ئەلیفبا كوردی ب پیتێن لاتینی و عەرەبی | هۆگر تاهر تەوفیق | محسن عەبدوررەحمان | عەرەبی | ٢٠٠٨ |
| ٧٠ | رێزمانا كوردیا كورمانجی | ویلەر م. ساكستون | فاخر عومەر محمد | زمانی/ ئینگلیزی | ٢٠٠٨ |
| ٧١ | تەفسیرا ب ساناهی بۆ قورئانا پیرۆز | دانانا هژمارەكا زانایان ب چاڤدێریا د.عبدالله الترکی | تەحسین ئیبراهیم دۆسكی | ئایینی/ عەرەبی | ٢٠٠٨ |

| ٧٢ | گەلیێ هەیڤا شین | --- | د.عارف حیتو | چیرۆك/ ئینگلیزی | ٢٠٠٨ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٧٣ | ئیسلام و ئەوروپا دژبەری و بهەڤرە ژیان | ئنگمار كارلسسۆن | زین العابدین زنار پەنجینار | ئینگلیزی | ٢٠٠٨ |
| ٧٤ | گۆلبژێرا هەلبەستڤانێن نەمسایێ | بەدەل رەڤو مزووری | بەدەل رەڤو مزووری | هۆزان/ ئەلمانی | ٢٠٠٨ |
| ٧٥ | بێ ئیفلەحیا گۆنەهێ و كارتێكرنا وێ ل سەر ژیانا مللەتان | د.عبدالله بن محمد السدحان | تەحسین ئیبراهیم دۆسكی | ئایینی/ عەرەبی | ٢٠٠٨ |
| ٧٦ | گەنجینا چیرۆكان | --- | د.فازل عومەر | ئینگلیزی | ٢٠٠٨ |
| ٧٧ | كورد و كوردستان | دێرك كینان | د.لەزگینێ ئاڤدرەهمانی | دیرۆكی/ ئینگلیزی | ٢٠٠٨ |
| ٧٨ | برەكا بالندان | --- | عزەت یوسف | ئینگلیزی | ٢٠٠٨ |
| ٧٩ | شۆرشا كوردێن تركیا و كاریگەریا وێ ل سەر پەیوەندیێن دەرڤەییێن ئیرانێ ١٩٠٨-١٩٣٢ | كاوە بەیات | موسەدەق توڤی | دیرۆكی / فارسی | ٢٠٠٩ |
| ٨٠ | فەرهەنگا ئیكسفورد بۆ زارۆكان | ئیلڤن گولد سمیث | ئیسماعیل عەلی دۆسكی | ئینگلیزی | ٢٠٠٩ |
| ٨١ | ناڤێن ئیسلامی | ئانێ ماری شیمل | مەسعود خالد گوللی | ئایینی / فارسی | ٢٠٠٩ |
| ٨٢ | پەیوەندی دناڤبەرا مامۆستای و قوتابی دا | هایم گینات | محەممەدسالح پێندرۆیی (جگەرسۆز) | فارسی | ٢٠٠٩ |
| ٨٣ | گەشتەك بۆ نك خودێ | د.نەجیب گیلانی | تەحسین ئیبراهیم دۆسكی | رۆمان/ عەرەبی | ٢٠٠٩ |

مللی ژ فارسی وەرگێرابوونە کوردی ، بەلێ ژ بەر کو بەلگە ژ دەستنڤیس و نڤیسێن وی نەگەهشتینە مە(بەرچاڤ نەبووینە) دا کو ببیتە ئێکەم وەرگێرێ کرمانجیا ژووری(ئانکۆ دێ مینیت هەتا کو ب بەلگەڤە بەرهەمێ وی دهێتە دیتن).

- نڤیسەر و وەرگێر مامۆستا (سەلاح سەعدوللا ١٩٣٠-٢٠٠٧ز) ب وەرگێرانا پەرتووکا (ئەوێ دپلوماسی) یا (جیمس اولدرج) ژ ئینگلیزی بۆ کرمانجیا ژووری دبیتە ئێکەم وەرگێرێ دەڤەرا بەهدینان کو پەرتووک وەرگێرای و چاپکری.

- ل دەڤەرا بەهدینان (نڤێسەرێن بەهدینان) د مەیدانا وەرگێرانێ دا ب وەرگێرانێن گوتار و جورێن ئەدەبیاتی دەستپێکرینە کو درۆژنامە و کۆڤارێن قۆناغێن جودا جودا دا بەلاڤکرینە.

- نڤێسەر و هۆزانڤان (د.عارف حیتو) د ماوێ ڤێ ڤەکۆلینێ دا دهێتە هژمارتن خودان پترترین بەرهەمێن وەرگێرایی یێن چاپکری ل دەڤەرا بەهدینان کو سەرجەمێ بەرهەمێن وی یێن وەرگێرایی نێزیکی (٣٦) پەرتووکانە، و نڤێسەرێن وەرگێر (دیان جەمیل) و (ئیدریس غازی) ژی دوویڤ دا دهێن.

-قۆناغا دناڤبەرا (٢٠٠٠-٢٠١٦) ب خورتترین و چالاکترین قۆناغ دهێتە هژمارتن کو بزاڤا وەرگێرانێ پێنگاڤێن بەرفرەهتر هاڤێژتی و پتر وەرگێرێن نوی بخوڤە گرتی و نەخاسمە تەخا گەنجان.

-دەڤەرا بەهدینان پێدڤی و فەراتیەکا مەزن ب هەبوونا دەزگەهەکێ وەرگێرانێ هەیە کو هەمی بەرهەمێن وەرگێرای بۆ کرمانجیا ژووری (بەهدینی) و نەخاسمە یێن (پارێزگەها دهۆکێ) بخو ڤەبگریت و سەرەرای چاپکرن و گرنگی دان ب وەرگێر و وەرگێرانێ.

# ژێدەر و پەراوێز


١. ارشد حیتو، رۆلێ وەرگێرانێ دپێشڤەبرنا ئەدەبێ کوردیدا ل سالێن ١٩٩١-٢٠٠١ دەڤەرا بەهدینان وەك نموونە(پشکا دووێ)، کۆڤارا پەیڤ، ژمارە ٢٩، بهارا ٢٠٠٤،ل ٤١-٤٢، و بۆ زێدەتر زانیاریان ل دور گەهشتنا وی ل دەڤەرا کاردوخییان بنێرە، هەرەگول عەزیزان (میر جەلادەت بەدرخان)، کاردوخی و وەلاتێ کاردوخان ئان کورد و کوردستان دوەختێ یەونانیستانا کەڤن دا، کۆڤارا هاوار، ژمارە ٣٢، دوو شەمب ١ ئیلونا ١٩٤١، کۆڤارا نیژەن، ژمارە ٦، بهارا ٢٠١٦، ل ٣.

٢. د.عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاریخی لإمارە بهدینان،(اربیل:٢٠١١)، ص٣٠٣، هێرش کەمال رێکانی، ئامێدیێ و چەند گەرۆکێن بیانی، کۆڤارا سیلاف ، ژمارە(٨)،کانوونا ئێکێ ٢٠٠٦، ل ٢١-٢٢، د.برگێت ئامان ، کورتە دیرۆکا باژێرێ ئامێدیێ ، کۆڤارا هاڤیبوون، ژمارە ٢٥و٢٦، ٢٠١٠، ل ٧٧- ٧٨، کۆڤارا نیژەن، ژمارە ٥، زڤستانا ٢٠١٥، ل ٧٢، مێژوویا چاپکرنا ئێکەم پەرتووکا کوردی پشتی داهێنانا چاپخانەیا نوی ڤەدگەریتەڤە بۆ سالا ١٧٨٧ێ ل رۆما، دەمێ مزگینەدەرێ کاسولیکی(ماوریزو گارزونی) ئێکەمین رێزمانا کوردی ب زمانێ ئیتالی ب (٧٨)لاپەر دانا،و هژمارا لاپەرێن دیترێن پەرتووکێ(٢٨٨)لاپەرە، پێك هاتییە ژ فەرهەنگەکا ئیتالی -کوردی یا پێنج هزار پەیڤ، هەروەسا(فەرهەنگا هەڤبەرکرنا هەمی زمان و شێوەیان) یا ئەکادیمی یا روسی (پالاس)کو ل هەمان سال ئانکۆ (١٧٨٧ز) هاتبوو چاپکرن و(٢٧٦) پەیڤێن کوردی بخوڤە گرتینە. بنێرە: فاروق عەلی عومەر، رۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا بەراییەکان ١٩١٤-١٩٣٩، کردوویە بە کوردی : تاریق کارێزی، چ١، (هەولێر: ٢٠٠١)، ل ٣٢.

٣. ارشد حیتو، ژێدەرێ بەرێ، ل ٤٤، لێ یا دروست ئەوە بۆ شێوەزارێ هەورامی(گۆرانی) وەرگێرابوون هەر وەکی د.مارف خەزنەدار ددەتە دیارکرن کو خانای قوبادی ب بنەکوك نەڤیێ قوباد بەگە ژ بنەمالا پاشایێن باجەلان و سالێن بوون و مرنا وی(١٧٠٤-١٧٧٨ز) دەست نیشانکرینە و دایە دیارکرن کو نەچاربوو جهێ خو بهێلیت و بچیتە وەلاتێ بابان(میرگەها بابان) و هەر ل وێرێ ل سالا ١٧٧٨چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ.بنێرە: د.مارف خەزنەدار ، مێژووی ئەدەبی کوردی، سەدەکانی چواردەم - هەژدەم، بەرگی دووەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل ٨٩ و ٩٤، و بۆ زانین شێوەزارێ گۆرانی شێوەزارێ فەرمی یێ میرگەها ئەردەلان بوو( دەڤەرا هەورامان ژی دکەڤیتە رۆژئاڤا ئەردەلان) و هەر وەسا شێوەزارێ فەرمی یێ میرگەها بابان ژی بوو دماوەیەکێ دیرۆکا ڤێ میرگەهێ دا و ژ وان هۆزانڤانێن هۆزان ب زارێ گۆرانی نڤیسین وەك : خانای قوبادی (١٧٠٤-١٧٧٨) و(بێسارانی ١٦٤٣-١٧٠١) و(وەلی دێوانە ١٧٥٤-١٨٠١) (مەولەوی ١٨٠٦-١٨٨٢) بنێرە، معتصم سالیي، ثقافة أهل الحق و معتقداتهم ، جریدة الاتحاد، العدد١٦٤٠، السبت ٢٠٠٧/٨/٢٥، کو گۆرانی دبیتە : هەورەمانی ، باجەلانی

# فولکلۆر: یاسا نەتەوەی یا کوردی

پ.هـ.د. عیماد وەیسی خالد

مللەتێ کورد ئێك ژوان مللەتایە کو ژبەر بارودوخێ خوبێ سیاسی و نەبوونا کیانەکێ سیاسی یێ دیارکری، هەمی دەمان ل بەر مەترسییا حەلیانا دناڤ مللەتێن دی و ژنافچوونێ بوویە. ئەدەب ل بن سیبەرا تەناهی وئارامی وسەقامگیریا سیاسی گەشەسەندنێ بخوڤە دبینیت. وهەبوونا کیانەکێ سیاسی دبیتە ئەگەرەکێ هاریکار بۆ پاراستنا وی ئەدەبی و گەهەشتنا وی بۆ دەستێ بەرەبابێن نوی. ژ بەربارودوخێ مللەتێ کورد ئەدەبێ نڤیسی یێ سەردەمێن کەڤن بەرزەبوویە و نەگەهشتیە دەستێ مە. و ل دووڤ بەلگێن هەین، دەسپیەکا ئەدەبێ نڤیسی بو سەدساليیا (١٠ێ) زایینی دزڤریت و ئەدەبێ سەردەمێن کەڤنێ مللەتێ کورد د قالبێ ئەدەبێ فۆلکلۆریدا خویادبیت.

ئەو چەندا ئەڤرۆ ئەم ب فۆلکلۆر و ئەدەبێ فۆلکلۆر دنیاسین دسەردەمێن کەڤندا پێدڤییەکا سەرەکییا ژیانا مللەتێ کورد بوویە و وی وەك لایەنێ زانستی پەسەند کربوو و ب کار دهینا، چونکە ل وی سەردەمی بارودوخێن گونجایێن خواندن و فێرکرنێ نەبوون تاوەکو بشێت ڤالاتییا پەروەردەیی ل دەڤ مللەتێ کورد پربکەت ولایەنی پەروەردەکرنێ ژی پێدڤی ب چەسپاندنێ بوو تاوەکو هوشیاریيا نەتەوەیی ل دەڤ بەرەبابێ نوێ زێدەبکەت .

هەرمللەتەکی بۆ ب ریڤەبرنا کاروبارێن ناڤخوییێن خۆ پێدڤی ب هندەك یاسایان هەیە کو ب یاسا دەولەتێ دهێتە ناڤکرن، لێ ل دەڤ مللەتێ کورد ژبەر نەبوونا دەستەلاتداریا سیاسی ئەم یاسایانە دقالبی یاسا نەتەوەیی دا دیاردبیت، ڤان یاسا هاریکاریيا مللەتێ کورد کریە تاوەکو بشێت کیانەکێ نەتەوەیی ئاڤا بکەت وببیتە ئەگەری پێشکەفتن و لگەل سەردەمی چوونێ.

ئێکەم لایەنێ گرنگ هەبوونا بیروباوەرانە کو وەك بنەمایێن سەرەکی، لایەنێن ئایینی، هزروبیر ورەوشت و تیتالێن مرۆڤی ل سەر ئاڤادبن. ل سەردەمێ کەڤن ئەفسانە شیا ڤێ ڤالاتیێ پربکەت و ب دانانا هندەك بنەما وەك هەیکەلەکێ ئایینی، بیروباوەر ل دەڤ مللەتێ پەروەردەکرینە. هەرچەندە ب هاتنا ئایینی ئیسلامێ گەلەك ژڤان بیروباوەران جهێ خۆدایە بیروباوەرێن ئیسلامێ لێ بەری جێگیربوونا ئایینێن ئاسمانی ئەرکێ ئاڤاکرنا لایەنێ ئایدیۆلۆژی و فەلسەفا ئایینی ل دەڤ مللەتێ کورد پتر ل سەرملێ ئەفسانێ بوویە. ئەفسانێ ب ڤێ چەندی بەرسڤا پرسیارێن مرۆڤی ددا و دبوو ئەگەرێ چێکرنا بارودوخەکێ تەنا و ئارام و پاراستنا وی ژدو دلیێ و رارایێ .

هەژی گوتنێیە ئەو بیروباوەرێن کەڤن کو زۆرجار ئەم ب بیروباوەرێن پروپویچ وخورافی دهژمێرین وەك رێکا چارەسەرکرنا ئاریشان دهاتنە ب کارهینان؛ بۆ روونکرنا ڤی بابەتی دی نموونەکێ ئینین: ل هندەك دەڤەرێن کوردستانێ بیروباوەر هەنە کو ل دەمەکێ دیارکری ژ سالێ رووبارێ دەڤەرێ گازی دکەت و داخوازا خوینێ یان قوربانی دکەت و رەنگێ رووباری ژی سووردبیت. هەرچەند ئەم د ڤێ باوەرێ داینە کو ئەڤ بیروباوەرە ژلایی زانستیڤە نە دراستن، چونکە نە رووبار گازی دکەت و نە دئاخڤیت ونە رەنگی وی سووردبیت و وەك دیاردەکا سروشتی پێدڤی ب قوربانیدانێ نینە لێ خەلکێ دەڤەرێ باوەری ب ڤی چەندێ هەیە و وەك بیروباوەر جهێ خو دهزرا وان داکرییە . ئەڤ چەندە وەك دیار بۆ سەردەمێن گەلەکێن کەڤن دزڤریت کو هێشتا مرۆڤ دوێ هزرێ دابوو کو دیاردێن سروشتی گیانێ هەی و هەست ب دەوروبەرێن خو دکەن. و ب ڤان ئەڤسانان بەرێ بنیاتی بۆ هزروبیر و رەوشت و تیتالێن ئایینی هاتنە دانان و رەدکرنا وان وەك دەربازبوون ژ هێلا سوور دهاتە هژمارتن .

پشتی دامەزراندن و ئاڤاکرنا کۆمەلگەهێن مرۆڤایەتی، هەر چەندە هندەك ئاریشە وەك ترس و ژیانا تاکەسی ب دووماهی هات لێ هندەك ئاریشێن دی پەیدا بوون کو بەرهەمێن ژیانا چڤاکی بوون، ل دەڤ مللەتێن سەرەتایی ئەڤ ئاریشە ب رێکا چیرۆکێن فۆلکلۆری دهاتنە چارەسەکرن و دناڤ هەر چیرۆکەکێ دا پالەوانەکی نموونەیی (مثالی) هەبوو کو خودان هێزەکا سەرڤەیی واقیعی بوون و ب هاریکاریا وێ هێزێ زێدەباری جادووگەریێ ئەو ئاریشە چارەسەردکرن . پشتی پەیدا بوونا دەزگەهێن میری ڤان چیرۆکان جهێ خودایە یاسایان. لێ ل دەڤ مللەتێ کورد هەرچیرۆکێ چارەسەریا ئاریشێن چڤاکی دکر. چونکە دەمێ مللەتێن بوونە خودان کیان، مللەتێ کورد تازە کیانێ خوێ سیاسی ژ دەست دا .

ئێك ژ لایەنێن گرنگ دژیانا مرۆڤی دا مێژوویا هەر مللەتەکییە ومرۆڤی بێ مێژوو وەك دارەکا بێ رهـ و ریشالە . دناڤ هەر مللەتەکی دا مێژوونڤیس ب ئەرکێ توومارکرن و نڤیسینا رویدانا وەك مێژوویا وی مللەتی رادبیت . بەری نڤیسین پەیدابیت هەمی مللەتان ب رێکا ڤەگێرانا رویدانا دقالبێ داستانان دا ئەو رویدان دپاراستن و دەمێ نڤیسین پەیدابووی وشیاین کیانەکی ژی بۆ خۆ دروست بکەن ئەو رویدان وەك مێژوویا نەتەوایەتی توومارکرن و هەتا نوکە ژی فەخر وشانازیێ بێ دکەن. هەرچەندە دڤۆناغێن سەرەتایی دا هەمی مللەت دڤێ چەندێ دا وەك ئێك بوون. لێ پشتی چێبوونا کیانان رێکا مللەتێ کورد ژوان جودا بوو، واتا دەمێ وان بدەستێ خو مێژوویا خو توومارکری، مللەتێ کورد تازە بندەست بوو ب ڤێ چەندێ ب ئەگەرێ دانپێنەدانا ب مافێن وی وەك مللەتەك مێژوویا کوردی ژی نەهاتە توومارکرن، زێدەباری ڤێ چەندێ گەلەك ژ شۆرش و راپەرینێن مللەتێ کورد بۆ ئازادی و سەربەستیێ کو ب خوینا لاوێن کورد هاتبوو وجودێ ژ لایێ مێژوونڤیسێن مللەتێن داگیرکەر یان نەهاتە بەحسکرن یان ب خیانەت و کارێن دژی ئایین وشۆرشێن رەگەزپەرەستانە و پاشکەفتن دهاتەناڤکرن. مللەتێ کورد شیا ب هاریکاریا ئەدەبێ فۆلکلۆری و ب تایبەت داستانێن فۆلکلۆری پرانیا وان رویدانان وەك مێژوویا زێرینا خۆ توومارێکەت. وی خوینا خۆ وەك حبر بۆ قەلەمی وسینگێ گەنج وبێرین مللەتێ کرە کاغەز بۆ توومارکرنا رویدانان وئەڤ رویدانە ب رێکا گوتنێ ژبەرەبابێن کەڤن بۆ بەربابێن نوی و د قالبێ مێژوویا پڕ سەروەریا مللەتی دا هاتە ڤەگوهاستن و گەهشتە دەستێ مە .

لایەنێ هزری ئێك ژوان لایەنێن گرنگە کو هەر ژکەڤن وەرە مللەت ودەولەتان گرنگی پێ دایە . ل کۆمەلگەهێن نوی ب ڤەکرنا خواندنگەهـ و ناڤەندێن فێرکرێ و دانانا پلانێن پەروەردەیی زارۆك پەروەردەدکەن و بەرەبابێن نوی پێ دگەهین لێ ل سەردەمێن کەڤن ئەڤ ئەرکە ب رێکا پەروەردەکرنێن ئایینی یان فێرکرنێن پەروەردەیی دناڤ ناڤەندێن ئایینی دهاتنە ب رێڤەبەرن، هەر مللەتەك پشتی دامەزراندنا کیانێ سیاسی بۆ خۆ شیا ب دانانا پلانێن پێدڤی ئەرکێ پەروەردەکرنا بەرەبابێن نوی ب جهـ بینیت. مللەتێ کورد ژی ئەڤ لایەنە ژ بیرنەکر و ل دووف شیانێن خۆ ب ڤی ئەرکی رابوو؛ ژبەر نەبوونا سیستەمێ دەستەلاتداریێ، مللەتێ کورد پەنابرە بەر فۆلکلۆری و ب دانانا پشکەکا تایبەت ب ناڤێ مامك یان مەتەلوکان شیا ڤێ چەندێ جهێ بینێت

و پلانەکا پەروەردەیێ دارێژیت بۆ ڤێ چەندێ مفا ژدو جۆرێن مامکان وەرگرت :

١- مامکێن مەبەستدار: ب هاریکاریا ڤێ جورێ مامکان شیا شیانێن هزری و لەزاتیا گەهشتنا ب مەبەستان ل دەڤ زارۆکێ کورد ب هێز بێخت .

٢- مامکێن ڤەگەری: ب رێکا وان شیا لایەنی شروڤەکرن وگەهشتنا ب ئەنجامان واتا شیانێن لێکدانێ ل دەڤ زارۆکێ کورد بەرڤ پێش ببەت.

ب ڤێ رێکێ مللەتێ کورد شیا د بارودوخی خو یێ نالەباردا ودویر ژ خواندنگەهـ و دەزگەهێن پەروەردەیی زارۆکێ خۆ پێش بێخیت وئەڤ چەندە د ئاستێ تێگەهشتنا زارۆکێن کورد ل دەمێ تاقیکرنێن شیانێن هزری دا دیاردبێت .

لایەنێن کۆمەلایەتی و پەروەردکرنا بەرەبابێن نوی وناساندنا رەوشت وتێتالێن مللەتی ئێك ژ ئەرکێن سەرەکی یێن دەزگەهێن پەروەردەیینە. بهایێ ڤێ چەندی وی دەمی دیاردبیت کو بەرەبابەکی نوی ب شێوەیەکێ زانستیانە دهێتە پەروەردەکرن و ژخەلەتیان دهێتە پاراستن ئەڤ چەندە ببوو بەدیلەك بۆ دەزگەهێن فێرکرن و پەروەردەیی وەك خواندنگەهـ و زانکۆ وبنگەهێن رەوشەنبیری. گوتنێن مەزنان ئەڤ ئەرکێ گران ب ستوێی خوڤە گرت وشیا کۆمەلەکا ئاموژگاری و ریکێن پێدڤی ل پێش مرۆڤێ کورد دانیت. بەربابێن کەڤن ئەو سەرهاتیێن ب سەردا دەرباز بووین وەك بیرهاتن یان سەرهاتیێن ئاموژگاریێ دقالبی رستەیەکا کورت وناڤەرۆکەکا کویر بەحس دکر. پشت بەستنا وان ب ڤان گوتنان بۆ ئاخفتنێن خو، ئەڤ گوتنە ب رەنگەکێ بەرفرەهـ دناڤ هەمی چینین خەلکی دا بەلاڤ بوون. واتا ل شوینا بەرزەکرنا وان سەرهاتیان کویتر وەك خەلەتی بوون ئەو ب باشترین و جانترین فورم وناڤەرۆك دەهەمی پیاڤاندا پێشکەفتی هەمی چینین مللەت کرن.

ئێك ژوان لایەنێن گرنگ کو بەرەبابێن کەڤن ژیرکری گرنگیدان ب هەست وسوزێن مللەتی بوو. ئەڤ لایەنە چێدبیت خوشی یان نەخوشی بیت. ئەڤ چەندە ل دەڤ مللەتێن خودان کیان ب دەستنیشانکرنا رۆژێن دلخوشکەر واتا هەلکەڤتێن خوش یان بیرەوەری یێن نەخوش دهێتە ب جهـ هینان لێ مللەتێ کورد ژبەر بارودوخێ خو و نەبوونا کەشوهەوایەکێ گونجای وهەروەسا بۆ هندێ کو سەربوورێن نەخوشێن مللەتی وەك شکەستنا راپەرین وشۆرشا لی نەبیتە ئەگەرێ لاوازی و دابەزینا وورا خەلکی و بچویك نیشاندانا وان نەخوشیيان ستران وەك پشکەکا ئەدەبێ فۆلکلۆر هاتە مەیدانێ وبەرەبابێن کەڤن ب هاریکاریا ستران ژبلی چێکرنا خوشیيان و بهێن ڤەدانێ چەند ئارمانجێن دی ژی ل پشت ڤەشارتن ژوان بابەتان :

١- چێکرنا هەرەوەزیێ (تعاون) دناڤ چینین مللەتی دا بۆ پەیدابوونا گیانێ هاریکاریێ ددەمێ شولکرن، خوشی یان نەخوشیيان‌دا .

٢- گەلەك ژ رویدانێن مێژوویێن مللەتێ دقالبێ ستران دا هاتنە بەحسکرن و ب ڤێ چەندێ سترانێ هاریکاریا داستانان کر، ژبۆ پاراستنا مێژوویا مللەتی.

٣- سروشتێ کوردستانێ وەك بابەتەکێ جوگرافیایی ب جوانترین شێوە دناڤ سترانان‌دا رەنگ ڤەدایە.

٤- رۆلێ ئافرەتێ دناڤ کۆمەلگەهێ دا دهێتە دەستنیشانکرن و لایەنێ ژیانا تاکەکەسی و کۆمەلایەتیا وێ دهێتە نیشاندان وب ڤێ چەندی سیفاتێن دلسوزی، ئەڤینداری وراستگویی دهێنە دیارکرن، لێ چ جاران وەك خەباتکار ناهێتە بەحسکرن چونکە خەبات ژ ئەرکێن زەلامی دهێتە هژمارتن نەك ئافرەتێ .

٥- گەلەك ژ رەوشت وتێتال و ئاموژگاری ب رێکا سترانان گەهەشتینە بەرەبابێ نوی .

٦- بەرفرەهیا سترانان ژ لایێ ناڤەروکیڤە کو هەمی لایەنێن ژیانێ وهەمی جوینێن مللەتێ کورد ب گەنج وپیر وئافرەت وزلام وزارۆکان ب خوڤەدکریت. وەك سترانێن: چاندنێ، زارۆکان، خوشیيان (داوەت و شەهیان) ، نەخوشیيان (بەهی) و ... دگریتە خۆ .

شارەزایین مللەتێ کورد دزانی کو ستران کارتێکرنەکا زێدە ل سەرهەست وسۆزێن خەلکی دکەت و دێشێت ب رەنگەکێ باش دناڤ خەلکی دا بەلاڤ ببیت، لەورا لدویف پێدڤی کرە هەلگرێ هزران وب ڤێ چەندێ پەیام گەهاندە مللەتی وهاریکاریا ئاڤاکرنا کەسایەتیا مرۆڤێ کورد کر و بوویە رێکەکا

بەدیل بو بەرسڤدانا پرسیاران.

پەیدا بوونا كومەلگەهێن مرۆڤایەتی هەرچەندە مفاداربوون ومرۆڤ ژ ترس وبرس وژیانا تاكەكەسی پاراست وبەرڤ تەناهی وژیانا كۆمەلایەتی بر، لێ ب چێبوونا وان هێدی هێدی جۆرەكێ دەستەلاتی پەیدابوو ئەڤ دەستەلاتە دەستەلاتەكا ناڤەندی بوو كو دقالبێ حكۆمەتێن دیكتاتوری دیار بوو. ڤان حكومەتان بۆ پاراستنا دەستەلاتێن خۆ، ب هاریكاریا رێكخستێن ئاسایش وسیخورێ گڤاشتن دئێخستە سەر خەلكی ودەستەلاتا خو دپاراست .

خەلك ل بەرامبەری ڤان ستەمكاریان یان بێ دەنگ نەبوون وب هاریكاریا یاخیبوون یان گازندا رەخنە ژ سیستەمێ حكۆمی دگرت وگالتە وگەپ رێكەكا باش بوو ژبوڤێ چەندێ .

مللەتێ كورد ژی چونكە ژ لایێ سیاسی سەرب حكۆمەتێن بیانی بـوو، زۆر جـار توشی ستەم وستەمكاریێ دبوون. هەرچەندە دەمێ دەلیڤا خو دديت ب رێكا شۆرش وياخيبوونان بەرسڤا ڤان ستەمكاریان ددا، لێ هندەك جاران دەلیڤە بو شۆرشێ پەیدا نەبوون ومرۆڤ كورد پێدڤی ددیت كو دەربرینی ژڤێ چەندێ بكەت لەوا ب رێكەكا ناراستەوخۆ رەخنە ژ حكومەتێ دگرتن وگالتە وگەپ بكار دهێنان. زێدەباری ڤێ چەندێ بۆ دیاركرنا خەلەتێن چینایەتی مفا ژی وەردگرت وزێدەبوونا گالتە وگەپان دناڤ مللەتێ كورد بەلگەیە بو :

١- مللەتێ كورد ب درێژاهیا مێژوویێ توشی گەلەك ستەمكاریان بوویە وب رێكا گالتە وگەپان ب رەنگەكێ ناراستە وخۆ دەربرین ژی كرێیە .

٢- هەبوونا رەوشت و تیتالێن بەرتەسك ودژوار دناڤ مللەتێ كورد دا كو وەك هێلێن سوور دهاتنە هەژمارتن ودقالبی گالتە و گەپ رەخنە ژێ دهاتەگرتن .

٣- سیستەمی چینایەتی یێ چڤاكی گڤێشینەكا زێدە دئێخستە سەر چینێ هەژار .

٤- هشیاربوونا مللەتێ كـورد كـو دشیا ب رەنگەكی زیرەكانە وان ستەمكاری وخەلەتییان دەسنیشانبكەت و رەخنێ ژێ بگریت .

پشتی لیكدانا ڤان بابەتان خویا دبیت كو پشكێن ئەدەبێ فۆلكلۆری بوونە رێكەك بۆ بەحسكرنا هەمی لایەنێن ژیانا مرۆڤێ كورد وهەروەسا ئاڤاكرنا كەسایەتیا وی و ب درێژاهیا مێژوویا پر نەخوشی ئەو ژنافچوونێ پاراستییە. هەروەسا هەرچەندە رەوشت و تیتالێن مللەتێ كورد د روخساردا گەلەك دژوار و هشكن وەك رێگر بۆ پێشكەفتنا مللەتێ دیاردبن لێ دراستیادا پارێزەرێن مللەتێ كورد بووینە وپشكێن ئەدەبێ فۆلكلۆری وەك یاسایا نەتەوەیی یا مللەتێ كوردە كو بڤەگرتنا هەمی لایەنێن ژیانێ ئەركێ خو ب جهـ بینیت وژبەر بارودوخێ ناسەقامگیری مللەتێ كورد، ئەركێ ئەدەبێ فۆلكلۆری گران دیاردكەت و ب ڤێ چەندێ فۆلكلۆری مللەتێ كورد ئێك ژ زەنگینترین وبەرفرەهترین فۆلكلۆرێن جیهانێ یە. بهایێ ئەدەبێ فۆلكلۆری وی دەمی باشتر دیاردبیت دەمێ جیاوازیا ناڤبەرا وی وەك یاسا نەتەوەیی لگەل یاسا دەولەتی دیاردبیت :

یاسایا دەولەتی ئەو یاسایە كو ژ لایێ حكومەتەكا دیاركری دهێتەدانان وسنوورێ كارپێكرنێ ل دووڤ سنوورێن جوگرافی وسیاسیێن وێ حكومەتێیە، واتا دەمێ مرۆڤ ژ سنووری وێ حكومەتێ دەردچیت كار ب وان یاسایان ژی ناكەت. لێ یاسایا نەتەوەیێ – فۆلكلۆر – وەسا مرۆڤێ كورد پەروەردەكرییە كو چ سنوورێن جوگرافیای و سیاسی نینن بەلكو دناڤ كەسایەتیا وی كەسییە بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤێ كورد بەرەڤ ئەوروپا بچیت ژ یاسایا دەولەتی رزگار دبیت لێ هەتا ل وێرێ هەر كوردە و دووڤ وان یاسایان دچیت كو وەك بنەمایێن هزری ل نك وی دبهادارن.

ل دووماهیێ هەژییە بێژین هەر چەندە گەلەك بسپور و شارەزا دناڤ مللەتێ كورددا هەبوونە كو هاریكاریا پارستنا مللەتێ كورد كریە ، لێ رۆلێ وان گەلەك كێمتر بوویە ژ رۆلێ ئافرینەرێن فۆلكلۆری دناڤ مللەتێ كورددا كو ب ئافراندنا فۆلكۆری وب كار هینانا وی هاریكاریا پارستنا مللەتێ كورد كریە. و ئەم پتر ژ هندێ كو قەرزدارێ چینی خواندەڤان و رەوشەنبیر بین قەرزدارێ چینێ نەخواندەڤانین .

# پەندا كوردی ل دەڤەرا بەهدینان

خالد سالح

گۆتنێن مەزنان وەكی پارچەك ژ فولكلۆری، سامان و گیانێ هەر نەتەوەیەكییە، خۆدیكەكە و فەلسەفا ژیانێیە، كاكلكا ئەزموونا ژیانییە، ژ هەر ئاخفتنەكا دی كاریگەرترە، دناڤ هەمی مللەتاندا یێن هەین، و ژ هزرو بیرێن مللەتان یێن هاتینە دارێتن، دەربڕینەكا مەزنە ب كێم پەیڤان.

ل سەر پێناسا وێ د (ئنسكلوپیدیا بریتانی) دا یا هاتی كو:

(گۆتنەكا رەوان و موكمە، ب رەنگەكێ گشتی ل كارە، ژوان دەربڕینانە كو دناڤ خەلكی دا دبەربەلاڤ، و پارچەكە ژ هەر زمانەكێ پێ دهێتە ئاخفتن)[1].

دیسان وەسان دبینت كو:

(دبیت گۆتنەكا تایبەت دناڤ گەلەك شارستانیەتادا هەبیت، چونكی گۆتن ژ كویراتییا مێژوویێ هاتینە، و كەس ژێدەرێ وێ یێ سەرەكی نزانیت، چونكی نە هاتینە نڤیسین).

(ئبن عەبد رەبە) ل سەر گۆتنان دبێژیت:

(كاكلكا گۆتنێ و واتایێن خۆشن)[2].

ل سەر بهایێ گۆتنان ژی دبێژیت:

(هەرمانترە ژ شعرێ و باشترە ژ گۆتارێ و چ تشت وەكی وێ بەربەلاڤ نەبووینە)[3].

ئیبراهیم النظام دبێژیت:

چوار تشت یێن دگۆتنان دا هەین، دئاخفتنێت دی دا نینن:

كورتییا پەیڤان، گەهاندنا واتایێ، باش میناك كرن، باشییا ئیدیومان[4].

روشدی سالح دبێژیت:

(شێوەیێ رەوانبێژییا كورت)[5].

وەسان گەلەكان بزاڤ كرینە كو پێناسا گۆتنێ و ساخلەتێن وێ شرۆڤە كەن، مینا (ئبن ئەلموقەفەع و فارابی و ئەلمەرزوقی) و... هتد.

ل ناڤ كوردان ژی (عەلائەددین سجادی) دبێژیت:

(پەندی پێشینان عیبارەتن لە چەند قسەیەكی كورتی كوردی ی پێكەوە نووسێنراون و مەعنایەكی بەرزیان تیایە)[6].

ل سەر ناڤەرۆكا وان ژی دبێژیت:

(چۆنیەتی ژیان و رەوشت و بیرو باوەڕیان چ لە بارەی سیاسی و كۆمەلایەتی ی، چ لە باری دەولەمەندی ی و هەژاری و پایەی دنیاییدا پیشان ئەدەن)[7].

گۆتنێن مەزنان دناڤ فولكلۆرێ كوردی ژی دا دەرگەهەكێ گەلەكێ مەزنە، و ژبەر مەزنی و بەرفەهییا دیالیكتان ژی، گەلەك زاراڤان ژی جهێ خۆ بۆ ڤان گۆتنان گرتییە، وەكی:

(مەتەل، مەسەلە و مەتەلۆك، قەسا باڤان،

گەپیدێ باڤان، پەندی پێشنان، قسەی پێشنان، مەسەلەی پێشینان، بەست و بەند و ...)[8].

پەندا کوردی ژی، مینا پەندێن هەمی وان مللەتان، رەنگڤەدانا هزری و کۆمەلایەتییا گەلێ کوردە، و ڤان پەندان رۆلێ خۆ یێ دناڤ ژیانا رۆژانە دا گرتی، چ ل گوندان و چ ل باژێران. و ژبەر دەولەمەندییا فولکلۆرێ کوردی، رۆژهەلاتناسان هەر دکەڤن دا، رۆلێ خۆ یێ دکۆم کرنا فولکلۆرێ کوردی دا دیتی، و چەندین پەرتووك دڤی بواری دا یێن چاپ کرین. مێژوویا کەڤنترین نڤیسین ل سەر گۆتنێن مەزنان دناڤ کورداندا ڤەدگەرێتەڤە سالا (1711)ێ، کو ل بن ناڤێ (مێسرۆب ماشتۆسە) ل ئەرمەنستانێ. و تا نهو کەس نزانیت ئەڤ دەستنڤیسە یا کێ یە، و یا پێك هاتییە ژ (15) گۆتنان ب تیپێن ئەرمەنی، تا نهو ژی ئەو گۆتن ل ناڤ کوردا هەنە[9].

دووەم نڤیسین یا (مەلا مەحمودێ بایەزیدی) یە، کو ل پەرتووکخانا (لینینگراد- پترسبۆرگ) هاتییە پاراستن[10]، و هندەك ژ وان گۆتنان ژ لایێ زایایێ رۆژهەلاتناسێ رۆسی (لیرخ) ڤە هاتینە وەرگێران بۆ سەر زمانێن رۆسی و ئەلمانی، و ل سالا (1857) ێ هاتییە چاپکرن.

سالا (1878) ێ ژی، (یەگیزارەڤ) پەرتووکەك ل ژێر ناڤێ (سەرپێهاتیا ئەتنوگرافیا کورد)، ل سەر کوردێن (یێریڤان)ێ چاپکر، و ل سالا (1891)ێ ل (تیبلیس) هاتە چاپکرن ڤە، کو ب دەهان گۆتنان دناڤدا بوون[11]. ل دوماهییا چەرخێ نۆزدێ، و دەستپێکا چەرخێ بیستێ گەلەك گۆتار ل سەر (ئەتنوگرافیا فولکلۆرێ کوردی) ل ناڤ رۆژنامەڤانییا (ئەرمەنستان) دا بەلاڤ بووینە. ئێك ژ وان کارێن گرنگ، کو ل سەر وی دەمی پێ رابووین، یێن فلکلوریستێ شەهرەزایێ ئەرمەنی (سەرکیس ئایکونی) یە، کو دناڤبەرا سالێن (1838-1908)ێ دا یێ ژیای پەرتووکەکا چاپ کری، کو پشکا پێنجێ ژێ بۆ فولکلۆرێ کوردی تەرخان کریوو، و پشکا شەشێ ژێ بۆ گۆتنێن کوردی بوون. و نێزیکی (200) گۆتنان یێن دناڤدا[12].

گەلەك گەریدان پویتە داینە فولکلۆرێ کوردی، ب تایبەت یێن ئەلمانی و نامیلکە ل سەر وی بابەتی بەلاڤکرینە. ژ وانان (فون لکۆك)، کو ژمارەکا گۆتنان کو ل سالا (1901)ێ ل باکوورێ کوردستانێ بهیستین ب هاریکارییا چەند کوردان ل (دیمەشق) راڤەکرینە، باش ل (ئەلمانیا) د سێ بەرگاندا ب پیتێن عەرەبی و لاتینی، دگەل وەرگێران بۆ سەر زمانێ ئەلمانی بەلاڤکرییە[13].

دیسان زانایێ ئەلمانی (هوگو مەکەس) دوو بەرهەم ب زمانێ (ئەلمانی) یێن نڤیسین. کو ئێك ژ وان گۆتنێن دەڤەرا (ماردین) ێ نە، و ل سالا (1926) ێ ل (پترسبۆرگ) چاپکرییە[14].

زانایێن (ئینگلیز)ی و (فەرەنسی) ژی ڤەکۆلین ل سەر کرینە. ژ وانان ئەفسەرێ ئنگلیزی (ی. نۆئێل) کو ڤەکۆلین ل سەر گۆتنێن دەڤەرا (هەکاریا) کرینە[15]. دیسان زانایێ (فەرەنسی) (م. پیرو رۆندۆ) ژی ل سالا (1933)ێ فولکلۆرێ کوردی کۆم کرییەو ڤەکۆلین ل سەر کرییە[16].

ل سالا (1937)ێ (رۆژە لیسکو) یێ فەرەنسی نڤیسینەك ل بن ناڤێ (پەندو مەتەل) بەلاڤکر، کو (280)ێ پەندن، دگەل وەرگێرانا وان بۆ سەر زمانێ (فەرەنسی)[17]. هەر ل ڤێ سالێ (کامیران عالی بەدرخان) دگەل نڤیسەرێ (فەرەنسی)(لویس پول مارگریت) بەلاڤۆکەك ل بن ناڤێ (پەند کوردی) بەلاڤکرینە، و ئەو گۆتن یێن باکوورێ کوردستانێ و رۆژئاڤایێ وێ نە[18].

سالا (1965)ێ ژی کوردناسێ (سوڤیەتی) (چ. خ. بەکاییڤ)، گەشتەك دناڤ کوردێن (ئازربایجان) دا کر و چەندەك ژ گۆتنێن وان بەلاڤ کربوون[19].

سالا (1966)ێ ژی (ت. ف. ئاریستوڤا) چەند گۆتنێن (کوردێن پشت قەفقاز) چاپ کرییە[20]. کوردێن سوڤیەتا بەرێ ژی پویتە داینە فولکلۆرێ کوردی، و نەمازە ل (ئەرمەنستان)ێ:

سالا (1936)ێ (حاجیێ جوندی و ئەمینێ عەبدال) (فولکلۆرێ کورمانجا) ل (یێریڤان) ێ بەرهەڤکرینە[21]، سالا (1957) ێ (حاجیێ جوندی) پەرتووکەك ل ژێر ناڤێ (فولکلۆرا کورمانجا) بەلاڤکر،

کو (٣٧٠)ێ گۆتن دناڤ خۆدا هەمبێز کربوون[٢٢]، سالا (١٩٦١) ێ (قەناتێ کوردو) ژی پەرتووکەکا فولکلۆری بەلاڤکرییە، و (٣٥٠) گۆتن دناڤدا هەنە[٢٣]، سالێن (١٩٦٩-١٩٧٠)، (ئوردیخانێ جەلیل)، دوو پەرتووکێن بچویك ل سەر گۆتنان ل (یێریڤانێ) چاپکرینە[٢٤].

ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ، (جەگەرخوین) (گۆتنا پێشیا) ب پیتێن لاتینی ل سالا (١٩٥٧)ێ بەلاڤکر[٢٥]. وەسان پەرتووکەکا دی ل ژێر ناڤێ (تعریب حکم وأمثال کردیه) ب پیتێن عەرەبی ژ لایێ ئەفسەرێ خانەنشین (جەمیل کەننە)ی ڤە، ل سالا (١٩٥٨)ێ ل (حەلەبێ) بەلاڤ بوو، دگەل وەرگێرانا وان بۆ سەر زمانێ عەرەبی، و (٣٠٠) گۆتنان دناڤ خۆدا دگریت[٢٦].

دیسان (مەحفوز مەلە سلێمان) ژی (٤٠٠٠) پەندێن کوردی دسالێن نۆتاندا چاپکرییە.

ل رۆژهەلاتی کوردستانێ ژی (قادری فەتتاحی قازی) (٢٠٠) گۆتن ب کوردی و فارسی، ل گۆڤارا (دانشکده أدبیات و علوم أنسانی) ل سالا (١٩٧٢)ێ ل تەبریز بەلاڤکرینە[٢٧].

پشتی هینگێ ب بەرفرەهی چوویە دناڤ بابەتی دا و پەرتووك ل سەر چاپکرییە (أمثال و حکم کردی)، ژبلی چەند نڤیسەرێن دی ل ڤێ دووماهیێ، مینا (سەید عەبدولحەمید حیرەت سجادی و ئیبراهیم ئەفخەمی، کەلیموللا تەوەحودی، ئەحمەد عەزدی[٢٨]، پەرویزێ جیهانی و...هتد).

ل باکوورێ کوردستانێ ژی هەر چەند درەنگ ڤی بابەتی سەرێ خۆ هلدایە، لێ بەرهەمێ هندە نڤیسەران هاتینە مەیدانێ، مینا (چیا مازی، مەلا ئەحمەد، عەزیز غەمجڤین، سالحێ عومەر، عوبدولقادر بینگۆل، محەمەد ئونجو و... هتد).

ل باشوورێ کوردستانێ ژی، هەر ژ مێژە چەند نڤیسەرێن کورد بخۆ پویتە ب پەندێن کوردی داینە. و ل بەراهیا هەمییان (ئیسماعیل حەقی شاوەیس)، ل سالا (١٩٣٣)ێ کو (٦١٢) پەند کۆم کرینە[٢٩].

(پیرەمێرد) ی کتێبەك دایە چاپێ ل ژێر ناڤێ (پەندی پێشینان)، کو (٦٤٤٨) پەندن وەکی شعر.

ل سالا ( ١٩٣٨)ێ (مەعروف چیاووك)ی ژی (هەزار بێژو پەند) بەلاڤکرییە[٣٠]. ل سالا (١٩٥٢) ێ (عەلائەددین سجادی) چەند لاپەرەك ل ژ (مێژووی ئەدەبی کوردی) بۆ (٣٠) پەندان تەرخانکرینە، دگەل راڤەکرنا وان گۆتنان[٣١].

(شێخ محەمەدی خال) ژی، (پەندی پێشینان) دوو جاران، ل سالێن (١٩٥٧، ١٩٧١)ێ چاپکرییە. چاپا ئێکێ (١٣٠٨) پەندن، و ل چاپا دووێ (٣٨٩٣) پەندن[٣٢].

ل سالا (١٩٦١)ێ (محەمەد توفیق وردی)، نامیلکا دووێ یا فولکلۆری بەلاڤکر، و ل دوماهیا ڤێ نامیلکێ چەند گۆتنێن کرمانجییا سەری، دگەل راڤەکرنا وان بۆ کرمانجییا خوارێ دناڤدا بوون[٣٣] و هەر ل ڤێ سالێ (سەرنجێك لە دەروازەی فولکلۆری کوردی) ژ لایێ کۆمەکا ماموستایێن (سلێمانی) یێ ڤە دەرکەت و (١٠) پەند دناڤدابوون.

ل سالا(١٩٦٩)ێ (عوسمان شارباژێری) ژی (گولشەن) چاپکرییە، کو (١٠٠١) گۆتنن[٣٤].

ل سالا (١٩٧٠)ێ (خورشیدە بابان) نامیلکەکا (٤٠) گۆتن دناڤدا ل ژێر ناڤێ (تیشك) بەلاڤکرییە[٣٥].

دیسان ب دەهان گۆتنێن مەزنان دناڤ رۆژنامەگەرییا کوردی دا بوون .

ل سالا (١٩٧٠)ێ (جەمال نەبەز) پەرتووکەك ل سەر گۆتنان ب کوردی و ئەلمانی بەلاڤکر، کو (٥٠٧) گۆتنن[٣٦].

وەسان ئەڤ کاروانە یێ بەردەوام بوو و پتر ل هەر جهەکێ کورد لێ پویتە پێ هاتیە دان، نەمازە ل باشوورێ کوردستانێ، کو ب دەهان پەرتووك ب تایبەت ب هەردو زاراڤێن سەرەکی بەلاڤبووینە:

(عومەر شێخەللا دەشتەکی، عەلی مەعروف شارەزوری، عزەددین مستەفا رەسول، مەحمود زامدار، خالد جۆتیار، ساجد ئاوارە، مستەفا بەرزنجی، حەمید گەردی، محەمەد مەلا قادر، عەبدولا خدر مەولود، عەبدولوەهاب کانەبی، هەردەوێل کاکەیی، حەمید رەشاش و رێبوار جەمال «ب هاوکاری» ... هتد).

ل دەڤەرا بەهدینان ژی چەندین پەرتووك ل سەر

ئاستێن جودا جودا ژ لایێ چەندین خەمخۆرێن فولکلۆری ڤە بەلاڤبووینە، یان پویتە پێ هاتییە دان. مێژوویا پویتە دانا ڤی بابەتی ڤەدگەریتەڤە سالێن شێستان، وەکی (مەلا مەحمود دێرشەوی) د پێشەکییا پەرتووکا خۆ (مشتاخا چیا ژ گۆتنێن پێشیا )دا هاتی:

(ئەز رابیم ئەڤ چەند گۆتن من کۆم کرن ل سالا ١٩٦٤).

ئەڤ پەرتووکە یەکەم پەرتووکە ل سەر گۆتنان ب کرمانجی ل باشوورێ کوردستانێ یا (مەلا مەحمودێ دێرشەوی) دەرکەتی یە، پەرتووك ل سالا (١٩٨٠)ێ ب زاراڤێ (بۆتانی) چاپبوویە، وەکی ئەو بخۆ ئاماژە پێددەت:

(ئەز ل سەر رێکا جەلادەتێ بەدرخان بەگێ چومە)[٣٧].

ژبلی ڤی نڤیسەرێ گەلەك نڤیسەرێن دی پویتە داینە ڤی بابەتی مینا:

- ئەحمەد قەرەنی: کانی، سالا ١٩٨٤.

- پێزانێ ئالیخانی: دو مراری ژ گەنجینا فولکلۆرێ کوردی، سالا ١٩٨٥.

- حەجی جەعفەر: گۆتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان، سالا ١٩٨٦.

- مەسعود خالد گولی: نەخشێ ل بەرا، سالا ١٩٩٩.

- خالد حاجی ئاکرەیی: ٢٠٠٨ گۆتنێن مەزنان، سالا ٢٠٠٨.

- وەهبیا محەمەد سەعید یاسین: گۆتنێت پێشینان ل دەڤەرا بەهدینان، سالا ٢٠٠٦[٣٨].

- عەبدولا عەلی شنگالی: گۆتنێت مەزنان و ئیدیوم ل چیایێ شنگالی، سالا ٢٠١٠.

- نزار محەمەد سەعید: چەند گۆتن و پەژنێن کوردان ژ دەڤەرا بەهدینان، سالا ٢٠١١.

- شەوکەت ئاڤدەل و مەسعود سەرنی: گولواز، سالا ١٩٩١.

- نهاد سەعدولا: نەخشێت ل کەڤرانە، سالا ٢٠٠١ (پتریا وان دهەڤپشکن دگەل کانی).

- مستەفا عەبدولرەحمان یونس ئەرەدنی، سەرۆکانی، بەرگێ ئێکێ، سالا ٢٠١٣، بپ١٣- ١٦٨.

- خالد سالح: دەستنڤیسەکا نە چاپکری... و چەند نڤیسەرێن دی ژی.

سەرەرای کو هند پەرتووك ل سەر ڤان گۆتنان هاتینە خرڤەکرن، لێ دسەر هندێ را ب دەهان گۆتنان یێن ماین کو بەرە بەرە یێن بەر ب مرنێ ڤە دچن و د چ پەرتووکان دا نە هاتینە خرڤە کرن و فەرە پتر پویتە پێ بێتە دان، بۆ نموونە:

- عەزو، نە رەزو نە پەزو، بەر بەلەکێت بەفرێ هەلبەزو... .

- بسك بادایێ با تێ نە، چاڤ کلدایێ کل تێ نە، حەز ژ خەلکی کر کەسێ ئاگەهـ ژێ نە[٣٩].

ب رەنگەکێ گشتی ئەو گۆتن و پەندێن ل دەڤەرێ ل سەر زارێ خەلکی د بەربەلاڤ ژمارا وان وەکی دپتریا پەرتووکێن ل سەر وی بابەتی هاتینە چاپکرن دناڤبەرا (١٥٠٠ تا ٢٠٠٠ ) گۆتن و پەندانە.

ب کورتی: وەکی ڤەکۆلەر دبێژن ژمارا گۆتن و پەندێن کوردی کو دپەرتووك و رۆژنامەو گۆڤاران دا هاتینە بەلاڤکرن دگەهنە (٣٠٠٠٠) گۆتنان (دگەل دووبارەبوونا گەلەك گۆتنان د پتر ژ ژێدەرەکی دا)[٤٠].

ئەگەر ئەم بنێرینە گۆتنێن دەڤەرێ دێ بینین کەرەستێن ئاڤاکرنا وان گۆتنان هەر ژ سرۆشت و کەل و پەل و خوارن و سەقا و گیاندار و رووەك و... دەڤەرێ یێن دەرکەتین، بۆ نموونە:

- ژ کەل و پەلان: دیزك، هومبان، ئاش، کووار، جەر، داس، بەندك، گێسن، شیژن، سنگ و... هتد.

- ژ خوارنان: دانهێرك، توتك، ئاسیدە، دەو، دۆرك، ماست، کەباب، دەوین، ترشك، ژاژی و... هتد.

- ژ گیانداران: پتریا گیاندارێن دەڤەرێ تێدا هەنە، مینا: کەو، کەر، مریشك، شێر، گورگ، رویڤی و... هتد.

- ژ رووەکان: پینگ، بێویژان، گارس، قیڤار، هەلز، مازوی، بیهـ، قەسپ، پیڤاز، پەلگ و... هتد.

- ئەندامێن لەشی: سەر، لنگ، سینگ، پشت، چاڤ، خوین، ددان، کەفا دەستی، ریهـ، کەزی و...

هتد.

- ژ جل و بەرگان: شال، دۆخین، شاشك، كالك و گۆرە، دەرسۆك و... هتد.

- ژیشەیان: شڤانی، زێرنگری، نانپێژی، نالبەندی، ئاشڤانی، گاڤانی، کەوگیرڤانی و... هتد.

- ژ کاران: جۆت، گێرە، نێچیر و... هتد.

- ژ ئامیرێن ژەنینێ: دهۆل، دەف، بلویل، تەمبیر و... هتد.

- ژ سروشتی و وەرزا و سەقای: دەشت، چیا، هەر چار وەرزێن سالێ، عەور، باران، مژ، با و... هتد.

وەسان فەرهەنگەکا بەرفرەها ژیانا خۆمالی کەرەستێن ئاڤاکرنا وان گۆتنانە.

دبیت پەیڤا (گۆتنێن مەزنان) ل دەڤەرا بەهدینان پەیڤەکا بەرفرەهتر بیت بۆ چەندین زاراڤێن بچویکتر، بۆ نموونە:

١- هندە گۆتن یێن هەین دسادە و سڤكن، چ راڤەکرن پێ نەڤێت، هەر ژ گۆتنا وان مرۆڤ دزانیت چ مەبەست یا پێ هەی، ئارمانجا سەرەکی ژی ژێ یان شیرەتن، یان پێزانین، ئەڤە ژی د دابەش کرینە بۆ سەر دوو پشکان:

* ئاخفتنێن نۆرمالێن سڤك، وەکی دێ بێژن:

- قوەتا دوژمنێ خۆ بزانە، پاشی شەری دگەل بکە[٤١].

یان: وارێ بێ خودان چ لێ شین نابت[٤٢].

* گۆتنێن ب کێش و سەروا لێ واتایەکا سڤك یا هەی، بۆ نموونە:

- سۆر دسۆتینە، سپی دپێتینە، رەش ئەسمەر دپێ گۆتینە (ل سەر سالۆخەتا ژنکێیە):

- سەرێت سپی غەمێت دلانن، سەرێت رەش بهارا دلانن[٤٣].

٢- پەند: چ ب کێش و سەروا، مینا دێ بێژن:

- هیڤی سەد جارا هیڤی، خۆ ل بەر خودانی نەکە ریڤی، ئیللا چیڤە دەرمانێ چیڤی.

- هندی خیارە، ژ تویتکی دیارە.

- هەرە ریکێ بلا یا دویر بت، هەرە رێکێ بلا یا دویر بت، کچێ بینە بلا یا پیر بت.

- مۆمێ ئاگر بەردا کۆمێ و ئەو بخۆ چوو سەرێ زومێ.

- ناخۆت نان و ژاژی، خودان دکەت تیلەو تاژی.

یان بێ کێش و سەروا وەکی دێ بێژن:

- هەکە دار هشك بوو، سیبەرا وێ ژی دێ نەخۆش بیت.

- خەتا خار ژ گایێ پیرە[٤٤].

د هەردو حالەتان دا ئەو گۆتن رستەنە، سەرڤە واتایەکا تایبەت یا هەی و دبنڤە واتایایەکا دی یاهەی.

٣- ئیدیوم: ئەڤە ژی پتر لایەنێ زمانی ڤەدگریت، کو سەرڤە مەبەستەك، و دبنڤە مەبەستەکا دی پێ هەی، و ل هندە جاران ئیدیوم و پەند دگەهنە ئێك، واتە بۆ هەردو مەبەستا ل کارە:

- ژ مێشێ کرە گامێش[٤٥]:

واتە: تشت گەلەك مەزن کر.

- خراب (زراڤ) رستن[٤٦].

- دۆرکا ددەت:

واتە: گەلەك حەز کەت.

گۆتنێن کوردی ب رەنگەکێ گشتی (کو یا بەهدینان ژی پشکەك ژێ)، دبیت ددەمێ خۆدا هەر ئێکێ چیرۆکا خۆ یا تایبەت یا هەی، کا بنیاتێ وان چ بوویە، لێ ب بوورینا دەمی هەر بەرە بەرە گەلەك ژێ یێن ژ ناڤچووین، و ب تنێ پتریا گۆتنان رویت یا گەهشتییە مە، بۆ نموونە:

- ب خفت و خەلەك ئەم دەرباس نابین، هەتا ئەم راست نەبین ئەم دەرباس نابین.

بنیاتا گۆتنێ:

دونیا بهار بوو.. رویڤییەك و مارەك ل بەر ئاڤێ گەهشتن ئێك خواستن ژێ دەرباس بن. ماری گۆت رویڤی: من بکە پشتا خوە و من دەرباس بکە ژبەر کو ئەز نەشێم دەرباز ببم. رویڤی ژی ڤەبوول کر و کرە پشتا خوە. دەمێ گەهشتین نیڤا ئاڤێ، ماری خوە دستویێ وی ئالاند و گۆتێ: دێ ب تە ڤەدەم. رویڤی گۆت: ئەز نزانم تۆ چ دبێژی. کا بچەکێ دەنگێ خوە بلند بکە!. ماری جارەکادی گۆتێ: دێ ب تە ڤەدەم. دیسا رویڤی گۆتێ: من ها ژ تە نینە و گوهێت من

دگرانن. کێمەکێ دەڤێ خوە نێزیکی گوهێ رویڤی کر. رویڤی دەڤێ خوە ئاڤێت سەرێ ماری و باش گڤاشت هەتا خەلەکێت ماری ژ ستویێ رویڤی سست بین و رویڤی گۆت: (ب خفت و خەلەك ئەم دەرباز نابین، هەتا ئەم راست نەبین ئەم دەرباز نابین)[٤٧].

یان گۆتنا دبێژیت: سڤۆرە و بەرو منێ خوە!.
بنیاتا گۆتنێ:
دبێژن سڤۆرەك ژ دارەکێ کەت و گۆت:
باوەر بکن منەك بەزی ژ من حەلییا !.
هندەکا گولێ بوون گۆتنێ:
مال وێرانو تۆ هەمی وەقیەك تێنینی!!.
گۆت: سڤۆرە و بەرو منێ خوە![٤٨].

هەلبەت دەڤەرا بەهدینان وەکی پارچەك ژ کوردستانا مەزن، و وەکی درێژەپێدانا سرۆشتی یا وی زمانییە، لەوما دێ بینین گەلەك ژ گۆتنێن دەڤەرێ دهەڤپشکن دگەل زاراڤێن دی یێن کوردی. بۆ نموونە:

ل باکوورێ کوردستانێ دبێژن:
- بەرخێ نێر، ژبۆ کێر[٤٩].
ل بەهدینان دبێژن:
بەرخێ نێر بۆ سەرژێکرنێیە.
- ئاڤ زانە بناڤ بناڤ ل کویە[٥٠].
ل بەهدینان دبێژن:
سەرێ ئاڤێ دزانیت بنێ ئاڤێ یێ ل کویرێ.
ل رۆژئاڤای کوردستانێ دبێژن:
- ئێ بلند دفرێ، نزم دکەڤێ[٥١].
ل بەهدینان دبێژن:
یێ بلند بفریت دێ نزم کەڤیت.
دیسان ل رۆژئاڤا دبێژن:
- کارێ ئیرو نەهێلە سبەهێ[٥٢] .
ل بەهدینان دبێژن:
شولێ ئەڤرۆ نەهێلە بۆ سوباهی، بلا خارنا ئەڤرۆ بۆ سوباهی بهێلی.
ل ئەرمەنستان و گورجستان دبێژن:
- ئار د کوتکی کەڤن دایە[٥٣] .
ل بەهدینان دبێژن:
ئاگر ب کەڤنە کۆلکاڤە دمینت.
دیسان ل ئەرمەنستان و گورجستان دبێژن:
- دەوسا شێرا، رۆڤی دکە کێف و سەیرا[٥٤].
ل بەهدینان دبێژن:
شوینا شێرا ریڤی لێ دکەن گێرا.
ل خوراسان دبێژن:
- وە وەریسێ خەلکی مەرە چالێ[٥٥].
ل بەهدینان دبێژن:
ب وەریسێ خەلکی نەچە کەڤری- دارا.
دیسان ل خوراسان دبێژن:
- هێلوینا مریشکێ کۆر خودێ وە شەڤ چێ دکە[٥٦] .
ل بەهدینان دبێژن:
خودێ هێلوینا تەیرێ کۆرە ژی چێدکەت.
ل رۆژهەلاتی کوردستانێ دبێژن:
- کەر بۆنی زەعفەرانی بۆ چییە؟[٥٧].
کەر چ ژ بێنا بیهێ د زانیت.
هەروەسان ل رۆژهەلاتی کوردستانێ دبێژن:
- سەد رەحمەت لە کفن دزی هەوەل[٥٨].
ل بەهدینان دبێژن:
رەحمەت ل گۆرا کفن دزی.
ل هەولێرێ دبێژن:
- بەخت هات لە سەری بزرە وەکی کەری، هەموو دەرێ عافەری[٥٩].
ل بەهدینان دبێژن:
ئەگەر بەخت هاتە سەری ، ب زرە وەکی کەری، خەلك دێ بێژیت سەد ماشەللا ئافەری.
هەروەسان ل هەولێرێ دبێژن:
- ئەی رویتی فەلەك بەس بگەرە چەرخ ئو فەلەك رسقی کێم نابتە گەلەك[٦٠] .
ل بەهدینان دبێژن:
هندی ب گەری ل چەرخ و فەلەك، رزقێ پیچەك نابیتە گەلەك.
ل سلێمانیێ دبێژن:
- رۆنی رژاو، ئەکا بە خێری باوکی[٦١].
ل بەهدینان دبێژن:

دۆنێ رێتی ب خێرا بابێ یە.
دیسان ل سلێمانیێ دبێژن:
- دیزەیەك كەیبانوو بیشكێنێ، تەقەی نایەت[٦٢].
ل بەهدینان دبێژن:
سێنیكا ژنك «كابانی» بشكێنیت دەنگ ژێ ناهێت.
د زاراڤێ لەكی دا دبێژن:
- گوروە دەسی وە گۆشت نەمەڕەستی مووش تێلە.
واتە: دەستی پشیكی نەگەهشتە گۆشتی گۆت تەعلە[٦٣].
ل بەهدینان دبێژن:
رویڤی نە دگەهشتە تری دگۆت ترشە.
هەروەسان لەك دبێژن:
- مار خۆشی ئەو پینە نەمایتی ئەردەر كونا سەوزە مەهیتی[٦٤].
ل بەهدینان دبێژن:
ماری حەز ژ پینگی نە دكر، پینگ چوو بەر دەرێ كونێ شین بوو.
ل دەڤەرا ئیلام دبێژن:
سان لە جی خوەێ سەنگینە[٦٥].
ل بەهدینان دبێژن:
بەر ل جهێ خۆ یێ سەنگینە- ب قەدرە.
ل دەڤەرا ئیلام دبێژن:
- هێل چەفت هەن گای گەپە[٦٦].
ل بەهدینان دبێژن:
خەتا خار ژگایێ پیرە.
ل هەورامان دبێژن:
- مەكەرە قسێ بێ فكر و هۆشی بزانە دیوار هەنیشا گۆشی[٦٧].
مینا وێ گۆتنێ یە كو ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
دارو دیوار ب گوهن.
ل ناڤ شەبەكا دبێژن:
- چ قسەی حەقی، ئای مەندرۆ[٦٨].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
حەقی ئاڤێ رادوەستینت.

هەروەسان شەبەك دبێژن:
- تەوستان بابۆ فەقیریا[٦٩].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
هاڤین بابێ فەقیرانە.
زازا دبێژن:
كووتك پێ زوار نیشین سێید[٧٠].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
تاژی - سە-ب تەعدا نێچیرێ ناكەت.
هەلبەت گۆتنێن دەڤەرێ نە هەر ب تنێ دهەڤپشكن دگەل گۆتنێن دەڤەرێن دی یێن كوردستانێ، بەلكی هەڤپشكییەك دگەل گۆتنێن مللەتێن دی ژی هەنە، بۆ نموونە:
توركی:
- ب گولەكێ هاڤین ناهێت[٧١].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
ب گولەكێ بهار ناهێت.
- زمانێ شرین ماری ژ كونا وی دەردئێخیت[٧٢].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
ب ئەزمانێ خۆش دێ ماری ژ كونێ دەرئێخی.
ئنگلیزی:
The fingers of hand are not alike.
واتە: تبلێت دەستی هەمی هندی ئێك نینن[٧٣].
ئەو گۆتن ل دەڤەرا بەهدینان ژی ب هەمان رەنگ هەیە، دیسان د زمانێ بولگاری ژی دا یا هەی.
ئنگلیز دبێژن:
They that live longest.
واتە: هندی بمینین دێ عەجێبیا بینین[٧٤].
هەمان گۆتن ل ناڤ كوردان ژی ب وی رەنگی هەیە.
ئەلمانی[٧٥]:
- وەلاتێن دن، عادات و رەوشتێت دن[٧٦].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
هەرنە مللەتا، بگرن عەدەتا.
ئەلمانی دبێژن:
- شۆربا بێخێر ژ كێم دۆنییە (گرارا رۆن ژ كێم دانییە)[٧٧].
كورد ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:

- گرارا رۆن ژ کێم دانییە.
باسکی:
- چیا هەوجەی چیا نینە، بەلێ مرۆڤ هەوجەی مرۆڤییە[٧٨].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
- چیا ڤ چیا ناکەڤن، بەلێ چاڤ ب چاڤا دکەڤن.
بولگاری ژی دڤێ د بێژن:
چیا ب چیا ناکەڤن، مرۆڤ ب مرۆڤا دکەڤن[٧٩].
تۆنس:
- گۆتێ باب حێشتر ب سەدانە. گۆت گرانە.
گۆتێ باب حێشتر ب هزارانە گۆت ئەرزانە[٨٠].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
حێشتر هاتنە فلسەکی ، فلسەك نەبوو ب دەتە پێ.
دیسان کورد و تۆنسی دبێژن:
ئەزمان درێژێ دەست کورت[٨١].
جەزائیر و نەجد :
ئەگەر هەڤالێ تە هنگڤین بت، هەمیێ نە ئالیسە[٨٢].
هەمان گۆتن ل بەهدینان ژی ب وی رەنگی هەیە.
ئەڤ گۆتنێن هەڤپشك دناڤ وان مللەت و باژێرێن نێزیك پتر خۆیا و بەرچاڤن و دبیت ژ ئێك وەرگرتبن. وەکی (مووسل و بەغدا و حەلەب...) و ئەڤە چەند نموونەکن ژ گۆتنێن ل حەلەب دبەربەلاڤ و دهەڤپشك[٨٣]:
- مرۆڤ تەیرێ بێ پەرە[٨٤].
- ناڤەکێ گران و وارەکێ وێران[٨٥].
- ئەز میر و تۆ میر، پا کی دێ کەری هاژۆت[٨٦].
مینا وێ گۆتنا دەڤەرا بەهدینانە یا دبێژیت:
ئەز چیا و تۆ چیا گۆلك ما بێ گیا.
گەلەك دەست خارنێ دسۆژن[٨٧].
ل دەڤەرا بەهدینان دبێژن:
خارن ب هیڤیا دوو کابانییا ڤە بیت، یان دێ یا سویر بت یان بێ خوێ.
وەسان هندە گۆتن د هندە دەڤان ژی دا یێن هەین. و ل دەڤەرا بەهدینان دبەربەلاڤ. بۆ نموونە:

دهزار شەڤ و شەڤەك دا دبێژیت:
- هەمی جارا جەرك ب ساخی نازڤریتەڤە[٨٨].
- هەچیێ کۆرکەکێ بۆ برایێ خۆ بکۆلیت، ئەو بخۆ دێ کەڤیتە تێدا[٨٩].
یان (عومەرلخەیام) دبێژیت:
گویند بهشت با حور خوش است
من میگویم که یب انگور خوش است
این نقد بگیرو دست ازأن نسیه بدار
کأواز دهل شنیدن از دور خوش است.
واتە: (دەنگێ دهۆلێ- دەڤێ - ژ دویرێ خۆشە)[٩٠].
سەرەرای ڤێ چەندێ رەنگڤەدانا گۆتنێن کوردی هەر دکەڤن دا یا دناڤ شعرا کوردی دا هەی، چ ل سەر ئاستێ کلاسیکان و چ ل سەر ئاستێ هۆزانڤانێن هەڤچەرخ. ڤێجا چ گۆتنێ جهێ خۆ دناڤدا کربیت، یان بەروڤاژی گۆتن ژ وێ شعرێ دەرکەتبیت، وەکی نموونە:
جزیری دبێژیت:
بەلکو دیوار ب گوهبن ب خودێ کی ب خودێ
ب تو رەنگی نە کری ئەشکەرە ئەسراری حدوث
گۆتنا کوردی دبێژیت:
دیوار ب گوهن[٩١].
نالبەند دبێژیت:
هەر چەند کلام شبهی دوڕ بیت
بێ قەدر دبیت دەما کو پر بیت
گۆتن ژی دبێژیت:
ئەگەر ئاخفتن زیڤ بت، نە ئاخفتن زێرە[٩٢].
جەگەرخوین دبێژیت:
هەچی ماڵدارن، ژ خوە ب خالتیك و خالن
لێ هەچی بێ ماڵن، ژ خوە بێ خالتیك و خالن
گۆتن ژی دبێژیت:
هەچیێ ب مالە، ب خال و مامە[٩٣].
یان ل جهەکێ دی دبێژیت:
ئەڤ جیهانا خاپینۆك هەتا مە ژێ خوە ناسکر
چ بکم فێدە نەمایە ، عەمرێ خوە من خلاسکر
گۆتن دبێژیت:

حەتا من خۆ ناس كر، من عەمرێ خۆ دەرباس كر[٩٤].

عەبدەلرەحمان مزوری دبێژیت:

ئەو لاندكا دار دایە من

ئەو دارا سیتاڤ دایە من

ئەو كانیا ئاڤ دایە من

دارو بەرا

تێوەر نەكەم.

گۆتن ژی دبێژیت:

ئەو كانیا تە ئاڤ ژێ ڤەخاری، شێلی نەكە[٩٥].

وەسان ب دەهان دەڤێن دی كو كەتینە ژێر كارتێكرنا ڤان گۆتنان.

* *

گۆتنێن دەڤەرێ چ بابەت نینن ئەگەر خۆ لێ نە كریتە خودان، وەكی رێ نیشاندەرێ بۆ ژیانا وان، یان خۆ بۆ رابوونا وان ژی. لێ هندە بابەت ژ هندەكان پتر گرنگی یا پێ هاتییە دان، بۆ نموونە:

## ناڤێ خودێ:

كورد ئێك ژوان مللەتێن باوەرداره ب خودێ، پتریا وان بسورمانن، لەوما پشتا خۆ پێڤە گرێددەت وەكی راستی، نەشێت خۆ ژ رێكا وی بدەتە باش و ب دەهان گوتن وێ چەندێ دسەلمینن:

- هەچیێ ژ تە خافلە ئەو كافرە.
- خودێ هێلینا تەیرێ كۆرە ژی چێ دكەت[٩٦] .
- خودێ ددەت و خودێ دبەت.
- خودێ یا ڤی دەستی بۆ ڤی دەستی ناهێلیت.
- خودێ چیا دبینت لەو بەفرێ لێ دبارینت.
- بلا خودێ یار بیت، عالەم هەمی نەیار بیت.
- بێ خودێ بەلگێ دارێ ژ دارێ ناوەریێت.
- ئەگەر خودێ دا نابێژیت تۆ كورێ كێی[٩٧].
- ئەگەر خودێ دا دێ ژ كون مشكێ دەت.
- ئەگەر خودێ بر مرۆڤ بخۆ تێرا خۆ هەیە.
- نەجار بنڤە وەكی هەر جار، خودێ ئێكەو دەلیل (دەرگەهـ) هزار[٩٨] .
- دوو دل ئێك بن، پێ سیێ خودێ یە.

- چیچك چیچكە، ئاڤێ ڤەدخۆت و دمێ خۆ سەرئەڤراز دكەت (شوكرا وی دكەت).

## وەلات پارێزی:

سالەها سالە، مللەتێ كورد تووشی درندترین رەنگێن زولم و زۆرداریێ بوویە، و چ نەمایە دوژمنی نەكرین، لەوما هەر دشۆرشا دا بوویە، و دەنگێ وی دەركەتییە. چونكی دتەنگاڤیان دا بوو، و دەمێ:

- ئاڤ گەهشتە تەنگاڤیا هەوار دكەت:
- هەموو تشت ب زراڤێی دپرچییێت، بەس زۆرداری ب ستویریێ[٩٩] .

كورد دوژمنی ب مار دزانیت، لەوما دبێژن:

- مار نابیتە یار[١٠٠] .

دیسان دبێژن:

- سەد هیڤی ددەستێ دوژمنی دا ب تۆتكەكێ.
- ئەو چاڤێ كۆرە بیت پێ دوژمنی نەنیاسیت.
- دونیا ببیتە بهۆست، نەیار نابیتە دۆست[١٠١].
- دونیا (عالەم) دوژمنێ كەوی یە و كەو ژی دوژمنێ سەرێ خۆیە[١٠٢].

وەسان وەكی دگۆتنان دا دیار، مرۆڤی هانددەت كو مرۆڤ، مرۆڤێ خۆ نەدەتە ب یێ بیانی:

- بیانی، بدێ گۆشتێ رانی (گیانی)، نابیتە ئەمینێ خودانی.

یان دبێژن:

- بیانی، بدێ گۆشتێ رانی (گیانی)، دێ ل تە هێتە دەر پەشیمانی.

مرۆڤێ كورد گەلەكێ ب جهـ و وارێ خۆڤە گرێدایە، لەوما دبێژن:

- بەر ل جهێ خۆ یێ ب قەدرە (ب سەنگە)[١٠٣].
- گۆتنە كەوی كویرێ یا خۆشە؟ گۆت: ئەو جهێ ئەز لێ بوویمە تێژك (فەرخك)[١٠٤].

هەروەسان شێرەتان دكەت:

- سەبە (صەبە) ژ قەومێ خوەبە[١٠٥].
- ئەگەر تۆ بوویە پاشا، ل قەومێ خۆ نەكە حاشا.
- حەتا نەبیتە لازم مرۆڤ نەچیتە جهێ بیانی.

ئەگەر مرۆڤ چوو. دڤێت یێ وەسا بیت، وەكی شێرێ

ل ناڤ كاڤلانی.

- نەچە وی عەردێ تە كەسێ خۆ لێ نە.

- دەرگەهێ خۆ نەدە ب قەسرێت خەلكی.

هەروەسان مرۆڤی هانددەت كو هەڤكاریێ دگەل نەیاری نەكەت:

- ئەگەر كرمێ داری ژ داری نەبیت، زەوالا داری نینە[١٠٦].

- بەرك ژ رەخێ (لایێ) تەنگڤە ددریێت[١٠٧].

واتە دوژمن ل خالا لاوازیێ دگەریێت، مینا وێ ئیدیومێ یە كو دبێژیت:

- كویرێ یا نەرمە، ویرێ تێ دچیت.

## سنج و شیرەت:

ب رەنگەكێ گشتی، سنج و رەوشتێن پاقژ ژ ساخلەتێن كوردانە، لەوما شیرەتان ل سەر چەندین بابەتان دناڤ گۆتنێن دەڤەرێ دا ئاراستە دكەتن، بۆ نموونە:

※ **راستی:**

ئەڤ چەندە دچەندین گۆتنان دا ل بەرچاڤن:

- راستی رێكا خودێ یە (شیرێ خودێ یە).

- راست بەو دنك شێرارا هەرە.

- راستۆ درستۆ خارۆ شكەستۆ ... [١٠٨].

- راست و رێ و رێ، خایینو دەری رێ.

- راستی بێژێ كولاڤ خارە[١٠٩].

- حەتا مار راست نەبیت ناچیتە د كونێ ڤە.

※ **سەبر:**

- خودانێ سەبرێ مەلكێ مسرێ

- بێسیرە ب سەبر دبیتە حەلاوە.

یان دبێژن:

بێسیرە ب حەمدا خۆ دبیتە تری.

- ماكا ئاقلی سەبرە[١١٠].

※ **حەقی:**

- حەقی ئاڤێ رادوەستینت.

- راستی بەحەشتا حەقی یە و جەهنەما نە حەقی یە.

- خودێ حەقێ بزنا كۆچ ژ یا ب شاخ دستینت.

لێ ئەگەر حەقی نەمینت، دێ بێژن:

- حەقیێ دبن نەحەقیێ ڤە ترە ترە.

- حەتا حەقی سەر نەحەقیێ دكەڤیت، كەف سەر دەڤێ خودانی دكەڤیت.

- حەقی ب ئاڤێ دا چوو، ئاڤ چوو.

※ **درەو:**

- وەریسێ درەوا یێ كورتە.

- ئاگر بەربوو مالا درەوینی كەسێ باوەر نەكر.

- لاوێ دەرەوین، دخۆت جارەك فراڤین[١١١] .

※ **دزی:**

- ئەگەر دزو مالخو بوونە ئێك دێ گای دكولینكێ را بەن[١١٢].

- دزێ خۆماله دەرگرتنا بەتاله[١١٣].

- یا ژ دزیڤە هەمی كەس دزە.

- دزی ژ دزی دزی، عەردو عەسمان لەرزی.

- رەحمەت ل گۆرا كفن دزی[١١٤].

- یا ژ دزیڤە هەمی كەسا بەحسی وی یە (بەحسی دیكلی یە).

- دزێ ب بلیله.

- نیڤ دزن نیڤ دۆستن

- دیتم ئەزم، نە دیتم دزم[١١٥].

- ئاخفتنێت دیناو دزا وەكی ئێكن.

- شەڤ هات دزا خاست، رۆژ هات دلا خاست.

※ **تەمەعی:**

- چ مرۆڤی تێر ناكەت ژ ئاخێ (مستەكا ئاخێ) پێڤە

- تەماهی برا كوژە[١١٦] .

※ **لۆمە كرن:**

- لۆمەكارو گونەهكارو.

- یێ لۆمە كەت، دێ جەربە كەت.

- لۆمە كرن یا ل بەر دەرازینكا خانی.

- لۆمەكرنا دونیایێ مەزنترە ژ عەزابا گۆرێ.

※ **فەسادی:**

- كەڤلێ فەسادی تژی كا دبیت.

※ **غەیبەت:**

- یێ بكەت غەیبەتێ، خودێ نادەتێ مۆلەتێ.

## شۆل و كار:

هاندان ل سەر شۆلی ئێك ژوان ساخلەتانە كو دناڤ پەندێن كوردی (دەڤەرێ) دا هەین، چونكی:

- شەر ژ بەتالیێ چێترە[117] .

و یێ كار بكەت:

- شۆلكەرێ خۆبە، خۆشتڤیێ خەلكی بە[118] .
- دەستێ ماندی سەر زكێ تێرە[119] .
- هەسپێ (دەوارێ) باش ئالیكا خۆ زێدە دكەت[120].
- سەرو شرینو، بەرو هنگڤینو (واتە یێ بكەت دێ خۆت)[121] .
- چۆلی گۆتە بالی، ملێ خۆ بدە بەر شۆلی، دا خانیێ خۆ بكەینە عۆلی.

ل بەرامبەر ڤێ چەندێ:

- یێ نەكەت ناخۆت[122] .
- نانێ نەكەرا ل چ جها (عەردا) نینە[123] .
- حەتا نیڤا (بەرێ) دەستی رەش نەبت، تاما دەڤی خۆش نابت[124].
- كراو خۆراو، نەكەرو دل كەسەرو.
- بێخیرەت ناچنە بەهەشتێ[125] .
- چ ب چینی دێ وی هەلینی[126] .
- چ بكەیە كوورێ، ئەو دێ هێتە خوارێ.
- خودێ یا گۆتی: ژ تە حەرەكەت، ژ من بەرەكەت[127].

شۆل نە وەسان یێ گرانە وەكی خودان هزر ژێ دكەت، چونكی:

- شۆل شێرە، ئەگەر مە كر دێ بتە ریڤی.

ل ناڤ كوردان هندە مەرج یێ دشۆلی دا هەین، وەكی:

- پالێ ژپالا بژارتی، ژ سپێدێ حەتا ئێڤاری، هند نە كر هندی خاری.
- شۆلێ ئەڤرو بۆ سوباهی نەهێلە، بلا خارنا ئەڤرو بۆ سوباهی بهێلی.
- شۆلێ نیڤی ژێ نەكە هیڤی.
- شۆلێ خودانی ب شەڤ كری، یێ ل سەر كرییە گری.
- شۆلێ ژ نە دل، وەكی دینێ بێ عاقل[128] .
- شۆلا دەستێ مسمس خۆ پێڤە نەواستینە.
- شۆلا بكە ب ئەساس، دا ددلێ تەدا نەبیتە وەسواس.

هەلبەت ژبلی رێبەرێ، كو ئەو سەر پشكا وان مەرجانە، لەوما دبێژن:

- رێبەری چێترە ژ رێنجبەرێ.

لێ وەكی كورد دبێژن (شۆل خلاس نابیت):

حەتا مرنێ چاڤ ل كرنێ (كرنە - هەر كرنە)[129] .

## ژن:

وەكی دیار ژن نیڤا كۆمەلێ یە، لێ هەر مللەتەك و هەر كەسەك وەكی خۆ لێ دنێریت. ئەو ژی دمینتە ل سەرزانین و رەوشەنبیریا وان كەسان. هەمی ژن نە وەكی ئێكن لەوما دبێژن:

- ژن ژی بێت هەین و ژنكۆك ژی بێت هەین[130] .

یان دبێژن:

- هند ژنن، هند ژانن، هند مەحبۆبێت بەر دلانن، هند سەر دلكێت مێرانن[131].

هندە كەس ژنێ ب تشتەكێ مەزن دبینن و ب باشی لێ دنێرن:

- ژن ستوینا مالێ یە[132] .
- مال ژنە بنیات خانی.
- ژن ژیانە.
- شێر شێرە، چ ژنە ژ مێرە[133] .
- ژن و مال، نە مێر و مال.

لێ دناڤ كۆمەلەكێ پاشكەتی و خێلەكی دا، نە سەیرە ئەگەر هندەك هەڤدژی ڤێ چەندێ لێ بنێرن و بێ بهایا ژنكێ پتر، دچەندین گۆتنێن دەڤەرێ دا خۆیا و بەرچاڤن:

- ژن گویزە، ژ سەدا ئێكا عەزیزە.
- ژن چاڤ ژنا دكەن، مالا مێرا خراب دكەن.
- ژن دارێ خلۆلەیە[134] .
- پەراسیا ژنكێ یا خارە.
- ئەو مال خراب ببت ئەوا ژن تێدا ببت مالخوێ[135].
- سەد خلمەتا پرسیارا ژنا خۆ بكە، بەلێ ئێكێ

گوهێ خۆ بدێ.

- ژنك جهۆری... یە، مرۆڤ زوی ژ سەر خۆ ڤەکەت و ب دەتە سەر دەڤێ هەڤالێ خۆ.

- حەفت خویشکا بۆ برایەکی مال کر، هەمی ب پشتا دیکلکەکی ڤەدان.

- ژنکێ یا گۆتی: رەشکا رەشە شلۆخە سپی، ئەڤە نە ئێکێ دی.

- بالیلی یاگۆتی: نەعلەت ل توخمێ ژنکێ، یا ئەولی ل دەیکا من.

- کچك دبێژیت: کێ دەیکا مە مارکر ئەو بابێ مەیە.

- مەعریفەتا ژنکێ یا دکۆشا وێ دا .

- شۆلێت ژنکێ چل و چارن، ژوانا دوو ددیارن، ئەو ژی نان و گرارن.

یان دبێژن:

شۆلێت ژنکێ چل و چارن، ژ وان چار دیارن، بالاڤ و ئاڤ و نان و گرارن[١٣٦].

- کەر ل سەر سنگی (صنگی) دراوستیت.

واتە: دڤێت ژن یا سەربەردای نەبیت.

کەسێ کورد هندەك سالۆخەتێن تایبەت دژنکێ دا دڤێن، کو دبینت دهێژانە:

- ژنا ب سەرو بەر، چێترە ژ یا بەرك کەر[١٣٧].

- ژنا شەرمین ب شارەکی، مێرێ شەرمین ب کابەکی (کارەکی).

- ژنا بێ عەسل دەردە، ژنا ب عەسل دەولەتە.

- سەگێت دووڤ مالا، کچێت رینگالا، رەزکێ ل کەندالا، ووجێ ناگرن ژ چ مالا.

- دێهلا ترەك، ژێ چێ نابن سەبێت بەزەك.

## ئاخفتن و زمان:

بابەتەکێ گرنگە دناڤ پەندادا، و بۆ ڤێ چەندێ ب دەهان گۆتن ل دەڤەرێ یێن هەین:

- ئاخفتن ئاخفتنێ دکێشیت[١٣٨].

- ئاخفتن کەلەکا بەرانە[١٣٩].

- ئەگەر ئاخفتن ب پارە با کەسێ نە دکری.

- ئاخفتنا بن ئەزمانی ئەگەر نە دەرکەڤیت کەس نزانیت.

- تۆ دشێی قازانەکا دانقوتێ ب حەبینی ، نەشێی ئاخفتنەکێ ب حەبینی.

لەوما گۆتن هاندانا نە ئاخفتنێ، یان کێم ئاخفتنێ ددەت:

- نەئاخفتن زێرە.

یان دبێژن:

- ئەگەر ئاخفتن زیڤ بت، نە ئاخفتن زێرە[١٤٠].

- ئەزمانێ بری بە، سەرێ هەستی بە.

- ئەزمانۆی بری بە، سەروی ڤەهسیای بە.

- ئەزمانێ درێژ دارکۆکێ سەرێ خودانی یە[١٤١] .

- ئەزمانێ مرۆڤی بەلا سەرێ مرۆڤی یە.

چونکی :

- ئاخفتنا خۆش و نەخۆش ژ دەڤەکی (ئەزمانەکی) دەردکەڤیت[١٤٢] .

- لەوما گۆتنا کوردی هاندانا ئاخفتنا خۆش ددەت:

- گۆتنا خوەش بهارا دلانە[١٤٣].

- ئەزمانێ خۆش ماری ژ کونێ دکێشتە دەر.

وەسان گەلەك گۆتنێن دی ل سەر زمانی و ئاخفتنێ یێن هەین:

- هەمی دار دهێنە سۆتن، هەمی ئاخفتن ناهێنە گۆتن.

## خوارن:

ل سەر خوارنێ، کو مرۆڤ کێم بخۆت باشترە دبێژن:

- خارن گەردو... ، شویشتن رەنگ و روی یە.

- کێم خۆرێ داییم خۆربە[١٤٤] .

- هەچیێ بخۆت گەلەك، دێ ل دلی هێت کولەك.

ل سەر تێریێ و برسی بوونێ دبێژن:

- دکەنیت زکێ تێر، نا کەنیت سەرێ زێر[١٤٥] .

- زکێ تێر چێترە ژ سەرێ زێر.

- باب دمریت خەو دهێت، شیڤ نەخاری خەو ناهێت.

ل سەر جۆرێن خوارنان دبێژن:

- باليل دبێژیت: پاریێ خۆش نەدە ب یێ نەخۆش.
- ماستێ پاییزا بدەنە عەزیزا، شیرێ بهارا بدەنە نەیارا.
- ئاڤا ل دی بەرویێ، وەكی ماچا ل بن پەریێ[146] .
- ئاڤ دچیتە سەر ئاڤاهییا.
واتە: ئاڤ ل پشتی پاریێ خۆش.
- گۆتنە عیسێ: چ یا خۆشە ب ساری؟.
گۆت: فری و گرارا ب كاری.
- كەنگر خیزا بدەن عەزیزا، كەنگر بەیارا بدەن نەیارا.
- ساڤار ئالیكا مێرانە[147] .
- نە سلكە نە كوتلكە، هەر ئاڤێ فركە فركە.
واتە: ئەگەر گەلەكا رۆن بیت.
- ژ سێڤا سێ، ژ باهیڤا تژی مستێ، ژ هرمیكا هندی تۆ دشێی.
- سینكێ بەرانی، ناگریت جهێ نانی.
دیسان گەلەك گۆتنێن دی ل سەر خوارنێ هەنە:
- تێشك كەتنە دی، تێر نەخارن تێر توی.
یان دبێژن:
- هرچا ب كودی، تێر نەخارن توی.
واتە: كەسێ ب عەیال تێر ناخۆن، ب تایبەت ژن.
- شرینی عاقل جەمینی.
واتە: خوارنا تشتێن شرین.
- زك و بن زك بوونە هەڤرك، خودان كرنە تەرك.
گۆتن ل سەر بیهنافسیێ یە.

## خێزانداری:

ڤان گۆتنان ئەڤ چەندە ژی ل دووڤ ژیانا وان یا رێكخستی، هندە جاران ئێك دگرن و هندە جاران دژی ئێكن:
- كەس ب مریشكا ب پەز نەكەتییە، ب خزما ب پسمام نەكەتییە.
- برایێ نە ژ ماكێ نابت پسێ مێلاكێ.
- هەچیێ زاڤایەك هەی كەرەك وێ هەی[148] .
ل ناڤ كوردا ئەگەر هندە جاران كەسێن مالەكێ ب شەر بچن، دڤێت مرۆڤ مایێ خۆ ب خرابی دناڤ وان دانەكەت، چونكی ئەو هەر پێن ئێكن:
- سێنی سێكن، ئەو پێت ئێكن.
ل سەر پەیوەندیێن دەیبابا دگەل عەیالی دبێژن:
- دای ودۆتا ( وەلەدا) شەركر، بێ عاقلا باوەر كر[149] .
- دەیبابا بەرێ ل عەیالی، عەیالی پشتا ل دەیبابا.
- مرۆڤی نەڤێت كەس ژمرۆڤی چێتر بیت، مرۆڤی دڤێت عەیالێ مرۆڤی ژمرۆڤی چێتر بیت.
- ئەگەر بابێ مرۆڤی رەشك با دا سەد جارا دریت.
- دەیكێت كورا ل بەر دیوارا دكەنە ترە ترا.
ل سەر پەیوەندیێن دی دبێژن:
- خالەتێ خایێ، ژێ تێتن بێهنا دایێ [150].
- هندی مالە، مام و خالە.
- دەیك بۆ ژنباب، باب بۆ زرباب[151] .
- برایێ دایێ ، جهۆرێ كایێ.
- دەردێ هەویێ وەكی ئێشا تلیێ.
- ئاخا ژن و مێرا ژێكە.
واتە: وەكی ئێكن.
ل هندە جاران ئەڤ پەیوەندیێن خێزانی دخرابن، لەوما دبێژن:
- هندی دویرترە شرینترە [152].
- دویرهە نویرهە

## مەزنایی و ئاغاتی:

گەلەك گۆتنێن دەڤەرێ ل سەر ڤی بابەتی ژی پێن هەین، وەكی دێ دبێژن:
- مالا بێ مەزن خرابە (وێرانە)[153] .
لێ ئەگەر ئەو مەزن دكەڤن.
- گا كەتن، ساتۆر خۆش دبن.
یان دبێژن:
- كەلەخ بكەڤن، تەیر دمشەنە[154] .
یان دبێژن:
- ئەگەر شێر كەتن، ریڤی یاریێت خۆ پێ دكەن.
لەوما گۆتن مرۆڤی شیرەت دكەت كو:
- ئەگەر ئاغا ببیتە كەر و تۆ لێ سویار بووی، پێت خۆ لێ نە هەژینە.

- ئەگەر مەزن بۆ بەر، نەدە سەر.
چونكی سەر (مەزنایی)، بۆ مللەتی گەلەكە:
- سەر هاتە برین، ناهێتە كرین.
- ئەگەر سەر چوو پێ چ ناكەت.
- خەتا كویر ژ گایێ پیرە[155] .
لێ هندە جاران دێ بینین ئەو ب رۆلێ خۆ نارابن، وەكی سەركێش. یان هندەكێن نەهەژی یێن ل وی جهی، لەوما دێ بێژن:
- مەزنێ مە بۆ تۆمە، خۆلییا سەرێ مە بۆ كۆمە.
- خودانێ مە خرۆ بت، سەیێ مە قەرو بت، حالێ مە دێ هۆ بت.
- ئاغایێ مە خولامێ خەلكی.
- خەتا خار ژگایێ پیرە[156] .
- چیا دبێژن ئەم چیانە، گۆلكێت گارانێ دبێژن ئەم گا نە، هەچیێ كەر تڤەنگەك ب ملێ خۆ ڤەكر دێ بێژن ئەم ژ مالا عەلی ئاغانە .
دیسان دڤێت ئەو مەزن یێ هشیار بیت ، ب تایبەت ئەگەر دادی ل نك نەبیت، كو ئەو مەزنایی بۆ نامینت، و دێ كەڤیت:
- میر دێ هەر هەوجەی ماشێ بیت[157] .
- ئەگەر تاسی میرا كەت، چ شكەست ئان نەشكەست، دەنگ ڤ دونیایێ كەت[158] .

## وەرز:

- عەورێت بهارا ددرەوینن.
- هاڤین بابێ فەقیرانە.
- زڤستان هات: بەركا فەقیری دریا.
- زڤستان سارە، كەر گلد یارە.
- بالیلی یا گۆتی: چ رۆژا بارانە ئەو زڤستانە.
- ئادارێ پشك و بارێ خۆش گرارێ.
- ئادارێ مەشكا ل دارێ، ل ڤێرە نە ل بەرویا شنگارێ[159].
- نەڤرۆزە، نە نزارە نە بەرۆژ، تەمەت ئێكن شەڤ و رۆژ .
- نیسانێ بویكا (مەشكا) بارانێ[160] .
- نابەینا نیسان و گولانێ ، بێت تاڤیەكا بارانێ ، چێترە ژ باگوردانێ زێری ل ناڤا مەیدانێ.
- گولان دێ گول دەت.
- گولانێ توی ل كۆلانێ.
- خزیران خنزری، چ خۆ ل بەر نەگرت، غەیری دارا چلو (مازی) و مێوا تری[161] .
- تەباخێ، تری كەتە سەر ئاخێ ، مویژ نەمانە ل مشتاخێ.
- ئەیلۆلێ ب سەڤیا چوونێ[162] .
- كانوینا بچویك، بەفر دهێت پیچك پیچك، ب باناڤە دبیتە میچك.
- كانوینا مەزن، بەفر دهێت رم رم، بەفرە پێت مە نا تەزن.
- شواتێ بەفرو باتێ، كچك ژ گیا تێ.
- بابێ زیپانە، پیرا شفتانە (شەڤتانە)، جانا دەرمانە.
- زیپە دسارن، بارن نەبارن.
- عنتەرن ب تۆزو گەرن دبێ مەفەرن.
- بەین و بەندلخە، ناچن بێ تلخە.
- عەورێت سپییێت سپێدەهییا، هوین جابێ بدەنە موكرییا، دا چێكەن دەستكو بەفرییا.
- عەورێت سۆرێت ئێڤارا، جابێ بدەنە جۆتیارا، دا چێ كەن هیرو بارا.
- پێنج شەمبی باری، ئەینی هاتە هاری، شەمبی رۆژەكا بهاری.
واتە: باران بارین ژ سێ رۆژا نابووریت.

## مرن:

لایەنەكێ گرنگە دناڤ گۆتنان دا و ب دەهان گۆتن ل سەر مرنێ یێن هەین:
- ئینسان تۆڤێ مرنێ یە[163] .
- مرن كەرێ بەڤالایە، یێ ل بەر دەرێ هەمی مالا[164] .
- نیشانێت بارانێ بانە، نیشانێت مرنێ تانە[165] .
- ئەو مری ناكەڤت ل بەر وێ گریێ.
- هەر ئێك بۆ مریێ خۆ دگریت.
- باب مری خەو تێت، شیڤ نەخاری خەو ناهێت.

ئەڤ گۆتنە ل سەر برسێ یە.
- رای ل هەمی تشتا دبیت ل مرنێ نابیت.
- جابا مری زوی دگەریێت.
- مری مر، شەیتانی دەستێ خۆ ژێ کێشا.
واتە ژخرابیێ دویر کەتن.

## دونیا:

- دونیا ب پلم و بسك و گرارێت رۆن خۆشە.
- دونیا کورکێ حاکمی یە، هەررو دملێ ئێکی وەرە.
- دونیا کویرو دویرە.
- دونیا بەحەشتا کەرانە.
- دونیا سەیێ گەمبۆلە، جار سەردکەڤیت جار بن دکەڤیت.
- دونیا دهژیێت و خراب نابیت.
- دونیا هەمی یا ل بن سیبەرا دارێ، جار بۆ مە و جار بۆ هەوە.

## شەر:

- شەر دەهواتا (دەواتا) مێرانە[166] .
- شەر ب شیری و بازار ب درەوا.
- سەد کولاڤ چوونە سەرەکی.
- شەرو نیڤ شەر برایێت ئێکن.
- پشتی شەری مێرخاس دمشەنە.

## مێرانی:

مێرانی و وێرەکی ئێك ژساخلەتێن هەرە گرنگە دناڤ مللەتێ کورد (مینا هەمی مللەتاندا) دا. چونکی:
- دونیا مالێ مێرانە.
- مێربە و گۆشت و برنجا بخوو.
- گرارا مێرا یا ب قەرە (یا ب ئحمە).
- گۆشتێ مێرا نە ب کێشانە نە ب پیڤانە[167] .
- فەننێت مێرا کەلەهن (کەلانە).
- ئەگەر بایێ مێرا هات دێ زەبەشا ژ عەردی رادکەت.

ڤێجار شیرەت دکەت کو مرۆڤ یێ نە ترس و وێرەك بیت:
- رێك رێکا مرنێ ژی بت تۆ هەر ل پێش (بەراهیێ) بە[168].
- بەرخێ نێر بۆ سەربرینێ (سەرژێکرنێ یە) باشە[169].

کەسێ زیرەك و وێرەکە دخۆت:
- دڤێت مرۆڤی دل هەبیت دا مێلاکێ پێ بخۆت.

کورد مێرانیێ ب شێر و دیکل دزانیت:
- دیکلێ رۆژەکێ بە، نە مامرکا سەد رۆژا.
- هەرە بن سیبەرا شێری بلا تە بخۆت.
- شێر من بشکێنیت، نە ریڤی من ب ئالیست.

یێ مێر مێرە، و ناترسیت:
- ئەگەر مێر مێر بت، بلا شوینا خەنجەرێ کێر بت.

دیسان تۆڤێ مێرانیێ وەکی د چەند گۆتنان دا هاتی هەر دمینت:
- هێڤێنێ مێرا نا مرن.
- هێلینا بازی چ جارا بازی ژێ خلاس نابن.
- هیڤێنێ مێرا مێرن .
- تێشکێ شێری هەر شێرە[170] .
- بەفر دچیت چیا دمینت، مرۆڤ دچیت ناڤ دمینت.

ل بەرامبەر ڤێ چەندێ چەند گۆتنان هەلویستەك ژ ترسێ یێ هەی.

دبێژن:
- یێ... فرەهـ بە دا یێ عەمر درێژ بی.

لێ ل بەرامبەر چەند گۆتن هەنە دبێژن:
- دلێ ترسنۆك سینگێ سپی (گەورێ) نابینت[171].

هەروەسان چەند گۆتنێن دی ل سەر ترسێ یێن هەین:
- ترس ماکا (خویشکا) مەعریفەتێ یە[172] .
- ترسێ بکەنە ئامانێ سفری دێ کون کەت[173].
- یێ دترسیت ئەو دپرسیت.

- ژ وی ب ترسە یێ ژ خودێ نەترسیت.

هەڤكاری:

- دەستێ ب تنێ دەنگ ژێ ناهێت[174] .
- سویارێ ب تنێ تۆزێ ناكەت[175] .
- دەست ل سەر دەستا، حەتا عەسمانێ حەفتا[176].
- دیزك سەر سێ بەرا (پێپكا) دراوەستیت[177].

## ئابووری و مال و دراڤ:

لایەنێ ئابووری لایەنەكێ گرنگە ژ ژیانا هەر مللەتەكی، و ئەڤە یا بوویە پشكەك ژ ژیانا رۆژانەیا كوردان، و ئەو چەند دناڤ گۆتنێن مەزناندان ل دەڤەرێ ژی خۆیا و بەرچاڤن:

- خودانێ ملكی نائێخیت (ناهێلیت) خولكی[178]
- دراڤێ سپی بۆ رۆژا رەش.

یان دبێژن:

- مالێ گەش بۆ رۆژا رەش.

لێ ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینت كو مرۆڤ یێ پارە پەرێسبیت، بەلكی مەردینی ئێكە ژساخلەتێن باش ل نك خەلكێ دەڤەرێ:

- مالێ دونیایێ قرێژا دەستانە [179].
- مالێ هلگرتی رزقێ زالمی.
- مالێ مریا بۆ زیندییانە[180] .
- مالێ قەلسی و مەردی هندی ئێك دچیت[181] .
- ئەگەر سیخورە قەلەو دبیت قوینا وی تەنگ دبیت.

واتە: دەمێ ئێك زەگین دبیت قەلس دبیت.

هەر دیسان خۆیا دكەت، كو یێ باش دێ ب كێر خۆ هێت و یێ خراب تۆ بۆ بكەی ژی بێ مفایە:

- مالی نە بۆ كورێ باش نەیێ خراب نەكە[182].

لێ دسەر هندێ را هاندانا ئابووریێ ژی دكەت، نە مینا عەیشانێ بن:

- چەند گەنمێ دۆبانێ، چەند دوهنێ زۆزانێ، بینن بەر دەستێ عەیشانێ، هەر نینەو دبێژیت كانێ![183] .

چونكی ئابووری نەبیت:

- سرك بێت ئابووری تێدا نەبیت نامینت.
- خابۆرە، بەلێ ئەو ژی ب ئابوورە [184].
- ئاڤا زێ یە، ئابوور لێ یە[185] .

دیسان ل سەر بازاری گۆتنێن هەین:

- كێ دونیا دۆت؟ یێ كری و فرۆت[186] .
- سولتەو سویتە مالا رویتە، شۆل جۆتەو تاجرڤانی، سەد گۆر بابێ خودانی.
- برا برایە، بازارێ جودایە[187] .

ل سەر دەینی ژی دبێژن:

- سەد هزر دەینەكی ئەدا ناكەن.
- دیتنا دەینداری، نەخۆشترە ژ پێڤەدانا كۆرەماری.
- دەین خۆش بەو ببە شریكێ مالێ عالەمێ.
- ب دەستا بدەو ب پیا لێ بگەرە.
- ئەگەر دەین بوونە هزار قەهوێ ڤەخۆ.
- یا دەینی هەر دانە.
- مێر كوشتن خۆشترە ژ دەینداریێ .

## خرابی:

- یێ ڕستكا خەلكی ب هژێنت (ب قەتینت)، خەلك ژی دێ ڕستكا وی هژێنت (قەتینت).
- ئەگەر ئێكی ئێك نەڤێت خەونێت خراب پێڤە دبینت.
- ئەگەر تۆ بەندكەكێ سۆر و زەربای دا ب دەرێ هومبانا خۆ ڤەبی.
- ئەگەر مرۆڤی دەرگەهێ خەلكی قوتا خەلك ژی دێ دەرگەهێ مرۆڤی قوتیت.
- ئەگەر هەڤالێ مرۆڤی شەكر (هنگڤین) بت دڤێت مرۆڤ هەمیێ نەخۆت.
- ئەوێ تەپكێ ل بەر هەڤالێ خۆ دانیت ئەو بخۆ دێ كەڤیتێ.
- ئەوێ ستریا بچینت دڤێت پێخاس نەگەرێت.
- بەرا نە هاڤێژە ئەو كانیا تە ئاڤ ژێ ڤەخاری.
- هەتا مرۆڤ پیڤازێ نەخۆت بێهن ژ دەڤێ مرۆڤی ناهێت [188].
- چ ب چینی دێ وی هەلینی.

واتە: دەستكەفتیێ مرۆڤی ئەنجامێ كارێ مرۆڤییە، چ ب باشی چ ب خرابی:

- چ بكەیە كوواریٚ ئەو دیٚ هیٚتە خواریٚ.

## زك رەشی:

- برایێ من و بەریكا من و...

یان دبیژن:

- كی مفایە ئەو برایە [189].

- تەفشیكێ بەریٚ خۆیە (وەكی ئیدیوم ژی ل كارە) [190].

- حەتا پلەكێ ددەت، تلەكێ دبەت.

- دبیژنە كتكێ گ... تە دەرمانە، ئاخێ رادەتە سەر.

- دونیا رەڤ و رۆیـە، هەر كەسەكی بەر ل خۆیە [191].

- دونیا سەریك و بنێك بیت، بهۆستەكێ یا ژ مرۆڤی دویر بت.

- هەرنە ڤێ هەواریٚ ئەز تێ نە.

- بەحەشتا مرۆڤی بار تێ نەبیت، بلا كەرو گۆلك بچنە ناڤ.

## پیری:

- خۆزیا وێ پیریٚ جانییا وێ بێتە بیریٚ.

- پیری و هزار (سەد) عەیب [192].

- پیراتی میٚرانییٚ هندا دكت [193].

- بلا مرن هەبیت، پیری نەبت.

- ئەگەر گورگ (شێر) پیر بوو، دبیتە پێترانكێ سا [194].

- گۆتنە پیریٚ تە بۆری یان عاقل؟ گۆت: ئەگەر من بۆری دیتن دیٚ من عاقل هەبیت.

## میٚهڤانداری:

- كتكێ چاڤ بەلەكێ، میٚهڤان دخۆشن شەڤەكێ [195].

- رۆژەكێ میٚهڤان بە، ئێكێ سولتان بە، ئێكێ ل جهێ پێلاڤێ بە.

- پرسیارا میٚهڤانی یە.

- جهـ ب میٚهڤانا تەنگ نابیت.

- نانێ میٚهڤانی یێ دگەل میٚهڤانی.

- میٚهڤان سێ رۆژا میٚهڤانە، ژ ویٚرێ ویٚڤە سەدەقەیە.

هەلبەت كێم بابەت نەبن ئەگەر هندە گۆتنێن كوردی ب گشتی، كو ییٚن دەڤەریٚ پشكەكن ژێ، خۆ لێ نەكرینە خودان، بۆ نموونە:

**تەمبەلی:** بۆ خوارنێ بەدەل دەها، بۆ كرنێ با كەت گەها.

**ڤەلسی:** رەزڤان ل دەمێ تری گوە گرانە [196].

**نڤێژ:** نڤێژا بەر وەخت، وەكی میریٚ سەر تەخت.

**بێ چەنسی:** پەزێ ژارا، خوە ددت چار كنارا.

**جیرانی:** جیرانێ باش ژ دەیبابا چێترە.

**خویٚنداری:** خوینداری ب دارو بەرا نەكەڤیت [197].

**پەروەردە:** شڤك ب تەرینی دچەمیٚت [198].

**جۆتیاری:** ئەگەر جۆتیار جۆتیار بیت، ل سەر شاخا دێ جۆتی كەت.

**دەم:** سال ب سال، خۆزیكێت پار.

هەلبەت ب دەهان بابەتێن دی، مینا (زولم، تەنگاڤی، بەترانی، پەشیمانی، خورتی، منەت، هێجەت، داكەتن، دفن بلندی، تفاقی، بێهن فرەهی، ئەزمان خۆشكی، پاقژی، هەڤالینی، سواری، زانین و...).

# ژێدەر و پەراوێز


١. د. بدرخان السندي، الحكمه الكرديه، چ٢ سالا ٢٠١١، بپ٥.
٢. هەمان ژێدەر.
٣. هەمان ژێدەر.
٤. الاب يوسف قوشاقجي الامثال الشعبية الحلبية وأمثال ماردين، بەرگێ ئێكێ، سالا ١٩٨٤، بپ٤.
٥. د. گریگوری شرباتوف، العناصر المشتركه للامثال الشعبيه العربيه، گۆڤارا التراث الشعبي، ژماره ١١- ١٢ /سالا یازدێ ١٩٨٠ێ، بپ٤٩.
٦. د. شوکریه رەسول ئیبراهیم، ئەدەبی فۆلكلۆریی كوردی- بەشی دووەم، سالا ١٩٨٤، بپ٢١- ٢٢.
٧. هەمان ژێدەر، بپ٢٢.
٨. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بپ٥.
٩. هەمان ژێدەر، بپ٨.
١٠. د. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆریی كوردی، بپ٨.
١١. هەمان ژێدەر، بپ٩؛ د. بدرخان السندي، الحكمه الكرديه، بپ٨.
١٢. د. بدرخان السندي، الحكمه الكرديه، بپ٨؛ ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بپ٩.
١٣. د. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بپ١٠.
١٤. د. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بپ١٠.
١٥. هەمان ژێدەر، بپ١٠.
١٦. شوکریه رەسول، بپ١٤.
١٧. د. بدرخان السندي، الحكمه الكرديه، بپ٩؛ شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بپ١٦.
١٨. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، بپ١٦.
١٩. هەمان ژێدەر، بپ٣٣.
٢٠. هەمان ژێدەر.
٢١. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆریی كوردی، بپ ١٥.
٢٢. هەمان ژێدەر، بپ٣١.
٢٣. هەمان ژێدەر، بپ٣٣.
٢٤. هەمان ژێدەر، بپ٣٦.
٢٥. هەمان ژێدەر، بپ٣١.
٢٦. هەمان ژێدەر.
٢٧. هەمان ژێدەر، بپ٤٤.
٢٨. پەرتووكا (پند كرمانجی)- ئەحمەد عضدی، ژ لایێ بەرهەڤكەرێ ڤی بابەتی ڤە هاتیيە بەرهەڤكرن و سالا (٢٠٠٦)ێ ژ لایێ دەزگەها سپیریز ڤە هاتیيە چاپكرن.
٢٩. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆریی كوردی، بپ١١.
٣٠. د. بدرخان السندي، الحكمه الكرديه، بپ٩شوکریه رەسول، بپ١٦.
٣١. شوکریه رەسول، ئەدەبی فۆلكلۆریی كوردی، بپ٢١.
٣٢. هەمان ژێدەر، بپ٢٤.

٣٣. هەمان ژێدەر، بپ٣٣.
٣٤. هەمان ژێدەر، بپ٣٦.
٣٥. هەمان ژێدەر، بپ٤٢.
٣٦. شوکریە رەسول، ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، بپ٤٢.
٣٧. مەلا مەحمود دێرشەوی، مشتاخا چیا، بەغدا سالا ١٩٨٠، بپ (و).
٣٨. ژ بەرهەڤکرنا، مەسعود محەمەد سەعید یاسین.
٣٩. ئەڤ گۆتن و پەندێن ئاماژە ب ژێدەرێن وان نەهاتینە دان، ژ دەستنڤیسا بەرهەڤکەرێ بابەتی هاتینە وەرگرتن.
٤٠. خالد صالح، ژ پەندێن کوردەواری، گۆڤارا دەنگێ مە ژمارە (٢)، سالا ١٩٨٥ێ، بپ٣٧.
٤١. گۆتنێت مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان، بپ٧٩.
٤٢. هەمان ژێدەر، بپ١٢٥.
٤٣. هەمان ژێدەر، بپ٧٠.
٤٤. هەمان ژێدەر، بپ٤١.
٤٥. نزار محەمەد سەعید، چەند گۆتن و پەژنێن کوردان ژ دەڤەرا بادینان. دهۆك سالا ٢٠١١، بپ ١٠٠.
٤٦. واتە: بەر ب خرابی ڤە چوون.
٤٧. مەسعود خالد گولی، نەخشێ ل بەرا، دهۆك سالا ١٩٩٩، بپ٢٠.
٤٨. مەلا مەحمودێ دێرشەوی، مشتاخا چیا، بپ١٩٦.
٤٩. چیا مازی، فەرهەنگا گۆتنێن پێشییان، ئەڤراز حسێن ژ ئەلیفابێیا لاتینی ڤەگوهاستییە، دهۆك ٢٠٠٦، بپ١١١.
٥٠. هەمان ژێدەر، بپ٩٠.
٥١. مەحفۆزێ مەلە سلێمان ، ٤٠٠٠ پەندێ کوردی (سالێن نۆتان ب لاتینی)، بپ٧٠.
٥٢. هەمان ژێدەر، بپ١٢٠.
٥٣. ئوردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل، زارگۆتنا کوردا گۆتنێت مەزنا، وەرگێر پرۆفیسۆر بەدرخان سندی، سالا ٢٠٠٩، بپ٣٧.
٥٤. خالد صالح، پەندێن کوردی ل خوراسان. گۆڤارا ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٢١ سالا ٢٠٠٦، بپ ٩٥.
٥٥. هەمان ژێدەر، بپ٩٣- ٩٤.
٥٦. قادر فتاحی قازی، امثال و حکم کردی، بخش دوم، تەبریز سالا (١٣٧٥ ئیرانی)، بپ٢١٢.
٥٧. ئیبراهیم ئەفخەمی، بنەرەتی مەتەڵی کوردی، تەبریز سالا (١٣٦٨ ئیرانی)، بپ ١١٩.
٥٨. عومەر شێخوللا عەلی ، پەندی کوردی ، سالا ١٩٨٠
٥٩. هەمان ژێدەر.
٦٠. محەمەدی خال، پەندی پێشینان، چاپی دووەم ، سالا ١٩٧١، بپ٢٥١.
٦١. هەمان ژێدەر، بپ٢٤٦.
٦٢. ئازاد وەڵەدبەگی، پەندی پێشینان بە زاراوەی لەکی. گۆڤارا، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٧ سالا ٢٠٠٥، بپ ١٦٦.
٦٣. هەمان ژێدەر، بپ ١٦٦.
٦٤. حەکیم مەلا ساڵح، پەندی پێشینانی ناوچەی ئیلام. گ. ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە ١٥ سالا ٢٠٠٥، بپ٩١.
٦٥. هەمان ژێدەر، بپ ٩٠.
٦٦. سەفەر هاواری، پەندی پێشینان لە دەڤەری هەورامانداا. گۆڤارا ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٥ سالا ٢٠٠١، بپ١٣٠.
٦٧. هەردەوێڵ کاکەیی، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی شەبەك ، سالا ٢٠٠٨، بپ٨٢.
٦٨. هەمان ژێدەر، بپ٧٣.
٦٩. فەرهەنگا گۆتنێن پێشییان، بپ٢٠.

٧٠. فەرهەنگا گۆتنێن پێشییان، بپ٢٣.
٧١. فەرهەنگا گۆتنێن پێشییان، بپ٢٤.
٧٢. رەفیق محەمەد سەعید فەتاح و عەبدولستار فەتاح حەسەن، الامثال المقارنة، سالا ١٩٩٩، بپ٥٤.
٧٣. هەمان ژێدەر، بپ٥٤.
٧٤. مفا ژ پەرتووكا (ژ پەندێن ئەلمانی- حەجی جەعفەر)، هاتییە وەرگرتن.
٧٥. بۆ پتر ل سەر ڤی بابەتی، بنێرە: خالد صالح، هەڤبەركرنا پەندێن كوردی- ئەلمانی، گۆڤارا مەتین، ژمارە ١١٩ سالا ٢٠٠١.
٧٦. حەجی جەعفەر، وكهەڤیا پەندێت كوردی و ئەلمانی، گۆڤارا دهۆك، ژمارە (١٠) سالا (٢٠٠٠)، بپ٢٤.
٧٧. هەمان ژێدەر، بپ٢٥.
٧٨. جەلال زەنگابادی، بەرچنێك لە پەندێن كوردی، گۆڤارا ئاسۆی فۆلكلۆر، ژمارە ٧ سالا ٢٠٠٥، بپ ١٦٨.
٧٩. ژپەندێن ئەلمانی، بپ١٣٨.
٨٠. رجا الكشو، نظرة في منتخبات من الامثال الشعبية التونسية، مجلة التراث الشعبي، ژمارە ٣، سال١١/١٩٨٠، بپ١٨٣.
٨١. هەمان ژێدەر، بپ١٨٦.
٨٢. گۆڤارا التراث الشعبي، ژمارە ١١-١٢سالا ١٩٨٠.
٨٣. هەمان ژێدەر، بپ١٧٩.
٨٤. خالد صالح، گۆتنێن كوردی- حەلەبی، گۆڤارا ئاسۆی فۆلكلۆر، ژمارە ٢٥ سالا ٢٠٠٧، بپ ٧٤.
٨٥. هەمان ژێدەر، بپ٧٤.
٨٦. هەمان ژێدەر، بپ٧٤.
٨٧. هەمان ژێدەر، بپ٧٥.
٨٨. یاسین النصیر، من امثال الف لیله ولیله، گۆڤارا التراث الشعبي، ژمارە ٥-٦ سال ١٤/١٩٨٣، بپ١٧٦.
٨٩. هەمان ژێدەر، بپ١٧٩.
٩٠. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٤٩.
٩١. هەمان ژێدەر، بپ١٣٣.
٩٢. هەمان ژێدەر، بپ١٣٦.
٩٣. هەمان ژێدەر، بپ١٤٣.
٩٤. كۆڤان خانكی، گۆتنێن مەزنان دهۆزانا جەگەرخوین دا، بپ١١٦.
٩٥. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ١٥٨.
٩٦. هەمان ژێدەر، بپ ٤٣.
٩٧. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ١١٤.
٩٨. گۆتنێت پێشینان، بپ١٤٦.
٩٩. ئەحمەد قەرەنی، كانی، سالا ١٩٨٤، بپ١٢٦.
١٠٠. كانی، بپ١٠٢.
١٠١. گۆتنێت پێشینان، بپ١٠٤.
١٠٢. پێزانێ ئالیخانی، دو مراری ژ گەنجینا فۆلكلۆرێ كوردی، سالا ١٩٨٥، بپ٧٨.
١٠٣. گۆتنێت پێشینان، بپ٤٦.
١٠٤. كانی، بپ٩٧.
١٠٥. مشتاخا چیا، بپ٢١٢.
١٠٦. گۆتنێت مەزنان، بپ١٠٩.

١٠٧. پێزانێ ئالیخانی، دو مراری ژ گەنجینا فۆلکلۆرێ کوردی، بپ٦٧؛حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٢٢.
١٠٨. گۆتنێت پێشینان، بپ١١٤.
١٠٩. کانی، بپ٥٨.
١١٠. دو مراری، بپ٩٥.
١١١. مشتاخا چیا، بپ٢٥٠.
١١٢. کانی، بپ٥٦.
١١٣. دو مراری، بپ٨١.
١١٤. مشتاخا چیا، بپ١٢٥.
١١٥. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٥٣.
١١٦. نەخشێ ل بەرا، بپ ٣٥.
١١٧. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٧٢.
١١٨. گۆتنێت پێشینان، بپ١٢٥.
١١٩. کانی، بپ٥١.
١٢٠. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٤٩.
١٢١. نەخشێ ل بەرا، بپ٦٨.
١٢٢. دو مراری، بپ١٠٥.
١٢٣. هەمان ژێدەر، بپ٩٨.
١٢٤. گۆتنێت پێشینان، بپ٩٢.
١٢٥. دو مراری، بپ٦٩.
١٢٦. گۆتنێت پێشینان، بپ٥٧.
١٢٧. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٤٦.
١٢٨. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ٧٣.
١٢٩. مشتاخا چیا، بپ٧٩.
١٣٠. کانی، بپ ٦٥.
١٣١. حەجی جەعفەر، گۆتنێت مەزنان، بپ١١٩.
١٣٢. دو مراری، بپ٨٣.
١٣٣. گۆتنێت پێشینان، بپ١٣٠.
١٣٤. دو مراری، بپ٨٣.
١٣٥. مشتاخا چیا، بپ١١.
١٣٦. نەخشێ ل بەرا، بپ٦٩.
١٣٧. دو مراری، بپ٨٤.
١٣٨. نەخشێ ل بەرا، بپ١٤.
١٣٩. دو مراری، بپ٦٠.
١٤٠. گۆتنێت پێشینان، بپ٢١.
١٤١. دو مراری، بپ٥٧.
١٤٢. هەمان ژێدەر، بپ٦٤.
١٤٣. نەخشێ ل بەرا، بپ٨٤.

# گۆتنێن مەزنان ل دەڤەرا بەهدینان

پ.هـ.د. عیماد وەیسی خالد

ئەدەبێ فولكلۆری بەشەكە ژ ئەدەبێ هەر مللەتەكی، كو ل پال ئەدەبێ نڤیسی شیایە ببیتە رێكەك بۆ دەربرینا هیڤی و ئومێد و دەربرین و هزروبیرێن وی. زاراوێ فولكلۆر، زاراوەیەكە ژ زمانێ ئینگلیزی هاتییە وەرگرتن، ئەڤ زاراوە ئێكەمجار ژ لایێ (ولیەم جومس) و ل سالا (١٨٤٦) زایینی وەك زاراوەیەكێ زانستی هاتییە بكارهینان و ژ دو پەیڤان پێكدهێت:
(Folk) ب رامانا (گەل، خەلك، مللەت)
(lore) (ب رامانا (چیرۆك، پەند، زانست) دهێت و واتایا گشتی دبیتە (پەندی گەل، زانینا گەل، یان زانینا مللەتی دهێت[1].

## زاراڤێن گۆتنێن مەزنان:

زاراڤێن جودا جودا ل دەڤەرێن كوردان و بیانییان بۆ گۆتنێن مەزنان هاتینە گۆتن ودانان، هەرچەندە پرانییا زاراڤان ژ لایێ رۆخساریڤە ژێك جودانە لێ ناڤەرۆكا وان بۆ ئێك مەبەست دهێنە بكارئینان، ل دەڤەرێن كوردستانا باشوور (عێراقێ) و ب تایبەت ل دەڤ كرمانجییا ناڤەراست و كوردستانا رۆژهەلات (ئیران) ێ ژ بۆ گۆتنێن مەزنان چەند زاراڤەكان بكاردئینن، ئەو ژی ئەڤەنە: (پەندی پێشنیان)، (قسەی پێشنیان)، (مەسەلەی پێشینان)،(بێژ و پەند). ل كوردستانا باكوور (تركیا) و ئەرمەنستان و گورجیستان (جورجیا) یەكێتی سوڤیەتی یا كەڤن دبێژنێ: (قسەی باڤان) یان (مەسەلە و مەتەلۆك) و كوردێن ئازربیجانا سوڤیەت و كۆمارێن ئاسیا ناڤەراست دبێژنێ (گەپیەی باڤان)[2]، ب گشتی دەڤەرێن كوردی ب زاراڤێن (گۆتن، پەیڤ، گۆتنێن پێشنیان) بكاردئینن، زێدەباری وان ژی زاراڤێ (گۆتنێن مەزنان) بەربەلاڤێ كو ل دەڤ كرمانجێن بادینی دهێتە بكارئینان.

زاراڤێ گۆتنێن مەزنان ب پەیڤێن جۆرا و جۆر ل دەڤ مللەتێن بیانی دهێنە بكارئینان، بۆ نموونە ل دەڤ عەرەبان ئەڤ زاراڤەنە دهێنە بكارئینان ئەوژی (دارب، مەسەل، دارابی مەسەل، دورووب و ئەمسال، مەسەل و بەیان). دزمانێ ئوسمانییێ كەڤندا زاراڤێ (ئەنبارە، بەیان، ئیستلاهـ) دهاتن گۆتن. ل دەڤ ترك (پێشی تائبیر، ئاتاسۆز)[3]. دیسان د پرانییا زمانێن ئەورووپی دا ئەڤ زاراڤە بكاردئێن: (paradox,saying ,expression, metaphor, idiom[4]. د زمانێ فەرەنسیدا زاراڤێ (Proverbe) دهێتە بكارئینان كو ئەڤ زاراڤە بۆ چەرخێ دوازدێ زایینی دزڤریت، د بنیاتدا ژی بۆ زاراڤێ لاتینی (Proverbium) دزڤریت ب واتایا (لغز) یان (بەرامبەركرن = مقارنە)، د زمانێ عەرەبیدا ئەڤ زاراڤێ (مثل) ژی دهێتە بكارئینان ب

تایبەت د ڤەکۆلینێن ئەکادیمیدا ب واتایا (وەکی) یان ژی (بەرامبەرکرن - تنظیر) دهێت[٥].

گۆتنێن مەزنان پشکەکا گرنگە ژ ئەدەبێ فولکلۆری کو شیایە پتر ژ پشکێن دی دناڤ مللەتیدا بەلاڤ ببیت، ئەڤە ژی بۆ وێ پانتاییا بەرفرەهـ دزڤریتن کو ئەڤ پشکە دئاڤاکرنا جڤاکیدا بخۆڤە دگریتن ب رەنگەکی کو دێشێین بێژین: دناڤ جڤاکێ کوردیدا کەس نینە (زارۆك یان مەزن) کو مفا ژ گۆتنێن مەزنان وەرنەگرتبیت، ئەڤ مفا وەرگرتنە ژی ژ ئێکەم قوتابخانێ کو خێزانە، دەستپێدکەت و هەتا قۆناغێن دووماهیێن ژیانێ بەردەوام دبیت.

## پێناسێن گۆتنێن مەزنان:

سەبارەت پێناسا گۆتنێن مەزنان چەندین زانا و رەخنەگران ل دووڤ بۆچوونا خۆ پێناسێن جودا ئینانە، لێ نێزیکییەك دناڤبەرا هزرۆبیرێن واندا هەیە: عزەددین مستەفا رەسول دپێناسا گۆتنێن مەزناندا دبێژیت: ((پەندی پێشینیان بەرهەمێکێ زۆر کەڤنێ خەلکییە، فەلسەفا راستەقینەیا رەوشت و خۆیە و هەمی راستی و رویدانێن ژیانێ و کریارێن باش و خراب و ئەو ئەنجامێن مللەت سەبارەت هەر تشتەکی گەهشتیێ دچیتە دترازیا گۆتنێن مەزناندا، کو ژ لایێ روخسارێڤە گۆتن رستەیەکا کورتە کو رامانەکا کویر و مەزن تێدایە و چێدبیت وەك هۆزان بهێتە گۆتن و سەروا تێدا هەبیت[٦]. ئارسەر تایلور نڤیسەرێ ئەمریکی دبێژیت: (گۆتنێن مەزنان رستەیەکا رێکوپێك وجوان دارشتییە، وەك ئاخفتنەکا خودان تیڤل و پرامان دناڤ خەلکیدا بەلاڤبوویە)[٧]. ئەحمەد ئەمین نڤیسەرێ عەرەب دبێژیت (جۆرەکە ژ جۆرێن ئەدەبی کو ب کورتیا پەیڤان و جوانیا رامانێ و رەوانبێژیێ ژ ئاخفتنا ئاسایی دهێتە جوداکرن)[٨]. د. بەدرخان سندی ب ڤی رەنگی پێناسە دکەت: ((ئێکە ژ روویێن هەرە گرنگێن کەلەپووری هزرا کۆمەلایەتیا کورد، کو رۆلەکێ گرنگ دبینیت ژ بۆ پەیوەندیێن کۆمەلایەتی و ب رێکا زمانێ رۆژانە ل باژێر و گوندێن کوردیدا دروست دبیت)[٩].

## - تایبەتمەندیێن گۆتنێن مەزنان:

١- (پەندی پێشنیان و قسەی نەستەق، بەزۆر تر قسەی گەلە و خاوەنەکەی دیار نیە)[١٠].

هەر بەرهەمەکێ ئەدەبی ل دەستپێکێ خودانێ خۆ هەبوویە، لێ ژ بەر نەبوونا چاپ و چاپەمەنیێ ئەو بەرهەم نەهاتییە توومارکرن، لەوا ئەم نزانین خودانێ وێ کی یە، کەواتە ئەم نەشێین بێژین بەرهەمێ تاکە کەسی یە، بەلکو مللەت خودانێ وێ یە.

٢- (هزرو بیروبارێ کۆمەلایەتیا مللەتێ خودان بەرهەم پێکڤە دیارە)[١١].

مللەت خۆ ب خودانێ ئەدەبێ فولکلۆری دزانیت، لەورا تشتەکێ ئاسایی یە کو سیفات و تایبەتمەندیێن وی مللەتی تێدا دەردکەڤن هەروەسا د ناڤ بەرهەمێ هەر نڤیسەرەکی دا سیفات و شێواز و هزروبیرێن وی دەردکەڤن.

٣- (پەندی پێشنیان بایەخێکی پەروەردەیی هەیە، گەل لە رێگای پەندی پێشنانەوە نەوەکانی خۆ یەك لە دوای یەك پەروەردە ئەکا)[١٢].

گۆتنێن مەزنان ب ئەرکێ پەروەردەکرنا زارۆکان رادبیت، ئەڤان گۆتنان بۆ دبێژن داکو مفای ژ وان سەربۆران وەربگرن ئەوێن د سەردەمێ کەڤندا هاتینە رویدان، پەروەردەکرنا بەرەبابێ نوی (نەڤیی نوی) ئێك ژ ئەرکێن سەرملێ باب و باپیرانە، لەورا وان گۆتنێن مەزنان کرە رێکەك بۆ پەروەردەکرنا نەڤیێ نوی.

٤-(پەندی پێشنیان یا قسەی نەستەق، رستە ووتەیەکی کورتە، مانایەکی فراوان و قووڵی تیایە)[١٣].

فولکلۆر بەرهەمێ مللەتی یە، لەورا پێدڤییە ل دووڤ ئاست و شێوازێ مللەتی بهێتە گۆتن، چونکە باهرا پترا خەلکی ل سەردەمێ گەشبوونا فولکلۆری نەخوێندەڤان و ئاستێ تەکنیکی یێ وان یێ لاوازە، لەورا بەرهەمێ فولکلۆری (گۆتنێن مەزنان) بەشەکە ژ وی و ب وی زمانێ سادە و

ساكار دهێته گۆتن.

٥- (پەندی پێشینان و قسە نەستەق لە قسەكردنا ئەژین بۆ پتەوكردنی قسەش بەكارئەهێنرێت[١٤].

زۆر جار بۆ هندێ كو ئاخفتنكەر خۆ ژ زێدە بێژیێ یان پرێژیێ قورتال بكەت مفای ژ گۆتنێن مەزنان وەردگریت، ل ڤێرە گۆتنێن مەزنان وەك بەلگەیەكا پەسەندكری ژ لایێ هەمی خەلكیڤە رولێ خۆ دبینیت و هاریكاریا ئاخفتنكەری دكەت كو مفای ژ كورتبریێ ببینیت.

٦- (پەند و قسەی نەستەقی كوردی ل هەر ناوچەیەك بگرین لە ناوچەكانی كوردستان ناوێكی تایبەتی لە رووی رۆخسارەوە بو پەندەكان دانراوە، ئەم ناوانەش لە رووی رۆخسارەوە، لە یەك جیان بەلام لە ناوەرۆكدا هەموو یان یەكن و بویەك مەبەست بەكارئەهێنرێن)[١٥].

د ناڤ كوردستانێ دا گەلەك دیالێكت یێن هەین و هەر دیالێكیتەكێ شێوێ جیاوازێ خۆیێ تایبەت یێ هەی و فولكلۆرێ هەر دەڤەرەكێ ل دووڤ شێوێ ئاخفتنا وێ دەڤەرێ یێ هاتییە گۆتن ژ بەر ڤێ چەندێ گۆتنێن مەزنان رۆخسارەكێ جیاواز بخۆڤە دگریت، بەلێ ناڤەرۆكا وان ئێكە.

بۆ نموونە: دكرمانجییا ژووری دا گۆتنەك هەیە دبێژیت:

(برا برایە، بازارێ جودایە).

هەروەسا ئەڤ گۆتنە دكرمانجییا خوارێ دا ب ڤی رەنگی یا هاتی:

( براmان برای، كیسەمان جیای)

هەروەسا ئەڤ گۆتنە ل دەڤ كوردێن سوڤیەت ب ڤی رەنگی یا هاتی:

(برا براتی، بازار دیانتێ)

٧- (پەندی پێشنیان هەر وەك خۆی لە رێزی فولكلۆردا شتێكی تایبەتی یە، هەروەها لە گەل خۆیدا بەشێكی تری فولكلۆر ئەهێنێە كایەوە كە ئەویش كورتە چیرۆكە. چونكە هەموو پەندێك سەرەتایەكی هەیە، واتە شتێك، قەومێك، كارەساتێك، روداوێك رووداوە)[١٦].

ل پشت هەر گۆتنەكا مەزنان رویدان یان سەربۆرەك هەیە، ئەڤ گۆتنەیا هاتییە كورتكرن و ب شێوێ گۆتنەكا مەزنان هاتییە بكارئینان بۆ هندێ دەمێ مرۆڤ چیرۆكەكێ بۆ كەسێ بەرامبەر ڤەگوهێزیت دا بشێت ب ساناهی وەربگریت و ژ بەر بكەت.

٨- (پیاوانی دونیادیدە، پەندی پێشنیان، لاوان و نەوەی تازە فێری رەوشت و خو ئەكەن. خراپە و كەمو كورِی پێ چارە ئەكەن)[١٧].

هندەك جاران گۆتنێن مەزنان وەك گازندە و هشیاركرن دهێتە بكارئینان، لەورا پێدڤییە واتا ب رەنگەكێ نەراستەخۆ بهێتە گەهاندن.

٩- (پەندی واش هەیە لە وێنەی گالتە پێ كردن و گالتەكردن دان و خەلكی بۆ خەم رەواندنەوە ئەیگێرنەوە)[١٨].

هندەك جاران گۆتنێن مەزنان د قالبێ ئامۆژگاریان دهێتە بكارئینان و ئەو ئامۆژگارییە ب شێوەكێ جوان و پێكەنین دهێنە گوتن دا كەسێ بەرامبەر وێ گۆتنێ ب ساناهی وەربگریت.

١٠- (هەر پەندەك ل دەمەكێ دیاركری هاتییە گۆتن، لەورا پەیوەندی یا ب مێژوویێ ڤە هەی)[١٩].

هەر گۆتنەك ل سەردەمەكی هاتییەگۆتن، ئەڤەژی دبیتە ئەگەرێ هندێ دەمێ مرۆڤ ڤان گۆتنان دخوینین دێ رەوشا وی سەردەمی زانین ئەوێ ئەڤ گۆتنە تێدا هاتییە گۆتن، لەورا گۆتنێن مەزنان پەیوەندی یا ب مێژوویێ ڤە هەی.

١١-(لایەنێن باشی و خرابێن ئافرەتێ دیار كرینە)[٢٠].

گۆتنێن مەزنان دەربرینێ ژ سەردەری كرنا جڤاكی لگەل ئافرەتێ دكەت، لەورا ئەم دبینین كو لایەنێن باشی و خرابی یێن ئافرەتێ دەسنیشان دكەت.

١٢-(پەندی پێشنیان زۆر جارا راستە و راست ئەنجامێك دەدات بە دەستەوە..... یا ئەم پەندانە یەكسەر مانا نادەن بە دەستەوە ئەبێ لە

قسەکە وردبیتەوە و بکەیتە مەبەس)[21].

هندەك گۆتنێن مەزنان یێن هەین مانایێ ب شێوەکێ ڕاستە و خۆ دگەهینن و هندەکێن دی ڕاستە و خۆ مانای ناگەهینن تا کو بهێنە شلۆڤەکرن و مەبەست دهێتە دەسنیشان کرن ژ بەر وەکهەڤییا د رۆخساری دا.

## رۆخسارا گۆتنێن مەزنان:

١- (هندەك جاران ب سەر وانە، یان (ریتم)ە کا جوان یا تێدا هەی دگەل موسیقەکا سڤك، لەورا گەلەك جارا نێزیکی شێوازێ هوزانێ دبیت) [22].

٢- (گۆتنێن مەزنان چەند پەیڤەکێن کورتن، و ڕستەکا کورت پێك دئینن و رامانەکێ یان چەند رامانەکا دگەهینن)[23].

٣- (کەل و پەلێن رۆژانە: ناڤێ گەلەك کەل و پەلێن کوردەواری، یێن کو کوردا دژیانا خو یا رۆژانە دا بکارئینایێن د ناڤ گۆتنێن مەزنان دا هاتینە وەکی (بڤر، قازان، کالك،....هتد) بۆ نموونە :

(یێ هاتە همبانێ، دێ هێتە قازانێ)[24].

٤- (گۆتنێن مەزنان ب زمانەکێ گەلەکێ ب ساناهی و سڤك هاتینە گۆتن، کۆ هەر کەسەك تێبگەهیت و بشێت ژ بەر بکەت)[25].

٥- (گیانەوەر: ئێك ژ وان تشتێن ل بەر چاڤێن مە دکەڤن دەمێ ئەم گۆتنێن مەزنان دخوینین ناڤێن گیانەوەران، ب تایبەتی ئەوێن ب کوردستانێ هەین وەکی ( شێر، ریڤی، دارکۆکە، پشیك، سە، ..... هتد)، نموونە (شێر شێرە، چ ژنە چ مێرە)، (تۆبا دارکۆکێ یە)[26].

٦- گۆتنێن مەزنان هندەك جاران ب رەنگێ دێرەکا هۆزانی دهێت.

٧- (ئەم دشێین بێژین کو باهراپتر ژی یێت ب رویدان و کریارێن جڤاکی هاتینەگۆتن، یێن کو د بەردەوامی یا ژیانێ دا بەردەوام دبن، لەورا دبنە پیڤەر و ترازی یێت هەر رویدان و کریار و هەلوسیتەکی، و بەردەوام خەلکەك ددان و ستاندنا بۆ گۆتن و ئاخفتنێن خو دکەنە سپێنە و پێ رادگرن)[27].

٨- (کار و کریار: ئێکە ژ وان بابەتا کو دگۆتنێن مەزنان دا باس لێ هاتییە کرن، ئەو ژی ئەو کار و کریارێن رۆژانە پێ رادبوون وەکی (جۆت و کێل، بازار، پەز دۆتن، .....هتد).

نموونە: (برابرایە، بازارێ جودایە)، (چێل دۆتن و کەزان کەلوتن)[28].

١٠- (هەیڤێن سالێ: ئەگەر ئەم بەرێ خۆ ب دەینە گۆتنێن مەزنان دێ بینین هەر بابەتەکێ هەبیت باسێ وی یێ هاتییە کرن، لەوا باب و باپیرێن مە باسێ هەیڤێن سالێ ژی کرییە و ئەم ئاگەهدار کرینە سەر چاوانییا ب رێڤە چوونا هەر هەیڤەکێ.

وەکی: (سوباتێ، بەفرو باتێ)[29].

### ناڤەرۆکا گۆتنێن مەزنان:

**١- لایەنێ مێژوویی**[30]: دناڤ گۆتنێت مەزنان دا ئەزمونا مێژوویا گەلێ کورد و بیروباوەرێن وان دناڤەرۆکا وان دا دیاردبن، ئانکو ژ ئەنجامێ وان ئەزموونانە ئەوێن ب رێکا مێژوویێ گەهشتینە مە. نموونە: (ئەگەر نەدەت رەبێ مەعبود ژ خۆیە دانا سولتان مەحمود)، ئەڤ گۆتنە باسێ سەردەمێ حوکمێ سولتان مەحمودێ (تورك) ل کوردستانێ دکەت.

**٢- لایەنێ سیاسی**[31]: گۆتنێن مەزنان رۆلەکێ بەرچاڤ هەبوویە ژ بۆ هشیار کرن و رێکخستنا ڕێزێن گەلی و هەلوەشاندنا پیلانێن دوژمنان .

نموونە (بەرخێ نێر، هەر بۆ سەربرینێ یە).

**٣- لایەنێ ئابووری**: ئەگەر ئەم ب هویری بەرێ خۆ ب دەینە گۆتنێن مەزنان دێ بینین کۆ باب و باپیرێن مە گەلەك گرنگی دایە ب لایەنێ ئابووری و ب دەهان ئامۆژگاری ل مە کرینە کۆ لایەنێ ئابووری گەلەکێ گرنگە دژیانا مە دا، ئاشکەرایە کو مرۆڤێ زەنگین هەردەم یێ خۆ دیتی کاروکریارێن وی بڕێڤە دچن، لێ چێنابیت یێ فەقیر چاڤلێکرنا وی بکەت، لەوا دشێین بێژین کۆ ئێك ژ وان بابەتان یێ دگۆتنێن

مەزنان دا هاتییە باسکرن (لایەنێ ئابووری) یە ئەوژی دەمێ دبێژیت (ئەگەر رزق ب بەزینێ با، دا بۆ غەزالێ مینیت)، (ئەگەر نەکەی ناخۆی)[٣٢].

**٤- لایەنێ کۆمەلایەتی:-** ژ بابەتێن هەرە گرنگێن گۆتنێن مەزنانە کو گرنگییەکا زۆر پێ هاتییە دان دڤان بیاڤێن خوارێ دا:-

**أ- ئافرەت.** باب و باپیرێن مە گەلەك پیتە دایە ژنێ و ب سەدان گۆتن ل سەر هاتینە گۆتن، هندەك ژ وان گۆتنا ب باشی باسێ ژنێ یێ کری وەکی (مال ژنە و بنیات خانی) ە و هندەکێن دی ب خرابی باسێ ژنێ کرییە وەکی:

(عەقلێ دسەرێ ژنکا یێ د سەرێ مریشکەکێ دا)[٣٣].

**ب- ئامۆژگاری:** ئەڤ گۆتنێن ژ لایێ باب و باپیران ڤە هاتینە گۆتن مەرەم ژێ پەروەردەکرنا نەڤیێ نوی یە، لەورا دڤێت مرۆڤ گوهداریا ئامۆژگاریێن وان بکەت و ل دووڤ بچیت. وەکی (هەرە رێکا هەیڤەکێ نەچە رێکا ناڤەکێ)[٣٤].

**ج- مێرانی و بەرەڤانی:** ئێکە ژ سیفاتێن پیروزێن مللەتێ کورد، مللەتێ کورد چ جار حەز نەکرییە نانێ سەر شورێ بخۆت، و دهەر تەنگاڤییەکێ دا وان بەرەڤانی یا ژ مللەتێ خۆ کری، حەتا ژنکا مل ب ملێ زەلامان خەبات و تێکوشان یا کری و خۆ داینە کوشتن و ب سەر شوری نە ژیاینە. نموونە (بمرە ب سەر بلندی، بەلێ نە ژی ب سەر شوری)[٣٥].

**و- سرۆشتێ کوردستانێ:** باب و باپیرێن مە باسێ سرۆشت و جوانییا کوردستانێ کرییە، بۆ نموونە ئەڤە ناڤێ هندەك تشتێن سرۆشتی نە کو دگۆتنێن مەزنان دا هاتینە گۆتن (چیا، گەلی، دەشت، گول، ئاڤ، کانی، جۆ، رویبار و، ..... هتد ) نموونە.

(چ دەشتە چ زوزانە، عەسل خودانە)، (بەرا نە هاڤێژە وێ کانیا تە ئاڤ ژێ ڤەخاری)[٣٦].

**ز- ئایین و باوەر** [٣٧]: د بنەرەت دا زۆربەیا گۆتنێن مەزنان پاشماوێن فەرمووده و تێکستێن ئایینی نە. نموونە: (بنڤە نەجار وەکی هەرجار، خودێ ئێکە دەرگەهـ هزار).

**ر- خۆ مەزن کرن**[٣٨]: گۆتنێن مەزنان پیتەکێ مەزن ب بارێ جڤاکی و خۆ دویرکرن ژ دیاردێن نە جوان وەکی (خۆ مەزن کرن)ێ دایە وەك ئامۆژگاری ل خەلکی کرینە.

نموونە: (یێ بلند بفریت، دێ نزم کەڤیت).

**س- شەر و ئاشتی**[٣٩]: دیرۆکا نەتەوەوەیێ کوردی یا پری زولم و ستەم و زۆرداری و دەردەسەری بوو. مەزنان ئەم بێ بارنەکرینە ژ ڤی بیاڤی ژی وەك بەرهەنگاری بوون و داخازا سەربەخۆکرنێ د هەمان دەمان دا.

**ش- وەلات پارێزی:** ئێکە ژ بابەتێن هەرە گرنگ د گۆتنێن مەزنان دا، چ مللەت نینن دوژمنێت خۆ نەبن، دوژمن ژی دو جۆرن دوژمنێن بیانی و دوژمنێ خۆیی وەکی (ئاغا، بەگا، شێخان، موختار) ئەڤ مرۆڤە هاتینە دەسنیشانکرن ژ لایێ ئاقلدارێن مە ڤە وەکی (ئاغا ب من و تە ئاغایە)، دیسان دەربارەی دوژمنێن بیانی ژی مەزنان ئەم ئاگەهدار کرینە وەکی (گاڤانێ مللەتێ خۆ ، نەدە ب ئاغایەکێ بیانی)[٤٠]

## کێش د گۆتنێن مەزناندا:

هاتە باسکرن کو دەمێ باس ل کێشا گۆتنێن مەزنان دهێتە کرن، مەبەست پێ کێشا هۆزانێ نینە، چونکی گۆتنێن مەزنان نە هۆزانن، لێ د هندەك گۆتناندا دهێنە تێبینیکرن کو جۆرەکێ کێشداریێ تێدا هەیە وخۆشیەك دایە وێ گۆتنا مەزنان. گۆتنێن مەزنان ژ لایێ خەلکەکێ سادە ونەخویندەوارڤە هاتینە گۆتن وپاشی هاتینە ژبەرکرن، لەورا ژ لایێ کێشێڤە ژی دسادەنە و د هەمان دەمدا د رەسەنن و ب دروستی دەربرینێ ژ مرۆڤێ وێ ژینگەهـ و وی سەردەمی دکەن، بۆ کێشداریێ مە پشت بەستن ل سەر سەروایێ کرییە، چونکی د گۆتنێن مەزناندا هندەك جارا

سەروا هەیە و ئەو سەروا پارچێن (رستەیێن) وێ گۆتنێ ژێك جودا دکەت، ژ لایەکێ دیڤە نیڤە دێر دگۆتناندا نینن، لێ د ڤێ ڤەکۆلینێدا مە هەولدایە ل دووڤ رێزکرنەکا تایبەت ونێزیکی رێزکرنا هۆزانی ب دانین، چونکی مەرج نینە وەکو د زۆربەیا پەرتووکێن گۆتنێن مەزنان؛ گۆتن هەموو ل دووڤ ئێکدا بهێنە نڤیسین ژبەر کورتییا وێ ئانکو گۆتنێن مەزنان چ تۆپۆگرافییێن تایبەت بخوڤە نینن و هەر ئێك دشێت وەکو وی دڤێت رێز بکەت.

## ١- جۆرێن قالبێن کێشێ دگۆتنێن مەزناندا:

أ- قالبێ (٥) برگەیی برِیتما (٥) یا دوو رێزی:

دەواتا میرا
گرێ فەقیرا[٤١]

| دە | وا | تا | میـ | را | ٥ برگە |
|---|---|---|---|---|---|
| گ | رێ | فە | قیـ | را | ٥ برگە |

ب - قالبێ (٦) برگەیی ب ریتما (٣+٣) یا دوو رێزی:

ئاڤ د راوەستیت
ئەو نا راوەستیت[٤٢]

| ئاڤ | د | را | وەس | تیت | ٥برگەیی |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەو | نا | را | وەس | تیت | ٥برگەیی |

حیزا میرێ خۆبە
دزا مالا خۆبە[٤٣]

| حیـ | زا | میـ | رێ | خۆ | بە |
|---|---|---|---|---|---|
| د | زا | ما | لا | خۆ | بە |
| ٣ برگە | | | ٣ برگە | | |

ب هێجەتا سلکێ
خو گەهاند کوتلکێ[٤٤]

| ب | هێ | جە | تا | سل | کێ |
|---|---|---|---|---|---|
| خو | گە | هاند | کو | تل | کێ |
| ٣ برگە | | | ٣ برگە | | |

ج- قالبێ (٧) برگەیی ب ریتما (٤+٣) یادوو رێزی:

نە مریشکە هێکا بکەت
نە دیکلە بانگ بدەت[٤٥]

| نە | م | ریش | کە | هێ | کا ب | کەت |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نە | دی | ك | لە | بانگ | ب | دەت |
| ٤ برگە | | | | ٣ برگە | | |

١- د - قالبێ (٧) برگەیی ب ریتما (٣+٤) یا ئێك رێزی:

-(٤+٣) یا دوو رێزی:

نە مریشکە هێکا بکەت
نە دیکلە بانگ بدەت[٤٦]

| نە | م | ریش | کە | هێ | کا ب | کەت |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نە | دی | ك | لە | بانگ | ب | دەت |
| ٤ برگەیی | | | | ٣ برگەیی | | |

-(٣+٤) یا ئێك رێزی:

تێ سوتن
نا یێ گۆتن[٤٧]

| تێ | سو | تن | نا | یێ | گۆ | تن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣ برگەیی | | | ٤ برگەیی | | | |

تێ سوتن نایێ گۆتن[٤٨]

| تێ | سو | تن | نا | یێ | گو | تن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣ برگە | | | ٤ برگە | | | |

قالبێ(٨) برگە یی: برِیتما:

١- (٤+٤) یا دوو رێزی:

چیایێن بلند بێ مژ نابن
نەوالێن کویرێ ئاڤ نابن[٤٩]

| چیا | پێن | ب | لند | بێ | مژ | نا | بن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| نە | وا | لێن | کویر | بێ | ئاڤ | نا | بن |
| ٤برگەیی | | | | ٤برگەیی | | | |

٢- (٣+٥) یا ئێك رێزی:
ماڵ تێرە
کەڤانی شێرە(٥٠)

| ماڵ | تێ | رە | کە | ڤا | نی | شێ | رە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣ برگەیی | | | ٥ برگەیی | | | | |

## ٢- سەروا د گۆتنێن مەزناندا:

سەروا د هۆزانا فولکلۆریا کوردیدا خالا هەڤپشکە د ناڤبەرا زۆربەیا پشکێن هۆزانا فولکلۆریدا، ئەڤجا هۆزان یا کێشدار بیت یان ژی یا بێ کێش بیت. سەروایێ گرنگییەکا مەزن بۆ رۆخساریێ هەر جۆرەکێ ئەدەبی هەیە ب تایبەت ئەو جۆرێن رێزێن وان دکورت و کێشدارین. دگۆتنێن مەزناندا ژی سەروا گەلەك جاران دهێتە تێبینیکرن، هندەك ژ وان ژ دوو دەنگان و هندەك ژی ب دەنگەکی پێك دهێن و کێم جاران دبنە ئێك دەنگ یا ژ سێ دەنگان پتر.

### أ- دەنگێن سەروایێ:

هەرچەندە زاراڤێن دەنگێن سەروایێ ژ بۆ هۆزانا کلاسیکی دهێتە گۆتن، لێ دشیاندایە بۆ جۆرێن فولکلۆری ژی بهێنە بکارئینان ب تایبەت هەر سێ دەنگێن (سەروا و پاش سەروا و پێش سەروا).

أ- سەروایا هەر سێ دەنگێن سەروایێ تێدا دیاردبن:
مەبەست پێ ئەو نموونەنە کو هەر سێ دەنگێن سەروایێ تێدا دیاردبن، وەکو ئەڤان نموونێن ل خواری:
- شێر شێرە، چ ژنە چ مێرە(٥١)
- ساخ دبت شۆنا خەنجەرا، ساخ نابت شۆنا خەبەرا(٥٢)

پەیڤێن سەروا دەنگێ پاش سەروا دەنگێ سەروا دەنگێ پێش سەروا

| شێرە – مێرە | ە | ر | ێ |
|---|---|---|---|
| خەنجەرا - خەبەرا | ا | ر | ە |

ب- سەروایا بتنێ دەنگێن سەروا و پاش سەروا تێدا دیاردبن:
- خوەیێ صەبرێ ،دبت مەلکێ مصرێ(٥٣)
- گولێ نەدەب سوسنێ ،مێوێ نەدەب بزنێ(٥٤)

| پەیڤێن سەروا | دەنگێ پاش سەروا | دەنگێ سەروا |
|---|---|---|
| صەبرێ- مصرێ | ێ | ر |
| سوسنێ- بزنێ | ێ | ن |

ج- سەروایا کو بتنێ دەنگێن سەروا و پێش سەروا تێدا دیاردبن:
- چو تلیا ترێ، هات یێ مزەیت کرێ(٥٥)
- هەتا تە ماڵەك ئاڤا کر، تە شارەك وێران کر(٥٦)

| پەیڤێن سەروا | دەنگێ سەروا | دەنگێ پێش سەروا |
|---|---|---|
| ترێ- مزەیت کرێ | ی | ر |
| ئاڤاکر- وێران کر | ر | ك |

٤- ئەو سەروایا کو بتنێ دەنگێ سەروا تێدا دیاردبیت:
- هژیرا ژێ دخوت ،درەوا ژێ دکەت(٥٧)
- ل بەر مرنێ رادکت ، دا ل بەر تایێ رابچت(٥٨)

| پەیڤێن سەروا | دەنگێن سەروا |
|---|---|
| دخوت –دکەت | ت |

| رادکت –رابچت | ت |
|---|---|

**ب - پەیڤێن سەروایێ:**

پەیڤێن سەروایێ ژی؛ وەکو دەنگێن سەروایێ ب سێ شێوەیان دیاردبن، ئەو نموونێن پەیڤێن سەروا و پاش و پێش سەروا تێدا دیاردبن.

**١- پەیڤێن پاش سەروا:**

د هندەك نموونانداا پەیڤا سەروا و پاش سەروا ئێکن، ئانکو پەیڤێن پاش سەروا هەمان پەیڤێن سەروانە، هەر وەکو د نموونێن ل خوارێ دا دیاردبن:
- تەخۆش گوت، من ژی خۆش گوت[٥٩]
- مێڤانی ژ مێڤانی نەخوەشە، مالخوێ مالێ ژ هەردوکا نەخوەشە[٦٠]

| پەیڤا سەروا | خۆش گوت |
|---|---|
| پەیڤا پاش سەروا | نەخوەشە |

**٢- پەیڤێن پێش سەروا:**

- ژخودان ئەسلا بپرسە ،ژ بێ ئەسلا بترسە[٦١]
- جارەکێ لێکە بارەکێ گوێزا، جارەکێ لێکە بارەکێ دیزا[٦٢]

| پەیڤا سەروا | ب پرسە – ب ترسە | ئەسلا – ئەسلا |
|---|---|---|
| پەیڤا پێش سەروا | گوێزا – دیزا | بارەکێ – بارەکێ |

**٣- ریتم:**

ریتم د زۆربەیا دیاردێن سرۆشتی دا هەیە و ب گەلەك رەنگان دیاردبیت، لێ ب شێوەیەکێ گشتی ریتم دوبارەبوونا تشتەکییە ب رەنگەکێ رێکخستی، (محمد مندور) پێناسەکا گشتی ددەتە ریتمێ، دەمێ دبێژیت: ((ریتم پێکهاتییە ژ زڤرینەڤەیا دیاردەکا دەمی، ئەڤ دیاردە ل سەر قوناغێن دەمێن یەکسان یان وەکو ئێك دهێتە ئاڤاکرن، ئەگەر تە زرمە سێ جاران لێدا و پاشی زرما چوارێ بهێزتر ژ هەرسێکێن دی و ئەڤ کارە هاتە دووبارەکرن؛ دێ ریتم ب دووبارەکرنا زرما بهێز یا پشتی سێیێن سادە پەیدابیت، دبیت ریتم بتنێ ژ ئەگەرێ راوەستیانا پشتی سێ زرما پەیدابببیت ))[٦٣] .

## ریتم د گۆتنێن مەزناندا:

د ڤێ برگەیێ دا بتنێ دێ باس ل ریتما دەرەکی کەین کو ئەو ژی پێکدهێت ژ هەمان یەکەیێن کێش و ریتمێن هۆزانا فولکلۆری پێك دئینن، ئەو ژی یەکەیێن (٣) و (٤) و (٥) برگەیی نە. ئەڤ یەکە ژی ب دو بنیاتان دیاردبن، بنیاتێ سادە و بنیاتێ لێکدای.

**أ- بنیاتێ سادە:**

مەبەست پێ ئەوە کو بتنێ ئێك یەکەیا ریتمی بهێتە دوبارەکرن، ئەڤێن ل خوارێ ژی چەند نموونەکن ل سەر یەکەیێن (٤) و (٥) برگەیی:

١- بنیاتێ(٥+٥):
ئاڤ دراوستیت/ ئەو نا راوستیت[٦٤]
ماستێ پاییزا/ بدن عەزیزا [٦٥]

٣- بنیاتێ (٤+٤+٤+٤):
جارەکادی / یاری ب ئا / گرنەکە , نە / کو بسوژی[٦٦]
سەد سال بچن/ بسالاڤە/ خارزا ددەن// بخالاڤە[٦٧]

٤- بنیاتێ (٤+٤):
سەد سەر جوونە / کولاڤەکی[٦٨]
هیڤیا دەرا / خولیا سەرا(٣)

٤-بنیاتێ (٤+٤+٤):
مار دوژمنە / چ بچیکە / چ مەزنە[٦٩]

**ب- بنیاتێ لێکدری:**

مەبەست پێ ئەو بنیاتە یێ کو پتر ژ یەکەیا ریتمی تێدا دهێتە دیتن، ئەڤێن ل خوارێ ژی چەند نموونەکن ل سەر بنیاتێ ریتمی:

١- بنیاتێ (٣+٥):
هندی پاشتر / باشترە[٧٠]
مال تیرە / کەڤانی شێرە [٧١]

٢- بنیاتێ (٣+٤):

سماقا / شویشتی یە[72]
خەتا كویر / ژگایێ پیر[73]
٣- بنیاتێ(٥+٣):
رویێ وی / ژ جەرمێ گایە[74]
هندی پاشترە / باشترە [75]
٤- (٣+٤+ ٣+٤):
ئەو بخو یێ دبێژیت / ئەو بخو یێ ڤەدگێریت[76]
٥- بنیاتێ (٦+٤)

## ١-رەوشا ژنا كورد ژ لایێ جڤاكی ڤە:

دگەل دروستبوونا جڤاكێ مرۆڤایەتیێ، ژن دهەمی پێشڤەچوون ونەسەركەفتنان دا مل ب ملێ زەلامی بوویە وهەردەم بزاڤا دابینكرنا نانێ رۆژانە بۆ باشتر كرنا ژیانێ كرییە (ئەگەر بێت و بەراوردی باری كۆمەلایەتی ئافرەتی كورد لەگەل ئافرەتی میللەتانی دیكەدا بكەین، یەكسەر بێ رارایی و دوودلی دەتوانین ئەوە بڵێین كە كورد بە چاوی رێز و خۆشەویستی و مەزنی یەوە تەماشەی ئافرەتی كردووە، ئەمەش لەبەر ئەوە بووە كە بە لێ هاتووی و بزێوی و زیرەكی یەوە گەلێك جاراندا توانیویەتی بەشداری پێشخستن و دامەزراندنی كۆمەلی كوردەواری بكا[77]. ئەڤە ژی وێ چەندێ بۆ مە دیاردكەت كو ئافرەتا كورد ژی وەكی هەمی ئافرەتێن مللەتێن دی تر خودان شیان وهێز بوویە ورێزەكا تایبەت هەبوویە دناڤ جڤاكێ خۆدا. هەردیسان د هەڤدیتنەكێ دا دگەل مامۆستا (بلند محمد) ی دا بۆ مە ل دوور رەوشا ژنا كورد گۆت (دمێژوویێ هاتییە دیاركرن كو د قۆناغا دایكسالاریێ دا ژن سەروەر بوویە، زارۆ ب ناڤێ وێ هاتییە توماركرن، كو حەتا نوكە ژی هندەك بنەمال و كەس دناڤ جڤاكێ كوردیدا ب ناڤێن ژنان دهێنە ناسكرن، بۆ نموونە (عەلیێ رحانێ) یان (محەمەدێ فاتێ) ئەڤ نموونەیێن ب ڤی رەنگی ژی وێ چەندێ دیاردكەن كو ژنێ دناڤ جڤاكێ كوردی دا جهەكێ بلند و دیارهەبوویە هەتاكو زەلامێ بنەمالێ ب وێ بهێتە نیاسین)[78]. هەردیسان ئافرەتێ دگەل كێشێن كۆمەلێ و ئاریشێن جڤاكی ژی دا ململانێ كرییە ((گەورەترین كوسپ و بەربەستی بەردەم ئافرەت ومەحرووم كردنی لە سەربەستی و سەندنی مافەكاندا بە پلەی یەكەم تەنها داب و دەستوور و تراديسیۆنە كۆمەلایەتیەكانە))[79]. ژ ڤێ چەندێ بۆ مە دیاردبیت كو گەلەك جاران ژبەر چەندین كوسپ و گیروگرفت و ئاریشەیێن كەتینە درێكا ئافرەتێ دا ژبۆ ئەنجامدانا هەر تشتەكێ كو ئافرەتێ ڤیایە بكەت لێ جڤاكێ كو ئەو تێدا دژیت رێك نەدایێ یا ژ گەلەك تشتان هاتییە مەحروومكرن. هەر دەربارەی بەحسكرنا ژنا كورد و جیاوازیا وێ دگەل ژنێن وەلاتێن دیتردا (كلۆدیوس ریچ - Rich) دبێژیت (باری ئافرەتی كورد لەكوردستاندا لە ئافرەتانی تركیا و ئیران چاكترە، ژن و مێر وەك یەكن و جیاوازیان نی یە)[80].

ئاشكرایە كو رابردوو و دیرۆكا نەتەوێ كورد سەدان داستانێن نەبەرد و قارەمانی تێدا هاتینە توماركرن كو هەتا وەكو ئەڤرۆژی هەر ب نەمری ماینە (ئافرەتیش شان بە شانی پیاو تیایدا رۆلی بەرچاوی خۆی لە قۆناغە جیا جیاكانی ئەم داستان و مێژووە شكۆدارە دا بینیوە و بونیادنەری ئەم رابردووە بۆوە كە تاكو ئەم رۆژ نەتەوەكەمان شانازی بەو شێرە ئافرەتانەی وێنەی خانزادی میری سۆران و حەپسەخانی نەقیب و قەدەم خێر و لەمێژووی ئەمرۆژمان لەنموونەی لەیلا قاسم و دایكە ئامینە ودەیان و دەیانی تردەكات)[81].

ژ ڤێ چەندێ ژی خویادبیت كۆمەلگەها كوردەواری ژی كۆمەلەكا بنەما و تایبەتمەدیێن خۆ هەنە كو دگەل كۆمەلگەهێن دی تردا جودا دبن. هەردیسان مامۆستا بلند محەمەد دیاردكەت و دبێژیت (دڤەكۆلینەكێ دا ل دوور قۆناغێن ژن تێدا دەرباز بووی، شەیمان پالانی دیاردكەت كو د سەرهندێ را، ژن سەروەر بوویە، بەلێ پشتی مرۆڤی چاندن ڤەدیتی و شیای گیانەوەران ب خودانكەت پێدڤی هێزێ و رێكخستنا خێزانی بوویە، لەوا ژی ژن هێلایە ل نك خوە و زارۆكێن وێ ب خودانكرینە، ب ڤی چەندێ ژی زەلامی ژن ژبۆ كاروبارێن مالێ هێلایە

دناڤ چوار دیواران دا و ژکارێ ژدەرڤە دویر کرییە و خوە ژی وەکو دەستەلاتدار ل سەر ژنێ سەپاندییە[٨٢]. لێ هەکە ب شێوەکێ گشتی بەحسێ ژنێ دناڤ جڤاکا کوردی دا بکەین دێ دیاربیت کو ئەو ژی مرۆڤەکا کەدکاربوویە وجوت کرییە و ل ناڤ زەڤی وبیستانان بوویە ومژوویلی خودانکرنا تەرش و تەوالی بوویە، کو ئەڤە ل قوناغێن دەسپێکێ یێن ژیانا کوردان کو ل سەر ڤان کاروبارێن ژێگوتی ژیان دکرن. هەر دناڤ بەحسکرنا ئافرەتا کورد ژ لایێ جڤاکی وکۆمەلایەتیڤە (ئافرەتی کورد بە حوکمی باری جوگرافی ناوچەکە و دابونەریتی خۆی هەمیشە شان بە شانی پیاوان لە بوارەکانی کار و گوزەران و ژیان بەرێوەبردندا بەشداربوونە و لەهەمان کاتیشدا رۆلی جوامێرانە و بەرچاویان لە ئیدارەی کاروباری سیاسی دا نوواندووە، ئافرەتی کورد لە شۆرشی ئەیلولدا پشت و پەنای پێشمەرگە بوو بەلکو هەر خۆشی شەرەفی پێشمەرگایەتی پێ بەخشراوە تائەو کاتەی (بارزانی نەمر ) فەرمووی: ئەو ئافرەتەی نان بۆ پێشمەرگەش دەکات هەر پێشمەرگەیە)[٨٣].

## ٢- رەوشا ژنا کورد ژ لایێ سیاسی ڤە:

هەر چەندە دهەمی بیاڤێن ژیانێ دا ژنێ رۆلەکێ گرنگ و دیار هەیە وشیایە ل دەلیڤێن کاری بکەریت ول زانکو و پەیمانگەهان ببیتە مامۆستا و ل نەخۆشخانەیان ببیتە نۆشدار و د بیاڤێ پەروەردێ و ل فەرمانگەهێن خزمەتگوزاری دا جهەکێ دیار هەبیت، بەلێ د بیاڤێ کارێ سیاسی دا ب ڤی رێژەیێ دەلیڤا کاری نەدیتییە. ئەگەر ئەم بەحسێ مافێ سیاسیێ ژنێ بکەین ل سەر ئاستێ نیڤ دەولەتی ((هەندێك لە سەر چاوەکان مێژووی پێشنیارکردنی مەسەلەی بەشداری ژنان لە سیاسەتدا دەگەرێنێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، هەندێکی تریش بۆ سەدەی بیستەم لە دوای کوتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم))[٨٤]. هەردیسان مامۆستا بلند محەمەد دەربارەی ژنێ دکارێن سیاسی دا دبێژیت ((هەر چەندە دبرۆکێ دا ناڤێن چەند خانمان هاتییە کو رۆلەکێ دیار هەبووینە ژوانژی، (حەپسە خانا نەقیب ١٨٩١-١٩٥٢)، کو کوردستان بۆ دەمێت درێژ ل بن کونترۆلا دەستەلاتدارێن داگیرکەر مایە و خواندن ونڤیسین دەدەمەك زوودا نەهاتینە ڤەکرن وهەروەسا سیستەمێ عەشیرەتگەری و ئایینی ژی کارتێکرنێن خو هەبووینە کو کەسێ کورد ب تایبەت ژن نەزان بمینیت، هەر چەندە ل دەسپێکا سالێن بیستێ کۆمەلە و رێکخراوێن سیاسی دناڤ جڤاکا کوردی دا پەیدا بووینە، بەلێ چوونا ژنان بۆ ناڤ کارێ سیاسی، ب پێنگاڤەکا شەرمین و لاواز بوویە و چ جهێن دیار و بلند ببەرفرەهی دناڤ وان رێکخراوێن سیاسی وکۆمەلەیان دا نەدیتیە))[٨٥]. هەر دسان ئەم دشێن بێژین کو بەشداریکرن دناڤ سیاسەتێ دا ئێکە ژ شێوازێن گرنگێن دەربرینێ د دیموکراسی و بەرجەستەبوونا بەشداریا هاولاتی ((بەشداری لە سیاسەتدا دەربرینی ئەو هەستکردنەیە کە لای تاکێك یان کۆمەلە هاولاتییەکەوە (ژن و پیاو) دروست دەبێت، بۆ دەربرین لە ئیرادەو خواست و ویست و بەرژەوەندییەکانی کۆمەلگە))[٨٦].

**١-(سەرڤە سیسا بنڤە پیسە)[٨٧]،**

د ڤێ گۆتنێ ئاماژەیە بۆ وێ یەکێ کو ئەو تشتە یێ ژ لایێ دەرڤە و رۆخسارێ پاك و خاوێن وە جوانە و بێ کام و کاسییە، لێ ئەگەر سەحکەینە ناڤەرۆکا وێ دێ بینین تژی نەپاکی و نەجوانی ونەتازەییە. ئەڤە ژی چێدبیت هاتبیتە گۆتن بۆ مرۆڤ و کەل وپەلا. کو سەبارەت ب مرۆڤان ئەوە، ئەم دژیانا خودا هندەك کەسانا دبینین دروخسارا خودا توڤەکێ بێ کام و کاسییە و چ عەیب ل دەف نینە، لێ د رەفتار و ناخێ خودا مرۆڤەکێ خرابە و باشی ورەحەتیا خەلکی نەڤێت.

**٢-(دایێ رست کچێ بادا)[٨٨]،**

ئەڤ گۆتنە د ناخێ خودا بۆ رویدانەکێ یا هاتییە گۆتن کو ب دروستی یاچێبووی. و پشتی دەمەکێ یاکەفتییە سەر دەڤێ خەلکی و هێدی هێدی یا

هاتییە ڤەگوهاستن هەتا خەلکی دناڤ ژیانا خودا بکارئینای. و سەبارەت ئەڤێ گۆتنێ کو بۆ چ دهێتە گۆتن. ل دووڤ دیتنا من ئەڤ گۆتنە ژبۆ هندێ هاتییە گۆتن دەمێ دایك تشتەکی بێژیت و کچا وێ تمام کەت ئانکو پشتا وێ بگریت و هێشتا ئاخفتنێ ل سەر یا وێ زێدەکەت، یان ب رامانەکا دی تر دناڤ کار و بارێن خەلکی دا بۆ کو تشتەکێ نەراست ودوروست بکەنە راستی و حەقیقی و خەلك باوەریێ پێ بینیت دێ رابن هندەك ئاخفتن و کریارێن زێدە ل دووڤ تشتەکی ڤەکەن ودێ یێت گەلدا پەسەندا ئاخفتنا وی کەن ئەڤەژی دبیتە ئەگەر کو یێت دەوروو‌بەران باوەریێ پێ بکەن.

**٣-(پیرەژنا قورمچی، پاتێ سۆرێ ل سەر چچی، ژ خالا خەلکی ڤە کچی)**[٨٩]:

ئەڤ گۆتنە ئەم دشێین بۆ سەردەمێ بەری نوکە و داهاتی بکاربینین، چونکی یاگریدایە ب ژیانا مەڤە ل هەر دەم وجهەکی، ئاماژا ڤێ گۆتنێ چێدبیت بو وێ یەکێ هاتیتە بکارئینان کو هندی مرۆڤ خو دیار بکەت کو ژیانا مرۆڤی دچیت و تەمەنێ مرۆڤی ناچیت و چ کارتێکرنێ ل بەژن و بالا مرۆڤی و سەرو بەرێ مرۆڤی ناکەت لێ ئەڤ چەندە نەیا دروستە، چونکی هەر سەردەمەك و قۆناغەکا مرۆڤ تێدا دەرباز دبیت سیما و سالۆخەت و تایبەتمەندیێن خۆ یێت هەین دهێنە جوداکرن پێدڤییە ل هەر قۆناغەکێ رەفتار و کریارێن مرۆڤی دگەل وێ قۆناغێ بگونجیت. یان چێدبیت ئەڤ گۆتنە بۆ وان کەسا بهێتە گۆتن کو وەسا نیشا خەلکی بدەن کو یێت دروستن درەفتارێن خۆ دا، لێ دهەمان دەمدا دگەل ئێکێ دیتر هندەك رەفتارێن دی تر پیشان ددەن .

**٤- (دهمەن پیسە)**[٩٠].

باب وباپیرێن مە دزۆربەیا بواراندا گۆتن بکارئینانە و نەخاسمە بوارێ کۆمەلایەتی وئەڤ گۆتنە ژی بۆ وان کچ و ژنان دهێتە بکارئینان یێن بێ ئەدەب و بێ تورە، سنج.

**٥-(کچا بابێ خوەیە)**[٩١].

دەمێ کچەك یا خودان ئەسل بیت و خودان رەفتارێن جوان بیت کەسێن دەوروبەر دبێژنێ (کچا بابێ خوەیە) ئانکو باش هاتییە پەروەردەکرن وخودان رەوشت و رێزە.

**٦-(گەردەن قازە)**[٩٢].

زۆر جاران ژبۆ جوانی و ستایش کرنا کچ و ژنێن کورد مەزنان گۆتنێن خۆش بۆ بکارئینانە و ئەڤ گۆتنە ژی ب وێ رامانێ هاتییە گۆتن کو دەمێ کچەك یا گەردەن درێژ بیت و گەردەنا وێ یا جوان بیت دبێژنێ گەردەن قازە.

**٧-(ژنەك و عەشیرەتەك)**[٩٣].

ئەو رامانا بو ڤێ گۆتنێ دهێتە دیارکرن ئەوە کو هەکە تو ژنەکا باش ژ عەشیرەتەکێ بینی دێ ئەو ژن زارڤەکرنا وێ عەشیرەتێ کەت و دێ ب ناڤێ وێ عەشیرەتێ هەمیێ هێتە نیاسین، ئان ژی ب رامانەکا دیتر هەکە ژنەك یا هار بیت و یا دەست نەخۆش بیت و کا ئەو چ بێژیت دڤێت وەکی وێ بهێتە کرن و هندی هەمی بێنێ کەس نەشێتە پێ دبژنێ ژنەك و عەشیرەتەك.

**٨-(ژنێ بینە ژ ئەسلیان، تێ ببینە عەجێبیان)**[٩٤].

هەکە ئێکی ڤیا ژنەکێ بخو بخوازیت دێ بێژیت مەزنا یا گوتی ژنێ بینە ژ ئەسلیان دا ببینی عەجێبیان مەرەما ڤێ گۆتنێ ئەوە کو هەکە ژن یا خودان ئەسل بیت دێ ژنێن دی بخۆ عەجێبیا ژێ بینن.

**٩- (ژنا نە باش، مێرێ باش خراب دکە)**.

ئەڤ گۆتنە ل سەر باشی و خرابیا ژنێ هاتییە گۆتن، کو هەکە ژن یا ئەسلی بیت ئەو دێ سەرێ زەلامێ وێ یێ پێ بلند بیت، لێ ئەگەر ژن یانە باش بیت ئەو دێ زەلامێ خوژی وەکی خو لێکەت و بەرەف نەباشیان بەت، ئەڤ گۆتنە ژی مەزنان گوتییە داکو زەلام دهەلبژارتنا هەڤژینیێ دا باش هزرا خوبکەت.

٢٠- (ژنا جوان گویزە)

ژنا جوانە ب گوهار و پوشی
یان خانومانە پر ژپەروشی
داخ و مخابن ئاریشە دارە
پێ شاهی نابن چ دوست و یارە

ئەڤ هۆزانە هاتیبە ڤەهاندن ب جوانیا ژنێ كو مەبەست ژێ ئەوە هندی ژن یا جوان بیت لێ ئەگەر سرۆشتێ وێ نەیێ جوان بیت جوانیا وێ و بتنێ یامفادار نینە، و ئەڤ گۆتنە وەسا دیار دكەت كو ژن وەكی گویزێیە كاچاوا دێ گویزێ شكێنی تۆ نزانی كا یا درستە یان یا كرمییە، ژن ژی هەروەسا دێ ئینی و تۆ نزانی كادێ باش دەركەڤیت یان نە باش، مەزنان ژی گویز یاكرییە نموونە وەكی ژنێ.

## - قۆناغێن زارۆكینیێ:

- قۆناغا ژ دایك بوونی:

قۆناغا ژی یێ (١- ٣) سالێ (ساڤابوون)
قۆناغا ژی یێ (٤- ٦) سالێ (زاروكینێ)
قۆناغا ژی یێ (٧-١٢) سالێ (هەستكرن)
قۆناغا ژی یێ (١٣-١٨) سالێ (سنێلەیی)

## - قۆناغا (٤- ٦) سالیێ:

مللەتێ كورد پیتەكێ مەزن دایە پەروەردەكرنا زارۆكی ژ هەمی لایانڤە ئەگەر ئەم بهێێن بچینە دناڤ باخچێ فولكلۆرێ كوردی دا دێ بینین ئەڤ پیتەیە دناڤ چێروك و یاریێن زارۆكان دا دیار دبیت، لێ ئەڤ چەندە د ناڤ گۆتنێن مەزنان دا ب رەنگەكێ ئاشكەراتر و رونتر دیاردبیت. وان ب چاڤەكێ تایبەت بەرێ خۆدایە پەروەردەكرنا زارۆكان گەلەك گۆتن هەنە دبنە بەلگە بۆ ڤێ چەندێ كو هەر ژ ژیێ (٤-٦) سالیێ دێ بینین گۆتنێن هاتینە دانان دا زارۆكی دویر بێخین ژ هندەك دیاردێن نەباش بۆ نموونە (درەو ، دزی ، ئەزمان درێژی، ...... هتد).

ئەڤ قۆناغە قۆناغا ئێكێ یا پەروەردەكرنا زارۆكییە، لەورا هندەك تێبینیێن گشتی بۆ زارۆكی دهێنە دان ب رەنگەكی كۆ زارۆك ب باشی د وان تێبینیان بگەهێت، واتە پێدڤییە ئەڤ گۆتنە د ئاستێ تێگەهشتنا زارۆكێ (٤-٦) سالێدا بیت، دڤێ قۆناغێ دا زارۆكی هندەك شیانێن بەراوردكرنێ د ناڤبەرا، دیاردەیێن سادەیێن سرۆشتی دژیانا خۆدا هەیە، لەورا ژ گۆتنێن مەزنان یێن گرێدای ب ڤێ قۆناغێ ڤە، ژ سنوورێ ڤی ئاستی دەرباز بكەین داكو زارۆك ب باشی د پەیامێ بگەهیت و هاریكاریا ئاڤاكرنا كەسایەتییا وی بكەت.

د ڤێ قۆناغێدا زارۆك گەلەك جارا سنوورێ دەسنیشانكری بۆ ئاخفتنێ ل گەل بەرامبەری خۆ نزانیت و چێدبیت ڤی سنووری ب بەزینیت ، لەورا گۆتنەك دهێتە ئاڤاكرن ئەوژی:-

**١- (ئەزمانێ درێژ، داركۆكێ سەرێ خودانی یە)**[٩٥]

ئەڤ گۆتنە ئێكەم جار ناشرینیا كارێ (ئەزمان درێژی) دگەهینیتە زارۆكی و د قۆناغا دووێ دا ئەنجامێ خرابێ وێ دەسنیشان بكەت وەك دیار بۆ گەهاندنا ڤێ پەیامێ مفا ژ (داركۆكێ) هاتیبە وەرگرتن كو وەك باڵندەكا كوردستانێ دهێتە هژمارتن و ئەنجامێ كارێ وێ و دوبارە بۆ ناوی كاری رەنگڤەدانەكا نەگەتیڤ و ئەنجامێن نەخۆش ل سەر ئایندا هەلویستێ زارۆكی هەیە. د ڤێ بەراوردكرنێ دا زارۆك بباشی كارێ (داركۆكێ) دزانیت و ب بەراوردكرن ل گەل (ئەزمان درێژی) یێ ئەنجامێ نەگەتیڤێ ڤی كاری تێدگەهیت.

**٢- (ئاگر بەریۆ مالا درەوینی، كەسێ ژێ باوەرنەكر)**[٩٦]

دڤێ گۆتنێ دا ئێكەم جار مفا ژ سەرهاتییەكێ هاتیبە وەرگرتن، مفا وەرگرتن ژ سەرهاتییان بۆ ئاڤاكرنا گۆتنێن مەزنان ئێك ژ باشترین رێكێن پەروەردەیێ یە كو ب هاریكاریا وی كەسێ بێژەر هەول ددەت وێنەیەكێ هونەرێ دروست دیڤالبێ رویدانەكا بەر ئاقل دا وێنە بكەت داكو ب ڤی چەندێ نێزیكی ئاستێ تێگەهشتنا گوهداری بیت هەر وەكو دیار دڤێ گۆتنێ دا بێژەری دڤێت خرابیا (درەوا) و ئەنجامێ ڤی كارێ ناشرین بۆ زارۆكی دیار كەت بێژەر ب مفا وەرگرتن ژ چێرۆكەكێ هەول ددەت كو ئاستێ گۆتنێ بینیتە ئاستێ تێگەهشتنا زارۆكی، لەورا مفا ژ ڤی جۆرێ سادەیێ سەرهاتیێ وەردگریت داكو

ئێکەم جار زارۆکی ب خۆ ڤە گرێدەت و ب گۆتنا چیرۆکێ جۆرەکێ خۆشی و مژیلاهیێ بۆ زارۆکی چێدکەت و ل بن سیبەرا ڤێ چیرۆکێ پەیاما خۆ ب گەهینیتە زارۆکی. زارۆك د بەراوردکرنا ئەنجامێ ڤێ چیرۆکێ و ئەو رویدانا ب سەرێ پالەوانی هاتی ل گەل ئەنجامێ (درەو)ێ دزانیت کۆ ئەنجامێن نەگەتیڤێن ئەڤی رەوشتێ خراب چیە و پێکولێ دکەت ڤی رەوشتی (درەوکرن) ل دەڤ خۆ نەهێلیت داکو تووشی وی ئەنجامی نەبیت ئەوێ ب سەرێ پالەوانێ چیرۆکێ هاتی، ئەڤە دێ بیتە هۆکارەك بۆ پەروەردەکرنا زارۆکی و دویرئێخستنا وی ژ کریارەکا خراب.

**٣-(ئاقل تانجێ زێرینە، بەلێ د سەرێ هەمی کەسی دا نینە)**[٩٧]

زارۆك ب چیرۆکان پەروەردەدبیت و دبەر چیرۆکان دا دخەو دچیت گەلەك ژ ڤان چیرۆکان بەحسێ ژیانا میر و پاشایانە کو چ کێماسی ل دەڤ وان نینن و هەروەسا خودان تانجەکا زێرینن کو ئەڤ تانجە گەلەك دەستهەلاتێ ددەتە وان ژ وان دەستهەلاتا خۆشتڤی بوونا وان ل دەڤ خەلکی و رێز و تەقدیرا خەلکی بو وان ژ سیفاتێن ڤان میر و پاشایان، (هەبوونا دەستهەلاتەکا زێدە، زەنگینی، هێرو شیانێن زێدە، جوانی، ناڤەندبوونا وان دناڤ کۆمەلگەهێ دا)، ئەڤ تایبەتمەندیە ب رەنگەکی کو هەر زارۆکەکی دڤێت وەکی وان میرو پاشایان بیت و نیشانا میر و پاشایان ژی (تانجا زێرینا) وانە کو گەلەك جارا زارۆك د خەیال یان خەونا خۆدا هەلگرێ وێ تانجێ یە.

باب و باپیرێن مە بۆ ئاڤاکرنا گۆتنەکێ کو ئامۆژگاییەك تێدابیت مفا ژ ڤان پێزانینان وەرگرتییە و کرییە هێڤێن بۆ گەهاندن پەیاما خۆ و ( ئاقل هەر چەندە تشتەکێ نەبێ ماددی یە، لێ ژ بەر بەردەوامییا بکارئینانا وێ وەك هێمایەك بۆ ئەنجامدانا کارێن باش و دویر کەڤتن ژ کارێن خراب دهێتە بکارئینان) وەك تانجا زێرینا وی میرو پاشای بکارئینایە ب رەنگەکی کۆ هەر زارۆکەکێ ژ سنوورێ باشیا نەدەرکەڤیت و بەرەڤ خەلەتییان نەچیت ب هەلگرێ وێ تانجێ ددانن.

## - قۆناغا دووێ ( ٧-١٢) سالیێ:

د ڤێ قۆناغێ دا زارۆك ب وەرگرتنا پێزانینان ئاستێ وی یێ تێگەهشتنێ بلند دبیت ب رەنگەکی کو دێ شێت هوکار و ئەنجامێن گەلەك دیاردان پێکڤەگرێدەت زێدەباری بەراوردکرنا دیاردێن ژ قۆناغێن ماددی دەرباز دبن و بەرەڤ لایەنەکێ مەعنەویێ سادە دچن، چونکە هەر چەوا بیت ئەو هەر زارۆکە و نەگەهشتیە ئاستەکێ بلندێ تێگەهشتنێ، واتە ئەڤ قۆناغە ب قۆناغا دەستپێکی یا تێگەهشتنا لایەنێن مەعنەوی دهێتە هژمارتن.

ئەو گۆتنێن مەزنان ئەوێن بۆ ڤێ قۆناغێ هاتینە تەرخانکرن زێدەترن ژ قۆناغا بەرێ، چونکی زارۆك یێ ئامادەترە بۆ وەرگرتنا پێزانینان، واتە ژ قۆناغا دەستپێکی یا زارۆکینیێ دەرباز بوویە ژ وان گۆتنان:-

١-(تۆ چ دچینی، دێ وی هەلینی)[٩٨]

کۆمەلگەها کوردی ب رەنگەکێ گشتی کۆمەلگەهەکە کو دکەڤندا ل سەر حسێبا چاندن و پەروەردەکرنا مەڕ و مالاتی هاتییە ئاڤاکرن، واتە د سەردەمێ کەڤن دا کێم کەس هەبوون پێزانین ل سەر چاندن یان خودانکرنا مەرو مالاتی نەبیت، لەوڕا دێ بینین باب و باپیرێن مە بۆ ئاڤاکرنا گۆتنێن مەزنان مفا ژ ڤێ چەندێ وەرگرتییە.

د ڤێ گۆتنێ دا هۆکار و ئەنجام هاتینە دیارکرن ئەوژێ چاندن و چنین، ب بێژەر ل دووڤ ئاستێ قۆناغا دووێ ڤێ گۆتنێ ئاڤا دکەت و مفا ژ بلندبوونا ئاستێ زانستی و تێگەهشتنێ و مەنتقی ل دەڤ زارۆکی وەردگریت و بەراوردەکێ د ناڤبەرا دیاردەکا سرۆشتی ژ (هوکار و ئەنجام) و رەوشتێ مرۆڤی دکەت و پێدڤییە زارۆك ب پێکڤە گرێدانا دیاردێن سرۆشتی ب بابەتێ رەوشتی بشێت رامان و پەیاما بێژەری تێبگەهیت داکۆ بشێت ئاستێ خۆیێ کەسایەتی بلند بکەت.

٢- ((گۆتنێن مەزنان، نەخشە ل بەرینە))[٩٩]

هەر چەندە ئەڤ گۆتنە وەك گۆتنەکا سادە دهێتە بەرچاڤ و چێدبیت ل دەستپێکێ مرۆڤ هزر بکەت کو یاگرێدایە ب قۆناغا دەستپێکی (٤- ٦) سالیێ، لێ دراستی دا ئاستێ ڤێ گۆتنێ یێ بلندەترە

ژ ئاستێ قۆناغا ئێکێ، چونکە بنەمایێ ڤێ گۆتنێ ل سەر هندەك پێزانینێن زانستی ئاڤاکرییە کو ژ ئاستێ زارۆکێن قۆناغا ئێکێ دەرباز بیت ئەو پێزانین ژی گرێداینە ب (بەری) و نەخشاندنا ل سەر کو پێدڤییە زارۆکی پێزانین ل سەر بەری و نەخشێن ل سەر و شیانا مانا وان بۆ ماوەیەکێ زێدە هەبیت ب ڕەنگەکی کۆ دیاردێن سرۆشتی چ کارتێکرنەکا وەسا ل سەر ناکەت، لەورا ئەڤ گۆتنە بۆ قۆناغا دووێ دهێتە ڤەگوهاستن و هۆکار و ئەنجامێن نەخشاندنا ل سەر (بەری) دیار دبیت باب و باپیرێن مە مفا ژ هەبوونا ڤێ دیار دێ دناڤ کوردستانێ دا وەرگرتییە و کرییە ناڤەرۆکەك بۆ گۆتنەکێ کو خزمەتا ئاڤاکرنا کەسایەتیا زارۆکێ کورد بکەت .

٣. (چیا ب چیا نا کەڤن، بەلێ چاڤ ب چاڤا دکەڤن)[١٠٠]

هندەك جاران باب و باپیرێن مە بۆ گەهاندنا پەیامەکێ و دەسنیشانکرنا سیفاتەکێ مرۆڤی کو چێدبیت وەك سیفەتەکێ لاواز ژی هژمارتن مفا ژ دیاردێن سرۆشتی وەرگرتییە ئەو دیاردە ژی دیار دێن سرۆشتی یێن کوردستانێ نە، ل ڤێرە ئەوان خالا پێدڤی بوونا مرۆڤی ب ئێك و دو خۆ بێ منەت نەکرن ژ ئێکتر وەك سیفەتەکێ سرۆشتی یێ مرۆڤی دایە نیاسین و ل بەرامبەر بەراوردەك د ناڤبەرا سیفاتێن چینایی وەکی رستەکێ نەلڤ کو پێدڤی ب چ تشت و چ کەسا نینە لگەل سیفاتێن مرۆڤی کرییە و ئەو سیفەتێ گەلەك جاران خەلك بلاوازی دهژمێریت وەك سیفەتەکێ سرۆشتی هژمارتییە داکو مرۆڤ ب بەرچاڤ وەرگرتنا وی سرۆشتی و پەروەردەکرنا وێ کەسایەتیا خۆ ب هێز بێخیت.

مە گەلەك نموونە یێن ب ڤی ڕەنگی یێت هەین ژ وان گۆتنێن مەزنان کۆ هاتینە گۆتن بۆ پەروەردەکرنا کەسیەتیا زارۆکێ کورد ژ وانا:-

- یێ خۆ ل دووڤ بەرکا خۆ پاڤێژە.
- ئەوێ دخوازیت رویەك رەشە، ئەوێ نەدەت هەردوو روی درەشن.
- تبلێن دەستا نەوەکی ئێکن.
- هەتا نیڤا دەستی رەش نەبیت، تاما دەڤی خۆش نابیت.
- ئاخفتنێت دەروینا، دیوارێ سەر بفرێ یە.
- ئاقل نە ب بچیکی و مەزنی یە.
- ئەوێ بۆ هەڤالێ خۆ قەبری بکولیت، ئەو بخۆ دێ کەڤیت تێدا.
- ئەو دیوانا تو نەخواستی، نەچێ.
- بەکرۆك ل هەمی جها هەنە.
- بزنا لەنگ شیڤا گورگی یە.
- باوەریا خو ب ئاڤا بۆش نەئینە.
- هەر بەرەك ل جهێ خۆ یێ ب قەدرە.
- ترانە بێهنەکێ دخۆشن.
- تبلا خۆ نەکە ئاگری، دانە سوژیت.
- چ ژنهەلی بێ ژووردانی نینن.
- چ دەرد دبێ دەرمان نینن.
- چ شۆلا بێ مرۆڤێت مەزن نەکەی.
- خودێ چیا دبینیت لەوا بەفرێ لێ دبارینیت.
- خودێ حەقێ کەسێ بەرزە ناکەت.
- خوارنا ئەڤرو بهێلە بۆ سوباهی، بەلێ شولێ ئەڤرو نەهێلە بۆ سوباهی.
- خوێندەواری روون دکەت شەڤا تاری.
- کرە گوهارك و کرە گوهێ خۆ .
- تۆبا دارکۆکێ یە.
- بۆ ڤی گوهی بێژە، ژێ دی دەرکەڤیت.
- چ خۆ ددەڤێ دا ناگریت.
- دێ بێژی کون دگوها نینن.
- ژ مێشێ کرە گامێش.
- یێ گەلەك باخڤیت، دێ خەلەت بیت.

## - قۆناغا (١٣-١٦) سالیێ:

د ڤێ قۆناغێ دا ئاستێ تێگەهشتنێ ل دەڤ زارۆکی هند بلند دبیت کو ئێدی هەول ددەت کەسایەتییەکا سەربەخۆ بۆ خۆ ئاڤا بکەت، و بیتە خودان بریار رۆلێ خۆ دناڤ خێزانێ دا هەبیت، دناڤ هەڤالان دا کەسایەتیا خۆ هەبیت و دناڤ جڤاکی دا ب کەسەکێ زیرەك و ئاقل و خودان

کەسایەتییەکا جوان و تێگەهشتی بهێنە هژمارتن، لەورا دێ بینین ئەو جحێل هەول ددەت کەسایەتییا خۆ ب سەلمینیت د گەلەك هەلویستان دا کارێن مەترسی دار دکەت داکو دۆرماندوری وی دان پێدانێ پێ بکەن.

د ڤێ قۆناغێدا زارۆك بەرەڤ قۆناغا هەرزەکاریێ دچیت، لەورا ب قۆناغەکا نازك و هەستیار دهێتە هژمارتن، ئەڤ قۆناغە بۆ پەروەردەکرنا زارۆکی و وەك قۆناغا دووماهیێ بۆ وەرگرتنا ئاموژگاریێن راستەوخۆ دهێتە هژمارتن، زارۆك گەلەك ژ بابەتێن مەعنەوی ب باشی تێدگەهیت، ئاگەهـ ژ گەلەك رەوشت و تیتالێن دناڤ کۆمەلگەهێ دا، چ ئایینی چ شارستانی هەیە و دێ شێت وان رەوشت و تیتالان کو پتر د قالبێ مەعنەوی دانە شلۆڤە بکەت، لەورا گۆتنێن ڤێ قۆناغێ ژی ئالوزتردبیت و ل دووڤ پێشکەفتنا هزری یا زارۆکی ئەڤ گۆتنە ژی پێش دکەڤن ب رەنگەکی کو زارۆك د هەردو قۆناغێن بەرێ دا نەشێت ڤان گۆتنان ب باشی و دروستی شلۆڤە بکەت.

بۆ نموونە:

١. ((نەبە خۆێ یا هەمی گرارا))[١٠٢]

هەر وەکی مە ئاماژە پێ دای د ڤێ قۆناغێ دا زارۆك هەول ددەت کەسایەتیەکێ بۆ خۆ بینیت هەتا کەسایەتییا خۆ دناڤ جڤاکی دا ب سەلمینیت، لەورا هەر کارەکێ کو ژ ئاستێ وی ژی بلند تر بیت مایێ خۆ تێد کەت پێخەمەت سەلماندنا رۆلێ خۆ و کەسایەتییا خۆ و ل ڤیرە باب و باپیرێن مە شیاینە سنوورەکی بۆ نیشاندانا شیانێن زارۆکان دیار بکەت ب رەنگەکی کو وان تێبگەهینن کو ئەویێ د قۆناغەکێ دا کو هێشتا رۆلێ وان ب وی رەنگێ ئەو هزر دکەن نەیێ بەرچاڤە کو ئەڤ داخوازا سنووردارکرنێ ژی ب بەراوردکرنەکێ ل گەل ژیانا کوردەواری دهێتە کرن.

هەر وەسا بۆ ڤێ قۆناغێ ژی گەلەك نموونەیێن ب ڤی رەنگی یێن هەین ژ وان گۆتنێن مەزنان کو هاتینە گۆتن بۆ پەروەردەکرنا کەسایەتییا زارۆکێ کورد ژ وانا:-

- بەحر ب دەڤێ سەی پیس نابیت.
- برا برایە، بازارێ جودایە.
- بویە خۆێ یا هەمی گرارا.
- ب ئاخفتنا خۆش مار ژ کونێ ئینا دەرێ.
- بلا خودێ یاربیت، بلا دونیا هەمی نەیار بیت.
- هەچیێ دەرگەهێ ئێکێ بقوتیت، دەرگەهێ وی ژی دێ هێتە قوتان.
- ئاگر ژ دەهمەنا مرۆڤی بەردبیت مرۆڤی.
- ئاخفتنا خۆش و نەخۆش ژ دەڤەکی دەردکەڤن.
- ئاسن ب گەرمی دهێـە چەماندن.
- ئاخفتنێ سێ جارینە بەرگۆتنێ پاشی بێژە.
- ئاڤ ل سەر حەقی یێ، رادوەستیت.
- ئاسنێ بێ ئەساس، نە دبیتە شیر، نە دبیتە داس.
- ئەمانەت هەلامەت.
- ئینسان تۆڤێ مرنێ یە.
- بلا شێر تە بخۆت، بەلێ رویڤی حیلێ ل تە نەکەت.
- بریندار ئێشا برینا خۆ دزانیت.
- بلا دوژمنێ مرۆڤی ب ئاقل بیت، بلا دوستێ مرۆڤی نە دین بیت.
- بەرا نەهاڤێژە سەی دا نە رەویت.
- بینە زەحمەتێ، بخۆ نەعمەتێ.
- بۆ وی کەسی بمرە، یێ خەمێت تە هەلدگریت.
- ب لەزێ چ جار ناگەهی مرادێ.
- بەر ژ ئەسلێ خۆ گرانە.
- بەریکا خۆ ب پارێت خەلکێ گەرم نەکە.
- پارە قرێژا دەستانە، هەکە شوشتن چ نامینیت.
- پەشیمان ل نیڤا رێ ژی بزڤریت هەر باشە.
- پیچەکێ بخۆینە، گەلەکێ بزانە.
- پشتی مرنێ توبە نینە.
- تشتێ تونە بینی باوەر نەکە.
- تەمبەلی کلیکا دەرگەهێ هەژارییێە.
- جیرانێ نێزیك چێترە ژ برایێ دویر.
- جهـ ب مێهڤانا تەنگ نابیت.
- چ عەرد ژ مالا مرۆڤی خۆشتر نینن.
- چ جار مرۆڤێ خۆ نەدە ب خەلکێ بیانی.

- چوون ب دەستێ مرۆڤی یە، هاتن نە ب دەستێ مرۆڤی یە.
- چ ژیێ كەسیێ نەخۆشتر نینە.
- خالەتێ بێهنا دەیكێ ژێ دهێت.
- خەبەر ئەگەر دەركەڤتیت ژ زارا، دێ كەڤنە بازارا.
- بنڤە نەجار، وەكی هەر جار، خودێ ئێكە دەرگەهـ هزار.
- خودێ چ ل ئەنیێ نڤێسی یە، دێ ئەو بیت.
- چاڤێت خۆ ژ راستی یێ نقاندن.
- هەمی دار دهێنە سۆتن، بەلێ هەمی ئاخفتن ناهێنە گۆتن.
- هەتا مرۆڤ ل سەر دەستا برێڤە نەچیت، قەدرێ پیا نزانیت.
- دفنا وی یا د هەمی عەردارا.

## قۆناغا پێگەهشتنێ:

ئەڤ قۆناغە قۆناغەكا هەستیارە كو تێدا گوهۆرینێن فسیولۆژی و دەروونی ب سەر زارۆكی دا دهێن زارۆك ب ڤی چەندێ ژ قۆناغا زارۆكینی یێ بەرەڤ قۆناغا هەرزەكاریێ ڤە دچیت، ئەو گۆهۆرینێن د ڤێ قۆناغێ دا چێدبت دبنە ئەگەرێ هندێ كو گوهۆرین د گەلەك هەلویستێن هەرزەكاری دا دروست بن ب رەنگەكی كو ئێدی ئامۆژگاریان ب رەنگەكێ ڕاستەوخۆ ناوەرگریت، چونكە خۆ خودان كەسایەتییەكا جیاواز و ب هێز دزانیت هەمی دەمان هەول ددەت ل دووڤ تێگەهشتنا خۆ بریاران بدەت، لەوڕا گەلەك ژ گۆتنێن مەزنان یێن گرێدای ب ڤی قۆناغێ ڤە ب رەنگەكێ نە ڕاستەوخۆ دهێتە گۆتن داكو هەستێ وی هەرزەكاری بریندار نەكەت یان هەستەكی بۆ وی چێنەكەت كو ئەو وێ گۆتنێ وەك مایتێكرن د ئاڤاكرنا كەسایەتیا خۆدا بینیت، زێدە بارێ ئەو گوهۆرینێن فسیولۆژی ئەوێن دبنە ئەگەر كو زاڕۆك بەرەڤ قۆناغا هەرزەكاریێ بچیت كو دبیتە ئەگەر كۆ سەرنجا وی بەرەڤ رەگەزێ بەرامبەر (كچ یان كوڕ) دچیت و هەست ب پێدڤی بوونا هەبوونا پەیوەندییان دناڤبەرا رەگەزێ خۆ و رەگەزێ بەرامبەر دكەت چونكە سەربۆرێن وی یێن ڤێ قۆناغێ دكێمن چێدبیت تووشی ئاریشان ببیت، لەوڕا باب و باپیرێن مە ب هاریكاریا گۆتنێن مەزنان كو یێن گرێداینە ب ڤی قۆناغێ ڤە هەول داینە ئێكەم جار رێكخستەكێ بێخنە دناڤ ڤان جۆرە پەیوەندییان دا و ئەوژی ب دانا ژمارەكا پێزانیان ل سەر ڤان بابەتان و دووەم جار پێكۆلێ دكەن ب شلۆڤەكرنا سنوورێن رەوشت و تیتالان یان ئایدولۆژی یا بەربەلاڤ سنوورێ ڤان پەیوەندییان دەستنیشان بكەن.

- (برا چیایێن گرانن)[103]

قۆناغا (١- ٢-٣) دا زارۆك یێ گرێدایە ب دایك و بابێن خۆڤە، لەوڕا چ ب هایەكێ مەزن وەك پێدڤی بۆ خۆشیك و برایێن خۆ نا دانن و چێدبیت ململانا دناڤبەرا وان ژی دا هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بیت، لێ پشتی قۆناغا پێگەهشتنێ پەیوەندیا هەرزەكاری ل گەل دایك و بابان كێم دبیت و بەرۆڤاژی ڤێ چەندێ پەیوەندیا وی ل گەل خۆشك و برایان ب تایبەت برایان (ل دووڤ سیستەمێ عەشیرەتی) ب هێزتر دبیت و چونكی ژ لایێ هزری ژی گەهشتییە ئاستەكێ بلند ب رەنگەكێ باش بهایێ وان دزانیت باب و باپیرێن مە ب مفا وەرگرتن ژ ڤان پێزانینان و زانینا پێدڤێن هەر كەسەكی بۆ كەسەكێ دی ب تایبەت برا ب برا هەول دایە گرنگیا خۆ بێخنە سەر ڤی بابەتی دا ئێكەم جار ئەو هەرزەكار د سنوورێ جڤاكی دا بتنێ نەمینیت، هەر وەسا بنەمایێن عەشیرەتێ ژی كو جڤاكێ كوردی ل سەر هاتییە ئاڤاكرن بهێنە پاراستن.

٢. (( بخۆزیا كەس ناگەهیت جۆتێ كەزیا))[104]

د دەمێ هەرزەكاریێ دا ئێك ژ گرنگترین تشتان ل دەڤ هەرزەكاری رەگەزێ بەرامبەرە ب رەنگەكی كو مەزنترین هیڤی و ئومێدێن هەرزەكاران دهەبوونا پەیوەندییان ل گەل رەگەزێ بەرامبەرە كو هەلگرێ جوانترین سیفەتان بیت، باب و باپیرێن مە ب هەبوونا پێزانینان ل سەر ڤێ قۆناغێ و مفا وەرگرتن ژێ هەول دایە ب بەراوردكرنا ڤێ دیاردێ ل گەل ئەو پەیاما وان

دڤێت بكەهینن ب باشترین رەنگ كو ب ئاشكەراترین شێوە ئەو پەیام گەهاندی یە، دیسان بۆ ڤێ ڤوناغێ ژی وەكی یێن بەرێ هندەك گۆتن یێن هەین ژ وانان: -
- برایێ خراب چێترە، ژ خویندارێ باش.
- خراب دبیت مالا زێرا، بەلێ خراب نابیت مالا مێرا.
- خوین بخوینێ ناهیتە شویشتن.
- دبەر ماری را ببورین، دێ مویەكێ ژێ كێشیت.

## گۆتنێن مەزنان:

گۆتنێن مەزنان گۆتنەكا كورت و پر رامان دەربرینێ ژ سەربورا مرۆڤی دكەت دوارێن جودا جودایێن ژیانێ وەكی (سیاسی، ئابووری، جڤاكی..... هتد) ب ئارمانجا پەند وەرگرتن و بەختەوەركرنا ژیانا مرۆڤی و نەهێلانا شاشیان. ئەڤە وەكو كورتە پێناسەكێ بوو بو گۆتنێن مەزنان بەلێ دەربارەی تایبەتمەندی و رەگەزێن وی، مە ئەو ڤەكۆلینا خۆ دا بەحس نەكرییە، چونكی گەلەك ڤەكۆلین ل سەر هاتینە كرن، لەوما ئێكسەر دەست ب پراكتیكرنا گۆتنان كرییە.
ژ گرنگترین بابەتێن مرۆڤایەتی د گۆتنێن مەزناندا ئەڤێن ل خارێ نە:-

### ١- ئازادی و سەربەستی:

ژ گۆتنێن ل سەر ڤی بابەتی:
((ئەگەر سەربەست نەژی. مرن خەلاتە بو گیانی)) (١٠٥)

ژیان ب سەربەستی و ئازادی خۆشە. ئەگەر مرۆڤ ب حەز و ڤیان و ئارەزوویا خو بزاڤێ دژیانێ دا نەكەت وی دەمی نەبوونا مرۆڤی ژ هەبوونێ باشترە. ژبەر هندی ژی گەلێن جیهانی یێن بن دەست گیانێ خو دكەنە قوربان پێخەمەت راكرن و نەهێلانا بن دەستیێ و دابینكرنا ئازادیێ. چونك و نابیت مرۆڤ وەكی ئامیرەكی بیت و خەلكەك مرۆڤی ل دووڤ هەست و ڤیان و ژێو ئارمانجێن خۆ برێڤە ببەت. مەزنترین ئازادی ژی ئەوە یا خودی دایە مرۆڤی. د سەر هەمووئەو تشتێت خودێ دایە مرۆڤی ژبوون و مەزن بوون و هەموو خۆشیێت ژیانێ و دبێژیتە مرۆڤی تویێ ئازادی تەدڤێت رێیا باش یان یا خراب بگری.
((دار ئازادیێ ب خوین و خویدانێ تێ ئاڤدان)) (١٠٦)

بێ گومان پەیڤا ئازادی پەیڤەكا پر رامانە و سەركێشایە هەمی ئاستەنگێن ژیانێ یە، ئەڤ گۆتنە ب وێ مەرەمێ هاتییە گۆتن و ئازادی یا كەفتییە بن پەرا خو بەخنكرن و قوربانیدانێ. بۆ دەستڤە ئینانا ئازادیێ، ئانكو دڤێت مرۆڤ هەول و بزاڤا بكەت كو ب هەر رەنگەكی بیت ب سەربەخۆیی و سەربەستی بژیت و هەمی پێكڤە بزاڤێ بكەن و خۆ ژ بندەستیێ رزگار بكەن.

### ٢- ئاشتی و تەناهی:

ئاشتی و تەناهی وەك بابەتەكێ مرۆڤایەتی دناڤ گۆتنێن مەزنان دا ب ئاوایەكێ بەرفرەهـ هەبوویە ژوان گۆتنان:
(مرۆڤ ماری ل سەر ئاڤێ ناكوژیت) (١٠٧)

مرۆڤی چەند دوست هەنە، هند دوژمن ژی هەنە، ئەڤجا دڤێت هەردەم ئەو ل بەر سینگێ ئێك نەراوەستن، دڤێت گیانێ لێبوردەیێ دناڤبەرا وان دا هەبیت، ئەڤ گۆتنە ژی بو ڤێ مەرەمێ هاتییە واتە خۆ ئەگەر دوژمنێ مرۆڤی ل سەر ئاڤێ بیت ناچێبیت بكوژیت و توند و ستەمێ لێ بكەت و دڤێت ئەو داخازا ئاشتیێ بكەت چونكی ئێك ژ بهایێن بەرزێن و مرۆڤایەتیێ یە.
(( ئەگەر مرۆڤی شەركر، دڤێت جهێ سولحێ بهێلیت)) (١٠٨)

چ مرۆڤ نینە كو خەلەت نەبن. ژیان ژی یا بەردەوامە و هەمی هەڤركی و خۆشی و نەخۆشی یە. مرۆڤ دڤێ گێژڤانكا ژیانێ دا گەلەك جاران دكەڤیتە شەر و زۆرانبازیان بەلێ یا فەر ئەوە مرۆڤ دارێ ژینێ نەبریت پاشی ژیان ب دروستی رێڤە ناچیت. دگەل دلمان و شەری و لێكدانێ دڤێت لێبۆرین و چاڤنقاندن ل هندەك پرسگریكان بێتە كرن. ژ كەڤن دا دناڤ مللەتێ كورد دا مە دیتییە گەلەك جاران پشتی شەر خویندارێ (سولح) دهێتە كرن

کو ئەڤەژی سیفەتەکێ باشە دگەل ڤێ گۆتنێ چەندین گۆتنێن دی ژ هەنە.

## ٣- وەکهەڤی و دادپەروەری:

ئەڤ بابەتە دناڤ گۆتنێن مەزنان ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ دهێتە دیتن ژ دو ئالیان ڤە ئەو ژی دژاتیکرنا ئەزاتیێ و نەدادپەروەریێ و گرنگی دان ب وەك هەڤی و دادپەروەریێ وەکی:

((تەفشویکێ بەرێ خۆیە)) [109]

مرۆڤ د پێکهاتنا خویا بایولۆژی دا هەموو وەکو یەکن پێدڤییە جوداهی دناڤبەرا مرۆڤان دا وەك (مرۆڤ) نەهێتە کرن. پێدڤییە ئەرك و ماف ژبۆ هەموویان وەك یەك بن و ئەگە ئەڤ سیستەمە ئێکچو و دێ چین دروست بن و دێ مافێ کەسێن بێ هێز و بێ شیان هێتە پێشلکرن و هەر کەسەك ژی دێ بو بەرژەوەندیا خۆ کارکەت و ئەڤ گۆتنە ژی ب ڤێ مەبەستێ یە کو تنێ دێ تەفشێ خو بەرێ خو بیت و ل ڤێرێ مرۆڤایەتی زور لاواز دبیت ئەڤە ژی ب دیتنا یاسایێن ئەکمانی و یاسایێن مرۆڤایەتیێ یا رەت کرییە.

- هەمی کەس ئاغایێ مالا خۆیە. [110]

دەمێ خودی مرۆڤ ئەفراندی و دروست کری چ جوداهی نەکرییە دناڤبەرا هەژار و دەولەمەندان، بچوك و مەزنان، دەستهەلات و بێ دەستهەلاتان، ناچێبیت ستەم و زۆری لێ بێتە کرن. ئەڤێ گۆتنا سەری ژی دەربرینێ ژڤێ چەندێ دکەت کو هەرژ کەڤندا و هەتا نوکە جڤاکێ مە ل دووڤ ئاغا و بەگان دچیت و ئەو دەستهەلاتا خۆ بسەر خەلکێ هەژار و فەقیر دا دسەپینن هەر دیسان ب وێ مەرەمێ یە کو ناچێبیت ئێك زۆرداریێ ل ئێکی ب ناڤێ ئاغایەتیێ ئەز ئاغامە بکەت، چونکی هەر کەسەك ئاغایێ مالا خو یە.

## ٤- برایەتی و دۆستایەتی:

ئەڤ بابەتێن مرۆڤایەتی جەختێ ل سەر مرۆڤی وەکو مرۆڤ دکەت ئانکو مرۆڤ وەکو برایێ مرۆڤی د ژیانێ و هەبوونێ دا ژ گۆتنێن ل سەر ڤی بابەتی:

((دوستێ چاك چێترە ژ برایێ خراپ)) [111]

هەڤالینی و دوستایەتی ئێك پەیوەندیێن ب هێزە دناڤبەرا مرۆڤان دا ئێکە ژ سیفەتێن بەرزێن مرۆڤی، دیارە هەر ژ کەڤندا باب و باپێرێن مەژی گرنگی ب ڤێ پەیوەندیێ دایە و بەرز راگرتییە لەوما ئەڤ گۆتنە گۆتییە چونکی هەڤال و دوست ژ هەرکەسەکی نێزیکتر بۆ مرۆڤی و هەڤالی ژی ئەوە یێ خۆشی و نەخۆشی و بەرتەنگییان ل هەمبەر مرۆڤی رادوەستیت و دەستێ هاریکاریێ بۆ مرۆڤی درێژ دکەت و ئەگەر مرۆڤی هەڤالەکێ ب ڤی رەنگی هەبیت گەلەك باشترە ژبرایەکێ خراپ،

((دوستی لەهەنگامێ تەنگی ی ئەزانرێ)) [112]

ئەڤ گۆتنە ب وێ مەرەمێ هاتییە کو مرۆڤ گەلەك جاران تووشی دەلیڤێن بەرتەنگ و نەخۆش دبیت مرۆڤ پێدڤی ب کەسانێن دی هەیە داباریێ مرۆڤی سڤك بکەت، ئێك ژوان کەسان هەڤالن، گەلەك جورێن هەڤالان هەنە. لێ هەڤالێ راست و دروست و ژدل حەژ ژمرۆڤی و هەڤالینێ دکەت ئەوە یێ دوان دەلیڤێن تەنگا رو رەش دا ل هەوارا مرۆڤ بیت و دگەل ئێش و ژانێن مرۆڤی بژیت و خۆ ل مرۆڤی بکەتە خودان و یاپێ چێدبیت بو مرۆڤی بکەت. ئەڤ گۆتنە و چەندین گۆتنێن دی ژی هەنە.

## ٥- پێکڤە ژیان و لێبوورین:

دناڤ گۆتنێن مەزنان دا پێکڤە ژیان و لێبورین چ برەنگەکێ راستەخو یان نەراستەوخو بۆ ئارمانجا هەبوونا ژیانەکا هەڤپشك و تژی لێبوورین دناڤبەرا مرۆڤان دا ل سەر رویێ ئەردی:

((ئێشا تلیێ. ئێشا لاشی هەمیێ)) [113]

خۆشترین ژیان ئەوە یا مرۆڤ پێکڤە ب ئێك دەست و دل و ب ئێکگرتن دژی. دوبەرەکی و نە پێککرن دەردەکێ کوژەکە بو مللەتی. پێدڤییە مرۆڤ مینا لەشی کاربکەت و مرۆڤ ببنە تەمامکەرێن ئێك و دو وەکو ئاڤاهییەکی داکو یێ موکم و ب هێز بیت هەردەمێ لبنەك دڤی ئاڤاهیی دا دشکێت یان خراب دبیت بێگومان کارتێکرنێ ب ئاڤاهیێ هەمیێ

دکەت، ئانکو پێدڤییە مرۆڤ دخۆشی و نەخۆشیا دشینی و شەهیانان دا یێ پشکداربیت و خۆ ژ جڤاکێ خۆ ڤەدەرنەکەت و مرۆڤێ ڤەدەر ژ جڤاکی یێ لاوازە هەر وەکی دڤێ گۆتنێ دا (گورك پەزا ڤەدەر دخوت).

((حولی گوت گولی، هەکە ئەم ملێ خو نەدین ل بەر شولی، کولکێ مە نابت عولی))[114]

مەرەما باب و باپیرێن مە ژڤێ گۆتنێ کو مرۆڤ هەمی پێکڤە دەستێن و خو بدەنە ئێك و پێکڤە کار بکەن و هەردەم نێزیکی ئێك بن و هاریکاریێ ئێك بکەن داکو بشێن ب ئارامی بژین و بەختەوەربن، ئەم وەك مللەتێ کورد کو چەندین سالان ل ژێر بن دەستی و زولم و زورداریێ دنالین و ئەڤروکە ئازاد بووینە، لەوما فەرە ئەم ب موسلمان و ئێزدی و مەسیحی و کلدانی...هتد پێکڤە دەستێن خو بکەینە ئێکدا و جڤاکەکێ نموونەیی پێك بینین و پێکڤە ژیانەکا خۆش هەبیت.

## ٦- بابەتێن مرۆڤایەتی ب گشتی:

ژبلی بابەتێت مە بەحسکرین چەندین بابەتێن دی هەنە کو مرۆڤایەتی بخو ڤەدگریت مینا (هەژاری، مەردینی، خێرخوازی، ئێککگرتن...هتد. بو نموونە دبابەتێ مەردینی دا ئەڤ گۆتنە بو هاتییە:

(ببە مێڤانێ فەقیرێ مەرد، نەبە مێڤانێ زەنگینێ نەمەرد)[115]

دڤێ گۆتنێ دا گرنکترین بابەت دهێتە دیتن، ئەوژی بابەتێ مرۆڤایەتی یە و بابەتێ مەردینی ئێو ژوان بابەتایە کو جهەکێ بەرز دناڤ جڤاکێ کوردی دا هەیە، د ڤی سەردەمی دا وەکی یا دیارە کو کەسێن هەژار و بەلەنگاز گەلەك مەرد ترن ژ کەسانێن زەنگین. چونکی مرۆڤێ زەنگین هەردەم چاڤی وی یێ ل مالێ وی و پارێ وی کا چ زێکێم بوو چ زێدەبوو، بەلێ مرۆڤێ هەژار د سەر هەژاریا خۆ دا چاڤێ وی یێ ل دەرگەهی کاکی دێ هێت، هەروەك دڤێ گۆتنێ دا (تەماهی ژ زەنگینایە، مەردینی ژ فەقیرانە). هەروەسا د بابەتێ قەنجی و چاکیێ دا ئەڤ گۆتنا خارێ هاتییە:

((چاکیێ بکە و دئاڤێ دا بەردە))[116]

بابەتێن چاکی و قەنجی ئێك ژگرنگترین بابەتێن مرۆڤایەتی نە واتە چاکیێ بکە دوور ژ رەگەز پەرستیێ و دەمار گێریێ و دڤێت مرۆڤ چاکیێ دگەل گشت مرۆڤان بکەت، چ هەژار بیت یا زەنگین و هەتا دگەهیتە وی رادی کو مرۆڤ چاکیێ دگەل دوژمنێ خو ژی بکەت و ئەڤ گۆتنە ژی بۆ ڤێ چەندێ هاتییە کو هندی ژ مرۆڤی بێت مرۆڤ باشیێ دگەل مرۆڤان بکەت و وەکی گوتی د ئاڤێ دا بەردەت.

بابەتەکێ دی یێ گرنگ بابەتێ راستگۆیی یە کو ئەڤ گۆتنە بو هاتییە:

(هەرکەسێ ب حیلە بژیت، دێ ب هەژاری مریت)[117]

ئەڤ گۆتنە ب وێ رامانێ دهێت کو مرۆڤ دڤێت یێ راستگۆبیت، راستگۆیی ژی ئێك ژ رەفتار و سیفەتێن بەرزێن مرۆڤی یە کو دڤێت مرۆڤ پێگیریێ پێ بکەت، هەروەسا خودایێ مەزن ژی فەرمانێ ل مرۆڤان دکەت کو دڤێت راستگو دەست پاك بن، حیلە و فیلان ل مرۆڤێن دی نەکەن چونکی ئەو مال مولکێ ب فێلبازیێ دهێت، هەریێ بەردەوام نابیت رۆژەك دێ هێت بو وی نامینیت و هەر دێ ب هەژاری مریت.

دبابەتێ هەڤگرتنا مرۆڤایەتی، ئەڤ گۆتنە بۆ دهێت:

((پەزێ بێ شڤان رزقێ گورگی یە))[118]

رامانا ڤێ گۆتنێ ئەوە کو پێدڤییە ئێککگرتن د ناڤبەرا مرۆڤان هەبیت.

و مللەتی هەمی ئێك بگریت و نەهێنە ژێکڤەکرن، چونکی ئەگەر هەڤگرتن نەبیت، وەلاتێن داگیرکەر دشێن ب ساناهی دەست ب سەر وەلاتێ مە بگرن و داگیر کەن و دێ وەکی ڤی پەزێ بێ شڤان لێ هێین و دێ بینە خوارنا گورگی و دێ ئازادییا خۆ ژ دەست دەین.

# مامك يان تشتيك

ئیسماعیل تاها شاهین

مامك یان تشتیك، پشكەكا گرنگن ژ فلكلۆرێ نەنڤیسییێ مللەتێ كورد كو ل هەر چوار پارچەیێن كوردستانێ د ناڤ خەلكیدە بەلاڤن. ئەڤ مامك و تشتیكە، زاردەڤ، دەست بۆ دەست، بابك بۆ بابك، دئێنە ڤەگێران و ڤەگوهاستن. ناسینا كەسێن بۆ جارا ئێكێ چێكرین و دارێتین، گەلەك ب زەحمەتە و ب سەرهلبوونا ئەگەرێن پەیدابوونا وان بۆ جارا ئێكێ هێژ ب زەحمەتترە..

## پێناسە:

دەستەواژەیەكا لێكئینایی و وێنەدارا ڕوخسار ئاشكەرا و ڕامان تەمژی و ڤەشارتی و ژ بەركرییە. دوبارە، د قالب و كراسەكی كورتڤەبڕ و گڤاشتیدە، مەرەم و مەخسەدەكا ئێكسەر نەدیار و ڤەشارتی دگەهینت، كو تنێ هندەك نیشانێن نەئێكسەر ژێ هاتینە دان، و گەلەك جاران بەرسڤا وێ د ناڤ كۆمەكا پەیڤێن پێش و پاشكریدە هندا و بەرزەیە.. پێشتر و د سەردەمەكی دەستنیشاننەكریدە، ژ بەرێ كەسەكی كەڤنی نەناسڤە، هاتییە دارێتن، و وەك پسیار ڕابەری كەسەكێ یان كۆمەكێ دئێتە كرن. مامك و تشتیكان ناڤێ خوە، ژ ڤان هەردو دەستەواژەیێن كو گەلەك جاران د سەرێ واندە دوبارە دبن وەرگرتییە: ((مامكێ منۆ مامانی)) یان ((تشتیكێ منۆ تشتە)).

## ناڤەرۆكا مامك و تشتیكان:

مامك وەك پێشچاڤ، پتر كێش و كێلاییا زانین و تێگەهشتنا بەر و بیر و هشێن سەردەمەكی كەڤن و بۆریێ ساڤا، ددتە دیاركرن. سادە و ساكارییا سەر و سیمایێ ژین و ژیارەكا بۆری پێڤە دیارە، خودانكرنا پەزی، كیانا مەشكێ، جۆت و هەڤجار، داس و جۆنی و دستار، ئەڤە هەمی شاهدن. هەتا پرانییا دیاردەیێن سرۆشتی ئەوێن ب ناڤ یان ب نیشان، د ناڤ كرارێ گەلەك مامكاندە هاتین، وەك: شەڤ و ڕۆژ، عەور، دووكێلا داران، ستێرێن ئەسمانەكی سایی و زەلال و گەلەك جانەوەر و تەیر و تەوالێن دیتنا وان نها ل بەر گەلەكان ب زەحمەت، چارچۆڤ و سنوورێ جیهانەكا بەرتەنگ و نەفرەهـ بەرچاڤ دكن. لێ د گەل ڤێ هەمییێ ژی، تڤاڤەكا كێم ژ مامك و تشتیكان، نیشانێن نووچێكرنێ پێڤە دیارن و بەرسڤا وان هندێ دگەهینت كو ڤەرێژا سەردەمەكی پاشترن، بەلێ كێماتی و قەتلازییا وان، ئیشارەتێ ددت، كو چان و شارستانییا ئەڤرۆ، دەرفەت و دەلیڤە د سنگێ دارێتن و چێكرنا زێدەتر مامك و تشتیكاندە، گەهاندییە

ڕادەیـا بنبرکرنێ. ئەڤە چەندەك ژ وان مامك و تشتیکانە، ئەوێن ژ ڤەرێژا سەردەمێ ئەڤرۆ:
- تەنوبرا مەتێ، قەلەك کەتێ، دەستێ کەسێ ناگەهتێ.
(بەرسڤ: تڤەنگە)
- سەرێ وی ب سەر ستێرا کەڤتییە.
(بەرسڤ: زابتە)
- سەرڤە سێلە، ژ ناڤدە زنڕە، ژ بنڤە ئاڤە.
(بەرسڤ: لۆکسە)
- سەرڤە چرکەچرکە، بنڤە چرکەچرکە، وەلا بابۆ خوەش تەڤرکە.
(بەرسڤ: سەعەتە)
- دئاخڤت بێ دەڤە، گولێ دبت بێ گوهە.
(بەرسڤ: تەلەفۆنە)
- ژ زکێ دا خوە دەردکەڤت، پشتا بابێ خوە دخوەرینت.
(بەرسڤ: زلکێ شخاتێیە)

مامك د بنیاتا خوەدە، ڤەرێژا سەربۆرەکێیە، ڕوخسار و ناڤەرۆکا وێ، ڕەهوانی و شارەزاییەکێ دیار دکن. مامك جوونەیارییەکە، د ناڤبەرا مامکبێژی و گوهداریدە.. یارییەکە د لاش و گەودێ دەستەواژە و چەند پسیارەکێن بەرسڤ بەرچاڤ یان ڤەشارتی و مرۆڤخاپیندە، یان د قالبێ کۆمەکا وێنە و شەبهاندن و خواستن (إستعارە) و پەیڤێن خودان گەلەك ڕاماندە، کو جارنا هندەك ژێ، ب سەرڤە خەبەر و ڤەجنقاندنن و ژ بنڤە کەنینە.. ئەڤە چەندەك ژ وان نموونەیانە ئەوێن ڤێ ئێکێ بەرچاڤ دکن:

- ئەز چۆمە تاخێ ژێری، ژنا ل سەر مێری، من گۆتێ دێ چ کی؟ گۆ: دێ ئینمە نێری!!
(بەرسڤ: دستارە)
- تەیر دفرت پووش ب ملانڤە.
(بەرسڤ: تەیر د فرت و پووش ژی ب مل و بەتەنانڤەیە)
- چۆم بەر دەری، دارێ ڕابووی بەری، فاتێ ئینا سەری.
(بەرسڤ: ئاشە)
- دارکێ دوتا، تە د خوە قوتا.
( بەرسڤ: بێجامەیە؛ بەجامەیە)
- درێشە، درێشە، کەرۆ درێشە.
(بەرسڤ: درێشە)
- زك ل زك، دار ل کونك، شوغلێ ژنك.
(بەرسڤ: دستارە)
- سەر ل دا تە، بن ل تە، گوی ڕهێ بابێ تە.
(بەرسڤ: مەشکە)
- کا چۆ ما دان.
(بەرسڤ: کا چۆ ڕەخەکێ و دان ما د جهێ خوەدە د دەمێ بێدەر هلاڤێتنێدە)
- کوڕێ کوڕێ منۆ، برایێ مێرێ منۆ.
(بەرسڤ: کوڕێ دەیکەکێیە خوە بۆ کوڕێ خوە کرییە پێکوهۆڕکا دەیکا مێرێ خوە).
- گەرمە، نەرمە، دۆخینێ ڤەکە، هەکە مە نەخوار ل سەر مە.
(بەرسڤ: عوورکن)
- مها من پاییزێ مر، بهارێ گۆشتێ وێ کەلاند.
(بەرسڤ: بهار ناڤێ ژنەکێیە)
- چۆمە زەڤییەکا خرەبەر، من داپیرا تە دانا سەر، باپیرێ خوە ژی هاڤێتە سەر، کادیا [دووکێلا] شین ژ قۆنێ برە دەر.
(بەرسڤ: دستار).
- هەلدکێشمە تە، دادکێشمە تە، ڕەپڕەپۆکێ خۆ دبەمە تە.
(بەرسڤ: کەڤچك)
-- هەپلەمچە، هەپلەمچە، هزار مێرا دکەت، هەر کچە.
(بەرسڤك پارەیە)
- هاڤینێ فراڤین چێکر، پاییزێ فراڤین ژ نوو بر دا پالا.
(بەرسڤ: هاڤین و پاییز دو ژنکن)

زمانێ هندەك مامك و تشتیکان، هۆستایی ۆ بلیمەتییا مامکدارێژان د کراسێ چەند پسیار ۆ گرێهشکەکێن وەك تەلیسماندە دیار دکت، ژ بۆ دان هندەك مەرەم و مەخسەدان، ب شارەزاییەکا بێ وێنە

ملێن تڤاڤەکا بێژە و پەیڤێن د دەست مەدە مری یان نیڤمری، داپینە هەڤ و پێکڤە ڕستکرینە و کرینە گیانەکی زێندییێ جهێ گوهشین و عەجێبگرتنێ.

هندەك گۆتنێن دی هەنە، زیرەکییا ل سەرێك دوبارەکرنێ پێ دئێتە جەرباندن. ژ هندەك ڕستە و دەستەواژەیێن پەیڤ تێکهلکێشایی و نێزیکی ئێك و پێش و پاشکری پێکهاتینە، ژ بەر نێزیکاتی و وەکهەڤییا ژ دەڤ دەرئێخستنا پەیڤێن گەلەك ژ وان، یان نێزیکاتییا جهدەرکێن تیپێن هندەك ژ وان پەیڤان، ئەو و مامك ژ ئێکا ئەرکی و لێنانێڤە، د گەلەك سەر و ڕوویاندە، نێزیکی هەڤن. ڤان گۆتنان، هەتا نها چو ناڤێن تایبەت لێ نەهاتینە کرن، و ئەو ژی هەر ل سەر حسێبا مامك و تشتیکان دئێنە هەژمارتن. ئەڤەژی تڤاڤەکن ژ وان گۆتنان:

١- پشك و مشك وێ ل سەر دەرخوونکێ، من پشك خوار ما مشك.

٢- چۆمە دەراڤێ ڕێلا، پیرەمێرەکێ ئاڤ ژ سەر من وەرگێڕا، من مەڕکا خوە د کوونا وی وەرگێڕا، وی مەڕکا خوە د کوونا خوە وەرگێڕا.

٣- حوسۆ خمسێ بحەشینە، حوسۆ تو خوەش خمس حەشینکی.

٤- ڕووڤی د ڕها ڕوولێڕە لووری.

٥- سێڤ گندری من سێڤ خوار، گوی گندڕی من سێڤ خوار.

٦- شەلێ سێڤۆ شەش گەزن، هەر شەش گەز، شەلێ سێڤونە.

٧- خالێ منۆ کۆپال سومۆ، حەفت کون د کونا کۆپالێ بابێ منۆ.

٨- هلکورمزی، داگورمزی، شەش تا دەزی، د کونکا دەرزییا دەیکا تەڕە بەزی.

### ئەرك و ئارمانجێن سەرەکییێن مامك و تشتیکان:

١- تەژیکرن و بوارتنا دەمێ ڤالا یێ مامکبێژ و گوهداران.

٢- لڤاندنا شیانێن خاڤ و ڤەشارتی و بەرزەیێن گوهداران و خورتکرن و تیلکرنا هزرا وان، ب ڕێکا هلێخستن و شاراندن و ئاراندنا گیانێ قەبکرن و هەڤرکییێ، ب ڕێکا مژوولکرن و شلقاندنا هزرێ، کو چێترین ڕێکە سەرنج پێ بێتە کێشان و زیرەکی پێ بێتە جەرباندن و باوەرییا دو ئالییان (مامکبێژ و گوهداران) پێ بێتە تێر و تەژیکرن و خوەجهکرن، و هەڤبەندییێن جڤاکی د ناڤبەرا هەردوو ئالییاندە موکومتر لێ بێن.

٣- کۆمکرن و قەفاندنا هزرکرنێ د چارچوڤێ بابەتەکێدە و ئاژۆتنا بەر و بیر و بالا گوهداری بۆ وێ سەمتێ؛ بۆ وی ڕووکار و جهی، ئەوێ مامکبێژی دڤێت. ئەڤەژی ئێکە ژ ڕێك و شێوازێن پەروەردەکرنێ یێن سەرکەڤتی.

## هندەك نموونە ژ مامك و تشتیکان:

١- ئەز چۆم مالا حارس، من پسیارکر ژ خەلکێ فارس، کێ دیتییە گۆشتێ ب گارس.
(بەرسڤ: هەژیرە)

٢- ئەز چۆم گوندێ تاری، من بەرێ خوە دا ئاقاری، حەفت ددانێت د دەڤێ ماری.
(بەرسڤ: جۆتێ گایان)

٣- ئێرەڤە دار، وێڤە دار، ئێکێ د ناڤدە کۆرەمار.
(بەرسڤ: خەنجەرە)

٤- ب تاقێ ڤەکە، تەماشەکە.
(بەرسڤ: عەینەیە)

٥- ب مستێ ناچتە تەستێ.
(بەرسڤ: ڕومە)

٦- بزنا کالە، ل پشت دیوارە، نە ددۆشم و نەدفرۆشم.
(بەرسڤ: مۆرییە؛ مێرییە)

٧- بزنا مەلای، چۆ سەرێ چیای، نەهێلا داڤا گیای.
(بەرسڤ: دەڤکە؛ گویزانە)

٨- بێدەرا ل پشتا خانی، کا چێترە ژ دانی.
(بەرسڤ: پامبوویە)

٩- پەزێ عەلۆ مەما، بەردا چەما، هەتا سپێدێ کت ژێ نەما.

(بەرسڤ: ستێرن)

١٠- پەزێ مام ئێزدینە، گرتە کێزەشینا، نە هەوارە و نە بانگینە.

(بەرسڤ: سپهن)

١١- پچووکێت وا مەزن نابن و مەزنێت وا پیر نابن.

(بەرسڤ: بەرن)

١٢- پیرەمێرەکێ تێت ژ دەشتێ، پشتیبەکێ ستریا وێ ل پشتێ، من گۆتێ دێ چ کێ؟ گۆ: دێ چمە بەحەشتێ.

(بەرسڤ: ژوژیە)

١٣- پێنج برا قەسرەکێ ئاڤا دکن.

(بەرسڤ: کرنا گۆرەیا ڕیسییە ب پێنج شیشکان)

١٤- تەڤەکا خالا ل پشت مالا.

(بەرسڤ: جۆکە)

١٥- تەنوورا دمدمێ، تەژی ئارێ گەنمێ، سحارێ ڕابووم خەتمێ.

(بەرسڤ: ستێرن)

١٦- تەیر دفرت پووش ب ملاڤە.

(بەرسڤ: تەیر دفرت و پووش ب مل و بەتەنانڤەیە)

١٧- تشتێ منۆ تشت، نیکلێ وی خشت، پلەك لێدا کوشت.

(بەرسڤ: پێشییە)

١٨- جۆ دارینە، کۆدەل ئاخینە، خوارنا وێ گیایێ شینە.

(بەرسڤ: قەلوونە)

١٩- چۆ د کونێڤە نەمارە، تۆڤدانکێ ب ملیڤە نە جۆتیارە، پوورتێ پێڤە نە کارە.

(بەرسڤ: شەرمگەهێ زەلامییە)

٢٠- چۆمە دیوانا میر، من پسیارکر ژ خەلکێ پیر، کێ دیتییە تەیر ب شیر؟.

(بەرسڤ: چەکچەکوولەیە)

٢١- چۆمە شکەفتەکا تاری، تەژی تێدە مراری.

(بەرسڤ: ددانن)

٢٢- چارێ ل دەشتێ، و دو یێ ل تەنشتێ، و قۆنا ل سەر پشتێ.

(بەرسڤ: هەسپێ سوار ل سەر پشتێیە)

٢٣- چێلا زادە، چۆ ب چەمادە.

(بەرسڤ: ئاڤە)

٢٤- خشت و مشت، چۆ وێراهە ڕوونشت.

(بەرسڤ: گێسکە)

٢٥- خلنگ و خلنگ، هەشت پێ و دو لنگ.

(بەرسڤ: جۆتیارە)

٢٦- خەجۆکا پشت شکەستێ، بێ گۆشتە و بێ هەستێ.

(بەرسڤ: مۆرییە؛ مێرییە)

٢٧- د سەر ئاڤێرە دچت سە نادت.

(بەرسڤ: دەنگە؛ گازییە)

٢٨- دارا ل ناڤ دارا، زەر دکت ژ گوهارا.

(بەرسڤ: دارگوهیشکە)

٢٩- دارە نەدارە، سەرحولیبە نە مارە، گیا دخوت نە دەوارە.

(بەرسڤ: کویسەلەبە)

٣٠- دارکێ دوتا، تە د خوە قوتا.

(بەرسڤ: بێجامەیە)

٣١- دەرێ وێ ل دا تە، گوییێ وێ ل سەر دەڤێ حەفت بابێت تە.

(بەرسڤ: مەشکە)

٣٢- دەمێ تێت میرە، دەمێ دڕوونت وەزیرە، دەمێ دچت فەقیرە.

(بەرسڤ: بەفرە)

٣٣- دەیکا تە دکت، بابێ تە تێرە دکت.

(بەرسڤ: گۆرەیە)

٣٤- دچنە مستێ، ناچنە تەستێ.

(بەرسڤ: تیرۆکا نانییە)

٣٥- درێژکە تەنگە، پانکە تەنگە، ڕاکە تەنگە.

(بەرسڤ: تەنگە)

٣٦- درێشە، درێشە، کەرۆ درێشە.

(بەرسڤ: درێشە)

٣٧- دو بان و دو دکان، هەشت مە و دو بەران.

(بەرسڤ: هەردوو دەستێن مرۆڤینە)

٣٨- شەش بەند و بەندلکەك، دو نان و کوتلکەك.

(بەرسڤ: تەرازوویە)

٣٩- ڕەشە ڕەشە وەكی قیر، دفرت وەكی تیر، كوتلكا چێ دكت وەك یێت مالا میر.
(بەرسڤ: كێزگولۆلك)

٤٠- ڕەشە وەكی بزن، هووره وەكی كرزن، میر و حاكم ژ بەر دلەرزن.
(بەرسڤ: كێچە)

٤١- ڕێڤە دچت بێ پێیە، دگریت بێ چاڤە.
(بەرسڤ: عەور و بارانە)

٤٢- زك ل زك، دار ل كونك، شوغلێ ژنك.
(بەرسڤ: دستارە)

٤٣- ژ ئێرە هەتا كتە، مهێت كوڕەتە، گوهانكری ئاڤس نە.
(بەرسڤ: كچكن)

٤٤- ژ ڤێرێ هەتا سندۆر، هەمی جوهییێت ڕتلسۆر.
(بەرسڤ: گولیرن ؛ گلوێرن)

٤٥- سۆرێ سۆبركری، بۆ دەرێ كوونا بابێ چێكری.
(بەرسڤ: مەسین)

٤٦- سەر ئاڤەنۆس، بن ئاڤەنۆس، چار چەنگ و فیل و فەنگەنۆس.
(بەرسڤ: كیڤژالە)

٤٧- سەر د تەڕە، نیڤ د ئەردیڕە، بن د ئاخیڕە.
(بەرسڤ: گەنمە)

٤٨- سەر گەلگەلە، بن گەلگەلە، چاڤ زیڤە سمبێل بەلە.
(بەرسڤ: كێریشكە یان سڤۆرەیە)

٤٩- سەرڤە هەسانە، ژ بنڤە قورئانە.
(بەرسڤ: كڤاركە)

٥٠- سەرنشیڤ كە تەژی دبت، سەرئەڤرازكە خالی دبت.
(بەرسڤ: كومە؛ كولاڤە)

٥١- سەقەتۆكێ ب لنگەكێ، چۆ شەڕێ گوندەكێ.
(بەرسڤ: بڤرە)

٥٢- سێ برا ب شاشكەكێ.
(بەرسڤ: خوانە)

٥٣- سێنیا ساڤارا، ل سەر گوهێت دارا، بۆ جاروبارا.
(بەرسڤ: هنارە)

٥٤- شۆڤا خرەبەر، باپیرێ من كەت ، پیرا تە كەتە سەر!!.
(بەرسڤ: دستارە)

٥٥- عەجێبە سەد عەجێبە، ماهینا شەش ڕكێبە، كوری ب هەستییێ پشتێڤە.
(بەرسڤ: تەرازوویە)

٥٦- عەرێنە و مەرێنە، دو دەستن، دو پێنە، قالبە ڕوح تێ نە.
(بەرسڤ: مەشكە)

٥٧- عەسكەرێ خالا، گرتە دۆر مالا.
(بەرسڤ: سنگێت كوینانە)

٥٨- فەقیر دئاڤێت، زەنگین دهلگرت.
(بەرسڤ: كلمیشە)

٥٩- قادر ژ وی قادری، دار د دارێڕە كری، پێڤە هاتی وەكی ستری.
(بەرسڤ: بێكوانەیە)

٦٠-قدقد دارە، سەر مشارە، قوون قەدارە.
(بەرسڤ: دیكلە)

٦١-قەسرا سپییە بێ دەرییە.
(بەرسڤ: هێكە)

٦٢-قەسرەكا هشتی مشتی، دو مال تێدە ڕوونشتی.
(بەرسڤ: لبا گویزێیە)

٦٣-كا چۆ ما دان.
(بەرسڤ: كا چۆ دان ما)

٦٤-كانییا ل پەساری، میر و حاكما ژێ ڤەخواری.
(بەرسڤ: چچكن)

٦٥-كەر دزرت، پشكل ژ كوونێ دفرت.
(بەرسڤ: تڤەنگە)

٦٦-كەرە نە كەرە، هەفساری ل سەرە، تشۆ تشۆ ل دووڤ من وەرە.
(بەرسڤ: باگوردانە)

٦٧-گرێدە دچت، بەردە ناچت.
(بەرسڤ: كالكە)

٦٨-گرێكا بزمارا، ئاڤێتە پشت مالا، بۆ جاروبارا.
(بەرسڤ: تووڤلهنارن)

٦٩-گورزا دارا، وا ل نزارا، ژێ تێت دەنگێ برێندارا.

(بەرسڤ: سەلکە)

٧٠-گیسکێ گوری، ل نهالێ نری.

(بەرسڤ: ئاشە)

٧١-لاندارەك وا ل هەوا، عەزیزەك تێدە د خەوە.

(بەرسڤ: زکێ ماهینا ئاڤسە)

٧٢-لاوێ ئەلمانا دگەرِت ل سەر بانا، کوون تیژترە ژ ددانا.

(بەرسڤ: دووپشکە)

٧٣-مامکێ منۆ مامانی، تشتەکێ ل سەر مێزا سولتانی، ژ خودێ و پێغەمبەرا پێڤە نوزانی.

(بەرسڤ: ژنا ئاڤسە)

٧٤-مامکێ منۆ مامکانی، خوە دهلاڤێژت زرچانی.

(بەرسڤ: بەقە)

٧٥-من بزنەك دیت ب سە و دو شاخا.

(بەرسڤ: سها بزنێ و هەردوو شاخێن وێنە)

٧٦-من دی ب رێڤە، تشتەکێ ب تێڤە، من نەزانی گولە ئان سێڤە.

(بەرسڤ: گولیرە)

٧٧-مێرگا شین، دو مار لێ دخوشین، ئێك هەسپە ئێك ماهین.

(بەرسڤ: رۆژ و هەیڤن)

٧٨-نە پێ پێڤەیە نە پانی، ئەو ب خوە دچتە سەر بانی.

(بەرسڤ: دووکێلە)

٧٩-هۆ دکت مۆ دکت، ل بەر دەرێ ستەمبۆلێ شۆل دکت.

(بەرسڤ: مەقەسە)

٨٠-هۆلهۆلێ دکت، بۆلبۆلێ دکت، قەستا چیایێ ستەنبۆلێ دکت.

(بەرسڤ: عەورە)

٨١-هانیکێ مانیکێ، فەرشێ ل سەر دەرێ کانیکێ، رێ نادتە جانیکێ.

(بەرسڤ: قەریسەیە)

٨٢-هەرمە هەرمە، گارانەك وا ل بەر مە، گۆلکێ دووماهییێ حەفت چەرمە.

(بەرسڤ: پیڤازە)

٨٣-هلندر و ملندر، کورِ ژ بابێ بلندتر.

(بەرسڤ: هێسترە)

٨٤-هێرڤە دارە، وێڤە دارە، د نیڤێدە گورگێ هارە.

(بەرسڤ: مشارە)

٨٥-یاسینێ کوون خوار، چۆ سەرێ لاتێ، لات ئینا خوار.

(بەرسڤ: گویزانە)

٨٦-یێ مری یێ ساخ دکێشت.

(بەرسڤ: دەستاڤە)

# ئەدەبێ زارۆكان د فولكلۆرێ كوردی دا بەهدینان وەك نموونە

حەجی جەعفەر

كەڤنترین ئەدەبێ زارۆكان د فولكلۆریدا خۆ نیشاددەت، ئانكو بەراهیك ئەدەبێ زارۆكان ئەو بوو یێ د فولكلۆریدا هاتی، ئەو ئەدەبە د ناڤ چوار دیواراندا شین بوو، د ناڤ چادر و رەشمالێن كۆچەرێن دچوونە زۆزانان و دهاتنە دەشتێ پەیدابوو.

ئەڤ ئەدەبە ل سەر زارێ باپیر و داپیران د ناڤ وان چوار دیوار و وان رەشمالاندا دهاتەڤەگیران، ئەدەبێ زارۆكان د فولكلۆریدا خۆ ب گەلەك رەنگان خویادكەت. جار وەك ئەدەبەكێ سەربەخۆ، جار ژی دبن كەپەنێ ئەدەبێ مەزناندا خۆ نیشاددەت، ب رامانەكا دیتر ئەو چیرۆك و سەرهاتی و داستان و ئەفسانەیێن بۆ مەزنان دهاتنەگۆتن، زارۆكان ژی ب دلخۆشی گوهێن خۆ بۆ وان چیرۆك و داستان و ئەفسانەیان بەلدكرن. هەروەسان ئەدەبێ زارۆكان د فولكلۆریدا جار وەك هەلبەست و هۆزان جار ژی وەك پەخشان هاتییە.

ب گشتی ئەم دكارین بێژین كو ئەدەبێ زارۆكـان د فولكلۆری دا پێكهاتییە ژ خالێن ژ پشكێن ژێری و هەمان ئەڤ پێكهاتە ژ ئەدەبێ زارۆكان یێ دەڤەرا بەهدینان ژی دگریت:

## ١. چیرۆك:

مەرەما مە ژ چیرۆكا زارۆكان د فولكلۆریدا، ئەو چیرۆكە یا كو قارەمانێن وێ مرۆڤ بن، چیرۆك ل سەر زارێ كەسایەتیێن مرۆڤ بێتەڤەگێران. ئەو چیرۆك ب كلیلا هەبوو نەبوو، یان ب كلیلا جارەكێ ژ جاران دهێتەڤەكرن و ب كلیلا ئەز هاتمەڤە چ نەدا من، یان ب كلیلا چیرۆكا من چوو دەشتێ، دەیك و بابێت من چوونە بهەشتێ دهێتەگرتن. وەك ڤێ نموونا ژێری ب ناڤێ (عیسكو) هاتی:

هەبوو.... نەبوو، ناڤێ ئێكی عیسكو بوو، عیسكو یێ بێ دای و باب بوو، ل نك مامێ خۆ بوو، ل وێرێ دخوار ڤەدخوار، رۆژەكێ مامێ وی گۆتێ:

عیسكو كارێ خۆ بكە سۆبەهی دێ چینە دروینا دەخلی.

عیسكوی گۆتێ باشە.

بۆ سپێدە، رابوون پالەگرتن و چوونە ناڤ دەخلی دروینێ. هەتا بوویە نیڤرۆ، مامێ وی گۆتێ:

عیسكو رابە هەرە مال بێژە ژنماما خۆ دیكلی بۆ پالا ڤەكوژیت و زوی بلێنیت و بینە و وەرە، زیكا پالە دبرسینە. گۆت بلا.

عیسكو چوو مال، گۆتێ: ژنمام مامێ من یێ گۆتی، گایێ جووتی بۆ فراڤینا پالا ڤەكوژیت.

ژنكێ گۆتێ: ئەو چاوا، دیارە یێ گۆتی دیكلی ڤەكوژیت؟!.

گۆت: نە،

وی گۆتیێ: یێ گۆتی گایێ جووتی.

ژنماما وی چوو ب ناڤ گوندی کەت، هندە زەلام ئینان و رابوون گایێ جووتی ڤەکوژت. هەتا کەڤلکری بوو ئێڤار. هندی مامێ عیسکوی خۆ گرت، نەهات ئینا گۆتە پالا، ئەز دێ رابم دیڤرا چم، کا چ سەروبەرە، نەکو تشتەك ڤەومیبیت.

رابوو چوو مال بەرێ خۆ ددەتێ، کو یێ گای چێ دکەن و د مژویلن.

گۆتی ئەڤە چییە؟.

گۆت: مانێ عیسکۆی گۆت، مامێ من یێ گۆتی، گایێ جووتی ڤەکوژن.

مامێ عیسکوی بەردا ب دووڤ عیسکوی ڤە هەتا رەخێ گوندی.

عیسکو چوو دەڤ پالا گۆتە وان: دێ بلا هوین ل ڤێرە د برسی بن و مامێ من ژی ل مال تێر پشکێت بژارتی بخۆت. پالە ژی رابوون ئاگر بەردا دەخلی و دەخل سووت.

مامێ عیسکوی هات مێلاکا بۆ پالا ڤەلاندی و دانایە سەر گرارێ....

بەرێ خۆ د دەتێ دەخلێ سووتییە، گۆت: ئەڤە چییە؟! پالا گۆت، حال و مادێت عیسکوی ئەڤە بوون، مە ژی دەخل سووت.

مامێ عیسکوی، ل عیسکوی گەریا، عیسکو پێ حەسیا رەڤی چوو..

ب رێڤە بۆ خۆ ڤەلەك گرت و چوو، هەتا گەهشتیە گوندەکی، چوو مالەکێ گۆتێ مێڤانان د حەوینن؟

گۆتێ: سەر چاڤا.... گۆت: ئەز ل ڤێرێ نابم.

چوو مالەکا دی، دیت ژنەکا ل بەر دەری، گۆتێ: هوون مێڤانا د حەوینن؟

ژنکێ گۆتێ: نە. گۆت: پا وەعدە ئەز ل ڤێرە بم.

هندی ژنکێ گۆتێ زەلامێ من ل مال نینە و چاوا دێ ل نیك من بی؟!.

عیسکۆی گۆتێ دێ ل بەر دەرۆکی نڤم.

ژنك نە شیایێ، بوو وەختێ نڤستنا عیسکۆی خۆ د خەورا بر. وی دیت کابرایەك ب ژوور کەت (دەزگرێ ژنکێ بوو)، ژنکێ چەند تشتێن هەین هەمی بۆ ئینان، هێشتا نە خوارین مێرێ ژنکێ ل دەری دا!

دەزگرێ ژنکی گۆتێ چبکەم؟.

ژنکێ گۆتێ: هەرە د کارێ دا. کابرای خۆ هاڤێتە دکارێدا.

ژنك چوو بۆ زەلامێ خۆ دەرگەهـ ڤەکر، گۆتێ: ئەڤە چ زەلامە ل ناڤ دەرکی نڤستی؟.

گۆتێ: نزا مێڤانەکە. گۆتێ: هەرە بینە ژوور. گازیکرێ هات، جهێ وی چێکر و نڤستن.

بێهنەکێ مان عیسکوی ڤەلا خۆ شداند، ڤیغێن ژێ هات!!.

گۆتێ ئەڤە چییە؟.

گۆت: ڤەلا منا برسییە گۆشت دڤێت.

زەلامی گۆتە ژنکا خۆ رابە بۆ بینە.

گۆت: ژ کیڤە بینم؟! گۆت: رابە هەرە....

رابوو چوو گوشت بۆ ڤەلێ ئینا (ڤەل ناخۆت)، عیسکو رابوو تێر خوار.

بێهنەکا دی پێچوو ڤیغێن ژێ ئیناڤە، گۆتێ چییە؟.

گۆتێ: ڤەلا من تێنییە ئاڤ دڤێت.

گۆت: هلو ئاڤێ بۆ بینە.

عیسکوی گۆت: مانێ هوسا ئاڤێ ناڤەخوت.!.

گۆتێ: پا چاوا؟!.

گۆت: دڤێت مەنجەلەکا ئاڤێ کەل کەن و ب کارکێ داکەن!!.

گۆت: رابە حورمەت بۆ ئاڤێ دروستکە.

هندی ژنکی گۆتێ کارکا مەیا ئاخێ یە دێ خرابیت،...

گۆت: بلا خراب بیت.

رابوو مەنجەلەکا ئاڤێ کەلکر و بر ب کارکێ دا کر.

عیسکوی دمێ ڤەلێ هۆ دابەر ڤەل مر. ژ نوی عیسکو نڤست.

ئاگر بەربوو ژنکێ، رابوو چوو گۆتە عیسکوی: ئەڤ جوامێرە تە د کاری دا سووت، رابە ببە د ئەردەکی را بکە...

عیسکوی ب دەنگەکێ بلند جابا وێ دا...

ژنکێ خۆ بێ دەنگ کر.

جارەکا دی چوو ب نك عیسکوی ڤە گۆتێ: هلو تە چ دڤێت دێ دەمە تە.

گۆتیێ دەهـ زێرا. گـۆت: بلا.

ژنکـێ و عیسـکـوی تەرم ژ مالـێ هینا دەر و دانا سـەر پشـتا کـەری و گـرێدا. دەهـ زێر دانە عیسـکـوی و عیسـکـوی کـەر هاژوت و چوو.....گـەهشـتە سـەر بێدەرەکا فەلەیەکـی، عیسـکـوی کـەرێ خۆ هاژۆتە سـەر بێدەرێ و خـۆ ڤەشـارت. خـودانـێ بێدەرێ هات، گـازیکـر... هـێ کـورۆ... کـەرێ خـۆ ل سـەر بێدەرێ ببە (پایێ مریە، دەنگـی ناکـەت)، ئەوی ژی بەرەك هاڤێتی، ل بن گـوهـی دا و د کـەری دا هینا خـوار. عیسـکـوی کـرە هەوار تە بابێ من کـوژت، دڤێت ئەز ژی تە بکـوژم.

خـودانـێ گـەنمـی خۆ هاڤێت بەختـێ کـوڕکـی و گـۆتـێ: تە چ دڤێت ئەزێ حازرم.

عیسـکـوی گـۆتـێ: چل بارێت گـەنمـی دگـەل چل گـا. گـۆت: بلا

خـودانـێ گـەنمـی عیسـکـو برە مال، چل بارێت گـەنمـی دگـەل چل گـا دانـێ و گـۆتـێ: تۆ ل سـەر سـەرێ من هاتـی.

عیسـکـوی بەرێ هەمـیا دا رێکـا گـوندێ مامـێ خـۆ و هاتە مالا وی.

مامـێ وی ما حێبەتـی!! نەزانی، دێ چکـەت و چ بێژیت!!

عیسـکـوی گـۆت مام: ئەڤە چل بارێت گـەنمـی پێش دەخلـێ تەڤە، ئو ئەڤە چل گـا پێش گـایێ تەڤە و ئەڤە دەهـ زێر پێش حەقـێ پالاڤە.

ئینا ژ نوی مامـێ وی چوو دەسـتـێ وی و گـۆتـێ: ئەز بوومە مامـێ تە و تو بوویە برازایێ من[1].

ب راسـتـی فولکـلـۆرێ کـوردی یـێ پرە ژ ڤان ڕەنگـە چیرۆکـان، نەخاسـمە ل دەڤـەرا بەهدینان، ئەو پەرتووکێن ل ڤـێ دەڤـەرێ بۆ زارۆکـان هاتینەچاپکـرن باشـترین نموونە نە بۆ گـۆتنا مە.

## ٢. چیڤانۆك:

ئەو ڤەگـێرانە یا کـو پڕی خـەیال و راسـتـی تێدا نەبیت، ئەڤە ژی د بنە دو تا:

- چیڤانۆکێن مرۆڤ و گـیانەوەر تێدا دبنە قارەمان.
- چیڤانۆکێن تنـێ گـیانەوەر تێدا دبنە قارەمان.

### أ- چیڤانۆکێن مرۆڤ و گیانەوەر تێدا دبنە قارەمان:

ئەڤە ئەو چیڤـانۆکـن یێن کـو مرۆڤ و گـیانەوەر تێدا رۆلـێ خـۆ دگـێڕن و وەکـهەڤ دگـەل ئێك دئاخڤن. فولکـلـۆرێ کـوردی ب ڤان رەنگـە چیڤـانۆکـا یـێ دەولەمـەندە. ئەڤ رەنگـە چیرۆکـە هندەك جاران ب کـلیل ڤـەدبن و دهێنەدائێخسـتن، هندە جارا ژی بـێ کـلیل ڤـەدبن و دهێنە گـرتن. بۆ نموونە ئەڤ چیڤـانۆکـا ل خـوارێ بـێ کـلیل ڤـەدبیت و دهێتەگـرتن، هەروەسـان مرۆڤ و گـیانەوەر، بـکـرە نەگـیاندار ژی تێدا پشـکـدار دبن.

چیڤـانۆك ب ناڤـێ ((دێ خـۆم و خـۆم)) هاتییە[2]:

چـوومـە رێکـەکـا دوور، بەرکـەك لـێ بوو، من گـۆتـێ: بەرکـۆ تو ل ڤێرێ چ دکـەی؟

گـۆتـی: بۆچـی گـیا ل بن من شـین بییە؟!.

من گـۆتـێ: گـیاوۆ بۆچـی تو ل بن بەری شـینبووی؟

گـۆتـی: بۆچـی پەز من دخـۆت؟!.

من گـۆتـێ: پەزۆ بۆچـی تو گـیای دخـۆی؟

گـۆتـی: بۆچـی گـورگ من دخـۆت؟

من گـۆتـێ: گـورگـۆ بۆچـی تو پەزی دخـۆی؟

گـۆتـی: بۆچـی سـە دهێنە من؟

من گـۆتـێ: سـەوۆ بۆچـی تو دچیە گـورگـی؟

گـۆتـی: بۆچـی کـابانی تێر نادەتە من؟

من گـۆتـێ: کـابانیـێ بۆچـی تو تێر نادەیە سـەی؟

گـۆتـی: بۆچـی مشـك همبانکـا دانـێ من دخـۆت؟

من گـۆتـێ مشـکـو بۆچـی تو همبانکـا دانـێ کـابانیـێ دخـۆی؟

گـۆتـی: بۆچـی پشـیك من دخـۆت؟

من گـۆتـێ: پشـیکـێ تو بۆچـی مشـکـی دخـۆی؟

گـۆتـی: دێ خـۆم و خـۆم، چاڤـەکـێ تەیـێ زل و یەکـێ بل.

### ب: چیڤانۆکێن ب تنێ گیانەوەر تێدا دبنە قارەمان:

ئەڤە ئەو چیڤـانۆکـن یێن تنـێ گـیانەوەر تێدا رۆلـێ خـۆ دگـێڕن، ئەڤ چیڤـانۆکـە ل سـەر زارێ گـیانەوەرێن وەك: ریڤـی، گـۆرگـی، کـێڤرویشـکـێ، پلنگـی، پشـیکـێ،

بەرخکێ، هرچێ، حێشترێ و ... هتد دهێنەگۆتن.

ئەڤ تایێ چیڤانۆکان ژ هەموو چیرۆك و چیڤانۆکان دەولەمەندترە. مەبەستا گێرانا وی ژی هەروەکی یا چیرۆکێ یە، زارۆکی فێری پەرەوەردا باش و ساخلەمدکەت، فێری راستیێ، دادپەروەریێ، مێرانیی و مەردینیێ....دکەت. ئەڤ چیڤانۆکە ژی هندەك جاران ب کلیل و هندەك جاران ژی بێ کلیل دهێنەڤەکرن، بۆ نموونە ئەڤ چیرۆکا ل خوارێ ب کلیل دهێتەڤەکرن و گرتن، هەروەسان تنێ رۆلێ گیانەوەران تێدایێ بەرچاڤە.

چیڤانۆك ب ناڤێ ((رویڤی و کەر)) هاتییە[٣]:

هەبوو.... نەبوو، کەس ژ خودێ مەزنتر نەبوو، کەس ژ بەنیا درەوینتر نەبوو، هەبوون حەفت مالێت قەرەچان، هەر حەفت مالان کەرەك هەبوو، هەر مالەکێ ئێڤاری دندکەکا جەهی بۆ کەری دهینا، ئەڤە بۆ خوارنا کەری، دبێژن کەر گەلەك لاواز و قار بوو.

رۆژەکێ رویڤییەکێ فێلباز لێ پەیدا بوو و گۆتێ: ئەرێ خالێ کەر ئەڤە بۆچی تو هوسا لاواز بووی؟

کەری گۆتێ: هەرێ... هەرێ خالێ رویڤی، تە چ های ژ حالێ من هەیە!! هەفت مالێت قەرەچا هەمی شولێ خۆ ل سەر پشتا من دکەن، تو ب خۆ دزانی هەر دو رۆژان مالێت وان یێ ل جهەکی و خوارنا من رۆژێ هەفت دنکێت جەهی نە.

رویڤی گۆتێ ئەز دێ بۆ تە رێکەکێ بینم کو تو ژ دەستێت وان دەرکەڤی.

کەری گۆتێ خالێ رویڤی هەکە تو ڤێ قەنجیێ ل من بکەی، ئەز چ جاران قەنجییا تە ژ بیر ناکەم.

رویڤی گۆتێ: کەنگی قەرەچان مالێن خۆ بارکرن، تو خۆ نەساخ کە.

کەری گۆتێ: سوباهی دێ بارکەن.

رویڤی گۆتێ: سوباهی تو شیڤێ نەخۆ، خۆ نەساخ بکە، پاشێ ئەز دێ هێمە نك تە.

کەری گۆتێ: باشە.

بۆ ئێڤاری هەفت دندکێت جەهێ بۆ ئینان، کەری خۆ مراند، هندی هاتنە کەری، کەری شیڤ نەخوار، ئەڤرۆ مری هەکە ئەڤە دەهـ رۆژە.

بۆ سپێدە بەرێ خۆ ددەنێ کەر یێ مرییە، وان گۆت کەر مرا!

رابوون ب چ حالێ هەی مالێت خۆ بارکرن و کەر هێلا ل شوینوارا.

رویڤی هات بەرێ خۆ ددەتێ کەرێ ل وێرێ، مالا یێت بارکرین، گۆتێ خالێ کەر تویێ چەوانی؟

گۆتێ: نەمرنە، نە ژینە.

رویڤی گۆتێ هلو کارێ خۆ بکە، ئەم دێ چینە زۆزانا.

چوون ... مابەینەکێ دیتن کو دو بەران یێت ب شەر چووین.

گۆتنێ: ئەڤە هەوە خێرە، ڤی شەری دکەن؟!

ئەوان گۆت: وەللا ئەم ژی نزانین دێ چ کەین!؟ ئەم ژی ب شەر چووین، بەلێ ئەڤە هوین دێ کیڤە چن؟.

رویڤی گۆتێ: ئەم دێ چینە زۆزانا. جۆتێ بەرانا گۆتێ هوین مە ل گەل خۆ نابەن؟

رویڤی گۆتێ: رێکا ب هەڤالا خۆشە.

جۆتێ بەرانا ب دووڤ رویڤی و کەری کەتن و چوون... هەر چوون هەتا جۆتەکێ کەوا دیتی، کەوا پرسیار ژ رویڤی کر گوتێ: دێ کیڤە چن؟

رویڤی گۆتێ: مە ل بەرە بچینە زۆزانا.

جۆتێ کەوا گۆتێ: ئەگەر هوین مە ل گەل خۆ ببەن، ئەم گەلەك حەز دکەین.

رویڤی گۆتێ: وەرن.

رویڤی دگەل هەڤالێت خۆ کەتنە رێ بەرەڤ زۆزانا چوون، چەند رۆژەکان گەهشتنە زۆزانان.

کەر ل گەل جۆتێ بەرانا و جۆتێ کەوا کەتنە خۆشیان، چەروانەکا خۆش و ئاڤەکا مشە هەبوو.

رویڤی ژی سپێدێ زوی دا چیت، ئێڤاری دا هێتەڤە، دیت هەڤالێت وی ب کەیفن، وی ژی گۆتێ: مادەم هوین ب کەیفن و دلێ هەوە یێ خۆشە بلا حالێ من یێ نەخۆش بیت، چ نینە بلا بۆ هەوە یا خۆش بیت، بلا بۆ من یا نەخۆش بیت، ئەم یێ ل گەل ئێك هاتین، مرن و ژین پێکڤە.

هەیامەك چوو کەر گەلەك قەلەو بوو، بیرێت

خەربیێ لێ دان، گۆتە رویڤی زرا منا دهێت، ئەز دێ زرم !!

رویڤی گۆتێ: خالێ كەر مە چ دەستەلات ل ڤێرە نینە، دوژمن دێ ل دووڤ دەنگێ تەهێتن دێ مە خۆن.

كەرێ گۆتێ: ئەز دێ یا دلێ خۆ بێژم ئو كولێت خۆ رێژم بلا بهێنە من.

كەری دەست ب زرینێ كر ئۆ زری. گورگەكی گوهـ ل دەنگێ وی بوون ل دووڤ هات، بەرێ خۆ ددەتێ كو ئەڤە كەرەكێ هوسا قەلەوە ! گۆت ئەڤە خۆش شیڤە. گورگی خۆ كرە گڤشك خۆ ل بنێ زكێ كەری دا. كەری هەردو پێت خۆ ل ستۆیێ گورگی شداندن، هەر بەرانەك چوو لایەكی و دانا گورگی ب قۆچا، مامێ رویڤی چوو دەفتەرەك ئینا و ل گورگی خواند.

گورگ كوشت، رویڤی و هەڤالێت خۆ ژ دەستێ گورگی رزگاربوون و ب خۆشی پێكڤە ژیان.

چیرۆكا من چوو دەشتێ دایك و بابێت من چوون بهەشتێ.

## ٣- هۆز و بەرهۆز:

هۆز و بەرهۆز ئەو بابەتێ فولكلۆرێ زارۆكانە ئەوێ زارۆكی ل سەر دەنگان فێردكەت. زارۆك دێ گەلەك دەنگێن نێزیكی هەڤ بۆ ئێك و دو د رستەكێدا، یان د چەند رستاندا هینن، كا كی دێ باشتر بێژیت و خەلەت نابیت، بۆ نموونە دێ بێژن، كی دشێت سێ جاران بێژیت: ((سۆڤی شەریڤی شەش سە هەبوون، هەر شەش سەیێت سۆڤی شەریڤی لێككەتن، چ شەر ژ شەرێ هەر شەش سەیێت سۆڤی شەریڤی خۆشتر نەبوو)).

یان ((رەژی سۆژك خۆش رەژی سۆژكە)).

یان (( چوومە زەڤیكا ب كور، هاتنە من سێ سەیێت در، من كر فر، وان كر تر، من كر فر)).

یان (( پشك و مشك ل سەر دەرخوینكێ، من پشك خوار، ما مشك، من پشك خوار، ما مشك...))

فولكلۆرێ كوردی یێ پرە ژ ڤی ئەدەبێ زارۆكان[٤].

## ٤- مامك:

مامك یان تشتكێ منۆ تشتۆ، بابەتەكێ گرنگە، د ئەدەبێ فولكلۆرێ زارۆكاندا، چونكی مێشكێ زارۆكی ددەتە شولی و بەرفرەهـ دكەت. هەروەسان پێكەنینەك و پشكورینەكا خۆش و شرین ل سەر لێڤێن زارۆكی دبارینە[٥]. ژبلی ڤێ ژی كاریكاتێری و كومیدیەت ژ مامكێن كوردی دباریت[٦]. ژبەر ڤان ئەگەران و هندەكێن دی، مامك دبنە پشكەكا هەرە گرنگ د ئەدەبێ زارۆكاندا. ئەو ژی بلا بێتە گۆتن كو ل سالا (١٩٨٦)ێ من گۆتبوو: مەتەلوكێن كوردی ب گشتی نابنە ٧٠٠ هەفت سەد مەتەلۆك، ئانكو یێن مایی نێزیكی ٣٠٠ مەتەلۆكانە كو هێشتا نەكەتینە سەر كاغەزێ. هەروەسان من گۆتبوو: ئەڤ ژماردنە تەخمینە بەلێ گەلەكا نێزیكی راستیێیە.... گۆتنا ڤان مەتەلۆكان ل دۆر هندەك تشتان دزڤرن و هەر ڤان دوبارە و سێ بارە دكەن، لێ ب ئاوایەكێ دی[٧]. ئەڤێن خوارێ ژی هندەك مامكن، كو مەزن و زارۆك بكاردهینن، لێ زارۆك پتر بكاردهینیتن هەروەسان ب (مامكێ منۆ مامۆ) یان (تشتیكێ منۆ تشتۆ) دەستپێ دكەت:

١-سەر گلكلە، بن گلكلە، چاڤ زیق و سمبێل بەلە.
(كێڤریشكە)

٢- چوومە ئودا ژێری، من دیت ژنا ل سەر مێری، من گۆتێ دێ چ لێكەی؟ گۆتی دێ هینمە نێری.
(دستارە)

٣- بابێ تە دانیشتیە ل دیوانێ، گونێت وی چوونە كۆلانێ.
(كولندە)

٤-كانیكا بەرێ ل كەندالی، میر و حاكما ژێ ڤەخواری.
(مەمكێت دەیكێ نە)

٥- چار چەقچەقین دكەن دو بەلبەلین دكەن، هزار و ئێك باوەشین دكەن.
(هەسپە، یان هێسترە چار پێنە، دوگوهن، موویێت كورێنە)

٦- سیهـ دقوتن یەك ژبەر ڤەدەت.
(ددان و زمانە)[٨]

## ٥- هەلبەست:

ئەڤە ئەو هۆزانن، ئەوێن زارۆك خۆ ب خۆ ڤەدهینن و دناڤ خۆدا ڤەدگێرن و ل دۆرلەیزن، وەك: حەوایێ حەوایێ، ڤیڤانێ ڤیڤانێ، بەیتا کتکێ، بەیتا کێچێ..... هەلبەستا هەڤال هەڤالوشکێ... ئەڤێن خوارێ ژی چەند نموونە ژ هەلبەستێن زارۆکان، کو دبنە پشکەکا هەرە سەرەکی د ئەدەبێ فولکلۆرێ زارۆکاندا، دێ بۆ نمونە چەندەکان ژ وان هەلبەستان بەرچاڤکەین یێن ل دەڤەرا بەهدینان بەربەلاڤ:

١-هەڤال هەڤالۆشکێ
ناو پەنیرۆشکێ
کەکێ من چوو سیکێ
ئینان جلێت بیکێ
بیکا مەیا جانە
ل سەر بەرەکێ پانە
بەرێ پان کەلشتی
شێرەك تێدا کوشتی
شێرێ مەیێ هارە
دەست و پێ قەنتارە[٩]

٢-چیچێ چیچێ
پەرە میچێ
بسکا تە روحانە
روحانا بێهن خوەشە
کەزی مارێ رەشە
مارێت رەش دو تانە
ل کوردستانێ وەرتانە
کوردستانا کشتە
شێرەك تێدا کوشتە
شێرۆ مال خرابۆ
دەست و پێ عەنابۆ[١٠]

٣- بیکا مە باران دڤێ
دەخلەکێ ئەرزان دڤێ
ئەرزانیا سالان دڤێ
بیکا مە خێلی خێلی
نادەینە حەسەن گێلی
دێ دەینە ئامێدی یا
دێ دانە سەر کورسی یا
دێ پێ دادەن شەمسی یا
......................
......................[١١]

## ٦-سترانێن لاندك هژینێ (لۆرین):

ستراتێن لۆرین، پشکەکا دی یە ژ ئەدەبێ زارۆکان د ناڤ فولکلۆرێ کوردی دا. هەر د لاندکاندا گوهێن زارۆکێن ساڤا فێری ستران و ئاوازێن دایکێ دبن. دایکا دل پڕ ئەڤین، هەر ژ هەیڤا ئێکێ و هێرڤە، نازکترین و دلسۆژترین ستراتان ژ زارۆکێ خۆرا دبێژیت، ئەڤ سترانە ب ئاوازەکا پڕ خەمگین و دلشکەستی تێنە ڤەلۆرین.

ئارمانجا ڤێ سترانێ تنێ ئەو نینە کو بچویك دبەررا بنڤیت و بکەڤیتە خەوەکا خۆش و شرین، بەلکو ئارمانجەکا دی ژی هەیەن ئەو ژی ئەوە دایك ب رێکا ڤان ستراتان خەم و خەیالێن دنیایێ، خەمو خەیالێن خۆ پێ ب رەڤینت.

بارا پتر ژ ڤان ستراتان، ئێك روخسار و ناڤەرۆك هەیە، هەروەسان بارا پتر ژ پەیڤ و وێنێن وان ئێکن. لەورا ب هزرا من ئەڤ سترانە، هەموو سێ چوار سترانن، تا و چق ژێ چووینە، ئانکو سێ چوار ستران قورمن، یێن دی ژی تا و چقن، بەلێ سەربەخۆییا خۆ وەرگرتینە،هەتا رادەکی کو مرۆڤ نزانیت ئەڤ تایە ژ سترانا بنیاتی هاتیە وەرگرتن و قەتاندن[١٢]. ئەڤێن خوارێ دو نمونەنە ژ سترانێن لۆرین:

١- هەی لایێ لایێ
ئەز لاندکا خۆ لالینم
سبەهیا راکەم، ئێڤاریا زووی نڤینم
ئەزێ دەیکەکا دەیبابی،
بۆ لاندکا ساڤا ژ کیڤە ئینم
هەی لایێ لایی
ئەزێ لاندکا خۆ ل باکەم
ئێڤاریا زووی نڤینم، سبەهیا راکەم
ئەزێ دەیکەکا دەیبابی

بۆ لاندكا ساڤا ژ كیڤە پەیداكە

******

هەی لایێ لایێ

دارێ لاندكا من ژ دارێ بەری

هوستا كارا دارێ لاندكا ساڤا كورتێ بڕی

مەمكێ دایێ كورتە ناگەهتە دەڤێ كوڕی

......................... [١٣]

٢- هەی لایێ لایێ لایێ

ڤێ شەڤێ ل من كریە دوومە

تەرازی بلەرزن

پێرۆ ل هنداڤی بێلایێ بینەف كوومە،

دێ بلا هەردوو چاڤێت رەش،

بەژنا تەیا بلند، یێت من عەبدالێ خودێ بانە

پاشی بلا حازربان، ل سەر روحا من،

عەبدالەكێ خودێ فەرەنگ و رۆمە

.........................

......................... [١٤]

## ٧- سترانێن لەیزاندنێ:

ئەڤ سترانە ژی، پشكەكا هەرە گرنگە ژ ئەدەبێ زارۆكـان، هەر ل وی دەمێ زارۆك پێدڤی سترانێن لۆرینێ، پێدڤی هندەك سترانێن دی ژی یە كو دبێژنێ: سترانێن لەیزاندنا بچووكان.

ڤان سترانان ئارمانجەك دی هەیە، كو جودایە ژ سترانا لۆرین، كارێ سترانا لۆرین ئەو بوو زارۆكی بنڤینیت، لێ كارێ ڤێ سترانێ ئەوە، بچووكی هشیاربكەت، سڤك بكەت، زیخ بكەت. دایك یان هەر ئێكا دی، زارۆكی د ناڤ دەستێن خۆدا دئینیت و دبەت و ڤان سترانان دبەررا دبێژیت.

جوداهیا دی یا ڤی رەنگێ سترانێ دگەل سترانا لاندك هژینێ ئەوە، ئەڤ سترانە كورتترن ژ سترانێن لۆرینێ، هەتا هندەك جاران دبنە دو سێ رێزكەك. لێ ئەڤ سترانێن لەیزاندنا بچووكان ب هژمار پترن ژ سترانێن لاندك هژینێ. هەروەسان ئەڤ سترانە ژ خەم و خەیالێن دنیایێ د ڤالانە، بەروڤاژیا سترانێن لۆرینێ كو پڕن ژ ڤان خەمان. ئەو ئاوازێن خەمگین و پڕ خەفەت د ڤان سترانێن لەیزاندنێدا نینن، هەروەك د سترانێن لورینێ داهەین. پەیڤێن سترانێن لاندك هژینێ د نەرم و دلسۆژترن ژ پەیڤێن سترانێن لەیزاندنا زارۆكان. ئانكو پەیڤێن سترانێن لەیزاندنێ د نێر و سوارن، بەلێ پەیڤێن سترانێن لۆرینێ د مێ نە و پەیانە، دوعا و مەدح و شانازی جهێ خوە د سترانا لەیزاندنا بچووكاندا پتر دبینیت ژ سترانا لۆرین.

ئەڤ سترانە هەتا ژیێ دوسێ سالی دگەل زارۆكێ دچن)[١٥]، ئەڤە ژی چەند نموونە نە ژ وان سترانا:

١- هەی داوۆ عەمەرێ من

هەی داوۆ عەمەرێ من

تو ل سەر بانا توتیكە

تو ل بەر بانا توتیكە*

گازی كچكێت گوندی كە

گازی زەرییێت گوندی كە

هەچیا جان تۆ ماچیكە

هەچیا كرێت تۆ قوتیكە

+++++++++++

هەی داوۆ عەمەرێ من

هەی داوۆ عەمەرێ من

هەچیێ ل تەدا بێژە من

هەچیێ ل تەدا بێژە من

شەرێ گوندی خەما من

شەرێ گوندی خەما من

++++++++++

عەمەری سێ ژن هەبین

عەمەری سێ ژن هەبین

ئێك بۆ كیسك و قەلینا

ئێك بۆ كیسك و قەلینا

ئێك بۆ شەرك و شەڤینا

ئێك بۆ شەرك و شەڤینا

یا ئەسمەر بۆ ناڤ نڤینا

یا ئەسمەر بۆ ناڤ نڤینا[١٦]

٢- هەچیێ بێژیت كرێتە

دیوارەك ب سەردا بێتە

نەگەهیت ژ بن هەلبێتە
دەستێ راستێ بشکێتە
دەستێ چەپێ بخێتە
++++++++++
هەچیێ بێژیت یێ جانە
خودێ بدەتێ کورانە
رەحمە ل دەی و بابانە

٣- خودۆ ۆ باری تەعالا
دەست و پیپا بدە تفالا
دا پێ بچنە مالێت خالا
++++++++++
خودۆ ۆ تویێ دبینی
پەرژانی تێ د وەرینی
چاڤێت حەسیدا پەقینی
+++++++++++
خودیۆ ۆ تە هیمەت کر
کچکا ل بانا دەوات کر
کچکا مەلایی ل کۆرێ مە مەهرکر[١٧]

## ٨- پێکەنۆك:

پێکەنوکێن زارۆکان بارا پتر د چیرۆك و چیڤانوکاندا خۆیا دبن، وەك چیرۆکا (مەلایێ گولێ):

هەبوو..... نەبوو، دبێژن جارەکێ زەلامەك هەبوو، ناڤێ ژنا وی گولێ بوو.

ڤی زەلامی مالا خۆ بار کر ژ گوندەکی چوو گوندەکێ دی، هەکە رۆژەکێ هەکە ئەینیەکێ، هەکە هەیڤەکێ.....ژنا وی گولێ چوو سەر کانیا بالاڤێ داکو بالاڤێ بکەت. گولێ چوو د دەرێ سولینێ دا روینشت، ژنکێت گوندی هەمیان پێکڤە گۆتێ: وەرە ژ دەرێ سولینێ، ما تو نزانی ئەو جهێ ژنا مەلایە؟!.

گولێ ما حێبەتی و ژ وێرێ هات و چوو جهەکێ دی بالاڤا خۆ کر.

پشتی بالاڤ کری قەستا مالا خۆ کر و گازی زەلامێ خۆ کر، گۆتێ:

جامێرۆ ب خودێ تە بڤێت، یان نەڤێت، دێ بییە مەلایێ ڤی گوندی، خۆ ب مەلاتیێ بینەدەر، کەس مە نانیاسیت.

زەلامی گۆتێ: حورمەت تە چ گوهـ لێ بوویە، مەلاتیا چ و حالێ چ؟! ئەز (ئەلحەمدێ) ب دروستی نزانم بخوینم، ڤێجا چەوا ئەز دێ بمە مەلایێ خەلکی، نابێژن ئەڤە چ مەلایە؟!.

گولێ گۆتێ: ئەز نزانم، هەکە تە بڤێت ئەز و تو بقەدر بین ل ڤێ گوندی، دێ بییە مەلا چونکە ئەز ئەڤرۆکە چوومە بالاڤێ، حال و مەسەلێت بالاڤیا ئەڤە بوو (چیرۆکا خۆ بۆ گۆت).

زەلامی گۆتێ: دێ باشە بەلێ ئەز مەلاتیێ نزانم، ئەز خۆ نادەمە شەرمێ د دەستێت خەلکێ دا.

گولێ گۆتێ: بۆ من نەبێژە، تە دڤێت و نەڤێت، دێ بییە مەلا... هندی زەلامی کر و نەکر، نەشیا خۆ ژ دەستێت ژنا خۆ قورتالکەت. زەلام نەچار بوو، گۆتە خەلکێ گوندی ئەز (مەلامە) ئەزێ هاتیمە ڤێرێ، هەکە هەوە بڤێت ئەز دێ بمە مەلایێ ڤی گوندی، هەکە هەوە نەڤێت چنە...

خەلکێ گوندی گۆتێ: ئەزبەنی ئەم یێ ل مەلایەکێ باش دگەرێین، تو ل سەر سەرێ مەهاتی، هەما تو ببە مەلایێ مە، بەلکی تو ژ ئەڤێ دی چێتر بی... رۆژا خوتبە وەرە وەعزی بخوینە، دێ سەحکەینە تە، درێژ ناکەین، بوو رۆژا خوتبە، زەلام رابوو گۆتە گولێ:

ئەڤە ئەز چوومە خوتبێ، بەلێ ب خودێ ئەز چ نزانم، دێ خەلکێ گوندی من ژ ڤێرێ ژێ دەرێخن.

گولێ گۆتێ: جامێرۆ هەما هەرە ب هیڤیا خودێ ڤە، زەلام چوو مزگەفتێ، چوو ل بەر سنگێ زەلامان راوەستا و هەر هزرێت خۆ کرن و بەرێ خۆدا دیوارێت مزگەفتێ و نەزانی دێ چ بێژیت.... زەلام رەڤی، مرۆڤێت مزگەفتێ دا ب دووڤ وی ڤە... هەتا هەمی ژ مزگەفتێ دەرکەفتین. خودێ وەسا حەزکر، مزگەفت هەرفت و هەمی ب سەریەکدا هاتەخوار!!.

وی زەلامی گۆتی: ئەلحەمدولیللا، کەس د بنڤە نەما، هەکە ئەز ڤێ خوتبێ نەهاتبام، هوون هەمی دا دبنڤەبن..... .

هەمیا گۆتی: بخودی مەلا تو راست دبێژی، هەما خودێ و تە روحا مە ستارکر، هەکە کت ژ مە نەدما.... ئێڤاری خەلك چوونە دیوانا حاکمێ گوندی، گۆتنە حاکمی: مەلایەکێ هوسا باش و ب کەرامەت بۆ مەیێ هاتی و (چیرۆکا مزگەفتێ بۆ گۆت).

سێ چوار رۆژ ب سەرڤە نەچوون، گوستیرا ژنا حاکمی بەرزە بوو، هندی لێگەریان گوستیرکێ گۆت پرسیارا من نەکەن.

حاکمی گۆت: هەرن بێژنە (مەلایێ گولێ) بلا بهێت، بەلکی ئەو دیاربکەت کا کێ برییە....؟.

مەلای گۆتێ: دێ ڤێجا ڤێ جارێ دێ چەوا خۆ خلاسکەم.

گولێ گۆتێ: جامێرۆ دێ هەرە ئەڤێ جارێ ژی ب هیڤیا خودێ ڤە.

مەلا چوو نك حاکمێ گوندی گۆتێ: تو سێ عەلعەلۆکا بدە من، هەر رۆژ دێ ئێکی خۆم، رۆژا سیێ دێ دیارکەم کاکێ گوستیرا ژنا تەبرییە!!.

حاکمی سێ عەلعەلۆك دانێ و مەلا چوو مال گۆتە گۆلێ: دێ وەرە دا ڤان سێ عەلعەلۆکا بخوین هەتا رۆژا سیێ پاشێ دێ ژ ڤێرێ بارکەین و رەڤین.

بۆ شەڤ گولێ عەلعەلۆکەك چێکر و دیماهی پێ هینا......پاشێ مەلای گۆتە ژنا خۆ (گولێ): ئەڤە یەك. دزیکەرەکێ گوستیرکێ هاتبوو بەر پەنجەرێ گوهێ خۆ دداێ، کادێ مەلا چ بێژیت! هەکو مەلای گۆتی ئەڤە یەك ئەو وەسا تێگەهشت، کو یێ دبێژیت ئەڤە دزەك.

دزیکەر رەڤی چوو گۆتە هەڤالێت خۆ: مەلایێ پێ حەسیای هەکە هوین باوەرنەکەن، شەڤەکا دی ئێکی ژ هەوە دگەل من وەرن دێ چین گوهێ خۆ دەینێ.

هەر ب وی رەنگی ژنا مەلای عەلۆکێ دوویێ چێکر و مەلای گۆتێ ئەڤە دوو، یەکێ مایی گولێ.

هەردو دزیکەر رەڤین چوون گۆتنە هەڤالێ خۆ: مەلایێ ب دزیا مە حەسیای عیلاجەکێ.

هەر ب رەنگێ مە گۆتی رۆژا سیێ.... یان شەڤا سیێ عەلۆکێ سیێ ڤەکوشت و مەلای گۆتێ: ئەڤە سێ سوبەهی دێ چمە نك حاکمی.

هەر سێ دزیکەرا گوهێ خۆ داینێ و هەر دجهدا هاتنە ژوور و گۆتنێ:

بۆ خاترا خودێ، مە خۆ هاڤێتە ناڤ مالا تە، تە چ دڤێت ئەم د حازرین.

مەلای گۆتێ: دێ باشە هەرن گوستیرکێ بینن، چوون گوستیرك هینا.

مەلا سپێدێ چوو نك حاکمی گۆتێ: ئەڤە گوستیرا ژنا تە !!.

حاکمی گۆتێ: تە چاوا دیت؟.

مەلای گۆتێ: هەما پرسیار نەکە......... و مەلا چوو مال.

چەند رۆژەکێن دێ ب سەرڤە نەچوون، حاکمی گۆتە مەلای مارەکێ د کانییا گوندیدا، کەس نەشێتێ، هەمی گاڤا یێ د ئاڤێدا، بەس نیڤرۆ یا دەردکەڤیت، ل سەر فەرشێت کانیێ، ڤێجا مە دڤێت تو ب کوژی، بەلکی بەلا وی ژ مە ڤەکەی.

مەلای گۆتێ: باشە ئەزبەنی.

مەلا هاتە مال، گۆتە ژنا خۆ: دێ گولێ ڤێ جارێ چ بکەم؟! دێ چەوا ماری کوژم ئەڤ گوندە هەکە نەشێت بکوژیت، ئەز دێ چاوا کوژم؟!.

گولێ گۆتێ: دێ هەرە جامێرۆ ڤێ جارێ ژی ب هیڤیا خودێ ڤە.

مەلا چوو سەر کانیێ، هو دیت ئەو کافرە مارە یێ د ئاڤێدا، رەڤی چوو سەر وێ دارا ل هنداڤ ئاڤێ. ماری دەڤێ خۆ ڤەکر و بەرێ خۆ دا مەلای، مەلا ژ ترسا لەرزی و شیرێ وی ژ دەستا کەفت، کەتە د دەڤێ ماری دا و مار کوشت!! مەلا ژی دلگرتی بوو، د دارێ دا کەفتە ب رەخ ماری ڤە، هەموو بوو خوین.

خەلکێ گوندی د هاوارێ هاتن و هەمییا گۆت: مەلای مار کوشت، جاب بۆ حاکمی چوو، حاکمی گۆت بلا مەلا بێتە ڤێرە.

هەمیا مەلا دانا سەر دەستێت خۆ و برە دیوانا حاکمی و گۆتنی حاکمی: ب خودێ مەلای شەرەکێ مەزنێ دگەل ماری کری، مە ب هەمی عەمرێ خۆ شەرێت هوسا نەدیتینە، ناڤێ مەلایێ گولێ، ل هەمی دنیایێ

گەریا.... هندەك ژ وەلاتەكی هاتن، گۆتن: ئەم دێ مەلای كەینە حاكم بەلێ ب شەرتەكێ.
مەلای گۆتێ: بلا.
ئێك ژ وان گولەك كرە د دەستێ خۆدا و هاتە نك مەلای و گۆتێ:
هەكە تە زانی ئەڤە چیە د دەستێ من دا؟.
مەلای هندی هزرێت خو كرن، نەزانی دێ چ بێژیت، ئینا گۆت: ئاخ... گولێ.
زەلامی ژی ئێك و ئێك دەستێ خۆ ڤەكر و گۆت: بخودێ تو راست دبێژی تو مەلایەكێ ب كەرامەتی و هەژی هندێی ببیە حاكم.
مەلا ل گەل خۆ بر و كرە حاكم[18].
(چیرۆكا من چوو دەشتێ دەیك و بابێت من چوون بهەشتێ).
ئەڤ چیرۆكێن هوسا دبڕن د فولكلۆرێ كوردی دا، مەزن و زارۆك تێكدا تێدا پشكداردبن، وەك چیرۆكا دۆقۆی[19] .

## ٩- جڤین:

مەرەما مە ب جڤینا ئەو خەبەرێن كرێتن ئەوێن زارۆك دبێژنە هەڤ. ئەڤ جڤینە ژی ب گەلەك رێیا دهێن. هندەك جاران ئێكسەر بێ كراس د مەیدانا یاریاندا دهێنە گۆتن. بۆ نموونە:
هوسان ب زمانەكێ رەش خەبەرێت پیس د بێژنە ئێك و دوو. یان ئێك دێ بێژیت ئای! یێ دی دێ بێژیت: كیرێ گای تەرا مای، هەتا مالا ئاغای.
هندەك جاران ژی، زارۆك جڤینا ددەنە كەسێن بیانی یێن نە ژ وان، بۆ نموونە دبێژنە:
... ... دەرپێ تە كەفت، توپا خودێ ب دلێ تە كەفت.
یان دبێژنە قەرەچان:
قەرەچ قەرەچ دەقدەقی، لێڤكا.... لێ پەقی.
هندەك جارا ب رێكا یاریا جڤینا ددەنە ئێك و دوو، بۆ نموونە دێ بێژن:
- تە سارە؟ هەرە بن كوركێ مام عەتارە، دا پیچ پیچك د تەدا بەتە خار.
- من ل تەدا، تە ل من نەدا، عیركێ بەشۆی د دەڤێ تەدا.
- ئێك دێ بێژیت: گیت، ئەوێ دی دێ بێژیت: من قونا تە دیت.
- داكو كەس نە ئاخڤیت دبێژن: كەرە بۆم، كەرە بۆم، سۆر سۆر كێ قاسم، د وی را ببیتە ئاسن.
- هەچیێ تشتەك ل سەر سەری ژنا كەری.
- هەچیێ بێتە سیها من،
بخوت گۆشتێ سپیها من،
تا بگریت، با بگریت،
رۆژەكا عەیدێ زوی بمریت.
- كرم كرم ناكەم،
دو سنگێت پیلا دكەم،
گایەكی دئینم بۆ جۆتی،
بزنەكێ دئینم بۆ شیری،
دەیكا تە حەلالا ڤی كیری.
- دەروێشم، قەلین كێشم، تەدكەلێشم.
- یاسینم، كیر مەسینم، تە دخەسینم[20].
- كچێ، كچێ!... ئا....سەر پێ كوچێ!
- كورۆ، كورۆ؟...ئا. سەر پێ خرۆ!
- ب هزرا من ئەڤ جڤینە ژی پشكەكا دی یە ژ ئەدەبێ زارۆكا. بەلێ یا فەرە بێژم، كو ستران و چیرۆك و چیڤانوكێن ئەدەبێ زارۆكان ژ جڤین و خەبەرێن پیس و دلرەش د ڤالانە، لێ دبێت مەزناندا هەنە[21].

## ١٠- بەیت:

رەنگەكێ دی یە ژ رەنگێن ئەدەبێ زارۆكان د فولكلۆری دا. ئەڤ رەنگێ ئەدەبی، ئانكو بەیت، ب كێش و سەروانە، لێ ئاوازێ خۆیێ تایبەت د گێرانێدا هەنە. د ناڤ ئێك بەیتدا، هندەك جاران جۆت سەروانە، هندەك جاران چوار رێزان ئێك سەروایا هەی، دو رێزك ژی ئانكو مالكەك هەمی گاڤا خۆ دناڤ بەیتێدا دو بارە دكەت. وەك بەیتا كێچێ:
هەرێ كیچێ، كێچە فنگێ
پێب قولنگێ، ددانسنگێ
تو ب عیسا كەی، تو ب میسا كەی
هەكە تو ئەڤ شەڤە من ژ خەو راكەی
*****
كێچەك نینە دوونە و سێنە

بەریەلەکا ژێهەل تێنە
دێ مەلە دەڤی لێ بێنە
دێ سەیدا دەڤی لێ بێنە
*******
کێچەك نینە سێنە و چارن
د بەر بەلەکێت مەرا دبارن
سەیدا چ بکەم، کێچا خارم
مەلا چ بکەم، کێچا خارم
*******
ئەز رەڤیم چوومە مالا ئامینێ
دانا بەر من، کوتلکا دەوینێ
کێچا هەلدا مالدۆخینێ
هەرێ کێچێ، کێچە فنگێ
پیب قولنگێ، ددان سنگێ
*******
ئەز رەڤیم چوومە مالا بێزارێ
دانا بەر من سێنیکەکا ساڤارێ
کێچا وەنەکر دندکەك بچیتە خارێ
هەرێ کێچێ، کێچە ڤنگێ
پیب قولنگێ، ددان سنگێ
**********
ئەز رەڤیم چوومە مالا عەیشوکێ
دانا بەر من پیچەکا باجانسۆرکێ
هەرێ کێچێ، کێچا خارم
سەیدا چ بکەم چ دژوارن
**********
ئەز رەڤیم چوومە باکۆزێ
دو کێچ تێن ژ ناڤ تۆزێ
خۆ د هەلاڤێژنە چەرمێ پۆزێ
خۆ د هەلاڤێژنە چەرمێ پۆزێ
هەرێ کێچێ، کێچا خارم
سەیدا چ بکەم، چ دژوارن
*********
ئەز رەڤیم چوومە باگێرێ
دوو کێچ تێن ژ بن کنێرێ
من گۆت گاز تێن ژ گێرێ
من گۆت گاز تێن ژ گێرێ
هەرێ کێچێ کێچا خارم
سەیدا چ بکەم، چ دژوارن
*********
ئەز رەڤیم چوومە سپینداری
مالێت مرۆڤان بێت داینە حساری
ناهێلیت کەس بێتە خاری
ناهێلیت کەس بێتە خاری
هەرێ کێچی، کێچا خارم
سەیدا چ بکەم، چ دژوارن
*********
ئەز رەڤیم چوومە غلبیشی
دو کێچ تێن برویشی
گۆت دێ کیڤە خلاسبن عیرکیشی
هەرێ کێچێ، کێچە فنگێ
پیب قولنگێ، ددان سنگێ
تو ب عیسا کەی، تو ب میسا کەی
تو ب محەمەدێ مستەفا کەی
هەکە تو ئەڤ شەڤە من ژ خەوا شرین ڕاکەی
*********
ئەز رەڤیم چوومە گەلیێ بالندا
بەرێ خۆ ددەمێ دو کێچێت د پاخلا مندا
نە کێچ بوون، جانەگا بوون
وەریس ل من دو تا بوون
سێ گوند ل دەشتێ ژبەر رابوون
سێ گوند ژ دەشتێ ژبەر رابوون
********
ئەز رەڤیم چوومە دێرا مەزن
بەرێ خۆ ددەمێ دو کێچ دبەزن
هەرێ کێچێ کێچا خارم
سەیدا چ بکەم، چ دژوارن
*********
ئەز رەڤیم چوومە دێرا قلۆن
بەرێ خۆ ددەمێ دو کێچ مرۆڤەکی دگرۆن
هەرێ کێچێ، کێچا خارم
سەیدا چ بکەم، چ دژوارن[٢٢]

# نفرین ژ دەڤەرا بەهدینان°

ئەحمەد عەبدوللا زەرو

دەما هزرێن زاروکینێ د هێن، وێنێن ژیانا سادەیا بەری پتر ژ چەرخەکی ل بەرچاڤان د هێن و دچن. زارۆکینی و ژیانا رۆژانە ل پێشچاڤ دبن و دیرۆکا وان چاخان وەکو ڤەگەریانەك دهێنە دیتن، کونج و قولاچکێن وان جها و رەوشت و تیتال ل بیردئێن کو ژ وانان نفرینن، لێ نفرین چنە؟ .

داخوازێن خرابن و نە ژ دلن دەما ژ دەڤێ دەیکێ دەردکەڤە وب ئاوایەك نەراستەو خۆ یان ئێکسەرە.. پەردەکا پەسنکاریێ تێدایە، لێ ب ئاوایەك کرێت ڤە، نەمیناکی جڤینانە کو دبنە کرێتیێن ئێکسەر ل سەر بەرکێ و ژ زاردەڤێ مرۆڤێ بێ رەوشت دەردکەڤە و یێ بەرهەڤە جڤینا بدت و داپیڤت و ئامویرێ نێری ژبو شکاندنێ بکاربینیت، و مرۆڤێ گوهدار شەرمێ پێ بکت، لێ نفرین گۆتنێن دکرێتن و مرۆڤ پێ نائێشیت و شەرم تێدا نینە، پتریا وان گۆتنا ژ زار دەڤێ دەیکێ یە، کو نە ژ کەزەبا دلێ خوە دبێژە و هندە جارا کەنی و گرنژین و یاری گەڤز و ترانە ژێ چێ دبن بەروڤاژی جڤینا کو ل داویێ شەر و پێکداداان و دل رەشی و زیزبوون و دوورکەتن ژهەردو ئالێن جڤین داین و د ئەنجام دا هندەك رەوش دگەهیتە دادگەهـ و پولیسان نفرین، نەرمیەکا ڤەشارتی تێداو ناگەهیتە ئێشاندانێ. دەما دەیك دبێژت: (نەگەهی یە چۆ مرادا !)، یان:

- (دێ هەرە سەر تل وێڤە، پشت پەحنێ هرڤە!). لێ جڤینان پەیڤێن کرێت و بێ رەوشت تێدانە.

ئەڤ بابەتە ژ بەر چەند خالان هاتیە هەلبژارتن:

(١) وەکو کەلتوورەکێ کەڤن دوی چاخێ خێزان ئێکگرتی و دئێك خانی و ژیانەکا سادە دبووراندن.

(٢) ژبەر پەسەنا وی سەردەمی و ژین و ژیارا وان.

(٣) نفرین ب زمانەك خۆمالی و رەسەن دا هاتیە، وەکو زاراڤێن خۆمالی کو ئەڤرۆ نەماینە و بەرەڤ بریان.

(٤) وەکو رەوشتەکا دەروونی هەبوویە و دایکێ وەکو چارەکن و تەناکرنا لەشی ژ وێ گرانیا ل سەر ملێن وێ بکاردهینا.

## نفرین ژ چێکرنێن ژنکان:

زمان وەکی زانایێ ئەمریکی (ئەمبروز بیرس)[1] دبێژیت: (دنێڤ هەر جڤاکەکی دا دوو زمان دهێنە بکارئینان، زمانێ فەرمی خواندنگەهـ و فەرمانگەهـ و کارێن زانستی و رەوشەنبیریا گشتی و رۆژنامەگەریێ و ئەدەبیاتادا بکارتێت، و زمانێ کولانکی و ل سەر زارێ نەخوێندەوارا، ئەو ژی زمانێ جڤین و ترانا و نفرینانە.. دیسان دبێژیت: زمانێ زانستی ئەوە گەلەك جاران

خواندەڤانی، خویندکاری ژ خواندنێ دوور دئێخیت ژ بەر گرانییا بکارئینانا وێ).. لێ بەروڤاژی زمانێ ترانێ و نفرین و جڤینایە، چونکە زمانێ دووێ کوورتر و سڤکترە ژ بۆ شروڤەکرنا ئالیێ زانستی گرانترە ژ زمانێ ترانێ و نفرینا ژ ئالیێ دەروونی ڤە، لەورا ل بەر مێشکێ مرۆڤی پێناسەکا فیزیایێ، کیمیایێ، ماتماتیکێ زۆر گرانە دەما تو پەسنا یان پێناسا کەسەکی یان رەوشەکی، یان تشتەکی ب زمانێ ترانێ یان نفرینێ دکەی... چونکە پەیڤێن ترانە و جڤین سەرنج راکێشن و کەنی و خۆشییەك تێدایە، بەلکو پێناسا ب زمانێ زانستی گرانترە ژ ئالیێ هزری ڤە ژبو وەرگرتنێ، بنێرە ڤێ پێناسێ دەما دخوازین زارۆیەکێ دەڤ گری و چیر نەخۆش پێناس بکین:

( زارۆك: مرۆڤەك دلئێشە ب کەلەخەك بچووکڤە) پەیڤا ترانە و نفرینا بەرۆڤاژ دهێتە بکارئینان و پەسنێن کرێت دهێتە بکار ئینان، چاخێ دایك دبێژتە کورێ خۆ و نفرینێ لێ دکت:

(دێ روونە هەی سەر گامۆختە وۆ !!) پەسنا کورێ ب سەر مەزنیێ دکەت، واتە تۆرەبوون دگەل ترانێ. ئەڤجا نفرین ژ چێکرێن ژنکانە، چونکە ژین و ژیارا ژنێ دایکێ مالە، هەتا ژخەو راکرنا زارۆکا و خۆ بەرهەڤکرن ژبو کارێ رۆژێ و پێدڤیێن مالێ، دێ بێژتە کورێ خۆ، هەرە بازاری... لنك بابێ خۆ.. فلانی.. فلانی .. بێژێ و بلا بکریت و بینە.

--- دەما ژنك دگەهنە ئێك و دیوانا وان د شارهیت تە دیت ژنەکێ گۆتی: کچێ! من گوتە وێ سەرتراشییا کچا خۆ (هەما پیچەك هاری من بکەو تنێ تەشیەکێ برێسە!؟) لێ ناکت .. وەرن وان خودانکە، ڤێجا تە دیت ژنکا هاڤێتنە بەر ئێك و دو ژ وان نفرین و کرێتییا.. بەلێ ل هندەك دەمێن رۆژێ دبێ کارن و کۆلانا د پیڤن، ناخوینن، هەما ب شەر و لێکدانێ ڤە دمژوولن و دهێنە ڤە ب گری سەرشکەستی، چیە — چنینە!! کورێ فلانێ بەرەکێ لێدای .. ڤێجا دبیتە حەشرا ژنکا و خەبەر و گەف و نفرینان، تە دیت دایکا کورێ سەر شکەستی گوتێ: (کورۆ هەی نە مماوۆ !) ماتەژی نەشیا بەرەکێ لێ بدی، یان سەری لێ بشکێنی، (هەی ئیشەللا وی سەری نەراکت!)، یان: (نەبتە زاڤا !) و دابتە حەشرا نفرینا و جڤینا، ئەڤجا ب تەڤایی نفرین پەیدا دبن و (ژن - دەیك) ئامیرێ چێکرنێ یە.

## ئەگەرێن نفرینا:

ئەگەرێن نفرینان ب تەڤایی دەما زارۆك د جڤۆك و هار و گۆرێخ و نەحەجمتی و نە گوهدار بن، یان جارنا سست و خاڤ و نەوێرەك و سەرشۆر بن و ب گۆتنا دەیبابا نەکەن، یان سەربەردای و کۆلانی بن و دخواندنا خۆدا د کەتی بن، واتە هەر پەسنەکا نە ب دلێ دەیکێ بت، دبنە هۆکارەك ژبۆ نفرین لێکرنێ.

گەلەك جاران ئێش و نەخۆشی دبنە بابەتێ نفرینا.. بۆ نموونە:

--- هەی(زەرە بابێ تو گرتی) یو- یێ ، یان: (داملێ) تو گرتی، (ستوو خەلیایێ) یان (ستوو شکستیێ).

دەیکێ ب گۆتنا نفرینێ د گەل بکارئینانا دەستی کەلا دلێ خوە داشکاند، بەلکو دگەل گۆتنا نفرینا دەیك ب دەستی ژێ بچیتێ، ئەڤجا چ ب حتکا و تەپا، یان ب شینکی و تیرۆکێ و بستا کەل، یان بەلکو دا ترسینیت و بێژتێ: ئێهێ!! دێ تە داغدم تونە روونی! و جارنا ژێ ب گێسکی یان هەر تشتێ بەر دەستی کەتبا دا دناڤ ملا یان ل پشتێ و باڤێن پیادا دەت و دبێژنە ڤی رەوشێ کو دەیك ب ئازرت و ل زارۆکی بدەت یان یێن ب تیڤل بێژیتێ (کەلا دلی شکاندن) و ئەڤ چەندە کو دەیك خوە تێدا کەسەکێ سەرەکی ببینت ب (نفرین) ئەوژی دوعایێن نەیێن چاکن. و نفرینێن د ڤی بابەتی دا مۆرکا دەڤەرێ ل سەرە و ژ ئالیێ زمانی ڤە ژی هەر دەڤۆکا دەڤەرێ یە (دەڤەرا زاخۆ) ، ژ بلی چەند نموونێن کێم کو یێن دەڤەرا بەهدینان ب گشتی نە، کو ب رێکا هەڤالان گەهشتینە من، یان ل سەر زارێ ئەڤیندارا دنێڤ حەیرانوك و لاوك و سترانێن کوردی دا و ب رێکا دەنگێن هونەرمەندێن ناڤدار و کۆچك و دیوانان دا هەنە.

هیچ دەمەکی دایك نە هەڤرك و دل رەشا زارۆکێن

خۆ بوونە، بەلکو بەروڤاژ د پەروەردەکرنا زارۆکێن خۆدا هەرا دلین و خوشتڤیێن وێ بوونە تنێ ڤیانا جەگەری و دلسۆزیێ و کەزەبا وێ زارۆکێن وێنە، لەورا د گۆتارا وێ دا هەر دیارە دەما ب دلینی بان باندکتە زارۆکێن خۆ:

( کورێ من، کچا من، یان: دلێ من .. ئەزگوری، دلێ دایکێ .. بووتە نەمینم).

ل ڤێرە، کریار و نەکرن و نە حەجمین و پر بزاڤی و نەگوهداری و دگەل وەستیانا دایکێ دبنە هۆکارێن سەرەکی ژبۆ تێکدانا رەوشا وێ و گۆتنا پەیڤێن کرێت وەکو تەناکرنا سایکولوژیا دایکێ. لەورا دێ نێرینە گازیێن دەم بۆ دەمی ژدلینیێ بەرەف خوارێ دهێت بۆ زمانەکێ رەق و کرێت ئەگەر د نەحەجمتی بان دا لێ خورت:

- کورێ من، کچا من، دێ روونە سەر خۆ!، کۆرو روینە !، کچا من ب تەبتە!.

- کچێ روونە، هەی فلانێ و.. فلانێ! و پێدا هەرە ژ پەسنێن کرێت و بەلەڤاژ.

وەکی دیار جهێ نفرینان مالە، کۆلانە ، بەر دەریکێن هەڤسویانن و هەر جهێ دەنگێ ژنکا و ئازرینا وان بچتێ دبتە کۆچك و دیوان، چونکە دەما ژنك ل هەڤدو ب ئازرن و بێژن.. تەدیت نفرین فرین بەر پەرێن ئەسمانا و بوویە شەرەنیخ و گۆتنێن ب تیڤل وجڤین ودبیت ببتە شەرو پێکدادان ژی و دا هەڤدو ژکرێتیا و حنگ و پرچ کێشانێ هنجنن سەرا شەرەنیخا زارۆکایە و همزاریا وان .. نهۆ ب شەرن و بێهنەکا دی دگەل هەڤدو نەو هەچکو چوننە...

ژبۆ دەربرینا دایکێ و دل هینکرنێ و گۆتنا نفرینا، دەما د ئازرت و ل زارۆکێ خوە و پێ هەڤسوییا و دبتە شەرەدەڤ و دکەڤیتە دناڤ کۆمەکا گۆتنێن کرێت، هەچکو وان زارۆکا ب سەدا کێترە رابووینە و کریار کرین ونەب دلێ دایکێ .. ئها ل ڤێرە کۆچکا مە یا نفرینا دێ گەرم بت ب وان رۆژانێن ڤۆناغێن سالێن پێنجیان و شێستان و هندی من گوهداری کرن و من بهستی و ژێ خواری .. بەلێ د نێڤ ڤێ کۆما نفریناداں هندەك ئێش و پەسن و جڤاکێ

وی سەردەمی دێ خۆ یا بت. ئەڤەژی هاتییە ژ بەر هەبوونا نەخۆشیێن وی سەردەمی و هەژاریێ و کێم بوونا بیمارکرنێ، لەورا دێ کەچەلیێ و تیفۆ و مەلاریا و سل و چاڤکولی و گەلەکێن دی د نێڤ وان نفریناداں بینین و دەیکێ چەوا بکارئینانە و یان ژبۆ کەشەفرێتیا مرۆڤی د هندەك پەسنادا و کتە نفرین و پەسن ددتە پال وان زارۆکا.

سەرو چاڤ ئالاڤێ نفرینێ بوونە، نەگەهشتنا مراد دیسان ئالیەك دی بوو، و ئێش و هنگافتن وڤەگرتن دەردێ بابەتی بوو دەما دەیك دئازرت و ئاگرێ کوچکێ نفرینا گەرم دکت و هل دکت و پێ نەڤێت نفرین پار ڤە دبن ل پەی بابەت و ئالیێ مە خۆ یاکری:

دەما زارۆك ل سپێدەیا دخەوە و دارابیت وان ژخەو راکت دێ بێژتە وان:

--- فلانۆ، فلانێ، دێ رابە درەنگە، سپێدەیە، رابن دابچن خواندنگەهێ یان رەزی یان دوکانێ و هاری بابێ خۆ بکی، کور ژبێ خیرەتی دێ بێژت: نەشێم، بهێلە بنڤم، خەوا من تێ و پێدا هەرە.. لێ دەیك دێ نەچار بت و ئازرت:

--- دێ رابن هەی گەمارێ چاڤێن وە گرتییۆ..

** دەما سفرێ دا دنن، تەدیت یەکێ ژوانە هەر بلەز خوار و هلنگفت.. دێ دەیك بێژتێ:

--- ما تۆ ژ کۆلبێ رابی!، رزی یۆ، یان: زك مەزنۆ!، ما تو ئاشی، هەردەم تێرکا وی ڤالایە..

--- هەکە گەلەك خوارەبا دا بێژتێ:

سەحکێ ڤرو- ڤرکێن وی، هندی دەها دخووت، چەوا دخووت، چەند گۆرمە میشە! ماشەرە!، چەند عویجە، دێ بێژی عویجێ لێفێ یە[٢].

** دەما دەیك رادبیت و پنییا ب زارۆکی ڤە دنیت، نەخاسم ژ بو سەری و پەسنێن وی.. ژبو کەچەلیێ وسەری دا بێژتێ: جارنا هەڤالا دبەردانێ کەچەلی و ئەڤ بەیتە پێ دگۆتن:

--- کەچەللو ڤایێ- ڤایێ

مێشا مەزن بەردایێ

هەتا دویڤکێ دونیایێ...

** هەکە سەر مەزن بایە، دا بێژتێ: کورۆ هەی سەر

مەزنۆ، یان: سەر گۆم – گۆمەووۆ![3].
هەی سەر گامۆ ختەووۆ!، یان: هەی سەر شوور! (ژبوبێ زراڤی و ترسنۆكی تێ گۆتن). هەی سەر بەر دایۆ ! (ژبو یێ فەلیتەوكولانی تێ گۆتن). هەی سەر كرینكۆ! (ژبو مرۆڤێ بێ وەغەر–چوغر نحس تێ گۆتن).
** جارا دەیكێ ژبێ بێزاری، دا نفرینێ ل زاروكێن خۆ كەتن و بێژتە وان:
- دێ روینە، سەری نەراكی! (ژبێ خیرەتی و خاڤیێ یان جارنا خوە ب نەخۆشیێ خویا دكر و دا بێژت: نەخۆشم، دا چ كارا نەكت وپێ نەرابت .. وەكو درەوەكێ، فێلەكێ ل دەیكێ دكر).
** تەدیت دەیكێ ب (خولیێ) چوو كوری یان كچێ و نفرین ل وان كرن:
- دێ روینە هەی خوەلی سەر ! یان: خۆلی سەرۆ!.
** هەكە كچ بت، دێ دەیك بێژتێ:
--- بەرێ خۆ بدێ، دێ بێژی پیرا مەیە، وەك پیر هەڤیانە!، چەند پیر فنەكە.. (فنك- ساحرە) یان گەلەكا شەهرەزابت، دێ بێژی پیرا فنێ یە[4] (فەنێ یە).
** دەما حرحر- حرحر كریان، دا بێژتە وان:
--- كورۆ (كچێ)، بێ دەنگ بە (كرپە) ؛ هەی گەوری ل تە درهاوۆ (درهایێ).
** تە دیت بو لویرە- لویرا زارۆكی، و دەیكێ لێ ڤەگێرا گوتێ: كورۆ كر بە، ما تۆ گۆری؟!.
یان تەدیت دەیك ل كچێ زڤری و گۆتێ: دێ روینە، هەی خودێ خەفس ل تە كریێ !، یان: دێ هەرە هەی توڤێن وەك تە شین نەبن!، دێ روینە هەی تە خۆ ل قاقۆستێ داوۆ!، دێ روینە هەی نەمما وۆ (نەمایێ).
** دەما بچووكێ نەحەجمتی تشتەك خواستبا و نەدابانێ، دا بێژتێ:
--- روینە سەر خۆ، روینە سەر كوریا خۆ!!.
یا ن: كچ – كورانێ ! تێرمەندۆكێ !.
** دەما بچووك كەتبا و نە تەبتی با یە، دا بێژتێ:
--- دێ روینە هەی پررەشێ! هەی پر رەش، هەشێپێوەرێ (هەشێپێوەرۆ).
--- ژی كورتێ، ژی نەممایێ (نەمماوۆ) بت، هەی ژی رێڤاسێ (رێڤاسۆ)[5].
** دەما كور – كچ د هلنگڤیت و دەڤ و دەڤ ب ئەردی دكەڤت، نفرین ژ دەیكێ بارن:
--- دێ بخۆ هەی ستوو شكەستیێ (شكەستیوۆ).
یان:
--- ئۆ خوەش، تەخار! هەی ستوو خەلیایێ. ما چاڤ ب تەڤە نینن، نابەرێ خۆدی رێكا خوە، ما تۆ كۆری، بەر پێت خۆ نابینی؟!.
** تەدیت كچێ ژ دەیكێ خواست بچیتە سەر ئاڤێ و كەدینی تژی بكت.. تە دیت كچێ بەرسڤ دا:
--- نەشێم .. بلا فلان بچیتێ.. دەیك ژی ب نەرمی دا بێژتێ: كچامن، خۆشكا تە نەخۆشە، نهۆ یا ژبەر بالاڤێ هاتی، هەما تۆ هەرە ..و كچ ژی ب ركمانی ڤە هەر دابێژتێ: نەشێم!.
تەدیت دەیك لێ ئنری و گۆتێ: هەی نەشیانێ تو گرتی، نێ پێنكاڤەكە!.
** جارنا دەیك دا كۆمەكا نفرینان كەتن كو ئەو ژی گرێدای كۆمەلەك ئێش و نەخۆشیانە، مینا دگوت:
--- هەی داملێ تو گرتیێ (گرتییوۆ)، یان: دێ رابە هەی خەمە با یێ تو گرتی!، هەی زەرە بایێ تو گرتی!، هەی فالنجی هاتی تە.. فالنجیێ توگرتی!، كچێ هەی رەشەبایێ تۆ گرتی رەشەبایێ ل تەدای!.
** گەلەك نەحەجمتی بایە، دا بێژتێ: دێ روینە هەی تۆب دل!، یان: هەی تۆپا خودێ ب دلێ تە كەتی! (برویسی یە). كورۆ ما فلفل تە دایە!، ماتە باریت خارە! ما پێتە، ئاگری! ما ئاگر تەدایە.
** جارنا هندەك تایبەتمەندیێن دەڤەركی پەیدابن و دبنە ئالییەك ژ كەلتووری وێ دەڤەرێ، ل زاخۆ هندەك نفرین پشتی كۆچ بەریا جوهی یا بەرەڤ ئسرائیلێ پەیدابوون، جوهییەكێ زاخۆ ب ناڤێ (چینە)، گەلەك هار و گڤر بوو، خەلكی خوە ژێ دكری... ل داویا سالا ١٩٥١ێ دگەل جوهیێن زاخۆ بەرەڤ ئیسرائیلێ ڤە چوو. لێ (چینە) كەتە دناڤ دەڤێ ژنكادا و بووە هێمایەكێ نفرینێن وانە، ئەگەر زارۆكەك ژمال دەركەتبا و گۆتبایە دەیبابا، ئەڤە ئەز

چووم و ناهێمەڤە.. دا دەیك ژ بێزاری و تۆرەیی ڤە بێژتێ:
-- دێ هەرە چوونا (چینە)ی بیت.. نەزڤری ڤە!.
دا بێژتێ: بچی و نەهێیە ڤە!، سەر تل و وێڤە، پشت پەحنێ هرڤە ! و دو بەر ژی د دووڤ دابن..
** یان دا بێژتێ: دێ هەرە چوونا حەسەنێ محۆی بت! (کو تاژیێ وی ل دووڤ کێڤریشکێ ڤە چوو د کۆنێ ڤەو نەشیا ژ کۆنێ دەرکەڤت و تێدا ما هەتا مری).
** جارنا هندەك پەیڤێن نەکوردی (تورکی) دهاتن گۆتن، بۆ نموونە:
--- دێ روینە هەی ئێنکەرچەریێ[٦].
ژبو کورێ کولانا و هەردەم نە ل مال، دابێژتێ:
--- ما تو هەیتەیی! یان: هەیتەیێ کۆلانا، ئانکو فەلیتە (سەربەردای)، دێ روینە هەیلا تە نە دیتیوۆ !
--- نەگەهی چ مرادا، نەگەهی مرادا خوە!.
وەسان گەلەك نفرینێن دی هەنە:
--- دەبلا ڕەق ل ویرێ و نەرابی !، یان: هەی کوراهی ب تە کەتیۆ!، دە بلا پیا بکی جووت! ئانکو ڕەق بی ل ویرێ، کچێ دێ روینە، دێ بێژی تو یا ژکەترا چێبووی !(ژڤەبحەتا).
** جارنا دەیك نفرینەکا ب ترانکی ڤە دگێریت و پەسنا لاوێ خۆ دکت:
--- وەی داوۆ — داوۆ
سەر مەخمەلێ من داوۆ !
** دەما نفرین ب سەرو سیمایی ڤە تێ گۆتن:
--- بەرێ خۆ بدێ چ ئێلچی یە[٧]، ددان چیقۆ[٨].
** ژنفرینێن دەڤەرا مزووریا .. دەما دبێژن:
--- داوۆ ئێشەلا ساڤار د زکێ تەدا گەرم نەبیت!، یان: دێ هەرە ئێشەلا کچکەکا کۆر بکەتە رزقێ تە!.
--- دێ هەرە ئێشەلا کفنێ تە ژ کیستێ خەلکێ بیت!، مالا مە چرا تە بیت[٩].
** تەدیت دەیك ل کچێ ئازری و ئارها: تۆ ل مەهینێ سوار نەبی، یان: کراسێ بویکینیێ ل بەرخۆ نەکی!.
--- تو نەبی یە دادۆك!، هەی کچێ تو نەبیە دەیکا کورا !.

--- هەردەستی، پێنج تلی ژێ بکەڤن! (ئانکو چ پێڤە نەمینن).
یان: هەی ستوو شکەستیێ، تۆ نەبیە خوشکا برا، تۆ دارێ لاندانێ نەهژینی، تۆ نەبیە دەیك، تو سەر دیفکێ خوە شین نەبی، تۆ سەر زینی نە برقی، مالا وە ئاگر ڤێ بکەڤت ، دەردەك تە بگرت دەرد هەبن دەرمان نەبن، تۆ ببی رزقێ هارەکێ (دینەکێ)، هەرۆ شەپێنا وی بت، ئێشەك تە بگرت، دەرمان بەزێ مێریا زەر بت، ئێشەلا تۆ ل مال بابێ کەزیا سپی ڤەهینی، تۆ ب جانیا خوە شاە نەبی!، ئێشەلا سێ ژن ل سەرێن، دەردێ هەویێ تە ب گرت، تۆکا نەعلەتێ ل تەبت، سەری نەراکی، ل وێرێ شین بی، زیلکا بدی، هەی چاڤێن تە د تاری بن، بەرێ خۆ بدێ چەندێ چۆغرە[١٠] دبێژی تووکە، هەیلا تۆ نمایێ (نەمماوۆ)، دێ روینە هەی خوەلی سەرێ، هەش پێوەرێ، خۆدێ چو دیندەها ل دووڤ تە نەئێخت و ... .
** دەیك جارنا ژ زارۆکێ خۆ یێ نەحەجمتی بێزار دبت، تنێ دێ بێژتێ:
--- دێ هەرە خوەزی وێ شەڤێ بابێ تە ل ئاشی بایە، یان: دێ روینە هەی گوگمێ تو گرتی (گرتیۆ).
** جارنا ل سەر سفرا خوارنێ، دەمێ زارو ب لەز دخۆت و هلنگفت، دەیك دێ زڤرت و تەپەکێ لێ دەت:
--- ما شەرە هەشپێوەرۆ، یان: هەی ددفنێنن تەرا دەرکەڤت!، کەررافی[١١] بت ! ، ما دێ رەڤت!.
** دەما ل چوونێ کور یان کچ ب خورتی و بێخیرەتی ل وان دا و سستی بەربوو .. تە دیت دەیکێ گوتە وان:
--- دێ خۆش وەرن، دێ لەز کن .. ببەزن، وە خێرە.
هەی فالنجی[١٢] کەتی پێن وە .. یان فالنجی هوین گرتینۆ!.
** ل دەما خوارن تەدیت دەیك ئازری و نفرین کرن:
-- دێ بخۆ! دێ ددفنێن خۆدا بینەدەر !. لێ دەما دبتە جڤین دا پەیڤێن پیس و چەپەل و کرێت دا بکار هێن.
د نفرینێ دا زارۆ یێن مالێ و کۆلانێ هەڤبەری وێ دەیکێ نکارن بەرسڤێ ب گۆتنێن چەپەل یان چەوت بدن چونکە ژدایکێ یە و دلێ دایکێ پر دلوڤانی تێدا و ناخوازت کرێتی نە ژ بو زارۆێن خوە و هەڤسوییا

ژی .. جارنا دبێژن : نفرین دوعایێن نەبێن چاکن.. لێ ناگەهیتە وی ئاستێ جڤین تێدا.
جارنا هندەك ژنێن دەرۆزڤان، دەما خەلك ژ وان بێزار ببن و چو نەدەتە وان و بێژنێ خۆشکێ خودێ بدت !. تەدیت هندەك ژوان ژنا ئەزمان رەشن و ب کرێتی بەرسڤا مرۆڤان ددن:
هەی خۆدێ نە دتە تە! یان: چ مرۆڤەك قەلس و گرتییە، چ پیسە!.
ئەرێ ئەڤ جۆرە نفرین و دوعایێن خراب ژ زار دەڤێ هنەك ژنێن زمان رەش ئەنجامێن خراب هەنە و مرۆڤ باوەریێ ب ڤان رەوشت و تیتالا د ئینیت؟ لەورا هنەك مرۆڤ هەنە باوەریێ ب نفرینێن هندەك ژنکا هەنە و د گێرن کو ئەو دوعایا خراب بجە هاتیە و چێ بوویە .. هنەك ژی باوەری ب سەرو سیمایێ ژنێ، مێری هەیە و هزر دکن یێ وان ببینت و ل دانێ سپێدەییا بۆ جارا یەکێ دێ هزر کت کو [خێرێ نابینت ].. یان نفرینا کری ب ئەنجامن و چێ بوویە ب سەرێ وان کەسا هاتیە دەما نفرین ژێ خارین..
--- جارنا دبێژت: ئەڤ ژنە چاڤ هاڤێژە..
--- د گێرن کو کەس هەبونە نێربانا جوانەکێ، یان فرندەکێ و پێ سەر سورمای بایە دا بێژت:
پەح ! پەی ! چەند جوانە ! چەند لێکدایە!.
چەند ەژنەکا سپەهی هەیە ! و پێدا هەرە ژ پەسنا.. و دگ[illegible] کو ئەو دوعا و نفرین ئێکسەر بوویە ئەگەرێ دەرد و بەلایێ و دەردەك هاتییە سەرێ مروڤێ پێ گوتی و نفرین لێکری. ڤێجا، یێ باوەری پێ هەبایا، تە دیت ئەو کەساتی بوویە هێمایێ نفرینا و خەلکێ خوە ژێ دکری و ددایە پاش و نەدنێرینێ و مالا دەرگەهێن ل بەر دگرتن تاکو چاڤێ وی/وێ ب ناڤمالێ نەکەڤت.. نەکو مالباتێ یان ناڤمالیێ چاڤین بکت و دەردەك بێتە سەرێ وان. نەخاسم ژنکا و کچکا خوە ژ هندەك ژنکا ددایە پاش.. یان چاڤ هاڤێژە یان نفرینێن وێ و دوعایێن چێ دبن و دبنە دەردو وئێش. دەما کچەك دگەل خۆ بایە و ژنەکا وەلو چاڤ هاڤێژ دیتبا، تە دیت کچێ گۆتە دەیکا خۆ وەرە دبن عەبایی ڤە دا تە نە بینت و چاڤین بکت. یان دوعا و نفرینا ل تە بکت و خرابیێ بگەهینتە تە. ل ڤێرە راستی و نەوەیی تەڤلی ئێك دبن .. خەلکێ سادە وەلۆ باوەر دکن و بوویە دیاردەك باوەری پێکرنێ و رەوشتەك دناڤ مللەتێ دا.
لەورا ژن دچوونە دبوارێ ئایینی دا و ب خواندنا قورئانێ و ئایەتێن تێدا ژبۆ پاراستن ژ نفرین و چاڤ هاڤێژییا وان جۆرە مرۆڤان:
دبێژن مێرەك هەبوو و دەما چاڤێن وی ب گیاندارەکی رند کەتبا ب دا بێژت: پەی ! چەندا رندە یان خرنکە ! ئێکسەر ئەو گیانەوەر رەق دبوو کەتە وێرێ، دبێژن ئەوی چاڤەك و نفرینەك لێکر.

## نفرینێن ئەڤینداران:

دکەلتوورێ زارەکی یێ کوردان دا بابەتێ نفرین خوە تێدا دبینت ب تایبەت دنێڤ ئەڤینداارادا، چاخی ئەڤینی دگەهیتە پلەیەك گەرم لەورا کچ ل پەی کورێ دچت کا وی چ یارك نینن و دکەڤیتە گومانێ، ئەڤجا ب لۆراندن و سترین ڤە پترتر دچنە دنێڤ کەلا وێ ئەڤینا ددلێ واندا، کچك ناخوازت ئەڤینا وێ چ یارك هەبن، لەورا دسترانا کوردی دا، نەخاسم دحەیرانۆکا دا ئەڤ دان و ستاندنە د وێنەیێن جوان و کرنت دا دزۆرن و ئەڤە هندەك نموونەیێن وان نفرینا دنێڤ لاوك و حەیرانۆکێن کوردی دا:
هەی پۆرا سەرێ تە وەریایێ !
هەی پۆر کورێ !
--- دەما بشارێ چەتۆ بانی عەمێ گۆزێ دکە و دبێژت:
* کولا خودێ ب مالا بابێ تە بکەڤت
تە مەجیدێ برایێ من وێ کوشتی یە [١٣] (سترانێن گەلێری).
--- جارنا تەڤز و ترانە و یاری خوە دنێڤ نفرینێ دا دبینت وەکی ڤێ حەیرانۆکێ:
* هەرێ حەیرانۆ هەرو شتی – شتی
تە قوون دیاروۆ ، پانی کەلشتی
من سەد حەیف و موخابنی وێ کچێ ژڤانی تە روینشتی [١٤] (سترانا لێریکی، بپ٤٧).
* بەژنا تەووۆ خۆخکا خەملاندی
باکەك هاتو بەلگ ژێ وەراندی

ئیشەللا خودێ مالا سەبەب و سەبەبکارا
ژنك قەتاندی[١٥] (سترانا لیریکی ، بپ٤١)
* ئەڤینی چ ئەڤینی
ب دار و بەرا بکەڤی
ئیشەللا چ کەسێ ل ما بەینا منۆ
بەژنا بلند باخڤیت:
عەزیزێ ژ هەمیا عەزیزتر ل مالێ
تو ب هەلینی[١٦] (سترانا لیریکی، بپ ٣٥)
* کوڕکۆ دینۆ نیڤە – نیڤە
تو قەرەچی، مۆخل ب ملی ڤە
ئەگەر تە ئەز نەڤێم،
ژ یێن کەری ڤە [١٧] (سترانا لیرکی، بپ ٢١)
* (ئیشەللا چی کەسێ ما بەینا من و بەژنا بلند
چاڤێن رەش بەلەك،
ئەنیا کال و کەڤەر باخڤیت،
ئەز دل نادم چ نفرینا لێ بکەم،
بۆ خاترا نەبیێ خودێ و ئومەتێ،
ئاخلیڤێ لێ بمریت شڤانێ پەزی
چریا ئەول
لێ بمریت هەردو گاکێن جووتی[١٨] (حەیرانۆکێت کوردی، بپ ٢٣٩)
* (مالا بابێ تە ل سەرێ گری
شکەلکەکێ خۆلیێ من پێوەر کری
هەرە، من گرتی تو یامری[١٩] (حەیرانوکێت کوردی، بپ ٢٣٥)
*((بابکێ منۆخێرا بکی، خێرێ نەبینی
هەفت طغارێت دەخلی بچینی
ئێکێ ئاخێ و
ئێکێ زیوانێ ژێ ب هەلینی
ببیە پرا (زاخۆ) کا شەوتی،
دەیندار رێکا تە بگرن
وی ژی ژتە بستینی[٢٠] (حەیرانوکێت کوردی، بپ ١٩٦)
*(( مالکێت مە، ل بەرە ژێرە
تۆ کەرەمکە وەرە ڤێرە
خەبەرەکی بۆ تە بێژم
ل تە بمرت ژنە، ل من بمرت مێرە
هەچیێ فەسادیێ ل ناڤبەینا مەدا بکت:
نەدانتە سەر رانکێ خۆ
وە لە دێ نێرە... [٢١] (حەیرانوکێت کوردی، ٣٢٢)
** تاخا ژووری تەنیر دادا
تاخا ژێری روحان ئاڤدا
ئیشەللا چ کەسێ بکەڤیتە
ناڤبەرا دو دلا دا،
نەگەهیتە چ مەخسەدا
چ مرادا !! [٢٢] (حەیرانوکێت کوردی، بپ ٦٣٩)
** ئێڤارە درەنگە رۆژ چوو ئاڤا
تە قەلەمێ رەشە
باسکێ چاڤا،
ئیشەللا هندی ئەز کچ بم !
دمالا بابێ خۆدا
تو نەبیە زاڤا... [٢٣]!! (حەیرانوکێت کوردی، بپ ٩٢٧)
* (ئەز دارەك و تۆ دارەك
تە چەوا سەر منرگرتوو
کەڤنە یارەك
هەکە ژمن چێتر نەبیت
پێڤە بدن هەفت دوپشك و
کۆرە مارەك..!![٢٤] (حەیرانوکێت کوردی، بپ ٢٥٩)
*(( کچکێ دینێ مالا بابێ تە
چەنگەکێ خۆلیێ
دگەل هەشێ من پێ وەرکری،
ئەزێ وەسانم
هەر وەکی هەفت سالە
تو یا مری ...!! [٢٥] (حەیرانوکێت کوردی، بپ ٢٤٤)

# هندەك داب و نەریتێن كوردان ل دەڤەرا بەهدینان

محەمەد حەسەن بناڤی

هەلبەت هەر مللەتەكی داب و نەریتێن خۆ هەنە، ل ڤێرە دێ هندەك ژ وان چەند داب و نەریتان یێن ل دەڤەرا بەهدینان، ئانكو ل پارێزگەها دهۆكێ ل كاربوون بەرچاڤكەین، كو نها هندەك هندەك ژێ بەرەڤ كێمیێ و نەمانێ دچن و هندەك ژی هێژ ماینە و چەند گوهۆرین ل دووڤ كاودانی و پێشكەتنێ و سەروبەرێ رۆژێ ب سەردا هاتینە، ژ وان داب و نەریتان ژێ:

## رەمەزان:

گاڤا كو مەها شەعبانێ ب داوی هات، یان ژی بەرەڤ داویێ دچوو، خەلكێ باژێر و گوندێن كوردستانێ دچوونە جهێن بلند و بەرێ خۆ ددانە هەیڤێ كا دێ هەیڤا نوو بینن یان نە؟ ئەگەر دیتبان بێ گومان دا بریار هێتەدان كو سوباهی، یان رۆژا دی رەمەزانە و دگەل وێ بریارێ خەلك دا ل سەرێ رەمەزانێ باشترین و خۆشترین خوارنێ بۆ پاشیڤێ چێكەن، هەر مالەكێ ئەو خوارنا چێدكرن، هندەك ژێ بۆ مالێن جیران و دەوروبەرێن خۆ ژی دبرن و یێ بەرامبەر ژی ئەو خوارن ب كەیف خۆشی وەردگرتن و مینا رۆژا جەژن لێ دهات.

ل رەمەزانێ خەلك شەڤانە دچوونە مزگەفتێ و نڤێژێن خۆ ب كۆم (جماعەت) و تەراویح دكرن و گەلەك ژ وان ل سەرێ رەمەزانێ هەتا داویا ڤێ مەهێ ل مزگەفتێ د مان و قورئان د خواندن هەتا مەلای كبارە دكر و خەلك دا رابنە پاشیڤان. ئەڤ كەسێن د مانە ل مزگەفتان گەلەك جاران ب خواندنێ ڤە عاجز دبوون و دوەستیان، لەورا هندە جاران دا یاریان ژی كەن و هندەك ژی دنڤستن، و ئەوێن د مانە هشیار ئەوێن دخەو رادكرن و د ترساندن، گەلەك جاران دەڤێن یێن نڤستی ب لسقەكێ، یان ب پاتا دگرتن و ب شویتكا وان د هلكێشان و ب بەركوژێركانڤە (ب گاریتاڤە) ئاسێ دكرن، ئەگەر هشیار نەببان دا هشیاركەن و بێژنێ:

- (**رابە كانێ تۆ ل كیڤەی، تۆ ل عەردی یان ل عەسمانی**؟!).

ئەو ژی هشیار دبوو، و ژبەر كو یێ گرێدای و هلاویستی بوو نەدشیا چ بكەت، ڤێجار دا هندە ئاخفتنێن زڤر و نەخۆش بێژیتێ، ئەوان ژی یاری پێ دكرن و دكرنە كەنی، پاشی دا ژ وێرێ ڤەكەن و ئیننە خوارێ و بێژنێ:

- (**هەر رۆژەكا تۆ بنڤی دێ حالێ تە ئەڤە بیت**).

هەژی گۆتنێ یە كەسەك ژ ڤێ كریارێ تۆرە نەدبوو، وەسان گەلەك یاریێن ژ ڤی جۆری د ڤێ مەهێ دا دهاتنەكرن. دیسان خەلكێ گوندی یان رەندەكێ،

ئەگەر هاڤین، یان پاییز با ڤێقی، مینا تری و هژیر و سێڤ و حولیك و مژمژە و...هتد بۆ وان كەسان دبرن یێن دمانە ل مزگەفتێ، لێ ئەگەر زڤستان، یان ژی بهار با باراپتر گویز و مێویژ و كتك و سەوكێن هەژیران و...هتد بۆ دبرن و ب ڤێ چەندێ بەهرا خۆ د خێرا وان دئێخست.
پشتی كبارە دهاتە كرن، هەر ئێك دا قەستا مالا خۆ كەت و چیتە مال و مالا خۆ و هەر مالەكا ل سەر رێكا وان كو نەرابووین بۆ پاشیڤێ هشیار كەن.
گاڤا رەمـەزان ژ نیڤێ دبـووری، یان هندە جاران ل سەرێ رەمەزانێ ژی خەلكی یاریا (فەرمۆشانێ) دكر. ئەڤ یاری یە دناڤبەرا دو یاریكەران دا بوو، یا وەسا بوو پشتی هەستیكێ سینگێ مریشكێ، كو مینا داركێ قۆسكێ یە و هەر ئێك لایەكی دگریت ب هەڤرا دشكێنن، ئێدی پشتی هینگێ گاڤا یاریكەرەكی گازی یێ دی كربا، د ڤیا یێ دی ل بیرێ بیت و نە بێژیێ (بەلێ)، یان (ئا، ئە)، چونكی هەر گاڤا وەگۆتبا، هەڤركێ بەرامبەری وی دا بێژیتێ:
- (**فەرمۆش من ژ نە بر**).
لێ ئەگەر ل بیرێ بی ت و بێژیتێ «بیرا من دهێت»، یێ دی خۆ بێ دەنگ دكر، كەواتە ژێ نەبر. یان ل هندە جاران ژی ئەڤ یاری یە وەسان دهێتە كرن كو ئێك تشتەكی بدەتە ڤ یێ بەرامبەری خۆ و ئەگەر ژێ وەرگرت ئەڤە دۆرا، لێ ئەگەر گۆت(یێ ل بیرا من) ئەڤە ژێ نەبر.
هەژی ئاماژێیە كو ئەڤ یاری یە بەهرا پتر سەرا هێكا دهاتەكرن و ڤیابا رۆژا جەژن ئەو هێك دابانێ.
گاڤا رەمـەزان بەرەڤ داویێ دچوو، خەلكی فترە (زكاة الفطر) ل دووڤ مەرج و رێو رەسمێن فتران د ئیسلامێدا دادان و فەر بوو ل پێشی جەژنێ هاتبانەدان و هەر ئێكی ل دووڤ هژمارا كەسێن ئەو ژ خودانكرنا وان بەرپرس و ل دووڤ برا دیاركری بۆ فتران دان، ژ برنج و گەنم و ئار و مێویژ و قەسپ و پارە و كەشك و...هتد و وەسان ل جەژنێ نەدما بێ پێخوارن.
ئەگەر چ دبیت جیاوازیا رەمەزانێ دناڤبەرا گوند و باژێران گەلەك نەبیت، لێ ل باژێران باراپتر بۆ هشیاربوونا خەلكی بۆ پاشیڤێ دەهۆلقوت كۆلان كۆلان دگەریا و خەلك ژ خەو هشیار دكرن و گەلەك جاران ل وێ نیڤ شەڤێ زارۆك ب دووڤ دكەتن و دگەل وی دگەریان و ل بەری جەژنێ، وی دەهۆلقوتی فترە ل دووڤ حەزا خودانی بەرامبەری كارێ خۆ وەردگرتن.

## هەردو جەژنێن حەجیا و رەمەزانێ:

دەما هەیڤ دهاتە دیتن دبوو جەژن (عەید)، ل وێ شەڤێ (تەراویح) نەدهاتنەكرن، گاڤا بانگێ عەیشا ددا، یان پشتی بانگی (تەكبیر- كەلیمە) ددان و ئەو ژی ب ڤی رەنگی یە:
« الله اكبر، الله اكبر، الله اكبر، لا اله الا الله، والله اكبر، الله اكبر، ولله الحمد».
ئەڤ چەندە ژی بۆ خەلكی دیار دبوو كو جەژنە، ب تایبەت ئەگەر هەیڤا رەمەزانێ (٢٩) رۆژبان، چونكی ئەگەر (٣٠) رۆژ بان گومان تێدا نەبوو، ڤێجا خەلكی و ب تایبەت ژنكان كاروبارێ جەژنێ دكرن و زارۆكێن خۆ ژ گشت لایانڤە راست دئێخستن.
ل شەڤا جەژن خەنا دهاتە ترشكرن و شێلان، و ل دەمێ نڤستنا ددەستێن زارۆكان ددان و دا كو جلك و نڤین پیس نەبان ب پاتەكی دهاتنە گرێدان، هەتا ئەو خەنا ب دەستێن وانڤە زها و هشك دبوو، پاشی ل سپێدێ ل رۆژا جەژن دەستێن خۆ دشویشتن، یان ژی دمانە هشیار و گاڤا دەستێن وان زها دبوون دا شۆن و ژ نوو نڤن... هەژی ئاماژێیە ل بەرێ گەلەك مەزنان ژی ئەو خەنا ددەستێن خۆ ددان، لێ نە وەكی بچویكان، بەلكو هەر بتنێ تلەك، یان دو تل خەنا دكرن و دگۆتن (سونەتا جەژنێ) یە. ل سپێدەهیا جەژنێ ژی هندی ژ خەلكی دهات سەرێن خۆ دشویشتن و دچوونە نڤێژا جەژنێ و پشتی دزڤرین، كۆم كۆم دچوونە مالێن ئێك و دو جەژنا ئێك و دو پیرۆز دكرن و هەر زەلامێن چەند مالەكان ل مالەكێ تێشت دخوارن، ئەڤ ڤان مالان ژی چ ل گوندان و چ ل باژێران خۆشترین خوارن بۆ تێشتا جەژنێ ئامادەدكرن، دگەل خۆشاڤێ و ئەو خوارن ل گەلەك دەڤەرا ل ناڤ مال یا بەرهەڤ بوو،

ئەو کەسێن دچوونە جەژنێ ژی یێ دلێ وی چووبایێ د چوو دخوار، ل گەلەك دەڤەرێن دی ژی خوارن نەددانانە ناڤ مالێ، بەلکی ئەگەر خەلك چووبانە جەژنێ و روینشتبان ژنوو خوارن ددانانە بەر، هەژی گۆتنییە ل ڤان دوماهییان خوارن نەدهاتە دانان هەتا نەهاتبا داخوازکرن. پشتی سەروبەرێ ژیانێ هاتییە گوهارتن، ئێدی خۆشاڤ ژی نەدهاتە چێکرن، بەلکی ل شوینا وان شەربەت و جۆرێن شرینـاهییان جهێن وان گرتن. دیسان ل ڤان جەژنان شەکرۆك و چکلێت و جگارە دهاتنە پێشکێشکرن، هەر چەندە جگارە د زیانبەخشن چونکی پتریا خەلکی جگارکێش بوون دهاتنە پێشکێشکرن و نها پێشکێشکرنا جگاران گەلەك کێم بووینە، یان دشێن بێژین نەماینە و د ڤان رۆژێن جەژناندا گەلەك جاران زارۆك فێری جگارە کێشانێ دبوون. هەروەسان ل جەژنان کادێن مەزن ژی دهاتنە چێکرن و نافکا وان روینێ خۆمالی بوو، لێ نها ئەو ژی هاتینە گوهارتن و کادێن بچویك چێدکەن ب نافکێن جودا جودا، مینا ئارخافك و گویز و گویزا هندێ و کونجی و خورمێ و...هتد.

بۆ جەژنان، چ یا حەجیا (قوربانێ) و چ ژی یا رەمەزانێ هێك ژی دهاتنە کەلاندن و رەنگکرن، دەمێ زارۆك ل جەژنان دگەریان، ئەڤ هێکە ددانێ و زارۆکان ژی هەر ئێکی زەرفەك، یان ئامانەك ڤێبوو و تشتێن خۆ دکرنە دناڤدا و چونکی ل جەژنان هێك دمشە بوون، یاریا هێکانێ ژی ژ لایێ بچویك و مەزنانڤە مشە دهاتە کرن و هەر ئێکی هێکەك هەلدگرت و ل هێکا ئێکێ دی ددا، هێکا کێ شکەستبا ئەو دهاتە دووراندن و هێکا خۆ ددایێ و هندەك هێك گەلەك د موکم بوون و ب ساناهی نەدهاتنە شکاندن گەلەك هێك پێ دبرن[1].

ڤان جەژنان بچویك و مەزن دگەریان، هەتا گوند هەمی خلاس کریان و ئەگەر بازێریان، ل جەژنێن رەندەکا خۆ و جیران و کەس و کارێن خۆ هەمیان دگەریان و جەژنێن وان پیرۆزدکرن. پشتی ژ جەژنان ب داوی دهاتن، زەلام ل ناڤ گوندی ڤێك دکەتن و یاری و ترانە دکرن، زارۆ ژی دچوون هێسکێ، هەر زارۆیەکی، یان چەند زارۆیان پێکڤە وەریسەك د برن و دچوونە پشدارەکێ و وەریسێ خۆ پێڤە دکرن و خۆ تێدا داددان، هەتا دبوو نیڤرۆ، هندەکان ب تنێ خۆ ددادان و هندەکان ژی هەڤپشك، کو دەپەکێ درێژ ل شوینا دارەکی ب وەریسی ڤە ئاسێ دکرن، ئێك دنیڤەکێ دا و دو دچوونە رەخا و دهاتنە دادان و ستران دبەررا دهاتنە گۆتن و دگۆتنە ڤێ هێسکێ (هێسکا داری).

گەلەك جاران هندی زارۆکان خۆ د ڤان هێسکاندا دادان، گێژ دبوون و رەنگێ وان پێتی دبوو، ئێدی خۆ نەددادان و وەریسێن خۆ ڤەدکرن و قەستا مال دکرن هەتا چێببنەڤە.

وەکی دیار د کوردستانێ دا گەلەك ئایین، مینا فەلە و ئێزدی و موسلمان ب هەڤرا دژین و گوندێن هەڤپشك هەبوون و هەتا نها ژی هەر هەنە، لەوما ئەو ژی پشکداری جەژنێن ئێك دبن و دچنە مالێن ئێك و جەژنا هەڤدو پیرۆز دکەن.

## جەژنا نەورۆزێ:

جەژنا نەورۆزێ جەژنا مللی و نەتەوەیی یا کوردانە، نەورۆز دکەڤیتە سەرێ بهارێ و دبیتە سەرسالا کوردی، ل ٢١ ئادارا سالا زایینی دەست پێدکەت، گەلێ کورد هەر سال ل ڤێ رۆژێ ئاهەنگ دگێران و دچوونە چۆل و بەیاران، گەشت و سەیرانێن خۆش دگێران و ئەڤ رۆژە ببوو رۆژا بەرخودانێ، ب تایبەت پشتی هەستێن نەتەوایەتی خورت بووین و پشتی بزاڤێن رزگاریخوازێن کورد پەیدابوون و سەرهلداین، سالانە ل کوردستانێ نەورۆزان خۆنیشادان چێدبوون و خەلکی نەرازیبوونێن خۆ دژی داگیرکەران دیاردکرن، ب تایبەت تەخێن گەنج و خویندکاران و گەلەك ل سەر وان چەندان دهاتنە گرتن و ئەشکەنجەدان و سێدارەدان ژی.

ل نەورۆزێ داوەت و شاهی دهاتنە گێران و شانۆگەری دهاتنە پێشکێشکرن، ب تایبەت شانۆیا (کاوەیێ ئاسنگەر)، ل بەرێ ل سەرانسەری کوردستانێ دهاتە نمایشکرن و ل نها خەلك ئازادانەتر ڤان ئاهەنگ و شەهیانان دگێرن و ئەو رۆژ بێن بووینە بێهنڤەدانێن فەرمی ل هەرێما کوردستانێ.

## مێهڤانی و مێهڤانداری:

كورد ب شێوەیەكێ گشتی مێهڤان حەوینن و حەز ژ مێهڤانان دكەن، ل دەمێن بووری وەكی نها نەبوو، كوردستان یا ئاڤابوو و بەهرا پتریا خەلكێ دەڤەرێ ل گوندان دژیان و كاروان دهاتنە كرن و هەر دەڤەرەكێ متایێ خۆ دبرە دەڤەرەكا دی دفرۆت و پارە یان متایەكێ دی یێ ئەو پێدڤی دئینا، و ڤان كاروانان چەند رۆژەكان ڤەدكێشان، لەورا ب نەچاری قەستا هندەك مالان دكرن و دگۆتنێ:

(هوین مێهڤانان دحەوینن؟؟)، خودانێ مالێ ژی ئەگەر جهـ هەبایە دا بێژیتێ: (مێهڤان مێهڤانێن خودێنە، كەرەمكەن هوین ل سەر چاڤان هاتن)، مێهڤانی ئەگەر دەوار دگەل نەبایە دا چیتە ژوور و روینتە خوارێ، لێ ئەگەر دەوار دگەل بایە دا بارێ دەوارێ هاڤێتە (دانیتە) جهەكی و دەوارێ خۆ شەلینت، سەرجل و بەریشت و كورتانی ژێكەت و خودانێ مالێ ل جهەكی گرێددا، یان ژی دبر دكرە د گۆڤێ ڤە و دهاتە دەڤ مێهڤانی دروینشتە خوار و پێكڤە دئاخفتن و گەلەك جاران ئەگەر زەلامێ مالێ ل مال نەبا ژنكێ مێهڤان دحەواندن و ددانە رێ، دەمێ مێهڤانداریێ ژی رێزەكا مەزن لێدگرت و ل بەر خزمەتا وی رادوەستان، هەر ئێكی ل دووڤ حالێ خۆ یێ ئابووری باشترین خوارن بۆ چێدكرن و گاڤا زاد ژی دانابانە بەر، خودانێ مالێ ئەگەر یێ تێر ژی با خوارن دگەل دخوار دا مێهڤان شەرم نەكەت و نەدبوو خودانێ مالێ بەری مێهڤانی ل سەر خوارنێ رابیت و هەر خۆ مژوول دكر هەتا مێهڤانی تێر دخوار. كوردان وەسان هزر دكر كو خوارنا وان یان تشتێ وان ب مێهڤانان كێم نابیت، لەورا دكەڤن دا دهاتە گۆتن: (رسقێ مێهڤانی یێ دگەل مێهڤانی). پشتی زاد خوارنێ ئەگەر شەڤبایە، خەلكێ دەوروبەرێن وێ مالا مێهڤان لێ، ب تایبەت زەلام دچوونە دەڤ ب گوندی ڤە، یان بۆ شەڤبێرێ، ئێكێ ژ وان زەلامان دگۆتە مێهڤانی (دڤێت تۆ گیسكێ خۆ بدەی) و سەبرێ مە بینی، ڤێجار چ سترانانان بێژیت، یان چیرۆك و سەرهاتیان. ل وی دەمی مێهڤان یێ نەچار بوو ئەگەر ستران زانیبان دگۆتن، یان ژی ئەگەر چیرۆك و زانیبان دگۆتن و دیوان كەرِ دبوو و گوهداریا مێهڤانی دكرن. هندەك جاران وەسان چێدبوو كو مێهڤان یێ شەرمین بوو، یان چیرۆك و ستران نەدزانین، لەورا دیوان دشاریا و ئاخفتن و سوحبەتان ل ناڤبەرا مێهڤان و خودانێ مالێ، یان ژی خەلكی دەست پێدكر. گەلەك جاران وەسان چێدبوو خودانێ مالێ، یان ئێكی ژ وان زەلامێن ل دەڤ چیرۆكەك، یان سترانەك دگۆت و شەڤبێریا خۆ هەتا دەمێ نڤستنێ دكرن و پشتی سپێدێ مێهڤان دچوو سەر رێكا خۆ.

## مزگەفت:

ژبەر كو كورد ئێك ژ نەتەوەیێن موسلمانە، لەورا مزگەفتان ل جەم كوردان ب گشتی و هەر دكەڤن دا جهەكێ پیرۆزە و تایبەت یێ هەی، مزگەفت ژبلی كو جهێ خوداپەرێسیێ و نڤێژا بوویە، جهێ كومبوون و تشتێن گرنگ ژی بوویە، هەروەسان جهێ ئاگەهداركرن و راگەهاندنێن گشتی و یێن ب پەروەردەیی ژی بوویە كو پەیوەندی ب بەرژەوەندیا گشتیڤە هەی، دیسان جهێ فێركرن و پەروەردەكرنا زارۆكان ژی بوویە، هەروەسان جهێ بریاردان و بریار وەرگرتنا پرسێن چارەنڤیسساز ژی بوو و جهێ كۆمبوونا جڤاتا گوند و ئاڤاهیانبوو ل سەر گشت مەسەلێن پەیوەندی ب خەلكێ گوندی یان رەندەكانڤە هەبین، مینا گرتنا كەراخان و ل گوندێن ئاڤی و گرتنا شڤان و گاڤانێن گوندی و كرنا قەولی... هتد.

هەر گوندەكی مزگەفتەك یان پتر لێ هەبوون و هەر خەلكێ گوندی بخۆ عەرد بۆ مزگەفتێ تەرخان دكرن و ل سەر كیستێ خۆ ئاڤادكرن هەر مزگەفتنەكێ مەلایەك بۆ دگرت، هەژی گۆتنێ یە هەر مزگەفتەكێ ل هەر گوندەكی مولك و زەڤی و زارێن خۆ هەبوون، ئەو زەڤی و ئەرد چ دێمی با یان ئاڤی، ژ لایێ هندەك كەسێن خەلكێ گوندی بخۆ دهاتنە سەخبێركرن و شینكرن، ڤێجار چ دەرامەتێ لێ هاتبا شینكرن،

بەرهەمێ وان دفرۆتن و ئەو پارێ پێ دهات، نیڤەك بۆ مزگەفتێ بوو و یێ دی بۆ وی کەسی بوو یێ شیندکر و ئەو پارە ل نك کەسەکێ جهێ باوەریێ دهاتە هەلگرتن و بارا پتر ئەو کەس موختارێ گوندی بوو، دەمێ مزگەفت دهاتە ئاڤاکرن گوندییان، ئەگەر باژێر با خەلکێ رەندەکێ بۆ خێرا خۆ بێ بەرامبەر ل سەر کاردکرن، بۆ نموونە کارێ بەر برینێ و کێشانا بەرا و ئاڤاکرنێ و هەلاشکرنێ و ئاخبانکرنێ، هەمی خەلکێ گوندی ب زبارە و بێ بەرامبەر دکرن و ئەگەر تشتەك ب پارە هاتبا کرین، ئەو پارە ژ پارێ مزگەفتێ دهاتە راکرن، دیسان ئەگەر ناڤمالییەك بۆ مزگەفتێ هاتبا کرین و مزگەفت پێ رائێخستبان، هەر ژ وان پارا رادکرن. دیسان ئەگەر مزگەفت یا دەولەمەند با و گەلەك پارە هەبان، ب وی پارەی مەلا ژی بۆ گوندی دگرتن و ئەگەر ئەو پارە تێرا نەکربان، پارێ مەلای سالانە، یان ژی هەیڤانە ل سەر گوندی دهاتە بێشکرن و گوندییان ژ نك خۆ ددان.

هەژی گۆتنێ یە کو هەر مزگەفتنەکێ کەسەك هەبوو سەرەگوهییا وێ دکر و ب خزمەتا وێ رادبوو دگۆتنێ (مجێور)، پارێ وی ژی هەر ژ پارێ مزگەفتێ دهاتەدان، کارێ وی ژی ئەو بوو مزگەفت پاقژ دکر و سۆپا وێ هەلدکر و دار بۆ دهینان و قەددکرن و بانێ مزگەفتێ ژ بەفرێ دمالشت و کا دکر و دگێرا و ڤی کاری ژ پاییزێ و هەتا بهارێ، یان سال ب سال ڤەدکێشا و هندە جاران بۆ چەند سالان ل سەر ئێك هەر ئێك مجێور دهاتەگرتن و هندە جاران ژی هەر سالێ ئێك دهاتەگرتن، هەژی گۆتنێ یە ئێزدییان ژی (مجێور) هەر ب ڤێ واتایێ یێن هەین، کو ئەو ژی سەرەگوهییا قوبێن خاسێن ئێزدییان دکەن[2]، دیسان دێر و کنیشتەیان ژی هندە کەس هەبوون سەرەگوهییا وان دکر و سەخبێری ژێ دکرن، هەر ژ پاقژیێ و هەتا مالشتنێ و گێرانا بانی و ب کارێن وان رادبوون و ڤان کەسان ژی ل نك وان ناڤێن تایبەت هەبوون.

کـوردان ژبەر پیرۆزییا مزگەفتان بلند رادگرتن و نەدهێلان کەس چ زیانان بگەهینتێ، وەکی دیار ل بەرێ خواندنگەهێن فەرمی نەبوون کو خەلك بۆ فێرکرنێ زارۆکێن خۆ فرێکەنێ، لەورا فرێدکرنە مزگەفتان و مەلای دەرس دگۆتنێ... هەر ژ ئەلیفبێتکا و هەتا قورئانا پیرۆز (ختم) دکرن، پشتی قورئانێ گەلەکان پێ چێ نەدبوون و خواندنا خۆ دهێلان، ئەو مزگەفتێن مەلایێن باش لێ هەبان و ئیجازا مەلاتیێ وەرگرتی، هندەك ژ زارۆکێن گوندی دمانە ل دەڤ و بەردەوامی ب خواندنا خۆ ددان هەتا چەند کتێبەکێن دینی و مەلاتیێ ب دەرسینی دخواندن، ئەو مزگەفتێن مەلایێن باش مەلاتی لێ دکر، (فەقی- فەقە) ژ گوندێن دەوروبەر و دەڤەرێن کوردستانێ ژی بۆ خواندنێ قەست دکرنێ، واتە مزگەفت جهێ فێرکرنێ و زانینێ بوو و ب رۆلێ خواندنگەهێ رادبوو، هەژی ئاماژێ یە ئەو زارۆکێن دچوونە بەرفەقیاتیێ چ دگەل خۆ نەدبرن و ب هیڤیا گوندییان ڤەبوون و گوندییان ژی رۆژانە خوارنا وان ددانێ و هەر مالەکێ رۆژەکێ خوارن بۆ دبر، کو دگۆتنێ (راتبێ فەقا)، لێ ئەگەر ئەو فەقیێن چووینە وی گوندی دۆست و هەڤال و نیاس هەبان دچوونە وان مالان و وان سەخبێری و چاڤدێرییا وان دکر، لێ گەلەك جاران فەقی د زۆر بوون، وەسان گوندییان خانیيەك ددانە ڤێ و خوارن ژی ژ لایێ گوندییان ڤە بۆ دچوو، لێ ئەگەر خواندنگەها دینی لێ هەبا، هەر وێ خواندنگەهێ سەرەگوهییا وان دکر و وەکی دیار گەلەك خواندنگەهێن ژ ڤی جۆری ل دەڤەرا بەهدینان هەبوون، مینا (قوبەهان ل ئامێدیێ، شەرانش، مایێ، کێستە و...هتد).

ئیجازا مەلاتیێ ژی نە یا ب ساناهی بوو و هەمی مەلا نەدشیان بدەن، دڤیا ئەو مەلایێ ئیجازێ بدەت یێ دەولەمەند و هەییبا، چونکی داب و نەریت د وەسا بوون، هەر مەلایەکێ ئیجازە دا با فەقەکی، دڤیا ئەو فەقە ژ لایێ مەلای ڤە هاتبا کارکرن، ژ شمی (پێلاڤ) هەتا کومی و جل و بەرگ بۆ کربان، ئەو مەلایێن ئیجازە ددان، یان ئەوێن ئیجازە وەردگرتن دگۆتنێ (مەلایێ دووازدە علم). دەمێ فەقەی هەر قۆناغەکا خواندنێ بربیا، کو بۆ نموونە قورئان خەتم کربا، مالا وی یان ژی وی بخۆ خوارنەك یان شرینەهییەك دئینان

و ددانە خەلكی و دكرە بەرفرەهیا خوارنێ.
هەژی گۆتنێ یە كو ئەو گوندێن ئەڤ رەنگە خواندنگەهێن ئاینی لێ هەین، گەلەك جاران هندە خەلكێ گوندی و گوندێن دەوروبەران هندەك ژ زەڤی و ئەردێن خۆ دكرنە خێر و دیاری بۆ خواندنگەهێ، دا ژ بەرهەمێ وان زەڤی و مولكان خەرجی ل فەقییان هاتبا كرن و شیلان و تەكیا پێ بهێنەدانان و ئەو كەسێن ب بەردەوامی دچوونە مزگەفتێ و هەمی نڤێژێن خۆ ل مزگەفتێ ب جماعەت دكرن دگۆتنێ (سۆفی).

## زەڤیێن خێرێ:

ل هەر گوندەكی بەهرا پتریا گوندییان هندەك زەڤی هەبوون دگۆتنێ (زەڤیێن خێرێ)، كو خودانێن وان بەری وەغەرا داویێ بكەن دكرنە خێر د رێیا خودێ دا، ئەو زەڤی ژ لایێ هندەكان ژ خەلكێ گوندی ڤە دهاتنە شینكرن ب نیڤبەری، یان ب نیڤی و ل وەرزێ پاییزێ، دەمێ بەرهەمێ وان دهاتە راكرن و كۆمكرن، ددا ب مێویژ و ل سەر خەلكێ گوندی دهاتنە بەلاڤكرن، ئەو كەسێ زەڤیا خێرێ ڤێ مێویژ دبرنە مزگەفتێ و ل سەر سۆفییان بەلاڤەدكرن، سۆفیان ژی دبرنە مال و یان ل سەر مالان لێكڤەدكرن و هەر مالەكێ چەند گەهشتبایێ ددانێ، بێگومان دابەشكرن ل سەر مالان باشتر بوو، چونكی دبیت هەمی مال نەچووبانە مزگەفتێ و مێویژ نەگەهشتبانێ، لێ ئەگەر ئەو كەسێ زەڤی كرینە خێر گۆتبیت دڤێت خێر ل مزگەفتێ بێتەدان، دڤیا ئەو برانە مزگەفتێ و دابانە سۆفییان.

## زارۆك:

زارۆك، یان بچویك وەكی دهێتە گۆتن (فێقیێ ناڤ مالێنە) و خەلك زۆر حەز ژێ دكەن، لێ جوگرافی و سرۆشتێ كوردستانێ ژ لایەكیڤە و بارێ گرانێ ژیانێ و كاودانێن نەخۆش و بەلەنگازی و نەداریا خەلكێ دەڤەرێ، وەل خەلكی كریوو كو ل دووڤ ئاستێ پێدڤی چاڤدێریا ژنا ب تشت (دو گیان- ب حال) نەكربا و وێ ژی هند چاڤدێرییا خۆ نەدكر، یان ب رەنگەكێ دی ئەم دشێن بێژین هەتا ژنك نەهاتبا سەر رۆژا خۆ كو ب بچویكی نەساخ دبوو هەر هەمی كار دكرن و خۆ ژ چ كاران نەددا پاش، ژبلی ئەگەر مالەكێ گەلەك ژن و كچ تێدا هەبان، وەكی ژنتی و زنبرا و دش و خەسوی و هەوی و...هتد و هەست ب ئێش و ئازارێن وێ كربان و هاریكاریا وێ دكرن و نەدهێلان ب هەمی كاران رابیت و وان پێشڤە دكرن. ل بەرێ هەر گوندەكی، یان هەر رەندەكەكێ هندەك ژنكێن ب ناڤسالڤە چوویی و بسپۆر و شەهرەزا د بوارێ زارۆكبوونێ دا هەبوون كو دگۆتنێ (داپیرك) و ڤان (داپیركان) ل دووڤ وەختێ خۆ د بیاڤێ زارۆكبوونێ دا بسپۆرییەكا باش هەبوون.
هەر گاڤەكا ژنكەك ب بچویكی ئاگەهـ ببا، ژنكێن داپیرك و شەهرەزا دهاتنە دەڤ وێ و هاریكاریا وێ بۆ بچویكبوونێ دكرن و ئەڤ كەسێن وەسان شەهرەزا وەسان چێدبوو كو گەلەك جاران ئەگەر زارۆك د زكێ دایكێ دا یێ خەلەت با بۆ دەركەتنێ دروست دكرنەڤە و نەدهێلان چ كێماسی ب گەهنە زارۆكی و دایكا وی ژی.
هەر گاڤەكا زارۆك ژ دایك دبوو، داپیركان زارۆك پاقژ دكرن و نافكا وان دبرین و د هندەك پاتا دپێچان و ددانانە وێرێ، یان ژی ددانانە رەخ دایكێ ڤە دگۆتنێ (پێچك)، یان ژی (سەرپێچك) و گەلەك جاران وەسان چێدبوو ئەڤ زارۆكە ب ئاڤا تەزی دهاتە شویشتن، ب مەرەما وێ چەندێ دا ئەڤ زارۆكە یێ ب هێز و خودان شیان بیت، و گەلەك جاران ب ئاڤا تێهنشیر ژی دهاتنە شویشتن و ئەڤ بچویكە ددانە ڤ دایكا وی دا هندەك شیر دابایێ و د گۆتنە ڤی شیری (فرشككرن) و دەمێ زارۆكی بۆ جارا ئێكێ شیرێ مەمكێن دایكا خۆ خوار دگۆتنێ (یێ فرشكبووی)، ل سەر ڤێ چەندێ گۆتنەك هەیە دبێژیت (یێ ل فرشكێ -شیری- گرتی، دێ ل شاری- شوواری- هێلیت)، كە واتە وی كاری و ب تایبەت یێ خراب ناهێلیت.
دیسان گەلەك جاران دەمێ بچویك دناڤ پاتادا دپێچان ددانانە د تشتەكی دا و گومتلەكێ شەكرێ ددانانە

سەر لێڤێن وی، و گەلەك جاران پیچەکا خوێ ژی پێ وەردکرن و دشویشت، ئەڤ چەندە ژی ب مەرەما هندێ دا لەشێ زارۆکی خاڤ نەمینت و ب شدیێت. پشتی بێهنا گوندییانێ ژ بەر ئێش و ئازارێن زارۆکبوونێ دهات، خوارنەك ددانێ دا ب هێز کەتبا د گۆتنێ (ئاسویدە) و ئەڤ خوارنە یا تایبەت بوو ب وان ژنێن ب زارۆکبوونێ نەساخ دبوون. ئەو زارۆکێ ژنوی ژ دایکبووی ژی چەند رۆژەکان ما دناڤ پێچکێ را، پاشی لاندکەك بۆ دکرین، یان ژی بۆ ددانە چێکرن، لاندك ژ داری دهاتە چێکرن، بچویك چ کور یا یان کچ تێدا دهاتنە هەژاندن و دنڤاندن، باراپتر دارتراشان، یان ژی هۆستایێن قەرەچان هەتا نها ژی چێدکەن و ژبلی لاندکێ هەمی تشتێن وێ یێن پێدڤی بۆ بەرهەڤدکرن کو پێکهاتیبوون ژ:

- **بالیفك و دۆشەکێت لاندکێ:** کو مینا تویرکەکی چێدکرن و جهێ قەسرویکێ لێ هێلن و وی تویرکی ب پیشەکێ تایبەت داگرن کو بێهنەکا خۆش ژێ دهات و دۆشەکەکا دی هەر مینا وێ ب هەریێ، یان ژی پەمبوی دادگرن و ددانە سەر یا ئێکێ دا لەشێ زارۆکی ژ بنکێ لاندکێ بلند بیت و هندە پاتێن تایبەت ددانە سەر ڤێ دۆشەکێ دا زارۆکی ب داننە سەر و د لەشێ زارۆکی ب ئالینن.

- **دەست بلوینك:** پێکهاتییە ژ دو دانا و زارۆکان پێ گرێددەن و ل ڤێرە زارۆك ئازادیا هەمی لڤینێن خۆ ژ دەست و پییان ژ دەست ددەت.

- **سەرپێك:** بالیفکەکا بچویکا چوارگۆشەیە، ددانە سەر رانێن زارۆکان، دا بچویك نەشێت پێن خۆ ب لڤینت و بلولکا وی ژبەر نەچیت.

- **بلویك:** کەهەکا لەڤەنی ب درێژاهیا نێزیکی (١٥سم) و سەرێ وێ ب شەمایێ دهاتە چێکرن و ب قایدا ئەندامێ لەشێ زارۆکێ کور، ئارمانج ژێ ئەو بوو کو دەستاڤا زراڤا زارۆکێ کور تێرا بچیتە قەسرویکێ دا خۆ تەر نەکەت.

- **قەسرویك:** ئامانەکێ کویر و زراڤە و بنێ وێ زراڤترە و لێڤەکا چەماندی یا ل سەری هەی دا ب کەڤیتە سەر دەپێ لاندکێ، ئەو ژی ژ گلینەی، یان ژی ژ ڤافونی دهاتە چێکرن و ئارمانج ژێ ئەو بوو زارۆك خۆ پیس نەکەت و دەستاڤا وی بچیتە دناڤدا.

- **کولله:** پەرۆکەکە ددانانە سەر لاندکێ و ڤێدا دهاتە خوار، دا زارۆکی ژ مێش و مۆر و پێشییان ب پارێزیت[٣].

- **رستکا لاندکی:** رستکەك بوو ژ مۆرکێن رەنگین دهاتە چێکرن، یان ئەگەر مۆرك نەبان، باهیڤ یان گویز ل شوینێ د سمتن و دو گوهـ ئێشك (قواقع) دکرنە دناڤدا و ئەو د وێ باوەریێ دا بوون کو ب وان هەردو گوهـ ئێشکان، گوهێن زارۆکان نائێشن و گەلەك جاران ل دەمێ دەستێن زارۆکان د ڤەکری خۆ پێڤە مژویلدکرن کو ل هنداڤی سەرێ وی بوون. دیسان گەلەك ژ ژنکان لاندکێن زارۆکێن خۆ ب چارچەڤ و زرزرکێن جودا جودا دخەملاندن.
هەلبەت دگەل گوهورینا بارێ ژیانێ، سیمایێن لاندکان ژی گەلەك یێ هاتیە گوهارتن و وەکی بەرێ نەماینە و هندەك کەس هەر ئێکجار ب کار نائینن، هەروەسان ئەو مللەتێن دەردۆرێن کوردان ژی مینا عەرەبان، لاندك ب کار نەئینانە و هەر ب تنێ دپێچکێدا بوون هەتا مەزن دبوون.
وەکی دیار د بەرێ دا پتریا خەلکی رێنجبەر بوون و هەر ب رێنجبەریا خۆڤە دمژوولبوون و دەمێ دچوونە سەر کارێن خۆ، ژنك و زەلام ب هەڤرا دچوون و وەسان نەدشیان رۆژانە لاندکێ دگەل خۆ ببەن، بەلکی ل ناڤ ملکی (جۆلاندك) چێدکرن و زارۆك تێدا د هەژاندن و دنڤاندن.
هندەك جاران وەسان چێدبوو، دایکا بچویکی یا بێ شیر بوو، یان شیرێ وێ تێرا زارۆکێ وێ نەدکر و وەکی دیار ل بەرێ شیرێ تۆزێ ڤۆدیکان مینا نها نەبوون،

لەورا نەچار دبوون ئەگەر هەبا شیرێ چێلان ددانێ و دگۆتن ماوەیێ دو گیانییا چێلان مینا یا مرۆڤان نەهـ هەیڤن و شیرێ وان پتر یێ نێزیکی شیرێ مرۆڤانە، لێ ئەگەر ئەو ژی نەبا، دچوونە نك وان ژنکێن شیرێن وان ژ زارۆکێن وان دزێدە و ڤێ ژنکێ ژی بێگومان بێی مێرێ خۆ ئەڤ پێنگاڤە نەدهاڤێت و شیر نەددایێ، چونکی گەلەك جاران کێشێن جڤاکی ل سەر ڤێ چەندێ پەیدادبوون و ئەو زارۆکێن شیرێ ئێکودو دخوار، دبوونە خویشك و برایێن ئێك نەدبوو ببنە هەڤژینێن ئێك، چ کچ با یان کور، ئەو زارۆکێن شیر دابایێ دڤێت ناڤێ وی هاتبا نڤیسین، دا ئاریشە ژێ درست نەببان، چونکی ل بەرێ گەلەك جاران ئەڤ رووданە پەیدادبوون، پشتی مەزن دبوون دا چن خوازن و ژبیرکەن کو شیرێ ئێك یێ خواری، لێ دبیت ل بیرا جینا دووێ بیت و ل بیرا وان ئینابیت.

هەژی ئاماژێیە کو ل بەرێ پرانییا جڤاکێ کوردی حەز ژ کوران دکرن، و حەز دکرن ژنێن وان کور ل شوونا کچان ببان، تایبەت کو ل بەرێ جڤاك پتر یێ پێدڤی ب کارێن زەلامی هەبوو، هەر ژ جۆت و کێلا و سەخبێریکرنا رەز و باغان و چێکرنا زەڤی و بیستانان و بۆ چلوی برێ و دارکێشانێ و خودانکرنا تەرش و کەوالان و ژبلی کو ناڤە و پشتە بۆ بابێ و بۆ عەشیرەتێ و ل بەرێ ئەگەر زەلامەك مربا و چ کور ل پشت خۆ نەهێلابان دا بێژ (دەرگەهێ مالا وی هاتە گرتن)، لێ ئەڤ چەندە ژی یا بەر ب کێمبوون ڤە دچیت.

دیسان ل هەر گوندەکی، یان رەندەکەکا باژێری ل دەڤــەرا بەهدینان کەسانێن بسپۆر و شەهرەزا هەبوون، بچویکێن نێر (کور) سونەت دکرن و ل هندە دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ کچ ژی دهاتنە سونەتکرن و هێشتا ل هندە دەڤەران ئەڤ دیاردە یا مای ژی، لێ ل بەهدینان چ هەبوون بۆ ڤێ دیاردێ نینن.

هەروەسان ئێزدییێن دەڤەرێ ژی، مینا موسلمانێن دەڤەرێ زارۆکێن خۆ سونەت دکەن، لێ دبیت وان رێ و رەسمێن تایبەت ب ڤێ چەندێ هەبن و موسلمانێن دەڤەرێ ئەو چەند نینن. ئێزدی ب ڤێ هەلکەفتێ ئاهەنگان دگێرن و بەهرا پتر زارۆکێن خۆ د کۆشا زەلامەکێ موسلماندا سونەت دکەن و دڤی حالەتی دا ئەو دبنە کریڤێن ئێك و ل دەمێ سونەتکرنێ دڤێت چیکەك، یان دو چیکێن خوینا زارۆکی ڕشتبانە سەر جلکێن وی کەسێ زارۆك (کەسێ موسلمان) د کۆشێ دا، پاشی دایکا زارۆکی ئەو خوینە ژ جلکێن وی دشۆیشت و ب ڤێ چەندێ دبوونە کریڤێن ئێك یێن خوینێ و وان حەق یێ ل سەر ئێك هەی هەتا خوینێ ژی بەرەڤانیێ ژ ئێك بکەن[٤].

د بەرێدا ژبەر نەبوونا نۆشدار و دەرمانان، گەلەك زارۆك ب ئێش و پەژیکێن بەلاڤ دمرن، لەورا هندەکان نڤشتی و حەمایلك ب بچویکێن خۆڤە دکرن، ب وێ مەرەمێ دا ئێش و نەساخی ژێ دووربن و ژ هەر نەخۆشیەکا بیت بهێنە پاراستن[٥]، دیسان هندەکان وەسان هزردکرن کو بچیکێن وان بەرچاڤ (چاڤین) دبن، لەورا هندەك گوندییانان (ناڤچاڤك) ب سەرێ عەیالێ، یان ژی ب بەرسینگا وانڤە دکرن دا چاڤین نەبن.

دیسان ل بەرێ هندەکان وەسان هزر دکرن کو یێ ژ مەبۆشتر (ئەجنە) دادڕسنە زارۆکێن وان و زارۆکێن وان د لاندکێ دا دمرن، لەورا ل بەرێ دەمێ گورگ د کۆشتن ددانێن وان یێن شەری (کێلب) دئینانەدەر و د سمتن و ب بەندکەکی ڤە دکرن و ب لاندکا زارۆکی ڤە دهەلاویستن، ب مەرەما هندێ دا یێ ژ (مەبۆشتر) نە داڕسنێ و چ ل زارۆکی نەکەن، چونکی وەکی د کەڤنە باوەرییاندا هەی ئەجنە گەلەك ژ گورگا د ترسن و گورگ ئەجنا دبینن و تێژکێن وان دخۆن و گاڤا گورگ دیت، پێسترك دیت و نەشێت ب لڤیت.

دیسان وەکی کەڤنە باوەری ئەگەر ئێکی گەلەك زارۆکێن وی مربان، دهاتە گۆتن هەر کەسەکێ ناڤێ گیاندارەکی دانیتە سەر زارۆکێ خۆ، ئێدی زارۆکێن وی نامرن، لەورا و هەر دکەڤندا و هەتا نها ژی ل ناڤ کوردان ب گشتی و پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی ناڤێن گیانەوەران ل سەر ناڤێن مرۆڤان ل بەرچاڤن، چ مینا فڕندا بن وەکی کۆتر و کەو ئەلهو، یان گیاندارێن

دی مینا گورگین و...هتد.

بێ گومان پشتی ژنکێ زارۆك دبوو، نەدبوو هەتا چل رۆژ نەبووریبان ژ مال دەرکەڤیت، و هندی ئەڤ ماوەیە نەبووریبا، دگۆتن (فلان ژنك یا چلکدارە) و یا نازکە نەدهێلان دەرکەڤیت، یان ژی کارێن مەزن و گران بکەت ئەگەر یا نەچار نەبا و وەسان هزر دکرن ئەگەر دەرکەڤیت و کار بکەت دێ مریت و هزرێن خراب ژێ دکرن، لەورا د چلکداریا وێ دا خزمەتا وێ دهاتەکرن و رێز لێ دهاتەگرتن، هەر چەندە گەلەك جاران ژنکێ خۆ ل ماوەی (چلکداریێ) نەدگرت و رادبوون و د روینشتن و دەردکەتن و کارێن خۆ دکرن، ژبەر کو ئێك ژن بوو و ژبلی وێ کەس ل مال نەبوو، یا نەچار بوو رابیت و بکەت.

ل دەمێ ژنك رادبوو سەر داری لاندکێ و شیر داییێ، هندەك سترانێن تایبەت و زێمار ب زارۆکێ خۆ دگۆتن و باراپتر ئەڤ سترانە و لاییێ لاییێ دبەر هەژاندنا لاندکێ را دهاتنە گۆتن دا زارۆك نڤستبا. هەژی ئاماژێ یە ئەو کەسێ زارۆك دما ب هیڤیێ ڤە و سەخبێرا وی دکر هەتا گوندیانا وی دزڤریتەڤە دگۆتنێ (دادۆك) و ئەو کەسا زارۆك بۆ چەندەکا درێژ دما ل نك دگۆتنێ (داییں).

## هەڤمە (هەڤمەهـ)[٦]:

ل نك کوردێن دەڤەرا بەهدینان (هەڤمە- هەڤمەهـ) ژی هەنە، کو بۆ ژنکێن زارۆك دبوون دهاتە بکارهینان، پشتی ژنك ژ بچویکبوونێ سەرراست دبوو و هێشتا یا چلکدار، بیر و باوەرێن کەڤن ل نك خەلکێ دەڤەرێ د وەسابوون کو ژنك یا نازکە و نابیت ژ خانی دەرکەڤیت و گەلەك کار بکەت، ب تایبەت ب شەڤ، چونکی دبێت ژمەبۆشتر (ژمەچێتر) دارسێ و دیسان بیر و باوەر دوەسابوون کو ئەگەر دو ژنك پێکڤە نەساخ ببان و ئێکێ کور ببا و یا دی کچ، چێنەدبوو هەردو ژنك بچنە مالێن ئێك، چونکی دگۆتن ئەو ژنکا کور بووی دێ هەڤمەهێن وێ ب سەر یا دی دا چن و ئێدی وێ ژنکێ زارۆك نابن و ب دو گیان ناکەڤیتەڤە... دیسان چێنەدبوو دەنگێن وان ژی چووبانە ئێك، واتە دڤێت دەنگێ هەردووان نەچووبانە گوهێن ئێك و ئەڤ چەندە ژی هەر ژبەر هەڤمەهیێ بوو.

دیسان وەکە کەڤنە باوەری ل نك خەلکێ دەڤەرێ ئەگەر دو ژن ب تشت (دو گیان- ب حال) بان، چێنەدبوو ئەڤ ژنکە چووبانە نك ئێك، چونکی هەر ئێکا بەری یا دی چووبا نك هەڤالا خۆ دا دلێ یا دی ئالۆزبیت و هزرا کەت و بێژیت هەڤمەهێت فلان کەسێ یێ ب سەر من دا دا هاتین، ئەز دترسم ئێدی من بچویك نەبن.. دەمێ هەردو ب تشت (دو گیان) و کەسێ ژ هەردوکا سەرراست نەببا، گرانییا وێ ب سەر هەڤالا وێ دا دچوو یا بەرێ چووبا جەم هەڤالا خۆ... ژبەر هندێ ئەڤ ژنکە ب سەرێکڤە نەدچوون، ئەگەر ئێك ژ هەردوکا نەساخ ببا، نەدبوو یا بچویك بووی بچیت سەرا یا دی بدەت... چونکی ل وێ باوەریێ بوون دێ هەڤمەهێت یا ب تشت ب سەر یا ی دا چن و دێ ژ زارۆکان خلاس بیت.

ئەگەر هندەك ژنك جیرانێن ئێك بان و ڤیابان هەڤمەهێن وان ب سەر ئێکدا بچن، بەری ئەو ژنك ل گەل یەك باخڤن و دەنگێن وان بچنە ئێك، دێ تشتەکێ خۆ ل گەل ئێك گوهۆرن، ڤێجار ئەو تشت چ بیت، لێ باراپتر دەرزیکە و ئەو د وێ باوەریێ دا بوون کو ئەگەر تشتێن خۆ پێك گوهارتن ئێدی هەڤمەهێن وان ب سەرئێکدا ناچن.

ئەگەر وەسان چێببا ئەو ژنا دو گیان چووبا نك ژنەکا زارۆك بووی، نەمازە ئەگەر وێ ژنێ ئێدی زارۆك نەببان و ب تشت نەکەتبا، یان زارۆکێ وێ نەرابیا پیا و ب پیان نەچووبا، دابێژن (هەڤمەهێن فلانە ژنکێ یێ ب سەر مندا هاتین)... و ئەڤە ژی شاشییەکا مەزن بوو و دڤیا زوی ب ئێك ژ ڤان هەردو رێکا هاتبا چارەسەرکرن:

أ- ئەو ژنا هەڤمەهێن وێ ب سەر یا دی دا چووین، دا چیتە نك ژنا دی و دەمانا (دەهمەنا) کراسێ (دشداشێ) خۆ بەتە هنداڤی سەرێ یا دی و بێژیتێ: (من گەردەنا تە ئازاکر، ئەگەر تۆ گرتیبا من بی،

من تۆ ئازاد کری).
ب- ئەو ژنا دەست ب وێ شاشییێ (خەلەتیێ) کری و چوویە مالا یا دی، دا پاریەکێ نانی ئینیت و دەرزیکەکێ کەتە دناڤرا و بۆ یا دی فریێ کەت.
گەلەك جاران ئەڤ تشتە ژ لایێ هندەك ژنێن نەزان و پاشکەتی و بێ سەربۆر، ب تایبەت ژنێن ژ نوی شویکری و گەنج کو چ ژ ڤان تشتان نەدزانی دهاتە ئەنجامدان و کرن، لێ نها خەلکی باوەری ب ڤان چەندان نەمایە. هەر دیسان ژنکا چلکدار (زهستانی) نەدبوو بچیتە ناڤ دەهواتان ژی، یان دەڤ بویك و زاڤایان و ئەگەر چووبا دەڤ وان و پشتی هینگێ بویکێ زارۆك نەببان، دگۆت ئەو ئەگەرە من زارۆك نابن، چارەسەریا ڤێ چەندێ ژی ئەو بوو دڤیا ژنا زهستانی (چلکدار) چووبا مالا بویکێ و روینشتبا و پێن خۆ درێژکربان و بویك سێ جاران د سەر پێن وێ را هاتبا و چووبا، پاشی بویك دا روینت و ژنا زهستانی سێ جاران دا د سەر پێن وێ را هێت و چیت... دهاتە گۆتن کو ئەڤ هەڤمهە نە هەر ب تنێ ل نك ژنکان هەبوو، بەلکی ل جەم وان گیانەوەران ژی هەبوون یێن قەولێن وان ژنان هەین، کە واتە یێ دەمێ زکپریا (ئاڤسبوونا) وان هندی زکپریا ژنان دمینن و دزێن، وەکی چێلا بۆ نموونە و گاڤا چێل د زا، چێنەدبوو ژنکا ب حال چووبا مایێ خۆ تێ کربا، هەتا هەیامەك ب سەرڤەدچوو، ئەگەر ژنك چووبا نك چێلێ، یان چێلێ گوهـ ل دەنگێ وێ بوو، دگۆتن دێ شیرێ وێ کێم بیت و هشك بیت، و دبێژن هندەك پەرندە ژی وەکی ژنکانە، مینا عەلۆکان... کو چێنەدبوو ژنکا زهستانی عەلۆك ڤەنابان و هێك بۆ چیچەلۆکا دانابانە بن، یان ژی چوبا نك و مایێ خۆ تێ کربا و تۆمك دابایێ، چونکی ئەو ژنا ب وی رەنگی و ئاڤ و تۆمك دابانێ، وێ عەلۆکێ چیچەلۆك نەدهینانەدەر و نەدروینشتە سەر هێکا. لێ ئەڤە هەمی بیر و باوەربوون و نها بەرەڤ نەمانێ ڤە دچن[٧].

## خودانکرنا تەرش و کەوالی:

بێگومان د بەرێدا ژیانا خەلکی پتر ل سەر خودانکرنا پەزی و گیانەوەرێن کەهی بوو، ڤێ

برینا هریێ ژ پەزی



چەندێ زەحمەت و ڕەنجەكا زێدە دڤیا، لەورا خەلكێ دەڤەرا بەهدینان وەك پتریا كوردان چووینە كۆز و بەربهار و پاویز خێر و زۆزانان، دا كو شیابان كەوالێن خۆ ب خودان بكەن، خودان پەز ژبەر كو نەدشیان تێرا پەزێ خۆ ئالفی (مشتی) بكەن، لەوما كۆز بۆ زڤستانێ پەیدا دكرن و قەستا وێرێ دكرن، و پشتی دبوو بهار و تێرخۆر ل دەڤەرێن وان پەیدا دبوو قەستا دەڤەرێن خۆ دكرنەڤە، بێگومان خەلكێ دەڤەرێن چیایی و بەفرین دچوونە كۆز و بەربهار و پاویز خێران، و پشتی ژ كۆز و بەربهاران دزڤرین، هەیڤەكێ دووان دمانە ل مالێن خۆ ل گوندی، پاشی قەستا زۆزانان دكرن و هەتا پاییزەكا درەنگ و سەرێ زڤستانێ دمانە ل وێرێ و جارەكا دی قەستا ل گوندێ خۆ دكرن و هندەك ژی دچوونە كۆز و پاویز خێران. هەژییە بێژین ل هەر گوندەكی هندەك خودان پەز و تەرش و كەوال هەبوون كو ژ هندەكان پترتر، هندەك ژی هەبوون د شەهرەزا و ڕێبەربوون، خودانی پەزی ئێكێ ژ هەمییان شارەزا و ڕێبەرتر بۆ خۆ د هەلبژارت و دكرە سەركەرێ خۆ، ئانكو مەزن و ڕێبەرێ خۆ، سەركەری مافێ گرتنا شڤانی و شڤان پێچكا هەبوو، دگەل بازاركرنا بهایێ گیسك و كاڤڕێن نێر ل دەمێ فرۆتنێ، لەورا سەركەرێن پەزی ل هەر گوندەكی چ گۆتبا و چەوان شڤان گرتبان، كەس دگەل نە دئاخفت و هەمی خودان پەزان گوهداریا وی دكرن و چ قەول دگەل شڤانی كربا د ڕازیبوون[8].

## نەساخی:

هەر كەس د ژیانا خۆدا تووشی ئێش و نەساخیان دبیت، جڤاكێ كوردەواری ژی دەمێ ئێك نەساخ دبیت، كەس و كار و لێزمێن وی دچن سەرەدانا وی دكەن و بۆ د ئاخڤن و ژیرڤە دبەن و شیرەتان لێ دكەن كو خۆ ل بەر بگریت و سوپاسیا خودێ بكەت و دناڤ جڤاكێ دەڤەرێ دا وەسایە كو هەر داخوازییەكا نەساخ بكەت، هندی ژ وان بهێت بۆ ب جهـ دئینن. دیسان مەلا و ڕهسپیێن گوندی، یان ێێن گەڕەكێ ڕۆژێ جارەكێ یان پتر سەرەدانا وی دكەن و بۆ دئاخڤن و دلەی دلی ددەن. ژ لایێ ئایینی ژی ڤە (ئیسلامەتیێ)، سەرەدانا نەساخان خێرەكا مەزنە، لەورا خەلكی خۆش سەرا نەساخان ددان، دەمێ نەساخ گەلەك تەنگاڤ دبوو، خودانێن وی خێر و نەزر و سەدەقە و مەولید پێ دكرن، ئەڤ خێرە هندەكان هەر زوی و دەملدەست بێ گیروبوون ددان و هندەكان ژی بۆ دەمەكێ دی گیرو دكرن یان هەتا پێ چێدبوون. هەژی یە بێژین سەدەقە و نەزر ژ مەولیدان ب ساناهیتر و كێم خەرجیتر بوو ژ مەولیدان. هەر دیسان ئەو كەسێن سەرا نەساخی ددا، هیڤی و دوعا بۆ ژ خودایێ مەزن دكرن كو ساخ ببیت و بزڤریتەڤە ناڤ هەڤال و هۆوگر و مال و عەیالێن خۆ.

## مەولید[9]:

یەك ژ تیتالێن پێشچاڤێن كوردەواریێ بوون كو دگەل پەیدابوونا ئیسلامێ ل ناڤ كوردان پەیدابووین و پویتەكێ مەزن پێ دهاتەدان و هەتا نها ژی ل گەلەك دەڤــەران یا هەی، بێگومان مەولید بەهرا پتر بۆ نەساخان دهاتنەكرن، یان ژی ئەگەر لێزمەكێ مرۆڤی كەتبا د تەنگاڤیەكا مەزندا، ئەگەر وەسان چێببا كو نەشیابا ئەو مەولیدا كری بدەت و مربا، پشتی مرنا وی ئەو مەولید ژ لایێ لێزمێن كەسێ مری ڤە، مینا كوری و كچێ و برای و نەڤی دهاتەدان.

گاڤا ئنیەت دكر مەولیدێ بدەت، دا خوارنەكا باش و بەرفرەه چێكەن و پەزەكێ یان دووان سەرژێكەن و خوارنەكا ب دلێ خۆ چێكەن، خەلكێ گوندی هەمی گازی دكرنە سەر خوارنا مەولیدی، مەلایەك ژی دئینانە سەر مەولیدێ دا بخوینت، پاشی هەمیان دەست پێ دكر دخوار، هەژی یە بێژین شەربەت ژی ددانە بەرهەڤبوویان و ل باژێران بوخێر ژی هەلدكرن. بەرامبەر ڤێ خواندنێ گەلەك مەلایان پارە وەردگرتن[10].

## داوەت نەبی[11]:

ئێكە ژ تیتالێن كەڤنێن دەڤەرێ، ئەگەر پەزێكەك، یان وەبایەك یان ئێشەكا كوژەك پەیدابا و هندەك پێ

مریان، مینا: سۆرکان و خوریکان و ...هتد، وی دەمی مەزن و ڕهسپی و مەلایێ گوندی داوەت نەبییەك دکرە خێر، ب وێ مەرەمێ خەلکێ وان ژ وان ئێشان هاتبا پاراستن، دەملدەست پشتی بریارێ دا خەلکی پێ ئاگەهدارکەن و بێژن فلان رۆژێ داوەت نەبی یە. ڤێجار بۆ فراڤینێ با یان شیڤێ، بۆ ڤێ چەندێ ژی جهەکێ بەرفرەه دهاتە دەستنیشانکرن، کو جهێ خەلکێ گوندی یان تاخی لێ ببا و هەر مالەکێ ل دووڤ پێچێبوونا خۆ خوارنەکا باش چێدکر و دکرە سێنیکا و دبرنە ناڤ داوەت نەبی، و مرۆڤێن دەولەمەند خوارنەکا باشتر و پتر دبرن، دەمێ خوارن ل وی جهی کۆم دبوو، هندەکێن بسپۆر و شارەزا ئەو خوارن ب شێوەیەکێ جوان ددانا و ب ڕێزدکرن، بۆ نموونە هەر سێنیکەکا برنجێ، پاشی یا ئیپراخا، وەسان ساڤار و ترشك و دانقوت و گۆلۆل و...هتد، ڤێجار هەر ئێکی کا دلێ وی دچیتە چ، دا ل راستا وێ خوارنێ راوەستیت و کەڤچکی دەستێ خۆ گریت. بێگومان بەهرا پتر بچویك دچوونە ڤان داوەت نەبییان، مرۆڤێن مەزن و سەرە کێمتر دچوون، دیسان ژنك و کچکێن مەزن ژی نەدچوون و خوارن ل مالێن خۆ دخوارن. پشتی خوارن ڕێز دبوو، هەمی ل دۆران کۆمدبوون و مەلایێ گوندی دچوو نیڤەکێ رادوەستا و هندەك هیڤی و دوعا ژ خودایێ مەزن دکرن کو وێ خێرێ قەبوول بکەت و وێ ئێشێ ژناڤ وان راکەت و هندەك تشت پێڤە دخواندن، پاشی دا فەرمانا خوارنێ دەت و هەر ئێك ل راستا خۆ دا روینت و خوارنێ خۆت و هندەکان هندەك ژ وێ خوارنێ بۆ مالێن خۆ ژی دبرن کو دگۆتنێ (تبەرك) و پاشی هەر ئێکی کەڤچکێ خۆ هەلدگرت و دچوو مال ڤە.

## مرن[١٢]:

دەمێ نەساخ دکەتە بەر سەکەراتا مرنێ، مەلایێ گوندی، یان قورئان خوینەك دچوو دەڤ یاسینەك (سۆرەتا یاسین) لێ دخواند، د بەرێ ئەگەر یاسین یان دەور لێ نەهاتبا خواندن، دلێ خودانێ مری د ما و دگۆت (مرێ مە بێ مرار بووی)، پشتی خودایێ مەزن ئەمانەتێ خۆ ژێ دستینت، مرۆڤێت مری لێ کۆمدبن و هندەك کفنی ئامادە دکەن، و چاڤێن مری دانن سەرێك و بەرەڤ قیبلە دکەن و پاشی مرۆڤەکێ شارەزا دشووت و کفندکەت، لێ نها مینا بەرێ نینە و کێم مری نها ل مال دهێنە شویشتن، چونکی نها جهێ شویشتنا مریان ل مزگەفتان هەیە... و ئەو ئاڤا مری پێ دهاتە شویشتن یا تێهنشیرە و دبێژنێ (ئاڤا شارێ).

د بەرێ دا هەر ئێکی کفن بۆ مرێ خۆ د کڕی، و کێم جاران خودان خێرەکی بۆ د کڕی، وێ چەندێ ژی پتر پەیوەندی ب بارێ ئابووریڤە هەبوو، لێ نها ئەو مزگەفتا مری لێ دهێتە شویشتن کفن پێ لێ هەی و ژ لایێ خودان خێراڤە دهێتەکڕین. بێ گومان کفن دڤێت جانگ بیت، لێ ئەگەر جانگ نەبیت نفسی ژی پێ دروستە کو هەردو د رەنگ سپی نە.

ئەو کەسێ مری دشووت دڤێت مرۆڤەکێ ژ خودێ ترس و نهێنی ڤەشێر بیت و چ نهێنی و ڕازێن مری دەهری (ئاشکەرا) نەکەت. پشتی مری دهێتە شویشتن و کفنکرن، ددانا ناڤ مالێ و قورئان خوین لێ ڤێکدکەتن و قورئان لێ دخولند، ئەگەر شەڤ بایە مری نەدهاتە ڤەشارتن و هەتا سپێدێ لێ دخواندن و سپێدێ زوی قورئان خوین دچوونە سەر موقبەرێ و زیارەت دکۆلان و خواندنا قورئانێ ل سەر بەتال نەدبوو هەتا دهاتە ڤەشارتن و هندەك خورت و گەنج دمانە ل مالا مری، یان ئەو جهێ مری لێ و ل بەر خلمەتا وان کەسان ڕادوەستان یێن ل سەر مری دخواند، چا و ئاڤ ددانێ. هەژی گۆتنێ یە ئەو بەهرا پتر جاران ئەو خەرجییا دهاتەکرن نە ژ کیستێ خودانێ مری بوو، ب تایبەت ئەگەر خودانێ مری یێ ژار و دەستکورتبا، چونکی وی دەمی خودانێن مری پتر ب خۆڤە دمژویلبوون و ئاگەهـ ژ چ نەبوون، لێ ڤێکاڤێ ئەڤ چەندە نەمایە و ژبلی لێزمێن مری کەس نامینتە ل جەم و کەس لێ ناخوینت.

ل دەمێ کۆلانا گۆڕێ مری، ڤیا ئەو کەسێ تەڤرێ ئێکێ، یان مەڕا ئێکێ لێدا، گاڤا ڤەدشارتن ژی دیسان دڤیابا هەر هەمان کەس مەڕا ئێکێ بەری هەمیان ئاخ کربا سەر. و هەر جهەکێ مری دا لێ هێتە ڤەشارتن، هندەك ب کۆلانا گۆری ڤە دمژویلبوون و هندەك ب بەر و حەلانێن مەزن ڤە دمژویلبوون و د کێشان سەر

**رێ و رەسمێن بەهیداریێ**



موقبەرێ بۆ بیراستنا گۆڕی. پشتی ژ کۆلانێ ب داوی دهاتن، ل وان دەڤەرێن بەر و حەلان لێ نەیی، یان یێن ب زەحمەت بۆ ئینانێ، ئێك دووەكێن شارەزا دچوونە دناڤ گۆڕی دا و دبیراست و زیارەت بەرگۆڕ د كۆلان و هەوجەی بەر و حەلانان نەدبوون بۆ بیراستنێ. نها ئەڤ چەندە نەمایە و زیارەت ب (حەفاران) دهێنە كۆلان و ب (بلۆكان) دهێنە بیراستن.

پشتی ژ زیارەتی ب خلاس دبوون، نێزیكی بیست زەلامان دا چنە مری، داریەست ژ مزگەفتێ د برو مری دكرنە تێدا و چەند زەلامەكان داریەست ددانانە سەر ملێ خۆ و دبر، هەر بێهنەكێ ئێك و دو د گوهۆڕی و دچوونە شوینا ئێك دا نە واستیابان و خێرا هەمیا تێ كەتبا، گاڤا داریەستا مری رادكرن و دبر، لێزمێن وی دكرنە گری، لێ مەزن و ڕهسپییان خۆ ژێ عاجز دكرن و نەدهێن ڤێژیا راهێلن و سەرێ خۆ ڤەچرن، یان ژی پێ بێژن چونكی دگۆتن بۆ مری خرابە و گونەهە، ژبەر هندێ ل گەلەك دەڤەران پێ گۆتن نەبوون، د سەر هندێ را ل گەلەك دەڤەران دهاتە پەیرەو كرن.

گەلەك جاران نڤێژ ل سەر موقبەرێ ل مری دهاتەكرن، لێ ل ڤێ دووماهیێ نڤێژ هەر ل مزگەفتێ بخۆ ل سەر دهێتەكرن و دبێژنە ڤێ نڤێژێ (نڤێژا مری).

بێگومان دەمێ مری دهاتە ڤەشارتن بەر ب قیبلە (ڕۆگەهـ) یە و ددانانە سەر تەنشتا راستێ و دەمێ سەرێ وی ددانا عەردی، حەلانكەكێ بچویك ددانانە هنداڤی سەری، دگۆتنێ (بەرێ سلەمی)، پاشی حەلانێن مەزن ددانانە سەر هەتا هەمی گۆڕ دگرت و كەلەخێ مری دهاتە ڤەشارتن، ب شێوەیەكی كو ئاخ نەچووبا سەر كەلەخێ مری، پاشی ئاخ رادانە سەر كێلی، پاشی دهاتە قوتان دا ئەو ئاخ هاتبا شداندن و رێز بەركەكا بچویك ژ كێلیێ بۆ كێلیێ ددانان و هەر ئێك

ل جهێ خۆ دروینشت و مەلای (تەلقین) لێ دخواند و ل نها هندەك ڤێ (تەلقینێ) لێ ناخوینن و دبێژن چێنابیت، پاشی خەلك دچوونە دەستێ خودانێ مری و هەر ئێك دچوو مالا خۆ.

## زیارەت گرتن[١٣] :

پشتی مری دهاتە ڤەشارتن، چەند قورئان خوینەکان ب شەڤ و رۆژ ل سەر وی زیارەتی دخواند و نەدبوو خواندنا قورئانێ ل سەر بەتالبیا، خەلك ل وێ باوەریێ بوون کو خودایێ مەزن بۆ خاترا قورئانێ و خواندنا وێ ل وی مری بووریت و دلۆڤانییا پێ بەت... و ئەو کەسێن قورئان ل سەر مری دخواندن پارە بەرامبەری وێ خواندنێ وەردگرتن، زێدەباری خوارنا وان ژی د وان رۆژێن وان قورئان د خواندن و ئەوێن پێ چێبووی زیارەتێ مریێ خۆ هەتا شەڤا ئەینی ب سەردا دهات د گرتن و قورئان ل سەر دخواندن. هەژی ئاماژێ یە کو نها ئەڤ ئێجادە (تیتالە) نەمایە و یا بنبڕ بووی و کەس زیارەتان ناگریت.

## بەهی[١٤]:

ژبلی پەیڤا (بەهی)، پەیڤێن (شینی، تازی، پرسە) ژی د زمانێ کوردی دا ل کارن، لێ من پەیڤا (بەهی) گونجاوتر ژ هەمی پەیڤێن دی تر دیت.

دەمێ ژ سەر موقبەرێ دزڤرین، دو لێزمەکێن مری خودانێن مری دگەل خۆ دبرنە مالێ و نەدهێلان ئەو بچن، ژبەر کو ئەو ب خەما خۆڤە دمژویلبوون و دا ژبیرڤە چووبان، پشتی جهێ بەهیێ ژ لایێ مرۆڤێن مری و خودانێن ویڤە دهاتە دیارکرن، بەهی دهاتە دانان، هەژیە بێژین مرۆڤێن مری و دەور و جیرانان پێکڤە هاریکاری ل خودانێ مری دکر و هەر ئێکی تشتەك، یان خوارنەك ب درێژاهییا رۆژێن بەهیێ بۆ دبر و ئەڤە ژی بارسڤکییەك بوو بۆ خودانێن مری.

بەهییا ژن و زەلامان دهاتە دانان و ل بەرێ ل مالێ هەر ئێك ب تنێ و ئێك جار دچوو بەهیێ، دیسان ئەگەر بەهی ل گوندەکێ دەوروبەران بایە، چەند کەسەکان خۆ ددانە ئێك و دچوونە گوندێ بەهیێ و وان نوونەراتیا هەمی گوندی دکر، باراپتر ژی ئەو کەسێن دچوون دپێکهاتی بوون ژ (موختاری و هەر بنەمالەکێ ئێك) و ئەگەر مری لێزمەکێ ئێکی با، ئەو ئێك ب مالڤە دچوونە بەهیێ.. هەژیە بێژین ئەوێن دچوونە بەهیێ ئەگەر د پێچێبوویبانە هندە تشت بۆ خودانێ بەهییێ، مینا برنج و روین و هندە جاران پەزەك ژی دبرن و هەتا نها ژی ئەڤ چەندە ل کارە، لێ نە وەکی بەرێ.

دەمێ بەهیدار دچوونە بەهیێ فاتحەك، یان دوعا بۆ مری دکرن و دروینشتن و هندەك گەنج هەبوون، قەهوەك یان چایەك دداێ و ل بەر خلمەتا وان رادوەستیان، لێ ئەڤ چەندە ژی بەر ب نەمانە.

## شیڤمری[١٥]:

پشتی مری دمر و بەهی ب داوی دهات، خودانێن مری یان مالا وی رۆژانە شیڤا وی بۆ مالەکا دەستکورت و نەدارێن گوندی دبر و دگۆتنێ (شیڤمری) و ئەڤ شیڤمری یە هەتا سالا دزڤری سالێ، یان ب سەرڤە ژی دچوو هەر ددان، ل ڤی دەمی، یان ل دوماهی شەڤا شیڤمرییان خودانێ مالێ دا پەزەکێ سەرژێکەت و خوارنەکا بەرفرەهـ چێدکر و ل گوندی و دەر و جیرانێن خۆ بەلاڤەدکر کو دگۆتنێ (شیڤبڕ)، ئەڤ ئێجادە نها هێدی هێدی یا ژ ناڤ دچیت، ئەگەر ب تەمامی ژناڤ نەچوو بیت. ژبلی ڤێ چەندێ ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەهێ (سێ رۆژك و حەفتی و سەرسال) ژی د بەربەلاڤن، لێ گەلەك دبێژن ئەڤ چەندە نە ژ ئێجاد و تیتالێن کوردەواری و موسلمانانە، بەلکی چاڤ ل خەلکەکێ دی کرینە و ل جەم هندەکان بوویە تیتال و ل هندە دەڤەر ل دووڤ دچن.

# رێز و سەروبەرێن ژنئینانێ ل دەڤەرا بەهدینان

جەمیل شێلازی

بسم الله الرحمن الرحیم
[وَمِنْ ءَایَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْواجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَوَدَّةً وَرَحْمَةً..]
(سورة الروم، آية ـ ٢١)

(ژن و مێر ببن تفاق جهەك ناگریت موقابل)
(ئەحمەدێ نالبەند)

(ژنا مێر ل پشتە، دونیا و عالەم چ تشتە!!)
(گۆتنا مەزنا)

چەند بۆچوونەکێن رۆژهەلاتناسان دەربارێ ژنا کورد.. (باسیل نیکیتین) دبێژیت: (کورد چ جا هزر ناکەن کو ئەو بەرتەنگیێ بێخنە د رێکا ژنێ دا، بەلکو ئەو هەموو دەما وێ ددانن جهێ باوەریێ، و خودان ماف و بەرپرساتی، ئەوێن زەلامی هەبن. ئەڤە دیاردکەت ژ لایێ خویەتیێ ڤە کو ژن خودانا وێ رێزگرتنێ یە یا بۆ زەلامی هەی)[١].

هەر (مینورسکی) دەبارەی ژنا کورد دبێژیت: (ژنێن کورد بێ پەردەپۆشی و ب ئازادی و بێ شەرمکرن دناڤ جڤات و جڤاتگەهان دا د روینن و گەلەك جار ژی بۆ کارەکی دگەل زەلامان دا دکەڤنە دان و ستاندنانێ هەڤپشکن..)[٢].

هەر (نیکیتین) ژ (مینورسکی) ڤەدگۆهێزیت: (کورد دهێنە هژمارتن ژ وان گەلێن موسلمانن یێن پتر دڤەکری ل بەرامبەری ژنان، بێگومان دکارێن مالێ دا..)[٣].

دیسان (باسیل نیکیتین) دبێژیت: (ژنێن کورد خۆ پەردەپۆشیێ ناکەن، ئەو تێکەلیێ دگەل زەلامان دا دکەن ل دەمێ کومبوونان دا، و وان ئاخڤتنا خۆ هەیە ل نك زەلامێن خۆ.. و نە ژ رەوشتێن کوردانە ئەو توخیبی بۆ سەربەستییا ژنێ بدانن، چونکە ئەو د ڤەکری نە، و دەهمانپیسی دناڤ واندا نینە، گەلەك ژ وان رەوشتێن پیسێ یێن ل نك رۆژهەلاتی ل نك وان نینن)[٤].

دەبارەی رێزگرتنا ژنا کورد بۆ مێهڤانی (سۆن) بەحس دکەت و دبێژیت: (گەلەك جار وەسا چێبوویە کابانییا مالێ بخێرهاتنا من یا کری زەلامێ وێ ژی ل مالێ نەبوو، دگەل مندا روینشتی یە من ئاخفتن دگەلدا کری یە، قەت ب خۆ نە ئینایە دەر کۆ شەرم دکەت، یان نە وەکی سادەیا ژنێن تورك و فارس، و گەلەك ب دلخۆشی و کەیفخۆشی بۆ من خوارن بەرهەڤ دکر، دەمێ زەلامێ وێ ژ کاری زڤرییەڤە وەکی رێزگرتن بۆ من هەر ئەز نە دهێلامە ب تنێ، هەتا زەلامێ وێ هەسپێ خۆ دشەلاند و دبر گۆڤێ گرێ ددا و دهاتە

ژوور)[٥].

(مەیجەر نوئێل) دبێژیت: (ژنا کورد ب دەهمان پاقژی و رەوشت بلندیێ هاتینە نیاسین، لەوما (تەنێ سزایێ) زینایێ و دەهمان پیسیێ ل نك هەموی کوردان کوشتنە[٦].

## ژنئینان ل نك زەلامێ کورد:

خێزان ب چەند شێوان پێکدهێت، لێ یا ژ هەمییان باشتر خێزانا ژن و مێرینی یان زەلام و ژن، کو هەردوك دبنە ستوینا سەرەکی بۆ دروستکرنا خێزانێ. بەلێ چەند ئەو دو کەسە پێکڤە دهەڤگرتی بن هەڤسەنگیا رەوشنبیری و ژی و چینایەتی.. هتد، دناڤبەرا وان دا هەبیت، ئەڤە دێ خێزانەکا پتر درێژخایەن و سەرکەفتی تر بن و ئەو و زارۆیێن خۆ باشتر دێ بنە ئەندام و رەگەزێن گونجای و دروستکەر د جڤاکی دا[٧].

ژبەرکو ژن د جڤاکا مەدا تشتەك پیرۆزە، لەورا جڤاکێ مە ب چاڤەکێ گرنگ بەرێ خۆ ددەتە ژنئینانێ، و ژ بەر کو جڤاکا مە رێژەیا هەرا زۆرا وێ موسلمانن، ئەڤ چەندە ژی بوویە هۆیێ وێ چەندێ، هەردەم ب دێرینا ئیسلامێ بەرێ خودانە هەلبژارتنا هەڤژینیێ (ژنئینان)ێ، ئانکو ئەو سالۆخەتێن ئیسلامێ بۆ هەلبژارتنا هەڤکویفێ (هەڤژینێ) دانایێن، جڤاکێ مە ژی ب وی پیڤەری ل هەلبژارتنا هەڤژینێ نێرایە، بۆ ڤێ چەندێ ژی (میجەر نوئێل) دبێژیت: (ژنئینان ژ لایێ کوردان ڤە پیرۆزترە ژ گەلەك موسلمانێن دی یێن وەك عەجەم و ترك ب گرنگی تر دنێرنە وێ هەڤبەندیێ، ژن ل کوردستانێ، چاڤ ژنێن موسلمانێن دی تر ئازاد ترن، پرانییا ژنئینان و شویکرن ل ناڤ کوردان، ژ ئەنجامێ ئەڤینداریێ سەر هلدەت، ئەڤ هەڤگرتنە ژ وی ئەنجامی پەیدادبیت، رۆلەکێ بەرز و سەرەکی دناڤ خێزانا نوی دا دبینیت)[٨].

دەربارەی ژنئینانێ دناڤ کوردان دا (مەلا ئەنوەر) دبێژیت: (ژن ل دەڤ گەلێ کورد یا خودان رویمەتە، چ رویمەتێ وێ ژ یێ زەلامێ کێمتر نینە، نەخاسمە ئەگەر سالۆخەتێن زانستی و پاقژیێ و تەقوایێ ل دەڤ هەبن، و یا سەربەستە ژی د ناڤ مالێ دا، ئەو ب کەیفا خۆ دەردکەڤیت ژ بلی هندەك مالێن کێم، بەلێ مخابن ئەو د شویکرنا خودا نە یا ئازادە و ب دلێ خۆ نەشێت هەڤژینی هەلبژێریت، شویکرنا وێ بێ رازیبوونا دەیبابا چێنابیت ئەوێت کۆ گەلەك جار بەرێ خۆ نادەنە بەرژەوەندییێن وێ، و بەرێ خو نادەنە هەست و بوچوونێن وێ، بەلکو ئەو بەس بەرێ خوددەنە بەرژەوەندیێن خۆ)[٩].

ژنئینان دیاردەکە ل هەمی جیهانێ یا بەربەلاڤە، نە ژن بێ یی مێری ب قەتینیت و نەمێر دشێت بێ یی هەڤکیان و هەڤسەر بمینیت، چونکی هەر ژ دەمێ دونیا هاتییە دانان، خودایێ مەزن نێر و مێ یێ ل سەر روویێ عەردی دروست کرین و داین، دگەل دروستکرنا ڤان هەردو تۆخما ڤیانەکا بێ قام ددلێ وان دا شوینکر بەرامبەری ئێك، وەکی خودایێ مەزن دفەرمووت: [وَمِنْ ءَاياتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْواجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْها وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً..][١٠].. ئانکۆ: (و ژ نیشانێت مەزناتی و دەستهەلاتداری یا وی، ئەوە وی هەر ژ هەوە (گیانێ هەوە) بۆ هەوە هەڤسەر چێکرن، دا سەبر و هەدارا هەوە پێ بێت، و ل دەڤ ڤەهەسن و ڤیان و دلۆڤانی ئێخستە د ناڤبەرا هەوەدا..)[١١] .

ژنئینان ژ مللەتەکی بۆ مللەتەکێ دی دهێتە گوهارتن ژ لایێ ئیجاد (عادات) و تیتالێن کۆمەلایەتی و جڤاکی ڤە، هەر مللەتەکی ئیجادێت خوەیێت تایبەت یێت هەین و ل پەی ب رێڤە دچن[١٢].

دەڤەرا مە یا بەهدینان وەکی هەمی دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ تیتال و رەوشتێن خۆییێت تایبەت یێت هەین و ژ کەڤندا هەتا نۆکە یێت پاراستین و ژ ناڤ نەچوونە، هەر چەندە هندەك گوهۆرین و کێماسیێ ب سەر داهاتینە بەلێ پا ژ ناڤ نەچووینە و ل جەم خەلکێ دەڤەرێ ب کارتێن و جهێ سەربلندییا مەیە و شانازیێ پێ دبەین.

رێز و سەروبەرێن ژنئینانێ ل دووڤ ڤاڤارتنا ماموستا (محەمەد حەسەن بناڤی)، ل سەر سێ پشکان دهێنە دابەشکرن، ئەوژی:

پشکا ئێکێ: رەنگێن پێ ئاخفتن و ڤایلبوونا کۆر و

كچان.
پشكا دووێ: رەنگێن ژنئینانێ.
پشكا سێێ: داوەت و شاهی[13].
بەلێ مامۆستا (سادق ئامێدی)، ڤان سێ پشكان هێشتا بەرفرەهتر و ل سەر (١٠) قۆناغان دابەش دكەت، ئەوژی:

١- چاڤ كرن و پێكهاتنا هەردو لا - خوازگینی.
٢- دەزگر برن.
٣- نەخت برن.
٤- جلك كەركرن.
٥- بەردەوات.
٦- شەڤا خەنا.
٧- سەرشووا بویك و زاڤا.
٨- بویك ڤەگوهازتن (ئینان).
٩- زاڤا داكرن.
١٠- شەهیانا داوەتێ:
أ- سپێدێ زاڤا ئینانە دەر.
ب - سەر تێشتا بویكێ[14].

ل دووڤ ڤان دابەشكرنا هەردو مامۆستایان، و ل دووڤ ئەو ژێدەرێن(*) ل بەر دەستێ مە و ئەو زانیارێن مە شیاین ل سەر رێز و سەروبەرێن ژنئینانێ خرڤەكرین، یان گەلەك ژ وان مە بخۆ دیتی نە، دێ بەحسێ وان خالان كەین.

## پشكا ئێكێ: رەنگێن پێ ئاخفتن و قایلبوونا كوڕ و كچان:

### * لێگەڕهان:

دناڤ جڤاكا دەڤەرا مە دا دو جۆرە لێگەریان هەبووینە، ئەوژی:
أ- گەلەك جار كچ ژ لایێ باب یان دەیكا كوڕكی دهاتە هەلبژارتن، هەتا دبیت كوڕكی نەدیتباژی، هەما قایل دبوو و خوازگینی دهنارتن (لێ ئەڤ دیاردە گەلەك یا كێم بوو).
ب - كوڕك بۆ خۆ ل هەڤكویفەكێ دگەڕهیت، ئەڤە ژی هندەك جار باب یان دەیكا چاڤی خۆ ل سەر كچەكێ ددانن، نەخاسم دایك سەحدكەتە مرۆڤەكا خۆ و باب سەحدكەتە مرۆڤەكا خۆ، كۆ ئەڤە ل نك هندەك هۆزا وەك تیتالەكێ بوو نە دبوو كچ شوی ب ژ دەرڤەی بنەماڵ یان هۆزا خۆ بكەت، ئەڤێ چەندێ (ڤاسیل نیكیتین) د پەرتووكا خۆدا دووپات دكەت، دبێژیت: هەر (خەلكێ ئویجاخا - بلباس - وەناكەن كچێن خو بدەنە ژ دەرڤەی ئویجاخا خۆ، بەلێ رویدانێن رەڤاندنێ د ناڤ كچێن ڤێ ئویجاخێ دا دزۆرن)[15].. بەلێ ئەگەر ژ لایێ (هەر ئێك ژ وان ڤە هاتبا بەرچاڤكرن ژی)، یان ئەگەر كچەكا ل گوندێ وان بیت، ئەوێ گاڤێ پێدڤی ب چوونا پێش یا كوڕكی نەدكر، چونكە پرانییا وان ئێك دو ل شەڤەرۆكێن سافار قوتانێ یان چوونا بێرێ و یان زیارێن دەخل و برنج و چلی برێ یان ل چوونا مازی و گیایێن خوارنێ ل وەرزێ بهارێ ئێك دو دیتن، كو ئەڤ چەندە ژی هندێ دسەلمینیت كو ل گوندان پتر كچ و كوڕ د سەربەست بوون، دگەلێك دا دەركەڤن كارێن گوندان (سترانێن حەیرانۆكان) ژی باشترین بەڵگەیە بۆ گۆتنێ، لەوما پێدڤی چوونا كوڕكی بۆ پێش كچكێ نەدكر.

هەر ڤێ چەندێ ژی رۆژهەلاتناس (مینورسكی) ژی دسەلمینیت، دەمێ دبێژیت: (چو پەردە دناڤبەرا كچ و كوڕاندا نینە، ئەو ب شێوەیەكێ زۆر باش ئێك و دو دنیاسن، ژنئینان ژی دناڤ واندا ب رێككەفتنە و هەستەكێ رۆمانسی یێ بەرفرەهـ دەستێ خۆ ب سەر دلێن واندا گرتییە)[16] .

بەلێ ئەگەر كچك ل دۆندەكێ دەور و بەران بوو، گەلەك جار كچ ژ لایێ كەسەكی دهێتە چاڤكرن، ل وی دەمی دێ دەمەكی دەستنیشانكەن بۆ چوونا پێش كچكێ ژ لایێ كوڕكی و دەیبابێن ویڤە.

### * ناڤدەستك:

هندەك جار ژی دا كوڕەك دا حەز ژ ئێكێ كەت یان بەرۆڤاژی، ل وی دەمی دا كەسەك دی، دكەفتە دناڤ ڤێ ژنئینانێ دا د گۆتنێ (ناڤدەستك)، ئەڤ ناڤدەستكە چ ژن با یان مێر، بەلێ بەهرا پتر ژن

بوون و ژ ژنکا ژی پیرەژن. چاخێ کوڕکەکی کچکەك دڤیا و کچکێ ئەو نە دڤیا یان بەرۆڤاژی کچکێ کوڕك دڤیا و کوڕکی ئەو نەدڤیا، چ کوڕ بابە یان کچ، نێزیکەکا خۆ، چ دای، خویشك، مەت، ژنمام، باب... هتد، دا ڤرێکەت نك وی (کەسی یان کەسا) دڤیا و دبەڕا دکر و دگۆت هەتا پێ رازی دبوو و دگۆت بلا.

***خوازگینی:**

دەمێ کوڕ و کچ پێك رازی دبوون، ب هەر رێکەك ژ ئەوێن مە گۆتین، ل دووڤدا رۆژەکێ دێ دیارکەن بۆ چوونا خوازگینییا دا مالا بابێ کچکێ ژی پێ ئاگەهدارکەن. بابێ زاڤای یان برایێ وی ل گەل هندەك مرۆڤێن وی دا کارێ خۆ کەن. هندەك ژ ریهـ سپیێن گوندی و مەلا ژی دگەل خودا دبرن، هندەك چانتکێن بچویك یێت تایبەت بۆ خوازگینییا هاتین چێکرن، تژی تشت دکرن و بۆ مالا بابێ کچکێ دبرن و دچوون، (دبەرێ دا هەر گوندەکی هندەك چانتك ژ ڤانا لێ هەبوون و بۆ ڤێ چەندێ ب کاردهاتن، مخابن ڤێکاڤێ نەمانە و یێ ژ ناڤ چووین).. ئەو تشتێن خوازگینییا دگەل خۆ دبرن وەکی: گویز و مێویژ و سێڤا و کەزانا..هتد بوون. دیارییەك بوو ژ لایێ زاڤای ڤە، بۆ بویکێ و مرۆڤێن وێ، گاڤا دگەهشتن مالا بابێ بویکێ، مالا کچکێ دا ل بەر خلمەتا وان راوەستن و سەروبەرێ خوارنێ بۆ کەن، چ پاشیڤەك با یان ڤێقییەك..هتد، دا بۆ چێکەن و دەنێ. هەژیە بێژین هەمی دەما خوازگینی ب شەڤ دچوون و ب کارێ خۆ رادبوون، ئەرکێ سەر ملێ خوازگینییا ئەو بوو، ئەگەر بابێ کچکێ گەلەك نەخت ژ بابێ کوڕکی خواستبا داخواز ژێ دکر هندەکێ ژێ کێم بکەت و خواترا وان بگریت، ژ بەر هندێ هەر یەك ژ خوازگینینا دا بێژیت: بابێ بویکێ بۆ خاترا من تشتەکی ژێ بهێلە، دا بابێ بویکێ دەت خاترا وی تشتەك ژ نەختێ کچا خۆ هێلیت، هەر وەسا بۆ چەکا و خەلاتا ژی هێڤی ژێ دکرن و دگۆت: (بلا ئەڤە ژی ل سەر خواترا مە بیت).. باب و برایێت کچکێ ژی خواترا وان دگرت و چەك و نەختێ کچا خۆ کێم دکرن و بارێ زاڤای خۆ سڤك دکر..(هەلبەت ئیجاد ئەوبوو پشتی خواترا هەمیا دگرت، دا ل دووماهیێ مەلا ژی داخوازێ ژێ کەتن و ژ بۆ خاترا وی ژی هندەك نەخت و زێران کێم بکەت، بێگومان مەلای ژی گەلەك رێز ل نك خەلکێ هەبوو، دا ل سەر خاترا وی ژی تشتەکی هێلن) ب ڤی رەنگی دا پێك رازی بن و مەلاژی دا بێژیت (الفاتحە)، دا فاتحەکێ خوینن و ئەڤە نیشانا پێکهاتنێ بوو، ئەگەر ئەو گوندێ چووینی یێ دویربایە دا وێ شەڤێ مینە ل وێرێ، لێ هەکە یێ نێزیکی گوندێ وان بوو، دا دەستوبرییا خۆ ژێ خوازن بۆ خۆ مننەتا ژێ گرن، دا رابن زڤرنە مالێ، مرۆڤێن وان ژی چاڤەرێ خوازگینان بوون، هەتا بهێنە ڤە، هەر گاڤا دگەهشتنە مالێ دا پسیار ژێ کەن، (ناڤێ تەیرێ هەوە چییە؟) ئانکو چ ژ هەوە خوازتییە، ژ نەخت و زێران، ئەوژی دا بۆ وان بێژن.

***نیشانی (دەزگری):**

ل ناڤ پتریا خەلکێ دەڤەرێ نیشانی بۆ نە دبرن ژبەر دەستکورتییا خەلکێ، بەلێ ئەگەر کەسەکێ حال خۆشبا (زەنگین) یان زوی بویکا خۆ نەڤەگۆهستبانە، دا نیشانیێ بەن پێڤە کەن، ئەوژی نیشانا وێ چەندێ یە کو فلانە کچێ یا شویکری (یاددەزگریێ) دا.. دا کەس دی دلێ خۆ نەدەتێ و نەچیت خوازگینییا وێ.
دا هندەك ژ مالا زاڤای چنە بازێرێ ئامێدیێ (ئەگەر خەلکێ بەرواری بالا و نێروە و رێکانییا بان)، و ئەگەر دەوروبەرێن دهۆکێ بانە، گەلەك جار دچوونە مووسلێ بۆ (جیهازا) بویك و زاڤای، و کڕینا نیشانیێ و تشتێن داوەتێ.. پتریا تشتێن نیشانیێ ئەڤە بوون: (دوو دەستێن جلکا، گوستیرك، کەفیك، هندەك شەکرۆك و چکلێت ئەگەر هەبانە، سێ چوار کەر (قالب) یێت سابوینێ ژ هەمی رەنگا، سێ چوار بکورکەکێت دەزیا، پێنج شەش گەزێت(*) لاستیکێ و شویشەکێ گۆلاڤی..هتد.
پشتی ڤان تشتان دکڕن و دزڤرنە مالێ، دا دەیکا زاڤای یان لێزمەکا وی ل گەل زەلامەکێ مرۆڤێ وان چن مالا بابێ کچکێ و ڤان تشتێن مە گۆتین بۆ بەن، پشتی ژ وێرێ دزڤرین یان هێشتا ل وێرێ کچکێ

خەلەکا خۆ دکرە تلا خۆ یا بابەلویچێ ژ دەستێ راستێ دا خەلك بزانن یا دەزگرێ دا، و مرۆڤێت وێ دا رابن وان شەکرۆك و شرینییا بۆ هەڤال و هەڤکیفێن کچکێ و مرۆڤێت خۆ بەن، دگۆتنێ (شریناهی).

هەژی گۆتنێ یە ئەوێن شریناهیا بویکێ دخوار، بەری بویك ڤەگوهاستبا هندەك تشت بۆ بویکێ دبرن وەك دیاری، ئەڤ چەندە نهۆ ل هندەك دەڤەرێن کوردستانێ ل کارە.. و پێدڤی گۆتنێ ژی ل دەمێ کوڕ و کچ دەزگرێ دا، ئەو جهێ کوڕك لێ با کچکێ شەرم دکر بچیت وێرێ، یان مالا وان، هەتا ئەگەر د رێکەکێ دا کەفتبانە بەرێك کچکێ بزاڤ دکر خۆ ژ رێکا وی بدەت پاش و سەرێ خۆ دچەماند (دەربرین بوو ژ شەرمێ)، هەروەسا کوڕکی ژی، هەتا کچك بۆ ڤەدگوهاست.

## پشکا دووێ: رەنگێن ژنئینانێ..

ل دەڤەرا بەهدینان وەك هەر دەڤەرەك دی گەلەك رەنگێن ژنئینانێ هەبوون، ئەڤان چەند رەنگان ژی چەند هۆکارەك هەبوون بۆ پەیدابوونا ڤان رەنگێن ژنئینانێ، ئەوژی هۆکارێن تەخابەتی و هۆزایەتی و جڤاکی و ئایینی بوون، ل هندەك ژ وان جۆران هێدێ هێدێ بەرەڤ نەمانێ چوون و نهۆ ئەو جۆرە نەماینە (ئەگەر ما بن ژی زۆر دکێمن).. ئەڤەژی ئەو جۆرێن ژنئینانێ بوون ل دەڤەرا بەهدینان:

### *پێگوهۆرکاتی:

پێگوهۆرکاتی زەلام کچا خۆ بۆ کوڕێ خۆ یان بۆ خۆ بدەتە کوڕێ بێ بەرامبەر دا ئەوژی کچا خۆ بدەتە کوڕێ وی یان وی، بێ کو مەهرا ب ئازادیا کچان تێدا هەبیت.. کو پێگوهۆرکاتی د تێکەها موسلمانەتیێ دا نە یا دورستە، هەر وەکو د فەرموودەیێ دا، (کوڕێ عەمەری (خ) گۆت: پێغەمبەری (س) نەهی ژ پێگوهۆرکاتییێ کر(*)).. و پێگوهۆرکاتی: ئەوە زەلام کچ (یان خویشك)ا خۆ بدەت ئێکی کۆ ئەوژی کچا خۆ بدەت وی و بێ یی کۆ مەهرەك دناڤبەرا واندا هەبیت)[17]. لەورا ژی ژ لایێ زانایێن ئایینی ڤە ئەڤ جۆرێ پێگوهۆرکاتییێ حەرام کرن، ئیلا ب ڤان مەرجێن خوارێ:

١- رازیبوونا هەر چواران (هەردو کچ و هەردو کوڕان) تێدا هەبیت، بێ تەعدایی.

٢- ئەڤ مەهرا هەردو کچان نە هندی ئێك بیت.

٣- هەردو کچ د ئازاد بن، د خواستنا مەهرێ دا بێ کەسەك ببیتە مایتێکەر یا چو کەسەکی و چو توخیبا بۆ مەهرا وان نەدانن.

د ناڤ جڤاکێ مە دا پێگوهۆرکاتی پەیدابوویە ژ بەر چەند هۆکارەکان، ئەوژی ئەڤەنە:

١- نەخت (ڤەلەن)، دەمێ نەخت پەیدابووین بۆ ئەگەرەك ژ بەر دەستکورتییا خەلکی ل وی دەمی، نەچار دبوون کچێن خۆ بکەنە پێگوهۆرك، ژ ترسا خواستنا گەلەك نەخت و زێر، پێگوهۆرکاتی دکرن.

٢- دەمێ کوڕەکی و کچەکێ ئێك دو دئەڤاند، لێ گەلەك جار ب دلێ دەیکا یان بابێ (یان هەردووکان) نەبوون کچا خۆ بدەن وی کوڕکی، چ ژبەر هۆکارێن تەخابەتی یان ئویجاخی یان هۆزایەتی..هتد، لەوما مەرجێ پێگهۆرکاتییێ ددانانە بەر مالا کوڕکێ بەلکەی بهێلن و نەخوازن، بەلێ پتریا وان ب پێگوهۆرکاتییێ رازی دبوون.

٣- تۆلڤەکرن، دەمێ ئێکی کچەك د رەڤاند (ژبەر هەر ئەگەرکێ بایە)، پشتی بزاڤا پێکهاتنێ دگەل مالا بابێ کچکێ دهاتە کرن ژ لایێ مرۆڤێن کوڕکی ڤە، مالا کچکێ مەرجێ پێگوهۆرکاتییێ دکرنە (بەدەل) ئانکو ئەوژی کچەکێ بدەنە وان وەك تۆلڤەکرنەك بوو د گەل یێ کچا وان رەڤاندی، دا مالا کوڕکێ کچ رەڤاندی نەچار بن، ل شوینا کچا وان ئەوژی کچەکی بدەن وان بلا ب دلێ وێ کچێ نەبایەژی[18].

گەلەك ئاریشە و نەخۆشی ژ ئەنجامێ پێگوهۆرکاتییێ روی ددا، چونکی گەلەك ب زەحمەتە (چوار) دل وەکی ئێك بن و هەر چوارا ئێك و دو ڤیابانە، گەلەك جار وەسا چێدبوو ئێك دا کچا پیرەمێرەکی بۆ خۆ ئینیت و خویشکا خۆ دەتە وی پیرەمێری بێی ب دلێ وێ بیت.. کۆ ژ لایێ ئایینێ موسلمانەتییێ ڤە دژی ڤی جۆرێ شویکرنێ یە، ئانکو ئەگەر ژن و

مێرا هەڤکویفی دناڤبەرا واندا نەبیت و نە ل رێزەکێ بن، دبیتە ئەگەرێ نەڤێککرنێ دناڤبەرا واندا، لەوما پێغەمبەر (س)گۆت: (ژن ناهێتە مارەکرن ئێلا ب فەرمانا سەمیانی (ولی)، و ناهێتە شویکرن ئێلا ژ هەڤکویفەکی بیت)[19].. هەروەسان ئیمامێ عەلی (خ) ژ پێغەمبەری (س) ڤەدگۆهێزیت: (ئەی عەلی سێ تشت ناهێنە گیروکرن........ و کچ وەکی هەڤکویفەك بۆ پەیدا دبیت)[20].

هەر د جڤاکا مەدا ژی ژ بۆ دانە شوی یا کچێ دەمێ وەختێ وێ هات ئەڤ گرنگییە داینێ، لەوما ژی مەزن دبێژن: (شویێ ئەڤرۆ بۆ سوبەهی نەهێلە)[21]. هەر دیسان دەربارەی پارچا دووێ یا فەرموودەیێ و هەڤکویفی، جڤاکا مەژی، ئەڤ مەرجە بۆ دانە شویا کچێ دانایە، مەزن دبێژن: (دو سەرێت نە ژ رەنگەکی، ناکەڤن سەر بالگەهەکی!)[22]، یان (سەرێ نە ب سەرێکڤە ناچن دەڤ ئێکڤە!)[23]، یان (هەر کەزی زەرەکێ سمبێل سۆرەك ل بەرە)[24]، یان (ژنێت جوان مێرێت جوان دڤێن)[25].

یان هێشتا زارۆك د لاندکێ دا دایبابان دگەلێك دگۆتن، دا بێژن: (هەکەر زارۆیێن مە مەزن بوون، کچا تە بۆ کوڕی منە و کچا من بۆ کوڕێ تەیە!) کۆ ئەڤ چەندە گەلەك جار د ناڤ چیرۆکێن مە یێن فۆلکلۆری ژی بەرچاڤە.

هەلبەت ڤێ چەندێ ژی (نەرێنییێن) خۆ یێن جڤاکی هەبوون، چەندین ئاریشە ژ پێکوهۆرکاتییێ دروست دبوون، وەکی:

١ـ ئەگەر دناڤبەرا ژنەك و زەلامێ وێ دا نەرێککەفتن پەیدابیان، دناڤبەرا واندا نەخۆش دبوو، دا دەیبابێن وێ ژنێ بویکا خۆ (ئەوا پێکوهۆرکا) کچا وان، دناڤ مالێ دا نەخۆشیان بۆ دروست کەن، بلا وێ و زەلامێ خۆ حەز ژ ئێك ژی کربایە (ئانکو تۆلڤەکرنە ژ بەر کچا خۆ ـ پێکوهۆرکا ـ بویکا وان).

٢ـ ئەگەر دناڤبەرا ژنەك و مێرەکی دا نەرێککەفتن پەیدا ببان و ببا ئەگەرێ بەردانا ژنێ ژ لایێ زەلامێ وێ ڤە، دا دەیبابێن کوڕکی زەلامێ کچا خۆ (ئەوا پێکوهۆرکا کچا وان) نەچار کەت، مادەم بویکا وان هاتە بەردان (سەر راست کرن)، دڤێت ئەوژی کچا وان بەردەن، بلا دناڤبەرا کچا وان و زەلامێ وێ دا نەخۆشی نەبن و حەز ژ ئێك ژی کربانە.

٣ـ یان ئەگەر ژنەکێ زارۆك نەبان و زەلامێ وێ ژنەك دی ئینابا ژبەر زارۆکان، دا دەیبابێن وێ کچێ ل سەر کوڕێ خۆ سەپینن دڤێت تۆژی ژنەك دی ل سەر کچا وان بینی و بلا هەتا وێ زارۆك هەبانە ژی.

٤ـ خالەکا دی یا گەلەك گرنگ دناڤ پێکوهۆرکاتییێ دا هەبوو، وەکی نەریتەکێ نە جوان ل نك هندەك ئویجاخان یان عەشیرەتا هەبوو، برنا کچەکا ب پێکوهۆرك بەری پێکوهۆرکا وێ، ب چۆ رێیا قەبویل نەدکرن و ب کێماتی ددانان، لەوما هندەك مالان تەنێ کچەك هەبوویە و دبیت دایك یا پێچارەیە و نەشێت کارێن مالێ بکەت، دا داخوازێ ژ وێ مالا خزماتی دگەل کری کەن، کۆ ئەم دێ بویکا خۆ بەین، پاشی پشتی دەمەکێ دی هوین وەرن بویکا خۆ ڤەگوهێزن، لێ ب هیچ رەنگەکی قەبویل نەدکرن و ب کێماتی ددانان ئەو بەری بویکا خۆ ڤەگوهێزن، لەوما گەلەك جار هەر ل دەستپێکێ دبوو ئەگەرێ هەردو لا بویکێن خۆ بەردەن، هێشتا نە ڤەگوهاستین، خزماتییا وان ژێك ڤەدبوو، کۆ ئەڤەژی مەزنترین زولم بوو ل کچێن خۆ دکرن، چونکە دناڤ جڤاکێ مە یێ کوردەواری دا ژنا دو جار ببیتە بویك ب چاڤەکێ گەلەك کێم لێ دنێران، هەر وەکی د چەند گۆتنەکێن مەزنا وێ چەندێ دسەلمینیت: ((ژنا دوو جارا خەملاندی، چو دلا نە حەباندی!)[26]یان (ژنا بێژن وەکی چەمێ بێ تانە!)[27]یان (ژنکا بێژنە هەرۆ خۆ ل گەل ئێکی دبێژیت!)[28] یان (بێژن بێژنە، مەمکێت بێژنا سێڤێت کرمینە، بێژنا نەئینە، بەرمایکێت خەلکینە!)[29].. ئەگەر نێرینا جڤاکی ئەڤە بیت بۆ ژنا هاتییە بەردان، ئەرێ چارەنڤیسێ وان ژنا چییە دناڤ جڤاکی دا؟! چاوا ل نك خودی نەخۆشترین تشتێ حەلال بەردانە (طلاق)، لەوما ژی د گۆتنەکا مەزنا دا هاتییە: (حەفت جارا خۆ بدە رەڤان، جارەکێ خۆ نەدە بەردان!)[30] .

دەربارەی بەردانێ ل نك کوردان، (مینۆرسکی) دبێژیت: (بەردان ل نك کوردان تشتەکێ ب ساناهییە و ب لەز

ددەت، هندەك جارا دناڤبەرا واندا ل سەر تشتەکی کێشەك پەیدادبیت، دێ بێژیتێ: ئەگەر فلان تشت هۆسا نەبیت، تەلاقێن تە دکەفتی بن، ئەڤ تشتە ب ساناهی روی ددەت، دووڤرا ژی پەشێمان دبیت و دەروونێ زەلامی نەخۆش دبیت، خۆشیا وی د وێرێ دایە جارەکا دی بگەهیتە ڤە ژنا خۆ ڤە، ئەڤەژی ژ وان تشتانە ل گۆرەی ئیسلامێ ناچێبیت، هەتا شوی ب زەلامەکێ دی نەکەت و بەرنەددەت، هەر بۆ دەرێخستنا راستییێ دڤێت بەحسێ وێ بکەین، کو ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ رەوشتە ل باژێران دا بەربەلاڤە، بەلێ ل ناڤ هۆزێن کۆچەری دا خودان رەوشت و نەریتێن سادەترن..)[٣١]

.. هەلبەت جڤاکێ مە ل دەڤەرا بەهدینان پتریا وێ جڤاکەکێ گوندی یە (کۆچەری) بوو، لەوما باوەر ناکەم، ئەڤ بۆچوونا (مینۆرسکی) ل سەر دەڤەرا مە بهێتە سەپاندن، چونکە ئەگەر کویرتر مرۆڤ ڤان گۆتنان شرۆڤەبکەت، زەلام دەمێ دبێژیت ژنێ ئەگەر تۆ هۆ نەکەی تەلاقێن تە ژ من چووی بن، چونکە ئەو دزانیت ژن یا ئامادە نینە ببیتە ئەگەرێ بەردانا خۆ، ئەو دزانیت بەردانا وێ دێ بیتە ئەگەرێ بێ بەهاکرنا بنەمالا بابێ وێ، دیسان ئەو بخۆ ژی دێ دناڤ جڤاکی دا کەسەکا بێ بها بیت (هەر وەکی ئەو گۆتنێن ل ژووری بەحسێ ژنا بەردای دکەن)، لەوما دێ یا زەلام دبێژیت، دێ جێبەجێ کەت، بەس نەهێتە بەردان!

### *ژنئینانا ب قەلەن (نەخت):

ل پێشیێ دڤێت بزانین قەلەن (نەخت) ژ مەهرێ جودایە، مەهر یا ژنکێ یە، کەسێ ماف نینە بێ پی رازیبوونا ژنکێ هیچ (تصرف)ێ تێدا بکەت، چ چەك بن، چ ژی پارە بن، چ ژی ملك بیت. (د زمانێ عەرەبی دا هۆسان مەهر هاتییە پێناسەکرن):

مەهر: ئەو تشتە یێ کۆ مافێ ژنێ، ژ پێش مارەکرنا وێ ڤە، و ئەڤە نە دانەکە ژ زەلامی بەلکو ئەو قەرەبووکرنە ژ پێش ئەو خوشیێن زایندەی یێن زەلام ژ ژنێ دبینیت[٣٢] .

هەر وەك د قورئانا پیرۆزدا د چەند ئایەتەکان دا بەحسێ مەهر (أجور ـ صداق)ێ دکەت، وەکی د ئایەتەکێ دا دبێژیت: (وَآتُوا النِساءَ صَدُقاتِهِنَ نِحْلَةً.....)[٣٣]، ئانکۆ: (و مارا ژنان ب خۆشی بدەنێ، و هەکە وان (ژنان) تشتەك ژ مارا خۆ ب خۆشی (و ب دلێ خۆ) بۆ هەوە هێلا (و گەردەنا هەوە ئازاکر)، ئێدی بخۆن ل هەوە حەلال بیت و نۆشی جان بیت)[٣٤].

یان (فَانكِحُوهُنَ بِاءِذْنِ أَهْلِهِنَ وَآتُوهُنَ أُجُورَهُنَ بِالْمَعْرُوفِ)[٣٥]، ئانکو: (و مەهرا وان ب قەنجی ـ ب ئاوایەکێ دروست و شەرعی و گونجایی د گەل سەر و بەری ـ بدەنە وان...)[٣٦].

بەلێ قەلەن (نەخت) دهێتە وەرگرتن ژ لایێ سەمیان (دەیبابێن) کچکێ ڤە، بۆ خۆ دخوازن نەك بۆ کچکێ، د جڤاکا مەدا پەیدابوونا نەختی ڤەدگەریتەڤە بۆ وان تیتالێن جڤاکی، کۆ هزر دکەن، ئەگەر ژنا بێ نەخت بیت، ل دەڤ کەس و کارێن خەزویری بێ بهایە، هەر وەکی د گۆتنەکێ دا هاتییە: (بێ نەختێ، بێ بەختێ)[٣٧].. یا ژ هزرا وانڤە هندی نەختێ کچکێ گرانتر بیت دێ یا ب قەدرتر بیت، لێ دیارە وان ژ بیرکرییە، نەختێ گران وێ مالێ خراب دکەت، ئەوا خزمانیێ دگەلدا دکەن و کچا خۆ ددەنێ، هەر مەزنا گۆتییە: (نەختێ گران، مالێ وێران)[٣٨].. هەر (مەلا ئەنوەر) ئێك ژ ئەگەرێن رەڤاندنێ دکەتە قەلەنێن گران، وەکی دبێژیت: (.. و ل دەمێ هەلبژارتن ژ دەستێ ژنان ئیاینە دەر و قەلەنێن مەلعون ـ نەخت ـ ئاشکەرا بووین، و ژ بەر نەزانینا هندەك مەلا د کارئینانا مەرجێن مارەکرنێ دا پتر کارتێکرن د زێدەکرنا دیاردا رەڤاندنێ دا هەبوویە.. و سیستەمێ تەخایەتی (طبقات) ژی بەهرەیەك د ڤێ دیاردێ دا هەبوویە)[٣٩].

د ناڤ جڤاکا مە یا دەڤەرێ دا ژنئینانا ب قەلەن، ئێك ژ وان جۆرانە یێن هەتا دەستپێکا سالا (٢٠٠٠)ێ، ئەڤ دیاردە ل کاربوو.. هۆکارێن پەیدابوونا نەختان دزڤرنەڤە بۆ چەند خالەکان، ئەوژی:

١ـ ئەگەر کورکێ چو خویشك نەبانە بۆ خۆ کربانە پێکوهۆرك، هەلبەت بابی کچکێ کچا خۆ بێ بەرامبەر نەددایێ، نەچار دبوو ب قەلەن ژنێ بینیت.

٢ـ وەك بەری نهۆ ژی مە ئاماژە پێکربوو، هندەك جار کچەك و کورەکێ ئێك دو ئەڤاندییە، لێ ئەو کورِ ب

دلێ دایبابێن کچکێ نەبوو، دا نەختەکێ گران ژێ خوازن ب مەرەما هندێ دەستا ژ کچا وان بکێشیت، لێ کورکی ژی ئەو کچ نەدهێلا، چەند قەلەنێ وێ گرانبایە (هەتا گەلەک جار وەک هندەک دیاردێن هۆزایەتی، بنەمالا کورکی ژی مایێ خۆ دڤێ چەندێ دا دکر، ب کێماتی ددانان دەستان ژێ بەردەت، لەوما هەمیا خۆ ددا بەر وی قەلەنی و قەبویل نەدکرن، کورک دەستا ژێ بەردەت).

٣- هندەک جاران دایبابێن کچێ کچا خۆ داینە کەسەکێ دەولەمەند هەکەر ژ کچا وان مەزنتر بایە ژی، یان ئەگەر کچێ نە ڤیابایە ژی، ژ بەر هەژاریێ ددا وی کەسێ دەولەمەند ژ بەر هەژاریا خۆ، لەوما د گۆتنەکێ دا هاتییە (هەیی بە کورێ کەری بە!) ئانکو بەس یێ دەولەمەند بە، نە گرنگە بنەمالا تە چنە و کینە!!

لێ پشتی سالا (٢٠٠٠)ێ وەرە ل ڤێ دەڤەرێ دیاردا پێکگوهۆرکاتی و قەلەنان بەرەڤ کێمبوونێ چوویە، دشێیم بێژم هەما نەمایە، ب تایبەتی پێکگوهۆرکاتی.

## ☆رەڤاندن:

دیارە رەڤاندنا ژنێ د ناڤ جڤاکا کوردەواری دا مینا گەلەک جڤاکێن رۆژهەلاتی دیاردەکا بەر بەلاڤە، لەوما گەلەک رۆژهەلاتناس و دیرۆکناسان ژی بەحسێ رەڤاندنێ کرینە.

(دەمەلوجی) دەبارەی رەڤاندنێ دناڤ کوردان دا دبێژیت: (رەڤاندنا ژنان ل نك كوردان ئویجادەكێ بەردەوامە هەر وەكی ل نك هەمی هۆزێن پێ پەردەپۆشی و خەملاندن ل ناڤ بەلاڤ، و ل نك هندەك مللەتان كێمترە ژ هندەكان، و ژ وان ئێزدینە ئەوێن دبینن رەڤاندن دروستە، و ل نك كوردان رەڤاندن نە یا رەوایە بەلێ هندەك ژ وان تۆش دبنێ، و ل نك هندەكان ژی هەبوون بۆ نینە، ب تایبەت ئەوێن خودان هێز. و رەڤاندن ناهێتە ئەنجامدان ئیلا ب ڤیان و رازیبوون بیت و كێم جار ژی ب تەعدایی بیت. پشتی رەڤاندنێ هندەك كەسێن ریە سپی دێ بزاڤا پێكهاتنا وان كەن، پشتی مەهرا وێ دهێتە دان، ئەوژی كوژمەكێ پارەیی دهێتە دان دبێژنێ (الحشمە) ب كوردی دبێژنێ (حەڤێ كرێتیێ)، كۆ ئەو قەرەبووكرنا نامووسا مالا كچكێ یە ژ ئەگەرێ رەڤاندنێ. و هندەك جار نەشێن هەر دو لا پێك بینن ئەگەر وەكهەڤی دناڤبەرا هەردو لا دا نەبیت ژ لایێ هێز و نە ل ئاستێ ئێك بن، و رویدانەكا ب ڤی رەنگی ل سالا ١٩٤٦ێ ل ناحیا مزووریا پەیدابوو و د ئەنجام دا شەرەكێ دژوار پەیدابوو و چەندین كەس هاتنە كوشتن و ئێمناهیا وان تێكچوو و حكۆمەتێ پێرابوونێن دژوار ب رێكا پۆلیس و لەشكەری دا گرتنە بەر)[٤٠].

هەر تشتێ هەژی ل ڤێرە ئاماژێ پێ بكەین، سەرهاتییەكا كورت یا رەڤاندنێ كو ل ڤێ دەڤەرێ رویدایی، د پەرتووكا (دەمەلوجی)دا سەرهاتیا وێ هاتییە ڤەگوهاستن، ئەوژی دبێژیت: (زەلامەكی ژنەك هەبوو، ژ وێ ژنێ سێ زارۆك ژێ هەبوون، بەری شەش سالان ئەڤ ژنە ئینابوو، ئەو گەلەكا جوان بوو، هندی یێ ب ئەڤینیا وێ داخبار بوو گەهەشتبوو رادەیێ دیناتیێ، شەڤەكێ ژ شەڤێن هاڤینێ یێن جوان، خرۆسكا وی یا شەهوانی زال بوو ل سەر هزرێن وی و هزرا وی چوو رەڤاندنا ژنا خۆ، كو د رامانا رەڤاندنێ دا چوونا نڤینا وێ (أغتصاب)، د ڤێ چوونا نڤینێ دا خۆشیەكا دی ژێ دبینیت، ژ ئەوا ب رازەمەندیا وێ بیت. هندی شیرەت لێ كرن، كو ژ ڤێ هزرا هیچ تشتەكی خۆیا ناكەت ژ بلی دیناتیێ، ئەو چاوا ب رەڤن هەر سێ زارۆكێن خۆ بهێلن؟! بەلێ گۆهداریا وێ نەكر و ژ ركا خۆ نەهات خوار، وەسا دیارە ئەڤ كارە ب دلێ وێ ژی هات، ئینا رابوون رەڤین چوون گوندەكێ نێزیك. ل دەمێ سپێدێ پشتی ئاخفتن بەلاڤەبووی، بابێ ژنكێ ب ڤێ چەندێ زانی، كا چاوا زاڤای وی كچا وی (ژنا خۆ) رەڤاندییە، ئەڤ چەندە ب شكاندنا وی كر، وی چێلەك و كەرەك ژ زەلامێ كچا خۆ خواستن، وەك قەرەبووكرن ژ بەر شەرەڤا خۆ. و ئەڤ كێشە هاتە بلندكرن بۆ نك من، دا ئێك لایی بكەم، من وەسا دیت ل نك ژنكێ ژی ئەڤە نە تشتەكێ مەزنە و چو تێدا نینە، هەر وەكی زەلامەك و ژنا خۆ چووینە سەیرانێ بۆ شەڤەكێ و زڤرینەڤە،

ما کێ شۆلەژێ یە؟! و زەلامێ وێ گۆت: ما نە ژنا منە و چاوا من بڤێت دێ وەکەم؟! و بابێ ژنکێ دگۆت: ئەڤە شکاندنە بۆ من و داخوازا قەربووکرنێ دکەم، پشتی من ل ڤێ کێشی نێرای من نەدیت چو شکاندن تێدا هەبیت، تەنێ وەك دیناتییەکێ زەلامێ گرتی یا وەختییە و بەرێ وی دایە ڤێ ئەحمەقیێ و ئەو وێ قەرەبووکەتن ب زڤراندنا کەرێ وێ چیلێ ژێ بزڤرینیت ڤە)[41].

هەر دەربارەی دیاردا رەڤاندنێ (مەلا ئەنوەر) دبێژیت: ((رەڤاندن د ناڤ کوردان دا هەر ژ دەستپێکا دیرۆکێ هەتا نهۆ هەبوو، لێ ئەڤی عەدەتی بەرەڤ زێدەبوونێ و بەلاڤبوونێ کرییە، نەمازە د ناڤ گوندان دا، و ل دەمێ هەلبژارتن ژ دەستێ ژنان ئیاینە دەر و قەلەنێن مەلعون ـ نەخت ـ ئاشکەرا بووین، و ژ بەر نەزانینا هندەك مەلا د کارئینانا مەرجێن مارەکرنێ دا پتر کارتێکرن د زێکەکرنا دیاردا رەڤاندنێ دا هەبوویە.. و سیستەمێ تەخایەتی ژی بەهرەیەك د ڤێ دیاردێ دا هەبوویە)[42].

رەڤاندن دناڤ جڤاکا مە دا ب دو شێوەیا دهاتە ئەنجامدان، ئێك ژ وان رەڤاندنا ب تەعدایی بوو، ئانکو کەسەکێ خودان شیان چاڤ ددانانە سەر کچەکێ و دبیت دایبابان نە دڤیان ب دەنێ یان کچێ بخۆ ئەو کەس نە دڤیا، بەلێ ئەو کەسێ خودان شیان بوو، دا وێ کچێ رەڤینیت ب تەعدایی، هەر چەندە ئەڤ جۆرێ ژنئینانێ د ناڤ موسلمانەتیێ نە یێ دروستە، چونکە چو کچ ناهێنە مارەکرن، بێ یی سەمیان (ولی)، و بێ رازیبوونا کچکێ..).

جۆرێ دووێ یێ رەڤاندنێ، ب رازەمەندیا کچێ یە، ئەڤ تیتالە ژ هۆکارێ کورەك حەز ژ کچەکێ بکەت، لێ دایبابێن کچکێ نەدەنێ ژ بەر هۆکارێن تەخایەتی، یان هۆزایەتی، یان دەیکێ دڤێت بدەتە مرۆڤەکێ خۆ، یان بابێ وێ دڤێت بدەتە مرۆڤەکێ خۆ، یان کورك ژ مالەکا هەژارە و کچ ژ مالەکا دەولەمەندە.. هتد.. (ڤاسیل نیکیتین) د پەرتووکا خۆدا وێ چەندێ دسەلمینیت، دناڤ هندەك هۆزا دا کچێن خۆ نادەن ژ دەرڤەی هۆزا خۆ، دبێژیت: (خەلکێ ئویجاخا ـ بلباس ـ وەناکەن کچێن خۆ بدەنە ژ دەرڤەی ئویجاخا خۆ، بەلێ رویدانێن رەڤاندنێ د ناڤ کچێن ڤێ ئویجاخێ دا دزۆرن)[43].. هەر ئەڤ چەندە بوویە هۆکارێن زێدەبوونا دیاردا رەڤاندنێ دناڤ جڤاکێ کوردەواری دا، کو فۆلکلۆرێ کوردی یێ پڕە ژ میناکێن هە، لەوما پێدڤی زێدەتر میناکا نینە.

رەنگە دناڤ جڤاکێ مەدا ل نك هندەك هۆزا رەڤاندن وەکی نەریتەکی بیت و هیچ ئاریشە تێدا نەبیت، بەلێ د پرانییا دەڤەرا بەهدینان دا رەڤاندن ژ کارێن نە رەوایە و جڤاك قەبویل ناکەت، لەوا وەکی بەری نهۆ مە ئاماژە پێ کری، کوشتن ژێ پەیدادبوو دناڤبەرا مالا کورکی و کچکێ دا هەتا دگەهەشتە عەشیرەتی یێ، هەر وەکی میناکا بەری نهۆ مە ئاماژە پێ کری.. یان دڤیابا کوڕ و کچ هەردو هاتبانە کوشتن، یان وەك قەرەبووکرنا کرێتییا مالا بابێ کچکێ کوژمەکێ پارەی یێ نە بەر ئاقل ژ مالا بابێ کورکی دهاتە خواستن.. یان ژ پێش کرێتییا کچا خۆ داخوازا کچەکا وان بەرامبەر رەڤاندنا کچا خۆ دکرن، کۆ گەلەك جار دبیت کچا رەڤاندی برایێن بێ ژن ژی نەبانە کو وێ کچا بوویە پێگوهۆرك لێ مارە بکەن، جا هندەك جار دانە بابێ کچکا رەڤاندی یان برایەکێ وێ ب سەر هەوی.

### ☆مەهرکرنا ل سەر پێچکێ:

د بەرێ دا ل گەلەك دەڤەرێن کوردستانێ یا بەلاڤ بوو ب تایبەتی ل گوندا، دو کەسان دەمێ خودێ زارۆك ددانێ، یان هێشتا دەمێ ژنێن وان ب دوو گیان دا بێژن: (ئەگەر ژنێن مە سەرراست بوون، خودێ کورەك دا من و کچەك دا تە، کچا تە بۆ کورێ من، یان کچەك دا من و کورەك دا تە، کچا من بۆ کورێ تەیە.. یان کورەك و کچەك دا حەز ژ ئێك کەن، دبیت کورکی چو خویشکێن مەزن نەبوون بۆ خۆ بکەت پێگوهۆرك، بەلێ ئەگەر خویشکەکا ساڤا هەبایە، دا بابێ کچکێ بێژیتێ: ئەز کچا خۆ دێ دەمە کورێ هەوە، ب مەرجەکی کچا هەوە یا ساڤا بۆ کورێ منە، وەك پێگوهۆرك، لەوما گەلەك جار

ل نك مەلایی، یان ل نك دیدەڤانا ئەڤ رێككەفتنە رادگەهاند، دا دەمێ كچا وان مەزن بیت لێڤە نەبن، ئەگەر خۆ ب دلێ كچكێ نەبیت ژی.. ئەگەر ئەم چیرۆك و سترانێن فۆلكلۆری تێكڤەدەین، ب دەهان ئەڤ میناكە تێدا هەنە، مینا (فەرخ و ستی) و (تەیار ئاغا) و ..هتد.

ل دووماهیا ڤێ پشكێ من زۆر پێخۆشە، ڤێ سەرهاتییا (دەمەلوجی) د پەرتووكا خۆدا ڤەدگێریت، كۆ ئەڤ سەرهاتییە ل ئێك ژ گوندێن دەوروبەرێن دهۆكێ رویدایە، وەك میناكەك ب دەمە بەرچاڤ، دبێژیت:

ژنەكا خزمەتكار بۆ من ژ گوندێ (زڤنكێ) ئینا د ژیێ (١٢) سالێ دا بوو، داكو بكەمە خزمەتكارا خۆ، ناڤێ وێ (ئەسمەر)بوو، بابێ وێ مربوو و دەیكا وێ ژی شوی كربوو، نەڤیا بوو كچا وێ بمینیتە دگەل وێ دا چونكە زەلامێ وێ بێ چارەبوو، پشتی چەند رۆژەكا زەلامەكێ كۆچەرێ (قشویری) كۆ هۆزەكا گەرۆكە، هاتە نك من و داخوازا ژنا خۆ ژ من كر، كو گۆلێبوویە ل نك من خزمەتكارە..!، من گۆتێ: ژنا تە كییە؟ گۆتی: خزمەتكارا تە (ئەسمەر)ە، من گۆتێ: هەی زەبەلاح، ئەڤ زارۆكە ژنا تەیە؟! گۆتی: بەلێ یا ژ من رەڤی. زەلامەكێ زەخم و ب ترس بوو د ژیێ (٥٠)ی سالیێ دا بوو، سمبێلێن وی وەكی كوریا كەری بوون، چاڤێن وی ئاگر و شەڕ ژێ د باری، ئەو ب دەنگەكێ بۆڕ د ئاخفت، عەرد ژ بەر دلەرزی. من پرسیارا خزمەتكارێ كر: ئەڤە زەلامێ تەیە؟ گۆت: نەخێر ئەز نانیاسم و من نەدیتییە، بەلێ خۆیابوو ژێ د ترسییا. پاشی خۆیابوو كۆ كچك ژنا وی زەلامی یە، دەمێ دەیكا وێ شوی ب زەلامێ دووێ كری، وی دڤیا خۆ ژ وێ كچا خلاس بكەت، ئەوی ئەڤ كچكە دایە ڤی زەلامی ترسنۆك ل سەر رووبارەكێ ب (٣) لیران و ل نك مەلایێ گوندی مارەكرییە و وی برییە. بەلێ كچك نەشیایە ببیتە ژنا ڤی زەلامێ وەكی هۆڤان، ژ بەر رەڤییە و چوویە نك دەیكا خۆ، دەیكا وێ ژی ئینایە نك من كرییە خزمەتكار و مەسەلا وێ ل من ڤەشارتییە. من جابا دەیكا وێ هنارت، ئەوێ دانپێدان ب راستییێ كر، ئەز كەفتمە د بەرپرسیارییێ دا، زەلامی دڤێت ژنا خۆ بزڤرینیت و ئەو وەكی هۆڤانە، نە دویرە ئەو وێ بكوژیت یان دەیكا وێ. و كچكێ ئەو وەك زەلامێ خۆ نەڤێت ب هەر حالەكێ هەبیت، من پشنیازەك دا زەلامێ وێ ئەو وێ سەرراست كەت و مەهرا خۆ بزڤرینیتە ڤە، ئەو رازی بوو، بەلێ دەیكا وێ نەشێت فلسەكی ژ مەهرا وی بزڤرینیت. وێ شەڤێ ئەو زەلام ما ل مالەكێ، ب مەرەما رۆژا پاشتر چارەیەكێ ل ئاریشا وان بكەین. ئەو ل مالا گەنجەكێ د (٢٠) سالیێ دا ژ خەلكێ گوندی ما، ئەوی ژنەك هەبوو د (٤٠) سالیێ دا، ئەو دگەلێك دا دهەڤگرتی نەبوون. ب شەڤێ ژنێ گازندە ژ زەلامێ خۆ كرن و گۆتێ تۆ زارۆكی و نەشێی ب مەرجێن میرینیێ رابی، كوركی ژی دگۆتێ: تۆ ژنەكا قەیرەی و نەشێ یی ب كارێ ژنینیێ رابی وەك ژن تەنها وەك دایك بی بۆ من نەك ژن. زەلامێ مێهڤان ژی گۆل ڤێ بگرەڤەكێشا وان بوو، چونكە ئەو مرۆڤەكێ پیسە ئەو ژن كەفتە دلێ وی، ئینا پێشنیارەك دا زەلامێ وێ كو ئەو ژنێن خۆ پێك بگوهۆرن، ئەڤ پیشنیارە ژ هەردو لاڤە هاتە قەبویلكرن، هەردوكان ژنێن خۆ لێك گۆهارتن و هەردو لا دمفاداربوون[٤٤].

ئەڤە چەند جۆرەكێن ژنئینانێ بوون ل دەڤەرا بەهدینان، كو هەژی گۆتنێ یە ل ڤان سالێن دووماهیێ ل پرانیا دەڤەرێ ب رێژەیەكا زۆر باش نە پێگوهۆركاتی و نە نەخت و نە رەڤاندن نەماینە بەرەڤ نەمانێ چووینە.

تشتێ پێدڤی ل ڤێرە بهێتە گۆتن، ل دەڤەرا بەهدینان پتر ژ ژنەكێ، تا رادەیەكێ یا كێمە، هەر چەندە وەك شەریعەتی ماف دایێ پتر ژ ئێك ژنێ بینن، لێ تا رادەیەكێ یا كێم بوو، ئەوا هەی ژی دزڤریت چەند هۆكارەكان، وەكی (توما بووا) دبێژیت: ((چونكی كورد هەمووی موسلمانن رێ ب وان هاتییە دان پتر ژ ژنەكێ بینن، د كەڤندا سەرۆكا گەلەك ژن دئینان و زارۆك گەلەك دبوون، ئەڤەژی ژ بەر بارێ سیاسی بوو، ئەڤرۆ پاشمایێ ڤێ چەندێ وەختە بەرەڤ نەمانێ دچیت، بەلكی هەر نەمایە، بەلێ دناڤ دەڤەرێن شارستانی دا مایە ل نك هندەك خەلكێ نەشارستانی، بەلێ

ئەوژی ژ دو ژنان زێدەتر نائینن)[٤٥] .
هەر ژ هۆکارێن پتر ژ ئێك ژنیێ، نەبوونا زارۆکان، یان کچ هەنە و کوڕ نینن، یان ژبەر نەشیانێن ژنێ بۆ پێدڤیێن زەلامی یێن ژنینیێ، یان ..هتد.
دەربارا وان ژنێن زارۆك نەبن (توما بووا) دبێژیت: (هەر وەسا تەلاق دان تا رادەیەکێ یا کێمە، خۆ ئەگەر هەبیت ژی هۆیێ سەرەکی ئەڤەیە، کو ژنێ زارۆك نابن یان کچ دبن کوڕ نابن)[٤٦].. یا ژ من وەرە هۆکارێ بەردانا ژنێ د جڤاکا کوردەواری دا ژ ئەگەرێ نەبوونا کوڕان یان زارۆك نەبوونێ نینە، دبیت زەلام ژنا دووێ و هەتا یا سێ یێ ژی بینیت، داکو زارۆك ببن یان کوڕ ببن، بەلێ کو ببیتە ئەگەرێ بەردانا ژنێ، ئەز دشێم بێژم د ناڤ کوردا دا نینە، چونکە مە بەری نهۆ ئاماژە پێ کرییە کا چاوان کورد حەز ژ بەردانێ ناکەت.

## پشکا سێێ: داوەت و شاهی..

### ☆بەری داوەتێ:

پشتی ژن دهێتە خواستن و نیشانی پێڤە دهێتە کرن، هەلبەت دێ مالا زاڤای دەست ب کار و بارێن بویك ڤەگوهاستن (داوەت)ێ کەن، پێدڤییە سەروبەرێ داوەتێ بکەن، هەژی گۆتنێ یە پرانییا خەلکی داوەتێن خۆ دئێخستنە د پاییزی دا، چونکە خەلکێ دەست کورتبوو، نەچاربوون خۆ ل هاتنا دەخل و دان و دەرامەتی دگرتن.
ژ تیتالێن داوەتێ ئەو بوو، مالا زاڤای ل دەمێ کرینا جلکێن بویك و زاڤا دگەلدا خەلات بۆ مرۆڤێن زاڤای وەك (خویشك و برا و مەت و خالەت و.. هتد) دکرین.. و دیسان مالا بویکێ ژی هندەك تشتێن ناڤمالێ بۆ کچان خۆ دکرین، لێ ئەڤ ئویجادە ژ دەڤەری بۆ دەڤەرێ جیاواز بوو.
چاخێ نێزیکی داوەتێ دبوو، مرۆڤێن زاڤای هندی ئێکێ دلێ وان ل سەر بایە دا گازی کەن بۆ داوەتێ ب ژن و مێرڤە، چ تشت بۆ کەسێ نەدبرن، ئەگەر ئەو داوتبێت دهاتن گازی کرن ل گوندی بخۆ بان. بەلێ ئەگەر ژ دەرڤەی گوندی بان و ژ گوندێن دەوروبەران بان، دا هەر کەسەکێ گازی دکر، خەلاتەك بۆ دبر و دگوتێ: هوین گازیکرینە داوەتا مە نە (بێ بی گێرانا کارتان یان هیچ تشتەکی)، هەلبەت گازیکرنێ گرنگیا خۆ هەبوویە، لەوما هاتییە گۆتن: (نەخواستیا جهێ خۆ نینە) ئانکو ئەوێ نە دهاتە خواستن شەرم دکر بچیت ناڤ وێ داوەتێ، دبیت تا رادەیەکی تا نۆکە ژی ئەڤ تێگەهە ل کارە.. ئەو کەسێن دهاتنە گازیکرن باش کارێ خۆ دکرن، کو باشترین جلك دکرنە بەر خۆ (پرانییا خەلکێ جلکێن تایبەت ب داوەتان ڤە هەبوون، تەنێ ل دەمێ داوەتان، نەخاسم ئەو کەسێن داوەتکەر و سترانبێژ و سەماکەر)، چونکە ل وی دەمی کەیف کەیفا وان بوو.
دەمێ مالا کچکێ دهاتە ئاگەهدارکرن کو فلانە رۆژێ دێ هێین بویکا خۆ ڤەگوهێزین.. دا کاروبارێن داوەتێ هێنە بەرهەڤکرن، داوەت ژی ژ چەند قۆناغان دهات، رێز و سەربەرێن داوەتێ ل دووڤ ڤان قۆناغان دهاتنە کرن:

### ☆بویك و سەرخەنا بویك و زاڤای..

ئەگەر بویك ل گوندێ زاڤای بیت، ژن و مێرێن گازی کرینە شەهیانێ ب رێکا شەکر و خەبویس گێرانێ دێ ل مالا زاڤای ژن جودا و مێر ژی جودا خرڤەبن، هەر ئێکی ژ وان دەستکەکا سترانبێژا خۆمالی هەیە دەست ب ستران و لاڤژان دکەن پاشی ل جهێ بۆ بەردەستکری خرڤە دبن.
زەلام ل مالا زاڤای دەست ب سترانێن تایبەت ب سەرێ زاڤای دهێنە گۆتن دکەن، خەنا دهێتە شێلان، دی تۆلازەك هێتە دەستنیشانکرن ژ مرۆڤ یان هەڤالێن زاڤای ژ بۆ خەناکرنا تبلا زاڤای (د ڤێت ئەوێ تبلا زاڤای خەنا دکەت هێشتا ژن نەئینابیت).. ل دەمێ دەست ب تبلا زاڤای دکەن، ئەوێن هاتینە هەلبژارتن بۆ ستران گۆتنێ دێ دەست ب سترانێن سەری زاڤای کەن، وەکی ڤێ سترانێ:

| | |
|---|---|
| دوو کوڕك ژێلەل تێنۆ | هەری زاڤا |
| دوو لاوك ژێلەل تێنۆ | کوڕکە زاڤا |
| هەر دوو تەمبویرێ دبێنۆ | هەری هەی زاڤا |

دەواتەك ل دهۆكێ ل سالا ١٩٧٦



**ل سەر سەرێ یارێ بێنۆ هەری هەی زاڤا**
**ل سەر سەرێ یارێ بێنۆ کوڕکە زاڤا..**

پشتی تبلا زاڤای خەنا دکەن، هەر ئێك ژ وان گەنج و تۆلازێن ل کوچکێ دێ هندەکێ ژ وێ خەنایێ د تبلا خۆ دەن و ئەڤە ژی وەك تبەرکەکی یە.

ژنان ژی بۆخچکا بویکێ ژ جلکێن بویکینیێ بۆ کەرکرین و دروین، ژ کراس و کورتەك و ئێلەکێ خەجیکری و هەڤال کراس، خێلی و پێلاڤ و گولاڤ و چەند تویرکێن خەنایێ و سێ قالبێن سابوین و دگەل لیفکەکێ یان دووان و پێنج دەرسۆکان، دو بۆ دەستان، دو بۆ پێیان، و دەسمالەکا مەزن یان دەرسۆکەکێ ژی بۆ سەری، دێ هەمویا کەنە دناڤ بۆغچکەکێ دا، هندەك دبێژنێ چەکما بویکێ (یان جیهازا بویکێ).. پاشی ژنێن بۆ پویلکی و دگەل سەرسپی و هندەك زەلامان دێ بەرەڤ مالا بابێ بویکێ ڤە چن ب ستران و لاڤژە، وەکی ڤان لاڤژان دبێژن:

**های ژووردا ژووردا ژووردا منێ گۆل بەیازێ**
**ل نیڤا گۆلێت سۆردا مالی منێ گۆل بەیازێ**
**را دمویسم د هنگۆری دا مالی منێ گۆل بەیازێ**
**های پێدا پێدا پێدا مالی منی گۆل بەیازێ..**

یان:

**چ دارا ل ناڤا دارا نارۆنێ نارۆنی نارۆنا من**
**چ دارا ل ناڤا دارا کورتکێ رەندکێ بەرخکا من**
**تەڤشیکێ دەست نەجارا نارۆنێ نارۆنێ نارۆنا من**
**تەڤشیکێ دەست نەجارا کورتکێ رەندکێ بەرخکا من..**

(دا گەلەك درێژ نەبیت، ئەگەر خەنا بویکی ل

رێ و رەسمێن خەناكرنێ



گوندێ زاڤای بیت یان ل گوندەكێ دی بیت، هەر هەمان سەروبەرێ خەنایێ دهێتە گێڕان، لەوما دێ بەحسی خەنایا بویكێ دەمێ ل گوندەك دی بیت كەین)..

رۆژەكێ د بەری داوەتێ دا پویلك دچیت، دا مالا زاڤای زەلامەكی وەك قاسد هنێرنە گوندێ مالا بابێ بویكێ، دا ئەو هاتبانە ئاگەهداركرن كو داوەتە، دا مالا بویكێ بەرهەڤیا كچا خۆ كربانە.. چەند كچەك ژ یێن مالا زاڤای دگۆتنێ بەربویك، دگەل ژنەكا دانعەمر كۆ دگۆتنێ (سەرسپی) (*) و دگەل دو سێ زەلامان دەستنیشاندكرن، دا بۆغچكا بویكێ دگەل خۆ بەن و ل دەوارێن خۆ سویار بن، هەر دەمێ ژ گوندی دەردكەتن دەست ب گۆتنا ستranان دكرن، هەتا دگەهشتنە گوندێ بویك لێ، هەلبەت ژ تیتالێن

داوەتا ئەو بوو، هندەك كەس دا هندەك ئامانێن تژی ئاڤ بەن و چنە سەر بانەكێ كو دزانی دێ پویلك تێڕا بۆریتە مالا بویكێ، دەمێ پویلك دگەهەشتە نك وان ئەو دا وێ ئاڤێ ب سەرێ پویلكی دا كەن، وەك ئویجادەكا داوەتان بوو، لەوما گەلەك جار دەمێ پویلك دگەهەشتە نێزیك گوندی ستران نە دگۆتن، دا خەلكی نەزانیبایە كۆ پویلك هات، هەتا د هاتنە بەر دەرێ مالا بابێ بویكێ.. (ئەگەر گەهشتبانە مالا بویكێ، ئێدی وان رێ نەددان كەسێ دناڤ مالان وان دا ئاڤێ لێ بكەن و شل بكەن، دگۆتنێ هوینژی دزانن دخانیڤە هوین چ لێ ناكەن)(*).

ل پشتی شیڤ دخوارن دا، خەنا ترش دكر و دەستێت بویكێ ددا و تۆلاز و بچویكێن گوندی ژ دچوون دەستێن خۆ خەنا دكرن، هەتا درەنگی شەڤ

ستران دهاتنه گۆتن، بەر بکەڤنه سەر جهێن خۆ یار و ترانه ب بویکێ دکرن و ئەڤ کورته بەندێت نارینکی بۆ دگۆتن:

**نارین ژ ماڵێت ماڵدارا**
**خەنا د تەفسی و ترارا**
**سەمایه ل بن گۆهارا..**

یان:

**خانیکێ رەخ ئاقاری**
**گرێ خوه بکه ئێکجاری**
**خوه بگره ل سەر دەواری..**

یان:

**ئەڤ شەڤه بنڤه تێره**
**شەڤەك دی وەغەر خێره**

***

**ئەڤ شەڤه بنڤه بتنێ**
**شەڤەك دی وەیله ل منێ..**

سپێدێ زوی سەر سپی دا رابیتن ئاڤێ گەرم کەت و سەرێ بویکا خوه شۆت، چێنه دبوو کەسێ سەرێ بویکێ شویشتبا ژ سەر سپی و کچکا ب دەیباب پێڤه، چونکی باوەریا وان ب کەسێ دی نەدهات و دگۆت نەکۆ فندەکێ (فێلەکێ) لێ بکەن و زاڤای گرێدەن، وەسا دهاته گۆتن دەمێ سەرێ بویکێ دشۆن چی مویێ وێ ئێك هلگریت و گرێدەت دێ زاڤا هێته گرێدان، ڤێجا هەر ژ بەر هندێ دەمێ سەرێ بویکێ دشۆیشت بەربویا نۆبەت لێ دگرت.

کچکا ب دەیباب دا بەری سەرێ خۆ شۆت، ژ نوی دا سەرێ بویکێ شۆن، چاخێ سەرێ بویکێ دشۆیشت نەدبوو روینشتبا سەر چو جها و دڤیا ل سەرپێت خۆ راوەستابا ژ قۆنڤه، ئەڤەژی ژ بەر هندێ بوو نەکۆ فێلەك لێ هاتبا کرن و زاڤا گرێدابا، گاڤا سەرێ بویکێ دشۆیشت ئەڤ سترانه دگۆت:

**کا عەردێ بویك لێ شویشتی**
**مەکانێ بویك لێ شویشتی**
**ب تەڤر و بێرا ماڵشتی**
**دایکوکێ خوه ل سەر کوشتی..**

یان:

**عەردێ نارین لێ شویشتی**
**عەردی نارین لێ شویشتی**
**دایکوکێ خوه ل سەر کوشتی**
**دایکوکێ خوه ل سەر کوشتی**
**کانوین و هەردو چری**
**کانوین و هەردو چری**
**شولکێ خودێ کری**
**شولکێ خودێ کری**
**دای و کچێت ژنك کری**
**دای و کچێت ژنك کری..**

پشتی سەرێ وێ دشویشت، کچکا ب دەیباب دا کارێ وێ کەت و چێنەدبوو قولپك و لەوندیێن وێ گرێدابان، بێگومان ئەڤەژی ژ ترسێت گرێدانا زاڤای بوو، گاڤا کارێ وێ دکر کچکا ب دەیباب و بەربویا ئەڤ سترانه ژ نارینکێ دگۆت:

**نارینێ دەبکا منێ**
**تۆ بکه کارێ منێ**
**هنده هەتا مرنێ..**

پاشی دا هندەك گولاڤێ لێ کەن و خەملینن و بەن ژوورا تایبەت ب بویکێ ڤە و مینن ل هیڤیا داوەتێ هەتا دهات. هەژی گۆتنێ یه بێژین کارێ بویکێ هەر ژ شمکێ و پێلاڤێ هەتا کەفیکەکا سەری سپی بوون، ژ بلی وان کەسێت نەدشیان و ژێ نەدهات کارێ بویکا خوه باش بکەن.

پشتی کارێ وێ دکر و هەڤال و هۆگرێت وێ دچوون خاترا خوه ژی دخواست و ئەڤ سترانه دگۆت:

**دێ نارینێ ب دەرینن**
**پەرچەمێ ژ بەر هەلینن**
**دا هەڤال تێر ببینن..**

### ☆ڤەگوهاستنا بویکێ..

رۆژا پاشتر مرۆڤێت زاڤای خۆ پێك دئینا و کارێ خۆ دکر و دچوون بویکێ، ئەڤه ئەگەر بویك ل گوندی

نەبا و ل گوندەكێ دویر با، ئەگەر ل گوندی با و مالا وێ نێزیكی یا زاڤای با، پێنج شەش زەلامەك ل گەل سێ چوار ژنكەكا دا چن بویكێ كاركەن و ب پیبا دئینا مالا زاڤای، بێگومان ل گەل ستران و دهۆل و زۆرنایێ یان دۆدكێ (ئەگەر یا ب داوەتڤە)، لێ ئەگەر مالا بویكێ پویچەكێ یا دویربا ژ مالا زاڤای دا پێنج شەش دەوارەكا خەملینن و بەرپشت كەن و بەن بویكێ لێ سویاركەن و ئینن، دیسان ب ستران و رەقاس و داوەتڤە دچوون.

تشتێ هەژی گۆتنێ بە بێژین، ئەگەر ئەڤ داەتە پێكوهۆركانێ بایە، دناڤبەرا وان دو مالان دا، دڤیا هەر گوندەك بویكا خۆ د رێكەكا جودا ژ یا دی را ببەت و هەكەر هەر دو دەهوات ل دەمێ ڤەگوهاستنا بویكان دا، داوەتیێن وان كەفتبانە بەرێك و د ئێك رێكێ را هاتبان، دەمێ دگەهشتنە بەر سینگێ ئێك، گەلەك جارا شەڕ و كوشتن ل ناڤبەرا هەردو لادا چێ دبوون، كەسێ رێك بۆ كەسێ نەبەردا كۆ تێرا بچیت، چونكە كەسێ یا كێم بۆ كەسێ نەدادگێڕا، كۆ گەلەك جار دبوو ئەگەرێ كوشتنا دناڤبەرا وان هەردو لایان دا[٤٧].

بەلێ ئەگەر بویك ل گوندەكێ دویر بایە، داوەتی دا دەوارێن خۆ خەملینن و ژن و زەلام لێ سویاربن، بەرەڤ گوندێ بویكێ ڤە چن، (ئەگەر ل دەمێ خوازگینییا مەلایی ـ ئزن ـ ژ بابێ بویكێ وەرنەگرتبایە، دا مەلایێ گوندی دگەل خۆ بەن ژ بۆ وەرگرتنا ئزنێ ژ باب یان سەمیان (ولی) یێ كچكێ).. هەر وەسا دگەل خۆدا هندەك (گویز یان مێویژ یان سێڤ) دبرن، چونكە دەمێ بویك ژ گوندی دەردئێخست، زارۆكێن گوندی رێ ل داوەتیا دگرت و داخوازا گیسكی دكرن، ئەوژی دا وان گویز و مێویژان دەن وان دا رێكێ لێ بەردەن.. ل دەمێ چوونا بویكێ ب رێڤە چ ب دەهۆل و زۆرنا یان سترانێن دەنگی كۆ چەند ژنكان دگۆتن و چەندان ڤەدگێران، بەرەڤ گوندێ بویك لێ دچوون.

دەمێ داوەتی دگەهشتنە ناڤ گوندی و نێزیكی مالا بویكێ ببانە، دا ژنكێن دگەل داوەتێ چووین ڤێ سترانێ بێژن:

**های هاتن هاتن**
**فاتماكێ مێهڤان هاتن**
**ل دوورێت ڤەسرێ وەرهاتن**
**ل سەر سەرێ فاتێ هاتن**
**های بێنۆ بێنۆ بێنۆ**
**فاتماكێ مێهڤان بێنۆ**
**ل دورێت ڤەسرێ وەربێنۆ**
**ل سەر سەرێ فاتمێ بێنۆ..**

كو ل دەمێ گەهشتنا داوەتیان بۆ نك بویكێ، ئەڤ بەندێت نارینكێ دگۆتن:

**ئەمێت هاتین تە بنیاسین**
**تە ب كورتەك و كراس كەین**
**تە ژ ماڵبابێ خلاس كەین**

***

**ئەمێت هاتین تە ببینین**
**بێهنەكێ ل دەڤ تە روینین**
**تە ژ ماڵبابێ هلینین..**

هەتا كو فراڤینا داوەتییا بەرهەڤ دبوو، زەلام ل ماڵەكێ یان مەیدانەكێ دا داوەتێ كەن و سترانان بێژن و ژن ژی ل مالا بویكێ سترانان بێژن كارێ بویكێ كەن.

پشتی فراڤین دخوارن و بەرهەڤیا خۆ دكرن، دا دەست ب برنا بویكێ كەن، دا ژنك كارێ بویكێ كەن و جیهازا وێ لێكدەن، گاڤا بویك رادكر دو زەلامێن دەسنیشانكری ژ داوەتییان دا چن بویكێ راكەن، ل دەمێ رادكر ژنكان ئەڤ سترانە د بەرڕا دگۆت:

**مە راكر چەندا كێلە**
**خابویرێ د ئاڤێت پێلە**
**نارینێ ماڵباب هێلە**

***

**یا رابوی راوەستایی**
**لەوەندی داهێلایی**
**یا مایی ل هیڤیا برایی..**

ل دەمێ راكرنا بویكێ وەك تیتالەكێ بوو دڤیا سێ جار

راکریایە، هەر وەکی د ناڤ کەڤنە باوەریێن کوردەواری دا هاتییە: (ژ بەری بویکێ ژ مالا بابێ دەربێخن، ژنکا سەر سپی یان ئەو زەلامێ دگەلدا دچن بویکێ بینن، دێ پارچەیەك قوماشی یان بەندکەکی ب درێژاهییا مەترەکێ ئینن و ل دوور بەژنا بویکێ را ئینن و دێ دەستێ خوە دەن ملێ بویکێ و سێ جارا وێ راکەن ژ پیاڤە دەینن ڤە، و هەر جارەکێ دێ گرێکێ ڤەکەن و جاردی ڤەکەن و جاردی ڤە گرێ دەن.. دبێژن ئەڤەژی نیشانا هندێ یە کو مرۆڤ دژیانا خوەدا د سێ قوناغا را دبۆرت، ژ دایك بوون، شوی کرن، مرن)[٤٨] .. دیسان ل هندەکێن دی، ئەو راکرن و داناندن بۆ هندێ یە (دا دەولەتا بابێ خۆ دگەل خۆ نەبەت!).

هەر ژ تیتالێن ل دەمێ راکرنا بویکێ، لەوندیێن وێ بەرددەن، برایەکی وێ یان مرۆڤەکێ نێزیکی وێ، هندەك پارا دکەتە دناڤ لەوەندیێ وێ را و گرێ دەت، هەکو گەهشتنە مالا زاڤای و دانا سەر جهێ وێ، بچویکەکێ (کو دڤێت کورك) بایە، (یێ ب دایك و باب) کەنە ددانگا (کۆش)ا وێ دا (دا ل پاشەرۆژێ ئەوێ ژی کورەکێ وەکی وی هەبیت)، ئەوژی دێ وان پارا دەتە وی بچویکی[٤٩].

بەری بویکێ ژ مالێ بیننە دەر، ئەگەر نە پێکوهۆرکاتی بایە، دا هندەك ژ لێزمێت بویکێ (پشتە دەر) دگرت، دا دەرگەهی دائێخیت و دگۆت: (هینگێ ئەم دەرگەهی ڤەدکەین، هەتا هوین پشتەدەرێ نەدەن، هوین بویکێ نابەن)، دا نەچار بن کوژمەکێ پارەی دەنێ، دا دەرگەهی لێ ڤەکەت، دگۆتنە ڤێ دیاردێ (پشتە دەر).

هەکو بویك ژ خانی ئینا دەر، دێ بویك سەرێ خۆ چەمینیت داکو دەولەت (خێر و بێرا) مالا بابێ وێ بۆ مالا زاڤای نەچیت[٥٠].. (ئەو کومێن خۆرت و جوان و زەلامێن سەرە پێن دل تەر و کەیف چی، خاترا خۆ ب ڤێ سترانێ ژ مالبابا بویکێ دخوازن:

**بیننە دەرێ ژ خانی**
**مالکوکێ ئاڤا**
**بیننە دەرێ ژ خانی**
**ئەم چووین مالی ئاڤا**
**سویارکەنۆ ل جانی**
**مالکوکی ئاڤا**
**سویارکەنۆ ل جانی**
**ئەم چووین مالی ئاڤا..**

دەمێ بویك ل هێستری یان هەسپی سویاردکرن، دێ کچکەکێ ل پشت بویکێ سویارکەن، بەلێ دڤێت ئەو کچك نە ئێتیم و سێوی بیت ئانکو یا ب دایباب بیت، ئەڤ سترانە دگۆتن:

**هەسپێ بینن ژ گارانێ**
**دا کەنە ئەختە خانێ**
**لێ سویارکەن چاڤ دەرمانێ..**

گاڤا بویك سویار دکر، تژی دۆرا زەلام و ژن و جحێل بوون، دو ژنکا ئەڤ بەندا نارینکێ دگۆت:

**نارینا منێ بێ عێبێ**
**کەزی ژ تاکێ ملهێبێ**
**پێ خوە باڤێ رکێبێ..**

پشتی ب رێ دکەتن و دچوون، دیسا ئێکی سەرێ دەوارێ بویکێ دکێشا هەتا ژ گوندی دەردئێخست، مرۆڤێت زاڤای خەلاتەك ددا وی زەلامی و دگۆتنێ (سەرکێش).. ژنك و زەلاما ستران دگۆتن و لێك ڤەدگێران، سترانێن چوون و هاتنێ ئێك بوون و ژێك جودا نینن.

داوەتی هەتا دگەهنە گوندێ زاڤای، چەندین جۆرێن سترانان ژ لایێ ژن و زەلامێن داوەتی ڤە دهێنە گۆتن، و داوەت دگەهیتە بەر دەرێ زاڤای، ڤی سترانێ دبێژن:

**کانێ دمیکا زاڤای**
**کانێ دمیکا زاڤای**
**ستوشکەستی پێ خەلیایی**
**ستوشکەستی پێ خەلیایی**
**کا جهێ وێ دانایی**
**کا جهێ وێ دانایی..**

هێژ داوەت نە گەهەشتی بنەجها خۆ، ئودەك بۆ

بویكێ ڤاڵە دكر و ل قولاچەكا وێ (پەری) ڤەددا و ژنكەك ل گەل كورِكەك و كچكەكێن ب دایباب پەری ڤەددان، مەبەست ژ كورِك و كچكا ب دایباب ئەوبوو دا بچویكێن وان (بویك و زاڤا) نەبن ئێتیم و سێوی و هەتا مرنێ ل گەل د ساخ بن، دەمێ پەری ڤەددان ئەڤ سترانە دبەرِا دگۆتن:

**قەسرێ ئاڤاكە قەسرێ ئاڤاكە**
**هەرێ (عەمەرۆ) قەسرێ ئاڤاكە**
**تو وی (عەلی) دناڤدا زاڤاكە..(*)**

زاڤا یێ ل سەر بانی ل هیڤیا وێ كومەكا ئاخێ یا ل بەر پێت وی، (دێ رەحەت پێ خۆ ل وێ ئاخێ دەتن و ب سەرێ بویكێ وەركەت)، چونكو باوەری یا كوردان یا وەسان بوو (ئەگەر پویچەكا ئاخێ هاڤێتە سەرسەرێ بویكێ و بەر پێت وێ، ئێدی هەتا هەتایێ دێ مینیت یا گوهدار) (*)..

دەمێ چنگلێن بویكێ دگرتن و دا ل دەرازینكا خانی بەرێڤەكەن، دەیكا زاڤای قوپكێ خۆ یێ تژی پارە و گویز و شەكرۆك و چكلێتا دا ل بەر پێت بویكێ دەت و شكێنیت، بچویك دا بۆ خۆ وان تشتا ڤێدەن و هەلگرن. پویلكە ئان ژی شریناهییا بویكێ بوو دا هەمی دەما ئەو و هەڤسەرێ خۆ ل بەرێك دشیرین بن، و دا بویكێ بەن سەر جهێ وێ، گاڤا دبر دو ژنكا ئەڤ بەندا سترانێ دگۆت و دووا ڤەدگێرا:

**كانێ دەیكا زاڤای**
**ئەو تەختێ تە دەینایی**
**بویك هاتۆ راوەستایی..**

پاشی بویك ددانا سەر جهێ وێ ل بن پەریێ، دوو ژنك دا ڤێ سترانێ بێژن و دووا ڤەدگێرا:

**ئەو كەسكێ وەكو دەزی**
**مە تێرا دیتن كەزی**
**تە پیرۆزبیت ئەو خەسی..**

چاخێ بویك ددانا سەر جهێ وێ، لێزمەكا زاڤای دا كورِكەكێ بچویك كەن د كۆشا وێ دا ب مەبەستا هندێ كو خودێ زوی بچویكا ب دەتێ و یێ نەخری كورِبیت.. هندەك ژنك دمان ل نك بویكێ یێن دیژی دەوات دكرن.

و ئویجاد ئەوبوو ل گوندان، هەر ماڵەكێ ژی ل نك خۆ هندەك خوارن حازر دكر (ل دووڤ پێچێبوونا خۆ)، و بۆ مالا دەواتێ دبرن (كو ئەڤە ژی هاریكارییەك بوو بۆ مالا زاڤای دا بارێ وان گەلەك گران نەببایە)، و خوارن ژی ل سەر بانەكێ بەرفرەهـ ددانان و بۆ زەلاما ل لایەكی و بچویكان ل لایەكی، دگۆتنە ڤی خوارنێ (دەوات نەبی).

## - سەرشوویا زاڤای..

پشتی بویك دگەهیتە گوندی، دێ دەست ب سەرشووا زاڤای كەن، ئەوژی جل و ئەو تشتێن پێدڤی سەرشویشتنێ دكرنە دناڤ بۆغچكەكێ دا، (دەمێ جلك دكرنە دناڤ بۆغچكێ دا، تایێن بۆغچكێ دگەل ئێك نەگرێ ددان، بەلكو دسەر ئێك را دبورینن و ب دەرزییەكی دگەهینن ئێك چونكە هەكەر گرێدان دبێژن زاڤا ژی دێ ئێتە گرێدان)[51].. كەس و كارێن زاڤای و داوەتی دا زاڤای بەرەڤ جهێ سەر شویشتنێ بەن، چ ل سەر كانییێ بایە یان ل سەر شیڤێ یان ل سەرشۆیەكێ، دا چن سەر ئاڤەكێ، كۆ بەری هینگێ دوو گەنج دچوون كوچك هەلدكر و مەنجەلك ددانا سەر، دەمێ زاڤای دبەنە جهێ سەرشوویێ، ب رێڤە هندەك سترانێن ب سەرشوویێ ژ لایێ زەلامان دهێنە گۆتن، وەكی ڤێ سترانێ:

| | |
|---|---|
| **زاڤای ببەنە سیلاڤێ** | **زاڤا هەی زاڤا** |
| **زاڤای ببەنە سیلاڤێ** | **كورِك هەی زاڤا** |
| **لێ ب رەشینن گولاڤێ** | **زاڤا هەی زاڤا** |
| **لێ ب رەشینن گولاڤێ** | **كورِك هەی زاڤا** |
| **ل سەر خاترا بەلەك چاڤێ** | **زاڤا هەی زاڤا** |
| **ل سەر خاترا بەلەك چاڤێ** | **كورِك هەی زاڤا..** |

هەر وەسا تۆلاز و گەنجێن رەڤاسكەر دەست ب رەڤاسێ دكەن، ب كەیف و خۆشی دچنە سەرشوویێ.

بەری دەست ب سەر شویشتنا سەرێ زاڤای کربانە، دا بچویکەکێ نەبالغ ئینن سەرێ وێ ل وێ سەرشوویێ دا شوون، پاشی دا مرۆڤەکێ زاڤای ل بەر ئەو بەرێ دێ سەرێ زاڤای ل سەر شوون زێرەڤانی دکر، دا کەس ژ دەواتییان وی بەری ژ جە نە وەرگێریت، چونکی دگۆت ئەگەر ئەو بەر هاتە لڤاندن یان قەلپاندن دێ بیتە ئەگەرا گرێدانا زاڤای.

و زەلامێن ب چەك دێ هندەك کێلان ل بەر بەتەکێ بەرامبەری خۆ ڤەدەن و دەست ب ئارمانجانێ کەن، گەلەك جار ئارمانجانی دبوو هەڤرکی دناڤبەرا گوند و گوندی دا و ناڤ دئێك ددان، هەتا سەرشویشتنا زاڤای ب دووماهی دهات.

دیسان ل دەمێ زڤراندنا زاڤای بۆ گوندی، دەست ب تەق تەقا تڤەنگا و ستران و رەقاسێ، هەتا دگەهشتنە مالا بۆ زاڤای و زەلامان بەرهەڤکرین، (چونکە جهێ ژن و زەلامان ژێك جودا و ژێك دویر بوون).. ئانکو داوەتێن رەشبەلەك ل ناڤ جڤاتا مەدا ب هیچ رەنگەکی نە دهاتنە کرن، بەلکو ژنکان جودا داوەت دکر و زەلامان جودا.

## -سەرێ زاڤای و نارینك(*)

ل مالا زاڤا لێ دروینشت دگەل مهڤانێن داخوازکرینە داوەتێ، دا زاڤا دگەل وان مێهڤان ریهسپیێن گوندی ل ژوورەکێ روینە خوارێ، و گەنج و تۆلاز دا ل مەیدانەکێ داوەتەکا بەرفرەه گرێدەن و ب سترانێن داوەت و گۆڤەندا دیلان دشاراندن.. و ل دیوانا زاڤای ژی دەست ب سترانێن سەرکی زاڤای کەن، وەکی ڤێ سترانێ:

| | |
|---|---|
| **دیوانا ل سەر دیوانێ** | **میرۆ رابە ژ دیوانێ** |
| **دیوانا ل سەر دیوانێ** | **شمکێ دانن میر رابۆ** |
| **چ دیوانەکا تەنگە** | **میرۆ رابە ژ دیوانێ** |
| **چ دیوانەکا تەنگە** | **شمکێ دانن میر رابۆ..** |

هەر هەمان جۆرێ داوەتێ ل مالا بویکێ ژی دهاتنە کرن، کچ و قیزێن گوندی دا ل مەیدانەکێ دەست دیلان و گۆڤەندی کەن و سترانێن تایبەت ب داوەتێ ڤە بێژن داوەتی ل بەر کەن.. و سەرسپی و ژنێن سەرە ژی ل ژوورا بویکێ دا دەست سترانێن نارینکێ کەن.. ئەڤ پارچێن نارینکێ ل دیوانا بویکێ دهێنە گۆتن، هندەك ژ وان وەك شیرەتانە و هندەك ژی ب رندی و جوانی و سپەهیا بویکێ دهێنە گۆتن، وەکی ڤان میناکان:

**زراڤێ وەکی داڤێ**
**زراڤێ وەکی داڤێ**
**مە تێرا دیتن چاڤێ**
**مە تێرا دیتن چاڤێ**
**تە پیرۆزبیت ئەو چاڤێ**
**تە پیرۆزبیت ئەو چاڤێ..**

یان:

**های ل تانا، های ل تانا**
**نارۆنکێ نارم جانێ**
**نارۆ باهیڤا تەرە**
**نارۆکێ نارم جانێ**
**مە ئینا بۆ ژ گەڤەرە**
**نارۆنکێ نارم جانێ..**

پاشی ئەو جڤاتا زاڤا لێ روینشتی، دا رابن نڤێژێ ب جەماعەت کەن و زاڤای ژی نڤێژ دگەل وان دکر.. و دا مەلایێ ئینن دا کو بویکێ ل زاڤای مارە بکەت، بەلێ ل دەمێ مارەکرنێ، دێ ژوورەکێ ڤالاکەن کۆ کەس تێدا نەبیت، ژ بلی مەلایی و زاڤای بابێ وی و دو دیدەڤان، نابیت کەس دی د وێ ژوورێ ڤە بیت، و هەتا نابیت ژ دەرڤە کەس وان نەبینیت، یان گول دەنگێ وان نەبیت، داکو کەس زاڤای نەگرێدەت، کۆ گرێدان ژی ب ڤی رەنگی بوو: ل دەمێ مەلا ب رێ و رەسمێن مارەکرنێ رادبیت، هەکەر ئێك ژ ئەوێن ل وێرێ دحازر یان ئەوێن ئەڤان کەسان دبینن، بەنکی گرێ بدەن یان سەرێ شویژنێ خواربکەت و بکەتە د کونا دەرزیکی را، یان چەقۆیا ڤەکری دەڤێ وێ بکریت، دبێژن دێ وێکاڤێ زاڤا هێتە گرێدان و نەشێت ب کارێ خۆ رابیت دگەل بویکێ دا، لەوما ئەو زاڤایێ نەشێت ب کارێ خۆ دگەل بویکێ دا رابیت دبێژن ل دەمێ مەهرکرنێ یێ هاتییە گرێدان.. و هەکەر ئەو گرێکا

دەرزی یان سەری شویژنێ ژ کونا وێ ئینا دەر یان دەڤی کێرکێ هاتە ڤەکرن، دێ گرێیا زاڤای ژی هێتە ڤەکرن و ب کارێ خۆ دگەل بویکێ دا رابیت(٥٢).

پشتی مارەکرن ژی تەمام دبیت، شەڤ بەرەڤ نیڤیێ دچیت، دێ قاسدەکی هنێرنە ناڤ ژنکا مالا بویکێ، دا بێژنێ: (خانی بەردەن دا زاڤا بهێت)، گاڤا ئەڤ ئاخفتنە دگۆت، ژنك دا مەزەلێ سستکەن و بچویکا ژێ دەرئێخن و برازاڤا ل گەل هندەك زەلامێن دی دا زاڤای بەرهەڤکەن بۆ سەر جهێ وی.

بەلێ ل ڤێرە هندەك کەسان بزاڤ دکر تشتەکی زاڤای وەك پێلاڤ یان گۆرە یان دەرسۆك..هتد ژ برازاڤای بدزیت، دگۆت هەتا گیسکی نەدەت ئەو بۆ وی ئەو تشتێ ڤەشارتی نە دزڤراند، گەلەك جار بابێ زاڤای دا بزنەکێ یان میهەکێ یان دیکلەکی دەت وان بەرامبەری زڤراندنا پێلاڤا زاڤای، ئەوانژی شەڤبێرییەکا خۆش ب وی تشتێ وەك جزا دداێ بوورینن، یان هندەگ گەنج دا چن گوڤا یان کۆلکێ مرۆڤەکێ زاڤای (مام بیت یان پسمام یان.. هتد) دا بزنەکێ یان چەند دیکل و مریشکان بۆ خۆ بەن سەرژێ کەن و بژێرن و کەلینن، هەتا سپێدێ تۆلاز دا ل مالەکێ ڤێککەڤن و گۆشتی بژێرن کەیفێ کەن.

ل دەمێ برنا زاڤای بۆ سەر جهێ وی، ئەڤ سترانە ب رێڤە دهاتە گۆتن:

**بەرێ سپێدێیە، بەرێ سپێدێیە**
**پێلاڤا زاڤای ناچیتە پێیە**
**دێ زاڤای راکەن، وەختێ خەوێیە**

***

**کورتەکێ تە یێ سۆر، کورتەکێ تە یێ سۆر**
**شالا زاڤای سۆرگۆل، دوور مەندوور**
**دێ زاڤای راکەن، دا ببەینە ژوور..**

ل دەمێ دگەهشتنە بەر دەرێ مەزەلا بویك لێ، ئەڤ سترانە دگۆتن:

**دیوانا ل سەر دیوانێ**
**میرۆ رابە ژ دیوانێ**
**شمکێ دانن میر رابوو**
**بەدیێ زاڤای ببێم کانێ؟**
**میرۆ رابە ژ دیوانێ**
**شمکێ دانن میر رابوو..**

یان ژی ئەڤ سترانە دگۆت و لێك ڤەدگێران:

**وەرە کولانێ، وەرە کولانێ**
**دەیکا زاڤای، وەرە کولانێ**
**چ بێم کولانێ، چ بێم کولانێ**
**بویکا ژ م دخازیت، شالێ و شەش خانێ..**

(دەمێ زاڤا ب ژوور دکەت و دبرە بن پەریێ نك بویکێ، دڤێت بویك ژ پێشڤە رابیت و زاڤا دەستێ خۆ دانتە سەر سەرێ وێ، داکو سەهما وی بچیتە د سەرێ وێ را)(٥٣).

هەر چەندە ئەڤ باوەرییە ب رەنگەکێ شاش هاتییە وەرگرتن، هەکەر ئەڤ باوەرییە باوەرییەکا ئایینی یە، هەر وەکی پێغەمبەر (س) دبێژیت: (ئەگەر ئێکی ژ هەوە ژنەك ئینا، یان ژی کەنیزەك (جاریە) کری بلا دەستێ خۆ دانتە سەر پۆر (ناڤچاڤك)ا وێ، و ناڤێ خودێ بینیت، و دوعا بەرەکەتێ بکەت، و بێژیت: خودێ وو ئەز پسیارا باشی و باشیا چێکرن و تەبعێ وێ ژ تە دکەم، و ئەز خۆ ب تە ژ نەباشی و نەباشیا چێکرن و تەبعێ وێ د پارێزم، و هەکەر ئێکی ژ هەوە حێشترەك ژی کری بلا دەستێ خو دانتە سەر زینیا پشتا وێ هەر وەبێژیت)(٥٤).

پشتی تێر ستران ل نك بویك و زاڤا دهاتنە گۆتن، دا مرۆڤێن زاڤای ژی هەمی ژ ژوورا بویك و زاڤا دەرکەڤن، تەنێ سەرسپی و برازاڤا دمان ل وێرێ، دا برازاڤا دا مەسینی بۆ زاڤای هەلگریت دگەل زاڤای دەرکەڤیت، چیت جهێ تارەتێ، پشتی زاڤای تارەتا خۆ دگرت، دا زاڤا رێکا چوونا نك بویکێ نیشا دەت و زڤرینیتە ژوورا وی و ئەوژی دا چیت ژوورەك دی نێزیك ژوورا زاڤای، دا ل وێرێ چاڤەرێ بی زاڤای بیت هەتا کارێ خۆ دگەل بویکێ ئەنجام ددا.. سەرسپی ژی هەر دا هندەك شیرەتا ل بویکێ کەت، و دا بێژیتێ: (خۆ سەرگێز نەکە، چ گۆتە تە گوهێ خۆ بدێ و کەیفا خەلکی ب

خۆ نە ئینن).. سەرسپی دا کەفیکەکێ یان پاتەکێ سپی(*) ب دۆشەکا وانڤە ب سنجەقا ئاسێ کەت و دا دەرکەڤیت و چیت ژوورەکا دی نڤیت(*)، برازاڤا ژی هەر بێهنەکێ دا چیت پشت دەرگەهێ بویك زاڤا و دەرگەهی ڤوتیت، کا زاڤای کارێ خۆ کر یان نە، ئەگەر زاڤای گۆتبایێ (هەما هەرە ئەزێ بوویم زاڤا)، دا وێگاڤی چیت بێژتە سەرسپیێ کۆ ئەوان کارێ خۆ یێ کرین، چونکە هەتا سەرسپیێ نیشان بۆ دەیبابێت زاڤای نە ئینابان باوەر نەدکرن، کۆ ئەوژی ئەو پاتێ سپی بە، دڤێت خوینا کەفتنا ژ کچینیێ پێڤە هەبیت دا خۆیا بیت کۆ بویکا وان یا پاقژە و هێشتا کچ بوو، کۆ دبێژنە وی پاتەیی (نیشانی)، دا برازاڤا ژی چیت نڤیت، بەلێ ئەگەر زاڤا نەشیابا ب کارێ خۆ رابیت، دا برازاڤا بەش هندەك ئاڤا تەزی لێ کەت، دا شیا ب کارێ گۆهنێلیێ رابا و ببا زاڤا، برازاڤا هەمی بزاڤ دکرن کۆ زاڤا بشێت کارێ خۆ دگەل بویکێ بکەت، چونکە ئەگەر نەشیابا ب وی کاری راببیت، دا خەلك بێژن یێ هاتییە گرێدان، یان یێ نەمێرە، لەوما مرۆڤێت زاڤای ژی نەدشیان بنڤن هەتا زانیبانە کو زاڤای وان کارێ خۆ دگەل بویکێ یێ کری و بوویە زاڤا، دا ژ نوی هندەك مێلاکێ بۆ بژێرن یان هندەك هنگڤینی و شرینیێ بۆ وان بەن دگۆتنێ (پاشیڤا بویك و زاڤا)، و ل هندەك گوندان ئێجادە ئەوبوو، دەمێ زاڤای کارێ خۆ دگەل بویکێ دکر، دا مرۆڤێن زاڤای هندەك تڤەنگان هاڤێژن، دا خەلك بزانن زاڤا ب کارێ خۆ رابوو، پاشی دا ئەوژی چن سەر جهێ خۆ نڤن.

د گەل بانگێ سپێدێ دا برازاڤا چیت زاڤای ژ خەو راکەت و بەتە سەرشوویێ دا سەرێ خۆ بشۆت و هندەك برازاڤان د برنە مزگەفتێ نڤێژا ب جەماعەت، هندەکان ژی دا بێژنێ ل ماڵ نڤێژێ بکە.

## - رۆژا سێ یێ ژ داوەتێ..

ل دەمێ تاڤێ ددا، دا ژ لایێ دەیکا زاڤای ڤە دا سەرتێشتەکا خۆش بەرهەڤ کەن و بۆ بویك ز زاڤا بەن کۆ دگۆتنێ (سەر تێشتا زاڤای)، دا بۆ بویك و زاڤای پێکڤە خۆن، و پاشی دا زاڤای دەرئێخن، دا خویشك و برایێت زاڤای دبەری زاڤای رەقسن و ب تلیلی و ستران زاڤای بەنە دیوانێ و ئەڤ سترانە دهاتە گۆتن:

**سپێدمیەکێ زوی رابووم، تێ دفکرن ڤێ دنیایێ**
**بەدلەکا شەڤێ رابووم، تێ دفکرم ڤێ دنیایێ**
**دوو میرا ژ خەوی راکەن، ل بن تاکۆکێت لەیلایێ**
**پشتی تە ل من دحەرام بن، سێرانوکێت دنیایێ..**

ل رۆژا سێ یێ ژ داوەتێ پشتی زاڤا ل جهێ روینشتنێ ددانان و بویك ل ماڵ کار دکرن، داوەتی و کەس و کارێن زاڤای ژ نوی دچوون دەستێ زاڤای لێ پیرۆزدکرن و دگۆتنێ: (هیڤیا مە ئەوە هوین پێکڤە پیروکال ببن و ژینەکا پر خۆشی کامیرانی پێکڤە ببۆرینن) و هەر ئێکی ل دووڤ شیانێن خۆ هندەك پارە دکرن دپاخلا زاڤای دا وەك خەلاتێ وی.. هەر ب ڤی رەنگی ژی دچوون سەرێ بویکێ و هەڤکویفێ وی لێ پیرۆز دکرن، هەر ئێکێ ل دووڤ شیانا خۆ تشتەك دکرە دسفرکێ دا(*)، وەك خەلاتێ بویکێ.

ل دانێ ئێڤاری یێ رۆژا سێ یێ ئێجاد ئەوبوو زاڤا بچیتە داوەتێ، دا برازاڤا زاڤای بەتە رێزا داوەتێ، ل وی دەمی هەمی داوەتی ژ مێر و تۆلاز و بچویکان ژی قەستا داوەتێ دکرن، دا رێزا داوەتێ گرن خۆ ژ بەر و پشتا ڤە هلاڤێژن هەتا داوەت گەرم ببیت، هندەك سترانێن سڤك دهاتنە گۆتن کۆ داوەت ب ساناهی ل بەر هاتبا کرن، وەکی ڤێ میناکێ:

**های دیلانێ دیلانێ**
**زاڤای بینن دیلانێ**
**قەول هات قرار کانێ**
**زاڤای بینن دیلانێ..**

ل نیڤا گەرا داوەتێ ژی هندەك کەسێن رەقاسکەر، دا ژ ناڤ گەرا داوەتێ دەرکەڤنە ناڤا داوەتێ ل بەر ئێك دا هێێن و چن و خۆ سەرێك و بنێك کەن و رەقسن، هەتا زاڤا دبرەڤە ژوور.

هەر دهەمان دەمدا دا سەرپی و بەربویك دا بویکێ ژی بەنە داوەتێ، هەمی ژن و کچ ژی دچوونە داوەتێ و

ئەڤ سترانە دووا دگۆت و دووا ڤەدگێران:

**دێ بهەژینن، دێ بهەژینن**
**دێ ل گۆڤەندێ، بهەژینن**
**کچکێت کەمەر زێرین**
**دێ ل گۆڤەندێ، بهەژینن**

یان:

**گۆڤەند ل بانێ یالی**
**سەیرانا ل بانێ یالی**
**هاتنێ چاردە سالی**
**مەشیانێ چاردە سالی**
**کی شێخە، دێ چمە لالی**
**کی شێخە، دێ چمە لالی..**

داوەت دمانە بەردەوام هەتا هەمی د وەستیان و پۆسیدە دبوون، داوەتیێن داخوازکری یێن گوندێن دەور و بەران دا هێدی هێدی خواترا خۆ خوازن و بەرەڤ مالێن خۆ ڤە چن.

ل گوندی ژی هەتا نێزیکی مەغرەب دما بەردەوام و پاشی داوەت ڤە درەڤی و هەر ئیکی قەستا مالا خۆ دکر و بویك و زاڤا ژی دمانە ل سەر کەیف و خێر و خۆشیێن خۆ.

پشتی حەفتیا بویك و زاڤا تمام دبوو، دا دەیکا بویکێ هندەك کادا و تشتا بۆ کچا خۆ بەت و چیت نك کچا خۆ، دا رێکا وێ ڤەببیت ئەوژی ژ رۆژ پێڤە بچیت مالبابا خۆ، ئەگەر ل گوندی با دەیکا وێ ب شەڤێ دچوو ئو دزڤری، لێ ئەگەر ل گوندەك دی با شەڤەکێ دما ل وێرێ ژ نوی دزڤریڤە.

پشتی دەیکا وێ دزڤری، ژ نوی ئەوژی دا کارێ خۆ کەت و ل گەل تیبەکێ خۆ (برایێ زەلامێ خۆ) یان لێزمەکێ هەڤکویفێ خۆ، دچوو مالبابا خۆ و دگۆت ڤێ چەندێ (بابا)، دەست ڤالە نەدچوو، هندەك تشت بۆ مالبابێ دبرن و دچوو، گاڤا کچك دزڤریڤە بابێ وێ هندەك تشت ددانێ وەکی: چێلەکێ، گایەکی، بزنەکێ، گیسکەکی، کاڤرەکی... هتد. یان هندەك پارە ژ لایێن مرۆڤێن بویکێ ڤە ددانێ ل دووڤ پیچێبوونا خۆ وەك خەلاتێ وێ.

## ژێدەرو پەراوێز


١. ڤاسیل نیکیتین، ألاکراد، بیروت - ١٩٦٧، ص٨٨.

٢. مینۆرسکی، کورد، د.مارف خەزنەدار کرییە عەرەبی و حمە سعید حمە کریم کرییە کوردی، چاپخانا زانکۆیا سەلاحەدین، ١٩٨٤، بپ ١٥٩.

٣. باسیلی نیکیتین، الکرد، تقدیم: لویس ماسینیون، نقله من الفرنسیه وعلق علیه: الدکتور نوری طالبانی، ط١، مطبعة خانی، دهۆك ـ ٢٠٠٨، ص ١٠٢.

٤. باسیلی نیکیتین، الکرد، ژێدەرێ بۆری، بپ١٥٦.

٥. باسیلی نیکیتین، الکرد، ژێدەرێ بۆری، بپ ١٥٦؛ مینۆرسکی، کورد، ژێدەرێ بۆری، بپ١٦٠.

٦. یادداشتەکانی مەیجەرنوئێل لە کوردستان، و. حسین احمد جاف و حسین عثمان نێرکسەجاڕی، چاپخانا اوفسیت حسام، بەغدا ـ ١٩٨٤، بپ١٧٦.

٧. بوار نورەدین، رەدووکەوتن، چاپا ئێکێ، چاپخانا شڤان، سلێمانی ـ ٢٠٠٥، بپ٣١.

٨. یادداشتەکانی مەیجەرنۆئێل لە کوردستان، و. حسین احمد جاف و حسین عثمان نێرکسەجاڕی، چاپخانا اوفسیت حسام، بەغدا ـ ١٩٨٤، بپ (١٧٦).

٩. أنور المایی، الاکراد في بهدینان، ط٢، مطبعة خەبات، دهۆك ـ ١٩٩٩، ص (١١٦).

١٠. سوره الروم، ئێیە ـ ٢١.

١١. ئیسماعیل سگێری، تەفسیرا ژیان، چاپا ئێکێ، چاپخانا أسوه، ئیران ـ قم/ ٢٠٠١، بپ٣٥٠.

١٢. محەمەد حەسەن بناڤی، ژ رەوشت و تیتالێن کوردەواری، چاپا ئێکێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر ـ ٢٠٠٦، بپ ١٠١.

# یارییێن دەڤەرا دهۆك

**بەرهەڤکرنا: پەیبەرێ ئەرتیسی**

یاری ئێك ژ وان تایێن فۆلکلۆری یێن گەلەك بەلاڤە ل ناڤ مللەتان و ل سەرتاسەری جیهانێ کو ئێك ژ وان مللەتان ژی کوردە. یاری ژبۆ گەلەك ئارمانجان دهێنە کرن، وەکی خوشییەك و دەم بۆراندنەك و کەنییەك و وەکی هەڤرکمانیەك و وەکی چارەیەك بۆ نەخۆشی و دلتەنگییان، ب تایبەت یێن دەروونی و دیسان یاری، دەربرینەکە ژ هەڤگرتن و هەڤپشکیێ، سەرەرای وێ چەندێ کو بووراندنا دەمی یە، ب تایبەت ل دەمێ بێ کارێ.
دیرۆکا پویتەدانا یارییێن کوردی گەلەکا کەڤنە و ڤەدگەریێتەڤە بۆ سەردەمێ مەلا مەحمودێ بایەزیدی (١٧٩٧-١٨٥٨) ێ. کو چەند یارییێن کوردی، د پەرتووکا خۆ یا ب ناڤێ (عادات و رسوماتنامەیێ ئەکرادیە) بەلاڤ کرین، دیسان چەندین خەمخۆرێن دی ژی پویتەداینە ڤی لایێ فۆلکلۆری، مینا محەمەد کەریم شەریف و سالح عەلی سالح و توفیق نەبەز و ... هتد. ل دەڤەرا مە ژی پویتە پێ هاتییە دان ژ لایێ چەند نڤیسەران ڤە، مینا ئەنوەر مایی و سەگڤان عەبدولحەکیم و خالد سالح و محەمەد حەسەن بناڤی و ... هتد.
ئەگەر ئەم بنێرینە ڤان یارییان دێ بینین گەلەك د سڤك و سادەنە و هەمی یێن ژ سرۆشتی هاتینە دەرئێخستن، یارییان ب دارا و بەرا و پاتا و ئاڤێ و هەر تشتەکێ دەست دکەڤیت دکەن. هەر دیسان ئەڤ یارییە ل سەر ژیێ یاریکەران ژی ددابەشکرینە، یان رەگەزێ وان، بۆ نموونە دێ بینین هندە یاری یێن زارۆیێن ساڤانە، ل بەرامبەر هندەك یێن سنێلا و مەزنا و یان هندە جاران پیرەمێرانە، دیسان هندەك یێن کورانە و هندەك یێن کچانە. هەروەسان یاری ل سەر وەرزا و ل سەر شەڤ و رۆژ و هەلکەفتان ژی دداپەشکری نە.

**١- ئارمانجانێ:**
یارییەکە (مژیلاهییەکە) پتر جحێل و زەلام ب تڤەنگان د کەن، تێدا نیشانان دانن، وەکی کێلی و بەرا و فیشەکا و هەر جۆرە نیشانەکا دی و بەرێ گولا ددەنێ کا کی دێ وان نیشانان ئێخیت؟ دڤێ یاریێ دا سەگڤانییا مرۆڤی دیار دبیت و ب دەهان گۆتن و سەرهاتی ل سەر ئارمانجانێ هەنە. بۆ نموونە ئەو ئاغایێ هێك دانایە سەرسەرێ خولامەکی و هێك کرییە ئارمانج. دبیت ڤێ یاریێ گرنگییا خۆ ژ لایێ سەربازیێ و پێگەهشتنا زەلامینیێ ژی هەبیت. هندە جاران ڤێ یاریێ ب مەرج ژی د کەن.

پەزو گورگ



## ٢- بویكا بارانێ:

يارييەكە ل گەلەك جهێن كوردستانێ ل سالێن كێم باران دهێتەكرن، ڤێ يارێ وەكی دوعا دكەن دا باران بباريت. تێدا كۆمەكا زارۆيان، يان هندە جاران جحێل ژی هندە جلكان د كەنە بەرخۆ و هلۆپكەكی وەكی نیشانا مرۆڤان چێدكەن و ب كۆلانا دكەڤن و دگەل هندێ دبێژن:

بویكا مە باران دڤێ

دەخلەكێ ئەرزان د ڤێ

ئەرزانيا سالان د ڤێ[1]و ... هتد.

ل بەرامبەر خەلك ژی ئاڤێ ب هلۆپكی دا د كەن، وەكی نیشانا ئاڤێ و بارانێ و هندە خوارن و شرینا هیان ژی ددەنێ.

## ٣-بێل بێلاڤا:

دبيت ناڤێ يارێ ژ (بێلا ئاڤا) هاتبيت، ئەڤ يارييە پتر ل زڤستانان د هێتە كرن، زارۆ ب دووڤ ئێك د كەڤن، مال مال د چنە بەر دەرگەهێن وان و ئێك دێ دبێژيت:

بێل بێلاڤا

خودێ كورێ هەوە بكەتە زاڤا[2]

ببەنە سەرێ گەرماڤا.

يێن دی دێ بەرسڤێ دەن و بێژن: ئامین ...

ئەو ژی ل بەرامبەر خوارنێ و شرینا هیان ددەنە وان.

## ٤-تیركێ مرادان:

ئەڤ يارييە هەر مینا ياريیا (بێل بێلاڤایە)، لێ ل ڤێرە زارۆ تیركا چێ دكەن و د كولینكێن بانان دا دادهێلنە خوارێ و پاش د هلكێشنەڤە. مال ژی ل بەرامبەر تشتێن خوارنێ و شرینا هیان دكەنە تێدا و هندە جاران ژ بۆ كەنیێ مال پەلێن ئاگری، يان هەر تشتەكێ بكێرچ نەهێت د كەنە تێدا.

## ٥- پەزو گورگ:

د ڤێ يارێ دا دو ياریكەرێن ژ هەمیيان خورتر، ئێك دێ بیتە گورگ و ئێك دێ بیتە شڤان. ياریكەرێن دی

پرێ پرێڤانێ



هەمی پەزن و دێ چن وەکی رێزکێ ئێك ل پشت ئێکی پشتا شڤانی گرن و د ڤێت پشتا وی نەبەردەن.
گورگ دێ ل بەرامبەری شڤانی راوەستیت و بێژیتێ:
پیرێ گۆتی پەزەکێ
شڤان دێ بێژیتێ: نادەمە تە پشکلەکێ[٣]
چەند جاران گورك دێ بێژیت و شڤان ژی هەر دێ وێ بەرسڤێ دەت، دووماهیێ گورگ نەچار دبیت هێرشێ دبەتێ، کو ئارمانجا وی هەر جار ئەوە دەستێ خۆ ل پەزا دووماهیێ بدەت و ئەگەر لێدا ئەڤە وی خوار و وەسان تا هەمی یاریکەران د ئێخیت (دخۆت).

## ٦- پرێ پرێڤانێ:

دو یاریکەرێن ژ هەمیان زیرەکتر دێ دەستێن خۆ تێکدانن و وەکی پرەکێ چێکەن و دانن عەردی و یاریکەرێن دی ئێك دێ بیتە سەرکێش و یێن دی هەمی دێ پشتا وی وەکی رێزك گرن و گەرێن و پاش دێ هێنە نك پرێ:
- ئوو پرێ پرێڤانێ
- ئووو
- پردکا تە یا چەوایە؟
- یا ب عەردی ڤە
- ئیشەلا دێ خرابتر لێ هێت
- ئیشەلا کنەك ژ پەزێ تە نەمینت.
جارەکادی سەرکێش دێ دویر کەڤیت و وان گێرینتە ڤە، تا دزڤریت دێ بینت رەخەکێ پرێ یێ بلند بووی (هەردو یاریکەران دەستێن خۆ ژ رەخەکیڤە بێن بلند کرین):
- ئوو پرێ پرێڤانێ
- ئووو
- پردکا تە یا چەوایە؟
- یا رابوویە سەر چکەکێ
- ئیشەلا دێ رابیتە سەر هەردو چکا
- ئیشەلا پەزێ تە زێدە بیت.
وەسان هەر ب وی رەنگی پر دێ هەر بلندبیت تا هەردو یاریکەر رادبنە ژ پێرڤە، ئێدی رێزك دێ دبن پرێ را چن و هەر جارا دچن یاریکەرێ وان یێ داویێ دهێتەگرتن و ژ

ناڤ یاریێ دهێته دەر، تا داویێ سەرکێشی ژی دگرن و یاریا وان ب داوی د هێت.

### ٧- چەق چەق میرێ شامێ:

نەه یاریکەر پشکداریێ د ڤێ یاریێ دا دکەن، چوار ژێ دبنە (سۆفی) و چوار ژی د بنە (حەجی)، ئەڤ هەشت یاریکەرە دێ ب رەنگەکێ بازنەیی ب تەنشت ئێکڤە روینە خوار، کو چۆکێن هەمیان د بلند بن و پەحنییا پێن وان ب عەردی ڤەبن و دەستێن وان دێ دبن چۆکێن وا ڤە بن، یاریکەرێ نەهێ کو دکەڤیتە بەر دچیتە د نیڤا وان دا و دروینتە خوار و ئارمانجا وی ئەوە ئەو بەرێ ددەستێ وان دا (یان ل هندە دەڤەرا دو بەرن) دیار بکەت کا ل کویرێ یە؟ ل ڤێرە هەمی یاریکەر ب بزاڤن و بەر ل چ جها بێ راوەستیای نینە و د گەل هندێ دبێژن:

ئێك دێ بێژیت:

چەق چەق میرێ شامێ...

یاریکەر دێ لێ ڤەگێرن:

حەجی دێ بێژن: چوو درێکا سوفیادا ...

سۆفی دێ بێژن: چوو درێکا حەجیادا ...

وەسان تا ئەو بەری د دەستێن ئێکی دا دگریت و ئەو ئێك ل جهێ وی ل نیڤەکێ دکەڤیتە بەر.

### ٨- حەفت بەرکی:

یاریکەر د بنە دو جوین، جوینەك د کەڤیتە بەر و جوینەك یاریێ د کەت. پشتی حەفت بەرێن بچویکێن پەحن ددانە سەرێك، یاریکەر دێ ژ دویراتییەکا دەست نیشانکری هێن هۆلەکا بچویك گرێل کەنە وان حەفت بەران کو بێخن. دەمێ ئەو بەر ژ سەرێك د کەڤن دێ رەڤن و یاریکەرێن ل بەر دێ هۆلێ راکەن و د بیاڤەکێ دەستنیشانکری دا راهێلنە وان یاریکەران و هۆلێ بۆ ئێك هاڤێژن کو دەلیڤێ ببینن و هۆلێ ل وان بدەن و هەچیێ هۆل ڤێ کەت ئەو وێ گەرێ ژ یاریێ هاتە دەر. ل بەرامبەر ئەو یاریکەرێن رەڤین دێ بزاڤێ کەن دەلیڤەکێ ببینن دا وان بەرا جارەکادی داننە سەرێك ڤە (یان هندە جاران حەفت چوارگۆشا دروست دکەن کو

٧- چەق چەق میرێ شامێ:



حەوایێ حەوایێ



هەر بەرەکێ بکەنە د ناڤ چوارگۆشەکێ دا).
ئەگەر شیان دێ هەر یاریا خۆ کەنەڤە و ئەگەر نەشیان ئەو دێ کەڤنە بەر و جهێ یاریێ پێك دهێتە گوهارتن.

## ٩- حەوایێ حەوایێ (حایێ یان وەلحایێ):

یارییەکە پتر کچ د کەن، تێدا کۆمەکا کچان ب رەنگەکێ بازنەیی و ب رێك و پێکی د زڤرن و د گەل زڤرینێ ئاوازێن تایبەت ب یاریێ ڤە دبێژن، ئەڤ ئاوازە ژ دەڤەرەکێ یا جودایە ژ دەڤەرەکا دی:

حایێ حایێ حایێ ...
کولیلکا دو تایێ
بەژنا شێر ئاغایێ
شێر ئاغا بلبلە
چووبوو پشت میسلە
میسل دەربوو دەربوو
کەسکێ سووری وەربوو
کەسکێ سووری کێ بوو
یێ خویشکا زینێ بوو
زینێ تو ب خودێ کەی
سلاڤا ل مەمێ بکەی
مەمێ چووبوو سیکێ
کرین جلێت بویکێ
بویکا مە کوردانە
سەر بەرەکێ پانە [٤]... هتد.

یان یاریکەرەك دێ ڤی ئاوازی بێژیت و یێن دی دێ لێ ڤەگێرن بێژن: قیقی قیقی ... ب ڤی رەنگی :

قیقانێ قیقانێ حەلێ ... قیقی قیقی
یا ب تۆق و مەرجانێ حەلێ ... قیقی قیقی
مێرکێ حەلێ کوشتی حەلێ ... قیقی قیقی
ئەحیا بەگ روینشتی حەلێ ... قیقی قیقی
ئەحیا بەگ و تێزە حەلێ ... قیقی قیقی
قەیتان کرنە رێزە حەلێ ... قیقی قیقی
قەیتانا مامێ منە حەلێ ... قیقی قیقی

بەر گرت و بەژنا منە حەلێ ... قیقی قیقی
سێڤا سەر بوغچێ یە حەلێ ... قیقی قیقی
دا بچین سێڤا ژێ بكەین حەلێ ... قیقی قیقی
بێنا گولا تێ بكەین حەلێ ... قیقی قیقی
گولێت مە باپیچن حەلێ ... قیقی قیقی

## ١٠- سابینا رەقێ:

دو یاریكەر د ڤێ یاریێ دا د پشكدارن. تێدا هەردو دێ پشتێن خۆ پێكڤەن و دەستێن خۆ تێك ئالینن كو پارچا ژ ناڤدا یا ئەنیشكا هەردوان پێكڤە بیت و وەسان هەر جارا ئێك دێ هەڤالێ خۆ بلند كەت كو پێن وی ژ عەردی راكەتەڤە و د گەل هندێ ئێك بێژیت و یێ دی ڤەدگێریت:

- سابینا
- رەقێ
- یا ل بن
- دەقێ

یان ل هندە دەڤەرا دبێژن:

حەلیمایێ
جهۆرێ كایێ
تەنیا سێلێ
ماستێ چێلێ
هەچیێ بخۆت
دێ چیتە ترتركا حێلێ.

## ١١- كۆمبلۆر:

ئەڤ یاریە باراپتر ل بهاران دهێتەكرن، تێدا زارۆك دوپیشكا ب زلكەكێ قایم د هینەدەر، زارۆك زلكی دادهێلنە تێدا دا دوپیشك زلكی بگریت. دگەل وێ كریارێ دوپیشكی د كێشن و ڤی ئاوازی دبێژن:

كومبلۆر و كومبلۆر
كومبلۆرێ ب شیر و تیر
شیر و تیرێ مام عمبەر
مام عمبەرێ كەفچك زەر
* * *
كەڤچك زەرێ بەیارا

یێ د خۆت و مشك و مارا[٥] ... هتد.

پاش دوپیشكی د هینئە دەر و د كوژن، یان ژی د كەنە د ناڤ كون مێرییەكێ دا و ئەو ژی مژیلاهییەكا دی یە.

## ١٢- هۆلانا شاری[٦] :-

ل پێشیێ(هۆل) چی یە ؟ :

هۆل: دهێتە دروستكرن ب هندەك پاتێن پەرۆكی و ب رەنگێ گرۆڤر ئانكو تەپەكا بچویك یان ژ مویێ گیانەوەری دهێتە دروستكرن.

شار: گۆرەپانا یاریێیە كو یاری دناڤدا دهێتەكرن.

- ئەڤ جۆرە یاری یە ل سەرانسەری كوردستانێ و ب تایبەت ل گوندا یا بەربەلاڤە، ئەڤ یاریە دهێتە كرن د ناڤبەرا دو تیمادا كو ئەڤ تیمە ب هژمار تەمەت هەڤبن، دا بشێن هەڤركیا هەڤدو بكەن، گۆرەپانا یاریێ ب (خۆلیێ) دهێتە توخویبكرن یان ب شێوەیێ بازنەكا نەیا ب رێك و پێك، ئەو هەردو تیمێن دیاركری، ئێك دێ چیتە د ناڤ شاریدا و یادی دێ ل رەخێن شاری بەلاڤ بیت، ئانكو د بازنێدا و دێ هۆلێ هاڤێنە بەر ئێك و دو و دێ بزاڤێ كەن كو ئەوێن د ناڤ شاریدا بوەستینن و كۆمكەنە سەرئێك، دابشێن وێ هۆلێ پاڤێژنە ئێك ژوان ئەوێن د ناڤدا، دەما هۆلا خۆ وەشاندە ئێكی ئەگەر ئەڤ هۆلە ما دناڤ سنوورێ شاریدا ئەو ژی دێ وێ هۆلێ هاڤێنە ئێكی دەرڤەی شاری، لێ نابیت ژ سنوورێ شاری دەركەڤیت ئەگەر لێ نەدا دێ ئەو دەركەڤیت وهۆسا هەتا هەمی تیم دەركەڤن لێ ئەگەر دەما هۆلێ دهاڤێنە بەر ئێك و دو ئێك ژ هەڤالێن دناڤ شاریدا دێ ڤەگریت، ئێكسەر تیما ل دەرڤە دێ هێتە دناڤدا و یا دناڤدا دێ چیتە ژ دەرڤە و هۆسا دێ بەریكانە یا بەردەوام بیت هەتا ماندی دبن و ب كەیف و شادی یاری ب داوی دهێت.

## ١٣- گڤدەرەشانێ (مێشەرەشانێ)[٧]:

ئەڤ یاریە ل سەر دەمێ خۆدا گەلەكا بەر بەلاڤبوو، لێ مخابن ئەڤرۆ وەك چەندین یاریێن دی بەرەڤ نەمانێ دچیت، ڤێ گاڤێ كەس ڤێ یاریێ ناكەت. پێكهاتنا ڤێ یاریێ:-

گڤدەرەشانێ (مێشەرەشانێ)



١- دو خیچ ب خۆلیێ دهێته دیارکرن، یان بەرکێ بچویك و دویراتییا وان (٧- ١٠) مەترن ب شێوەیێ راست.

٢- دو تیم ژ توخمێ نێر چونکی توخمێ مێ ڤێ یاریێ ناکەن .

چاوانیا کرنا ڤێ یاریێ:

هەر ژ ناڤێ وێ یا دیارە (گڤدە رەشانێ) دەما ئەڤ تیمە خۆ ژێك جودا دکەن یان لێکڤەدەر دبن هەر ئێك ژ تیما دی دێ چیتە سەر هێلا خۆ دێ دیارکەن کادێ کیژ تیم چیتە یادی، ئەو تیما دیار کو دێ چیتێ، کەت کەتە دێ چنە تیما دی و دەما ل سەر خیچێ دەرباز دبیت دێ بێژیت گڤدەرەش (گڤ ڤ ڤ ڤڤڤ) .... و دێ چیتە تیما بەرامبەری خۆ نابیت (بێهنا خۆ هەلکێشیت) هەتا ئەو بشێت دەستێ خۆ ل ئێك ژ تیما بەرامبەر بدەت و نەکەڤیتە ددەستێن واندا چونکی ئەگەر ئەو کەڤتە ددەستێ واندا ئەو نابەردەن هەتا بێهنا خۆ ڤەدخۆت یان هەناسێ بکەت ڤی دەمی ئەو دێ کەڤیت، لێ ئەگەر نەکەڤتە ددەستاندا و شیا دەستێ خۆ ل ئێکی بدەت و ڤەگەریتە سەر خیچا خۆ و کەسێ نەگرت و هەناسا وی نەکەڤت ئەوێ وی دەستێ خۆ لێدای ئەو دێ کەڤیت و ئەڤێ دی دێ بێهنا خۆ دەت دێ هەڤالەکێ دی یێ تیما وی چیتێ و دێ هۆسا بەردەوامیێ دەنە یاریا خۆ هەتا تیمەك قورتال دبیت و ئەو تیما قورتال دبیت ئەو تیم یا دۆراندیە، تیما دی دێ یا سەرکەفتیبیت پاشی ئەو تیم دێ چنە سەر خیچێ و تیما دی دێ چنێ ئانکو بەروڤاژی دەستپێکا ڤێ یاریێ.

هۆسا دێ بەردەوامیێ دەنە یاریا خۆ هەتا دوەستیێن ئەو تیما بارا پتر خال بدەست خۆ ڤە ئینایێن دێ تیما دی دەست خۆشیێ لێکەن و یاری دێ ب داوی هێت، لێ دڤێت دەستێ وی ب لەشێ وی یێ ب جلك بکەڤیت.

## ١٤- تیسانێ[٨]:

تیسانێ ئێکە ژ یارێن گەلەك بەربەلاڤ وفلکلۆری،

بەلێ بارا پتر یاریکەرێن ڤێ یاریێ ئەون کو ژیێ وان دناڤبەرا (٦- ١٤) سالییێدا ژ هەردو رەگەزان .

پێکهاتیێن ڤێ یاریێ:-

*چەند کەسەك چ کور یان کچ .

*هەر ئێك ژوان تیسەك (حەلانکەکێ بچویك) دەستادا بیت .

*کۆرکەك یا کۆلای بیت.

*گۆکەك یان میتکەك (بەرەکێ بچویك)ە.

چاوانیا کرنا ڤێ یاریێ :

- ئەڤ کەسانە هەمی دێ چنە پشت گۆکێ و دێ تیسێن خۆ هاڤێنە کۆرکێ کو دویراتی دناڤبەرا گۆکێ و کۆرکێدا (٥ - ٦) مترن، پشتی هەمی دهاڤێنێ کیژ ژ هەمییان نێزیکترە بۆ کۆرکێ ئەو یێ ئێکێیە و بەراهیا هەمییا دێ هاڤێتە گۆکێ هەر دەما تیسێ وی ب گۆکێ کەڤت و ئەو گۆك ژ جهێ وی هاڤێت دێ چیت ب پێن خۆ پیڤیت کا چەند هاڤێتیە ئەگەر (٢٠) پێ هاڤێتبن و دێ ل ناڤ دەرکەڤیت و ئەوێن مایین جارەکا دی دێ یاریێ دەست پێکەنەڤە و هۆسا دێ یاری ب رێڤەچیت حەتا دمینیتە ل وێرێ (ئێك) ئەو ئێك دێکەڤیتە بەرگۆکێ وکەت کەتە دێ ڤێ گۆکێ بۆ هەمییان رادەت هەر ژ یێ ئێکێ حەتا یێ داویێ و دەما رادانا گۆکێ بۆ یێ ئێکێ رادا ئەڤ گۆکە چەند دوور بچیت بۆ وی باشە ئەوێ راددەت، چونکی خودانێ تیسی (دەرچوویێ ئێکێ ژ یاریێ) دێ تیسێ خۆ هاڤێتە گۆکێ ئەگەر لێدا یان ڤێکەڤت (کرنەك) کرێ ئانکو خەبەرەك گۆتێ و هۆسا دێ هەر بۆ وی رادەت حەتا تیسێ وی ڤێ نەکەڤیت ئەو دێ قورتال بیت و دێ بۆ سەرکەفتیێ دووێ رادەت و هۆسا هەتا یاری ب داوی دهێت و دێ زانن کا هەر کەسەکی چەند کرن (خەبەر) دانە وی ئەوێ گۆلێ راددەت و ئەوێ پتر ژهەمییان کرن داینێ ئەو دێ بیتە سەرکەفتیێ ئێکێ و ب ڤی رەنگی دێ بەردەوامیێ دەنە یاریا خۆ حەتا ماندی دبن و دەستخۆشیێ دێ ل ئێك و دووکەن و یاری ب داوی دهێت.

تیسانێ



١٥- رەزكێ رەمەزانێ



## ١٥- رەزكێ رەمەزانێ(٩):

رەزكێ رەمەزانێ یان (پەزێ میری) یان (پەزكێ پرێ) ئەڤ یاریە ژی ئێكە ژ یاریێن فولكلۆری، پێكهاتێن ڤێ یاریێ ژی چەند كەسەكن، كچ و كور دێ بنە بازنە و دوو كەسێن شارەزا دێ سەركێشیا یاریێ كەن .

چاوانیا كرنا ڤێ یاریێ :

* ئەڤ كەسانە هەمی دێ ریز بن و دەستێن ئێك و دو دێ گرن و شارەزایێن ڤێ یاریێ دێ هەر ئێك ژوان چیتە سەرەكێ ریزێ و دێ گازی ئێك و دوو كەن ب ڤی رەنگی:-

كەسێ ئێكێ: هو رەزكێ رەمەزانێ؟

كەسێ دووێ: تە چیە دەرگەڤانێ.

كەسێ ئێكێ: پەزێ میری چ دخۆت؟

كەسێ دووێ: هەلهەلۆك.

كەسێ ئێكێ: چ ب شیر؟

كەسێ دووێ: گیز بەلۆك.

كەسێ ئێكێ: چەند مەنجەلۆكێت شیری؟

كەسێ دووێ: بیست و دوو .

كەسێ ئێكێ: سابوینا رەقێ یا بندەقێ؟

كەسێ دووێ: سابوینا بندەقێ.

كەسێ ئێكێ: پیك یان زورنا ؟

كەسێ دووێ: پیك .

كەسێ ئێكێ: داوەتا كێ یە؟

كەسێ دووێ: داوەتا ئازادە، ئێكە ژ وان كەسێن د ریزێدا، ئەڤ كەسە یێ ل دەڤ كەسێ ئێكێ، دێ هەمی د بن دەستێ ویرا چن هەتا بەرۆڤاژی دبیت، ئانكو دزڤریت، هۆسا دێ گازیكەنە ئێك و دو هەتا هەمی قورتال دبن.

پاشی كەسێ دووێ دێ بێژیت: پیرێ یا گۆتی دستاری بهێرن بێی دەستێن ئێك و دوو بەردەن دێ هەمی دجهێ خۆدا زڤرن.

پاشی دێ بێژیت: پیرێ یا گۆتی جۆنی ب قوتن هەمی دێ دجهێ خۆدا رابن و روینن و هۆسا یاری دێ ب داوی هێت.

**١٦- هۆلانا كۆركێ:**

ئەڤێ یاریێ تەنها كوڕ دكەن، كرنا ڤێ یاریێ ژی ب ڤی رەنگییە:

هۆل: هندەك پاتا دێ كەنە دناڤ گۆرەكێدا و دێ گرۆڤركەن دا وەكی تەپەكێ بەلێ یا بچویك لێ بهێت، ئێك دێ بیتە دادڤان ئانكو ئەو كەسێ هۆلێ ل ناڤ كۆران ب شێوەكێ دروست پاڤێت دێ هەرئێك بۆ خۆ كۆركەكێ چێكەت و ل هنداڤ راوەستیت ب شێوەیەكێ رێك و پێك وەكی دیار دێ دادڤان دەست ب هاڤێتنێ كەت ئەڤ هۆلە چوو دكیژ كۆركێدا دێ خودانێ وێ هۆلێ هاڤێتە یێ دی ئەگەر ڤێكەڤت ئەڤە دێ بەرەك بچویك كەتە دكۆركا ویدا هەچیێ كێمتر بەرك چوونە دكۆركا ویدا ئەوێ سەركەتییە، هەتا سنووریێ ب ڤی رەنگییە .

**١٧- مۆركانێ:**

ئەڤ یارییە ژی ل دەڤەرێ گەلەكا بەربەلاڤە و تنێ كچ ب ڤێ یاریێ رادبن و ئەڤ یارییە ب ڤی شێوەی دهێتە كرن:

هەردو كچ دێ بۆ خۆ جهەكی دەسنیشانكەن دێ مۆریكا لێ گرێلكەن، ئەوا مۆركێ گرێل دكەت ئەگەر مۆركەكا دی ڤێ كەڤت ئەوێن گرێلكرین یان رادابن دێ هەمیا راكەت بەلێ ئەگەر هەردو یاریزانا مۆركێن خۆ خلاسكرن ڤێك نەكەڤتن دێ هەر ئێك مۆركێن خۆ هەلگریت و دێ جارەكا دی دەست هاڤێنە مۆركا و مۆركانێ كەنەڤە هەتا ئێك ژ وان مۆركێن هەڤالا خۆ هەمیا ژێ دبەت و هۆسا ئەڤ یارییە دێ ب سنوور هێت.

**١٨- كوت كوتانێ:**

ئەڤ یارییە دناڤبەرا دوو گرۆپێت وەك یەك دهێتە كرن، دێ دەست ب كێشانا مەرجێ خۆ یان پشكێ كەن كا كیژ دێ كەڤیتە بەر، ئەو گرۆپی دكەڤیتە بەر دێ دیار بیت چ دەست بادانێ یان ژی تەڕ و هشكانێ دێ دەست ب ڤێ یاریێ هێتە كرن، ب ڤی رەنگی ئەو

مورکانێ



پارسەنگانێ



گرۆپا دکەڤیتێ دێ روینن ب شێوەیەکی بازنی و گرۆپێ دی ژی دێ هەر ئێك ل هنداڤ سەرێ هەڤالێ خۆ راوەستیت حەتا پرسیارێ، گرۆپێ دئاخڤیت دێ بێژیت (کوت کوت) هەر ئێك ئەوێ ژ پێرڤە دێ هەردو دەستێت خۆ داننە سەر چاڤێن ئەوێن روینشتی و ئێك ژوان ئەوێن ژ پێرڤە دێ ل رەخێ وان زڤریت و دێ تکەکێ ب (تبلا بەرانی دگەل یا شەهدێ) ب هێز ل ناڤ چاڤێت ئێك ژ ئەوێن چاڤێن وان گرتی دەت و دێ ڤەگەریێتە جهێ خۆ دێ سەرۆکێ تیمێ بێژیت (کوت کوت) ئانکو چاڤا بەردەن دێ ئەو رابن تیما دی دێ کەڤیتێ ئەگەر نەزانن هەر زوی دێ بێژیت (کوت کوت) و دێ جارەکا دی ب ڤی رەنگی یاری ب رێڤە چیت، ب کەیف و شاهی دێ یاری هێتە کرن و دێ دەست خۆشیێ ل ئێك و دوو کەن.

### ۱۹- پارسەنگانێ:

ئەڤ یارییە یا کەڤنە و ژبۆ بەرچاڤکرنا هێزا خۆ دناڤبەرا چەند کەسەکادا دهاتەکرن پەهلەڤان ب ڤێ یەکێ دەردکەتن مەیدانێ، لێ نها یا بوویە یارییەکا جیهانی ئەڤ یارییە ب ڤی رەنگی دهێتە کرن:

- چەند کەسەك دێ هێن (بەرەکێ گرۆڤر) ئانکو ب شێوەیەکێ بازنە یان تەپك دێ بەرهەڤکەن خیچەکێ دێ بۆ خۆ دەستنیشانکەن، هەمی دێ چنە پشت خیچێ ئەوا دیار، ئێك ئێك ڤی بەرێ وەکی تەپکێ ل سەرسەرێ تبلێن دەستی دێ هاڤێن کا دێ کیژ یاریکەر ڤی بەری پتر ژ هەمییان هاڤێت ئەو دێ دەرکەڤیت، کو ژ هەمی هەڤالێن ل وێرێ ئامادە ب هێزترە یان ژی خودان شیانترە، بەلێ ئەڤە دێ دیار بیت پشتی هەمی یاریکەر دو سێ جارا ڤی

بەری دهاڤێن ئەوێ دەرکەڤت ژهەمیا پتر شیان هەنە، هەمی دێ دەست خۆشیێ لێ کەن و ب ڤی رەنگی ئەڤ یارییە ب داوی دهێت، وەکی دیار ئەڤ یارییە ل سەرانسەری جیهانێ دهێتە کرن.

## ٢٠- سێ پێنگاڤانێ:

ئەڤ یارییە ب ڤی رەنگی دهێتە کرن:
دێ خیچەکێ نیشانکەن، یاریزانێ ئێکێ خۆ دهاڤێت دێ ڤی بەری ب دەستێ خۆ گریت (سێ گاڤا) دێ چیتە پێش وێ خیچا دیار و دێ غاردەت پێ خۆ دێ ل پشت وێ خیچێ دەت سێ گاڤا دێ خۆ هاڤێت گاڤا سیێ پێدڤییە ل سەر پێ خۆ وی بەری د دەستێ خۆدا دانیتە جهەکی لێ ب مەرجەکێ ل سەر پێ نەکەڤیت، یاریزانەکێ دی دێ هێت خۆ هاڤێت ب وی رەنگێ دیار بەرەڤ وی بەرکی دێ چیت بەلێ ب مەرجەکی دەمێ ئەو ژی خۆ دهاڤێت سێ گاڤا و گاڤا سیێ دێ ل سەر پێ خۆ راوەستیت، بەلێ ژجهـ نالڤیت دێ وی بەرکێ دیار ژ جهی راکەت و هۆسا هەمی یاریزانێن ئامادە دێ سێ گاڤا خۆ هاڤێن کێ ئەو بەر پتر ژ هەمیان بر دێ ئەو بیتە قارەمانێ ڤێ یاریێ و هۆسا یاری ب داوی دهێت .

## ٢١- چوونا دتەلیسیدا[١٠]:

ئەڤ یارییە گەلەکا بەربەلاڤە ل سەرانسەری کوردستانێ دهێتە کرن و هەردو رەگەز ڤێ یاریێ دکەن، ل هەمی دەڤەرا ژی وەکو یەك دهێتە کرن، دیسا ڤێ یاریێ هەڤرکییەکا جوان تێدا هەیە .
ئەڤ یارییە ژی ب ڤی رەنگی دهێتە کرن :-
چەند کەسەك (مێ یان نێر) دێ ئامادەبن و دێ خیچەکێ بۆ خۆ دەستنیشانکەن و هەمی دێ ل پشت خیچێ راوەستن و هەرئێك دێ بۆ خۆ تەلیسەکی بەرهەڤکەت و خالەکێ ژی دێ دادڤان بۆ دەستنیشانکەت کو بگەهیتە وێ خالێ و ل رەخێ وێ خالێ بزڤرن و بگەهنە سەر خالا جارا ئێکێ لێ

چونە تەلیسی دا



برنا هێکێ



دەربازبووین کو ئەو خالە یا هەمی ل پشت، دێ دادڤان بێژیت هەمی هەر نە سەرخیچێ دەما چوونە سەر خیچێ دێ هەمی چنە دتەلیسێ خۆدا و دێ دەستێ خۆ باش هاڤێنە تەلیسی و دێ ل هیڤیا گۆتنا دادڤانی بن، دەما دادڤانی گۆت: ئێك دو سێ، هەمی ب هەڤرا دێ جۆتکانێ د تەلیسیدا خۆ هاڤێن، لێ ب چ رەنگەکی نابیت پێن وان ژ تەلیسی دەرکەڤن و دەستێت وان لێ ڤەبن، بەرەڤ خالا دیار کری دێ چن دەما گەهشتنە خالێ دێ هەر ب ڤی شێوەی ڤەگەرن بۆ وێ خیچا دیار کو دادڤان ل سەر راوەستای، ئەو یاریکەرێ بەراهیێ دگەهیتە دەڤ دادڤانی یان سەر خیچێ ئەو دێ بیتە یاریکەرێ ئێکێ، هۆسا یاری ب داوی دهێت شیانێن یاریکەرا دێ دیارین.

## ٢٢- یارییا برنا هێکێ[11]:

ئەڤ یارییە دهێتەکرن و یا بەربەلاڤە ل پتریا باژێر و گوندێن کوردستانێ، دیسان ئەڤ یارییە ژی هەڤرکییەکا جوان و سەیرە چەند کەسەك دێ خیچەکێ کێشن و هەمی دێ ل سەر ڤێ خیچێ رێزبن و هەر ئێك ژ وان دێ کەڤچکەکێ گرارێ کەتە د دەڤێ خۆ دا و دادڤانێ ڤێ یاریێ ژی دێ هەر کەڤچکەکی هێکەکێ دانیتە سەر و دێ جهەکی بۆ دەستنیشانکەن کو بگەهیتە وێرێ و دادڤان دێ بێژیت: ئێك و دوو سێ، دەما گۆتنا (سێ) ژ دەڤی دەرکەڤت هەمی ب هەڤرا دێ بەزن و کا دێ کیژ بەراهیا هەمی هەڤالێن خۆ گەهیتە جهێ دیارکری، ئەوێ بەری هەمییان گەهشت ئەو دێ بیتە سەرکەڤتیێ ئێکێ و یێ دی دێ بیتە یێ دووێ و هۆسا ئەڤ یارییە دهێتەکرن و بۆ هەردو رەگەزا چێدبیت و چەند پشکدارین دروستە.

## ٢٣- گوستیرانێ[12]:

ئەڤ یارییە ژ یارییێن گەلەك بەلاڤ و گرنگە و پویتە پێ دهێتەدان، ئەڤ یارییە ب ڤی رەنگی دهێتە کرن:

وەکی هەمی یارییێن دی هەڤرکییەکا گەلەك مەزنە

دناڤبەرا دوو تیمادا دهێتە کرن چ کور یان کچ یان ژی تێکەل، دەستپێکرنا ڤێ یاریێ هەر ژ ناڤێ وێ دیارە کو ب (گوستیرك) کرنا یاریێ دێ هێتە دەستنیشانکرن.

بەری دەست ب ڤێ یاریێ بهێتە کرن دێ دو (سەردار) هێنە دەستنیشانکرن، ئەڤ هەردو سەردار دێ دەستم بادم کەن کادێ کیژ تیم ل بەراهیێ دەست ب ڤەشارتنا گوستیرێ کەت، دەمێ دیار بوو کا کیژ تیم دێ دەست ب ڤەشارتنا گوستیرێ کەت، ئەو تیم دێ ( پارچەکا قوماشێ مەزن یان بەتەنییەکێ) بەرهەڤکەن و هەمی دێ دەستێن خۆ بەنە بن بەتەنییێڤە، بەرپرسێ کۆمێ د بن بەتەنییێڤە دێ ئەو گوستیرێ دانیتە ناڤ دەستێ ئێك ژ ڤان هەڤالێن خۆ و هەر ل بن بەتەنیێ هەمی دێ دەستێن خۆ گرن یان (مچینن) و بەرپسیارێ کۆمێ دێ بێژیت(بات بات) ئانکو هەمی دەستێت خۆ ژبن بەتەنییێڤە بینىە دەرێ و دێ دەستێت خۆ بەرامبەری تیما هەڤرك راوەستینن ئێك ژ تیما بەرامبەر دێ ئاخڤیت و دێ بێژیت گوستیر یا دیارە و بەرامبەری تیما دی دێ ئەو دەستێ ئەو حەز دکەت دێ بێژیت (پویچکە یان ڤەکە) و ئەو دەستێ حەز کەت دێ ئەڤی دەستی بدە من ئەگەر هات و چوو گوستیر دیار کر ئەڤە ئەو تیما گوستیر وەرگرتی دێ دەست هاڤێنە ڤەشارتنا گوستیرێ بەلێ ئەگەر هات و چوو نە دیار کر دێ خالەك هێت دەستنیشان کرن هەتا دبنە بیست خال، خالا بیست و ئێکێ دبێژنێ (دەستە گول) ئەگەر یا بیست و ئێکێ تیما بەرامبەر دیار کر پێنج خال دێ ژ کۆما خالا هێنە خوار، کێ خالا (دەستە گول) ب دەست خۆ ڤە ئینا ئەو تیم دێ تیما سەرکەڤتی بیت.

تێبینی:

ئەو ب خۆ گوستیرانێ ب بیست و ئێك خالا دهێتە کرن بەلێ هەر دو کۆم دشێن بۆ خۆ کۆمەکا دی یان هەژمارەکا دی دەستنیشانکەن بەلێ ب مەرجەکی یا کەت بیت ئەو ژمارە ئێك ژڤان هەژمارا بیت (٢١ – ١٥ – ٩).

ئەو تیما سەرکەڤتن دەستڤەئینا ئانکو دەستەگول

چولانێ



چولانێ



ب دەستڤەهات دێ گوستیرکێ ڤەشێریت و تیما دۆراندی دێ هەر یاریکەرەك بۆ خۆ دەستەکێ یاریکەرەکێ بەرامبەر هەلبژێریت.

## ٢٤- چۆلانێ[١٣]:

ژ یاریێن بەربەلاڤە ل دەڤەرێ و ب گەلەك رەنگان دکەن. باراپتر رەگەزێ (مێ) ئەڤێ یاریێ دکەن، یان ژی زارۆکێ (نێر و مێ) پشکداری ڤێ یاریێ دبن. چاوانییا سازدانا ڤێ یاریێ:

ئەڤ نەخشێ دیار کو شەش لاکێشێن وەك یەك پێك هاتییە و ب خولیێ یان گێچێ دهێت نەخشەکرن، د ڤێ یاریێدا هەڤرکی دناڤبەرا دوو یاریزانان یان دوو تیماندا دهێتەکرن، دێ خیچەکێ کێشن یان ژی دێ پارچەکا رەژێ ئینن ودێ ڤی نەخشی ل جهەکێ دەشت یان رەق چێکەن و بەرکەکێ پان کو ب پێی بچیت ب رەنگێ(بازنە) بۆ خۆ دێ پەیدا کەن، وەکی هەمی یاریێن دی دێ دەست ب (دەستم بادم) کەن ئەوێ ب دەستم بادم سەرکەڤت ئەو دێ وی

بەرکی هاڤێتە لاکێشا ژمارە ئێك ئانکو ئەو دێ دەست پێ کەت.

ل سەر پێیەکی دێ خۆ هاڤێتە د خانا ئێکێدا و هەر ل سەر پێیەکی پێ خۆ ل بەرکی ددەت و دهاڤێتە دەرڤە لێ دڤێت نە کەڤیت و بەرك نەکەڤیتە سەر خیچێ و پێ وی ژی نەکەڤیتە سەر خیچێ پاشی دێ هاڤێتە خانا دووێ هەروەسا ل سەر پێیەکێ دێ چیتە خانا ئێکێ و دەربازدبیتە یا دووێ خۆ دەرێخیت پاشی خانا سێ و هەروەسا دێ چیتە خانا چوارێ بەلێ هەر خانا بچیت دڤێت ب شێوەکێ رێك و پێك ب خانا ئێکێ دەستپێکەت، تا دگەهیتە خانا شەشێ بەرك بەرەڤ خانا شەشێ دهێت بۆ دەرڤە بەلێ چوونا یاریکەرێ ئێك دو وهۆسا هەتا د گەهیتە خانا شەشێ.

پشتی خانا شەشێ قورتال دکەت یاریکەر دێ هەردو چاڤێن خۆ نقینیت و ب جۆتکانێ دێ خۆ هاڤێتە ناڤ

نیشان كرنا ئارمانجێ، و ڤ كویرێ بكەڤیت درستە.
- گۆیا بەر كاشۆیان:
واتە: كەسەكێ تەپەسەر و هەرێ لێدای، یان نیشانە بۆ تیرێن خەلكی.
كاشویانێ ژی یاریەكا فولكلۆرییە، كو گۆیەكا دناڤدا هەی.
- كوتی لێدان:
دناڤ یاریان دا كریارەكە دناڤ یاریا (كوتیانێ) دا، دەمێ ئارمانج ب جە نەهێت.
دناڤ ئیدیومان دا واتە: ئەنجام نەهنگافتن. نە لێدان. كەچ كرن.
- هەمی گاڤا پێ ل بەر گۆكێ:
واتە: هەردەم پێ كەتییە، و چ بزاڤ ژێ ناهێن.
- رێكا مامو چیچە:
واتە: دەلیڤەدان بۆ دەرباس بوونێ، ئەڤ چەندە جارجاران یا دناڤ یاریا (چیزانێ) ژی دا هەی و د ئیدیومان ژی دا هەمان ئەو دەلیڤەیە.
- ویڤانێ كرن:
دناڤ ئیدیومان دا واتە: جار جاران دیاربوون و جارەكادی بەرزەبوون.
دەمێ دیار دبیت و هەر زوی بەرزە دبیتەڤە دێ بێژنێ: ئەڤە تو ویڤانێ دگەل مە دكەی؟!.
ئەڤە ژی یاریەكە بۆ زارۆكێن گەلەك بچویك، كو هێش ب سەر پیا نەكەتین دكەن، و پتر ژبوو دكەن دا ب كەنە كەنی.
- بزدم بادانێ یە:
ئەڤە یاریەكا دەستپێكییە بۆ هندە یاریێن دی.
دناڤ ئیدیومان دا واتە: پێنگاڤێن هێدی هێدی. یان ب دلێ خۆ ب رێڤە چوون.
- بن ئاڤكی چوون:
ئەڤ چەندە دیاریان دا یا هەی. دەمێ هندەك خۆ دئێخنە ئاڤێ، و خۆ تێدا نقو دكەن و دچن دا هەڤالێن خۆ ب دزیڤە بكرن.
دناڤ ئیدیومان ژی دا واتە: ب دزیڤە. یان ب رێكەكا هونەری. یان ب رێكەكا خاپینۆك.
- بن كەفشانێ:
یان: ل بن كەفشانێ چوون:
ئەڤ چەندە دناڤ ئیدیوماندا شەرە. لێ ل هندە جارێن دی، وەكی یاری ژی ل كارە بۆ دیار كرنا هێزا خۆ.
- بەرێك دانان:
یان دبێژن: پێ ئالینك دانان:
واتە : پلان و نەخشە دانان بۆ كەتنەكا ئێكی. یان ئێخستنا وی. یان ئاستەنگ بۆ چێكرن.
ئەڤ چەندە هندە جاران وەكی یاری ژی ل كارە.
- پشی نینویە:
دناڤ ئیدیوماندا واتە: دەستپێكەكا نەرم و رەحەت. پاشی دژواری و درب دانان.
ئەڤ چەندە یاریەكە، باراپتر مەزن دگەل زارۆكان ژبوو كەنینێ دكەن.
- جەهـ بەلاڤ بوون:
دناڤ یاریان دا، واتە دوماهیا یاریان.
دناڤ ئیدیومان ژی دا، واتە دوماهیا هەر تشتەكی، دا هەر ئێك بۆ خۆ بچیت.
- سابینا رەڤێ یە:
واتە بەرامبەری ب باشی و خرابی. من هەلگرە دێ تە هەلگرم. من دانە دێ تە دانم. و ئەڤە یاریەكا كوردەوارییە، كو ئێك ل بەرامبەری ئێكی رادكەت و ددانیت و د ناڤ ئیدیومان ژی دا هەمان واتا هەیە.
- غارو بەزانێ:
كارو خەبات كرن، ژبوو كا كی دێ ل بەرێ گەهیتە ئارمانجێ. مینا دەمێ غاردانێ دكەن.
- لەعب و لیت ژ خۆ چێكرن:
یان دبێژن: كەتن لەعب و لیتا.
واتە: فندو فێل كرن.
- هۆلانێ پێ كرن:
دێ بێژن: دێ هۆلانێ پێ كەم.
واتە: دێ باش قوتم.

## ستران و ئامیرێن ژەنینێ دناڤ ئیدیومان دا:

چەندین ئیدیومێن كوردی، هێڤێنێ وان یێن ژ ستران و مقام و ئاوازو ئامیرێن ژەنینێ هاتینە وەرگرتن، وەكی:
- بار دان ب بەندەكا مقاما:

دناڤ ئیدیوماندا واته هەروه (پەروه) چوون. یان یێ نەزانیت بازاران بكەت.
- مقامێ رۆژێ ل دووڤ رۆژێ:
واته: هەر تشتەك ل دووڤ رۆژا خۆ.
- تەویك دان:
ئەڤ چەنده دسترانانده یێن هەین. پشتی مقاما دبێژن هندەك تەویكا ددەن دبێژن: تەوووو... .
دناڤ ئیدیومان ژی دا واته: ب دلی و رازی بوون. یان پشتەڤانی كرن.
- حەمكو حەیرانو:
واته: خۆزی دان بەر دلی.
- یێ چوویێ... .
دناڤ ئیدیومان واته: یێ بەردەوامیێ پێ ددەت.
یان: یێ بەردەوامە ل سەر گۆتنا ستران بێ راوەستان. وەسان ئەڤ چەنده بۆ گۆتنا چیرۆكا و ئاخفتنێ و هەر تشتەكێ گەلەكێ پێڤه مژویل ژی ل كارە.
- ڤێر كرن:
دێ بێژن (فلان كەسی) یێ ڤێر كریێ...
یان دبێژن: یێ ڤێر كریه سترانا... .
واته یێ مقام و سترانا. یان هەر تشتەكێ خۆش دبێژیت.
- ئاواز گۆتن:
یان: دل سەد ئاواز گۆتن:
تشتەك نه ب ئەشكەرایی گۆتن. یان گومان دئاخفتنا وی دا هەبیت. نه یێ ئێك دل و پشت راست.
- بلویل بۆ گای لێدان:
واته: بێ مفا. هەر وەكی چنه. یان چ تێنەگەهشتن.
- بلویل لێدان:
خۆش گۆتن:
واته: ل دووڤ چوون ب ساناهی.
دێ بێژن: (فلان كەس) ل دووڤ بلویلا وی چوو.
- دزێ ب بلویل:
یان : دزێ ب زەنگل:
كرنا كارێن خراب ب ئەشكەرایی و بێ پەرده، و نەڤەشارتی.
یان: ئێكێ نەزانیت دزیا بكەت. یان دزیا وی زوی ئەشكەرا بیت.
- دهۆلا دگەلی دایه:
واته: دەنگ ڤەدان. یان هەمی پێ ئاگەهدار بوون.
- دهۆل قوتان:
واته: پەسن و مەدحه كرن.
- داری دهۆلێ یه:
واته: دەنگ ڤەدان. بەحس كرن.
- لێڤ دودك بوون:
واته: سالۆخەته بۆ كەسێن لێڤ ستویر.
- بۆ زرنا ددەستاندا:
واته: ددەستاندا رۆن بوون. نزانیت دێ چەوان چارەسەركەت.
- زرنا شكاندن:
واته: دەق شكاندن. خۆشی بۆ نەهێلان. یان سست كرنا هاندانا تشتەكێ، كو ئێك حەز ژێ بكەت.

**چەك دناڤ ئیدیومان دا:**

كورد دبێژن: (چەكێ مێری ل بالگەهێ مێری یێ باشە) و ژیانا كوردان وەسان یا خواستی كو چەك هەر دگەلدا بیت و دگەل بژیت. چ بۆ بەرەڤانیێ و چ بۆ راڤ و نێچیران و... ڤێ چەندێ ئێكا هند كریه كو ببیته پارچەك ژ زمانێ وی ژی، كو دناڤ چەندین ئیدیومان خویا و بەرچاڤە... تڤەنگ و شیر و تیر و رم و خەنجەر و كەمەر و كڤان و... نموونه ل سەر وێ چەندێ:
- تڤەنگا تەمویه:
واته: پەسنا ژ قەستا دكەت. پوف دكەتێ.
- تڤەنگ پێ ڤالا كرن:
واته: دەست رێژكرن، هەتا چ فیشەك نەمان. چی یا ژ دەست هاتی كرن.
- تڤەنگ هەر یا سویار:
واته: هەر یێ ب شەر. یان هەر یێ بەرهەڤ بۆ شەری.
- تڤەنگێت دەهواتیان:
واته: چ ژ بوو نینن. هەر ب تنێ دەنگه و پشتی هینگێ جارەكادی بێ دونگی. گۆتنین بێ وج و بێ نرخ.

- دەستەکی شێر تێدا و ئێکی تیرتێدا:
واتە: شەڕۆکە. حەز ژ شەرا کرن. ئامادە بۆ شەری.
- دەستکێ شیری و تیری بوون:
واتە: ب هەمی رەنگان خۆ گوهورین.
- خۆ ل شیری دان:
یان: خۆ ل شیرێ خودێ دان:
واتە : هەڤرکمانی. نە پێگیر بوون.
- داوەشاندنا شیرێ شین:
واتە: دانانا دریێ کوشتنێ.
- دبن شیرێ (وی) را چوون:
واتە: ل بەر حوکم و دەست هەلاتا وی
- شیر چەم و چەم چوون:
واتە: شیر بلند بوون. یان خودان شیان و دەست هەلات.
- کەلەخ ب سەرێ رما ڤەکرن:
واتە: دەست کەفتی. نێچیر کرن.
- نان ب سەرێ رما ڤەکرن:
واتە: گرانی. کولب بوون.
- تیر هاڤێژ:
واتە: چاڤ هاڤێژ.
- خەنجەر هوسین:
واتە: کارکرن بۆ شەری. یان: یێ سیبەرا ئێك ب تیر دهنگێڤن.
- کەمەر بەستن:
واتە: خۆ بەرهەڤ کرن بۆ شەری. یان: شەڕ و شۆڕ و لێکدانە.
- کاڤلان زراڤ:
واتە: گەلەك ب خۆ خورین.
زێدە باری گەلەك ئیدیومێن دی هەر ل سەر چەکی.

**کەڤنە باوەری:**

گەلەك کەڤنە باوەری یێن هەین کو بووینە پشکەك ژئیدیومان، بۆ نموونە:
- بن ڤەرەنگ خوارن:
یان: بنێ قازانێ خوارن:
واتە: باران و بەفر بارین ل دەهواتا کەسەکی.
ئەگەر ل دەهواتا ئێکی سەقا تێك بچیت دێ بێژنێ: دیارە تە بن ڤەرەنکا خواری (وەکی کەڤنە باوەری).
- بۆ خەسویێ گۆتن:
ل دووڤ کەڤنە باوەریێن کوردی دا ئەگەر ئێك یێ نەساخ بیت و ب تایبەت ئەگەر پەرسیڤ لێ بیت، و بچیت بێژیتە ئێکی پەرسیڤا ل من. دێ بێژنێ: هەرە بۆ خەسویا خۆ بێژە، واتە بلا بەرسیڤ بۆ وێ بچیت.
- حەفت بەر ل دووڤ را هاڤێتن:
واتە: نەڤیانی. و ئەڤە دناڤ کەڤنە باوەریان دا یا هەی.
- بێهنشکا خێری:
یان: بێهنشك هاتە سەر.
واتە: راستی، پشتەڤانی. ل دەمێ دوو کەس دئاخڤن و گۆتنەکێ گومان ل سەر هەبیت و دوێ دەلیڤێ را ئێك ب بێهنشیت. وەکی کەڤنە باوەری دێ بێژنێ ئەڤە بێهنشکا خێرێ ژی هاتە سەر.
- خەسا مووسل ل ناڤ:
واتە: حەرام و ئەڤە پتر ل ناڤ ئێزدییان یا بەربەلاڤە.
- خەسوی حەز ژێ کرن:
واتە: ب بەخت. دەمێ هندەك دێ دەست پێ کەن کو دێ خوارنێ خوون و ئێك ل سەر هەلبیت دێ بێژنێ: دێ وەرە خەسویا تە حەز ژ تە دکەت!
- شەیتانێ ب دەپك:
واتە: کارێن گەلەك خراب کرن.
دناڤ کەڤنە باوەریان دا دبێژن گەلەك جۆرێن شەیتانان یێن هەین. کارێ ئێك ژ وان ئەوە دەمێ مرۆڤێ بسۆرمان ژ پێرڤە دمیزت دەپەکی ددانیتە بەر دا پەشکێن ڤەپەشنە وی و بێ نڤێژ بیت و نەشێت نڤێژان بکەت.
- کولاڤێ ئەجنا د سەری:
واتە: سێربەن. کەس نابینت. کار ب ساناهی ب دەستڤە دهێن.
- عەمرێ تە ژ عەمرێ من درێژتر:
دەمێ ئێك دێ ئاخفتنەکا دەست نیشان کری بێژیت، و یێ ل بەرامبەری وی ژی هەر دا وێ ئاخفتنێ بێژیتێ. ئەو دێ بەرسڤێ دەت و بێژیتێ: عەمرێ تە ژ عەمرێ من درێژترە.

- دەڤ بێنان:
واتە: نە ئاخفتن. یان گرێدانا دەڤی.
ئەڤ چەندە یا ژ ویرێ هاتی دەمێ ل رۆژئاڤا هندە پەز بەرزە دبیت و دمینتە ل چۆلی.خودانێ پەزی دێ چیتە نك ئێكی و باراپتر مەلایە، دا دەڤێ گورگی ببێنیت، و دێ چەقۆکەکێ دەڤ ڤەکری دەتە ڤێ. مەلا دێ پێڤە خوینت و دەڤێ چەقۆکێ گریتەڤە. نیشانا دەڤێ گورگییە (دەهبەیە).
وەسان گەلەك ئیدیومێن دی ژی ب ڤی رەنگی ل سەر کەڤنە باوەریان هەنە.

**خوارن دناڤ ئیدیومان دا:**

وەکی دیار ب دەهان خوارنێن کوردی هەنە و ئەو ژی یێن بووینە پارچەك ژ ئیدیومان (ترشك، کوتلك، سلك، ئاسویدە، دۆرك، کولیچە، دەو، پەلاڤ ماش و... یێن مایی):
- دل ل ترشکێ هەبین:
واتە: حەز کرن بۆ کارەکێ تایبەت.
- ژ ترشکێ کوتلك بەسە:
واتە: تشتەکێ گرنگ.
- سلك ژی (ڤیان) و کوتلك ژی:
دێ بێژن: سلك ژی دڤێت و کوتلك ژی دڤێت.
واتە: هەمی تشت بۆ خۆ ب تنێ دڤێن. یان رەنگە زك رەشییەکە.
- ئاسویدە نەخارن:
واتە: چو ژ دەستی نەهاتن. دەست کورتی، ژاری.
- حەز ژ (حەژ) ئاسویدا کرن:
واتە: تشتێ ب دەست نەکەڤیت. بۆ خۆزییا دلی دهێتە گۆتن.
- پەلاڤ خارن:
یان: پەلاڤ ماش خارن:
واتە: خۆشی. زەحمەت نەدیتن.
- سە ژ کولیچا نە رەڤین:
واتە: کەس ژ خۆشییا و خوارنێن خۆش نا رەڤیت و خۆ نادەتە پاش.
- (دبێژیتە) نانی پەپیشك:
واتە: بچویك، زارۆ.
- دۆرکا ب دۆن:
واتە: هەمی تشت ل هەمی دەما بۆ مرۆڤی دروست ناهێن. دێ بێژن:
دۆرکا تە هەر یا ب دۆن نابیت.
- دەوینا ب پینکە:
واتە: خوارنەك، یان کارەکێ بێ سەر و بەر.
- دەوێ یاسێ بوون:
واتە: دەوێ رۆهن. یان ئاڤەماستا رۆهنا هەمی ئاڤ.
- دەوێ جەرباندی:
واتە: تشتەکێ دیتی و بینای و هاتییە تاقیکرن باشترە. گۆتن دبێژیت:
دەوێ جەرباندی چێترە ژ ماستێ نە جەرباندی.
- گێلما گاڤانی:
واتە: خوارنێن دناڤ ئێك دا و باراپتر گەلەك د بێ سەر و بەرن.
وەسان گەلەك ئیدیومێن دی هەنە کو خوارن و تشتێن پەیوەندی ب خوارنێ ڤە هەین بوویە بنیاتێ وان... هنگڤین، دانقوت، گرار، کەباب، دۆشاڤ، کادە، ساڤار، سفرە و... یێن مایی.

**رستن و چنین دناڤ ئیدیوماندا:**

رستن و چنین و کارێن دەستی ئێك ژ پێدڤییێن ژیانا کوردان بوون و نهو پارچەکە ژ فولکلۆرێ وی و ئەو ژی یێن بوویە پارچەك ژ ئیدیومێن دەڤەرێ مینا:
- خراب رستن:
واتە ساخلەمیا خراب و بەرەڤ نەباشبوونێ ڤە چوون.
- گلۆلکا ئالزیای:
واتە: تێك شێلان. یان تێك نە گەهشتن. چ سەرەدەری نەدیتن.
- گلۆلك هەلچنین:
واتە: کار ئەنجامدان. یان کار بەرنگڤە هاتن. دروست بوون.
- د تەڤنی نەگەهشتن:
واتە: د سەروبەر و کاودانی نە گەهشتن.

- خودانێ خۆ و دۆخینێ:
واتە: خودان دەستکەتی و باراپتر ل سەر حسابا هندەکانە.
- ژ کومی حەتا شمی:
یان دبێژن: ژ کولاڤی حەتا پێلاڤێ.
واتە: هەمی، ژ سەری تا بنی. سەرانسەر.
- ساق و گۆرە گرێدان:
واتە: خۆ بەرهەڤ کرن، چ بۆ رێکەکا دویر، یان شەرەکی یان... .
- سەرێ وەریسی بۆ وی بوون:
دێ بێژن: بلا سەرێ وەریسی بۆ تەبیت.
واتە: ب دەستڤە بەردان و گەلەك ل دووڤ تشتەکی نەچوون.
- زەرێ ژ مێزەرێ (مەحفیرێ) کێم:
واتە: کێماسیەکا کێم دا ل سەر تەمام بیت. گۆتن دبێژیت:
زەرێ ژ مەحفیرێ کێمە.
- بەرك برن بەرێك:
واتە: حەز ژ ئێك کرن (بۆ کچ و کوران). گونجاندن دگەل ئێك.
وەسان چەندین ئیدیومێن دی، مینا گویفك و چانتك و... .

## چیرۆك و سەرهاتی دناڤ ئیدیوماندا:

چیرۆك و سەرهاتیێن کوردی ژی پشکەکن ژ ئیدیومێن دەڤەرێ:
- کورێ چیرۆکا بوون:
واتە: زوی مەزن بوون.
- چیرۆکا رۆستەمییە:
واتە: گەلەك درێژ بوون.
- چیرۆك و چیڤانۆك گۆتن:
واتە: گەلەك درێژ بوون.
- چیرۆکێت مارا:
واتە: ب دوماهی نەهاتن.
- چاڤێت زیق و کوریا رەق:
واتە: پێڤە چوون پشتی نموونەکێ خراب ل بەر چاڤان دیتن. و ئەڤ چەندە دناڤ چیرۆکەکێ دا هەیە.
- حالێ زەمبیل فرۆشی:
واتە: نەخۆش حال.
- پیرا ب فندو فێل:
واتە: شەهرەزا و خاپینۆك
- کولیلکا دەرێ کانیێ:
واتە: ئارمانج دانانا هەروە. د خەیال و ئاشۆپێن خۆشێن بێ بنیات دا ژیان.
- گیسکێ عیسێ یە:
واتە: وەکی خۆ مان. نە قەلە و دبیت و نە لاواز، (ژ سەرهاتیێن عیسێ دەلایە).
- میرم بووری:
واتە: پەشیمانیا بێ مفا، (ژ سەرهاتیێن عیسێ دەلایە).
- ستو کەتن گرێیا گۆلکێ:
واتە: کەتن دناڤ گرفتاریەکێ دا، ژ ئەنجامێ کارێن ژ خۆ مەزنتر کرن.
- سەرك بادان:
واتە: لێڤەبوون، خاپاندن، هێجەت گرتن، بهانە دیتن.
وەسان گەلەك چیرۆك و سەرهاتیێن فولکلۆری و مێژوویی ژی.

## جل و بەرگ دناڤ ئیدیوماندا:

گەلەك ژ جل و بەرگ و پێلاڤ و ئەو تشتێن ل بەر دکەن ژی بووینە ئیدیوم:
- ئینسان دارێ لباسییە:
واتە: مرۆڤ ب جلکان یێ دیار و پێشکێشە.
- هەچیێ هات، (چوون) دبن قاپیتی ڤە:
واتە: ل دووڤ رۆژێ و کاودانی و بەرژەوەندیێن خۆ چوون.
- باش دپێچۆلکێ پێچان:
دێ بێژن: باش دپێچۆلکێ نەهاتییە پێچان.
واتە: نە باش، نەپەروەردەکری.
- کراسێ درێژ بۆ کەرکرن:
واتە: باشی و قەنجی بۆ حساب کرن.
- کالك و گۆرە گرێدان:

واتە: خۆ بەرهەڤکرن، یان دەستپێکرنا کارەکی.
- پێلاڤ ژ پێخاسی خاستن:
واتە: خواستنا تشتەکی ژ کەسەکێ ئەو تشت نەبی.
- ئاخفتن ژ بن شاشکێ دەرکەتن:
واتە: ئاخفتن ژێ چێکرن.
- کرن شەکال:
دێ بێژن دونیا کرە شەکال و کرە پێ خۆ.
واتە: چ خەم ژێ نە هەلگرتن.

**چاندن و کەل و پەلێن چاندنێ دناڤ ئیدیوماندا:**
گەلەك ژ زاراڤێن چاندنێ، یان ئامیرەتێن چاندنێ و کاروبارێن دی کو ل دەڤەرێ ل کارن ژی بووینە ئاڤاکەرێن ئیدیومان مینا:
ژ ئامیرەتان:
تەڤر، تەفشی، بێرك، مەرك، داس، بڤر، گێسن و... هتد.
ژ کار و کریارا و جها و ئەو تشتێن پێ دادگرن:
جۆخین، بێدەر، مەلۆکە، پرێزە، هەلامەت، سەڵك، سەڤیك و... هتد.
- چار (سەد) گێسن کرن:
واتە: گەلەك کرن و کرنەڤە.
- مەلۆکە ل پرێزا نەرابوون:
واتە: چ ب دەست نەکەتن. دەستکەفتی ژ ڤالاهییا نەهاتن.
- ئاڤا دسەلکێ یە:
واتە: تشتێ مفا ل دووڤ نەبیت. یان پالێ پویشی.
- ئاگرێ بن جۆخینێ:
واتە: کەسەکێ بنڤە بنڤە بیت. فتنەچی و بەرزە، خاپینۆك (ئاگرێ بن کایێ).
- تەفشیێ بەرێ خۆ:
واتە: ب تنێ بۆ خۆ دکەت و بۆ خۆ دڤێت. زك رەش.
- هەلامەتێ ناڤ گولبەرۆژا (برنجی):
واتە: گەلەك کرێت. یان راوەستیان و بێ لڤین.

**نان پاتن و کەل و پەلێن وێ دناڤ ئیدیوماندا:**
نان پاتن ژ کارێن سەرەکیێن ژیانێ نە، لەوما بووینە پارچەك ژ وێ ژیانێ و پارچەك ژ زمانێ رۆژانە.
ئەگەر ئەم ل ڤێ فەرهەنگۆکێ بنێرین، دێ بینین ب دەهان پەیڤان جهێن خۆ دناڤ ئیدیومان دا گرتینە، ب تایبەت پەیڤا (نان) بخۆ، کو پتر ژ (٥٠) ی ئیدیومان پەیڤا نان هەمبێز کرییە :
- بێ نان و خوێ:
واتە: بێ ئەخت و بار. قەنجی نەزان.
- نان ژ دەڤێ سەی رەڤاندن:
واتە: پیس، تەمەعکار.
- نانێ گوهـ شۆریێ خارن:
واتە: هەمی کارێن کێماسی ل سەر خۆ قەبیل کرن، ژبوو زکی.
وەسان گەلەك پەیڤێن پەیوەندی ب نانی ڤە هەین بووینە ئیدیوم: کوچك، سێل، هەڤیر، تەنویر و... هتد).
- تەنویرا جەهنەمێ:
واتە: گەلەك گەرم.
- هەڤیر گەلەك ئاڤ ڤەخارن:
دبێژن: ئەڤ هەڤیرە دێ ئاڤێ ڤەخۆت.
واتە: چیر درێژبوون ودرێژ ڤەکێشان.
- ئاگر ل بن کوچکی نەهاتن هەلکرن:
واتە: هەژاری. یان تشتەك دخانی ڤە نەبی(کوچك بۆ گەلەك کارانە).

**دەوار و کار و بارێن وان دناڤ ئیدیوماندا:**
ئەڤە ژی فەرهەنگۆکەکا بەرفرەها دەڤەرێ یە کو بوویە پارچەك ژ ئیدیومان:
کورتان، هافر، جهۆرك، سنك، هەفسار، وەریس و... هتد:
- کورتانێ دەجالی:
یان دبێژن: قەرتێ دەجالی:
واتە: گەلەك پێڤەمان و بێ ئەنجام (خراب بوون).
- جهۆرکەك بەرا دا سەر:

واتە: کوشت ژ برسان.
- هەڤسار کرن:

واتە: گرتن ، قەید و بەند کرن. هەڤدژی بەردان و ئازادیێ.

- کوری کرن سنگ:

واتە: مرن، رەق بوون، بەست گرتی بوون (سنگ بۆ گەلەك تشتان بکار دهێت).

- هافر خۆش بوون:

واتە: خۆرا بوون، ئاشك خۆ بوون. (هافر بۆ گیانداران ب گشتی ل کارە).

## کەسایەتییێن فولکلۆری دناڤ ئیدیوماندا:

کەسایەتییێن فولکلۆری بووینە ئیدیوم، وەکی رەنگڤەدانەك بۆ کەسایەتییا وان:

- لاوکێ مەعدەنی:

واتە: کەسێ جحێل و زیرەك و... هتد.

- دێ بێژی عەلیکێ بەتێ یە:

واتە: چاك و زیرەك.

- رۆستەمێ زالێ:

واتە: زەبەردەست، مێرچاك، زیرەك، چەلەنگ و ژبەر خۆ دەرکەتی.

- لەیل و مەجریم:

واتە: دوو ئەڤیندار. یان گەلەك حەز ژ ئێك کرن.

وەسان گەلەك کەسێن دی (مەم و زین و عیسێ دەلا و میر محێ و عەمێ گۆزێ...هتد) .

## کوچکدان (لێنانگەهـ) دناڤ ئیدومان دا:

ب دەهان پەیڤێن رۆژانە ل کوچکدانان، یان بۆ خوارنێ و کوچکدانان ب کار دهێن و بووینە ئیدیوم (کەچك، هەسکیك، دیز، شکەڤ، کێر، سەراد، بێژینگ، هاون، تویرك، جهالك، هومبان، قازان، ترارك، ساتۆر و... هتد) .

- کۆدك ل تراركێ مێرادان:

واتە: خۆ تووشی کارێن ژ خۆ مەزنتر کرن.

- خرێن ژ بنێ قازانێ هینان:

واتە: چ تێ نەهێلان. هەمی خوار.

- ئاڤا جەرکی گەرم بوو:

واتە: کەڤن بوو. یان ژ بهایێ وی هاتن خوارێ.

- کێر گەهشتن سەر هەستی:

واتە: نەچار کرن، تەنگاڤ کرن.

- گۆزك و مەسین ڤێك کەتن:

واتە: چ چێ نەبوون.

## جوانکاری و ثویشتن و ڤەثویشتن دناڤ ئیدیوماندا:

بابەتەکێ دی یێ گرنگە دناڤ ئیدیومێن دەڤەرێ دا: (کل، کلێ سبحانی، کلدان، گوهار، گوستیر، سابین، تاس و حەمام و... هتد ) چەندین پەیڤین دی بووینە ئیدیومێن دەڤەرێ:

- کل د چاڤا وەراندن:

واتە: قەنجی لێ کرن، جوان کرن، باشی دگەل کرن.

- (ژنوی) تل ل بن کلدانی دان:

واتە: ژنوی دبەر خۆرا چوون.

- سابوینا حلوی:

واتە: دەڤ خۆش، جەمباز.

- کرن گوهار:

واتە: شیرەت وەرگرتن. یان شیرەت ژبیر نەکرن.

- گوستیرا تبلی:

واتە: ل بەر فەرمانا وی. گوهداری کرن بی دوو دلی.

هەلبەت چەندین بابەتێن دی یێن فولکلۆری هەنە کو مفا بۆ ئیدیومان ژێ هاتینە وەرگرتن و ئیدیوم ل سەر هاتییە ئاڤاکرن.

ژ بلی ڤێ چەندی گەلەك پەیڤان ژی جهین خۆ مشە دناڤ ڤان ئیدیومان کرینە و بووینە پشکەك ژ ئاڤاکرنا وان ، مینا (خوێ، ئاڤ، ئاخ، ئاگر، ئەزمان، پاری، کانی و... هتد) .

## لەش ئاڤاکەرێ ئیدیومان:

لەشێ مرۆڤی گرنگترین ئالاڤە، کو ئیدیومێن دەڤەرا بەهدینان ل سەر هاتینە ئاڤاکرن. ئەگەر مرۆڤ لەشێ مرۆڤی وەك نەخشە ب دانییە بەرچاڤ، دێ بینی پتریا ئەندامێن لەشێ مرۆڤی دهەڤپشکن بۆ ئاڤاکرنا وان و یێن دناڤ خۆدا هەمبێز کرین.

ئەگەر مرۆڤ نێرینەکێ دناڤ ئیدیومێن دەڤەرێ دا

بکەت، کو دبنە پتر ژ (٥٠٠٠) ئیدیومان، دێ بینت نێزیکی ٣٠٪ ژێ دتایبەتمەندن ب لەشێ مرۆڤی ڤە. ئەڤە ژیلی وان پەیڤێن گرێدای ب بزاڤ و لڤینێن مرۆڤی ڤە هەین، وەکی خەو و نڤستن و کەنی و گری و گیان و ساخی و نەساخی و هزر و مرن و... هتد. هەروەسان ژیلی ڤەرێژێن (دەرکریێن) ژ لەشێ مرۆڤی دەردکەڤن، وەکی خوهـ و تف و دەستاڤ و ئەو پەیڤێن ب وان ڤە گرێدا. ئەڤە زێدە باری گەلەك پەیڤان ب مرۆڤی ڤە نینن، یێن ب گیانداران ڤە هەین، لێ وەکی میناك ل سەر مرۆڤان دهێنە پراکتیزەکرن، بۆ نموونە: ( پیرت، کۆفیك، کوری و... هتد):

ئیدیوم: پویرت لێ رابوون:

واتە: مەندەهۆش بوون. یان کارتێکرنا بێهنا و دژواریا رویدانان.

ئیدیوم: کوری کرن سنگ (داس- دار):

واتە: مرن، رەق بوون، بەست گرتی بوون.

وەسان گەلەك ئیدیومێن دی، مینا کۆفیك شۆر کرن و... هتد.

دیسان ئەگەر ئەم ل ڤان ئیدیومان بنێرین، دێ بینن هندەك ئەندام پتر ژ هندەکێن دی ل کارن وەکی:

- سەر، دل: هەر ئێك ژ وان نێزیکی (٢٠٠) ئیدیومان.
- دەست، چاڤ: هەر ئێك ژ وان پتر ژ (١٥٠) ئیدیومان.
- پێ، دەڤ: هەر ئێك ژ وان پتر ژ (١٠٠) ئیدیومان.
- گوهـ، ئەندامێن دەستاڤێ: هەر ئێك ژ وان پتر ژ (٦٠) ئیدیومان.
- خوین، پشت، ئەزمان: هەر ئێك ژ وان پتر ژ (٣٥) ئیدیومان.
- مل، لێڤ، زك، تبل، دفن، روی، ددان: هەر ئێك ژ وان پتر ژ (٢٠) ئیدیومان.
- ستۆ، هەستی، موی، سینگ: هەر ئێك ژ وان پتر ژ (١٠) ئیدیومان.
- ئەنی، مەژی، پەراسی، لەپ، حەفك، نینۆك، بن کەفش، لنگ: هەر ئێکی پتر ژ (٥) ئیدیومان هەنە.

ئەڤە زێدەباری چەندین ئەندامێن دی، ب رێژەیەکا کێمتر، کو ژمارا وان کێمترن ژ (٥)ئیدیومان، و بووینە ئاڤاکەرێن ئیدیومان.

ئەڤە ژێ چەند نموونەکێن وان ئیدیومانە:

سەر:

- سەرێ ماکەرا دەجالی کێشان:

واتە: ژی (تەمەن) عەمر درێژ.

- سەرو چاڤ:

تەنی و روینی دسەر و چاڤا ددەت.

واتە: شەرم و کەرامەت بۆ نەهێلان.

موی:

- ماست نە بێ بێ موییە:

واتە: کارەکێ نهێنی یێ هەی. یان تشتەکێ بەرزە و دبنڤە یێ هەی.

بسك:

- بسك ل بەر گرتن:

واتە: هشیار کرن بۆ ئەنجام نەدانا کارەکێ دەست نیشانکری ژبەر زیانێ.

ئەنی:

- خوها ئەنیێ:

واتە: حەقێ واستیانێ. حەقێ زەحمەتا دەستێ وی.

ناڤ چاڤ:

- ناڤ چاڤ گرتی بوون:

واتە: دەست گرتیبوون، چرۆك بوون، تنگژین.

چاڤ:

- چاڤ لێ سۆر بوون:

واتە: خۆ خرخۆش کرن بۆ ئەنجامدانا شەرەکی و بەلایەکێ.

بری:

- دناڤبەرا چاڤ و بریادا:

واتە: دەمەکێ گەلەك کورت.

مژیلانك:

- مژویلانکا بەرچاڤ گرتن:

واتە: نەدیتن، کۆرەبوون.

بژی:

- دەست ب بژیارا گەهشتن:

واتە: دیتن، گرتن و سزادان.

ریهـ:

- ب ریهاڤە هلاویستن:

واتە: نە تمام كرن، مژویل كرن، حال نەخۆش كرن.

ڕوی:

- كاڵك ژ ڕوی چێكرن:

واتە: زڕ شەرم، ڕوی موكم، دخەما چ تشتی نە.

سمبێل:

- ب كتەكا سمبێلێ ڤە گرێدان:

واتە: ل بەر وی چ نینە.

گوهـ:

- نانێ گوهـ شۆریێ خارن:

واتە: هەمی كارێن خراب ل سەر خۆ قەبیل كرن ژبوو نانی .

بن گوهـ:

- بن گوهـ پوڤدان:

واتە: هاندان بۆ ئەنجام دانا كارەكی، ناڤ تێنان.

دفن:

- بێهن ل سەرێ دفنێ:

واتە: بێهن لێ تەنگ كرن.

كەپ:

- بەر كەپ ڕەش بوون:

واتە: سمبێل هاتن، بوون خورت ، بوون زەلام، سنێلەیی.

دەڤ:

- دەڤ بەش:

واتە: هەر یێ برسی. یان دەڤ ب گری (بۆ زارۆكان).

لێڤ:

- لێڤەك ل عەردی ئێك ل عەسمانی:

واتە: سل، عاجزو پۆسیدە.

مەژی:

- مەژی غولغولاندن:

واتە: هزر ب شۆل ئێخستن. هزر برن بۆ جهەكێ دی (كارەكی).

ئەزمان:

- ئەزمان دەڤی دا هاتە دەر (هاتە خار):

واتە: كەرخین، گەلەك واستیان.

كێلب:

- ب كێلبێ ڤەكرن:

واتە: كارێ ژ خۆ بوون، كارێ بێ وج بوون.

ددان:

- ددان نیشادان:

واتە: تێ شەهرەزابوون، خو نیشادان:

حەفك:

- كەلە گری كەتن حەفكێ:

واتە: كەلا گرینێ لێدان.

ستو:

- كنف ئێخستن ستۆی:

واتە: بێهن تەنگ كرن، چ پێ چێنەبوون.

گەردەن:

- گەردەن قازە:

واتە: سالۆخەتە بۆ گەردەنێن سپی وجوان درێژ.

گەوری:

- گەوری تژی كرن:

واتە: بەرتیل كرن، دەست گەرم كرن.

قرقڕك:

- قرقڕك برین:

واتە: سەرژێكرن، سزادان، كوشتن.

قدقدك:

- قدقدك گرتن:

واتە: ژنڤەنەبوون.

پاتك:

- ب پشتا پاتكێ ئاخفتن:

واتە: ژ نە دل، یان ب نەڤیانی و نیڤ سل و ب خورتی ئاخفتن.

سینگ:

- سینگ لێكدان:

واتە: لێك كەتن، ب شەر چوون.

پەراسوی:

- ل بن پەراسویاڤە:

واتە: نهێنییەك، یان نەڤیانەكا ڤەشارتی.

زك:

- دزكدا كەلین:

واتە: خەمەكا مەزن و خۆ پێ های نەدەت.

نافك:

- نافك برین:

واتە: تێ شەهرەزابوون، هەمی تشت ژێ زانین.
مەمك (چچك):
- مەمك ددەڤی دا:
واتە: ساڤا، زارو، بچویك.
پشت:
- نان کەتن سەر پشتا خەزالێ:
واتە: نان و ژیان ب زەحمەت کەتن.
تەنشت:
- ل سەر ئێك تەنشت کەتن:
واتە: نڤستن تا سپێدێ بێ لڤین(ل سەر ئێك تەنشت).
کێلەك:
- دەست دان کێلەکێ:
واتە: چ نەکرن. نەشێت چ بکەت ژ نێرینێ پێڤەتر.
تل (طل):
- ب تلی (طلی) دادان:
واتە: نەکامی و لۆمەکرن.
دل:
- مان ل سەر دلی:
واتە: گرانییەك، نەمەزاختن، نەفرۆتن، خوارن نە حەل کرن.
هناڤ:
- گرك دهناڤاندا:
واتە: گەلەك سار، ژ سەرما لەرزین، لەرزکا تایێ و... .
مێلاك:
- پەز بۆ مێلاکێ سەرژێکرن:
واتە: کارەك بۆ کارەکێ فەرترو گرنگتر.
مەعدە:
- مەعدا کەوی یە:
واتە: نەشێت تشتەکێ پیس و گرتن بخۆت. یان گەلەکێ سپی یە.
جەگەر:
- جەگەربوونی:
واتە: ژ خوین و ڕڤیشتێ بوون.
عیرك :
- بێ (ب) عیرك بوون:
واتە: بێ (ب) کەرب و عیناد.
زەراڤ:
- پێ ل زەراڤی نان:
واتە: زەراڤ ستویر بوون، دلێر بوون.
ناڤتەنگ:
- ناڤتەنگ لێ قەتیان:
واتە: گەلەك لاواز بوون.
دەست:
- دەست داهێلان:
واتە: بێ کار، چ ژێ نەهاتن.
مل:
- مل ژێ خارن:
واتە: دشیاندایە کارەکی و نەمازە یێ گران ئەنجام بدەت.
بن کەفش:
- تشتەك دبن کەفشی ڤە هەیین:
واتە: نهێنییەك یان ئارمانجەك هەیین.
چنگل:
- چنگل کێش کرن:
واتە: (زارۆکان) هەر ژ ملان راکرن و نەدویرە کارتێکرنا لێ بکەت.
زەند:
- زەند هلدان:
واتە: خۆ بەرهەڤکرن بۆ کارەکی و نەمازە یێ گران.
چەنگ:
- چەنگ هاتن:
واتە: مەزن بوون و دشێت هندە کاران ئەنجام بدەت.
چەچك و لەپك:
- چەچك و لەپێن خاڤ و خرچ:
واتە: کەسێ نەرم دکاری داو کار ژبەر نەچیت.
لەپ:
- دلەپاندا رۆن بوون:
واتە: ئالۆزو شەپرزەبوون. رێ ل بەر بەرزەبوون، کو نەزانی دێ چ کەت.
تبل:
- تبلا بری خوێ نەکرن:

واتە: چ کاران ناکەت بلا چەند یێ سڤك بیت. یێ کارو کەسبە.

نینۆك:

- نینۆك هاتن:

واتە: مەزن بوون و ب شیان کەتن. شیانا بەرەڤانیێ هەبین.

پێ:

- ژ پیا کەفتن.

واتە: نەشێت ب رێڤە بچیت

لنگ:

- دونیا دان سەر لنگەکی.

واتە: گەلەك لێ گەریان و هاتن و چوون

تەشك:

- ریتن ب تەشکێن خۆڤە.

واتە: کارێ خراب ژ خۆ چێکرن.

چۆك:

- چۆك لێ شکەستن.

واتە: راوەستان ژ کاران و نەشێت ئەنجام بدەت.

کاب:

- کراسێ کورت ل کابا.

واتە: خەم ژێ نەخارن، شۆل پێ نەبوون.

گۆزەك:

- دەست ل سەر گۆزەکێ.

واتە: چ ژێ نەهاتن.

پاش پەحنی:

- پاش پەحنی ل هێرڤە بن:

واتە: بچیت و نە زڤریت.

بن پێ:

- بن پێ خوریان:

واتە: گەلەك حەزکرن بۆ ئەنجامدانا کارەکی ب گورو کەل.

هەستیك:

- هەستیك لێ نەرم کرن.

واتە: گەلەك هاتە قوتان.

خوین:

- خوین ژێ بەردان.

واتە: ئازراندن.

گۆشت: - گۆشتێ خۆ خارن:

واتە: مەزاختنا مالێ هلگرتی ل رۆژێن تەنگاڤی، کو ل سەر بژیت.

وەسان ب دەهان ئیدیومێن دی ژی هەر ب ڤی رەنگی...

## نویاتی دئیدیومێن دەڤەرێ دا:

زمان وەکی ئالاڤەکێ ساخ، هەر دوەرار و پێشکەتنێ دایە، و خۆ دگەل دەمی دگونجینت. دبیت ئەو پەیڤێن دوهی ل سەر دەڤ و زارابوون، ئەڤرۆ بەر ب ئەرشیف ڤە چوون دچن، و ل بەرامبەر هندە پەیڤێن نوی خۆ خۆ دگەل دەمی و دگەل داهێنانێ دگونجینن. لەوما دێ بینین گەلەك زاراڤێن نوی و ل بەرامبەر ئیدیومێن نوی خۆ دناڤ زمانی دەڤەرێ دا، مینا هەمی زاراڤ و زمانان خۆ کەهی دکەن، بۆ نموونە:

- کەلێ شەکرێ:

سالۆخەتە بۆ کەسێ رح سڤك و شرین، کو خەلك حەز ژ دکەن.

- گۆلکێ تەعاونیێ:

سالۆخەتە بۆ کەسێن قەلەو، وکرێت.

- مریشکا بیلادی (مەعمەلێ):

واتە گەلەك سست و خاڤ.

- دێ بێژی تەیارەیە:

واتە سرت و سڤك

- سینەما بەلاش:

سالۆخەتە بۆ کەسێ ببیتە لێبۆك تەشابەت، ژبەر کارەکێ وی کربیت، و خەلك یاریێن خۆ پێ دکەن.

- پەرێت نەعامەینە:

میناکە بۆ تشتێ گەلەك نەرم.

- دێ بێژی باب ئەلتۆیە:

واتە گێلەشۆکە و کەس د زمانێ کەسێ ناگەهیت.

- دێ بێژی کارەبێ گرت:

واتە د جهێ خۆدا هشك بوو، نا لڤیت.

- دێ بێژی ژ مالا نەجیم جادری یە:

واتە گەلەك دان بەرخوو.

- کرن ڤرڤرۆك:

کرن ئالاڤ ددەستی خۆدا. زال بوون ب سەردا.
- برغی شداندن:
نەچار کرن کو خۆ زیرەك کەت.
وەسان گەلەك ئیدیومێن دی ژی کو خۆ گونجاندین دگەل دەمی و بووینە پارچەك ژ زمانێ رۆژانە.

## ڕووەك و گیاندار د هەمبێزا ئیدیوماندا:

هەلبەت کێم ڕووەك، یان گیاندار نەبن، ئەگەر گەلەك ژێ هۆکارێن ئاڤاکرنا ئیدیومێن دەڤەرێ نە، وەکی ڕەنگڤەدانەك بۆ ژیانا وان یا رۆژانە کو ڕەفتارێ دگەل دکەن:

- ژ ڕووەکان: کولند، سماق، پێرپینە، پیڤاز، گول، کەزان، تری، پینگ، بەلگ، بەڕوی، سیر، سڵك، فلفل، مشمژ، نێرگز، نۆك، هژیر، برنج، کژنیژ، کولیلك، شێلم، سپیندار، گوڕێل، کناری، قەسپ، پەمبوی، تڤر، مازوی، هەلز، گولبەڕۆژ، توی، کونجی، جەهـ، گارس، مەڕان، گوهیشك، هەلهەلۆك، تەعلیشك، گەنم، قاچ، قیڤار، باجان، گێزەر، بیهـ، تویتن، گول محەمەد، کفر، کاریش، گوندۆر، سۆر گول، فێقی و.... وەکی دێ بێژن:
- ئاگر بەردان گیایێ شین:
واتە: کەسەکێ نەخۆش، یان ئاگر و ئاتاف بیت.
- بەڕوییا ب قەلپیچکا خۆ نەرازی:
واتە: کەسێ ب مال و حال ونفش و کاودانێ خۆ نە رازی.
- بیها د ئاڤێ دا:
واتە: دبێژن وەکی بیها د ئاڤێ دایە. واتە لەرزین.
- پیڤاز هاتن سپی کرن:
واتە: هەمی تشت ئەشکەرا بوون. نەمانا نهێنییان.
- پێرپینەل سەر دلی شین بوو:
واتە: سل و ژ جهـ نەرابوون. وەکی دێ بێژن: بهێلە بلا پێرپینە ل سەر دلی شین بیت.
- دبێژیتە گویزا گەوز:
واتە: مەزن ئاخفتن، بەتران.
- نافکا نیرگزێ:
واتە: سالۆخەتە بۆ جوانیێ.

- ژ گیانداران ژی: هەسپ، مریشك، بەراز، دیکل، کەر، ماکەر، گورگ، کوند، بەرخ، میهـ سە (صە)، پلنگ، مار، پۆر و عەبدال، شڤان حەیرینك، کێچ، ماهین، دارکۆکە، تۆك، مێری، بەق، چیچك، چێل، گا، حێشتر، کێرویشك، سپیە، کارك، مێش، هرچ، کەو، دوپشك، دێهل، بزن، گامێش، سڤۆرە، گۆلك، قەل، کتك، مێ گورگ، مشك، کێز، ماسی، بەران، شێر، رویڤی و ... وەکی دێ بێژن:
- گازیا دووڤ گورگییە:
واتە: چوونا ل دووڤ و بێ مفا.
- کوند لێ خاندن:
واتە: کەس لێ نەمان، کاڤل و وێران.
- پاری ژ دەڤێ سەی ڕەڤاندن:
واتە: پیس، تەمەعکار.
- بەرخێ د زکێ ماکێ دا:
واتە: کەسەکێ دناڤ خۆشیاندا بیت.
- کۆرێ کێچ گرتی:
واتە: ئێکێ تشتەکێ نەبی و ب دەست ب کەڤیت. یان نەبەردان ب ساناهی.
- تۆبا دارکۆکەیە:
واتە: لێڤە نەبوون. هەر ب تنێ ب دەڤی دبێژیت، لێ ناپێژیت و هەر دمینتە ل سەر کارێن خۆ.
- حێشتر ب مۆچکێ ئاڤدان:
واتە: تشتەکێ نە ل قەبارێ کەلەخەکێ مەزن.
- کوریا مشکی ب ئار نە کەتن:
واتە: ژاری و نەبوونا چ تشتان د خانیڤە.
- گیسك کرن بەران:
واتە: گوهارتنا زیانەکا کێم ب پاریەکێ مەزن.
هەلبەت هندە گیاندار پتر ژ هندەکان ل کارن، وەکی کەر، گا، مار گەلەك ل کارن. نموونە ل سەر ماری دبێژن:
- مارێ بن گلگلە:
واتە: بنڤە بنڤە، کو ب خافلەتی دریێت خۆ دانیت.
- مارێ ژنکا کوشتییە:
واتە: کارەکێ سەیر ومەزن، کو خودان باوەر نەکەت، و هەر بەحس ژێ دکەن.

- برایێ ماری:
واتە: رویت، کەسێ چ تشت نەبن. بێ مال و دەراڤ.
- مارێ کلك برییە:
واتە: کەسێ کارەکێ ب سەری هاتی ژبیر نەکەت. دوژمنایەتی.
- خیرەتا مارێ مری:
واتە: گەلەك بێخیرەت.
وەسان ب دەهان ئیدیومێن دی ل سەر مارا و گای و... هتد.

## ئیدیوم و ژمارە (٧):

ژمارە (٧) پیرۆزی وتایبەتمەندییا خۆ یا دناڤ زمانێ کوردی و دبیت زمانێن گەلەك مللەتان ژی دا یا هەی و جهێ خۆ دناڤ ئیدیومان ژی دا یێ گرتی:
- حەفت بەر ب دووڤ را هاڤێتن:
واتە: نەڤیانی.
- حەفت تام ژێ هاتن:
واتە: گەلەك ب تام.
- حەفت دەستێت خەوێ کرن:
واتە: ژ مێژ وەرە نڤستی. گەلەك نڤستن.
- حەفت نان ب شین ئاسیدێ خارن:
واتە: کولب و گرانی، گەلەك برسی بوون.
- حەفت نیڤەکێن شەڤێ:
واتە: درەنگی شەڤ.
- خۆ ل حەفت ئاڤا دان:
واتە: زیرەکی. چ ب سەری نە هاتن.
- کتکا حەفت رح:
واتە: قایم، زوی نە مرن.
- کورِی د حەفت عەردارا قەتیان (بزدیان):
واتە: سەربۆر دیتی، شەهرەزا بوون. ناهێتە خاپاندن.
- کورِی کەتن حەفت تەلها:
واتە: د خەما چ نینە. د شیاندایە سەرەدەریێ دگەل ئاریشان بکەت. یان دشیاندایە خۆ رزگار کەتن.
- گێسن حەفت رێزی ب دیواری را هینان :
واتە: زیرەك و خودان شیان. حنێریەند.
- ل بن حەفت کەلەکێت بەرا:
واتە: مری.
- یاری ل سەر حەفت وەریسا کرن:
واتە: نەمان ل سەر چ رێکێن تایبەت. هەرروژ ل سەر رێبازەکێ.
- ب حەفت ئاڤا هاتن شویشتن:
واتە: بێ وج و بێ مفا.
- یێ دحەفت خەوادا:
واتە: دخەوەکا گەلەك کویر دا.

## ئیدیومە پەیڤ:

د زمانێ کوردی دا ب گشتی، کو زاراڤێ بەهدینانی پشکەك ژێ، گەلەك جاران دێ بینین پەیڤەکا فەرهەنگی وەکی ئیدیوم ژی ل کارە، بۆ نموونە:
- رەنگڤەدانا سالۆخەتێن گیانداران ل سەر مرۆڤی، وەکی دێ بێژن:
شێر، پلنگ: واتە زیرەکی.
گورگ: درِندایەتی.
مار، کۆرە مار، دوپیشك: نەیار، ب خافلەتی درب دانان.
کەر، گۆلك: ساویلکەیی و بێ ئاقلی.
بەرخ: عەزیز و خۆشتڤی.
پەز، میهـ: کەسەکێ ژار و گوهدار وەکی خودانی دڤێت.
مریشك و دیکل: نیشانا مێیاتی و نێراتیێ. زەلامینی و ژنکاتی. یان زیرەکی و نە زیرەکی.
هرچ، گا، چێل، گامێش: سالۆخەتە بۆ کەسێن ب کەلەخ و هندە جاران بۆ کرێتیێ ژی ل کارە.
کوند، کێرویشك، قەل: بێ ئیفلەحی.
کولی: زیان بەخشی.
رویڤی: فێلبازی.
مەیموینك: کرێتی. هەڤدژی خەزال، یان خفشا خەزالێ.
سڤۆرە، تاژی: لڤینێن سڤك.
وەسان سالۆخەتێن پترییا گیاندارێن دی ژی دبنە رەنگڤەدانا سالۆخەتێن مرۆڤی ژی.
- ب سەدان پەیڤێن دی یێن فەرهەنگی ب وی رەنگی هەنە، کو وەکی ئیدیوم ژی ل کارن:

ئاغا، پاشا، سولتان، زەپزەپە: کەسەکێ باش و دخۆشیادا بژیت.
ئێڤار، پاییز: درەنگ، پیراتی، هەڤدژی بهار و سپێدە.
ئاش: تێر نەبوون.
تەنی، ڤیر: سالۆخەتە بۆ رەشاتیێ، هەڤدژی بەفر و کەڤی.
هەڤیر: سالۆخەتە بۆ کەسێن خاڤ و خرچ و نەرم. هەڤدژی ئاگر.
پاری: دەستکەفتی.
بەنیشت، قاچك، ڤەجین: گەلەك گۆتن، هەڤدژی کەر و بوم.
نیسەك، بێکانە: ژێڤە نەبوون.
هەستیك: سالۆخەتە بۆ کەسێن گەلەك لاواز. هەڤدژی باگوردان.
پیڤاز: ئەرزان و بێ بها، هەڤدژی زێر و زیڤ.

## ژێدەر و پەراوێز


١. سادق بەهائەددین، ئیدیەمێت کوردی، چ٢، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ- هەولێر، (دهۆك: ٢٠٠٥).
٢. حەجی جەعفەر، پەژن و گۆتنێت کوردی، چاپخانا حەجی هاشم- هەولێر، (دهۆك: سالا ٢٠٠٦).
٣. خالد سالح، گولۆلك هەلچنین، چاپخانا خانی- دهۆك، (دهۆك: ٢٠٠٧).
٤. نزار محەمەد سەعید، چەند گۆتن و پەژنێن کوردان، چاپخانا هاوار- دهۆك، (دهۆك: ٢٠١١).
٥. مالپەرێن ئنتەرنێتێ.


* دبێژن کەزانێن ڤی گوندی کەسك دبن، و جارەکادی سۆر دبنەڤە.

** دبێژن کەسێ ژێژی نە دیت بۆ، دەمێ رۆژەکێ ئێکی ژێژیەك گرتی و برە گوندی و چوو نیشا خەلکێ گوندی دا کا ئەڤە چ نشتە؟ دبێژن شەهرەزایێ وان گۆت ئەز دزانم ئەڤە چیە. هندەکان ژی گۆتنێ ئەو چ نشتە؟ گۆت: یێ ژ ڤی دبیت دێ وەکی ڤی بت و یێ ژ یێ دی ژی دبت دێ هەر وەکی ڤی بت و... .

# فلكلۆرێ كلدانییان ل دهۆكێ

بەرهەڤكرن: خالد سالح

وەكى ديار پتریيا كلدانیێن باژێرێ دهۆكێ ل وی تاخی دژیان كو دگۆتنێ (تاخێ فەلا)، لێ نهو و ژبەر مەزنبوونا باژێری و ڤەكرنا جەهدان پتریيا تاخی كەتییە ناڤ بازارێ دهۆكێ دا و بوویە پارچەك ژ بازاری و سیمایێ وی یێ كەڤن هاتییە گوهارتن، ڤێجار بەری بچینە دناڤ بابەتی دا فەرە دانەنیاسینەكێ دگەل ڤی تاخی بكەین:

ئەڤ تاخە ل نك خەلكێ باژێری ب تایبەت كوردان ب تاخێ (فەلا) یێ بەرنیاسە، ب فەرمی د گۆتنێ (نصاری)، مەسیحیێن وێ بخۆ دبێژنێ (محلە سورایی، واتە مەسیحی)، یان ژی دبێژنێ (محلە ختیثا)[1]، و پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا١٩٧٠ێ ناڤێ وێ هاتە گوهارتن بۆ (برایەتی)[2]، ئێكە ژ تاخێن كەڤنێن باژێرێ دهۆكێ، دكەڤیتە هنداڤی چەم و باغان ل لایێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دهۆكێ و تاخ بخۆ ب چاڤ تاخێن دی یێ نزمە و بۆ لایێ رۆژهەلاتی ڤە دچیت و ل جهێ دبێژنێ (كەندالی) كو دكەڤیتە لایێ باشوورێ رۆژهەلاتێ تاخی چەندەكێ بلندتر لێ دهێت و هەژمارا خانیێن وی ل سالا ١٩٨٥ێ نێزیكی (٣٠٠) مالان بوون[3] و هەمی ب تەرزەكێ كەڤن هاتینە ئاڤاكرن و پتریيا ئاكنجیێن وێ مەسیحی بوون، دگەل كێمەكا جوییان[4]. ژمارا ئاكنجیێن مەسیحیێن كاتۆلی یێن كلدانی ل دهۆكێ، وەكی گەرۆكێ فەرەنسی (ریتر) ئاماژێ پێ كری ل سالا (١٧٧٤)ێ نێزیكی ٣٠ سەرخێزانان بوون و ئامارا ئەبرەشیا كلدانی یا سالا (١٩١٣)ێ كو (خوری یوسف تفنكچی) پێ رابووی دبێژیت ئامارا وان ٣٥٠ كەسن و هەمی كلدانیێن كاتولیكن و ب زمانێ كلدانی د ئاخڤن و ل دووڤ ئامارا كەنیسەیا كلدانییا یا سالا (١٩٥٠)ێ ژمارا وان ٥٢٠ كەسن، و ئامارەكا دی كو ل سالێن سیهان ژ چەرخێ بووری هاتییە كرن ئاماژە دكەتە ئاكنجیێن باژێرێ دهۆكێ و وان ب ٤٢٠ سەرخێزانان ب ڤی رەنگی دخەملینت:

- ٢٥٠ خێزانێن موسلمان.
- ١٠٠ خێزانێن مەسیحی.
- ٧٠ خێزانێن جوی.

هەروەسان ئامارێن سالێن (١٩٤٧، ١٩٥٧، ١٩٧٧)ێ ژمارا خەلكێ ڤی تاخی ب ڤی رەنگی بوون: (٧٤٢كەس، ٨٦٣كەس، ١٥٤٣كەس) ل دووڤ ئێك[5].

ڤی تاخی گەلەك جهێن كەڤنار لێ هەبوون، لێ پتریيا وان ژبەر ڤەكرنا جادان و بەرفرەهبوونا باژێری ژناڤچووینە، وەكی: كەنیسا كلدانییان كو بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٦٣٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن و جارا دووێ ل سالا (١٨٥٠)ێ و جارا دووماهیێ ل سالا (١٩٤٨)ێ

و تا نها مایە[٦]. دیسان دو ئاکنجیکەهێن (مجمع) جوییان لێ هەبوون، ئێك دکەتە باکوورێ دێرا ناڤبری و یا دووێ ل پشت خواندنگەها (الطاهرة) دا و پشتی هینگێ بۆ پارچەك ژ پەیمانگەها ئیسلامی. ئەڤ هەردو کۆمەلگەهە ل سالێن حەفتیان و هەشتیان ژناڤچووینە[٧]، هەلبەت ژبلی (جامعا) مەزن و خواندنگەها (الطاهرة) و خانا یەلدەی و قەنتەرکا داود سەلمان کو پێنج دنگە ب بلنداهیا سێ مێترا و فرەهییا ٧٠سم هەبوون و ب بەر و گێچێ هاتبوو ئاڤاکرن و چەند جهـ و شوینوارێن دی ژی[٨].

نێرینەك ل فلکلۆرێ کلدانییان ل بازێرێ دهۆکێ، تاخێ (فەللا- برایەتی) وەکی پشکەك ژ هەمی کلدانییان دێ بینین گەلەك جیاوازی دناڤبەرا رەوشت و تیتالێن وان دگەل یێن هەمی خەلکێ دەڤەرێ و ب تایبەت یێ کوردان نینە، بەلکی هەر هەمان رەوشت و تیتالن، ژ یاری و خوارن و گۆتنێن مەزنان و راڤ و نێچیر و...هتد، دگەل چەند تایبەتمەندییێن هەر مللەتەك ژ وان بخۆ ژ لایێ زمانی و ئایینی و ...هتد. وەکی دیار فلکلۆر یێ دابەشکری یە سەر چەندین تایان، فلکلۆرێ کلدانییان ژی هەر ب هەمان شێوە دابەش کرییە بۆ سەر چەندین تایان، ژ وان ژی:

## أ- یاری:

هەلبەت وەکی ئاماژە پێ هاتییەکرن چ جیاوازیێن مەزن دناڤبەرا یاریێن کوردی و یاریێن کلدانییان نینن، ژ یاریێن گرنگ کو دناڤ واندا دهاتنە کرن ژی:

### ١- (کەعبی):

ب کوردی دبێژنێ کابانێ، یاری ب کابا (جۆرە هەستیکە گیاندارایە) دکرن، ژ سالێن شێستان و هێرڤە ئەو یاری دناڤ واندا ل دهۆکێ نەمایە[٩].

### - (قتی و بیتی):

ب کوردی دبێژنێ (دار و ترانێ)، یاریێ ب دو داران دکەن، ئێکێ درێژ ب درێژاهییا (٦٠- ٧٠سم) و ئێکێ کورت ب درێژاهییا نێزیکی (١٥سم).

### - (نجاغی):

ب کوردی دبێژنێ (کوتیانێ)، تێدا دارێن سەرتیژ ب درێژاهییا (٦٠- ٧٠سم) بلند دکەن و د ئەردێ تەر (شەهگرتی) د چوکلینن.

### - (جونکانی):

یان هەر (چوینگانێ یان خەزالانێ) ب کوردی، تێدا یاریکەر خۆ ڤەدشێرن و ئێك دچیت ل وان دگەرێت.

### - (شماشارۆکی):

د کوردی دا هەمان یاریا (شمشالۆکانێ یان شمشارۆتکانێ)یە، تێدا یاریکەرا کۆمکێن ئاخێ یێن بچویك ل جهێن نهێنی چێدکرن و یاریکەرێن دی دچوون لێ دگەریان، ل شوینا کۆمکێن ئاخێ هندەکان ب رەژیێ یان ل پاشتر ب تەباشیرێ خیچك ل جهێن نهێنی چێدکرن و یاریکەران لێ دگەریان.

### - (مزراعی):

یان د کوردی دا (ناعۆرانێ) یە.

### - (تبلاتا):

کو د کوردی دا (تەبەلانێ) یە، و تێدا یاریێ ب تەبەلا دکەن، تەبەل ژی جۆرە شویشەکێ رەنگا و رەنگە، قەبارەیێ وێ هندی مازوییانە.

### - (کرهـ اوبە):

یان د کوردی دا دبێژنێ (گیخانێ یان ژی تەپا پاخلێ)، ڤێ یاریێ دچوارچۆڤەکێ دەستنیشانکری دا دکەن، تێدا یاریکەر دبنە دو جین، جینەك یا ژ دەرڤە و تەپە یا ددەستێن وان دا، چ ئەشکەرا و چ ژی ڤەشارتی و ددانە جینا ژ ناڤدا کو ئەو ژبەر تەپێ درەڤن دا تەپە ڤ وان نەکەڤیت و نەکەڤن.

### - (دای مسی):

د ڤێ یاریێ یاریکەر پشتا خۆ دچەمینن و یێن دی خۆ د سەر پشتا وی (وان) را د هاڤێژن، دڤێ یاریێ پەیڤەکێ

ب زمانێ وان دبێژن كو وەكی نڤیسەری بخۆ ئاماژێ پێ كری واتایا وێ یا دیار نینە كو دبێژن (دای مسی... كی كەسی... و)، و ئەڤ یارییە ل دەڤەرێ دناڤ كوردانداا ب (كەرخەپیانێ) یا بەرنیاسە.

## - (كیل و بیل):

هەر هەمان یاریا كێل و بێلانێ یە كو دناڤ كوردان دا دكەن و هەر ب هەمان ناڤی، یاریكەر دبنە دو جین و هەر جینەك سێ بەرێن پان (كێلی) ل بەرامبەری ئێك دادنن و بەرا تێوەردكەن دا وان كێلان بێخن، و هەچی جینا كێلێن بەرامبەری خۆ ئێخستن ئەو یێ سەركەفتییە.

## - (جیزانی)[10]:

هەر هەمان ناڤێ كوردی (چیزانێ، یان تێسانێ) یە، بەرێن پان كو هندی كەفا دەستی نە دبێژنێ (چیز) د نیشانەكێ وەردكەن كو ئەو دبێژنێ (بقوشە)، یان (عەدلۆك) د كوردی دا.

## - (خا اقلا):

یان د كوردی دا دبێژنێ (ئیشقلكێ) و یاریكەر تێدا ب سەر لنگەكی د چوارچۆڤەكێ دەسنیشانكری دا دێ چیت یاریكەرێن دی بگریت دا ئەو ل شوینا وی بكەڤنە بەر.

وەسان گەلەك یاریێن دی ژی هەنە و هەر ب هەمان ناڤێن كوردی، بۆ نموونە (رێزانی، دامانی)، ژبلی یاریێن نوی كو ب دۆمینێ و زارا و پەركا دكەن.

هەروەسان كچكان ژی یاریێن خۆ یێن هەین، بۆ نموونە:

## - (بقوشی، یان بقلوشی):

یان ب كوردی دبێژنێ پێنجۆكانێ، یاری دناڤ كوردان ژی دا هەر یارییەكا كچانە و ب پێنج بەرێن مینا گویزێ یان بچویكتر دكەن.

## - (خومری، یان طم خریزا):

دیسان یاریەكا كچكانە ب (نمنمك و مۆركان) دكەن و د كوردی دا دبێژنێ (مۆركانێ، یان نمنمكانێ) و تێدا یاریكەر مۆرك و نمنمكان ژێك دبەن دەمێ ب رێكێن تایبەت دكەنە دكۆركەكا بچویكا دەستنیشانكری دا.

## - (شورا و سیطا):

یان د كوردی دا دبێژنێ (بهۆستانێ)، تێدا دو كچك ل بەرامبەر ئێك دروینە خوار و بنێ پێن خۆ پێكڤەدنن و یاریكەرێن دی خۆ سەررا دهاڤێژن، و چەند یاریكەر دشێن خۆ د سەررا ب هاڤێژن هەر بلندتر لێ دكەن. ئەڤ یاری یە دناڤ زارویێن كورداندا ژ لایێ كچ و كورانڤە دهێتەكرن.

## - (قوندری):

ئەڤ یاری یە پتر ل جەژنان دهێتەكرن، تێدا یاریكەر پارا، یان هێكان دناڤ پێلاڤاندا ڤەدشێرن و یاریكەر دچت بەختێ خۆ تاقی دكەن كا دێ بۆ كێ دەركەڤیت؟.

## - (جوللا):

هەمان یاریا (چۆلانێ) یە د ناڤ كورداندا، یاریكەر لاكێشەكی دروست دكەن و شەش چوارگۆشێن هندی ئێك دناڤدا دنەخشینن و یاریكەر بەرەكێ پانێ بچویك و ب رێكێن تایبەت وی بەری ل سەر پیپەكی دبەت.

ژ یاریێن زارۆكان ژی، كو باراپتر دەیبابان بۆ زارویێن بچویك دكرن، یان هندە جاران وان بخۆ بۆ خۆ دكرن یاریا (شیب ربب طوطیثا) یە، كو هەر هەمان یاریا (ئەلەڤەن دولەڤەن)ا زارۆیێ كوردانە، كو بچویك وەكی رەنگێ نیڤ بازنەیی دروینن و پێن خۆ درێژ دكەن، یان هندە جاران دەستان ل شوینا پییان دادنن، ئەوێ یاریێ ب رێڤە دبەت، چ دایك بیت یان زارۆكەك ڤان پەیڤان وەكی لێكهاتنەك ب ئاوازڤە دگەل دبێژیت:

(شیب ربب طوطیثا
كیجو و میجو مرقیثا
دایی سیا رامرا میا
قوج و جیر و جمصتا)[11].

**ب- خوارنێن وان[12]:**

هەر دیسان چونکی هەمان جهـ و هەمان سرۆشتە دێ بینین گەلەك ژ خوارنێن کلدانێن دەڤەرێ ژ یێن خەلکێ دی یێ دەڤەرێ د جودا نینن، ژ خوارنێن وان ژی:

- **(تبیتی):** دبیت ئەڤ خوارنە یا تایبەت هەر ب وان ب تنێ ڤە، ناڤێ وێ یێ ژ پەیڤا ئارامی (بیبا، یان موبیتا) هاتی، ب واتایا (ئەوێ ب شەڤ دمینت)، و دبیت ئەڤ خوارنە ژ جوییان هاتبیتە وەرگرتن کو وان شەڤێن ئەینی ل سەر شەمبی، کو شەمبی رۆژەکا پیرۆزە ل نك وان ل سەر ئاگرەکێ رەحەت دلێنان و خوارن مینا کێپارێ (سەروپێکانە) دگەل چەند جوداهییەکان. مەسیحی ل رۆژێن جەژن و مێهڤانداریان ڤێ خوارنێ دلێنن.

- **(قرعیی):**

مینا خوارنا پێشترە (تبیتی)، لێ ل ڤێرە عویرك و ریڤیکێن حەشاندی تێدا نینن، دبێژنێ (قرعیی)، چونکی کولندێن هشککری دکەنە دناڤدا (قری مویشی)، ژبلی نۆکان.

- **(مضیرە):**

کوتلکێن حەشاندی نە ب قەلیێ، دگەل ماستی، یان کەشکێن حەلاندی دناڤ ئاڤێ دا و چەند تشتێن دی ژی دکەنە دناڤ دا، مینا دانقوتێ و نەعناعێ و باراپتر ڤێ خوارنێ ل رۆژێن ئێك شەمبی دخۆن کو پتریا وان ژ بەر بێهنڤەدانا رۆژا ڤێ رۆژێ یێن ل مال بەرهەڤن.

- **(خموصتا):**

هەر هەمان خوارنا (ترشکێ) یە کو ل دەڤەرێ یا بەربەلاڤ، پێکهاتییە ژ کوتلکێت پەحن و د داگرتی ب قیمێ گۆشتی و پیڤازێن هویرکری، دیسان بەقلی و کولند و باجانرەشك و باجانسۆرك، (یان ئاڤکا تەماتی) دکەنە ناڤ و ل هندە جاران سلکان ژی دکەنە بەر.

- **(حامظ کبة):**

هەر کوتلکێن پانێن داگرتینە ژ گۆشتێ قیمەکری و پیڤاز و بهاراتا، و دناڤ ئاڤکا تەماتێ دا دکەلینن دگەل هندە برنجی.

- **(کبە یخنی):**

کوتلکێن پانن ژ دانهێرکی دروست دکەن و ناڤا وان ب گۆشتێ قیمەکری و پیڤازێن هویرکری د داگرتی نە و هندە برنجی ژی ددەنە دگەل.

- **(کوتلکێن رۆژیان):**

هەر هەمان ئەو کوتلکن کو ل پێشتر ئاماژە پێ هاتینەکرن، لێ ژبەر رەمانێ و رۆژی گرتنێ کو تشتێن گۆشت و هەمی بەرهەمێن گیانداری ناخۆن، ل شوینا گۆشتی ب پیڤازێن هویرکری، یان پیڤازێن هویرکری دگەل کونجییان، یان پیڤازێن هویرکری دگەل تەحینی دهێنە داگرتن و هندە برنجی ددەنە دگەل.

- **(هەریسە):**

خوارنەکە پێکهاتییە ژ دانقوتی کو دگەل گۆشتی دکەلینن و هندە جاران گۆشتێ مریشکێ دکەنە ناڤ و دگەل روینی و دۆشاڤێ دهێتە پێشکێشکرن، و خەلکێ تاخێ فەلا ل دهۆکێ ئەڤ خوارنە وەکی بیرهاتنا (مارایث الاها) کو دکەڤیتە ١٥ کانوونا ئێکێ پێشکێشدکەن و رێورەسمێن تایبەت ب ڤێ هەلکەفتێ دگێرن.

- **(یبراخی):**

خوارنەکا بەربەلاڤا دەڤەرێ یە و ب کوردی ژی هەمان ناڤێ ئیپراخ یێ هەی، پێکهاتییە ژ برنجی و گۆشتێ قیمەکری و بهاراتا و ئاڤکا تەماتا و ... و وی تێکەلەی دکەنە دناڤ بەقلی و بەلگێن مێوان و بەلگێن کەلەمیادا، یان ژی دناڤ پیڤاز و باجانسۆرك و کولند و ...هتد دا، پشتی ژ ناڤك دکەن، و ل دووڤ حەزا خۆ جۆرێن بهاراتان دکەنە دناڤ دا، پشتی هینگێ ل سەر ئاگری دکەلینن.

- **(بقوتا):**
هەر هەمان خوارنا (دانقوتا) دەڤەرێ یە.

- **(كوركر بقليا):**
خوارنە كو زەلام حەز ژێ دكەن (سافارا ب قەلی).

- **(نسرا):**
یان د كوردی دا دبێژن (سمیتك)، كو ئەو ژی دانهێركێ هویرە و دهاتە لێنان.

- **جۆرێن نانی:**
هەلبەت نانی چەندین جۆر هەنە و وان ژی ب هەمان شێوە گەلەك جۆر هەنە، وەكی:

**(رقی):**
یان د كوردی دا دبێژنێ (نانێ تەنك، یان نانێ سێلێ).

**(تخراثا دسقی):**
كو ب كوردی دبێژنێ (سەوكێن ب گژنیژ)، پێكهاتیيە ژ رونی نە دگەل پیڤاز و ئاڤكا تەماتێ و كژنیژا.

**(تخراثا دكوبتا):**
یان ب كوردی دبێژنێ (سەوكێن پەنیری).

**(تخراثا دبرتوی):**
واتە سەوكێن ب رونی و شەكرن و هندە جاران تەحینێ ژی پێرادەن. ب كوردی دبێژنێ سەوكە رونی، یان نان تەحینك و... .

**(تخراثا دكرسا):**
سەوكن ژ سمیتكی دهێنە دروستكرن.

**(تخراثا دبصلا):**
هەر هەمان (تخراپا دسسقی)یە، لێ رونی و دوینگ دناڤ دا نینە و پتر بۆ رۆژیان دهێنە چێكرن.

**(تخراثا داوشعنی):**
قەبارەیێ ڤان سەوكان دناڤنجی نە، پشتی چێدكەن د زەیتا كونجیا و رها زەر دهەلینن دا رەنگەكێ زەر ب دەتێ و ئەڤ نانە ب هەلكەفتەكا ئایینی كو دبێژنێ (احد السعانین) بەری رۆژا رابوونێ دروست دكەن.

**(تخراثا د بلو):**
سەوكەكا مەزنە و تایەكێ هشكێ مێوێ یێ كورت ب درێژاهیا (١سم) دكەنە دناڤدا و پشتی وی نانی ل سەر كەس و كارێن مالێن لێكڤە دكەن دێ لێ نێرن كا ئەو دارك بۆ كێ چوویە؟ ئەوێ بۆ چووی یان دێ خەلاتەكی دەنێ، یان ژی دێ بێژنێ گۆڤێ پاقژ كە (بیكاری)!!.

**(طباقه ننوش):**
مینا (كاهی) نە، ناڤێ وێ یێ ژ وێ چەندێ هاتی كو ژنكەكا ناڤدار ب ناڤێ (ننوش) ل ڤی تاخی هەبوو یا ب ناڤ و دەنگ بوو ب چێكرنا ڤی جۆرە نانی.

**(لواشی):**
ژ ئارێ سپی (سفر) دناڤ تەنویرێ دا مینا شكلێ هێكێ دروست دكەن.

**(كليجه):**
هەر هەمان كادە نە كو خەلكێ دەڤەرێ باراپتر ب هەلكەفتا دروست دكەن، پشتی هەڤیری دروست دكەن نافكێن وان ب چەندین تشتان مینا گویز و گویزا هندێ و كونجی و خورمە و ... كا ئەو حەز ژ چ دكەن دادگرن، پشتی ئەو ژی دگەل رونی و بهاراتان دهێنە بەرهەڤكرن و پاشی هێكا پێرادەن و دهێنە قەلاندن، كو ل بەرێ د تەنویرا دا د قەلاندن، لێ نها د فرنادا دقەلینن.

**ج- گۆتن و ئیدیوم ل نك كلدانییان**[١٣]:
هەلبەت ئیدیوم و گۆتنێن مەزنان ل نك وان باراپتر هەر هەمان گۆتنن كو ل دەڤەرێ د بەربەلاڤ، ئەڤە

ژی چەند نموونەکن ژ وان گۆتنان:
-أولا کیذی راقذ... کیمر أرا بلمتا.
واتە: ئێکی نەدزانی دەهواتێ بکەت، دگۆت عەردێ خارە.
گۆتن بۆ وان کەسان ل کارە بێن بەهانەیا بۆ کارەکی دبینن کو نەڤێن بکەن و هێجەتان دەردئێخن.
- أود زالی بخولە د خورح لقیسی... بدائر دلا قیسی.
واتە: ئەوێ ب هیڤیا وەریسی خەلکی بچیتە دارا، دێ بێ دار زڤریت.
واتە مرۆڤ خۆ نەهێلتە ب هیڤیا خەلکی ڤە و پشت بەستنێ ل سەر خۆ بکەت.
- أو کلبا د بخرتوثا لصیدا... لا کیوذ جو فایدا.
واتە: سەیێ ب تەعدا بچیتە نێچیرێ، نێچیرێ ناکەت.
واتە هەر تشت ب تێکگەهشتن دهێتەکرن و ب خورتی کەس چ کاران ناکەت.
- أو دلا راخش لایدایح... لا کیاذی قدرا دأ قلاثیح.
واتە: حەتا سەر دەستی ب رێڤە نەچی، قەدرێ پیا نزانی.
ئانکو تا کارێن گەلەك زەحمەت و نەخۆشییان نەبینی، بهایێ دەلیڤێن فرەهـ نزانی.
- أو دزالی لنونی... بتریا قونی.
واتە: یێ بچیتە ماسییا، دێ قوینا وی تەر بیت.
چ کار بێ ئاستەنگی و زیان نابن.
- ان عصریلی بکما دخوی... خوی بمایث.
واتە: ئەگەر ب گڤێشنە دەڤێ ماری دێ مریت.
ئەڤ گۆتنە وەکی ئیدیوم ل کارە بۆ تشتەکێ گەلەکێ پیس بیت.
- ان کل جوجکی اخلیوا تینی... لا کبایشوا جو مندی تا مرواثا.
واتە: ئەگەر هەمی چویچکا هەژیر خاریان، چ بۆ خودانا نەدمان.
ئانکو هەمی کار نەیێت هەمی کەسانە و هەر ئێکی شۆلێ خۆ یێ هەی.
- أرخی زلا... کمباقر لجقجاقی.
واتـە: ئاڤێ کتێت ئاشا بـرن، تۆ یێ بەحسـی چەقچەقۆکا دکەی.

رویدانەك، یان کارەساتەکا مەزن روی بدەت، لێ ئەو خۆ ب کارەکێ بچویك و چنەڤە مژویل بکەت.
- أینا دشاتت منح مایی... لا مهرشنتا.
واتە: بەرا نە هاڤێژە ئەو کانییا تە ئاف ژێ ڤەخاری.
واتە زیانێ نەگەهینە وی تشتی یێ قەنجی ل مرۆڤی کری و دبیت هەر مرۆڤ بخۆ هەوجەی وی دەرگەهی ببیتە ڤە.
- ان زالی لیاما... یاما بیوشا مقامح.
واتە بچیتە سەر ئاڤێ، ئاف دێ لێ هشك بیت.
وەکی ئیدیوم ل کارە بۆ کەسێت بەخترەش و چی کارێ دەست دهاڤیتێ بەرنگڤە ناهێت، بلا چەند یێ مشە و ب ساناهی بیت.
- ایذا دخو کیبا.
واتە: دەستێ بن بەری یە.
وەکی ئیدیوم ل کارە بۆ وان کەسێت بێ دەسەلات و چ ژ دەستی نەهێت.
- باری (زوزی)... شختا د ایذایلای.
واتە: پارە قرێژا دەستانە.
ئانکو مال و دەراڤێ دونیا ژ قرێژا دەستا دروست دبیت، دهێت و دچیتەڤە و دڤێت مرۆڤ خۆ ل سەر ب خەم نەئێخیت.
- براتا مخ کشرا ایلا.
واتە: کچك مینا پرانە.
مەبەست ژ ڤێ گۆتنێ ئەوە کو گەلەك کەس کچکان دخوازن، و ل ڤێرە ئەگەر ئێك بێژیتە ئێکی هەرن فلانە کچکێ بخوازن، لێ ئەو ناچن چونکی ل بەری هینگێ یا هاتیبە خاستن و چێنەبوویە.
- ایذا تورتا... بقذالا د مارح کمتلتیلا.
واتە: دەستێ شکەستی د ستویێ خودانی ددانن.
ئانکو شاشیا هەر کەسەك دکەت هەر یا ل سەر ملێ وی و بارگرانییا وی بۆ وی یە.
- او دمترعس بأقلح کقایم... واو دمقترعس بلشانح لا کقایم.
واتە: ئەوێ ژ پێی د هەلنگڤیت دێ رابیت، لێ یێ ژ ئەزمانی د هەلنگڤیت نارابیت.
ئانکو مرۆڤ یێ ل ئەزمانێ خۆ هشیار بیت، ئەگەر

دێ تووشی دەردەسەریان بیت و دێ مرۆڤی ئێخیت و نەشێت رابیتەڤە.
-اخری کو تلکا... لا کمکاسی.
واتە پیساتی د بن بەفرێ ڤە ناهێتە ڤەشارتن.
تشت چەند یێ نهێنی بیت دێ هەر ئەشکەرا بیت و د کوردی دا دبێژن « مری د بن بەرکێ ڤە ناهێتە ڤەشارتن».
-أو دلا اثی منوخ... سی منیح.
واتە: ئەوێ دگەل تە نەهێت، تۆ دگەل وی هەرە.
گیانێ لێبوورینێ دناڤ ڤێ گۆتنێ دا هەیە کو مرۆڤ گەلەك یێ سەر رەق و دژوار نەبیت.
- براتا... مخ طلا دخورتا ایلا.
واتە: کچ دارا سپینداریێ یە.
ئانکو د لاوازن و خۆ ل بەر گرانیا ناگرن. هندەك ژی بۆ هندێ دبێژن کو زوی هزرێن خۆ دگوهورن.
- برقاذا لتری خولی.
واتە ل سەر دو وەریسا دلەیزیت (درەڤسیت).
بۆ وان کەسان ل کارە یێن دو ڕوی و ل هەر جهەکی ب رەنگەکی دئاخڤن.
- دموخ کبینا... وڤو شمینا.
واتە: برسی بنڤە، ڤەلەو رابە.
ئەڤ گۆتنە هاندانە کو مرۆڤ نەخۆت و بنڤیت، چونکی ئەو چەند یا خرابە.
- طلا دخاتا... ولا طلا دختنواثا.
واتە: سیبەرا خورنیفکا و نە سیبەرا زاڤایا.
چونکی ئەو چەند کێماسییە و چکە ل ناڤ چاڤێن خودانی.
- لایسرت خاصوخ بشیباڤا دناشی.
واتە: پشتا خۆ ب کەمەرا خەلکی گرێ نەدە.
ئانکو خۆ نەهێلە ل هیڤیا خەلکی و وەکی د کوردی دا دبێژن: (هیڤیا دەرا خۆلیا سەرا) و (هیڤیا خەلکێ ئاڤا د سەلکێ).
- ناشی قملی بدماخا... شوشی قملا لبلاخا.
واتە: خەلك چوونە نڤستنێ، شۆشێ ژنوی کەتە بەر شۆلی.
بۆ وان ژنکان ل کارە یێن درەنگ کارێن خۆ دکەن.

- ناشا بلوشتا... و بیپا بکنوشتا.
واتە: مرۆڤ ب جلکا و مال ب گێسکا.
گۆتن هاندانە کو مرۆڤ د بەر خۆدا بچیت و مالا مرۆڤی ژی یا پاقژ و بژین بت.
- شوبت بازی بزبوزی... شوبت خیاری ترعوزی.
واتە: تێژکێت بازیا جهێت بازیا گرتن و ترۆزیا جهێ خیارا گرتن.
ل دووڤ کێش و سەروایا گۆتنێ دبیت گۆتنەکا رەسەنا وان بیت. گۆتن مینا وێ گۆتنێ یە کو دبێژیت: جهێ شێرا ریڤی لێ دکەن گێرا، ئانکو مرۆڤێت بێ سەر و بەر جهێت کەسێت زیرەك و لێهاتی گرتن.
- دوکثا دکساقط... کلاقط.
واتە: ل کویرێ دادا ل وێرێ خار.
گۆتن وەکی ئیدیوم بۆ وان کەسان ل کارە کو گەلەك های ژ خۆ هەین و چ دەلیڤا ژ دەست نادەن.
- ها خولوخ... و ها دبشتوخ.
واتە وەریس و مێشەڤانیا خۆ ببە.
گۆتن بۆ وێ چەندێ ل کارە دەمێ دو کەس پێکڤە کارەکی دکەن، لێ ئێك خۆ نەڤۆلە کەت و یێ دی ل بەرامبەر کریارا وی خۆ ژبەر بهاڤیت و یێ بێختە د تەنگاڤیان دا.
ل سەر ڤێ چەندێ چەند مرۆڤەك چوونە چیای، ل فرەکەکی کو کەس نەدشیا ب گەهیتێ مێشەکا هنگڤینی دیتن، ئەو مرۆڤ پێك هاتن کو وێ مێشێ ببرن و ب برایینی لێکڤەکەن، ئێك ژ وان گۆت من وەریسەکێ هەی، من داهێلنێ ئەز دێ چمێ، وان ژی گۆتێ بلا. ئەو کەس داهێلان و ل وێرێ مێش بری، پشتی بری گۆت: وەریس وەریسێ منە و مێش ژی مێشا منە. وان ژی ل بەرامبەر گۆتنێ پا دێ مێشا خۆ ببە و هێلانە ب وێ بەتەنێ ڤە.
- سوسا مکیخا... ربسیە خیلانی کهاوی.
واتە: لیتکێت هەسپێ بێ دەنگ د مەزنن.
مینا وێ گۆتنێ یە کو دبێژیت: «کتکا مەلویل (کێتکا مس مسی) دینگێ مەزن دخرینت»، یان: « ئاڤا مەند مرۆڤی دخەندقینت»، کو ب بێ دەنگی دریێت مەزن ددانن.
- شمشا د اذار لکلاثی... و شمشا دنیسان لبناثی.

واتە: رۆژێت ئاداری بۆ بویکێت من ب هەلێت، رۆژێت نیسانێ بۆ کچێت من.
ژبەر کو دەیك پتر حەز ژ کچێت خۆ دکەت.
- یوت بایداپوخ... وجیلت بأقلاپوخ.
واتە: ب دەستا بدە، ب پیا لێ بکەرێ.
گۆتن ل سەر قەرانە کو ب ساناهی ب دەستا ب دەیە ئێکی، لێ ب زەحمەت و ب پیا لێ گەریان هەتا د زڤرینیەڤە.
هەلبەت ب دەهان گۆتنێن دی ژی هەنە و پتریا وان هەر هەمان گۆتنن کو ل دەڤەرێ دبەربلاڤ و ل سەر زارێ خەلکێ وێ ژ هەمی نەتەوە و ئایینان ڤە دهێنە گۆتن.

## د- راڤ و نێچیر[١٤]:

نێچیر ب چەندین رێکان دهێنەکرن:

**- قشتا:**

کو د کوردی دا دبێژنێ (قۆسك- بەندەك)، پێکهاتییە ژ دارەکێ کورت و دو چق ب سەری ڤە، مینا پیتا (Y) و هەر سەرەك ژ وان ب لاستیکەکێ دهێتە گرێدان و ئەڤ هەردو سەرێت بەردای ب کەڤلەکێ پانڤە دگەل ئێك دهێنە بەستن، ئێدی بۆ نێچیرێ ژی بەرەکێ هندی گویزەکێ دکەنە دناڤ وی کەڤلی دا و لاستیکێ دکێشن و بەرددەن، ئێدی ئەگەر ئەو بەر ڤ نێچیرێ کەت دهێتە کوشتن، یان برینداركرن.

**- نشوی:**

د کوردی دا دبێژنێ (داڤ)، ئەو ژی داڤەکا قایم و زراڤە، ژ بەندکەکێ یان چلەی، یان ژی ل بەرێ ژ مویێن کوریا هەسپی دروست دکرن و پشتی هینگێ وێ مینا خەلەکا لێ دکەن و ب رێکێن تایبەت و ل دەم و جهێ تایبەت پێ نێچیرێ دکەن.

**- اقولا:**

یان د کوردی دا دبێژنێ (خەفك)، پێکهاتییە ژ دو نیڤ بازنەیێن تێلەی و سپرنگەك یێ دناڤبەرا هەردووان دا هەی و ب رێکا داڤەکا دەزیێ قایم سەرەکی دانی پێڤە دکەن و دەمێ فرندە دێ وی گەنمی خۆت دهێتە راکێشان و خەفك د شەقیێت و نێچیر دکەڤیتێ.

**- طبکثا:**

هەر هەمان (تەپکن) کو د کوردی دا هەین.

**- باثورا، یان بثورتا:**

هەر مینا (طبکثا)یە، لێ ل ڤێرە بەری ددانە سەر دارەکێ زراڤ و دانی ل بن رادئێخن و گاڤا نێچیر دهێتە بن، ئەو دار دهێتە راکێشان و نێچیر دکەڤیتە د بنڤە. ئەڤ جۆرە مینا نێچیرا (مۆخل و بێژینگانە).

**- قولاثا:**

یان د کوردی دا دبێژنێ (تەلهە).

**- نێچیرا ماسیان:**

ئەو ژی ب چەندین رێکان دهێنە گرتن، وەکی:
شۆك، تۆر، سوتی (سیت ب کوردی)، هەلبەت ژبلی تڤەنگان.

# چەند پیشەسازیێن دەڤەرا بەهدینان

محەمەد حەسەن بناڤی

بێگومان پیشەسازی و کارسازی ئێکە ژ بنەمایێن پێشکەفتنا هەر مللەتەکی، لەورا دێ بینی هەر جڤاکەکی ل هەر وەلاتەکی ژ دەسپێکا ژیانا خۆ پێکۆلا چێکرن و دروستکرنا هندەك تشتان دایە کو رۆژانە پێدڤی دبنێ.
کوردان ژی مینا هەر مللەتەکی ئەڤ پێنگاڤە یا هاڤێتی و پێدڤیێن خۆ دناڤ خۆدا قەتاندینە بێی کو هەوجەی جهەکێ دی ببن، مینا دروستکرنا سابوونێ و ئامانا و جل و بەرگان و گەلەك تشتێن دی، وەکی چێکرنا چەکی و تەڤن و تەڤنکاریێ و...هتد.
ئەڤ سەروبەرە ژی ل دەڤەرا بەهدینان د چەند پیشەسازی و کارسازیێن کوردەواریدا دیاردبیت ژ وانا:

**سابوون:**

سابوون ئێك ژ پێدڤیێن ژیانێ بوو، لەورا هەر زوو خەلکی هزر د چێکرنا وێ دا کرییە، ئەڤ سابوونە بەهرا پتر ژ کەزانان دهاتەچێکرن، چونکی کەزان وەکی کەرەستەیێ چێکرنا وێ ل دەڤەرێ پێ مشە بوو، چێکرنا وێ ژی ب ڤی رەنگی بوو:
پشتی خەلکی کەزان دچنین، بەرتاڤ دکرن هەتا هشك دبوون، پشتی هینگێ کەزانێن باش د فرۆتن و دەبارا خۆ پێ دکرن، ئەوێن دمان کو بەهرا پتر د بێخێر و د کویر و مکوم بوون، دگەل جۆرێ کو دگۆتنێ (بێمك) دبرن د قوتان هەتا هویر هویر دکرن و وەکی مەعجوینی لێ دهاتن و هەر گوندەکی چەند حەلانەکێن مەزن بۆ قوتانا کەزانان لێ هەبوون... و هەر مالەکێ ل دوڤ پێدڤیێن خۆ بۆ سابوونێ کەزان د هەلگرتن و ئەڤ کارە پتر ل زڤستانێ دهاتە ئەنجامدان، چونکی دونیا د تەزی و روینێ ژ کەزانان دەردکەت یێ پێدڤی سەرمایێ بوو دا زوی ب مەییت.
گاڤا دبوو دەمێ دروستکرنا سابوونێ، ژنکان ئەو کەزان دبرنە سەر وان حەلانان و دقوتان و بۆ ڤێ چەندێ ژی گەلەك جاران ژنك وەکی زیارە دچوونە هاریکاریا ئێك هەتا کەزانێن مالەکێ دقوتان.
پشتی دهاتنە قوتان دا کەنە د مەنجەلەکێ دا و هێلن، رۆژا باشتر ژنك لێ ڤێك دکەتن و خۆ دکرنە رێز، ئێك دا هندە کەزانێن قوتای هلگریت و گڤێشیت هەتا روین ژێ دکەت، ئێك دا دەتە ڤ یا دی هەتا باش دهاتە گڤاشتن و چ روین نە دما تێدا، وەسان هەتا کەزانێن قوتای خلاس دبوون و هەمی دهاتنە گڤاشتن و چ روین (دۆن، دوهن) نەدما تێرا. بێگومان ئەو روینێ ژ ئەنجامێ وێ گڤاشتنێ دەردکەت هەمی د ئامانەکی دا کۆم دکر و وێ ئاڤێ (روینی) بەن کەنە دناڤ بەفرێرا هەتا ئەو روین دجەمسی (دمەیی).

پشتی د مەیی دا مەشکێ هینن و هلاویسن و وی روینی (دۆنی) کەنێ و ئاڤا تەزی کەنە سەر و هندەك بەفرێ کەنە ناڤ دا باش تەزی با، پاشی مەشکا خۆ دکیبان هەتا باش تێکەلك دبوون و ب دلێ وان چێدبوو، پاشی دا مەشکا خۆ خالی کەنەڤە مەنجەلێ و هێلن، پاشی دا ئینن نەرماڤا دەنێ، واتە دا هێن زرکێ چێکەن و ئاڤا زرکێ دکرە ناڤ وی روینێ ژ کەزانا گرتی و دکەلاندن، چەند کەلەك دئینانێ... پاشی دا کەنە ڤ ناڤ بەفرێ را هەتا دمەیی، دو رۆژان دهێلا، پاشی دا هینن (تیژاڤێ) چێکەن و پێ کەلینن، تیژاڤ ژی ب ڤی رەنگی دهاتە دروستکرن:

دا کلۆزەکی دانن سەر دویلستانێ[1] و بنێ وی کون کون دکر، پاشی دا هندەك دارا داننە سەر وان کونا و هندەك پویشی ژی داننە سەر، ژنوی دا کولۆزی ب نیڤی خۆلی کەن، مەنجەلەك ددانا سەر کوچکی و تژی ئاڤ دکر و ئاگر ددانانە بن هەتا ئەو ئاڤ برپر د کەلی و پرچك دهلاڤێتن... ژنوی دا وێ ئاڤێ ب ئامانەکی راکەن و کەنە سەر وی کولۆزی، بێگومان ئامانەك ددانانە بن کونکێن وی کولۆزی، دا کو ئەو ئاڤا ژێ دکەت چووبا وی ئامانی، هۆسا ب ڤی رەنگی تیژاڤ تێرا خۆ دگرت، دا کو زانیبان کا ئەو تیژاڤ باش چێبوویە یان نە، دا هینن بەندکەکێ موی کەنە دناڤدا، ئەگەر ئەو بەندك قەت قەت ببا و ببا هەریسە، ئەو تیژاڤ یا لاوە... ژنوی دا وی روینێ نەرماڤکری ب وێ تیژاڤێ ژی کەلینن هەتا باش تیر دبوو، پشتی تیر دبوو دا مەنجەلا خۆ راکەن و بەن جارەکادی کەنە دناڤ بەفرێرا هەتا باش دمەیی و هشك دبوو، پاشی دا ب کێرێ ڤالبێن سابوونێ برن و بۆ شویشتنا سەر و جلکان هلگرن و بێگومان بۆ وی دەمی سابوونەکا باش دروست دبوو، سابوونەکا رەنگا و رەنگ، شڤێرەکا (خیچەکا) سووربوو و ئێکا کەسك و ئێکا شین و ئێکا سپی... .

ژبلی کەزانان سابوون ب بەرکێن مشمژا و باهیڤان ژی دگەل تۆفکێن کولندان و بەرکێن حاجی باهیڤکان ژی دهاتە دروستکرن، لێ بەهرا پتر بەرکێن باهیڤ و مشمژا ئەو بوون یێن تەحل، چونکی یێن شرین بۆ خوارنێ ب کاردهینان. هەژی گۆتنێ یە کو ئەڤ جۆرێ سابوونێ هەر مینا یا کەزانان دهاتنە دروستکرن، لێ رەنگێ جۆرێ داوییێ یێ رەش بوو.

## چێکرنا گولاڤێ:

گولاڤ، ئاڤا بێهن خۆشا گولانە، دهاتە بکارهینان بۆ بێهن خۆشیێ و سەرنج راکێشانا یێ بەرامبەری خۆ ل خۆ د رەشاندن... ئەڤ ئاڤە ژ بەلگێن کولیلکێن بێهنخۆش دهاتە دروستکرن. ئەڤ کارە پتر ل وەرزێ بهارێ دهاتە ئەنجامدان، دەمێ گول و کولیلکان بەرك و بەتەن و شیڤ و نهال و بەرجۆ دنخافتن و خێڤ دکر، مینا گولمحەمەد و گولزەر و گولهرچ و گولشیلان و بنەفش و ئەسمین و هەلال و بەیبینان... هتد.

ئەو کەسێ دڤیا گولاڤێ دروست بکەتن، ل دەسپێکێ کەلەك بەلگێن گولان دکرن و کۆمدکرن، پاشی کوچکەك چێدکرن و ئاگر تێدا هلدکرن و قازانەك دهینان و پاتەکێ فرفۆت (کو ئاڤ ب ساناهی تێدا بچیتە خوار) ب سەر قازانێ دا دگرتن ب بەندکەکی یان تشتەکی دی ل سەر دشداندن، پاشی دا هینن هندەك بەلگێن گولان داننە سەر وی پاتەی و قازانێ داننە سەر کوچکی و تشتەکێ بنێ وی حولی و پیچەکێ گران داننە سەر وان بەلگان و دهێلان هەتا ئەو بەلگ دنمیان و ب ئاڤ دکەتن و ئاڤا گولان چپك چپك ژ وان بەلگان دکەتە د قازانێدا هەتا دزانین ئاڤ ب تەمامی نەمایە دوان بەلگان و ب تەمامی یێن هشك بووین، پاشی دا وان بەلگان ڤالا کەنە سەرئامانەکی و هندە بەلگێن دی داننە جهێن وان و ب وی رەنگی هەتا هەمی ئەو بەلگێن گولان خلاس دبوون و چ ئاڤ تێدا نەدمان، پاشی قازانکا خۆ ژ سەر کوچکی ددانان و ئەو بەلگێن هاڤێتی دکرنە دناڤ دەستێن خۆداڤە و ل هنداڤی قازانێ دگڤاشتن کو ئەگەر هندەك ئاڤ تێرا مابا ئەو ژی دەردکەت و دچوو ناڤ یا دی... ل دوڤدا ئەو پاتێ ب دەرێ قازانێ ڤە هاتییە ئاسێکرن ژێڤەدکرن و پیچەك خۆ لێدگرتن هەتا د تەزی و ئەو ئاڤ دکرە هندەك ئامانێن بچویك و ناڤنجی و دهلگرتن و ل دەمێن پێدڤی بکاردهینان.

**چێكرنا حوبری:**

حوبر ئێكە ژ كەرەستەیێن نڤێسینی، لەورا خەلكێ دەڤەرێ پێدڤیەكا باش پێ هەبوویە. حوبر ژ وان رووەكان دهاتە دروستكرن كو ل كوردستانێ (دەڤەرێ) شین دبوون، مینا دارتوی (توی شەمب) و دری و بنەفش و رووەكێن سرۆشتیێن دی.

پێنگاڤا دروستكرنا وی ژی ب ڤی رەنگی بوو:

ل بەراهیێ و پشتی دری، یان توی شەمبی د ئامانەكیدا كۆم دكرن، دا هێن گڤێشن هەتا ئاڤا وان هەمی ژێ دهات و حەل دبوون، پاشی دا وێ ئاڤێ ل پاتەكێ فرفۆت كەن و پارزنینن دا باش پاقژ ببا و چ گلێش و پیساتی دناڤدا وێ ئاڤێ دا نەمابا، ل دوڤدا ئەو ئاڤ دكرە ئامانەكی و دكەلاندن هەتا تیر دبوو، پاشی ئاگر ل بن دڤەمراندن و دهێلانە ل وێرێ هەتا سار دبوو، و ئەو ئاڤا دما تێ دبوو حوبر و دناڤ ئامانەكێ بچویك دا دهەلگرتن و پشتی هینگێ نڤیسین پێ دهاتەكرن.

لێ ئەگەر كەرەستەیێ چێكرنا حوبری كولیلكێن بنەفشا بان، پشتی گەلەك ئەو جۆرە كولیلك دكرن و كۆم دكرن، پیچەكا ئاڤێ لێدكرن و دكرنە د ئامانەكی دا و ددانانە سەر ئاگری و دكەلاندن هەتا دمرن و ب ئاڤ دكەتن، پاشی ژ سەر ئاگری راكەن و خۆ لێگرن هەتا باش سار دبوو، ل دوڤرا دا ب دەستا گڤێشن هەتا ئاڤا وان هەمی ژێ دهات و ئەو ئاڤا ژ ئەنجامێ گڤاشتنێ دەركەتی دا د ئامانەكی دا كۆمڤەكەن و دكەلاندن هەتا دیسان تیر دبوو، پاشی ئاگر ل بن دڤەمراندن و د پاتەكی دا دپارزناندن و د ئامانەكێ بچویك دا دهلگرتن بۆ دەمێن پێدڤی.

**چێكرنا قاچكێ كوردی:**

قاچك ئێك ژ وان تشتانە كو بۆ پێدڤیان دهاتە بكارهینان، چ بۆ جوینێ و چ ژی وەكی دەرمان و گەلەك جاران ئەڤ قاچكە ل كەل كەلا گەرمێ و ل هاڤینان و ل بەر تاڤێ دەمێ كاردكرن، ب تایبەت ل دەمێ چوونا مازییان و شڤانیێ و گیا دروینێ و چلی برێ كو ئاڤ ل وان جهان دكێم بوون و... هتد دهاتە جوین دا تێهنا خۆ پێ بشكێنن و زوی ب زوی تێهنی نەبن.

نها ئەڤ پیشەسازی یە ل سەرانسەری جیهانێ یا بەلاڤە و ب جۆرێن جودا دهێنە چێكرن و ل ناڤخۆ نها ب (علك) دهێتە نیاسین و جهێ قاچكی و بەنیشتی پێ گرتی، ئەڤێن ل خوارێ ژی چەند جۆرێن قاچكی نە ل دەڤەرا بەهدینان:

**أ- قاچكێ كرنگێ (كەنگرێ):**

هەر د كەڤندا قاچكێ كەنگرێ ل دەڤەرێن چیایی دهاتە چێكرن، چونكی كەنگر مشە ل چیا و زۆزانان شیندبوون و هەتا نها ژی هندەك وی كاری دكەن. ئەڤ جۆرێ قاچكی دهێتە هژمارتن خۆشترین و بهاترین جۆرێ قاچكی ل دەڤەرێ، چێكرنا وی ژی ب ڤی رەنگی بوو:

خەلكێ ڤان دەڤـەران ل هاڤینان دەمێ كەنگر زەردبوون و بەرەڤ بەهین ڤە دچوون، یان رەنگێ وان دهاتە وەرگێران و هشك دبوون، دچوون قاچك ڤەدكرن، دەوروبەرێن وی ب تەڤركەكێ بچویك دكۆلان هەتا رها وی، یان قورمێ وێ دەردكەت... بەر رها وی باش حولی دكر و ئاخ و بەر ژێ ڤەددان و هندەك ئار پێوەردكرن، ژنوی دا رها وی ب كێرێ برن و ژێڤەكەن، شیر تێ دهات و ئەو شیر ڤێدا دچوو خوارێ و دما ل سەر ئارێ ب دۆرا وەركری و كۆم دبوو... .

ب ڤی رەنگی یەك كەس یان چەند كەسەك پێكڤە دچوون قاچك ڤەدكرن، و رۆژێ گەلەك ڤەدكرن، پشتی دزانین تێرا خۆ یێن ڤەكرین دا زڤرنە مالڤە و رۆژەكێ دوا خۆ لێ گرن هەتا ئەو شیرێ ژ بنێ كەنگرێ هاتی پێ مەهی و هشك بووی، پاشی دا ئامانەكی بەن و چن قاچكێن خۆ راكەن و هیننە مال و ل مال ژ قرش و ئاخێ و بەران پاقژ كەن، ل دوڤرا ب ئاڤێ دشویشتن و كرنە د ئامانەكی دا و پیچەك دكەلاندن و ددانانە وێرێ هەتا سار دبوون، جارەكادی ئاڤەكا دی لێدكرن و هەر چەندەك ددانە ئێك و بەردرێژ دكرن، یان دكرنە بالۆلك و ب ڤایدا جوینێ لێدكرن كو دگۆتنێ (دەڤجوین). وەسان ب ڤی رەنگی هەمی ئەو قاچك دكرنە دەڤجوین، هندەكان بۆ دەبارا ژیانا خۆ دفرۆتن و هندەكان بۆ هەڤال و هۆگرێن خۆ دهنارتن، ژبلی كو

بۆ خۆ ژی دهلگرتن.
هەژی ئاماژێ یە کو هندەکان هەر دەمێ تەقالکێن قاچکی رادکرن، ئێکسەر پشتی پاقژکرن و شویشتنێ دکرنە ددەڤێ خۆدا و دجوین و هەر دبەررا تفدکرن هەتا ئەو تەعلاتییا دناڤ دا هەمی دچوو و قاچك خۆش دبوو.

## ب- قاچکێ کەرێ:

کەر، یان گیایێ کەرێ ل چیا و زۆزانان شین دبیت، رەنگێ وی بۆزەکێ سەر سپی ڤەیە، دارێ وی هندی تلا مرۆڤی یا قلیچێ یە، هندەك پەرمیچکێ وەکی موی و دەزییان ب دارکێ ویڤە هەنە، گەلەك بەلگ پێڤە هەنە و رەنگێ وان ژی یێ بۆزە، لێ دبێ پەرمیچکن. دروستکرنا وی ژی ب ڤی رەنگی بوو:
خەلك دچوون بەر بنێ وان ڤەدکۆلان هەتا رها وی دەردکەت و دۆرێن وی حولی و خۆش دکرن و ئار پێوەر دکرن، ژنوی ئەو رهـ دبرین، یان ڤەدکرن و دو سێ رۆژان خۆ لێدگرتن و پاشی دچوون رادکرن و دهینانە مال پاقژدکرن و هەمی پێکڤە دکرنە د ئامانەکی دا و ئاڤ دکرنە سەر و دکەلاندن، پاشی ژ سەر ئاگری ددانان و خۆ لێ دگرتن هەتا د تەزین و ساردبوون، پاشی دا جارەکادی ب قایدا جوینی لێکەن و جوین و ئەوێن دمان ژی دکرنە (دەڤجوین)، چ بۆ هلگرتنێ و ب کار هینان ل دەمێن پێدڤی و چ ژی بۆ فرۆتنێ کا ل وی سەردەمی ب چەندێ دفرۆتن، هەژی گۆتنێ یە ئەڤ جۆرێ قاچکی وەکی یێ کەنگرێ یێ خۆش نەبوو، ژبەر:
١- ئەڤ جۆرێ یێ چر و نویسەکە و ب مرۆڤی ڤە دمینت.
٢- ئەڤ جۆرە ب تامترە.
٣- هەمی دەما شرینی تێ نینە.
٤- رەنگێ وی یێ تەحینی یە و نە یێ سپی یە.
ژبلی کو ئەڤ قاچکە بۆ جوینێ دهاتە بکارهینان، حەکیم و لوقمانێن دەڤەرێ ژی مفا بۆ نەساخییان ژێ ددیتن، ب تایبەت بۆ نەساخیێن باهینکێ و فرکێ و هەر جهەکێ لەشی ئێشابا، دا ڤی قاچکی بەری خۆشکرنێ ب پاتەکێ نفسی رادەن و داننە سەر وی جهێ ئێشابا، نەخاسمە پشتێ و دەست و پییان.

## ج- قاچکێ بەنیشتی:

ئەڤ جۆرێ قاچکی ژ بەنیشتێ کەزانان دهاتە چێکرن و پتریا خەلکی هەر دبێژنێ (بەنیشت)، چونکی دارێ کەزانێ دمشەنە و ب تایبەتی ل دەڤەرێن چیایی و بەنیشت ب قورم و سەرچەق و تایێن کەزانان ڤە دهێت، هەر دارەکا بریندار یان تیڤلی دبوو بەنیشت پێڤە دهێت، و هندە جاران بێ برینداری زلقێن بەنیشتی[٢] پێڤە چێدبن... و گەلەك جاران ئەڤ بەنیشتە دکەڤیتە بەر قورمێ دارێ و راستا سەرچەقان، خەلکی ئەڤ بەنیشتە لێکددا و مینا قاچکی دجوین و ب دو رێکان ئەڤ بەنیشتە دهاتە خۆشکرن:
١- گاڤا بەنیشت کۆمدکر، بێی تشتەکی لێ بکەن دا پاقژ کەن و هاڤێنە دەڤێ خۆ و هەر جوین و تفکەن هەتا تاما وی خۆش دبوو، پاشی دهێلانە ددەڤێ خۆدا و دجوین و ئەڤ جۆرە دما چر و ل دەمێ جوینێ ب دەڤێ مرۆڤی ڤە دما.
٢- پشتی بەنیشت کۆمدکرن و ژ زلکا و بەرکێن هویر و قرشا و قەلپا و ئاخێ پاقژ دکرن دا باش شوون و کەنە د ئامانەکی دا و هندەك شیری کەنە سەر و کەلینن هەتا باش دناڤدا دکەلی، پاشی دا ژ سەر ئاگری راکەن و دانن و خۆ لێگرن هەتا دتەزی، پاشی دا وی شیری رێژن و ئاڤەکا دی لێکەن و پاشی ب قایدا دەڤجوینان ڤەدبرین، ڤێجار چ بۆ دهلگرتنێ با یان ژی بۆ فرۆتنێ.
هەژی ئاماژێ یە ئەو قاچکێ دناڤ شیری دا دکەلاندن تاما وی خۆشتر بوو، دیسان نەیێ چر و نویسەك بوو، چراتی و نویسەکییا وی ب کەلینێ دچوو.
خەلکێ دەڤەرێ ژبلی مفا ژێ وەرگرتن بۆ جوینێ، گەلەك جاران بۆ کارێن حەکیمیێ دهاتە بکارهینان، حەکیم و لوقمانان بۆ برینان پشتی هندەك کەرەستێن دی دکرنە ناڤ و دکرنە نانتف بکاردهینان و دئێخستنە برینان.

### د- قاچکێ ڤێری:

ئەڤ رەنگێ قاچکی ئێك بوو ژ وان قاچکێن ل دەڤەرێ دبەربەلاڤ، ب تایبەت ل وان جهێن ڤێر لێ هەین، لێ کێمتر دهاتە بکارهینان و هندی قاچکێ کەنگرا و کەرێ هەبا کەسێ ئەڤ بەنیشتە نە دجوی، چونکی تاما وی یا نەخۆش بوو، بەلکی هندە جاران تاما گازێ ژی ژێ دهات، ژیلی کو رەنگێ وی ژی نە یێ سپی بوو، بەلکی یێ رەش بوو و ژبن ئەردی دەردکەت، رێکا خۆشکرنا وی ژی ل وان دەڤەرێن ڤێر لێ هەین ئەو بوو دا ڤێری کەنە ددەڤێ خۆدا و هەر جوین و هەر تفکەن هەتا تاما وی یا نەخۆش چووبا.

ل وان دەڤەرێن ڤێر ژی لێ نەبی، ڤێر ژ عەتارێن پشتگۆرکا دکرین و بۆ خۆ هەر ب رێکا ناڤبری خۆش دکرن.

### ە- قاچکێ شڤانان:

ڤی جۆرێ قاچکی ل دەڤەرێ گەلەك گرنگیا خۆ مینا یێن پێشتر نەبوو، ب تایبەت ل جەم مەزنان کو وان نە دجوین و پتر زارۆکان بکار نەدهینان.

ئەڤ جۆرێ قاچکی ژ گیایەکی ب ناڤێ (قاچکێ شڤانان) دهاتە چێکرن، ئەڤ گیایە ب قاسی (١- ١,٥سم) بلند دبیت، ڤی گیای کۆمەکا بەلگێن هویر ب سەریڤە هەنە و وەکی سەرکەکی خۆ ددەنە ئێك، ئەڤ گیایە ل بهاران ل چیای شین دبیت، زارۆکان ئەو گیا دکرن و پاقژ دکرن و دکرنە ددەڤێ خۆدا و دجوین، رەنگێ وی یێ سپی یە و ددەڤێ مرۆڤی دا مینا قاچکێن دی نە دحەلیا.

### ە- کلێ چاڤان (کلێ سبحانی):

کلێ چاڤان دەرمانەکێ تۆزە و رەنگێ وی یێ رەشە، ژبۆ جوانیێ و ب تایبەت ژ لایێ ژنانڤە دهاتە بکارهینان، دیسان وەکی دەرمان بۆ چارەسەریا هندەك ئێشێن چاڤان دهاتە بکارهینان.

ئەڤ دەرمانە ل دەسپێکێ بەرەکێ رەشێ تەیسۆکە، ڤێجار ئەو بەر چ یێ مەزن بیت یان بچویك و ل گەلەك جهان ل پارێزگەها دهۆکێ هەیە و ئەو جهێ دەرمان لێ هەی دگۆتنێ (کۆرا دەرمانی)، هندەك ئامان دبرن و هندەك ئاخ دکۆلان و دکرنە وی ئامانی و ئاڤ لێدکرن و دشویشتن و دەرمان ژێ دگرت و کۆمدکر، هۆسا چەند رۆژان دچوونێ هەتا تێرا خۆ لێکددان.

هەژی ئاماژێ یە کو هندەك جاران بێی ئاخێ ب کۆلن و ئامانی ببەن، کەسانێن شارەزا و زیرەك هەبوون، هەر ل سەر ئاخێ دەرمان دنیاسین و کۆمدکرن و دهینانەڤە.

پاشی ئەڤ دەرمانێ هاتییە کۆمکرن، ژنکان باش دشویشت و پاقژ دکرن و ل دوڤدا ب جۆنیەکێ، یان هاونەکی دقوتان هەتا هویر هویر دبوو و وەکی تۆزەکێ لێدهات و زڤراتی تێ نەمابا، دا وی دەرمانی کەنە سەر پاتەکێ فرفۆت و دەستێ خۆ، یان تبلا خۆ یا بەرانی دسەررا هینن و بەن، ئەو تۆزکا دەرمانی یا دپاتەی دا دچوو خوار ئەو دەرمانێ دروست بوو، ئەوێ دما ل سەر پاتەی دما جارەکادی دکرنە دهاونی، یان جۆنی دا ڤە و دقوتانەڤە هەتا ئەو ژی وەلێ دهات و دپاتەی دا دچوو خوار و ئەوا ل بن دکەت ب کێر بکارهینانا چاڤان دهات و دهلگرتن. هەژی ئاماژێ یە کو هندەکان ئەڤ دەرمانە ژ خۆ زێدە چێدکرن و ل دوڤ بهایێ وی سەردەمی وەکی ژێدەرەکێ ئابووری دهاتە فرۆتن.

### کلدانك:

ئامانەکێ بچویکێ تایبەتە بۆ هلگرتنا کلێ چاڤان و ژ کەڤلێ رانکێن دیکلی دهاتە چێکرن، دەمی دیکل سەرژێدکرن ژنکان رانکێن وی ژێڤە دکرن و کەڤلێ وی د سەردا دهینا و باش ژ وی گۆشت و بەزێ پێڤە دشویشتن و پاقژ دکرن و هندەك ئار پێوەردکرن و ڤەدگەمراندن (دپەرخاندن) هەتا ئەو تەراتیا تێ هەی هەمی ژ خۆ بەردابا، هۆسا ئەڤ کریارە چەند جارکی دهاتەکرن هەتا ئەو کەڤلە وەکی چەرمەکێ گەمارگرتی لێ دهات و بەردەوام یێ نەرم بوو و ژ لایێ ژنەکا شارەزاڤە ب باشترین و جوانترین شێوە دهاتە دروین، هندەکان ژی بۆ جوانیێ کلدانکێن خۆ ب مۆرکێن هویر و رەنگا و رەنگ دنەخشاندن و کل دکرنێ.

**کلچیڤ:**
ئامیرەکە بۆ تێوەراندنا دەرمانێ (کلێ چاڤان) دهاتە بکارهینان و ژ دارێ هەڤرستی یان گویزێ یان کەڤۆتی... دهاتە چێکرن، چونکی دارێ وان یێ نەرم بوو، واتە یێ زڤر نەبوو، کلچیڤ ب قاسی (٦- ٨سم) یێ درێژە، سەرەکێ وی یێ گرۆڤرە، ژنکان ب تبلان ئەو سەر دگرت و کل پێ دچاڤێن خۆ دوەراندن، سەرێ دی ژی زراڤ و حولی دکرن، ب شێوەیەکێ وەسان کو شیابان دەرمانی پێ دچاڤێن خۆ ب وەرینن و زیانێ نەگەهینتە چاڤان، هەژی گۆتنێ یە هندەکان ئەو سەرێ ستویر و گرۆڤر بۆ جوانیێ دنەخشاندن و ژنکان ئەو کلچیڤ دکرنە دناڤ کلدانکێدا و دهلگرتن و ل دەمێن پێدڤی بکاردهینان. ئەڤ کلە پتر بۆ جوانیێ دهاتە بکارهینان، لێ هندە جاران بۆ هندەك ئێشێن چاڤان ژی بکاردهینان.

**پیشەسازییا چێکرنا گلینەی:**
گلینە ئێك ژ پیشەسازیێن هەرە کەڤنارە ل کوردستانێ و هەر دکەڤندا بۆ قەتاندنا هەوجەیێن رۆژانە دهاتنە چێکرن و هەتا نها ژی ل دەمێ هلکۆلانان ب دەهان ژ وان جۆرێن ئامانێن گلینەیی ژێ دەردکەڤن کو ب بوورینا سەدان سالە کوردان مینا پتریا مللەتان شارەزایی د ڤی بواریدا پەیداکرینە و هەر هاتینە دروستکرن و بکارهینان.
دەڤەرا بەهدینان ئێکە ژ وان جهێن دیار کو ئەڤ پیشەیە لێ هەبوویە و خەلکێ وی شارەزایی دڤی بواری پەیداکرین، ئێك ژ وان دەڤەران دەڤەرا نەهلێ یە ل قەزا ئامێدیێ- گوندێ درگنێ و وەکی دهێتە گۆتن کو ل بەرێ جۆرە ئامانەك چێدکرن دگۆتنێ (قۆقە)، لێ چ پێزانین ل سەر ڤێ چەندێ نینن.
ل بەرێ گەلەك جۆرێن گلینەیی ل دوڤ پێدڤیێن رۆژانە دهاتنە چێکرن و دبیت هەتا نها ژی هەوجەیێن هندەك کەسان پێ دقەتیێن، لێ ئەڤ پیشەیە پتر بەرەڤ مانێ ڤە دچیت، ژ وان پێدڤیێن ل بەرێ ژ گلینەی دهاتنە دروستکرن ژی ئەڤەنە:

دهن



**گۆسك:**
بۆ تەزاندنا ئاڤێ و ئاڤ ڤەخوارنێ دهاتە بکارهینان، گۆسك یێ گرۆڤر و زراڤ و بلندە و ل لایێ سەری زراڤ و تەنگ دبیت و وەکی گەوریێ لێ دهێت، دو چمبلك (دەستك) پێڤە هەنە. ژ ساخلەتێن ڤان گۆسکان ئەوە کو چێکێن ئاڤێ تێ ددێرێن و دەمێ با لێ دەت ئاڤێ دتەزینت.

**جەڕك:**
ئێکە ژ وان ئامانێن ئاڤ پێ ژ سەر کانییان دهینان و ل مال ددانانە سەر تەنشتێ و دو بەر ددانانە بن لایەکێ وی دا ئاڤ ژێ نەرژێت، جەڕك ژی ئاڤێ د دێرینن و ئاڤ دتەزیت.

**کەدوین:**
هەر جەڕکە، لێ قەبارێ وی بچویکترە.

**دیزك:**
مینا قازانان دهاتە بکارهینان و خوارن تێدا چێدکرن، بلنداهییا وی دناڤبەرا (٢٠- ٣٠سم) بوو.

**لینك (کلۆسك):**
ئەو ژ گۆسکی مەزنترە و بۆ هلگرتنا هندە خوارنان، مینا ڕوینی و دۆشاڤێ و... هتد دهاتە بکارهینان، لینکی چوار چمبل نێزیکی دەرۆکێ وی هەنە و ئاخا ڤان لینکان یا سۆرە دا ئاڤێ مینا جەڕك و گۆسکان دخۆ نەدێرینت.

**دەن:**
ئامانەکێ مەزن بوو بۆ عومبارکرنا ئاڤێ و یێ بنەجهە پشتی ددانە سەر بەرا، یان دارا، یان ژی بنکەکێ ئاسنی ل دوڤ قەبارێ وی بۆ چێدکەن و ددانە سەر، دەرێ وی یێ فرەهە و ترار ب ساناهی دچیتە دناڤدا، ئامانەکێ بچویکتر ژی هەبوو ددانانە بن و چێکێن ئاڤا دەنی دکەتنێ کو دگۆتنێ بن دەنك، دەن ژی ئاڤێ ددێرینن.

**سندان:**
ئەڤ ئامانە یێ مەزنە و نیڤەکا وی یا فرەهە، هەروەسان دەرێ وی ژی یێ فرەهە و دو، یان چوار

سندان



جەڕك،



چمبلكان دبەنێ، ئەڤی سندانكی ساخلەتەكا هەی، ئەو ژی ئەوە هندەك دەرمان ب رێكێن هونەری ل سەر رویێ وێ ب كویرهێ دهێتە حەلاندن و مینا تیخەكا بویاغا كەسك ل سەر چێدكەت دا چ تشتێ رۆن تێ نەهێتە دێراندن، ئەڤ ئامانە بۆ قەلیێ و رۆنی دهێتە بكارهینان كو تێرا سالێ هەمیێ بكەت.

**ئاخینك:**
ئامانەكێ دی یێ ئاخێ یە و مینا تەستان دهاتە بكارهینان.

**سۆلین:**
مینا بۆریێن ئاڤێ بوون كو ئاڤێ ژ جهەكی ڤەگوهێزنە جهەكێ دی.
هەروەسان چەندین ئامانێن دی تر ژی هەبوون، مینا كوچك و تەنویر و بوخیری و...هتد.
هەلبەت ل بەرێ ئەگەر ئەو جۆرە ئامان ب رەنگەكێ سادەیی هاتبنەدروستكرن، لێ ب بوورینا دەمی هەر وەرار و پێشكەتن یا بخۆڤە دیتی و ب ئامیرێن نوی وان پارچێن گلینەیان دروستدكەن، ئامیرێ سەرەكی ژی یێ دروستكرنا وان (چەرخە) كو ب رێكا زڤراندنێ كار پێ دهێتەكرن و ل بەرێ ئەڤ چەرخە ب بەری دهاتەدروستكرن و پاشی بوویە چەرخێ داری و ل نها ئەگەر ڤان گلینەیان چێكەن ب چەرخێن ئاسنی چێدكەن و ب هێزا كارەبێ كاردكەت (دزڤریت) و وەسان كار گەلەك ب ساناهیتر و لەزتر لێ دهێت، لێ ب رەنگەكێ گشتی ئەڤ كارە گەلەك یێ كێم بووی ئەگەر نەبێژین ل دەڤەرێ هەر ب تەمامی نەمایە.

**قۆناغێن كاری:**
قۆناغێن چێكرنا ئامانێن گلینەیی ب ڤی رەنگی یە:

ل بەراهیێ ل وەرزێن گەرمێ و ب دروستی دناڤبەرا هەیڤێن (١- ١٠) دا دێ ئاخێ ژ گلكەنێن تایبەت هینن، چونكی ئاخا وێ یا تایبەتە و دبیت ل هەر دەڤەرەكێ نەبیت، پاشی بەرا ژێ دگرن و ل مۆخلێ دكەن و دناڤ ئاڤێ دا دشێلن و هەڤیردكەن كو ببیتە تەقن، ل دوڤرا دەست ب چێكرنا ئامان كەن كو ئەو ئاخا هەڤیركری بدانە سەر چەرخی و بزڤرینن و ب دەستان ل دەمێ زڤرینێ ئامانی حولی دكەن و دنەخشینن و قۆناغ بۆ قۆناغێ هەتا ئامان ل دوڤ داخوازی و پێدڤیێن وان دروست دبیت پاشی دێ ئامان ل سەر چەرخی هێتەراكرن و بۆ چەند رۆژەكان داننە جهەكێ پاقژێ بەر تاڤ هەتا هشك دبیت، ئێدی ئامان دێ یێ بەرهەڤ بیت بۆ قۆناغا قەلاندنێ، چونكی ئامان دڤێت هەر بهێتە قەلاندن و بێی ئەو كریار ئامان ب ئاڤێ خراب دبیتەڤە، لێ ب قەلاندنێ ئامان موكوم دبیت و زوو ب زوو خراب نابیت و ب سالان بمینتە دبن ئاڤێ ڤە خراب نابیت وەكی چەوان نها وەكی شوینوار ل جهێن كەڤنار دهێنە دیتن، قەلاندنا وان ژی ب ڤی رەنگی یە:
ل بەراهیێ دێ ئامانا دناڤ تانكا دا بەرهەڤكەن و كەنە دناڤ كویرهێ دا و دۆرێن تانكا پركەن ژ دارا، پاش دێ بیتە گەها قەلاندنێ د جهەكی دا كو دبێژنێ (كویرهە)، ئەو ژی پێكهاتییە ژ ژوورەكا بچویك و دو چاڤیك پێڤە هەنە كو درێكا وان دا هەر ئاگری دبەررا خۆش دكەن و بەرێ وێ یێ سەرئەڤرازە دا دویكێل ژی تێرا دەركەڤیت، هەروەسان بۆ داكرن و دەرئێخستنا ئامان ژی، ل بەراهیێ ئاگرێ رەحەتە پاشی دێ هەر پیچ پیچە ئاگری خۆش كەن و درێكا هەردو چاڤیكاندا هەر ئاگری شارینن و پشتی بۆ دەمەكێ درێژ دمیننە دناڤ وی ئاگرێ شاریای دا، ئێدی ئاگری خۆش ناكەن و دێ مینن هەتا ئاگر دڤەمرێت و پاشی پشتی سار دبیت دێ ئامانێن گلینەیی هیننە دەر [٣].

## ژێدەر

١. مینا سێپێكایە و قازان ددانانە سەر.
٢. ئەو گومتلێن گرۆڤرین بەنیشتی نە كو ب دارێ ڤە، یان ژی ژ دارێ دكەتنە عەردی.
٣. بۆ پیشەسازییا چێكرنا گلینەی مفا ژ ڤان هەردو ژێدەران هاتییە وەرگرتن.


- وارهێل سەرگەلی، ئامانێن ئاخێ ل درگنێ، گۆڤارا دهۆك، ژمارە ٢١، سالا ٢٠٠٣، بپ٥١- ٥٤.
- جەمیل محەمەد شێلازی، كارسازێ پیشەیێ ئامانێن ئاخێ ل دەڤەرا ئامێدیێ (دیدار)، گۆڤارا ئاسۆی فۆلكلۆر، ژمارە ٢١، سالا ٢٠٠٦، بپ٩٦- ١٠٠.
- بەكر عەبدولكەریم كۆڤلی، كارسازیا كوردەواری، (دهۆك: ٢٠٠٤).

# راڤ و نێچیر ل پارێزگەها دهۆکێ

خالد سالح

پێزانین ل سەر دەمێن دەستپێکی یێن نێچیرێ دناڤ مرۆڤاندا گەلەك دکێمن، چ خەفك و تەلهە نەهاتینە دیتن كو وێ چەندێ پشتراست بكەن، لێ فیلێن ب رِمان هاتینە هنگافتن هاتینە دیتن، هەروەسان هەستیکێن گیانداران كو شوینێن درێن رِمان ل سەر د دیار دیتینە. دیسان بەلگە ل سولوتری ل فەرەنسا هەنە كو مرۆڤان هەسپ نەچارکرینە خۆ د فرەكە كەڤراندا ب هاڤێژن. گیاندارێن كەلەخ مەزن بەری ۳۰۰ هزار سالان هاتینە نێچیرکرن، یان دبیت بەری پتر ژ ملیون سالان ژی هاتبیتەکرن و یا هاریکاریا وان کری بۆ نێچیرێ کەلەخێ مەزنێ گیانداران بخۆ بوو.

پشتی مرۆڤ فێری نێچیرێ بووی، رِمێن سەر تیژ و پێشکەتی و جۆرێن دی یێن چەکێ نێچیرێ دروستکرن، بۆ نموونە رِم و جۆرێن رِما ل بەری (۱۵۰۰۰) سالان هاتینە داهێنان و تیر و کڤان ل بەری (۱۱۰۰۰) سالان. وەسان دیارە وەرارا رێکێن نێچیرکرنێ ل دوماهیا چەرخێ بەستی دەستپێکرییە[1].

## نێچیر وەکی پەیڤ:

ئەڤ پەیڤە وەکی د فەرهەنگا مابی دا هاتی دبێژیت:

نێرچیر: راڤ، گرتنا تەیر و تەوال و حێوانا.

نێرچیرڤان: کەسێ کار و شۆلێ وی راڤ بیت.

نێرچیرڤانی: کارێ کرنا راڤێ.

نێرچیربوون: راڤبوون.

نێرچیربووی: راڤبووی.

نێرچیرتر: راڤبوونتر، راڤتر.

نێرچیرکرن: راڤکرن[2].

نێرچیرکری: راڤکری .

راڤ: نێرچیر؟

راڤچی: نێرچیرڤان[3].

نێچیرکرن، یان نێچیر هنگافتن وەکی ئیدیوم واتە ئارمانج هنگافتن، گەهشتن ب ئارمانجێ، نێچیرگرتن، یان دەستکەفت ب دەستڤەهینان[4].

نێچیرا ژ دەست فری، واتە ژ دەستدانا دەست کەفتیێ[5].

## نێچیر ل نك كوردان:

هەلبەت نێچیر ئێك ژ پیشە و ئارەزوویێن کەڤنێن خەلکێ کوردستانێ نە و سروشتێ وێ و هەبوونا جۆرێن گیاندارێن جودا ئێکا هند کرییە کو ئەڤ کارە بهێتە کرن و گەلەك رۆژهەلاتناسان ئاماژە یا ب کوردان و نێچیرێ کری، مینا نیکیتین و توما بوا و فریزەر و هاملتون و مستر ریچ و...، بۆ نموونە

باسیل نیكیتینی وێرەكی و زیرەكییا كوردان د نێچیرا گیاندارادا دیار كرییە و گۆتییە: (كێم جاران فیشەكا وان پەز كیڤیا ناهنگێڤیت) و توما بوا ژی دبێژیت كو كورد حەز ژ چۆلی و ژدەرڤە دكەن و نێچیر ژ ئارەزوویێن وان یێن پێشەكی نە و (نێچیرڤانەكێ شەهرەزا و سەگڤانە و نێچیر ئارەزوویا وی یا ئێكێ یە و هەڤالێن خۆ ژی داخواز دكەتە سەر ئاهەنگا نێچیرێ و كوردستانێ مشە گیاندارێن درندە، مینا هرچ و گورگ و حەفتیار و ریڤی و بەرازێ كیڤی لێ هەنە). فریزەر ژی ئاماژە دكەتە نێچیرێ ل دەڤەرا سلێمانیێ و كا چەوان خۆ بۆ نێچیرێ بەرهەڤ دكەن. دیسان هاملتون ژی سالۆخەتا نێچیرڤانێن كورد دكەت دبێژیت:

(نێچیرڤانێن كورد یێن شەهرەزا خۆ د ناڤ خۆ ژی دا د كێم ئاخفتنن و وەكهەڤییەك دناڤبەرا وان و گاڤانێن چیا ل ئسكوتلەندا دا یا هەی، دیسان پێدا دچیت و دبێژیت: (ب گەلەك رەنگان كورد و ئاشووریان وەكهەڤییەك یا دگەل ئسكوتلەندیان هەی).

مستر ریچ ژی د یادداشتێن خۆدا ل سەر نێچیرێ ل دەستپێكا سەدسالیا نۆزدێ ل میرگەها ئامێدیێ و ل سەر پاشایێ ئامێدیێ نڤیسییە دبێژیت:

(دەمێ دەردكەتە نێچیرێ جلكێن خۆ ل جهێن نێچیرێ وەكی كەسێن سادە ژ خەلكێ چیا د گوهارتن، سەردكەتە چیایان و خۆ بەرددا عەردی ل هیڤیا پەزكیڤیا بوو و هەچییا ژیێ وێ ژ چوار سالان كێمتر نەدكوشتن و كەسێن شەهرەزا ژ دوور ژ شاخێن وان ڤێ چەندێ دزانن. ئەڤ جۆرێ نێچیرێ، و نێچیرا ب داڤا و تەلها و ب تڤەنگان و گرتنا كەوان ب تەیرێن بازی، وەرزشا ئێكانە بوو ل دەڤەرا ئامێدیێ، چونكی دەڤەرەكا چیایی یە و نەشێن نێچیرا ل سەر پشتا هەسپان بكەن)[٦]. ڤێ دەڤەرێ تا نها ژی شوینوارێ هندە چەپەرێن نێچیران لێ ماینە مینا چەپەرێ سەرێ گەلیێ ئیسفكا ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە، نێزیكی (٦كم) ژ سەرێ ئامێدیێ یێ دوورە[٧] و چەپەرێ پاشای ل سەرێ گەلیێ هرمیا ل گوندێ بۆتیا و (٤كم) ژ سەرێ ئامێدیێ یێ دوورە[٨]، ئەڤ هەردو چەپەرە یێ ل سەرێ چیایێ مەتینی و نێزیكی باژێرێ ئامێدیێ نە. ژبلی چەندین چەپەرێن دی، كو دیرۆكا وان ژی ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ بەهرەم پاشای كو ئەو ژی نێچیرڤان بوو، ئەوێ ل سالا (١٦٩٥)ێ ژ دایكبووی، وەكی د پارچە سترانەكێ دا هاتی دبێژیت:

برەكا نێری و بزنا، ل كاڤلە میرا ڤەرەسیا چیاكێ مەتینا

جابەكێ ل (براهیم پاشایی) ڤەگێرن، دا بێتە چیا دا خلاس نەبنەڤە، دلێ بابیز، ل جهكێ بەهدینا[٩].

نە هەر بتنێ بەهرام پاشای نێچیر دكر، بەلكێ كورێن وی (ئالیخان بەگ و ئیسماعیل پاشا)ی ژی ئەڤ كارە دكرن، د پارچە سترانەكا فلكلۆری دا ناڤێ (ئالیخانی) هینای دبێژیت:

دێ بیێنێ ئەو كەیف و ئەشق و
نێچیرێت خاجە ئالیخان بەگێ نە
بێت دزڤرێتەڤە
ژ حەراما چیایێ مەتینا[١٠].

ژبلی ڤان چەپەران هەتا نها ژی شوینوارێن چەپەران ل چەندین گوندان هەنە، هندەك ژ وان دكەڤنن و هندەك نوی ب بەردەوامی دهێنە ئاڤاكرن. هەژی ئاماژێ یە كو دو جۆرێن چەپەرا ل دەڤەرا بەهدینان هەنە:

ئێك: چەپەرێن پەز كیڤیا، كو چەپەرێن گشتینە و هەر كەسەكی مافێ هەی تێدا نێچیرێ بكەت.

دو: چەپەرێن كەوا، كو چەپەرێن تایبەتن و ب تنێ وان كەسێن ئەو چەپەر دروست كرین مافێ هەی تێدا نێچیرێ بكەن.

### ئارمانج ژ نێچیرێ:

وەكی ئاماژە پێ هاتییەكرن سرۆشتێ كوردستانێ دەهان جۆرێن گیاندار و فرندان دناڤ خۆدا هەمبێز دكەت، كەسێ كورد ژی هەر د كەڤن دا بزاڤا كری وان گیاندار و فرندان ب رێكێن جودا و بۆ مەبەستێن جۆرا و جۆر نێچیر بكەت، چونكی هەر كارەكێ دهێتە كرن بێگومان ئارمانجەك یا ژێ هەی، نێچیرێ ژی گەلەك ئارمانج ژێ هەنە، وەكی:

١- وەکی رێکەکا ژیانێ و پەیداکرنا نانێ رۆژانە، ڤێجار چ ئەو نێچیر بۆ خوارنا گۆشتێ وی بت و چ ژی بۆ فرۆتنێ بیت. هەلبەت پێ ئەڤ ئارمانجە هەبیت دڤێت رۆژانە ڤی کاری بکەت ئەگەر دێ مینتە برسی و ئەڤە دبیت یا گونجای بیت بۆ دەمێن بەرێ، لێ بۆ نها دەست نادەت، چونکی بارێ ژیانێ پێ هاتییە گوهارتن و نها کەس پشتا خۆ ب نێچیرێ گەرم ناکەت.

٢- وەکی ئارەزوویەك ئەوێن وەکی مژویلاهی ڤێ چەندێ دکەن، هەر ب تنێ ل وان دەمان دکەن کو دبێ کار و نزانن دێ چ کەن، یان وان گیانداران دبەن و شەران پێ دگەل توخمێ وان بخۆ دکەن، ب تایبەت کەوان، ژ بەر کەو وەکی دناڤ کوردان دا دبێژن (کەو دوژمنێ سەرێ خۆیە). لێ ل هندە جاران دێ بینین هندەك ئێکجار حەز ژ ڤێ ئارەزوویێ دکەن و نەشێن دەستبەرداری ڤی کاری بن. ل سەر ڤێ چەندێ دکەڤندا دبێژن پاشایەکی بریار دابوو کو نابیت ب چ رەنگان نێچیر بهێتەکرن و یێ بچیتە نێچیرێ سەرێ وی دێ هێتە لێدان، ئێدی کەس نەوێرا بچیتە نێچیرێ ژبلی ئێکی نەبیت رۆژانە ب دزیڤە دچوو و دگۆت کو سەرێ من ژێڤەکەن ژی ئەز نەشێم بهێلم، دڤێت هەر کەلا دلێ خۆ دارێژم. دبێژن جارەکێ ل چیای ل نێچیرێ بوو و دەنگێ تڤەنگا وی هات و هەمی پێ هایدار بوون، پاشای ژی زانی و گۆت هەرن بگرن. هەر وێ گاڤێ چوونە چیای گرتن و ئینانە کۆچکێ، ئینا پاشای گۆتێ: تە بۆ وەکر و بێ ئەمری من کر؟.

گۆت: پاشا ئەز نەشێمە خۆ، تۆ چ ل من دکەی وەبکە. ئینا پاشای گۆتێ:

ئەز دێ شەرتەکی دانمە بەر تە، ئەگەر تە کر ئەڤە چیا و نێچیر ل بەر تە، لێ ئەگەر تە نەکر دێ سەرێ تە برم. دبێژن پاشای پێنج فیشەك دانە ڤێ و گۆتێ دڤێت تۆ بۆ من پێنج کیڤیا بکوژی و هەر پێنجا ل بستیکا دلێ وان بدەی.

وی ژی گۆتێ: باشە.

پێنج فیشەك ژێ وەرگرتین چوو چیای، دبێژن پێنج کیڤی پێ کوشتن و پشتی هاتین بەرێ خۆ داینێ، بستیکا دلێ هەر پێنجا یا قەتاندی، ئینا پاشای تڤەنگەکا لاو دا ڤێ و گۆتێ:

ئەو تۆ و ئەو چیا ب بەرتەڤە[11].

٣- گەلەك جاران ڤی کاری وەکی مێرانی دزانن و پەسنێن خۆ دکەن و ناڤا ل خۆ ددەن کا ئەو چەند د سەگڤان و چەوان نێچیرێ دکەن. بۆ نموونە ل گوندەکی کەسەکی پلنگەك کوشت، لێ هەر زوی مەزنێ وان زانی و گۆتێ خۆ بێ دەنگ بکە و تە چ پلنگ نە کوشتینە مە پێ کوشتی، تۆ نە ئەو زەلامی پلنگا بکوژی.

٤- هندەك گیاندار ژ بەر زیانێن وان دهێنە نێچیرکرن، بۆ نموونە گورگ و ریڤی و بەراز و سڤۆرە و کێرویشك و هرچ و ... هتد کو گەلەك زیانان دگەهینینە دەرامەتی و تەرش و کەوالی.

## دەمێن نێچیرکرنێ:

هەلبەت هەر جۆرە بالندەك و هەر جۆرە گیاندارەکی دەمێن تایبەتێن نێچیرێ هەنە، ئەو چەند ژی دمینتە ل سەر چەند هۆکارەکان کو وێ چەندێ دەستنیشان بکەن، ب تایبەت برس و تێهن و گوهنێلی، کو ئەڤە ئەگەرێن سەرەکی نە بۆ دەستنیشانکرنا دەمێن نێچیرێ و هندە رێك هەنە کو نێچیرێ بۆ نك خۆڤە بکێشیت و بێخیتە تەپك و داڤێن خۆ، بۆ نموونە:

- **دەمێ جۆتکێ**: ئەو دەمە کو پێ نێرێ کەهی ل مال گازی دکەت و وەکی نێچیرڤان دبێژن پێ مێ پێ کیڤی بەرێ هەڤالێ خۆ پێ نێر پێ کیڤی کو دگەل بوویە جۆتك ددەتە وی نێری و د ئەنجامدا دکەڤیتە داڤان و ئەڤ جۆرە نێچیرە باراپتر ل بەری دەمێ هێککرنێ دهێتە ئەنجام دان و پتر ل بهارێ یە، نێچیرڤان ڤێ چەندێ ب دەلیڤە دبینت دا پێ مێ پێ نێر راکێشتە نك جهێ نێچیرێ و بێخیتە داڤێن نێچیرڤانی، ب تایبەت کەو و سیسکان.

- **نێچیرا کانییان**: باراپتر ل هاڤینان دهێتە ئەنجامدان، نێچیرڤان داڤان ل وان جهێن کانی لێ هەین ڤەددەن و دەمێ بالندە تێهنی دبن و قەستا وان کانییان دکەن دکەڤنە داڤان.

- **نێچیرا بەر کەڤزا:** دیسان پتر ل هاڤینان دهێتەکرن دەمێ پێشك دەردکەڤن و کەو ژبەر پێشکا ناحەوینن و دچنە جهێن تۆزگەڤزکێ دا پێشك نەهێنێ و ژێ دوورکەڤن.

- **کەوێ بارێ:** ل پاییزان ژی کەوێ بارێ یە، نێرە کەوی دانن و کۆما نێرە کەوان (رەڤێن وان) دهێن و دکەڤنە داڤان، یان ب سیتان ژی دهێنە نێچیرکرن.

- **نێچیرا لیسا:** کو پشتی ب رۆژ جهێن کەوان دیار دکەن، ب شەڤ قەستا جهێن وان دکەن و دکوژن (شەڤیار) و ئەڤ جۆرە نێچیرە پتر ل زڤستانان دهێتە ئەنجامدان.

- **کارە کەو:** دیسان ل زڤستانان دەمێ گەلەك بەفر دکەڤیت و کەو د شەپرزە و د بێ هێز دهێتەکرن کو خەلك ب هەڤرا دچنێ و ژ بێ چارەییا کەوان ب دەست دهێنە گرتن.

-**نێچیرا پەزکیڤیا:** هەر دیسان پەز کیڤی ژی دەمێن نێچیرێ هەنە، ل هاڤینان ل بەر کانییان و دبێژن پەز کیڤی ل پشتی ستێرا گەلاوێژ دەردکەڤیت ژنوی قەستا کانییان دکەت، ل پاییزان ژی چەپەرا ددانن د زێرەڤا و رێکێن واندا و دکەڤنە بەر ستێرکێن نێچیرڤانان. ل زڤستانان ژی نێچیرڤان پتر ل گوڤکێن وان دگەرێن و ئەو جهێن دچنە تێدا، دیسان ل پشتی (١٨) هەیڤا دووازدە ژی ل دەمێ پەز کیڤی بۆ گوهنێلیێ ب ناڤ ئێك دکەڤن ل گەرا کیڤیا دچنێ[١٢] .

- **تەپکان** باراپتر بۆ جۆرێن چویچکان ل دەمێ بەفرێ کو ئەرد سپی دبیت ڤەددەن، دەمێ جۆرێن چویچکان ل دووڤ خوارنێ دهێن دکەڤنێ[١٣]. هەر دیسان کێرویشکان ژی پتر ل زڤستانێ دچنێ و نێچیرڤان دبێژن کێرویشك ل ژووردانی نەشێت خۆش بچیت چونکی پێن وی درێژترن ژ دەستێن وی و گەلەك جاران ئەڤ نێچیرڤانێن ل دووڤ کێرویشکان ل سەر بەفرێ دبەزن، چاڤێن وان ژبەر رۆناهییا بەفرێ خراب دبن، لەوما ل نها گەلەك بەرچافکان دکەنێ، لێ دبەرێ دا هێلەکا تەنیێ ل بەر چاڤێن خۆ دکێشان و ئەو چەند ژی دبوو هاریکار کو چاڤێن وان خراب نەبن، یان ژی هندەکان هەر ژبۆ ڤێ مەبەستێ چاڤێن خۆ کلددان[١٤].

هەلبەت ژبلی ڤان دەمان دبیت هەر دەلیڤا نێچیر ب دەست نێچیرڤانی بکەڤیت، خۆ ژێ نەدەتە پاش و نێچیرا خۆ بکەت.

**جۆرێن نێچیران:**

ل دووڤ وێ سرۆشتێ ل کوردستانێ هەی و ئەو گیاندارێن تێدا دژین، نێچیرێ ژی گەلەك جۆر هەنە، و ژ وان:

گیاندارێن ل دەڤەرێ دهێنە نێچیرکرن:

١ - راڤە ماسی، کو ب سولتا و شۆکا و تۆرا و... گەلەك رێکێن نوی ژی دکەن.

٢- ریڤی و کێرویشك، کو ب تەلهە و جفت و تڤەنگ و تاژییان دکەن.

٣- بەراز و قوربەشك کو پتر ب شەڤ دهێتەکرن و ئەوێ ب ڤی کاری رادبیت دڤێت یێ شەهرەزا بیت کو سەمت و شین پێن وان بزانیت.

٤- پەز کیڤی و شفر و خەزال[١٥]، کو گەلەکا ب زەحمەتە، چونکی ئەڤ گیاندارە باراپتر دچنە جهێن ئاسێ کو زوی ب زوی مرۆڤ نەشێت ب گەهیتێ و نها ژ بەر وان نێچیران ئەو گیاندار گەلەك یێن کێم بووین و هندەك ژێ هەر ب تەمامی مینا شفران ژ ناڤچووینە.

٥- کەو و سیسك و پۆر و جۆرێن فرندان، کو ب داڤ و بێکانە و تۆر و گەلەك رێکێن دی دکەن.

٦- سیخور، کو باراپتر ل سپێدەهیان دهاتە ئەنجامدان[١٦].

٧- ژیژی ژی باراپتر ب شەڤ ل هاڤینان و ل بن دارێن توییان ب ساناهی ب دەست دهێنە گرتن.

## رێکێن نێچیرکرنێ:

هەلبەت رێکێن نێچیرێ گەلەکن و هەر جۆرە گیاندارەکی یان بالندەکی جۆرە رێکەکا تایبەت، یان چەند رێك ژ بۆ نێچیرێ هەنە، گرنگترین گیاندارێن ل دەڤەرێ دهێنە نێچیرکرن پەز کیڤی و کەون، ژ رێکێن نێچیرێ ل دەڤەرا بەهدینان ب رەنگەکێ گشتی ئەڤەنە:

**بێکانە (دارکێت بێکوانێ):**
ئەڤە ئێکە ژ وان رێکێن جۆرێن بالندێن بچویك (چویچکان) پێ نێچیر دکەن، تێدا دێ دارەکی (شڤکێ دارەکێ و باراپتر بیهۆکە پشتی سپی دکەن) ب درێژاهیا نێزیکی (٢٠-٣٠سم)یان درێژتر ژێ هینن و بێکانێ پشتی دکەلینن و سار دبیت پێ رادەن دا نیسەك بیت و دانە جهەکی کو مشە چویچك دهێنێ و ئێخنە درێکا وان دا، چ ل بەر کانییەکا ئاڤێ، یان ل سەر دارێن فێقی، یان هەر جهێ چویچك گەلەك بەرێ خۆ ددەنێ و ئێکجار کانییان دەمێ تێهنی دبن و قەستا ئاڤێ دکەن، ئێدی دەمێ چویچك دهێن و داددەنە سەر وێ شڤکێ پێڤە دمینن و ئەو جهێن ژێدەرێن ئاڤێ لێ د کێم جۆرێن چویچکان پتر لێ دهێنە کرتن ژێ، بۆ نموونە ل جهەکی ئێك کانی یا هەی و چویچکێن دەڤەرێ قەست دکەنی ب سەدان چویچکان و ژ جۆرێن جودا دکەڤنێ. هزرا ڤێ رێکێ نها بۆ گرتنا مشکان دناڤ مالان ژێ دا یا ل کارە ب (سیکوتین)ێ[17].

**تەپك:**
تێدا ئەرد ب کویراتییا نێزیکی (٣٠ - ٤٠سم) دهێتە کۆلان و هەر چوار رەخێن کۆرکێ ب بەرێن حلوی دهێنە نژاندن، پاشی دارەکێ سەرێ وی دو چقل دهینن ددانە سەر لێڤا کۆرکێ و حەلانەکێ بچویکێ مەزنتر ژ فرەهیا دەرێ کۆرکێ دهینن ب رەنگەکێ بەروارکی هەر ل هنداڤی کۆرکێ ددانە سەر وی سەرێ دو چقل، ئێدی جهێ تەپکێ ب دەخل و دانی و ب کایێ رەش دکەن، دەمێ چویچك و بالندە نێزیکی وی جهی دبن، دار دکەڤیت و نێچیر دمینتە دبن حەلانی دا دناڤ کۆرکێ دا. هندە جاران رەخ و رووبێن تەپکان پەرژان دکەن دا بالندە نەچار بیت و د وێ رێکێ را دەرباز ببیت و د کەڤیتە تەپکێ.
گەلەك جاران و ژ بۆ کەنیێ و ترانە پێ کرنێ، ب تایبەت ئەگەر بزانن یێن کێ نە هندە تشتان دکەنە دبنڤە و ئەو تشت گەلەك جاران دبیسن[18].

**دێمجامە (دێمجانە):**
ئێکە ژ رێکێن کەڤن بۆ نێچیرکرنا کەوان، یان هندە جاران سویسکان ژێ، دێمجامە پەرۆکەکێ ڤەبی یێ چوارگۆشە، یان لاکێشەیی یە و باراپتر ب رەنگێ ئاخێ یە ب ڤەبارێ مێترەکێ یان چەندەکێ فرەهتر (یان گەزەکێ هەتا گەز و نیڤان). وێ دێمجامێ ب چوار داران پەروازدکەن دا خۆ بگریت، هەروەسان دو داران ب نیڤەکا وی ڤەدکەن وەکی دەستك دا بشێن ساناهی هەلگرن. پاشی چەند پارچێن پەرۆکێن رەنگاو رەنگ ژ وێنەیێن مارا و دوبپشکا و گیاندارێن درندە ل سەر وی پەرۆکێ مەزن ددەن و چەند کونەکان دهێلنە ل پەرۆکی بۆ دیتنێ و دا پشت پەرۆکی ببینن کا چ هەیە و دیسان دا بشێن جفتێ تێرا ب هاڤێژیت؟. ئێدی دەمێ نێچیرڤان ب جفتا خۆڤە کەوان ل پشت وێ دێمجامێ د وان کونکانرا دبینت، پیچ پیچە خۆ نێزیك دکەت، کەو ژێ ل بەرامبەر دەنگی ژ خۆ دهینن، دبیتە قب قبا وان و پیچ پیچە ل هەڤ ڤەدجەمیێن، وەسان نێچیرڤان ب ساناهی دێ شێت جفتەکێ بەردەتێ و دێ شێت پتر کەوان ب ئێك جفت نێچیر بکەت و بکوژیت[19].

**کارە کەو:**
ئێکە ژ وان رێکێن کەوان پێ ل زڤستانێ دگرن، ل دەمێ گەلەك بەفر دباریت و رەشی چەند رۆژەکان ل دووڤ ئێك نەمینتە ل ئەردی، کەو گەلەك برسی و شەپرزەدبن، دڤان دەمان دا گەلەك کەس ژ خەلکێن گوندان خۆ ددەنە ئێك، خۆ ل وان جهێن کەو لێ هەبن بەربەلاڤ دکەن و کەوان رادکەن و د ئێك دەمدا هێرشێ ب دار و بەرا و هەر تشتێ ددەست واندا دکەنە سەر و هێل هێلێ و دەنگە دەنگێ ژ خۆ دەرتێخن، کەو ژێ دترسن و هەر درەڤن، و چونکی کەو یێ برسی یە و ژ سەرما هەر پرا ل خۆ ددەن، لێ ب ساناهی ژ ناڤ بەفرێ دەرناکەڤن، ب تایبەت ئەگەر بەفر یا نەرم بیت و دناڤدا بچنە

خوار و هەتا دەردکەڤنەڤە گەلەك د واستیێن و شەپرزە دبن و ب ساناهی دکەڤنە ددەستێن کۆمێن نێچیرڤاناندان، لێ ئەگەر کورشە بیت کەو ب ساناهی ل سەر دچیت و زوو ب زوو نا واستیێت و ناهێتە نێچیرکرن. د ڤێ جۆرێ نێچیرێ دا دشیان ژمارەکا مەزنا کەوان بگرن و ل دڤەرێ دبێژنە ڤێ رۆژێ (کارە کەو). ئەڤ جۆرە راڤە ئێکە ژ وان رێکێن زیانبەخش و دژوار بۆ ژینگەهێ، چونکی ژمارەکا مەزنا کەوان تێدا ب ساناهی ژ ناڤ دچن [20].

## دەری (سیتە):

ئێکە ژ وان رێکێن کەوان پێ نێچیر دکەن، هزرا وێ یا د وێ چەندێ دا کو کەوان بێخنە دکۆرکاندا، ئەو ژی یا پێك هاتییە ژ دوو دەپێن تەنك مینا دەرگەهێن خانییان، دئێخنە بەرێك ب درێژاهیێن دەرێن کۆرکان، واتە نێزیکی (١٥×٣٠سم) یان پتر و هەردو رەخێن وان موکم گرێددەن کو ژ بەرێك نەچن، لێ نیڤەکا وان، واتە ئەو جهێن دەپ دگەهنە ئێك دهێت و دچیت دا کەو پێ بکەڤنە تێدا، پاشی ددانە سەر کۆرکان، لێ ئەو دەرگەهـ (هەردو دەپ) دکەڤنە سەر کۆرکێ و هەر دەمێ نێچیر دکەڤیتە سەر، هەردو لایێن ژناڤدا ژ دەرگەهی ژ بن پیا دچنە دناڤدا و نێچیر دکەڤیتە دکۆرکێ دا و جارەکادی سەروبەرێ وەردگریتەڤە کو بگەهنە ئێك ڤەو بکەڤیتە سەر نێچیرێ و نێچیر دمینتە دبنڤە.

لێ چەوان دێ بەرێ نێچیرێ (کـەوان) دەنە وان دەریان؟

هەلبەت نێچیرڤان پشتی کۆرکان چێدکەن دێ رابن پەرژانەکی دروست کەن و دناڤبەرا هەر چەندەکێ دا دەریەکی دروست دکەن، ئەو دەری جهێ وان کۆرکانە کو دانن، و ل ڤێرە نێچیرێ بڤێت و نەڤێت دێ دوان جهانرا دەرباس بن و وەسان دهێنە نێچیرکرن [21].

## داڤ:

داڤ پێکهاتییە ژ (١٠٠ - ١٥٠) دارکێن ب درێژاهییا (١٠- ١٥سم) و ب ستویراتییا قەلەمی، ئەڤ دارکە ژ لایێ سەریڤە دهێنە قەوراندن مینا جۆکا لێ دکەن دا چلەی ل سەر گرێدەن و دسەردا نەهێتە خوار. دیسان بنێ ڤان دارکان (سنگان) تیژ دکەن دا د ئەردی را ب چوکلینن.

ئارمانج ژ ڤان داڤان ئەوە کو فرندان ب رەنگەکێ گشتی و کەوان ب تایبەتی پێ بگرن، کو هندە بازنان ب وان چلان چێدکەن، دەمێ پێ بالندەی دکەڤیتە د ئێك ژ وان بازناندا و ب رێڤە بچیت یان د فریت، ئەو چلە هەر دگەهیتە ئێك و رووبەرێ وێ بچویك دبیت تا پێ بالندەی دگریت و وەسان بالندە دهێتە نێچیرکرن و نەشێت خۆ رزگار کەت.

ل ڤێرە ئەگەر داڤ کەتە ستویێ وی بێ گومان دێ خەندقیت و مریت. هەژی ئاماژێ یە وەکی دبەرتووکا (سەرۆکانی) دا هاتی دبێژیت:

داڤەکا زراڤ دئێخنە وان دارکان کو دبێژنێ (ژەهـ)، ژەهـ: د بەرێ دا ژ رویڤیکا پەزی یا پیس دهاتە چێکرن و هندەکا ژ موویێ کوریا دەوارا و هەسپ و ماهینا چێدکرن، لێ نۆکە ژ چلەی دهێنە چێکرن، پشتی کو ژەهـ وان سنگاڤە ئاسێ دکر و دئێخستە د وی جهێ قەوراندی و گوگراندیدا یا بەرهەڤ بوو بۆ نێچیرێ [22].

## نێچیر ب داڤان:

نێچیرکرن ب داڤان گرنگترین رێکێن نێچیرێ نە و ل ڤان حالەتان دهێنە دانان:

- ل هاڤینان ل دەمێ گەرمێ، تەیر و تەوال ب گشتی گەلەك تێهنی دبن، لەوما نێچیرڤان ل نێزیکی رۆژئاڤا دا رادبن ب دانانا ڤان داڤان درێکێن ئاڤا دا، ب تایبەت ل بەر کانییان دا ل سپێدێ زوو دەمێ ئەو بالندە دهێنە سەر کانیێ بۆ ئاڤ ڤەخوارنێ پێن وان دکەڤنێ و دهێنە نێچیرکرن، ب تایبەت کەو و سیسك و تێژکێن وان. دڤێت نێچیرڤان ژی سپێدێ زوی بچیت نێچیرا خۆ ژێڤەکەت، چونکی ئەگەر زوی نەچیت دبیت ب خەندقن، یان ب هەر رێکەکا هەی خۆ قورتال کەت [23]، و بەیتا کەوا دبێژیت:

هەچیێ كەتە ل داڤێ
وەز بەزیمێ وێ گاڤێ[٢٤].

**نێچیر ب كەوێ رباد:**
رێكەكا بەربەلاڤە و دبیت ژ هەمیان پتر ل كاربیت، تێدا نێچیرڤانی دێ كەوەكێ زیرەكێ نێر و مەشقدای پێ هەی، دێ بەتە ئاڤاری ل جهەكێ كەو لێ هەین، دێ پێن وی ب دارەكی یان بەرەكی ڤە گرێ دەت و داڤان ل رەخ و دۆرێن وی راچنیت و دێ چیت خۆ ل جهەكی دوور ڤەشێریت و گوهێ وی دێ مینتە ل مەیدانكا نێچیرێ. كەوێ وی دێ خوینت و دەمێ كەوان گوهـ ل دەنگێ وی بیت ئەو ژی دێ ل بەرامەر خوینن و دێ هێنێ، دێ چنە ئێك و چنە ئێك ب نكلان و وەسان هندە كەو دێ كەڤنە داڤان و نێچیرڤان دێ چیت گریت و ئێخیتە دناڤ رِكەیێ دا[٢٥]، و ناڤێ كەوێ رباد یێ د بەیتا كەوا دا هاتی:
لێ بوو سیكێت حەدادا
حەرب و زەربا پێك دادا
شاپەر چوو سەر ربادا
رباد ڤەوی د غەدارن
خۆش ل وان بژارن[٢٦].

**كەوێ جەلاب:**
كەوەكێ دەنگ خۆشە، ئەڤ كەوە نە یێ بەردایە، بەلكی یێ د رِكەیەكێ دا و ددانە سەر بەرەكی، یان ب ناڤ دارەكێ ڤە د هەلاویسن و داڤا ل رەخ و دۆرێن وی د هەلچنن و دەمێ كەو ل دووڤ دەنگێ وی د هێن دیسان دكەڤنە وان داڤان، و د بەیتا كەوا دا یا هاتی:
جەلابی بانگ دگۆتە
عشقا دلێ من سۆتە[٢٧].

**كەوێ جەلاب و رباد:**
ل ڤێرە هەردو كریارا ب هەڤرا دكەن، كەوێ جەلاب دخوینت و یێ رباد یێ بەرهەڤە بۆ شەری و هەر دەمێ كەو دهێنە شەری د كەڤنە وان داڤێن ڤەدای.

**داڤ ل بەر بەلەكان:**
ل دەمێ گەلەك بەفر دباریت و ئەرد هەمی سپی دبیت، خودانێن داڤان هندە جهان رەش دكەن و داڤا ل بەر ددانن و هەر دەمێ كەو دهێن دكەڤنێ.

**داڤ ل بەر لیسێن كەوان:**
هەلبەت یێ كارێ نێچیرێ دكەت جهێن وان ژی باش دنیاسیت و دزانیت كا ل كویرێ لیس دبن، لەوما هندە جاران داڤان ل وان جهان ڤەددەت و كەوان دگریت.
- ل زڤستانێن بەرێ دەمێ بەفرێن زۆر دبارین و رەشاتی نەدما ل ئەردی، برێن زەرزیریا دهاتن و گەلەك كەسان (نێچیرڤانان) هندە ئەرد رەش دكرن و تۆمك ددانانە سەر و داڤ ل بەر ددانان، وەسان هندە جاران ب دەهان ئەو رەنگێ چویچكان ژی دگرتن.

**چەپەر:**
ل رۆژێن بەفر هندە جهان رەش دكەن و نێچیرڤان خۆ ل پشت چەپەران ڤەدشێرن و هەر دەمێ كەو دهێنە جهێ رەش، ئەو جفتا، یان تڤەنگان بەرددەتێ و دكوژیت.

**شەڤیار:**
ئەو نێچیرە یا ل شەڤێن گەلەك تاری بۆ گیاندارێن بچویك و ب تایبەت كەوان دهێتە كرن، نێچیرڤان ب شەڤ رۆناهیيەكێ (لایتەكێ) دبەن و دچنە وان جهێن دزانن ئەو گیاندار یێن لێ، دەمێ دگەهنە ویرێ لایتان دئێخنە چاڤێن وان، چاڤێن وان ژی تاری دبن و نەشێن ب رەڤن، ئێدی نێچیرڤان دێ نێچیرا خۆ ب دارەكی یان جفتەكێ یان هەر تشتێ دی دێ كوژیت. لێ مەرجە دونیا تاڤە هەیڤ نەبیت، چونكی ل ڤان جۆرە شەڤان نێچیر نێچیرڤانان دبینن و ژ بەر درەڤن[٢٨].
لێ ئەگەر ل ڤان شەڤیاران ڤیان وان فرندان بگرن، ب تۆرا (شەبەكا) ب ڤی رەنگی دگرن:
ل بەراهیێ تۆرێ ب ڤی رەنگی دروست دكەن:
دێ رابن بازنەكی ب داری چێكەن و دەستكەكێ درێژێ

داری پێڤە گرێدەن و دێ ئینن تۆرەکێ کو ژ بەندکا چێدکەن و ب قەبارێ وی بازنەی ل دۆر ئالینن و مینا تیرکا پێڤە ئاسێ کەن. بۆ نێچیرێ ژی ل رۆژێن سەرما و بەفر زێرەڤانیا وان فرندان دکەن کا دێ کیڤە بەرێ خۆ دەن دا پاشی ل دووڤ بچن. ڤێجار چ دشکەفتا ڤەبیت، یان ژی ل بەر کەڤرەکی بن کو بەفر نەگریت و تەیر ل وێرێ کۆمڤە دبن، نێچیرڤان ژی ب شەڤ تۆرێن خۆ دبەن و دچنە وان جهێن دەستنیشانکری و هەر دێ پیچ پیچ خۆ نێزیك کەن کو بزانن ئێدی دێ تۆرا وان گەهیتێ و ئێکسەر دێ هاڤێژنە سەر وان فرندان و بێ گومان هندەك دهێنە گرتن و هندەك ژی قورتال بن. ژ گرنگترین ئەوبالندێن ب ڤێ رێکێ دهێنە نێچیرکرن، کەو و سیسك و کۆترەشینك و تڤیرك و ...هتد[٢٩].

## شاقۆلك (لك):

یان هندەك دبێژنێ (لك)، ئەو ژی (ئامیرەکێ نێچیرا چویچکایە، ژ دوو داران و باراپتر ژ دارێ کناری کو دارەکێ ب ستری بە دهێتە چێکرن، بنێ وان دهێتە گرێدان و دکەنە د ئەردی را و سەرێ وان هەردو داران دێ بەنکەکی ئێخنێ و ئەو بەنك ب ئاوایەکێ تایبەت دهێتە گرێدان و ل ئێك دهێتە وەربادان و وەکی تەلیێ لێ دهێت و ئەزمانکەکێ داری دێ کەنە دناڤرا و دەمێ چویچك دهێت دا کو دادەتە سەر وی ئەزمانکێ داری دێ ژبەر پیا چیت و پێت چویچکێ دێ کەڤنە دناڤ وێ وەربادانا بەنکی دا)[٣٠].

## نێچیر ب مۆخل و بێژینگا:

ئەڤە ئێکە ژ وان رێکێن جۆرێن چویچکان و ب تایبەت سیڤاندۆکان پێ دگرن، پتر زارۆك ڤی جۆرێ نێچیرێ دناڤ مال دا دکەن، تێدا ل رۆژێن زڤستان، دەمێ بەفر دباری و دبوو سەرما و رەشاتی نەدما ل ئەردی، زارو دارەکێ درێژ ب درێژاهیا (٣٠ - ٤٠سم) دهینن و بەروارکی ب گۆشەیەکا تیژ ددانە بن بێژینگەکێ، یان سەرادەکێ و وی جهی ب دانانا هندە تۆمکی و کایێ رەش دکرن، پاشی بەندکەکێ درێژ ب بنێ وی داری ڤە گرێددەت، کو سەرکێ بەندکی ددەستێ زارۆکی دا بیت و ئەو بچیت خۆ ل پشت نهانییەکی ڤەشێریت و ب دزی ڤە بنێریتە سەر و بەرێ وی جهی کا چویچك دێ هێنە بن یان نە؟ دەمێ دبینت چویچك هاتنە بن، بەندکێ خۆ دکێشیت و دار ژ بن بێژینگێ دچیت و بێژینگ دکەڤیت و چویچك دکەڤنە بن بێژینگێ.

## تەلهە (تەلی):

ڤی جۆرە نێچیرێ ژبلی کو نێچیرە گەلەك جاران ل بەر رەزا و وەرزێن گوندۆرا و هەر جهێ گیاندارێن زیان بەخش دچنێ و زیانێ ل دەرامەتی ددەت ڤەددەن، ئەو ژی پێکهاتییە ژ دو نیڤ کڤانێن ئاسنی و ژ لایێ بنی ڤە هەردوك پێکڤە د ئاسێ کرینە و ب بەندکەکێ (زنجیرەکێ) پێ گرێدایە و ئەو زنجیر یا ب بەرەکی ڤە گرێدایە دا کو ئەگەر گیاندار هاتە نێچیرکرن وێ تەلهێ دگەل خۆ ببەت، چونکی گەلەك جاران گیاندار پێ شیای تەلهێ دگەل خۆ ببەت. ئەو هەردو کڤان د گەهنە ئێك و پێن گیانداران، یان هەر ئەندامەکێ دی یێ لەشێ وی و ب تایبەت حەفکا وی د کەڤیتێ و دهێنە نێچیرکرن، هەر چەند ئەگەر حەفکا گیانداری کەتێ باراپتر د مریت. هندە تەلهە هەنە سەرێ وان مینا دندکێن سەر تیژن دا کو دەمێ هندە گیاندار دکەڤنێ پێن وان د هەستیکی را بشکێنن، ب تایبەت گیاندارێن ب هێز و درندە مینا گورگان.

ژ گرنگترین ئەو گیاندارێن ب تەلهان دهێنە گرتن گورگ و پەزکیڤی و کێرویشك و حەفتیار و ریڤی و گەلەك گیاندارێن دی کو هندە جاران خۆ سە ژی دکەڤنێ[٣١].

## قۆسك (لاستیك):

قۆسك دارەکێ کورتە نێزیکی (١٥سم) یێ درێژە و دوو چق مینا پیتا (Y)یا ئنگلیزی یێن پێڤە و هەردو سەرێن وی ب دو چۆپێن تایران، یان چەند داڤێن لاستیکی پێکڤە گرێداینە و هەردو سەرێن دی دێ ب کەڤلەکی ڤە هێنە گرێدان. ڤێ نێچیرێ پتر

زارۆك دكەن، تێدا دێ بەرەكی ئێخنە دناڤ وی كەڤلی دا، ب دەستەكی كەڤلی ب بەرڤە كێشێت و ب دەستێ دی دێ بنێ وی دارێ دو چق موكم گریت و پاش دێ كەڤلی بەردەت، بەر دێ چیت فڕیت و ب نێچیرێ كەڤیت، نێچیر ژی باراپتر جۆرێن چویچكانە، ب تایبەتی سیڤاندۆك، یان هندە جاران گیاندارێن مەزنتر ژی، مینا سڤۆران و هەر جۆرە گیاندارەكێ نە گەلەكێ مەزن بیت[32] .

**خەفك:**

هزرا چێكرنا وێ هەر مینا تەلهانە، لێ ئەڤە بچویكترن و ژ تێلێن رەق بۆ نێچیركرنا گیاندارێن بچویك و ب تایبەت چویچكان دهێنە دروستكرن و دەمێ دهێتە ڤەدان هەردو نیڤ بازنێن تێلێ دبنە بازنەكێ تەمام و دەمێ دشەقیێت و نێچیرێ دگریت جارەكادی دبنە نیڤ بازنەڤە[33].

**نێچیرا تەیرێ بازی:**

بازی بالندەكێ بها گرانە، دبیت ئەڤ جۆرە نێچیرە ل دەڤەرێ گەلەكا كێم بیت، لێ وێ ژی نێچیرڤانێن خۆ هەنە، ڤی بالندەی ب رێكێن تایبەت نێچیر دكەن و پشتی هینگێ وی پەروەردە دكەن كا دێ چەوان نێچیرێ كەت.

**نێچیرا بەرازان:**

وەكی دیار پتریا كوردان موسلمانن و ئەڤ نێچیرە (وەكی خوارن) یا حەرامە، لێ ژ بەر كو ئەڤ گیاندارە پێ زیانبەخشە بۆ دەرامەتی و باغ و بیستانان تێك ددەت، لەوما خەلك گەلەك نێچیر دكەن و د كوژن. ل ناڤ كوردان ب رەنگەكێ گشتی بەرازی ب تڤەنگێ دكوژن، لێ دبیت هندەك داڤێن تێلا دروست دكەن كو ستویێ وان ب كەڤیتێ و تێدا د خەندقن، یان هندەك سا فێركەن كا دێ چەوان نێچیر كەن، یان سە جهێن وان ئەشكەرا بكەن و خودانێ تڤەنگێ ل دووڤ رەوینا وی بچیت و ب كوژیت، هەژی ئاماژێ یە كو بەراز باراپتر رەڤدەنە د گەل ئێك[34] .

**نێچیرا هرچان:**

هرچ دەهبەكێ ب ترسە، ژ وان ترسان و ژبەر وان زیانێن هرچ دگەهینتە دەرامەتێن خەلكی یێن چاندنێ و ب تایبەت یێن گوندان، خەلكی ئەو ب تڤەنگان د كوشتن و ب دەهان چیرۆك و سەرهاتی ل سەر ڤێ چەندێ هەنە، كا چەوان خەلكی خۆ ل هرچان داینە و ب لەپان ئەو كوشتینە، یان سەیان خۆ لێداینە و ب هاریكاریا خودانێ وی ئەو كوشتینە، هەروەسان چیرۆك و سەرهاتیێن كەڤن ژی ل سەر ڤێ چەندێ هەنە، بۆ نموونە سەرهاتییا خەتابێ مامیەزدینی، كو ب ڤی رەنگی هاتییە گۆتن:

دبێژن د چاخێ حوكمداریا (ئیسماعیل پاشایی) دا ل ئامێدیێ هرچەكێ خۆ ل گەلیێ هەسپا ل هنداڤی كانی بۆتكێ ئاسێ كربوو و ترسەك ئێخستبوو دەڤەرێ و دەنگ و بەحسێت هرچێ ل دەڤەرێ بەلاڤبوو، بەلێ كەسێ بۆ خۆ نەكرە خەم ل دووڤ بچیت و ب كوژیت.

دبێژن خەتاب ژ عەشیرەتا مزووریا زەلامەكێ دەستهەل و زیرەك بوو، سێ كور ب ناڤێن (سولەیمان، مەلاك، زالێ) هەبوون، ئەوی هزر د كوشتنا وێ دا كر دا ببیتە خودان مولك و ئەملاك، ئینا گۆتە كورێت خۆ ئەم دێ چینە كانی بۆتكێ، ئێك ژ هەوە بلویرێ ب ژەنیت و ئێك دهۆلێ ب قوتیت و ئەز ژی دێ دەست هاڤێژمە شیر و مەتالان و دێ رابمە رەقاسێ، ئەو دێ ل دووڤ شەهیانا مە هێت و گەلەك حەز ژ كەیف و سەمایێ دكەت، هوین ژێ نەترسن و ئەز دزانم دێ چ كەم.

دوو كورێت وی دەست دانە بلویرێ و دهۆلێ و وی ژی دەست دا شیر و مەتالان و قەستا كانی بۆتكێ كرن، ل وێرێ هەردو كورێت وی دەست دانە بلویرێ و دهۆلێ دەست هاڤێتنە ئاوازان و خەتاب ژی كەتە راست و چەپان و وەستیكا و گەرێن رەقس و دیلانان، بیستەك چوو نرنرا هرچێ هات و رابوو سەرپێ و هاتە دیلانێ و ئەو خەتاب د بەرێكدا هاتن و چوون، تا نابەینەكێ خەتابی شیرەك هاڤێتە دەستەكێ

وی و فڕاند، هرچ كەت و رابووڤە، هرچا سەر خلۆلە بوو ئاگەهـ ژ دەستێ خۆ نەبوو و جارەكادی رابووڤە و رابوو سەمایێ و نەزانی چ چێبوویە، خەتابی شیرەكێ دی هاڤێتە پییەكێ وی و فڕاند، هرچ كەت و نەشیا رابیتەڤە و خەتاب كەتە سەرێ وی ب شیران و كوشت و رابوو دا قەستا ئامێدیێ بكەت و مزگینیێ ب گەهینیتە میری، رێكێ ڤە ل سەر كانیا مەندێ چیرۆكا خۆ بۆ مەندێ گۆت، كەیفا مەندێ ژی هات و گۆت هەكە هەوە ئەو مزگینی گەهاندە میری و میری هوین ب زەڤی و ئاڤاران خەلاتكرن، بێژنێ ل نك مەندێ ب دەنە من، چونكی ئەز ژی یێ ب تنێ مە. وەسان مزگینی گەهاندنە میری و میری ئەو ب سێ زەڤیان (زەڤیا سەرێ تەكیایێ، زەڤیا شەلالێ، زەڤیا مالخرابا) ل بامەرنێ و سێ زەڤی ل تاژیك و ئاشەوا ژی خەلاتكرن[35].

هەر چەند هرچ گیاندارەكێ دڕندەیە، لێ گەلەك جاران دهێتە كەهی كرن و سەمایێ پێ دكەن.

**نێچیرا سڤۆران:**

سڤۆران ژی ب چەند رێكان دگرن:

- ئەگەر دونیا بهار بیت، جهێن وان ل دەمێ بەلگە چلوی دبیتە (گوە سڤۆرە) دەست نیشان دكەن و پشتی هینگێ تێژكێن وان دهینە دەر و ب خودان دكەن.

- ل زڤستانێ دەمێ سڤۆرە ل سەر ئێك مالیتە دبن دهینە دەر، شین پێن وان ل سەر بەفرێ دیارن و ل دووڤ وان شین پێیان دچن و سڤۆران ب تەڤركان دهینەدەر پشتی دەرێ كونێن وان د قۆقلێن دارارا فرەهـ دكەن، كو دارێ ب كەلێژن و هێلینین وان خراب دكەن. باراپتر دەمێ دهینە دەر سەرژێدكەن و دخۆن، یان ژی هندەك د حەبینن.

- ژ رێكێن دی یێن نێچیرا سڤۆران تەپكن، گویزا دكەنە دناڤ تەپكاندا و دەمێ سڤۆرە دێ چیتێ دكەڤیتە دناڤدا، لێ وەكی دیار دانێن سڤۆرەی دتیژ و دژوارن و گەلەك جاران دەمێ دەستێ ئێكی دگریت، هینگێ دراوەستیت تا ددانێن خۆ ب ناڤ ئێك بێخیت، لەوما دڤێت نێچیرڤان یێ هشیار بیت و دەمێ ژ تەپكێ دهینتەدەر، ل دەستپێكێ بەری ب هشیاری ل سەر راكەت و دارەكێ دو چقێ و درێژ ددانیتە سەر پاتكێ دا بشێت ژ پاتكێ بگریت و بینتەدەر[36].

**نێچیرا سیخوران:**

د ڤێ كریارێ دا دا سەلەمێشكەكا تەنگ هینن و خوارنەكێ كو سیخور حەز ژێ دكەن كەنە دناڤدا و داننە وان جهێن سیخور لێ هەین، دەمێ سیخور ل دووڤ وێ خوارنێ دچوو دا چیتە دناڤدا و ل دەمێ دێ دەركەڤیت پشت و پشت دەردكەڤیت، لێ زختكێن (شیشكێن) لەشێ وی دچنە دناڤ شفكێن سەلەمێشكێ دا و نەشێت دەركەڤیت و دهێتە نێچیركرن.

**نێچیرا ریڤییان:**

هەلبەت ژ بلی تەلهە و تڤەنگ و تاژیان گەلەك جاران ریڤی (كیژك ژی) ب كولندێن كەلاندنێ د گرتن، دا كولندەكێ ڤالاكەن و هشك كەن و دەرێ وی ب قایدا سەرێ ریڤی ڤەكەن و كەشكان یان گۆشتی كەنە تێدا و دانە وان جهێن ریڤی لێ هەین، دەمێ ریڤی ددیت دا سەرێ خۆ كەتە تێدا لێ نەدشیا بینتەدەر و كولند دگەل سەرێ وی رادبوو ڤە ئێدی دەمێ نێچیرڤان د هات دا ب ساناهی گریت. و وەكی كەنی د بێژن جارەكێ ریڤیەكی گەلەك زیانا ئێكی كربوو، وی ژی ئەڤ رێكە ل بەر ریڤی دانابوو، دەمێ سپێدێ هاتی و ریڤی د وی كراسی دا دیتی، ژ دلسۆتن گۆپالەك ل سەرێ وی دا كو د ناڤ كولندی دا بوو، كولند شكەست و بۆ دو قاف و ریڤی ب سلامەتی چوو[37] !! . ل ڤی دەمی ل شوینا كولندی دۆلكێن نایلۆنی ددانن كو تەمەت سەرێ ریڤی بیت كو بچیتە تێدا و نەشێت سەرێ خۆ دەربێخیت.

**نێچیرا سیسكان:**

هەلبەت سیسك باراپتر بۆ گۆشتێ وان دهێتە

نێچیرکرن و باراپتر ب رێکا داڤان ئەنجامدان، تێدا نێچیرڤان دێ سیسکێن مێ دناڤ رکەکێ دا ڤەشێریت و داڤان ل رەخان ڤەدەت، دەمێ یێ مێ دخوینیت یێ نێر ژی دێ دەنگی کەت کو دبێژنە دەنگێ وی وەهاندن و ل دووڤ دەنگێ وێ دهێت دکەڤیتە داڤێ[٣٨] و ل ڤی دەمی گەلەك جاران ل شوینا سیسکا مێ دەنگێ وێ دهێتە تووماردکرن و کەوێ نێر یێ دهێتە خاپاندن، چونکی گەلەك جاران یا بووی کو خودانی کەوێ مێ یێ بربیە نێچیرێ لێ نە خواندی یە.

## نێچیرا پلنگان:

وەکی دیار پلنگ گیاندارەکێ ب ترسە و ل دەڤەرێ هەبوو، لێ باراپتر یێ بەرزەیە و ل دووڤ گۆتنان دەنگێن وان ل چیایێ مەتینا هاتیبە بهیستن. ئەڤ گیاندارە هەر ب تنێ ب تڤەنگان د هاتە کوشتن و وەکی دیار هەمی گیاندارێن دی ژی ب تڤەنگان د هاتنە کوشتن، دناڤبەرا سالێن چلان و پێنجیان ئوسمان موسای، کو ژ دایکبوویێ دەستپێکا سەدسالیا بووری بوو، دو پلنگ دیتبوون، ئێك ژ وان ب تڤەنگێ کوشت و یێ دی چوو هنداڤی بەتەنێ، ئێدی ئەو نەکوشت نەکە ب برینداری بهێتە خوار و ب کەڤیتە نك وی. پشتی وێ رویدانێ گەلەك ژ مەزن و کەنکەنا چوونە نك و گۆتنێ ب تنێ بێژە فلان کەسی (مەبەست ژێ ئەو مەزنن) یێ کوشتی، تە چ دڤێت دێ دەینە تە، لێ ئەو رازی نەبوو کو ناڤەکێ مەزنە[٣٩].

## نێچیرا ژیژیان:

نێچیرا ڤی گیانداری پتر ب شەڤ ل بن دارێن تویا دهاتنە کرن، کو رۆناهیەك دبرن و د چوونە وان جهێن دار توی لێ هەین و ب ساناهی ب دەست دهاتنە گرتن دەمێ خۆ تێك دبرن و خۆ دکرنە گومتل، یان ژی هندە جاران عەرد ب قەدارێ تەنەکەکێ د کۆلان و تەنەکە دکرنە د عەردی را و هندە پیش د دانانە سەر، دەمێ د سەررا دچوو دکەتنە تێدا. لێ ل ڤێرە و پشتی دگرتن رەنگە دژوارییەك د سەرژێکرنا وی دا هەبوو، ل بەراهیێ ژیژی دکرنە د ئاڤێ دا سەرێ خۆ دەرێخیت و پشتی دەردئێخست شیژنەك دکرنە د دفنێ را دا نەشێت خۆ بکەتە گومتل ڤە و ژنوی سەرژێدکرن.

## نێچیر و کەڤنە باوەری:

دناڤ کورداندا گەلەك کەڤنە باوەری ل سەر نێچیرێ هەبوون، بۆ نموونە:

دەمێ بچویکەك دگەل بابێ خۆ بچیتە نێچیرێ، بەری بچیت دەیکا وی دێ هوسکیکەکی ل ق ... وی دەت، دا وەکە ئەو دبێژن نەهێتە چاڤین کرن[٤٠].

هەر دیسان دەمێ نێچیرڤان چ نێچیران نەکەت و دەست ڤالا بزڤریت، دێ بێژن یێ هاتیبە چاڤینکرن، وەسان هەر ئێکێ ل دووڤ گۆتنا وان بهێتە چاڤینکرن، دێ تڤەنگا خۆ، یان خەنجەرا خۆ دەتە ڤ ژنکەکێ، دا کو ئەو سێ جاران د بن فیستانێ کچکەکێ را بینت، واتە د بەر سینگێ وێ را بینت و ببەت و دڤێت کچك بیت، ئەگەر چاڤێن حەسویدا ل دووڤ گۆتنێن وان نابەڤن[٤١].

هەر دیسان دا کو نێچیرڤان نەهێتە چاڤینکرن، ئەگەر دونیا شەڤ و تاری نەبیت، نێچیرڤان نێچیرا خۆ د چانتکی دا ڤەدشێریت و ب دزی ڤە د هینتە دناڤ گوندی دا، ئەگەر یێ مەزن و ب کەلەخ ژی بیت، دێ ڤەت ڤەت کەت دا کەس نەزانیت نێچیرا کری.

## گۆتنێن مەزنان و نێچیر:

دبیت نێچیر و نێچیرڤانی لایەنەکێ گرنگێ ژیانا کوردەواری بیت و گەلەك ژ کەسان شانازیێ ب وێ راڤ و نێچیرێ و سەگڤانیێ بکەن، ب تایبەت ل دەمێن بەرێ، لێ ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینت کو ئەڤ کارە یێ هێژایە، بەلکی کوردان د ناڤ گۆتنێن مەزناندا نەبیا خۆ یا ژێ کری و چەندین چیرۆکێن فلکلۆرێ هەنە کو خودانێ نێچیرێ یێ تووشی رویدانێن مەزن و مرنێ بووی، یان رویدانەکا ل سەر وێ نێچیرێ ب سەری هاتی، وەکی چیرۆکا (سەیدکو) ی و چیرۆکا (خەج و سیابەند) و ... و گەلەکێن دی، هەرووەسان چەند گۆتن ژی ل سەر وێ چەندێ هەنە، کورد دبێژن:

- سولتە و سیتە مالا رویتە، شۆل جۆتە و تاجرڤانی، سەد گۆر بابێ خودانی.

واتە شۆلێ دروست هەر جۆت و بازرگانی یە و خودانێ راڤ و نێچیران، واتە (سولتە و سیتان) هەر بێ رویت و برسی یە و چ دەدەستاندا نینە. یان دبێژن:
كار جۆتە و بازرگانی، رەت خودانێ كەوگیرڤانی[42] .
ئێ نێچیرێ بكێ، تێر ناخۆت[43] .
شنكالی ژی دبێژن: شۆل جۆتە، تێجیرڤانی رتبابێ وی، كەوگیرڤانێ تەلیڤانێ نێچیرڤانی[44] .
كوردێن خوراسان ژی دبێژن: مەرگان، پەلەوان، عاشق تمیشە برچی[45] .
واتە: نێچیرڤان، پەلەوان، عاشق هەردەم د برسی نە.

**نێچیر ل نها:**

هەلبەت دگەل وەرارا ژیانێ رێكێن راڤ و نێچیران ژی وەرار كرینە و نهو رێكێن سەیر بۆ راڤ و نێچیران هەنە، دبیت گەلەك ژ وان د مەترسیدار بن چ ل سەر ژینگەهێ و چ ژی ل سەر ژیانا وان بخۆ، چونكی ب هزاران گیاندارهێنە كوشتن بێ چ مفا ژی ژێ بێتە دیتن.

**سلتە:**

دەڤەرا بەهدینان ئێكە ژ وان جهێن گەلەك ئاڤ و رووبار و دەراڤ لێ هەین، ل بەرامبەر سامانێ ماسییان ژی یێ دەولەمەندە و ب دەهان جۆرێن ماسییان دناڤ دا هەنە، هندەك ژ ناڤ چووینە و هندەك ژی ماینە، بۆ نموونە ئەڤ ماسیێە دناڤ رویبارێ خابووری دا هەبوون:
(فەرخ كو مەزنترین ماسی بوو دناڤ ئاڤا خابووری دا و كێشا وی دناڤبەرا (٤٠- ٨٢كگم) دا بوو، چەور، شەبوت كو د قۆناغەكا تایبەت دا ڤی ناڤی لێ دكەن و دەمێ مەزن دبیت دبێژنێ مێگ و دەمێ هێژ مەزنتر لێ دهێت دبێژنێ مێگا سەرجەلەب، شەقلە یا زراڤ و درێژ و باڤ كەسك بوو و خەلكی گەلەك حەز ژێ نەدكر، ماسی زەرك كو ناڤ ژ رەنگێ وێ هاتییە، دوشەتیك كو ل قۆناغێن دەستپێكی دبێژنێ شینك، ماسی بەحریك كو رەنگێ وێ سۆرەكێ تاری بوو و درێژاهییا وی ژ ٢٠سم نەدبووری و سمبیلێن وی ددرێژ بوون و نەدهاتە خوارن، ماسی جهیك كو یا رەنگ رەشە و درێژاهییا

وی ژ ١٥سم نابووریت و خۆ ب بەراڤە د نویسینیت، دومبەك كو ئەو ژی یا بچویكە و رێژا درێژاهییا وی ژ ١٥سم نابووریت، ماسی پەحنك كو پشتی عیراق بوویە كۆماری كرینە دناڤ ئاڤێ دا، ناقۆر كو ماسیەكا مەزنە و خەلك حەز ژێ دكەن، مارماسی كو هەتا نها ل ناڤ ئاڤا خابووری ماین و ل بەرێ نەدهاتنە خوارن، زڤرۆك و چەندین جۆرێن دی یێن ماسیان[46] ، كو نها گەلەك ژێ ژناڤچووینە و نەماینە.
ئێكە ژ رێكێن گرتنا ماسییان، ئەڤ نێچیرە پشتی شكەستنا سەقایێ سار ل زڤستانێ ل سەر ئاڤ و دەراڤــان دهێتەكرن، سلتە ل سەر وان جهێن تام سووولاڤ دهێنە چێكرن، ل بەراهیێ دو دیوارێن هشكە بەر كو دبێژنێ (كەزیگەهـ) دهێنە چێكرن و كاریتە ل سەر دهێنە رازاندن و چەپەرەكێ ژ شڤتانان چێكری كو درێژاهییا وان د ناڤبەرا (٤-٥م) و پانی دناڤبەرا (٢-٣م) و دۆرماندۆرێن وی وەكی كۆزكێ و دیواركری ل سەر وان كاریتان د نڤینن و ئاڤ دگەل ژ سووولاڤێ دهێتە سەر وی چەپەری و ئاڤ ب ساناهی د چەپەری دا دچیتە خوار، لێ ئەو ماسیێن دمینە ل سەر نەشێن دەركەڤن و دهێنە گرتن[47] .

**شۆك (چنگال):**

رێكەكا بەربەلاڤە بۆ گرتنا ماسییان، تێدا شۆكەكێ (چنگال)، ب داڤەكا درێژا چلەی ڤە دكەن و خوارنەكێ مینا كرمان، یان هەڤیرەكی، یان هەر تشتەكێ دی پێڤە دكەن، ب مەرجەكی كو ئەو خوارن ژێڤە نەبیت و دهاڤێنە ئاڤێ (باراپتر د گەراڤا)، دەمێ ماسی دێ هێت دا بخۆت، دەڤێ وی دكەڤیتێ و نێچیرڤان دكێشیتە دەرێ، ئەگەر ماسی یا مەزن بوو دهێلیت و ئەگەر یا بچویك بوو، جارەكادی بەرددەتە ناڤ ئاڤێ دا ڤە.

**تۆڕ (شەبەكە):**

كارەكێ هەڤپشكێ گرتنا ماسییانە، باراپتر ل هاڤینان دهێتە كرن كو دونیا نە یا سارە و ماسی ژی ب لڤینن و د دیارن، تێدا پتر ژ سێ نێچیرڤانان د رووباراندا پشكداریێ تێدا دكەن، دو ژ وان تۆرێ بەروار

د ناڤ ئاڤێ دا دگرن، کو بنێ تۆرێ د ناڤ رویباری دا ب ئەردی ڤەنن و پێن دی د چنە سەری و خۆش ڤ ئاڤێ دا دهێن و گەلەك جاران دار و بەرا ژی ب کاردهینن دا ماسی بۆ لایێ تۆرێ دا بچن و دەمێ نێزیك دبن، هەردو نێچیرڤانێن تۆر هەلگرتین دێ ب هەڤرا بلند دکەن، وەسان گەلەك ماسی دهێنە گرتن، پێن بچویك د هاڤێنە ئاڤێ و پێن مەزن ژی بۆ خۆ لێکڤە دکەن و گەلەك جاران بۆ لێکڤەکرنێ ژی پشکێ دهاڤێژن، واتە کا چەند نێچیرڤانن، دێ هند نیشانا دروست دکەن کو هەر ئێك یا ئێکی یە و دەمێ ئێك دوێرێ را دەرباز دبیت، دێ بێژنێ هەر نیشانەکێ دانیتە سەر کۆمەکێ و هەر ئێك وێ کۆمێ رادکەت یا نیشانا وی چوویە سەر، پشتی هینگێ هەر ئێك ماسیێن خۆ وەکی گلوازان ژ حەفکێ ب شڤکەکێ ڤە دکەن و ئەگەر گەلەك ماسیان بگرن دبیت پتر ژ گلوازەکی چێکەن.
دیسان جۆرە تۆرەکا دی ژی یا هەی کو مینا تویرکایە و درێکا ئاڤێ دا ئاسێ کەن، دەمێ ماسی دکەڤنە دناڤدا نەشێن دەرکەڤن و ب ساناهی دهێنە گرتن[48]

## ژێدەر و پەراوێز


١. كلين دانيال، ترجمه ليون يوسف، موسوعة علم الاثار، الجزء الثاني، الطبعة الاولى، دار المأمون للترجمة والنشر، وزارة الثقافة والاعلام، مطابع دار الحرية للطباعة والنشر، (بغداد – ١٩٩٠)، ص٣٦١.
٢. طه مظهر مایی، فەرهەنگا مایی، (دهۆك ٢٠٠٩)، بپ٩٦٥.
٣. هەمان ژێدەر، بپ ٥٠٦.
٤. خالد صالح، گلۆلك هەلچنین، (دهۆك: ٢٠٠٧)، بپ٥٥٤.
٥. هەمان ژێدەر، بپ٥٥٣.
٦. المجتمع الكردي في المنظور الاستشراقي، بپ ٤٤٤- ٤٤٦.
٧. جەمیل محەمەد شێلازی، چەند بەربەرەك ڤەشارتی ژ دیرۆکا دەڤەرێ، (دهۆك: ٢٠١٣)، بپ٦٠.
٨. هەمان ژێدەر، بپ٦١.
٩. هەمان ژێدەر، بپ٧٠.
١٠. هەمان ژێدەر، بپ٧٩.
١١. خالد سالح، سەرهاتیێن کوردی، (دهۆك: ٢٠٠٧)، بپ٦٠.
١٢. پێزانین ژ کامل عەزو ل پاییزا (٢٠١٤)ێ هاتینە وەرگرتن، ژ دایکبوویێ سالا (١٩٦٥)ێ یە، خەلکێ گوندێ بازێ، ئاکنجیێ دهۆکێ.
١٣. کارسازیا کوردەواری، بەکر عبدالکریم کوڤلی، (دهۆك: ٢٠٠٤)، بپ٢٢٠.
١٤. پێزانین ژ کامل عەزو هاتییە وەرگرتن.
١٥. گەلەك ژ ڤان جۆرە گیانداران هەر ئێکجار نەماینە، یان گەلەك کێم بووینە کو ناهێنە دیتن، ب تایبەتی شفر و خەزال.
١٦. ئەحمەد قەرەنی، پرەنسیپێن راڤ و نێچیران دکەلەپووری کوردەواریێدا، بپ٤، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٢١، سال ٢٠٠٦.
١٧. فیستەڤالێن فولکلۆری ل دەڤەرا ئامێدیێ، بپ ١٥٠- ١٥١؛ سەرۆکانی، بەرگێ دووێ، بپ ٣٧-٣٨؛ کارسازیا کوردەواری، بپ٢٢٧.
١٨. فیستەڤالێن فولکلۆری ل دەڤەرا ئامێدیێ، بپ١٥٢؛ سەرۆکانی، بەرگێ دووێ، بپ٤٠-٤١.
١٩. فیستەڤالێن فولکلۆری ل دەڤەرا ئامێدیێ، بپ١٤٨؛ سەرۆکانی، بەرگێ دووێ، بپ٤٢؛ کارسازیا کوردەواری، بپ٢٢٤؛ جەلال سنجاوی، راوە کەو لە چیای قەرەچووغ، گۆڤارا ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٧ سال ٢٠٠٥، بپ١٨٠؛ عەلائەددین سجادی، کوردەواری، (بەغدا: ١٩٧٤)، بپ١٦٤.
٢٠. سەرۆکانی، بەرگێ دووێ، بپ٤٤.
٢١. فیستەڤالێن فولکلۆری ل دەڤەرا ئامێدیێ، بپ١٤٧؛ سەرۆکانی، بەرگێ دووێ، بپ٤١؛ کارسازیا کوردەواری، بپ٢٣٠.

# دەهوات ل پارێزگەها دهۆکێ

كامیران درباس هرۆری

ئێك ژ نیشانێن هەردەم بەرچاڤێن كەیف و خۆشییان دناڤ كوردانداب گشتی گێرانا گۆڤەند و دیلانانە، وگەلەك رەنگ و جوینێن دیلانان دناڤ كوردانداو ل سەرانسەری كوردستانێ هەنە، هەر چەند سەر و سیمایێن سەرەكییێن دەهواتان نێزیكی ئێكن، لێ دگەل هندێ ژی جوداهی دناڤبەرا دیلانێن ڤێ دەڤەرێ و دگەل دەڤەرەكا دی هەنە، ڤان جوداهییان مۆرەكا تایبەت یا دایە هندەك دەڤەران كو ناڤێ وان دگەل هندەك رەنگ و جوینێن دەهواتان چوویە و پێ ناڤدار بوویە. گۆڤەند و دیلان وەكی هەر چەقەكێ دی یێ فۆلكلۆری و دبیت ژ هەمیان پتر تا ژێ دچن، تۆ هەر دەڤەرەكا پارێزگەها دهۆكێ بگری دێ بینی چەند گۆڤەند و دیلان لێ دهێنە دیتن و هندەك د تایبەتن ب وێ دەڤەرێ ڤە، یان ژی رەنگە جوداهییەك دگەل دەڤەرەكا دی هەبیت. ل هندەك دەڤەران ب ڕاستی دچنێ مینا دەڤەرا زاخۆ و ئاكرێ و ل هندەكان ب چەپی، مینا دەڤەرێن دهۆك و ئامێدیێ. هندەك جاران دیلان ئێك ناڤە، بەلێ بتنێ گوهۆرین یا دبییەكی دا هەی، چ كێم یا زێدە. ل هندەك جهان خۆ ژ پییان، یان ژی ژ ناڤتەنگێ دفشینن یان بەروڤاژی. دگەل گوهۆرینا هەژاندنا ملان، گەلەك جاران ژ نەزانینێ ژی دبیتە ئەگەرێ پەیداكرنا گوهۆرینان. دیسان دبیت ئەگەرێ ڤان گەلەك جوینان گرێدای سروشتی بن و ئەگەرێ ساریا سەقایێ دەڤەرێن چیایی ئێك ژ وان هۆكارانە یێن كو بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا گەلەك ڤان رەنگێن گۆڤەندان، چونكی دەڤەرێن دەشتی كێمتر دەهوات لێ هەنە و دبیت گەرماتییا دەڤەرێن بیابان و خیزگە دەستەكێ مەزن د سست و پویتیبا گۆڤەندێن واندا هەبیت. بۆ نموونە ئەگەر ئەم بنێرینە دەشت و بیابانێن عەرەبی، دێ بینین هەر ب تنێ ئێك جۆرێ گۆڤەندێ لێ هەیە، لێ ل دەڤەرێن چیایی دەهوات نە هەر ب تنێ دەربرینە ژ كەیفخۆشیێ، بەلكی ئالاڤ و میكانیزمەكە بۆ خۆ گەرمكرنێ، چونكی باراپتر گۆڤەندێن ناڤ چیای خۆ هلاڤێتن و لەز و لڤین پێڤە دیارە. ژبیر نەكەین كو گۆڤەند و دیلان كارەكێ ب ساناهی نینە و ژ ملێ هەمی كەسان ناخۆت، بەلكی لێكدان و كاروكۆكێ مرۆڤی و زەلامباشی و گەود و كەلەخی و گرێدانا دەرسۆكان و راپێچان، رەوشەكا پتر ددەتە گۆڤەندان و گونجاندنا وی كاروكۆكێ دگەل گوڤەندێ تەكووز دەردكەڤت. گرتنا سەرچەمكی د گۆڤەندێن دەڤەرا دهۆكێ دا گرنگییا خۆ و مەرجێن خۆ یێن تایبەت هەنە و هەر كەسەكی پێ چێ نابیت پێ رابت. ژ مەرجێن وێ ژی ئەوە كەسێ سەرچەمكی بگریت

گوڤەندا سێ پێ



پێدڤییە دەهواتكەرەكێ هشیار بیت و نەقلا دەهواتێ و سەلیقەیا وێ بپارێزیت و نەهێلیت نە گونجان و ڤەقەتیان بكەڤیتە دناڤ و ب شەهرەزایی سەرەدەریێ دگەل بكەت و جاروباران هندەك لڤینێن ئەنتیكە بكەت دا جودایی بكەڤیتە دناڤبەرا وی و دەهواتییێن دی دا.

شاهی و گوڤەندێن دەڤەرا دهۆكێ پری رێ و رەسمێن تایبەتن، بگرە ژ خەلاتگێرانێ و چوونا بویكێ و ڤەگوهاستنێ و...هتد، و هەر دەڤەرەكێ رێ و رەسمێن خۆ هەنە و هەر ئێك ژ وان تایبەتمەندییان خۆشییا خۆ هەیە، لێ ب بوورینا دەمی ئەڤ رێ و رەسمە هەر پیچ پیچە پێن ژ ناڤ دچن و بەرەڤ نەمانێ نە، ئەڤ رێ و رەسمێن ل بەرێ دناڤ دەهواتان دهاتنە گێران پتر گرێدای سرۆشتێ كەڤنێ مللەتی ڤە بێ گرێدای بوو كو نها گەلەك كێم ئەو چەند دهێنە دیتن. هەر دیسان چوونا ئالای ژی رێ و رەسمەكێ كەڤنە رەوشا گوڤەندێ گەرمتر لێ دكر و خۆشیەكا دی ددایێ. هەژی ئاماژێ یە ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەها دهۆكێ گەلەك جۆر و رەنگێن گوڤەند و دیلانان هەنە، لێ دێ بینین ل جهەكی دەهواتەكا تایبەتا هەی و وێ دەهواتێ ناڤێ خۆ یێ تایبەت هەیە، لێ هەمان دەهوات دێ ل جهەكێ دی یێ پارێزگەهێ ب ناڤەكێ دی بینین. ئەڤە ژی ناڤێ چەندەك ژ وان دەهواتان:

## ١- سێ پێی:

دەهواتەكا سڤكە، بەهرا پتر كچ و كور ڤێ دەهواتێ دكەن، تێدا دێ تلێن خۆ یێن قلیچێ ددەنە ئێك و

شامیرانێ



گەڕیا گۆڤەندێ دروست دكەن. ل بەراهیێ پێ یێ ڕاستێ ل عەردی ددەن و پاشی پێ چەپێ و جارەكا دی دێ پێ ڕاستێ ل عەردی دەنەڤە بێ كو ژ جهـ بچن و دەستێن وان د ڕاگرتینە ل ڕاستا شویتكێ و كەمەرێ و ل گەل هەر پێ قوتانەكێ دەستێن خۆ دهەژینن، و پشتی پێ سێ ل عەردی ددەن دو پییان ب ڕەخێ چەپێ ڤە دچن و جارەكادی ڤان لڤینان ژ سەری ڤە دەست پێ دكەنەڤە.
ژ سترانێن بۆ ڤێ دیلانێ دهێنە گۆتن: مە دەوینە، یا ل بەر چەما، كەلاتێ و... هتد.

## ٢- ئێك پێی:

هەر مینا سێ پێ یە، لێ ل ڤێرە ل ڤێ دیلانێ ئەوە پێ ڕاستێ ب تنێ ئێك جار ل عەردی ددەن و دو پییان ب ملێ چەپێ دا دچن و سڤكترە ژ دەهواتا سێ پێیی.

ژ سترانێن ۆ ڤێ گۆڤەندێ دهێنە گۆتن: كولڤل، های تۆزە، های بقوتن و... هتد.

## ٣- بێناتی (شامێرانێ)[1]:

ل بەراهیێ دەستێن خۆ تێك دگرن و ملێن خۆ ددەنە ئێك و پێ چەپێ ل سەر پەحنیێ (پانیێ) هێدی ل عەردی ددەن و ددوڤدا خۆ هەر ل سەر پانییا چەپێ دفشینن بێی ژ جهـ راكەن و پاشی جارەكادی پێ چەپێ ل سەر پانیێ هێدیكا دێ ل عەردی دەنەڤە و پێنكاڤەكا كورت ب پێ چەپێ دێ بۆ سینگی هاڤێژن و ب پێ ڕاستێ ژی دێ پێنكاڤەكێ هاڤێژن و پێ چەپێ دێ بلند كەن بێی داننە عەردی و پێ ڕاستێ هێدیكا ل عەردی دەن و خۆ ل سەر فشینن و پشتی رابوونێ دێ پێ ڕاستێ بۆ پاشڤە كێشن و سەر ژ نوی ڤان لڤینان دێ دەست پێ كەنەڤە، ئەڤ دیلانە هێدی

یە و دەهواتکەر کێم ژ جهـ دچن.

ژ سترانێن ئـەڤ گۆڤەندە ل بـەر دهێتەکرن: شامیرانێ، ڕەزکێ میرا، ئەزێ بریندارم، لۆلۆ پسمامۆ.
ل دەڤەرا نهێلێ دەهواتی ملێن خۆ ددەنە ئێك و دەستێن خۆ دکەنە تێکدا و پێ چەپێ ل عەردی ددەن و پێنگاڤەکێ ل سەر پێ چەپێ دهێنە پێش و پێنگاڤەکێ ل سەر پێ راستێ بۆ پێش دهێن، ل سەر پێ ڕاستێ ڕادوەستن و پێ چەپێ دهلاڤێژن و پاشی پێنگاڤەکێ بۆ پاش دزڤڕن و ل سەر پێ چەپێ ل پاش و پێ ڕاستێ ل پێش و هەردو ل عەردی خۆ دفشینن و پاشی پێ ڕاستێ بۆ پاش دبەن و پێ چەپێ ل پێش دمینیت و خۆ جارەکادی فشینن و پێ چەپێ جارەکادی دقوتن و سەر ژ نوی دەست پێ دکەنەڤە.

## ٤- کەلەکڤان:

دەهواتیێن ڤێ گوڤەندێ زەلامن و ژنك ناکەن، چونکی لڤینێن گران و ب زەحمەت تێدا هەنە و بۆ فێربوونێ یا گرانە. دیلانکەر تلێن خۆ بێن قلیچێ ددەنە ئێك و دگەل ئاوازێ سترانێ دێ پێ چەپێ هێدیکا ل عەردی دەن دگەل دەست هەژاندنێ و پێنگاڤەکا کورت ل سەر پێ چەپێ بۆ پێش هاڤێژن و لەشێ خۆ پێڤە دێ بۆ پێش بەن دگەل پێنگاڤێ و پێ ڕاستێ دێ ژ عەردی بلند کەن بێی بچنە پێش و جارەکا دی ل سەر پێ چەپێ پاشڤەهێن و پێ ڕاستێ داننە عەردی و دگەل دێ بۆ ملێ ڕاستێ زڤڕن و گرانییا لەشی ل ڤێ لڤینێ دکەڤیتە سەر پێ چەپێ و دەستێ چەپێ دێ دەنە پشت خۆ و دەستێ ڕاستێ دێ ل سەمتا

کەلەکڤان



تل زەندان (گولشێنی) دو پێیی



شویتکا هەڤالێ ل پێشییا وی بیت، دگەل زڤڕینێ دێ پێ خۆ یێ ڕاستێ ل عەردی دەن و پێنگاڤەکێ بۆ پێش چن و پێ چەپێ هینن ل عەردی دەن و زویکا ل سەر ملێ چەپێ زڤڕن و پێ چەپێ ئێك پێنگاڤ دێ هاڤێن و پێ ڕاستێ دێ ل عەردی دەن و پێنگاڤەکا کورت دێ ل سەر پێ ڕاستێ هاڤێژن.
ئەڤ دەهواتە ل بەر سترانێن کەلەکڤان و زێرینێ دهێتەکرن.

## ٥- تل زەندان (گولشێنی) دو پێیی:

ئەڤ دەهواتە ژ هەمی دەهواتان پتر دهێتەکرن، چونکی دەهواتەکا نەرمە (هێدی) و مرۆڤ پێڤە ناواستییێت و بەهرا پتر کوڕ و کچ ڤێ دەهواتێ تێکەل دکەن، دەهواتی تلێن خۆ یێن قلیچێ تێك دانن و دەستێن خۆ ڕاستا شویتکێ رادکەن و قولپکا سەرملی بۆ ژووردا و ژێهەل دهەژینن و ل جهێ خۆ دێ پێ ڕاستێ بۆ لایێ چەپێ هاڤێژن و پاشی پێ چەپێ بۆ لایێ ڕاستێ هاڤێژن و پێیەکی ژ جهێ خۆ بۆ لایێ چەپێ دچن (هندەك بۆ لایێ ڕاستێ دچن).
ئەڤ گۆڤەندە ل بەر گەلەك سترانان دهێتە گۆتن، وەکی گولشینێ، هۆب یەومان، های نێچیر، گوستیر زێڕ و...هتد.

## ٦- تل زەندان (گولشێنی) سێ پێیی:

ئەڤ دەهواتە هەر مینا یا پێشترە، لێ ل ڤێرە سێ جاران پێن خۆ بۆ لایێ چەپێ و ڕاستێ دهاڤێژن، ل ڤێ دەهواتێ پێ ڕاستێ دێ بۆ لایێ چەپێ ئێك جار هاڤێژن پشتی بزڤڕیننەڤە جە دێ دو جاران پێ چەپێ بۆ لایێ ڕاستێ هاڤێژن و ژنویکا دێ پێنگاڤەکێ بۆ لایێ چەپێ ژ جە چن دگەل دەست هەژاندنێ و ب ڤی ڕەنگی دێ جارەکادی دەست پێ کەنەڤە. ژ سترانێن ڤێ گۆڤەندێ ژی های های مەمۆ.

## ٧- تل زەندان یا گران:

هەر مینا گولشێنییا دو پێ یە و هەر هەمان لڤینێن وێ نە ژ لایێ پیبانڤە، لێ ژ لایێ دەستان ڤە دەستێن خۆ دو سێ جاران دهەژینن و جارا چوارێ دگەل چوونێ بۆ لایێ چەپێ دەستێن خۆ دادهێلن و ئەڤ دەهواتە و ئاوازێن وێ ژێ گرانترن. ژ سترانێن بۆ ڤێ دەهواتێ دهێنە گۆتن وەكی تیارێ، هەورەخێ، توی چاوشی و سترانێن ڤی جۆرێ دەهواتێ د خۆش و دلڤەكەرن و پتر تاما كوردەواریێ ژێ دهێت و باراپتر پیرەمێر ڤێ دەهواتێ دكەن.

ل دەڤەرا نهێلیا دەهواتا (گولشێنی) دەهواتی تلێن قلیچێ تێك دگرن و لەوەندییان بەرددەن، و دگەل ئاوازێ دەستێن خۆ دهیننە ئاستێ ناڤتنەگێ و پێ راستێ ل پێشییێ ژ لەشی زێدەتر سڤك ل عەردی دهینە قوتان، پاشی هەر پێ راستێ بۆ پاش دزڤرینن و پێ چەپێ دو جاران لڤینەكا سڤك پێ دهێتەكرن و هندەك جاران ب سەر پێ راستێڤە دهێن و پاشی دو پێنگاڤان ل سەر پێ چەپێ و راستێ بۆ دەستێ چەپێ دچن و دگەل چوونێ دەستێن خۆ بەرددەن كو ل راستا لەشێ وان بهێت.

## ٨- شێخانی یا زەلامان:

دەهواتەكا ب رەواجە و جحێل گەلەك حەز ژێ دكەن و گەلەك جاران ئەڤ دەهواتە رەشبەلەك دهێتەكرن، دەهواتكەر دەستێن خۆ تێك دگرن و ملێن خۆ پێكڤەدنن. ژ سەرێ ڤێ دەهواتێ ڤە پێ چەپێ دێ ل عەردی دەن و پێنگاڤەكا كورت بۆ پێش هاڤێژن و پێ راستێ دێ ل عەردی دەن و ل سەر پێ چەپێ دێ پێ راستێ بۆ پاشڤە هینن و دگەل هژاندنا لەشی دێ پێ چەپێ ژ عەردی راكەن و بۆ پاشڤەبەن داننە عەردی و دگەل دێ بۆ ملێ چەپێ زڤرن و دەستێن خۆ راكەن و دەنە پشت خۆ و هەژینن دبەر بەژنا خۆدا، و گرانییا لەشی دكەڤیتە سەر پێ راستێ و پێ چەپێ

شێخانی



چوخو



دێ ل عەردی دەن پێنگاڤەکا کورت بۆ پێشڤە چن و پێ ڕاستێ دێ ل عەردی دەن و پێ ڕاستێ پێنگاڤەکا کورت بۆ پاشڤە هێن و پێ چەپێ دێ ل عەردی دەن و ل سەر ملێ ڕاستێ زڤڕن و جارەکادی دێ دەست پێ کەنەڤە. هندەك بەری ڤی دەهواتی دەست پێ بکەنەڤە جارەکادی ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕنەڤە، ئانکو دو جاران خۆ باددەن و جارا دووێ دو پیپیان دقوتن و ژنویکا جارەکادی ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن.

ژ سترانێن ئەڤ دەهواتە ل بەر دهێتەکرن وەکی چۆخۆ، وەرنە سێڤا، هەرێ خرێ، های تەباکن، عەیشۆویێ و... هتد.

هەژیە بێژین دەمێ دو جاران ل سەر ملێ چەپێ باددەن ناڤێ دەهواتێ دهێتە گوهارتن و دبیتە (چۆخۆ)

## ٩- چۆخۆ (شێخانی):

ل دەڤەرا نهێلیا دەهواتی دەستێن خۆ تێك دگرن و ملێن خۆ ددەنە ئێك، دەستپێکێ پێنگاڤەکا کورت ل سەر پێ چەپێ بۆ سینگی دچن و پاشی پێ ڕاستێ ل عەردی ددەن (دقوتن) و پاشی دو پێنگاڤێن کورت بۆ پاش دچن و ل سەر پێ چەپێ دزڤڕن و دو پێنگاڤێن کورت بۆ پێش دچن و دگەلدا بۆ لایێ چەپێ دزڤڕن و پێ ڕاستێ ل عەردی ددەن و پێچەك ژ ناڤتەنگێ پێهەل بۆ ڕوویێ چەپێ دزڤڕن و جارەکا دی سەر ژنوی دەست پێ دکەنەڤە.

## ١٠- چۆخۆ:

دیسان دەهواتی ملێن خۆ ددەنە ئێك و دەستێن خۆ دکەنە تێکدا و لەوەندیێن خۆ بەرددەن، دەستپێکێ پێنگاڤەکا کورت ل سەر پێ ڕاستێ دێ بۆ پێش هێن و پێ چەپێ دو جاران سڤك ل عەردی ددەن و پاشی ل سەر پێ چەپێ ڕادوەستن و پێ ڕاستێ ل عەردی ددەن و دو پێنگاڤان بۆ پاش چن و دەستێن خۆ بۆ پاش دبەن و دگەلدا پێکڤە بۆ لایێ چەپێ دزڤڕن و دو پێنگاڤان بۆ لایێ چەپێ دچن و پێ ڕاستێ ل عەردی ددەن و

جارەكا دی ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و دو جاران پێ چەپێ ل عەردی ددەن.

## ٩- شێخانی یا ژنكان:

ئەڤێ دەهواتێ هندەك ژ لایێ چەپێ ڤێرا دچن و هندەك ژی ژ لایێ ڕاستێ. ل دەسپێكێ پێ ڕاستێ ئێك جار دقوتن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و دەستێن خۆ ددەنە پشت خۆ و دو پێنگاڤان بۆ لایێ چەپێ دچن و پێ ڕاستێ دقوتن (ل ڤێرێ هندەك ژنك دزڤڕنەڤە و دو جاران پێ چەپێ دقوتن دبێژنە ڤێ دەهواتێ چوخۆ)، پاشی خۆ ل سەر ملێ ڕاستێ باددەن و جارەكادی دێ دەست ب لڤینێن ڤێ دەهواتێ كەنەڤە.

## ١٠- هەرێ باسۆ:

دەهواتكەر ل ڤێ دەهواتێ دەستێن خۆ تێك ددانن و دبەر بەژنا خۆدا دادهێلنە خوارێ و دگەل ئاوازێ سترانێ دێ سێ جاران پێ ڕاستێ ل دەن و جارا سێێ دێ پێ خۆ بلندكەن و بۆ پاشڤە كێشن و خۆ ل سەر پێ چەپێ هلاڤێژن و دو جاران بۆ پاشڤەهێن و بۆ پاشڤە چن، پێنگاڤەكێ ب پێ ڕاستێ دچن داننە عەردی و پێ چەپێ دگەل بلند دكەن بێی ببەنە پێش و دێ داننە ڕاستا پێ ڕاستێ و جارەكادی دێ پێ ڕاستێ سێ جاران ل عەردی دەن و دەست پێ كەنەڤە.

ژ سترانێن بۆ ڤێ دینێ دهێنە گۆتن سترانا هەرێ باسۆیە.

پێدا پێدا



هەرێ گولێ



## ١١- های پێدا پێدا:

گەلەك جوداهی دناڤبەرا ڤێ دەهواتێ و دەهواتا هەرێ باسۆی دا نینە. ل ڤێ دیلانێ دەهواتی دەستێن خۆ تێك دگرن و دبەر بەژنا خۆدا دادهێلن، پێ ڕاستێ سێ جاران د قوتن و بۆ پاشڤە دبەن و پێنگاڤەکێ ل سەر پێ چەپێ و ئێکێ ل سەرە پێ ڕاستێ بۆ پێش دچن و پێ چەپێ دهلاڤێژن و بۆ پاشڤە دکێشن و ژنویکا ددانن عەردی، جارەکادی ڤان لڤینان ژ سەری دەست پێ دکەن.

ژ سترانێن بۆ ڤێ دەهواتێ دهێنە گۆتن سترانا های پێدا پێدا.

## ١٢- کورۆ:

ل ڤێ دیلانێ ژی دەهواتکەر ب تلێن خۆ بێن قلیچێ دەستێن ئێك دگرن و ژ ئەنیشکێ ڤە دشکێنن و ل سەر پەحنیا پێ چەپێ سێ جاران خۆ ژ سەری هەتا پێیان وەربادەن و جارا سێ پێ ڕاستێ دو بهۆستان ژ عەردی بلند دکەن و بۆ پاشڤە دبەن، پاشی پێ چەپێ ژی ژ عەردی بلند دکەن و بۆ پێش دبەن و ددانن عەردی و خۆ دگەل دفشینن و زویکا بۆ لایێ چەپێ ل سەر پێ چەپێ د زڤڕن و گرانیا لەشی دکەڤیتە سەر پێ چەپێ و پاشی بەری بۆ ملێ ڕاستێ بزڤڕن یێ ڕاستێ ل ئاخێ ددەن.

ژ سترانێن ئەڤ دیلانە ل بەر دهێتەکرن سترانێن کورۆ و سترانا پرا بلبل و... هتد.

## ١٣- هەرێ گولێ:

ئەڤ سترانە گەلەکا سڤك و ب ڕەوشە، بێ

زیرەك و بێهن فرەهـ نەبیت نەشێت ڤێ دەهواتێ بکەت. د ڤێ دەهواتێ ژی دا دەهواتی تلێن خۆ یێن قلیچێ تێك دگرن و گەرییا گۆڤەندێ گرێ ددەن.
پێ ڕاستێ ل ئاخێ ددەن و پاشی پێ چەپێ و ددووڤرا پێ ڕاستێ بلند دکەن و بۆ پێش دهلاڤێژن و بۆ پاشڤە تینن و ددانن ئاخێ و پێ چەپێ ئێك جار دقوتن و ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤرن و دەستێن خۆ ددەنە پشت ئێك و خۆ دهلاڤێژن، دگەل ڤان لڤینان پێ ڕاستێ ئێك جار دقوتن و پاشی جارەکادی پێ چەپێ دقوتنەڤە بەری ل سەر ملێ چەپێ بزڤرن.
ژ سترانێن ڤێ دەهواتێ ژی سترانا هەرێ گولێ.

## ١٤- شرینێ لەیلان:

ل ڤێ دیلانێ ژی دەهواتی ب تلێن قلیچێ دەهواتێ دکەن، ل سەر پانییا پێ ڕاستێ سێ پێنگاڤێن کورت بۆ لایێ ڕاستێ دچن و پاشی پێ چەپێ دهلاڤێژن و ئێك سەر بۆ لایێ چەپێ دزڤرن و سێ پێنگاڤێن کورت ل سەر پانییا پێ چەپێ دچن و پاشی پێ ڕاستێ دهلاڤێژن و ددانن عەردی و سێ پێنگاڤێن دی یێن کورت ل سەر پانییا پێ چەپێ بۆ سینگی دچن و پێ ڕاستێ جارەکادی دهلاڤێژن.
ژ سترانێن ڤێ دەهواتێ ژی سترانا شرینێ لەیلانێ و یا ل بەر چەما و... هتد.

## ١٥- تیل مەرجان:

ئەڤ دیلانە مینا دیلانا شێخانی یە، لێ چەند جوداهی دناڤبەرا هەردووان‌دا هەنە. دەهواتە دەستێن خۆ د دەنەڤ ئێك و دو دبەر خۆدا دادهێلنە خوارێ و دگەل ئاوازێ سترانێ پێ چەپێ دێ سڤك قوتن و پێنگاڤەکا کورت ل سەر چن و پاشی ب پێ ڕاستێ ئێك پێ دێ قوتن و بۆ پاشڤە کێشن دگەل لەشێ خۆ وەکی دەهواتا شێخانی یێ پاشی پێ چەپێ دێ ژ عەردی ڕاکەن و بۆ پاشڤە هینن داننە ئاخێ و دو پێنگاڤا ب پێ ڕاستێ دێ بۆ سینگی چن ل سەر

کولاڤ ڕەش



سنجانێ



پێنگاڤا دووێ دێ دەستێن خۆ دەنە پشت خۆ و ل سەر ملێ چەپێ زڤڕن و دو پێنگاڤا ل سەر پێ چەپێ چن و پێ ڕاستێ ئێك جار قوتن و پاشی پێ چەپێ ژی ئێك جار دقوتن و جارەكادی خۆ ل سەر پێ چەپێ فشینن و جارەكادی دێ پێ چەپێ قوتنەڤە و ژنویكا دێ ل سەر ملێ ڕاستێ زڤڕن و ژ سەری ڤان لڤینان دەست پێ كەنەڤە.

ژ سترانێن ئەڤ دەهواتە ل بەر دهێتەكرن سترانا تیل مەرجان و گەلەك سترانێن دی كو بۆ دەهواتا شێخانی دهێنە گۆتن.

ل دەڤەرا نهێلێ دەهواتی ملێن خۆ ددەنە ئێك و دەستێن خۆ دكەنە تێكدا، ل سەر پێ چەپێ جارەكێ پێ ڕاستێ دقوتن و ل سەر پێ چەپێ دو پێنگاڤان بۆ پێش دهێن و پاشی بۆ دەستێ چەپێ دزڤڕن و دو پێنگاڤان بۆ پاش دچن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و پێ ڕاستێ دقوتن و دو جاران ل سەر ملێ ڕاست و چەپێ دزڤڕن و دو جاران پێ چەپێ دقوتن وجارا سییێ خۆ دفشینن و هندەك خۆ ژ ناڤتەنگێ خویل دكەن و جارەكادی پێ چەپێ دقوتن.

## ١٦- كولاڤ ڕەش:

پێ چەپێ دێ جارەكێ ل عەردی دەن و دێ زڤڕن پێ ڕاستێ ل عەردی دەن و جارەكادی زڤڕن بێی ژ جهـ بچن و پێ چەپێ ل ئاخێ دەن و زڤڕنەڤە پێ ڕاستێ دو جارا قوتن و دێ زڤڕن ل سەر پێ چەپێ پییەكی بۆ سینگی چن و دگەل فشاندنێ و پێ ڕاستێ هیننە بەر و پێ چەپێ هلاڤێژن و بۆ پاشڤە بەن و پێ ڕاستێ ژی دێ پاشڤەبەن و داننە پشت پێ چەپێ و ل ڤێرێ پێ چەپێ دێ مینتە ل سینگی و جارەكادی ڤان لڤینان دێ دەست پێ كەنەڤە. ئەڤ دەهواتە ب دەست گۆتنێ، یان ژی تل گرتنێ دهێتەكرن.

ژ سترانێن ئەڤ دەهواتە ژی ل بەر دهێتە كرن سترانا كولاڤ ڕەشی.

## ١٧- لێ لێ کنێ:

پێ چەپێ دێ جارەکێ قوتن و پاشی پێ ڕاستێ ژی جارەکێ دێ قوتن و دووڤ دا پێ چەپێ دێ دو جاران ل عەردی دەن و ل ڤێرێ دێ دەستێن خۆ بۆ پشت خۆڤە بەن، بێی پێ چەپێ بزڤرینن دو پێنگاڤا بۆ لایێ ڕاستێ چن دگەل هەر پێنگاڤەکێ دێ خۆ فشینن و جارەکادی ژ سەری دەست پێ کەنەڤە، ل ڤێ دەهواتێ تلێن خۆ یێن قلیچێ تێك دگرن.
ئەڤ دیلانە ل بەر سترانا لێ لێ کنێ دهێتەکرن.

## ١٨- هەی دۆت:

پێ ڕاستێ دێ سڤك قوتن و پاشی پێ چەپێ هەر ب وی رەنگی و ل سەر پێ چەپێ پێنگاڤەکێ دێ بۆ سینگی چن بەلێ خوار و ب لایێ چەپێ دا، پاشی پێ ڕاستێ دی هیننە بەر، ئێك جار ل عەردی دەن هەر ل سەر پێ چەپێ پێ ڕاستێ.
دێ بۆ پاشڤە هینن و گرانییا لەشی دێ ئێخنە سەر پێ ڕاستێ و پێ چەپێ ژ عەردی خلۆلەکەن و ئێك پێ ل عەردی دەن و جارەك دی دەست پێ کەنەڤە.
ئەڤ گۆڤەندە ل بەر سترانا هەی دۆت و گەلەك سترانێن دی دهێتەکرن.

## ١٩- سنجانێ:

دەهواتەکا سڤك و ب رەوشە، بەهرا پتر زەلام ڤێ دیلانێ دکەن. پشتی گەڕیبا گۆڤەندێ ب تلێن یێن قلیچێ گرێددەن (هندەك دەستێن خۆ تێك ددانن و

عەودیشۆك:



بابلەكان،



ملێن خۆ ددەنە ئێك)، دەهواتی پێن خۆ پێن ڕاستێ ژ عەردی بلند دكەن و ل سەر پێ چەپێ سێ جاران خۆ دهلاڤێژن و دگەل هەر هلاڤێتنەكێ پێ خۆ پێ ڕاستێ بۆ سینگی دبەن، ل جارا سێێ پێ خۆ پێ ڕاستێ ددانتە ئاخێ و زویكا ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و پێ چەپێ دهلاڤێژن و پاشی ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن و پێ ڕاستێ ژی دهلاڤێژن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕنەڤە، ڤێجارێ ل سەر پێ ڕاستێ سێ جاران خۆ دهلاڤێژنەڤە و دگەل هەر هلاڤێتنەكێ پێ خۆ پێ چەپێ بۆ سینگی دبەن، لێ نادانە ئاخێ و ژنویكا ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن و خۆ ئێك جار ل سەر پێ چەپێ دهلاڤێژن و پێ ڕاستێ بۆ سینگی دبەن و ئێك جار خۆ ل سەر پێ ڕاستێ دهلاڤێژن و پێ چەپێ بۆ سینگی دبەن پاشی بۆ پاشڤە دزڤڕینن و ددانتە عەردی، ب ڤی ڕەنگی ئەڤ لڤینە دێ دەست پێ كەنەڤە.

## ٢٠- عەودیشۆك:

ئەڤ دەهواتە ژ هەمی دەهواتێن دی پتر نێزیكی دەهواتا شێخانی یە، ل ڤێ دەهواتێ دەهواتی پشتی دەستێن ئێك دگرن ملێن خۆ ددەنە ئێك و دبەر خۆدا دادهێلنە خوارێ، پێ چەپێ هێدیكا دقوتن و پێنگاڤەكا كورت پێ بۆ پێش دهاڤێژن و پێ ڕاستێ ل عەردی ددەن و پاشی بۆ پاشڤە دكێشن و ددووڤرا پێ چەپێ ژی بۆ پاشڤە دكێشن و جارەكادی دو جاران پێ ڕاستێ دقوتن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و دەستێن خۆ ددەنە پشت خۆ و پێ جارەكێ دقوتن و پاشی پێ ڕاستێ ژی جارەكێ دقوتن و گرانیا لەشی دكەڤیتە سەر پێ ڕاستێ و پێ چەپێ ژ عەردی خلۆلە دكەن و ڤێجارێ دو جاران دقوتن و ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن. ژ سترانێن ڤێ دیلانێ ژی سترانا عەودیشۆی و سترانا نێری یە.

## ٢١- بێریۆکێ:

دەهواتەکا سڤك و ب غاردانە. ل ڤێرێ ژی دەهواتی ب تلێن قلیچێ دەستێن ئێك و دو دگرن و سێ پێنگاڤا بۆ سینگی دچن و پێنگاڤا سێ ل سەر پێ ڕاستێ خۆ د هلاڤێژن و پاشی دزڤڕن و بۆ ملێ چەپێ بادەن و سێ پێنگاڤا ب ڤی لایی ژی دا دچن و ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن، هەژیبە بێژین ئەڤ لڤینە گەلەك ب لەز و بەز دهێتەکرن.

سترانا ڤێ دەهواتێ ژی سترانا بێریۆکێ یە.

ل دەڤەرا نهێلێ دەهواتی تلێن خۆ یێن قلیچێ دگرن و لەوەندیێن خۆ بەردەن و دگەل ئاوازێ ملێن خۆ دهەژینن و دەستێن وان ل ئێك ئاست دسەر ناڤتەنگێ دا و سێ پێنگاڤا بۆ پێش دهێن و دەستپێك لێ سەر پێ ڕاستێ و پاشی پێ چەپێ و پاشی پێ ڕاستێ و ب ڕەنگەکی کو پێ چەپێ دێ بۆ پێش ل هەوا هلاڤێژن و پێنگاڤەکێ ل سەر پێ چەپێ دزڤڕنەڤە و پێ ڕاستێ دهلاڤێژن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و دو پێنگاڤان ل سەر پێ چەپێ بۆ سینگی دچن و پێ ڕاستێ بۆ سینگی دهلاڤێژن.

## ٢٢- دیکۆ:

پشتی دەهواتی تلێن خۆ یێن قلیچێ تێك دگرن و گرانییا لەشی خۆ دئێخنە سەر هەردو پییان سێ جاران دێ خۆ هێدیکا فشینن و پێ چەپێ قوتن و پاشی پێ ڕاستێ ژی قوتن و بۆ لایێ چەپێ دزڤڕن و سێ پێنگاڤا دچن و ل هەر پێنگاڤەکێ وەکی دیکلی دکەن دەمێ قەست دکەتە مریشکێ، ژنویکا دێ ل سەر ملێ ڕاستێ زڤڕن و پێ چەپێ قوتن و پاشی پێ ڕاستێ ژی دێ قوتن و ب ڤی ڕەنگی ئەڤ دەهواتە دهێتەکرن.

ژ سترانێن ئەڤ دەهواتە ل بەر دهێتە کرن سترانا دیکۆ... هتد.

## ٢٣- بابلەکان:

ل سەر پانییا پێ چەپێ و پشتی دەهواتی تلێن خۆ یێن قلیچێ تێك دگرن، سێ پێنگاڤێن کورت دهاڤێژن و دگەل هەر پێنگاڤەکێ ژ ناڤتەنگێ پێهەل دگەل دەستان خۆ بۆ لایێ چەپێ وەربادەن، پاشی دەستێن خۆ دادهێلن و سێ پێنگاڤان بۆ پاشڤە دهێن.

سترانا ئەڤ دەهواتە ژی ل بەر دهێتەکرن سترانا بابلەکانە.

**هەلبەر**



تەمزەر



## ٢٤- هەلەمەندێ:

ل ڤێ دەهواتێ دەهواتی خۆ دکەنە دو جوین و دەستێن خۆ ددەنە ئێك و دو خۆ نێزیکی دو گەزان ژێك فڕ دکەن و ل بەرامبەری ئێك ڕادوەستن، دەست ب سترانێ دکەن و دگەل ئاوازێ سترانێ جوینەك دهێت و دبن دەستێن هەڤالێن خۆرا دچن وەکی خیچا ماری، هەتا دبن دەستێن هەمیانرا دچن و جارەکادی ل بەرامبەری هەڤالێن خۆ رادوەستن، ب ڤی رەنگی جوینێ دووێ ژی دێ هۆسا دەست پێ کەن هەتا دبن دەستێن جوینێ دی را چن و جارەکادی ل بەرامبەری جوینێ ئێکێ ڕادوەستن.

ژ سترانێن ئەڤ دەهواتە ل بەر دهێتەکرن سترانا هەلەمەندێ و... هتد.

## ٢٥- یۆخ یۆخە:

د ڤێ دەهواتێ ژی دا دەهواتی خۆ دکەنە دو جوین و ل بەرامبەری ئێك ڕادوەستن و دەستێن خۆ دبەر خۆدا دادهێلنە خوارێ، جوینێ ئێکێ دگەل ئاوازێ سترانێ دێ بۆ سینگی چن هەتا دگەهنە بەر سینگێ جوینێ دووێ و پاشڤە دهێن هەتا دگەهنە جهێ خۆ، پاشی جوینێ دووێ ژی دێ ب نك جوینێ ئێکێ ڤە چیت هەتا دگەهنە بەرسینگێ وان و پاشی بۆ پاشڤە زڤڕن تا کو دگەهنە جهێ خۆ و ئەڤ دیلانە ب ڤی ئاوایی دهێتەکرن.

## ٢٦- هەلەبەر (پیرەمێر):

ل ڤێ دەهواتێ تۆلاز ملێن خۆ ددەنە ئێك و دەستێن خۆ تێك ددانن، دەستپێکرنا ڤێ دیلانێ دێ پێ ڕاستێ ب نك یێ چەپێ ڤە بەن و ڤەگێرنەڤە و پاشی پێنگاڤەکێ ل سەر پێ چەپێ بۆ سینگی چن و پێ ڕاستێ ل ئاخێ دەن و دو گاڤان پاشڤە زڤڕن و ل سەر ملێ چەپێ زڤڕن و پێ چەپێ ئێك جار قوتن، هەروەسان پێ ڕاستێ و ژ نویکا ل سەر ملێ ڕاستێ زڤڕن، لڤینێن ڤێ دەهواتێ گەلەك ب لەز و بەزن.

ژ سترانێن بۆ ڤێ دەهواتێ دهێنە گۆتن سترانێن پیرەمێر و سترانا های مفری و... هتد.

## ٢٧- تەمزەر:

ئەڤ دیلانە وەکی دیلانا هەلەبەری یە، ب تنێ جوداهی د هندەك لڤیناندا هەنە، ل ڤێ دەهواتێ هندەك دەستێن خۆ تێك دگرن و هندەك ب تلێن قلیچێ دەستێن ئێك دگرن و گرانییا لەشی ژ سەریڤە دکەڤیتە سەر پێ چەپێ و پێ راستێ ژبەر خۆ دبەن و سێ جاران خۆ ل سەر پێ چەپێ دفشینن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤرن و ب پێ چەپێ ئێك پێنگاڤ بۆ لایێ چەپێ دچن و پێ ڕاستێ بۆ پێش دبەن و زویکا بۆ پاش ڤەدکێشن و ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤرن و پێنگاڤەکێ ب پێ چەپێ بۆ سینگی دچن و پێ ڕاستێ دهاڤێژن و دو گاڤان بۆ پاشڤە دزڤرن و گرانییا لەشی جارەکادی دێ کەڤیتە سەر پێ چەپێ و پێ ڕاستێ ژبەر خۆ دبەن و جارەکادی خۆ سێ جاران ل سەر پێ چەپێ دفشینن.

ژ سترانێن ڤێ دەهواتێ ژی سترانا تەمزەر و... هتد.

## ٢٨- دۆلابێ (دو ڕێزی):

ل ڤێ دەهواتێ دەستێن خۆ ب سەر ملێن ئێکڤە دهاڤێژن و بازنەکی چێدکەن و هندەك دچن سەر ملێن وان و ئەو ژی دەستێن خۆ ب سەر ملێن ئێکڤە دهاڤێژن و بازنەکی دروست دکەن و ل ڤێرە دەهواتی دبنە دو ڕێز ل سەر ملێن ئێك.

ژ سترانێن بۆ ڤێ گۆڤەندێ دهێنە گۆتن سترانێن دەهواتا ملانێ نە و ئەڤ دیلانە هێدیکا بۆ ملێ چەپێ دچن.

## ٢٩- دەهواتا هرچێ:

ئەڤ دەهواتە یا ب کەنی و ترانەیە، دەهواتی دەستێن خۆ ددەنە ئێك و بازنەکی دروست دکەن، پاشی هەر ئێك پێ خۆ یێ ڕاستێ ب سەر دەستێ خۆ یێ ڕاستێ ڤە هاڤێت و گرانییا لەشی دمینیتە ل سەر پێ چەپێ ب تنێ، دێ سترانا بێژن و خۆ ل سەر

تەمزەر



دم دم



پێ چەپێ هلاڤێژن و بۆ لایێ ڕاستێ چن.
گەلەك سترانێن دیلانا بۆ ڤێ دەهواتێ دهێنە گۆتن.

## ٣٠- تالان (کەچەل):

ئەڤ دەهواتە دەست پێ دکەت پشتی دیلانکەر ب تلێن قلیچێ دەستێن ئێك دگرن و پێ ڕاستێ ئێك جار دقوتن و پێنگاڤەکا کورت بۆ پێش دچن، پاشی ئێك گاڤ ب پێ چەپێ بۆ پێش دچن و خۆ ل سەر دفشینن و بۆ پاش ڤە دکێشن و ئێك جار پێ ڕاستێ دقوتن و ل سەر ملێ چەپێ دزڤڕن و سێ گاڤان بۆ لایێ چەپێ دچن، ژ نویکا ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن و ئێك جار پێ ڕاستێ دقوتن، ب ڤی ڕەنگی ئەڤ لڤینە دەست پێ دکەنەڤە.
ژ سترانێن ڤێ دیلانێ ژی سترانا تالانە، سترانا کەچەل و گەلەك سترانێن ل بەر دەهواتا شێخانی دهێنەکرن.

## ٣١- زراڤ:

ئەڤ دەهواتە ژی هەر مینا یا پێشترە، ب تنێ هندەك لڤینێن زێدەتر دناڤدا هەنە. دەستپێکرنا وێ سێ جاران پێ ڕاستێ ل عەردی ددەن و رادکەنەڤە و ئێك پێنگاڤ بۆ لایێ چەپێ دچن و ل سەر ملێ ڕاستێ دزڤڕن و ب پێ ڕاستێ ئێك پێ دقوتن و ئێکێ کورت بۆ پێش دچن و گاڤەکێ ب پێ چەپێ بۆ پێش دچن و خۆ ل سەر دفشینن و بۆ پاشڤە دکێشن و جارەکادی پێ ڕاستێ سێ جاران ل ئاخێ ددەن و رادکەنەڤە. و ژ سەری دەست پێ دکەنەڤە.
ژ سترانێن ئەڤ گۆڤەندە ل بەر دهێتەکرن وەکی سترانا زراڤ.

## ٣٢- ملانا گران:

دەهواتکەر دەستێن ئێك دگرن و شۆر دکەن و

ملێن خۆ ددەنە ئێك، چەند جاران خۆ ژ ملا دهەژینن دگەل فشاندنێ و پێ ڕاستێ رادکەن و ددانن و پاشی پێ چەپێ ژی و بۆ لایێ چەپێ دچن و ئەڤ دەهواتە گەلەکا هێدی یە.
ل دەڤەرا نهێلیا دەهواتی ملێن خۆ ددەنە ئێك و دلەرزینن و دەستێن خۆ دکەنە تێکدا و د هەر خۆ هلاڤێتنەکێ دا جارەکێ پێ ڕاستێ بۆ پێشڤە دهاڤێن و جارەکێ پێ چەپێ بۆ سینگی دهاڤێژن و دگەل چوونێ خۆ دفشینن و بۆ لایێ چەپێ چوونەکا هێدی دچن و سەرچەمك و بنچەمك هەر ئێك ئالایەکێ ددەست دا.

## ٣٣- ملانا سڤك:

جوداهیا دناڤبەرا ملانا سڤك و ملانا گران ئەوە ل ملانا سڤك لڤینێن وێ ب لەز و بەز دهێنەکرن و ئاوازێ سترانێن ڤێ دەهواتێ ژی دسڤکترن ژ سترانێن ملانا گران.

## ٣٤- دم دم:

چ جوداهیا وەسا دناڤبەرا ڤێ دەهواتێ و دەهواتا ملانێ دا نینە، ب تنێ دەستێن خۆ نا دەنەڤ ئێك، هەر ئێك دەستێ خۆ یێ ڕاستێ دبن نافکێدا ددانیتە سەر دەستێ چەپێ و دەهواتی ملێن خۆ ددەنە ئێك و بۆ لایێ چەپێ دچن و خۆ ژ ملا دهەژینن.
سترانا ڤێ دەهواتێ ژی سترانا دم دمەیە.

## ٣٥- کۆلیانی:

دەهواتەکا ژێهاتی یە و پتر ل بەر دەنگێ دهۆل و زرنایێ دهێتەکرن، ناڤێ ڤێ دەهواتێ یێ ژ ناڤێ گوندێ کۆلێ ل دەڤەرا سلێڤانەیان هاتی کو گوندەکێ ب ناڤ و دەنگە بۆ ڤێ دەهواتێ و ئەڤ دەهواتە پتر ل دەڤەرێن زاخۆ و سێمێلێ دهێتەکرن.
ئەڤ دیلانە جوینەکە ژ دیلانێن ملانێ و لڤینێن وێ

ملانا سڤك



پتر ژ ناڤتەنگێ پێهەلن.

## ٣٦- ناڤچەلیێ:

دەهواتی تلێن خۆ یێن قلیچێ تێك دگرن و لەوەندییان بەرددەن و ل دەستپێکێ پێ چەپێ یێ ل پێش و دەستێن وان یێ ل ئاستێ ملان و پاشی پێ ڕاستێ دێ بۆ پێش هینن و ڕاوەستینن و دەستێن خۆ دێ بۆ پاش بەن و هەژینن و پێنگاڤەکا دروست و نیڤ پێنگاڤێ بۆ لایێ چەپێ دا دهێن کو جارەکا دی پێ ڕاستێ ل پێش بیت و جارەکا دی دەستێن خۆ بۆ پاش دبەن و ژ کەلەخێ وان دبووریت.

## ٣٧- بژاندنا ئێکێ:

دڤێ دەهواتێ دا دەهواتی تلێن قلیچێ تێك دگرن و لەوەندییان بەرددەن و دەستێن وان ل ئاستێ ناڤتەنگێ دا و دگەل ئاوازێ پێ ڕاستێ سڤك ل عەردی دهێنەدان و دگەل ڤێ لڤینێ دەستێن وان ل پێشن ژ سینگی پێشتر و پاشی دو پێنگاڤان بۆ لایێ چەپێ دچن بێ زڤڕین و دگەل هەر پێنگاڤەکێ بۆ لایێ چەپێ دەستێن خۆ دهەژینن کو هەر جارەکێ دەستێن وان بۆ پاش دچن.

## ٣٨- گۆڤەند:

دەهواتی ملێن خۆ ددەنە ئێك و دەستێن خۆ دکەنە تێکدا و پێ چەپێ ل عەردی ددەن و ملێن خۆ باددەن و پێنگاڤەکێ ل سەر پێ ڕاستێ دێ بۆ پێش هێن و پێ چەپێ دێ بۆ سینگی هاڤێژن و پێنگاڤەکێ بۆ پاش زڤڕن و پێ چەپێ دێ ل عەردی بیت و پێ ڕاستێ ل عەردی ددەنو دگەل دێ خۆ فشینن و پاشی پێنگاڤەکێ بۆ پاش چنەڤە و ل سەر پێ چەپێ قوتن و خۆ فشینن و جارەکادی دەست پێ دکەنەڤە.

هەلبەت ژبلی ڤان دەهواتان گەلەك جۆرێن دی یێن دەهواتان ل دەڤەرێن جودا یێن پارێزگەهێ هەنە، وەکی دیلانا بویکێ دەلالێ، دیلانا ڕویڤی و بازیدە و...هتد.

### تێبینی

١. ناڤێ گەلەك دەهواتان هەر ل سەر ناڤێ سترانەکێ یە، بۆ نموونە: شامیرانێ، گولشێنی، هەرێ گولێ، بابلەکان و...هتد.

# خان ل پارێزگەها دهۆکێ

خالد سالح

خانا ل پارێزگەها دهۆکێ مێژوویەکا کەڤن یا هەی، ئەو ل سەردەمێن کەڤن مینا ئۆتێلان بوو و گەلەك جاران مینا جهێن بازرگانی ژی دهاتنە بکارهینان، لێ ژبەر مەزنبوون و بەرفرەهبوونا وان جهێن ئەڤ خانە لێ هەین و گوهورینا سیمایێن ژیانێ ب رەنگەکێ گشتی، ئێدی ڤان خانان ژی هەر پیچ پیچە ئەو رۆلێ کەڤن ژ دەستدان، ب تایبەتی کو گەلەك ژ وان خانان و ب تایبەت د ناڤ بازێران دا کەتنە بەر جادان ل دەمێ د هاتنە بەرفرەهکرن، لەوما و ژبەر وان ئەگەران دووڤچوونا ڤی بابەتی دبیت کارەکێ ب ساناهی نەبیت، چونکی نهو هندەك ژ وان خانان هەر ب تنێ ناڤ بێن ژێ ماین و ژێدەران ژی کێم ئاماژە یا پێ کرین، لەوما ئەڤ بابەتە پتر پێدڤی دووڤچوونێ یە.

هەبوونا خانان ل جهەکی بەلگەبوو کو رەنگە بازرگانییەك و کرین و فرۆتن یا لێ هەی و بازار یێ خورتە، ب تایبەت بازێرێن دکەتنە جهێن ستراتیجی و ل سەر رێکا هاتن و چوونان، مینا دهۆك و زاخۆ و دەڤەرا ئامێدیێ و ئاکرێ و گەلەك جهێن دی تر ژی، لێ ئایا خان چیە و بۆ چ مەبەست دهاتنە بکارهینان؟.

پتریا بۆچوون و ڤەکۆلینان ل سەر پەیڤا خان ئەوە کو پەیڤەکا عەجەمی یە و هندەکێن دی بۆ هندێ دچن کو پەیڤەکا تەتەری یە، یان ژی تورکی یان ئارامی یە، یان ژی دبیت ژ پەیڤا (خانە، یان خانا) کو ژ پەیڤا (خن)، ب واتایا ئەو جهێ بازرگان بارەگایێ خۆ لێ دادانن هاتبیت و باراپتر ژ لایێ خانەکی، یان میرەکی ڤە یا هاتییە ئاڤاکرن[1].

وەکی دیار دو جۆرێن خانان ل دەڤەرێ هەبوون:

**١- دناڤ بازێراندا**: ئەڤ رەنگە خانە بەلگەیەك بوو کو بزاڤەکا بازرگانی یا ل وی جهی (بازێری) هەی و نیشانا وەرار و پێشکەتنا وی جهی یە.

**٢- ژ دەرڤەی بازێران**: ب تایبەت ل سەر رێکێن ستراتیجی و جهێ پێکڤە گرێدانا دەڤەران. ئەڤ خانە د کڤانکری بوون و قەبارێ وان بچویکتر بوو ژ وان خانێن دکەتنە دناڤ بازێراندا[2]، ڤان جۆرە خانان پالە و سەرپەرشت (متوەلی) هەبووینە و ئەڤ سەرپەرشتە ب کارێ ژمێرباریێ رادبوون و خان د لەپێن واندا بوون، ئەو بەرپرس بوون ژ هەر تشتەکی دناڤ خانێ دا روو بدەت، ژ دزیان و نویژەنکرنێ و هەر کارەکێ پەیوەندی ب خانێ ڤە هەی[3].

ئەڤ خانێن هاتینە ئاڤاکرن بۆ چەندین مەبەستا هاتینە بکارهینان، ل بەری هەر تشتی وەکی جهێ ڤەحەواندنا کاروانییان دگەل دەوارێن وان بوو، زێدەباری ئالفدانا دەوارێن وان ژی[4]، هەروەسان وەکی جهێ پۆستەی و ڤەگوهاستنێ بوون، مینا خانا

مستەفا ئەلجەوادی ل تاخێ كوندكی ل زاخۆ[٥] كو دەرگەهەكێ مەزن هەبوو، هەروەسان ڤان خانان پێشوازییا خەلكێ گوندان دكرن و فێقی و دەرامەتێ وان وەردگرتن، مینا خانا (بەسێ)، یان كو هندەكان دگۆتێ خانا (قاسم عەلوشی) ل زاخۆ كو وێ ژی دەرگەهەكێ مەزن هەبوو[٦]، پشكەكا ڤان خانان دوكان ژی لێ هەبوون و جهێ كرین و فرۆتنا متایێن جۆرا و جۆر بوون و ب شەڤ زێرەڤان د مانە ل بەر، وەكی خانا (موشێ گەبای) و خانا (ئەوقافێ) كو دهاتە هەژمارتن مەزنترین خان ل زاخۆ، ژوورێ وێ یا تایبەت بوو بۆ كرین و فرۆتنا گەنمی و جەهی و نیسك و نۆك و ماش و گەنمۆكان[٧]، هەروەسان ئەڤ جۆرە خانە ل دهۆكێ ژی هەبوون، وەكی خانا رەئۆف ئەفەندی. دیسان هندەك ژ خانان وەكی جهێ پێشوازییا خەلكێ گوندان بوون و لێ ڤەدجەمیان، مینا خانا حاجی حەجی عەلی هەر ل زاخو كو پشتی هینكێ بوویە گەراجێ ڤەگوهاستنا نەفەران[٨].

هەلبەت دیرۆكا ئاڤاكرنا خانان ل دەڤەرا پارێزگەها دهۆكێ دیرۆكەكا كەڤن هەیە و باراپتر هەمی ب بەر و كلسی ل سەر رێكێن ستراتیجی هاتینە ئاڤاكرن، دیرۆكا هندەك ژ وان ڤەدگەرێنەڤە سالا (١٢١٧)زایێ، وەكی ئیبن جەبیر د گەریانا خۆدا ئاماژە ب ئێك ژ وان كری دەمێ بەحسی زاخۆ دكەت دبێژیت:

ل وی گوندی خانەكا نوی و یا مەزن هەیە و ل سەر رێكا هەمی خانن و وێ شەڤێ ئەم ماینە ل وێرێ[٩]. هەژی ئاماژێ پە كو ل سالا ١٨٩٤ێ سێ خان ل زاخۆ هەبوون[١٠]. هەروەسان دیرۆكا ئاڤاكرنا گەلەك خانێن دی ڤەدگەرێتڤە بۆ سەردەمێ سولتان حسێنێ وەلی، دناڤبەرا سالێن (١٥٣٤-١٥٧٠)زایێ كو ئەو رابووی ب ئاڤاكرنا كۆمەكا وان خانان ل سەر

كارێ نالبەندیێ



رێکێن ستراتیجی[11]، لێ ب بوورینا دەمی پتریا وان ژناڤچووینە و شوینوارێن هندەکان هەر ئێکجار نەماینە.

ژ وان خانێن ل سەردەمێ سولتان حسێنێ وەلی هاتینە ئاڤاکرن، خانا قەدشێ کو دکەتە ناڤ بازارێ قەدشێ یا نها دا و چایخانەك ل جهێ وێ هاتیە ئاڤاکرن، دیسان خانا کۆرێت گاڤانا ل گوندێ کۆرێت گاڤانا. هەروەسان چەندین خانێن دی ل دەڤەرێ هەبوون[12]، مینا خانا حەجی نەجیبی ل بامەرنێ کو هەتا سالێن چلان ژ سەدسالیا چوویی مابوو، دیسان خانا تاژیکا دناڤ گەلیێ تاژیکا دا ل سەر وێ رێکا دچیتە گوندێن بەراشێ و سویار و سپیندارا ل دەڤەرا بەرواری ژێریا[13]. هەروەسان پێنج خان ل گوندێ ئێتیتێ ل نێزیکی دهۆکێ هەبوون. ئەو ژی خانا سەعید عەبدولرەحیم (شوینوارێن دیوار ودەرگەهەکێ وێ هەیە)، خانا مالا حەموی، خانا حەجیێ سلوی، خانا حەجی سەعیدی، خانا سەلیمێ حەجی. حەجی رەمەزانێ تاهرێ ئیسفێ ژ بابێ خو ڤەدگێریت ودبێژیت، ئەڤ خانە هەمی تژی کاروانی و رێڤنگ دبوون، چونکی ئەڤ گوندە ل سەر رێیا ئامێدیێ وموسلێ بوو[14].

ژ خانێن دی کو ل سەردەمێ حسێنێ وەلی هاتینە ئاڤاکرن خانا ئەرەدنا بوو:

## خانا ئەرەدنا:

وەکی دیار گوندێ ئەرەدنا جهەکێ ستراتیجی یە دناڤبەرا دەڤەرا بەرواری ژووریا و لایێ سپنەی ڤە، لەوما ئەڤ خانە لێ هاتیە ئاڤاکرن کو هەتا سالێن حەفتیان ژ سەدسالیا چوویی مابوو، لێ نها چ ژ شوینوارێن وێ نەمایە و ب تنێ شکلەکێ وێ مایە و ئەو وێنە ب ڤی رەنگی هاتیە سالۆخدان:

(خانا ئەرەدنا ژ دو ژۆرا، یان ژی هۆلا پێکدهێت، هەردو ب رێکا کڤانەیی هاتینە نژنین، بێ گومان ماددێ ئاڤاکرنێ بەر و کلسن، بەرێت شکەستینە، بەلێ ئەم نەشێن بێژین د تراشی و نکراندینە، بانێ خانێ یێ راستە، دیارە ب ئاخێ هاتیە چێکرن، دیسان خانە ژناڤ دا یا کوتنەکری (کورتانکری- لەبخ) بوو، دەرگەهێ وێ دکەڤیتە رەخێ ژێری ئانکو بەرامبەری گوندێن بیباڤا و تاژیکا، بەلێ ڤەلافەتا وێ دیار نینە)[15].

هەلبەت ل دەڤەرێ ب دەهان خان لێ هەبووینە، ژ وان خانێن دی یێن گرنگ ئەڤەنە:

## خانا لالشێ:

ئەڤ خانە دکەڤیتە گوندێ لالش ل لایێ رۆژهەلاتا پەرستگەها لالش ب دووراتیا (١کم) و ناڤێ خانێ یێ ژ ناڤێ گوندی هاتی، یان ژی هندەك دبێژنێ (خانا ئێزدییان) کو جهێ بێنڤەدانا ئێزدییان بوو دەمێ دهاتنە تەوافا پەرستگەهێ، دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ یا دیار نینە، لێ ل دووڤ شێوازێ ئاڤاکرنێ دیرۆکا وێ ڤەدگەرێتەڤە سەدسالیا شازدێ، یان هەڤدێ زایینی، ئەڤ خانە (نەخشێ وێ یێ درێژ و درێژە (١٩,٥٠×٩,٥٠م)، ژ شەش ستوینێت بەرین پێکدهێت، کو گرێت نیرومێکری یێت خانێ هەلدگرن... دیسان چەند ئاڤاهیێت دی هەنە کو ب دیوارێت ژووری و رۆژئاڤایڤە هاتینە نویساندن[16].

## سالۆخەتا ئاڤاهی ژناڤدا:

ئەگەر لێ نیرینەکێ ژ ناڤدا ل ڤێ خانێ بکەین دێ بینین ب ڤی شێوازی یە:

دەرینکێ ئێکێ: دهێتە هەژمارتن دەرگەهێ سەرەکی یێ خانێ و دکەڤیتە نیڤا دیوارێ رۆژهەلاتی، پانییا وێ (١,٨٠م) و بلنداهییا وی (٢,٨٠م)، ئەڤ دەرینکە ب رێکا دەرینکێ دووێ دچیتە دناڤ خانێ دا، کو دکەڤیتە دناڤ دیوارێ ژووری یێ حەوشا کڤانکری دا، پانییا ڤێ دەرینکێ (٢,٧٥م) و بلنداهییا وی (٤,٣٥م). مرۆڤ دشێت د رێکا ڤی دەرینکی را بچیتە سەر ئەردێ حەوشا ب هاریکاریا سێ دەرازینکان، بلنداهییا هەر دەرازینکەکێ (٢٥سم) و پانی (٨٠سم)ن. لێ دەرینکێن سیێ و چوارێ دکەڤنە دناڤ دیوارێ ژێری دا. دەرینکێ سیێ (٥,٣٠م) ژ دیوارێ رۆژهەلاتی دویرە، پانییا ڤی دەرینکی (١,٥٥م) و بلنداهییا وی (٣,٢٠م). دەرینکێ چوارێ ژی (٣,٤٥م) ژ دەرینکێ سیێ یێ

دویرە، پانییا وی (١,٩٠م) و بلنداهی ژی (٣,٤٠م). دەرینکێ پێنجێ ژی دکەڤیتە دناڤ دیوارێ رۆژئاڤایی دا، (٢,٦٠م) یێ ژ دیوارێ دویرە، پانییا وی (١٩٠م) و بلنداهییا وی ٣,٤٠م).

ئەڤێ خانێ چەند ئاڤاهیێت پێڤە نویسیایی هەنە، ژ وانان:

- ئاڤاهیەکێ گرۆڤر، ب درێژاهیا (١٩,٧٠م). پانییا وی ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە (٧٨سم) و ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە (٤,٩٤م)و بلنداهییا وی (٤,٥٠م) و پانییا دیوارێ ژووری (٩٠سم).
- ئاڤاهییەکێ نە ب رێك و پێك، درێژاهییا دیوارێ رۆژهەلاتی (٨,٦٥م) و یێ رۆژئاڤایی (٤,٢٧م) و یێ ژێری (٤,٥٥م) و یێ ژووری (٦,١٨م) و دەرگەهەك دکەڤیتە لایێ رۆژهەلاتیڤە کو دچیتە سەر ئاڤاهیێ دی.
- ئاڤاهییەکێ دی ب درێژاهیێن (١٣×١٠×٦,٦٤م) و ب بلنداهییا (٣,٤٠م)، دیوارەك دکەڤیتە نیڤەکا وی دا، پانییا وی (٩٠سم) و پێنج دەرینك یێن تێدا هەین، پانییا هەر ئێکی (٨٠سم) و بلنداهی (١,٧٠سم)، دەرینکێ ئێکێ دکەڤیتە دناڤ دیوارێ رۆژهەلاتی دا، دویراتی دناڤبەرا دەرگەهان (١,٣٠سم)، پێنج کولینك بۆ رۆناهی و بای دناڤ دیوارێ ژێری دا هەنە[١٧].

هەلبەت ل بازێران ژی ب دەهان خان هەبوون، بۆ نموونە ل بازێرێ دهۆکێ هەر د کەڤندا خان لێ هەبووینە و گەڕیدەکی فەرەنسی ب ناڤێ (هنری بندیە) دگەل هەڤالێن خۆ کو ل هەیڤا چریا ئێکێ سالا ١٨٨٥ێ گەهشتیە دهۆکێ[١٨] دبێژیت:

(ژبەر کو ئەم درەنگ یێن گەهشتین، خودانێ خانێ نە ژ دل دەرگەهـ ل مە ڤەکر، گۆرەپانەکا پری هەسپ و بارگیر بوو)[١٩].

هەر دیسان ئەڤ گەرۆکە دەمێ چوویە ئامێدیێ، بازێری د کاودانەکێ خراب دا دبینت و وەی ئەو دبێژیت: (دێ بێژی هزاران گولێن تۆپان یێن ڤێ کەتین)[٢٠] و ل سەر خانا ژی دبێژیت: (خانەکا کەڤنا هەرفتی، مینا هەر جهەکی لێ هەیە)[٢١].

## ئەڤ خانێن ل دهۆکێ هەین ئەڤەبوون:

### ١- خانا یەلدەی:

خانەکا تا رادەیەکی یا مەزن و نوی بوو پێش خانێن دی ڤە و ژ کەلپیچی هاتبوو دروستکرن، پێکهاتیبوو ژ دو نهۆمان، جهێ وێ ژی دکەتە جهێ بازارێ نها ل نێزیکی پرا نۆهەدرا ل بەرامبەری ئۆتێلا ئاشەوا، پێکهاتیبوو ژ (٢٦) ژووران و دو ئاخویران، ناڤێ خانێ ژ ناڤێ خودانێ وێ (یەلدە) هاتییە، کو خەلکێ (تلکێبێ) بوو، دبێژن کەسەکێ ترانەکەر و ئاقلمەند و بێهن فرەهبوو، ل بەغدا وەغەر کرییە. ئەڤ خانە ژ لایێ عابد محەمەد عومەر ڤە چەند سالان ب کرێ هاتییەگرتن، ناڤبری ل سالا (١٩٣١)ێ هاتییە سەر دونیایێ. پشتی ئەڤ خانە نەمای بوویە گومرکا خوێ و فەرمانگەها تویتنێ[٢٢] و پشتی جەهدە هاتییە ڤەکرن ئەڤ خانە ژ ناڤچوویە[٢٣].

### ٢- خانا حەدادا (ئاسنگەرا):

مەزنترین و کەڤنترین خان بوو ل دهۆکێ، د گۆتنێ خانا ئاسنگەرا چونکی بەری جهێ وێ ببیتە خان جهێ ئاسنگەران بوو و ئامیرێن ئاسنی لێ چێدکرن. ئەڤ خانە د کەتە پشت (خانا رەئوفی و سینەما نەورۆز)، ل دووڤ گۆتنا (محەمەد عەلی سەعید نالبەند) ئەڤ خانە ژ هەمییان مەزنتر و کەڤنتر بوو، لێ بەری هەمییان پویچ بوویە، یا پێکهاتیبوو ژ مەیدانکەکا مەزن و دەرگەهێ وێ دکەتە سەر بازارێ دهۆکێ، دناڤ دا ژی، باکوورێ خانێ ژ ناڤدا چەند دوکانەکێن کەڤن لێ هەبوون و پتریا وان د پشت گوهڤە هاڤێتیبوون و ل داویێ چەند ئاسنگەران تێڤە کاردکرن، ل سالێن داویێ ببوو جهێ فرۆتنا تەرش و کەوالی بەری کو ببیتە جهەکێ سەرەکی ل ناڤ بازارێ دهۆکێ بۆ فرۆتنا پەرۆکان[٢٤].

### ٣- خانا رەزوقی:

ل سالێن سیهان ژ سەدساليیا بووری دگەل قەیسەریا دهۆکێ و چەند خانییەکێن باش ل سەر جادا گشتیا دهۆك- ئامێدی ژ لایێ بەهجەت

مەسکونی ڤە هاتینە ئاڤاکرن، خانەکا نە گەلەك ب رەواج بوو، پێکهاتیبوو ژ مەیدانکەکێ و چەند ژوورەکان، ناڤێ وێ ژ ناڤێ وی کەسی هاتیە (رەزوقی) کو خان ب رێڤەدبر. ئەڤ خانە بۆ دەمەکێ کێم وەکی سینەما هاتە بکارهینان و دبێژن ئەڤ سینەمایە ب ئەنقەستی هاتیە سۆتن، و پشتی هینگێ بەهجەت مەسکونی ژبەر وێ چەندێ، یان ژبەر هەر ئەگەرەکێ دی ملکێ خۆ فرۆتە سلێمان شەعیای و دهۆك ب جهـ هێلا، ل داویا سالێن پێنجیان جهێ خانێ وەکی گومرکا ڤێقی هاتە بکارهینان و پاشی وەکی خواندنگەهەکا سەرەتایی هاتە بکارهینان و نها جهێ وێ بوویە سویکا (چوارگۆشە-مورەبەع)[25].

## ٤- خانا حەجی سەعیدێ نالبەند:

ل ناڤەراستا سالێن سیهان ژ سەدسالیا بووری هاتیە دروستکرن، د کەتە دناڤبەرا دوکانێن عادل ئەسعەدی ژ لایێ رۆژهەلاتی و باکووری و بازارێت نالبەند یێ نها ژ لایێ رۆژئاڤایی، و دێدیکا حەمە کەرۆی ب تەنشتڤە بوو[26]، خودانێ وێ حەجی سەعید کورێ جەرجیسی بوو، ژ بنەمالا نالبەندا بوو، ل سالا ١٩٥٩ێ وەغەر کرییە، پشتی وی کورێ وی محەمەد عەلی کو ژ دایکبوویێ سالا ١٩٣٠ێ یە و نها ئاکنجییێ دهۆکێ یە ئەڤ خانە ب رێڤە برییە و دبێژیت وی بیست سالان ل بەر کارکرییە، بەری ئەڤ جهە ببیتە خان وان دەوار لێ نال دکرن و ژنوی بوویە خان و پشتی بوویە خان ژی پێشییا وێ بۆ نالبەندیێ دهاتە بکارهینان و پاشیێ وێ جهێ ڤەحەواندنا دەواران بوو، هەتا کارێن خۆ ب رێڤەدبرن، یان ژی هندە جاران ب شەڤ ژی د مانە تێڤە و بهایێ کریا وان ژ (٥-١٠) فلسان، بەرامبەری (٢-٣) سەنتا بوو ب رۆژ و دناڤبەرا ((١٠-٣٠) فلسان، بەرامبەری (١٠-١٢) سەنتا بوو ب شەڤ[27].

## ٥- خانا بەهجەت سالح ئەلنعمان:

ئەڤ خانە ب ناڤێ (رەئوف ئەفەندی) یا ناڤداربوو، ناڤێ خانێ ژ ناڤێ خودانێ وێ (بەهجەتی) هاتییە، ناڤبری ژی خەلکێ مووسلێ بوو. دکەتە جهێ (سینەما نەورۆز) ل بەرامبەری فەرمانگەها پۆستە و گەهاندنێ یا کەڤن (جهێ کەلا دهۆکێ یا کەڤن و نها هاتییە هەرفاندن)، خان یا پێکهاتیبوو ژ دو نهۆمان دگەل چەند دوکانان ل سەر رێکا گشتی کو دەرگەهێ سەرەکی یێ خانێ لێ بوو، کەرەستێن ئاڤاکرنا وێ ژی هەر بەر و کێچ بوون، ل داویێ دوکانێن وی د هاتنە بکارهینان بۆ فرۆتنا گەنم و جەهان، تا ل دەستپێکا سالێن حەفتیان کو جادا دهۆکێ یا سەرەکی دبەر را بووری و سیمایێ وێ ژی گوهارتی[28].

## ٦- خانا سەعید بەگێ:

ناڤێ خانێ ژ ناڤێ خودانی (سەعید بەگی) هاتییە کو خەلکێ مووسلێ بوو، جهێ وێ دکەتە جهێ رێڤەبەریا ئەوقافا دهۆکێ و ئۆتێلا ئاشەوا یا نها، ئاڤاهیێ وی سێ نهۆمە بوو، نهۆمێ ئێکێ پێکهاتیبوو ژ چەند ژوورەك و مەیدانەکێ بۆ ڤەحەواندنا دەواران نهۆمێ دووێ بۆ رێڤینگ و خودانێن دەواران و نهۆمێ سێێ بۆ کرێ بوون، و پتریا کرێداران خویندکارێن ئامادەیی و فەرمانبەرێن ل سەر میلاکێ ڤەزا دهۆکێ کاردکرن بوون، پشتی هینگێ ئەڤ ئاڤاهیە بۆ جهێ گومرکا ڤێقی[29].

## ٧- خانا حەجی عەبدالی:

ئەڤ خانە ل سالێن سیهان ژ سەدسالیا بووری هاتییە دروستکرن، کەرەستێن ئاڤاکرنا وێ ئاخ و کێچ و بەر بوون، پێکهاتیبوو ژ چەند ژوور و مەیدانەکا گرتی بۆ ڤەحەواندنا رێڤینگ و دەوارێن وان، جهێ وێ دکەتە بەرامبەر رێڤەبەریا پولیسێن دهۆکێ یێ نها هاتییەهەرفاندن، ناڤێ وێ ژ ناڤێ خودانێ وێ (حەجی عەبدال محەمەد حەجی نەبی). ل دەستپێکا سالێن حەفتیان سیمایێ ڤی ئاڤاهی هاتە گوهارتن[30].

ل بازێرێ زاخۆ ژی وەکی د سالناما ئوسمانی یا سالا ١٨٩٠ێ دا هاتی دو خان لێ هەبوون[31]، ژ خانێن بازێرێ زاخۆ کو ئاماژە د ژێدەران دا پێ هاتییە کرن ئەڤەبوون:

### ١- خانا موشێ گەبای:

دبیت کەڤنترین خان بیت ل زاخۆ، دو نهۆم بوو، دکەتە بەرامبەر بانکا (ئەلرەشید) ل زاخۆ، ب رەنگەکێ رێك و پێك ژ بەرا و کێچیێ هاتبوو دروستکرن و ب دەرەجکا دچوو نهۆما دووێ، پاشتر مینا ئوتێلێ ب ناڤێ ئوتێلا (خابۆر) دهاتە بکارهینان و وەکی ئوتێلا دووێ بوو ل زاخۆ ل سالێن پێنجییان، دو دەرگەهـ دچوونێ، ئێك ژ جادا (الجار سی)[٣٢] ل ژووری و یێ دووێ ل بەرامبەری دەرەجکێن قایمقامیێ، ئەڤ جهە وەکی یەکەم گەراج بۆ ترومبێلێن بچویك هاتییە بکارهینان و هەروەسان وەکی یەکەم پانزینخانە و گەلەك بازرگان دناڤدا هەبوون[٣٣].

### ٢- خانا حەجی عەلی قۆچەبەگی:

دکەتە جهێ بازارێ بەرێ یێ گۆشتفرۆشا ل رۆژئاڤایێ خواندنگەها بهار، ئەڤ خانە ژ لایێ (حاجی میرشامی) د هاتە برێڤەبرن[٣٤].

### ٣- خانا حەجی ئیبراهیمی:

دکەتە جهێ ئوتێلا (ئەلئەمین) یا نها ل رۆژهەلاتی جامعا حەجی براهیمی، ئەڤ خانە جهێ ڤەحەواندنا خەلکێ گوندان و دەوارێن وان بوو[٣٥].

### ٤- خانا ئەحمەد حاجای:

دکەتە رۆژئاڤایێ ناڤنجیا بەردخان، ژ لایێ (ئەحمەد شازو) ی ڤە دهاتە ب رێڤەبرن[٣٦].

ل ئاکرێ ژی ئەڤ خانە هەبوون:

**١- خانا حەیوانان.**

**٢- خانا حەجی حەسەنی**

کو ل سالێن چلان ئەڤ خانە هەبوو، یا رێڤەبەرێ بازێرڤانیا ئاکرێ دناڤبەرا سالێن (١٩١٢- ١٩٣٦) بوو[٣٧].

هەر دیسان هەتا دەستپێکا سەدسالیا بیستێ خان ل بنێ سویکا ئامێدیێ هەبوون و نالبەندی ژی بوون، دکەتنە پشت سویکا نها بۆ لایێ رۆژئاڤایی و دگۆتنێ (مقێمێ) و کاروانێن مەزن دهاتنە وێرێ کو هندەك دگەهشتنە (٣٠٠- ٤٠٠) هێستران و ژ خانێن مەزن ل ئامێدیێ خانا (مەمیا)، یان ژی دگۆتنێ (خانا مەمکا) هەبوو[٣٨].

## ژێدەر پەراوێز:

١. خانا لالشێ، د. زیدان رەشید، گۆڤارا دیرۆك، ژمارە ٣ سالا ٢٠١٤، بپ٦؛ هەلشکافتنەك ل سەر خانا ئەرەدنا، کۆڤان ئیحسان. گۆڤارا سیلاڤ، ژمارە ١٠٢، بپ ١١.
٢. گۆڤارا دیرۆك، هەمان ژمارە، بپ١٣.
٣. هەمان ژێدەر.
٤. سعید الحاج صدیق الزاخویی، زاخۆ، الماضی والحاضر، (دهۆك)، ص٣١١، ؛ خانێن دهۆکێ، بپ٢١، کامیران درباس هرۆری، گۆڤارا دهۆك، ژمارە ٥ سالا ١٩٩٨آ.
٥. زاخۆ، الماضی والحاضر، ص٣١١.
٦. هەمان ژێدەر.
٧. هەمان ژێدەر.
٨. هەمان ژێدەر، بپ٣١٢.
٩. هەمان ژێدەر، بپ٩.
١٠. زاخو... الماضی والحاضر، بث١١.

# خوارنێن کوردی

محەمەد حەسەن بناڤی

## پێشگۆتن :

هەر مللەتەکێ ل سەر رویێ ئەردی ژیای پێکوّل کریە ژیارا خوە ژ وی ئەردێ ل سەر ژیای پەیدا بکەت. ڤێجار هەر ژ چەرخێن کەڤن هەتا ڤۆناغێن هەڤچەرخ ، هەر نەتەوەیەکێ و ل دووڤ پێدڤیاتیێن خوە و سرۆشتێ جوگرافیێ خوە ژیانا خوە بریە سەری.

نەتەوا کورد ژی یەك ژ وان نەتەوانە یێن دکاودانێن خۆش و نەخۆشدا ، بەردەوامی دایە ژیانا خوە، شیایە خوە بکریت و ژ ناڤ نەچیت وەکی مللەت و خوە بپارێزیت.

نەتەوا کورد شیا کولتور و زمان و دیرۆك و داب و نەریتێن خوە ژ گشت لایانڤە بپارێزیت. خوارن یەك ژ وان لایەنێن ژیانێ نە، یێن مللەتێ کورد پاراستین و نەهێلای ژ ناڤ بچن. باب و بابکالێن مە ل کاودانێن سەخت و دژوار، ل خەلا و بەلا شیاینە کار د ئاخا خوە دا بکەن و د ژیانێ دا ب مینن و ژ ناڤ نەچن و خوارنا خوە ب دەست خوەڤە بینن، بێی هەوجەی خەلکەکێ دی ببن. ئەو ژی ب رێیا چاندنێ و وەکی دیار کوردستانە بۆ یەکەم جار د دیرۆکێ دا چاندن لێ هاتیە کرن و خوارن ژ چەندین تشتان پێك د هاتن، ژ دان و دکاکی مینا گەنمی و جەهی و خوروبی و تەحلە و گارس و گەنموّك و کەردر و برنج و نیسك و نۆك و ماشان و ... هەر وەسان ژ رەنگێن گۆشتی ژی. یێ تەرش و کەوالێن کەهیان، یان یێن ماسی و گیانەوەر و تەیر و تەوالێن کیڤیان، ب رێیا نێچیرێ. دیسان سرۆشتێ کوردستانێ یێ دەولەمەندە ب گەلەك جۆرێن گیایان. ژ ڤان تشتان کوردان خوارن ژێ دروست دکرن و هەر نەهـ دەهـ رۆژەکان جارەکێ دوورا خوارنەکێ د زڤری بۆ خۆ دروست بکەن.

هەر چەندە دبیت خوارنێن کوردان ب رەنگەکێ گشتی وەکی ئێك بن، لێ دبیت هندە جاران خوارنێن تایبەت ب دەڤەرەکا تایبەت ڤە هەبن، کو د تایبەتمەند ن ب وێ دەڤەرێ ڤە و ئەگەر رەنگە جیاوازیەك ژ دەڤەرەکێ بۆ ئێکا دی هەبیت ژی نە گەلەکا مەزنە.

ل خوارێ ژی چەند خوارنێن د تایبەت ب پارێزگەها دهۆکێڤە، کو ئەو ژی دابەشکری نە بۆ سەر سێ پشکان :

### پشکا ئێکێ:گرارێن کوردەواریێ یێن هشك و رۆن: - سمیتك*:

پشتی دانێ سمیتکێ دهاتە پاقژکرن و دبژارت. قازان ددانا سەر کوچکی و هندە ئاڤا کەلاندی دکرێ. دان د کرە د قازانێ دا و پیچ پیچە تێکڤە ددا و هندە خوێ دکرێ. یێ ڤیابا دا پیڤازی هویر کەن و کەنە دناڤ

ساڤار



رۆینی دا و داننە سەر ئاگری، و بێ نەڤیابا ژی نە دکرێ هەتا پیڤاز د قەلیان و دا ب سەر گرارێ وەرکەن و تێکڤە ددا.

## - ساڤار:

ڤێ خوارنێ ژ گەنمی دهێتە چێکرن. پشتی گەنم د هاتە کەلاندن و هشککرن و قوتان و هێران و پاقژ کرن و دانابای، ساڤار تێرا خوە دکرە ئامانەکی و پاقژ دکر و بژارە دکر ژ دندکێن پیس و گر و نەهێرای و دەغەلان. ئاڤ ب قایدا گرارێ د کرە قازانێ و د کەلاند و ساڤار دکرە سەر، و پیچە تێکڤەددا وەدرپۆشا قازانێ ددانا سەر و ئاگر ل بن کێم دکر و خوە لێ دگرت، هەتا ئەو ئاڤ ل بەر هشك دبوو. پاشی رۆین د ئاقلەویکەکێ د حەلاند هەتا داخ دبوو، و ب سەر وەردکرن و پیچە تێکڤەددا، دا رۆین دناڤ هەمیێ دا حەلببا و پیچەك د هێلاڤە ل سەر ئاگرەکێ رەحەت و ددانا، و خوە لێ دگرت هەتا ڤەدوەرها و تاما خوە ددا، ل بەرێ بەهرا پتر، یان هەمی رۆینێ خۆمالی بوو، یان ژی قەلیەکا تێر پشك دکرە سەر ساڤارێ و تامەکا تایبەت ددایێ. ئەگەر ل بەرێ رۆین ب سەردا دکر، لێ نەهو رۆینی دکەنە قازانێ و داخ دکەن و ژ نوی دانی دکەنێ و تێکڤە ددەن و ئاڤا کەلاندی ب قایدا وێ دکەن سەر و د نخێمن و ژ سەر کوچکی ددانن خوە لێدگرن هەتا چێدبیت و ژ سەر کوچکی ددانن.

ساڤار خوارنەکا خوەش و ب قیم بوو لەورا هاتییە گۆتن: (ساڤار ئالیکا مێرایە).

## - دانهێرك :

ڤێ گرارێ ژی هەر ژ گەنمێ نە کەلاندی دروست دکەن. گەنمێ پاقژ کری دبەن ل دستاری، یان ل ئاشی دکەن و دهێرن و ل مۆخل و بێژنگا دکەن. ئەو دانێ ب سەر بێژنگێ دکەت د گۆتێ (سەرۆکە). ئەوێ بن مۆخلێ دکەت ژی د گۆتێ (هویرکێ دانهێرکی) و ئەوێ دما د مۆخلێ دا دانهێرك بوو.

پشتی دانهێرك د هاتە بەرهەڤکرن، هەر وەکی ساڤارێ د هێتە لێنان و خودان ل دووڤ حەزا خۆ دشێت گیایەکی ، یان پیڤازێ بکەتە بەر.

- **دانکێش**[1]:

دانێ گرێ دانهێرکییە (سەرۆکە). ل هندەك دەڤەران

د لێناو د خوار وەكی گرار. دیسان وەكی ساڤار و دانهێركان دهاتە لێنان.

## - دانقوت:

هەر ژ گەنمی د هێتە دروست كرن. پشتی ب ئاشی، یان ب جوهنی د هێتە قوتان و تیڤلێ وی د سەردا دچیت و هشك دبیت. د بژێرن ژ دندكێن خرش و خراببووی و پیس پاقژ دكەن و ژ نوی دەست ب لێنانا وی دكەن.
قازان ددانا سەر ئاگری (كوچكی) دا هندەك روینی، یان قەلیێ كەنێ، و هندەك پیڤازا كەنە بەر، دان دكر سەر و ئاڤ دكر سەر، هەتا دزانی تێرا هەیە. دا ئاگری دەنە بن هەتا د كەلی و كابانی ل بەر د رادوەستا دا نە سۆتبا و تاما وێ خۆش هاتبا.

## - دانلۆق (دانەلۆق)[2]:

هەر ژ دانقوتی دروست د كەن و ئەڤ خوارنە یا رۆهنە وەكی شۆربا. روین، یان قەلی د كرە قازانێ و ئاڤ د كرە سەر هەتا د كەلی و دبیت ئەگەر هەبان گیا و هەستیك ژی كریانێ، وهندەك دانقوت دكرە بەر و هەر تێكڤەددا هەتا باش د ناڤ ئێك هەلدبوون. هندەكان ژی كوتلكێن هویرێن بێ نافك دكرنە بەر و دەرپۆشا قازانێ ددانا سەر و ئاگر ل بن كێم دكر هەتا ب دلێ خۆ چێدبوو، و ددانا هەتا تاما خوە ددا و ب شیڤێ د خوار (ل بەرێ ب فراڤینان نە د خوارن).

## - دانقوتماش [3]:

هەر دانقوتە و ژ گەنمێ قوتای و نە كەلاندی دهێتە چێكرن. لێ ب تنێ ماش د كرن بەر. ل بەراهیێ ماش دهاتنە زەركرن و ئەو دگەل دانقوتێ پێكڤە دكرنە د قازانێ دا و ئاڤا كەلاندی ب سەردا دكر و هندەك روین و پیڤاز دكرن ناڤ و تێكڤەددا ، هەتا باش د ناڤ ئێك هەلدبوون ، و دەرپۆشا قازانێ ددانانە سەر و د ما ل سەر ئاگرەكێ كێم هەتا چێدبوو . پاش دا دانن هەتا ڤەدهوسی و ژ نوی رۆی دكر.

## - پەلاڤ[4]:

برنجا هشكە، ب تنێ. خوارنا كەدخوەدابوو. پشتی برنج ژ دندكێن خراب و رزی و پیس و ب پیش دهاتە پاقژ كرن و زەردكرن، یان ژی دەمەكی د هێلا د ئاڤێ

پەلاڤماش



دا. پاشـی روین دكره قازانێ و ئاگر ددانا بن هەتا باش داخ دبوو و برنج د كره سـەر و تێكڤە ددا و هندە خوێ پێوەر دكر. پاشـی ئاڤا كەلاندی دكره سـەر و د نخافت هەتا د كەلی . پشتی هینكێ ئەگەر زانیبا ئاڤا وێ یا كێمە ، دا هندەكا دی كەنە سـەر و ئاگری ل بن كێم كەن هەتا ڤەدهوسی و چێدبوو. و ژ نوی دا ژ سـەر كوچكی دانن .

## - پەلاڤماش(٥)

وەكی پەلاڤێ یە، لێ ماش ل سـەر دهێنە زێدە كرن. ماش دهێنە زەركرن، پاشـی برنج دهێتە شـویشـتن و بۆ ماوەیەكی دمینتە د ئاڤێدا و قازانێ ددانن سـەر ئاگری و روینێ د كەنێ هەتا د حەلهیت و داخ دبیت. پاشـی ماش و برنجان تێكەل دكەن و د كەنە قازانێ و تێكڤە ددەن هەتا باش تێكەل دبن و تێرا وان ئاڤ و خوێ ژی د كەنێ و تێكڤە ددەن و دەرپۆشـا قازانێ ددانن سـەر هەتا د كەلیت و هشـك دبیت. و دێ خۆ لێ گرن هەتا ڤەدهسیت و دبیت ئەڤ مالێن پێ چێبووی گۆشـتی ژی ب كەنە بەر.

## - چرخیس (٦) :

ئەڤ خوارنە ژ جەهێ قوتای دهاتە دروسـت كرن. وەكی گەنمێ دانقوتێ د جوهنی یان تشـتەكێ دی دا هاتە قوتان. پشـتی هشـك بوونێ ل دسـتاری د كر و د هێرا. ل دیڤ دا ل مۆخلێ ، یان بێژینگەكا هویر دكر. پاشـی دا روینی كەنە بنێ قازانێ و حەلینن و ئەو ئاركێ هویرێ ب بن مۆخلێ كەتی كەنە سـەر و هەتا باش د كەلی. پیچەك یا تام روهنا كوسـپەیی بوو. وەكی گولولان خالی دكره لەگەنان و خۆ لێ دگرت هەتا سار دبوو. پاشـی نیڤەكا وێ قۆر دكر، و دۆشـاڤ، یان روین دكره وێ قۆرێ و گرارا خوه پێ د خوار. ئەو سـەرۆكێ (دانێ) ب سـەر مۆخل و بێژنگا دكەت دگۆتنێ دانهێركێ جەهی، و ئەو ژی وەكی دانهێركێ دهاتە لێنان .

## - چیچاڤك(٧):

خوارنەكا كەڤنا دەمێن بەرتەنگاڤیانە، ژ گارسـی د هێتە دروسـت كرن، ل شـوینا برنجی، یان دانەكێ دی گارسـی د كەنەبەر. گارس د جوهنی دا دهاتە قوتان هەتا تیڤلێ وی د سـەردا د چوو. پاشـی دا شـۆن و دەوی كەنە قازانێ و دانن سـەر كوچكی و تێكڤەددا هەتا د كەلی و گارس دكره بەرو تێكڤە ددا هەتا هشـك د بوو، و پشـتی د تەزی نیڤەكا وێ قۆر دكر و تژی روینێ خۆمالی، یان دۆشـاڤ د كر، و خوارن بەرهەڤ دبوو بۆ خوارنێ.

## - دەوین(٨):

خوارنەكا كەڤنە و ل هەر چوار وەرزان دهاتە چێكرن. ل هندە دەڤەران مینا شـنگالێ دبێژنێ (مەیر). خوارن ژ دەوی و دانقوتی (دانقوتێ گەنمی، یان جەهی) د هاتە چێكرن . ئەگەر زڤسـتان با، كەشـك د بشـافت و دەوێ كەشـكێ ب كار دئینا. لێ ل وەرزێن دی یێن سـالێ، دەوێ مەشـكێ دهاتە ب كار هینان. لبەراهیێ گەنم، یان جەهـ دهاتە قوتان و شـویشـتن و بەرهەڤكرن، دا ب قایدا مالێ دەوی كەنە قازانێ و ل سـەر ئاگری تێكڤەدەن هەتا كەل دهاتێ، پاشـی ئەو دانقوتێ بەرهەڤكری دا كەنێ وەكی مەرقێ و دیسان هەر تیكڤەددا دا مەرقا وێ نەمینتە ب بنێ قازانێ ڤە و هندەكان نۆك، یان رەنگێن گیایان، مینا بەلگێن سلكا و پوینگ و تێهنافك و جاتر ژبۆ تامێ دكرنە بەر.

## - گارسدهۆك یان داندهۆك(٩):

ئەڤ خوارنە پتر ل وان دەڤەرێن گارس لێ دهاتە چاندن یا هەی، ل شـوینا برنج و گەنمان ب كار دئینا. خوارنەكا رۆهن بوو نەك هشـك و كوسـپەیی. پشـتی گارس دهاتە قوتان و پاقژ كرن و شـویشـتن، دەو ئامادە دكر و ب قایدا مالێ دكره قازانێ و ددانا سـەر ئاگری و ب هوسـكیان* تێكڤەددا دا ڤردی ڤردی نەبیا هەتا

كوتل دەوك



كەل دهاتێ. پاشی دا لەپەكێ گارسی، یان پتر وەكی مەرقێ كەنێ و تێكڤەددا ب بنیڤە نەمابا و هندە جاران هندە گیا، مینا بەلگێن بەقلی و سلكا و پوینگ و نەعناع و تێهنافك و جاتر ژبوو تامێ دكرنێ.

## برنجدهۆك[10]:

ژ دەوی و برنجی د هێتە دروستكرن. برنج دهێتە بژارتن و پاقژ كرن و شویشتن، و تێرا خۆ دەوی كەنە قازانێ و ئاگری ل بن هەلكەن و تێكڤەدەن هەتا كەل دهێتێ. پاشی دێ هندە برنجی وەكی مەرقە[11] كەنێ و هەر جار جار دێ تێكڤەدەن دا نەدەت بنێ خوە و پێڤە بمینت. دیسان هندە گیایان ژی ژ بۆ تامێ مینا پوینگی و تێهنافكێ و جاترێ و ... كەنێ. یان هندە جاران كوتلكێن هویرێن بێ نافك و گورۆڤڕ دكەن ناڤ و د كەلیت هەتا پیچە تیر و هشكڤە دبیت، پشتی خوارن د تەزیت دخۆن.

## - كوتلدهۆك [12]:

ئەڤ خوارنە ل هەر چوار وەرزێن سالێ دهێتە دروست كرن، ب تایبەت ل بهاران كو شیر و رەنگێن گیایان كو دكرنە بەر د مشەبوون. خوارنەكا روهنە، ژ دەوی و كوتلكان دهێتە چێكرن. دانهێرك د نماندن و كوتلكێن هویر و گورۆڤڕ ژێ بەرهەڤدكرن كو بكەنە قازانێ. هندەكان كوتلكێن مەزن ژی دگەل دكرنێ و ناڤك دكرن د بەررا، ڤێجا ئەو ناڤكە چ قیمە با، كو ژ گۆشتی و كەرەفس و پیڤازان پێك دهات، یان ژی ئارخافك و قەلیبان و ئەڤ خوارنە مینا وان خوارنێن دەوی كو ل پێشتر ئاماژە پێ هاتییە دان دروست دكرن و مەرقێ ژی د كەنێ كو باراپتر برنجە، لێ ل نەیێ دانێن دی ژی د كەنێ و هەر دبەررا تێكڤەددەن و ژ بۆ تامێ ژی گەلەك جاران گیایا دكەنێ.
هندەك دبێژنە ڤێ خوارنێ (دۆغەبا)، كو فارس ژی ب كار دهینن.

## - گولۆل[13]:

خوارنەكا هشكە، ژ دەوی و برنجی دهاتە چێكرن و لێنان. پشتی برنج دهاتە بژارتن و پاقژ كرن و شویشتن، قازان ددانا سەر ئاگری و ب قایدا مالێ دەو

دکرنێ و تێکڤەددا هەتا دکەلی. پاشی مەرقە (برنج) دکرێ، و چ کوتلك، نە هویر و نە گر نە دکرنەبەر. تێکڤەددا هەتا زانیبان ئێدی نامینتە ب بنیڤە و دا هێلنە ل سەر هەتا کەلیبا. پشتی د کەلی دا رویکەن ئامانا هەتا باش د تەزی و هشك د بوو مینا قالبەکی لێ دهات، دا نیڤەکا وێ قۆر کەن و تژی دۆشاڤ، یان روینێ خۆمالی کەن و پێ د خوار. گۆتنەکا مەزنان ل سەر دبێژیت: (گولۆلە، ب روینی شۆلە).

## ڤرك[١٤]:

خوارنەکا رۆهنە (شۆربەیە). روین و پیڤازان تێکدا د بنێ قازانێ دا سوور، یان داخ دکر و ئاڤ دکرە سەر. پشتی ئەو ئاڤ د کەلی، ساڤارێ بژارتی و خوێ دکرنێ و هندە جاران گیا ژی د کرنێ، یان سادە ژی دروست د کر و تێکڤە ددا و خوە لێ د گرت هەتا د کەلی، پاشی ددانا و ب نانی د خوار.

## - کوتلهویرك[١٥]:

خوارنەکا رۆهنە. ژ گیایێن بهاری و ترشی و برنجی پێك د هات. ژ وان گیایان ژی (سێبسك ، گەنمۆك ، گەزنگ، پوینگ و ... هتد). ل دەستپێکێ دا هندە دانهێرکی نمینن و هەڤیرکەن و هندە کوتلکێن هویر و گوروڤر و بچویك ژێ چێدکرن. پاشی ئەو گیایێ هەیی دا زەرکەن. ل دیڤدا دا روینی و پیڤازا کەنە دقازانێ دا و گیایێ زەرکری کەنە سەر و تێکڤەددا و کوتلك کت کت دبەر تێکڤەدانێ را دکرنێ، دا نەمابانە پێکڤە. هەر دیسان لەپەکێ برنجی ژی وەکی مەرقە دکرێ و پیچەك تێکڤەدداڤە و هندەك سماق ژی د بشافت و ترشێ وێ دکر بەر و دهێلا ل سەر ئاگری هەتا چێدبوو. دڤێ خوارنێ دا هندە جاران کوتلکێن مەزن ژی چێدکرن و تژی بەر قەلی د کرن و د ناڤ دا د کەلاندن، لێ بەهرا پتر کوتلکێن هویر بوون.

## ئاڤرینك[١٦]:

ل بەری هەر تشتەکی دا هندە دانهێرکی، یان ساڤاری نمینن و کەنە هەڤیر و کوتلکێن هویر ژێ چێدکرن، هندەك کولندێ خوارنێ هویر دکر و د شویشت و د کر ئامانەکی. ل دیڤدا دا قازانێ داننە سەر ئاگری و هندەك روینی کەنە بنێ وێ و د حەلاند و هندەك پیڤاز هویر د کرن ناڤ. پاشی هندەك نۆك و هەستی د کرن بەر ئەگەر هەبان و تژی سەر ئاڤ دکر و د کەلاند. پاشی هندەك برنج د کر بەر، دگەل کولندێ هویر کری (یان ل هندە جاران ل شوینا کولندان شێلم هویر دکرن بەر)، و دکەلاند و ئەو کوتلکێن هویر کت کتە دکرنە تێدا و هێدی تێکڤەددان، دا نەمابان پێکڤە، و دما ل سەر ئاگری هەتا باش دکەلی و چێدبوو، و دهێلان هەتا سار دبوو .

## ئاڤپیڤازك (ئاڤویرك)[١٧]:

تێدا چەند پیڤاز دێ هێنە قەدکرن و هندە گۆشتێ ب بەز کەنە پشکێن هویر. پاشی دێ قازانێ داننە سەر کوچکی و هندە روینی کەنێ و گۆشت و پیڤازان باش شۆن و کەنە دناڤدا و تێکڤەدەن و ئاڤێ کەنە سەر و خوێ پێوەرکەن و هندەك ل دووڤ دلێ خۆ دەرمانك و بهاراتان ژی دکەنێ، دهێلا ل سەر ئاگرێ هەتا باش د کەلی.

## - گرارشیر[١٨]:

ئەڤە خوارنەکا رۆهنە مینا شۆربان، باراپتر بۆ نەساخان، کو نەشێن خوارنان بخۆن یان بچویکێن ژ نوی فێری خوارنێ دبن د هێتە چێکرن. ل دەستپێکێ برنج د بژارت و د شویشت. پاشی دا قازانێ داننە سەر ئاگری و ب قایدا خوارنا وان دڤێت دا شیری کەنێ و پیچەکا ئاڤێ کەنە سەر و تێکڤەدەن هەتا کەل دهێتن. پاشی دێ برنجی کەنە بەر و پیچەك تێکڤەدەنەڤە هەتا د کەلیت. و برنج د ناڤ ڤێ خوارنێ دا د حەلهیت. ڤێ خوارنێ روین پێ نەڤێت، چونکی شیری پێکهاتەیێن روینی یێن دناڤدا هەین.

## - سلکهویر (سلکین)[١٩]:

ل دەستپێکێ سلك د هاتنە شویشتن و سپیکرن و کەرکرن. پاشی د کرنە د قازانێ دا و ددانانە سەر

ترشك



ئاگری و د كەلاندن. ل دووڤـدا دئینانەدەر و هویر دكرن، جارەكادی د كرنەڤە ناڤ وێ ئاڤێ یا سلك تێدا كەلین، هندەك ڕوین د كرێ و هندەك سماق د هاتە بشافتن و ترشێ وێ د كر ناڤ، پاشی برنج د شویشت و قازانكا خوە دداناڤە سەر ئاگری و برنج ژی د كر ناڤ و هندەك خوێ پێوەردكر و تێكڤە ددا هەتا سلك و برنج تێكەلی یەك ببان، خوە لێدگرت هەتا برنج و سلك پێكڤە چێدبوون و ئاڤا وێ ژی هشك دبوو، ئاگر ل بن دهاتە كێمكرن هەتا ب دلێ خوە د كەلی و ڤەدهوسی و بێهنا خوە بەردا و خوارن خۆشتر لێ د هات ئەگەر هەستی كریانە بەر.

## برنجا ب شێلم (شێلم سۆرك):

پشتی شێلم د هاتنە زەركرن، نیڤ كەلی د بوون، ئەو ئاڤكا شێلم تێدا زەركرین د هێلا د قازانێ دا و دداناڤە سەر كوچكی و برنجێ بژارتی و پاقژ و شویشتی د كر ناڤ وێ ئاڤێ تێكڤەددا، و ڕوین و خوێ د كرن ناڤ و تێكڤەدداڤە هەتا باش د ناڤێك هەلدبوون، و دهێلان هەتا دكەلی و ژ سەر كوچكی ددانا.

- **ترخینا ترشی**[٢٠]:

گیایێن بهاری، مینا (گەزنگ، پوینگ، كەڤیر، ترشۆك، گەنمۆك، سێبسك و ... گەلەكێن دی ) دكرن و پاقژ دكرن و د شویشتن. پاشی دكرنە د قازانێ دا و د كەلاند و ترشیێ سماقێ د كرە سەر و زەر دكر و د كەلاند. پاشی د ا ئینن برنجی، یان دانقوتی شۆن و پاقژ كەن و كەن بەر، هەلبەت ڕوین و خوێ ژی دكرنێ، و ئەگەر خودان بێ پێچێبووی با دا برنجی كەنە بەر و ئەگەر نە، دا دانقوتێ كەنێ، و ئاگر ددانا بن د كەلاند هەتا هشك د بوو، دناڤ ئێك هەلدبوو. تاما وێ خۆشتر لێ د هات ئەگەر هەستی ل بەریان.

## ترشك[٢١]:

ئەڤ خوارنە هەر ژ كەڤندا ل ناڤ كوردا یا بەلاڤە. ل دەستپێكێ قیمە بۆ ناڤكێن كوتلكان چێدكر. ناڤك ژ گۆشتێ قیمە كری و كەرەفس و پیڤازێن هویركری، دگەل هندەك دەرمانكان پێكڤە تێكەلی یەك د كرن و پیچەك ڕوین د كر ناڤ و ل سەر ئاگری د ما هەتا پیچەك د كەلی و چێدبوو. هەر دیسان

دانێ کوتلکان، کو ژ دانهێرکێ هویر د نماند و هەڤیر دکرن و گرکێن ب قایدا کوتلکان ڤەدبرین، ناڤکێن بەرهەڤکری د کرن د بەررا و سێنیەکێدا رێز د کرن و د بەرهەڤبوون بۆ کرنا قازانێ.
پاشی قازانەك ددانا سەر کوچکی و هندە ئاڤ دکرێ و ئاگر ل بن خوەش دکر، هندەك بەقل ، یان بەلگێن سلکان هویر دکرن و د کرنە ناڤ ئاڤا ترشکێ و هندەك سماق دبشافت و ئاڤا وێ د کر ناڤ وێ ئاڤێ، و هندەك روین ژی دکرە ناڤ و تێکڤەددان هەتا کەل دهاتێ، کوتلك کت کت د کرن تێدا و تێکڤە ددا، هەتا هەمی کوتلك خلاس د بن و هەر د هێنە تێکڤەدان دا پێکڤە نەمینن و نەمیننە ب بنێ قازانێ ڤە، پاشی دەرپۆشا وێ ددانا سەر هەتا باش دکەلی و د زانی یا چێبووی
گەلەك جاران ئەگەر سلك هەبان د کرنە بەر و د گەل دکەلاندن، بڤێ چەندێ ئاڤکا وێ سوورڤە دبوو ، و تاما وێ ژی مز د بوو، لێ نهو د بیت ل شوینا سماقێ پیچەکا لەیموندزێ بکەنێ. هەروەسان مەعجینێ تەماتێ ژی د کەنێ، دا ئاڤکا وێ سوور و تام ترشڤە دبیت.

## ئێخنی (ئیغنی)[22] :

کوتلکێن ڤێ خوارنێ ژ دانهێرکی، یان برنجی دهێنە چێکرن. ل دەستپێکێ برنج و گوشت پێکڤە د قوتان هەتا هەردوو پێکڤە هویر دبوون و تێکەلی هەڤدبوون، وەکی هەریسێ لێ دهاتن. پشتی هینگێ ئەو تێکەلە د کرە کوتلکێت بچویك و گۆڕۆڤر، ناڤکێن قیمەی د بەرا دکرن پێ دهاتنە داگرتن. هندە جاران هویرکێ کاکل باهیڤان ب قیمەی وەردکر و ترشێ سماقێ نە دکر بەر، بەلکی یا بێ ترشە. شوینا ترشی باجان سوورك د مەرچقاندن و ئاڤکا وان دکر بەر، هندەك مەعجینێ تەماتێ دکەن بەر و دیسان هندەك ژێو تامێ، بەلگێن سلکان یان بەقلی هویر دکەن بەر دا تاما وێ خوەشتر لێ بهێت.

## شلا ترشی[23] :

ئەڤ خوارنە ژ بەلگێن سلکان، یان بەقلی و گیایێن بهاری دهاتە دروست کرن. پشتی بەلگێن سلکان د هێنە هویر کرن و زەرکرن و پاقژ کرن. قازانێ ددانن سەر ئاگری و روینی و خوێ دکەنێ و بەلگێن سلکان پێن هویر کری و شویشتی دکەن ناڤ، دگەل گلاسەك، یان دو گلاسێن ئاڤا سماقێ (ترشی) ب سەردا دکەن و تێکڤەددەن هەتا دکەلیت. پاشی دێ هندەك برنجی وەکی مەرقە شۆن کەنە بەر و هێلن هەتا د کەلیت. ئەگەر ئەڤ خوارنە ب گیایێن بهاری ژی بهێتە دروست کرن، هەر ب ڤی رەنگی دهێتە لێنان.

## - هەڤریشك[24] :

خوارنەکا کەڤنا کوردەوارییە ژ نانی و شیری دهاتە دروست کرن. ل دەستپێکێ نان (چ یێ رەق و چ یێ نەرم) هویر دکرنە ئامانەکێ کویر و بەرفرەهـ. پاشی شیر ب سەردا د کر هەتا ئەو نان نەرم دبوو و شیر دکێشا خوە و دادانانە بەر سەیێن بەر پەزی[25].
هندەك جاران ئەڤ خوارنە ژ نانێ تەنکێ قەلاندی و رەق و روینی خۆمالی و دۆشاڤێ ژی چێدکرن. ئەڤ خوارنە ددانە سەیێن بەر پەزی ژی ب تایبەت ل چیا.

## - پەردەپەلاڤ[26] :

خوارنەکا پر بهایە. ژ برنجی و گۆشتی و هێکا و باهیڤ و خاتینۆك و بەزالیا پیچەکا ئاری، دگەل بکارهینانا خوێ و بهاراتان و روینی و هێلێ. ل دەستپێکێ برنج دێ هێتە شویشتن و زەرکرن، گۆشتەکێ زۆر دێ هێتە هویرکرن و خوێ و بهاراتان پێوەرکرن و تێکڤەدەن و هەڤیرکەن و گولومچکێن بچویك ژێ چێکەن و دروینیدا قەلینن، هەر ب وێ روینی خاتینۆك و باهیڤ و بەزالیا ژی قەلینن و سوورکەن، پاشی وێ هێکا نە کەلاندی دگەل ئاری و ئاڤێ دێ پێکڤە هەڤیرکەن، هەتا هەڤیرەکێ

کێپاری



باش ژێ چێدبیت. ئەو ئامانێ هاتی بەرهەڤکرن، دێ ناڤا وی و رەخێن وی روینی تێدەن و پیچەکا ئاری پێوەرکەن. پاشی دێ هەڤیرێ خوە وەکی نانێ تیرکی یێ تەنك پەحنکەن و ب وێ پەحنیاتیێ دێ کەن د ئامانێ ئامادەکریدا و دڤێت ئاگەهـ ژ هندێ هەبیت، ئەو هەڤیرێ وەکی نانی قەد نەبیت و لێڤێن زێدە ب سەر لێڤێن ئامانیدا د چن. پشتی هینگێ برنجی و باهیڤا و خاتینۆکا و هێلێ و کوتلکێن هویرێن قیمەی و بەزالیا دێ تێکەلکەن و کەن د وی ئامانیدا و هەر کوژیەکی دێ هێکەکا کەلاندی و سپیکری دانن و ل دووڤ حەزا خوە. پاشی دێ هندە ئاڤە گۆشتێ، یان ئاڤخوێ ب سەرداکەن و سەرێ برنجی دێ ب وان لێڤێن هەڤیرێ زێدە گرن و ب سەرکڤە بەن و کەن د فرنێدا ب پلەیەکا گەرما ناڤنجی، تا کو هەڤیر ڕەنگێ براشتی ددەت و سوور دبیت. دێ ژ فرنێ ئینن دەرێ و وەرگێرن سێنیەکا بەرفرەهـ و هێتە خەملاندن ب زەیتونا و باجانسوورکا و ... کابانی دشێت شوینا کوتلکێن هویرێن قیمەی گۆشتێ و ماسی و مریشکان بکاربینن. ئەڤ خوارنە ل دەڤەرا زاخو یا بەربەلاڤە.

## - کێپاری (سەروپێ) [٢٧]:

خوارنەکا بەربەلاڤە و ل هەر چوار وەرزێن سالێ د هێنە چێکرن. پشتی کوال دهاتنە سەرژێکرن، سەرك ژ خوینێ و پیساتی دهاتە پاقژ کرن و شاخێن وان ژێ دئینان دەرێ ئەگەر پێڤەبان، پاشی دا کەن د ئاڤەکا کەلاندی دا و دەقیقەکێ دووا د هێلا تێدا موی هەمی تەڕ دبوون، زوی دئینادەری و موی ژێ د هلکێشان و د ئینانەدەر، ئەڤ چەندە چەند جارکی دووبارەدکر هەتا هەمی د ئینانەدەر، پاشی د بستەکێ ڕا دکرو ددا هنداڤ گوڕیا ئاگری ئەگەر مویەك مابا پێڤە دا کوزربیا، ئەگەر هندەك موی مابان و ئاگری ژێ نە گرتبا، بستەکا ئاسنی دکر د ناڤ ئاگریڕا هەتا سور دبوو ب وان جها ڤەدنا یێن موی ماین تێڕا دا ئەو ژی سوتبان و هاتبان کوزراندن، پاشی تژی ئامانەکێ مەزن ئاڤا گەرم د کر و دا سەرکی کەن تێدا و ب کێرەکێ ئینن دەرێ و ڤەدڕەنی و دکرڤە د وێ ئاڤێدا و د ئیناڤە دەری و ڤەدرەنیڤە. چەند جارکی ئەڤ کریارە دووبارە د کر هەتا پاقژ دبوو، پاشی دفن و چاڤ باش پاقژ د کرن، تشتێن پیس ژێڤە دکرن و د

ئاڤێتن، پاشی ددانا سەر بەرەکی یان جهەکێ ڕەق ب تشتەکی ڤەدقوتا دا هەر تشتێ پیسێ پێڤە و تێدا ژێڤە ببیت و بێتە دەر و پاقژ ببیت ، خودان دشێت سەرکی ساخ پێکڤە بکەلینت، هندەکا ژی دکر دوو پارچە و هێدی هێدی مەژێ وی ژی د ئینا دەر، هندەکان د ئاڤێت و هندەکا جدا چێدکر. پشتی ڤێ چەندێ ژی سەرك باش دهاتەڤە شویشتن و دهەلگرت، هەر ب ڤی ڕەنگی دەست و پێ (پێپك) ژی پاقژ د کرن و د هەلگرتن، ژ هەژیبە بێژین ل ڤان دوماهیان سەر وپێیان د گورون، بێگومان ئەڤ چەندە ژی یا ب ساناهیترە، پشتی هینگێ ئاڤ د مەنجەلەکێدا یان د قازانەکا مەزندا د کەلاند و عویرك د کرن ناڤ و بۆ ماوێ چەند دەقیقەکان، پاشی دا ئینن دەر و زوی زوی تیڤلێ عویرکی ژ سەر رادکر و ژێڤە دکر یان ب کێرێ د ڕەنی هەتا عیرك ژ هەمی پیساتان پاقژ د بوو، ئەڤ چەندە ژی چەند جارکی د هاتە دووبارکرن هەتا باش پاقژ د بوون و چ پیساتی پێڤە نەمابان ، پاشی پارچە پارچە د کرن  ب قایدا تویرکێن بچویك دا کو دانی بکەنێ بۆ کەلاندنێ، هندەك خوێ پێوەر د کر و د هێلان. د دووڤدا ڕویڤیك د کرن د ئاڤا گەرمدا و باش د شویشتن، پاشی ڤاژی د کرن و قاما ژ ناڤدا دەردکەت و خوێ و لەیمون پێوەردکرن و د پەرخاندن، هندەکان ئەو ژی ب کێرێ د ڕەنین هەتا باش پاقژ دبوون، ئەو ژی ددانا وێرێ،  برنج باش دشویشت و هندەکان قیمە و بهارات د کرن ناڤ و تێکەلی یەك د کرن و عویرك و ڕویڤیك ب دەزیبەکی ددورین و برنج د کرێ. پشتی د هاتنە داگرتن، دەرێ وان د هاتە دروین دا دانێ وان نە ڕشتبا. پشتی هینگێ دا  قازانەکا مەزن ب نیڤی ئاڤا کەلاندی کەن و دانن سەر ئاگری و سەر و پێیان کەن تێدا و ئاگری ل بن خوەشکەن. پاشی عویرك و ڕویڤیکێن داگرتی هندەك شویژن لێددان و کونکێن بچویك تێڤە دکرن دا ب ساناهی کەلیبان و د کرن تێدا بۆ ماوێ دوو سێ دەمژمێران ل سەر کوچکی هەتا د کەلین ... و کەلین و نە کەلینا وان ل سەر پیری و جانی و تەڕیا (ناسکیا) وێ پەزێ ڕادوەستا یا هاتیە سەرژێکرن .

## - کولندریك[28]:

ل دەستپێکێ دان د بژارت و دشویشت. پاشی کولندێن زەرێن (سیلحی) هویر دکرن و د کرن پارچە پارچە و د شویشتن و د کرن قازانێ و ددانانە سەر ئاگری هەتا پیچەك د کەلین، یان د هاتنە زەرکرن، پاشی هندە ئار و روین دکر بنێ قازانێ دگەل هندەك پیڤازێ و ئاڤێ و خوێ و دکرن ناڤ و تێکڤەددا هەتا کەل د هاتێ، کولندێن نیڤ کەلی، یان زەرکری د کرن ناڤ، پاشی دان (برنج، یان ساڤار و...هتد) دکرنێ و ب کەڤچکەکێ مەزن تێکڤەددا ، دا دناڤێك هەلببا و د هێلا هەتا د کەلی.

## - ئیپراخ[29]:

ڤێ خوارنێ باراپتر ژ برنجی و ژ نەچاری ژ دانێن دی ژی ( گارس، دانهێرك و ...) چێدکەن. ئیپراخ ژ بەلگێن (سلکا و بەقلی و کەلەمیا و ترشۆکێ و کەڤلەپیرێ و ئەزمانگاکی و مێوان) و هندەك جاران باجانسۆرك و باجانرەشك و فلفل و پیڤاز و کولند و پەتاتان ژی چێدکەن، کو ب قەورینن و دانی بکەنی. پشتی بەلگ و تشتێن ئیپراخان دهێنە بەرهەڤکرن و زەرکرن، دانێ خۆ د بژارتن و دشویشتن. هەروەسان هندەك کەرەفس و باجانسۆرك و پیڤاز و هندە جاران پیڤاز تەڕك باش هویر دکرن و د ناڤێك هەلدکرن و دگەل دانی تێکەلی ئێك دکرن. هەروەسان هندە جاران کەڤچکەك یان پتر ژ مەعجینێ تەماتێ تێڤەددا ، دگەل دەرمانکێن ڕەشێن دژوار. گەلەکا گۆشت هویر دکر و د ناڤ هەلددا. ژنك دا روینن و وی دانکی[30] کەن دناڤ بەلگانرا و پێچن و ڕێز ڕێز دا داننە د قازانێ دا، هەتا هەمی د پێچان. پاش دا قازانێ داننە سەر ئاگری و ب هندە سماقێ بشێڤن و ئاڤا وێ ب سەر ئیپراخاندان دا کەن و ئاڤێ کەنە سەر و د نخامتن هەتا دکەلین ، پشتی قازان ددانا خۆ لێ دگرت هەتا ڤەدوەرهان وتاما خوە بەردا.

## - کوتلکێن حەلەبێ[31]:

ئەڤ خوارنە ل دەڤەرێ یا کەڤنە و دبیت دگەل مللەتان یا هەڤپشك ژی بت. ل دەستپێکێ قیمە ژ گۆشتێ پەز و حێوانا، یان یێ مریشکێ دگەل پیڤازا

ئیپراخ



د هێته دروست کرن و کەرەفسێ، یان مەعدەنۆسێ پێکڤە باش هێنە هویر کرن و تێکەلکرن و هندەك رونی کەن ناڤ و پیچەك ئاری پیوەرکەن و دانن سەر ئاگرەکێ رحەت و تێکڤەدەن و هندەك دەرمانکێن رەش و تام خوەش پیوەرکەن هەتا روین هشك دبیت. پاشی هندەك برنجی دێ قوتن و هێرن هەتا دبیتە ئارك و هەڤیرکرن ، هندەك برنجی ناقوتن، بەلكی دشۆن و دکەلینن و خوێ د کەنێ و ئاڤا وێ ژ بەر درێژن و هەڤیر دکەن و پیچەك خوە لێکرن و کەن گرکێن ب قایدە و ب وی قیمێ هاتییە ئامادەکرن داگرن و دناڤ روینیدا قەلینن و ب گەرمی دێ هێنە خوارن، یێ بڤێت نانی پێ دخۆت یێ نەڤێت ژی ب تورسی دخۆت.

## - نیسك (شۆربا نیسکێ)[٣٢]:

بەری هەر تشتەکی نیسك دێ هێنە بژارتن، پاش دێ هێنە شویشتن و هندە ئاڤێ کەنە قازانێ و نیسکا کەنە ناڤ و داننە سەر ئاگرەکێ رەحەت هەتا زەردبن. پاشی دێ ژ سەر ئاگری دانن و پارزنینن و خوێ و بهاراتا و رژدان، دگەل چەند کۆپەکێن ئاڤێ کەن ناڤ نیسکان و تێکڤەدەن و داننەڤە سەر ئاگری. پاشی دێ پیڤازێ هویر کەن و دناڤ روینی دا سوورکەن و ب سەر نیسکێ وەرکەن. د ڤێ خوارنێ دا ئەگەر خودان حەز کەت دێ کێمەکا برنجی، یان هندە تشتێن دی وەکی مەرقە کەنە دناڤدا .

## - ماش (شۆربا ماشێ)[٣٣]:

خوارنەکا روهنە مینا نیسکێ یە، و هەر وەکی وێ د هێتە چێکرن. ل بەراهیێ دهێنە بژارتن و ب ئاڤا تەزی دهێنە شویشتن و ددانە سەر ئاگری، هەتا تیڤلێ وان د سەردا دچیت و ژێڤە دبن. ل دەمێ کەلینێ تیڤلێن وان ب کەڤگیرەکی ژ سەر دهێتە گرتن و هاڤێتن و هندەك برنجی یان دانقوتێ یان نۆکان دێ کەنە بەر ماشێ. دیسان خوێ و فلفلان دکەنە ناڤ و ئێکسەر د هێتە تێکڤەدان، دا ب بنێ قازانێ ڤە نەمینت. ل دووماهیێ ژی پیڤازێ ژی هویر دکەن و د قەلینن و ب سەر وەردکەن.

نیسك



- **ئاڤە پوینگ**(٣٤):

ئەڤ خوارنە ل بهاران ژ پوینگی و نۆكان دهێتە دروست كرن، چونكی د ڤی وەرزی دا پوینگ یێ مشەیە. پشتی پوینگ د هاتە شویشتن و زەركرن، هندەك نۆك دهێنە زەركرن هەتا نەرم دبن. پاشی ژ سەر كوچكی ددانن و ئاڤا وان ژ بەر دریژن و دشۆن و ددان ویرێ. ل دووڤدا قازانێ ددان سەر كوچكی و ب قایدا خوارنا خوە ئاڤێ كەنێ و داننەڤە سەر كوچكی و پوینگی و نۆكان و هندە خوێ كەنێ و تێكڤەدەن هەتا د كەلیت. پاشی دێ هندە پیڤازان هویركەن و شۆن و درۆینیدا قەلینن و كەنە ناڤ و تێكڤەدەن و پیچەك هێلنە ل سەر ئاگری هەتا باش چێدبوو.

ئەڤ خوارنێن ل سەری دیاركری، دبیت ژ دەڤەرەكێ بۆ ئێكا دی رەنگە گوهۆرین دناڤدا هەبن، یان دبیت جیاوازی دناڤاندا ژ دەڤەرەكێ بۆ ئێكا دی هەبیت، و ژ بلی ڤان خوارنان گەلەك جۆرێن شۆربا ژی هەنە،مینا شۆربێن(كولندی و پەتاتان و مریشكێ و ئاڤا گۆشتی و ...) .دیسان گەلەك رەنگێن شلان (شلا ب پوینگ و ب فاسولیا و بەزالیا و لۆبیكا و باجانرەشكا و بامیا و كڤاركان و كەنگران و تۆلكێ و ... )، و گەلەك خوارنێن ژ گۆشتی ژی چێدبن، مینا (كەباب و تكە و براشتنا مێلاك و گولچیسك و قەلی و گۆشتێ ماسی ... ). و زێدەباری جۆرێن كێكان و شریناهیان مینا داتلی. هەروەسان جۆرێن گیایان، چ ب خاڤی و چ ژی زەركری، یان ل بەرگراران، مینا (گویرسك، تۆلك، كاری، لویش، سترك، سوریاز، لویشك – لویشرەشك -، بندارك، گەنمۆك، سێبسك، گەزنگ، پوینگ، كەڤیر، كەنگر ، هەگەدان و ... هتد). ئەڤ گیایە باراپتر د هاتنە زەركرن و خەساندن و د كرنە بەر گراران و ب وی ناڤی د هاتنە ناڤ كرن، وەكی (ساڤارا ب كەنگر، برنجا ب كاری، ساڤار و برنجێن ب سترك، ساڤارا ب لویش، برنجا ب بندارك، برنجا ب هەگەدان و گەنمۆك و سۆریاز و سێبسك و ...) و ئەڤ گیایێن دكەن بەر برنجان، دروستە بكەن بەر ساڤاران ژی .

ئەڤە ژ بلی چەند خوارنێن تایبەت ب زارۆكانڤە، ب تایبەت دایكێن بێ شیر، یان بچویكێن وان (شیرژەن)

و شیر لێ حەرام دبوون. لەوما ژ نەچاری هندەك خوارن بۆ وان چێدکرن وەکی :

## - خەمیرە *:

نانێ تەنکێ قەلاندی هویر دکەن، و دگەل کاکل باهیڤ و شەکرێ د قوتن هەتا دبوو ئار. و پشتی هینگێ تێرا بچویکی هەڤیر دکەن و ددەنێ.

## - ئارکێ برنجی (برنجێ قوتای) ** :

ل دەستپێکێ برنجی د کەلینن، وئاڤێ ژ بەر د رێژن و بەرتاڤ د کەن هەتا هشك دبیت، و پشتی هینگێ د جوهنی، یان هاونی دا د قوتن و ل مۆخلێ دکەن و ل دەمێن پێدڤی ئاڤ لێ دکر و ددا بچویکا. هەژی گۆتنێ یە کو روین و خوێ نە دکرن ڤێ خوارنێ.

## پشکا دووێ / پێخوارنێن کوردەواری:

پێخوارن، ئەو خوارنن کو ب تنێ نە د هاتنە خوارن، بەلکی د گەل نانی د خوارن و پتریا وان د ناڤ سرۆشتێ دەڤەرێ دا هەبوون و پەیدابوون. ژ وان خوارنان ژی :

## - ئاسویدە[٣٥]:

پتر بۆ ژنکێن بچویك دبوون چێدکرن. ئەڤ خوارنە ژ دۆشاڤێ و هەر رەنگەکێ ئاری با دروست دکر. هندەك دۆشاڤ د کەلاند و هندەك روین، دگەل هندەك ئاری دکرێ و تێکڤەددا هەتا هشك دبوو. لێ هندەکان ب رەنگەکێ دی دروست د کر. ئەو ژی دۆشاڤ دکرە ناڤ ئاڤێ و وەکی شەربەتێ لێدهات و ددانا سەر ئاگری هەتا د کەلی. پاش سمیتك د کرە ناڤ و پیچەك تێکڤددا، هەتا باش د کەلی و دبوو خوارنەکا روهن. پاشی روین د حەلاند و داخ دکر و ل سەر دکر و خۆ لێ د گرت هەتا سار دبوو[٣٦].

## - ئاردۆشافك [٣٧] :

هەر ژ دۆشاڤێ و ئاری د هاتە دروست کرن . دۆشاڤەکا پارزناندی دکرە ئامانەکێ وەکی ئاقلەویکێ و پیچەکا ئاری پێوەر دکر دا هشك نە ببا و تێکڤەددا، هەتا باش تێکەلی یەك دبوون و هێشتا یا روهنڤە ددانا بەرخوە و ب نانی د خوار.

## - ئارخافك[٣٨]:

ژ وان خوارنانە کو ب نانی د خوارن و گەلەکا ب ساناهیە بۆ چێکرنێ. روینی د ئاقلەویکێ دا د حەلینن هەتا داخ دبیت و هندە ئار دکرێ وتێکڤەددا و پلەکا خوێ پێوەردکر و تێکڤەددا هەتا دناڤێکدا حەلدبوون و پیچەك هشك دبوو. هندە جاران کادەو کوتلکێن ئارخافکێ ژی ژێ چێدکرن، ب تایبەت ئەگەر روینێ خۆمالی هەبایە و نهو یێ رووەکی ژی بکاردهینن. ئەڤ خوارنە ئەگەر ڤیابا گژنیژی ببایە، دا هندە چیکێن ئاڤێ لێ کەن.

## - ئارمەڤێتك[٣٩]:

ژ ئاری و هنگڤینی دروست د کەن. پشتی هنگڤینی گەرم دکەن و د حەلینن، هندەك ئاری پێوەر دکەن و تێکڤەددەن و ب نانی دخۆن، و خوارنەکا ب هێزە بۆ لەشی.

## پەڵیك (زڤرۆك)[٤٠]:

ژ روینی و ئاڤێ و ئاری و خوێ دروست دکەن. ل بەراهیێ دێ روینی حەلینن هەتا داخ دبیت. پاشی دێ ئاری کەنە ناڤ و تێکڤەدەن و پاشی دێ هندە ئاڤا کەلاندی ژی کەنە ناڤ و باش تێکڤەدەن، هەتا باش روین و ئاڤ و خوێ و ئار تێکەلی یەك دبن. ئەگەر هەبا هندەکان ژی قەلی، یان هێکەك د پەقاند ناڤ و باش تێکڤەددا و دخوار.

## - ئاوارك[٤١] :

ژ ئاڤێ و ئاری و روینی و شەکرێ مینا پەلیکێ دهێتە دروست کرن، ب تنێ د ڤێ خوارنێ دا شەکرێ د کەنێ و د پەلیکێ دا ناکەنە ناڤ. دیسان خوێ ژی تێدا ناهێتە بکارهینان.

## - پەلیپیتك[٤٢] :

ژ ژاری ئەڤ خوارنە دهاتە دروست کرن. تێدا ئاڤ

دكەلاند و هندەك ئار دكرە دناڤدا و هندەك خوێ پێوەردكر و تێكڤەددا، هەتا باش دناڤێك هەلدبوون و ب نانی دخوار.

## - پۆخین[43] :

هەر مینا (ئاردۆشافكێ) دهاتە دروست كرن.ب تنێ ل ڤێرە ئاركێ نۆكان (ئارینۆك) ل شوینا ئاری دكرە ناڤ و تێكڤددا هەتا باش دناڤێك هەلدبوون، و ئەگەر دۆشاف نەبایە، ل شوینێ شەكر دكر ناڤ ئاڤێ و تێكەلدكرن هەتا باش شرین دبوو، ژ نوی ئارێ نۆكان، یان هویركێ نۆكێن قوتای د كرە ناڤ.
هندەكان ئەڤ ناڤە بۆ كونجییان بكاردهینان، دەمێ دقوتان بەری ببان (قەلاتك)، یان قەلاندبان بۆ هێرانێ ب نانی دخوارن و دگۆتێ (پۆخین)[44].

## - پینی[45]:

هەر پەلیكە، ژ ئاری و ئاڤێ و رۆینی دهێتە دروست كرن و هێكان ژی د كەنە نـاڤ. ل دەستپێكێ رۆین دهێتە حەلاندن و ئاری و خوێ د كەن ناڤ و تێكڤەددەن و ئاڤا كەلاندی دكەنە ناڤ و پیچەك تێكڤەددەن. پاشی هێكەك دووا د پەقینن ناڤ و باش تێكڤە ددەن، هەتا باش دناڤك هلدبن و چێدبن، دێ ژ سەر ئاگری دانن.

## - گویزەبەز [46] :

ژ گویزا و دۆشاڤێ، یان هنگڤینی دهێتە چێكرن. تێدا كاكلكێن گویزا د قوتان هەتا هویر دبوون و دۆشاف دكرە ناڤ و دكرە د جەركەكی دا، و دهەلگرتن هەتا باش تاما خوە ددا ئێك، یان دهێلان هەتا بهارێ. و رۆژانە بۆ كەسێن رێنجبەر دهینانە دەر و وەكی پێخوارن دگەل نانی ددانێ. ئەڤ خوارنە ژ وان خوارنان بوو كو هەمی كەسان پێ چێنەدبوو بۆ خۆ چێكەن.

## - گەریسە :

كاكلكێن گویزا د جوهنی دا د هاتنە قوتان، هەتا رۆهن د بوون و وەكی گرارەكا رۆهنا تیر لێدهات، و ب نانی د خوار.

## - مەرەمیت (47):

ل وان دەڤەرێن چیایی، یێن كەزان لێ دمشە دهات چێكرن. ئەڤ خوارنە ژ كەزانا و دۆشاڤێ دهاتە دروست كرن. كەزان دهاتن بژارتن ژ قەلپ و بستیك و دەغەل و كەزانسۆرك و حەبرمانان[48]. پاشی دا د جوهنی دا، یان ل سەر بەرەكی قوتن، هەتا هویر هویر دبوون و ب دوهن دكەتن .. پاشی دا كەنە د ئامانەكی دا، و دۆشاڤێ ب سەردا كەن و هەلگرن. هەر گاڤەكا هەوجە ببانێ، دا ئینن دەر و ب نانی خۆن. هندە مالان ئەگەر هەبان دا كاكلكێن گویزا و باهیڤان ژی د ناڤدا قوتن.

## - كولندیك (كولندسویرك)[49]:

پتر خوارنا دەڤەرا زاخۆیە. ل دەستپێكێ دا كولندی باش شۆن و كەنە پرتێت بچویك و هویر و جارەكادی دێ شوونەڤە و داننە وێرێ. پاشی پیڤاز ژی هویر دكرن و دشویشتن و رۆین دكرە د قازانەكا بچویك دا، و ددانا سەر ئاگری هەتا داخ د بوو. پاشی پیڤاز د كرنە ناڤ هەتا د مرن و كولندێ هویر كری دكر سەر و تێكڤەددا، و قەپاغا قازانێ ددانا سەر، و چەندەكێ خۆ لێ دگرت، هەتا ئەو كولند حەلدبوو، پاش دا ئاگری ل بن كێم كەن هەتا ئەو ئاڤا ل بەر هشك دبوو، پیچەك خوێ پێوەر د كر و د خوار.

## - بەلچەك[50]:

پتر خوارنا وان دەڤەرانە یێن هەژیر لێ دمشە. پارێزگەها دهۆكێ مشە ئەڤ پێخوارنە چێدكر. پێخوارن ژ هەژیرا و دۆشاڤێ دهاتە دروست كرن. ل دەستپێكێ دۆشاف دكەلاند و دكرە جەركەكی، یان ئامانەكی. پاشی هەژیر (كتكێن هەژیرا) د ئینان و پرت پرت دكرن، یان ساخ و دكرنە د ناڤ وێ دۆشاڤێ دا و دەرێ جەركی باش دگرت، دا هەوا

تێنەچووبا و خراب نەببان، و د هەلگرتن هەتا نێزیکی بهارێ، یان بهارێ و وەکی پێخوارن د خوار، یان وەکی بەرفراڤینك [51] بۆ پالا د ئینا.
هندەکان ئەڤ خوارنە ژ کولندێن تایبەت ب بەلەچەکان ڤەچێدکر [52].

## - میخلەمە [53]:

ل دەستپێکێ گۆشت دهێتە هویرکرن و هنجنین و شویشتن و کەنە د ئاقلەویکەکێ دا هندە رۆینی کەنە سەر و داننە سەر ئاگری و جارجاران تێکڤەدەن، هەتا ئەو گۆشت سوور دبیت و د هێتە قەلاندن. پاشی دێ دوو سێ هێکەکان کەن ناڤ و هندە خوێ پێوەر کەن و تێکڤەدەن، هەتا هێك و گۆشت باش د ناڤك هەلدبن و چێدبن.

## - ریچول (مرەبا) [54]:

ریچول ژ فێقی شرینیان دهێتە چێکرن، مینا دۆشاڤێ و شەکرێ د هێتە چێکرن، ژ وان فێقیان ژی (سێڤ، بە، مژمژە، حولیك، خۆخ، هەژیر، دری و توی و ... هتد). هەر گاڤا مرەبا چێبوو، ژ سەر ئاگری ددانن و هەتا سار دبیت ،دکەنە شویشان و هەلدگرن بۆ دەمێن پێدڤی.
ژ جۆرێن مرەبا ژی:
* **مرەبا سێڤان** [55]: ل دەستپێکێ سێڤان باش دشۆن و تویز تویز دکەن (کاژی کاژی) و پاقژ دکەن و ئاڤەکا دی ژی لێ دکەن. پاشی دێ کەن قازانێ و ئاڤێ کەن سەر، هەتا ددەت سەر سێڤانرا و دانن سەر ئاگری بۆ ماوێ نیڤ دەمژمێرێ و پاشی ژ سەر ئاگری ددانن و بۆ سێ کۆپێن سێڤێن کەلاندی، کۆپەکێ شەکرێ و کەڤچکەکێ ئاڤا لیمۆکان کەن ناڤ و دانن سەر ئاگرەکێ رحەت و بەردەوام تێکڤەدەن، هەتا شەکر دناڤدا باش د حەلهیت و دبەررا کەفێ و تشتێن زڤر ژ سەر گرن و ئاڤێژن، هەتا چێدبیت.
* **مرەبا بهان** [56]:
ل دەستپێکێ بە دهێنە شویشتن و پشتی د کەنە د قازانێ دا ئاڤێ د کەنە سەر و ددانە سەر ئاگرەکێ ناڤنجی هەتا نەرم دبن. دێ ژ سەر ئاگری دانن و هێلن هەتا سار دبن و تێڤلێ وان دێ ژێڤە کەن و د نیڤەکێ را کەرکەن و کەن چوار کاژی و ناڤکا وان ژێڤەکەن. پاشی دێ کەنە پرتێن مەزن و ستویر و کەن د قازانێ دا. پاشی ئەو ئاڤا بە تێدا هاتینە کەلاندن دێ شەکرێ کەن ناڤ تێکڤەدەن و دانن سەر ئاگری و بەردەوام تێکڤەدەن. هەر زڤراتی و کەفا ب سەر دکەڤیت ژ ناڤ دگرن هەتا پیچەك تیر دبیت و دێ هندەك ئاڤا لیمۆکان کەن ناڤ و هندەك هێلێ کەن ناڤ پاتەکی و گرێدەن و ئاڤێن د ناڤدا، پاشی دێ بها ژی کەن ناڤ وێ شەکراڤا چێکری و دانن سەر ئاگرەکێ رحەت هەتا تیر دبیت. ل دووماهیێ دێ ژ سەر ئاگری دانن، و هێلێ ژی ژ ناڤ ئینندە دەر، و خۆ لێ گرن هەتا سار دبیت و د ئامانەکی دا پارێزن، بۆ دەمێن پێدڤی.
* **مرەبا هەژیران** [57]:
ل وان دەڤەرێن هەژیر لێ د مشە، ژ هەژیرێن باش نە گەهشتی (کەرك) [58] دهێتە چێکرن. هەژیر باش دهێنە شویشتن، پاش دێ هێنە سپیکرن، یان ب تیڤلڤە کەن د ناڤ شەکر و ئاڤادا، بۆ ماوێ دوو دەمژمێران. ل دووڤدا دێ دانن سەر ئاگرەکێ رحەت و کێم ئاڤا لیمۆکان کەنێ و هێلێکەن ناڤ پاتەکی و گرێدەن و کەن د ناڤدا و هێدی هێدی تێکڤەدەن هەتا کەل د هێتێ و تیر دبیت. پاشی ددانن و پشتی سار دبیت دپارێزن.
گەلەك جۆرێن دی یێن مرەبا هەنە، کو ژ فێقیێن ب بەرك چێدکەن مینا مرەبا (مژمژا و خۆخا و حولیکان و ... ). ل دەستپێکێ بەرکان ژێ د هیننە دەر و نێزیکە وەکی جۆرێن دی دروست د کەن.
دوو جۆرێن دی یێن مرەبایێ یێن هەین، کو چێکرنا وان پیچەك یا جودایە ژ رەنگێن دی، ئەو ژی مرەبا (دریا و تویانە) و ب ڤی رەنگی:
دری دهێنە بژارتن و دکەنە د نفسکەکێ دا و ئاڤێ ب سەردا کەن و تێك د هەژینن هەتا د زانن باش پاقژ بوون. دریان و شەکرێ ریز ریز دانن د ئامانەکی دا و بۆ دەمێ نیڤ دەمژمێرێ. پاشی دێ دانن سەر ئاگرەکێ رحەت و هێدی تێکڤەدەن هەتا شەکر باش

قەلی سێلك



د حەلهیت و كەل دهێتێ. بەردەوام د بەررا تشتێن زڤر و كەفێ ژ سەر گرن. پاشی دێ درِی ژ ئاڤێ هێنە جودا كرن. لێ ئاڤ دێ هەر مینتە ل سەر ئاگری مینیت و هندەك ئاڤا لیمۆكان ژی كەنێ هەتا تیر دبیت. جارەكادی دێ درِیا كەنێ ڤە هەتا باش تیر دبیت. باش دێ ژ سەر ئاگری دانن، و پشتی سار دبیت دپارێزن بۆ دەمێن پێدڤی. هەژی گۆتنێیە كو مرەبا (توییان) ژی هەر ب ڤی رەنگی دهێتە دروستكرن.

## - قەلی[59]:

ژ تەڤ پێخوارنان پتر بكار دهات. ئەڤ پێخوارنە هەم وەك رِوینی بكار دهات ل دەمێن پێدڤی و بێ رِوین هەم وەك پێخوارن. لێ د هەردوو بواراندا گرنگییەكا مەزن هەبوو، و خولكی چێدكر[60].

هەر مالەكێ ل دووڤ پێچێبوونا خوە قەلی چێدكر. ئەو ژی  ژ گۆشتێ تەرش و كەوالێن بێچارە، پشتی ربیتە دكرن دهاتە چێكرن. یان ژی ژ گارِەشا (چێل و گۆل). پشتی كەوال دهاتە سەرژێكرن. گۆشت دهاتە جودا كرن و،  ژ هەستیان ڤەدكر و هەستی هشك دكرن. و گۆشت دكرنە پشكێن ب قایدە و پاقژ دكر و شویشت. دیسان بەز و قەلەوی ژی ژ گۆشتی ڤەدكر و د كرە پشك. گۆشتێ هویر كری دكرە د مەنجەلەكێ دا هندە ئاڤ د كرە سەر و ددانا سەر ئاگری هەتا گۆشت زەردبوو (دگەردی)[61]، پاشی ژ سەر كوچكی ددانا و گۆشت ژێدگرت و دكر قازانەكا دی یا مەزندا. ئەو بەزێ كری پشك دكر ناڤ و دناڤك لەلدكر هەتا ل ناڤ گۆشتی د حەلها و هەمی د بوو رِوین، و گۆشت و رِوین پێكڤە د مان د قازانێ و ژ سەر ئاگری ددانا هەتا پیچەك ساردبوو. پاشی دكرە تەنەكا یان كولوزان و دهەلگرت بۆ زڤستانێ، یان وەكی رِوین بۆ ناڤ گراران. ژ هەژییە بێژین ئەو ئاڤا گۆشت تێدا كەلاندی و هێشتا هشك نەبووی، دگەل هندەك پشكێن گۆشتی دكرە د هندە ئامانان دا بۆ خوارنێ، یان ژی ل مالان بەلاڤ دكر و د گۆتێ (ئاڤكا گەرادێ).

## قەلی سێلك[62]:

هەر ژ گۆشتی د هێتە دروست كرن و پێخوارنەكا سەرِبێیە و ناهێتە هەلگرتن. ڤێ قەلیێ باراپتر

ژ دەرڤەی مالان، ب تایبەت شڤان و رێڤینگ و سەیرانچی چێدکەن. تێدا گۆشت و بەز پێکڤە هویردکرن یان پشك پشك کرن، و د کرە نیڤەکا سێهلەکێ و خوێ پێوەر دکر و ددانا سەر ئاگری و هەر تێکڤەددان هەتا چێدبوو .

## - قەلی هێك :

ژ هێك و قەلیێ دهێتە چێکرن . ل دەستپێکێ هندە قەلیێ دکەنە د ئاقلەویکەکێ دا و ددانن سەر ئاگری هەتا قەلی د حەلیێت. پاشی دێ هێکا پەقینن ناڤ و تێکڤەدەن هەتا چێدبیت. هندە جاران ژی هێکا تێکڤە نادەن.

## - هێکە روین[٦٣]:

هەر وەکی قەلی هێکێ یە، لێ یا بێ گۆشتە. هێکێ د پەقینن ناڤ روینێ داخکری و خوێ پێوەر دکەن. ڤێ ژی هندەك هێکێ تێکڤە ددەن و هندەك تێکڤە نادەن و دێ ل سەر ئاگری مینن هەتا چێدبن هێتە پێشکێشکرن.

## - رهك (عوروق)[٦٤]:

ژ قیمەی و ئاری، یان برنجێ قوتای ، یان ئارکێ برنجی دگەل پیڤاز و کەرەفس و باجانسۆرك و فلفلان هەر ئێکی ل دووڤ حەزا خوە تشت د کرن ناڤ. قیمە بەرهەڤ دکر پیڤاز و کەرەفس و باجان ژی هویر دکرن و د ناڤێك هەلدکرن دگەل فلفلان. هندەك ئار پێوەر دکر دا دگەل گۆشتی و زەرزەواتان یەککرتبا و ببا هەڤیر، دەرمانکێن رەش پێوەر دکرن و دگەل هندە تەماتا باجانسۆرکا د ناڤێکدا هەڤیر دکرن، هەتا باش د بوو هەڤیرەکێ هشك و باش یەکدو دگرت ... گرکێن بچویك ژێ ڤەدبرین و پیچەك پەحن د کرن و د روینیدا دقەلاندن و هەچیا د قەلییا دهینانە دەر هەتا هەمی چێدبوون.

## - کڤارك (کارك):

بەرهەمەکێ سرۆشتییە و گەلەك جۆرێن کڤارکان ل کوردستانێ هەنە:

* **کڤارکێن هەلزێ**، باشترین و خۆشترین جۆرە. ل جهێن هەلز لێ هەی شین د بن.

* **کڤارکێن ئاخێ**، ل وان جهێن هەمی ئاخ شین د بن.

* **کڤارکێن سپینداران**، د بەر قورمێن دار سپینداران، ل بەر لێڤجوویێن ئاڤێ و حەودێن سپینداران شین دبن .

* **کڤارکێن بییان**: ل بەر قورم و رهێن بییان شین د بن. و ئەڤ هەردوو رەنگێن دووماهیێ گەلەك نە دهاتنە دخوارن.

ژ بلی وان، هندە رەنگێن ژەهراوی (زهایی) ژی هەبوون، کو نە دهاتنە خوارن و پتر ل بەر تراشان شین د بوون. ئەڤ رەنگە د هاتنە نیاسین دەمێ مرۆڤی قەلپکێ ژ سەرڤە راکریا، دا بینت یا تژی تۆزەکا زەرڤەبوو دگۆتێ (زهایی)، کو بۆ کەوالێن برین دکەتنە لەشی وان، یان دکرمی د هاتە بکار هینان و کرم ب وێ تۆزێ دمرن. چێکرنا کڤارکێ ژی ب ڤی رەنگی بوو :

کڤارك ژ ئاخ و دەغەلان دهاتە پاقژ کرن و شویشتن و د ئاڤا کەلدا دهاتە زەردکرن و د ئینانەدەر و ئاڤەك لێ دکر. پاشی پیڤازەك هویر دکر و د کرە ناڤ روینی هەتا د مر. کڤارکێن زەرکری پشتی هویر کرنێ د کرنە ناڤ و تێکڤەددان و د هێلانە ل سەر ئاگری هەتا چێدبوون[٦٥].

ئەڤ خوارنە ب هندە رەنگێن دی ژی دهاتە دروستکرن، وەکی بەر گراران ، یان بەر ئاڤکا . هەر ب ڤی رەنگێ دیار کری (دومبەلان) ژی ل وان جهێن دوبەلان لێ د مشە د هێنە چێکرن .

## - بچرك [٦٦]:

نانێ تەنکێ یێ قەلاندی د هاتە هویر کرن و هندەك روینێ خۆمالی د کر ئامانەکی و د حەلاند هەتا داخ دبوو، پاشی ئەو هویرکێ نانی د کر ناڤ و تێکڤەددا، هەتا چێدبوو، و روین د کێشا خوە و هشکڤە د بوو. ئەڤ خوارنە نهو بەر ب نەمانڤە چوویە.

## - فری[٦٧]:

ژ وی شیری د هاتە چێکرن، کو ژ بێچکا زێدەدبوو ل دەمێ زانا تەرش و کەوالان دگۆتێ (زاك).شیر دپارزناند و دکرە د ئامانەکی دا و پلەکا خوێ پێوەردکر

و تێکڤەددا دا خراب نەببا و ببا قالب و حولی ببا. هەتا چێدبوو.

## - ژاژەروین[68]:

هندەك ڕوین د کر ئاقلەویکەکێ و د حەلاند و هندەك ژاژی د کر ناڤ و تێکڤددا، هەتا دناڤ ڕوینی دا د حەلها و وەکی تەڤالەکی لێ دهات هەتا چێدبوو.

## - تەرەماست[69]:

پشتی شیر دپارزناند، د کر ئامانەکی و د کەلاند و وەردگێرا ئامانەکێ دی و هێڤێن لێ دکر و د هێلا هەتا رۆژا پاشتر، پاشی دا سەرتویکی ژ سەر راکەن و پاتەکێ پاقژێ جانگی دانن سەر ڕویێ وی ماستی. هندەکان ژی گەرکا برنجی ددانا سەر وی پاتەی هەتا ئەو گەرك تەڕ دبوو (شل دبوو)، دا وێ ڕاکەن و ئاڤێژن، هندەك دی کەن سەر هەتا ئاڤا د ناڤ ماستی دا هشك د بوو، ئەو گەرك شێله بۆ شێلێ د گوهۆری. پاشی دا هندەك ڕوینی حەلینن و داخکەن و ل سەر ڕویێ ماستی کەن و هلگرن هەتا زڤستانێ و د خوار.

## -دەوێ پێرپینێ[70]:

پشتی مەشك د هاتە کیا ، هندەك دەو دکر تویرکەکی و د هلاویست، هەتا ڤەدوەرها و ئاڤا وی هەمی ژێ د ڕشت و تیر دبوو. پاشی دا ئینن هندەك پێرپینێ پاقژ کەن و هنجنن و کەنە د قازانەکێ دا و هندەك ئاڤ دکر سەر و ددانا سەر ئاگری هەتا نێزیکی کەلینێ دبوو، یان ئەو پێرپینە زەردبوو. پاشی دا دانن و ئەو ئاڤە ژبەر درنت و د شویشتەڤە و پیڤازەك هویر دکر ناڤ و هندەك خوێ پێوەر دکر و تێکڤەددا، هەتا باش تێکەلی یەك دبوون. ڤێ خوارنێ هندەکان پیڤاز د کرنێ و هندەکان نە د کرنێ. ل گوندان گەلەك جاران تویرکێن دەوێ پێرپینێ د کرنە دناڤ ئاڤێن تەزی دا و ل بەر سیبەران و ل دەمێن پێدڤی د خوارن.

هەروەسان هندەکان پێرپینە د کر ناڤ ماستی و چێدکر و د گۆتنێ (ژاژێ پێرپینێ).

ژ بلی ڤان، گەلەك پێخوارنێن دی ژ شیری چێدبوون ، مینا (لۆرك، پەنیر، ماست، ژاژی، نیڤشك، سەرتویك و ... هتد).

ژ گیایێن سرۆشتی ژی کو د هاتنە بکارهینان وەکی پێخوارن (پێرپینە، پوینگ، سترك، بندارك، کەنگر، کاری، تۆلك و ... هتد).

## - کەنگرێن قەلاندی[71]:

گیایەکێ بهاریێ ب سترییە، لەوما ل بهاران دهاتە چێکرن. ل دەستپێکێ ژ ئاخێ و ستریا د هێتە پاقژ دکر و شویشت، پاشی دهاتنە زەردکرن و د ناڤ ڕوینیدا د قەلاندن و وەك پێخوارن ب نانی د خوارن.

**- کەنگر هێك:**

پشتی کەنگر دهێنە زەرکرن، چەند هێکان د پەڤینە ئامانەکی کویر و د شلڤاندن، هەتا زەرك و سپیلك دناڤێك هەلببان. پاشی هندە ڕوین دکر ئاقلەویکەکێ و داخ د کر و ئەو کەنگرێن زەرکری کت کتە د ئاڤەهێکێ د هلاندن و د کرن ناڤ ڕوینی دا و د قەلاندن. هوسان هەتا تێرا خوە چێدکرن.

**- کەنگر ماست :**

پشتی کەنگر د هێنە زەرکرن و هویر کرن، دێ ماستی کەن د ئامانەکی و کەنگرێن زەرکری دناڤ هەلدەن و ب نانی خۆن.

## - کاری[72]:

کاری ڕووەکەکێ سرۆشتیێ بهارییە . پشتی د هێتە زەرکرن و خەساندن دهێتە چێکرن و خوارن وەك پێخوارن دگەل نانی یان دکەن بەر گرارێن هشك و د خۆن وەك برنج و ساڤاران، کاری چەند جۆرەکن ژوانا :

* **کاریا کەلێ :** ل دەڤەرێن چیایی و ئاسێ و ل زۆزانا شین دبیت . بەلگێ وێ ئێکەو یێ پەحنە.

* **کاری چچك:** ل دەشتێ و دەڤەرێن تام دەشت شین دبیت، بەلگێ وێ نە گەلەکێ پەحنە ، ل بنێ بەلگی هندە بەلگێن زراڤ و وەربێچای و بالۆلکی یێن پێڤە.

* **کاری ڤۆنسۆژك (کاریا ژەهرکی)**، ناهێتە خوارن و ل ئەردێن دەشت و تام دەشت شین دبیت.

چێکرنا کاریێ: پشتی کاریێ ژ بەلگێن زەر و هشك و داڤێن گیا و ئاخێ پاقژ دکەن و دشۆن، دکەنە د قازانەکێ دا و ئاڤێ دکەنە سەر و ددانە سەر ئاگری هەتا کەل دهێتێ و زەر دبیت (دمریت). پاشی دێ دانن و ئاڤێ ژ بەر رێژن و ئاڤەکا دی کەن سەر و هندە ترشێ سماقێ کەن سەر، دگەل هندەك خوێ و داننەڤە سەر ئاگری، هەتا کەل د هێتێ. دێ هندەك تەحینێ کەن ناڤ و دەرپۆشا قازانێ دانن سەر بۆ ماوێ دەمژمێرەکێ دێ ل سەر ئاگرەکێ رحەت هێلن. جار جار دێ تام کەنێ کا دەڤێ مرۆڤی د گەزیت یان نە ؟ ئەگەر گەزت ئەو هێش چێنەبوویە و دێ هەر هێلنەڤە ل سەر ئاگری هەتا د (خەسیت)، واتە چێببیت و ئەو ژی ل سەر پیری و تەراتیا گیبای د راوەستیت. پشتی چێدبیت، هندەك ئاڤا وێ درێژن و هندەك نارێژن. دیسان ژ بۆ تامێ هندەك هەستی و گۆشتا د کەنێ و هندەك ناکەنێ. ڤێ کاریێ ل هندە جاران د کەنە بەر گراران، یان کوتلك د کرنە بەر. یان وەك پێخوارن د هاتە خوارن، ڤێجار هەر ئێك ل دووڤ حەزا خوە.

**پوینگ**[٧٣]:

گیایەکە ل بەر ئاڤا شین دبیت. پشتی ب تەرینی (نازکی) د هێتە کرن، د هێتە پاقژ کرن و شویشتن و دکەنە د قازانەکێ داو ددانە سەر ئاگری هەتا کەل دهێتێ و زەر دبیت. پاشی دێ دانن و ئاڤا وێ ژ بەر رێژن و ئاڤەکا تەزی لێکەن و دێ گڤێشن دا ئاڤا وێ ڤەوەرهیت، پاشی دێ هندە روینی کەن قازانێ و هندە پیڤازێن هویر کری کەن ناڤ هەتا د مرن و دێ پوینگی کەن سەر و تێکڤەدەن هەتا باش چێدبیت، و هندەکان هێك ژی د کرنە بەر و تێکڤەددان هەتا باش تێکەلی هەڤ دبوون. پوینگ ل بەر خوارنێن هشك و شلان ژی د هاتە خوارن.

وەسان گەلەك گیایێن دی، ب تایبەت یێن بهاری و هاڤینی ژی ل دەڤەرا بادینان د هاتنە چێکرن، وەکی (تۆلك و سترك و پێرپینە و ...). چ وەکی زەرکری و چ قەلاندی و چ ژی ل بەر گراران.

ل دەڤەرا دهۆکێ گەلەك پێخوارنێن دی ژی ژ جۆرێن نانی چێدکرن، ڤێجا نانی گەنمی با، یان یێ جەهی و گارسی و خوروبی و تەحلە و گەنمۆکی و کەردری و ... ) و ئەو ژی ل دووڤ پێچێبوونا وان بوو. ژ وان خوارنان ژی:

## - نانتحینك (نانتەحینك)[٧٤]:

تەحین و دۆشاف باش دناڤێك هەلدکرن، رەنگ لێ د هاتە گوهۆرین. دا ئینن دنانی دەن (هەر جۆرەکێ نانی با) و هەردوو نان ل وی رویێ تەحین و دۆشاف پێڤە ددانا سەرك، دا دەستێن وان ل دەمێ خوارنێ پیس نە ببان و ئەڤ خوارنە پرانیا جاران بۆ رێنجبەران دهاتە چێکرن.

## - نارۆینك (نان روینك)[٧٥]:

پشتی نان د هاتە پەحتن، ئارخافکەکا رۆهن چێدکر و د نانی ددا و د پێچان و ددانان وێرێ هەتا تێرا پێدڤیا خوە چێدکرن و د کرنە د ناڤ مێدەکەکێ دا و بۆ رێنجبەران وەکی فراڤین، یان بەرفراڤینك دبرن.

مەزنان ل سەر ڤێ چەندێ گۆتییە: (بێ عەسلان نارۆینکان بدەنێ).

## - دۆرکێن دوهندای [٧٦]:

دەمێ نانێ تەنك د هاتە پەحتن و نان د ئاڤێت سەر سێهلێ، هندەك نیڤشك دکر سەر و ل سەر د حەلها و ب کەڤچکەکی ل سەر دۆرکێ بەلاڤ د کر. پشتی چێدبوو وەردپێچان و ددانانە د تەبەقێ دا هەتا تێرا پێدڤیاتیا خوە چێدکرن و بۆ رێنجبەران ددانان یان وان ب خوە د خوارن.

## - رویدانك :

ئەو نانە یێ ل دەمێ پاتنێ چەند هێکەکان د پەڤینن ناڤك و پێکڤە ب کەڤچکەکی د شەڤینن و د رویێ وێ ددەن و وەکی پێخوارن د هاتە خوارن[٧٧] .

- **کادەسویرك (کادێن ژاژی)**[٧٨]:

پێخوارنەکە یان ب تنێ ، یان ب چایێ و دەوی و ئاڤێ

دهاتە خوارن. ل بەراهیێ گرکێن هەڤیری د هاتنە پەحنکرن و ژاژی وەك ناڤك د کرن د ناڤرا و لێڤێن هەڤیری دگەهاندنڤە ئێك و بەر درێژ د بوون و ددانان سەر سێهلێ و لێك وەردگێران هەتا چێدبوون.

**کادێن قورادا (سەوکێن قورادا)**[٧٩]:

قوراد گیایەکە ل بەیاران شین دبیت. ل بەراهیێ پاقژ و د شوون و هویر دکەن. پاشی د خوێ دا دهێتە پەرخاندن و ئاڤەکێ لێدکەن دا سویراتیا وان کێم ببیت. پاش دێ کەنە د ئامانەکی دا و ڕوینە کەن ناڤ و تێکڤەدەن و پیچەکا ئاری پێوەرکەن و گرکێن هەڤیری ژی باش پەحنکەن و قورادا کەن دناڤرا و لێڤێن هەڤیرێ پەحنکری گەهینن ئێك و دانن سەر سێهلێ و لێك وەرگێرن هەتا چێدبن.

### - سەوکێن ب گژنیژ[٨٠]:

پشتی گژنیژ د هاتنە هێران و قوتان، هندە ڕوین د کرنە ئامانەکی و پیڤازێن هویر کری دکرن ناڤ هەتا د مرن، پاشی گژنیژێن هویرکری دکرن ناڤ و تێکڤەددان، و هندە تەماتە د کر ناڤ و د تێکڤە ددانەڤە، هەتا ئەو تشت هەمی دناڤك هەلدبوون و ژ سەر ئاگری ددانان. پاش دا گرکێن هەڤیری ب ڤایدا سەوکان پەحنکەن و گژنیژان پێرادەن و ب تەنویرێ ڤەدەن (یان ئاڤێن فرنێ) هەتا چێدبوون.

### - شلك[٨١]:

د ڤێ خوارنێ دا هەڤیرەکێ ڕوهن چێدکر و ب کەڤچکەکی ئەو هەڤیر ل سەر سێهلا کەل بەلاڤ دکر، هەتا سێهل هەمی دگرت و خوە لێ دگرت هەتا پیچەك چێدبوو، و لێك وەردگێرا، هەتا ب تەمامی چێدبوو، و ددانان و چەندەك ددانانە سەرێك و پرت پرت د کرن و ڕوینێ خۆمالی و هنگڤین پێکڤە د حەلاندن و د کرە سەر، خوە لێ دگرت هەتا ئەو ڕوین و هنگڤین د کێشانە خوە دخوارن. گۆتنەکا مەزنان دەربارەی شلکان دبێژیت:

(ئەگەر هەیە شلك و ملك ، ئەگەر نەیە ، کەسەر و کولك).

### - خورمەڕوین :

پشتی خورمە ژ بەرك دکر، د کرە ئامانەکی و هندەك ڕوین د کر بەر و دانا سەر ئاگری و ب پشتا کەڤچکی خورمە د پەتشاند و تێکڤددا، هەتا خورمە و ڕوین باش تێکەلی ئێك د بوون و خورمە نەرم دبوو، مینا هەڤیری لێ دهات و یەکدوو دگرت و چێدبوو. ژ بلی خورمێ هندەکان خورمەڕوینا قەسپان ژی چێدکر. دیسان و ل دووڤ حەزا خوە هندەکان هێك ژی د پەقاندن ناڤ.

ژ بلی ڤان خوارنێن ل سەری هاتینە دیار کرن، خوارنێن دی وەك فێقی د هاتنە خوارن، ب تایبەت ل شەڤبێرێن زڤستانان، مینا (گویز و مێویژ و کاکل باهیڤ و کتکێن هەژیران و سەوکێن هژیران و کەزان و جۆرێن فێقی و ... هتد).

## پشکا سێ / ڤەخوارنێن کوردەواری :

گەلەك جۆرێن ڤەخوارنان ل پارێزگەها دهۆکێ مینا هەمی کوردستانێ هەنە، ژوانان:

### - دۆشاف:

ئەڤ ڤەخوارنە هندە جاران وەك پێخوارن ژی د هاتە خوارن، ل کوردستانێ چەند جۆرێن دۆشاڤێ هەنە، ژ وانا :

※ دۆشاڤا تری.
※ دۆشاڤا مێویژان
※ دۆشاڤا قەسپان (خورمێ)

### دۆشافا تری[٨٢]:

پشتی تری د هاتەکرن و کۆمکرن، ئەو تریێە د ئامانەکی دا* باش د هاتە مەرچقاندن و و پەتشاندن و گڤاشتن بێگومان بەری بێتە مەرچقاندن، هندەك خوەلیا پاقژ پێوەر دکر، پاشی زەلامەکی پێت خوە باش دشویشتن و ب پیان دچوو ناڤ و ئەو تر وەسان د پەتشاند هەتا چ ئاڤ نەدما تێ و د بوو سێلمیتە (سێلماتە). ڤێجار چ د جرنییەکێدا چووبا ناڤ و پەتشاندبا یان د تەشتەکا ئاسنیدا، هۆسان هەتا

هەمی تری د هاتە مەرچقاندن و گڤاشتن. سێلمیتە ژ سەر دگرت و ئامانەك ددا بەر کونا جرنیێ و ئەو پاتە ژێ د ئینادەر، ئەو شەربەتا تری (ئاڤا تری) د چوو وی ئامانی. هۆسان ئەڤ کریارە یا بەردەوام بوو، هەتا هەمی تریێ وان خلاس دبوو، ئەو ئاڤا تری د هاتە پارزناندن و ددانا سەر ئاگرەکێ خوەش و د کەلاند، ب ڤێ چەندێ هەر تشتەکێ زێدە وەکی کەفێ و بستیکێن تری و گەرێ ژ سەر دهاتە گرتن وپاقژ کرن هندەکان دەمێ د پارزناند ل پاتەکێ فرفوت دکر، دا دۆشاڤا وی چ تشت نەمابان تێ و یا پاقژ با، بەردەوامی ب کەلاندنێ ددا هەتا ئەو ئاڤا تری تیر دبوو، ژ سەر ئاگری ددانا و هەلدگرت ڤێجا چ بۆ خوارنا خوەبا، یان بۆ فرۆتنێ.

## - دۆشاڤا مێویژان[٨٣]:

باراپتر ئەو مێویژێن د برنە بازاری و نەهاتبانە فرۆتن د کرنە دۆشاڤ، لێ نە یێن بژارە. ل بەراهیێ مێویژ د هاتنە قوتان هەتا باش د مەرچقین و دبوونە مەعجین. یان کورێن تایبەت د هاتنە چێکرن، بن و رەخێن وێ حەلانێن بەری ددانانێ و ئاسێ دکرن، دا ئاخا رەخێن وێ نەچووبا ناڤ مێویژان. دا وێ کورێ ب نیڤی، یان کێمتر مێویژ کەن و دەن بەر مەرێزان هەتا پرت پرت دکرن و دبوونە مەعجین. ئەو دەست د ئینادەر و ئێکێ دی چێدکر و گەلەك دەست چێدکرن، هەتا هەمی چێدکرن و ئەڤ مەعجینە کۆم دکر و خوەلی دکر ناڤ، دا ب پێن وان ڤە نەمابا، و ب پیان د چوون ناڤ هەتا ئەو مەعجین د بوو (لیتە)، پاشی دا دەنێن تایبەت ب چێکرنا دۆشاڤێ ڤە، کو ژ ئاخێ چێدکرن و کونەك د بنی بوو، دگۆتێ (تغارە) ئینن و گیایێ رەشەکی کەن بنی و لیتەی کەنە سەر و ئاڤ پێدا دکر، هەتا ددا د سەررا، و شەڤەك و رۆژەکان، یان پتر د ما د ناڤدا. پاشی ئامانەك ددانا بەر کونا تغارێ و ئەو کون ڤەدکر ئاڤا مێویژان د هاتێ و ئەڤ کریارە چەند جارکی د هاتە ئەنجامدان، هەتا شریناهی نەمابا د ناڤ لیتەی دا. ل دووماهیێ سێلمیتە د هاتە ئاڤێتن و ئاڤا مێویژان د کرە مەنجەلان و د کەلاند، هەتا تیر دبوو، دەمێ هندەك د کرە د ئامانەکێ بچویك دا، ب بنێ وێ ڤە مابا و ئەڤە نیشانا چێبوونێ بوو.

## - دۆشاڤا قەسپان[٨٤]:

قەسپ، یان خورمە دکرنە د مەنجەلەکێ دا و هندەك ئاڤ د کرە سەر و ددانا سەر ئاگری هەتا د کەلی و ئەو قەسپ نەرم دبوون . پاشی ژ سەر ئاگری ددانان. یان دا کەن تویرکەکی و دانن سەر چەپەرەکێ کون کون و بار دکر و ئامانەك ددانا بن، هەر ئاڤەکا هەبا ژێ دهات و د چوو وی ئامانێ ل بن. هەتا هەمی ئاڤ ژێ دهاتە کێشان و ئەو ئاڤ د کرە مەنجەلان و ددانا سەر ئاگری د کەلاند هەتا چێدبوو. ژ سەر ئاگری ددانا هەتا سار دبوو د کر ئامانا و هلدگرت .

## خوەشاڤ[٨٥]:

ژ مێویژا و کاچکاچکێن سێڤا و هرمیکا و حولیرەشکێن هشککری و کتکێن هژیران و مشمژێن هشککری (قەیسی) و ... د هێتە چێکرن. پشتی مێویژ ژ دویلك دکرن و پاقژ دکرن، هەمی پێکڤە دشویشتن و د کرنە د ئامانەکی دا و ئاڤ دکرە سەر و ددانان سەر ئاگری، هەتا نێزیکی کەلینێ دبوو هێشتا کەل نەهاتیێ، ژ سەر ئاگری ددانان و وخوە لێ دگرت هەتا رۆژا پاشتر، ئەو تشتێن د ناڤ وێ ئاڤێ دا، ئاڤ د کێشا خوە و بف دبوون و تاما خوە بەرددا ناڤ وێ ئاڤێ، یان هەتا شرین و خوەش دبوو و دگەل زادی د خوار، یان ل جەژنان دهاتە ڤەخوارن.

## - سهك (٨٦) :

ل پارێزگەها دهۆکێ گەلەك جۆرێن سهکێ هەنە، ل سەر وی تشتی د مینت یێ ژێ چێدکەن. وەکی:

* **سهکا تری:** ژ هەمی رەنگێن تری د هاتە چێکرن. پشتی تری د هاتە تلی تلی کرن، دەستێن خوە باش ب ئاڤ و سابینان د شویشتن و زها د کرن ب دەستان ئەو تری دهاتە د مەرچقاندن و گڤاشتن، هەتا هەمی

تری د د گڤاشت، پاشی دا نخێڤن دا پیس نەبیت و د هێلا ل وێرێ بۆ دەمێ شەش حەفت رۆژان و رۆژانە د هاتە تێکڤەدان و مەرچقاندن، هەتا بەرك و قەلپێن تری و ئاڤا وی خوە ژێك بەردا. پاشی ئامانەکێ دی باش د شویشت وپاتەك ددانا سەر دەری و پێڤە ئاسێ دکر و ئەو ئاڤا تری پیچ پیچە ل وی پاتەی د کر و ئەو تشتێن ب سەر د کەتن، د گڤاشتن پشتی پاتە ژێڤە دکر و ئەو سێلمیتە و بەرك و تیڤلێن ب سەر دکەتن د هاڤێتن.

پشتی پارزناندنێ ئەو ئاڤ د کرە د هەر جۆرەکێ ئامانانداپا، و دەرێ وان باش دهاتنە گرتن، کو با ب ناڤ نە کەتبا، ئەگەر دا خراب بیت و بیتە مەی (شەراب)، ددانا جهەکی بۆ دەمێ چل رۆژان، و د ڤی ماوەی دا نەدبوو دەرێ وێ ڤەکەن، ئەگەر دیسان دا خراب بیت و بیتە مەی و باشی ب کار دهینان بۆ دەمێن پێدڤی.

* **سهکا مێویژان:** ژ هەمی جۆرێن مێویژان دهاتنە چێکرن. ل بەراهیێ مێویژ ژ دیلك دکرن و پاقژ دکرن و د کرنە د ئامانەکێ مەزن دا و ئاڤێ دکەن سەر و پاتەکی دانن سەر دەرۆکێ وێ و بۆ ماوێ سێ چوار رۆژان د هێلن، دا ئاڤێ باش ب مێژن و بوف ببن، مینا تری لێ بهێن. پشتی دەستێن خوە د شوون و زوها دکەن، دێ هەمی مێویژان پەرچقینن و نخێمن هەتا هەفتیەکێ. ئێدی وەکی سهکا تری چێدکەن[87].

* **سهکا قەسپان :** هەمی جۆرێن وان ڤەدگرن و پتر ل وان گوندێن بێ رەز لێ د هاتە چێکرن. پشتی ئاڤا قەسپان دهێتە کێشان، هەر مینا سهکا تری و مێویژان د هێتە چێکرن.

**- سهکا دۆشاڤێ**[88]:

هندەك ئاڤێ دێ کەن ئامانەکی و هندەك دۆشاڤێ دێ کەن ناڤ و خوێ پێوەر کەن و باش تێکڤەدەن و کەڤچکەکێ هەڤیر ترشی (سهکا کەڤن) کەن ناڤ و کەن ئامانەکی و دەرێ وێ باش گرن ب رەنگەکی کو با تێ نەچیت و دێ داننە جهەکێ گەرم، هەتا هەیڤەکێ یان پتر. پاشی دێ ل تویرکەکێ قوماشی کەن و پارزینن دا چ پیساتی ب بن نەکەڤن و یا پاقژ بیت.

## - شەراب (مەی)[89]:

پتر ل گوندێن مەسیحیان د هێتە چێکرن. ژ گەلەك رەنگێن فێقیان د هێتە چێکرن و چێکرنا وێ هەر وەکی یا سهکێ یە، لێ ل ڤێرە بەری چل رۆژ ب دوماهی هاتبان د هاتە ڤەکرن، دشێن پشتی بیست رۆژان دەرێ وێ ڤەکەن و ئەگەر با ب ناڤ کەتبا دبوو مەی (شەراب). و ب هیچ رەنگەکی نابیتە سهك.

هەلبەت ژ بلی ڤان خوارنان گەلەك خوارنێن نوی جهێن خۆ دناڤ خوارنێن دەڤەرێ دا گرتینە و بووینە پشکەك ژ خوارنێن رۆژانە، مینا:

## - شێخ مەحشی[90]:

ژ باجانسۆرك و باجانرەشك و پیڤاز و قیمێ گۆشتی و پیڤازا و خوێ و بهاراتا رووینی د هێتە دروستکرن. ل دەستپێکێ دێ باجانرەشکان بەرهەڤکەن و ژ بنیڤە یان ژ سەریڤە دێ هێتە قەدکرن پاشی دێ هێتە قەوراندن و قۆرکرن، پاشی دێ خوێ پێوەرکەن یان کەن ناڤ ئاڤخوێدا بۆ ماوێ (١٥) دەقیقان، پاشی دێ هێنە پاقژکرن و هشککرن و د رووینیدا قەلینن، پیڤاز ژی دێ هێنە هویرکرن و د رووینیدا هێنە قەلاندن، قیمێ بەرهەڤکری دێ کەن سەر و پێکڤە د رووینیدا هێنە سۆرکرن و خوێ و بهاراتا و کەرەفسێ پێوەرکەن و پاشی تێکەلی یەك کەن... پشتی هینگێ باجانرەشکێن قەوراندی دێ هێنە داگرتن ب وی قیمێ بەرهەڤکری و ب داڤێن کەرەفسێ دێ هێنە گرێدان و کەن دقازانەکێدا و هندەك ئاڤا باجانسۆرکێن گڤاشتی یان ئاڤا مەعجینێ تەماتێ کەن سەر و دانن سەر کوچکی و ئاگری دەن بن یان دێ کەن د فرنێدا بۆ ماوێ نیڤ دەمژمێرێ ب پلەیەکا گەرمێ یا ب قایدە هەتا ئاڤا وێ پیچە تیر دبیت دێ هێتە دانان و ب گەرمی ل گەل برنجێ یان ب نانی دێ هێتە خوارن.

## - مەقلۆبی (برنجا وەرگێرای)[٩١]:

ڤێ خوارنێ پێدڤی ب گۆشتێ نەرمەیێ پەزی یان مریشكێ و برنجی و باجانرەشك و باجانسۆرك و كولند و سیر و پیڤاز و ئاڤە گۆشتێ و فلفلان و خوێ و بهارات و ترشی و رۆینی هەیە.

ل دەستپێكێ برنج د هێتە پاقژ كرن و نماندن، پاشی پیڤاز و باجانرەشك و كولندو فلفل و باجانسۆركان دێ كەنە تەقال تەقال ، و سیر و كەرەفسان هنجنن و ئەڤ خوارنە هەر مینا برنجێ دهێتە دروست كرن، لێ گەلەك ژ تشتێن ناڤبری قەلاندی د كەنە د ناڤدا و رێز رێز ددانن، كو رێزا سەری ب برنجی ب داوی بهێت. پاشی ئاڤەگۆشتێ دێ ب سەر هەمیێ دا كەن و دانن سەر ئاگری یان د فرنێدا ب پلەیەكا گەرمێ یا ناڤنجی و خوە لێ دگرن هەتا چێدبیت، پاشی دێ وەرگێرن سێنیەكا مەزن و ب گەرمی د هێتە خوارن، خودان دشێت كشمش و باهیڤا ژی بكار بینت.

## - تەشریبا گۆشتی:

ل دەستپێكێ دێ گۆشتی هویركەن و كەن پشكێن گر و خوێ پێوەر كەن و ئاڤێ ب قایدا چێكرنا تەشریبێ دانن سەر ئاگری هەتا د كەلیت، پاشی گۆشتی و هندەك دی خوێ و سەركێن پیڤازا پێن پشتی د هێنە پاقژكرن كەن ناڤ ئاڤا كەلی و خوە لێكرن هەتا ئەو گۆشتە باش د كەلیت، دێ پیڤازان ژی جداكەن و ترارەكی كویر و پیچە فرەهـ یان هەر ئامانەكێ بیت، دێ نانی هویركەنێ پاشی وێ ئاڤە گۆشتێ ب گۆشتڤە دێ كەن سەر هەتا د نمهیت و ب گەرمی د هێتە خوارن.

بێگومان هەر ئێكی ل دووڤ حەزا خوە بهارات پێوەردكەت ... سەرەرای بهاراتا سیرا و ترشێ سماقێ یان تەمەر هندێ و لیمو بەسرا د كەن ناڤ. هەژیە بێژین هندەك تەشریبا عویركان ژی چێدكەن ( ل دووڤ پێزانینان ل ناڤ سندیان چێدكەن)، لێ چێكرنا وێ یا جودایە ژ چێكرنا تەشریبا گۆشتی.

## - بریانی[٩٢]:

ژ وان خوارنانە یێن نوی پەیدابووین ، پێدڤیاتیێن وێ هندەك گۆشتێ نەرمە و چەند پەرداغەكێن برنجی و هندەك پەتات و باهیڤ وكشمژ (خاتینۆك) و خوێ وسیر و پیڤاز و رۆین و بهارات، دێ گۆشتی هویركەن و كەن پشكێن ب قایدە و باش هێتە شویشتن و د رۆینیدا قەلینن و كوپەكی ئاڤێ كەن سەر گۆشتی و دانن سەر ئاگری هەتا ئەو ئاڤە هشك دبیت و گۆشت د كەلیت، پاشی سیر و پیڤاز د هێتە هویركرن و قەلاندن درۆینیدا، پاشی پەتات دهێنە سپیكرن و هویركرن و قەلاندن، دیسان پیڤاز و سیر و كشمژ و بەزالی و باهیڤ ژی درۆینیدا دهێنە قەلاندن و جدا ددانن وێرێ ...

پاشی برنج دهێتە لێنان، پشتی برنج چێدبیت، ئەو تشتێن هاتینە ئامادەكرن باش تێكەلی یەك دكەن و دكەن ناڤ گرارێ و تێكڤەددەن هەتا باش دناڤ گرارێ لەل دبن، ددانن ڤە سەر ئاگرەكێ كێم و خوە لێدگرن هەتا چێدبیت ژ كوچكی ددانن هەتا سار دبیت و تاما خوە بەرددەت.

# كار و پیشەیێن كوردەواری ل پارێزگەها دهۆكێ

كامیران درباس اسماعیل

## هێلا مازییا:

وەك دیار سرۆشتی دەڤەرێ سرۆشتەكێ چیایی یە و گەلەك جۆرێن گیای و داروباری لێ هەنە، خەلك مفایەكێ باش ژێ دبینن و دبیتە داهاتەك بۆ خەلكێ دەڤەرێ، ئێك ژ ڤان داهاتان مازی یە و ب تایبەت ل گوندێن دێم.

وەك دیار مازی ب جۆرە دابەرویەكێ ڤە دهێت كو دبێژنێ (دارمـازی)، بەرویێن وان ژی دبێژنێ (بەروی مازك) و باراپتر وەك ئالف بۆ پەزی دهێتە ب كارهینان، مازی هەر د كەڤندا وەك دەرمان بۆ چارەسەریا هندە ئێشان دهاتە بكارهینان، هەروەسان بازرگانی پێ دهێتەكرن و بۆ پیشەسازیان دهێتە ب كارهینان، تایبەت بۆ خۆشكرنا پیستێن گیانداران و گەلەك كارێن دی، لەوما بهایێ خۆ د ناڤ بازرگانیێ دا هەیە و دهێتە هنارتن بۆ وەلاتێن هەڤسوی، ب تایبەت ئیران و تركیا، هەروەسان د ناڤ عیراقێ بخۆ ژی دا دهاتە فرۆتن و بازرگانێن وێ هەبوون. دیسان مازی مینا تەبەلان یاری پێ دهاتنەكرن، ب تایبەت ژ ئالیێ زارۆكانڤە. ل دەڤەرێ دو جۆرە مازی هەنە: مازیا شین و مازیا سپی و جۆرێ ئێكێ ب بهاتر بوو ژ یێ دووێ و بازرگانی پتر ل سەر هەبوو.

## هێلاچنینا مازییان:

هێلا مازیان باراپتر دكەڤیتە داویا هەیڤا تەباخێ، هەر دەڤەرەكێ رێ و رەسمێن خۆ یێن تایبەت هەنە. هەروەسان هەر گوندەكی سنوورێ خۆ یێ دەستنیشانكری ژی هەیە و نابیت زندەگاڤیان ل سەر ئاقارێ گوندەكێ دی بكەت و مازیان د ناڤ ئاقارێ وی گوندێ دا بچنیت، ئەگەر ئەڤ چەندە رویدا، دبیت ئاریشە دناڤبەرا وان گوندان دا پەیدا ببان، یان ژی مازیێن وی ژێ هاتبانە ستاندن و ئاخفتنێن نەخۆش گۆتبانێ، ل هندەك گوندان ئاقار د ناڤبەرا گوندییان بخۆ ژی ڤە یێ لێكڤەكری بوو و نابیت كەس زێدەگاڤیان ل سەر جهێ ئێكێ دی بكەت. دیسان نابیت ل بەری دەمێ دەستنیشانكری كەس بچیت مازیا ب چنیت.

ل هێلا مازیان بەراهیێ رۆژەك دێ ژ ئالیێ روی سپییێن گوندیڤە هێتە دەستنیشانكرن و نابیت كەس بەری هینگێ ڤی كاری بكەت. ل ئێڤاریا رۆژا بەری هێلێ بانگهەلدێرەك، چ گزیر بت یان موختار، یان هەركەسەكێ دی دێ چیتە سەر بانی یان جهەكێ بلند و گازی كەت:

**هێ ... گەلی گوندییان، سوباهی هێلا مازیانە.**

ل سپێدێ زوی ژن و زەلام دێ خۆ بەرهەڤ كەن، دێ چانتك و چەلاكان دگەل خۆ بەن، چەلاكە ژی دو جۆرن و هەر جۆرەكێ كو ب ئاوایەكێ ئەندازەیی د هاتنە چێكرن كارێ خۆ یێ تایبەت هەبوو، ل رۆژا هێلا مازیان دا بەرێ خۆ دەنە چیا و زنارێن گوندی و مازیان چنن، ڤێجار هەر كەسەك و كا دێ چ ب دەست كەڤیت، ل هندەك دەڤەران دار مازی هەبوون كو ناڤ و دەنگێن خۆ هەین كو گەلەك ب بەر بوون د گۆتنێ (دارا مەعدەن)، هەروەسان هندەك كەس ژی هەبوون ناڤێ وان ب گەلەكچنینێ چووبوو د گۆتنێ (مازی چن). د بەر مازی چنینێ را گەلەك جاران ستران د هاڤێتنە بەرێك و ل بێهنڤەدانان گۆڤەند گرێددان دا وەستیانا خۆ ژ بیربكەن.

دەمێ مازیان دچنن، باراپتر مازیێن كت دبینن، لێ هندە جاران ب شێوازێن دی دبینن، بۆ نموونە:

**بەركاتك (بەركاتۆك)،** دو مازیێن پێكڤە نویسیای.

**جۆتك،** دو مازی ب بستیكەكێ ڤە و گەلەك نێزیكی ئێكن.

**سێتك،** سێ مازی ب بستیكەكێ ڤە.

**مازیا كەلەمی،** ئەو مازی نە كو پشتی بەلگوەرینێ دیار دكەن[1].

## چنینا كەزانان (كەزوانان):

ئێك ژ دەرامەتێن دی یێن گرنگ ژ سروشتێ دەڤەرێ دهێن كەزانن كو مفا ژێ دهێتە وەرگرتن، چ بۆ كەزانان وەك خوارن و چ بۆ فرۆتنێ و چ ژی مفا ژێ وەرگرتن بۆ چێكرنا سابوونێ و چێكرنا تەحینێ و دەرئێخستنا بەنیشتی، كو ئەو ژی گەلەك جاران وەك دەرمان و ب تایبەت بۆ كولكان د هاتە ب كارهینان، هەروەسان ل بەرێ خوارنەك ژی ب ناڤێ تەحینا كەزانا یان كو هندەك دبێژنێ (مەرەمویت) ژێ چێدكرن، لێ وەك دیار ژیانا خەلكی ب رەنگەكێ بەرفرەهـ هاتییە گوهارتن، لەوما ئەڤرۆ دەست ب ژ كارێ چێكرنا سابوونێ ژی هاتییە بەردان و نها كەس وی كاری ناكەت، لێ دبەرێ دا د نەچاربوون ب رێكێن تایبەت چێدكرن و ئەو ژی د چەند قۆناغان را دەرباز دبوو و هەر قۆناغەكێ دەمەك پێ دڤیا.

**چنینا كەزانان،**

پشتی كەزان دگەهن، خەلك ئێك ئێكە یان كۆم كۆم قەستا چیا دكەن و ب رێكێ ڤە، یان دبەر چنینێ را ستران ژی د هاڤێژنە بەرێك. چنین و كۆمكرنا كەزانان ئەگەر ل بەرێ ب رەندۆل* و سەڤیكان بیت، ئەڤرۆ نایلۆنان ددانە بنێ دارێ و كەزانان ب چەلاكان دادقوتن و پشتی ڤێدانێ، ل بەر هەتاڤێ رادئێخن هەتا باش هشك دبن، پاشی ژێك دهێنە ڤاڤارتن، ب تایبەت ئەگەر بۆ كارێن بازرگانی بن.

د ناڤ ژیانا كوردەواریێ دا و ژ بەر گرنگییا ڤێ دارێ گەلەك جهـ ل گوندان پێ دهێنە نیاسین، هەروەسان ناڤێ خۆ دناڤ زمانی ژی دا وەك مامك، یان وەك ئیدیوم و گۆتنێن مەزنان گرتییە:

- **بەحرا شینە، ئاڤ تێ نینە** .... واتە كەزان (وەك مامك).
- **چێل دۆتن و كەزان كەلۆتن** !! (گۆتنا مەزنان).
- **خودێ كەزانا ددەتە بێ ددانا** (گۆتنا مەزنا)[2].

## چاندن و فرۆتنا دار سپینداران:

سپیندار دارەكا ئاڤی یە و باراپتر ب دەستی دچینن، دارەكا بلندە و تا (٣٠م) بلند دبیت، ژیێ وێ هەتا سیهـ سالان درێژ دبیت. دەڤەرا بەهدینان ژی دەڤەرەكا گونجایە بۆ چاندنا ڤی جۆرە داری، ب تایبەت دناڤ گەلیێن كویر دا و ل بەرئاڤا، ب گەلەك رەنگان مفا ژ دارێ وێ دهێتەوەرگرتن، چ وەك دار بۆ گەلەك كاران و چ وەك بازرگانی، ل بەرێ بۆ ئاشێن ئاڤێ ژی دهاتە ب كارهینان، لەوما گرنگیەكا تایبەت ددانە چاندنا وان. شارەزایێن كارێن سپینداران دیار دكەن دبێژن ل چوار سالیێ دارێ وێ ب كێر برینێ دهێت، سپینداران بازرگانێن خۆ هەبوون كو گۆتنێ (تەراح)، ئەو تەراح دهاتن ل حەودێن سپینداران دگەریان، دەمێ ئەو و خودانێ سپینداران پێكهاتبان، ئەو دارێن د كرین نیشانەكا تایبەت لێ د كرن دگۆتنێ (قەمچە-قامچی)، و ئەگەر چەند تەراحان ئەو حەود كریبان، هەر ئێكی نیشانا خۆ لێ دكر، یان ل هندە دەڤەران پارچەیەكا هندی تلەكێ درێژ ب كێركێ ژ سپیندارێ

کۆمکرنا کەزانان



ڤەدکرن د گۆتنێ (ناتك). پشتی هینگێ ئەو دار د ئێخستن و د هاتنە سپیکرن و ل دووڤ پێدڤی دار د هاتە پارچەکرن (بنتا، ناڤتا، سەرتا).

بۆ ڤەگوهاستنا داران ژی ئالاڤێن کێشانا وان ب ساناهی نەبوون، لەوما ب ڕێکێن تایبەت و درێکێن ئاڤێ دا دهاتنە ڤەگوهاستن هەر ژ داویا بهارێ و تا چلێ زڤستانێ، واتە ل ١٢/٢٥ ئەڤ کارە دهاتە ئەنجامدان، شارەزایێن ڤی کاری د بێژن جوییان ل بەری هەر کەسەکی ل دەڤەرێ ئەڤ کارە دکر. ل بەراهیێ دار د کرنە کەرخ *و وێ ژی شارەزاییەکا باش پێ دڤێت، هەر ژ چێکرنا کەرخان و بارکرنێ و هەتا دگەهیتە بنەجهێ، ئەو کەسێن ئەڤ کارە ژی دکرن دڤێت چەند ساخلەتێن تایبەت هەبان دا شیابا ڤی کاری بکەت، وەك: مەلەڤانی، هێز، شارەزایی، بێهن فرەهی*.

دارا سپینداری ناڤێ خۆ یێ دناڤ فلکلۆرێ کوردی ژی دا گرتی، چ د ناڤ گۆتناندا، یان ژی دناڤ حەیرانۆکاندا؛

گۆتن دبێژیت:

**تۆ وەك سیها سپینداریێ.**

حەیرانۆکەك ژی دبێژیت:

**های شڤن شڤن**
**سپینداریت گوندێ مە شڤن**
**ژ سەری د لەقن ژ بنی د لڤن**
**سەد حەیف و مخابن کورکێت گوندێ مە ب تنێ د نڤن**[3].

## کرنا ساڤارکرن:

ساڤارکرن ئێك ژ پێدڤیێن ژیانێ بوو ل کوردستانێ،

چونکی خوارنا وان یا سەرەکی بوو و د نەچار بوون بکەن دا قویتێ زڤستانێ بۆ رۆژێن تەنگاڤ ڤەجەمینن کو رێك و رێبار ژ بەر سەقایێ دژوار دهاتنە گرتن و ئالاڤێن هاتن و چوونێ نە مینا ئەڤرۆ د مشە و ب ساناهی بوون.

کرنا ساڤاران باراپتر ل داویيا هاڤینێ و بەربەرکی پاییزا دهاتەکرن، هەر مالەکا ساڤار دکر، گەنمەکێ بژارە ددا رەخەکی بۆ کرنا ساڤاری، چونکی لاوینیيا ساڤاری یا گرێدای لاوینیيا گەنمی بوو کو باراپتر دندکا وی یا درێژ بوو، مینا گەنمێ (ئیتالی و ددانحێشترکی و زەرگول و ... هتد).

**ساڤارکرن د چەند قۆناغانرا دەرباز دبیت:**

ل بەراهیێ گەنم دهێتە بێژنگکرن و شویشتن و ل هندە جهان دهێتەڤەدکرن ژێ، واتە هلاڤێتن و وەربادانا گەنمی دناڤ سێنیەکێ دا دا بەر و کلکلە ژناڤ بهێنە ڤاڤارتن. ل دووڤدا و ل رۆژا ساڤارکرنێ دێ مەنجەلەکا مەزن یا تایبەت ب ساڤاران ڤە هینن و کوچکەکێ مەزن بۆ بەرهەڤکەن، مەنجەلێ ددانە سەر کوچکی و تژی ئاڤ کەن و ئەو گەنمێ پاقژ کری بەرددەنە دناڤ وێ ئاڤێ دا و ئاگرەکی ل بن خۆشکەن، هەتا ئەو گەنم دکەلیت و ئاڤا وی هشك دبیت و دان ب تنێ بمینت، هینگێ ساڤار کو دبێژنێ (دانیك) دگەهن و نیشانێن چێبوونا وان ددیارن. پشتی وێ چێبوونێ ئێدی ل گەلەك جهان زارۆ وەك رەوشت و تیتال سێنییەکێ دگەل خۆ دهینن و بۆ خۆ دهێنە دانیکان و هەر ئێکی لەپەکێ بۆ دکەنێ و ئەو ژێ خوێ پێوەر دکەن دخۆن. پشتی هینگێ دبیتە زبارا رائێخستنا وان دانیکان کو چەند ژن و زەلام پێ رادبن و باراپتر د جحێلن، وان دانیکان ب تەنەکان، یان تەبەق و سەلکێن شڤکا و گوینیکان دهیننە دەر و ل بانەکێ هنی و هوسی و پاقژ رادئێخن و ئێك ل سەر بانی بەلاڤەدکەت دا زوی هشك بیت و ترش نەبیت، ب تایبەت ئەگەر سەقا یێ گەرم بیت. پشتی ڤێ کریارێ هەلامەتەکی (مامکەکی) دناڤدا د چوکلینن، یان هندەك ل بەر رادوەستیان دا چیچك نەخۆن هەتا هشك دبوو ژ ئالیێ ژنکانڤە دهاتەتێکڤەدان دا زوی هشك بیت و دا ترش نەبیت، ب تایبەت ئەگەر دونیا یا گەرم با. پشتی هشكبوونا وی گەنمی ب چەند رۆژەکان جارەکا دی خرڤە دکرن و دکرنە د گوینیکاندا بەرهەڤدکرن بۆ قوتانێ، ئەگەر گەلەك با دبرنە ئاشی، لێ ئەگەر یێ کیم با ب دستاری و میرکوتان (کو ل هندە جهان د بێژنێ داردنگ) دکرنە ساڤار و ئەڤ چەندە نها گەلەك یا کێم بووی و بەر ب نەمانێ ڤەیە.

پشتی هێرانێ جارەکادی دهینانە مال و ل بێژنگەکا تایبەت دکرن و ددانە بای و سڤی و دان ژێك جودا دکرن، ساڤارێ ب سەردکەت دگۆتنێ سەرۆکە و یێ هویرێ بن دکەت د گۆتنێ سمیتك و یێ ناڤنجی د گۆتنێ خاتوینی. هەژی ئاماژێ یە ل بەرێ هندەکان ئەو سڤی ژێ دکرنە بالیفك.

ساڤارێ جهێ خۆ دناڤ گۆتنێن کوردی ژێ دا گرتی:

- **ساڤار ئالیکا مێرانە.**
- **ساڤارێ مێران بێنۆ بێنۆ دکەلت.**
- **چو نەدیتی ساڤار (دانهێرك) لێ عەیدە.**
- **ئادارێ، ئاگر خۆشترە ژ ساڤارێ.**

دناڤ ژیانا کوردەواریێ دا ل دەڤەرێ ئەگەر د رۆژا ساڤارکرنێ دا ئاریشەك یان بەلایەك بۆ خودانێ مالێ رویدابا، پشتی هینگێ وان وەك کەڤنە باوەری چ جاران ساڤار ب دەستێ خۆ نە دکرن، بەلکی ب هیڤیيا مالەکادی ڤە دکرن و دگۆتن: ساڤارکرن ل مە ناهێت.

## شەڤەرۆك:

کارەکە ب شەڤ و ب کۆم دهێتەکرن، لەوما ناڤێ شەڤێ یێ ل سەر، د ڤێ کریارێ دا کچ و کورێن گەنج ب هەڤرا ساڤاری دهێرن، یان ژێ برنجێ پیش دهێرن دا ببیتە برنجێ گرکگری، واتە نیڤ سپی و نیڤا دی ب پیش، یان ژێ بۆ نیسك و دانهێرکان و پشتی هینگێ د جوهنی دا د قوتان و دبوو برنجێ بەرهەڤکری بۆ خوارنێ. ئەڤ شەڤەرۆکە ل دوماهیيا پاییزێ پشتی بێدەر دهاتنەهەلاندن دهاتەئەنجامدان. د ڤێ کریارێ دا کچ و کورا خۆ دکرنە دەستك،

واتە کچەك دگەل کورەکی، یان دو کور دگەل دو کچان و دستار ب هەڤرا باددان و سترانێن تایبەت ب شەڤەرۆکان دگۆتن. دەمێ دەستکەك وەستیابا د گەل دەستکەکێ دی دهاتەگوهارتن و ئەڤ شەڤەرۆکە دبیت بۆ چەند شەڤەکان ڤەکێشابا، ئەو ژی د ما ل سەر وی دەرامەتێ هەیی کا چەندە. خودانێ مالێ ژی ژ ئالیێ خۆڤە خوارنێن خۆش بۆ وان بەرهەڤدکرن و فێقی دداین و پشتی نیڤا شەڤێ خوارن ژی بۆ دهینا، و ئەگەر دەستکێت شەڤەرۆکێ برسی ببان، ب سترانکی داخوازا خوارنێ ژ کابانییا مالێ دکرن و وێ ژی ل دووڤ پێ چێبوون خوارن بۆ دهینا، مال چەند یا هەیی و حال خۆشتر با، دەستکێ دستاری ژی گەرمتر لێ دهات، چونکی هەمی مال وەك ئێك نەبوون، بەلکی هەبوون د هەژار و حالێ وان یێ ناڤنجی و هەبوون د حالخۆش، دبیت د ڤان شەڤەرۆکاندا هندەك چیرۆك و سەرهاتی و ستران و حەیران و مامك ژی هاتبانە گۆتن.

**ئالاڤێن شەڤەرۆکان:**

**١- دستار:** پێکهاتییە ژ دو حەلانێن گر و گرۆڤر، رەنگێ وان سەر شینی ڤەیە و ئەڤ جۆرە بەرە ل جزیرا بۆتا یێ مشەیە کو دستارێن باش ژێ دهاتنە دروستکرن. دستار ژ دو کتا پێکدهێت، کتا بنی کو ل نیڤا وی د هاتە قەوراندن و دارەك موکم تێ دقوتا دا کو ژ کتا سەری نە دەرکەڤیت، دیسا کتا بنی یا نە لڤ بوو و نە دهاتە بادان، بەلکی مینا بنکەکی یێ راوەستیایی بوو و کتا سەری د هاتە بادان. کتا سەری ژی هەر ب قەبارێ کتا بنی یە، نیڤا وی ب قەبارێ پەحنکا دەستێ زەلامەکی د هاتە قەوراندن بۆ هندێ دا تێرا ساڤاری ب کەنێ، دیسان رەخێ وی ژی د هاتە قەوراندن و دارەك ب درێژاهییا بهۆستەکێ بلند وەك دەستك موکم تێرا د قوتان.

**٢- گرك:** بنێ وی هەر مینا بنێ دستاری یە، لێ کتا سەرێ دارەکێ موکم بوو، مینا دارێ توی و چنارێ و گویزێ. گرك یێ تایبەتمەند بوو بۆ سپیکرنا برنجی.

سترانێن شەڤەرۆکان:

ئەو سترانن ئەوێن ل شەڤێن پاییزا د بەر شەڤەرۆکانرا د هێنەگۆتن، ژ سترانێن کاری نە و باراپتر ژ چێکرنا ژنانە، ئەڤ جۆرە سترانە یا کێمە، نە مینا سترانێن داوەتان مشەنە، لێ ژ ئالیێ کێش و سەروایێ ڤە مینا وان دهێنەگۆتن، دبیت ئەگەرێ وێ چەندێ ئەو بیت شەڤەرۆك ب تنێ ل وەرزەکی یێن هەین و ژ ئالیێ هندەکانڤە د هێنەکرن، لێ گۆڤەند و دیلان ب درێژاهییا سالێ بەردەوامن و ژ ئالیێ پتریا خەلکی ڤە دهێنەکرن:

**دێ ب هێرە ب هێرە دستاری ب هێرە**
**دێ ب هێرە ب هێرە دستاری ب هێرە**
**دستاری بادە نێ یارا ل ڤێرە**
**دستاری بادە نێ یارا ل ڤێرە**

دناڤ ڤان شەڤەرۆکاندا گەلەك جاران وەك یاریان ژی دهاتنەکرن، بۆ نموونە دا دستاری ب دژواری بادەن و بەردەن و کا دەستکێ دستاری ل راستا کێ راوەستیابا دا بێژنێ تۆ دێ شوی کەی و وەسان ئەو کریار چەند جارکی دوبارەدکرنەڤە، یان هندە جاران داوەت ژی د بەررا د کرن[٤].

## هێستر و نالبەندی:

ژ بەر سەختی و دژوارییا رێکێن چیای و نەبوونا ترۆمبێلان، خەلك یێ نەچاربوو دەواران ب رەنگەکێ گشتی، هەر ژ کەرا و هەسپا و هێسترا ب خودانکەن، لەوما هەر د کەڤندا خەلکێ دەڤەرێ پویتە پێ داینە و رابووینە ب سەخبێرکرنا وان و سەروبەرێ وان ب هەمی رەنگان هاتییەکرن، ژ جل و بەرگان و ئالفی و نالکرنێ و ... هتد.

هەلبەت هێستر ژ هەمی دەوارێن دی ب هێزتر بوو بۆ هاتن و چوونێ، لەوما گرنگییەکا پتر بۆ کاروبارێن خۆ پێ ددان و وەك دیار ئەڤ گیاندارە نازێت، چونکی تێکەلەکە ژ ماهینێ و کەری.

کارێ خودانکرنا هێستران (دەوار ب گشتی) نها پتر ل سەر سنووران هەنە ژبۆ ڤەگوهاستنا کەل و پەلان دناڤبەرا وان سنووراندا، چونکی هەر هێسترەك دشێت ١٠٠ کیلویان بار بکەت و ژ بەر ڤێ گرنگیێ

پێ ددەن گەلەك جاران ناڤان ژی ددانە سەر وان هێستران، وەك: خەمۆ، کوندۆ، خەزال و ... هتد. یان هندە پەیڤان ب زمانەکێ تایبەت د گەل د ئاخڤن، بۆ نموونە:

وشە: واتە هەرە د هاژۆتنێ دا.

بەرە: خۆ ڤەدە، هەرە رەخەکی.

هەستە: پێ خۆ راکە.

شۆ: وەرە.

شۆش (وشۆش): راوەستە.

هەروەسان فیتییەکا تایبەت ژبۆ ئاڤ ڤەخوارنێ یا هەی.

**سەرویەرکرنا دەواران،** پێکهاتییە ژ چەندین کاران، وەك: کورتانی، جلی، سەرهەفساری، تەنگێ، نالان.

**چێکرنا کورتانان،**

ڤی کاری هۆستایی و شارەزاییەکا باش پێ دڤێت، د بەرێ دا مووسلیان ئەڤ کارە دکرن و د هنارتنە دەڤەرێ. یان هندەك ژ وان مووسلیان هەر ل باژێرێن دەڤەرێ بخۆ مینا دهۆکێ ئەو کاردکرن، لێ ل ڤان سالێن داویێ هندەك ژ خەلکێ دەڤەرێ بخۆ ژی ئەو کاردکرن و تا نها ژی هندەك ل سەر د بەردەوامن.

چێکرنا کورتانان پێدڤی ب چەند تشتان هەیە، وەك: تەحتیك، تەلیس، قرشەکێ تایبەت کو ژ گیا کورتانی چێدکەن دگەل دو سێ جووتەکێن شوژنان و هندەك ئالاڤێن دی، کورتان ژ پالییێ و بەرۆکی و سەریالیێ پێکدهێت.

جلێ هێستریێ ژی ژ کەربەتەنی و تەکنامان (تەحتیك-تانیك) و جوهالان دهێتە چێکرن، ب دو سێ تایی و تەرتیبدان ب درواریێ هەتا د بوو جل، تەنگ ژی ل سەر جلی دهێتە گرێدان و ئەڤ تەنگە ژ ریسی دهێتەکرن، ژ ئالیێ خواریێ پێ پانە و ل سەری پێ زراڤە. سەرهەفسار ژی د کەڤیتە سەرێ دەواری و هەفسار ژ بن لغاڤا دەواری دکەفتە سەرهەفساری، سەرهەفسار (٢-٣م) یێ درێژە. جهۆر ژی وەك چانتکەکی یە، ئالفێ دەواری د کەنە تێدا و د ستویێ وی دان (مینا هافرەکێ هەلاویستییە)[٥].

## نالبەندی:

پیشەیەکا کەڤنا کوردەوارییە، ڤێ چەندێ ژی شارەزایی پێ دڤێت و یێ بسپۆر بیت د ڤی کاری دا دبێژنێ (نالبەند)، دبیت بنەمال ژی ب ڤی ناڤی هەبن کو هەر ژ ڤی پیشەی هاتینە. گرنگیا ڤی کاری یا د وێ چەندێدا کو هندی دەوار ل سەر کەڤر و کاشان دچن، دەست و پێن وان د مەهن و ئەڤ نالە ژ مەهیانێ د پارێزن، ڤی کاری پێدڤی ب چەند تشتان هەیە، وەك: بزمار، نال، سومتراش، گازك، چەکووچ، زیاف (کو ل نیڤا دەواری دگرت)*، نالبەند د کاری خۆ دا یێ پێدڤی دو کەسانە دا هاریکاریا وی بکەن دگرتنا دەواری دا.

قەبارێن نالان ژی نە وەك هەڤن، ئەو ژی دمینتە ل سەر قەباریێ پێن دەواری، بۆ نموونە پێن کەری د بچویکن.

## نەخۆشی و چارەسەرییێن دەوارن:

وەك هەر زیندەوەرەك، دەواران ژی ئێشێن خۆ هەنە و ل دووڤ کاودانێ وی سەردەمی چارەسەر دکرن، ئەڤ ئێشێن د بەرنیاس ژی ئەڤەبوون:

- **بەلگ،** دەواریێ توشبووی د گۆتنێ (یا ژ بەلگا گرتی)، تێدا گیاندار شڕ دبوو و نە دچەری، بۆ چارەسەرکرنێ ژی شیژنەك ل دفنا وی ددان و خوین ژێ د هات و تەنا دبوو.

- **کام،** ئەگەر هێستر ل دەمێ چەرینێ نەشیابا چەرا خۆ داعویرت، د گۆتن (کامێت وی یێت کەتین)، بۆ چارەسەرکرنێ ژی دارەکێ ستوور هندی دەستبڤری دکرنە ددەڤی دا، دا دەستێ هۆستای لەق نەدابا و کێرکەك ل پەحنکا دەڤێ وی ددان و خوێن ژێ دهینان.

- **بێرخوین،** نیشانێن ڤێ ئێشێ سینگێ وی د وەرمت و نەدشیا ب چەرت، بۆ چارەسەرکرنێ ژی دەپەکێ داری باش گەرم دکرن و چەند جارەکان ب سینگێ وی ڤەدنان.

- **باخوین،** تێدا بەرسینگێ دەواری د وەرمی، بۆ

چارەسەرکرنێ ژی پیچەك ژێ د سومتن و بەنك ژ داڤەکا چیای کو یا تایبەت چەند جارەکان تێ د هەلکێشان و دبرن و دهینان.

- **زکئێش (قۆلنج)**، تێدا دەوار خۆ بەرددەتە ئەردی و خۆ د کەتە قورمك کو نیشانا زکئێشانێ یە، بۆ چارەسەرکرنێ ژی گۆپالەکێ کنێرێ تێ د هوسین، یان تشتەکێ شرین دانێ دا زکێ وی پێ چووبا.

- **کفتەبوون**، ئەڤ ئێشە گیانداری ژ کار دئێخیت و نەشێت ب رێڤە بچیت، بۆ چارەسەرکرنێ ژی هەیامەکێ چ کاران پێ ناکەن هەتا بێهنا خۆ باش ڤەددەت.

## کون بەفر:

جۆرە زێارەکە ل وان جهێن بەفرین د هاتە ئەنجامدان، تێدا بەفرێ بۆ رۆژێن پێدڤی و گەرم، یان ل هندە جاران وەك دەرمان دهاتە ب کارهینان و ب رێکەکا تایبەت د هاتە هەلگرتن.

ل ڤان دەڤەرێن بەفرین جهێن تایبەت هەنە بەفرێ تێدا ب پارێزن و ب کون بەفر دهێنە نیاسین و دبیت ئەو جهـ یان ئەو دەڤەرا کون بەفر ژی لێ، هەر ب وێ چەندێ بهێتە ناڤکرن، بۆ نموونە گەلیێ کون بەفرێ ل گوندێ ئۆرە ل دەڤەرا بەرواری ژووریا کو وەك نموونەك ژ کونبەفران:

ئەڤ کونبەفرە دکەڤیتە گەلیێ کونبەفرێ ل جهەکێ گەلەك بەفرین، دکەڤیتە دووراتیبا پتر ژ دەمژمێرەکێ ژ گوندی ب پییان، کووراتیبا وێ (٢٠-٢٥م) و فرەهیبا وێ (٣-٤م) و ژ ئالیێ خوارێ ڤە پانترە، خەلکێ ڤی گوندی هەتا نها ژی وەك رەوشت و تیتالەك د بەردەوان ل سەر ڤی کاری کو دکەڤیتە جهەکێ بەرپالی (بەر بەتەن) و ب زیارە ڤی کاری دکەن.

ل بەراهیێ رۆژەکێ دەست نیشاندکەن و ل رۆژا کاری بەفر ب مەرێلان دهێتە ڤەبرین و ب حێلا ملان دهاتە داگەراندن بۆ سەر کون بەفرێ و ئەڤ کارە ب دەنگ و دۆر و تلیلی دهێتە وەرگەراندن بۆ ناڤ کونبەفری و گومتل گومتل د هەرفیننە تێدا و د ناڤدا دکەڤتە سەرێك، دگەل ڤی کاری گەلەك جاران ترانە و شەرەبەفر و گولومچکانێ ژی دهێتە کرن.

پشتی هینگێ ب خوارن و کەیف و خۆشی ڤی رێورەسمی ب داوی دهینن، وەك چەوان ب درێژاهیبا رێکێ ل هاتێ ب خۆشی و سەما و دەنگێ تڤەنگان هاتین و گەلەك جاران خەلکێ باژێران بۆ مەبەستەکا تایبەت، یان بۆ نەساخا دچنە گوندی بەفرا سرۆشتی دهینن[١].

## گۆپال چێکرن:

گۆپال چێکرن ئێك ژ وان پیشەییانە کو ل ناڤ کوردان هەین، دبیت گرنگیا وی ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی یا جودا بیت و دبیت ل هندە جهان هەر پێدڤی پێ نەبیت، لێ ل هندە جهێن دی مینا چەکەکی یە، ب تایبەت بۆ شڤانان.

گۆپال ئالاڤەکێ داری یە، درێژاهیبا وی دۆرێن ئێك مەترە و کەڤا وی ١٢سم و بەراتیبا وی ل دووڤ ستووری و زراڤیبا داری بخۆ دمینت، دهێتە ب کارهینان کو مرۆڤ ب دەتە بەرخۆ، ب تایبەت بۆ کەسێن دانعەمر و نەساخ و سەقەتان، یان ژی شڤان بۆ هاژۆتنا پەزی ب کاردهینن و ل هندە جهان، یان بۆ هندە کەسان وەك ماڤوولییەکێ بوو، ب تایبەت دارێ کنێرێ کو وی داری ل دەڤ کوردان پیرۆزیا خۆ ژ بەر چەند ئەگەران هەیە، ئێك ژ وان ئەوە کو دبێژن مار ژ بەر بێهنا دار کنێرێ د رەڤیت، سەرەرای وێ چەندێ ناڤێ کنێرێ یێ دناڤ قورئانا پیرۆز ژی دا هاتی (سدر)، لەوما دبێژن دارەکێ ب خێر و بێرە، گۆتنەکا مەزنان ژی ل سەر دبێژیت:

**(کنێرە، سەرهەژمێرە، خێر و بێرە)**.

گۆپالی و گۆپال کنێری رەنگڤەدانا خۆ دناڤ سترانا فلکلۆری ژی دا گرتییە:

**ناڤێ شڤانی عەمەرە ...... گۆپالێ وی ژ گولا زەرە**
**گۆپال کنێر و سویکا باژێر هەلپەسێر و پیرۆز بە رح هەلبژێرو.**

چێکرنا گۆپالان



گۆپال ژ هەمی جۆرێن داری دهێته چێکرن، لێ دارێ کنێرێ دهێته هەژمارتن ماقوولترین دار بۆ چێکرنا گۆپالی.
چێکرنا وی ژی هەلبەت هەمی کەس نەشێن پێ رابن، بەلکی شارەزایێن خۆ هەنە و ب چەند ئامیر و ئالاڤان چێدکەن، بێ پێ رادبیت ژی دڤێت کەسەکێ دەستبژارە بیت دا بشێت باش دەربێخیت، گۆپال چێکرن د چەند قۆناغانرا دەرباز دبیت.
ل دەسپێکێ دار دهێتە هەلبژارتن و ئەو دارێ بۆ گۆپالی ژێ دگرن دبێژنێ (شڤگۆپال)، ئەڤ شڤە دناڤبەرا سەرێ پاییزێ و بەری داربەڤینێ دا د هاتنە برین، ل بەراهیێ ئەو شڤ دکرنە د (خوەلپەلێدا)* دا ب ساناهی کەفا وی هاتبا ڤەچەماندن و بۆ ماوێ (٢٠-٣٠) رۆژان بەرتاڤ دکرن پشتی هینگێ هشکدکرن هەتا ئاڤمری** دبوو، لێ نها وان شڤان دکەنە د ئاڤا کەلاندی دا هەتا نەرم دبن و ژ نوی ڤەدچەمینن، پاشی د هاڤێنە د قەفارەی دا، یان قەراسەی*** هەتا هشک دبیت و قالبێ خۆ دگرت و پشتی (١٥-٢٠) رۆژان ڤەدکرن و دادتراشین و حولی دکرن و زەیت پێرادان (زەیتکرن)[٧].

## چاندن و کاروبارێن چاندنێ:

هەلبەت ل کوردستانێ ب گشتی ب دەهان جۆرێن فێقی و دەرامەتان دهێنە چاندن، پارێزگەها دهۆکێ

ژی وەك پارچەك ژ ڤێ رەوشێ ب دەهان ژ وان جۆران ب رێکێن خۆ یێن تایبەت و ل دووڤ رەوشت و تیتالێن خۆ دهێنە چاندن، بۆ نموونە:

## برنج:

وەك دیار برنج بەری ٣٠٠٠ سالان ل هندستانێ هاتییە دیتن و کیشوەرێ ئاسیا دهێتە هەژمارتن گرنگترین جهـ بۆ چاندنا ڤی دەرامەتی و ژ وێرێ بەلاڤبوویە و گەهشتییە جهێن دی یێن جیهانێ.

برنج ل پارێزگەها دهۆکێ ل دەڤەرێن ئاڤی دهێتە چاندن و گەلەك حەز ژ ئاڤێ دکەت، دبیت ئاڤ ب شێوەیەکێ رێك و پێك ل هەمی پارێزگەهێ نینە، لەوما دێ بینین خوارنا خەلکێ دەڤەرێ یێ سەرەکی ئەو تشت بوون کو ژ گەنمی د هاتنە چێکرن، لێ برنجی ژی ژ بەر مفایێن خۆ وەك خوارنەکا گرنگ، ب تایبەت ل جەژن و بیرهاتناندا جهێ خۆ یێ گرنگ هەبوو و چەندین جۆرێن برنجان، مینا ڕووتك (قوت و درێژ)، کەسنەدیتی، شەشمەهی، خاتوونی، سۆر و ... ل دەڤەرێ د هاتنە چاندن و هندەك هێشتا ل سەر د بەردەوامن.

برنجی رێکێن خۆ یێن تایبەت بۆ بەرهەمهینان ڤی دەرامەتی هەنە، هەر ژ بەرهەڤکرنا ئەردی و چێکرنا کەرتکان و چاندنێ و ئادەی و دروینێ و سپیکرنێ و ...هتد هەتا دگەهیتە لێنانێ.

چاندنا برنجی ژ هەری کێلێ* دەست پێ دکەت و پشتی چاندنا برنجی رۆژانە سەرەدانا زەڤیا برنجی دکەن کا ئاڤ ل سەرە یان نە؟ چونکی دڤێت ئاڤ ل سەر نەهێتە برین. پشتی هلددەن و بەژنێ دکەت، ئادە دکەن و کەرتکا وەردگێرن هەتا دهێتە دروینێ.

قۆناغا دروینێ دهێتە هەژمارتن خۆشترین قۆناغ کو جۆتیار بەرهەمێ رەنجا دەستێ خۆ دبینت و ئەڤ چەندە ژی باراپتر ب زبارە و گۆتنا ستران دهێتەکرن، پاشی ل بێدەرێ دهێتە خرڤەکرن و دبیتە قۆناغا گێرەکرنێ، ل بەری گێرەکرن ب گا د هاتە کرن، لێ پشتێ گا بەرەڤ کێمیێ چووین، ئێدی ب کەران دکرن. چەند کەرەك پێکڤە گرێددان و د دانە سەر قرش و قالێ برنجی، هەتا هویر دبوو و برنجی خۆ ژ قرش و قالی بەردا و دڤی دەمی دا و دگەل پێشکەتنا سەروبەرێ چاندنێ نها ئەڤ رەوشە نەمایە و هەر تشت ب ماکینان دهێتەکرن.

پشتی قۆناغا گێرەکرنێ ژی ب دوماهی دهێت، هەمی ئەو پیشێ ل سەر بێدەرێ دمینت ب رێك و پێکی و شارەزایی دهێتە لێکدان کو دبێژنێ (بادەك).

د کرنا برنجان دا و ژ بۆ پاراستنا دەرامەتێ خۆ ژ چویچك و فرندان گەلەك جاران ل بەر د راوەستیان یان ژی هەلامەت دناڤدا د چوکلاندن، یان ژی چەقچەقۆك ب کاردهینان کو دەنگ ژێ دهات و فرندە د ترساندن، یان هندەکان کولە دناڤدا ڤەددان.

ژ بەر خۆشی و بهایێ برنجی گۆتن ژی ل سەر هەنە:
مێر بە و گۆشت و برنجا بخۆ[٨].

## تویتن:

تویتن کەرەستێ سەرەکیێ پیشەسازیا جگارانە، ل هندەك وەلاتان وەك دەرامەتەکێ ئابووری دهێتە نیاسین، جهێ وێ یێ رەسەن کیشوەرێ ئەمریکا بوو و ژ وێرێ بەلاڤبوویە ل سەرتاسەری دونیایێ و ل سەدسالیا یازدەی مشەختی گەهشتییە ناڤ وەلاتێن موسلماناندا.

تویتن ل پارێزگەها دهۆکێ ژی دهێتە چاندن و هندە دەڤەران ناڤ و دەنگێن خۆ بۆ چاندنا ڤی دەرامەتی دەرێخستینە، مینا بەرێ گارەی، سەرکێن سندیان، شاورێ، زێوا شێخ پیراموس و گەلەك جهێن دی.
چاندنا تویتنێ شارەزایەك و چاڤدێریەکا تەمام ژی بۆ دڤێتن.

تویتنێ گەلەك توڤ هەنە و هەر توڤەکی ل دووڤ تایبەتمەندیێن خۆ ناڤێن خۆ یێن تایبەت ژی هەنە، بۆ نموونە:

**تویتنا گارەی:** بەلگ بچویك و ب بێهنە.
**گەمبۆل:** بەلگێ وێ گەلەکێ مەزنە.
**تویتنا کەرسێ:** بەلگ هویرە و ژ هەمی جۆران خۆشترە بۆ کێشانێ.

**سەرتیرۆك**: بەلگ ناڤنجییە.
هەلبەت وەك دیاربووی تویتنێ گەلەك چاڤدێری پێ دڤێت، هەر ژ ئاڤدانێ و ئادەی و خەپارێ و زبلکرنێ، هەتا دگەهیتە قۆناغا چنینێ کو ئەو ژی قۆناغ قۆناغ ل دووڤ ئێك و ب ڤی ئاوایی دهێتە چنین:
ل پێشیێ: بنسۆرك، بنك (ئەڤە ژ هەمییان خۆشترن).
پاشی: ناڤبەلگ، سەربەلگ.
ل دووماهیێ: کاتە (کو ئەڤە ژ هەمییان نەخۆشترە).
هەلبەت هەر ئێك ژ ڤان ژی تام و بێهنا خۆ یا تایبەت یا هەی.
د سەریدا تویتن ل کوردستانێ ب قەلوونان دهاتە کێشان، لێ پشتی پەرك پەیدابووین دناڤ وان پەرکاندا دهاتنە پێچان و ئەو تویتن د ناڤ کیسکێن تایبەت دا دهاتە هەلگرتن و هەر جگارکێشەکێ کیسکێ خۆ یێ تایبەت هەبوو، کو ئەو ژی ب شارەزایی دهاتە چێکرن و ل هندەکان جهێ پەرکان یێ جودابوو، گەلەك جاران مەردینیا زەلامان د کیسکێ وی را یێ دیاربوو کا چەند پێشکێشی دیوانێ دکەت.
ئێك ژ رێکێن دی یێن هەلکێشانا تویتنێ برمویت (برنویت) بوو، کو تویتن هویر دکرن و ب دفنێ هەلدکێشان و باراپتر دگەل هندێ د بێهنژیت[٩].

# دار هەژیر:

دارەکا مفادارە، ئێکە ژ کەڤنترین دارێن بەرگر ل رۆژهەلاتا ناڤین و د دەپەبەرەکێ مسری دا بەری ٤٥٠٠ سالان هاتییە وێنەکرن و ناڤێ وێ د قورئان و تەوراتێدا هاتییە، ئێك ژ وان دەرامەتانە کو جۆتیارێ دەڤەرێ پویتە پێ دکەت، دارەکا دێم و ئاڤی یە، بەلگ مەزن و بەلگوەرینە، دارێ وێ سست و خلۆلەیە، خۆ ل بەر سڕ و سەرمایێن دۆمدرێژ ناگریت، دەسپێکا هەیڤا تەباخێ دەست دگەهیت هەتا سەرما دهێت.
هەژیر ل دەڤەرێ گەلەك جۆرن، ئەو ژی دمینتە سەر قەبارە و رەنگێ هەژیرێ، مینا: بێناتی، تەفسك، هەژیرا سپی، وەزیری، قەرانی، ئەرزەنی (رەش و زەر)، رحانی، دێرکی (کتك)، رووباری (شنگاری)، ریخکی، شینك، حەزبەرکات، ملقی، داپیری، دوبەر، تێلیانی، ئاشیر بلی، گشتك (یا گرە، رەنگێ وێ سپی یە و ژ ناڤدا سۆرە)، گەگویی. هەلبەت ناڤ ژ دەڤەرەکێ بۆ ئێکا دی دهێنە گوهارتن و ناڤ و دەنگێ هندە دەڤەرا پتر ژ هندەکێن دی بۆ وی جۆرێ هەژیرێ چوویە و ناڤ و دەنگێن خۆ دناڤ فلکلۆری دا دەنگ ڤەدایە و ستران پێ هاتینە گۆتن، وەك هەژیرا شنگاری و دێرکی.
ژ بەرهەمێن هەژیران:
ل دەڤەرێ و ب کوردستانێ ب گشتی چەند بەرهەمەك ژ ڤان هەژیران دهێنە چێکرن، وەك:
١- کتك: هەژیرا هشککری یە.
٢- سەوکێن هەژیرا.
٣- مورەبا (ریچال).
٤- دناڤ دۆشاڤێ ژی دا دهێنەڤەدان.
ئەڤ جۆرە خوارنێن ناڤبری هەر ئێکێ ژ جۆرە هەژیرەکێ چێدکەن، بۆ نموونە: دێرکی بۆ کتکان، سەوك ژی ژ ئەرزەنی و رحانییان دهاتنە چێکرن.
هەژیر بەرێ ل دەڤەرێ ب قەلەمان دهاتنە چاندن، لێ نها ب رێکێن پەتورمە و شتلکرنێ، یان رێکێن زانستی یێن نوی دهێنە چاندن[١٠].

# هنار:

ئێك ژ دەرامەتێن دی یێن گرنگێن دەڤەرێ یە و وەك فێقییەك دهێتە نیاسین، گەلەك جۆرێن هناران ل دەڤەرێ هەنە، بۆ نموونە:
مسافك: هنارەکا شرینە و ل دەسپێکا هاڤینێ دگەهیت، مسافکا دهۆکێ ناڤ دەنگێن خۆ ل دەڤەرێ هەنە. ژ بلی هنارێن: شرین، مز، دکانی* و سپی و سۆر (ئەڤ هەردو جۆرە ل پاییزێ دگەهن)، شەهرەبانی، رادیشۆ (یا مزە و رەنگ سۆرە)، شێوەیی (دندك گر و سپی و تام مزە)، ملێسی.
چەند زاراڤێن پەیوەندی ب هناران ڤە هەین:
**ڤیقیك** (دیلك - دیکلك): هەر کویزیەك ژ کویزێن هنارێ.
**تلۆڤە**: کۆمەکا هنارانە، ب بستیکێن ئێکڤە دهێنە گرێدان، چ بۆ جوانیێ و چ بۆ هشککرنێ و خوارنێ ل دەمێن نەبی و دبیت هەتا بهارێ ب مینن.

**دندك هنار:** هەر لبەك (دندكەك) دناڤ زكێ هنارێ دا و ژ بەر جوانیا وان هندە تشتان، یان ناڤان ب وان دندكان ب ناڤ دكەن و دكەنە مینا: (دێ بێژی دندكا هنارێ یە) و ڤێ پەیڤێ جهێ خۆ دناڤ چیرۆكێن فلكلۆری ژی دا گرتییە و وەك كەڤنە باوەری ژی دبێژن دندكەك ژ دندكێن هنارێ یا ژ بهەشتێ هاتی، لەوما ناهێلن چ دندك ب كەڤنە ئەردی و دخۆن، یان دبێژن هەر دندكەكا ب كەڤیتە دناڤ ئاڤێ دا ڤێرییێت وێ دچنە ئەسمانان.
**كەلشتۆك:** ئەو هنارە یا دەمێ گەهشتنێ دا د پەقیت و دبیتە دو كەر. ل هندە دەڤەرا پەیڤا (پەقە) ل كارە.
**تووڤل هنار:** تویڤلێ ب سەرڤە یێ هنارێ یە، پشتی خوارنا هنارێ وان تیڤلا هەلدگرن و هشك دكەن، پاشی دهێتە كەلاندن و بۆ خۆشكرنا پیست و مەشكانێ دهێتە ب كارهینان.
**قوپك:** سەركێ هنارێ یە و دهێتە بكارهینان بۆ دەرمانان، دگەل مازیا شین و فالكێن نەعناعێ تێكەل دكەن و د قوتن و ل مۆخلێ دكەن و دئامانەكیدا د پارێزن وەك دەرمان بۆ گەوری ئێشێ.
گەلەك دەڤەرا ناڤ و دەنگێن خۆ ب هنارا ل دەڤەرێ هەبوون وەك ئەرمشتێ، كو رەنگڤەدانا وان وەك سالۆخەت بۆ جوانیا كچان دناڤ سترانان دا دەنگ ڤەدایە، هەروەسان هنارا ئاكرێ كو هنارەكا ترشە، لەوما شەبرمان و حەبرمانان ب رێكێن تایبەت ژێ چێ دكەن، حەبرمان دندكێن هنارانە كو هشك دكەن، شەبرمان ژی مینا پیشەسازیەكێ یە، ل دەسپێكێ دندكێن هنارا دهینە دەر و وان دندكان د پەرچڤینن و پاشی دكەلینن هەتا تیرڤە دبیت و شەكرێ پێوەردكەن، ڤێجار چ ب خوارنەكێ دا كرن و چ ژی ب نانی خوارن.
ل ڤان سالێن دووماهیێ پتر پویتە ب ڤی دەرامەتی دهێتەدان و گەلەك جهێن دی ژی ناڤ و دەنگیا خۆ پێ دەرئێخستییە، وەك گوندێ هرورێ و چەندین جهێن دی.
د بەرێ دا خەلكێ گوندان ب كاروانی ئەڤ دەرامەتە د برنە دەشتێ و د گوهارتن ب گەنم و جەه و پێدڤیێن دی و هەتا د گەهشتنە دەشتێ، د بۆ درەنگ و نەدشییان ڤەگەرنەڤە، لەوما د مانە ل وان گوندان و ئەو دگەل خودانێ مالێ د چوونە كۆچكا مەزنێ گوندی، چ موختار با یان یا ئاغا و گەلەك جاران داخواز ژ وی دهاتنە كرن كو چیرۆك و سەرهاتییان بێژیت، چونكی باراپتر مرۆڤەكێ سەربۆر دیتی و چیرۆكزان بوویە[11].

## دروینە:

ژین و ژیارا خەلكی باراپتر ل سەر چاندنا تۆڤچینیێ بوویە، و دان و دكاك مینا گەنم و جەه و نیسك و نۆك د چاندن، ب تایبەت گەنم و جەه كو ژ دەرامەتێن سەرەكی بوون، گەنم د كرنە ساڤار و دانهێرك و دانقوت و هەڤران (بۆ ئاری) و جەه ژی وەك ئالف بۆ تەرش و كەوالی ب كاردهینان.
پشتی چاندنا ڤان دەرامەتان د چەندین قۆناغانرا دەرباز دبن، دگەهیتە قۆناغا دروینێ و ئەڤە ژی باراپتر كارەكێ زبارەیە، چ ب پارە و چ ژی هەروە و هەر دەڤەرەكێ پالەیێن خۆ یێن زیرەك بۆ ڤێ كریارێ هەبوون و هەر پالەیێ دچوو داسا (شالۆكا) خۆ ژی دگەل خۆ دبر. سپێدەیا رۆژا دروینێ پالە ل بەری تێشتێ سەر زەڤیێ كۆم دبوون و سەرپالەی بۆ وان بەرۆك، یان گاز ڤەدكر.
ژ ئالاڤێن پێدڤی بۆ ڤی كاری: داس، شالۆك، قەیناغ، چەنگال، هەسان، شاخكێ روینی.
دروینە د چەند قۆناغانرا دەرباز دبوو: پشتی دهێتە دروین و پشت خۆڤە دهاڤێت، پالەیەك ل دووڤ دچوو و دكرە مەلۆكە* و مەلۆكە ژی دكرنە گدیش و بۆ وێ چەندێ شخرە **د هاتنە ب كارهینان، هەتا هەمی ل ئەردەكی ل سەرێك كۆمدكرن، یان گدیش گدیش*** دكێشانە بێدەرێ، ل ڤێرە ژی بۆ گێرەكرنێ جەنجەر**** دهێتە بكارهینان، و پاشی دگەهیتە قۆناغا (دانەبای)، كو دانی و كایێ ب ملهێبێ (شەنە)***** ژێك جودا دكەن.
هەلبەت ئەڤ كارە ژی مینا هەر كارەكێ زبارە یێ پێدڤی خوارنێ و چاڤدانێ یە كو خودانێ زەڤیێ پێ رادبیت، ل بەراهیێ سەرتێشتەكا سڤك بۆ وان دبرە زەڤیێ و ل دەمێ تێشتەگەهێ ژی تێشت بۆ دبر.

ستران ژی دگەل ڤێ کریارێ دهێنە گۆتن، باراپتر سترانێن داوەتانە کو ب کێش و سەروا نە، سەلیقا وان یا گونجایە دگەل دروینا شالۆکێ، دبیت ئەگەر زەڤییا مەزنەکێ گوندی بیت، ددکێ یان زورنایێ دگەل خۆ ببەنە سەرکاری و وان پتر هانددەن کو پتر کاربکەن، یان ل دەمێ بێنڤەدانێ مینا ئاهەنگەکێ ب گێڕن.

کریارا دروینێ هندە بیروباوەرێن کەڤن ژی هەنە کو کارتێکرنا خۆ ل سەر وێ کریارێ دکەن، بۆ نموونە نابیت ئەڤ کریارە ل رۆژێن سێ شەمبی و چارشەمبی بهێنە ئەنجامدان کو ئەو رۆژ د بێ ئیفلەحن و هەتا دەمەکێ نێزیك بالاڤ ژی ل وان هەردو رۆژان نەدهاتنەکرن[12].

## چێکرنا جۆیان:

کارێ چێکرنا جۆکان ئێکە ژ کارێن زیارە و پەیوەندی ب چاندنێ ڤە هەی، لەوما هەر سال جارەکێ ل دەستپێکا بهارێ خەلکێ گوندان ب وێ چەندێ رادبن و جووێن خۆ ژ ئاخێ و کەڤژێ و بەلگا و رها و قەرەمی و هەر تشتەکێ تێدا پاقژ دکەن و راددەن دا ئاڤ خۆش بچیت و ب ساناهی ب گەهیتە ناڤ باغ و بیستانان دا و هەروە نەچیت.

ل بەراهیێ رۆژەك دهێتە دەستنیشانکرن، ل وێ رۆژێ سپێدێ زوی هەر ئێك دێ کەل و پەل و ئالاڤێن خۆ یێن ڤی کاری کو پێك هاتینە ژ مەربێل (مەربێر)، تەڤر، لیهازە (لهازە)، مرج، شالۆك، داس، هسان، کارتیك ژ مال هینت و فراڤینا خۆ ژی کەتە د چانتکی دا و قەستا جهێ کاری کەت.

پشتی پالە ل هەڤ ڤەدجەمیێن، کار ل سەر وان دهێتە لێکڤەکرن، هندەك دروینێ دکەن و هندەك راددەن و هندەك ژی خوارنێ بۆ پالەیان بەرهەڤدکەن و هەر ئێك ل جهێ خۆ دەست ب کارێ خۆ دکەت و سترانان ددەنە بەرێك و د بەررا داوەتان دکەن، یان ل هندە جاران پالە ژ ئالیێ سەرپالەیانڤە د هاتنە زوخاندن و ب وێ چەندێ کارێ وان ب رەوشتر و خۆشتر لێ د هات هەتا جوو باش رادان و پاقژ دکن.

هەژی ئاماژێ یە ئەگەر دو گوند یان پتر ل سەر ئێك ژێدەرێ ئاڤێ بانە ئەڤ کارە هەرسێ گوندان ب هەڤرا دکرن. هەروەسان هندەك هەڤبەند ژی وەك بریار هەنە کو خودانێن ملکی د پێگیر بن، بۆ نموونە ئاڤ ب گەڕ ل سەر گوندیان دهێتە لێکڤەکرن، ب تایبەت ل سالێن هشکاتی، یان ل وان جهێن ئاڤا وان نە گەلەکا زێدەبیت و ل ڤێرە کەسەك ژ گوندیان دهێتە دەستنیشانکرن بۆ لێکڤەکرن و دروستکرنا نۆبەتا ئاڤدانێ کو دبێژنێ (کەراخ)[13].

## داڤەرست:

خەلکێ کوردستانێ د کەڤندا گەلەك ئالاڤ بۆ کورتکرنا رێکێ و دەربازبوون ژ ئاڤ و رووباران، مینا کەلەك، گەمی، پرێن داری، سێکولندك، بازەبەر و ... ب کارهینانینە.

داڤەرست ئێك ژ وان رێکان، کو مرۆڤ تێدا ژ ئاڤان دەرباز دبوون، ب تایبەت ل وان رووبارێن مینا زێیێ مەزن، یان هەر رووبارەك و ئاستەنگەکا ئاڤێ، ل ڤێرە پالە مینا زیارە لێك خرڤەدبن و کاری لێکڤەدکەن، هندەك داران دهینن و هندەك کارێ خوارنێ دکەن و هندەك ژی کۆلانێ دکەن و هندەك ژی رووپیڤانێ دکەن، چونکی کارەکێ ئەندازەیی یە و دا دروست دەرکەڤیت.

ل بەراهیێ چالەك ل ناڤتەنگا زەلامەکی دهێتە کۆلان و دپشترا هندەك ئاسنێن گران و ب سەنگ دادهێلنە د وێ چالێدا و پاشی وەریسەکێ پیلای لێ د شدینن و باش موکوم دکەن و ب چەند گرێك و خلفەبێن قاییم گرێکدەن و ب ترۆمبێلەکێ وان تێلان دکێشن کو پێشتر د دوچەڤیا ستوونەکا ئاسنین دەربازدبوو و ل ملێ دی یێ ئاڤێ ب قورمەکێ دار بەرۆیەکا قورم ستوویرڤە دکرن. پاشی وەریسێ داڤەرستێ د شدینن و جارا جار ب ترۆمبێلێ د کێشن هەتا باش رك دبن، ئێدی داڤەرست دێ یا بەرهەڤ بیت بۆ دەربازبوونێ و دەدەمێ شورشێن کوردستانێ دا رۆلەکێ باش د دەربازبوونا پێشمەرگەی و گوندیان کەل و پەلاندا هەبوو[14].

## شڤانی:

شڤانی ئێك ژ پیشەیێن گەلەك كەڤنە د ناڤ ژیانا مرۆڤایەتیدا و دهێتە هژمارتن پیشەیا ئێكێ پشتی نێچیری، ژ بۆ ڤەكۆلینا ژین و ژیارا مللەتان ژی زانایێن ئەنترۆپۆلوژی بهایەكێ مەزن ددەنە ڤێ پیشەی. كوردان ژی هەر ژ كەڤنڤە پویتەكێ گەلەك مەزن یێ دایە ڤێ پیشەی و چ گوند نینن ئەگەر ب سەدان پەز تێدا نەبن، ب تایبەت ل دەمێن بەرێ كو ژیارا وان یا سەرەكی ل سەر پەزی بوو، بۆ ڤێ چەندێ ژی وان ل دووڤ زانین و شارەزاییا خۆ هندەك كار كرینە، دا كارێ وان سڤكتر لێ بێت و هەمی كارێن وان ژ بێری و چێكرنا مەشكان و دەستنیشانكرنا سەرەشڤانی و سەروەركرنا دەمێن چەروانی و بێهنڤەدانا وان بهێنە رێكخستن.

**سەرە شڤان:**

كەسەكێ خودان سەربۆر و شارەزایە د كارێ شڤانیێ دا و دورهێ هەمی مالان دنیاسیت، یێ خودان بریارە و ئاخفتنا خۆ د دەستنیشانكرنا جهێ چەرا پەزی دا هەیە، هەروەسان د ئاراستەكرن و شیرەتكرنا بێری و شڤاناندا و د عێكرنا پەزی دا، هەر بێری و شڤانەكێ پێگیری ب ئاخفتنا وی نەكربا ژ ئالیێ وی ڤە د هاتە سزادان، هەژی ئاماژێ یە سەرەشڤان ل دەستپێكا بهارێ هەتا ژێك ڤەگرتنا پەزی دهاتە دەستنیشانكرن.

**كارێ بێرێ:**

بێر كارەكێ ب كۆم و رێكخستییە، مەبەست ژێ دۆتنا پەزی یە، ئەڤ كارە ل سپێدێ و ئێڤاران دهێتە كرن. سەرەشڤان بۆ خۆ بەرەكی وەك كورسی خۆ ددانیتە سەرێ بێرێ و بێری خۆ دكەنە دو رێز، بیاڤێ دناڤبەرا هەردو رێزاندا (١,٥-٢م)انە، ئەو رێزبوون ژی ل دووڤ بۆشبوونا پەزێ وانە، چەند بۆشتر بیت دێ ل پێشتر بیت و ل هندەك دەڤەران بەروڤاژی یە، واتە یێ كێمتر ل پێشە و گەلەك جاران هەتا نۆبەتا وان د هات تەشی د رێستن.

دوتنا پەزی ژلایێ بێریان



**چوونا بێرێ:**

بێریان ل سپێدێ زوی کارێن خۆ دکرن، چاڤێن خۆ کلددان و بسکێن خۆ شە دکرن و باددان، پارزینکێن خۆ هەلدگرتن و ب کەنی و ترانە بەرێ خۆ ددانە جهێ بێرێ و ب رێڤە گەلەکان تەشی د رێستن، د چوونا ڤان بێراندا گەلەك جاران قەول و ژڤان دناڤبەرا ئەڤینداران دا دهاتنە دەستنیشانکرن و ل هندە جاران پەیوەندیێن نوی د ناڤبەرا هندەکێن دی دا پەیدا دبوون و رەنگڤەدانا ڤێ چەندێ د گەلەك سترانێن فلکلۆری دا یا دیارە، دەمێ شڤان ب گرنژین ڤە بەر ب بێریان ڤە دهات، بێریان ژی مەنجەلۆکێن (زەرکێن) خۆ تژی ئاڤ د کرن و ب سەرێ شڤانی دا دکرن، یان شڤان د گرتن و دکرنە د ئاڤێ دا، پشتی بێرکرنا دانێ سپێدێ هەمییان پێکڤە مێدەکێن خۆ ڤەدکرن و پێکڤە فراڤین د خوارن.

پشتی بێرکرنا دانێ ئێڤاری ژی ئاشیرکێت خۆ د هەلگرتن و ب ستران و کەنی و ترانەڤە بەر ب گوندی زڤرین، دو بێریان د گۆتن و دووان لێ ڤەدگێران.

**مەشك و چێکرنا مەشکێ:**

مەشك مینا کارخانا رێچالی یە دناڤ مالدا، ژ پیستێ پەزی دهێتە چێکرن، پێکهاتییە ژ بەن و وەریسێت لۆلەبان و سێ پێکێ، چێکرنا مەشکێ ژی کارەکێ ب ساناهی نینە، بەلکی شارەزایی و بێهن فرەهیەکا زێدە پێ دڤێت، چێکرنا وێ هەر ژ دەستپێکێ هەتا دووماهیێ د چەند قۆناغانرا دەرباز دبیت و هەر قۆناغەك دەمەکی د کێشیت و پێدڤی ب چەند کەرەستەیان هەیە، کو چێکەرێ وێ ژ دەوروبەرێن خۆ پەیدا دکەت، وەك تویڤلێ هناران و سۆرکێ (رها کاویرێ: بنا خورنیفك پێڤە دهێن) و دوکێلا تەنویرێ یان کوچکی، مەشکێ ماستی دکەنێ و ب حێلا ملا و ب بێهن فرەهییەکا زێدە مەشکێ دکێن و ستranان د بەررا ب سەلیقەیەکا گونجای د بێژن، سترانێن وان ژی دهێنە هژمارتن ژ سترانێن کاری، ناڤەرۆکا وان ل سەر بێرێ و مەشکێ و رۆونی و جهێن چەرا پەزی و پەسنێن شڤان و مەشککێیانە، مەشك ژی هێدی هێدی ماستێ خۆ دکەتە دەو و نیڤشك.

مەشك



## هندەك بیروباوەرێن کەڤن ل دۆر پەزی و مەشکێ و بێرێ:

- ل دەستپێکا بێرکرنا ئێکێ ژ سالێ هێکەك ددانانە د نیڤا بێرێ دا، ژ بۆ دویرئێخستنا پەزی ژ چاڤیکرنێ و ب شیرکەفتنا وی، ئەو هێك د بن پێت پەزی ڤە هاتبا شکاندن و ئەگەر نە شکەستبایە، سەرەشڤانی ب عێجزی ڤە د شکاند.

- دەمێ پەز دهاتە بەران، یان بزن دهاتە نێری، کچکەکا بچویك ل بەرانی، یان ل نێری سویاردکرن دا بەرێ پەزێ وان یێ مێ بیت.

- ل دەمێ بێرکرنێ نابیت کەس د ناڤ پەزی را ژ ڤی ملی چووبا ملێ دی، ب هزرا وان دێ شیرێ لایەکی بۆ ئالیێ دی چیت.

- هەستیکێت ماری دگەل مۆرکان دکرنە ڕستك و ب مەشکێ ڤە دکرن دا مەشکا وان ب روون ب کەڤیت و گەلەك نیڤشك ل سەر مەشکێ بێتە گرتن.

- لۆلەبێت مەشکێ هەردەم ژ دارەکا ب بەر، نە یا خرش چێدکرن، دا کو مەشکا وان یا ب بەر بیت و گەلەك روون ل سەر بێتە گرتن.

## چولیبر:

جۆرە زبارەیەکە، پەیوەندی یا ب پەزی ڤە هەی وەك ئالف، یان ژی بۆ سەرگرتنا بانان دهێتە بکارهینان، ئەڤ زبارەیە بەرەڤ پاییزی سەرێ هەیڤا ئیلۆنێ دهێتە ئەنجامدان، خودانێ چولیبرێ دێ چەند کەسان بۆ وێ مەبەستێ بەرهەڤکەت و سپێدەهیبا رۆژا دەستنیشانکری پشتی دگەهنە جهێ شۆلی ل وێرێ دێ شۆل هێتە لێکڤەکرن د ناڤبەرا تەخەکەران و ڤەکێشان و کەسێن د نژنن، د هەر گوندەکی دا هندەك کەس هەبوون ناڤ و دەنگێن وان چووبوو وەك داسبڕ و تەخەکەر و ڤەکێشك و کەسێن دنژنن... ئەڤە د ناڤ گوندییاندا د ئاشکەرا بوون، چولیبرێ پەرگالێن خۆ یێن تایبەت هەبوون، وەك: داس، هەسان، شاخك و دو گوهی.

ل دەسپێکێ شۆلکەران کارێ خۆ هەتا تێشتەگەهێ دکرن و وی دەمی تێشت بۆ وان ژ مال دهاتە سەر شۆلی و دناڤبەرانرا و ب بریارا سەرپالەی شۆلکەران بێهنا خۆ ڤەددان و دبەررا داس د هوسین و رۆن دکرن و جگارە دکێشان و هندە جاران فێقی دخوارن و پشتی بێهن ڤەدانێ جارەکادی دەست ب کاری دکرنەڤە.

## قۆناغێن بڕینا چولی:

پشتی بڕینا جارا ئێکێ، هەر سالێ چولی ناڤەك بۆ هەیە.

سالا ئێکێ دبێژنێ: کورۆپە.

سالا دووێ دبێژنێ: نەرمە (یان ل هندە جهان مراتە).

سالا سیێ دبێژنێ: سێ داس.

ئەگەر ل سالا سیێ چولی یێ کێم بیت ناهێتە بڕین، لێ ئەگەر سالبوارتی بیت، ئانکو سالەکا دی ب سەرڤە بچیت باشترە و ئەو ژی دمینتە ل سەر زاخا عەردی و ئەگەر یێ بەرهەڤ بیت دبێژنێ (هاتڤە). دیسان هندی چولی ب پاش کەڤیت بەرەڤ پاییزی بۆ خودانێ تەرش و کەوالی باشترە، لەورا ژ زاردەڤێ پەزی باب و باپیران یا گۆتی: (خۆزی خودانێ من یێ تاوی با، دا چولیێ منی پاییزی با).

## ترآندنا چولی:

چولی ب سێ رەنگان دهێتە نژنین کو وێ ژی شارەزایی پێ دڤێت:

١-سەردارك (گوهدارك): ئەو جوینە یا ل سەر دارێ دهێتە نژنین.

٢- باسك: ئەو ل پشت دارەکێ چولی دهێتە نژنین و دڤێت پیچەکێ یا بەرپال بیت.

٣- دی (دیهـ- دهـ): ئەو چولی یە یێ ل سەر عەردی ب ئاوایەکێ خر دهێتە نژنین و گیا و هەلز پتر ب ڤی رەنگی دهێنە نژنین.

## جوینێن چولی:

ئەو ژی سێ جوینن ب ڤی رەنگی:

**١-چولیێ دینداری:** دارەکا ب خەملە و دارێ وی یێ نەرمە و دارەکێ کێمە، ئەڤ جۆرە بۆ پەزی ژ هەمیان خۆشترە، چونکی بەلگێن وی د حولی و زراڤ و درێژ

و بێ تۆزن و ل جهێن نزار شین دبن.

**٢- چولیێ مازی**: ئەڤە ل ریزا دووێ دهێت، بەلگێن وی پان و گرۆڤن، باراپتر بۆ سەرێ گوهدارکێ، یان ژی سەرێ باسکێ دهێتە هێلان، ئەڤ چولی بە سێ بەرێن سەرەکی ددەت: بەڕویماسك، مازی، گولیل (گوریل)، ژبلی هندە جاران بێکوانە* ژی پێڤە دهێت.

**٣- چولیێ بەڕوی**، ئەڤ جۆرە یێ نەخۆشە، بەلگێ وی یێ زڤرە و دارێ وی یێ رەقە و نە گەلەکێ ب خەملە و بەڕوی پێڤە دهێن.

**یاری و رەوشتێن ب چولی ڤە گرێدای:**

ژبۆ بێنڤەدانی و دا شۆلکەر هەست ب بێزاریێ و وەستیانێ نەکەت هەر کارەکی پێدڤی ب سوحبەت و یاری و سترانا چەند رەوشتێن تایبەت دناڤ ڤی کاری دا هەبوون وەك:

١- كت و جۆتانێ: یاریەكە ب مازیان دهاتەكرن.

٢- هەڤرکانێ: هەردەم هەڤرکانێ دناڤبەرا داسبڕی و تەخەکەری دا دهاتەکرن، دا هەر ئێك ژ وان زیرەکی و ڤەرێژا کارێ خۆ دیارکەت کا چەند یێ زیرەکە. بۆ نموونە ئەگەر تەخەکەر ب داسبڕی را گەهشتبا دا تەخەکا چولی دانیتە سەر پشتا داسبڕی و رامان ژ ڤێ کریارێ ئەو بوو ئانکو ئەز شیامە تە. یان ژی دا بەری وی چیتە بنێ دارەکێ دابێژیتێ وەرە ڤێ دارێ ببرە. رامانا ڤێ چەندێ ژی ئەو بوو کو دڤێت داسبڕ فەرمانا تەخەکەری ب جە بینت چونکی شیا وی.

٣- ئەگەر داس ژ دەستێ داسبڕی کەفتبا، تەخەکەر دا خۆ گەهینتە داسێ و دا هەلگریت و دا بێژیتە داسبڕی وەرە خوارێ شۆلێ تە نە چولیبڕینە، ئەو دا چیتە سەر دارێ و دا داسبڕی هینتە خوارێ.

٤- گەلەك جاران ئەگەر سەر پالەی دیتبا كار ژبەر داسبڕەکی، یان تەخەکەرەکی ناچیت گازی دکرێ کا داسا تە؟ کا تەخا تە؟ کانێ دەنگێ داسا تە ناهێت و...هتد.

**شیپرە:**

جهەکێ دەستنیشانکریە و سنوورەکێ بەرفرەهە، بۆ وی جهی دهێتە گۆتن یێ مشتیا پەزی لێ دکەن، چ هەلز بیت یان گیا یان ژی چولی. دناڤ هەر شیپرەکا چولی دا جهێ سەردارکێ، یان گوهدارکێ، یان ژی جهێ نژنینێ یێ دیاربوو، چونکی دزانین هەر شیپرەکێ دێ چەند گوهدارك یان سەردارك کەڤنێ، ژبەر هندێ دناڤبەرا چەندەکێ دا دا جهەکی ل نیڤەکێ دەستنیشانکەن دا ژ هەمی رەخا چولی ب ساناهی کێشابانە ویرێ.

هەژی ئاماژێ یە ئەڤ کارە ژی نها بەرەڤ کێمیێ ڤەچوویە و ژینگەهـ ژی هند رێکێ نادەت ئەڤ کارە بەرەڵلایی بهێتەکرن و ئەڤ دیاردە یا کەڤنە و ل بەرێ دەمێ دارستانێ دار و بار سەخبێردکرن، یان چولیبڕان تایەکێ جوان دهێلانە ب گوپا دارێ ڤە دگۆتنێ (تایێ مەلکی) و هەتا نها ژی ئەڤ رەوشتە مایە دناڤ رەوشتێن چولبڕاندا.

## خوێدانا پەزی:

ئێكە ژ پێدڤیێن خودانکرن و سەخبێرکرنا پەزی، وەك شارەزایێن ڤی کاری د بێژن ژبۆ هندێ یە دا پەز گۆشتێ خۆ پێ بگرت و سست و خاڤ نەبت، کارێ خوێدانێ وەك رێ و رەسمەکێ خودانکرنا تەرش و کەوالی هەر ژ کەڤندا سەروبەرەکێ تایبەت هەیە و ل هەمی دەڤەرێن کوردستانێ وەکهەڤ دهێتەکرن.

خوێدانێن پەزی مەرجێن خۆ یێن تایبەت هەنە و ل بەری هەر تشتی دڤێت جهەکێ تایبەت ب وێ چەندێ ڤە هەبیت کو دبێژنێ (خویریز)، ئەو ژی چەند بەر و فەرشەکێن پان و مەزنن و خوێ ل سەر دهێتە بەلاڤەکرن و پشتی وێ د خۆت ، چ فەرشێ خوێ ل سەر نەما جارەکادی درێژنە سەر... هۆسا هەتا قەدەرا خوێ یا دەستنیشانکری ددەتە پەزێ خۆ.

دناڤ پەزی دا ل سێ چوار جهان دویکێل ژ ناڤ پەزی بلند بوو ژ بەر ئەو پەزێن وەك پەرسیڤی لێ دویکێل بچیتە د دفنا وان دا و (دەپزن، ئانکو بکوخن) دا بێهنا وان فرەه بیت و بشێن خوێ بخۆن.

هندەك كەوال ب داران ڤە دهاتنە گرێدان دا ئەو پەزێن شیرێن وان خراب دبوون دگەل ئەڤێن دی نەخۆن دا ئێشا وان نەڤەگریت.

هندە جاران ئەگەر خوێ زێدەكربا د دانا سەر دارەكێ بۆ جارێن بێت.
ئەگەر ئێشەگا ڤەكر مینا خوریكان پەز ڤەگرتبا، خودانێن پەزی نەچار دبوون پەزێ خۆ جودا خوێ بدەن دا ئێش دناڤ پەزی وی دا بەرەلاڤ نەبیت[١٥].

**ئالفكرنا پەزی ل زڤستانێ:**

هەلبەت دڤێت ل هەر چوار وەرزێن سالێ پەز بهێتە چاڤدان و ژ بەر ل زڤستانێ گەلەك جاران ژ بەر سەقای نە دشییان پەزی دەربێخن، لەوما فەرە خودان كارێ خۆ بۆ رۆژەكا هۆ تەنگاڤ بكەت، دا نە مینتە مەحتل و پەزێ وی ژ دەستی نە دەركەڤیت.
وەك دیار ل كوردستانێ دو سەقا بۆ پەزی هەنە، سەقایەكێ كو د شێن پەزی دەربێخن، ئەو ژی باراپتر هاڤین وٌ بهارن و سەقایێ نەخۆش، كو زڤستانە و گەلەك ژ پاییزێ، ژ بۆ خۆ بەرهەڤكرنێ بۆ ڤی سەقایێ نەخۆش ژی چەند كریار د كرن دا ب سلامەتی ژێ دەرباز بیت و دبیت جیاوازی د ناڤبەرا ئالفكرنا دەشتێ و چیا هەبیت، لێ هەر چەوان بیت دڤێت پێ بەرهەڤ بیت.
خودانێ پەزی ل داویا بهارێ دەمێ گیا دەست پێ دكەت د بەهیت، گیایێن وەك هەلزێ و كیڤارێ و كەركۆلێ دكەنە رویسی و تەخە و د كەنە باسك، یان د هێلن هەتا هشك دبیت. دیسان چلوی ژی ل پاییزان د برن و گوینی د كێشن و بەرِوییان كۆمدكەن و ئەڤە هەمی بەرهەڤكرنن بۆ وەرزێ دژوار و ئەڤە ژی د مینتە ل سەر شیان و هەژمارا پەزێ وی هەیی.
دەمێ دبیتە زڤستان، ئەگەر دونیا خۆشی بیت، هندە ئالفی بەری بەردانێ د دەنێ پاشی بەرددەنە چیای و ل ئێڤاری بەری رۆژئاڤا جارەكادی د زڤرینەڤە و دیسان ئالفەكی ددەنێ. ڤێجار چ چلوی بیت یان ژی ریسیێن گیایێن بهاری بن و ئەڤ چەندە ژی دمینتە ل سەر وێ شارەزاییا خودانێن وان بۆ خۆ پەیداكرین و د زانن دێ چ ئالف دەنێ، بۆ نموونە گوینی و بەرِوی ل پلەییا ئێكێ دهێت، ل دووڤدا هەلز و گیایێن دی و چلوی ژی ل پلەییا داویێ دهێت و هەر ئێكی ب رێكەكا تایبەت ددەنێ، بۆ نموونە گوینی دكەنە د ئاڤێ دا هەتا نەرم دبیت و د هنجنن و ژ نوی ددەنێ، یان ژی چلوی و گیایی ئاڤخوێ لێ د كەن و ژنوی ددەنێ.
دبیت هندەك كەسێن دی كایێ و جەهی ژی بۆ زڤستانێ بەرهەڤ د كەن و ب تایبەت ل دەشتێ[١٦].

## زۆزان:

چوونا زۆزانان پارچەكا هەری گرنگا بنەرەتی و كەڤنا ژیانا كوردەوارییێ یە، ب تایبەت دناڤ كۆچەران دا و ل ڤێرە ژن و زەلام مل ددەن هەڤ و كارێن خۆ یێن رۆژانە ب شێوەیەكێ رێكخستی ب رێڤە دبەن.
زۆزان دەڤەرەكا جوانە، هەمی مێرگ و چیمەن و كەڤیێن بەفرێ نە، جهەكێ خەملاندی یە ب گل و گیایێن مینا گوینی و تەڤری و چەند گیایێن دی، ل هاڤینان یا هوینە و ل زڤستانان ژی گەلەكا سارە و جهەكێ رەوال و رویتە، جهێ وێ وەك د ژێدەرێن دیرۆكی دا هاتی دەڤەرەكا چیایی یە، دكەڤیتە دناڤبەرا چیایێن ئارارات و خەلاتێ و ئازربایجانێ و ئامەد و مووسلێ دا، ئیبنولئەسیر دبێژیت دەڤەرەكا بەرفرەهە ژ رۆژهەلاتێ دیجلە ل جزیرا بۆتا دەست پێ دكەت، هەتا دگەهیتە سنوورێ خەلاتێ و ل ئازربایجان ب داوهی دهێت و نها وەك ناڤەكێ جوگرافیێ دەستنیشانكری یە، ژ ئالیێ ژووریێ بۆتان ژ دەشتا میران و هەرە كولێ دەست پێ دكەت، هەتا گۆلا وانێ و دەڤەرا هەكارییا.
هندەك زۆزان هەنە ناڤ و دەنگێن خۆ دەرێخستینە، ژ وانان: فەرەشینێ، كێلەشینێ، مەیدان زەنگلێ، هەرە كولێ میرا، مەیدان بەلەكێ، بەرچەلان، كانی سپیێ، گەرِا بەرانا، مەیدانا كولی یا چارچەلێ هەركییا، زۆزانێت قەندیلی، سەرێ مەتینی، تەنینا سندییا، دەرارێ، كیكەلا، مێرگێت سۆتی، ئاڤا گویزێ، دیڤ ئاڤێ... هتد.
كۆچەران ل بەری سنوور دناڤبەرا عیراق و تركیا بێنە دانان وەك رێورەسمەكێ بەرچاڤ ل پاییزان د هاتنە سەركوزان (گەرمیانان) و ل داویا گولانێ كو وی دەمی بەلەك و كەڤیێن بەفرێ هێدی هێدی د حەلیێن قەستا زۆزانان دكرن دا پەزێ خۆ ب جوانترین شێوە ل جهێن شین و تێرچەر و هوین ب خودانكەن، لێ

پشتی سالا ١٩٢٤ێ ئێدی كۆچەرێن ئەرتووشی، هند هاتنە خوارێ و هند ژی مانە ل ئالیێ دی یێ سنووری، لێ هندی هەركی بوون ئەو ژی د هەمان سال دا ژ وان زۆزانان هاتنە دابرین، لێ ل جهێ وێ چەندێ قەستا زۆزانێن شنۆ ل رۆژهەلاتی كوردستانێ كرن، ل بنبەرێ شێخا و ملەزەر و كانی خاسك و سێوێژە و گادەرا و ساوەرا بێرا كۆرێ ... هتد. ئەڤ چەندە هەتا سالا ١٩٧٥ێ یێ بەردەوام بوو، پشتی كاودانێ سیاسی هاتیە گوهارتن، ئێدی ئەو چەند ژی نەما، لێ پشتی سەهلدانا سالا ١٩٩١ێ جارەكادی دەست دانە وێ كاری ڤە.

كۆچەران قۆناغا داویێ ل سەرێ خزیرانێ د گەهاندنە ڤان زۆزانان و هەتا چریا پێشین ل وێرێ خۆ جهـ دبوون، دەمێ دگەهشتنە وی جهی هەر چەند مالەكان دادانە جهەكی و رەشمال و كەپرێن خۆ دروست دكرن و دگۆتنە وی جهی زۆم و هەر ئویجاخەكێ زۆم و زۆزانێن خۆ هەبوون و هەر زۆمەكێ سەروەر ئاغایێ خۆ هەبوو و ئەو ژی یێ گرێدای ئاغایێ گشتی بوو.

ئەڤرۆ پشتی كاودانێ سیاسی و ئابووری و جڤاكی هاتیە گوهارتن، ئەڤ رێ و رەسمە ژی دگەل هاتینە گوهارتن و ئەگەر ل بەرێ ئەو پەز وەك كەرێن پەزی د چوون، ئەڤرۆ ب ترۆمبێلان دچن و ژن و ژیارا وان ل وان زۆزانان ژی هاتیە گوهارتن.

ل وان زۆزانان ئێدی هەر كەسەك ب كارێ خۆ رادبیت و هەمی مژویلی پەزی و خودانكرنا وی نە و ژنكان ژی كارێ خۆ یێ رۆژانە ژ مەشك كیانێ و نان پاتنێ دكرن و رەڤێن هەسپ و ماهین ژی ل وان بەرك و بەتەنان و ل بەر وان كەڤێن بەفرێ د چەرن و ئەڤە حالێ وانە هەتا د زڤرنە سەركۆزان ڤە[17].

## زۆم:

زۆم وەك پەیڤەكا فەرهەنگی واتە كۆمەكا رەشمال و كەپرێن مل دانە هەڤ و ل جهەكێ دەستنیشانكری و باراپتر ئەڤ زۆمە ژ ئالیێ مرۆڤكانیێ و خزمانیێ و بنەمالیێ دگەهنە ئێك، چەوان ل زۆزانان هەبوون وەسان ل دەشتێ ژی هەبوون، ل گەلەك جهان دبێژنە سپیاتیی وەك ژاژی و پەنیری ژی زۆم، چونكی ژێدەرێ وان هەر زۆم بوون.

بۆ چوونا زۆزانان ژی سیستەمەك هەبوو ل سەر ب رێڤە دچوون، جارا ئێكێ پێشبار دبرن و تەرش و كەوال د كرنە ناڤێك و بەرخ بەرەماك دكرن و چەندەكان ددانە پێشیا خۆ و درێكەكا دەستنیشانكری را دبرن و ل هاتنێ ژی هەر ل سەر سیستەمەكی د زڤرین، دەمێ دچوونە زۆزانان د ناڤ گەلەك ئویجاخانرا دچوون و وان باج ددانە وان ئویجاخان بەرامبەر وێ چەندێ كو كەس زۆرێ ل وان بكەت و پاراستنا وان ب ستویێ خۆڤە دگرتن.

ل ڤان زۆزانان مینا بازارەكێ ڤەكری ژی لێ هەبوو، بازرگانان قەستا زۆزانان دكرن و پەرگالێ خۆ لێ د گوهارتن ب روین و ژاژی و پەنیر، هەروەسان بازرگانێن كرین و فرۆتنا پەزی د چوونە ویرێ و كاڤر و كەوال و بەران و هری د كرین.

پەزێ زۆزانان و هەسپێن وان ناڤ و دەنگێن خۆ د كەڤندا دەرئێخستینە، پەزێ وان قەرەقاش و كۆلەسۆرە، هەسپ و ماهینێن وان ژی كەعێلێن رەسەنن، بچویك و مەزنێن كۆچەران فێری سویاریێ دبوون و ژنێن وان ژی ل چوون و هاتنان سویاری ماهینان د بوون و كارێن زەلامان دكرن.

ل هندەك دەڤەران زۆزان ددەستێن ئاغایان، یان میران دا بوون، كۆچەران ژ وان د كرین بەرامبەری پەزی یان روینی، لێ هندەكێن دی زۆزانێن وان د خۆسەربوون و ملكێ وان بخۆ بوو.

ژ بەر جهەكێ سرۆشتی بوو، لەوما ریچالێ ڤێ دەڤەرێ ژی تاما خۆ یا سرۆشتی و یا تایبەت هەبوو.

چەراندنا پەزی ل زۆزانان ل سەر چەند قۆناغان د هاتە پشككرن، ژ سپێدێ زوی هەتا تێشتەگەهێ د گۆتنێ تێشتەگەهێ. ژ پشتی نیڤرۆ هەتا بەربەری ئێڤاری دگۆتنێ پالین، ژ ئێڤاری پێدە شیڤخوەر بوو، پشتی نیڤ شەڤ د وەرگەریا و پەز دەردئێخستنە چەرێ دگۆتنێ شەڤین.

رەشمال، یان كوین (كوون) ژ مویێ بزنان دهێتە چێكرن، تا تا دهێتەكرن و ڤان تایا هەمیان ددەنە بەرێك و ستوونان دادانە بن، فرەهی و مەزنیا رەشمالان

ب هەژمارا ستوونان دهێنە ناڤكرن، بۆ نموونە دێ بێژن رەشمالەكێ چاردە ستونی.
كۆچەران ل بەرێ ب تنێ پەزێ سپی رادگرتن و تێكدا قەرەقاش و كۆلەسۆر بوو، زوی ب زوی تێكەلی بزنان نەدكرن، لێ ل ڤان داویان بزن و چێل ژی دانە دگەل پەزێ خۆ و پشتی ل دەشتێ ئاكنجی بووین، دەست دانە خودانكرنا پەزێ عەرەبی و پەزێ حەمدانی و جۆرێن دی ژی، دیسان مێشێن هنگڤینی ژی ل وان زۆزانان ب خودانكەن.
دەڤەرا بەهدینان ژی زۆزانی خۆ هەنە و ب تایبەت ل چیایێ مەتینا كو چەندین زۆزان لێ هەنە، مینا: خرابە، نەهجەرا، سەریرا (گوندێ زێوا شێخ پیرامویس)، كانی بۆتكێ، ناڤێلا، كانی نیڤشكێ، سەردەریا و گەلەكێن دی.
دڤان زۆزانان ژی دا كار هەمی یێ رێكخستییە، ژ تێشتەكرن و بێركرن و پالینكرن و شیڤخۆركرن و شەڤینكرن و ئاڤدان و دانەمەخەل و هەڤشیكرن و هەر كارەكی دەمێ خۆ یێ دەستنیشانكری یێ هەی.

## كۆلانا رەزان:

رەزان وەك هەر كارەكی پێدڤی ب سەخبێریێ و چاڤدانێ یە، ئێك ژ وان كاران ژی كۆلانە كو مینا زبارەكێ باراپتر هەروە دهێتە كرن و هەتا نها ژی ئەڤ كارە ل دەڤەرێن چیایی یێ بەردەوامە.
كارێ كۆلانێ دەسپێكا چێكرنا رەزانە، باراپتر ب تەڤایی و پێكڤە دهێتە كرن، كەسێ د ڤیا كۆلانێ بكەت ل بەری هینگێ كارێ خۆ دكر، چەند پالەیەك بۆ خۆ دەستنیشاندكرن و ئالاف و پەرگالێن شۆلی و خوارن بەرهەڤدكرن و رۆژەك د هاتە دەستنیشانكرن، وێ رۆژێ خودانی رەزی (یان چەمی) ب پالەیێن خۆڤە ل جهێ كۆلانێ بەرهەڤ دبوون، ژ رێڤە تێشتا وان د بر و بەربەری نیڤرۆ فراڤین بۆ دبر و دەمێ بێنكویكا ئێڤاری ژی خوارنەك بۆ وان دهاتە بەرهەڤكرن.
كارێ كۆلانێ ژی مینا هەر كارەكێ پێدڤی ب هێزێ و شارەزایێ هەیە، هەروەسان پێدڤی ب هەڤركمانیێ ژی دكر دا پالە پتر گەرم ببان و پتر كاركربان و ستران ژی د بەرا دگۆتن دا هەست ب كەرخین و وەستیانێ نەكەن و سترانێن بەر ڤی كاری را دهاتنە گۆتن هەر سترانێن گۆڤەندانن.
كۆلان ل سەر چەند جوینەكان هاتبوو پشككرن، وەك:
**جۆتكانێ:** كارێ كۆلانێ یە، ب ئاوایەكی كو دو كەس ب هەڤرا و وەك هەڤركمانییەك پێ رادبن، پێكڤە مەرێن خۆ ل ئاخێ ددەن و كا كی پتر یێ ژ خۆ رازی یە؟ هەلبەت یێ د خۆرا نەبینت ناكەت.
**سەرمەرك:** سێ چوار جاران ل دووڤ ئێك دێ مەرا خۆ ل ئاخێ دەت، بێی پێ خۆ ل مەتركێ بدەت.
**سێتكانی:** مینا جۆتكانێ یە، لێ ل ڤێرە سێ كەس ب گەرمی پێن خۆ ل مەرێ ددەن.
هەلبەت پالێ نە زیرەك و سست و خاڤ و نەشیابا بەرۆكێ خۆ ببەت گەلەك جاران دبوو پێترانكێ پالێن دی و هەر ئێكی ژ ئالیێ خۆڤە ئاخ د هاڤێتنێ.
پالە ل گۆر جهێ خۆ ناڤ لێ دهاتە كرن، وەك:
**پالە:** هەر كەسەكێ كۆلان دكر پێ دهاتە ب ناڤكرن و د گۆتنێ پالە.
**ناڤپالە:** ئەو پالەبوون یێن دكەتنە نیڤەكێ و گرانیا كارێ كۆلانێ دكەتە سەر ملێن وان، لەوما د كەڤن گۆتینە (سەبە، ناڤپالە نەبە).
**ردالە:** ئەو پالە بوو یێ د كەفتە بنی، وی ژی دگەل سەرپالەی پالە دهینان و دبرن.
**سەرپالە:** سەركێشێ هەمی پالەیێن كۆلانێ بوو، وی بەرۆكێ كاری ڤەدبری و كەسێ بێی وی مافێ بێهنڤەدانێ نەبوو.

## مزەیتكرن:

خەلكێ دەڤەرێ هەر دكەڤندا پویتە داینە رەزان و بوویە پارچەك ژ ژیانا وان، وەك دیار رەز و جۆرێن تری مشە ل دەڤەرێ هەنە، ب تایبەت ل وان جهێن دێم و كێم ئاڤی و جهێن نزار و بەتەنان.
رەز پارچەكا ئەردی یە، دهێتە كۆلان و ڤەوژارتن ژ بەرا و گل و گیا و تیركێن مێوا لێ دهێنە چاندن، پتریا مێوێن لێ دهێنە چاندن زەرك و رەش مێوە، ژ بلی

چەند جۆرە دارێن دی یێن دێم، مینا هەژیران و سێڤ خوانکی و باهیڤ و هرمیك و سماق و ... هتد.
هەلبەت گەلەك جاران ئەڤ بەرهەمێ زێدە ژ خوارنێ و فرۆتنێ د کرنە مویژ، کریارا چێکرنا مێویژان (زەرکی) دبێژنێ مزەیتکرن، ئەڤ پەیڤە (مزەیت) دبیت ژ پەیڤا (مەزیدەن) کو پەیڤەکا ئیرانی یا کەڤنە، ب واتایا (مێتن) کو هەتا نها ژی د فارسی دا ل کارە هاتبیت.
کریارا مزەیتکرنێ د چەند قۆناغانرا دەرباز دبیت:
ئەڤ کارە ل هەیڤا تەباخێ و هەتا بەری (عید سلیف) دهێتەکرن، و نابیت پشتی ڤی دەمی بهێتەکرن، چونکی ئێدی دەم بەرەڤ سەرما ڤە دچیت و دبیت مێویژ نەگەهن.
کارێ مزەیتا کارەکێ ب کۆم و هەڤپشکە، ژن و مێر و زارۆك پشکداریێ تێدا دکەن، ل بەراهیێ رۆژەك بۆ مزەیتکرنێ دهێتە دەستنیشانکرن و رۆژا کاری ژی هەمی ل ناڤ رەزی بەرهەڤدبن و کار دهێتە لێکڤەکرن، هندەك تری د چنن و هندەك دکێشن و هندەك ل زرکێ ددەن و هندەك ژی ل مشتاخێ رادئێخن.
ل بەراهیێ زرکێ ب ڤی رەنگی چێ دکەن:
چەند رۆژان بەری مزەیتان خودانێ رەزی دێ چیتە چیای، هندەك دارا سۆژیت و کەتە خۆلی، پاشی وێ خۆلیێ بۆ ماوێ سێ هەتا چوار رۆژان تێ تێکەلی ئاڤێ کەت و رۆژانە تێکڤەدەت و دبێژنە وێ ئاڤێ (زرك).
کارێ مزەیتان ژی ب چنینا تری دەستپێدکەت، ڤێ چەندێ ژی شارەزایی پێ دڤێت، پێدڤییە بستیکا تری درێژ بهێلیت دا ئەو ژنکێن ئیشییان د زرکێ دهەلینن بشێن بگرن و دەمێ ل زرکێ د دەن دەستێ وان نەسۆژیت، هەروەسان دڤێت دروست بکەتە دناڤ سەڤیکێ دا، دا ئەو ژنکا ل زرکێ ددەت دروست دەرێخیت ژی، پاشی ئاڤا زرکێ د ئامانەکی دا ل ناڤ رەزی کو دبێژنێ (دیزك) دا دکەلینن و دڤێت ئاگر بەردەوام ل بن زرکێ بیت دا سار نەبیت، وی تری ئیشی ئیشی د وێ زرکێ دهەلینن و ل ئەردەکێ پاقژو راست و بەرتاڤ کو دبێژنێ (مشتاخە) رادئێخن و پشتی هەشت نەه رۆژان دبنە مێویژ، قەبارێ تریێ دهاتە چێکرن ژی ب دیزکان دهاتە پێڤان، بۆ نموونە دا بێژن من دەه دیزکێن زرکێ یێن ل رەزێ خۆ داین، واتە دەه تەنەکێن ئاڤا زرکێ یێن مەزاختین.
هەلبەت د ڤی کاری دا گەلەك تلی ژ ئیشییان د وەریان، وەسان ئەو تلی دکرنە دبنێ سەڤیکێ دا و ل زرکێ ددانانە رەخەکێ مشتاخێ، یان ژی باراپتر رەزان ماسر* بۆ چێکرنا دۆشاڤێ ل ناڤ هەبوون.

**جوینێن مێویژان:**

پشتی تری هشك دبیت و دبنە مێویژ، دێ مێویژا کۆمکەن و کەنە د تەبەقادا و دێ پەرخینن دا دیلکێن وان ژێڤە ببن و ژ گلێشێ دگەل هاتی پاقژ ببن، د ڤێ کریارێ دا مێویژا دکەنە سێ دەست:
١- هندەك د زەر و گر و باشن دبێژنێ (بژارە)، ئەڤە بۆ خوارنێ گەلەك د باشن و بهایەکێ باش دناڤ بازاری دا دکەت.
٢- دەستێ دووێ پیچەك د بێ سەروبەر و بێ خولك و قورمچی نە دبێژنێ (تێکەلی).
٣- دەستێ سیێ مێویژەکا هویرە، چونکی تریێ وێ یێ هویر بوو، باراپتر یێ بێ بەرکە و دبێژنێ (خاتینۆك).
گۆتنێن کوردی ژی ل سەر ڤێ کریارێ هەنە:
- ل تەباخێ مشتاخە کەتنە ئاخێ.
- تەباخێ، تری کەتە مشتاخێ.
- ل تەباخێ، تری کەتە ئاخێ، بوو مێویژ ل مشتاخێ.
هەلبەت ڤان هەمی گۆتنان ئێك واتا یا هەی.
د ڤێ کریارێ ژی دا ستران ددەنە بەرێك و گەلەك جاران داوەت و دینان ژی گرێددەن.

## گویز داقوتان:

وەك دیار ئێك ژ دەرامەتێن دەڤەرێ گویزن، ب تایبەت ل جهێن ئاڤی و د ناڤ گەلییاندا، گویزێن دەڤەرێ هندەك ل هاڤینێ دگەهن و هندەك دگەهنە پاییزێ و باراپتر ل هەیڤا دەهـ دهێنە داقوتان. ئەو کەسێ رادبیت ب داقوتانا گویزان کو دبێژنێ (جەلوەشین) دڤێت گەلەك زیرەك و پەهلەوان و شارەزابیت، چونکی دارا گویزێ دارەکا بلندە و کارەکێ مەترسیدارە. جلوەشین دو جەلان کو دبێژنێ جەلێ داوەشاندنا

گویزان دگەل خۆ ب سەر دارێ د ئێخیت، ئێکێ درێژە بۆ تایێن درێژ و سەرێن تایا و یێ دی یێ کورتە بۆ ناڤ تایا، ئەوێن ل خوارێ ژی ڤێکددەن دبێژنێ (ڤێدانك) و وەسان هەتا هەمیان دادقوتن و ئەگەر جلوەشین ب کرێ گرتبیت دێ پارێن وی دەتێ یان گویزا ل دووڤ رێککەفتنا وان کو دو یان سێ بۆ خودانی بەرامبەر ئێکێ بۆ جلوەشینی.

پشتی ژ داقوتانا گویزا ب دوماهی دهێن گویزێ ژ رستکێ (ئەو تیڤلێ کەسك) ڤەدکەن و دبیتە لۆچیسك، وی ژی ل بەر تاڤێ رادئێخن هەتا هشك دبیت، ڤێجار چ هەلگرتن و چ فرۆتن و چ ب متایەکێ دی گوهارتن. گەلەك جاران رستکا بۆ رەنگان (وەك سۆراڤ) ێب کارهینن، قەلپیچکان ژی بۆ سۆتنێ ب کاردهینن. هەلبەت ژ بلی دارێ وێ کو دارەکێ موکمە و یێ ب بهایە و دچیتە دناڤ پیشەسازیێن داری دا.

دناڤ فلکلۆرێ کوردیدا گەلەك جاران یاریان ب گویزان دکەن، یان ل سەر دکەن کو ژ ئێك ببەن، گویز شکاندن نە کارەکێ ب ساناهی یە، لەوما دناڤ کوردان‌دا دبێژن وەك ئیدیوم دبێژن (فلان کەس گویزا ل سەر دلێ مە دشکێنیت).

دیسان کەڤنە باوەرییەك ژی یا هەی کو نابیت مرۆڤ گویزا بچینیت، چونکی ئەگەر قورمێ وێ هندی ستویێ مرۆڤی ستویر بوو مرۆڤ دێ مریت، دبیت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ئەو بیت کو دارا گویزێ زوی ب زوی مەزن نابیت و دەم پێ دڤێت هەتا مەزن دبیت[١٨].

## چاندنا گارسی:

گارس ئێکە ژ دەرامەتێن هاڤینی کو نهو کێم دهێتە چاندن و ل بەرێ پتر د هاتە چاندن، ب تایبەت ل سالێن کەل و خەلا و گرانی، کو ل وان سالان گەلەك گرنگیا خۆ هەبوو، لەوما ئەگەر کەسەکێ گەلەك فەقیر با دا بێژنێ (نانێ گارسی ژی ب دەست ناکەڤیت). ئەڤ دەرامەتە پشتی جەه دروینان ل مەها خزیرانێ دهاتە چاندن، چاندنا وان ژی د ڤان قۆناغان را دەرباز دبوو:

١- ل بەراهیێ عەرد دهێتە ریسەکرن، پاشی تۆڤ پێ دهێتە وەردکرن و ژ نوی ب گا و دەواران دهاتە دکێلان، دڤێت ئەو چەند ژی ب شارەزایی بهێتە ئەنجامدان، نە گەلەکێ همبز بیت و نە گەلەکێ شەلال.

٢- ل دووڤدا دهێتە شینەکرن، شینەکرن ژی کریارەکە پشتی تۆڤکرنێ و کێلانێ دکەن، ئەو ژی چەپەرەکە ژ شفتانان ب هەژڤە د دووڤرا دخشینن دا کو تۆڤ بن ئاخ ببیت و گومتل هویربن.

٣- دا کو کریارا ئاڤدانێ ژی ب ساناهی بکەڤیت زەڤیێ دکەنە چەند سەرە (لات) و دبێژن ئەو خیارێن ل ناڤ سەرێن (لاتێن) گارسی دچینن گەلەك دخۆشن.

٤- گارس ل هەیڤا چریا دووێ دهێتە دروین و پشتی دروینی دکەنە دەستك، دو دەستك یان پتر دا خۆ بگرن پێکڤە رادکەنە ژێرڤە دا ژ عەردی بلند ببیت و نەرزیت دبێژنێ (کوچە- کوچك).

٥- پشتی پیچەکێ هشك دبیت، قەرافە دکەن، واتە گولیا گارسی ژ بنێ وێ ڤەدکەن و پشتی گولیێ ژێڤەدکەن دبێژنێ (دەستکێ سولهێ) و قورمێ وێ پشتی گولی ژێڤەدبیت دبێژنێ (سولهە).

٦- پشتی هینگێ دبیتە کریارا گێرەکرنێ، ئەو چەند ژی ب باگوردانی دهێتە کرن و ئەو کایا ژێ دەردکەڤیت گەلەکا سڤکە دبێژنێ (خەفك) و چ مفا تێدا نینن نە وەك ئالف و نە وەك ل بەرێ دکرنە بالیفك و نە بۆ چ کاران، لەوما گۆتنەکا مەزنان مرۆڤێن بێ وج و بێ مفا ب ڤێ کایێ سالۆخەت ددەن دەمێ دبێژیت: (فلان کەس) خەفکا گارسی یە یان وەك خەفکا گارسی یە، لێ سولها وی د نماندن و بۆ تەرش و کەوالی قەت قەت دکرن و وەك ئالف ددانێ.

٧- پشتی ڤێ کریارێ گارسی دبەن دقوتن و دهێرن، چ وەك ئار بۆ نانی و چ ژی ب جۆنی دقوتان کو مینا دانهێرکی بۆ کوتلکا دهاتە بکارهینان و هندە جاران ل شوینا برنجی ئەگەر نەبا بۆ ئیپراخا دهاتە بکارهینان، یان ژی دگەل پیڤازێن قەلاندی مینا شۆربێ پێ د لێنان دبێژنێ (چیچاڤك). هەروەسان وەك ئالف و وەك تۆمکێ فرندان ژی دهێتە بکارهینان[١٩].

## گیایێ هەلزێ:

وەکی دیار ل کوردستانێ ب دەهان جۆرێن گل و گیا لێ شین دبن و پارێزگەها دهۆکێ ژی گەلەك گل و گیا و دار و بارێن خورستی لێ هەنە، چ ل دەشتێ و چ ل چیا و خەلکێ وی گەلەك مفا بۆ کاروبارێن جۆرا و جۆر ژێ دیتینە، چ بۆ خوارنێ و چ بۆ دەرمانان و چ ژی وەکی ئالف بۆ تەرش و کەوالی یان بۆ فرۆتنێ، کو هەلز ئێك ژ وانە، لێ هەلز چ گیایە؟

هەلز گیایەکێ کویڤی یێ بهاری یە و ل زۆزانان شین دبیت، داڤێن وی زراڤ و نازکن و گەلەکێ ب رەوش و رەنگ بالکێشە و کەسکاتییا وی دناڤ هەمی گیایان دا دیارە، ژ خەملا وێ یا جوان ناڤێ گەلەك کچان ب ناڤێ ڤی گیای (هەلز) هاتینە ب ناڤکرن، ناڤێ وی یێ زانستی (Prangas ferulacea)، یان (P. macrocarpa)، کۆمکۆمە و دبەرێکرا ل جهێن بەفرین و ل چیایێن بلند شین دبیت، درێژاهییا وی هەتا مێترەکێ بەژنێ دکەت تۆڤەکی وەکی گویزکا ددەت و سالا پاشتر هەر ژ وی تۆڤی شین دبیت، ل وان دەڤەرێن لێ شین دبن وەکی ئالف بۆ تەرش و کەوالی دهێتە دروین و هشککرن، تیرکا ڤی گیای سۆرڤەیە و هندە جاران هندی باسکێ دەستی ستویر دبیت، ب خوارنا ڤی گیایی شیرێ پەزی زێدە و شرین دبیت، چونکی شەکر ئێك ژ پێکهاتەیێن ڤی گیایی یە، رها ڤی گیای دەمێ دهێتە برین شیراڤەك ژێ دەردکەڤیت و ئەڤ شیراڤە وەکی دەرمان بۆ دەرمانکرنا جهێن کرمی و کوشتنا کرمان دهێتە بکارهینان. ژبەر گرنگی و بهایا ڤی گیای دهێتە پاوانکرن و شوپیرەکرن و کرین و فرۆتن ل سەر هەیە. گیایێ هەلزی ب هندێ ناڤدارە کو کڤارکێن بژارە و مەزن دناڤرا شین دبن کو دبێژنێ (کڤارکێن هەلزێ) و بۆ خوارنێ گەلەك ب تامن.

## جلکێن کوردی و چێکرنا شەل و شەپکان:

جلك ئێکە ژ نیشانێن ناسکرنا مللەتان و کوردان ژی جلکێن تایبەت بخۆڤە هەنە و وەکی دیار کورد گرنگییەکا باش ددەنە بەژن و بالا و جلکێن خۆ و گەلەك جاران دناڤ سترانێن کۆچك و دیوانان دا گاڤا سالۆخەتا ئێکی هاتباکرن، چ ژن با یان مێر ب جلکان و راپێچێ و کار و کۆکی وی دهاتە سالۆخەت دان، سەیر نەبینە کو هندەکان خوارن دخانی ڤە نینە، لێ جلکێن وان ب سەر و بەرن و چ کێماسی ل جلکێن وان نینە وەکی د گۆتنێن مەزنان ژی داهاتی:

**- شەلوال شینۆ، چ ل مال نینۆ.**

یان دبێژن:

**- خودانێ شاش و لفە، د مالێ دا نینە ئوفە.**

هەلبەت جلکان وەکی هەمی ئالیێن دی یێن چاندی نیشانێن وارگەهـ و ژینگەها مرۆڤ دناڤدا دژیت دیارن و هەر مللەتەکی ل دووڤ سرۆشت و سەقایێ خۆ جلك یێن دروین، بۆ نموونە فرەهیا جلکێن کوردی و شۆراتییا کراسێ وان باراپتر ئەگەرێن خۆ پاراستنێ ژ سەرمایێ نە، هەروەسان گرێدانا شاشکان ژی، لەوما دێ بینین دەڤەرەکێ بۆ دەڤەرەکا دی جوداهی هەیە و خۆ دناڤ کوردان بخۆ ژی دا دێ بینین دەڤەرەك ژ دەڤەرەکا دی جوداهی هەیە، و مرۆڤ ب وان تدارەکێن ل بەر و رەنگێ راپێچانا وان دزانیت کا خەلکێ کیژ دەڤەرێ یە؟ بۆ نموونە شەل و شەپکێن ئاکرێ، نەمازە یێن عەشیرەتێن هەرکی و زێباری و سۆرچییێن بەهدینان جودانە ژ یێن دەڤەرا دهۆك و زاخۆ، یێن دەڤەرا ئاکرێ و عەشیرەتێن ب سەر ویڤە ژ دوکایی و پێسیرێ ڤە د تەنگن و ژ دەلنگاڤە د فرەهن و پتریبا وان ئێك دەرسۆك گرێددەن، لێ گەلەك ژ عەشیرەتێن دی دو دەرسۆکان رادپێچن، و ل هندە دەڤەران مینا زاخۆ شال ل سەر شەل و شەپکان دهێتە گرێدان و قائیشێ ل سەر گرێددەن، هندەك ژی شویتکا پاتەی گرێددەن و ل ڤان داوییا گوهۆرین کەتییە دچێکرنا شەل و شەپکان دا و ب تایبەت د دروینێ دا و جهی و دەمی و کاودانێن سیاسی کارتێکرن کرییە سەر ڤێ چەندێ و هەر دەڤەرەك دناڤ سنوورێ وەلاتەکی دا کەتییە ژێر باندۆر و رەوشت و تیتالێن وی وەلاتی دا و گەلەك ژ کوردان و ب تایبەت ژ تەخا گەنجان هەر ب ئێکجاری دەستبەرداری ڤان جلکان بووینە، یان ژی جلکێن ژ

پەرۆکێ نۆرمال دکەنە بەرخۆ کو دبێژنێ (خاك)، ب تایبەت پێشمەرگەهـ گەلەك ڤان جلکان ل بەردکەن. و جلکێن رۆژئاڤایی وەکی پەنتەنۆل و ڤاتان کارتێکرن ل سەر ڤان جلکان کرینە و زالبووینە ل سەر، لەوما ل هەرێما کوردستانێ رۆژەك ب ناڤێ (رۆژا جلکێن کوردی) بۆ ڤێ مەبەستێ هاتییە تەرخانکرن.

## شەل و شەپك و چێکرنا شەل و شەپکان:

بەری بەلاڤبوونا بەرگویزان، جلکێن پرانییا کوردان، ب تایبەت یێن تەخا هەژاران کراس و دەرپێ بوون... ژ خزنە و جانگێ سپی دهاتنە چێکرن، یێ سەری فەسالا کراسێ نها بوو، بەلێ سینگێ وی نە یێ بەردای بوو و ژ کراسێ نها درێژتر بوو هەتا سەرچۆکان دهات و ل هەردو تەنشتانڤە مینا جلکێن مللی یێن پاکستانییان بوو، ژ بنی ڤە بۆ ژناڤدا یێ قەوارتی بوو. دەرپێ ژی فەسالا شەلوالی بوو و سەر هچکێن وی ب لەوەندی بوون، نها ئەڤ جلکە وەکی جلکێن ژ ناڤدا دبن شەل و شەپکان ڤە دکەنە بەرخۆ، کو تنێ ل نك هندە دانعەمران ماینە. شەل و شەپك ژی وەکی جلکێ سەرەکی یێ زەلامێ کورد، ب تایبەت ل نك کرمانجان پێکهاتییە ژ سێ پارچەیان، ئەو ژی:

١- شەل.

٢- شەپك.

٣- شال، کو نها پتر (پشتبێن، شویتك)ێ ل شوینا وێ گرێددەن و ل هندە جهان ئێلەکی ژی ل سەر دکەنە بەرخۆ.

وەکی دیار چێکرنا شەل و شەپکان کارەکێ دەستی یە و نە یێ ب ساناهی یە، ل بەرێ ل دەڤەرا بەهدینان جوییان پتر ئەڤ کارە دکرن، لێ نها پتر مەسیحی دکەن و باراپتر یێن دەڤەرا بەرواری بالا، و چێکرنا وان ژی د چەند قۆناغانرا دەرباز دبیت:

ل بەراهیێ (٣) کیلۆیێن مەرەزی، کو تێرا دەستەکێ شەل و شەپکان هەیە دهینن و دشوون، و پشتی هشککرن و ڤەچرین و شەکرنێ (١،٥کگم) ژێ دمینن، ڤان کیلو و نیڤان دکەنە گولیك و کتکتە ب دارکێ مەرەزی ڤە دکەن و درێسن، هەتا هەمی

جورێن شەل و شەپکان



دبیتە داڤ (نها ل شوینا تەشیێ واتریەمپی بۆ وێ مەبەستێ بکاردهینن)، و پشتی ژ قۆناغا ڕستنێ ب داوی دهێن، د بستەکا تایبەت دا دئالینن و بۆ ماوێ چوار دەمژمێران بەرتاڤ دکەن، پشتی هینگێ مەرەزێ بەرتاڤکری ژ بستێ ڤەدکەن و باش دسترکێ ڤەددەن هەتا باش تەڕ دبیت و دا داڤێن مەرەزی موکوم ببن و خۆ ل بەر بیرێ بگرن و حولیتر لێ بهێن و تێك نە ئالزێن. پشتی ڤێ قۆناغێ دێ چنە قۆناغا ڕاچاندنێ و دڤێ قۆناغێ دا (١٦- ١٧ گەزێن) ئەوا سترك* کری کو ڤەدەرێ دەستەکێ بەرگویزانە دێ هێتە ڕاچاندن و دڤێت ئەڤ کریارە ل هاڤینان ل بەری دەرکەتنا هەتاڤێ ل بەر سیبەران و ل زڤستانان ل ڕۆژێن هەتاڤ بهێتەکرن. دووڤرا مەرەزێ ڕستی دێ ل مێکویکان هێتە بادان و ڤێ چەندێ ژی شەهرەزایی پێ دڤێت و دڤێت ب ڕەنگەکێ هونەری بهێتەکرن دا پێ بەرهەڤ بیت بۆ قۆناغا بیرێ، کو قۆناغەکا هەرە گرنگە و هۆستایەکا باش پێ دڤێت، چونکی ئەڤ قۆناغە ب ئەندازیاری شەهرەزایی دهێتەکرن و ژ هەر قۆناغەکا دی پتر ئامراز پێ دڤێن، وەکی: مەیووتە، دەپ، شە، تەختێنی، گور، پرماسە، ناولتە، مناور، و هەر ئامرازەکی کارێ خۆ یێ تایبەت هەیە.

پشتی ژ بیرێ ب دوماهی دهێن دێ پیڤن و د نیڤێ ڕا بڕن و بۆ دەمێ (٣- ٤) دەمژمێران دێ کەنە د ئاڤێ دا و دەنە بەر شوینکان هەتا باش پاقژ دبن و پاشی دێ ب تایبتێ شوون و هێتە ڕائێخستن و پیچەکا کبریتێ ل بن هێتە سۆتن دا ب جەهوەر بکەڤیت و پاشی دێ ل قالبا هێتەدان و دێ کەنە د ئاڤەکا کەلاندی دا کو کەل بۆ دەمێ (٢٠- ٣٠) دەقیقا بێتێ و ل گوڕ ڕەنگێ بەرگویزی، پاشی دێ دەرئێخن و بۆ دەمێ شەڤەکێ کەنە د قالبێ ئاسنی دا هەتا باش زوها دبیت، ئێدی ئەو شەل و شەپك دێ د بەرهەڤ بن بۆ فرۆتنێ و وەکی دیار چەندین جۆرێن شەل و شەپکان ل دووڤ ڕەنگێن وانْ هەنە، گرنگترینێن وان:

١- پشتپەز.
٢- خەزالی.
٣- ئەسمانی (عەسمانی).
٤- شەکری.
٥- شەرنەخی.
٦- بنەفشی.
٧- کێخمە.
٨- کەڕانی.
٩- بادایی.
١٠- سێڤکی.
١١- بەکر بەگی.
١٢- ڕەش.
١٣- سپی.

**شال، یان پشتبێن (شویتك):**

شال پارچەیەکا پەرۆکی یە، ب دەست یا هاتییە کرن و ب نەخش و نیگارێن جوان هاتییە خەملاندن، ڤان شالان ژن و مێر ل بەر دکەن، ب تایبەت عەشیرەتێن سندی و کۆچەرێن ئەرتووشی و هندە سلێڤانەیی و هەتا نها ژی هندەك ل پشتا خۆ گرێددەن و خەلکێ ڤان عەشیرەتان زوی بزوی شویتکان گرێ نادەن، ژ گرنگترین ڕەنگ و جۆرێن شویتکان ژی ئەڤەنە:

عەجەمی (ژ هەمییان ب بهاترە)، کەرمانی، کەشمیری، و وەسان دیارە کو پتریا ڤان شالان ژ ڕەخێ ئیرانێ ڤە دهێن و بهایێ هندەك ژ وان هەتا (١٥٠٠ دۆلارانە).

## جلکێن ژنکان:

وەکی دیار جلکێن ژنان جوداهی دگەل یێن زەلامان هەنە و پرانییا جلکێن ژنان کراس و فیستان بوون، کراسێن دەڤەرا بەهدینان ب ڕەنگەکێ گشتی د درێژبوون تا سەر گۆزەکێ و ل ناڤتەنگێ دهاتە ئێك، نە وەکی یێن دەڤەرا سۆران کو سەر و بن ئێك بوو... سەرهەچکێن وی هەتا بازنکێ دەستی د درێژ و ب لەوەندی نە و ژ هەمی ڕەنگێن پەڕۆکێ ڕەنگا و ڕەنگ دهاتە دروین، گەلەك جاران کورتەك ل سەر کراسی دکرنە بەرخۆ کو هەتا ناڤتەنگێ یێ درێژ و بێ هچك بوو، ل هندە دەڤەران دبێژنێ ڤەدەك، یان ئێلەك، و هندە جاران ل شوینا کورتەکی فیستان ل سەر کراسی دکرنە بەرخۆ، دبن کراسی ژی ڤە باراپتر ژن ئەتەکی

دکەنە بەرخۆ و زەخمە نە ژ مێژە گەهشتییە دەڤەرێ و ئێلەکی جهێ وێ چەندێ دگرت کو نەدهێلا بەرسینگێن ژنکان شۆر ببنە خوارێ و ڕاهۆلە ببن. هەڤالکراس ژی پارچەیەکا دی یا جلکێن دەڤەرا بەهدینان بوو کو ژنکان د بن کراسی ڤە ژ نافتەنگێ و پێدا دکرنە بەرخۆ و زیێ وێ یێ سەری یێ ب دۆخین بوو، گەلەك جاران شال ژی ل سەر کراسی گرێ ددان و تشت دکرنە دبەر پشتا خۆرا، و هندە جاران شوینا شالێ کەمەر گرێ ددان، ب تایبەت د هەلکەفت و گۆڤەنداندا و هندە جاران ل رۆژێن جەژن ژی. دیسان ژنکان دەرسۆك و پۆشی ژی دهاڤێتنە سەرێ خۆ و گەلەك رەنگ هەبوون. هندی پۆشی ژی بوون، یان کەسرەوانی باراپتر ل هەلکەفتان و بۆ جوانیێ دکرنە سەرێ خۆ... ل هندە جهان چارك (چارۆك) ژی هەبوون و دبەر خۆدا بەرددان.

## ژێدەر و پەراوێز

١. هەڤدیتن دگەل ڤان کەسان ژ گوندێ بابیرێ هاتینە ئەنجامدان: (حەجی سلێمان رەجەب بابیری ژ دایکبوویێ سالا ١٩٤٠ێ، عەبدولقەهار سەلمان ژ دایکبوویێ سالا ١٩٦٠ێ، جومعە ئوسمان ژ دایکبوویێ سالا ١٩٦٤ێ، محەمەد پیرو ژ دایکبوویێ سالا ١٩٤٧ێ).

*. رەندۆل: دەولەکا چەرمی یە، خودان رەز ل ناڤ چیایان بۆ چنینا فێقی ب کاردهینن، بارا پتر ژ کەڤلێ مەشکەکا دڕیای مینا دۆلکا بۆ چنینا کەزانان چێدکرن.

٢. هەڤدیتن دگەل ڤان کەسان ژ خەلکێ گوندێ ئاسهێ، دەڤەرا بەرواری بالا هاتینە ئەنجامدان:(سالح محەمەد ئاسهی ژ دایکبوویێ سالا ١٩٥٤ێ. حسێن مستەفا ئاسهی ژ دایکبوویێ سالا ١٩٤٥ێ، عایشە سالح محەمەد ژ دایکبوویا سالا ١٩٥٥ێ، عەقیلە ئاسهی ژ دایکبوویا سالا ١٩٤٠ێ).

*. کەرخ: کریارەکە تێدا سپینداران بۆ کارێن بازرگانیێ و ڤەگوهاستنێ ب ئاڤێ دا بەرددەن تا دگەهیننە جهێ مەبەست ژێ، د ڤێ کریارێ دا ٢٢ سپینداران ب تێلێ یان کنفان گرێددەن دبێژنێ فەرشێ ئێکێ. پشتی هینگێ هەر بنەکی پینجەکی دبەر دقوتن دا موکم بیت، پاشی دو متران ژ سەریڤە دێ هێلن دێ دارەکی دانن سەر گرێدەن دبێژنێ (کەستە)، ل دووڤدا ئەو ٢٢ دارێن ل بنی پێنج پێنجە پێگڤە گرێدەن دا ژ بەرێك نەچن و دێ ٦٠ بنێن داری هاڤێنە سەر وی (کەستەی) دا کەرخ درێژ بیت. دبێژنە ڤان داران (سەلەمە). پاشی (کەستەکا) دی دێ هاڤێنە سەر وان داران، پشتی هینگێ ٨٠ سەر تا (طا) دهینن ددانە سەر وان (سەلەما) و دو دارێن حولی بۆ بێهن ڤەدانان د دانە سەر وان (سەلەما) و دارێن مەزن کو ستویراتیا وان سێ چوار بهۆست ددانە دوماهیکا کەرخێ دا گران بیت و ژ سەریڤە رابیت. پشتی هینگێ سێ سەرتابێن (سەرطابێن) حولی دبێژنێ (دەعفینك)، ئێکێ کورت و ئێکێ ناڤنجی و ئێکێ درێژ بۆ هاژۆتنا کەرخێ و هەر ئێکی کارێ خۆ یێ تایبەت یێ هەی.

*. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ڤی بابەتی، بنێرە: سعید الحاج صدیق الزاخویی، زاخو... الماضي والحاضر، ٢٠٠٩.

٣. هەڤدیتن دگەل هەر ئێك ژ حاجی ئوسمان ئاغۆ رێوانی، ژ دایکبوویێ سالا ١٩٥٢ێ یە و سەلمان تاهر محەمەد بابیری، ژ دایکبوویێ سالا ١٩٥٢ێ یە هاتینە ئەنجامدان.

٤. هەڤدیتن دگەل ڤان کەسان هاتینە ئەنجامدان: (مریەم محەمەد، خەلکا گوندێ بێلیزانێ و ژ دایکبوویا سالا ١٩٥٢ێ یە، جەمیلە ئەحمەد خەلکا گوندێ بابیرێ و ژ دایکبوویا سالا ١٩٥٠ێ یە، عەیدێ حەسەن بێلیزانی ژ دایکبوویا سالا ١٩٥٥ێ یە، زەکیە عەلی عومەر ژ دایکبوویا سالا ١٩٤٦ێ یە، حەجی سالح بێلیزانی ژ دایکوویێ سالا ١٩٤١ێ یە و سالا ٢٠١٠ێ وەغەر کرییە).

٥. هەڤدیتن دگەل ڤان کەسان هاتینە ئەنجامدان: (ئیبراهیم رەشید ئارۆشی، ژ دایکبوویێ سالا (١٩٦٥)ێ یە و کەسەکێ شەهرەزایە د ڤی بواری دا، حەجی رەمەزان موراد ئۆرەیی کو دیسان کەسەکێ شەهرەزایە د ڤی بواری دا ژ دایکبوویێ سالا (١٩٤٢)ێ یە، حەسەن رەزیکی کو شەهرەزایی د چێکرنا کورتاناندا هەی و ژ دایکبوویێ سالا (١٩٣٧)ێ یە و سالا (٢٠١٣)ێ وەغەر کرییە.

*. زیاف: ئامیرەکێ نالکرنا دەوارانە، دارەکێ تەمەت دەستکێ مەرێ ستویر و بهۆستەکێ درێژ و سەرەکێ وی کون شەلیتەکێ تێ هەلدکێشن و دەمێ نالکرنێ ئەڤ شەلیتە وەکی خلفێ لێ دکرن و لێڤا دەواری یا سەری پێ گرێددان دا نەلڤیت.

٦. هەڤدیتن دگەل ڤان کەسان ل گوندێ ئۆرە هاتینە ئەنجامدان: (عەبدولغەفار حەبیب ئۆرەیی ژ دایکبوویێ سالا (١٩٥١)ێ،

# کەڤنە باوەری ل بەهدینان

بەرهەڤکرن: جەمیل شێلازی

## بەراهی:

بێ گۆمان هزر و بیر و هەستێن مللەتێ کورد، د پڕن ژ باوەریێن مللی (المعتقدات الشعبیە) مینا هەر مللەتەکی د جیهانێ دا. چونکی فۆلکلۆرێ مە ژی گەلەکێ دەولەمەندە، ژ هەمی جوران (چیرۆک، سەرهاتی، ئەفسانە، ستران، گۆتن، مەتەل و باوەریێن مللی..هتد). هەر وەکی گەلەك ڤەکۆلەران هەڤبەرکرن د ناڤ فۆلکلۆرێ مە و یێ جیهانی دا کرین، گەلەك هزر و بیرێن هەڤپشك دناڤبەرا وان دا هەنە.. کو ئەڤەژی وێ چەندێ خۆیا دکەتن هەڤبەندیەك د ناڤبەرا فۆلکلۆرێ تەڤ جیهانێ دا هەیە.. لەوما مە ژی ب فەر زانی ڤی دەرگەهی ب قوتین و هندەك دیتن و بۆچوونان ل دوور پەیدابوونا باوەریان ل قەلەم ب دەین، ل دووڤ ژێدەر و سەرۆکانیێن پەیدابوونا باوەریان ل دووڤ دیتن و بۆچوونێن رۆژهەلاتناسان و فۆلکلۆرناسان، یێن ل دوور باوەریێن مللی ڤەکۆلاین و نڤیسین، نە خاسمە ل ناڤ جڤاکا کوردەواری دا، کا بۆچی باوەریێن مللی پیتر ل دەڤ ژنا کورد پەیدابووینە ژ زەلامی؟ و ل دووڤ ڤان خالێن ژێری:

- بۆچی ئەڤ باوەری یە ل دەڤ ژنا کورد پەیدابووینە؟
- بۆچی ئەڤ باوەری یە هەتا نوکە د ناڤا هندەك جڤاکێن مە، چ گوندی بن یان باژێری، بەردەوامی دایە ڤەژاندنا خو و ماینە ساخ؟
- ئەڤان باوەریان چ کارتێکرن هاتینە سەر کو هندە رهێن خۆ د ناڤ هزر و بیرێن مللەتێ مەدا برینە خوارێ؟
- ژێدەر و سەرۆکانیا ڤان باوەریان ژ کویڤە هاتنە؟

## پێناسە:

باوەریێن مللی هنەك را و بووچوونن، یان پێرابوونن، خەلك باوەریێ پێ د ئینن، هەتا نها د مێشکێ تەڤایی یێ پڕ مللەتان دا د مینن. لێ ل پەی پێشکەفتنا جڤاکی و ئابووری و رەوشەنبیری، خەلەکا ڤان باوەریان، گاڤ بۆ گاڤێ بەر تەنگ دبیت و ل پەی گوهۆرینێن مەزن یێن پیشەسازی و تەکنەلوجی ل با مللەتێن پێشکەفتی، گەلەك کێم د بن و وا هەیە ل پاشەرۆژەکا نێزیك، لبا نفشێن داهاتی، ب یەك جاری بنبرین. باوەریێن مللی تایەکە ژ تایێن زانیاریا فۆلکلۆری، تایەکێ نەیێ هێسایە، زانایێن فۆلکلۆری ب تایەکێ گرنگ ل قەلەم ددەن[1].

## ژێدەرێن پەیدابوونا باوەرییێن مللی:

دەربارەی چیرۆکا چیڤانۆکی (خرافی) نڤیسەر (فردریش فۆن دیرلاین) دبێژیت: (ئەم حاشاتیێ ناکەین، دبیت چیرۆکا چیڤانۆکی د هندەك دەلیڤان دا هاتبیتە ڤەگوهاستن ژ مللەتەکی بۆ مللەتەك دی، و رەهێن خۆ دناڤ وان ئەردێن غەریب دا بەلاڤەکرین.. چیرۆکێن چیڤانۆکی هەمی پێکڤە ل سەر هندێ د رێککەفتینە، کو ئەو هندەك باوەری نە، د مێژوویا خۆدا د گەهنە کەڤنترین سەردەم، و جارەکا دی دەلیڤە بۆ هەلدکەڤیتن دیار ببنە ڤە د وان نڤیسینان دا، کو هندەك زانینێن نە هەستی (لاشعوری) بەرچاڤ بکەن[2].

دەربارەی باوەرییێن چیڤانۆکی (عەلی جزیری) د پەرتووکا خودا (الأدب الشفاهی) دا، ب ڤی شێوەی بەحس دکەتن: هندیکە باوەرییێن چیڤانۆکی (خزعبلات - Sapestition)، ئەو هندەك هەڤۆکن د گەل پەرتووکێن خودایی، د گەل باوەریەکا راست ب شێوەکێ گشتی، و ئەڤ باوەری یە د هێنە گرێدان ب جادووگەری (سحر)ا دەستپێکی ڤە، ئەڤجار ئەو: کۆمەکا کریار و رەوشت و هزرانە یێن خەلکەکی وەرگرتین، ل سەر هندەك رویدان و تشتێن دی، د ژیانا وان یا رۆژانە دا.. هندیکە ئەڤ باوەرییێن چیڤانۆکی نە، ئەو هەمی تیتالێن جادووگەری نە، نە بەس د تایبەتن ب کوردان بتنێ ڤە، بەلکو ل نك هەمی مللەتێن هەڤسوی و دەوروبەر ژی هەنە ژ ئەنادۆل و ڤەفقازێ، بەلێ هندەك کریار ل نك کوردان هەنە کو گەلەك د هەژمێرن ئەو ژ پاشمایێن بت پەرستانن (عبدە الاوثان)[3].

لێ (ڤاسیل نیکیتین) ل دووڤ دیتنا (مار)ی پەیدابوونا باوەریێ ل ناڤ جڤاکا کوردەواری د زڤرینیتە ئەگەرێ سەرکەفتنا فەلاتی و موسلمانەتی یێ ب دەستخوڤە ئینایین، دبێژیت: (باوەری و بەشێن ڤێکاڤێ د ناڤ کوردان دا ژ لایێ ئایینی ڤە، ئەو ب دیتنا (مار) ی ئەگەرا سەرکەفتنا فەلاتی و موسلمانەتیێ ب دەستخوڤە ئینایین دژی باوەریا ل ئاسیا کەڤن دا)[4].

(دیڤید ورنەر) ئەگەرەکێ دی ڤەدگەرینیتە پەیدابوونا باوەریان، ئەوژی هندەك کارتێکرنێن سالۆخەتێن ناڤخۆیی (یێن مالێ) نە، دبێژیت: (هندەك سالۆخەتێن مالێ کارتێکرنەکا ئێکسەر هەیە ل سەر لەشی، و هندەکا ژی کارتێکرن د چارەسەرکرنا دا هەیە، ژ بەر وان باوەری پێ هەیە، هێزا باوەریێ (ئیمان)ێ کارتێکرنەکا مەزن ل سەر هەیە. (گۆتنەکا عەرەبا دبێژیت: باوەری پێ ب بەری بینە، دێ ساخبی (وەرگێر). نموونە ل سەر ڤێ چەندێ ئەڤ سەرهاتیە یە: جارەکێ مێن زەلامەك دیت، گازندا سەرئێشانەکا دژوار دکر، و ژنکەکێ بۆ چارەسەرکر، ئەوژی پرتەکا پتاتا شرین دایێ و ئەو قانع کر، کو ئەڤە (مسەکەن)ەکی کارتێکەرە بۆ سەر ئێشانێ، ئینا زەلامی باوەری پێ ئینا و سەرێ وی تەنا بوو، یا روون و ئاشکەرایە کو باوەریا ڤی زەلامی ب ڤێ چارەسەریێ (نە ب پتاتێ) ئەو بۆ ئەگەرا وی هەست ب رەحەتیا سەرێ خۆ کر. و گەلەك سالۆخەتێن مالێ کارتێکرنەکا باش هەیە د چارەسەرکرنان دا، چونکی ئەڤ چارەسەرکرنە ژ باوەریا خەلکی ب وێ چەندێ دەردکەڤیت.. لەورا مفایەك مەزن ژ بۆ چارەسەرکرنا وان تشتێن خەلك هزر د کەت نەساخیە، یان ژی هندەك دەلیڤێن ترسێ و دوو دلی یێ)[5].

## جۆرێن باوەرییان دناڤ جڤاکا کوردەورای دا:

ئەگەر مرۆڤ خواندنەکێ بۆ کەڤنە باوەرێن کوردی بکەت، ئێکسەر دێ بینین د بنە دوو جۆر، ئەوژی:

**١ـ باوەرییێن مللی.**

**٢ـ باوەرییێن ئایینی.**

باوەرییێن ئایینی بخۆژی جارەکا دی دبنە دوو چەق، ئەوژی:

**أ ـ باوەرییێن ئایینی.**

**ب ـ باوەرییێن نە ئایینی.**

## ١- باوەرییێن مللی:

باوەرییێن مللی ل تەڤ دران هەنە، د بەلاڤن، ل ناڤ تەڤ تەخێن هەژار ل گوندان و باژێران، نەمازە ل ناڤ کەسێن نەخواندەوار. ڤان بیر و باوەران بها و رۆلەکێ بەرچاڤ، د دەستپێکا دیرۆکا هزرا کوردی دا دیتییە[٦].

دبیت گەلەك ئەگەر هەبن ژ بۆ پەیدابوونا باوەرییێن مللی، کو ئێك ژ ڤان ئەگەران وەکی بەری نهۆ مە ئاماژە پێ کری ل دووڤ گۆتنا (فردریش فۆن دیرلاین)، کۆ دزڤرینیتە وان باوەرییێن د ناڤ چیڤانۆکان دا پەیدا بووین.. هەر وەسا (د.عبدالحمید یونس) ژی د زڤرینیتە هندەك گیانەوەران دناڤ ئەفسانە و چیڤانۆکان، کۆ ب ڤی رەنگێ ل خوارێ بەحسێ رەسەنیا گیانەران دکەتن، ب تایبەتی ئاخفتن، دبێژیت: (چ گۆمان تێدا نینە کۆ گیانەوەر ژی د رەسەنیا خۆیا ئەفسانەی دا یان د چیرۆکا مللی دا، کو گەلەك ژ سالۆخەتێن مرۆڤایەتیێ وەرگرتن، و ل پێشیا ڤان سالۆخەتان ئاخفتن ئانکو ئەزمان، ئەو نیڤەکا سەرەکی و گەلەك د فۆلکلۆری، نە خاسم د ئەفسانێ دا ل ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیا، و ژ ڤێ جیهانا کەڤن بارکر بۆ هەمی ئەردی. و ژ باوەرییێن کەڤن کو گیانەوەر ب ئاقلترە ژ مرۆڤان)[٧] .. هەر خالەکا دی ژ وان ئەگەرێن باوەرییێن مللی پەیدابووین، هندەك کارتێکرنێن دەروونی نە، وەکی نموونا (دیڤید ورنەر) بۆمە ڤەدگێریت، ئەوژی نموونا (پتاتێ)، ئانکو کارتێکرنا هندەك رویدانێن رۆژانە ل سەر دەروونێ مرۆڤی بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا باوەرییێن مللی.

هەر کەسێ ژ مە هویر هزرێن خوە دجیهانا باوەرێن ئەفسونی یێن مللی دا بکەت، دێ بینیت چەند جیهانەکا بەرفرەهە، فرە تشت دخۆرستی دا و دیاردێن خۆرستی بووینە کەرەستێ سەرەکی یێن ڤان باوەرا نۆلا: جانەوەر، دار و بارا، خانی و ئاڤاهیا، چیا، شکەفت، پرتێن دارا، ئانکو زۆربەی تشتێن ل ژینگەهـ و دۆربەری جڤاکا، ژ دیاردێن خۆرستی ژی: باران، ستێر رشتن، هەیڤ غەوارەبوون، رۆژ غەیرین..هتد[٨].

## ٢- باوەرییێن ئایینی:

دناڤ باوەرییێن کوردی دا رێژەیەکا زۆر ژ باوەرییێن ئایینی دناڤ دا هەنە، کو ئەوژی هەمی هاتینە وەرگرتن ل دووڤ ئایەتێن قورئانێ و سوننەتا پێغەمبەری (س)، ئانکو هەمی ل دووڤ بەلگەیێن هاتینە وەرگرتینە.. بەلێ گەلەك باوەری ب ناڤێ ئایینی دناڤ دا هەنە، ئەوبخۆ هیچ بەلگەیەك ژ (قورئان و سوننەتێ) پێ نینە، کو ئەو یان ژ ئایینێن بەری خۆ وەرگرتنە یان ب رێکا هندەك رێکێن سوفیاتی (تصوف)ی هاتینە، بەلێ نە ئایینی نە.

### أ - باوەرییێن ئایینی.

ئەگەر ئەم ل هندەك ژێدەران بزڤرین دێ بومە خۆیابیت، کا هەر باوەریەکا ب ناڤێ ئایینی هاتی دێ هێتە هژمارتن ژ باوەرییێن ئایینی یان نە؟.. ل دوور هندەك روشت و تیتال (عرف و عادە) تان و هەڤبەرکرنا وان د گەل یاسایێن شەرعی، کا چەند د گەلێك دا د هەڤگرتینە، د پەرتووکا (النهج المبين لشرح أصول العشرين) دا، هاتیە: (هندیکە رەوشت و تیتالن، دێ خەلك د گەل وان ب رێڤە چن هندی ئەو چ ژ شریعەتی نە گۆهورن.. رەوشتێ خەلەت ئەو راستیا گۆتنێن شەرعی ناگۆهوریت، بەلێ د ڤێت مرۆڤ ل سەر وان توخیبێن رامانێن پەیڤێن کورت راوەستیت، و مرۆڤ پێ هشیار بیت ژ درەو و ب دووڤ ڤەنانا زێدە، هەمی لایەنێن مەسەبی و ئایینی، چونکی دەربرین نە ب ناڤانە، بەلکو ئەوێن پێ د هێنە ناڤکرن. و تیتال هاتیە ناڤکرن ل دووڤ دیتنا (فقە) زانان، رەوشت: ئەو تشتە یێ خەلکی نیاسی و ل سەر ب رێڤە دچن د ژیانا خۆیا رۆژانە دا و د ناڤ بازارێن خۆدا، چ ب گۆتن یان کریار یان هێلان.. هندیکە رەوشتە دبیتە دوو پشك، ئەوژی، یێ دورست: ئەوە یێ خەلکی زانی و دگەل چ دەڤێن شەرعی نە یێ هەڤدژ (مخالف)ە، هەتا ئەگەر چ دەڤێن تایبەت ژی پێ نەهاتبن. و ئەڤێ پشکێ چ (أختلاف) د ناڤبەرا خودان زانستان دا نینە ل دەمێ ب کار ئینانێ و (استنباط و قضاء)ان دا.. و یێ نە

دورست (فاسد)؛ ئەوە یێ خەلکی زانی، بەلێ یێ (مخالف)ە د گەل حکمێن شەرعی و بناغێن وی یێن موکوم. وەکی گەلەك خەلك د زانیت هندەك تشت د حەرامن، و ئەو ب کریارا وان ڕادبن، وەك: ریبا، قومار، کوشتنێ، دەهمان پیسی و گەلەکێن دی.. پشتی ئەو ناڤێن وان د گوهورن یان ب کریارەکا دی ڕادبن کو ئەو کریار هەر دبیتە راستیا وی تشتێ حەرام و مەبەست پێ..!)[9].

ڕەنگە ئەڤ جۆرە باوەریە د ناڤ جڤاکێ کوردی یێ موسلمان ژی دا د مشەبن.. هندەك پەرتووکێن ب ناڤێ موسلمانەتیێ، کو د پڕن ژ ڤان جۆرە باوەریان، مینا: (شمس المعارف الكبرى، الحكمة في الطب والرحمة، بدائع الزهور في وقائع الدهور..هتد)، زکێن ڤان پەرتووکان د پرن ژ ڤان جۆرە باوەریان، کو پرانییا وان ژی د هەڤدژ (مناقض)ن، د گەل دەقێن شەرعی یێن موسلمانەتیێ دا.

دناڤ کەڤنە باوەریێن مە دا نموونە د زۆرن ژ ڤی جۆرێ باوەریێ، وەکی ڤێ نموونێ: (هەکە ژنکەکێ ب ڤێت مێرێ وێ ب کەڤیتە د بن دەستهەلاتا وێ دا، دێ ئاڤا بێ نڤێژیێت خۆ ب بەرزەیڤە کەتە ناڤ تشتەکی دا، و دەتە مێرێ خۆ، بەلێ ژنك دێ بێ ـ ئیمان ـ بیت!)[10]. هەر دناڤ باوەریێ بخۆدا دا خۆیاکر (ئەو ژنا ب ڤێ کریارێ رابیت دێ بێ ئیمان بیت)، ئانکو باوەریەکە ب ناڤێ ئایینی هاتیە، لێ نە یا ئایینی یە، ئەگەر چاوا دێ بێ ئیمان بیت؟!.

ڕەنگە دبیت گەلەك ژ ڤی جۆرێ کەڤنە باوەران د ناڤ گەلێ کوردێ موسلمان ژی دا هەبن، بەلێ دەربارا هاتنا ئیسلامێ و ڤان باوەریان (د. محمد عبدالقادر) دبێژیت: (ئەو ئایینێ هنارتی بۆ ڤاسدێ خۆ محەمەدی (س)، بۆ ڕێکا راست و ئایینێ دورست، داکو بەرێ وی جڤاکێ بەرزەبوویی د ناڤ چیڤانۆك و نەهشیادا، هزر و بیر و هۆشێن وان تژی ڕەوشت و تیتالێن کەڤن، بلا ئەو تشت خرابکاری ژێ بیت، و وان هەمی تشتێ نوی قەبویل نەدکر، هەکەر خۆ یێ باش ژی بیت. ئەوان مێشکێ خۆ دائێخست بوو ژ هزرکرنێ و د گۆتن: [بل انا وجدنا اباءنا على أمة وانا على اثارهم مهتدون..زوخروف/٢٢] ئانکو، دبێژن: مە باب و باپیرێن خۆ ل سەر دین و ڕێکەکێ یێت دیتین، و ئەم ژی ل دووڤ شۆپا وان دچین..(تەفسیرا ژیان/٤٩) ئەوان پەرستنا سەنەمان د کر هەر وەکی بابێن وان دکر، بێ یی ئەو هزرا خۆ د راستیا ڤی عیبادەتی دا بکەن کۆ ئەڤەژی ژ چیڤانۆکانە )[11].

هەر ژ وان خالێن بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا هندەك باوەریێن ئایینی ل نك کوردان، دیارە زانینا زمانێ تەیر و تەوالان ژ لایێ سلێمان پێغەمبەری (س)، و ئەو دیالۆکێن دناڤبەرا سلێمان پێغەمبەری و گیانەوەران دا هەی، ئەگەرەك سەرەکی نە بۆ پەیدابوونا باوەریێن مللی دناڤ جڤاکێ کوردەورای دا.. پشتی بەلاڤبوونا ڤان چیرۆك و ئەفسانەیێن ل سەر زارێ گیانەوەران د ناڤ جڤاکا کوردەواری دا، جهێ خۆ د ناڤ دا کر، و پشتی هاتنا موسلمانەتیێ دناڤ هزر و بیرێن مللەتی دا برن خوار، بوون ئەگەرێ پەیدابوونا باوەریان ب ڕەنگەکێ بەرفرەهتر.. چونکی گەلەك نموونە د قورئانا پیرۆزدا، د ناڤ چیرۆکێن پێغەمبەران (سلاڤێن خودێ ل سەر وان بن) دا خۆیادکەن، کۆ گیانەوەر د ئاخڤن یان (سولەیمان ) پێغەمبەر (س) ئەزمانێ گیانەوەرا دزانی، بۆ نموونە، د قورئانا پیرۆزدا هاتیە: [حتى اذا آتوا على وادى النمل قالت نملة يا أيها النمل أدخلوا مساكنكم لا يحطمنكم سليمان وجنوده وهم لا يشعرون، فتبسم ضاحكا من قولها وقال رب أوزعني أن أشكر نعمتك التي أنعمت علي...[12]]. ئانکو: (هەتا لەشکەرێ وی گەهەشتیە نهالا مێریان (نهالەکە ل شامێ گەلەك یا ب مێریە) مێریەکێ گۆت: گەلی مێریان هەرنە د جهێن خۆڤە، سولەیمان و لەشکەرێ خۆ هەوە نە هەرشینن، بێ ب خۆ ب حەسن.. ڤێجا سولەیمان ب ئاخفتنا وێ، گرنژی و کەنی و گۆت: خودێ وو، دەستێ من بگرە ئەز شوکرا تە بکەم، ل سەر وان کەرەمێن تە دگەل من و دەیبابێن من کرین)[13] .. هەر وەسا خودایێ مەزن ڤێ چیرۆکێ ل سەر زارێ (سولەیمان) پێغەمبەری (سلاڤێن خودێ ل سەر بن) ڤەدگۆهێزیت: (وتفقد الطير فقال مالي

لا أرى الهدهد أم كان من الغائبين، لأعذبنه عذابا شديدا أو لأذبحنه أو ليأتيني بسلطان مبين، فمكث غير بعيد قال أحطت بما لم تحط به وجئت من سبأ بنبأ يقين..[١٤] ). ئانكو: (سولەیمانی چاڤێ خۆ ل تەیران گێرا و گۆت: بۆچی ئەز هودهودەی نابینم، یان ژی ئەو نەیێ حازرە، یان ئەز دێ ئیزایەكا مەزن دەمە بەر وی، یان دێ ڤەكوژن، یان ژی ئەو (ژبەر نەهاتنا خۆ) دێ نیشانەكارۆن و ب هێژ بۆ من ئینیت، و گەلەك پێڤە نەچوو (هود هود هات) گۆت: ئەز ب سەر وێ هەلبووم یا تو ب سەر هەلنەبووی، و من سالۆخەكێ ڕاست و بێ شك ژ سەبەئێ، یێ بۆ تە ئینای..[١٥])..
دیسان (خفس) كو گۆهرینەكا گشتی بوویە ژ مرۆڤی بۆ سەر قلخێ گیانەوەركی، ئەڤەژی دناڤ گەلەك چیرۆكان دا دهێتە بەرچاڤكرن، نەخاسمە چیرۆكێن زارۆكـان، كو د ڤێ دەربـارێ دا ژی، و(نزار محەمەد سەعید) ب ڤی ڕەنگێ خوارێ بەحسێ خفسێ دكەت ل سەر گیانەوەران، دبێژیت: (خفس گۆهورینەكا گشتی یە ژ مرۆڤی بۆ گیانەوەری، یان كەرستەكێ بێ گیان، خفس ل وان مرۆڤا تێتە كرن ئێن زیان و گۆنەها دەرهەڤا ئایینی دا دكەن، ئانكو دەتە سەر گۆتنێن خودێ و پێغەمبەرا. خودایێ مەزن ل سەر خفسێ د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت: (فلما عتوا عما نهوا عنه قال لهم كونوا قردة خاسئين..[١٦]).
ئانكو: (ڤێجا وەختێ وان خۆ مەزن كرین ل سەر تشتێ نەهی یا وان ژێ هاتیە كرن، و زێدەگاڤی یا خۆ نەهێلایین، مە گۆتە وان: ببنە مەیمونێكێت ڕسوا و ڕەزیل..[١٧])، ل جهەكێ دی دبێژیت: (وجعل منهم القردة والخنازير...]ئەو كەسێن ب كار و كریارێن نە ڤەنج ڕادبن دژی ئایینی و دژی چاكیێ و مرۆڤایەتیێ، دێ ژ قلخێ ( شكل) وان وەرگەرینیتە قلخێ گیانەوەرەكی. ل دوی تەرزێ كریار و گۆننەها خوە دبنە: كمكمە، مەیمونك، كویسەلە، جورد و بەراز... هتد. مەبەست و و ئارمانج ژ چێكرنا ڤان باوەریا، مەبەستەكا سنجی یە (ئەخلاق)ی یە ب شێوێ شیرەت و ئاموژگاریا، ب تایبەتی ل سەر زارۆكان و خۆرتا)[١٨].

هەر ژ وان ژ وان خالێن بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا باوەریان ل ناڤ جڤاكا كوردەوارای دا، هندەك پەرەندە و مێرولائێن خزمەتا ئایینێ موسلمانەتیێ كرین، وەكی ماموستا (نزار محەمەد سەعید) دەربارەی هندەك پەرەندە و مێرولائێن خزمەتا ئایینێ موسلمانەتی كرین دكەتە هۆیەك دی ژ بۆ پەیدابوونا هندەك باوەریان ل دەڤ مللەتێ كورد، دبێژیت: ئایینێ موسلمانەتیێ كار د هزر و بیرێن كوردان دا كریە كو دیتنەكا تایبەتی ب ڕێز و شانازی سەحكەنە هندەك پەرەندە و مێرولائێن خزمەتا ئایینی كری، ژ وان: كوتر، تەڤنپیرك، مێری، (پەڕندێ) تەیركێ سلێمان پێغەمبەری (هدهد)ەی، هەسپێ فاتما نەبیا و حاجی ڕەشك[١٩].

### ب ـ باوەرییێن نە ئایینی:

ڕەنگە گەلەك باوەریێن مە ب ناڤێ ئایینی هاتبن، لێ ئەوبخۆ نە ئایینی نە، یان ژ ئاینێن بەری خۆ وەرگرتنە و دگەل ئایینێ مەدا د هەڤدژن، هەر وەكی ڕۆژهەلاتناس (مار) هندەك ژ ڤان جۆرە باوەریا دزڤرینیتە (وثنية)ێ وەكی دبێژیت: هەڤیر ترشێ (وثنية) چوو د ناڤ جیهانا ئیسلامی د ئاسیا بچویك دا، ب ڕێكا كوردان، چونكی جڤاتا كوردی دچوو د ناڤ سەلجوقیان دا، ل وی دەمی موسلمانەتی یێ خۆ ئاڤادكر ل سەر گلێشێ فەلاتیێ، ئەوێ بوویە ئەگەرێ ململانێ د گەل بزاڤێن ئایینی یێن مللی، ل وی دەمی ئایینەكێ نوی هاتە دامەزراندن ئەوژی دەروێشی بوو، هەر چەوا ڤی ئایینی دەست ب بزاڤێن خۆ كر، قوچانێ دگەل هندەك لایەنێن دی كر، گەلەك كوشتن بوو، ئینا بۆ ئەگەرێ ڕابوونا موسلمانتی یێ، ئەوا وی دەمی كونترۆلا خۆ هەی[٢٠].

هەر دیسان دەمێ مرۆڤ پێداچوونەكێ د پەرتووكا (باوەرییێن ئایینی د ناڤ عێراقا كەڤن)دا د كەین، دێ بینین:

هندەك باوەرییێن مە یێن كوردەواری هەبووینە گەلەك بەری هاتنا ئیسلامەتیێ، لەوما نە هەر باوەریەكا ئایینی، ژ ئیسلامەتیێ هاتینە وەرگرتن، وەك ڤان نموونان: (ئەگەر د خەونا خودا بەرێ خودا ڕەخێ

چەپێ دێ دوژمنێ خۆ شكێنیت، و ئەگەر چاڤێ وی یێ راستێ خۆ هلاڤێت دێ ئێشەك ـ نەساخییەك ـ لێ پەیدا بیت..[21]). یان (حەفت عەفریت یێت هەین زارۆكێن شیرڤژە ـ المرضع ـ د كوژن و بوونا زارۆكان گیرۆدكەن..[22]. یان (نڤشتی ل نك وان تشتەكێ گەلەك پێدڤی بوو، هەمییان د هەلگرتن داكو وان بپارێزن ژ هەمی جورێن عەفریتان، هەتا خوداوەندێن وان ژی هەلدگرتن..[23]). یان (نڤشتێن (ئەللاماشی) وان شەیتانان ددەنە پاش ئەوێن زەرەرێ د گەهینە ژنكێن ب دوو گیان و شیرڤژە..[24]).

هەر ل دووڤ ڤان باوەریێن د ئایینێ موسلمانەتیێ پەیدابووین، و كوردان باوەری ب موسلمانەتیێ ئینایین، (عەلی جزیری) ئەگەرێ ژ دەستدانا كوردان بۆ گەلەك باوەریێن خۆ یێن كوردی و باوەری پێ كرن ب باوەریێن بیانی ڤەدگەرینیتە ڤە بۆ موسلمانبوونا كوردان و هندەك باوەریێن هەڤسوییێن خۆ، دبێژیت: (كوردا گەلەك باوەریێن خۆ ژ بیر كرنە، و باوەریێن هندەكێن دی وەرگرتنە نە خاسمە پشتی بەلاڤبوونا موسلمانەتیێ د ناڤ وان دا.. و هەر د وی دەمی دا، هندەك باوەریێن گەلێن د ناڤ دا، و یێ هەڤسوییێن خۆ وەرگرتینە، هەر وەكی مە ئاماژە ب باوەریا خاچێ د ناڤ موسلمانان دا كری )[25].

تشتێ پێدڤی ب ئاماژەكرنێ ل دوور وەرگرتنا باوەریێن هەڤسوییێن خۆ، كوردان گەلەك جار باوەریێن هەڤسوییێن خۆ یان ئایینێن دی وەرگرتنە، وەك ڤێ نموونا ب بخۆ دیتی: من مرۆڤەكێ موسلمان دیت، ناڤێ وی (شەماشە) بوو، من پسیار كر، كا بۆچی ناڤێ وی شەماشە یە؟! گۆتن: بابێ وی، زارۆكێن وی بۆ نە د مان، ئانكو دمرن، ئینا چوو نك فەلەیەكی، وی ژی گۆتیێ: دەمێ زارۆكێن ئێكێ مە د مرن (بۆ نەمینن) ئەم زارۆكەكێ خۆ ب ناڤێ موسلمانان ناڤ د كەین، داكو بۆ بمینیت و نەمریت! ڤێجار تۆژی ناڤەكێ فەلا دانە سەر كوڕێ خۆ دا نەمریت، ئینا ناڤێ وی كرە شەماسە!! نۆكە ژی ئەڤ مرۆڤە ل كۆمەلگەها ئازادی ـ ل رۆژ هەلاتێ ناحیا سەرسنكێ، یێ ئاكنجی یە(بەرهەڤكەر).

## پەیدابوونا باوەرییان ل دەڤ ژنا كورد:

دناڤ بیروباوەرێن جڤاكا كوردەواری دا رێژەیا هەرە زۆرا وان ل دەڤ ژنێ پەیدابووینە، كا چاوان پێتریا نفرینان ژ لایێ ژنێ ڤە دهێنە گۆتن، وەسا پێتریا باوەرییان ژی ل نك وێ پەیدابووینە، و پیتر ژ وان باوەریێن ل دەڤ ژنا كورد پەیدابووین، ژ ئەگەرا كارتێكرنا ـ چیرۆكێن ئەجنا ـ نە، كو گەلەك ژ ڤان چیرۆكا د هێنە دارژتن ل سەر ڤان خالێن ژێری و پەیدابوونا وان د گەل مرۆڤان، بۆ گەلەك ئەگەران د زڤرن، هەر وەكی (د.عبدلحمید یونس) دزڤرینیتە ڤە بۆ ڤان خالێن ژێری:

١ـ ئەجنە ئێكی ژ مرۆڤان د بەن بۆ كارێن خۆ یێن تایبەت.

٢ـ ئەجنە مرۆڤان د بینن.

٣ـ گۆهورینا ئەجنەكی ب ئێك ژ مرۆڤان.

٤ـ سەرەدانا ئێك ژ مرۆڤان بۆ جیهانا ئەجنان.

٥ـ دلبەرەك ـ محبوبە ـ ژ ئەجنان بۆ ئێكی ژ مرۆڤان[26]..

پشتی پەیدابوونا ڤان چیرۆكێن ناڤەرۆكا وان ل سەر خالێن ژۆری، دناڤ مللەتێ كورد دا پەیدابووین، كارتێكرن د هزر و بیرێن ژنا كورد دا كر، بوون ئەگەرا پەیدابوونا باوەرییان ل دەڤ وێ.. هەر ل دوور ڤێ چەندێ (د.عبدالحمید یونس) دبێژیت: (چیرۆكێن مللەتان د پرن ژ رویدانێن ئەجنا یێن مرۆڤان بەرزە دكەن، ئەو وان ڤەدگوهێزن بۆ جیهانا ئەجنان یان جادوودكەن ـ دسێحرینن ـ، و هندەك هەنە كو باوەریا وان ئەوە یا ل سەر عەفریتان خویكا سالێ بدەنە شەیتانان، ئەوژی كو ب هنارتنا هژمارەك ژ وان بۆ جیهانا شەیتانان، ژ بەر هندێ دهیێن ژ مرۆڤان بەرزەدكەن و دبەن، ب تایبەتی زارۆكان داكو ژ پێش زارۆكێن حۆڤە بۆ شەیتانان ڤرێكەن[27]).. دیسان (د. نبیلە ابراهیم) د پەرتووكا خودا بەحسێ (بروب)ی دكەت، كا چاوا دەمێ ئەو رێبازا خۆ ل سەر چیڤانۆكێ ب جێبەجێ ـ تطبیق ـ دكەت. ئەو ژ بۆ ئاڤاكرنا چیڤانۆكێ هندەك

خالان د زڤرینتە کەسایەتییێن خرابکار ـ شریرە ـ دبێژیت: (دەمێ (بروب) دهێت چیرۆکا چیڤانۆکێ شرۆڤەدکەت، شرۆڤەکرنەکا دورست ژ بۆ ئاڤاکرنا چیرۆکا چیڤانۆکی دبێژیت...[28]).. (کەسێ شەرخواز ـ الشخصیە الشریرە ـ ئەوە یێ هەموو دەما نەخوشیێ د گەهینیتە ئێك ژ کەسێن خێزانێ[29]).. دخالەکا دی دا دبێژیت: (ئێك ژ کەسێن سەرەکی د چیرۆکا چیڤانۆکی دا کەسێ نەباشە ـ خرابکارە ـ یێ کۆ هەر نەخۆشیێ بۆ قارەمانێ چیرۆکێ یان ئێك ژ کەسێن خێزانا قارەمانی چێ دکەتن )[30].. و (تۆما بووا) د پەرتووکا خودا ڤێ چەندێ ددەتە خۆیاکرن: (د باوەریا ژنا کورد دا چاڤێن پیس ـ العیون الشریرە ـ یان چاڤێن حەسوید ـ العیون الحاسدە ـ هەنە، دڤێت چ کەسێ چاڤێن پیس هەین، ئەوێ کارتێکرنێ د کارێ ژنکێ و زارۆکێ وێ دا بکەت، نەخاسمە ژنا دوو گیان نابیت چ کارا ل دەڤ بکەن. ب وێ باوەریێ بوون، ئەو زارۆکێ د زکێ وێ دا، یان ل بەر چچکێن وێ، دێ چاڤەکی لێ دەت و کوژیت!.. هەر ل سەر ڤێ باوەریێ (تۆما بووا) د پەرتووکا خودا دبێژیت: (هەر کەسێ چاڤ زەر بیت، چاڤ پیسە.. ئەوێن کۆ چاڤێن پیس کارتێکرنێ تێ دکەن، بێگۆمان پشکا زۆرتر ژنێن زك پڕن ـ دوو گیان ـ و زارۆکێن وان، ئانکو نابیت ل نێزیك چاڤ پیسان ئەو چو کاران بکەن و تەشی یێ ب رێسن. هەر وەسا دڤێت هەر ژنەکا زارۆك بوو هەتا چل رۆژان نەچیتە لایێ چاڤ پیسان، چونکی چاڤ پیس ب خرابی لێ دنێرن.. د سەر ڤێ چەندێ را ئەگەر هات و دۆ ژنان ژ نوی زارۆك ببن ب رێکێ ڤە کەفتنە بەر سینگێ ئێك دڤێت ئەو دەرزی و زارۆکێن خو پێك بگۆهورن(*)، پشتی ئەو د زڤرنەڤە بۆ مال بێ یی ئەو هێشتا نە ئاخفتین[31]).

دەمێ زارۆك بوونێ دا، بۆ مرنا زارۆکی یان یا ژنکێ، هاتنا گیاندارا بۆ کوشتنا وان (ڤاسیل نیکیتین) دبێژیت: (د باوەریێن مللیێن کوردی دا، دەمێ ژنك ب زارۆکی نەساخ دبیت، گیاندارەك جادووگەری ـ سێحری ـ هەیە دبێژنێ (هلالناسی) ئەو پێکهاتیە ژ ژنکەکا بەژن بلند، کەشەفرێت، ب ترس، دوو مەمکێن درێژ هەنە ددانیتە سەر ملێن خۆ و ئەڤ ژنکا جادووگەر ـ سێحربەند ـ دلێ ژنکا ددەمێ زارۆك بوونێ دا، دئینیتە دەر و دبەتە سەرکانیێ، داکو ب ئاڤێ بشۆت، ئەگەر ئەو شیا ڤێ بکەت، ژنکا ب زارۆکی نەساخ دێ مریتن! )[32].

## ئەنجام..

ژ وان دیتن و بۆچوونێن بۆری، ل دوور پەیدابوونا باوەریان، ئەڤ خالێن هە بومە خۆیا دبن:

١ـ پیتریا باوەریان ژ چیڤانۆکان هاتینە ڤەگوهاستن، و ژ گەلەکی بۆ گەلەك دی.

٢ـ گەلەك باوەری ژ خوداوەندا هاتینە وەرگرتن و باوەری پێ ئینانە.

٣ـ ئایینێن فەلاتی و بۆزی و موسلمانەتی، کارتێکرن د هزرا خەلکێ دا کریە و باوەری ل دەڤ پەیدابووینە.

٤ـ چیرۆکێن ئەجنان کارتێکرنەکا باش د پەیدابوونا باوەریان دا هەبوویە، نەخاسمە ل نك ژنێ (ئافرەتێ).

٥ـ پێشەوایێن ئایینان وەك (مەلا و شێخ و قەشا و راهب و...هتد) رۆلەکێ کاریگەر د پەیدابوونا باوەریان دا هەبووینە.

٦ـ ژ ئەگەرێ کو مرۆڤ زمانێ گیانەوەران دزانن، گەلەك کار د پەیدابوونا باوەریان دا کریە (کۆ ئەڤ خالە ژی هەر دزڤریت بۆ ئایینی).

٧ـ چارەسەرکرنا گەلەك ئێشێن دەروونی - سایکولۆژی - ل سەر دەستێ، شێخ و مەلان و مەزاران... هتد، گەلەك باوەری ل نك ژنێ پەیداکرینە.

**ژێدەرێن هەتا نهۆ ل دوور باوەریان هاتینە بەلاڤەکرن،**


١ـ حەجی جەعفەر، هەندەك کەڤنە باوەرێت خەلکی ل بەهدینان، دار الحریة للطباعة، بغدا ـ ١٩٩٣.

٢ـ بەیار باقی، بیروباوەرێن کەڤن د ناڤ مللەتێ کورد دا، چاپخانا هاوار، دهۆك - ١٩٩٩.

٣ـ نزار محەمەد سەعید، هن ئالیێن جڤاکێ کوردەواری د کولتۆرێ گەلێری دن، چ١، چاپخانا

رەوشەنبیری، هەڤلێر ـ ٢٠١١.
٤ـ تارق شوكری خەمۆ، ژمارە (٣ ـ ٧ ـ ٤٠) د میتولۆجیا ئێزدییان دا، چ١، چاپخانا خانی، دهۆك ـ ٢٠٠٧.
٥ـ نزار محەمەد سەعید، كورد و باوەرێن ئەفسونی ل سەر داروباری، كۆڤارا (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (١٢٣)، ئیلۆنا ١٩٨٩، بەرپەر١٧١ ـ ١٧٦.
٦ـ ئەحمەد عەبدوللا زەرۆ، كورد و فرندە دباوەرێن چیڤانۆكی دا و هەڤبەركرن، كۆڤارا (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە(١٢٣) ـ بەرپەر ١٨٦ ـ ١٩١.
٧ـ جەمیل محەمەد شێلازی، پەیدابوونا باوەرێن مللی، كۆڤارا (پەیڤ)، ژمارە (٣٦)، سالا ـ ٢٠٠٦، بەرپەر
٨ـ جەمیل محەمەد شێلازی، باوەرێن ئایینی دناڤ كەڤنە باوەرێن كوردی دا هەردوو پەرتووكێن هندەك كەڤنە باوەرێت خەلكی ل بەهدینان و بیروباوەرێن كەڤن دناڤ مللەتێ كورد دا (وەك نموونە)، كۆڤارا (ڤەژین)، ژمارە (٢٩)، پائیزا ٢٠٠٢، بەرپەر ٤٣ ـ ٦٤.
٩ـ جەمیل محەمەد شێلازی، هندەك باوەری ل نك زارۆكێ كورد، كۆڤارا (مەتین)، ژمارە (٨٨)، گۆلانا ١٩٩٩، بەرپەر ٤٢ ـ ٤٤.

تێبینی/ داكو بابەت گەلەك درێژ نەبیت ب ژێدەران، دێ ژمارا ژۆری (بەرامبەری ژێدەران)، دگەل ژمارا بەرپەرێ ژێدەری ل دووماهیا هەر باوەریەكێ ئینین.

## باوەری د جڤاكا كوردەواری دا ل بەهدینان:

### ١- باوەرییێن مللی..

هەر كەسێ ژ مە هویر هزرێن خوە دجیهانا باوەرێن ئەفسونی یێن مللی دا بكەت، دێ بینیت چەند جیهانەكا بەرفرەهە، فرە تشت دخۆرستی دا و دیاردێن خۆرستی بووینە كەرەستێ سەرەكی یێن ڤان باوەرا نۆلا: جانەوەر، دار و بارا، خانی و ئاڤاهیا، چیا، شكەفت، پرتێن دارا، ئانكو زۆربەی تشتێن ل ژینگەهێ و دوربەری جڤاكا، ژ دیاردێن خۆرستی ژێ: باران، ستێر رشتن، هەیڤ غەوارەبوون، رۆژ غەیرین..هتد[٣٣].

رەنگە هەر دەرگەهەكێ مرۆڤ بنێریتی ب دەهان باوەری ل سەر هەنە، و هەتا نهۆ چەندین پەرتووك و ڤەكۆلین ل سەر هاتینە بەلاڤەكرن: لەوما تەنێ دێ ئاماژێ ب هندەك نموونان دەین.. ل دووڤ ئەو ڤاڤارتنا كاك (بەیار باڤی) بۆ باوەرییان كری دكەتە (١٣) ە پشك، ئەمژی دێ ل دووڤ وێ ڤاڤارتنێ نموونەیان ئینین، ئەوژی ئەڤەنە:

#### پشكا ئێكێ: هاتن و چوون و سەفەر.

(هەكە زلكەك ـ ڤرشەك ـ ب سەر چایا مرۆڤی بكەڤیت، ئەڤە دێ مێهڤانەك بۆ مرۆڤی هێت، هەكە زلك درێژبیت، ئەڤە مێهڤانێ درێژە، هەكە زلك قەلەو بیت، ئەڤە مێهڤانێ قەلەوە.. ١ ـ ١٩) یان (دەمێ دفنا مرۆڤی دخورت، دبێژن ئەو دێ مێهڤان بۆ مرۆڤی ئێن.. ٢ ـ ٨) یان (هەكە لنگێ ئێكی دخوریا، دگۆتن ئەو دێ چیت سەفەرەكێ.. ٣ ـ ٦٧) یان (هەكە تشت ژ دەستێ مرۆڤی ب كەڤن، دیسان دێ مێهڤانەك هێت.. ١ ـ ١٨) یان هەكە بۆ ویرچ ویرچا چویچكا، دێ مێهڤانەك هێت.. ١ ـ ١٨) یان (هەكەر مرۆڤ ب رێكەكێ چوو دەم سپێدە بت و مرۆڤی كێرڤیشكەك دیت پێدڤی یە ژ ئەوێ وەغەرێ بزڤرت، چونكە كێرڤیشك نیشانا بێ ئیفلەحی یێ یە، هەر وەسا هەكەر مرۆڤی ئێڤاری مارەك دیت پێدڤی یە بزڤرت، چونكە ئەوژی وەك كێرڤیشكێ بێ ئیفلەحە و دێ بەلایەك ئێتە رێكا مرۆڤی.. ٢ ـ ١١) یان (هەكەر مرۆڤی ڤیا سەفەرەكێ بۆ جهەكی بكەت هەر رۆژا هەبت دروستە تەنها رۆژا سێ شەمبی نەبت، چونكە رۆژەك بەشە و دێ بێ ئیفلەحی یەك ئێتە د رێكا مرۆڤی دا، ئانكو سەفەرا مرۆڤی نە ب خێر بیت..٢ ـ ١٢).

#### پشكا دوویێ: خوارن و ڤەخوارن.

(دبێژن: هەكەر ل سەر خوارنێ برك ـ ئیسك ـ هاتە مرۆڤی دڤێت مرۆڤ دەڤ ژ خوارنێ بەردەت و بەس كەت.. ٢ ـ ١٥) یان ( هەكە مێش كەڤتە د

چایا مرۆڤی دا، دێ رزقێ مرۆڤی زێدەبیت.. ١ ـ ٢٠) یان دەمێ شیرێ ئێكێ نە مەهیت، دێ بێژیت شیرێ من یێ هاتیە چاڤین كرن، لەوما دێ ئاغلەویكەكا دوهنی شارینیت و بناڤ شیرێ خۆ وەركەت، داكو چاڤێت وێ پەقن ئەوا شیرێ وێ چاڤین كری..١ ـ ٢٨) یان (دبێژن هەكەر مرۆڤ نانێ سۆتی بخۆت دێ چاڤێن مرۆڤی رۆهن بن و مرۆڤ دێ بۆ خوە پارا بینیت.. ٢ ـ ١٥) یان (دەمێ نانا ژنكێ ل سەر سێلێ گەلەك پڤ دبوو، دگۆت ئەو ئێكێ گەلەك برسی یێ ل وێرێ.. ٣ ـ ٦٦) یان (دبێژن: ل دەمێ خوارن تێتە لێكڤەكرن هەر چی یێ خوارنا دبنێ قازانێ دا ـ ڤرڤرانك ـ گەهەشتێ، ئەو دێ دەهوەتا وی باران باریت.. ٢ ـ ١٦) یان (هەر كەسێ پەیالا وی یا چایێ دوو كەڤچك تێدابن، ئەو دێ ل پاشەرۆژێ دوو ژنا ئینیت، ئانكو دێ كەت دوو ژن.. ٢ ـ ١٧) یان (هەكەر مرۆڤی سەرێ مریشكێ خوار، ئەو نیشانا هندێ یە مرۆڤ دێ بیتە مرۆڤەكێ نەكبەت ـ بێ ئیفلەح ـ د ژیانا خودا..٢ ـ ١٥).

## پشكا سیێ: داروبار و دەرامەت و گول و گیا.

(هەكە یەكی گویزەك چاند، مەزن بوو، چی گاڤا قورمێ وێ هندی حەفكا ـ ستویێ ـ مرۆڤی ستویر بوو دێ مریت!..٥ ـ ١٧٣، ٢ ـ ٢٤) یان (هەر هنارەكێ دێندكەك ژێێن بەهەشتێ یێن دناڤ دا، و ژ بەر هندێ دڤێت مرۆڤ نەهێلیت چو دندك ژێ بمینن نە خواری.. ٢ ـ ٢٢) یان (دبێژن: نێرگز یێ ل بەر دەست نڤێژا پێغەمبەری شین بووین.. ٢ ـ ٢٦) یان (بنەفشۆك دەمێ مویێن بن كەفشێ پێغەمبەری وەرباین یێن شینبووین و بووینە بنەفشۆك!(*)) یان (دارەك ل دەڤ مەزارگەها شێخادی هەیە، هەكەر هەردوو دەستێن مرۆڤی ل دور قورمێ وێ زڤرین، هەر چ هیڤی و ئومێد د دلێ مرۆڤی دا هەبن دێ بجهـ ئێت.. ٢ ـ ٢٥) یان (چ كەسێ گیایێ كەسك ب سۆژیت دێ چێلا وان مریت.. ٢ ـ ٢٣) یان (ل مزگەفتا شێخ مەنسویری ل ئامێدیێ قورمەكێ دار تویێ هەیە، خەلكی ژ خوەرا پرتكێن بچویك ژێڤە دكرن، دكرنە ستكورا بچویكێن خەندەكوك لێ دا ژێ بچیت و ساخ ببن..٥ ـ ١٧٣) یان (داركێن پشت ئێشا، ل تاخێ بەرۆشكێ ل بازارێ دهۆكێ هەبوون، هەر وەكی ژ ناڤێ وان دیارە ئەو كەسێن پشتا وان ئێشان قەست دكرنێ.. ٥ ـ ١٧٥) یان (دەمێ كاریێ دداننە سەر ئاگری و دكەلینن، نابیت د بەررا باخڤن، چونكی دێ دەڤگر بیت..١ ـ ٣٩) یان (هەكە پیڤازێت ئێكی گەلەك تیژ بن، دێ بێژن: خودانێ پیڤازا گەلەك ترِ و فسێت دناڤدا كرین، لەوما هند تیژ بووینە.. ١ ـ ٣٧).

## پشكا چوارێ: گەردوون و سرۆشت.

(دەمێ هەیڤ تێتە گۆهورین ـ غەیرین ـ ئەو هینگێ نەهەنگ ـ حویتەك ـ یێ هەی هەیڤێ دگریت و دڤێت داعویریت، و ژ بەر هندێ خەلك تەقێ دكەن ـ ب تەنەكا و هاڤێتنا تڤەنگا ـ داكو ئەو نەهەنگ بترسیت و هەیڤێ بەردەت.. ٢ ـ ٢٩، ٣ ـ ٣٦) یان (ئەو پنی یێن سپی و ب رێز ل عەسمانا كۆ ب شەڤێ دیار دكەت دبێژنێ رێكا كا دزا، ئانكو ئەو كایا ژ وان رشتی ب رێڤە هاتنێ..٢ ـ ٢٩) یان (هندەك ستێر ل عەسمانا كوم دیار دكەن وەكو گوپالی، دبێژنێ تەرمێ نحێ، و ئەڤێ چەندێ ژی پێڤە دبێژن: تەرمێ نحێ .. نح ل پشتێ، رۆژا هەشتێ.. چو بەهەشتێ.. یان ژی ب ڤی رەنگێ خوارێ دبێژن: بابێ نحێ.. نح ل پشتێ.. هەچیێ حەفت جار بێژیت.. دێ چیت بەحەشتێ..٢ ـ ٢٩) یان (كوردا هزر دكر كۆ هەر مرۆڤەكێ ل سەر رویێ عەردی دژیت، ستێرەكا ل عەسمانی هەی.. لەوما دەما ستێرەكا درژی یا، بەرەڤ عەردی دكەتە خوار، د گۆتن ئەڤە ئێك مر!..٣ ـ ٦٦، ٢ ـ ٣٠) یان (پشتی باران دباریت، هندەك جاران كەسك و سۆر ـ قوس قزح ـ ل عەسمانا چێ دبیت، و ژ دویرڤە مرۆڤ هزر دكەت كو ئەڤ تیر و بازنێن رەنگا و رەنگ ل سەر ئەردی راچاندینە و ژ بەر هندێ دگۆتن چ كەسێ خوە د سەر ئەڤی كەسك و سۆری را باڤێژیت هەكەر كچ بیت دێ بیت كۆر و هەكەر كۆر بیت دێ بیت كچ.. ٢ ـ ٣٢، ١ ـ ١٠) یان (چیایێ بێخێری، یێ ب ناڤ و دەنگ یێ كۆ بازێرێ دێرینێ زەحفەرانێ هەمبێزكری و دویراتی یا

(١٥کم) دکەڤیتە ژێری یا ڕۆژئاڤایێ زاخۆ، ناڤێ ڤی چیایی (بێخێر) سەرهاتی یەك هەیە دبێژیت: دەمێ توفان رابووی و گەمی یا نەح پێغەمبەری (س) دگەل پێلێن خۆ بری، ژ بەری ئەو گەمی بکەهیتە چیایێ جودی (کو دکەڤیتە بەرامبەری بێخێری) گەمی گەهەشتە چیایێ بێخێری (هینگێ ناڤێ وی بێخێر نەبوو) بەلێ چیایی خۆ ژ بەر گەمی یا وی چەماند و نەهێلا ل سەر راوەستیت، ئینا نوحی خوە لێ عاجز کر و گۆتێ هەی (بێ خێر) ئانکو چو خێر تێدا نینە، و هەتا نوکە ئەڤ چیایە یێ هشکە و بێ ئاڤە و دبێژن ئەڤە ژی ئەنجامێ وێ نفرینا (نوح) ی یە.. ٢ ـ ٣٦).

## پشکا پێنجێ: گیانەوەر و تەیر و تەوال.

(دبێژن: ئەو مرۆڤێ ژ صەی بترسیت، هەر ژ دویرڤە صە ئەوان دبینیت و دوکێل ژ سەرێ وان دچیت، ژ بەر هندێ صە ئەوان ناسدکەت و هێرشا دبەتە سەر.. ٢ ـ ٤٠) یان (حەیوانەت ژ مرۆڤا کێمتر دژیت، چونکە حەیوان هەمی یێن ژ مە بۆشتر ـ ئەجنا ـ دبینن، و ژ ترسێن وان دا زوی دمرن و ژی کورتن، و ل هندەك دەڤەرا دبێژن عزرائیلی دبینن.. ٢ ـ ٤٠) یان (هەکەر ژنك دەستێن خۆ ب پشتا ماری ڤە بینیت (مارێ مری)، ئەو دێ دەستێن وێ ژنکێ ب روین ـ دوهن ـ کەڤن دەمێ مەشکێ دکێت، ئانکو دەمێ مەشکێ دکێت دێ روین زۆر ب سەرکەڤیت.. ٢ ـ ٤٢) یان (هەکەر مرۆڤی کەڤلێ ماری دسەرێ خوە بدەت، ئەو دێ پویرتێ سەرێ مرۆڤی بهێز بیت و درێژ بیت، بو کۆر و کچا.. ٢ ـ ٤٢) یان دەمێ خودێ پشیك چێکری ژ حەیوانەتێن دی پیرۆزتر چێکر، و ژ بەر هندێ هەر حەیوانەکی گیانەك ـ رۆحەك ـ دایێ و پشیکێ حەفت دانێ.. ٢ ـ ٤٥) یان (هەکەر مرۆڤ ئەوێ پەقویشکا دناڤ بەرچێلکا ماسیێ دا بخۆت، دێ مرۆڤ مەلەڤان بیت.. ٢ ـ ٤٦) یان (ئەو سالا زرکێتك گەلەك هەبن، ئەو دێ وێ سالێ گەلەك بەفر ل ئەوێ دەڤەرێ باریت.. ٢ ـ ٥٢) یان (ل دەمێ بەرێ شڤانا دارێ کنێرێ د دەینا بن سەرێ خوە، داکو مار نە ئێتە وان و ب وانڤە نەدەت، دەمێ نڤستنێ.. ٢ ـ ٥٦) یان (هەکەر تەڤنپیرك تەڤنێ خۆ د مالا ئێکی دا چێ کەت، دێ بەرەکەت کەڤتە وێ مالێ.. ١ ـ ٤٤) یان (هەکە دخەودا تە شلخەکا مێشێت هنگڤینی ب بەرەکی ڤە یان دارەکێ ڤە دیت، سپێدێ هەرە بن وی بەری یان بن وێ دارێ ڤەکۆلە دێ بۆ خۆ جەرکەکێ زێرا ل وێرێ بینی.. ١ ـ ٤٤).

## پشکا شەشێ: نەساخی و نەخۆشی.

(ئەو کەسێ باوی بیت، ئانکو با لەشێ وی بگرت، دڤێت ببەن دەڤ ژنکەکێ هەتا کۆ ئەوی بای بسۆژیت، ئەو ژنکە ژی دڤێت ئێکا وەسابیت ب ئێتیمی مەزن ببیت ئانکو کەدا دەستێ بابێ خوە نە خواربیت، ئانکو ژ بەری ببیت، باب لێ مر بیت.. ٢ ـ ٦٤) یان (کوردێن ئێزدی دبێژن: هەکەر بیرۆڤ ل ئێکی هات و ڤیا دەرزیکێ دەینت، دڤێت ل سێ رۆژێن چارشەمبا ل دووڤ ئێك ئەو دەرزیکێ ل دور جهێ بیرڤکرتی ب دەت و خوە نەشۆت.. ٢ ـ ٦٥) یان (هەکە تایێ ئێك گرت، دڤێت دەیکا وی بچیتە مالا ئێکێ خودانێ دوو ژنا و ئەوێ زەلامی های ژ خوە نەبیت و ئەو ژنە، نانی ژ دەست بینت دەر و بۆ کورێ خوە بینت و بدەتێ.. دێ ساخ بیت.. ٢ ـ ٦٩) یان (هەچیێ ب شەڤ د قودیکا رۆناهیێ را بەرێ خۆ بدەتە خۆ، دێ دین بیت!..١ ـ ٤٥) یان (هەکەر پەرسیڤ هاتە ئێکی و گۆت، پەرسیڤا ل من، دێ بێژنێ هەرە بۆ خەسیا خۆ بێژە، داکو پەرسیڤا وی نە ڤەگریت.. ١ ـ ٥١) یان (هەکە چاڤك ـ کولك ـ د لەشێ بچویکەکی را هاتن، دێ سەرەکی ڤەکوژن و چاڤێت وی حەیوانی پەقینن د ئامانەکی دا و دێ وێ ئاڤێ د کولکێت بچویکی دەن، داکو ساخ بن و چاڤێت حەسیدا پەقن..١ ـ ٢٦) یان (هەکە ئێکەك نەساخ بیت و رۆژ بۆ رۆژێ لاواز بیت و ساخ نەبیت، دێ هندەك ـ رصاصی ـ ل هنداڤ سەرێ بچویکی یان مەزنی حەلینن دەمێ رصاصی د حەلینن ب گێسکیدا دکەن، ل هنداڤ بێژنگەکێ، ل هنداڤ تەستەکا ئاڤێ ل هنداڤ بچویکی، یان مەزنی.. ١ ـ ٢٧) یان (دبێژن: ئەو زەلامێن نەمێر، ئەوان مویری یێن خوارین ژ بەر هندێ یێن نەمێر بووین، ئانکو ئەوێ مویری یێ

بخۆت دێ نەمێر بیت.. ٢ ـ ٧٨).

## پشکا حەفتێ: شاهی و دەهوەت و ژنئینان.

(گاڤا بویکێ ژ مالا بابێ وێ دەردئێخن و بۆ مالا زاڤای ببەن، دێ بویك سەرێ خوە چەمینیت داکو دەولەتا (خێر و بێرا) مالا بابێ وێ بۆ مالا زاڤای نەچیت.. ٢ ـ ٨٤) یان (دەمێ زاڤای دبن سەرشۆیێ و جلکێن وی یێن زاڤاتی یێ دئێخن دناڤ بوخچەکێ دا تایێن بوخچکێ دگەل ئێك ناگرێ دەن بەلکو دسەرئێك را دبورینن و ب دەرزی یەکێ دگەهینن ئێك چونکە هەکەر گرێدان دبێژن زاڤا ژی دێ ئێتە گرێدان.. ٢ ـ ٨٧) یان (دبێژن: پێدڤی یە ژ بەری شویشتنا زاڤای، مرۆڤ بچویکەکێ نەبالغ د ئەوێ سەرشۆیێ دا بشۆت، ئەوا کۆ زاڤا تێدا بێتە شویشتن.. ٢ ـ ٨٨) یان (دەمێ بویکێ دبەن پشت پەرێ د ژۆرڤە کچکێن نە شوی کری تێن لێ خرڤەدبن و بنێ پێن خوە د بنێ پێن بویکێ دهەسوین، داکو ئەو ژی وەکو وێ بگەهن مرادا خوە و شوی بکەن.. ٢ ـ ٩٠) یان (زاڤا و بویك دڤێت هەشت رۆژا ژ مال دەرنەکەڤن، قورئانەك ژی د ڤێت ل هنداڤ سەرێ وان هەبیت، هەکە هاتو ئێك دەرکەڤت د ڤان هەشت رۆژادا گۆناهە و دوور نینە بێنە هنگاڤتن.. ١ ـ ١٣) یان (دڤێت بویکێ ل ماهینا سوار کەن داکو بزێت ـ زارۆك ببن ـ ل دەوارێ نێر سوار ناکەن چونکی پاشی بویك نازێت (زارۆك نابن).. ١ ـ ١٨) یان (ئەوێت بەندکێ پەرێ ڤەدەن، دڤێت مرۆڤێت زاڤایی بن و خودان باوەر بن، داکو بەندکێت پەرێ باش گرێدەن و ب شدینن، چونکی هەکە هاتو بەندکێ پەرێ ل چاخێ هەشت رۆژا ڤەبوو، یان قەتیا، ئەڤە مسۆگەرە دێ بەلایەك هێتە سەرێ بویك و زاڤا، یان ژی پێکڤە نا قەتینن.. ١ ـ ١٩) یان (هەکە د خەودا مرۆڤی دیت زاڤایە، یان ئێك ژ مالا مرۆڤی بویکە، یان زاڤایە، یان داوەتە، ئەڤە دێ بەلایەك هێتە سەرێ مرۆڤی.. ١ ـ ١٩).

## پشکا هەشتێ: دەم و هەژمار و یاری.

(هەکە رۆژا ئەینی یێ مرۆڤ ب سەفەرەکێ چو و مرۆڤەکێ کورە کەفتە رێکا مرۆڤی ئەو نیشانا یێ ئیفلەحیێ یە، بلا مرۆڤ بزڤریت.. ٢ ـ ٩٤) یان (هندەك رۆژ یێن هەین نابیت خەلك خوە ل وێ رۆژێ بشۆت، چ وەکو بێ ئیفلەحی بۆ ئەوێ رۆژێ یان ژی ژ بەر کۆ ل ئەوێ رۆژێ بەلایەك ب سەرێ ئەوێ بنەمالێ هاتی یە.. ٢ ـ ٩٥) یان (دەمێ ل گوندەکی یەك دمریت، نابیت وێ رۆژێ کەس بچیتە بالاڤێ، هەکە هاتو هندەك ل سەر بالاڤێ بوون، دڤیا ئاڤا خۆ برێژن و بێنە مال، چونکی د ڤێت ئاڤ هەمی وێ رۆژێ بۆ مری بیت.. ١ ـ ٢٠) یان (هەچیێ سەد نیشان لێ بن دێ چیتە بەهەشتێ..١ ـ ٢١) (هندەك دبێژن هەچیێ حەفت نیشان لێ بن دێ چیت بەهەشتێ) یان (دەمێ بچویکێ د چلکا دا دشۆن، د ڤێت دەیکا وی تڤکەتە تەستا ئاڤێ بەری سەرێ بچویکی بشۆت، داکو نە هێتە هنگاڤتن.. ١ ـ ٣١) یان (رۆژێت پێنج شەمبی، چاڤێ مریێ مرۆڤی یێ ل دەرگەهی، هەکە خێرەك ژێ دەرکەت، دێ کەیفا وی هێت، هەکە چ نە دەرکەت، دێ عاجز بیت.. ١ ـ ٣٣) یان ( ئەو رۆژێن ژ هەمی رۆژا پیرۆزتر بۆ سەرشویشتنا بچویکا رۆژا پێنج شەمبێ و ئێك شەمبێ یە، و نا چێبیت ـ نەدورستە ـ بچویکا ل رۆژا ئەینیێ بشۆن، چونکە دبێژن، هەکەر سەرێ وان هات شویشتن (کچ دێ هار بن، کوڕ دێ ژار بن)..٢ ـ ٩٥ /٩٦) یان (ل جەم ئێزدیا هەکە بیرۆڤ ل کەسەکی هات، و ڤیا دەرزیکێ دەینت، دڤێت ل سێ رۆژێت چوارشەمبویا ل دووڤ ئێك، ئەوێ دەرزیکێ ل دوور جهێ بیرۆڤ گرتی بدەت و وێ رۆژێ خۆ شل ـ تەڕ ـ ئاڤ نەکەت.. ٤ ـ ٤٤) یان (دەمێ مرۆڤ کەسەکێ چاڤا دهاڤێژیت دبینیت، دڤێت مرۆڤ سێ مووا ژ لەشێ خۆ هلکێشیت، داکو چاڤێ وی مرۆڤی ـ چاڤ هاڤێژ ـ کارتێکرنەکێ ل لەشێ مرۆڤی نەکەت.. ٤ ـ ٤٤) یان (هەکەر پویرت ل سەرێ بچویکی هات نا چێبیت ژ چل رۆژیێ ببۆریت دڤێت ب مەقەسێ ببڕن، چونکە هەکەر بچویك ژ چل رۆژیێ بوری ئەو پویرتە حەرام دبیت.. ٢ ـ ٩٩) یان (رشتنا ئاڤا گەرم ب شەڤێ نەباشە، چونکە ژ مە بوشتر ل وێرێ بن و ب کەڤن بەر وێ ئاڤێ و بێنە سۆتن، هینگێ دێ تۆلا خوە ژ مرۆڤی ڤەکەن..٢ ـ ١٠٠) یان (رۆژا سێ شەمبی بالاڤ کرن گونەهە، هەتا

بەراز خۆ ل ئاڤێ نادەت، چونکی رۆژەکا بێ ئیفلەحە.. ١ ـ ١٤).

## پشکا نەهێ: ژنك و بچویك بوون.

(ب هیچ رەنگەکی دڤێت ژنك حەیوانەکی (بزنێ، بەرخێ، مریشکێ، دیکلی..) سەرژێ نەکەت، بەلێ هەکەر ب حەملە بیت چێدبیت ب ئەڤ کاری رابیت.. ٢ ـ ١٠٣) یان (هەکەر خودێ بچویك دئێك رۆژ دا، دا دوو ژنکا ل ئێك گوندی یان ژی جیرانێن ئێك بن و بچویکێت هەردووا کوڕ بن، دڤێت هەردوو مال نانی بۆ ئێك و دوو ببەن.. ٢ ـ ١٠٦) یان (هەکە ژنکەکێ بچویك بوو، نابیت ژنکەکا دی دەستێ بچویکێ خۆ بگریت و بچیتە جەم یا نەساخ، چونکی بێهنا چلکا دێ چیتە بچویکی و دێ نەساخ بیت.. ١ ـ ١٧) یان (هەکە مرۆڤ تشتەکی ل نك ژنکا ئاڤز بخۆت و نەدەتێ، دێ بچویکێ وێ حەول ـ ڤیر ـ بیت.. ١ ـ ١٦) یان (هەکە ئاڤکا بێچولکێ کەڤت، دێ ب دەزیەکی ڤەکەن و ب لاندکا وی ڤەکەن، داکو زکێ زارۆکی نە ئێشیت، و هەکە هاتو پێڤە نەکر، دێ زکێ وی هەردەم ب ئێش و ئازار بیت.. ١ ـ ١٥) یان (هەکە ژنکەکا ئاڤز بۆ وی بچویکێ د زکێ خۆدا کراسەك دوری، دەهمەنێت وی دێ هێلتە ڤەکری و نا دوریت، چونکی هەکە دوری، ئەو بچویك زویکا ب سەر پیا نا کەڤیت.. ١ ـ ٢٦) یان (هەکە گلیز ژ دەڤێ بچویکەکی بێت، دێ پێلاڤا خالێ وی د دەڤی دەن، داکو گلیزی نەکەت.. ١ ـ ٢٩) یان (هەکە ژنکەك یا ئاڤز بیت و زکێ وێ گەلەك یێ شۆڕ بیت، دێ بێژن، ئەڤێ ژنکێ دێ کچەك بیت، هەکە یێ خڕ و خڕ بوو، دێ بێژن کوڕکە.. ١ ـ ٣٠) یان (هەکە ژنکەکێ بچویك ببیت، دێ وەریسکەکی، ل دۆر پێچولکێ ئالینیت، داکو نەهێتە هنگاڤتن..١ ـ ٣٠).

## پشکا دەهێ: یێ ژ مە بۆشتر (ئەجنە).

(دبێژن: یێن ژ مە بۆشتر ب شەڤێ سێ جارا گازی مرۆڤی دکەن، هەکەر ل گازی یا ئێکێ مرۆڤ ل خوە زڤری دێ مرۆڤ دین ـ شێت ـ بیت و ساخ بینا مرۆڤی ب زەحمەتە.. ٢ ـ ١١٣) یان (هەکەر مرۆڤ ب شەڤێ ژ مال دەرکەڤت و ئاسن بخۆڤەکر، هینگێ یێن ژ مە بۆشتر نەوێرن نێزیکی مرۆڤی ببن، چونکە ژ ئاسنی دترسن.. ٢ ـ ١١٥) یان (دبێژن: یێن ژ مە بۆشتر گەلەك ژ گورگا دترسن، چونکە بتنێ گورگ ئەوان دبینیت و ئەوان دخۆت.. ٢ ـ ١١٦) یان (دەمێ بویك د گەهتە مالا زاڤایی، دێ ئاسنەکی هاڤێنە ناڤ مالێ، هەتا حەفت رۆژا چێنابیت، ڤی ئاسنی راکەن، داکو ژ مەچێتر نە هێتە د خانی ڤە.. ١ ـ ٤٨) یان (ب شەڤێ بالاڤ کرن گۆناهە، چونکی تەپە تەپ و رەقە رەق، زەرەێ د گەهینتە ژ مە چێترا ـ ژ مە بۆشتران ـ پاشی نەکو مرۆڤ ژی بێتە هنگاڤتن.. ١ ـ ١٥) یان (ل ناڤ بەینا عەیشا و مەغرەب ـ بانگاڤە ـ دڤێت مرۆڤ ژ خانی دەرنەکەڤیت، هەکە دێ ئەجنە مرۆڤی هنگێڤن..١ ـ ١٥).

## پشکا یازدێ: شەیتان.

(دەمێ دەنگ ژ ئاگری دێت، دبێژن: ئەڤە هندەکێ بەحسێ مە دکەن، لەوما دەنگێ ژ ئاگری دێت.. هندەك دی د بێژن ئەڤە شەیتانە پف دکەتە ئاگرێ مە.. ١ ـ ٤٠) یان (فیتك ڤەدان ل نك کوردا تشتەکێ کەشەفرێتە، چونکی دبێژن: کەیفا شەیتانی ب فیتکا دێت.. هندەك دی د بێژن، ب فیتکا شەیتان ئامادە د بیت.. ١ ـ ٤٥) یان (هەکە ئێك ل هنداڤ بانەکی، یان ل هنداڤ کەندەکێ راوەستا، دێ بێنێ وەرە هێڤە هەکە دێ شەیتان پالەکێ ب تە رانیت.. ١ ـ ٤٦) یان (هەکە ژنکێ نانێ خۆ خلاص کر ژ پاتنێ، بتنێ یا دووماهیێ ما، دەمێ دهاڤێتە سەر سێلێ دێ سێ جار تیرۆکا خۆ ل نانێ دەت و سێ کونا تێ کەت، داکو چاڤێ شەیتانی کورەبیت.. ١ ـ ٤٧) یان (دەمێ هندەك ژ موسلمانا نڤێژێ دکەن، لێڤا ئەوێ جل نڤێژکا ئەو نڤێژێ ل سەر دکەن وەردپێچن ئانکو ڤەدچەمینن داکو شەیتان نڤێژێ ل سەر نەکەت.. ٢ ـ ١٢١) یان (هەکەر مرۆڤ ژ بەر خەوا ب رێڤە چوو، بیێ کۆ مرۆڤ ب خوە ب حەسیێت، ئەو هینگێ شەیتان مرۆڤی دبەت، دا کۆ مرۆڤی تۆشی بەلایەکێ بکەت..٢ ـ ١٢٠).

### پشکا دوانزدێ: ئەندامێت لەشی.

(دبێژن: هەکەر چاڤێ مرۆڤی یێ چەپێ بلڤیت ئەو نیشانا هندێ یە کۆ دێ بەلایەك، ئانکو کارەساتەك ئێتە رێکا مرۆڤی..٢ ـ ١٢٥) یان (هەکە دخەودا، ددانەکێ مرۆڤی کەت، ئەڤە دێ کارەکێ نە باش هێتە سەرێ مرۆڤی..١ ـ ١٤) یان (هەکە سەرێ دفنا مرۆڤی بخۆریێت، دێ مێهڤانەك بۆ مرۆڤی هێت.. ١ ـ ١٨) یان (دەمێ تامیزك د بەر دفنا مرۆڤی را و سەر لێڤێت مرۆڤی را دێن، دبێژن دیارە شڤێدی تۆ یێ ترسیایی، ئانکو ئەگەرا تامیزکێ ترسە.. ١ ـ ٢٣) یان (ل هندەك دەڤەرا دبێژن چاڤێ مرۆڤی بلڤیت ئەو نیشانا هندێ یە دێ مرۆڤ خەبەرەکی ببهیست.. ٢ ـ ١٢٥) یان (هەکەر دەستێ مرۆڤی یێ راستێ خوریا ئەو دێ پارە کەڤن د دەستێ مرۆڤی دا.. بەلێ هەکەر دەستێ مرۆڤی یێ چەپێ ب خوریت ئەو دێ پارێن مرۆڤی چن.. ٢ ـ ١٢٥) یان (هەکەر سەرێ بچویکی مەزن بیت ئەو بچویکە ل پاشەرۆژێ دێ دەولەمەند بیت.. ٢ ـ ١٢٦) یان (هەکەر پێن بچویکی د مەزن بن، ئەو ل پاشەرۆژێ ئەو بچویکە دێ بیتە مرۆڤەکێ نەکبەت و بێ ئیفلەح.. ٢ ـ ١٢٧) یان (هەژمارا چالکێن دنیڤا سەرێ مرۆڤی دا چەند بن، ئەو دێ مرۆڤ هندە ژنا ئینیت.. بۆ نموونە هەکەر دوو چالك بن ل نیڤا سەرێ مرۆڤی را بن دبێژن دێ مرۆڤ دو ژنا ئینیت، و هەکەر سێ بن سێ یا.. هتد.. ٢ ـ ١٢٥) یان (هەچیا سەر و چاڤێت سپی بیت و لەش رەش، دێ بێژن: ئەڤە یا ب بەختە.. ١ ـ ٣٥).

### پشکا سێزدێ: بیر و باوەرێن هەمەرەنگ.

(دبێژن: چەند مرۆڤەك ل سەر دنیایێ دمریت ئێك ژ دایك دبیت.. ژبەر هندێ ئەڤ دنیایە هەتا نوکە یا مای.. ٢ ـ ١٣١) یان (نابیت مرۆڤ ناڤێ مرۆڤەکێ خۆ یێ ساخ دانیت سەر بچویکێ خۆ یێ ژ نوی بووی، چونکە ب ئەڤێ چەندێ دێ ئەو مرۆڤێ ساخ، دێ ژی کورت بیت و زوی مریت.. ٢ ـ ١٣٢) یان (هەکەر مرۆڤی بۆ خۆ خانییەك ئانکو ئاڤاهییەك ئاڤاکر، دڤێت چویچکەکێ یان هەر تشتەکێ ب رۆح ڤەکوژیت و خوینا وی ل سەرێ دەرێ ئەوی ئاڤاهی بدەت داکو کەس چاڤا لێ نەدەت.. ٢ ـ ١٣٢) یان (هەکە ئێکی بۆ خۆ خانیەك ئاڤاکر، دەمێ خانیێ وی دروست بوو، دێ تەپکەکا هەرێ ب هنداڤ دەرگەهی ڤەنیت، دا خانیێ وی چاڤین نەبیت.. هندەك دی شاخێت بزنا، یان کیڤیا ل هنداڤ دەرگەهێ خۆ د چقلینن.. ١ ـ ٣١) یان (هەکەر دەنگێ ئێکی خوەش بیت و سترانا و لاڤژا پێ بێژیت ناچێبیت مرۆڤ گوهێ خوە بدەتێ چونکە حەرامە.. ٢ ـ ١٣٤.. ل دوور ڤێ باوەریێ: بابێ من، مامەك هەبوو ب ناڤی (صدیق) کو ئێك ژ ناڤدارترین سترانبێژێن دەڤەرا بەرواریا بوو، جارەکێ ل لایێ باکۆرێ گۆندی ل بەر پەزی بوو، و ڤێر کربوو سترانا، شێخێ مایێ ژێ ژ گۆندێ (مایێ) دهاتە گۆندێ (شێلازا)، ل چیایێ (گابنێرکی(*)) گۆل دەنگێ مامێ (سەدیق) بوو، کۆ ب وی دەنگێ خۆش ڤێرکریە سترانان، پشتی هاتیە گۆندی و زانی کا کی بوو ستران دگۆتن، ئینا گۆتێ دەنگێ تە یێ حەرامە تۆ سترانا پێ بێژی! پشتی هینگێ ستران هێلان، من بخۆ ل سالا (١٩٩٠) گەلەك بزاڤ کر هندەك سترانا بۆ من بێژیت و ئەز توومار بکەم، لێ نەگۆتن، ژ بەر کارتێکرنا گۆتنا شێخی!!) یان (هەکە مێری ل مالەکێ مشە بوون، ئانکو مێریا بەردا مالا وان، دێ بێژن: ئەڤ مالە دێ هێتە بارکرن.. ١ ـ ٣٠) یان (هەچیێ د خەودا بینیت، کو یێ نڤێژا دکەت، ئەو نڤێژێت ل سەر.. ١ ـ ٣٤) یان (هەکە ئێك ترسیا، ب تایبەتی هەکە بچویك بیت، دێ هندەك ئاڤێ دەنێ، داکو چی لێ نەهێت و ژ ترسێ رزگاربیت.. ١ ـ ٣٦) یان (هەچی جحێلێ بەنیشتی بجویت، دێ پاشی سمبێلێت وی خوار بن.. ١ ـ ٤٦) یان (ب بیر و هزرێت کوردا دەجال هندێ درێژە، هەکە هێکەکێ دانە سەر سەرێ وی دێ ب ئاسمانی کەڤیت.. ١ ـ ٤٦).

## ٢ـ باوەریێن ئایینی.

مە ل دەستپێکا ڤی بابەتی ب درێژی ل سەر باوەریێن ئایینی و باوەریێن ب ناڤێ ئایینی هاتین لێ د بنەرەت دا نە ئایینی نە بەحسکریە، لەوما ل ڤێرە

دێ هەر جۆرەكی ژ وان چەند نموونان بۆ ئینین، ب بەلگە، داكو بزانین هەر گۆتنەكا ب ناڤێ ئایینی هاتی نە مەرجە یا ئایینی بیت.

## أ - باوەریێن ئایینی:

*(ب هزرو بیرێت كوردا ـ ژمە چێتر ـ هەنە و ل جهێت تاری و كویر دژین، وەكو شكەفتا و نهالا.. لەوما د ڤێت مرۆڤ خو ژ ڤان جها ب پارێزیت.. ژیانا ژ مە چێتران گەلەك نێزیكی ژیانا مرۆڤانە.. ١ ـ ٨) .. (قوتادە ژ زارێ عەبدوللایێ كوڕێ سەرجسی دبێژیت: (پێغەمبەری (س) ئەم داینە پاش، ژ میزتنا د قوركادا، ئینا گۆتە قوتادەی، بۆچی چێنابیت بمیزنە د قوركادا؟ گۆت: ئەو مالێن ئەجنانە)[٣٤]. (ژ ریوایەتا ئەحمەد و نەسائی و ئەبوو داوود و حاكم و بەیهەقی).

*(مەیمونك ل جەم كوردان مرۆڤ بوو، بەلێ دەمێ قوینا كوڕێ خۆ ب گەنمی پاقژكری، خودێ خفس لێ كرو كرە مەیمون..١ ـ ١١).. د قورئانا پیرۆزدا، هاتیە: [ولقد علمتم الذين أعتدوا منكم في السبت فقلنا لهم كونوا قردة خاسئين][٣٥]. ئانكو (بێ گۆمان هوین دزانن كا مە چ ب سەرێ وان ئینا ـ ئەوێت داینە سەر بریارا خودێ ـ و رۆژا شەمبی یێ دەست درێژی كرین، مە گۆتە وان ببنە مەیمونكێت رسوا و رەزیل)[٣٦].. (هەر چەندە د قورئانێ دا ئاماژە ب خفسكرنا هندەك مرۆڤا بۆ مەیمونكا كر، لێ نە ژ پاقژكرنا قوینا كوڕێ وی ب گەنمی بوویە!!).. هەر وەسا ل جهەك دی دا هاتیە: [قل هل أنبئكم بشر من ذلك مثوبة عند الله من لعنه الله وغضب عليه وجعل منهم القردة والخنازير..[٣٧]) ئانكو (هەی موحەممەد) بێژە وان: ئەرێ ئەز بۆ هەوە بێژم كا كی ل دەڤ خودێ عەیبدارتر و ئیزاترە؟! ئەوە یێ خودێ لەعنەت لێ كری، و ژ دلۆڤانی یا خۆ دویر ئێخستی، و خودێ ـ ژبەر گۆنەهێت وی ـ لێ كەربگرتی بوویی، و هندەك ژ وان كرینە مەیمونك و بەراز و .. )[٣٨].

* (ب هزر و بیرێت كوردان ـ ژمە چێتران ـ ئۆل هەنە، هندەك موسلمانن، ترس ژ ڤان نینە، چونكی دباشن و ئاشتی خوازن، هندەك فەلە و ئێزدی و جوینە، دڤیا مرۆڤ خۆ ژ ڤان بپارێزیت و ژێ بترسیت، چونكی خرابیێ د گەهیننە مرۆڤان. ١ ـ ٨).. د قورئانا پیرۆز دا هاتیە: [يا معشر الجن والأنس ألم يأتكم رسل منكم يقصون عليكم آياتي وينذرونكم لقاء يومكم هذا..[٣٩]). ئانكو (گەلی ئەجنە و مرۆڤان ئەرێ ما پێغەمبەر ژ هەوە ب خۆ بۆ هەوە نە هاتن، نیشان و ئایەتێت من بۆ هەوە بێژن، و هەوە ژ ڤێ رۆژێ بترسینن؟)[٤٠].

هەروەسان، هاتیە: [قال أدخلوا في أمم قد خلت من قبلكم من الجن والانس في النار..[٤١]). ئانكو (و خودێ ئەڤە) گۆت (وان)، هوین دگەل مللەتێت بەری هەوە بۆرین ژ ئەجنەو مرۆڤان هەرنە دناڤ ئاگریدا.. )[٤٢].

*(دەمێ زاڤا بچیتە بن پەریێ، دڤێت بویك پێشڤە رابیت و زاڤا دەستێ خۆ دانتە سەر سەرێ وێ، داكو سەهما وی بچیتە د سەرێ وێ را.. ١ ـ ١١).. پێغەمبەر (س) دبێژیت: (ئەگەر ئێكی ژ هەوە ژنەك ئینا، یان ژێ خدامەك ـ جاریەك ـ ك كری بلا دەستێ خۆ دانتە سەر پور ـ ناڤچاڤك ـ ا وێ، و ناڤێ خودێ بینیت، و دوعا بەرەكەتێ بكەت، و بێژیت: خودێ وو ئەز پسیارا باشی و باشیا چێكرن و طەبعێ وێ ژ تە دكەم، و ئەز خۆ ب تە ژ نەباشی و نەباشیا چێكرن و تەبعێ وێ د پارێزم، و هەكەر ئێكی ژ هەوە حێشترەك ژێ كری بلا دەستێ خۆ دانتە سەر زینیا پشتا وێ هەر وەبێژیت )[٤٣].. (ژ ریوایەتا بوخاری و ئەبوداوود و ئبن ماجەی و بەیهەقی و حاكمی).

*(هەر دیسان دەمێ ئەڤ دیاردە ل عەسمانا روی ددەت ئانكو وەكو پەلوخێن ئاگری دیار دبن، دبێژن ئەو هینگێ شەرێ كافر و موسلمانایە و موسلمان ـ یان سەحابە ـ ئەوان بزۆتا د كافرا ـ یان شەیتانی وەردكەن ـ .. ٢ـ ٣٠، ١ ـ ٣٦).. د قورئانا پیرۆز دا هاتیە: [ولقد زينا السماء الدنيا بمصابيح وجعلناها رجوما للشياطين وأعتدنا لهم عذاب السعير[٤٤] ]. ئانكو (ئەڤە مە ئەسمانێ دونیایێ یێ ب ستێران خەملاندی، و مە ئەو ستێرێت كرینە تیوەر بۆ رەجماندنا شەیتانان، و مە بۆ وان ئیزا و نەخوشی یا

دۆزەها شاریایی یا بەرهەڤكری)[٤٥].

*(دبێژن نە دورستە مرۆڤ ب شەڤێ پیڤازێ بخۆت، چونكە دێ فریشتە ـ ملائكە ـ خۆ ژ مرۆڤی دویر د ئێخن.. ٢ ـ١٤ ، ١ ـ ٢١).. ژ جابری (خ) گۆت: پێغەمبەری (س) یێ گۆتی: ((هەر كەسێ سویر یان پیڤاز خار بلا ژ مە دویركەڤیت، یان بلا ژ مزگەفتا مە دویركەڤیت). (د متەفقن ل سەر) یان وەكی د ریوایەتا موسلمی دا هاتی: (هەر كەسێ پیڤاز و سویر و قوراد خارن بلا نێزیكی مزگەفتا مە نەبیت، ب راستی ملیاكەت ژ وی تشتێ نە خۆشدبن یێ مرۆڤ پێ نەخۆشدبن)[٤٦] .

*(هەكە مرۆڤ خوارنێ و ڤەخوارنێ ژ پێرڤە ڤەخۆت گۆنەهە، دڤێت روینیت و بخۆت و ڤەخۆت.. ١ ـ ١٤).. هەر چەندە چەند فەرموودە هەنە وێ چەندێ دسەلمینن پێغەمبەری (س) ئاڤا ڤەخواری و ئەو ژ پێرڤە بوو، وەكی: (ئیبن عەبباسی (خ) گۆت: من ئاڤا زمزمێ دا پێغەمبەرێ خودێ (س) ڤەخوار و ئەو یێ ژپیاڤە بوو)[٤٧].. یان و ژ نەززالێ كورێ سەبرە (خ) گۆت: عەلیێ كورێ ئەبی تالبی (خ) د دەرگەهێ رەحبەرا هات ـ مەخسەد پێ دەرگەهێ كوفەیە ـ و ژپیاڤە ئاڤ ڤەخوار، و گۆت: ب راستی من پێغەمبەرێ خودێ (س) دیت وەكر هەر وەكی هەوە ئەز دیتیم من كری[٤٨]. (ژ ریوایەتا بوخاری).

بەلێ د هندەك فەرموودێن دی دا هاتییە، كو نابیت موسلمان ژ پێرڤە ب خۆن و ڤەخۆن، ژ وان: (و ژ ئەنەسی (خ) گۆت: پێغەمبەری (س) نەهی یا كری زەلام ژپیاڤە ئاڤێ ڤەخۆت، قەتادەی گۆت: مە گۆتە ئەنەسی، یا خارن؟ گۆت: ئەو خرابترە یان پیسترە)[٤٩]. (ژ ریوایەتا موسلمی).. (ژ ئەبی هورەیرە (خ) گۆت: پێغەمبەری (س) گۆت: كەس ژ هەوە ژپیاڤە نە ڤەخۆت، و هەكە ژبیركر بلا دلێ خۆ راكەت)[٥٠]. (ژ ریوایەتا موسلمی).

ل دووڤ ڤان فەرموودێن بوری دیاربوو كو باوەریەكا ئایینی یە، لێ چاوان دورسترە ـ ژ پێرڤە یان روینشتی؟ـ ئەو دمینیتە ل سەر رەئیا فقە زان و توێژەندەرێن فەرموودان، هەر چاوا بیت ئەڤە باوەرییەكا ئایینی یە.

*(دەمێ دەجال دهێت، دێ ل هەمی جیهانێ گەریێت، بتنێ نەشێت بچیتە شامێ، لەوما خەلك هەمی بەرێ خو دەنە شامێ، داكو ژ بەر دەجالی رزگاربن. گۆتنەكا مەزنا دبێژیت: (توبایێ یی عامێ هەرنە شامێ.. ١ ـ ٢١). (ئەنەس (خ) ژ زارێ پێغەمبەری (س) ڤەدگوهێزیت: گۆت: دەمێ دەجال دئێت نیینە بازێرەك ئیلا دەجال دێ چیتێ، بەس مەكەهـ و مەدینە تێ نەبن، ل بەر هەر دەرگایەكێ وان فریشتە یێن تێدا د راوەستاینە و زێرەڤانن، دێ شەیتان ل مەسبەحێ هێتە خوارێ، دێ مەدینە سێ جارا لەرزیت، هەمی گاور و دوو روی ـ منافق ـ دێ چنە وێرێ )[٥١]. ( ژ ریوایەتا بوخاری).

*هەچیێ ب مەزنی ل سەر عەردی را بچیت، دەمێ بمریت عەرد دێ وی دناڤ خودا شدینیت.. ١ ـ٣٢).. د قورئانا پیرۆزدا هاتیە: [ولاتصعر خدك للناس ولا تمش في الارض مرحا أن الله لايحب كل مختال فخور[٥٢]).. ئانكو ((كورێ من) ژ مەزناتی روی یێ خۆ ژ خەلكی وەرنەگێرە، و قەبە و دفن بلند ب رێڤە نەچە ب راستی خودێ حەژ وان ناكەت ئەوێت قەبە و دفن بلند زێدە ب خۆ شاهی[٥٣]).. هەر دیسان خودێ دفەرمووت: (ولا تمش في الأرض مرحا انك لن تخرق الأرض ولن تبلغ الجبال طولا..[٥٤]) ..ئانكو (ب شاهی و مەزناتی ل سەر ئەردی ب رێڤە نەچە، ب راستی تۆ چوونا خۆ نەشێی ئەردی كون بكەی و بكەلێشی، و تۆ ب درێژیێ ژی ناگەهی یە چیایان )[٥٥].. (ژ زارێ ئەبی هورەیرە(خ) دبێژیت: پێغەمبەری (س) گۆت: خودێ ب جەلالەتا خۆڤە دبێژیت: عەزیزیا نەفسێ كارێ ـ جلكێ ـ منە، و مەزناتی راپێچا منە، ئەوێ ململانێ ب ئێكێ ژ ڤان دگەل مندا بكەت، دێ وی سزادەم... (موسلمی د سوننەتا خودا ئینایە). و د ریوایەتا ئەبی داوودی و ئیبن ماجەی دا هاتیە: (ئەوێ ب ئێكێ ژ ڤان ململانێ دگەل من بكەت، دێ وی هاڤێمە د ئاگری دا )[٥٦].

*(هەكە مرۆڤ بچیتە سەر گۆڕێ ئێكی و نەكەتە گری، دێ مری، مرۆڤی بینیت، هەكە مرۆڤی كرە گری، دلێ وی ژی دێ مینیت و ئەو ژی دێ كەتە

گری و چاڤ دێ لێ تژی رۆندك بن و نه شێت مرۆڤی ببینیت، لەو دڤێت مرۆڤ نەکەتە گری، داکو مرێ مرۆڤی، مرۆڤی ببینیت.. ١ ـ ٣٢).. (ئەبی مووسایێ ئەشعەری دبێژیت: دەمێ عومەر بریندار بوی، صوهەیبی دگۆت، وای برایێ من! ئینا عومەری گۆتێ: ما تە گۆلێ نەبوویە پێغەمبەری (س) یا گۆتی: (مری د هێتە سزادان ژ بەر گری یێ ساخان[٥٧] ). (ریوایەتا بوخاری).. یان (ژ موغەیرێ کورێ شوعبەی (خ)گۆت: من گۆل پێغەمبەری خودێ بوو(س) دگۆت: هەر کەسێ پێ هاتیە گۆتن، ب راستی رۆژا قیامەتێ ب وێ گۆتنا ل سەر هاتیەکرن د هێتە ئیزادان)[٥٨] . (د متەفقن ل سەر).

*هەکە ئێك خانیەکی، یان دیوارا، ل سەر گۆرێ مریەکێ خۆ ئاڤاکەت، دێ رۆژکا قیامەتێ هەمی بنە بار و کەڤنە سەر ملا، ڤێجا نەشێت رابیتە ڤە و ببەهەشتیا را ناگەهیت..١ ـ ٣٣).. (جابری (خ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (س) نەهیا کری: گۆڕ بێنە گێجکرن و ل سەر روینە خوار و ل سەر بێتە ئاڤاکرن[٥٩] ). (ژ ریوایەتا موسلمی).

*(رۆژێت پێنج شەمبی، چاڤێ مرێ مرۆڤی یێ ل دەرگەهی، هەکە خێرەك ژێ دەرکەت، دێ کەیفا وی هێت، هەکە چ نەدەرکەت، دێ عاجزبیت.. ١ـ٣٣ و ٦٥).. (ژ ئەبی هورەیرە (خ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (س) گۆت: کار و کریار رۆژا دووشەمبی و پێنج شەمبی ـ ژ لایێ ملیاکەتێت زێرەڤانڤە ـ بۆ خودێ دهێنە گۆتن ـ و خودێ چێتر دزانیت ـ و ئەز حەز دکەم کارێ من بێتە گۆتن و ئەز یێ ب رۆژی[٦٠] ). (ژ ریوایەتا ترمزی، و موسلم ژی ریوایەت دکەت بێ پەیڤا رۆژێی بینیت).

* (هەچێی گەلەك گۆنەهـ کرین، دێ رۆژا قیامەتێ دناڤ خۆها خۆدا خەندقیت، هەکە کێم گۆنەه کر بن، دێ هەتا ناڤ تەنگێ د خۆها خۆرا مینیت، و هۆسا، چەند کێمتر بن دێ خۆه کێمتر بیت.. ١ ـ ٣٣).. دقورئانا پیرۆزدا هاتیە: [لا ظلیل ولا یغنی من اللهب*انها ترمی بشرر کالقصر..[٦١] ) ئانکو (دێ هەرنە بەر سیبەرا دویکێلا سێ چەق... ئەو سیبەرا نە هەر وە ژ گەرمێ دپارێزیت، و نە ژ گۆری یا ئاگرێ دۆژەهێ[٦٢] ).. ( پێغەمبەری (س) گۆت: دێ رۆژ نێزیکی مرۆڤان بیت رۆژا قیامەتێ هندی میلەکی، دێ هەر کەسەك هندی کریارێن خو چیتە د خۆهێ را، هندەك هەتا گوزەکان، و هندەك ژی هەتا چوکان، و هندەك ژی هەتا ناڤکێ، و هندەك ژی هەتا دەڤی). (ریوایەتا موسلمی).

*(چەند بچویکێت مرۆڤی بمرن، هند دەرگەهێت بەهەشتێ بۆ مرۆڤی ڤەدبن.. ١ـ٣٧).. (ژ ئەبی هورەیرە (خ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (س) گۆت: نینە موسلمانەکێ سێ ژ زارۆکێت وی بمرن، و ئاگر وی بگریت بۆ سویندێ نەبیت. و جهێنانا سویندێ مەخسەد پێ گۆتنا خودێ یە: [وان منکم الا واردها] ئانکو: (و کەس ژ هەوە نینە د سەرڕا ـ د سەر دۆژەهێرا ـ نەچیت.[٦٣] ). (دمتەفقن ل سەر).. هەر ئەڤ فەرموودە ژ ئەنەسی (خ) هاتیە ڤەگوهاستن، پێغەمبەر (س) دبێژیت: (نینە موسلمانەکێ سێ زارۆیێن وێ یێن نەبالغ بمرن، ئیلا خودێ دێ بەتە بەحەشتێ ژ بەر دلۆڤانیا وی ب وی و وان زارۆیان[٦٤] ). (ریوایەتا موسلم و بوخاری).

*ژنك یا ژ پەراسیا چەپا ئادەمی چێ بووی، ژ بەر هندێ هەمی گاڤا ل بەرگرن، ئینا مرن دا ئینسانی.. ١ ـ ٤٩).. خودێ د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت: (یاأیها الناس أتقوا ربکم الذی خلقکم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا کثیرا ونساء[٦٥] ). ئانکو: (خەلکینۆ پارێزگاری یا خودایێ خۆ بکەن ـ باوەری پێ پێ بینن و بپەرێسن ـ ئەوێ هوین ژ ئێك گیانی ب تنێ ئافراندین ـ و ئەوی خودایی ژ وی گیانی ـ هەڤسەرا وی ژێ چێکری (ئافراندی و ژ ڤان هەردۆکان گەلەك ژن و مێر دان و بەلاڤ کرن)[٦٦] ).. (ژ ئەبی هورەیرە (خ) گۆت: پێغەمبەرێ خودێ (س) گۆت: خێر و شیرەتان و باشیێ ژ خۆ بۆ ژنان بخوازن ـ ئانکو نەفسا خۆ ل سەر هندێ راکەن باشیێ و خێرێ بگەهیننە ژنێ ـ ب راستی ژن یا ژ پەراسیێ چێبووی و دەرکەفتی (ئەڤە ئیشارەتە بۆ چێبوونا حەوایێ ژ پەراسیا ئادەمی (س) و ب راستی جهێ خوارتر ژ پەراسی سەرێ وێیە ئانکو ئەزمانێ وییە)، (ئەڤە مەتەلەکا چاوا جهێ ژ هەمیا

خوارتر ژ پەراسی یێ سەرێ وی یە هوسا جهێ ژ هەمییان پتر دبیت ئەزیەت ژ ژنێ بێت سەرێ وێ یە ئانكو ئەزمانێ وێ یە) هەكە تو چوی راستكەی دێ شكێنی، ـ چونكی پەراسی د بنەتارێ خودا یا خوارە و راست نابیت، هوسا هەكە تە ڤیا خواریا ئەزمانێ ژنێ راستكەی دێ گەهیتە بەردانێ ـ و هەكە تو بهێلی دێ هەر مینیت خوار ڤێجا خێرێ و شیرەتان و باشیێ ژ خو بو ژنان بخوازن ـ ئانكو نەفسا خو ل سەر هندێ راكەن باشیێ و خێرێ بگەهیننە ژنێ[٦٧] ـ ). (د متەفقن ل سەر).

*(ژ هزرێن دناڤ مللەتێ كورد دا بەربەلاڤ، دبێژن ئەو مروڤێ وێنێ گیاندارەكی چێكەت ـ رسم بكەت ـ بو وی گەلەك گونەهە چونكە روژا قیامەتێ دێ ئەو ئێنە داخوازكرن ئەو روحێ بدەت ژبەر ئەوی وێنێ وی چێكری، ژ بەر هندێ نە بتنێ چێكرنا وێنێن گیاندارا بەلكو هەتا هەلاویستنا وێنەی ژی ب دیوارێ خانی ڤە دگوتن گونەهە وێنە ب دیوارا ڤە نەدهاتە هەلاویستن.. ٢ ـ ٩٨).. (ژ ئیبن عومەری (خ)، گوت: پێغەمبەرێ خودێ (س) گوت: ب راستی ئەوێت ڤان پەیكەران چێ دكەن روژا قیامەتێ دێ بێژنە وان، وان ساخكەن ئەوێت هەوە چێكرین[٦٨]). (ریوایەتا موسلم و بوخاری).. هەر چەندە ئەڤ بابەتە دناڤ زانایان دا بابەتەكێ ئیختیلافی یە، كا مەرەم ب وان فەرموودێن ل سەر وێنەكرنێ هاتین، وێنێن ـ مجسم ـ ن یان هەر وێنەكێ بیت، لەوما تەنێ دێ بێژن ئەڤ باوەریە ژی ژ ئایینێ ئسلامێ هاتیە وەرگرتن.

*(دبێژن، دوزەخ ـ جەهنەم ـ سالێ دوو جارا بێهنا خو هلدكێشیت، جارەكێ هەلما وێ گەرمە هێنكێ ل سەر عەردی دبیتە هاڤین و جارەكێ هلما وێ سارە، دبیتە زڤستان.. ٢ ـ ١٠٠).. (ئەبو هورەیرە (خ) دبێژیت: پێغەمبەری (س)، گوت: ئاگری گازندا خو برە نك خودێ، گوتێ: خودایێ من، هندەكا هندەكێ ژ من دخوت، ئینا خودێ روخسەت دایێ ب دوو بێهنا، بێهنەك د زڤستانێ دا، و بێهنەك د هاڤینێ دا، ئەو گەرما دژوارا هوین دبینن ئەوە، و ئەو سەرما دژوار ژی ئەوە )[٦٩]. (ریوایەتا بوخاری).

*(دبێژن، شەیتان خوە د گوهریت بو سەر رەنگێ هەر مروڤەكێ وی بڤێت و مروڤ نەشێت هەردوا ژێك جودا بكەت، بو ڤێ چەندێ سەرهاتیەك هەیە دبێژیت:....٢ ـ ١٢٢).. (ئەبی هوەریرە (خ) دبێژیت: من گولێ بوو پێغەمبەری (س)، گوت: (ئەوێ من د خەوێ دا ببینیت، دێ من ب هشیاری ـ ئانكو روژا قیامەتێ ـ ژی بینیت، شەیتان نەشێت خو بینیتە سەر ررەنگێ من). (ژ ریوایەتا بوخاری).. (هەروەسان ئەبی سەعیدێ خودری (خ) دبێژیت: من گولێ بوو پێغەمبەری (س) گوت: ئەوێ ئەز د خەونێ دا دیتم ئەوی دیتنا من دورست دیت، شەیتان نەشێت خو بینیتە سەر رەنگێ من[٧٠]). (ژ ریوایەتا بوخاری).

* (دەمێ بو ئێكەمین جار پویرتێ سەرێ بچویكی ژێڤە دكەن، ئەوی پویرتی نا هاڤێژن ئاخێ بەلكو رادكەن و ل بەر پارا دكێشن ب تەرازی یەكێ بو ڤێ مەبەستێ دئینن، و ئەوی پارەی ژی ل سەر بچویكا بەلاڤەدكەن ب خێرا سەرێ ئەوی بچویكی، ئانكو دا كو ل پاشەروژێ سەرێ وی بچویكی ژی ببیت سەرێ خێرێ و بەرەكەت بكەڤیت.. ٢ ـ ١٢٧/ ١٢٨).. ئەڤ باوەریە ژی یا ئایینی یە (عبدالستار كاظم) ژی ڤی د بواری دا دبێژیت: (عەدەت بوو ب تایبەت دناڤ گەلەك ژ موسلمانێن دیندار دا، كو د حەفتی یا ئێكێ دا ژ بوونا بچویكی سەرێ وی بتراشن، و دا وی ل بەر پارا یان زێری كێشن و دا دەنە هەژاران[٧١]).. (هەر وەسا ژ ئیمام مالكی هاتیە ریوایەتكرن، كو فاتیما - كچا پێغەمبەری - موی یێ سەرێ حەسەن و حوسەینا و دەیكا كەلثومێ، ل بەر زیڤی كێشایە و ئەو زیڤ كریە خێر.. و ژ كورێ ئیسحاقی هاتیە گوتن، پێغەمبەری (س) گوتە فاتیمایێ، دەمێ خودێ حەسەن دایێ: یا فاتیما سەرێ وی بتراشە و هندی گرانیا وی موی، زیڤی بكە خێر، وێ ئەو موی ل بەر زیڤی كێشا، سەنگا وی بوو دەرهەمەكێ زیڤی یان كێمتر ژ دەرهەمەكی)[٧٢].

*(كورد دبێژن، دارەك یا ل بەهەشتێ هەی چەند مروڤەك دمریت بەلگەك ژێ دوەریت و چەند ئێك ژ دایك دبیت بەلگەك پێڤەتێت.. ٢ ـ ١٣١).. (هاتیە

گۆتن ژ کەعبێ ئەحباری، کو خودێ دارەك ل بن عەرشێ خۆ دایە، هندی ژمارا مرۆڤان بەلگ پێڤە هەنە، دەمێ عەجەلێ ئێکێ تمام بوو، ژ ژینا وی بەس چل رۆژ مان بەلگێ وی دێ ژ دارێ وەربیێت، چیتە نك عزرائیلی، دێ ئەو زانیت کۆ فەرمانا هەلکێشانا روحا وی هات[٧٣].. ئەڤ گۆتنە مە ل دووڤ ژێدەرێن ئاماژە پێکری وەرگرتن، بێ یی بزانین کا ژ کێ هاتینە ریوایەتکرن، بەلام هەر چاوابیت خویادبیت کو باوەریەکا ئایینی یە، جا چ یا دورست بیت یان نە یا دورست بیت.

*(دبێژن، ل دووماهیکا دنیایێ ـ جیهانێ ـ چیایەك بلند یێ هەی دبێژنێ ـ چیایێ قاف ـ و ل پشت ڤی چیای دوو گیاندار یێن هەین نێزیکی مەیمینکانن ب رەنگێ ڤە، دبێژنێ عەجیجك و مەجیجك، و هەر گاڤا ئەو ژ پشت وی چیایی هاتن دێ رویبار و کانی هشك بن و ئەو هەمیێ ڤەخۆن و خوارن و ڤەخوارن نامینن. بەلێ هەتا ڤێ گاڤێ ئەوان نەشیایە دیوارێ ـ کەڤری ـ ئەوی چیایی کون بکەن و تێرا بێن، هەر شەڤ ئەو ئەزمانێ خۆ د کەڤری دهوسین هەتا کۆ هندی پەرەك سیرێ تەنك دبیت و خەو چاڤێن وان دگریت و دبێژن ئەم دێ نڤین و ئەڤ چەندا مایی بلا بۆ سوبەهی بیت، سوبەهی ژ خەو رادبن دبینن جارەکا دی ئەڤ دیوارە یێ وەکو خۆ لێ هاتی جارەکا دی ڤە سەر ژنوی دکەڤن بەر و ئەزمانێ خۆ تێ د هوسین.. ٢ ـ ١٣٥).. د قورئانا پیرۆز دا هاتیە: [وحتى اذا بلغ السدين وجد من دونهما قوما لايكادون يفقهون* قالوا يا ذا القرنين ان يأجوج ومأجوج مفسدون في الأرض فهل نجعل لك خرجا على أن تجعل بيننا وبينهم سدا* قال ما مكني فيه ربي خير فأعينوني بقوة أجعل بينكم وبينهم ردما* أءتوني زبر الحديد حتى اذا ساوى بين الصدفين قال أنفخوا حتى اذا جعله نارا قال أءتوني أفرغ عليه قطرا* فما أسطاعوا أن يظهروه وما أستطاعوا له نقبا][٧٤]. ئانکو (هەتا گەهەشتیە دنیڤەکا دوو چیاندا، ل وێرێ ملەتەك دیت چو زمان نەدزانین ـ یێ وان ب خۆ نەبایە ـ ئەوان گۆت: هەی زیلقەرنەین یەئجووج و مەئجووج خرابی یێ د ئەردێ مەدا د کەن، ئەگەر ئەم پشکەکێ ژ مالێ خۆ بۆ تە بدانین، تو دێ دناڤبەرا مەو واندا ناڤبرەکێ چێکەی؟.(زیلقەرنەین) گۆت: ئەو مال و ملك و شیانا خودایی دایە من، ژ وێ پشکا هوین ژ مالێ خۆ بۆ من دئێخن چێترە، ڤێجا ب هێزێ ـ ب زەلامان و ئالاڤان ـ هاری من بکەن، دا دناڤبەرا هەوە و واندا ناڤبرِ و سکرەکێ موکوم چێکەم. قەتێت ئاسنی بۆ من بینن ـ ڤێجا ئەو قەت دنیڤەکا هەر دوو رەخاندا دانانە سەرێك ـ هەتا هەر دوو رەخ گەهاندینە ئێك ـ پاشی (زیلقەرنەین) گۆتە (وان): ب کویرهان پڤکەنێ و ئاگرێ خۆ بکەن ـ وان ژی ئاگر خۆشکر هەتا ئاسن سۆر بووی ـ و بوویی یە ئاگر (زیلقەرنەینی) گۆت: سفر یێ حەلیایی بۆ من بینن دا دارێژمە سەر.. ـ ڤێجار ناڤبرِ سکرەکێ زێدە موکوم و قاهیم د ناڤبەرا واندا چێکر ـ وان نەشیا د سەررا بهێن ـ هندی یێ بلند بوو ـ، و نەشیان کون بکەن ژی ـ هندی یێ قاهیم بوو ـ)[٧٥] .. (ژ زارێ ئەبی هورەیرە (خ) گۆت: پێغەمبەری (س) گۆت: دێ سکرێ رۆمێ ڤەبیت، ئەو سکرێ یەئجووج و مەئجویجایە، کونەکا بچویك تێڤە دبیت)[٧٦] . (ژ ریوایەتا بوخاری).

## ب ـ باوەرییێن نە ئایینی:

رەنگە گەلەك ژ باوەرییێن مە یێن کوردەورای ب ناڤێ ئایینی هەبن، لێ ئەوێن بەری نهۆ مە ئاماژە پێ کرین هەمی ب بەلگە ژ (قورئان و سوننەتا پێغەمبەری) بوومە خۆیابوون کو باوەرییێن ئایینی بووینە، بەلێ کومەکا باوەرییان مە هەنە ب ناڤێ ئایینی هاتینە بەلێ هیچ بەلگەیەك پێ نینە کو یێن ئایینی نە، لەوما ئەو ناهێنە هژمارتن ژ باوەرییێن ئایینی، ئەڤە ژی هندەك نموونە نە ژ وان:

بەری نهۆ مە ئاماژە ب هندەك ژ وان نموونان کر ئەوێن گرێدای خفسێ، کو یێن د قورئانا پیرۆز دا ئاماژە پێ هاتینە کرن (مەیموینك و بەران)، لەوما دێ بینین کومەکا دی یا گیانەوەرا د ناڤ باوەرییێن کوردەواری دا ئاماژە پێ کرینە کو خفس لێ هاتینە کرن، بەلێ هیچ بەلگەیەك ژ (قورئان و سوننەتێ)

پێ نینن، ئەوژی ئەڤەنە:

(کویسەلە مرۆڤ بوو، بەلێ دەمێ ب عەلبا مەزن کری و ب یا بچویك د فرۆت، خودێ خفس لێ کر و کرە کویسەلە و پشتا وی ژی عەلبا مەزن پێڤە کر و یا بچویك ژی ب بن زکێ وی ڤەکر.. ١ ـ ١١، ٢ ـ ٤٦ / ٥٨، ٣ ـ ٤٣) یان (لەگلەگە مرۆڤ بوو ـ بەگ ـ بوو، دەمێ ژ ژنکەکێ خوازتی ب دارێ را بچیتە سەر، و وی ل بن دارێ بەرێ خودایە ژنکێ، بۆ تیڤە تیڤا وی ب ژنکێ کرە کەنی، ئینا خودێ خفس لێ کر و کرە لەگلەگە.. ١ ـ ١١، ٢ ـ ٥٠ / ٥٩/ ٦٠، ٣ ـ ٤٤) یان (دبێژن: هرچ ژی ژنك بوو، زارۆیێ خوە ل سەفەرەکێ ل پیا دانا و د دووڤا را ب کەرەکێ پەنیری پاقژ کر، ئینا خودێ خفس لێ کر و کرە هرچ.. ٣ ـ ٤٥) یان (دبێژن سیخور ل بەراهیکێ جوهی بی، بەلێ خودێ خەفس لێ کر و کرەسیخۆر.. ٢ ـ ٤٧) یان (سەرهاتیا تەیرێ دوبراك و ژنباب.. ل دووماهیا ڤێ سەرهاتیێ هاتیە: ئینا خودێ دوعا وان قەبویل کر و کرن دوو تەیر و هەتا نووکە ل ئەسمانا دبێژن: کەکۆو .. کەکۆو.. ٢ ـ ٥٥) یان (سەرهاتیا گدگدوك بۆرێ تتریك و ... ژنباب.. ل دووماهیا ڤێ سەرهاتیێ هاتیە: ئینا خودێ ژی دوعایا وان قەبویل کر و هەردوو کرن دوو تەیر.. ٢ ـ ٥٥) یان (پۆر و عەبدال و .. ژنباب.. بۆ خوە دوعا کرن ببن دوو بالندە، ئینا خودێ دوعا وان قەبویل کر و هەردوو کرن دوو تەیر، نهۆ دەنگێ وان یێ دیارە، دەمێ دبێژن: تەتە دیت؟ تەتەدیت؟.. ٢ ـ ٥٩) یان (دبێژن: ئەڤ بالندەیە ژ بەرێ مرۆڤ بی، ئەو و برایێ خوە چوونە ئاشی، دا کو هەڤرانێ خوە بهێرن.. بەلێ ل وێرێ سەرا دوورا ئاشی ب شەڕ چوون و ئێکی ئێك کوشت و کرە د کوتەلا ئاشی دا، دبێژن.. پشتی هینگێ پێشەمان بی و نفرین ل خوە کر و بۆ ئەڤ بالندەیە.. ٢ ـ ٥٩).

*(هەکە ژنکەکێ کچەك ببیت، دێ کەیفا مەلائیکەتا هێت و بێژنە ئێك و دوو فلان کەسێ کچەکا بی، بەلێ هەکە کوڕ بیت دێ ب خەم کەڤن، چونکی ل ئاسمانا کچ ب قەدرترن ژ کوڕا.. ١ ـ ٣٧).. دقورئانا پیرۆزدا هاتیە: [ویجعلون لله البنات سبحانه ولهم مايشتهون* واذا بشر أحدهم بالأنثى ظل وجهه مسودا وهو كظيم..[٧٧]). ئانکو (وان ـ ملیاکەت ـ کچ دانان بۆ خودێ، ـ حاشای خودێ ـ خودێ ژ گۆتنا وان یێ پاك و پاقژە، کا وان چ دڤیا ئەو بۆ خو ددانان.. و هەر وەختێ مزگینی ب کچێ بۆ ئێکی بێتە دان ـ کو خودێ کچەکا دایێ ـ دێ ناڤچاڤێت وی تێکچن و ڕەش بن، و دێ کەربگرتی بیت و دێ کەربێ داعویریت )[٧٨].. هەروەسان هاتیە: (ان الذين لايؤمنون بالآخرة يسمون الملائكة تسمية الأنثى)[٧٩]. ئانکو (ب راستی ئەوێت ژ ئاخرەتێ بێ باوەر، ملیاکەتان دکەنە کچ..[٨٠]).

ئەڤ باوەریە وەکی قورئانی بۆ مە دایە خۆیاکرن، ئەو یا بەری هاتنا موسلمانەتی یێ یە، ئەوێن باوەری ب خودێ و پێغەمبەری و رۆژا ئاخرەتێ نە.. ئەو ڤێ گۆتنێ دبێژن، لەوما ئەڤ باوەریە نە باوەریا ئایینێ مە یێ موسلمانەتیێ یە.

(کوردا تەنی د سەرێ دفنا بچویکی ددا، د گۆتن دا چاڤین نەبیت.. هەر وەها بۆ ڤێ مەبەستێ موریکێن ڕەش و سپی د ناڤێك دا، یان یێن شین دکرنە ستویێ یان دەستی.. ٣ ـ ٦٨) یان (هەکەر رەز یان بیستانێ مرۆڤی هاتە بەری و مرۆڤی ڤیا ژ چاڤا و حەسویدیێ بپارێزیت، پێدڤی یە هندەك قاپلوکێن هێکا بینیت و ب کەتە گەلواز و ب بەنکەکی یان دەزیەکی ڤەکەت و دناڤ دا بهەلاویسیت، داکو ئێدی کارتێکرنا چاڤا نەکەت و هەر کەسێ ب چاڤێ حەسەدێ بەرێ خۆ بدەتێ چاڤێن وی ژی وەك ئەوان هێکا سپی ببن و ب پەقن، ئانکو ئاڤا سپی بێتە چاڤا.. ٢ ـ ٢٣).. هەلبەت ئایینێ مە یێ پیرۆز هەر تشتەکێ ب ڤی شێوەی بۆ مەرەما چاف لێ نەدانێ ب زارۆکی ڤەکەت یان لانداکا زارۆکی یان ب ناڤ دەرامەتی ل ناڤ بیستانان یان کرنا پاتەیەکێ کەسك ب زەندکا خۆڤە.. هتد ئەڤە هەمی هەڤدژی ئایینێ مە ئیسلامێ نە، چونکە خودێ د قورئانا پیرۆزدا دبێژیت: [وان يمسسك الله بضر، فلا كاشف له الا هو[٨١] ].. ئانکو ئەگەر خودێ زیانەکێ بگەهینیتە تە، کەس نینە راکەت، ئەو نەبیت..[٨٢]).. هەروەسا پێغەمبەر (س) دبێژیت: (ان الرقى والتمائم والتوله شرك) ژ ریوایەتا ئەحمەدی و حاکمی و ئەبو

داودی و ئبن ماجەی و ئبن حەبان..هەر وەسا عوقبەیێ كوڕێ عامری (خ) دبێژیت، پێغەمبەر (س) گۆتی:(من تعلق تمیمة فلا أتم الله له، ومن تعلق ودعة فلا ودع الله له[٨٣]) .

## باوەری ل نك زارۆكی..

ل نك زارۆكێ كورد، هەژمارەكا باوەریا پەیدابووینە، كو ((ب هزرا من)) سەرۆكانییا ڤان باوەریا، زارۆك ژ لایێ دایكێ ڤە وەردگریت!..ئانكو ژ نك ژنكێ ئەڤ باوەریە بۆ زارۆكا دچن، و پشتی ژیێ زارۆك دبیتە (٥ ـ ٦) سالی، چیرۆكێن سەرزاری (جانەوەر و ئەجن و پیرهەڤیا و مارێن حەفت سەر..هتد)، بۆ دهێنە گۆتن، ل نك وان هەمی دبنە دۆرهێل، باوەری پێ پێ دئینن.. و دیسان گەلەك جارا دەمێ زارۆك شویماتی یا د مالێ دا دكەت، دایك دێ بێژنێ: (روینە خوارێ شویماتیا نەكە، هەكە دێ بێژمە ئەزمان سۆركا بهێن تە بخۆن!)، د ئاشوپا زارۆكی دا، ئەڤە گیاندارگە مرۆڤا دخوت!![٨٤].. هەر وەسا (كەچا كورد) د گۆتارا خۆ (ژن و زمانێ ماكی) دا دبێژیت: (بێگۆمان گوهاستنا فۆلكلۆری ژ رۆلەكی بۆ رۆلەكێ دن بەشێ مەزن ل سەر دەستێ ژنا كورد بوو، چونكی زارۆك ل سەر دەستێ وێ مەزن دبن، ل تەمەنێ دوو سالی گوهـ ددن دەرگۆشێ د خەو رە دچن.. دایك ب دەیان رووداو و سەرێهاتیا و كارەساتا ب رێ یا چیرۆك و لاوك و لوراندنا ژ بۆ زارۆكا دگۆهێزە..)[٨٥].

## چەند باوەریەك ل نك زارۆكی:

(د باوەریا زارۆكی دا، ئەزمان سۆرك گیانەوەركە و زارۆكێن شویماتیا دكەن دخۆن.. ٩ ـ ٤٢) یان (دەمێ ل بهارا چویچك هێلینكێن خۆ چێ دكەن و هێكا دكەن و پاشی دكەنە چویچك، و بچویك دچن دا وان هێك و تێژكا بیننە دەرێ، هەر هندەك ژ ئهەڤالێن وان دێ بێژنێ: دەستێ خۆ نەكەنێ، دێ ماكا ـ دەیكا ـ وان نفرینا ل مەكەت و دێ بێژیت: من كرو من كر.. من قوینكا خۆ پێڤە كولكر.. سەر سۆركێ جەهنەمێ بۆ خۆ برا.. ٩ ـ ٤٣) یان (دەمێ بچویكەك رابیت، دا پێشیەكێ بكوژیت، دێ هەڤالێت وی بێژنێ: (نەكوژە هەكە دێ هەڤالێن وێ هێنە مە و بێژن: وەرنێ ب خشت و وەرنێ ب خشت.. ڤی نیڤ مێری مێرەك ژ مە كوشت!!.. ٩ ـ ٤٣) یان (دەمێ كیچەك دهێتە گرتن چ ب دەستێت ژنكەكێ یان زارۆكەكی، وەكی دڤێن بكوژن، پێ نەڤێت هندی كێچ یا ب زەحمەت بۆ كوشتنێ، دڤێت باش بهێتە پەرخاندن، هەكەر نامریت، ئەڤجار د باوەریا واندا، وێ گاڤێ كێچ دبێژیت: كوشتن كوشتنە.. سۆتن سۆتنە، بەلێ پەرخاندن چ گوی خوارنە؟!.. ٩ ـ ٤٤)، هەلبەت ئەگەر كێچێ پاڤێژنە دناڤ ئاگری دا دێ خۆ قورتال كەت، ئەگەر دانا سەر عەردەكی دا بكوژیت، دیسان دێ خۆ قورتال كەت، بەلێ ب پەرخاندنێ چۆ قورتالبوونی نینە، لەوما ڤێ گۆتنێ دبێژیت.. یان (دەمێ بچویك كمكما دبینن، دەڤێت خۆ دمچینن، داكو ددانێت وان نە مێرن، چونكی هەكە ژماردن دێ مرۆڤ مریت.. ١ ـ ٢١، ٢ ـ ٤٩) یان (هەچیێ مێرێت زەر بكوژیت دێ چیتە بەهەشتێ، چونكی یێت ئێزدییانە.. ١ ـ ٢٧) یان (دەمێ مرۆڤ نینوكێت خۆ درێژ دكەت، دێ بێژن ببرە گۆنەهە، چونكی شەیتان دێ نڤێژێ ل سەر كەت.. ١ ـ ٣٢) یان (هەچیێ كرە غار و كەفت، دێ بێژن شەیتانی گۆپالێ خۆ دا بەر پییا، لەو كەفت.. ١ ـ ٣٢) یان (نابیت بەڤا بكوژن، هەكەر دێ باهلیلك ل دەستێن مرۆڤی هێن..٢ ـ ٦٣).

*(دەمێ مرۆڤ نینوكێت خۆ درێژ دكەت، دێ بێژن ببرە گونەهە، چونكی (شەیتان) دێ نڤێژێ ل سەركەت(ئەڤە یا بچوكانە)...(هەندەك كەڤنە باوەرێت...../٣٢).

و د پەرتووكا(بیروباوەرێن كەڤن.....)دا هاتیە: دەمێ نینوكێن بچویكا درێژ ببان و نەقوساندبان، دایك و بابا ژێ دخواست نینوكێن خو ببرن چونكە دگۆتن هەكەر نینوك درێژ بن شەیتان دێ نڤێژێ ل سەر كەت، ئانكو دێ بیتە هەڤالێ شەیتانی..(بیروباوەرێن كەڤن...../١٢).

پاشی(بەیار باڤی) ڤێ تێبینیێ ل سەر ددەت: (رەنگە ئەڤ پالدانەك بیت بۆ زارۆكا، كو ئەو نینوكێن

خوە ببڕن داکو دەستێن وان پیس نەبن و ئاخ نەچیتە دناڤ نینوکێن وان رە).(٨٦)

- ئیبن عومەر(خ) دبێژیت: پێغەمبەری(س) گۆت: پێنج تشت ژ پاقژیێ نە(من الفطره): تراشتنا موێن پیس، سوننەتکرن، قوساندنا سمبێلا، هەلکێشانا موێن بنکەفشی، قوساندنا نینۆکان.(٨٧) (رواه الجماعه).

- ئەنەس(خ)دبێژیت: پێغەمبەری(س) دەم دەستنیشانکر ژ بو قوساندنا سمبێلا و قوساندنا نینوکا و هەلکێشانا(تراشین)ا موێن بنکەفشان و تراشینا موێن پیس، کو ئەم پێتر ژ(٤٠) رۆژان نەهێلین.(ریوایەتا ئەحمەد و ئەبو داوود و هندەکێ دی).

ئەڤەژی ژباوەرێن ئایینی یە یێن پاقژیا موسلمانەتی یێ نیشا موسلمانا ددەتن، کو هەردەم موسلمانەتی یێ حەز ژ پاقژیێ کریە، ئەبی مالك - حارثێ کورێ عاصمێ ئەشعەری(خ) گۆت: پێغەمبەری(س) گۆت: پاقژی رەخەکێ باوەریێ (أیمان)ێ یە.(٨٨) (ریوایەتا موسلمی).

- ئەبی هورەیرە ژ پێغەمبەری ڤەدۆهێزیت: پاقژی پێنجن ( یان پێنج ژ پاقژیێ نە)، سوننەتکرن، تراسدشینا موێن پیس، هەلکێشانا موێن بنکەفشا، قوساندنا نینوکان، قوساندنا سمبێلان.(٨٩) ( ریوایەتا بوخاری).

## ژێدەر و پەراوێز


١. نزار محەمەد سەعید، هن ئالیێن جڤاکێ کوردی د کولتۆرێ گەلیری دا، چ١، چاپخانا وەزارەتا رەوشەنبیری، هەڤلیر ـ ٢٠١١،بەرپەر ١٢.

٢. فردریش فوون دیرلاین، الحکایة الخرافیة، ترجمة د. نبیله ابراهیم، بغداد ـ (د. س)، ص ٣٢.

٣. علی الجزیری، الادب الشفاهي، ط٢، مطبعة أوفسیت، أربیل ـ ٢٠٠٠، ص ٥١.

٤. ڤاسیل نیکیتین، الاکراد، دار الروائع، بیروت ـ ١٩٦٧، ص ٢٠٩.

٥. دیڤید ورنەر، مرشد العنایة الصحیة حیث لایوجد طبیب، ترجمة: د.متی حداد، ط٧، بیروت ـ لبنان، ١٩٩٠، ص ٢.

٦. نزار محەمەد سەعید، هن ئالیێن جڤاکێ کوردی د کولتۆرێ گەلیری دا، ژێدەرێ بۆری، بەرپەر ١٤.

٧. د. عبدالحمید یونس، الحکایة الشعبیة، افاق عربیة، بغداد ـ (د. س)، ص ٤٦.

٨. نزار محەمەد سەعید، کورد و باوەرێن ئەفسونی ل سەر داروباری، کۆڤارا رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢٣، ئیلۆنا ـ ١٩٨٩، بەرپەر١٧١.

٩. عبدالله قاسم أبو شلبی، النهج المبین لشرح أصول العشرین، ص٣٠٥ ـ ٣٠٩.

١٠. حجی جعفر، هندەك کەڤنە باوەرێت خەلکێ دەڤەرا بەهدینان، بەغدا ـ ١٩٩٣، بەرپەر ١٧.

١١. د. محمد عبدالقادر (أبو فارس)، أسس فی التصور الاسلامي، دار الفرقان، ط٣، ١٩٨٦، ص ١١٨.

١٢. سوره النمل، ایه ١٨ ـ ١٩.

١٣. اسماعیل سگێری، تەفسیرا ژیان، چ١، چاپخانا أسوە، ئیران ـ ٢٠٠١، بەرپەر ٣٧٨.

١٤. سوره ألنمل، ایه ٢٠ ـ ٢٢.

١٥. اسماعیل سگێری، ژێدەرێ بۆری، بەرپەر ٣٧٨.

١٦. سوره الأعراف، ایه ١٦٦.

١٧. اسماعیل سگێری، ژێدەرێ بۆری، بەرپەر ١٧٢.

١٨. نزار محەمەد سەعید، کۆڤارا (روشنبیری نوێ)، ژێدەرێ بۆری، بەرپەر (٢٦٧).

١٩. نزار محەمەد سەعید، کۆڤارا (روشنبیری نوێ)، ژێدەرێ بۆری، بەرپەر (٢٦٦).

٢٠. ڤاسیل نیکیتین، الاکراد، دار الروائع، بیروت ـ١٩٦٧، ص ٢٢١ ـ ٢٢٢.. یان: باسیلی نیکیتین، الکرد ـ دراسة سوسیولیجیةوتأریخیة، تقدیم لویس ماسینین، نقله من الفرنسیة وعلق علیه، د. نوری طالباني، ط١، مطبعة خاني، دهۆك ـ ٢٠٠٨، ص٣٣٤.

# ئامویرێن هێرانا دەخل و دانی ل دەڤەرێ

بەرهەڤکرن: جەمیل شێلازی

## کورتیەك دیرۆکی:

ئەگەر ل نك رۆژهەلاتناسان (کوردستان لاندکا شارستانیەتێ بیت[*])، هەلبەت ئەڤ چەندە ڤەدگەریتەڤە بۆ وان پاشماینێن هەستیکبەندێن مرۆڤێ (نیاندرتال)، ئەوێن د شکەفتا (شانەدەر) دا هاتینە دیتن، کو ل دۆر وان هەستیکبەندان (دلشاد عزیز زاموا) دبێژیت:

(د نویترین ڤەکۆلینا پەیمانگەها نەتەوەی و ئەکادیمی بۆ زانست و ڤەکۆلینا (NAS) ل رێکەفتی (۲۷/کانونا ئێکێ/۲۰۱۰) ژ لایێ ڤەکۆلەر jennifer vieges) - جنیڤەر ڤیگاس) هاتیە بەلاڤەکرن، سەبارەت خوارنا مرۆڤێن شکەفتا شانەدەر ل کوردستانا عێراقێ و شکەفتا سپای (SPY) ل وەلاتێ بەلجیکا، ڤی ڤەکۆلەری کۆمەکا پێزانینێن هویر و بها ل سەر خوارنێن مرۆڤێن ڤان هەردوو شکەفتان بەلاڤ کرینە. ڤان ڤەکۆلینا پشتا خۆ یا ب ڤەکۆلینا هویر ئەڤا ل سەر ددانێن مرۆڤێ شانەدەر و سپای یا راستکری، ب تایبەت ل سەر دەمێ بەری یێ کەڤن دەوروبەرێن (٤٤٠٠٠-٣٦٠٠٠ب.ز) ئەو ددانێن بەری (٥٠ سالا) ژ نها هاتینە دیتن، بەلێ تا نها ژی ڤەکۆلین ل سەر د بەردەوامن، و ئەڤ ڤەکۆلینە پشت ب وان بەرماێن خوارنێ دبەستیت

ئەڤێن بەری (٤٠٠٠٠ سالا) ماینە دناڤبەرا ددانێن مرۆڤێ ڤان شکەفتاندا. دەرئەنجامێ ڤێ ڤەکۆلینێ دیار دبیت کو مرۆڤێ نیاندرتال نە ب تنێ مرۆڤەکێ گۆشت خوار بوو، هەر وەکی ڤەکۆلینێن بەری وی دەمی ئاماژە پێ دکر، بەلکی چەندین جۆرێن فێقی و دەخل و دانی و گیایان بۆ خوارنێ بکارئینانە، دیسان زانیە چەندەها رەنگێن خوارنێ ب لێنیت، ئەڤەژی وان هەمی ڤەکۆلینا ئەڤێن بەری وی دەمی ل سەر مرۆڤێ نیاندرتال هاتینە نڤێسین و د گۆتن مرۆڤێ نیاندرتال مرۆڤ خوار بوو و گۆشتێ ئێك و دوو دخوار!! بەلێ ئەڤ ڤەکۆلینە دیار دکەت کو مرۆڤێ نیاندرتال ب تنێ مژویلی نێچیر و خوارنا گۆشتێ گیاندارا نەبوو بەلکی چەندین جۆرێن دەخل و دانی و فێقی و گیای بۆ خوارنا خۆ بکارئینانە. ڤێ ڤەکۆلینێ چەندین جۆرێن خوارنا دیارکرینە کو مرۆڤێ نیاندرتال بکارئینانە وەك: دەخل و جەهـ Barley و خورمە Dates.

هەژیە بێژین کو شکەفتا شانەدەر دکەڤیتە زنجیرا چیایێ برادۆست، ئێکە ژ شکەفتێن هەرە مەزنێن کوردستانێ، دناڤبەرا سالێن (١٩٥١-١٩٦١) ێ شوینوارناسێ ئەمریکی (رالف سولیکی) پشکنین تێدا ئەنجام داینە و چەندین هەستیێن

مرۆڤێن نیاندرتالا تێدا دیتینە، بۆ دەمەکی دناڤبەرا چەرخێ بەری ێ کەڤن و نوی دزڤرنەڤە (٦٥٠٠٠) سالا بەری نها مرۆڤ لێ ژیایە، دناڤ ڤێ شکەفتێ دا ژ بلی هەستیێن مرۆڤا چەندین دیکیومێنتێن دی دەربارەی ژیانا مرۆڤێ شانەدەر هاتینە دیتن، توڤێ وان هەر هەشت جۆرێن گۆلا ئەڤێن دناڤ ئێك ژ گۆرێن نیاندرتالا هاتینە دیتن کۆمەکا بیردۆز و ڤەکۆلینان پەیداکرن[1].

گۆمان تێدا نینە ئەڤە بوویە سەدەمێ کو ژیان ل کوردستانێ ل دەستپێکا پەیدابوونا مرۆڤایەتیێ یە، هەر وەکی ئەڤ چەندە (هاتیە ئاشکەراکرن ژ لایێ زانایێن شوینواران ڤە، کو ئەوژی مانا شوینوارێن کەڤنترین گوند ((چەرمۆ) جیرمۆ - Jarmo ل عێراقێ و کاتلێ هییوك ـ Catal Huyuk ل ترکیا وئەریحا ل فەلستینێ، کو د هزارا حەفتێ و شەشێ دا ژ بەری زایینی هەبووینە. و ل هزارا چوارێ ژمارەکا زۆر ژ خەلکی ل باشوورێ وەلاتێ د ناڤبەرا هەردوو رووباران دا (عێراقا نوی) شیاینە سەرەدەرێ د ئاڤا دیجلە و فوراتی دا بکەن و وان دەشتێن ل رەخان شین بکەن و ئاکنجیبوونا خەلکی ل سەر لێڤێن رووبار و دەراڤێن سەرەکی دا..)[2].

ژ ڤان بووچوونێن ژووری خۆیادبیت، کو ل کوردستانێ ب تایبەت گوندێ (چەرمۆ) ل دەڤەرا چەمچەمال ل هزارا چوارێ یا زایینی چاندنێ ل ڤێ دەڤەرێ دەستپێکریە، ئەوژی ب دیتنا هندەك ئامویرێن وەك (داس و شالۆك) یێن دورینا دەرامەتی.

هەر دەربارەی چاندنا دەرامەتی دناڤ کوردان دا (باسیل نیکیتین) ب ڤی شێوەی بەحس ژێ دکەت: (کورد د کاری دا وەك کلدانیێن کەڤن خودان زیرەکیەکا باشن، ئەو د کۆلانا جۆیێن ئاڤێ دا بۆ سەر جهێ چاندنێ ژ بۆ ئاڤدانا وان نا وەستیێن، کارێ وان ژێ وەك یێ هەموو خەلکێ نیشتەجێبوویێن چیایانە، ئەو گرنگیەکا باش پێ ددەن، لەوما ئەو ژ عەرەبان ژێ پتر دهێنە هژمارتن کو گرنگیێ ددەنە چاندنێ، ئەو هندە چاندنێ دکەن هندی پێدڤیا خۆ، و پویش و قرشێ وی دەرامەتی بۆ ئالفێ حەیوانێن خۆ بکاردئینن، و ئەو ب شێوەکێ تایبەت گرنگیێ ددەنە چاندنا گەنمۆك و دەخلی و جەهی و برنجی، زێدەباری تویتنێ، بەلێ پتریا داهاتێ وان ل سەر تەرش و کەوالی یە )[3].

## جۆرێن دەخل و دانی (دان و دکاکی):

چاندنا دەرامەتێ ل دەڤەرا بەهدینان چەندین جۆرێن دانی بخۆڤە دگرن وەك:

١ـ دەخل، وەك: گەنمێ ئیتالی، دندکا وی یا گرە بۆ ساڤار و دانهێرك و دانقوتا بکاردئینن، سپیك یێ ئاڤییە، زەرگۆل گولیا وی یا زەرە و شەش رێزی یە دیسان ئەڤ جۆرە بۆ ساڤار و دانهێرك و دانقوتێ دهێتە بکارئینان، رویتك، گۆلیا وی یا بێ سڤییە، مرویشی ل زەڤیێن ئاڤی بهارێ دهێتە چاندن.

٢ـ جەهـ : سپی و رەش.

ژ بلی گەلەك دانێن دی مینا:

٣ـ گەنمۆك.. ٤ـ گارس.. ٥ـ کونجی.. ٦ـ تەحلە.. ٧ـ خرۆبی.. ٨ـ ماش.. ٩ـ نیسك.. ١٠ـ نۆك.. ١١ـ برنج ـ هاڤینی و پاییزی و ب هەمی جۆرێن خۆڤە.

هەلبەت دگەل چاندنا دان و دکاکی، هزر د دروستکرنا هندەك تشتان دا کرییە ژ بۆ هێرانا ئەڤی دان و دکاکی، کو ئەڤ ئامویرێن هێران و قوتانا وان دان و دکاکان ل کوردستانێ هاتینە دورستکرن وەك پیشەسازیەکا خۆمالی، ئەوژی: (ئاشێن ئاڤێ، جۆهنی، گرك، دستار، و مدارە.. هتد) بووینە.

قوتان و هێرانا دەخل و دانێ ل ژوورێ مە ئاماژە پێ کرین ل دەڤەرێ ب رێکا چەند ئامویرەکێن کارێ خۆمالی (ناڤخۆیی) بوون، ئەوژی ئەڤەنە:

## ئاشێن ئاڤێ:

### دورستکرنا ئاشێن ئاڤێ ل دەڤەرێ:

ل دوَر دروستکرنا ئاشێن ئاڤێ و پێکهاتێن دروستکرنا وان، مە گەلەك گرنگی دایە بابەتێ (ئاشێن ئاڤێ[*])، چونکە ئەڤ بابەتە هاتیە بەرهەڤکرن ل دووڤ وان زانیاریێن ژ ئێك ژ هۆستا و شارەزاترین کەسێن ل دەڤەرا بادینان ئاش دروست

دکرن وەرگرتنە، کو ئەوژی (حەجی عەلی یێ ئاشی[*]) بوو.. و دگەل هندەك زانیاریێن مە کۆمکرین ل سەر وان زێدەکرینە.

چێکرنا ئاشان ئێکە ژ بەرهەمێن هزرکرنێ، کو مرۆڤ شیای ب دەست خۆڤە بینیت، ئەم دشێین بێژین، ب چێکرنا ئاشان گۆهرینەك ب سەر ژیانا مرۆڤی دا هاتیە، چونکو بەری پەیدابوونا ئاش و دستاران، مرۆڤی دانێ جەهـ و گەنمۆك و گەنم و گارس و تەحلە و خرۆبی.. هتد نەهێرای د خوارن، ژبەر گرنگییا ئاشی دژیانا مرۆڤی دا نەخاسمە ئاشێن ئاڤێ ل سەر دەمێن پێشین، مە ب فەر زانی ئاشی پێناسە بکەین و رۆلێ وی دژیانا رۆژانەیا مرۆڤی دا بێخینە بەرچاڤ.

**پێناسە:**

**ئاش:** کارگەهەکە بۆ گۆهورینا دانێ دەرامەتی مینا (گەنم، جەهـ، گارس، تەحلە، خرۆبی... هتد) ژ رەنگێ سرۆشتی بۆ رەنگەکێ دی کو باشتر و پتر خزمەتا ژیانا مرۆڤی بکەت و ب رێکەکا ساناهیتر مرۆڤ مفای ژ وی دەرامەتی بینیت.

## جهێ چێکرنا ئاشی:

هەتا کو بشێین ئاشەکی ل جهەکی بدانن، پێدڤی ب هەبوونا دو تشتێن گرنگە، ئەوژی:

ئێك/ دڤێت ئاڤەکا بۆش ل وی جهی هەبیت، کو ئاش ل بەر کاربکەت.

دو/ ئەو جهێ ئاڤ ژێ دهێتە خوار جهەکێ ژووردانی و بلند بیت، چونکە دڤێت بلنداهییا کۆتەلا ئاشی دناڤبەرا (٤ ـ ٦م) دا بیت.

لەوما گەلەك جهان ل دەڤەرێ ئاڤەکا زۆر بۆش لێ هەبوویە، بەلێ چونکی ل جهەکێ راستی سەر روویێ ئەردی یە، نەشیاینە کۆتەلێ لێ دروست بکەن، دبیت هندەك جار دێ بینین هندەك جۆیێن ئاڤێ ب دویراتییا پتر ژ (١کم) بریە، بەس بشێین کۆتەلێ ل بەر دروست بکەن، دا ئاش ل بەر کار بکەت.

چونکی مشە ژێدەرێن ئاڤێ ل کوردستانێ ل جهێن بلند هەنە، مرۆڤێ کورد هزرا خۆ تێدا کرییە و د بەرژەوەندیا خۆدا ب کارئینایینە، ژ گەلەك لایان مفا ژێ وەرگرتیە، ئێك ژ وان لایان، دانەکاری یا ئاشان بوویە، هەروەکو مە ئاماژە پێکری سرۆشتێ عەردێ کوردستانێ هۆکارەکێ باش بوویە، بۆ سەرکەفتن و سەرگرتنا ڤی کارێ گرنك.

ئاش هەتا کار بکەت پێدڤی ژێدەرەکێ ئاڤا بۆشە و ئەو ژێدەر مینا کانیا یان رووباران ژ جهەکێ بلند ب رێ یا جۆیێ بهێتە سەر وی جهێ ئاش لێ دهێتە چێکرن.

## ئاش و ئاڤاهیێ پێدڤی:

### کۆتەل:

ل بەراهیێ قەدا بنی (بنێزە)یێ سپینداری دا کۆلن و ناڤا وێ خولۆلە کەن، پاشی دا ئاڤێ بەردەنە وێ بۆتا کۆلای و ئاشی ل بەر دەنە شۆلی، کو ئەو لایێ قەدا سپینداری ئەوێ د کۆلا پشتی هنگێ (د ڤی چاخی دا کو ل بەرێ نەبوو) هەمی تەنەکە دکر پاشی ئاڤ

کوتەلا ئاشێ بێناتا



کوتەلا ئاشێ ئەرەدنا



د بەردایێ، ڤێ چەندێ ژی هاریکاریا ب هێزکرنا ئاڤێ دکر، داکو ئاش خۆرتتر کار بکەت، پاشی هزرا ئاڤاکرنا کۆتەلێ پەیدابوو.

کۆتەل، مینا دیوارێ بیرێ، دیوارێ وێ دهاتە ئاڤاکرن ئانکو ژ سەری ڤە فرەهـ و ژ بنی ڤە تەنگ بوو، ئانکو کۆتەل مینا بیرێ بوو، پتریا ئەو کۆتەلێن مە دیتین و پیڤاین وەکی ئاشێن (ئەرەدنا و ئینشکێ و زێوا شێخ پیراموس و شێلازا و ... هتد)، ب بەر و کسلان دهاتنە ئاڤاکرن (لەوما تا نهۆ ژی پرانیا پاشمایێن وان ماینە)، ب شێوێ بازنەی دهاتنە ئاڤاکرن، ئەگەر ب شێوێ چوارگۆشەی یان لاکێشەی ژی هاتبنە نژنین، کۆتەلا وێ ب شێوێ بازنەی بوون، بلنداهیا کۆتەلان دناڤبەرا (٤-٦م) بوون، و هەتا هندەك کۆتەل تا (١٢م) ژی بلندبوون، فرەهیا دیوارێن کۆتەلان دناڤبەرا (١,٥-٢م) دا بوون، تیرێ فرەهیا کۆتەلێ (١,٥م-٢م) دا بوون، ئانکو دناڤبەرا (٢٠٠٠-٣٠٠٠) لیترێن ئاڤێ تێدا خرڤەدبوون، داکو دەمێ ئاڤ ژ وێ خزینکا د بنێ کۆتەلێ دەردکەڤت و ب پەروانێن ئاشی دکەڤت ب هێز دەرکەڤیت و بشێت بەرێ سەرێ ئاشی بزڤرینیت، ئەو تەنگیا بنێ وێ د بێژنێ خزینکا کۆتەلێ و ئاڤ ژ سەری ژووردا دبەردایێ. بەری ئاڤ بهێتە کۆتەلێ هندەك دارك د نیڤەکا جۆیا ئاڤێ دا د چکلاندن و نێزیکی ئێك بوون، ڤان دارکان نە دهێلا قورمێن داری و گلێش بچنە دکۆتەلێ دا، دا خزینکا وێ ئاسێ نە بیت.

## پۆزك:

پارچەکا دارێ کۆلایە دئێخنە خزینکا کۆتەلێ قەبارێ وێ ل دووڤ هێز و بۆشاتیا ئاڤێ دهێتە چێکرن.

## ئۆدە (ژوور):

ئۆدەیەك یان پتر ئاڤا دکرن و ئاش ددانا تێڤە، پرانیا ئاشان ژ دو ژووران یان پتر پێکدهات، چونکە جهێ ڤەحەویانا وان کەسان بوو، ئەوێن دهاتنە ئاشی، ژ بەر

نیڤا کونەلێ



کو گەلەك جاران د بوو گەر (دوور) هەتا دوور بۆ هێرانا دانی د گەهشتێ، چونکە ژ گەلەك گوندێن ئاش لێ نەبی قەستا وان جهان دکرن یێن ئاش لێ هەبن.

د وێ ژوورا ئاش لێ دهاتە داناندن، ل راستا پۆزکا کۆتەلێ جۆیا ئاڤێ د چوو ژ دەرڤە و هەردو رەخێن وێ دیوار دکرن، پاشی چوار دارێن کەزانی یان تویێ یێن ستویر ددانان سەر و کتا بنی یا ئاشی د دانا سەر وان هەر چوار دارا، دگۆتنە وان دارا بەرازە.. دارێ کەزانێ یان یێ تویێ گەلەك بەرگریا رزینێ دکەن ژ بەر هندێ ئەو دار بکار دئینان.

## بۆشیلان:

ئەو جۆیا ئاڤێ ئەوا ژ بن ئاشی دەردکەڤیت د گۆتنێ بۆشیلان.

## دۆلاب:

دارەکێ ستویرە، ژ کەزانی یان تویێ چێ دکەن ژ هەمی رەخاڤە دکۆلن و نێزیکی (٢٠) مالکا تێڤە دکەن، هەر مالکەکێ پەرەکێ ژ داری چێکری دئێخنێ.

## پەر:

ژمارا وان (٢٠) پەرن، ژ دارێ کەزانی یان تویێ دهێنە چێکرن، دەمێ ئاڤ ژ پۆزکێ دەردکەڤیت ل وان پەران ددەت و دۆلاب دزڤریت دگەل زڤرینێ کتا سەری یا ئاشی دزڤریت.. دۆلابێ دو کون تێڤە هەنە، ئێك ل سەری و بستا ئاشی دئێخنێ، ئەو بست دکتا بنی را دەردکەڤیت و دگەهیتە کتا سەری و دچیتە د تڤرێ را بۆ بادان و زڤراندنا کتا سەری، ئەو کونا دبنێ

ئاش و دولاب ل دەمێ كاركرنێ



دۆلابێ ڤە دبێژنێ شەوبندك، شەوبندك تێك كەلن ژ مفرەقی هاتینە دارێتن.

**شە:**

پارچەكا ئاسنییە، مینا دەڤێ تەڤریە، ل سەر بندكی دزڤریت.

**بندك:**

پارچەكا ئاسنییە، دكەڤیتە بن شەی ل سەر تەختی.

**تەخت:**

دارەكە، كونەكا د سەری ڤە، دارەك دكەڤیتە د وێ كونێرا و بلند دبیت هەتا نك كتا بنی دبێژنێ پێ، سەرێ پێ ی ژی یێ كونە، دارەكی دئێخنێ بۆ بلندكرن و نزم كرنا كتا سەری دبێژنێ ملخە.

**ستێر:**

دارەكە د داننە سەر بستا ئاشی، جهێ میزانێ دگریت، سەرەكێ وی داری دكەڤیتە سەر كتا بنی و ئێك دێ دۆلابێ زڤرینیت، ئەگەر سەرێ داركی روویێ سەری یێ كتا بنی هەمیێ بگریت، وی دەمی ئاش

بەرێن ئاشی



دروست دبیت و كارێ خۆ ب رەنگەكێ سرۆشتی دكەت.

## بەرێن ئاشی:

ئاشێ بەری ژ دو بەرێن ب شێوێ بازنەی (گرۆڤر) پێكدهات و ئەو بەرێ بۆ ئاشی دهاتە بكارئینان ژی بەرەكێ تایبەت بوو ل هندەك جهێن تایبەت هەیە، چونكە ئەو بەر دڤێت هند یێ موكوم بیت دەمێ ل سەرێك دزڤریت و گەرم دبیت نابیت ژێك بخۆت، هەكەر دێ ئەو تۆز و پرتێن وێ چنە ناڤ دانێ دهێتە هێران. ل دەڤەرا بەرواری بالا ئەڤ جۆرێ بەری ل گوندێ بەریبرێ ل رۆژهەلاتێ باكوورێ ناحیا كانی ماسێ ل نێزیك توخیبێ تركیا هەیە، هەروەسا ل دەڤەرا ئامێدیێ ل گەلیێ ئاڤۆكێ ل رۆژهەلاتێ باشوورێ ئامێدیێ ب دووراتییا نێزیكی (٧كم)، و ل دەڤەرا بەرواری ژێریا ل گوندێ بەرئاشێ هەیە (كو دبیت هەما ناڤێ بەر ئاشێ هەر ژ وێ چەندێ هاتبیت، كو ئەو بەرێ ئاشی ژێ دروست دكەت، ل وێرێ هەیە)، ئەڤ بەرە ب ڤی شێوەی دهێنە دروستكرن:

## بەرێ بنی (كتا بنی):

بەرەكێ موكومە ژ ئێك پارچە یان چوار پارچە یان دەهـ پارچە پێكدهێت، ئەگەر پارچە بن، ئەو پارچە ب شێوێ سێگۆشەی نە، سەرێ زراڤێ وان دكەڤنە بەرێك دا، دا ل دەمێ لێكدانا ڤان پارچان دا ب شێوێ بازنەی دروست ببیت (ئەگەر پارچە بن)، ل دەمێ لێكدانا ڤان پارچان ب هاریكاریا تۆكەكا ئاسنی ل دوور وان پارچان ددەن دا پێ بهێنە لێكدان و دا ل دەمێ زڤرینا وی ژ بەرێك نەچن، ئەڤ بەرە ب شێوێ

كەتا بەرێ ئاشی یێ سەری



بازنەی حەلانەكێ ستویر و گرۆڤڕ ژێ دروست دبیت، ئەڤ بەرە نێزیكی (١,٣٠م فرەهیا وی یە × ٤٠سم ستویراتییا وی یە) نیڤەكا وی یا كونە نێزیكی (١٥ ـ ٢٠سم) ئەڤ كونە یا فرەهە، و بست تێرا بلند دبیت نێزیكی (٢٠سم) یان پتر دبێژنێ (كوریا ئاشی)، (دا كتا سەری ل دەمێ زڤرینێ خۆ ل سەر بگریت)، سەنگا هەر كتەكێ ژ ڤان نێزیكی (٣٠٠كیلو)یە.

## كتا سەری:

مینا كتا بنی دهێتە چێكرن، نیڤەكا وی یا كونە و بۆ هێرانێ گەنم تێدا دچیتە سەر كتا بنی، پشتی هەردو كتێن بەر ئاشی ددانانە سەر ئێك، دۆشكەكی ژ سێ لایانڤە ددەنێ، ب تنێ رەخەك دمینیت، دبێژنێ مزاخە، پاشی چوارچۆڤەكی ژ داری چێدكەن و د دانانە سەر دۆشكی، پاشی دۆل یان ئیستركێ دكەنە د وێ چوار چۆڤێ دا.

## دۆل:

ژ دەپێن داری ب شێوێ چوارگۆشەی دهێنە دروستكرن، لێ سەرێ وێ فرەهـ و بنێ وێ تەنگ، گەنمی بۆ هێرانێ دكەنێ، بنێ وێ بۆتكەكێ دئێخنێ، دەڤێ بۆتكێ دكەڤیتە هنداڤ گەوریا ئاشی و گەنم (دان) ژ بۆتكێ دكەڤیتە هنداڤ گەوریا ئاشی (كتا سەری)، ئەو بۆتك ب سێ بەندكا ب چوارچۆڤەی ڤە یا گرێدایە، هەردو بەندكێن پشتێ بۆ ئاسێكرنا بۆتكێ نە، بەندكێ سینگی یێ لڤۆكە بۆ كێمكرن و زێدەكرنا ئەوی گەنمی دهێتە گەوریا ئاشی ب كار دئینن.

**پیڤەر:**

داركەكێ خرك كریە، هەر خركەك ب خسمەكا گەنمی قەدارە كریە.

**گێلاس:**

داركەكە نیڤەكا وی یا كونە ژ دۆشكی دهێتە سەر بۆتكێ و یێ پێڤە ئاسێ كری یە، داركەكێ دی د وێ كونێ ڕا دگەهیتە سەر رویێ سەری یێ كتا سەری، دەمێ كتا سەری د زڤریت، ئەو دارك دهەژینیت و گەنم دهێتە خوارێ و دچیتە سەر گەوریا ئاشی و دهێتە هێران.

**بێر (یان) ئاركێشك:**

دارەكە و دەپكەك ب سەری ڤەیە، د مزاخێ دا ئاری پێ كوم دكەن.

**دارێ كۆمكرنا ئاری:**

دارەكێ دی هەیە، یێ كۆلایە، د مزاخێ دا ئاری پێ رادكەن، دبێژنێ دارێ ئار راكرنێ.

**تڤری:**

جهەكێ لاكێشەیە ل رویێ بنی ل نیڤەكێ یێ كتا سەری دهێتە كۆلان، سەرێ بستێ ژێهەل دكەڤیتێ بۆ زڤراندنا كتا سەری.

**مۆچك (یان) كودك:**

دارەكێ كۆلایە، قەدەرێ كیلویەكێ گەنمی دگریت.

**مز:**

دیارە ژ بەر كێمیا هەبوونا پارەی د ناڤ دەستێ خەلكی دا، لەوما دەمێ هەڤرانێ خۆ دبرنە ئاشی، ل دەمێ هێرانێ بەرامبەری هێرانا هەڤرانێ وان مز ژێ رادكر ئەوژی بۆ هەر خسمەكا گەنمی مۆچكەك ژێ رادكر، واتە بەرامبەر هەڤێ هێرانێ مز بوو.

**خەمیرە:**

كوچكەكێ مەزنە، ژ سێ لایانڤە ب هندەك بەرێن مەزن و بلند نێزیكی (٧٠سم)، دهێتە چێكرن، پاشی حەلانەكێ خیزی (دا خۆ ل بەر گەرمێ بگریت) ددانن سەر وان بەران (ئەڤ حەلانە نێزیكی (١م فرەهـ × ١,٥م درێژە)، رەخێن ڤی حەلانی نێزیكی (٣٠سم) ب ئاخێ و بەران دیوار دكەن، دا كونجی خۆ ل سەر بگرن، دەرێ كوچكێ خەمیرێ ژ دەرڤەیی ژوورێ یە (دا كو دوكێل نە هاتبا ژوورڤە)، ئەڤ خەمیرە تایبەت بۆ قەلاندنا كونجیان دهێتە بكارئینان، پشتی قەلاندنا كونجیا، دا ئینن ل ئاشی كەن و هێرن و كەنە تەحین.. دیسان ساڤار و سمیتك و دانهێرك ژێ پێ د هێران.

**تەق تەقك:**

ئەڤە دارەكێ نێزیكی (٣٠سم) درێژە و ستویراتیا وی هندی دەست بڤرەكی یان كێمترە، ئەڤ داركە ل دەرێ خزینكا دۆلابێ دهێتە دانان و سەرەكێ وێ دكەڤیتە سەر كتا سەری یا بەرێ ئاشی، ئەڤ داركە یێ لڤۆكە ل دووڤ رێژا لڤینا وی كونجی ژ دۆلابێ دهێنە كونا بەرێ ئاشی.

**كاركرنا ئاشێ ئاڤێ:**

ل دەستپێكێ دێ ئاڤێ بەردەنە كۆتەلا ئاشی، وەكو دیاربووی بنێ كۆتەلێ یێ تەنگە و پۆزك دكەڤیتە سەر، ئاڤ ل پۆزكێ دەردكەڤیت، ئێكسەر ل پەرێن دۆلابێ ددەت و دۆلاب دزڤریت، زڤرینا دۆلابێ، بست كو سەرەكێ وێ یێ دنیڤەكا دۆلابێ را ل رویێ بنی یێ كتا سەری ب وێ چەندێ كتا سەری یا ئاشی دزڤریت و گەنم ژ دۆلێ دچیتە بۆتكێ (ئەو كونا دنیڤا كتا ئاشی یا سەری) و ژ بۆتكێ دچیتە گەوریا ئاشی و ل ناڤبەرا هەردوو كتان (یا سەری و بنی) ل دەمێ زڤرینا وان وی دانێ دناڤ خۆدا دهێریت و دهاڤێژیتە رەخێن خۆ.

هەلبەت زڤرینا بەرێن ئاشی ل دووڤ وی دانی یە یێن د هێرن كا بۆ چ د هێرن، ل دووڤ لەزاتی و رەحەتیا زڤرینا وی، دان ژێ هویر یان گر دهێتە هێران.. چونكە ئەگەر هێرانا دانی بۆ ئاری بیت ب شێوەیەكی د زڤریت كو وی دانی بكەتە ئار، ژ خۆ ئەگەر بۆ ساڤار و دانهێرك و سمیتكێ یە، ب شێوەكێ دی د زڤریت، و ئەگەر بۆ هێرانا كونجیانە بۆ تەحینێ، ب شێوەكێ دی د زڤریت.

**هەڤران:**

ئەو جۆرێ گەنمی بوو یێ ل مال بۆ ئاری ئامادەدكرن، ژ بۆ كو ب بەنە سەر ئاشی بۆ هێرانێ، و هەر دانەك

یان دەرامەتەکێ د برنە سەر ئاشی دڤێت ل بەراهیێ ژنکان ژ هەمی زیان و کونجر و گلێشان پاقژ کربا، ئەگەر هەڤران یان دان گەلەك با، ژنێن جیران د هاتنە هاری و بۆ دکرنە زبارە دا زوی بهێتە پاقژ کرن، و هندەك جاران دبیت پێدڤی شویشتنێ با، دیسان د برنە سەر ئاڤا کانیێ یان رووباری و د شویشتن و ل سەر بانی ل بەر تاڤێ رادئێخستن، هەتا زوها د بوو، چونکە ئەگەر یێ نەرم (تەڕ) با نە دهاتە هێران.

ئەگەر دەرامەت کونجی بان، دیسان د شویشن دا ئاخ و گلێش ل ناڤ نەمابا، پاشی دەمێ دبرنە سەر ئاشی، دا بۆ ماوێ حەفتیەکێ کەنە دناڤ ئاڤە سویرکێ دا، پاشی دا ئینن دەر، ئەو کونجی دا هێنە قوتان، دا تیڤلێ وێ د سەردا بهێت، پشتی قوتانێ، ل بەر تاڤێ د هاتە رائێخستن دا زوها ببیت، پاشی دا دەنە بای دا ئەو تیڤکل و قەلپك ژ ناڤ بچیت، پشتی هینگێ دا د خەمیرێ دا قەلینن، قۆناغا دووڤدا دا ل ئاشی کەن، دا ببیتە تەحین.

هەژی گۆتنێ یە ل دەمێ ئاش دئێخستە کاری بۆ تەحینێ، دا هەمی گوندێن دەور و بەر ئاگەهدار کەن، ل فلان دەمی دێ ئاشی ئێخنە تەحینێ، د وی ماوەی دا هەر ئێکێ کونجی هەبانە دا بەنە سەر ئاشی، چونکە دەمێ د ئێخستە تەحینێ ژ بلی کونجیان هیچ تشتەك دی پێ نەدهاتە هێران، هەتا کونجی خلاس دبوون، دا جارەکا دی بەرێن ئاشی ژ تەحینێ شوون و پاقژ کەن، پاشی دا ئار و ساڤاران پێ هێرنە ڤە.

دیسان ل پاییزێ دەمێ برنجا گرك کرنێ، ل شوینا کتا سەری یا ئاشی دا دارەکێ ستویر یێ بیێ یان دوو سێ فرقەك (قەدێت داری) د ئینان د کولان و خەپە تێرا دکرن (خەپە ل شوینا برغیبا بۆ پێکڤە گرێدانا چەند دارەکان بکاردئینان)، رەخەکێ وی داری د تراشی و قۆرك تێڤەدکرن، ل شوینا کتا سەری یا ئاشی دا وی بکارئینن (چونکە برنج ل بن بەری دا هێتە هویر هویر کرن) لەوما دار بکاردئینا دا برنجی هویر نەکەت، د گۆتنە وی داری (دارێ گرك کرنێ).

### هندەك ئاش ل دەڤەرێ:

ل دەمێ گەریان ل گوندێن دەڤەرێ خۆیادبیت ژ وان شوینوارێن کۆتەلێن ئاشی کا چەند ئاش ل دەڤەرێ هەبووینە، کو هندەك تا نها ژی کار دکەن، لێ پرانیا وان تەنێ وەك شوینوار ماینە.. ل دەڤەرا بەرواری بالا ل ڤان گوندان ئاش هەبوون:

بێدوهـ (٥) ئاش، مایێ (٢)، دێریشکێ (١)، تروانش (٥)، خاری (١)، هێسێ (١)، هەترشێ (٢)، خانکێ (١)، شێلازا (٢)، دەرگەلێ (١)، هرۆرێ (٢)، ئاقارێ چەلکێ (٢)، ئەدنێ (١).. ئانکو ژمارا ئاشان ل دەڤەرا بەرواری بالا د گەهشتە (٢٦) ئاشان، و دبیت ژ ڤێ ژمارێ زێدەتر ژی هەبووینە.

دیسان هەر ژ ئاشێن ل دەڤەرا سپنەی هەبین، ئەڤە هندەکن: ئەرەدنا (٤) ئاش، دیهێ (٤)، زێوا شێخ پیرامویس (١)، ئاشەوا (١)، ئینشکێ (٤)، قەدشێ (١)، بێناتا (٢)، رووبارێ ئامێدیێ (٢)، ئێك ژوان ب ناڤێ (ئاشێ عیسێ) هاتیە نیاسین، ئەوێ دکەڤیتە ب رەخ پرا عیسێ ڤە، ل بنێ رووبارێ ئامێدیێ.

ل بازێرێ زاخـۆ دوو ئاش لێ هەبوون ب ناڤێ (ئاشێ بەگی) و (ئاشێ شەهابی).. هەر دیسان ل شەرانشێ (٦) ئاش لێ هەبوون، و ل داسیکێ (٣) ئاش لێ هەبوون (کو دکەڤنە بەرامبەر کۆمەلگەهێن بێرسڤێ و دەرکارێ، بۆ لایێ باشووری) دبێژن ئاڤا وان ژ سەر خیزاڤا را د هاتە سەر وان ئاشان ب رێ یا جۆیەکێ ب ناڤێ (جۆیا میری)(*).

ئەڤە هندەك نموونە بوون ل دوور هەبوونا ئاشان ل دەڤەرێ، کو تەنێ دا ب سەلمینن کا چەند ئاش ل دەڤەرێ هەبوون، چونکە ژیارا خەلکی هەمی ل سەر داهاتێ ناڤخۆیی بوو ژ لایێ خۆراکی ڤە، وەك (دەخل و برنج و جەهـ و نیسك و ماش و نۆك و گەنمۆك و کونجی و گارس و ..هتد) کو ئەڤە هەمی پێدڤی ب قوتان و هێرانێ هەبوون، لەوما ئاش وەك کارگەهەکا بەرهەمهێنانا خۆراکی یا گرنگ بوویە ژ بۆ ژیانا خەلکێ کوردستانێ یێ رۆژانە، ئانکو ژیارا وان ل سەر داهاتێ ناڤخۆیی بوویە.

## ئاشێن تا نهۆ ب ئاڤێ کار دکەن:

رەنگە ل هەرێما کوردستانێ ژی وەکی هەمی وەلاتێن دی یێن دەوروبـــەران پشتی پێشکەفتنا تەکنەلۆجی ب خۆڤە گرتین و کارگەهێن مەزن هاتینە دامەزراندن و ب ئەلکتریکێ یان گازوایلێ کاردکەن، کارێ ئاشێن ئاڤێ کێمبوویە، کو نها ئەگەر مابن ژی پرانیا وان ب کارەبێ کاردکەن، بەلێ دیسان هندەك تا نها ژی ماینە ب ئاڤێ کاردکەن، تایبەتی ئاشێن تەحینێ، چونکە هێرانا (ئار و ساڤار و دانهێرك و ..هتد) نها هەمی ب رێکا کارگەهێن مەزن دهێنە بەرهەمهینان، هەر چەندە کارگەهێن مەزنێن تەحینێ ژی هەنە، بەلێ تا نها هندەك ئاش ماینە ب ئاڤێ کاردکەن و تەحینێ بەرهەم دهینن، چونکە ئاشێ ئاڤێ ل دەمێ زڤرینا بەرێن وێ وەکی یێن ب (دینامۆیی) ب ئەلکتریکێ کار دکەن گەلەك گەرم نا بن، چونکە ئەگەر بەرێ وێ گەلەك گەرم بوو، تەحینێ د سۆژیت، بەلێ یێن ئاڤێ هند گەرم نابن تا تەحینێ ب سۆژن، لەوما ژی تەحینا ئاشێن ئاڤێ خۆشترە و خەلك پتر حەز ژ وی دکەن.

ل رووبارێ ئامێدیێ تا نها دو ئاش هەنە ب ئاڤێ کاردکەن و تەحینێ بەرهەم دهینن، ئەوژی ئاشێ (بەیازێ)یە کو دکەڤیتە نێزیکی خواندنگەها قۆبا (مەدرەسا قۆبا) ل رووبارێ ئامێدیێ، هەر دیسان ئاشێ (عیسێ)یە کو د کەڤیتە بنێ رووبارێ ئامێدیێ ب رەخ پرا عیسێ ڤە، و هەتا نها باشترین تەحین ل دەڤەرێ یا ڤان دو ئاشانە و ب تایبەت تەحینا ئاشێ عیسێ.

## هندەك ئامویرێن دی یێن هێرانێ:

ژ بلی ئاشێن ئاڤێ ئەوێن ل دەڤەرێ بۆ هێرانا دەخل و دانی دهاتنە بکارئینان، هندەك ئامویرێن دی ژی هەبوون، دەخل و دان پێ دقوتا و دهێران، ئەوژی (دستار، جۆهنی، گرك، مدارە، میرکوت)، کو ئەڤە ل پرانیا گۆندان دمشەبوون، هەلبەت ئەڤان ژی گرنگیا خۆ بۆ خەلکێ گۆندان هەبوون، چونکی ئاش ل هەمی گۆندان نەبوون، ئەو گۆندێن لێ هەین ژی گەلەك جار ل سەر دبوو دوور (گەر)، ئەڤجار خەلك نەچار دبوو هندەك ئامویرێن دی بکاربینن، کو

میرکوت



دستار



ژ ئاشان ب ساناهی تر بن، ئەڤەژی دانەناسینەیەکە بۆ وان ئامویران.

**میرکوت (دنگ):**

دارەکێ ستویراتییا وی نێزیکی (٢٠سم) چ ئەڤ دارە یێ گرۆڤر بیت یان ب شێوێ لاکێشەی بیت، درێژیا وی نێزیکی (٣٠سم) بوو، دا نیڤەکا وی کون کەن، و دا دارەکێ درێژیا وی نێزیکی (١م)ە و ستویراتییا وی هندی دەست بڤرەکی یان کێمتر بایە دا کەنە د وێ کونێ را بۆ کەنە دەستك، ئەڤ دنگە یێ تایبەت بوو ب قۆتانا دەخلی دەمێ ئامادە دکر بۆ ساڤار و دانقۆتی، و قوتانا کونجیان، چونکە ب وان دنگان، قەلپێ دندکا دەخلی و کونجییا د سەردا د بر پشتی د هاتنە نماندن.

**دستار:**

دستار: ئامویرەکێ هێرانا دانییە و یێ پێکهاتییە ژ دو بەرێن پەحن و خڕ و خڕ وەکی بازنەکی و ئەڤ بەرە جۆرەکێ تایبەتە و دبێژنێ بەرێ دستاری یان ئاشی و ل دەڤەرێن ژووری یێ هەی[٤].

د شێوێ دورستکرنا خۆدا وەکی بەرێن ئاشینە و ژ هەمان بەر دهێنە دروستکرن، بەلێ بەرێن دستاری، فرەهیا وان نێزیکی (٥٠سم) ستویراتیا بەری (١٥سم)، ئانکو سەنگا هەر کتەکا بەرێ دستاری نێزیکی (٤٠ ـ ٥٠کیلو)ا بوو.. بەرێ بنی نیڤەکا وی کون دکر و دارەك تێرا ئاسێ دکر و بلنداهیا وی داری هندی ستویراتیا کتا سەری بوو دگۆتنێ کوریا دستاری یان نێرکا دستاری، دا ل دەمێ زڤراندنێ کتا سەری خۆ ل سەر بگریت، دیسان کتا سەری دا لایەکێ بەری کون کەن و دیسان دارەکێ درێژیا وی نێزیکی (٣٠سم) و ستویراتیا وی هندی دەست بڤران بوو د گۆتنێ دەستك (کو جهێ دەستێ کچ و کوڕان بوو ل دەمێ زڤراندنا وی)، دا د وێ کونێ را ئاسێ کەن، دەستێن خۆ دهاڤێتنە وی دەستکی و دستار پێ دزڤراند، هەر ل نیڤەکا کتا سەری ژی کونەك تێ دکۆلا دا دارێ کتا بنی تێرا هاتبا، و دڤیا ئەو کون ژ وی داری فرەهتر بایە، چونکە دان ژی د وێ کونێ را

جوهنی



ب دەستی د گەل بادانا دستاری دكرە ناڤبەرا هەردوو كتان دا، دا بهێتە هێران.

**جۆهنی:**

ژ بەرێ گەنمی دهاتە دروستكرن، دا بەرەكێ گەنمی یێ نێزیكی (٥٠سم) بلند و (٥٠سم) فرەه ئینن، لایێ سەر یێ بەری دا راست (حولی) كەن، پاشی نیڤەكا وی دا كۆلن كویراتیا وی نێزیكی (٣٠سم) فرەهیا وی (١٥ ـ ٢٠سم) بوون، و ڤی جۆهنی ل بن نیوانیەكی (لیوانكەكێ یان بەرسڤكەكێ) دا عەردی كولن و وی بەرە جۆهنی كەنە دعەردی ڕا رویێ وی راستە عەردی كەن و ئاسێ كەن.. و جۆهنی پێدڤی ب پارچەكا دی هەیە دبێژنێ دەستە جۆهنی، دا ل بەر رووباران ل دەستە جۆهنیەكی گەڕن، ئەڤ دەستە جۆهنیە بەرەكێ گەنمی موكم یێ ئاڤی بوو، دڤیا یێ حولی بایە بلندیا وی نێزیكی (٣٠سم) بوون، ستویراتیا وی (١٥سم)، یێ گرۆڤرە.. جۆهنی قۆتان ل سەر هێزا دەستان بوو، هەلبەت قۆتانا جۆهنی ژی هندەك جار ب دوو دەستكان بوو، ئانكو دوو ژن دا هەر ئێك دەستە جۆهنیەكی هەلگریت، پشتی دانێ خۆ دكرە جۆهنی، دا هەر ئێك دەستە جۆهنیێ خۆ ل وی دانێ د ناڤ جۆهنی دەت و راكەت، دا یا دی دانیتێ، دیسان جۆرەكێ تایبەتێ سترانان هەبوون د بەر جۆهنی قۆتانێ ژی را دهاتنە گۆتن.

***گرك:**

د شێوێ خۆدا وەكی دستاری یە، بەلێ گرك ژ دارەكێ موكوم وەكی تویێ یان بییێ دهێتە دروستكرن یان ژی ژ كسل یان گێچێ دهێتە دروستكرن، چونكە ئەو بۆ سپیكرنا برنجی نە، لەوما دڤیا یێ سڤك بیت دا دندنكێن برنجی هویر نەكەت، ئانكو سەنگا وی دبیت نەگەهیتە (٥كیلو)ا، برنجی پێ گرك دكەن، لەوما دبێژنێ گرك.

ئەڤە ئامویرەكێ تایبەتە بۆ سپیكرنا برنجی یێ ب قەلپ ئانكو ئەوێ دبێژنێ (پشلویك)، و پشلویك ئەوە یێ پشتی برنج دئێتە دورین و گێرەكرن دانێ برنجی دمینیت و یێ ب قەلپە، لەوما دبێژنێ (پشلویكێ برنجی) یان (پویشكێ برنجی) و دێ ڤی پشلویكێ برنجی ب ڤی ئامیرەی گرك كەن، كارێ گركرنێ ژی وەكی كارێ هێرانا دەخل و دانی یە ئەوێ ب جۆهنی دهێتە هێران.

**مدارە:**

ئامویرەكێ بەری یە بۆ قۆتانا دانێن خوارنێ ب قەبارێن گەلەك ئانكو هەروەكی جۆهنی یە و هەر

مدارە



ب وی كاری رادبیت لێ ب رێژەیێن كەلەك.

ئەڤ ئامویرە چونكی یێ مەزنە دناڤ خانی دا نائێتە دانان، چونكی یێ پێدڤی جهەكێ فرەهە لەوما دێ ل جهەكێ ژ دەرڤە هێتە دانان كو مەیدانەكا كێماتی ب فرەهیا (٨ ـ ١٠م) بیت.. یان ژی ل حەوشەكا خانی یا فرەهـ.

پشتی ڤی جهی بۆ دەستنیشان دكـەن دێ ئاڤاهیەكی ب بلنداهیا ئێك مەتری یێ گرۆڤر ئانكو بازنەی ئاڤاكەن.

مدارە یا پێكهاتیە ژ دو بەرێن پەحن یێن كەلەك مەزن و كرۆڤر (بازنە) ب فرەهیا (١,٥م) و هەردو كت نیڤەكا وان یا كون كریە.. دێ كتا بنی راست ل سەر فرەهیێ پەحن داننە سەر وی ئاڤاهیێ هاتیە ئاڤاكرن و ئاسێ كەن و نیڤەكا وی دارەكێ ستویر كەنە تێرا كو ئەڤ دارە یێ ستوینی بیت ل سەر رویێ بەری ب درێژاهیا (٧٠-٨٠سم) و سەرێ ڤی داری ب درێژاهیا (١٠-١٥سم) یێ زراڤ كریە.

كتا سەری دێ ئینن دارەكێ ستویر كەنە دكونا نیڤەكا وی را و ب درێژاهیا (٢,٥-٣م) كو ژ مەودایێ كتا بنی زێدەتر لێ بیت ب درێژاهیا نێزیكی (٨٠-١٠٠سم) و دێ ڤی داری تێرا ئاسێ كەن و دێ بەرێ كتا سەری ب وی دارێ درێژ ڤە داننە سەر كتا بنی لێ ئەڤ كتا سەری پێدڤیە ب كەڤیتە سەر لایێ خۆ ئانكو سەر (تی یێ خۆ) و هۆسا دارێ نیڤەكا وی یێ درێژ دێ ل سەمتا دارێ ل نیڤەكا كتا بنی را بلند بوی و دێ كونەكێ ل ڤی دارێ كتا سەری كەن ب قەداری سەرێ دارێ كتا بنی یێ كو سەرێ وی زراڤكری و دێ وی دارێ كتا سەری یێ درێژ ئێخنە سەردارێ كتا سەر چێكری و دێ هەردو كەڤنە د ئێك دا و پێكڤە ئاسێ كەن.

بۆ قوتانا دەخل و دانا وەكی دانقوتی و ساڤاری و دانهێركی دێ پویچەكێ شل كەن (تەركەن) و دێ ل سەر كتا بنی بەلاڤەكەن دێ و دەوارەكی (هێستر یان هەسپ)ەك ئینن ل بەر سەرێ دارێ درێژ یێ كتا سەری و ل بەر وێ پشكا داری یا زێدە ژ مەودایێ ئاڤاهیێ كتا بنی كو دار بكەڤیتە پشت دەواری و نێركەكێ كت داننە سەر ستویێ وی و دێ دو وەریسا كو هەر ئێك ل لایەكێ تەنشتا دەواری بچیت و دێ ب نێركێ ل سەر ستویێ دەواری ڤە ئاسێ كەن و گرێ دەن. و سەرێن دی یێن وەریسی دێ ب دارێ كتا سەری یێ مدارێ ڤە گرێدەن.. پشتی دان ل بەر مدارێ دروست دبیت دێ دەواری هاژوون كو ب رێڤە بچیت چونكی یێ گرێدایە یێ نەچارە بەردەوام ل دۆر كتا بنی بزڤریت و ب ڤێ زڤرینێ دێ كتا سەری ل سەر تیێ وی ل سەر دانی زڤریت و ب گرانیا خۆ دێ قەلپێ دانی خۆ ژ دندكێن دانی بەردەت و ب بەردەوامی ب ڤی كاری دێ ئەڤ جوینە خلاس بیت و دێ ڤی جوینی راكەن و جوینەكێ دی داننە بەر و هۆسا هەتا هەمی دانێ هەر مالەكێ خلاس دبیت[٥].

## بەرهەڤكرنا قویتێ زڤستانێ:

ل وەرزێ پاییزێ، پشتی خرڤەكرنا هەمی دەخل و دانی، خەلك دا دەست ب بەرهەڤكرنا هێران و قوتانا دەخل و دانێ خۆ كەن، و بەرهەڤیەكا باش بۆ زڤستانێ و لێكدانا قویت و مشتیێ پەز و حەیوانێن خۆ و دار و دویێن سۆتنێ كەن، ژ بەر رێكێن گوندان ژ دەوروبەران د هاتنە برین.. ئەڤجار ل وەرزێ پاییزێ دا خەلك دەست ب پاقژكرنا دەخل و دانێ خۆ كەن، پاشی دا وی دەخلی كەلینن دگۆتنێ (كەلاندنا ساڤاری)، و دا ل سەر بانان ل بەر هەتاڤێ حشك كەن، دووڤرا دا دەست ب قۆتانا ساڤاران كەن، كو هەر شەڤەكێ دا بۆ مالەكێ كەنە شەڤەرۆك (كارێ قوتانا ساڤاری یا تایبەت بوو ب زەلامان ڤە)، پشتی ژ قۆتانا ساڤاران ب دووماهی دهاتن دا دەست ب هێرانا وان كەن، گەلەك ژ خەلكێ نەدشیان ببەنە سەر ئاشی چونكە ئاش ل هەمی گوندان نەبوون، و دیسان گەلەك جار ل سەر ئاشی دبوو دوور (گەر - سرا) زوی گەرا ئاشی نە دگەهەشتێ، لەوما ل هەر گوندەكی چەندین (دستار و جۆهنی و مدارە) هەبوون، دەخل و دان یێ دهێران و دقۆتان، هەلبەت شەڤەرۆكێن ساڤار هێرانێ ژ كارێن هەری گرنگێن گوندان بوون، ئەڤ شەڤەرۆكە ژ لایێ (كچ و كور، ژن و زەلامان) پێكڤە

دهاتە ئەنجامدان، كو دبوونە دەستك دەستك و سترانێن تایبەت ب شەڤەرۆكان ڤە دبەررا دهاتنە گۆتن.. و خودانێ شەڤەرۆكێ ژی پاشیڤێن خۆش بۆ وانێن ل شەڤەرۆكا وی ئامادەبووین بەرهەڤ دكرن، سەرەرای ئەڤە ئەنجامدانا كارەكێ ب زەحمەت بوو ژی بەلێ دیسان بۆ وان گەنجێن ل شەڤەرۆكان ئامادە دبوون كارەكێ زەوقی ژی بوو.

تێبینی: بۆ چێكرنا چەند خوارنەكێن ل خوارێ دیاركری، گەلەك مفا ژ پەرتووكا (كارسازیا كوردەواری(*)) هاتییە وەرگرتن.

**چێكرنا ساڤاری:**

ساڤاركرن ئێك ژ پێدڤیێن ژیانێ بوون ل كوردستانێ، چونكی: خوارنا وان یا سەرەكی بوو و د نەچاربوون بكەن، ژ بەر كو رێ ژ بەر بەفرێ د هاتنەگرتن و ئالاڤێن هاتن و چوونی مینا نها د مشە نەبوون.

كرنا ساڤاران ل داویا هاڤینان و بەربەركی پاییزان د هاتنەكرن، هەر مالەكا ساڤاردكر، گەنمەكێ بژارە بۆ وێ چەندێ د دا رەخەكی، چونكی لاوینیا ساڤاری ل سەر لاوینیا گەنمی بوو و پێدڤی بوو ژ جۆرە گەنمەكێ گر هاتبا چێكرن، و ژ كەڤن دا و هەتا نها ژی ژ گەنمێ جۆرێ ئیتالی یانژی ژ گەنمێ زەرگۆل و دانحێشترك د هاتە چێكرن چونكی ئەڤ جۆرە ژ هەمی جۆرا چێترن بۆ چێكرنا ساڤاری.. بۆ چێكرنا ساڤاری دێ گەنمی ژ ئێك جۆرێن هاتینە دیاركرن ئینن كو تێرا ساڤارێ سالێ هەمیێ بكەت جۆدا كەن و پاقژكەن و دێ مەنجەلا خۆ دانن.

ساڤاركرن د چەند قۆناغانرا دەربـاز د بوو، ل بەراهیێ گەنم بەرهەڤدكرن كو بێژینگ دكرن و ل هندە جهان د هێتە قەدكرن، واتە هلاڤێتن و وەربادانا گەنمی د ناڤ سێنیەكا مەزن دا دا بەر و گلگلە ژ ناڤ بهێنە ڤاڤارتن، پاشی مەنجەلێن تایبەت یێن مەزن بەرهەڤدكرن، كو هندەكا هەتا نێزیكی (١٠) وەزنە (تەنەكە) یێن گەنمی ب ئێك جار دكرنێ و رادگرتن و دكرنە ساڤار، ئەگەر مەنجەلا مەزن ب دەست نەكەفتبایە دا دو یان سێ مەنجەلێن بچویكتر ئینن كو هەر ئێكێ (٣ ـ ٤) تەنەكە (وەزنە) چووبانێ.

ل دووڤدا و ل رۆژا ساڤاركرنێ دێ مەنجەلا خۆ یان مەنجەلێن خۆ ئینن هەر ب چ قەبارە بن و داننە سەر كوچكەكێ تایبەت و بەروەخت كو ژ بەرا بۆ چێ دكر و ئاگری ل بن هەلكەن و ئاڤێ كەنێ و دێ گەنمێ خۆ شوون و بەردەنە مەنجەلا و دێ ئاگری بەردەوام ل بن خۆش كەن و كەلینن هەتا كو ئەو گەنم دوەرمیت و پۆف دبیت و دكەلی.. و نیشانا كەلینێ ژی ئەو بوو كو دەمێ كت و ماتێت دندكا د پەقین (ژ بەر پۆفبوونێ)، ئانكو چێبوو و گەهشت، و ل ڤی دەمی دبێژنێ یێ بوویە دانیك. و ئەڤ دانیكە دئێنە خوارن و بچویك وەكی رەوشت و تیتا دا بۆ خۆ سێنیكا ئینن و دا وان دانیكا بۆ كەنێ و بچویك دا خوێ پێوەركەن و خۆن.

پشتی ئەڤ گەنم (ساڤار)ە دكەلی دابیتە دانیك، دا ئاگری ل بن كێم كەن و بیتە زبارا رائێخستنێ كو چەند ژن و زەلام پێ رادبن و باراپتر د جحێلن، ب ئاغلەویكا، یانژی ب مەربێلا دانیكا كەنە سەلكێن شڤكا و تەنەكا و گوینیكا و ئاڤا سار لێ كەن، پشتی د ڤەوەربا، یان ئاڤا وێ كێم د بیت و دا بەنە سەر بانێ ڤالا كەن و بەلاڤەكەن و رائێخن كو تەنك ببا و ستویر نەمینیتە ل سەر ئێك دا زوی هشك ببیت و .. چونكی ئەگەر ستویر بمینیتە ل سەر ئێك زوی هشك نابیت و گەلەك جارا دێ بێن ترشونە بیت و تاما وی ساڤاری دێ نەخۆشبیت.. پشتی كریارا رائێخستنێ دێ هەلامەتەكی (مامكەكی) مینا مرۆڤی د ناڤ چوكلینن دا چویچك نەخۆن، یان هندە جاران مرۆڤ ل بەر رادوەستیان. هەژییە بێژین كو بەری كەلاندنا ساڤاری پێدڤییە ژنكێت مالێ بانێ خۆ ب هونین و ڤەهۆسین و حولی بكەن و حازر بكەن بۆ رائێخستنا ساڤاری ل سەر.

پشتی ساڤارێ خۆ هەمیێ دبەنە سەر بانی و رادئێخن دێ مینیتە ل سەر بانی ب شەڤ و رۆژ و ل بەر هەتاڤێ و رۆژێ جارەكێ یان دو جارا دێ هەمیێ تێكڤە دەن داكو روویێ وی یێ ل بەر بای و هەتاڤێ بێتە گهۆرین و دێ بەردەوامبن هەتا باش هشك

دبیت، و پشتی هینگێ دێ کوم کەن و زۆر جارا هەر ل سەر بانی ژنك دێ پاقژ کەن و دەنە بای و کەنە جوهالا و ئیننە خوارێ. پاشی دێ قۆناغا قوتانا ساڤاری دەستپێکەت، ئەوژی ب دوو رێکان دهێتە قوتان، ئەگەر ب میرکوتك (دنگا)ن ب قوتن، ژ لایێ زەلامان ڤە دهاتە ئەنجامدان.ل دەمێ ساڤار قۆتانێ ل گوندان دەست ب شەڤەرۆکێن ساڤار قوتانێ د کەن.. دا وی دەخلێ بۆ ساڤاری بەرهەڤکری، دا هندەك ئاڤێ لێ کەن، دا تیڤلێ وی نەرم ببیت، ل ناڤ خانی وی دەخلی کەنە نیڤا ژوورێ (کو دڤیا ئەو جهێ ساڤار لێ دقوتان، نە ل ڤاتێ دوویێ یێ خانی بایە، بەلکو دڤێت بنێ مەزەلێ ل سەر ئاخا کتری «خانیێن ئێك نهۆمی» بایە، دا ل دەمێ ڤۆتانێ کارتێکرن ل هەلاشێ «بانێ « خانی نەکربایە».. دا چەند میرکوت (دنگان) کو ل دووف پێدڤیا خۆ، دا ئینن، زەلام ژی دا ل بەر وی دەخلی راوەستن چ جۆت جۆتە یان چوار چوارە، دەست ب ڤۆتانا وی دەخلی کەن، دگۆتنە ڤی کاری شەڤەرۆك، دبەر ڤۆتانا دەخلی را جۆرەکێ سترانێن شەڤەرۆکان دبەررا دهاتنە گۆتن، هەتا هەمی ئەو دەخل دهاتە ڤۆتان و تیڤلێ وی دسەردا دچوو.. و ئەگەر ب جۆهنیان هاتبا قوتان ئەڤە پتر ب ژنان ڤە گرێدای بوو، هەر ئەو ژی ب رێکا چەند ژنان ڤە دکرە شەڤەرۆکا ساڤار قوتانێ، دا دو دو ژن لنگێن خۆ د بەر جۆهنی را دناڤێکرا هاڤێژن و هەر ئێك دا دەستە جۆهنیەکێ هەلگریت، دیسان دا دەخلێ خۆ یێ کەلاندی هندەك ئاڤێ لێکەن، تەرکەن و هەر جارەکێ جۆهنی تژی کەن و دەست ب قوتانا وی کەن، هەتا تیڤلێ وی د سەردا دچوو، دێ وی ژ جۆهنی ڤالا کەن و هندەکێ دی کەنێ، دیسان هەر بێهنەکێ دا ئەو ژنك دەستك دەستك ئێك دوو لێك گۆهرن، هەتا درەنگی شەڤ شەڤەرۆك دبەردەوام بوون، هندەك سترانێن تایبەت ب شەڤەرۆکان ڤە دبەررا دگۆتن.. پشتی دهاتە قوتان ب هەر چ رێك با، دا هەمیێ پێکڤە بەنەڤە سەر بانی و رائێخن ل بەر هەتاڤێ، هەتا هشك دبوو، پاشی دا خرڤەکەن و ب دەستی پەرخینن، دا تیڤلێ وی خۆ ژ دانی بەردابایە و پاشی دا دەنە بای، هەتا ئەو قەلپکێ د سەردا چووی هەمی ژ ناڤ دچوو، دگۆتنە وی قەلپکێ ژ ناڤ دچوو (سڤی).. پێدڤییە بێژین سڤیا ساڤاری ژنان ئەو سڤی بۆ دروستکرنا بالیفکان ب کاردئینان، چ بۆ پالدانێ یان دانانە بن سەرێ خۆ بۆ نڤستنێ.

پشتی ئەڤ کارە خلاس دبیت، دێ چەند مالەك پێکڤە کارێ خۆ کەن و ساڤارێ خۆ بارکەن و هندەك جارا ژنك ژی دگەل خۆ دبرن و دچوونە سەر ئاشی ل گوندەکێ ئاش لێ هەی، بۆ هێرانا ساڤارێ خۆ.. پتریا جاران د بوو دوور (گەر) ل سەر ئاشی، بەلێ دەمێ دوورا وان دهات، دەمێ ئەو دانێ قوتای ل ئاشی کەن و هێرن، پاشی ئەوێ دهاتە هێران ژ لایێ وان ژنان ڤە ل بێژینگێ دکر ژ بۆ ژێگرتنا سەرۆکێ وی ئانکو ساڤارێ گر و دێ جارەکا دی ئەوێ گر ل ئاشێ کەنەڤە هەتا ساڤارێ وان هەمی خلاس دبوو.. دا ساڤارێ خۆ بارکەن و ئیننە ڤە.

ئەڤ ساڤارێ هێرای سێ جۆرە لەوما پێدڤی ژێك ڤاڤارتنێ یە، یێ ئێکێ یێ گرە دێ ئینن ل بێژینگێت هویر کەن و هندی دانێ ب سەر بێژینگێ دکەڤیت و ئەڤ جۆرە ژ هەمیێ گرترە و ئەوە یێ ئەم دبێژینێ ساڤار و گرارا ساڤارێ ژ دهێتە لینان.. و جۆرێ دوویێ یێ ب بن بێژینگێ کەفتی پشتی ساڤار ژێ هاتیە ژێ گرتن و ئەڤێ مای ژی ب خۆ دوو جۆرەیە (دوو دەستە).. دێ هەمیێ ل موخلەکا گر کەن و ژ ئێکگرن، یێ ب سەر موخلێ دکەڤیت دبێژنێ هویرکێ ساڤاری یانژی (سمیتك)، ئەڤ جۆرە ژی دئێتە ب کارئینان بۆ لێنانێ و خوارنێ.. جۆرێ سێێ ئەو دەستە یێ ژ یێ دوویێ هاتیە گرتن و دموخلێ دا چوویی و ب بن موخلی کەفتی و دبێژنێ (بندان) یان ژی ئار ساڤارك چونکی وەکی ئاری یە لێ ب کێر نانێ عەدەتی نائێت.. ب ڤی شێوەی دێ هەر ئێك ژ وی دانێ هاتینە ژێك جوداکرن، هەر ئێکی ژ وان دێ ل دەمێن پێدڤی بۆ خوارنێ ب کارئینن.

بەلێ ئەگەر ئەڤ ساڤارە ب رێکا دستاری ل گوندی هێرا بان، خودانا مالێ دا دانێ خۆ هەر ب هەمان رێکێن بەری نها بەرهەڤ کەت بۆ هێرانێ،

و دێ جیرانێن خۆ هەمیان ئاگەهدار کەت، کو ئەڤ شەڤە، شەڤەرۆکا ساڤار هێرانا وانە، کوڕ و کچێن گوندی هەمی دێ وێ شەڤێ ل شەڤەرۆکێ ئامادەبن، دێ دەستك دەستك کوڕ و کچ پێکڤە دەست ب هێرانا ساڤاری کەن ب رێکا دستاری، ئەگەر دانێ خودانێ مالێ گەلەك بیت، دوو سێ دستاران ددانن و هەر دستارەکی چەند دەستکێن کوڕ و کچان ئێك و دوو لێك دگوهۆرن، جۆرەکێ تایبەت سترانا ب شەڤەرۆکان ب ناڤێ (سترانێن شەڤەرۆکان) د بەر ساڤار هێرانێ را دبێژن، دیسان خودانا مالێ بۆ وان پاشیڤەکا خۆش ئامادەکەت (چونکە ئەگەر پاشیڤا وان ب دلێ مێهڤانێن شەڤەرۆکێ نەبا، هندەك سترانێن وەکی ـ مە دەوینە ـ د بەررا دگۆتن، کو خوادانا شەڤەرۆکێ دزانی پاشیڤا ب دلێ وان نەبوو، لەوما دا رابیت پاشڤەکا دی بۆ ئامادەکەت).. هەر ب هەمان رێکا بەری نهۆ ساڤار دهێنە موخلك و بێژینك کرن و ژێك ڤاڤارتن.

ساڤاری جهێ خۆ د ناڤ گۆتنێن کوردی ژی دا گرتییە:

**-ساڤار ئالیکا مێرانە.**

**- ساڤارێ مێران بێنۆ بێنۆ د کەلت.**

**- چو نەدیتی ساڤار (دانهێرك) لێ عەیدە.**

**- ئادارێ، ئاگر خۆشترە ژ ساڤارێ.**

**چێکرنا دانهێرکی:**

دانهێرك ژی ژ جۆرەکێ گەنمێ گر دئێتە چێکرن وەکی ساڤاری ئانکو ژ گەنمێ جۆرێ (ئیتالی یان زەرگۆلی).. دێ ئینن گەنمێ خۆ پاقژ کەن و بێ کەلاندن قوتن، ب جۆهنییان یان ب میرکوت (دنگا)ن، هەر وەکی ساڤاری، لێ جیاوازیا دناڤبەرا ساڤاری و دانهێرکێ ئەوە کو دانهێرك نا ئێتە کەلاندن و رێژەیا قوتانا دانهێرکی پترە ژ رێژەیا قوتانا ساڤاری و دبێژنە قوتانا دانهێرکی (کرش کرن).. پشتی ژ قوتانێ خلاس دبیت دێ ل سەر بانی ل بەر هەتاڤێ و بای رائێخن هەتا هشك دبیت و دێ کۆمکەن و پاقژکەن و دەنە بای داکو سڤیا وی هەمی ژێ دەرکەڤیت و دێ بەنە سەر ئاشی (ئەگەر برنە سەر ئاشی) هەر دگەل دانێ ساڤاری بۆ هێرانێ، هەر ب هەمان رێکێن ساڤار هێرانێ دانهێرکێ ژی د هێرن.. و ئەگەر ل گوندی ب دستاری ژی هێرا، هەر ب هەمان رێکێن ساڤار هێرانێ، دانهێرکی ژی ب رێکا شەڤەرۆکان دهێرن.. ل دەمێ هێرانێ و موخل و بێژینك کرنێ ئەوژی دبنە سێ جوین، یێ ئێکێ یێ گر دبێژنێ دانهێرك و یێ دوویێ یێ هویر دبێژنێ هویرکێ دانهێرکی یانژی (سمیتکێ دانهێرکێ) و ئەڤ جۆرێ دوویێ بۆ لێنانێ کێم دئێتە ب کارئینان چونکی دئێتە هەلگرتن بۆ چێکرنا هەمی جۆرێت کوتلکا.. و هەر وەسا ئارکێ وی ژی دگۆتنێ بندان یان ئارکێ دانهێرکی و دگەل ئارکێ ساڤاری دهاتە تێکەلکرن و دکەنە شلك یانژی سەوك.

**چێکرنا دانقوتی:**

هەر ل دەستپێکا دەست ب چاندنا دەخل و دانی کرین، ل کوردستانێ ژی چەندین جۆرێن گەنمی پەیداکرینە و چاندینە، چونکە بۆ هەر جۆرەکێ خوارنێ جوینەکێ گەنمی یێ باشتر بوو، لەوما بۆ چێکرنا دانقوتی، جۆرەکێ گەنمی بکاردئینان دگۆتنێ (سماقی)، ئەڤ گەنمە ژی گەنمەکێ گر بوو و ئەڤ جۆرە ژ هەمی جۆرا باشتر بوو بۆ دانقوتی.

سالانە ژنێن مالێ دێ تێرا دانقوتێ خۆ یێ سالێ هەمیێ ژ ڤی جۆرێ گەنمی ژێ گریت و هەلگریت، ئەڤی گەنمی دا ژنك پاقژکەت و هەلاڤێژیت (دەتە بای)، ئەڤ کارە ژی ب کار دئینان بۆ گەنمێ بەر دناڤدا هەبانە.. دا ژنك گەنمێ خۆ ئینیت و پویچ پویچە کەنە ئامانەکێ داری، وەکی سینییەکا بچویك دگۆتنێ (شکەفك) و دێ گەنمێ خۆ ب ڤێ شکەفکێ هەلاڤێژیت کو ئەو گەنم ب لایەکی ڤە پویچ پویچە ژ شکەفکێ کەفتبا لایەکی و هەتا دووماهیکێ دێ پویچەك تێدا مینیت و دگەل چ بەرێت تێدا هەبن و دا وی خالی کەنە رەخەك و دگۆتنێ (سەربەر)، و هەتا گەنمێ وان یێ تەرخانکری بۆ دانقوتی خلاس دبیت.. دێ وی گەنمێ کومبویی یێ بەر تێداماین و دبێژنێ سەربەر دێ جۆدا و ب تنێ ب دەستی ئەو بەر ژێ دئێنە گرتن و ژ نوی کەنە ناڤ گەنمێ پاقژ.

پشتی گەنمێ خۆ پاقژدكەن و دێ پویچ پویچە قوتن ب جۆهنی و هەتا تیڤلێ خۆ باش رادهێلێت و ژ خۆ بەرددەت ب قوتانێ.. پێدڤییە دانقوت پتر بهێتە قوتان ژ ساڤاری و دانهێركی ئانكو وەسا باش بێتە قوتان هەتا كو باش سپی دبیت و كاكلكا نیڤەكێ دەردكەڤیت.. پشتی دانێ خۆ هەمیێ دقوتن دێ بەنە سەر ئاڤێ و باش شوون داكو هویرك و سڤیا وی ژێ جۆدابیت و بمینیت دانقوتێ سافی، و پشتی هینگێ دێ ئینن ل بەر هەتاڤێ رائێخن هەتا هشك دبیت و پشتی هشك بوونێ دێ ب دەستی باش پەرخینن داكو چ سڤیا پێڤەمای خۆ ژێ بەردەت و دەنە بای دا ژ سڤیێ خلاس ببیت و دێ دەست بژار كەنە ڤە ژ بەرا و چ تشتێ زێدە دناڤدا مابیت و دێ هۆسا دانقوت یێ دروست بیت بۆ كەلاندنێ و خوارنێ و گەلەك جارا هندەكێ ژ ڤی دانقوتێ نیسك تێڤەددان و دا جۆدا هەلگرن.

دانقوت دئێتە ب كارئینان بۆ لێنانا دانقوتێ و نۆك دكرنە ناڤ و باجان رەشك و هەستی ئەگەر هەبانە دكرنێ و دكەلاندن و دخوارن.. هندەك جارا دانێ دانقوتێ دئێتە بكارئینان بۆ مەرەڤا لێنانا گرارا نیسكێ ل شوینا برنجی.

**چێكرنا تەحینێ:**

پشتی ل دەستپێكا وەرزێ پاییزێ، كونجی وەك هەر دەرامەتەكێ دی دهاتە خرڤەكرن، دا دەست ب پاقژكرنا وان كونجیان كەن، كو دا دەنە بایی، ل دووڤدا دڤێت كونجی هاتبانە سپیكرن، ئانكو ژ قەلپكرنێ، و ئەڤ كارە ل سەر دەمێن كەڤن دهاتە كرن، دائینن كونجیێن خۆ كەنە گوینیكەكی یان جهالكەكی و كەنە دناڤ ئاڤە سویركێ دا، هەتا ئەو كونجی د نمیان، پاشی دا ئینن هەر د وی ئامانێ تێدا هاتینە نماندن، ب رێكا (میركوت) دنگا قوتن، هەتا تیڤلێ وان د سەردا دچوو و كونجی سپی دبوون.. پاشی دا ل بەر هەتاڤێ رائێخن، هەتا زوها دبوون، دووڤدا دا ب دەستی پەرخینن داكو كونجی ژ قەلپێ خۆ ڤەببان، و دا دەنە بای یان دا ل بێژینگێ كەن هەتا كونجی و قەلپێ وان ژێك ببن، و دا وان قەلپان هاڤێژن و كونجیێن رویس و سپی كری تنێ مینن.

پاشی دێ وان كونجییان ل بەر هەتاڤێ رائێخن، هەتا باش هشك دبن، پاشی هندەكا ژ وان كونجییان دا هەلگرن بۆ هندەك خوارنێن تایبەت وەك كادەیان.

وەكی مە بەری نهۆ ژێ ئاماژە پێ كرییە ل دەمێ ئاش دئێخستە تەحینێ هەمی گۆندێن دەور و بەر ئاگەهدار دكرن كو ئاشێ ئێخستیە تەحینێ، دا خەلك ژی كونجیێن خۆ بەن دانتە دوورێ.. هەر ئێكی دوورا وی د هات، دا كونجیێن وی د خەمیرێ دا قەلینن، پشتی قەلاندنێ دا رائێخن هەتا سار دبوون، دا جارەكا دی دەنە بای، ئەگەر گلێشەك یان قەلپەك مابیتە ل ناڤ دا ژ ناڤ چوبایە، پاشی دێ ل ئاشی كەن، هەتا دهێتە هێران و دبیتە تەحین، ل دەمێ تەحین وەك سركێ ژ بەرێ ئاشی دهێتە خوارێ، تەنەكێ ددەنە بەر وێ سركێ هەتا تژی دبیت، پاشی دێ وێ راكەن و ئێكا دی دانە بەر، و هۆسان تەحین دهێتە دورستكرن، تەحین خوارنەكا سەرەكی بوو، نەخاسم ل دەمێ رێنجبەریێ، ب تایبەت نان تەحینك (تەحین و دۆشاف).

تێبینی:

گەلەك ژ ڤان زانیاریێن ل دوور ئامویر و خوارنێن مە بەحسكرین، تا رادەیەكێ باش مەژی پێزانین ل سەر هەبوون، دگەل ژێدەرێن مە ئاماژە پێكرین، مە شیا ڤی بابەتێ ژێ داریژین (بەرهەڤكەر).

# سترانا فولكلۆری ل دەڤەرا بەهدینان

بەرهەڤكرن: جەمیل شێلازی

## دەستپێك:

گومان تێدا نینە كو دەولەمەندترین تایێ دارا فولكلۆرێ كوردی تایێ سترانێ یە، كو د ناڤ ڤی دا چەندین چەق ژێ دچن، دناڤ ڤان چەقان دا هەموی ژیانا كوردەورای ژ لایێ (جڤاكی و ئابووری و سیاسی) ڤە دهێتە بەرچاڤكرن، لەوما گەلەك گرنگە دهەمی بواران دا ل سەر سترانا كوردی ڤەكۆلین و هەلشكافتن بهێنە كرن، دا كو سترانا مە یا فولكلۆری بۆ بەرەبابێن مە و هەموی خەلكێ جیهانێ بهێتە نیاسین و دەولەمەندییا وی بناسن.

## ستران:

كەڤنترین پشكا ئەدەبێ فولكلۆری یە، كو وەك پشكەك دیارە ژ سترانا لیریكی، ئەڤ هۆنەرە ژ كەڤندا پەیدابوویە، كو ل وی دەمی هێشتا هوشیارییا مللەتی د رادەیەكا نزم دابوو[1].. سترانێ جهەك باش دناڤ ئەدەبێ زاردەڤێ كوردی وەرگرت، ژبەر پەیوەندییا وێ ب بیرەوەری و خۆشیێن كوردی ڤە، بۆ وێ چەندێ دچن كو ستران گەلەكا كەڤنە، چونكی دگەل هوشیاریێن كوردان یێن دەستپێكی (ئایین، جڤاكی، فەلسەفی .. هتد) ئانكو دەمێ كوردان دەست ب (نێچیر و چنینا دەرامەتی و شڤانەتیێ و پاشی چاندنێ و ..هتد) كری[2].

هندەك زانا بۆ وێ چەندێ دچن، كو سترانێن شڤانان كەڤنترین جۆرێ سترانێ یە، چونكی شڤانەتی ل نك وان ژ چاندنێ كەڤنترە، هەر چەندە هندەك زانایێن دن ژی هەنە كو شڤانەتی و تەرش و كەوال ب پشكەك ژ چاندنێ ددانن.. بەلێ ئەز وەسا دزانم ئەگەر ستران ژ دەمێ كاركرنێ پەیدابببیت، ئەڤە مرۆڤی هەر ل دەمێ مرۆڤی دەست ب چنینا فێقی كری و دەستپێكا ژیانێ ستران هەبوویە[3].

## تایێن سترانێ:

دناڤ فولكلۆرێ كوردی دا دەولەمەندترین تا تایێ سترانێ یە، لەوما دێ بینین چەندین تا و چق ژ سترانا فولكلۆری دچن، هەر چەندە تا نۆكە چەندین بۆچوونێن جیاواز ل سەر تایێن سترانێ هەنە، لێ پرانییا وان ل سەر ڤان تایێن خوارێ د هەڤگرتی نە:

١ـ سترانێن ئادە و دورینا و زباران.

٢ـ سترانێن داوەتێ (سەرێ زاڤایی و نارینكێت بویكێ).

٣ـ سترانێن كۆر و كچا، ئەڤیندارا (حەیرانۆك ـ دلێنی).

٤- سترانێن پیرەپاییزۆكا.
٥- سترانێن دستار هێرانێ (شەڤەرۆكان).
٦- سترانێن بێری و شڤانان.
٧- سترانێن زارۆكان (هەڤال هەڤالۆشكێ).
٨- سترانێن د بەر لاندكێ را (دەلۆری).
٩- سترانێن هێزۆكێ.
١٠- سترانێن شەڕ و جەنگان (لاوك ـ گەلێری).
١١- سترانێن زێماری - پێ گۆتنێ (تازیا - شینیا).
١٢- ستایشێت ئۆلی[٤].
١٣ ــ سترانێن نێچیر و نێچیرڤانان.
١٤ ـ سترانێن ئەڤینیێ.
نموونە بۆ هەر تایەكی:

## ١- سترانێن ئادە و دورینا و زباران:

سترانێن ئادە و دورینان و زباران تایەكێ گرنگە دناڤ سترانا فولكلۆری دا چونكە گەلەك بۆ چوون بۆ هندێ د رێككەفتی نە كو ئەڤ جۆرێ سترانێ یەكەمین تا بیت پەیدابووی، چونكە:

(هاتییە دیاركرن ژ لایێ ڤەكۆلەرێن شوینواران ڤە، كو كوردستان ژ وەلاتێن دەستپێكێ یە بۆ چاندنێ، نەخاسمە ئامویرێن چاندنێ و دورینێ ل گوندێ (چەرمۆ) هاتینە دیتن.. ئەڤ چەندە ژی (د.عەبدولفەتاح عەلی یەحیا)[٥] و (بروفیسور هـ. أ. رایت)[٦] و (تەها باقر)[٧]، د نڤیسینێن خۆدا دایە خویاكرن..)[٨].

ژیانا سەختا جڤاكێ كوردەواری نەچار كرینە گەلەك كاران بكەن مینا: (جۆت و كێل، خودانكرنا تەرش و كەوالی، چاندنا دەرامەتی، ..هتد)، كو ئەڤە هەمی ب كەسەكی و دو وانڤە نەدهات، لەوما زبارە بۆ ئێك دكرن، هەر ژ دورینا دەخل و دانی و ئادێن برنجا و چلی برێ و كۆلانا رەز و زەڤییان و ئاخەبانان... هتد)، كو د گەل ئەنجامدانا ڤان كارێن گەلەك گران هندەك سترانێن تایبەت ب ڤان جۆرە زباران ڤە دهاتنە گۆتن، كو ئەڤەژی دبوو هۆیەكێ هاریكاریا ئەنجامدانا كارێن خۆ بێی هەست ب وەستیانێ بكەن، د گەل ئەنجامدانا كارێ زبارێ دەمەكێ خۆش پێكڤە دبۆراندن.

ژ وان سترانێن د زبارێن ئادە و دورینان دا دهاتنە گۆتن، هندەك ژێ ئەڤەنە: (های هەوە هەوە، پیربووم پیربووم، كەو بۆنە جۆت، شەكر ئاغا، كاروانە، هات رەنی، یار هۆی خەجێ، عەیشۆكێ، هۆ لەیلێ، مەنجێ، رویبارە، عەدلێ، دێ ب كۆلن، مالا دەینە، خەزال، گەنم، مە دەوینە، هات كولندە كولندە، لاوكێ جەلالی، هۆلێ، دێ ب هێرە، چوخك، های بێری، شكەفكا كێ یە؟، حەسۆك، حەیات، لاگدیا پیرەمێرا، ئەو كیە تراری تاری؟، هاب جەلا جەلالییا، غەریبكا عەسمانا.. هتد).

ئەڤ جۆرێ سترانان ل بەر بەركێن ئادە و دورینان دهاتنە گۆتن، كو دا پالە بنە دو دەستك، دەستكەكێ دگۆت و یێ دی ڤەدگێرا، بەردەوام دبوون هەتا كارێ خۆ ب دووماهی دئینان.

ئەگەر دەخلەكێ گەلەك زبان و كونجر تێێ هەبانە سترانەكا تایبەت پێ دهاتە گۆتن، ئەوژی ئەڤەیە:

**ئەم چووینە زەڤیا كونجرە**
**گەهەشتم زەڤیا كونجرە**
**ڤان كونجرا نرە نرە**
**لاو دەركەتن، كوڕ دەركەتن دێ بن پالە**
**كونجر ددەستی دا یێ بێ حالە**
**كوڕا دەست دابوو شالۆكا**
**لاوا دەست دابوو شالۆكا**
**بێت خوینن تەیر و توكا**
**لاو رێز بوون بەر بەروكا**
**ئەڤ بەرۆكە ڤێ هەلبرن**
**ئەڤ بەرۆكە بێت گرتینە**
**كونجرێ چو حالێ خۆ نینە!!**[٩]"

## ٢- سترانێن داوەتێ (سەرێ زاڤایی و نارینكێت بویكێ):

سترانێن سڤكن ل دیلان و سەما تێنە گۆتن.. گۆڤەند ل بەر دهاتنەكرن و ب سەلیقە و كێش و قافیەنە.. ناڤەرۆكا وان ب جوانی و تولازیا زەری و ئەسمەرا هاتینە ڤەهاندن یان ژی ب هندەك بویەران

هاتینە گۆتن و بووینە پەستە یان سەلیقا سڤك بۆ دانایە.. کێش و قافیا دیلوکا وەك کێش و قافیا هەمی سترانێن دنن.. د ڕەسەنن و هەمی توخمێد برگا یێن تێدا هەین وەك شەش، حەفت و هندەك جارا بووینە یازدە، ب زمانەکێ سڤك و بژوین هاتینە گۆتن[۱۰].

سترانێن داوەتان تایەکێ بەربەلاڤە دناڤ هەمی جڤاکێن کوردەواری دا، چونکە تایێ ژ هەمی تایا تا نۆکە دهێتە بکارئینان، تایێ سترانێن شەهیان و دیلانانە، ئەڤ تایە ژی چەند چەق ژێ دچن، ئەوژی ئەڤەنە:

**أ. چوونا بویکێ:**

بۆ چوونا بویکێ چەندین سترانێن تایبەت ب ڤی چەقی ڤە هەنە، وەکی: (ئەمێت هاتینە تەوۆ، نەگری نەلۆرینە، بابێ تە بابێ تەوۆ، مە درەنگە.. هتد).

**ب. دەست خەناکرن:**

ل دەمێ چوونا مالا بویکێ ل شەڤێ پشتی هەمی هەڤال و هەڤدۆستێن بویکێ و کەس و کارێن وێ ئامادەبن، دێ ئەو بەربویکێن ژ مالا زاڤایی چووین، دێ دەست ب خەناکرنا دەستێن بویکێ کەن و دبەرڕا سترانێن تایبەت ب خەناکرنێ ڤە بێژن، وەك: (ئەز چوومە تێلێ، های ژووردا ژووردا، چ دارا ل ناڤا دارا، عەزیزا من دێ وەرە، ڤان زولفان خۆش سێران یا هەرێ دیلانێ، های بلبلۆ، هات عولیێ چوم عۆلیێ، نارینێ هەی نارینێ نارێ، نارین ژ مالێت مالدارا، خانیکێ ڕەخ ئاڤاری، ئەڤ شەڤە بنڤە تێرە، نارینێ دەیکا منێ ..هتد).

هەر د هەمان شەڤ دا ل مالا زاڤـای ژی رێو رەسمێ خەناکرنا زاڤای دکەن، کو هەمی مرۆڤ و کەس و کارێن زاڤای و گوندیێن وی ل وێرێ ئامادە دبن، چونکە ل نك هەمیان گەلەکا گرنگ بوو هەر ئێك هندەك ژ خەنایێ ددتبلا خۆ بدەت، دبیت ل نك هندەکان وەك کارەکێ گەلەك گرنگ بوو، دڤیا تبلا خۆ خەناکربایە.. هەر د بەر خەناکرنا تبلا زاڤای دو دەستکێن گەنجان دا دەست ب سترانێن دیوانان یێن تایبەت ب شەڤا خەناکرنی ڤە بێژن کو دەستکەکی دگۆت و ئێکی ژی ڤەدگێرا.. ژ وان سترانێن ل شەڤا خەنا زاڤای دهاتنە گۆتن: (های ژووردا ژووردا ژووردا منێ گول بەیازێ، چ دارا ل ناڤا دارا، عەزیزا من دێ وەرە...هتد).

**ج. سەرشویشتنا بویکێ:**

ل دەمێ شویشتنا سەرێ بویکێ چەندین ستران دبەرڕا دهێنە گۆتن، ژ وان: (ئەردێ نارین لێ شویشتی، یا من دیت مەشیا ل ناڤا ڕەزی ئای هەرێ جەمالێ، کا عەردێ بویك لێ شویشتی..هتد).

**د. چوونا بویکێ و کارکرن و ئینانا وێ:**

دەمێ بویك ئامادەکرن و دگەل سویارکرنا وێ دەست ب گۆتنا سترانان دکەن، وەکی: (مە درەنگە گەلی بەربوییا، دێ نارینێ ب دەرینن، بینە دەرێ ژ خانی، ئو نارینکێ های نارێ های نارێ، داوەت هاتە حەوشا مەزن، های ڕابۆ راوەستایی، بینە دەرێ ژ خانی، نارینا من یێ هی یێ، یار های چەڤرێ یار های چەڤرێ، خەزالێ، ..هتد).

**ە. نارینکێن ل مالا زاڤایی بۆ بویکێ:**

ل دەمێ گەهاندنا بویکێ بۆ مالا زاڤایی چەندین ستران دهێنە گۆتن، وەکی: (زراڤێ وەکی داڤێ، یا لبن دارێ یا ل بن دارێ، ئاڤکێت کوتەلێت ئاشا، نارۆ باهیڤا هشکە، کەپرۆکەك چێکر، گوزێ، بویکا منێ، سێلوانێ، چنێ، بارانکەك بارێ، پێرۆ ئو گلاڤێژن، بێژنە بێربوکێ، قاز قازێ، ئەسمین خان، گەلێ قەوالێ، نەگری نەلۆرینە، نەکی، ..هتد).

**ت. گاڤا زاڤای دبەنە سەرشوویێ و زڤراندنا وی بۆ مالا داوەتێ ل ناڤ زەلامان:**

پشتی بویکێ دگەهیننە مالا زاڤای، دێ زاڤایی بەرەڤ سەرشۆیێ بەن دا سەرێ وی بشۆن، هەر ل دەمێ برنا وی دەست ب گۆتنا سترانان دکەن، وەك:

(زاڤای ببنە سەرشویێ، زاڤای ببەنە سویلاڤێ،های نوی زاڤا، زاڤا ڕابە درەنگە، چ دیوانە دیوانەکا تەنگە، های نوی زاڤاوۆ، دێ بیننە ژوور، من حەیفا جۆتێ لاوا، کەلیا چارێ چ خۆش مەکانە، دیلم دیلانێ، مەگلانا خۆش مەگلانا، های مومێ، شیر ل بەر چەنگی نابزڤیت، ..هتد).

### ی ـ سەرێ زاڤای ل دیوانێ:

پشتی زاڤای ژ سەرشویێ دزڤرینن و ل مالا داوەتێ (جهێ زەلامان) دادنن، دێ دەست ب سترانێن تایبەت دیوانا سەرێ زاڤای کەن، وەکی: (دێ ببەنە مالێ، دیوانا ل سەر دیوانێ، کانیا ل چیایی، کەوێ، سەرۆ زاڤانە، خان واڤدەل، ..هتد).

### ك ـ برنا زاڤای بۆ سەر جهێ وی:

هەلبەت شەڤا یەکێ ژ داوەتێ گرنکترین شەڤە ژ شەهیانێ هەمیێ، نەخاسم ل دەمێ برنا زاڤای بۆ سەر جهێ وی، چەندین سترانێن تایبەت ب ڤێ ڕێ و ڕەسمی ژ هەنە، ژ وان: (بەرێ سپێدەیە، دیوانا ل سەر دیوانێ، وەرە کولانێ دەیکا زاڤای، ..هتد).

### ل ـ ل ڕۆژا پاشتر سپێدێ:

دەمێ دونیا ڕۆهن دبوو برازاڤا و چەند کەسەکێن نێزیك زاڤای دا بەرەڤ ژوورا بویك و زاڤا چن بۆ ژ خەو ڕاکرنا زاڤای برنا وی بۆ جهێ زەلام لێ دروینن، هەلبەت ل ڤێرە ژی چەندین سترانێن تایبەت هەنە، ژ وان: (سپێدەیەکێ زوی ڕابووم، ئامێدیێ کر تەکبیرە، ..هتد)، و ب تلیلی و ڕەقس و سەما زاڤای دبەنە جهێ وی.

### م ـ ڕۆژا دووێ یا گۆڤەندێ:

د ڕۆژا دووێ یا داوەتێ دا دەست ب دیلانان دهێتە کرن، زەلام ل جهێ خۆ و ژن ل جهێ خۆ و ژ وان سترانێن ل گەرا گۆڤەندێ دهێنە گوتن: (های دیلانێ دیلانێ، دێ بهەژینن دێ بهەژینن، خان مەرجان، ڕێزا مالا هێشتا دخەوە، بابلەك و بابلەکانێ، شێخانی، خان ئاڤدەل، دیلانۆکێ دیلانێ، کەو بۆنە جۆت، های هۆلێ هۆلێ هۆلێ، های زەری، ..هتد).. و داوەت و شەهیان و دیلان دمینیتە بەردەوام تا نێزیکی مەغرەب.

ل دەڤەرا بەهدینان چەندین پەرتووك ل دوور سترانێن شاهی و دیلانان و ڕێز و سەر و بەرێن داوەتا هاتینە چاپکرن، ئەڤە ژی هندەك ژ وان ژێدەرانە:

١. صادق بهائەددین ئامێدی، ڕێز و سەروبەرێت ژنئینانێ و کەڤنە شەهیانە و گۆڤەند، بەغدا - ١٩٨٥.
٢. حەجی جەعفەر، سترانێن داوەت و گۆڤەندێت کوردان، بەغدا ـ ١٩٨٦.
٣. کامیران بەرواری، پەروا چیا، بەغدا - ١٩٨٦.
٤. نورەددین سەعید مستەفا، گۆڤەند، بەغدا - ١٩٨٦.
٥. ئەمینێ ئوسمان، ژیان و ڤیان، بەغدا ـ ١٩٨٦.
٦. کامیران درباز هرۆری و شڤان شکری هرۆری، دهۆك - ٢٠٠١.
٧. کامیران نەبی بەرواری، نارینك و سەرێ زاڤای، هەولێر - ٢٠٠٥.
٨. مستەفا حسین، دیلۆك ـ سترانێن دروین و دیلانان، دهۆك - ٢٠٠٥.
٩. محەمەد حەسەن بناڤی، ژ ڕەوشت و تیتالێن کوردەواری، هەولێر - ٢٠٠٦.

## ٣ـ سترانێن کور و کچا، ئەڤیندارا (حەیرانۆك - دلێنی):

ئەو سترانن ئەوێن ب ئەڤینییێ و بەر دلکی پێ تێنە گوتن.. دناڤ کۆمەلا کوردی دا د بەلاڤن نەخاسمە دناڤ زەری و تۆلازادا، لەوا کول و کەسەرا ڤێکرا دا درێژن و گل و گازندە و کرفتارێدا خوە دکەنە هۆزان و ستران و ئاوازا و ئالێ ئەڤینی و دلداریا پاك و بژوین دیار دکەن.. ئێك ژ ساخلەتێن سترانێ ئەوە کو دشێن بەحسێ ڕامویسان و بەر و بەرسنگێدا کەچا بکەن د سترانێ دا.. ئەڤ جۆرێ سترانێ کەچ و کوڕ دهاڤێنە بەر ئێك[11].

هەر چەندە هەتا نهۆ دو بۆچوونێن ژێك جودا هەنە ل دوور حەیرانۆكێ كو بۆچوونەك دبێژیت حەیرانۆك نە تایەكێ سترانێ یە، بەلكو خواندنەكا ئیلقائی یە، لێ بۆچوونا دووێ حەیرانۆكێ دهەژمێرن تایەكێ سترانا فولكلۆرێ كوردی، ب تایبەت ژی ئەڤ تایە پتر توخیبێ دەڤەرا بەهدینان (داسنیا) ب خۆڤە دگریت، ئانكو ئەم دشێین بێژین ڤی تایێ سترانێ تایبەتمەندییا خۆ هەیە ب دەڤەرا بەهدینان ڤە.

## حەیرانۆك:

ئەڤ پەیڤە وەك خۆیایە كورتكرنە ژ پەیڤا (حەیران) كو پشكەك مەزن و بەلاڤە د سترانا كوردی دا، هەر وەسا ب پاشپرتا (ۆك) كورتكرییە و هاتییە بچویك كرن ژ بۆ ئەگەرێ خۆشكۆكرنا بابەتی و كورتییا رێز و بەیتێن وێ[12].

حەیرانۆك جۆرەكێ تایبەتێ سترانێ یە دناڤبەرا ئەڤینداران دا (كچ و كوڕان)دا ب ئەڤینا ئێك و سالۆخەتێن بەژن بال و جوانی و كار جل و چەك و خەملا ئێك ڤەهاندینە و دەربڕینێ ژ ئەڤینا ئێك دكەن.

كو ئەڤ تایە دناڤبەرا زەری و لاوك و ژنا كورد دە، لەوا چاخێ ڤەدگێرن و ئەم دبینین ل نێڤبەرا دو كەسانە، كول و كەسەرا ڤێكرا دا درێژن و گل و گازندە دبنە هۆزان، دبنە ئاواز، دەست پێ كرن ژی بڤی ئاواكی یە:

ـ كور دبێژیت:

**كچێ دینێ .. یان كەچێ دینێ.. هەر هۆسا هەتا حەیرانۆك ب دوماهی دێت.**

**یان بەرۆڤاژی گۆتنا مە.**

ـ كچك دبێژیت.. یان كچ دبێژیت:

**كوڕۆ دینۆ.. یان كوڕكۆ دینۆ.. یان كوڕا دینا..**

بڤی رەنگی، ب چەند دیمەنەكێن جوان و كورت مینا چار خشتەكیەكێ دهاڤێتە بەر ئێك و دو[13].

دەربارەی حەیرانۆكێ (عەبدورەحمان مزویری) دبێژیت: (.. چونكی گشت ستران و لاڤژە و لاوك و حەیران و حەیرانۆكێت مە شێعرن .. (كێش و قافی یێ) وان موی دبەرڕا ناچیت.. ژ كێشێت حەیرانۆكا چوار رەنگ هەنە، كو ئەڤ رەنگە د لاوك و ستران و لاڤژێت كوردی دا مشە هاتینە و ل سەر هاتییە نڤیسین و بەلاڤكرن..)[14]. ئەو چوار رەنگ ژی ئەڤەنە:

١ـ رەنگێ ئێكێ (سێ دەنگی) ئانكۆ سێ بڕگەیی، مینا:

**نارینێ..**

**گەنمێ مە یێ كرە**

**مە ب شیڤێ وەركرە**

**سەر سپی، ژ بویكێ جانترە..**

٢ـ كێشا دووێ (چوار دەنگی):

كو دگەل دووێ دبیتە چوار، یان ژی رێز هەمی ژ چوار دەنگا پێكدهێت و هندەك ژی دبنە (٨)دەنگ و پتر یان ژی (٦)دەنگ:

**خەمكێت دلا،**

**ئەم پیركرین..**

**رۆندكێت چاڤا،**

**ئەم كۆر كرین..**

**ڤەنجا خاستین،**

**خرابا برین..**

٣ـ كێشا (پێنج دەنگی):

ئەوژی مشەیە د هۆزانێت زارگۆتنا كوردا دا و ل سەر (٥)ێ دابەش دبیت:

خەما ل من تیر كر

خەما ل من تیركر..

چومە ناڤ دەری، دوستێ هەڤیر كر..

چاڤێ من رەبەنی كەتە قلفا سنگان و بەران

هوسا من سلاڤا خودێ

ژبیر كر..

٤ـ كێشا (حەفت دەنگی)، مینا:

ئەڤ شەڤە، شەڤا خێرا..

مەلایێ چوین مزگەفتا

جۆهیێن چوینە كەنیشتا

فەلەیێت چوینە دێرا..

دا ل ناڤ بەرا جۆت دلا

ڤەبیت دەرگەهێ خێرا[١٥]..

حەیرانۆك تایەکێ سترانا فولکلۆری گەلەکێ دەولەمەندە، کو هەتا نهۆ ل دەڤــەرا بەهدینان چەندین پەرتووك ل دوور دەڤێن حەیرانۆکان هاتینە بەلاڤەکرن، ئەڤە ژی ئەو پەرتووکن:

١ـ سەرفەراز عەلی نەقشەبەندی، دلێنی (حەیرانۆك)، بەغدا ـ ١٩٨٦.

٢ـ ئەحمەد عەبدوللا زەرۆ، حەیرانۆك (سترانا لێریکی)، بەغدا ـ ١٩٨٧.

٣ـ نورەدین سەعید سندی، حەیرانۆك زمانێ ئەڤیندارا، بەغدا ـ ١٩٨٨.

٤ ـ حەجی جەعفەر، حەیرانۆك ژ کەلەپووری کوردی، پشکا ئێکێ، بەغدا ـ ١٩٨٩.

٥ ـ ئیسماعیل بادی، حەیرانۆك (ڤەکۆلین و دەق)، دهۆك ـ ٢٠٠١.

٦ ـ عەبدولعەزیز خەیات، حەیرانۆك، دهۆك ـ ٢٠٠٢.

٧ ـ ئەدیب عەبدوللا، حەیرانۆك نامەیێن ئەڤینداران، دهۆك ـ ٢٠٠٥.

٨ ـ حەجی جەعفەر، ژ کەلەپووری کوردی ـ حەیرانۆك، پشکا دووێ، دهۆك ـ ٢٠٠٧.

٩ ـ جەمیل محەمەد شێلازی، سالۆخەت د حەیرانۆکان دا (ڤەکۆلین)، دهۆك ـ ٢٠٠٨.

## ٤ـ سترانێن پیرەپاییزۆکا: پیرەپاییزۆك:

ژ ناڤێ وان دیــارە کو ل کــەژێ پاییزێ دبێژن هندەك دبێژنێ پیرەپاییزۆك، د هەر بەندەکا سترانێ دا پەیڤا (پاییزێ) ب ئاشکەرایی تێت وەکی چاخ.. هندەك جاران ژی نیشانێن پاییزێ ددانن مینا ستێرا گلاڤێژێ، تەڤیێن باران و بەفرێ، یان با و عەوران.. ناڤەرۆکا پاییزۆکا ئەڤینی و بەر دلکی یە دناڤبەرا کچ و کورا دا، یان کویر نێرینا دونیایێ یە ب ئاوایەکێ فەلسەفی دەمێ بەلك وەراندنا دار و باری[١٦].. کورد ناس (توما بووا) دبێت: پاییزۆك، ئانکو سترانێن پاییزێ، بەندێن وێ کۆر و کچ دهاڤێنە بەر ئێك، دەمێ پاییزێ ژ زۆزانێن بلند تێنە خوار چو جوداهی د ناڤبەرا (پاییزۆکا) و سترانێن دی نینن وەك (لاوك، حەیرانۆك، دیلوك، ..هتد) ژ لایێ کێش و قافیاڤە وەك هۆزانێن سەر بەستن هەر بەندەك بارا پتر (سێ) قافیە ئێك دگرن[١٧].

ئیرۆ پاییزە
منێ نەکریە کار و بارێ زڤستانێ،
کۆچەرێد مال خراب مالێد خوە بارکرنە
ژ وار و کوزێد زۆزانێ،
خوزیکا ئەز بمامە هەڤال و هۆگرێ بەژنا بلند
د سێ شەڤێد کانوینێ دا و
سێ رۆژێد خوپانا ڤێ گۆلانێ[١٨]..

هەر ژ نیشانێت پیرەپاییزۆکان، زەربوونا بەلگێن دار و باری و وەراندنا بەلگان، چ ژی سێڤێن سۆر، چ ژی قر ـ قرا دەنگێ برویسیان، چ ژی دیاربوونا پنییێت عەوران ل عەسمانی، هەتا کو باب و بابیرێن مە ئەڤ عەورە ناڤکرن ب (عەورێت پەشێمانا).. ڤێجا چ پەشێمانێ هندێ بیت، کار و بارێ زڤستانێ نەکر بیت، ژ لایێ قویتی و دار و دویبان و مشتی یێ حەیوانەتی، وەکی دبێژن: (پاییز هات بەرکا فەقیری دریا)[١٩].. یان ژی عەورێن پەشێمانیێ بن، کو کۆچەران ژ زۆزانا بارکرن و بەرەڤ کۆزان ل دەشتێ دچن و دۆست و یار ژێکڤە دبن، وەکی ڤێ پیرەپاییزۆکێ دیارە:

پاییزەك لمن دەست دا،
منێ نەکریە کار و بارێ زڤستانێ..
سەرێ بەریکا مە دخازت،
رەشیشەکێ هویر بارانێ..
دنیا، عالەم زەوجین
ئەز و هەڤالا خۆ مابین
بیە سەرێ پەییزێ
کۆچەرا بارکر ل زۆزانا هاتە خارێ
بیە مەحەلێ دەست ژ هەڤدو بەردانێ..
پەییزەك لمن دەستدا

من چ ژ حالێ خۆ نەزانی[20]..
سەرێ سمریتكی گرتی بەفرێ
جەمەدێ گرتی بەفر و كانی..
دنیا، عالەم زەوجین
من چ ژ حالێ خۆ نەزانی ..
یان ژی ڤێ نموونێ:
پیرە پاییزە، بەفرێ لێ كر
قازی و قولنگا هێلین چێكر
وەیلا ل منێ، كورێ نەمایێ
كەنگی بۆ زڤستان، بەفرێ لێكر
مژ و مورانێ، ل من تێك وەركر
ئەز بەندەوارێ خودێ،
كەتمە سەر رێكا، من چ بۆ خۆ نەكر[21]..
یان ژێ ڤێ نموونێ:
ئەرێ پاییزێ پاییزێ..
پاییزەك هاتۆ، ب لەز و بەز، من نەكر
كار و بارێ زڤستانێ
تۆ دزانی كۆچەرا باركر، دەینابو،
وارێ زۆزانا
بابێ مێرەما دەلال دەینابو،
وارێ دەشتانێ
یارێ دلۆ، بابێ مێرەمێ[22]..

## ٥ ـ سترانێن دستار هێرانێ (شەڤەرۆكان):

دستار هێران و قوتانا دەخل و دانی، یەك ژ كارێن هەرە گرنگ بوون دناڤ ژیانا كوردەواری دا، چونكە د كەڤندا پەیداكرنا قویتێ رۆژانە یێ خۆ ژ ناڤ خۆیی پەیدا دكرن، و ژ بەر نەبوونا كارگەهان ل وی دەمی هزر د كارێ ناڤخۆیی دا كربوون، لەوما ژی قوتانا دەخل و دانی و هێرانا وان وەك كارەكێ سەرەكی یێ خەلكێ گوندان بوون، كو دگۆتنێ (شەڤەرۆك)، ئەوژی دستار هێران و قوتانا دەخل و دانی یە.. هەلبەت قوتانا دەخل و دانی زەلام پێ رادبوون.

ل دووماهیا پاییزا، ل سەرێ زڤستانێ، ل ناڤ گوند و زۆمێن كوردستانێ، ل شەڤێن درێژ و تەنگاڤی، ل شەڤێن خۆش و ساهی، پشتی با و باگێرا، دەمێ قەول و قرارا، دەمێ ژ ڤانا كچ و لاوا، رۆژەكێ ل مالا (میرانێ)، ئێكێ ل مالا (سێلوانێ)، ئێكێ ل مالا (عەیشانێ).. هتد، دەستكێت كوڕ و كچكا، تۆلاز و خوین گەرما، ل دۆر دستارێ بەری كۆم د بوون و دگۆتن:

های مە هێرا هێرا، مە دستار هێرا
سەر سینگێ (یارێ) خرێنا بێرا[23]..

دەستكێن شەڤەرۆكێ وەكو لێلاڤكێ خۆ ددەستكێ دستاری د ئالاند، دەستێن ب بازن و زەندێن وەك كەڤیا بەفرێ د گەل دەستێت لاو كوڕا لێك د هاتنە گۆهرین و وەراندن.. سێنیكێن هژیر و مێویژ و گویز و باهیڤ و هنارا، خۆ د كێشانە گەڕیا شەڤەرۆكێ، هەر وەكو وان ژی د گۆت، بێ مە شەڤەرۆك بێ رەوش و خەملە، ئەم هەڤگۆرێن وەنە، دڤیا ئەم ژی پشداریێ د دگەل وە بكەن.. دەمێ دەستكێ شەڤەرۆكێ برسیبایە، دا ڤێر كەنە سترانا (دیكلكی) و بێژن:

دیكلكێ مەی سۆرە های سۆرە
فڕدا چوو بوو ژوورە های ژوورە
ژ خەسیێ ڤە گوندۆرە گوندۆرە
دیكلكێ سەر ژێ كەن، های سەر ژێ كەن
بارا یارێ فڕێ كەن، های ڤرێ كەن[24]..

هەر دیسان دەمێ دەستكێ دستاری برسی ببان، دا ڤێ سترانێ بێژن، ڤێجا كابانی دا لەزێ كەت چیت پاشیڤەكێ بۆ بەرهەڤكەت، دا بێژن:

| | |
|---|---|
| چوخكێ مەوا مەوا | ئێ ل مالا چوخا |
| چوخكێ مەوا مەوا | كەو مالا چوخا |
| ئەمێت چوینە ڤەوا | ئێ ل مالا چوخا |
| ئەمێت چوینە ڤەوا | كەو ل مالا چوخا |
| پاشیڤ نەدا مەوا | ئێ ل مالا چوخا |
| پاشیڤ نەدا مەوا | كەو ل مالا چوخا[25].. |

هەر ژ وان سترانێن ل شەڤەرۆكان دهاتنە گۆتن، سترانا (مە دەوینە)بوو، كو ئەڤ سترانە دهاتە گۆتن، دەمێ پاشیڤا دوو مالا وەك یەك دەركەتبایە، ئانكو هەكە پاشیڤا شەڤەرۆكا ئەڤرۆكە و دوهی وەك یەك

بوایە، دەستکێن شەڤەرۆکێ دا ڤێ سترانێ بێژن، مەخسەد پێ ئەوبوو، ما دێ هەر شەڤ ڤی رەنگێ پاشیڤێ (خوارنێ) دەنە مە!! دەمێ ئەڤ سترانە دهاتە گۆتن، کابانییا ماڵێ ئێك و ئێك، دا زانیت کو پاشیڤا شڤێدی ژی، ل فلان ماڵێ هەر ئەڤە بویە، ڤێجا دا رابیت پاشیڤا خۆ گۆهوریت.

ستران ژی ئەڤەیە:

مەدەوینە مەدەوینە	هەرسێ دانا مە دەوینە

تبەرکێ شێخ شەمسەدینە	هەر سێ دانا مە دەوینە

تێشت و شیڤ و فراڤینە	هەرسێ دانا مە دەوینە[٢٦]..

تایێ سترانا شەڤەرۆکان تایەکێ گەلەکێ دەولەمەندە ب ڤی جۆرێ سترانێ، کو هەتا نهۆ پەرتووکەك تایبەت هاتییە چاپکرن ب سترانێن شەڤەرۆکان ڤە، ژ لایێ مامۆستا (حەجی جەعفەر)ی ڤە ب ناڤێ (سترانێن شەڤەرۆکا)، بەغدا - ١٩٨٧، کو د ڤێ پەرتووکێ دا ژمارەکا زۆرا سترانێن شەڤەرۆکان تێدانە، ئەڤە هندەك ژ وانە: (دیکل، کەو بوونە جووت، ئەز ل حەوشێوۆ، شەکر ئاغا، کاروانە، هات رەنی، یار هۆ خەجێ، عەیشوکێ، مە هێرا، هۆ لەیلێ، مەنجێ، رویبار، عەدلێ، دێ ب کولن، مالا دەینە، خەزال، گەنم، گندر گندر بارینۆ، هات کولندە کولندە، هێری ل بەر هێری، دێ ب هێرە، دستار، شکەڤا کێ یە؟، ..هتد).. هەر دیسان پەرتووکا (قەفتەکا سترانێن فولکلۆری) یا مامۆستا (حەجی جەعفەر)، بەرپەرێن (٨٩ ـ ١٢٥) ژمارەکا سترانێن مەشك کیانێ ب خۆڤە گرتینە.

## ٦- سترانێن شڤانان:

یەك ژ دەرگەهێن ژیارا جڤاکی یا کوردەواری، خودانکرنا تەرش و کەوالی یە، کو ئەڤە یەك ژ وان دەرگەهانە ل دووڤ هندەکان بۆچوونان یێن ل دەستپێکا ژیانێ هاتینە مەیدانێ، مللەتێ کورد ژ وان مللەتانە یێن گرنگییەکا مەزن دایە خودانکرنا تەرش و کەوالی، چونکە سرۆشتێ کوردستانێ زۆرێ هاریکارە بۆ خودانکرنا وی، هەر دیسان چونکە یەك ژ دەرگەهێن سەرەکی یێن ژیانێ رێچالێ تەرش و کەوالی یە، هندەك مالان پتر ژ (١٠٠ ـ ٢٠٠) سەرێن پەزی ب خودانکرن، یان هەر گوندەکی شڤانەکێ خۆسەر هەبوو، ڤان شڤانان ژی د بەر چەراندنا پەزی دا دەمێ خۆ ب گۆتنا سترانان دبووراند، هەر چەندە سترانێن شڤانان چو تایبەتمەندی نینە، بەلکو سترانێن (حەیرانۆك، کوچك و دیوانا، مێرانیێ، پیرەپاییزۆکان...هتد)، دگۆتن.

هەر جۆرەکێ ڤی تایێ سترانێ (سترانێن بێرییانن)، دەمێ بێریا پارزنکێن خۆ شیرمەشك دکرنە تێدا دهاڤێنە پشتا خۆ و مەنجەلۆکێن خۆ ددەستێ خۆ دگرتن و بەرەڤ بێرێ دچوون، کو گەلەك جار مەخەل (جهێ بێرێ) بۆ ماوێ دەمژمێرەکی ژ گوندی دویربوون، لەوما ب رێڤە بێرییان دەست ب گۆتنا سترانان دکرن، ئەڤ سترانە هندەك جار بێرییەکێ بتنێ دگۆتن، هندەك جاران دبوونە دوو دەستك دەستکەکی دگۆت و ئێکێ لێ ڤەدگێرا، هەتا دگەهەشتنە جهێ مەخەلێ، هندەك ژ وان سترانێن بێریان: (وەرە وەرە حەلیمێ جانێ، ئەمان شالێ، های هەلین، پیربووم پیربووم، دەولەت خان، باشیکێ خۆش باشیکێ، های شڤانا هێ هێ کە ..هتد).

یەك ژ سترانێن گەلەك ب ناڤ و دەنگ ل نك بێریڤانان، سترانا (بێریڤان)ە، ئەڤ سترانە دێتە گۆتن، ل سەرێ بێرێ، ئانکو دەمێ بۆ جارا ئێکێ بێری دچن پەزی و بزنێ دۆشن، ڤێجا بێری دێ چنە شڤانی و ئاڤێ پێدا کەن و گۆپالێ وی شکێنن و کەپەنێ وی درینن، دێ بیتە یاریەکا گەلەکا خۆش د ناڤ بەینا شڤانی و ڤیزا، دەستێت شڤانی ژ شڤانی را بەردانە، چ بکەت دەستویری ژێرا هەیە.. د ڤێ یاریا خۆش دا هندەك ژ بێریا دێ دەستا لێك دەن و ڤێ سترانێ د بەررا بێژن[٢٧]:

**بێریڤان بێریڤان بێریڤان بێریڤان	بێریڤان بێریڤان**

**بێریڤان بێریڤان بێریڤان بێریڤان	بێریڤان چەند جوان**

**سینگێ تە گوڵ و روحان	بێریڤان چەند جوان**

**سینگێ تە گوڵ و روحان	بێریڤان بێریڤان**[٢٨].

## ٧- سترانێن زارۆکان (هەڤال هەڤالۆشکێ):

سترانێن یاریێن زارۆکان (هەڤال هەڤالۆشکێ)، ژ وان تایێن سترانانە یێن زۆر دەولەمەند و چەندین یاریێن زارۆکان ب شێوێ ستران دهێنە کرن.. سترانێن لەیزاندنا بچووکان، هەتا ژیێ سێ سالیێ دگەل بچووکی دچن، پشتی هنگێ بچووك دچیتە ژ دەرڤەی مال ئەو بخۆ فێری رەنگەکێ دی یێ سترانا دبیت، کو دێ بێژنێ (سترانێن بچووکان)، ئەڤ سترانە گەلەك جاران گرێداینە ب هندەك یاریاڤە لەو دێ بێژنێ (ستران و یاریێت بچووکان)، ئەڤ ستران و یاریە هندی بێژی دناڤ بچووکاندا دمشەنە، ئانکو ب ژمار ئەڤە پترن ژ سترانێن لاندك هژینێ و سترانێن لەیزاندنێ[٢٩].

وەکی مە بەری نۆکە گۆتی کو گەلەك سترانێن زارۆکان (هەڤال هەڤالۆشکێ) هەنە کو ژ لایێ زارۆکان ڤە دهێنە ڤەلۆراندن، پتریا وانژی دگەل جۆرێن یاریان دهێنە گۆتن، ژ وان سترانان: (ئکلی دووکلی دوو نوزدە، ڤیڤانێ ڤیڤانێ، کا میرێ کەلێوۆ، کێتکێ سە هاتە تاری، قەسەك هەبوو قەسا کەری، چیچێ چیچێ، هەرێ کێچێ، هەڤال هەڤالۆشکێ، ئەلەڤەن دوو لەڤەن، چ لبن تەیە؟، بویکا بارانێ، حەوایێ حەوایێ، وەرە لبن گوهیشکێ، کونبلۆر و کونبلۆر، جووتیار، کی مریە؟، فات فات، سابینا رەقێ، عەیشۆکێ ترشۆکێ، هێسکێ نوکێ، زلیل .. بلیل، لا اله الا الله محەمەد رەسول الله، بتل بتلکێ، دار تەڤن، بەیتا کێتکێ، ئێکایێ، هۆ شانۆ، بەقێ، کورکۆ، سڤۆرە، عوسمانە...هتد).

ئەو پەرتووکێن ل دەڤەرا بەهدینان ل دۆر یاری و سترانێن زارۆکان هاتینە چاپکرن، ئەڤەنە:

١- سەگڤان عەبدولحەکیم، هەڤال هەڤالۆشکێ، بەغدا - (بێ سال).

٢- محەمەد حەسەن بناڤی، یاریێت کوردی، بەرگێ ئێکێ، چ١، هەولێر - ١٩٨٧.

٣- حەجی جەعفەر، ستران و یاریێت بچووکان، سلێمانی ـ ٢٠٠٥.

٤- خالد صالح، شمشالۆکانێ (هندەك یاریێن ل دەڤەرا بەهدینان)، هەولێر ـ ٢٠٠٩.

## ٨- سترانێن د بەر لاندکێ را (لۆرین):

ئەو توخمێ سترانایە ئەوێ بۆ زارۆکا تێتە گۆتن ل دەمێ هاویژکرنێ یان نڤاندنێ.. رەنگێ هۆزانا یێ لێ و ناڤەرۆکا وان داخازە بۆ ژیانەکا تەڕ و نازك بۆ زارۆکی.. راستی هندی بێژی پەیڤێد سڤك و لێك هاتی نە.. سەلیقەیەکا شرین و سڤك هەیە هندە جارا زارۆکی د بەرڕا دهلاڤێن دا یێ مژویل بیت یان دبەرڕا بنڤیت بارا پتر دایك یان داپیر ژ زارۆیێ خوە ڕا دبێژیت[٣٠].

ئەڤ جۆرێ سترانێ ژی جارەکا دی دبیتە سێ چەق، ئەوژی:

أ - سترانێن لاندك هژینێ.

ب- سترانێن قەبۆ قەبۆ.

جـ - سترانێن لەیزاندنا بچووکان.

أ - سترانێن لاندك هژینێ:

سترانێن لاندك هژینێ چەندین سترانێن تایبەت ب ڤێ چەقی ڤە هەنە، کو پرانیا وان دایك د بەر زارۆکێ خوڕا دبێژیت، دا بنڤیت، وەك نموونە:

هەی لایێ لایێ
ئەزێ لاندکا خۆ لالینم
سبەهیا راکەم، ئێڤاریا زوی نڤینم
ئەزێ دەیکەکا دەیبابی،
بۆ لاندکا ساڤا ژ کیڤە هینم[٣١]..

یان ڤێ نموونێ:

| | |
|---|---|
| داری لاندکا دار هنارە | هایی هایی لێندك |
| داری لاندکا دار هنارە | هایی هایی لێندك |
| یالبەر لاندکا سەربارە | هایی هایی لێندك |
| داری لاندکا دار هژیرە | هایی هایی لێندك[٣٢]. |

یان ڤێ نموونێ:

ئەزێ ب داری لاندکا خۆ بێژم، لایێ لایێ لایێ
ما هەکە ئەز خۆ سەرا لاندکا خۆ، پاڤێمە بەلایێ
ئەزێ داری لاندکا خر ببەمە بانێ ڤێ بێلایێ
ب لاندکا خۆ دادەم تاکەکێ رەش ریحانێ[٣٣]..

ب ـ سترانێن قەبۆ قەبۆ:

دەمێ بچووك رادبیتە سەر پییا، دەیك یان باب.. بچووكی دووری خۆ دكرن، هەردو دەستێن خۆ ژ ئێكڤە دكەت و دبێژیتە بچووكی: (قەبۆ قەبۆ قەبۆ..). بچووك ژی بكەنی ڤە دەستێت خۆ ڤەدكەت و ب غار خۆ لبەر سینگی ددەت.. هوسا دێ بینەكا خۆش یاریا ب بچووكی كەت، بچووك ژی دێ كەنیت و كەیفخوش بیت، هەر وەسا دێ فیری رێڤەچوونێ بیت و پێت وی دێ قاهیم بن.. و دبەر ڤێ چەندێ را هندەك جۆرێن سترانێن تایبەت ژێرا دبێژن، وەكی:

مەرگێ منۆ، بەركەتی
هەكو ژ خانی، دەركەتی
كچكێت گوندی، بدووڤ كەتی[٣٤]..

یان ڤێ نموونێ:

خوْدێوۆ تۆ مەزنكە
ب عەیال و ژنكە
مەرگێ دایێ گۆریكە[٣٥]..

جـ ـ سترانێن لەیزاندنا بچووكان:

هەر ژ جۆرێ سترانێن زارۆكی یێن لەیزاندنا زارۆكی نە كو هاویش بكەن یان بنڤینن، هندەك ژ وان نموونان:

هەی داوۆ هەمەرێ من
هەی داوۆ هەمەرێ من
تۆ ل سەر بانا تووتیكە
تۆ لبەر بانا تووتیكە
گازی كچكێت گوندیكە
گازی زەرپێت گوندیكە
هەچیا جان تۆ ماچیكە
هەچیا كرێت تۆ ڤوتیكە[٣٦]..

یان ڤێ نموونێ:

هەچیێ بێژیت كرێتە
دیوارەك بسەردا بێتە
نەگەهیت ژ بن هەلبێتە
دەستێ راستێ بشكێتە
دەستێ چەپێ بخلێتە

***

هەچیێ بێژیت جانە
خودێ بدەتێ كورانە
رەحمە ل دەی بابانە[٣٧]..

یان ژی ڤێ نموونێ:

خودێوۆ باری تعالا
دەست و پییا بدە تفالا
دا ب پییا بچیتە مالێت خال[٣٨]..

## ٩ـ سترانێن هێزۆكێ:

هەر چەندە دبیت ئەڤ چەقە ژی هەر بكەڤیتە دگەل تایێ یاریێن زارۆكـان دا، چونكە ئەڤە وەك یاریەكێ یە و ستران ژی دبەررا دهێنە گۆتن.. لێ ئەڤ یاریە بارا پتر یا كچكایە، ب تایبەتی ل رۆژێن عەید و سەر سالێ دكرن، برەكا كچكا دا هەر ئێك ژ وان وەریسەكی بەت و سێ چار دارێت حولی و پان و قاهیم، دا دگەل خو بەن و چنە ناف دارا، قەستا دارەكا مەزن كەن وەریسێن خۆ ب تایەكێ وێڤە كەن و دار تەڤنێ خوژی ب وەریسا ڤە گرێدەن و چنە تێدا خو هژینن و فركا ڤەدەن، پێكڤە دا ڤێ سترانێ بێژن:

مە دار تەڤنە، مە دار تەڤنە
گەلی كچكا، مە دار تەڤنە
ئەڤرۆ دێ وەریسا بینن
كچك ژ مالێ بلێ بینن
دار تەڤنێ مە بۆ كیرێ یە
ئەم دێ بێژین، بەر ئاڤێ یە
چاڤێت كوركی، یێ ب كچكێ ڤە[٣٩]..

هەر ژ سترانێن تایبەت ب هێسكێ ڤە، ئەڤ نموونەیە:

هێسكێ .. نۆكێ
گۆهێت حەسەنۆكێ
بێت كەتینە جۆكێ
جۆكا مە یا كویرە
عەسمانێ ژ مە دویرە[٤٠]..

هەر ژ سترانێن هێزۆكێ: (های دوود، های گۆیێ، لۆ پسمامۆ، دێ ب هێرە، هۆلێ، های نازێ، مەنجێ... هتد).. بۆ پتر زانیاری ل سەر سترانێن هێزۆكێ (بنێرە:

حەجی جەعفەر، سترانێن شەرڤەرۆکا).

## ١٠- سترانێن شەر و جەنگان (لاوك - گەلێری):

د ڤادا سترانا کوردی دا لاوك جهەکێ بەر فرەه ڤەدگرن و دبەلاڤن.. ئەو سترانن ئەوێن ب مێرچاکی و شەر و شوراتێن گۆتن.. بار پتر درێژن و بابەتێ وێ ل سەر زیرەکی و چەلەنگییا خۆرت و مێرخاسییا نە و هەر دەم ڤارەمان سەرکەتی یە و شاد و سەر بلند بەر مال تێت.. ئەڤ توخمە ستران ل کوچك و دیوانخانا، دهاتنە گۆتن.. دبونە پالڤەدان بۆ گەنج و تۆلازا کو ریبا مێرچاکی پێ بگرن و خوە بدەنە کوشتن د ریا سەر بلندی و سەرفرازیا ناڤێ خوە.. بارا پتر ژ ڤان لاوکا چار بەندن و کێشەکا درێژ هەنە و ل دوی برگا تێنە لێکڤەکرن و دەنگێ هۆزانا سەربەست دگریت[٤١].

سترانا گەلێری (دیلۆك) تایەکێ گەلەکێ دەولەمەندە دناڤ فولکلۆرێ کوردی دا ب تایبەت ل دەڤەرا بەهدینان، لەوما تەنێ دێ ئاماژێ ب ناڤێ هندەك ژ وان سترانان کەین وەك نموونە، ئەوژی ئەڤە هندەکن: (جەهوەر ئاغا، سمایل ئاغا بابێ خسرۆ، شەمۆیێ خەلەف، شەرێ گەلیێ مێزارێ، شەرێ شابانیێ - صادقێ برۆ، محەمەد ئاغایێ زاخۆیی، مەلا مستەفا، شێرێ بارزان، شەرێ ئاکرێ، شەرێ کەلا میرێ کورە، گەلیێ زیلان، شێخ رەقیب، مەلك یاقو، سوارۆ، لۆ میرۆ، عەلیێ بەتێ، شەرە - شەرە، نەمر ئاغا، چەتۆ، حەمێ مویسێ، شکێرە، سترانا نویرێ، عەمێ گۆزێ...هتد).

ئەو پەرتووکێن ل دەڤەرا بەهدینان ل دۆر سترانێن گەلێری یان کوچك و دیوانان هاتینە چاپکرن ل دەڤەرا بەهدینان، ئەڤەنە:

١- مستەفا نوری بامەرنی، سترانێن کوچك و دیوانا، بەغدا - ١٩٨٦.

٢- شەعبان مزیری، سترانێن کاویس ئاغای، بەغدا - ١٩٨٨.

٣- کامیران درباز هرۆری و شڤان شکری هرۆری، سترانێن گەلێری ((سترانێن ل سەر شەرێن کورد و داگیرکەران هاتینە گۆتن))، هەولێر - ٢٠٠٥، کو د ڤێ پەرتووکێ دا (١١٠) سترانێن گەلێری دناڤ خۆدا کومکرینە.

## ١١- سترانێن زێماری (تازییا - شینییا):

سترانا زێماری تایەکێ گەلەکێ گرنگە دناڤ سترانا فولکلۆرێ کوردی دا، تایەکێ دەولەمەندە چونکە ژ ئەگەرێ وان هەمی رویدانێن د ڤۆناغێن جودا جودا دا د ناڤ ژیانا کوردەورای دا، چەندین شەر و داگیرکرن بسەر دەڤەرێ دا هاتینە و ب سەدان کەس بووین قوربانی، ژ لایێ کەس و کارێن وانڤە ب تایبەت دایکێ ڤە گەلەك جار ستران پێ هاتینە ڤەهاندن و ڤەلۆراندن، وەکی: (سەیدکۆ سەیدەڤانۆ، شەمسیخانێ، براهیمێ حاجی، زینەل بەگ، تێلی تێلی پسمامۆ تێلی، خاجە ئالیخان بەگ، شێخ بهائەددین بامەرنی، سەعید بەگێ مەلکائیزی، حەمێ تروانشی، شاهینۆ، بەگیکێ، محەمەدێ ئاغێ، میرسێڤدین بەگ، ..هتد).

## ١٢- ستایشێن ئۆلی:

ستایشێت ئۆلی یان دبێژنێ لاوژە - لاڤژە، کوردناس توما بووا دبێژیت: سترانێن ئایینی یێن نە ئایەتێن قورئانا پیرۆزن ب راستی ئەڤ توخمە ژی دمشەنە دناڤ سترانێن کوردی دا بەحسێ پێغەمبەری (س) و هەڤالێن وی دکەن و شەرێن وان ل چاخێ بەرێ دەروێشا ب عەربانا ئەڤ ئەڤ سترانە دگۆتن و دبەرزا عەرەبانە دقوتان، ناڤەرۆکا وان ئایینی یەو ب رەنگێ هۆزانا ب کێش و قافیە ڤەهاندینە وەك: نهالا سیسەبانێ و بەیتا بوری رەش و چیرۆکا ئەیوب پێغەمبەر، چەندە هندەك ژ ڤان هۆزانن و خودان یێن هەین بەلێ وەك فولکلۆری لێ هاتینە[٤٢].

سترانێن ئۆلی (ئایینی) تایەکێ گەلەکێ دەولەمەندە و هندەك بۆ چوون وان دزڤرینن بۆ یەکەم تایێ سترانا فولکلۆری پەیدابووی هندەك ژی سترانێن کاری (ئادە و دروینان و زباران) د زڤرینن یەکەم تایێ

سترانا فولکلۆری.. لێ هەر چەوا بیت ئەم دێ ئاماژێ ب هندەك نموونەیان ژ ڤی تایێ سترانێ دەین، ئەوژی وەکی بەری نۆکە مامۆستا (عەبدولکەریم دۆسکی) گۆتی گەلەك ژ ڤان سترانان خودانێن خۆ هەنە و وەك بەیت یان هۆزان هاتینە ڤەهاندن، بەلێ چووینە دناڤ تایێ سترانا فولکلۆری دا وەکی (بەیتا سیسەبانی، قەولێ هەسپێ رەش، هلۆ رابە ئەبۆلقاسم، بەیتا قیامەتێ، بەیتا سەکەراتێ، قەولێ مسکینۆ ژارۆ ئادەمی، گۆە بدەنە بەیتەکا خۆش، بەیتا عەتەمی، بەیتا میر عومەر و دووماهیا شەرێ دمدمی...هتد).

ئەڤ جۆرێ سترانان گەلەك جار ل دیوانان و بیرەوەریان دا سترانێن ئایینی دهاتنە گۆتن ژ لایێ مەلایانڤە یان دەروێش ل گوندان دگەریان و ئەڤ سترانە دگۆتن و داهاتەك بۆ ژیارا خۆ پێڤە ب دەستڤە دئینان.

ژ وان پەرتووکێن ل دەڤەرا بەهدینان هاتینە چاپکرن و ئەڤ جۆرێ سترانان دناڤ خۆدا پاراسیتنە، ئەڤەنە:

١ـ محەمەد ئەمین ئوسمان، دیوانا مەلان، بەغدا ـ ١٩٨٦.

٢ـ محەمەد عەبدوللا زێباری، بەیتێن کوردی، هەولێر ـ ٢٠٠٢.

٣ـ جەمیل محەمەد شێلازی، سێ بەیتێن کوردی ددەستنڤیسا فەق محەممەدێ توخوبی دا سالا (١٣١٧مش/ ١٨٩٩ – ١٩٠٠ز)، دهۆك ـ ٢٠١٠.

٤ـ سەعید دێرەشی، کەلهێن ئاڤا (کۆمەکا ڤەکۆلین و تێکستێن کلاسیکی)، هەولێر ـ ٢٠٠٥.

## ١٣ ـ سترانێن نێچیر و نێچیرڤانان:

ئەڤ تایێ سترانێ پتریا بۆچوونان ئاماژە پێ نەکرییە، ئەڤەژی دزڤریتەڤە وێ چەندێ هیچ ڤاڤارتنەکا زانستی بۆ تایێن سترانا فولکلۆرێ کوردی نەهاتییە کرن، لەوما هەر ئێك ل دووڤ بۆچوونا خۆ ڤاڤارتن (تصنیف)کرنە، مامۆستا (حەجی جەعفەر) ئەڤە وەك تایەکێ سترانێ دانانە، ب هزرا من ژی تایەکێ سەرەکی یە، چونکە نێچیر ل دەستپێکا ژیانێ ل سەر دەمێ (مرۆڤێ نیاندیرتال) پەیدابوویە.. دناڤ جڤاکا کوردەواری ژی دا نێچیر ژ کارێن گوندان بێ رۆژانە یە ل نك هندەك کەسان، لەوما د ناڤ سترانا فولکلۆری دا چەندین ستران هاتییە لۆراندن ب نێچیرێ و گەلەك جار نێچیرڤان بوویە قوربانێ نێچیرێ و ستران پێرا هاتینە لۆراندن مینا: (سەیدکۆ سەیدەڤانۆ، سیابەندێ سلیڤی...هتد).

دەمێ نێچیرێ ب تایبەت پەزێ کویڤی دەمەکێ دەسنیشانکری هەیە کو نێچیرڤان حسابداریێ بۆ بکەت ئەوژی دەمێ گەر و گۆهنێلا کویڤیانە..ئەڤ سترانا خوارێ دەمێ دەستپێکرنا نیچیرێ خۆیادکەت:

ـ جابکەکێ ژ حسابدارا ڤەگێرن،
چ چوویە چریا پێشی
چ چوویە چریا پاشی..
برەکا نێریان و بزنا ڤەرەسیا هەرە کولێ میرا،
ڤی هیردە تراشی..
بزنێ گۆ: تڤەنگەکا ل بابکێ کارا دایی،
بێت لێ سۆتین تحێل و خاشی..
من ژ تە دڤێت تڤەنگەك ژ با(برەهیم پاشا)یی..
دەستە جۆهنیەکێ دەرمانی، دەستێ عاشقا قوتایی..
سوبەهیەکێ ژ رۆژێت گۆلانێ،
پاڤێمە حەجیەکێ گۆلی بەردایی..
مزگینی و سەد مزگینی ل تەبن،
سەر دارکوکێ نێچیرڤانا یا لێ بوویە نەخۆشی! [٤٣] (*).

وەسا دیارە چیایێ مەتینی د سرۆشتێ خۆدا، پەزێن کویڤی حەز ژ سەرێ چیایێ مەتینی کرینە، لەوما ژی ددەڤەکێ بەیتەکێ دا هاتییە:

سوبحان ژ بۆ وی خالقی
کو یێ مەتین چێکری
کیڤی لێ پەیداکری
ل بەر چێکرن چەند چەپەر
خێ ریزا خێ رێتە سەر[٤٤]..

نە تنێ کەسێن ئاسایی حەز ژ نێچیرێ کرینە بەلکو گەلەك ژ پاشایان ژی نێچیر وەك کارەك بۆ

بۆراندنا دەمی كری یە، هەر وەكی پاشایێن ئامێدیێ چەندین چەپەر ل سەرێ چیایێ مەتینی چێكرینە ژ بۆ نێچیرێ.. هەر وەكی ئەو پارچە سترانا بەری نۆكە ئاماژێ پێ دكەت، هەر د پارچا بەری دا ناڤێ (برەهیم پاشای) هاتییە، كو مەبەست پێ ((بەهرام پاشا)یە (١١٠٧ ـ ١١٨٢مش/ ١٦٩٥ ـ ١٧٦٨ز).. هەر دهەمان ستران دا، كا چاوا داخاز دكەت، كو برەهیم پاشا قەستا مەتینی بكەت ژ بۆ نێچیرێ:

دلكێ منۆ، پێ كینە كینە..

برەكا نێری و بزنا، ل كاڤلە میرا ڤەرەسیا چیاكێ مەتینا

جابەكێ ل (براهیم پاشای) ڤەگێرن، دا بێتە چیا دا خلاس نەبنە ڤە، دلێ باییز، ل جهێ باهدینا[٤٥]..

ژ وان چەپەرێن پاشای ل سەرێ مەتینی: (چەپەرێ سەرێ گەلیێ بۆتیا، چەپەرێ سەرێ گەلیێ ئیسفكا، چەپەرێ سەرێ ئەرەدنا، چەپەرێ سەرێ زێوا شێخ پویرامویسی، چەپەرێ سەرێ گوندێ ئەرزێ..هتد)، كو ئەڤ چەپەرە هەمی بۆ پاشایێن ئامێدیێ (بەهرام پاشای) و كورێن وی (ئیسماعیل پاشای و خاجە ئالیخان بەگێ و عەبدولعەزیز بەگ)ێ دزڤرن.. كو ل وی دەمی نەدبوو ژ بلی پاشایان كەس نێچیرا كوڤیان بكەت ژێ، هەر وەكی مامۆستا (محەمەد ئەمین دۆسكی) دنڤسینەكا خۆ دا ڤێ چەندێ دسەلمینیت: (ل دەمەكی ئیسماعیل پاشایێ (ئێكێ) (١١٨٢ ـ ١٢٢٣ مش/ ١٧٦٨ ـ ١٧٩٨ز) نێچیرا كویڤی یا قەدغەكر و هەر كەسێ كویڤی یەك كوشتبا و گەهشتبا گوهێ وی جابا وی ڤرێكەت و تڤەنگا وی ژێ ستینیت و سزا كەت...)[٤٦].

هەر د سترانەكا دی دا ئاماژێ ب (خان ئاڤدەلێ) میرێ هەكاری و خولامێ خۆ چووینە نێچیرێ، بەلێ میری گۆتیە خولامی نابیت تۆ نێچیرێ بكەی: (خان ئاڤدەلێ هەكاری و خولامێ خۆ چووینە نێچیرێ، بشەڤ د شكەفتەكێ ڤە نڤستن، خان ئاڤدەلی گۆتە خولامێ خۆ، نابیت چ پەزێ كویڤی بكوژی (چونكی كوشتنا پەزێ كویڤی بۆ میرا بتنێ بوو) سپێدێ خولام ژ شكەفتێ دەركەفت، ژ نشكاڤە، هند دیت، كو نێرییەك دەق و دەق كەفتە بەر سینگێ وی، وی ژی تڤەنگەك ل نێری دا و نێری كوشت و ژووردا دگەلی دا ئینا خوار.. دەمێ خان ئاڤدەلی، گۆهـ ل دەنگێ تڤەنگی بوی، دەركەڤت داكو خولامی فەلاقە بدەت، چونكی ژ گۆتنا وی دەركەڤت، تمام دەرنەكەڤتی، (كورشێ بەفرێ)، راراڤا و كەڤتە بن بەفرێ مر، ئینا خولامێ وی ئەڤ سترانە پێ گۆت (ل سەر زارێ نێری و بزنێ):

نێریكێ ب سێ دەنگا گازی بزنا سەر جەلەب دكەت،

مزگینی سەد مزگینی، ل من و تە بیت،

خان ئاڤدەلێ میرێ هەكاریا، یێ دزنارا،

كێستەكێ دا فری، تبلكا وییا جەمدی،

ناگریت لەولەبا حەراما سوزینی[٤٧]..

بۆ پتر زانیاری ل سەر سترانێن نێچیر و نێچیرڤانان، بنێرە:

١ـ حەجی جەعفەر، قەفتەك ژ سترانێن فولكلۆری، هەولێرـ ٢٠٠٧، بەر پەرێن (١٢٧ ـ ١٣٣)ێ.

٢ـ جەمیل محەمەد شێلازی، چەند بەرپەرەكێن ڤەشارتی ژ دیرۆكا دەڤەرێ، دهۆك ـ ٢٠١٣، چەپەرێن پاشای ل چیایێ مەتینا، بەربەرێن (٥٦ ـ ٨٤).

## ١٤ ـ سترانێن ئەڤینیێ:

سترانێن ئەڤینیێ تایەكێ سترانێ یە، چێدبیت دناڤەرۆكا خودا بكەڤیتە د چوارچوڤێ پیرەپاییزۆكا دا، لێ نە پیرەپاییزۆكن، چونكی چو نیشانێن پاییزا تێدا نەهاتنە، دیسان پیرەپاییزۆك پتر بێ ناڤن، لێ ڤی جۆری هەر سترانەكێ ناڤەك هەیە، دیسان دبیت ئەڤ تایە بكەڤیتە دگەل سترانێن كوچك و دیوانان دا، لێ د بەنكوك دا ئەڤ تایە دێ بیت دو چەق چەقەك ژێ سترانێن شەڕ و مێرخاسانە (گەلێری)نە، بەلێ ئەڤ چەقە تایبەتە ب سترانا ئەڤینیێ ڤە، كو پرانییا وان ژ لایێ ژنێ ڤە هاتینە ڤەهاندن، ژمارەكا زۆر ژ ڤی جۆرێ سترانێ دناڤ فولكلۆرێ كوردی دا هەنە، مینا: (شەنگە مەیرەمۆوك، حەمێ حێجی، لێ لێ نەمان، سوفی براهیم، شالێ، بێ مال، دوتمام، نازدار، هەی زالم، زیناڤا،

حەمك هەی لێ، ئاغا مەلۆ، لاوکێ ئەرمەنی، ئەسمەر، رۆنی، خەمێ، حزرەتێ جانێ، سەودالیێ، حەلیمێ، شاهینۆ، کنێ، عەلۆ شێنی، ئەمان .. نەمان، مێرەمێ، یار .. یار، دەمکێ خاترا، سمایلاغا، عەمێ گۆزێ، باژێرێ مەعدەنێ، گەلیێ شێخادی، دەلالۆ حەیران، ..هتد).

گەلەك جارا ئەڤ جۆرێ سترانێ دناڤبەرا کوڕ و کچان هاتیە ڤەلۆراندن، هەستێ ئەڤینا خۆ بۆ بەرامبەر خۆیاکریە، وەکی ڤێ سترانێ:

لێ لێ نەمان

لێ لێ نەمان، لێ لێ نەمان..

کچکێ گۆتی:

کورۆ دینۆ، خەما نەخۆ، من بخوازە،

ژ باب و برا، ئەز یا تەمە، ب کەفیل و دەمان

ئەگەر قایل بون، ئەگەر قایل نەبون

من ب ڕەڤینە ببە نك ئاغاکێ ڤان عەجەمان

لێ لێ نەمان، خەم هەلگرۆ سەرێ خەمان

خەما نەخۆ، ئەز یا تەمە، ب کەفیل و دەمان[48]

کوڕکی گۆتی:

کچکێ دینێ، ئەز دەخسیبوم، وەرە دەرێ

قرار و وەعدێت خودێ، سەر من کەفتبین

چی گاڤا دەستێ خۆ پاڤێژمە لەولەبکا

ڤێ تڤەنگێ، قەفتا ڤێ وەروەرێ

تە ل کۆلانا گوندی، ل ناڤ دەستێت باب و برا بینمە دەرێ

تە ب ڕەڤینم ببەم نك ئاغاکێ پشتە دەرێ

لێ لێ، خەم هەلگرۆ سەرێ خەمان

خەما نەخۆ، ئەز یا تەمە، ب کەفیل و دەمان..

تشتێ پێدڤی گۆتنێ ل دوور ڤی تایێ سترانێ، ئەڤ جۆرێ سترانێ ژ لایێ کچ و کوڕان و ئەڤینداران ڤە دهاتە ڤەلۆراندن ،

ل دەمێ چوونا مازیبان و چوونا بێرێ و ئادە و دورینان، شەڤەرۆکان و .. هتد.

## ژێدەر و پەراوێز

1. د.عیزەددین مستەفا رەسوول، لێکۆلینەوەی ئەدەبی فولکلۆری کوردی، چ1، چاپخانا زانکۆی سلێمانی - 1979، بپ 75.
2. علی الجزیری، الادب الشفاهی الکردی، ط2، مطبعة أوفسیت أربیل - 2000، ص165.
3. د.عیزەددین مستەفا رەسوول، لێکۆلینەوەی ئەدەبی فولکلۆری کوردی، ژێدەرێ بۆری، بپ 75.
4. رێکێش ئامێدێ، کۆڤارا (نووسەری کورد)، ژمارە (4)، خولا سی یێ، مایس - 1986، بپ21.
5. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، (کاروان)، ژ (61)، بپ147.
6. بروفیسور هـ. أ. رایت، (کاروان)، ژ (27)، وەرگێرانا/ فۆاد حەمە خورشید، بپ139.
7. عەبدولفەتاح عەلی یەحیا، (کاروان)، ژێدرێ بۆری، بپ150.
8. بۆ پێتر زانیاریان بنێرە: جەمیل محەمەد شێلازی، مێژوویا سالنامێ و دەمناسین دگۆتنێن مەزنان دا، چ1، چاپخانا هاوار، دهۆك - 2007، بپ 78 - 79.
9. ژ زار دەمێ داپیرا من (مراری مووسا)، ژی یێ وێ پێتر ژ (90)سالان بوو، خەلکا گوندێ شێلازا - بەرواری بالا، ل رێکەفتی (17/6/1986)ێ هاتیە وەرگرتن.

* بۆ پتر زانیاری ل سەر سترانێن ئادە و دورینان بنێرە پەرتووکا (حەجی جەعفەر، سترانێن شەڤەرۆکا، بەغدا - 1987).

10. عەبدولکەریم دۆسکی، زاراڤێد فولکلۆری، کۆڤارا (رۆشنبیری نوێ)، ژمارە (111)، سالا - 1986، بپ279.
11. عەبدولکەریم دۆسکی، ژێدەرێ بۆری، بپ278.
12. ئەحمەد عەبدوللا زەرۆ، حەیرانۆك (سترانا لیریکی)، چاپخانا زەمان، بەغدا - 1987، بپ 3.
13. ئەحمەد عەبدوللا زەرۆ، حەیرانۆك.. ژێدەرێ بۆری، بپ 3 - 4.

# بازێرێن بەهدینان دناڤ فۆلکلۆرێ دەڤەرێ دا

خالد صالح

بابەتێ بازێر و بازێرکێن کوردستانێ ب گشتی، یان گوند و هۆز و چیا و دۆل و رووبار و...هتد، بابەتەکێ گەلەکێ بەرفرەهە دناڤ فلکلۆرێ کوردی دا. دهۆك ژی وەکی بازێرەکێ کوردستانی، ناڤێ وێ دناڤ گەلەك تایێن فلکلۆرێ دەڤەرێ دا یێ هاتی. نە هەر دهۆك ب تنێ، بەلکی سەرجەم بازێرکێن سەر ب وێ ژی ڤە (ئامێدی، زاخۆ، ئاکرێ، سێمێل، شێخان و... هتد)، ژ بلی ناڤێ ب دەهان گوندێن دەڤەرێ. ئەڤە ژی چەند نموونەکن ل سەر بازێرێ دهۆکێ:

* دهۆك دناڤ حەیرانۆکاندا:

- دهۆکا رەنگین چەندا جانە
ئالەك دەشتە ئێك زۆزانە
بەختێ وەمە، مە بیانی حسێب نەکەن
ئەو مەوتنێ مە هەمیانە[١].

- دهۆکا رەنگین یا بەلاڤە
کێلیا شەدا ل هنداڤە
هەچیێ ژ دهۆکێ دویر کەڤت
دێ ژ خەمادا دەت هناڤە[٢].

- ڤێ دهۆکێ، ل بەر ئاڤێوۆ
هەر ئاڤەکێ، کانییەك لێوۆ
کەس بلا پشتی دەلالێ دلێ من، نە گرێدەت
قاهیشا رەختێ، ل سەر شویتکێوۆ[٣].

- ڤێ دهۆکێ، یا ب لەڤەنە
سەرێت لەڤەنا، ب کۆپکەنە
هندی مرۆڤێت، مرۆڤی ل وێرێ بن
یێت خەلکی، دبێ فایدەنە[٤].

- چوومە دهۆکێ سەرێ چەمی
سەردا جسرە د بندا گەمی
پشتی دۆستا من عەبدالا خودێ
خویشکێت منن ژنك هەمی[٥].

- ڤێ دهۆکێ سەرێ رێکا
دلێ من و هێلینا هێکا
من لاوکێ خۆ گرت و ژ سەدو ئێکا[٦].

- چیایێت دهۆکێ یێت سپی دکەن وەکی هێکا
ئەزێ گرێدانا شالا حەیاسی، دکەم ئێکا
خۆزیکا من و ل وێ گاڤێ
هەکو یار و دەزگر دگەهنە ئێکا[٧].

- چووم دهۆکێ دهۆکا میرا
ئیشەلا ئێشەك بگریت ژ جانا هەتا پیرا
هەکە بۆ من و دەلالێ من
نەبینن چ رێك و چ تەکبیرا[٨].

- چووم ئاقاری ئاقار سارە
چووم کانیێ نەی دیارە
گۆتن: یێ چوویە دهۆکێ خویندکارە[٩].

* دهۆك دناڤ بەیتاندا :
دبەیتا کێچاندا دبێژیت:
- ئەز ڕەڤیم چوومە مالا عەیشۆکێ
دانا بەر من پێچەکا باجان سۆرکێ
ژبەر کێچا ڕەڤیم چووبوومە دهۆکێ[10].
* دهۆك دناڤ سترانێن دەهواتاندا:
ئەڤ ناڤە مشە یێ دناڤ سترانێن دەهواتاندا هاتی:
- های سۆرە سۆرە دهۆکێ سۆرە
خەملا دهۆکێ شتلێت گوندۆرە
تەمێ نە کوژن، تەمێ بسپۆرە[11].
- های شینە شینە دهۆکێ شینە
خەملا دهۆکێ دارێت بەڕوینە
تەمێ نەکوژن کەسێ خۆ نینە[12].
- چوومە چەلێ دەر ب تۆکێ
چووم حەرامێ دەر ب تۆکێ
من ئینا شارێ دهۆکێ
بۆ یارێ دا ب دەرسۆکێ[13].
- های مێمێ مێمێ مێمێ
دوو مێمێ ل گەل مریەمێ
مێم ڕەڤا بوو دهۆکێ[14].
- هەمیا دێ بەم بۆ دهۆکە.
بۆ دۆتمامێ دابێن نەینۆکە[15].
- ناڤێ نارام مروکە للو............ نارینێ
ناڤێ نارینێ مروکە للو...........نارینێ
کەمەرا وێ ب زریۆکە للو........ نارینێ
کەمەرا وێ ب زریۆکە للو........ نارینێ
پاشا ڕابوو ل دهۆکە للو........... نارینێ
پاشا ڕابوو ل دهۆکە للو........... نارینێ[16]
- حەوشا مێمێ ب دار بێمۆکە
حەوشا کچکێ ب دار بێمۆکە
کەمەرا مێمێ ب زریۆکە
کەمەرا کچکێ ب زریۆکە
مێم ڕەڤا برە دهۆکە
کچ ڕەڤا برە دهۆکە[17].
- هات و کەژا دهۆکێ
هات و کەژا دهۆکێ
تۆ ب کراسێ ب گولێ
تۆ ب کراسێ ب گولێ
دۆستا لاوکێ خشکۆکێ
دۆستا لاوکێ خشکۆکێ[18].
- هات رووبارێ دهۆکێ
هۆ کوڕ و تۆی خرابی
ئەز دێ بێژمە بابێ خۆ
تۆ ژ من ڤەنابی
سەرو کانی ژ بیهۆکێ
هۆ کوڕ و تۆی خرابی[19].
- مەنجێ کچکۆکە کچکۆکە
یارێ کچکۆکە کچکۆکە
دوو کەو فەرخن یێ ل دهۆکە
دوو کەو فەرخن یێ ل دهۆکە
حاکمێت گران مەنجا کۆکە
حاکمێت گران یارا کۆکە[20].
- هات رووبارێ دهۆکێ
هات رووبارێ دهۆکێ
سەرەکانی ل بن بیهۆکێ
سەرەکانی ل بن بیهۆکێ
مە سلاڤە ل رووی زریۆکێ
مە سلاڤە ل رووی زریۆکێ[21].
وەسان ناڤێ دهۆکێ دگەل سەرکێ زاڤای و نارینکا بویکێ و گەلەك سترانێن دی ژی یێن دەهواتا دا هەنە، بۆ نموونە د (سەرکێ زاڤای- شەکر ئاغا) دا دبێژیت:
قەسرا ل دهۆکێ هاڤینا هوینە
بەژنا شەکراغای ژ ڕحانا شینە[22].
یان ژی (نارینکا بویکێ) کو دبێژیت:
نارینێ تاڤیا تەیرۆکێ
داڕێتە دەشتا دهۆکێ
نارینێ نەختێ دەرسۆکێ[23].
* ناڤێ دهۆکێ دناڤ سترانێن کۆچك و دیواناندا:
- حەمێ میسێ دبێت:
هەرێ مامۆ خەتابۆ تۆ نە ترسە ئەو چ نینە

هەرێ مامۆ خەتابۆ تۆ نە ترسە ئەو چ نینە، نێ هەمی کورێ خەلکینە، ئەنقەرینە، ستەمبۆلینە، مێردینی و دیاربەکرینە، دهۆکی و مویسلی و کەرکۆکینە، بەغداینە، روحایینە .

ئەوێ کت و مات فەسادێ ئاکرەیی و دهۆکی و ئامێدی نە، ب نانێ خەلکی مەزن بینە[٢٤].

- شادە شویدێ نویرێ باویل ئاغا گەلەك هەنە

ب سێ دەنگا بانی دکەت عەلییێ برا تویێ دەستهلینە

ئەڤرو ل من هاتن کوشتن عەزیز و خدرێ پسمام

جۆتێ زەریا ل دهۆکا داسنییا مابوو ژ کێرە.

* ناڤێ دهۆکێ دناڤ یاریاندا:

هەر چەند وەکی دەق چ تشتێ ئەشکەرا نینە. لێ گەلەکِ جاران زارو ناڤێ باژێرێ خۆ، یان باژێرکێن نێزیك کو وان رەنگە شەهرەزاییەك دگەل هەبیت دکەنە دناڤ یاریێن خۆدا. وەسان مشە ناڤێ دهۆك (وەکی ل دهۆکێ یاریێ دکەن) ڤی ناڤی ب کار دهینن. بۆ نموونە یاریەکا هەی، دەمێ زارو وێ یاریێ دکەن دێ بێژن دا (دهۆك دهۆکانێ) بکەین. لێ ئەگەر هەر ڤێ یاریێ ل جهەکێ دی بکەن، دبیت ناڤێ وێ ب گوهورن.

* زاخۆ دناڤ حەیرانۆکاندا:

- چووم زاخۆیێ چەندا هینە

دبەردا دهێت خابیرێ شینە

کوڕکۆ دینۆ وەرە من ژ بابێ من بخوازە

هەکە ئەز نەدام من ب ڕەڤینە[٢٥].

- بارانکەك باری، ل دەشتا زاخۆیێ

ڕەشیشەك باری، ل دەشتا زاخۆیێ

شەتێ مەندە، مەسکەن نیموەیێ

زاڤا دێ دگەل مە بە، دا بچین سەرشۆیێ[٢٦].

- ئەزێ چوومە زاخۆکا ڕەنگین باژێرێ ئاغا

ئەزێ چوومە سەرێ چیبا، سەرێ شاخا

ئەزێ بەرێ خۆ دەمە ڕێکا خەلکێ دەلال

بلا خودێ مرازێ من و خەلکێ دەلال بکەت

سەد قەدا بکەڤن، سەر ڤان ملکا، ڤان ئیجاخا[٢٧].

* زاخۆ دناڤ سترانێن دەهواتاندا:

* هە ژ جۆوێ هەتا جـۆوێ....... تۆ لاوکێ منی وەلەك

پشتێ گرێدە مالتۆوێ........... تۆ لاوکێ منی وەلەك

وەلەك چۆ بوو زاخـۆوێ......... تۆ لاوکێ منی وەلەك[٢٨].

* زاخۆ دناڤ سترانێن کۆچك و دیواناندا:

- ئەرێ خابیرۆ تۆ یێ تێوۆ ل سەرێ،

زۆزانێت ژووری، تۆ لەزێ دکەی، دلەزینی

دەستکێت هەلال و بەیبینا، ژ هەرە کۆلێ میرا،

دگەل پێلێت خۆ بۆ من تینی

دلکێ من ل دەرێ حەڤسا زاخۆکێ،

ل سەر ئاڤێت خابیرا، دقەهرینی

تۆ چ جابکێت خۆش،

بۆ من ژ لایێ یارکا من ڤە، ناهینی

ئەرێ خابیرۆ، مەندۆ، مەلیانۆ...

بۆرۆ گرانۆ، هیزلۆ وێرانۆ ، گۆملۆ خۆپانۆ

تۆ تێوۆ ل سەرێ زۆزانێت ژووری،

تۆ تێوۆ، چەندێ ب لەزۆ و ...[٢٩].

- ئەزێ ب سینەداغا زاخۆ ب سەرکەتم بەیانی نادە

تەیارا محەمەد ئاغایێ زاخۆیێ

کەکێ سمایل بابێ حێچێ نەوەلە ل ناڤ

برەکا تەیاری حکوومەتی دیار نادە ...

- نە بابێ نۆرێ یە

نە زۆر تەمەر پاشایێ مللیە

ئاغایێ زەنگ و زێرێت بابێ تورێت عەدێ یە

وێ هەنێ ، کورە لاوکێ من ، عەبدالا خودێ یە

شەریف بەگێ زاخولییە[٣٠].

* ئامێدیێ دناڤ حەیرانۆکاندا:

- ئەزا ب ئامێدیێ را دهێم وا ب شویرە

دبەردا رووبارە د پشت دا حەرامێ خابویرە[٣١].

- ئەزێ ب ئامێدیێ کەتم وا ب کەلاتە

دبەردا رووبارە د پشت دا حەرامێ وەلاتە

دێ تۆ دەستێ من عەڤدالێ خودێ بەردە

ستێرا سوبێ ل مە هەلاتە

- ئەز ب قشلا ئامێدیێ كەتم چەند شرینە
تەژی تێدا قایمەقام و ئیمباشینە
هندی ئەزا چاڤێ خوە دگەرینم
ئێكێ وەكی لاوكێ من د ناڤ دا نینە[٣٢].
- ئامێدیێ دەربەندە
سپنێ بادینا كۆر و لەندە
كچك كۆچەرە
كورك رەڤەندە[٣٣].
- سەرێ ئامێدیێ، ب قەلاتێ دێمە
ئەڤە حەفت سالە، ئەز ب خولامێ لێمە
كەس نزانیت، ئەز گرتیێ میر و حاكمامە
یان عاشقێ یارێ مە[٣٤].
- چوومە ئامێدیێ، حوكمەت یا درێ دا
رەزكێ مەژن، كەتە درێ دا
من گۆت: ئەز دێ كاغەزەكێ فرێكەم بۆ خیڤزانكی ددووڤ ڤێ شۆلێ دا[٣٥].
- چوو سەر بانی، چوو سەر بانی
شویتك گرێ دا، ب ئامێدیانی
ئەز دێ گۆری تە كەم
هەر حەفت برا، دگەل پسمامی[٣٦].
* ئامێدیێ دناڤ سترانێن دەهواتاندا :
- تە كراس ژ بەلكێ.......... كراسێ تە ژ بەلگێ بی یێ
من كری بوو ژ ئامێدیێ....... من كری بوو ژ ئامێدیێ
من دا دورین ب دەرزی یێ ......من دا دورین ب دەرزی یێ[٣٧].
- هەژ ئامێدیكێ كەلەك ڤەرەستن
هەژ ئامێدكێ كورو زالم كەلەك ڤەرەستن
دویلكێ دنیایێ خیڤەت گوهاستن و ...
* ئامێدیێ دناڤ سترانێن كۆچك و دیواندا:
- شاهینۆ ئەزێ، ب ئامێدیكێ ب سەركەتم ، یا ب زنجە
گارێ مال خراب، ب تویتنە، سپنێ مال خراب، ب برنجە
دەردێ ئەڤینیكێ شاهینێ من یێ گرتی و...[٣٨].

* ژ سترانێن مەشكا ژێ:
- سەر گركێ شارانیێ........های ژارێ
خۆشترە ژ ئامێدیێ.......... های مەشكێ
هەر چار رەخا كەڤی.........های مەشكێ
خۆشترە ژ ئامێدیێ..........های مەشكێ[٣٩].
* ئاكرێ دناڤ حەیرانۆكاندا:
- چ خەمەكا د سەر خەمێ دا
سۆرگول بشكفتن د حەرامێ رووبارێ ئاكرێ دا
من حەیف و سێ سەد مخابن
كچكێت گوندێ مە پیر بوون د مالا بابێ دا[٤٠].
- لاوكا دینا، ئەزێ چوومە ئاكرێ،
ب سەركەڤتم، حافا گولا، گولا گەشكر
ئەزێ چوومە سەرێ چیایێت بلند من تماشەكر
زەری و ئەسمەرێت گوندێ مە، ل سەر بانا خەوا خوەشكر[٤١].
* ئاكرێ دناڤ سترانێن دەهواتاندا:
- قەسرێت ئاكرێ دەرگەهـ سێنە
برجێت ئاكرێ دەرگەهـ سێنە
- قەسرێت ئاكرێ دەرگەهـ چارن
برجێت ئاكرێ دەرگەهـ چارن
- دیسان سترانەكا تمام ب ناڤێ (شەرێ ئاكرێ) هەیە، كو ل سەر شەرەكی یە ل سالا (١٩٦٣) ێ رویدای. ئەو ژ سترانێن نە گەلەك كەڤنە دناڤ فلكلۆرێ كوردی دا، بەلكی ژ ڤەرێژا شۆرشا كوردی بوویە، مینا ب دەهان سترانێن دی كو ژ ناخێ سترانبێژا دەركەتین، وەكی رەنگڤەدانا كاودانێ شۆرشێ و سەركەتنێن وێ.
* سێمێل د حەیرانۆكاندا:
جۆتیارۆ جۆتیارێ ڤێ نهێلێ
جۆتی بەردە قەلوینا خوە تێكە
بادە قەفتا سمبێلێ
ئەز بۆ تە چێترم ژ دەبرا سێمێلێ[٤٢].
سێمێلێ دناڤ سترانێن كۆچك و دیوانانداً:
- لێ لێ دایێ ئەزێ ناچمە بازێرێ سێمێلێ ل عەردێ یانە
بلا خودێ خراب بكەت مالا زالمێت وان زەمانە

دە خودێ دزانت زالمێت حکوومەتا عەرەبانە
چاوا وەختێ مەلك یاقو دەرباز بووی
چووی وەلاتێت غەریبیانە
پێنج سەدو پێنجی زارۆك ژ عەمرێ دەهـ سالی
هەتا عەمرێ پازدە سالی دەستێ وان دانە دارێ کەلەمچانە
هەر پێنج سەد و پێنجی زارۆك سەرژێکرن وەك حەیوانە
دە خوینا وان زارۆکا ل کۆلانێت سێمێلێ فیریانە
هەوار هەوارێت ڤان زارۆکا
ل چیایێت کوردستانێ دەنگ ڤەدانە
سێمێلێ دناڤ سترانێن دەهواتاندا:
- سترانێن تمام ل سەر رویدانێن سالا (١٩٣٣) ێ ل سێمێلێ دناڤ سترانێن دەهواتا هەنە[٤٣].
* شێخان دناڤ سترانێن کۆچك و دیوانانداا:
- شەرەکا ل مە چێبوو ل قەزا شەمکان و شێخان
ل گوندێ مرێبا ب دار و بییە
خودێ خراب بکەت مالا زەعیم خەلیل... تا دگەهیتە:
ئەوان تەکبیرا سۆتنا عەرز و عەیالێ کوردا...
ب حوکمێ تۆپ و دەبابان تەیارێت سویخۆیان و مێکان و باجەرا
قەزا شێخان و شەمکان گوندێ مرێبا ل مە گرتییە
دەلێ وایێ، دەلێ وایێ
ل ناڤ سترانێن دی ژی دا هەنە:
- هەکو کچکێت شێخان و دەنا،
دهاتن چوونە، تەوافا شێخادی
دێ بلا کەلەش دوستا من ل گەل با،
دا ئەز چووبامە سەری.
هەلبەت ناڤێ ب دەهان جهێن گوند و واران دناڤ ڤان جۆرێن فلکلۆری دا هەنە، مینا ئاشێ سویلاڤێ، ئێتویت، ئۆرمان، ئەرتۆش، ئەرمشت، ئێسیا، بادینا، باڤیا، باکۆز، باگێرا، بناڤێ، بەرچی، بشێش، بێبادێ، بەرواری، بریفکا، بلێجانکێ، بێبادێ، بێدە، پرا بلبل، جاریۆت، چیاکێ هلۆر، چیاکێ مەتینا، چیاکێ گولیا، خابیر، خورکی، درگنێ، دۆسکی، رەشاڤا، زێبار، زیناڤا، سگێر، سەرسنگ، سەرگەلێ، سویلاڤ، شەرمنێ، شێخادی، شێلازا، غلبیشی، قومریێ، کێستە، گارە، گرگاشێ، لینك، مامزدینی، مەتین، مەقلۆب، مزویری، مزویرکا، مێرستەکێ، هرۆر، هەرکی، هەسنەکا، هێتویت.

## ژێدەر


١. عەبدولعەزیز خەیات، حەیرانۆك، (:)، بپ٥٤.
٢. هەمان ژێدەر.
٣. حەجی جەعفەر، حەیرانۆك، ()، بپ١٠٤.
٤. هەمان ژێدەر، بپ٨٣.
٥. ئەدیب عەبدوللا، حەیرانۆك، ()، بپ١٣٠.
٦. خالد صالح، دهۆك دناڤ فلکلۆرێ کوردی دا، گۆڤارا دهۆك، ژمارە ١١ سالا ٢٠٠٠ێ، د پەرتووکا سترانا لێریکی، بپ٤٢، یا هێژا ئەحمەد عەبدولا زەرو دا هاتییە:
دلێ من و هییێلینا هێکا
ل ڤێ دهۆکێ، سەرێ رێکا
وە لاوکێ خۆ یێ ژێگرتی
ب سەد و ئێکا.
٧. هەمان ژێدەر. هندەك ژی دبێژن: هەکو دایك و وەلەد، خویشك و برا دگەهنە ئێکا.
٨. عەبدولعەزیز خەیات، حەیرانۆك، بپ١٠٨.
٩. دهۆك دناڤ فلکلۆرێ کوردی دا، بپ٤٦.